مەسعوود محەمەد

«گەشتی ژیانم»

- ❖ یەکەم ئاڵقەی ئەم گەشتە، لە ژمارە 103-104 ی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ی 1984 دا بڵاو کرایەوە و پاشان ئاڵقە ئاڵقە زنجیرەیان بەست.
- ❖ ساڵی 1992 لە ستۆکهۆڵم وتارەکان لە یەک کتێبدا کۆ کرانەوە و چاپ کران.
- ❖ ساڵی 1994 لە کوردستان چاپی دووەمی دەرچوو. پاش ئەو چاپە، نووسەر بە سەرلەبەری کتێبەکەدا چۆوە و زانیاری دیکەی خستە سەر. ئەوجا لە سایتی مامۆستادا خرایە ئینتەرنێتەوە.
- ❖ ساڵی 2009 لە کۆیە چاپی سێیەمی بڵاوکرایەوە.
- ❖ ساڵی 2014 «گەشتی ژیانم» سەرلەنوێ لەلایەن سایتی مامۆستاوە تایپ کرایەوە.

## ئاڵقەی یەکەم

چاوگێڕانەوە بە ڕۆژانی ڕابوردووی دوور وەک تێوەڕامانی ئاسۆی ئەوپەڕی دەشتی بەرین وەیا خوێندنەوەی دەفتەری ئەوسەری مێز، هەر لووتکەی بەرز و دێڕی تێرڕەنگیان لێ بەدی دەکات، ئنجا ئەگەر مەیلی چیرۆکنووسین پاڵ بە قەڵەمی مێژوونووسەوە نەنێت بۆ کەلێن گرتن و بەسەرەوە نانی ئەو کەمتاکورتە ژیانی سەرەتای ساوایی و منداڵییەوەی کە دێتەوە بەر یادی، بە چەند لۆقاوێکی شاشوبێشی خامەی بە پەلە لەو بوارە بەرتەسکە تێدەپەڕێت بۆ قۆناغی ئەملاوەتری عومری خوێندنی و گەمەوگەپی جگێنە و سێباز و کارەمستێنەی هەست بە دنیا و بە خۆیەوە کردنی.

لەگەڵ ئەمەشدا کە نووسەر دێت و ڕێچکۆڵەی ژیانی هەڵدەکاتەوە وەک کە منداڵ گوشی کۆلارە کاغەزەکەی لە تاقی ئاسمانەوە بۆ نێو پەنجەکانی هەڵدەکاتەوە، زۆر بەسەیری، مەتەڵێکی بچووک هەڵدێنێ کە دەبینێ ئەم ڕێچکۆڵەی عومری سەربە تەمومژی فەرامۆشی گەیاندوویەتی وا تێهەڵدەکشێ بەرەو ڕۆژگارێکی دوورتر کەوا جارێ غونچەی ژیانی خۆی تێیدا نەکرابۆوە، بەو لای گوشی کۆلارەی عومری خۆیەوە گوشی عومری کەسانی لە خۆی بە پێشەوە تێهەڵدەکشێت کە ئەگەر زوو پسابایە نۆرەی هەڵدانی کۆلارەی عومر نەدەگەیشت بەو. تومەز ئادەمی وەک کوارگ و دونبەڵان بێ ڕەگ و ڕیشە لە درزی زەوی و قەڵشتی درەختەوە دەرنایەت، هەر جارە جووتە هەناوێک، لە کۆنی کۆنەوە، نەخشەی مەلۆتکەی مەوهوومی بوونەوەریکیان دەور و تەسلیم کردووە بۆ جووتە هەناوێکی بەرەو خوارتر تا ئەو دەمەی کە واقەی ساوایەک ڕۆژەک لە ڕۆژانی ساڵنامەی ڕۆژگاری دەست نیشان کردووە بە مێژووی لەدایکبوونی فلانە کەس. بە ناچاری دەبێ بەرەو پێشینان بچمەوە تاکوو بزاندرێ من کێم؟

بنەماڵەی جەلیزادە

لە من بە پێشەوە پێنج پشت لە باپیرانم بە «جەلیزادە» ناسراون. پشتی شەشەم لەقەبی «کاکی جەلی» هەبووە نەک جەلیزادە چونکە خۆی زادەی «جەلی» نەبووە.

بابزانین حیکایەتەکە چۆن دەست پێ دەکات. خۆشبەختانە باوکم لەم مەیدانەدا ڕێگەی درێژی کورت کردۆتەوە بۆم، لە پێشدەستیی کتێبە چاپکراوەکەی «المصقول في علم الأصول» دا پوختەیەکی هەواڵی بنەماڵەی جەلیزادەی و ڕۆژگاری بەر لەو نازناوەشی بۆ شەش پشت هەڵداوەتەوە. بەپێی نووسینی باوکم کەوا بێگومان باشترین سەرچاوەی بێگرفتە لەم بوارەدا درەختی خانەوادەیی زانراومان لە ناوچەی کوردستانی عێراق بەم جۆرەیە:

ئا- لە گوندی «بێگەڵاس» ی هەرێمی پشدەر:

1. مەلا ئەبووبەکر. نازناوی «حاجی گەزۆ» بووە بە بۆنەی کەرامەتێکی وەپاڵی دراوە و پێوەندیی بە گەزۆوە هەبووە
2. مەلا حەسەن کوڕی مەلا ئەبووبەکر
3. مەلا برایم کوڕی مەلا حەسەن
4. مەلا حەسەن کوڕی مەلا برایم
5. مەلا برایم کوڕی مەلا حەسەن

وا زانراوە کە ئەم خانەوادەیەی سەربە ئایین و زانست لە جەزیر و بۆتانەوە لەبەر هۆیەکی نادیار ڕووەو کوردستانی عێراق گەشتی مشەختانەی کردووە تا لە بێگەڵاس نیشتەجێ بووە. لە جەزیر و بۆتان خانەوادەکە سەربە «شێخ برایمی جەزیرەی»یەوە دەگەیەنێ کە چەندوچۆنی ژیانی نازانین مەگەر ئەوەندە، کە خۆی و بنەماڵەی هەر سەربە زانست و ئایین بوون.

ب- لە گوندی «شیواشان» ی سەربە بیتوێن و هەرێمی ڕانیە:

کوڕەگەورەی مەلا برایمی ناوبراو لە کۆتایی لیستەی سەرەوەدا، لە بێگەڵاسەوە ڕای گوێستووە بۆ گوندی شیواشان. وا پێ دەچێ بەرتەسکیی ماوەی گوزەران بۆ خێزانێکی فرەئەندام هۆی ئەم ڕاگوێستنە بووبێت. برا و کەس و کاری دیکەی هەر

له دێی بێگەڵاس ماونەتەوە، تا ئێستاش خزمایەتی و دۆستایەتییان پێمانەوە بەردەوامە.

ئەم کوڕەی مەلا برایم ناوی «محمد» بووە. دەماودەم باسی مەلایەتی و، بەتایبەتی، خواناسی و دیداریی ئەم مرۆیە لەو دەوروبەرەدا بڵاوبۆتەوە تا ئەوەی دەگێڕنەوە کە زۆرینەی ژیانی خۆی لە ئەشکەفتێکی نزیکی شیواشان بە عیبادەت ڕابواردووە و، گۆیا، لە زۆر باردا بە شیری بزنە کێوی گوزەراندوویەتی. ئەشکەفتەکە بە «ئەشکەفتی مەلازادە» ناوی ڕۆیشتوە، خۆیشی هەر «مەلازادەی شیواشان» مەشوور بووە و زوربەی خەڵقی ئەو ناوە بێئاگان لەوەی کە ناوی «محمد» بووە. حاشیە و وردە هەواڵی دەستنووسی مەلازادە بە سەر هەندێک لە کتێبە دەسنووسەکانی کتێبخانەی جەلیزادانەوە هەر ماوە.

ج- لە گوندی جەلی:

کوڕەگەورەی مەلازادەی شیواشان کە ناوی «عبدالله» بووە، دە برای لە خۆی بچووکتری هەبوون، هەر لە دەمی ژیانی باوکیدا، دەگوێزێتەوە بۆ گوندی «جەلی» کە ماوەی دوو سەعاتێک بە سواریی وڵاغی خۆشڕۆ لە باکووری مەیلەو ڕۆژاوای کۆیێ، بە بناری شاخی «ئاوەگرد»ەوە، خنجیلانە تێکەڵ بە باغی هەنجیر و هەنار و مێو بووە. لە «جەلی» یەوە بەرەو «شیواشان» بڕۆیت دەبێ ڕووەو باشووری مەیلەو ڕۆژهەڵاتی بۆ ماوەی چوار سەعاتێک وڵاغت بئاژۆیت، لە کۆیەوە بۆ شیواشان بچیت، بەرەو ڕۆژهەڵات بە پێنج سەعات ڕۆیشتن دوای بڕینی دوو ڕێزە شاخی هەیبەسوڵتان و کۆسرەت دەیگەیتێ.

چیای ئاوەگرد لە کتێبی «دوحة الوزراء» دا ناوی هەیە کە لە 1750 ز دا عوسمان پاشای بابان بە سەرپێچی لە سوڵتانی عوسمانلی بۆ ماوەیەک تێیدا دەحەوێتەوە. حاجی قادریش ناوی هێناوە جارێکیان بە «تەوریە»، کە دەڵێ:

مەلاییکی فەقێیانە وەقارت
بەیانت ئاوە، گردە ئیقتیدارت

جارێکی دیکەش لە قەسیدەیەکدا دەڵێ:

به قەددی ئاوەگردە دەردی دووری
نەظیری ئیچ قەڵایە بێ حضوری

مەلازادەی شیواشان بە خەتی خۆی لە کتێبێکی دەستنووسدا نووسیویەتی کە یەکەم کوڕی «عبدالله» لە ساڵی 1116ک، لە گوندی شیواشان، پێی ناوەتە دنیا. بەڵام ساڵی بوون و مردنی خۆی و مردنی کوڕەکەی نازانین.

ئەم مەلا عەبدوڵایە کە یەکەمی سێ عەبدوڵایانە لە زنجیرەی مەلاکانی جەلیزادە ناوی دەرکردووە بە «کاکی جەلی». لەو ناوچەیەدا براگەورەی سێ ئاوایی، کە هەر سێیان پیاوی ئایین بوون، لەقەبی کاکیان هەبووە. دووەکەی دیکە «کاکی زێوە» و «کاکی هیران» ن ئێستاکە ئەم لەقەبە هەر بۆ «کاکی هیران» ماوە. دوای مەلا عەبدوڵا کوڕە گەورەکەی، مەلا عەبدولڕەحمان، هەم بە «کاکی جەلی» و هەم بە «جەلیزادە» ناوی دەرکردووە: لە میراتی باوکییەوە «کاکی جەلی» ی بۆ ماوەتەوە. چونکە لە گوندی جەلی و لە مەلای جەلی بەوەلەد بووە پێی گوتراوە «جەلیزادە».

مەلا عەبدولڕەحمان یەکێک بووە لە مەلا هەرە زلەکانی سەردەمی خۆی. بەسەر زوربەی کتێبە «زانستی-ئایینی» ئیسلامەوە حاشیەی دووردوودرێژی هەیە، لە سەر هێندێک لەو زانستانە کتێبی داناوە. هاوچەرخی مەلای ئیبنوئادەم و شێخی نۆدێ بووە. لە نموونەی وردبینی و توێژینەوەی زانستییانەی دەگێڕنەوە کەوا شەوێکیان، هەر لە گوندی جەلی، بە نیازی دڵنیابوون لە بارەی بزووتن و نەبزووتنی ئەستێرەی «قطب» - لە کوردەواری پێی دەڵێن «ئەستێرەی جەدی» - بۆ ماوەی چەندین سەعات بێ ئەوەی جووڵە بکات لەسەر پشت ڕادەکشێ و چاو دەبڕێتە ئەستێرەی «قطب» و چڵە دەرختێکیش بە عەیارە دەگرێ تاکوو لێی ڕوون دەبێ ئەستێرەکە بە ئاستەم دەبزوێ.

لە بارەی دینداری و خواناسیی مەلا عەبدولڕەحمانەوە ئەم سەرگوشتەیە پشتاوپشت و دەماودەم هاتووە: حەسوودان بە عادەتی ئەبەدییان تۆمەتی کەمتەرخەمی لە دینداریدا وەپاڵ دەدەن. مەلا ئەبووبەکری- میر ڕۆستەمە، دێیەکە لە هەرێمی شەقڵاوە کە مەلایەکی زێدە زانای ئەو سەردەمە بووە - بۆ تاقیکردنەوەی ئەو

تۆمەتە، لە بەرگی فەقێیەتیدا بە بەهانەی خوێندن دێتە لای مەلا عەبدولڕەحمان لە جەلی سەرنج لە گوفتار و ڕەفتاری مەلا عەبدولڕەحمان ڕادەگرێ تا دوای نوێژی خەفتنان و بەسەرچوونی جەمی ئێوارێ. هەرچی لێی دەبینێت و دەبیەت لەگەڵ خواناسی و دابی ئیسلامیدا جووت ڕۆییشتووە. کاتێک کە مەلا عەبدولڕەحمان دەیەوێ بەرەو ماڵ بچێتەوە، یەکێک لە فەقییەکانی مۆمی مۆمدانەکەی مامۆستای دەردەهێنێت و مۆمی مزگەوتی بەسەردا دەگرێت، بۆ داگیرساندنی. مەلا عەبدولڕەحمان لێی بە دەنگ دێت و پێی دەڵێت: ڕۆڵەکەم مۆمەکەی من بەسەر هی مزگەوتدا بگرە چونکە ئەوەی تۆ دەیکەیت بێشەرعییە، کە مۆمەکەی مزگەوت خواربێتەوە بۆ سەر مۆمەکەی من بڵێسەی بە بەر خۆی هەڵدەچێتەوە و پتری لێ دەتاوێنێتەوە. مەلا ئەبووبەکر کە ئەم تەقوایە لەڕادەبەدەرەی لێ دەبینێت خۆی لێ ئاشکرا دەکات و بە عوزرخوازییەوە دەستەکانی ڕادەمووسێت. لەوە بەولاوە بۆی بوو بە دۆست و چاکەخواز و قەدرزان تا مردن.

لە سەردەمی پاشایەتیی «عەبدولڕەحمان پاشای بابان»دا جارێکیان لە کۆیێ کۆبوونەوەیەکی گشتی بە پیاوماقووڵ و مەلا و ئەدیب و شێخانی کۆیە و دەوروپشتی بە سەرپەرشتی کردنی عەبدولڕەحمان پاشا خۆی دەبەسترێ. مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلیش لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار دەبێ. لە وتووێژدا کاکی جەلی سەرنجی خەڵقەکە ڕادەکێشێ، بەتایبەتی هی پاشا. کاکی جەلی لە بەرەو خواری مەجلیسەکە دانیشتبوو، پاشا پێی دەڵێ: ئەو شوێنە جێی تۆ نییە فەرموو هەڵکشێ. کاکی جەلی لە وەڵامدا گوتبووی: «پاشا ئاگر جێگەشی نزم بێ بڵێسەی بۆ سەرەوە دەچێ». دوای ئەم دیدەنییە عەبدولڕەحمان پاشا لەگەڵ قەدر و حورمەتێکی زۆردا مەلا عەبدولڕەحمان دەهێنێتە کۆیێ و مزگەوت و مەدرەسەی لە قەبەڵ دەکات و بەراتی چەند دێیەکی سەربە کۆیە و ڕانیە بەو مزگەوتەوە دەبەستێتەوە.

وا پێ دەچێ ئەم ڕووداوە لە دەوروبەری 1210 ی کۆچی بووبێت چونکە لە 1211 ی کۆچی عەبدولڕەحمان پاشا کتێبی «صحيح البخاري» کە دەستنووسی کاتبی خۆیەتی وەقف دەکاتە سەر کاکی جەلی، دیارە کتێبەکە بۆ ئەو نیازە نووسراوە دوای شناسایی نێوان پاشا و مەلادا. لەوەوە دەردەکەوێ، بنەماڵەی جەلیزادە تا ئێستا – ساڵی 1984 – 190 ساڵێکە لە کۆیێ نیشتەجێ بووە. مەلا عەبدولڕەحمانی جەلیزادەی کاکی جەلی لە ساڵی 1217 ک لە کۆیێ کۆچی دوایی دەکات. برا و

برازای لە جەلی دەمێنن و تا تا ئێستاش خزمایەتی و دۆستایەتی لە نێوانماندا زیندووە هەر وەک لەگەڵ دانیشتووانی شیواشانیش ئەو پێوەندییە هەر بەردەوامە.

دوای مەلا عەبدولڕەحمان کوڕە گەورەی «واثق بیللا مەلا عەبدوڵای جەلیزادە» دەبێتە جێگری باوکی. لەبەر هۆیەکی کە نازانین چییە ئاغاکانی کۆیێ گەڵەکۆیی لێ دەکەن و ماڵی بە تاڵان دەبەن. لە دەمی تاڵانەکەدا مەلا عەبدوڵا بە شمشێرێکی ڕووتەوە لەبەر دەرکی کتێبخانەکەی ڕادەوەستێ و سوێند دەخوا تا نەیکوژن ڕێ نادا کەس دەست بۆ کتێبەکانی درێژ بکات. دوای ئەم کارەساتە بە ماڵەوە دەچێ بۆ ئاکرێ و چەند ساڵێکان لەوێ بەسەر دەبات. حاجی حەسەن ناوێکی ئاکرەیی گوزەرانی دەگێڕێ و هەموو پێداویستییەکی دەبڕێ تەنانەت باغێکیشی لە قەبەڵ دەکات کە حەفت ڕۆژە جووت بووە. تا ئیمڕۆکەش قاپوقاچاغ لە ماڵمان ماوە ناوی حاجی حەسەنی لێ دێنن و دەڵێن تەشتی حاجی حەسەن، مەنجەڵی حاجی حەسەن.

ساڵێکیان گەورە پیاوانی کۆیێ تێکڕایان دەچنە ئاکرێ و مەلا عەبدوڵا ئاشت دەکەنەوە و دەیهێننەوە بۆ کۆیێ. لە ساڵی 1237 قەتلوعامێکی دوو بنەماڵەی غەفووری و عیساغا لە کۆیێ دەکرێت. «واثق باللە» لەو ساڵەدا لە کۆیێ بووە بەڵام نازانین ئایا قەتلوعامەکە بەر لە تاڵان کردنی ماڵەکەی بووە یان دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ بەم چوارینە عەرەبییە ڕووداوەکە مێژوونووس دەکات:

لقد جري حكم الحكيم الأحد<br>
في ثالث الشوال فجر الأحد<br>
بنهب كو والقتل للأكابر<br>
للظهر في غرلجد بالأبجد

نرخی وشەی «غرلجد» بە لێکدانەوەی «جمل» 1237 دەگرێتەوە. «واثق باللە» خەلیفەی مەولانا خالید بووە، شەش مانگانیش لە سلێمانی وەکالەتی کردووە. لەگەڵ مەلا یەحیای مزووری بەیەکەوە چەند جاران سەفەریان بۆ لای لە سلێمانی کردووە. لەساڵی 1246 ک، لە تاعوونێکدا دووچار دەبێت و دنیا جێ دەهێڵێت.

کوڕە گەورەی «واثق باللە» کە ناوی «أسعد» ە لەو ساڵەدا تەمەنی بیست ساڵی بووە. لە ماوەی تاعونەکەدا مەلا عەبدوڵا ئەم ئەسعەدە بۆ گوندێکی خۆی دەنێرێت

و هەر جارە کە ویستوویەتی بیبینێت بە دوایدا ناردووە و لە دەرەوەی کۆیێ چاوی پێی کەوتووە.

باوکم لەو پێشدەستییەی کتێبەکەی «المصقول...» دا قسە لە «أسعد» - کە دواتر بە حاجی مەلا ئەسعدی جەلیزادە ناسراوە - دەگێڕێتەوە کە خۆی بە عەرەبی نووسیوەتی و دەڵێ: «لە 1226 ی کۆچی ڕۆژی دەورەدانی کۆیێ لەلایەن شاهزادەوە (محمد علي ميرزا. أربيل في أدوارها التأريخية. 303) بە وەلەد بووم».

ئەو ڕۆژە عەبدوڕحمان پاشای والی بابانی (بە هەڵەی چاپ لەو پێشدەستییەدا لە جیاتی «بابانی» نووسراوە «العثماني») لە کۆیێ بووە و توانیوەتی لە گەڵیدا بگاتە مەسلەتی و شاهزادە لەو ڕێگەیەوە بگێڕێتەوە کە لێوەی هاتبوو.

حاجی مەلا ئەسعەد لەسەر نووسینەکەی بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

*«مەرگی باوکم لە ساڵی 1246 بە تاعوونی گشتی لە کویێ بوو. محەمەدپاشای والیی ڕەواندز زۆر ڕێزی لێنام و لە شوێنی باوکمی دانامەوە. ئەوسا کتێبی «عصام الوضع»م تەواو کردبوو. کە تەمەنم بوو بە 23 ساڵ کیژی محەمەداغای کوڕی حەوێزاغام مارە کرد و لەو تەمەنەدا «شرح الشمسية» م دەخوێند. لە سەرەتای موحەڕەمی 1250 بۆم گوێزرایەوە و هەر لەو ساڵەدا کوڕم «جمال الدين عبدالله» لە 22 ی شەوال بەوەلەد بوو».*

قسەکانی حاجی مەلا ئەسعەد لێرەدا کۆتایی دێت.

ئەم ژن و مێردیەتییەی حاجی مەلا ئەسعەد و کیژی محەمەداغای حەوێزاغا سەرەتای خزمایەتیی نێوان جەلیزادە و حەوێزییانە. لێرەشدا حیکایەتی بێگومان هەیە شیاوی باس کردنە:

دەماودەم هاتووە کە لە تاعوونی ساڵی 1246 دا لە بنەماڵەی حەوێزییان تەنها حاجی بەکراغای محەمەداغا و پلکێک و ئەو خوشکەی دەردەچن و هەموو دارایی بنەماڵە بۆ ئەو سێ کەسە دەمێنێتەوە. بەپێی داخوازیی باری کۆمەڵایەتیی ئەوسا و تارادەیەکیش بە فەرمانی شەریعەت بەشی هەرە زۆری میرات بۆ حاجی بەکراغا

دەمێنێتەوە. وەک دەگێڕنەوە باری گوزەرانی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە بە هۆی بێباوەری و زۆری خێزانی و خەریکبوون بە خوێندنەوە گەشەدار نەبووە. حاجی بەکراغا هەڵسووڕاندنی ئیشوکاری مڵکەکانی و باری گوزەڕانی ماڵەوەی کاک ئەسعەد بە مل خۆیەوە دەگرێ و هەر بە مەسرەفی خۆیشی خوشکەکەی خۆی لێ مارە دەکات.

دە ساڵێک بەو جۆرە تێدەپەڕێ. بەپێی نووسینی باوکم لەو بەینەدا لای مەلا محەمەدی قازی کوڕی مەلا ئیسماعیل لە کۆیێ بە خوێندنەوە خەریک دەبێ تاکوو لە ساڵی 1260 ی کۆچیدا حاجی بەکراغا تەکلیف لە کاک ئەسعەد دەکات کە بۆ خوێندن بچێتە دەرەوەی وڵات و دەینێرێ بۆ شام لای شێخ «عبدالرحمان الكزبري» تا ئیجازەی «حديث وفقه وتفسير» ی لێ وەردەگرێ. هەر لەو سەفەرەدا دوای ئیجازە وەرگرتن، کاک ئەسعەد بەر لە گەڕانەوەی بۆ کۆیێ دەچێتە حەج. دوای هاتنەوەی بە ماوەیەکی کەم حاجی بەکراغا سەرلەنوێ ڕێی خوێندنی دەنێتەوە بەر، ئەم جارەیان دەینێرێ بۆ لای مەلا عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی لە بەغدا تا ئیجازەی گشتیی لە زانستەکانی ئیسلامی لێ وەردەگرێ. لە ساڵی 1288 ک، بۆ جاری دووەم دەچێتەوە حەج. کوڕە گەورەی کە دواتر بە حاجی مەلا عەبدوڵا ناسراوە لەگەڵیدا دەچێ. حاجی کاک ئەسعەد دوای حەج لە مەککە دەمێنێتەوە و هەر لەوێش وەفات دەکات. باوکم لە حاجی مەلا عەبدوڵای باوکی دەگێڕایەوە کە دوای بەسەرچوونی حەجەکە ڕۆژێکیان حاجی کاک ئەسعەد پێی دەڵێ: ڕۆڵەکەم عەبدوڵا وەسوەسەیەک بە دڵمدا دێت هانم دەدا بچمە زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر (د). ئەمە دەسیسەی نەفس و شەیتانە دەیەوێ لە مەککە نەمرم، بە قسەی ناکەم. لە 1289 کۆچی دوایی کرد و لە مەککە شاردرایەوە.

حاجی مەلا عەبدوڵا دوای مەرگی باوکی لە 1289 کۆچی دێتەوە کۆیێ و لە شوێنی باوکی دادەنیشێت. چونکە تاڕادەیەک باسی حاجی مەلا عەبدوڵا لە نووسیناندا هاتووە پێویست نابینم لێرەدا درێژەی پێ بدەم. چی پێوەندی بە زنجیرەی ژیانی منەوە هەیە ئەوەیە کە لە نێوان سێ کوڕاندا، «بهاءالدين - محمد - نورالدين» کوڕی دووەمی کە باوکمە لە کیژی حاجی بەکراغای حەوێزی بووە. کوڕی یەکەمیان «بهاءالدين» - کاکەباوی پێ گوتراوە - بە گەنجیەتی لەسەردەمی باوکیدا جوانەمەرگ دەبێت و کەسی لە دوادا بەجێ نامێنێت. ئەوەندەی ژیا سەرپەرشتی

ملْک و ماڵی باوکی کردووه و گوزەرانی گێڕاوه. گەنجێکی بەرچاو و خاوەن وڵاخ و چەک و دەستوپاوەند بووه، شاعیر هەبوون له شیعردا مەدحیان کردووه، یەکێک لەوان که نازناوی «هەوایی» بووه له نێوان قەسیدەیەکدا ئەمەی بۆ نووسیوه، دیاره داوای یارمەتی لێ دەکات:

درِاوه کیسەکەم هەند بێ دراوه
له پەنجا جێگه پینەی لێ دراوه
له زوبدەی سیلسیلەی ئالی جلیه
جەنابی میری میران کاکەباوه

کوڕی سێیەم، شێخ نوورەددین، له خاتوو زێنەبی کچی شێخ کەریمی بەرزنجی کۆییێیه، بەو هۆیەوه که شێخزادەیه، له منداڵییەوه پێی گوتراوه «کاکه شێخ، شێخ نوورەددین». له بیرەوەریه ئێسکسووکەکانی تەمەنی منداڵی مامه نوورەددینم ئەم سەرگورشتۆکەیه باس دەکرێ: جارێکیان، که منداڵ بووه، له خەوی بەیانی هەڵدەستێ خەونێکی دەگێڕێتەوه بۆ باوک و کەسانی دەڵێ: له خەودا وام زانی کەوتمه ناو ئاو بەڵام تەڕ نەبووم. باوکم گورج دەڵێ: «ئەم شێخه چ شێخێکه که تەڕ نەبوه له ئاوا» باپیریشم بێ وەستان بۆی تەواو دەکات و دەڵێ: «ئەو شێخه برای تۆیه وەکوو نووره له چاوا».

گەشتی خوێندنی حاجی مەلا عەبدوڵا له باڵەک به ڕەفاقەتی حاجی قادر له زۆر موناسەبەدا بڵاو کراوەتەوه و له سەری نووسراوه هەروەها هەرای نێوان شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کەیفی جوانڕۆیی له مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد که کێشایەوه سەر هێندێ باپیرم لەبەر خاتری شێخ ڕەزا، کەیفی له مزگەوت، زۆر به دڵشکاوی، دەربکات و کۆیێ به جێ بهێڵێت و بچێ بۆ هەولێر، ئەویش له نووسیناندا باس کراوه. کەینوبەینی داستانی شێخ «نەبی ماویلی» له کۆیه کەوا هەندێک سەروبەری یەخەگیری حاجی مەلا ئەسعەد و حاجی مەلا عەبدوڵا بووه چی ئەوتۆی لێ بڵاو نەکراوەتەوه... گەلێک لایەنی دیکەی ژیان و شەخسیەتی و پلەی زانایی و بەشی زۆری ئەو نووسینانەی لێی بەجێ ماون، ماون به خەڵق ڕابگەیەندرێن بەڵام لێرەدا ئەو ماوەیه دەست ناکەوێ. ڕاستییەکەی مەلاکانی زنجیرەی بنەماڵەی جەلیزاده

هەموویان دەبێ بە درێژی لەسەریان بنووسرێ، کەرەستەی نووسینیش هەیە، هەر دەیەوێ یەکێک خۆی بۆ تەرخان بکات ئیتر، پەنا بەخوا، بابزانین چۆن دەبێ و کەی ئەنجام دەدرێ... حاجی مەلا عەبدوڵا لەساڵی 1908ز / 1326ک لە کۆیێ بە ڕەحمەتی خوا شاد بوو.

دوای ئەوە کوڕە گەورەی، محەمەد، کە دواتر بە «مەلای گەورە» ناوی دەرکرد لە جێی دانیشت. حەوت هەشت ساڵێک بوو خوتبەی جومعە و دەرسی فەقێکان لەلایەن باوکییەوە بەو سپێردرابوو.

هەرچەند ناساندنی ئەم مرۆیە بە خوێنەری کورد کاری سەرپێی و پەلە لێکردن نییە و تا ئێستا لە شەپۆلەکانی سەرووی شەخسیەتی بەولاوە چی ئەوتۆ لە قووڵایی دەروون و پاشخانی نەفس و سەقافەت و سەرجەمی هەوڵ و خەباتی لای خەڵق نەزاندراوە چارم ناچارە لێرەدا لە بواری گەشتی ژیانی خۆمەوە کە شەلەگەیەکم لە زێی ئەو، تەنها کورتەیەکی ژیانی بۆ خوێنەر بگێڕمەوە بایی ئەوە بکات تەئسیر و تاوی بورکانی ئەو لە مندا ڕوون بکاتەوە.

باوکم 1876-1943ز لە چەند نووسیناندا باسی هەندێ سەروبەری ژیان و خەبات و فکری کراوە وەک:

- گوتارێکی گەلاوێژی 1943 (دوای مەرگی)،
- کتێبی ئەمین زەکی بەگ لە بارەی «ناودارانی کورد»ەوە،
- کتێبەکەی قزلجی «مساجد السليمانية».
- دوو کتێبەکەی مومتاز حەیدەری و عبدولخالق عەلائەددین،
- چەند گوتار لە ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی بە بۆنەی بیرەوەریی وەفاتی وەیا موناسەبەیەک پێوەندی بەوەوە هەبووبێ،
- هەندێک لە نووسینەکانی مەغدید حاجی،
- ناوناوەیەک لە نووسینی خۆمدا،
- کتێبی «الأعلام- الزركلي»،

- کتێبی «علماء اربیل» ی زبێر بیلال،
- هی دیکەش...

چەند قەسیدەیەکی مەدحئامێزیش پێیدا هەڵگوتوە وەک: هەڵبەستەکەی ئەسیری و هینەکەی مەلا ئەحمەدی ئەشکەنەیی (چاپ نەکراوە) و یەکێکی مەلا مستەفای عاسی (چاپ نەکراوە). لە «مەرسییە»شدا لاواندنەوەکەی کۆمەڵەی «ژ.ک» ی مەهاباد و قەسیدەکەی «خادم» و هی سەید ئەنوەری حوسەینی و چوارینەیەکی دڵزار و یەکێکی مەلا زاهیری مەلا سادق (چاپ نەکراوە).

لە هەڵکەوتدا نووسەری وەکوو مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی و هەژار و د.کەمال مەزهەر و کەریم شارەزا و هی دیکەش بە چاکە باسیان نووسیوە. دوای مەرگی، لە پاییزی 1943 لە «یانەی سەرکەوتن» ی بەغدادا «تەئبینیە»یەکی بۆ گێڕا، لە ڕادیۆی مۆسکۆش لە 1976 کۆبوونەوەیەکی ئەدەبی بیرەوەری سەد ساڵەی وەلادەتی بڵاوکرایەوە، لە ڕادیۆی تاران و شوێنی دیکەی ئەم ڕۆژهەڵاتە نزیکە باسی کراوە و لە تەلەفزیونی کەرکووکیش ناوناوە دووان و گوتاری لەسەر بڵاوکراوەتەوە. لە کتێبە کوردییەکانی قوتابخانەی ڕەسمیش وەک ئەدیب و زانایەکی کورد لە سەری نووسرابوو.

ناحەزەکانی بریتی بوون لەمانە:

1. زۆردار
2. ئەفسانەپەرست
3. مێشکوشک
4. دوژمنی کوردایەتی.

بەڵام لە ژیانی خۆیدا کەسێک لە ناحەزانی زاتی نەکرد بە نووسین ناوی بە خراپە بهێنێ وەیا ڕووبەڕووی دەنگ هەڵێنێ.

ئەم مرۆیە لە سەرەتای ژیانی، هەر لە منداڵییەوە، ئاکاری زەکا و لێهاتوویی پێوە دیار بووە، لەمەشدا سەیر پێ هاتن جێی نابێتەوە چونکە بە عادەت منداڵی ساوا بە خۆی و خەسڵەتەکانیەوە فراژی دەبێت. یەکێک لە بەڵگەکانی ئەم لایەنە لەوەدا دەدیترێ کە ئەو دەمەی «خاتوو زێنەب حەزینە» بۆ «حاجی مەلا عەبدوڵا» دەگوێزرێتەوە هەرچی دیارییەکی بۆ باوکمی هێنابوو، بۆی گەورە بوون، باوکم 7-6 ساڵی بووە، دیارییەکانیش بۆ مێردمنداڵەی 12-10 ساڵی هاتبوون. «حزینە» گوتبووی: ئەو قسە و ڕەفتارەی لە کاک حەمەدیان دەگێرایەوە تەمەنی ئەو دیارییانەی ڕادەگەیاند. بەڵگەیەکی دیکە لەوەدایە کە لە عومری سوختەیی لای فەقێیەکی باپیرم دەرسی ڕێزمانی عەرەبی دەخوێنێ لە ماددەی «دغم» دا مامۆستاکەی پێی دەڵێ فیعلی وەکوو «مدد، قصص، لمم» دەکرێن بە «مد، قص، لم» ئەویش بە مامۆستای دەڵێتەوە: کەواتە ئەم فیعلەی «إقعنسَّ» لە کتێبەکە هەڵەی چاپە، دەبێ بڵێین «إقعنس» مەلای دەرسبێژیش دەڵێ، بەخوا کاک محەمەد قسەکەت ڕاستە. ئیتر لە دەورکردنەوەی دەرسەکەدا، باوکم تەسرِیفی فیعلەکە دەکات: «إقعنس، إقعنسا، يقعنس، يقعنسان...» کە باپیرم گوێی لێ دەبێ لێ دەپرسێ بۆچی وەها گەردانی فیعلەکە دەکات و ناڵێ «إقعنسس، يقعنسس...» ئەویش حیکایەتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە... باپیرم پێی دەڵێ، ڕۆڵەکەم ئافەرین لە تۆ بەڵام دەبێ مامۆستاکەت بگۆڕم، حیکایەتی ئەم جۆرە فیعلانە جارێ بۆ تۆ زووە لە «باب الملحقات» دەیگەیتێ. ئیتر مامۆستای لێ دەگۆڕێ. بەڵام وەک باوکم بۆمانی باس کرد تا نەخرایە بەر دەستی مەلا محەمەد ئەمینی کونەفلووسەیی، کە موستەعیدێکی لێهاتووی حاجی مەلا عەبدوڵا و مەلایەکی هەڵکەوتووی دواتریش بوو لە هەولێر، زیهنی بە چاکی ناکرێتەوە. دەیگوت مامۆستاکانم خەریک بوون بە شێوازی نالەباریان بمکوژێننەوە، مەلا محەمەد ئەمین ڕزگاری کردم، هەموو زانینم هی ئەو مامۆستایەمە.

لە سەرەتای دەست پێکردنی خوێندنی پلەی دوای سوختەییەوە بە باوکی دەڵێ: من خوێندنی بە زیللەت ناکەم، نانی «ڕاتبە» ناخۆم، ناچمە هەندەران بۆ فەقێیەتی. ڕابواردنم و مەجلیسی تایبەتی خۆم لە مزگەوت و مەدرەسەدا نابێ لە خاوەن قۆناخەکان کەمتر بێ. ئاغازادە و بەگزادە ڕێی نەبێ خۆهەڵداتەوە بەسەر ڕەجاڵی و مسکێنیی کۆبوونەوەی فەقێیانەماندا. حاجی مەلا عەبدوڵا قەولوبڕیەی لەگەڵدا

دەکات، ئەو بە چاکی بخوێنێ هەرچی ئارەزوویەکی هەیبێ بۆی پێک بهێنێ. بە درێژایی خوێندنی مەجلیسی بە قاوە و قلیان و چایە و سەماوەر و دەنگخۆش و قسەخۆشیەوە بارتەقای مەجلیسی خوداپێداوەکان بووە، بگرە لە هەندێ ڕووەوە لە هی ئەوانیش زیاتر بووە هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە لایەنی زانست و ئەدەب و نوکتە و هونەری قسە و ئەو جۆرە مەهارەتانەی لە خوێندنەوە سەر هەڵدەدەن پتر بابەتی مزگەوتە نەک دیوەخانە.

خوێندنی باوکم لە چاو دەوروبەری خۆی و باری ئەو سەردەمەدا هەروەک لە ڕووی بەسەربردنەوە لە هی خەڵقی دیکە جودا بووە هەروەها لەلایەن چەندوچۆنیشەوە کەممانەند بووە. خەست خەست لەگەڵ مامۆستاکانی، دواتریش لەگەڵ باوکی، خەریکی ساغ کردنەوەی کتێبە زانستییەکانی مزگەوت بووە و هەموو دڵ و مێشکی خۆی بەو کارە بەخشیوە. لە تەمەنی 17 ساڵەیدا بۆ ماوەی یەک ساڵی تەواو لە مزگەوتی گەورە دەرنەچووە. دەیگێڕایەوە، چۆن لەو ساڵانەی خوێندندا عیشقێکی زانست و کەشفی غەیب دەروون و هەست و هۆشی داگیر کردبوو، چەند بە ئاسانی گرێی شوێنە ئاستەنگەکانی کتێبە سەرسەختەکانی مزگەوتی بۆ دەکرانەوە. دەیگوت: لەو ساڵەدا کە هەنگاوم ئاودیوی دەرگەی مزگەوتی گەورە نەبوو، شەوانە بە درەنگە کاتی نزیک بەیانییەوە دەچوومە حەرەمی مزگەوت، لە تاریکایی و خامۆشیدا دەکەوتمە باوەشی زکر و فکری ئەوتۆوە کە هەر لەو تەرزە باری نەفسی ئارامدا، بە دڵ و دەروونلدا تێ دەپەڕێ لەو هەنگامە تازەیەی عومرمدا شەو لە دوا شەو لە حەرەمی مزگەوت هەستم دەکرد نوورێکی سەوز ئەو ناوەی دادەگرت و وەهای پێ ئارام دەبووم لە دەروونمدا ورتەی نارەزامەندی یەکجارەکی خامۆش دەبوو... لە ژێر سایەبانی ئایەتی «اولئک رضي الله عنهم ورضوا عنه» دا خۆم لە حاڵەتی ڕەزامەندیی نێوان بەندە و خاڵقدا دەدیت. گەش گەش لە بیرمە گوتی: ئەو ڕوونی و شەفافیەتەی تەمەنی 18-17 ساڵیمدا بە یەک لوقمەی حەرام دۆڕاند، بەڵام نەیگوت لوقمەکە چی بوو، لە کوێوە هات. منیش، لەو تەمەنەی 10-12 ساڵیمدا، نەمپرسی چ لوقمەیەک، چۆنا و چۆنی؟ دواتریش بۆی نەگەڕامەوە، شەرم و شکۆ ڕێی پێ نەدام بپرسمەوە. بەڵام دیارە دەبێ لوقمەکە لە دەرەوەی مزگەوتەوە بۆی هاتبێت چونکە ئەوسا لە مزگەوت دەرنەدەچوو جا بزانە دیارییەک لە دۆستێکەوە یان جەمە نانێک لە خزمێکەوە بۆی چۆتە مزگەوت ئەو تەئسیرەی بووە.

بێگومان تەجرەبەی باوکم لەو جۆرە مەیدانانەی سەربە غەیب و دەروون تا کۆتایی عومری بەردەوام بوو، بە نموونە: حکوومەت لە قەزای ڕانیە دەستی بە سەر موڵکێکی جەلیزاداندا گرت و کردی بە «محلولة» هەر چەند سەد ساڵێک بوو بێ کێشە لەبەر دەستماندا بوو. کێشەی مڵکەکە لە نێوان ئێمە و حکوومەتدا بەردەوام بوو تا هاوینێکیان ماڵمان لە چنارۆک بوو، دوای نانی سبەینە مامم، شێخ نووری، بە عادەتی خۆی هاتە لای باوکم، هەر کە دەرکەوت باوکم پێی گوت، نوورەددین خەریک بووم بە دواتدا بنێرم: ئێمشەو لە خەونمدا دەنگێکم هاتە بەر گوێ ئەم ئایەتەی خوێندەوە «إنني معكما أسمع وأرى» وام بە دڵدا دێت «قەنبەران» (ناوی مڵکەکەیە) نادۆڕێت. لە واقیعیشدا نەدۆڕا: ساڵح زەکی بەگی ساحێبقران بوو بە موتەسەڕیفی هەولێر، هیممەتی کرد و لە ڕێی «اطفاء ضريبة الأرض» - ەوە مڵکەکەی بۆ گێڕاینەوە. زەکی بەگ ماوەیەک لە کۆیە زووتر قایمقام بوو هەموو چەندوچۆنێکی کەسایەتی و ئاکاری باوکم، تاڕادەیەکیش، ڕابوردووی بنەماڵەی جەلیزادەی دەزانی و دڵنیا بوو لەوەی کە ئەو مڵکایەتییە شتێکی ڕەوایە و حکوومەت دەستدرێژیی لێمان کردووە. باوەڕ دەکەم زەکی بەگ ئەو سەنەدە شەرعییەشی دیتبێ کە لە 1260 ی کۆچی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە نیوەی مڵکەکەی پێ کڕیوە لە خاوەنەکەی، ئەو سەنەدە مابوو تا ساڵی 1963، لەو ساڵەدا هەرچی سەنەدی ئەوتۆیی و زوربەی هەرە زۆری نووسراوی خانەوادەیی جەلیزادان هەبوو (پڕی جانتایەکی قاڵب بەتاڵ) کە خوشکی گەورەم «نەجیبە» لە ماوەی عومریدا بە هەوڵی بێوچان کۆی کردبوونەوە و تۆزی لێ تەکاندبوون و شەرحی لێ دابوون، سەرپاکیان سووتان. ئەو دەمە من لە بەندیخانەی بەغدا بووم. سەنەدەکە بە ئاگر سووتا، مڵکەکەش لە گۆمی دووکان خنکا.

بۆ دڵدانەوەی ئەو کەسانەی حەز بە مڵکایەتیی زەوی ناکەن و تۆمەتی «إقطاعي»ی وەپاڵ دەدەن لێرەدا ئەوەندە دەڵێم، مڵکی وەک قەنبەرانی ئێمە لە شوێنی مەلاریاداری بێهێمنی و بێحکوومەتی وەک بیتوێنی ئەوسا دەستی فەلاحی بێدەرەتانی بەسەردا ڕانەدەگەیشت. بەر لە سەد ساڵ لەو شوێنەدا ئەگەر هەزار دۆنم زەویشت بە خۆڕایی دابایە فەلاحێکی هەژار نەیدەویست بە مەرجێک مەجبوور بایە بیکێڵێ و دایچێنێ نەک هەر لەسەر کاغەز لەقەبەڵی کرابایە چونکە ئەگەر مانگ و ئەستێرەشی لە سەر کاغەز لەقەبەڵ بکەیت زەرەر ناکا لە قبووڵ کردنی.

ئێمەش لە کۆیەوە هەر ئەوەندەمان پێ دەکرا، ساڵانە، بەشێکی ئەو مڵکە بە برنج داچێنین، خواش دەزانێ بە چ ئەرک و زەحمەتێک دادەچاندرا. ساڵی وەهاش هەبوو مەرەزە شەرای لێ دەدا، یەک دنکە برنجی لێ نەدەهاتە جەواڵی کەسەوە. تا دوای مەرگی باوکم ئنجا تووتن چاندن لە شوێنی ئەوتۆیی داکەوت، لە دەوری تووتنیش نەلوا ئاوەدان ببێتەوە. پەیدابوونی دەرمانی گەزندەکوژی «د.د.ت» و بووژانەوەی باری ئابووری گشتی دوای زۆربوونی پارەی نەوت کە کێشایەوە بۆ پەرەسەندنی مەکینەی جووت و دروێنەش، حیسابی کشتوکێڵی گۆڕی و شوێنی ناسازی وەک ئەو قەنبەرانەی گێڕا بە سازگار.

خۆشبەختانە لەم مەیدانەدا فۆلکۆر بە هانامان دێت: ئەو ئاوەی زەویەکانی قەنبەران ئاو دەدات پێی دەڵێن «قۆپی سوور و شەب». گوتەیەک هەیە لە بارەی ناسازگاری ئەو ئاوەوە دەماودەم هاتووە دەڵێ:

سووری گوتیە شەبێ
کاروانەک دێ لە حەڵەبێ
ئەمن دەیخەم ئەتوو مەیەڵە ڕاستەوەبێ

بەداخەوە ماوەی سازگاربوونی ئەو ناوە بۆ مڵکەکەی ئێمە کورت بوو چونکە لە ساڵی 1957 ەوە، کە لەلایەن میرییەوە بە نامەی ئامادەکردنی ناوچەکە بۆ گۆمی دووکان دەستی بەسەردا گیرا، مڵکەکە لە ئێمە شۆرا. لە سەردەمی مەلاریادا گەلێک لەوانەی بە داچاندن و ئاودانی ئەو مڵکەوە خەریک دەبوون لە خزم و کەسانی خۆمان گیانیان سپارد. بەهەمەحاڵ شەشیەکی ئەو مڵکە هی باوکم بوو، لە دوای ئەویشەوە 1/42 ی بەر من دەکەوت. خوێنەر خەیاڵی «اقطاع و دەرەبەگایەتی» بە دڵی خۆیدا تێنەپەڕێنێ.

بادەینەوە وەلای کورتەی سەرگورەشتەی ژیانی باوکم. لە 18 ساڵی ئیجازەی لە باوکی حاجی مەلا عەبدوڵا، وەرگرت و لە جێی ئەو دەرسی دەگوتەوە، هەر لە سەردەمی ئەویشدا زوربەی ئەرکی مەلایەتیی دوو مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد و هی مزگەوتی گەورە کەوتە سەر شانی. لە تافی هێز و تاقەتیدا ڕۆژی 21 دەرسی

گوتۆتەوە. حاجی مەلا عەبدوڵا گەیاندبویە 24 دەرسی ڕۆژانە. هەندێک لە مامۆستاکانی خۆی ئیجازەیان لێ وەرگرت.

لە 25 ساڵی کچە مامێکی خۆی لێ مارە کرا (نەعیمەی مەلا حەبیبی حاجی مەلا ئەسعەد) لەو ئافرەتە چەند منداڵێکی بەرهەم هاتن بەڵام لە کچێکی بەو لاوە ئەوانی دیکە هەموویان بەر لە خۆی و زوربەشیان بە منداڵی مردن... دەنگوباسی زیرەکی و بلیمەتیی کوڕێکی «عبد الحمید» ناوی کە لە تەمەنی 7-8 ساڵیدا دەماودەم دەگێڕدرایەوە و جێی سەرسوڕمان بوو، بەڵام باوکم خۆی باسی زەکای کوڕێکی دیکەی دەکرد کەوا بەر لە عەبدولحەمید هاتبوو بە منداڵیش مردبوو، دەیگوت ئەگەر ئەو منداڵەم بۆ ژیابایە ژنم نەدەهێنایەوە. بەهەمەحاڵ وەچەی یەکەم خێزانی سەرلەبەریان بێ ئاسەوار بڕانەوە.

خۆم گوێبیستی باوکم و مامم «شێخ نوورەددین» بووم کە دوای چەند ساڵێک لە مردنی خێزانی یەکەمی بە ئیلحاحی خزمی و دۆستانی، باوکم ڕازی بووە بۆ دووەم جار ژن بهێنێتەوە. هەر لە گەنجایەتییەوە دووچاری زگ ئێشەیەکی بە ئازار بووە (لە ساڵانی دوایی ژیانیدا بەدی کرا کە - «قرحة المعدة»- یە). دەیگوت زۆر جاران کە ژانەکە شیددەتی دەستاند لە خۆم بێئومێد دەبووم ئیتر چۆن زات بکەم ژن بهێنم؟ ساوایەکی هاتبێتە کایەوە بەسەر کێیدا بەجێ بهێڵم؟ بەڵام ڕێکەوت وەها بوو، بە دەم ڕاگرتنی پارێز و خۆپاراستنەوە بۆ ماوەی چەندین ساڵ دەردەکەی کزتر بوو تا ئەوەی خەڵق هەستی نەدەکرد چ ناساغیی پێوە دیار بێ. ئەو کوانەی مەعیدە نەبوایە لەلایەن تەنسازیەوە چ نوقسانی نەبوو، هەتا ژیا پێویستی بە چاویلکە نەبوو، داروەکازیشی بەکارنەهێنا. ئەو نەساغیەی باوکم بەپێی گێڕانەوە خۆی لە زێدە مەیلی وەلای سرکە و شفتە، سرکە و کەبابەوە تووشی بووە. زۆر جاران، کە منداڵ بووم لوقمەی چەوری پێ دادەنامەوە و دڵی ڕەوای نەدەدا بچێتە هەناومەوە. ئەگەر خۆم پێ نەگیرایە وەهای دەکرد شتێکی مەزەداری بە دوادا بخۆم کە یارمەتی هەزم بدات.

خێزانی دووەمی کە دایکی منە «حەبیبەی کچی شێخ ڕەزای کوڕی شێخ قادری سندۆڵان- ـە» - کە مەشوور بوو بە قادر سەرڕووت - لە بنەماڵەی ساداتی بەرزنجە بوو. «سندۆڵان» دێیەکە بە سەر زێی بچووکەوە نیو سەعاتە ڕێیەک بە سواری وڵاغ دەکەوێتە لای قیبلەی قەڵادزەوە. کاتی خۆی دەستەڵاتدارانی پژدەر

ئەو دێیەیان بۆ تەرخان کرد و مزگەوت و تەکیەیان تێدا بنیات نا بۆی، ئەویش کەوتە سەر تەریقەتێکی خەست و پاکی قادری و ناوی پێوە دەرکرد بەتایبەتی لە دیوی کوردستانی ئێران کە باوەڕیان پێی لە ڕادەبەدەر بووە. دەماودەم هاتووە کە پیاوێکی خواناس و حەقپەرست بووە و لێی نەزاندراوە لە شەریعەتی لا دابێ یان لە تەریقەت درێغی کردبێ.

لە ڕێکەوتێکدا1 حاجی مەلا عەبدوڵا ڕێگوزەری دەکەوێتە پژدەر لە شێخ قادر مێوان دەبێ، شێخ قادر ماوەیەک بە دەستەودایەرەی تەکیەوە بەرەو بیری دەچێت،

---

1- ڕێکەوتەکە بریتی بووە لەوەی کە قافڵەی تیجارەتی «حاجی ئەسعەداغا»ی خالۆزای باپیرم لە سەفەرێکی بەرەو کوردستانی ئێران ڕێگران بە تالان دەیبەن و دەکەوێتە بەر دەستی هەمزاغای مەنگوڕ. قافڵەکە هەموو دارایی حاجی ئەسعەداغای تێدا بووە، لەسەر تەکلیفی ئەو، حاجی مەلا عەبدوڵا دەچێ بۆ وەرگرتنەوەی ئەو قافڵەیە. کە دەگاتە لای، هەمزاغا بێ خۆخوراندنماڵەکە دەداتەوە. لەو چەند ڕۆژەی مێوانداری کردنی حاجی مەلا عەوڵا لەلایەن هەمزاغاوە نوکتە و لەتیفە ڕووی داوە، یەکێکیان ئەوە بووە کە هەوەڵ شەو کاتێک نان دەهێنن بۆ مێوانان حاجی مەلا عەبدوڵا دەست نابات بۆ خواردن هەمزاغا لە سەبەب دەپرسێت، باپیرم پێی دەڵێ: هەتا نوێژ نەکەیت و بەڵێنم نەدەیتێ لەسەری بەردەوام دەبی نانت ناخۆم... خولاسە دوای بەینێک نان دەخورێت. لەوە بەولاوە چەندێکی لە دیوی کوردستانی ئێران هەمزاغای کۆییەکی دیتبێت بە شایەدی نوێژ کردنی لای باپیرم و نوێژەکەش لەبەر چاوی کابرا دەکات. وەختێک دوای نانی شەو قەننەی تووتنی بۆن خۆش بۆ باپیرم دەهێنن، مۆدنەقەننەکەی لەغایەت بەدەر نازدار دەبێت. هەمزاغا دەڵێ: جەنابی مەلا با حیکایەتی ئە مۆدنەیەت بۆ بکەم ئنجا سەرپشک بە لێی، گوتبووی جارێکیان لە تاران بووم شای ئەو دەمە (ڕەنگە مظفر الدین بووبێت) داوەتێکی کرد منیش بانگهێشتن کرام... دوای نان خواردن کە ئەغڵەب کەچک و وردە ئامرازی تێدا خواردن لە زێڕ دروست کرابوو، بەقەدەر ژمارەی ئەو خەڵکە مۆدنەی وەک ئەمەیان بە قەننەکانەوە کرد، کە قلیان تەواو بوو مۆدنەکانینان کۆکردەوە... بەرپرسی قلیان گوتی مۆدنەیەک دیار نییە، ئەو خەڵکەیان پشکنی مۆدنە نەدۆزرایەوە...

دوای مولاقات که ڕوو دەکەنەوە سندۆڵان دەروێشەکانی شێخ قادر بە گەرمی دەفەزەنی دەکەن، وڵاغەکەی حاجی مەلا عەبدوڵا نەختێک چۆڵاغی دەکات، شێخ قادر پێی دەڵێ: جەنابی مەلا، دەفە و گوتنی دەروێشەکان تەئسیریان لە وڵاغەکەت کرد. ئەویش هەر بە هەمان گیانی نوکتەسازییەوە لە وەڵامدا دەڵێ: نەخێر قوربان، چۆڵاغی وڵاغەکە لەوەوەیە کە خۆی نەقشبەندییە کەیفی بە قادرییان نایەت... ئەوسا هیچ کامێکیان بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو کە دوای خۆیان کوڕی ئەمیان لەگەڵ نەوەی ئەویان دەبنە هاوسەر.

شێخ قادر چەند کوڕێکی لە دوا بە جێ دەمێنێ، شێخ ڕەزا کوڕە گەورە بوو لە جێی دادەنیشێ. شێخ ڕەزا زۆر ناژێت، دوای خۆی دوو برای لە سندۆڵان دەبنەوە بە خاوەن تەکیە، شێخ ئەمین و سەیدگوڵ. شێخ ئەمین تەکیەیەکی تازە بۆ خۆی دروست دەکات. سەیدگوڵ دەبێتە جێنشین لە تەکیەی باوک و کاکی. باوکم لەگەڵ سەیدگوڵدا دۆستایەتی و شناساییەکی زێدە بەتین پەیدا دەکا تا ئەوەی، کوردی گوتەنی، چی دیکەی بە بەرەوە نامێنێ. ئەم دۆستایەتییە بووە هۆی داخوازیی دایکم، برازای حاجی سەید، بۆ باوکم. بەر لە شەڕی یەکەم سەیدگوڵ چوو بۆ حەج و لەوە بەولاوە پێی دەگوترا حاجی سەید. تا ئێستاکەش هەروەها بە حورمەتەوە ناوی دەبرێ.

لە شەڕی یەکەمدا حاجی سەید چوو بۆ غەزا لە دیوی کوردستانی ئێران بەرانبەر سپای قەیسەری ڕووس و تێیدا شەهید بوو. دوو کوڕی لە پاش بە جێ ما. شێخ حەسەن کە لە هاوینی 1963 کۆچی دوایی کرد و شێخ حسێن2 کە ئێستا لە پژدەر

---

کە گەڕامەوە مەنزڵ کوێخایەکی لەگەڵمدا بوو لە گێڕانەوەی باسی بزربوونی مۆدنەکە گوتی: ئاغا مۆدنەکە بە منە (لای منە)، پرسیم چۆن لە پشکنیندا بەسەریان نەگرتەوە، گوتی ئاغا هێندەم پێ حەیف بوو ئەو شتە جوانە لە دەست بدەم، دەرفەتم دیت مۆدنەم لە پاشەڵی خۆم نا... ئنجا قوربان خۆت موختاری!! هەمزاغا ئەوەبوو لەگەڵ شێخ عوبەیدولای نەهری شۆڕشی نایەوە لە کوردستانی ئێران.

2- شێخ حسێن لە کۆتایی هاوینی ١٩٩٣ کۆچی دوایی کرد.

ئەركی مەعنەوی و خانەوادەیی سندۆلانی خستۆتە سەرشانی بێ ئەوەی بەرماڵنشین بێ.

شێخ ڕەزای باوكی دایكم چەند كچێک و چوار كوڕی لێ بەجێ مان، كوڕەكانی، شێخ خدر، شێخ جنێد و شێخ حەسەن لە دایكێک بوون. شێخ قادریان لە دایكی دایكم بوو. لە مانە تەنها شێخ جنێدیان ماوە لە دێیەكی نزیک ڕانیە «سەیداوە» دەژێت و موسڵمانێكی بێفێڵە و نانی شێخایەتیشی هەرگیز نەخواردووە. ئەگەر ویستبای دەیتوانی لە شێخایەتی ناو دەربكات بەڵام لەگەڵ شێخ خدری كاكی لە زوێكەوە ملیان نایە كەسابەتی شیناورد و خەلە و خەرمان و ئاژەڵ بەخێو كردن. بێمزە خزمەتی خەڵكیان دەكرد و هەرچی لە كەسابەتەوە بكەوتبایە خوانیانەوە دەور دەكرایەوە بۆ هەناوی میوانەكانیان.

باوكم كچێكی خۆی لە شێخ حەسەنی حاجی سەیدگوڵ مارە كرد. تاقە كچێک لەو ژن و مێردییە بەرهەم هات ئەویش لە تەمەنی 12-10 ساڵی جوانەمەرگ بوو. لە 1954 ئەو خوشكەم، كە لە دایكی من نەبوو دنیای جێ هێشت. لەمەوە دەردەكەوێ خزمایەتیی ئێمەی جەلیزادە، بەتێكڕایی، لەگەڵ پژدەر لەوەوە دێت كە چەند پشتێكمان لە بێگەڵاسی پژدەردا ژیاون. دواتریش بە هۆی پێوەندی خزمایەتیی نێوان باوكم و شێخانی سندۆلانەوە دۆستایەتییەكە نوێتر و بەهێزتر بۆوە. لەلایەن خۆمەوە پێوەندیم بە سندۆلانەوە هێندەی پێوەندیم بە جەلیزادانەوە مەحكەمە.

ڕیشەی پێوەندی جەلیزادان بە پژدەرەوە بێ سەروسەدا نەبووە. لە ڕێكەوتدا بە توندی خۆی نواندووە. لە سەردەمی حاجی مەلا عەبدوڵادا ڕووداوێكی عادەتی سەر دەكێشێتەوە بۆ هێندێ كە دوژمنایەتی بەرەیەک لە دەسترۆیشتووەكانی كۆیێ دژی حاجی مەلا عەبدوڵا خەست بێتەوە. حاجی مەلا عەبدوڵا برای خۆی «حاجی مەلا ئەحمەد» و كوڕێكی خۆی (باوكم) لەگەڵ دەستەیەک لە خزم و دۆستی دیكە دەنێرێ بۆ پژدەر كە بەپێی پێویست بەرژەوەندێک لەو كێشەیە ڕەچاو بكەن و بە فریای بێن بۆ كۆیێ. هێشتا ئەو دەستەیە خەریكی وتووێژ بوون لەگەڵ سەرۆكانی پژدەر كە ناحەزەكانی حاجی مەلا عەبدوڵا تێكڕایان دەچنەوە لای و عوزرخوازی دەكەن و ناخۆشییەكە بەسەر دەچێت. لەو سەفەرەدا تەمەنی باوكم 11- 12 ساڵی بووە، بەڵام بەشی زۆری وتووێژی بەرژەوەندبینی كە لەگەڵ سەرۆكەكانی پژدەردا دەكرێ لە باوكمەوە دەبێ. ئەوسا مەحموداغا و سەلیماغا و مەمەندەقیت و ئەو

جۆرە ناودارانە لە پژدەردا قسەڕۆیشتوو بوون، کە باوکم بە ڕاوێژە پڕ تاموشامەکەی خۆی باسی ئەو سەفەرەی دەگێڕایەوە بیسەر لێی تێر نەدەبوو.

باوکم باسی ئاغایەکی مەیلەو شێتەڵۆکەی قسەخۆشی دەگێڕایەوە ئەمما هەمووی لایەنی زەکاوەتەکی زگماکی تێدا بوو. پرسیان لێ دەکرد لە بارەی ئاغا زلەکان لە وەرامدا هەر یەکەی بەخەسڵەتی ڕاستینەی خۆیەوە هەڵدەدایەوە... فڵان؟ هی ڕاوتەدبیرانە. ئەی فڵان؟ هی مەیدان و شەڕناخێوییە. فڵانت پێ چۆنە؟ هی ژاژی و پەنیرانە...

ساڵی 1963 کە ئاوارە بووین و لای خاڵەکان لە پژدەر گیرساینەوە، من ئاغایەکی لێکەوتەی هەمان تایەفەم دیت هەم هۆشکول و هەم بە ئەدەب و قسەخۆشیش بوو.

لەم گەشتەی ژیانی خۆمدا مومکین نییە بتوانم بە جۆرێک لە بارەی باوکمەوە بدوێم بشێ خۆمی لێ ڕازی بم وەیا بۆ خوێنەر ببێتە بنەمای شارەزابوون لەو مرۆڤە. چی تا ئێستاش لە بارەیەوە نووسراوە لە سەرەتایەکی کەسایەتیی تێپەڕ ناکات.

بە عادەت نووسین و باس کردنی کەسان یان شتان، ئەنجامێکی بەرەواژ بە دەستەوە دەدات، هەتا بابەتی لەسەر نووسین و باس لێوە کردن بچووک و کەمبایەخ بێ، سوود پتر وەردەگرێ لە ناوهێنانی، چونکە بایەخێکی پێ پەیدا دەکات کە پێشتر لە تاریکایی و نەناسراویدا نەیبوو. کەچی بابەتی گرینگ و بایەخدار ئەگەر لە نووسین و باس کردندا مافی تەواوی خۆی نەدرێتێ غەدری لێ دەکرێ. بە نموونە دەڵێم کە گوترا: کۆپەرنیکۆس[3] بەر لە 500 ساڵێک سووڕانەوەی زەویی بە دەوری ڕۆژدا دۆزیەوە، لە سەدی نەوەد و نۆی کەسایەتی و بلیمەتی و زانست و هەستیاریی ئەم مرۆڤە تێدەبردرێ. بەڵام کە گوترا: مام هۆمەر یەکەم کورد بوو لە ساڵی 1925 قەوانی «هەیبەلار»ی لە بەغدا پڕ کردەوە، سەد ئەوەندە مافی خۆی بایەخ پەیدا

---

3- هەندێ زانایانی یۆنان بەر لە ئیفلاتوون گوتبوویان زەوی دەسووڕێتەوە بەڵام قسەیان دەنگی نەدایەوە، چۆنایەتی ئەو سووڕانەوەشیان شەرح نەدا وەک کە کۆپەرنیکۆس کردی... ئەم قسانەم لە چاپەمەنی خوێندۆتەوە نەک گوێبیستیان بووم.

دەکات. هەرچی کۆپەرنیکۆس بوو ڕاستییەکی جیهانی گرنگی دۆزیەوە کە لە ماوەی هەزاران ساڵدا ملیارەها ملیارەهای چاوی ئادەمیزاد بە سەریدا دەخشی و نەیدەدیت تا ئەوەی زوربەی بیروباوەڕی سەربە ئایین خۆی هەڵنا لەسەر بنگەی بەرەواژ کردنی ئەو ڕاستییە، کاریشی گەیاندە ڕادەیەک ئەوی دانی پێدا هێنابایە لە گەردەنی دەدرا، مام هۆمەریش بە پڕکردنەوەی قەوان کارێکی کرد ئەگەر کەڵەشێر و تووتیت لە جێگەی ئەودا دانابایە قەوانەکە بە قووقوو و جرەجرِ هەر پڕ دەبۆوە، ئنجا پارەشی خستە گیرفانی مام هۆمەرەوە (عافێتی بێ) ناوێکێشی بۆ پەیدا کرد (لێی پیرۆز بێ) دواتریش کە ناوی دێت بە «ڕابەر» لە قەڵەم دەدرێ (شەقی زەحمەتێ تە).

زانایەکی یۆنانی بەر لە دوو هەزار و هێندە سەد ساڵە ئەو یاسایەی دۆزیەوە کە بە ناوی ئەوەوە پێی گوترا یاسای ئەرخەمیدس. ڕەنگە بڵاویش بکرێتەوە، گۆنزالیز-ێکی برازیلی یەکەم کەس بوو لە مێژووی ئادەمیزادا توانیبێتی 300 قرِقێنە لەسەر یەک دەربکات، خوا نەیانبرێ هەردووکیان هەر یەکەمن، هەردووکیشیان ناویان لە جیهاندا بە ڕابەر بڵاو دەبێتەوە.

دێیتە سەر باسی کوردایەتیی خۆمان دەبینیت شاعیرێک لەسەر خواهشتی حکوومەت نەشیدی کوردیی بۆ قوتابیان داناوە، ڕەنگە مزەشی تێدا وەرگرتبێت... یەکێکی دیکەش بە کۆتی بەندیخانەوە نرکەی شیعری هاتووە، یاخود بەرژەوەندی زۆری خۆی لە پێناوی ئەو شیعرەدا پێشێل کردووە... هەمووی هەر کوردایەتییە و ناویشیان هەر بە قەدەر یەک ئەرک و خەبات و جانفیدایی خاوەنەکانیان ڕادەگەیەنن.

خانەقای سەید ئەحمەد بۆ ماوەی پتر لە 60 ساڵ نوای غەریب و تێشووی برسی و حەسانەوەی کەنەفت بوو. ئەو خانەقایە لە دەیان ساڵدا ڕێی لەبرسان مردنی فەقیری کەرکووکی بەستبوو چونکە هەموو هەژارێک دەیتوانی سێ جەمی بێمنەت لە خانەقا بخوات و پێشی نەگوترێ ناوت چییە. ئێستا گوێت لە ناوی سەید ئەحمەدی خانەقا نابێت مەگەر چۆناوچۆنی، کە ناویشی بێت هەزاریەکی کەسایەتی و ڕێز لەخۆنان و غەریبنەوازی و مەردایەتی و مەزنایەتیی ئەوی لێ وەرناگیرێت. کە دەگوترێ فلان و فلان و سەید ئەحمەدی خانەقا بەیەکەوە چوون بۆ حەج

خەیاڵ بۆ ئەوە نارِوا کە فڵان و فڵان و فیساریش لە قافڵەی سەید ئەحمەددا حەجیان بۆ کرا...

گوێم لە گوتاری نووسەر و هونەرکارێکی کورد بوو، لە جیاتی هەمومان، شانازیی بە ناوی گۆرانیبێژێکەوە دەکرد کەوا، بێچارە خۆی، لە بارێکدا بەسەری نەبرد بوێرێ داوای ڕێز لێ نانی بکات وەیا بیر بکاتەوە لە گرتنەبەری ڕاڕەوێک کە مرۆڤی ڕێزلێنراو تێیرِا دەڕۆن. گۆرانیبێژیشم دیتووە دەنگخۆشییەکەی زێدەجوانی بوو بە دەوری ئەو مەردایەتییە و حورمەتەوە کە تەواوکەری شەخسیەتی بوو. چاوەشی زورناڵێدەرم دیتووە هێندە پیاوانە و مەردانە حورمەتی خۆی ڕاگرتووە بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووە چاوەشییەکەی لێ بە عەیب بگرێ، هی دیکەشم دیتووە زاتی نەکردووە لە ڕیزی خەڵق دانیشێ.

بۆخۆت لەگەڵ خۆتدا لێک دەوە کە دەگوترێ وەیا دەنووسرێ: «بەر لە 40 ساڵێک فڵانە کەس ڕازی نەبوو شێخ لەتیف و کاکە زیاد لە سەرۆکایەتیی پارتی کوردستان بەشدار بن» چەند بە ئاسانی ئەو فڵانە کەسە لە ڕێکاری ئیفلاسەوە دەچێ بۆ پێشەوایی، شێخ لەتیف و کاکە زیادیش ڕووت دەبنەوە. تۆ وەرە بە خۆت و دەسەڵاتی میراتیەوە خۆت بە نیشتمان ببەخشیت کەچی یەکێک ڕەفزت بکات هەموو سامانەکەی ئەوە بێ نەهیچ دەسەڵات و نەهیچ شۆرەت و نە هیچ شتێکی هەیە... قوتەیەکی مل نێرکەکاردووە لە ئوتێلی کوردایەتی دابەزیوە بە خۆرِایی تێیدا دەلەوەڕێ... نۆشی گیانی بێ... بەڵام وەها خۆش بوو کە مادەم پیاوی وەک شێخ لەتیف ڕەفز بکرێ قوتەی مل نێرکەکاردووش لە هیچە نەبێتە پێشەوای ئوممەت. دوای 40 ساڵیش لەو مامڵەتە ئنجا ڕۆژی ئەوە نەهاتووە قوتەی ئەوتۆیی پێشەوا بێت...

نووسین و گێڕانەوەی دەماودەم ئەگەر ئینسافی لەگەڵدا نەبێ خاوەن هونەری گەورە و جەوانمەردی بێفێڵ و شەخسییەتی تێروپڕ ڕووت دەبنەوە موفلیسیش دەبێتە خاوەن بانک. هەرچی مێژووی کۆن و کۆمەڵایەتیی سەردەم هەیە لەم مەتەڵە ناقۆڵایەی «تێداچوون و پێقەڵەوبوون» ی ناوهێنان و لەبارەوە نووسینی کەموکووڕ و بێئینساف هاوپشکن.

لەم ڕوانگەوە دەڵێم ئەگەر تەواوی کەسایەتی و لێهاتوویی و خەسلەتە بەرزەکانی بابایەکی خاوەن قابیلیەت نەزانیت، بە تەنها ناوهێنانی وەیا خێرا پێدا تێپەڕینی نەک هەر لێی شارەزا نابێت بەڵکوو پتر نائاشنای دەبێت چونکە هەر وەک بە ناوهێنانی «ئاگر» زمان ناسووتێت هەروەهاش بیرت بۆ ئەوە ناچێت کە شت دەسووتێنێت ئەگەر پێشتر لێی بەڵەد نەبووبیت.

ناوهێنانی ئاگر بۆ ئەو کەسەی نەیناسیبێت بەر لە هەموو شتێک «ئاگرایەتی» ی پێوە ناهێڵێت، واتە «کەسایەتی» یەکەی دەسڕێتەوە. هەر بەو پێیە کە ناوی پیاوێکی وەکوو حەماغای کۆیەت هێنا ڕەنگە، لەم ڕۆژگارەدا کە ناوی «ئاغا»ی تێدا تاڵ بووە، زەرەری لێ بدەیت، تۆ دەبێ بزانیت حەماغا لە گرانیەکەی 1917 لە جیاتی ئەوەی نیوەی ڕەز و زەوی و زار و خانووی کۆیێ بکڕێ هات هەرچی خوا پێی دابوو کردی بە خۆراکی هەژار و غەوارەی ئەو شارە کە ناویشی نەدەزانین، ڕەنگە نەشی دەدیتن. «اصف ال قاسم اغا» پیاوماقووڵێکی مووسڵی لە نێوان دەستەیەک پیاوماقووڵانی بەغدادا دەیگێڕایەوە (زۆری دیکەش لە خەڵقی کۆیە و غەیری کۆیەش دەیانگێڕایەوە)، حەماغا برە مەڕێکی لە مامڵەتدا بوو، چێوداری مووسڵی نرخێکیان لە سەر دانا حەماغا پێی ڕازی نەبوو... بۆ سبەینە کابراکان پێ ڕازی بوون و پارەیان بۆی هێنا... حەماغا پێی گوتن: ئەو مەڕانە فرۆشران... مووسڵیەکان دەیانزانی لە خۆیان بەولاوە کەسی دیکە لەو ناوەدا نییە بتوانێ ئەو پارەیە بدات، بەڵام چەندێکی دەکەن تێبگەن مەسەلە چییە حەماغا هەر دەڵێ: مەڕەکان فرۆشران. دوایی لە سەر ئیلحاحی «اصف ال قاسم اغا» حەماغا دەدرکێنێ کە دوێنێ دوای کشانەوەی مووسڵیەکان «مەڕەکانی بە خوا فرۆشتن»... و هەمووی بوون بە خۆراکی هەژاری کۆیێ. تۆ کە نەزانیت ئەم مەسەلەیە تنۆکێکە لە مەردایەتیی حاماغا هەر ناوی نەبەیت باشترە بۆی، هەرواش هەموو ئەو جوانمەردانەی لە ڕیزەکانی کۆمەڵدا هەڵدەکەون و لەبەر نەناسراوییان بە خۆیان و پیاوەتییانەوە دەسوێنەوە و دەپوێنەوە و دەسڕێنەوە... «صديقة الملاية» ش لەگەڵ ئەو هەموو شتانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا لێیان ئاشکرا کرد بە خۆی و «صندوق امين البصرة» یەوە بیرەوەریی بۆ دەگێڕدرێ...

چەند حەیفە مێشک و دەروونی شۆڕشگێڕان و ڕۆشنبیران وێنەی نادروستی بوونەوەریان، بە مرۆڤ و ڕووداویەوە، لێ چەسپ بێ. مەیلێکی ئاشکرا لای بەشێکی

زۆری نووسەران بۆ خۆدانەپاڵ چەوسێنراوە لەگەلێک باردا دوو کاری نارەوایان پێ دەکات: یەکیان شاردنەوەی عەیبی هەژار، دوەمیان شاردنەوەی پیاوەتیی مرۆڤی ناهەژار.

پشتگیری کردن لە هەژار و چەوسێنراوە دەبێ ئەلف بێتکەی خەریکبوون بێ بە کۆمەڵایەتییەوە، بەڵکوو هێندە سەلمێندراو بێ وەکوو سەرمای زستان و شیرنایی شەکر کە ئیتر خۆ پێ هەڵدانەوەی جێی شەرم بێ نەک شانازی. ئەو پشتگیری کردنە بەر لە هەموو شتێک داوای ڕاستگۆیی و ڕاسترۆیی و ڕاستبینی لەو کەسانە دەکات کە دۆستی میللەتەکەیانن، کۆمەڵایەتی چ زەرەر ناکا لەوەی دەوڵەمەندێکی وەیا دەسەڵاتدارێکی وەیا ئەمیر و شێخ و مەلایەکی مرۆڤی بە شەرەف بووبێ، کەسێک لەو ڕاستییە وەتەنگ بێت، بێگومان، نەفسەکەی نەخۆشە و بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات ناحەزی میللەتەکەیەتی هەر دەسەڵاتیشی بوو بە فەرمانی ئەو نەخۆشییە دەکەوێتە سەرباری زوڵم و زۆر. لە لایەکی دیکەشەوە هیچ سوود بە کۆمەڵ ناگات بەوەدا هەژارێکی خوێڕوو مەدحی بکرێ، ئافرەتێکی گۆڕانیبێژ بۆ ماوەی ساڵەها خۆی بە ئەفسەرێکی بێگانە فرۆشتبێ نابێ بکرێ بە «رابعة العدوية» با هەژاریش بووبێت، خۆ هەژاری دیکە زۆر بوون خۆیان نەفرۆشت، میللەتیش لە مەیدانی ناو دەرکردندا ئەو نەزۆکە نییە بە گۆرانی گوتن یان زوڕنا لێدان نەبێ تاکێکی هەژاری مافی ناوهێنانی نەبێ، لە هەر شارە و لە زۆر ئاواییاندا کەسانی ئەوتۆ پێ دەگەن بارتەقای هەژارییان مەردن و ڕێز لەخۆ گرتوون.

چەندین بنەماڵەی کاسبکاری شارستان یان فەلاحی لادێ دەناسم، تۆش لای خۆتەوە دەیانناسیت، سەریان بۆ غەیری خوا فروو نە هێناوە و نانی مەردایەتییان خواردووە، ئەو شەرەفدارانە کفریان نەکرد کە نەبوون بە مزەخۆری بەیتی شایی و لاوکی دیوەخانان تاکوو ناویان بسرێتەوە، بۆ دەبێ پاراستنی نامووس و ئابرووی خانەوادەیی بە سەردانەنواندن بۆ غەیری خوا هێندەی زوڕنا لێدان وەیا قەوان پڕ کردنەوە نرخ و بایەخی نەبێ لای شۆڕشگێڕ و ڕۆشنبیر؟ هەزاران هەزار مەردی مەیدانی ڕێز لەخۆنان و شکۆ و گەردەنکێلی لە بیران چوونەوە، سەدانی دیکەش وا لەبەر چاومان دێن و دەچن زۆر نابا لە بیران دەچنەوە، بە هەموویان، بە هەزار هێندەی هەمووشیان، هەزار یەکی ناوی مریەم خان و دایکی جەمال-یان پێ ڕەوا

نادیتریێ، ڕۆشنبیریێکیش بیر ناکاتەوە لەو بێئینسافییە بێسامانەی میللەت لەگەڵ خۆیدا دەیکات بە دۆڕاندنی ناو و نیشان و ئاکاری ڕۆڵە هەرە مەردەکانی.

دیتوومە شەخسی میللەتفرۆش بە دوو پارچە هەڵبەست و بە جنێودان بە ئیستیعمار و دەرەبەگ و بۆرجوازی بۆتە سەدرنشینی کۆڕی نیشتمانپەروەری وەیا هەر نەبێ جێگایەکی بەرەو هەورازی لێ داگیر کردووە. دیتووشمە خۆبەختکردووی بێعەیب هەر چونکە شیعری نە گوتوە وەیا گۆرانیی نەچڕیوە وەیا لە نمایشتدا برمێ و بژێی بێلزوومی نەتەقاندۆتەوە، عەبدەلبەشەرێک مەرحەبای لێ نەکردووە. لەوە هەر بگەڕێ بە خەویش ناگاتە شوێنە بەرەوژوورەکەی بابای میللەتفرۆش. چەند حەیف و مخابنە عەیارەی چاکە و خراپەمان وەها بەرەواژ و قەڵب بێ، ئنجا سەد حەیف و مخابن کە ڕۆشنبیر هەستیش بە هەڵەی مامڵەتەکە نەکات چ جایی ڕیسوا و تاوانباری بکات.

خوێنەر لێم بە سەهوو نەچێت، من وەتەنگ نایەم لە شۆرەتی هیچ کەس، بەڵام بە مەرجێک لە هیچە نرخی زیاد لە لاوە وەپاڵ ئەو شۆرەتە نەدرێ، گۆرانیبێژ بۆ خۆی ناو دەردەکات و بەزم و گۆبەندان دەجۆشێنێ و پارەی تێدا وەردەگرێ و کەیفی پێوە دەکات، هەمووی لێ پیرۆز بێ، بەڵام لە خۆڕایی نەکرێتە شۆڕەسواری کوردایەتی... نەبرێتە ڕیزی دوازدە سوارە لە ئازایەتی... نەچێتە پایەی شێخ سەعدی پیران لە خۆبەخت کردن... بەسەر خەڵقی دیکەدا ڕانەشکێندرێ هەر چونکە گۆرانییان نەگوتوە، یان ئەو گۆرانیی گوتوە. ئافرەتێکی هەژار یان لەبەر نەداری یان لەبەر هەر هۆیەکی دیکە بێ گۆرانی بە پارە دەڵێت و خۆی بە بێگانە دەفرۆشیت وەیا دەبێتە تیاترۆ... وەیا... ئەوەندە بەسە بۆ خاترانەی هەژارییەکەی کە لێی بێدەنگ بیت و چاو لە خلیسکانەکەی بپۆشێت، لەوە بەولاوە ئینساف و میللەت و نیشتمان و فریشتە و پەریش لێت ناسەلمێنن بە ناوی مێژووەوە شانازیی پێوە بکەیت. عەیارەی نرخی بەرز و نزمیش دەردێتەوە بە ڕۆژگاری خۆی، کەسێک کە بە لای خەڵقی سەدەی هەژدەم و نۆزدەمەوە مەرد بووبێت و ڕێزی لێ نرابێت وەیا بە پێچەوانەوە بە سووکی سەیر کرابێت ناشێ من و تۆ دوای سەد ساڵ و دووسەد ساڵ عەیارەی نوێبابەتیان بۆ بەکار بهێنین و جێگۆڕکێیان پێ بکەین. خۆم بە بیرم دێ، پیاوی عارەقخۆرەوە بەلای خەڵقەوە سووکتر بوو لە جەردە و ڕێگر هەرچەند بەلای شەریعەت و قانوونیشەوە جەردەیی دزێوترە...

ئەم تێبینیانەی دوایی لە ڕواڵەتدا دوورکەوتنەوەیە لە بابەتی نووسین بەڵام ڕاستییەکەی ئەگەر لێیان بێئاگا بین، بە زۆری، نرخی کەسان و هەڵوەستی جۆراوجۆری فلان و فلان لە بارەی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و لە ڕووداوی عادەتیشدا بە هەڵە دادەشکێت وەیا هەڵدەکشێت.

گەشتی ژیان، هی هەر کەسێک بێت، لەگەڵ ڕێبازی کەسانی دیکە پێکدا تێدەپەڕن، ئیتر یان بە دۆستایەتی یان بە دژایەتی، ئنجا ئەگەر لە خوێنەر داوا نەکەم بۆ دیارخستنی لایەنی خەتابار لەو پێکدا تێپەڕینە و تێک ئاڵقانەدا عەیارەی ئەوسا لە کار بهێنێ ڕەنگە بۆ قەناعەتێک بڕوات کە خوازراوەی ئەم سەردەمە وەیا مەیل و ئارەزۆی خوێنەرەکە خۆی بێت. ئەمە لە لاییکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە تێکڕای ئەم تێبینییانە سەر دەگەیەننەوە بەو تێبینییە بنچییەی کە لە سەرەتاوە دەرم بڕی لە بارەی «ناوهێنان و باسکردن» ی بێ قووڵبوونەوە کە چۆن زەرەر لە مرۆڤی بایەخدار دەدات و مرۆڤی کەمبایەخیشی پێ دەوڵەمەند دەبێ. ئەم دەستوورە لە باسی مرۆڤی هەڵکەوتووی لەعادەتبەدەردا پتر خۆی دەسەپێنێ، بە نموونە دەڵێم: ئەگەر گوترا، قایمقام بە دوا بیست کەسیدا هەنارد و تەکلیفی نابەجێی لێکردن و لە نێوان هەمواندا فلان بە دەنگ هات و ئیعتیرازی گرت، دەبێ لەو کەسە قووڵ ببینەوە هەتا بزانین چ ماکێکی حەقپەرستی و نەترساوی لەودا هەبوو وای لێ کرد بە تەنها بێت دەنا ڕەنگە نرخی خۆی پێ نەدەین وەیا مەسەلەکە بدەینەوە بە ناشارەزایی و بێباکی و خەسڵەتی ئەوتۆیی. ئنجا لەگەڵ مندا سەرنج بدە ئەم ڕووداوە عادەتییە لە ڕەفتاری باوکمدا.

مەلیک فەیسەلی یەکەم لە هەولێر پێشوازیی لێ دەکرا. ئێوارە بەلەدیە لە یانەی فەرمانبەران داوەتێکی گێڕا لەسەر شەرەفی مەلیک. مەلا ئەفەندی و باوکم بۆ داوەتەکە لە «باداوە» وە هاتن بۆ هەولێر من منداڵێکی 10-12 ساڵی بووم لە خزمەتیاندا هاتم. لەبەر دەرگەی نادی ئۆتۆمۆبیلەکەی مەلا ئەفەندی و هی موتەسەڕیفی هەولێر لە یەک کاتدا وەستان و خەڵقەکەیان لێ دابەزی. موتەسەڕیف سڵاوێکی کرد و پێش مەلا ئەفەندی و باوکم کەوتەوە بەرەو شوێنی داوەتەکە. باوکم هەنگاوی هەڵێنا و دەستی موتەسەڕیفی گرت و پێی گوت: جارێ نۆرەی ئێمەیە. موتەسەڕیف، ماڵم حەقە، بەسەرەخۆی نەهێنا و گوتی، مرازم ئەوە بوو ڕێبەڵەدی بکەم نەکا ئێوە شارەزای شوێنەکە نەبن، باوکم پێی گوتەوە، باش

شارەزاین و «نشکرکم». ئیتر مەلا ئەفەندی و باوکم لە پێشەوە و موتەسەڕیفیش بە دوایانەوە بەرەو کۆمەڵەی داوەتکراوانەوە ڕۆیشتن، خەلقیش کە جەمبوورەی بەستبوو بە دەوری نادییەوە چاو ئەبڵەق بوون.

هەر لەو داوەتەدا باوکم هێندێ قسەی بە مەلیک فەیسەڵ گوت گەلێک بەولای ڕاگرتنی موتەسەڕیفەوە بوو. خوێنەر دەبێ وردبێتەوە لە ڕاگەیاندنی ئەو جۆرە هەڵوەستە، لە هەزار مەلا یەکێکی زات ناکا قۆڵی مدیر ناحیە بگرێت و بە دوای خۆیەوەی بدا، هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە دەزانێ بۆی ناچێتە سەر، لەوە هەر بگەڕێ کە نانبڕانی تێدایە. کە مەلاش زات نەکات کەسی دیکە زات ناکات. ئەدی چۆن مەلای کۆیێ موتەسەڕیفی دواخست و دواتریش قسەی بە مەلیک فەیسەڵ بڕیەوە؟ لەبەر ئەم هۆیانە:

1. خۆی لەسەر حەق دەزانی
2. بڕوای بێسنووری بە خۆی و کەسایەتیی خۆی هەبوو تا ئەوەی ڕەفتارەکە بەلایەوە وەک ئاو خواردنەوە بوو
3. ترس و تەمای لە دڵدا نەمابوو
4. بەخۆیدا ڕادەپەرموو زاڵ بێت بەسەر هەر ئەنجامێکی لەو هەڵوەستانەدا بکەوێتەوە
5. شەرمی لە خۆی دەهاتەوە لە ئاست داخوازی هەڵکەوت خامۆش بێت
6. کەرەستەی هەموو هەڵوەستێک و هەڵکەوتێکی، لەوانەی بێنە بەر هەنگاوی مرۆی وەک خۆیەوە، بە زیادەوە هەبوو: هەر لە زمانی پاراو تا ڕەوانبێژی تا زانستی سەردەم تا مێژووی گەلان تا دڵی هۆشیار تا جورئەتی بێسنوور...
7. بەگژ نارەواییدا دەچۆوە نەک ڕەوایی
8. مەلایەتی بەلای ئەوەوە ژووررووی هەموو پایەیێکەوە دەهات

لە ڕوون کردنەوەی ئەم نوختەیە شتێک دەگێڕمەوە لە زاری ڕەحمەتی حاجی میرزا عەبدوڵای خادمەوە. ڕەحمەتی گوتی: جارێکیان لە وەعزی ئێوارەیەکی ڕەمەزاندا کە هێندەی نوێژی جومعەی خەڵقی تێدا کۆ دەبوونەوە (بۆ بیستنی گوتاری ئەو وەعزانە زۆر لەوانەی دینداریش نەبوون تێیدا حازر دەبوون) شتێکی لە غەوسی گەیلانییەوە گێڕایەوە و بە «مەلا عبدولقادرگەیلانی» ناوی برد... هەندێک مێشکوشک وەتەنگ هاتن لەو جۆرە ناو بردنە و ناڕەزاییان درکاند... قسەکە گەیشتەوە مەلای گەورە. لە ئێوارەیەکی دیکەی وەعزدا بۆ قسەکە چۆوە و گوتی: بیستم هەندێک لە گوێگرانی ئەو ڕۆژە لێیان گران هاتووە گوتوومە «مەلا عەبدولقادری گەیلانی»، ئەوەی لەو زاتەوە سوودی هەبێ بۆ ئێمە عیلمەکە و مەلایەتییەکەیتی، کەشف و کەرامەتی لەگەڵ خۆی بەسەرچوون. مەلایەتیش ناوێک نییە نە بۆ غەوس و نە بۆ لەویش گەورەتر کەمایەتیی تێدابێ چونکە مەلایەتی دەکاتەوە عالمایەتی، ئەگەر ئەو کەسانە بەوە ڕازی نین لێرە بە دواوە دەڵێم «مەلا خوا».

ئەم حەفت هەشت خاڵەی سەرەوە کە بەشێکی کەسایەتی باوکم دەگرنەوە، لە هەموو هەڵوەستەکانیدا بەدەر دەدەنەوە، لە زوێکیشەوە ئەو خەسڵەتانەی چەسپاو بوون. بگەڕێوە بۆ ڕۆژگارێک کە تازەبەتازە ببوە جێگری باوکی، لە یاداشتەکەی ڕەحمەتی مەلای چوڕستانی دەبینیت کە چۆن باوکم دوای ساڵێک لە وەفاتی حاجی مەلا عەبدوڵای باوکی خوتبەی جومعەی بێ کاغەز خوێندۆتەوە و بە تێهەڵکێش قسەی بردۆتەوە بۆ تێپەڕینی ساڵێک بەسەر مەرگی باوکیدا و... و...

هەر ئەم قابیلیەتە بوو لە موناسەبەیەیێکی ڕەسمیدا بە هانای هات بتوانێ گوتارێکی یەک دوو سەعاتی سەرپێی بدات ڕووبەڕووی ئاپۆرەی خەڵقی شاری مووسڵ و هەرچی دەستەودایەرەی حکوومەت هەیە بە مەدەنی و عەسکەرییەوە و هەموو گەورەپیاو و مەلا و مەشایێخی مووسڵ و هەرێمی ئەو ناوە... بەدوا ئەو گوتارەدا «سلیمان نظیف» والی مووسڵ ئەو پایەی لێ نا کە پێشتر بۆ حاجی مەلا عەبدوڵای ڕەچاو دەکرد... مناسبی جێگەیە بڵێم، باوکم دەیگێڕایەوە کە «سلیمان نظیف» پێی گوتوە: دەزانم عالەم ڕووت لێ دەنێن بۆ کارگوزاری خۆیان لای من، تۆش هەر ئیشێکی بە لاتەوە مەبەست بوو، لەو نامەیەدا کە پێوە دەینێری بۆم، یەک بەیتی شێخ ڕەزای تاڵەبانی تێچێنی قسەکان بکە تا جێبەجێ کردنی لە گوماندا نەبێ، ئەو نامەیەی بەیتی شێخ ڕەزای تێدا نەبێ دەبێتە کاری دووبەختی...

باوکم مەلا بوو، بەڵام مەلایەک کە بتوانێ لە هەموو زانستەکانی ئیسلامدا کتێب دابنێ، تەنانەت لە گەلێک مەسەلەدا «اجتهاد» ی خۆی بەکار دەهێنا. بە درێژایی عومری مەلایەتی خۆی دەرسی گوتبێتەوە یەکسەر بێ ئامادە کردن دەرسی گوتۆتەوە. دەمدیت کە دەکەوتە سەر شەرح و تەقریری دەرسەکان وەک تاڤگە قسەی لێ هەڵدەڕژان، ناوناوە لە گەمەی تەقریردا هەڵوەستێکی دەکرد و چاوی دەبڕیە شتێکی نادیار. دەیگوت لەو تەرزەحاڵەتەدا چەند ڕێبازێکی شەرح بۆم دەکرێنەوە، لەو هەڵوەستەدا یەکێکیان پەسەند دەکەم. واش دەبوو کە پێویست بە شەرح نەبووبێت بە چەند قسە و هێمایەک لە دەرسەکە دەبۆوە.

باوکم «خطیب» بوو، بەڵام «خطیب» ێک کە بتوانێ بە کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی تا حەز بکات لەسەر بابەت بدوێ بێ حازر کردن و بێ کاغەز و بێ ئەوەی پێشتر ئاگادار بووبێ لە چ دەدوێ. باوکم لە دەروونددا ئیمانی بە «حەق» هێنابوو. لەو ئیمانەدا تێکڕای بوونەوەر لەبەر چاو و لەبەر تەبعی جۆرێک لەنگەری بەستبوو کە ئیتر گۆڕانی باری بوونەوەر نەتوانێ لەنگەر بەستنەکە تێک بدات، بۆیە بوو هەرگیز لە بارێکەوە بۆ بارێک نەدەگۆڕا. لە ماڵەوە و لە مزگەوت و لە نێوان ئاپۆرەی خەڵق و لای دەستەڵاتدار و بێدەسەڵات یەک زەڕڕە فەرق بە قسە و بە ڕەفتاری نەدەکرا. چ لە ژووری خۆی تەنها بایە و کتێبێکی خوێندبایەوە و چ لە دیوەخانە یان لە مزگەوت لەگەڵ خەڵق دانیشتبایە یان لە هەر هەڵکەوت و هەڵوەستی دیکەدا بایە هەمان ڕەفتاری دەکرد، واتە تەنها بایە و خەڵق دیار بایە بایی سەری موویەک حەرەکە و سەکەنەی نەدەگۆڕا، هەر بە قەدەر ئەوەی شەرم لە سێبەری خۆی بکات شەرمی لە خەڵق دەکردەوە.

من بەلای کەمەوە دە ساڵێک، بەر لە وەفاتی، گەیشتبوومە تەمەنێک مانای شتان تێبگەم (24 ساڵی بووم کە وەفاتی کرد) لەو دە ساڵەدا بەو لای هەموو سنوورێکەوە ئەم دیاردەیەی لەنگەربەستن و نەگۆڕانم لەو مرۆڤەدا بەدی دەکرد تا ئەوەی هەندێ جار بەلای خۆشمەوە دیاردەکە نائاشنا خۆی دەنواند، هەر دەتگوت بەسەر مەتەڵێکدا دەنۆرم کە باشی تێناگەم. وا بزانم ئەم قاڵبوونەوەی بۆ حەق، کە گوفتار و ڕەفتاری یەکچوون کردبوو، یەکێک بوو لە هۆی ئەو هەیبەتەی کە لەو مەجلیسە دەنیشت ئەوەی تێدا بایە.

له مەجلیسی دانیشتن بگەڕێین و سەیری ئەو ڕێگەیە بکەین کە پێیدا دەڕۆیشت، لە ماڵەوە بۆ مزگەوتی گەورە دوو ڕێگە هەبوو، یەکێکیان بە ناو بازاڕدا دەچوو، کە بە ناچاری ئەو ڕێگەیەی دەگرتە بەر هەر لە زارکی بازاڕەوە کە بۆ ئەهلی بازاڕ دەردەکەوت تێکڕایان هەڵدەستانە سەر پێیان تا لێیان ڕەت دەبوو، تەنانەت گاور و جوولەکەش وەک مسڵمانەکان بۆی ڕاست دەبوونەوە. واز لە ئەهلی بازاڕ بهێنین بۆ منداڵی کۆڵانەی گەڕەکەکەی خۆی، عەسری ڕۆژانی کۆتایی بەهار و سەری هاوین کە لە ماڵەوە دەردەچوو بەرەو مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد منداڵی گەڕەک کە سەرگەرمی قەپوقیری جگێنە و تۆپێنە بوون هەر کە چاویان پێی دەکەوت کەلاوجگ و تۆپیان لە دەستان بەردەبۆوە و خۆیان بە دیواری ئەم بەر ئەو بەری کۆڵانەوە دەگرت تاکوو لە چاوانیان بزر دەبوو. ئنجا وردە وردە دەگەڕانەوە بۆ گەمەکانیان.

من ئەمانە و سەدان شتی دیکەم دەدەیت لەو بابەتە کە لە کەسی دیکەم نەدەدیت ڕۆژ لە ڕۆژ هەیبەتی لە دڵمدا کاریگەرتر دەبوو. جارێکیان ماڵمان لە چنارۆک بوو، عەسران باوکم لە ماڵەوە بەرەژێر دەچوو بۆ ناو باغەکان، ئەو جارەش بە عادەتی خۆی لە باغچە بوو. من لە ژێر کەپری ماڵمان ڕاوەستا بووم، چەند کەسێک هاتن سەلامیان کرد و لە باوکمیان پرسی، گوتیشیان لە دیوی ئێرانەوە هاتوون بۆ پرسیارێکی شەرعی... من بردمن بۆ سەراوردی باغەکە و ئەو شوێنەشم نیشان دان کە باوکمی لێ بوو. هەر لە بیرمە باوکم کەوایەکی ئاودامەنی لەبەر بوو، یەک هەمیانەی لە کەمەری بەسەر کەواکەوە بەستبوو. چاوم لێ بوو پیاوەکان گەیشتنە لای و سەلامیان کرد و گوێم لێ بوو گوتیان لە جەنابی مەلا دەگەڕێین. باوکم گوتی: جەنابی مەلا؟ گوتیان بەڵێ. دوو پەنجەی دەستی ڕاستەی بردە سەر سنگی و گوتی، جەنابی مەلا ئەمەتە... کابراکان وەک داریان لە لووتی بدەی بەرەو پاش گەڕانەوە وەها شڵەژان بۆ چەند لەحزەیەک نەیانزانی چ بکەن تا هاتنەوە سەرەخۆ و چوون دەستیان ماچ کرد... ئەم دیمەنە بچووکە لەبەر چاومدا جیهانێکی ئەفووسناویی لە باوەشی خۆیدا دەگرت. هەیبەت و شکۆی باغێکی چۆڵ بە دەوری پیاوێکی تەنهای کەوا لەبەری هەمیان لە کەمەری دارعەسا بە دەست نەک هەر لە دڵی مندا بەڵکوو لە دڵی ئەو دوو سێ پیاوە غەریبەشدا هێندە سامناک بوو دەتگوت سێبەری بەسەر هەموو مەڵبەندەکەدا کشابوو. ئەو سێ کەسە ئەگەر لە ناکاو

بە سەر دەستەیەکی چەکداری زریپۆشدا کەوتبانایە هەر هێندە دەشڵەژان. لە ڕوویەکی دیکەوە سەیری ئەم مرۆیە بکەین:

لە سییەکاندا شەوێکی هاوین، کە خەڵق هەموو لە سەربانان دەنوستن، دوای بەسەرچوونی دەمی دیوەخانە و داهاتنی کاتی خەوتن، لە نوێنەکەمدا هێشتان نەبۆرژابووم باوکم لە نێو تەخت و چیغی خۆیەوە بانگی مامی کرد (بانەکانمان بەسەر یەکەوە بوون و شوورەیان لەبەیندا نەبوو) گوتی: «نوورەددین سەیری فڵانە شوێنی ئاسمان بکە وا فڵانە ئەستێرەی «سیار» خەریکە فڵانە ئەستێرە دادەپۆشێ». لەو عومرەی 13-14 ساڵیمدا بە دڵمدا هات کەوا ڕەنگە باوکم تاکە مرۆڤێکە بێ لە هەموو کوردستانی عێراقدا سەرنجی بۆ دیمەنی ئاسمانی ئەوتۆیی بکشێت و ئەستێرەکان بناسێتەوە بە وەستاو و گەڕۆکیانەوە.

هەروەهاش لە بیرمە کە نەوتی بابەگوڕگوڕ کەوتە سەر باری ئیشی تەواو و ئاگرەکانی شەو و ڕۆژ بڵێسە و دووکەڵیان بەرز دەبۆوە باوکم تێبینی ئەوەی کرد کە ڕەنگە زۆر نەبات ئەو هەموو دووکەڵەی پڕ لە غازی هەمەجۆر بە هەوادا بڵاو دەبێتەوە، کاری بەد لە دەغڵ و درەخت بکات و ژەنگیان پێ هەڵبێنێ. وابزانم حکوومەتیش بیری لەم لایەنە نەکردبۆوە، دوای دەیان ساڵیش ئنجا حیکایەتی «پیسبوونی هەوا» کەوتە سەر زار و زمانی خوێندووەکان...

گەلێک ڕووپەڕەی ئەوتۆیی لە ژیانی باوکمدا بۆ بەرچاوی بینەر دەرنەکەوتوون، هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە گۆشەیەکی شەخسیەتی ڕوون دەکاتەوە. منیش کە ئەم چەند لاپەڕەیەم لێ نووسین بۆ ئەوە بوو کە خوێنەری کورد نەختێک وردتر بێتەوە لە کەسێک کە بەر لە 59 ساڵ بێ کۆمە کردن لە هیچ شتێک وێرای کچی خۆی لەبەر خوێندن دابنێ لە قوتابخانەی کوڕان. (ئەم دێڕانەم لە ڕۆژی 15/9/1984 نووسی).

باوکم تاکە مرۆڤێکە تەئسیری بێسنووری لێم کردبێ. ئەو تەئسیرە لە زۆر ڕووەوە بوو بەڵام من تەنها باسی دوو ڕووی دەکەم کەوا زۆر بەسەیری پێچەوانەی یەکترن: ڕووی یەکەم ئەوەیە کە حەقپەرستی و ڕاستگۆیی و ڕاستڕۆیی ئەو لە مندا ماکی تەقدیسی «ڕاستی» ی ڕسکاند، ئەو تەقدیسەش کێشایەوە سەر هەندێ کە تا ڕادەی قێز هاتنەوە سڵ لە درۆزن و لە درۆ بکەمەوە بەتایبەتی لە مەیدانی

کۆمەڵایەتیدا. ڕەنگە عوزری کەسێک قبووڵ بکەم لەو درۆیەی دەیکات لە مامڵەتی بەیع و بازاڕدا بەڵام یەکێک لە بیروڕا و فەلسەفە و ڕامیاری و شتی گشتیدا درۆ لەگەڵ میللەتەکەی بکات تاوانبارترە لە پیاوکوژ و ڕێگر و دەستبڕ. درۆ کردن لەگەڵ میللەتدا بەلامەوە خیانەتی بێتەئویلە.

ڕووی دووەم ئەوەیە شەخسیەتی زێدە بەهێزی باوکم لە مندا وردە وردە هەستی لەخۆڕازیبوون و بەخۆداڕاپەڕموونی کز کردووە، ساڵ لە دوای ساڵ بە شێوەیەکی ئاشکراتر بۆم ڕوون دەبۆوە کە من هەرچی هەبم ناگەم بەو باوکە. ڕاستییەکەی بەحاڵ لە دەست هەستی «خۆ بە کەم زانین» ڕزگار بووم. هەمیشە لەگەڵ خۆمدا دەمگوت: من هەر جورئەتێکی لە پێویستدا بینوێنم ناگا بەو جورئەتەی لە هەمان پێویستدا باوکم دەینواند، تا گەیشتم بە پلەیەک کە ترسم لێ بنیشێ لە خۆدەرخستن و لە هەڵوەستدا ڕاوەستان چونکە کمەکمە ترسی «ناگەم بەو» لێم دەبوو بە «ناوێرم وەک ئەو».

هەر لەبیرمە - لەگەڵ بیرکردنەوەش شەرم دامدەگرێ - هاوینی 1946 کە کۆی کزبوونەوەی کوردایەتی بوو، عەبدولئیلاهـ لە هەولێر ئاهەنگێکی شاهەنشایانەی بۆ گێڕدرا و لە ئاهەنگدا بە گوتار و بە شیعر لەلایەن هەلپەرستانەوە بۆ ئاسمان بردرا، هەمووشی لەسەر حیسابی کوردایەتی. لەو دەمەدا ڕازی بووم بە نرخی نیوەی عومرم بوێرم هەڵستم و لغاوێک بخەمە زاری ئەو هەموو پێدا هەڵگوتنە و شاباش و چاوەشییەوە. بەڵێ جورئەتم نەکرد، بەڵام بێگومان هۆیەکی گەورەی جورئەت نەکردنەکەم بریتی بوو لەوەی کە لەگەڵ خۆمدا دەمگوت ئەگەر باوکم بەرحەیات بوایە ئەو کەسانە نەیاندەوێرا وەها بە ڕاشکاوی لەسەر حیسابی شەرەفی کوردایەتی حەیا و شەرمی وڵاتەکە بۆ سەر پێڵاوی «وصي» هەڵباوێن. لەو دەمەدا ئەو دوو نیوەبەیتەی شێخ ڕەزام بە بیردا دەهاتەوە کە تێیاندا دەڵێ:

بحمد الله نەما کاک ئەحمەدی شێخ
ئەگەر خۆ شێخ عەلیش دفع البلا بێ

بە نیسبەت ئەو دەمەوە «کاک ئەحمەد و شێخ عەلی» بۆ هەولێر مەلا ئەفەندی و باوکم بوون بەڵام عەزمشکێنی من جگە لە قسوریی خۆم تارمایی شەخسییەتی باوکم بوو کە بەسەر عەزممدا دەکشا و لە سێبەریدا کز دەبوومەوە.

بەر لەوەی خۆم بیدرکێنم کەس نەیدەزانی و گومانی بۆ ئەوە نەچووە کە چ جۆرە شەڕی ناوەکی و دەروونیم کردووە بۆ ڕەهابوون لە چنگاڵی ئەو هەستەی خۆ بە بێدەستەڵات زانین لە تەک دەستەڵاتی بێسنووری باوکمدا. کە ساوا بووم جارێ ئەو جۆرە بەراوردییە نەبووبووە لەمپەڕ لە پێش تواناممدا ئەوسا لە چاو ساوای دیکەدا گەلێک بەدەستەڵات بووم، بەڵام ڕەنگە لە ئەنجامدا سوودێکم پێ گەیشتبێ بەوەدا کە بارتەقای کزبوونەوەی لایەنی هەڵمەت بردن و خۆدەرخستن، لایەنی بیرکردنەوە و فکر بەکارهێنان و لێکدانەوەم گەشەی کردبێ...

## ئاڵقەی دووەم

بەو هێندەی تێپەڕی لە باسی پێشینان، جارێ دەست هەڵدەگرم، لە پێویستدا چەندێکی بشێ باسی لێوە بکرێ بۆی دەچمەوە.

وەک لە نووسینی دیکەی خۆمدا لێم بیستراوە، لێرەشدا دەڵێمەوە، ڕۆژی لەدایکبوونم تۆمار نەکراوە، لە بیریشم نییە گوێم لێ بووبێ باسی کرابێ. ڕاستییەکەی ئەم فەرامۆشییەی ڕۆژی هاتنە دنیام، هەر چەند هیچ حیسابێکی ئەم جیهانەی پێ ناگۆڕێ و، بەزاهیر، لە هیچ هەڵکەوت و ڕووداوێکی بەسەرچوودا کەلێن پەیدا ناکا، باوەڕ ناکەم لە هەڵسوکەوتی دواڕۆژیشدا دەنگ بداتەوە، دیسانەوە کەموزۆر پێی نائارامم. هەروەک زۆر ناخۆشە مرۆڤ بزانێ چ ڕۆژێک لەگەڵ مەرگدا دەستەملان دەبێ، لە باری پێچەوانەدا خۆشە بزانێ چ ڕۆژێک دەستەملانی جیهانی زیندەوەر و بوونەوەر بووە. مرۆڤ کە ڕۆژانی حەفتەی لێ دەشێوێن و نازانێ دوێنێ شەمۆ بوو یان هەینی، بایی ئەوەی بپرسێ لە خەڵق، بەو نەزانینە ناڕاحەت دەبێ. ئنجا ئەگەر ئەو هەینی و شەمۆیە پێوەندیی بە هەوەڵ پشکووتنی پۆقژەی عومری خۆیەوە هەبێ هەقیەتی پتری تێدا ناڕاحەت بێ، بەتایبەتی چونکە ناتوانێ بە پرسین لێشی بتۆژێتەوە، وەک کە دەتوانێ لە بارەی دوێنێ و پێرێ بپرسێتەوە. ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی دیکەشەوە چونکە ڕۆژی لەدایکبوونی زوربەی ئەوانەی لێوەم نزیکن بەڕاستی و دروستی زانراو و نووسراویشە، تەنانەت یەکێکی وەکوو مەلا عەبدوڵای کاکی جەلی کە لەساڵی 1116 ک هاتۆتە دنیا ئەو ڕۆژەی بۆ ناساندراوە، بەم هۆیەوە پتر حەزی زانینی ڕۆژەکەی خۆم دام دەگرێ. باوکم بە خەتی خۆی چەندین ڕۆژی بوون و مردنی کەسانی دوور و نزیکی نووسیوە، وەها بووە شتێکیشی لە بارەیانەوە نووسیوە، تا ئەوەی بۆ مەرگی یەکێکی وەکوو حەماغا چەند بەیتێکی بە فارسی هۆنیوەتەوە، بە حیسابی «جمل» مێژووشی دەرهێناوە، کەچی وەک حاجی قادر دەفەرموێ «... لە بەختی کەچم خامە نووکی لێرە شکا»، دڵی خۆم بەوە دەدەمەوە کەوا هەر نەبێ ڕزگار بووم لە خەریکبوون بە خوێندنەوەی وڕێنەی ئەستێرەناسەکان کە دێن ساڵ و بورج و ڕۆژی لەدایکبوون دەدەنە بەر حاپوولی پێشبینیەکانیانەوە و گۆڤار و ڕۆژنامەش لاپەڕەیان پێ پڕدەکەنەوە. بێگومان ئەگەر ڕۆژەکەی خۆمم زانیبایە گیرۆدەی ئەم فاکوفیکەی دەکردم چونکە من بەر لە

ناوەڕۆکی ئەو لە چاپدراوانە دێم وردە خافڵاندنەکانی وەک نەخشەی وشەی تێکهەڵکێش و تاقی کردنەوەی زیرەکی و مەتەڵ و لوغز و ئەو جۆرە لەبیربەرانە دەخوێنمەوە و پێشیانەوە دەخەریکێم، تا لێیان بە ئاوات دەگەم یان بێئومێد دەبم. ئنجا چۆن دەشیا پەنجە لە بینەقاقەی تالع و بەختی بە ئەستێرەوە هەڵواسراو قولاب نەکەم تا فەراقی ڕەش دەدات. لێرەدا نیوە بەیتێکی «شێخ ڕەزا»م بە بیردا دێت کە دەڵێ: «تا ڕیخی دەرنەهێنا تەئریخی دەرنەهێنا». پەرژینێکی قایمیشی بێ لە خۆم و خوێنەران لە بەیتەکانی دیکە...

بەم درێژەپێدانە نەختێکم لە دەردیسەری خۆمم بە دەست نەزانینی ڕۆژی هاتنە دنیامەوە گەیاندە سەری خوێنەریش، بەڵام بە خۆمدا ڕادەپەرمووم لێم بەداوێوە نەکات چونکە لە سەرەتاوە بە ئیزنی ئەو ڕێم بە خۆم داوە سەری بیەشێنم، چاوی ماندوو بکەم، باوەشکی بهێنمێ، ناوناوە بە دەربڕینی هەندێ بیروڕا لە خۆشمی بتۆرێنم و هەر دەشبێ لەگەڵمدا ئاشت بێتەوە چونکە ئەگەر ئەو ڕێگایانەم لێ کوێر بکرێنەوە دەستم قەڵەم ناگرێ و یەک تاکە هەنگاوم بۆ هەڵنایەندرێ لە گەشتنامەی ژیانم. ئەمەیە لە خوێنەرەوە بەخشینی ناچاری، وەک دەڵێن زۆر لە عەرەبەکانی پێش ئیسلام کاتێک کە بە دەوری کەعبەدا دەسووڕانەوە پاڕانەوەیان ئەمە بوو: «ربي إرحم، إن لم ترحم، جبرا ترحم». هەرچەند داوایەکەی ئەو برا عەرەبە بەسەرچووانە زۆری سنوورشکاندن تێدایە، بەڵام زۆریشی تێڕادیتن لە نەوازشت و بەخشینی پەروەردگار تێدایە.

کەواتە ئەو ڕۆژە دەستنیشانە سەرشارە گرنگەی ژیانم ونە، بەڵام خۆ و بەخت کژی هەوەڵ سەرەتاتکەم لەم جیهانە وەها تاریک نییە، ئەویش بە هۆی کەسبێکی ڕەزەوانانەی فۆلکۆرییانەی خۆشکەڵانەی تێکەڵاو بە عارەقەی ئەرک و شیرنایی ترێ و گەشایی هاتوباتی مێوژەڕەش، کە من بۆ یەکەم جار چاوم هەڵێنا مشتاغی ترێی مێوژ ڕۆنرابوو. ماڵمان لە چنارۆک بووە و بە عادەتی ساڵانە خاوەن باغەکان، کە ماڵی ئێمە یەکێک بوو لەوان، ترێ ڕەشەیان ڕنیوە و، هەریەکەیان لە سنووری پارچە زەویی دیارکراوی خۆیدا مشتاغی ڕاخستووە. لە جێگەیەکی وەکوو چنارۆک[4] کەوا

---

4- من لە نووسینی دیکەمدا گوتوومە «لە چنارۆک بەوەلەد بووم» بەڵام دەرکەوت ئەمە هەڵەیەکی بێمەبەست بوو لە منەوە چونکە کە لە دایکمم بیست

تاڕادەیەک فێنکترە لە دیوی کۆیە و حیسابی کشتوکێڵ و ڕەزبڕین و ئاودان و میوە پێگەیشتن و لێ خواردنی بەرەو خۆشناوەتی دەبێتەوە، ترێی مێوژی لە کۆتایی ئاب و سەرەتای ئەیلوولدا بە تەواوی دەگات.

پەندی ڕەزەوانی ئەو دەوروبەرەیە دەڵێ: «کە گەلاوێژ کەوتە بەر شەوێ دەست ببە بۆ باغەڵی مەوێ» – خەڵقەکە دەڵێن «مێوی» لە جیاتی «مەوێ». گەلاوێژ لە بەرەو کۆتایی ئاب بەر شەو دەکەوێ، چەند ڕۆژێکیشی دەوێ تا ترێی ڕەش لە قۆناغی دەست بۆ باغەڵ بردنەوە دەگاتە سەر و حەدی مشتاغان. بەو پێیە دەبێ لە ئەیلوولدا من بووبێتمە میوانی «دنیاکەی فانی کاروانسەراڕەنگ» ساڵەکەش 1919 ی ز بووە. وەک دەیانگێڕایەوە ئەو دەمە دنیا فەرەحنایی تێگەڕابوو، دوو ساڵ بە سەر گرانیی ساڵی 1917 دا تێپەڕی بوو ساڵێکیش بوو جەنگی یەکەم بەسەر چووبوو، ئینگلیز بووبووە جێگری تورکی عوسمانلی.

ئەو ئینگلیزانە هەر چییەک بووبن لە عوسمانلییەکان تێروتەسەلتر بوون و شێوازی حوکمیان پتر بەرەو شارستانەتی بوو. بە نموونە، نەبیستراوە نە «سوجەر» و نە «لێڤی»ی سپای ئینگلیز وەک «هەیتە»ی عوسمانلی ڕاووڕووتی کردبێ، بە پێچەوانەوە، یەکەم کاری ئینگلیزەکان دوای داگیر کردنی کۆیە ئەوە بوو کە فەقیرخانەیان دانابوو، شاریان پاگژ کردبۆوە لە چڵکنی و ناساغی و جەردەیی شەوانە و ئەو تەرزە نامەردییانە. خەڵکی هەژار بە دیار کەسب و کاریەوە چ لە شار بوایە چ لە لادێ و هاوینەهەوار و ناو شاخ و داخ، ترسی پۆلیس و ئیجارەگر و مەڕانەستێن و دەغڵقرسێنی لێ تەکیبۆوە. خولاسە شەوەزەنگی حوکمی عوسمانلی و

---

دەیگوت: کە تۆ بوویت مشتاغی ترێ «لە چنارۆک» ڕاخرابوو. لەوەڕا وەهام دادەنا کە ماڵمان لە چنارۆک بووبێت، دەنا بۆچی دایکم مشتاغی چنارۆک بکات دروشمی کژی هاتنە دنیام. لە مندا تەبیاتێک هەیە باشیشە و خراپیشە: کە قسەیەک بە ڕواڵەت ئاشکرا و بێ پێچەکە و خوارەکە بێت پرسیاری بە دەورەوە هەڵناستێنم، تەنانەت ئەم تەبیاتەم لە ساڵی ١٩٨٢ کە هەوەڵ جار پرۆستاتم لێ بەخەبەر هات قسەیەکی دکتۆرەکەم کە بەلامەوە دەلالەتی ئاشکرا بوو، تەبیاتەکەم لێ نەگەڕا پرسیاری ورد بکەم و ڕوونتر لە مەبەستی دکتۆر بگەم، ئیتر عەمەلیەتی پرۆستاتەکەم وەخرا هەتا ساڵی ١٩٨٨ کە خەریک بووم تێدا بچم.

قاتوقڕیی گرانی و ڕاوڕووتی مەئمورەکان و دەستدرێژیی دەسەڵاتدارەکان گەلێک گەلێک بەرەژێر بووبۆوە. لەمەشدا سەیروسەمەرە پەیدا نییە، هەرچی ڕێژیمی پێشکەوتووی وەکوو ئینگلیزە چاو نابڕێتە سوودی بچووکی باغەڵبڕین و گیسک دزینی ئەم و ئەو کە ئەگەر هەرچی ببێ بایی سەدەیەکی مەسرەفی داگیر کردنەکە ناکات. ئەو خەریکی بەرژەوەندی زلی وەک نەوت و تیجارەتی گشتی و ستراتێجی هیند و لەنگەربەستنی هێزە زلەکانی جیهانی و ئەم جۆرە ئامانجە بەرفرەوانە و دوورەدەستە دەبوو، تەنانەت بۆ ماوەیەک ئەوەندە مەسرەفی لەسەروبەری داگیر کردن و هەڵسووڕاندنی کاری عێراق بە خەرج دا، ڕۆژنامەکانی خۆی، بەدوا ئەواندا میللەتی بەریتانیاش، لێی بەدەنگ هاتن و ناڕەزامەندییان لێ نیشاندا و پتر لە 60% ی ئەو مەسرەفەیان پێ داشکاند.

بەهەمەحاڵ ئەگەر گوتەی «پێوقەدەم» دەنگی لێ هەڵبستێ، پێوقەدەمی من کوردی گوتەنی، سەرەوخێر بووە. وەک بزانم ئەو فەرەحناییە لە بیستەکاندا بەردەوام بوو تا ئەزمەی ئابووری دەوروبەری 1930. کە من پێم نایە دنیا باوکم لە من بەولاوە چەند منداڵ و وەچەی دیکەی هەبوو. لە ژنی پێشووی کچ و کوڕێک، لە دایکی منیش دوو کچ. دووەکەی پێشوو «عفت» و «عبد المقتدر» - شەپڕەدار بوو - دووەکەی پاشتریش «نەجیبە» و «حەسیبە». ئەم حەسیبەیە هەر بە منداڵی لە حەوزی ماڵەوەمان لە کۆیە، خنکا. نەجیبەی خوشکە گەورەم بە دوو ساڵ لە من گەورە تر بوو. پەروەردەبوونمان لە هیچ ڕوویەکەوە فەرقی نەبوو مەگەر ئەوەی کە ئەو کچ و من کوڕ بووم. بەڵام جارێ زووە بۆ ئەم وردپێوییە.

دایکم لەوانە بوو منداڵیان بۆ شیر نەدەدرا، هەندێک ئافرەت هەن گۆی مەمەکیان زەقایی ئەوتۆی نییە لێوی منداڵ پێوەی بەند بێ. بەم هۆیەوە هەموو منداڵەکانی دایکم بە دایان بوون. ڕەنگە وێنەیەکی هەرە زووی بیرەوەریی منداڵیم لە دەروونمدا چەسپ بووبێ ئەوە بێ کە دەمدیت دایکم پیاڵەی بەبەر سنگییەوە دەگرت و دڵۆپ دڵۆپ شیرەکەی تێ دەتکاند، دواتر پیاڵەکەی لە شیر بەتاڵ دەکرد بێ ئەوەی تنۆکێکی بچێتە هەناوی منداڵیەوە.

هەرچەند لەگەڵ خۆمدا هەوڵم نەداوە ورد ببمەوە لەوەی ئایا ئەم بە فیرۆچوونەی شیر و کەمتر منداڵ بە باوەش گرتنەوەی دایکم چ تەئسیرێکی لە گیانی کردبێ، دیسانەوە بێگومان بە ڕواڵەتیشدا دیار بوو چەندی پێوە ناڕەحەت بوو. تۆ ئەگەر

ئاوی جۆگەلەت بۆ بن درەختەکەت نەچوو ئۆقرەت لێ هەڵدەگیرێ هەرچەند لە لاوەش بە ستڵ و کوندە ئاو ببەی بۆ درەختەکە، ئنجا دەبێ حاڵی دایک چۆن بێ لەگەڵ نەچوونی شیری دەمارەکانی بۆ ناو زاری مەلۆتکەی هەناوی.

من کە هاتمە دنیا دوو ساڵ بوو دایانی نەجیبە و حەسیبە لە ماڵمان بوو. ئەو دایانەمان پێیان دەگوت «یاعیسمەت». بنەماڵەیان کۆیی بوو لە ڕیزی «أصناف». برایەکی هەبوو پێی دەگوترا سابیراغا نەک لەبەر ئەوەی کە ئاغازادە بوو بەڵکوو بەهۆی ئەوەوە کە چاودێری خانی مەحموداغای باوکی حەماغا بوو، لەبەر ڕالێبوون و خۆشویستن حەماغا خۆی ناوی لێ نابوو سابیراغا. یاعیسمەت شووی بە مەعرووف ناوێکی کۆیی کرد بەینێک بە پۆلیسی لە هەڵەبجە بەسەری بردبوو. کە گەیشتمە تەمەنی حیکایەتبیستن یاعیسمەت بۆی دەگێڕامەوە کە لە هەڵەبجە بووە هاتوچۆی خانمی وەسمان پاشا-ی کردووە، زۆریش بە ڕێزەوە ناوی خانمی دەهێنا. دەیگوت خانم لێی پرسیم هەڵەبجە خۆشترە یا دێی حەماغا، مەبەسیشی کۆیە بووە، لە وەڵامدا گوتبووی خوا ئاوەدانیان بکات هەردوویان خۆشن. وەک دەیگێڕایەوە ئەوسا هەر لە ماڵی خانم حەمام هەبووە، ڕێشی داوە بچێ بۆ ماڵەکەی و حەمامەکەی. وادیارە خانم کۆیەی بە ئەوسای هەڵەبجە گرتووە بۆیە گوتوەتی «دێی حەماغا». لە کۆندا نیشانەی شارستانەتی چەند شتێک بوو، یەکیان قەیسەریی بە دەرگە، ئەوی دیکەیان زۆربوونی ژمارەی پەرستگە (مزگەوت، خانەقا، تەکیە)، سێیەمیان حەمام، چوارەمیان زۆربوونی شوێنی مێوان داکردن (قۆناغ و خان)، پێنجەمیان شوورە بە دەوری ئاواییەوە. شەشەم و حەفتەم و هەشتەمیش هەن پێویست بە کوتانەوەیان ناکا... ئەمانە هەموویان لە کۆیێ هەبوون، تەنانەت لەسەر دەرگەی یەکێک لە حەمامەکانی نووسرابوو کە لە 1111 ک دروست کراوە.

مارف، مێردی یاعیسمەت، ماڵەکەی دەهێنێتەوە کۆیە و بۆ خۆی دەچێتەوە بۆ هەڵەبجە لەوێ ژنی دووەمی دەهێنێ. یاعیسمەت و کوڕە تاقانەکەی ئەوسای، فەتحی، لە خانوویێکی نزیکی ماڵمانەوە دەژیان. کە لە گرانیەکەی 1917 نەجیبەی خوشکم دەبێ، یاعیسمەت بۆی دەبێ بە دایان و بە فەتحییەوە دێتە ماڵی ئێمە. دوای چەند ساڵێک مارف بە ناساغی تەنها خۆی، دێتەوە کۆیێ و لە ماوەی بەر لە مردنی، یا عیسمەتی دەچێتەوە لای بۆ خزمەت کردنی، نەجیبەی خوشکیشم بە خێو دەکات تا مارف ئەمری خوا دەکات.

فەتحی لە هەڵەبجە خزم و برای هەن بەڵام من هیچیانم نەدیتوون فەتحی بە دوو ساڵ لە نەجیبە گەورەتر بووە، زۆر بە سەیری ئەم شیرەی یاعیسمەت لە ساوایی فەتحییەوە تا مەلۆتکەیی نەجیبەی خوشکم و بەوەلەدبوونی من دەوام دەکات. بەڵام لەوە سەیرتر شتێکی دیکە بوو، لە ساڵ 1928 کە ئیقلیمی خوشکم بوو یاعیسمەت بۆی بەشیر هاتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا کە من کەوتمە بەر مەمکی شیری کەم بووبوو، تێری نەدەکردم، بۆیە من لەوانە بووم شیری زۆر ئافرەتم خواردووە و برا و خوشکی شیریم لە ژمارە نەدەهاتن. هەرچەند منداڵ بەبیریدا نایەت سنگ و باوەشی کام ئافرەت بە خۆیەوە گرتووە و چ مەمکێکی مژیوە دیسانەوە سۆزێکی بۆ ئەو کەسانە دەڕوات کە شیرمشتن بۆتە پێوەندی لە نێوانیاندا.

بێگومان یاعیسمەت بۆ من خۆشەویستترین دایکی شیری بوو، بگرە لە دایکی خۆشم پتر خۆش دەویست چونکە هەتا فەراقە بووم هەر لە باوەشی ئەو دەنوستم، ئەویش من و خوشکەکانمی وەها دەویست کوڕەکەی خۆی فەرامۆش دەکرد. فەتحیش لەناو ئەو برا و خوشکانەی شیریم لە پێش هەموانەوە دەهات، چونکە بەیەکەوە دەژیاین، خۆ دوو ساڵ بوو لە ماڵمان جێگیر بوو ئنجا من پەیدا بووم، هەتا ژنی هێنا و بۆ ماوەیەکیش دوای ژنهێنان هەر لەگەڵمان بوو. کە گەیشتە تەمەنی هۆش بە دنیا شکان خزمەتی باوکمی دەکرد. بەینێک بە گوزەرانی خێزانەوە لێمان دابڕا بەڵام هاتوچۆی هەر ما، دواتریش کەوتەوە سەر باری جاران و یاریدەدەری من بوو. ئێستاکەش ماڵەکەی وەک بەشێکی ماڵی خۆم بێ وەهایە، تەنانەت کوڕەکانم، دەوەن و محەمەد، ئەوەندەی لە کۆیێ بن ماڵی «مامە فەتحی، کاکە فەتحی» بە هی خۆیان دەزانن، ڕێکەوت وەها بوو بەشێکی خانووی میراتیمان بوو بە هی یەکێک لە کوڕانی فەتحی و ئێستا بە خێزانەوە تێیدا دەژین، حەسارێکیشمان دەرک بەرەو دەرکی ماڵمان، هەمووی بوو بە هی ئەو، لە کۆنیشەوە تێیدا دەژیا و بەو دواییە لە 1981-1982 خانووی نوێی تێدا کرد. بە دڵمدا نایات ئەو بەشە خانووە و ئەو حەسارە ئێستا هی خۆم نین، چی منداڵی فەتحی هەبێ بۆ من بەقەدەر منداڵەکانی فارووقی برام نزیکن. بە درێژایی 68 ساڵ تا ئێستا، 1985، یان خۆی یان دایکی یان منداڵیک و دووانی لەگەڵمان ژیاون.

یاعیسمەت لە ژیانمدا شوێنێکی دیاری هەیە. باوەشی ئەو بۆ من لە جێگەی باوەشی دایکم بوو. بە هەموو عومری بایی سەری دەرزی دڵی نەیەشاندووم. لە ماڵەوەش

قسەی بەسەر هەموو ئەوانەدا دەڕۆیشت، لە ژن و لە پیاو، کە خزمەتی باوکم و دایکم و ماڵەکەیان دەکرد. ڕاستییەکەی، زوربەی هەرە زۆری ئەو یاریدەدەرانەی لە گەڵماندا ژیان بە چاوی خزم و کەس سەیر دەکران، ئەوانیش ئەو داب و دەستوورەیان ڕادەگرت کە لە ماڵی مەلای گەورە بوەشێتەوە. نەمدیت ئەو یاریدەدەرانە ڕۆژێک لە ڕۆژان شەرە چەپەڵۆکێ بکەن وەیا قسەی سووک بە یەکدی بڵێن. زۆریشیان لە سێبەری باوکمدا ژن و ماڵیان پێکەوە نا (لەوانە حەفت پیاوم بە بیردا دێت). چەندێکی لەگەڵ خۆمدا ورد دەبمەوە نایەتەوە بیرم یەکێکیان تێدا بووبێ خۆشم نەویستبێ. بەپێی داخوازی هەڵکەوت و ڕووداو لەم سەرگورشتەیەدا ناویان دەبرێ.

لە سەرەتای بوونمەوە تا 4-5 مانگ خێزان پێوەم ناڕاحەت بوون بە هۆی گریانی بێوچانم. دەیانگێڕایەوە، چەند خەریکم دەبوون بە ڕاژاندن و لە باوەش گرتن و خستنە جۆلانە و لە گۆی خوێندن و گێڕان و لایلایی دادی نەدەدان و هەر وارەم دەهات. باوکم دەیگوت. وەها گوێم پڕ بووبوو لە دەنگی گریانت کاتێک دەرسیشم دەگوتەوە لە مزگەوت لام وابوو گوێم لە گریانتە. ڕۆژانە دکتۆری ئینگلیزەکان سەری لێ داووم و تەرتیباتی هێوربوونەوەی بۆ ساز داوم «وانا باعیط - عادل امام» گوتەنی. بەڵام نەخۆشیم پێوە دیار نەبووە و فراژیبوونم لە کورتی نەداوە، بە پێچەوانەوە، وەک دایکم دەیگوت تەنسازیم بێعەیب بووە، ئیتر نازانم هۆی ئەو گریانە لەحەدبەدەرەم چی بووە. تەنها ئەسەرێکی ڕۆژانی ساواییم دواتر، پێمەوە دیار بووبێ ئەوەیە کە گریانی بە کوڵ و لەتکەوەچوونی بەردەوام ناووک دەردەپەڕێنێ. هەر لە بیرمە کە منداڵ بووم حەسوودیم بەو هاوڕێیانەم دەبرد کە ناوکیان بە قووڵدا چوو بوو. لە کەسیشم نەدەگەیاند ئەو خەفەتە دەخۆم، یەکەم جاریشە ئەم ڕازە دەردەبڕم.

ساواییم نازپێدراو بوو[5] چونکە بە تاقانە حیساب دەکرام. وەک گوتم عەبدولموقتەدری براگەورەم لە یەکەم هاوسەری باوکم، شەپڕەدار بوو، بارێکی زێدە

---

5- ئەو نازپێدراوییە لە حورمەتی باوکمەوە وەهای کرد لە تەمەنی منداڵی دوای چوار ساڵیمدا بە درێژایی کژی سەرما هەمیشە لە ماڵمان سینی پەقلاوە هەبێت کە زۆرم حەز لێی دەکرد، ئەو پەقلاوەیە لە ماڵی جەمیلاغا و حەماغا و مەلا

قورسیش بوو بە سەر حاڵ و وەزعی باوکمەوە. من کە گەیشتمە تەمەنێک شتم بە بیر بمێنێ دەمدیت کاکە موقتەدیر بە خۆی و دەست و قاچی ڕاستەی ئیفلیجییەوە یەکێک بوو لە دانیشتووەکانی ڕۆژانەی مەجلیسی باوکم، قبووڵیشی نەدەکرد لە باوکم و جەمیلاغا و مامم بەو لاوە کەس لێی بە پێش بکەوێتەوە، ناوناوە قسەی سەختی بەوانە دەگوت لە ڕیزی پیاوماقووڵ و براگەورەکانی ئەوسا دادەندران، بەڵام کەس لێی بە دەنگ نەدەهات و خاڵەبەخش کرابوو. عادەتێکی بۆ خۆی ڕەوا کردبوو، کە دەهات لە غافڵی بە دەستە چەپەکەی ساخڵەمی عێشتێکی توندی لە پشتی ملی یەکێک دەدا، تا ئەگەر کابرا بە خێرایی نەیگوتبایە «عێشت» کاک موقتەدیر دەیگوت «بەسەری جەنابی بابم کەوتەوە سەرت» و بەڕەهایی دووبارەی دەکردەوە. ئەم پیشەیەی لەگەڵ دکتۆرێکی ئینگلیز لە خەستەخانەی کەرکووک بەکاری هێنابوو، دکتۆرەکە هیچی لێ نەکردبوو، بە ڕووشیدا نەداوە. وەها دەبوو قسەی بڕندەی دەپەڕاند، جارێکیان لە مەجلیسێکی باوکم، بە سەر مێرگی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدەوە، دەمەو عەسر، زوربەی پیاوماقووڵانی غەفووری و حەوێزی و توجاری ئەوسا بە خۆیان و دەستە و دایەرەیانەوە ئامادەی کۆڕی ئەو تەرزە دانیشتنە بوون. من منداڵ بووم و لەو ناوە دەخولامەوە و گوێم لە غەڵبەغەڵب دەبوو بێ ئەوەی بمەوێ بزانم چ دەڵێن. کاکە موقتەدیر لە باری هەرە سەرێ لە تەنیشت باوکمەوە دانیشتبوو. هەر هەندەم دیت لەنکاو باوکم زللەیەکی بە تینی لە کاکە موقتەدیر دا، ئەویش هاڕەیەکی لێ هەڵستا و کەوتە لنگەفرتێ. بەو زللەیە خوەکەی «صرع»ی عادەتی هاتێ و وەک بەرخی سەربڕاو بە لرخە و لەرزین و دەست و پێ خوار بوون و چاو سووڕان بووە نیوەمردوو. باوکم وەکوو پشکۆ ڕووی سوور هەڵگەڕابوو. من پێشتر نەمدیتبوو دەست لە کاکە موقتەدیر بوەشێنێ، ئەو ڕۆژە لەو تەمەنەی منداڵیمدا حەپەسام. ڕاستییەکەی خەڵقەکە هەمووی داهێزا و دامرکا. دوو دڵۆپ فرمێسک لە چاوی باوکم بوو سەرەژێر هات... دەستی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی

---

ئەحمەداغای سلێماناغا – وە بۆم دەهات ئەمما پەقلاوە نە قەشمەری. یەک جار تووشی ئەو پەقلاوەیە بوومەوە، ئەویش کە حاکم بووم لە سلێمانی، نیوەڕۆژەیەکمان لە ماڵی حاکم ئەنوەر یەکتا بەڕێ کرد. بێ زیاد و کەم، کە بەر لە بیست و ئەوەندە ساڵە بە منداڵی تامەزرۆییم پێی دەشکاند، هەمان بابەت بوو.

و چەند قسەیەکی کرد هەستم دەکرد قرچەی هەناوی باوکم بوو کزکز دەمتاوێنێتەوە. من نازانم قسەکان چی بوون بەڵام وەک بۆسۆی لێ هەڵستێ بەسفتوسۆ بوو، بایی ئەوەی هەندێک لە دانیشتوان چاویان تەڕ بوو. هەوەڵ، دوو براگەورەی هەرە سەرووی مەجلیسەکە دەستیان لە باوەشی کاکە موقتەدیر گرت تا چەند کەسێک چوون و ڕایانگوێست بۆ گۆشەیەکی مەجلیسەکە. دواتر بیستم کاکە موقتەدیر قسەیەکی زێدە گرانی ڕوو بە ڕووی یەکێک لە پیاوماقووڵانی مەجلیسەکە کردبوو، باوکیشم لەو زللەیە بەولاوە چارێکی نەدۆزیبۆوە شکستی پێ هەڵبەستێتەوە. لە زۆر باردا بە درێژایی ئەو تەمەنەی منداڵیم تا مردنی کاکە موقتەدیر تووشی باس و خواسی دێین.

وەک گوتم لەبەر تاقانەییم لە ساواییم و بەرەو دواتریش منداڵێکی نازپێدراو بووم. چاوەدێری و ئاگاداریی هەمیشەیی یاعیسمەت-یش پتر ئەو نازەی دەسەلماند. هەڵبەت ساڵانی یەکەم و دووەمی منداڵیم بە بیردا نایەتەوە، چی لەو دوو ساڵەی بیگێڕمەوە هی بیستنە. لەو دوو ساڵە ئینگلیزەکان حکوومەتیان لە ناوچەکەدا دانابوو، حەماغای غەفووری کرابوو بە قایمقام، جەمیلاغای حەوێزی بە یاریدەدەری، باوکم کرابوو بە قازی، کەسانی دیکەش هەریەکە بەپێی لوان وەزیفەی درابوویێ. بەپێی ئەو ڕۆژگارە حکوومەتەکەیان ڕێکوپێک بووە، لە جغری دەستەڵاتی قانوونیدا ئەو فەرمانبەرانە لە کاری خۆیاندا ئازاد بوون بێ ئەوەی ئینگلیزەکان دەست لە ئیشیان بدەن.

دوای مردنی حەماغا هەرای دەرکردنی ئینگلیزەکان و هێنانەوەی چەند هەیتە و جەندرمەی تورک و بۆمباردمانی ئەو ناوچەیە ڕووی دا. من لەو هەرا و مەزادە یەک تارماییم بە مێشکدا تێدەپەڕێ ئەویش گرمە و دیمەنی ئەو تەیارانەی بە سەر شارەکەدا دەچوون و دەهاتن و تەقە و گرمەی تفەنگ و بۆمبایان لەگەڵدا دەبوو. لەو بۆمباردمانەدا موستەعیدێکی باوکم و فەقێیەک لە مزگەوتی گەورە بەر ساچمەی بۆمبا کەوتن، موستەعیدەکە بریندار بوو، مەلا شێخ کەریمی سەید ئەحمەدی گردەشینە، دواتر بووە دانیشتووی ئۆمەراوای سەربە ناحیەی قوشتەپە، ئیستاش لە هەولێر بەسەر دەبات و ڕێزلێگیراو و ناسراوە، تا بشڵێی لە چاو تەمەنی لەسەرە خۆیە. لەو دوو سێ ساڵانەی دواییدا جارێکیان بە خزمەتی گەیشتمەوە لە هەولێر (ڕێکەوت وەها بوو دوێنێ شەو، 19/1/1985 سەید ئەحمەدی برازای و کوڕێکی

سەید ئەحمەد سەردانیان کردم و چەندوچۆنی هەندێ حاڵوباری مەلا شێخ کەریمم لەوانەوە زانیوە).

فەقێیەکە، بەداخەوە کوژرا، ناوی تاهیری کوێخا عەلی دۆڵە سزەیی بوو، لە ناحیەی قوشتەپە. مەلا شێخ کەریم بە تەڕدەستی بەرێ کرا بۆ هەڵەجەی شێخ مارفی شێخ کەریمی بەرزنجی، لەوێوەش خزمانی بردیانەوە بۆ دێی خۆی. یەک دوو ڕۆژ دوای دەست پێکردنی بۆمباردمان ماڵی ئێمە و ماڵی مامم و بەشێکی زۆری خزمان گوێزایانەوە بۆ دێی «پێبازۆک». دوای ئێمە بە یەک دوو ڕۆژ ئنجا باوکم هات بۆ پێبازۆک، نەساغ و تاداریش بوو. دوای بەسەرچوونی ئەو کارەساتە پێگیری کرد لە گەڕانەوە بۆ کۆیێ. ئەو لە بنەڕەتەوە زۆری پێ ناخۆش بوو شێواویی وەها بێلزووم و بێسەمەرە و پڕ لە ئازار بزێتەوە، بەڵام چەند کەسانێکی ئاشقەتورک و چەندێکی چاو لە دنیا بە ئومێدی خێر و خۆشیی دوای گۆڕانی حاڵوبار هەراکەیان بەرپا کرد و هیچی ئەوتۆش نەهاتە کیسەیانەوە بێ هەرا مومکین نەبێ... زۆری نەبرد ئەو برا گەورانەی بووبوونە هۆی هەراکە هاتنە لای باوکم و ڕوویان لێ نا بگەڕێتەوە بۆ کۆیێ، ئەویش ماڵم هەقە، پڕبەدڵ سەرشکێنی کردن و قسەی مزر نەما پێیان نەڵێ، بەڵام سەریان دانەواند و پتر پێیان داگرت لەسەر گەڕانەوەی بۆ کۆیێ6... ئیتر گەڕاینەوە.

هەرای ئەو ساڵە لە نووسیندا باسی هاتووە بەتایبەتی لە بەشی دووەمی کتێبەکەی تاهیر ئەحمەد حەویزی «مێژووی کۆیێ» تەمەنی من لەو هەرایە سێ ساڵی بووە. لەو شتانەوە کە خۆم بەبیرمدا دێن و لەوانەی بۆم گێڕدراوەتەوە، پێ دەچێ منداڵێک بووم لەوانەی هەستیان بە دەوروبەر و واتای چاک و بەد زوو دەکرێتەوە. جارێک

---

6- دەستخاوێنی لێم داوا دەکات شایەدییەک لە باوکمەوە بگێڕمەوە: دوای گەڕانەوەی ئینگلیزەکان، ڕۆژێک باوکم و جەمیلاغا لای حاکم سیاسی بوون، حاکم گوتبووی بڕیارمە تایەفەی غەفووری کە پشتیوانی تورکەکان بوون لە کۆیە دووربخرێنەوە. جەمیلاغا بەدەنگ دێت و دەڵێت: بەو پێیە دەبێ ئێمەی حەوێزیش ئاوارە بکرێین نەک هەر غەفووری چونکە هەردوو تایەفە دەمێکە لەنگەری شارەکەیان ڕاگرتووە، یەکێکیان بێ ئەوەی دیکە هەڵناکەن. بەمەدا ئینگلیزەکە وازی لە نیازەکەی هێنابوو.

له تەمەنێکدا بووم کە بۆ شوێنی مەیلەو دوور وەیا سەربان و ژێربان بە باوەش دەیانگێڕام، هەستم دەکرد بە شەرم لە گەلێک شتی ئەوتۆ هاوڕێکانم کۆمەیان لێ نەدەکرد. ببڕای ببڕای جلکی کچانەم لەبەر نەدەکرد، تەنانەت قوماشێکی نەختێک زەرقیلە بووایە نەمدەویست. لە بیرمە جارێکیان سەربەرگێکی مەخمەلی گوڵداریان بۆم دروست کردبوو، چەندێکی ویستیان لە بەری بکەم پێم داگرت لەسەر هەندێ کەوا هەتا گوڵە ئاوریشمییەکانی لێ هەڵنەقەنن لەبەری ناکەم. کەمەرچینێکی بە قەیتانی زیوڕەنگیان بۆ کردبووم، پێی ڕازی نەبووم، فرسەتیان وەرگرت لە تاریکایی حەمام کردیانە بەرم، بە باوەشی یاعیسمەتەوە بووم و سەرم داپۆشرا بوو. تا لە نزیک ماڵی خۆمان لە تیکێکەوە چاوم بەو قەیتانە کەوت، دامە داری نەعلەتی و ناچارم کردن بمبەنەوە بۆ حەمام و لەوێ کەمەرچینەکەم لە بەر داکەنن.

ئامۆزاکانم هەموویان مەلەوان بوون من نەبێ، هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەچوو کەوا بتوانم لەبەر چاوی خەڵق جلک دابکەنم، مەلەش بە جلکەوە ناکرێ. ئەو خۆگیرییە لەگەڵمدا ژییا تا ئەوەی کە چوومە پۆلی یەکەمی ناوەندیی هەولێر 1934 نەمسەلماند جلکی ڕیازە لەبەر بکەم. مدیرەکەمان مەرحووم خورشید سەعید کارگێڕێکی ڕژد بوو لە ئیشەکەی، سزای ئەو قوتابیانەی دەدان بێقانوونییان کردبێ، سزایەکەش ئەوە بوو پاشنیوەڕۆ لە مەکتەب دەیهێڵاینەوە و بە غار پێکردن و بازدان و «امتد انهض» کەنفتی دەکردین، ئیتر بە درێژای ساڵی یەکەمم هەموو هەفتەیەک، ڕۆژی ڕیازە منی تێدا سزا دەدرام و بە جلکی عادەتیم ئەو عەزابەم دەچێشت. لە بەرەو کۆتایی ساڵ موفەتیشی خوالێخۆشبووی «سالم مامۆ» هاتە هەولێر. مەلا ئەفەندی، کە من لە ماڵی ئەو - دێی باداوە- دەژیام، داوەتێکی نانی ئێوارەی کرد بۆ ئەو و خورشید سەعید. کە هاتن و بەخێر هێندران ویستم من بەجێیان بهێڵم، خورشید سەعید نەیهێشت بڕۆم... لە قساندا بە چاکە باسی کردم بۆ مەلا ئەفەندی بەڵام گوتی عەیبێکی هەیە حەز لە ڕیازە ناکات. سالم مامۆ ڕووی تێ کردم و گوتی چۆن ڕیازە ناکەیت، دەزانیت «العقل السليم في الجسم السليم؟» پێم گوتەوە، ئەگەر لێم بگەڕێن من بەوەندە عەقڵەی هەمە ڕازیم... خوا لە هەموان خۆش بێ، نەیاندەزانی چییە لە ڕیازەم دەگێڕێتەوە.

بچمەوە بۆ منداڵیم، هەر چەندە بە ناچاری، داخوازیی گێڕانەوەی گەلێک سەروبەری ئەو شتانەی لە منداڵیدا پێیانەوە خەریک بووم لە منداڵیمەوە دەمهێنێ بۆ ساڵانی

دواتر دەنا مومکین نییە خوێنەر لێم تێبگات ئەگەر باسی ئەسەری عومری 4 ساڵیم هەڵگرم بۆ عومری پازدە ساڵیم کە لە وێدا بەدەری داوەتەوە...

یاعیسمەت بە درێژایی تەمەنی ساواییم قەڵغانم بوو، چی لە توانای دایانێک بێ بۆ پاراستنی شیرمژەکەی بۆ منی دەکرد. بەڵام منداڵی پێڕەوکە زەوت ناکرێ... لە وتووێژی گاڵتەئامێزدا گوتوومە، منداڵ کە کەوتە گاگۆڵە دەبێ بەو کەروێشکەی پێی دەڵێن «سەپسێنکە»، واتە دەگاتە عومرێک سەگ نایگاتێ و لێشی بێئومێد نابێ ئیتر پێوەی دەپسێ، منداڵیش بە گاگۆڵە بۆ هەموو پەنا و پەسێوێک دەچێت و ماندووش نابێ، ئەوەی ئاگاداریشی دەکات پێوەی فل دەبێ، خۆ کە بوو بە پێڕەوکە هەر مەپرسە، منیش بە پێڕەوکەیی زۆر کەسم بە خۆمەوە ماندوو کردووە، هەمیشە یەکێکم بە دواوە بووە، بە زۆری، لچکی کۆچکمی گرتووە و لە گەڵمدا بەوێ بەوێدا ڕای کردووە، بەو حاڵەش زۆر جاران دەمەو ڕوو دەکەوتم و ناوچەوانم هەڵدەترۆقا.

جارێکیان لە کەوتنمدا خوێن کوفارەی بەست لە لووتمەوە... بە دوا گریانمدا باوکم هات، لە بیریشمە یاعیسمەت بە پەلە و بە شێواوی و بێفایدە خۆڵی بە خوێنەکدا دەکرد بەڵکوو کمێکی لێ دەشارێتەوە و لە پەرۆشی باوکم کەم دەکاتەوە. ئەو کەوتنەم تا ماوەیەک کاری لە هەناسەم کرد چونکە لووتم دەگیرا، لە سەرمادا بە کرێم نەبایە نەدەکرایەوە.

## چنارۆک و من7

وەک گوتم من یەکەم هەناسەم لە چنارۆک هەڵێنا، ساڵەهای ساڵی دوورودرێژ، هاوینان، لە چنارۆکم بەسەر بردووە و شوێن قامکی لە دارشتنی قاڵبی ماددی و مەعنەویم هەیە. لە بناری ڕیزە شاخی هەیبەسوڵتان، بە دیوی ڕۆژهەڵاتدا، لەو شوێنەی کە شاخەکە لە کۆیەوە نزیکە، دوو جێگە هەن پێیان دەڵێن «چنارۆک»،

---

7- چەند لاپەڕەیەک پێشتر ڕوونم کردۆتەوە زادگای من کۆیە بووە نەک چنارۆک.

یەکیان لە باشوورەوە هەڵکەوتووە پێی دەڵێن «چنارۆکی بڵباسان». ئەمەیان ئاوەدان نییە قەتیش ڕێک نەکەوت بە دیتن ببینم. لەلایەن ڕەسمییشەوە دەکەوێتە سنووری قەزای ڕانیە هەر چەند دوورایی حدوودی لای سەری شاخی ئەو شوێنە تاکۆیێ 40-50 دەقیقە دەبێ بە پێیان کەچی 6-7 سەعاتە ڕێ لە ڕانیەوە دوورە. تومەز بە بۆنەی ئەوەی عەشیرەتی بڵباس هەمووی دەکەوێتە سنووری ڕانیە، ئەم چنارۆکەش بە جۆرێک لە جۆران دەستەڵاتی بڵباسی بە سەردا ڕاگەیشتووە خراوەتە سەر قەزای ڕانیە.

بە تەنیشت لای باشووری ئەم چنارۆکەوە، «چنارۆکی مەلایان» هەیە کە بە ئاو و باغ و ڕەزەوە هاوینان سێ هۆبە ماڵی لە خاوەن ڕەزان لێ پەیدا دەبێ: لە لای باکوورەوە هۆبەی سوولی خاڵەباس، لە ناوەڕاستدا هۆبەی دوو ماڵەی حاجی عەوڵای ساڵح و مام ئەمین، بەولاتریشەوە هۆبەی مەلایان یان هۆبەی سوولی پاشا، کە من لەمەیاندا دەژیام. بە هۆی جەلیزادانەوە چنارۆک پێی گوتراوە چنارۆکی مەلایان و هۆبەکەشیان هۆبەی مەلایان.

لە بیرەوەریی هەرە کۆنی ڕۆژانی هاوینمان لە چنارۆک دووانم دێنەوە بیر، یەکەمیان ئەوەبوو، ڕۆژێکیان ماڵی ئێمە و ماڵی مامم بە خاو و خێزانەوە، جگە لە باوکم و مامم کە لە کۆیێ بوون چووین بۆ شوێنێکی لە دامەن ڕەزەکانی چنارۆک پێی دەڵێن چۆمی مەلەک ڕحان (ڕێحان) شوێنێکی بە ئاو و داروبار و سێبەرە لە چاوانیش بزرە، ڕێبوار نایبینێ. کەرەستە و ئەسبابی خواردن و حەسانەوەمان پێ بوو. قەول بوو بۆ نیوەڕۆ گیپە لێ بنێین. لە هەرەتی ئەو کەیف و زەوقە هەورێکی هێنا و دایە بریسکوهۆر و گرمەوزرمە تا کاتێک وەک کوندەی سەرەو ژێر بارانی هەڵڕژاند. یاعیسمەت بێ سێودوو لێکردن و بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەی کەس منی لە کۆڵی خۆی توند کرد و سەرپۆشێکی ئەستووری پێدا دام و کوتای بەرەو کەپری ماڵمان لە بەرەو لای دامەنی چیای چنارۆک. مەودای چۆمەکە و کەپری ماڵەوەش بەرەو هەوراز بوو، بۆ ئافرەتی منداڵ بە کۆڵ بیست دەقیقەیەکی دەخایاند. دوای ئێمە لافاو لە تەنگژەی چەمەکەدا مەنجەڵی گیپەی ڕاماڵ دابوو، با و تۆفیش هەر بزگوڕەی لە پەنایەک پەستا بوو.

خولاسە سەیرانەکەمان بوو بە خۆ حەشاردان و پەلەقاژە و پێکەنینی تێکەڵ بە مشەوەشی، لە هەموانیش زەرەرکردووتر یاعیسمەت بوو، چاکتر بۆ خۆی ئەوە بوو

هەر لەو چەمە پەنام بدات نەک لەو ڕێگە بێنوایە ببێتە بووکەبارانە، تا گەیشتینە کەپرانیش باران بەسەر چوو. زۆر جاران ئەو ڕووداوە باس دەکرا و دەبووە هۆی پێکەنین و فشە و گاڵتە. سەغڵەتیی وەها دوای بەسەرچوونی شیرن دەبێ. ئەو ڕۆژە پاش بارانەکە چەند کەسێک لە کۆیەوە هاتن، باوکم ناردنی بە هاوارمانەوە چونکە لە کۆیەش باش باریبوو، دڵی پێمانەوە بوو. لەوانە یەکیان گەڕایەوە بۆ کۆیێ هەتا خەبەری سەلامەتیمان بەوێ ڕابگەیەنێ. خەڵق لە جاری وەهادا حیساب بۆ بروسکە پتر دەکا تا عەینی بارانەکە.

ڕووداوی دوەم ئەوە بوو، لە هاوینێکی دیکەدا کە هێشتان هەر منداڵ بووم ئاگر لە ڕەزێکمان «باریکە» ناو، بەر بوو. ئاوایی چنارۆک و «کانیکەند» ی دامەن چنارۆک هەمووی جمی بۆ ئاگربڕی. ئافرەتان کوندە بە سەرشارن و کوڵەوە، پیاویش لکەتەڕاش بە دەستەوە... بۆ بەرچاوی ئەوسام تێک هاویشتنێکی لە عادەت بەدەر بوو. کوێخای دێیەکی جەلیزادان لە قەزای ڕانیە «گەلی گوڵان» کە مەشوور بوو بە مەحموودی قاوەخۆر لێمان مێوان بوو. ئەو بە دەستووری ئاگربڕی کە لە پووشەنی شوێنی وەک بیتوێن دەکرێ سواری وڵاغەکەی بوو و کەوتە تەراتێنە لە بەرایی ئاگرەکە بۆ ئەوەی کۆڵانە بیەخێتە پووشەکەوە و ئاگری لێ نەپەڕێتەوە. ئەگەر ئاگر لە پووشەنی نغورد بەربێتەوە تاکە سوارە کەڵکی نابێ، خۆ ئەگەر بای لەگەڵدا بێ زۆر جاران سواریشی لێ دەرناچێ و ناچار دەبێت ڕووەو ئاگر بە غار بۆ دیوی سووتەن خۆ هەڵکوتێ. ئەو ڕۆژە کوێخا مەحموود تاکە قارەمانی سەر شانۆی ڕەزی ئاگر تێبەربووی بوو.

لە تاک تاکی خەڵقی ئەوێ ڕۆژی تەنها ئەو کوێخا مەحموودەم بە بیردا دێتەوە ئەوانی دیکە کۆمەڵە خەڵقێکی تێک هاویشتوو بوون. لە تێکڕای چەشمەندازیش بڵێسەی ڕێزی ئاگر و کوڵەکەی دووکەڵم دێتەوە بەر چاو. دێی «گەلی گوڵان» کە ئەوسا ئاوەدان بوو نزیکی سەعات و نیوێک لە چنارۆک دوورە و سەربە قەزای ڕانیەیە. کە ماڵمان دەچوە چنارۆک ئەو ئاواییانەی کە بە مڵکایەتی هی جەلیزادان بوون وەیا لێمانەوە نزیک بوون سەردانیان دەکردین، لە پێداویستیی کا و جۆش بۆ وڵاغان یارمەتییان دەداین.

چنارۆک هاوینە هەوارێکی مەیلەو فێنکە، بە هۆی نزیکیشی لە کۆیەوە بۆ لێ دانیشتن لە بارترە تا شوێنی دیکە. جگە لەمە چونکە ڕێی کاروانی نێوان کۆیە و

هەرێمی ڕانیە و قەڵادزە تا دەگاتە سەردەشت و دیوی کوردستانی ئێران بە چنارۆکدا تێدەپەڕێ هەمیشە هەستی ئاوەدانیی لێ دەکرێ نەک چۆڵی. یەک لەو شتە خۆشانەی دڵی منداڵی پێ دەکرایەوە، گەورەش تێوەی ڕادەمان، هاتوچۆی بێپسانەوەی ئەو کاروانانە بوو کەوا، ژووڕا و ژێڕا، بەرەو کۆیە و بەرەو بیتوێن و پژدەر وەکوو ڕچەی مێروو بە یەکدیدا تێدەپەڕین. ناوناوە قەتاری ئێستر و بارگیری توجارەکان بەو زەنگوڵە زلانەی ملیانەوە، بەتایبەتی قوڕادەی ملی ئێستری پێشەنگ سەرنجی هەموو بیسەر و بینەرێکی ڕادەکێشا بەتایبەتی منداڵەکان کە بە زۆری دەچوونە سەر ڕێی ئەو قەتارانە و بە دیمەنی وڵاغە تێروتەسەل و قەڵەو و زەنگۆڵەدارەکان دەگەشانەوە.

قەتارچییەکان بۆ بەر چاوی منداڵی کەم تەجرەبە وەک بەچکە قارەمانی ناو حیکایەتان خۆیان دەنواند. ئەوانیش بە دیار خەڵقی هۆبەی نزیک ڕێگاوە تین و تاقەتێکی زیادیان پێوە دیار دەبوو، دەنگدانی وڵاغەکانیشیان دلێرانەتر دەبوو لەوەی بە چوڵستاندا لە بەر گوێی کەس دەنگ نەداتەوە. لە ناویاندا هی وەهام دەدیت پێشتر لە ماڵی ئێمە وڵاغی لێ دەخوڕی، ئەوانە بە کزە و سۆزەوە بۆم دەهاتن، منیش پێیانەوە دەگەشامەوە. ئەوەی میسری پێی دەڵێن «عیش وملح» و لە کوردیدا «نان و نمەک» ی پێ دەگوترێ ئەگەر بە دەرسدان دزێو نەکرێ کاری دۆستانە دەکات.

ماڵی ئێمە لە چەند ڕۆژێکی دوایینی کژی چنارۆک سەروکارێکی دەبوو لەگەڵ ئەو قەتارە زرینگەدارانە، منیش لە خەیاڵی منداڵیمەوە هەستێکی بایی بوونم لە خۆمدا شک دەبرد کە دەمدیت بۆ گوێزانەوەی داری سووتەمەنیمان کە بەدرێژایی هاوین کەردار یان ئێسترداری خۆمان گیشەیان کردبوو لەبەردەم و بەدەوری کەپر و ساباتمانەوە، ئەو قەتارانەی سەربە ماڵی حاجی کاکەمین و حاجی جەلال و هی تریش بوون لە کۆیەوە بەتایبەتی دەهاتن بۆ ماڵمان بە هاتوبات و دەنگ و بانگی زۆرەوە وڵاغەکان دادەکران و قەتارچییەکان دادەمەزران و جگەرەیان بۆ پێ دەکرا و خواردەمەنی و مێوە و چایەیان بۆ دادەنرا و دوای لێ بوونەوە لە بەریان هەڵدەگیرا ئیتر ئەوان و پیاو و ئافرەتی ماڵی خۆمان و هەندێکی دیکە لە هۆبەکەش تێکڕایان دەکەوێنە بارەدار هەڵبەستن و ئێستر گرتن و بار لێ نان تا هەموو وڵاغەکانی ئەوان و هی خۆشمان بار دەکران و بە ئاهەنگی زەنگوڵەی قوڕادەوە بەڕێ دەکەوتن بەرەو کۆیێ. ئەم هاتوباتە زیاتر هەر بۆ ماڵی ئێمە لەبەر حورمەتی باوکم دەکرا چونکە

قەتاری توجارەکان لەو ڕۆژگارانەدا بە دائیمی لە هاتوچۆی نەقڵی تووتن و کوتاڵ بوون، پێیان نەدەکرا لە ڕۆژێک زیاتر کەسبەکەیان بوەستێنن. جگە لەمە، پێوەندیمان بەو ماڵانەوە لە پلەی تایبەتیدا بوو. ڕاستییەکەی ئەو جۆرە ڕیشاڵەی دۆستایەتی کە خەڵقی بەیەکەوە دەبەستەوە بژێوی دەدا بە لایەنی خۆشی و لەباریی ژیان و بەسەربردنەوە.

بەسەر کردنەوەی دۆستی نزیک و جیرانی ئاشنا و ناسیاوی دەستەنک لە کۆیێ بە هۆی ترێ و هەنجیری چنارۆک یەکێک بوو لەو مەشغەلەتانەی دەبوو هەموو ساڵێک حیسابی بۆ بکرێ. لە منداڵیمدا لایەنی میوەی دیاری بەڕێ کردن بۆ کۆیێ تەنها دەبووە هۆی سەیر کردنی ئەو کەسانەی خەریک دەبوون تلیان و پێتەرازوو داگرن و بە شانان بیانهێننەوە بەرەو هەوراز بۆ شوێنێک لە پشت کەپرمان ڕێزیان بکەن بۆ ئەوەی بەیانی زوو بە پشتی وڵاغ بۆ کۆیەیان بنێرن. سبەینان تا من لە خەو هەڵدەستام دەمدیت شوێنی ئەو دەسقەرتالە و ڕیزی پێتەرازووان لە پشت کەپر چۆڵ بووە. کە گەورەتر بووم زانیم بەشی هەرە زۆری ترێ و هەنجیری ڕەز و باغەکانمان دەبوو بە دیاری بۆ کەس و دۆست، گەلێک ساڵیش ئەوەندە مێوەیەی لایق بە دیاری بێ، لە باغەکان وەگیر نەدەکەوت بەشی خواردنی خۆمان و مێوان و دیارییەکان بکات، ئیتر بایی پێویست بۆ گرتنی کەلێنی ئەو تێهەڵنەهاتنە میوەی نایابمان دەکڕی. هەر لە گەوەرەییشمدا زانیم سووتەمەنیی ماڵی ئێمە لە دار و چیلکەی هاوینی چنارۆک کە خەڵق وای ڕادەنواند بە خۆڕایی چنگ کەوتووە، لە ڕاستیدا ساڵانە مەسرەفی خێزانێکی پێنج شەش نەفەری دەویست. بەڵێ ڕاستە بە درێژایی ساڵ کەردارێکمان سێ گوێدرێژی دەبرد بۆ شاخ و هەر نەبایە لەو سێ وڵاغە دووی بار دەکران لە دار، ئەوەندەی لە چنارۆکیش باینایە ڕۆژانە سێ بارەداری دەهێنایەوە ماڵەوە و ئەو هەموو چیلکە و چاری سێ کەپری لەسەر نوستن و ساباتێکی مێوان و کەپرێکی مەتبەخیش بە گردیی دەهاتنەوە بۆ ماڵەکەمان لە کۆیێ جگە لەو کاروانەدارانە بە دیاری لە دێی ناسیاوەوە بۆمان دەهات و بەمەدا دار و چیلکە وەها کەڵەکەی دەکرد کە هەتا لە مشە بسووتابایە دەگەیشتەوە چیلکە و داری ساڵی دواتر، واتە تەڕ و وشک تێکیان دەکردەوە، بەڵام بێگومان ئەگەر بە مەسرەفی سێ وڵاغە و بە مانگانە و جلک و بەرگ و خواردن و جەژنانەی کەردارەکەوە دار و چیلکەمان کڕیبایە پتر پێ دەهات، ساڵێکی جۆ نەختێک نرخی

هەڵکشابایە ئەو مەسرەفە لە سەد دیناری ئەوسای تێدەپەڕاند کە نرخی بارەدار لە سەد فلس کەمتر بوو. لە وردە حیسابدا دەبێ ئەوەش تێبخوێندرێتەوە کە ئەو کاروانەدارەی بە دۆستایەتی لە لادێوە بۆمان دەهات ئەویش ئەرکی داکردنی وڵاغەکان و خزمەتی خاوەنەکانیان و ڕاپەڕاندنی ئیشی حکوومەتیان، کە هەبووبێ، لە ئێمەی داوا دەکردەوە هەر چەند کەسیش لەو دۆستانە بەو نیازەوە سەریان لێ نەدابێتین.

لە موناسەبەی سووتەمەنییەوە قسەیەکی باوکم بە بیردا دێتەوە کە لە بارەی وەزعی زستانی بەفرە ئەستوورەی ساڵی 1910 ی دەگێڕایەوە، کە بەفرەکە خۆی نواند و ڕێی هاتوچۆی چیای بەست و ئومێد نەما سووتەمەنی تازە لە چیاوە بێتە جێی ئەوەی لە شاری دەسووتێندرێ باوکم کۆنترۆڵی خستبووە سەر دار و چیلکەیەکی لە ماڵماندا هەبووە و بۆ هەر شتە لە میعاددا بە کێشانە و پێوانە دەست بۆ دار و چیلکە دەبردرا. دەیگوت، خەڵقی دیکەش دەیانگوت، تەنگەتاویی سەرمای ئەو ساڵە وەهای کرد خەڵق چاوەخانوو هەڵوەشێنن و دار و چیلکە و چرووی ساپیتەی (ساپیتە: بنمیچ) بکەن بە سووتەمەنی، دەیگوت کە ناوناو چەند بڕکە دارێکم بە دیاری بۆ یەکێک دەنارد کاری بەرخێکی ساڵی عادەتی دەکرد.

چنارۆک هەر لە منداڵیمەوە – تا ئەو دەمەی لە پەنجاکاندا باری جۆری ژیان و گوزەران منی بە کۆیە بەستەوە و لە هاوینەی چنارۆکی دابڕیم – کار تێکردنێکی ماددی و ناماددیی لە مندا هەبوو. کە من بەند بووم بە کۆیەوە دایکم بە خۆی و ماڵی فەتحییەوە دەچوو بۆ چنارۆک و بە درێژایی هاوین خزمەتی ڕەز و باغەکان و دانانی گیشەی دار و کێشەی میوە بۆ شار لە کاردا دەبوون، منیش ناوناوە سەردانم دەکرد و هەندێ جار لەگەڵ برادەران چەند شەوێکان لەوێمان بەسەر دەبرد.

لەلایەن کار تێکردنی ناماددییەوە قسە درێژخایێنە، لێی کورت دەکەمەوە. ئەم هاوینەهەوارە بیرخەرەوەی باوک و باپیر و ئەو خزم و دۆستانەیە کە پێوەندییان بە چنارۆکەوە بووە و باس و خواسیان لە زۆر ڕووەوە دڵ و مێشکی بە خۆیەوە خەریک کردووە. بۆ یەکێکی وەکوو من کەوا زۆروکەم، ئاوڕ لە ڕابوردوو بدەمەوە چارم ناچارە دەبێ بەدەم خەیاڵەوە بنیشم و بچمەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی کە باپیرم لە

گەنجایەتیدا بە ڕەفاقەتی حاجی قادر سەری لە چنارۆک داوە و لێی ڕابوردووە و خوێندوویەتی و دەرسی گوتۆتەوە.8

لە تەختایی ژێر شاخەکەی سوولی پاشادا تاتەبەردێک هەبوو مەشوور بوو کە جێی لێ دانیشتنی باپیرم بووە، لە دوای ئەویش هی باوکم یان ئەو کەسەی لە مەجلیسی ئەو شوێنەدا براگەورەیی پێ بەخشرابێ. بە عادەت مێوانێکی لێ وەشابایەوە – بەتەمەن و بە لێهاتوویی – لەگەڵ باوکم لە سەر تاتەبەردەکە دادەنیشت. من دیتوومە جەمیلاغای حەوێزی و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و ساڵح زەکی بەگی ساحێبقران لەگەڵی دانیشتوون. پیاوماقووڵی دیکەم دیتوون لە سەر تەکلیفی باوکم بۆ ماوەیەک لە تەنیشتی دانیشتوون، دواتر بە تێبینیی تەمەنی جەحێڵییانەوە، لە خۆوە، دابەزیون بۆ سەر سەکۆیەک کە بە تەنیشت تاتەبەردەکەوە و کەمێک لەو نزمتر بوو.

چنارۆک لە ڕووی بیرخستنەوەی بۆ زەمانی دێرینتر دەڕوا، عوسمان پاشایەکی بابان دەیکاتە نیشتەمەنی خۆی و بەینێک لێی دەمێنێتەوە بە سەرپێچی لە حکوومەتی عوسمانلی. زوربەی ناوی شوێنە بەرچاوەکانی ئێستای چنارۆک لە عوسمان پاشاوە بە جێ ماوە. «سوولی پاشا» جێی مەجلیسی هاوینەی بووە. بەولاوەترەوە لە سووڕی گردێکەوە کانییەکی سارد و سازگار هەیە پێی دەڵێن «کانی خاتوون» شوێنی هاوینەی خێزانی بووە، بەولای هۆبە دوو ماڵییەکەی حاجی عەولای ساڵح و مام ئەمینەوە چێگەیەک هەیە بە «سوولی پیرەژن» مەشوورە، یەکێک لە ئافرەتانی سەربە حەرەمیەوە لێی بووە، دەشگوترێ دایکی پاشا بووە. «سوولی خاڵەباس»

---

8- حاجی قادر لەو نامەیەی بۆ باپیرمی ناردووە بەیتێکی یادی چنارۆکی تێدایە دەڵێ:

لە خۆم ئاگر هەڵێنم وەک چنارۆک
لە چاوم گریە دەربێ وەک حەمامۆک

ئاگر هەڵێنانەکە لەو ڕووەوەیە کە وشەی «چنارۆک» وشەی «نار»ی تێدایە ئیتر حاجیش حەقیەتی لە دەروونی «وەک چنارۆک» ئاگر هەڵێنێت. قسەیەکیش لە کۆنەوە گوتراوە گۆیا کە چنار زۆر پیر بوو لە خۆوە ئاگر هەڵدێنێت.

هاوینگەی پیاوماقووڵ وەیا وەزیری پاشا بووە... لە هۆبەی «سوولی پاشا» دارتوویێک هەبوو لە دامەنی لێژگەی شاخ پێی دەگوترا «تووی مەیدان»، هەڵبەت تووەکە دواتر چاندراوە بەڵام گۆڕاییەکە شوێنی ڕمبازی و وڵاغ تەعلیمدان بووە لە ڕۆژگاری عوسمان پاشادا.

لەو مەیدانەدا هەڵکشێیت بەرەو چیا جێگەیەکی مەیلەو بەرز هەیە پێی دەڵێن «قەڵات» بە سەر مەیدانەکەدا دەنۆڕێ و ئێستا ڕێی ئۆتۆمۆبیل لە ژێریەوە ڕەت دەبێ ئەوسا جێی بورج و بارووی قایمەکاری و نیشنگەی زستانی بووە بەڵام چ ئاستەواری بەرچاوی لێ نەماوەتەوە، کەسیش خەریک نەبووە بزانێ شوورە و دیواری لە کوێوە بۆ کوێ بووە. لە لای سەرووی چیاوە بەردێکی پان و ڕێک هەیە (دەبێ تەشوێ تەراش کرابێ) پێی دەڵێن «بەردی زوڕنا ئەنگێو» وەختی خۆی بۆ تەڕدەماخی و خۆنواندن، چاوەشان، دۆڵ و زوڕنایان لەسەر بەردەکە لێداوە.

جگە لەم ناوانە دوو ئەسەری مادديش لە شوێنەواری عوسمان پاشا دۆزرایەوە، یەکەمیان لە ڕۆژگاری باپیرمدا جارێکیان کابرایەکی مەرگەیی بۆ مەسەلەی تەڵاق دێتە چنارۆک بۆ لای باپیرم. ئەوسا ئاوی تاڤگە بچووکەکەی «سوولی پاشا» بە بڵاوی تنۆکە تنۆکە بە هەموو شاخەکەدا بڵاو دەبۆوە و جێگەی حەسانەوەشی لە سێبەری ئەو شاخەدا ناڕەحەت دەکرد، بەسەر شاخەکەوە لەناو زەل و زوول و دڕک و قامیشەڵێندا ئاوێک دەردەقوڵی و بە ناڕێکی و بێجۆگە ڕێی دەردەکرد بەرەوژێر بۆ بن سوول. باپیرم لە کابرا دەپرسێ ئاخۆ چۆنە لەگەڵ شاخەوانی، ئەویش دەڵێ باشی لێ دەزانم، باپیرم پێی دەڵێتەوە ئەگەر ئەو ئاوەم بۆ گرد بکەیتەوە سەریەک و وەک پلووسک لە سەری شاخەکەوە بۆ خوارێ هەڵڕێژیت تەڵاقەکەت هەڵدەبەستریتەوە دەنا نا... کابرا بە ئاسانی ئەو کارە دەکات و ئاوەکە گرد دەکاتەوە لە شوێنێکی ئەوتۆ بکەوێتە ناوەندی شاخەکە سەرەوژێری دەکاتەوە بۆ بنی. کە ئاوەکە گرد دەبێ وەک پلووسک، خەڵقەکە دەست دەدەنە حەوز لێ دان. هێندە نابا دوو ڕیزە فەرشی کۆنی یەک لە یەک بڵندتر کەوا بێگومان هی ڕۆژگاری عوسمان پاشا بووە دەردەکەوێ. ئەوسا تاقە بەردی فەرشەکان بە زۆری لە شوێنی خۆیان مابوونەوە، هەندێکی بۆ ڕۆژگاری ئێمەش بە ڕێکی ڕیزیان بەستبوو.

ئەسەری دوەم ئەوە بوو، لە سەردەمی باوکمدا کە من خۆشم جحێڵۆکە بووبووم بەڕێکەوت لە دەمی پێمەڕە کردندا ڕیزی کونجەئاو دۆزرایەوە کە کاتی خۆی لە

کانی خاتوونەوە ڕاکێشراوە بەرەو ئەو شوێنەی پێی دەڵێن قەڵات. دیارە لە سەردەمی عوسمان پاشادا بۆڕی مەعدەن نەبووە، بەو کونجە تێک هەڵکێشانە ئاویان لە ژێر خاکەوە ڕاکێشاوە بۆ شوێنی پێویست. ئاوی ژێر خاک نە زستانان دەیبەستێ نە هاوینانیش گەرم دەبێ، لە کونجیشدا یەک دڵۆپ کەم ناکا. لە کۆیێ ڕاکێشانی ئاو بە هۆی کونجەوە باو بوو تا دەمی مەشرووعی ئاو دامەزرا. بەداخەوە نموونە لەو کونجانەی چنارۆکی سەردەمی عوسمان پاشا هەڵنەگیرا، بەڵام ڕەنگە تا ئێستا کونجی دیکە لە ژێر خاک مابێتەوە چونکە کەس خەریک نەبووە دەریان بهێنێ، ڕەنگە ئەم ئەرکە یەخەی مامۆستا «عبدالرقیب یوسف» بگرێ.

ئەو عوسمان پاشایە بەپێی خەبەراتی دەماودەم و کەمتاکورتێکی لە سەری نووسرابێ دوای تەنگەتاوبوونی لەلایەن عوسمانلیانەوە گوێزاوەتیەوە بۆ شاخی ئاوەگرد کە درێژەی شاخی سەفینە بەرەو کۆتایی لای کۆییەوە. ئاوەگرد بەو مەودایەی شاخەکە دەڵێن کە «سناو» و «جەلی» و دەرماناوی «حەمام جەلی» دەکەونە دامەنی لای ڕۆژهەڵاتیەوە. دوو لووتکەی لەوانی دیکەی بەرزتر هەیە، هی لای باکووری پێی دەڵێن «مۆزێک» و نەختێک پانوپۆڕە. لووتکەی دوەمی بەلای جنووبەوە پێی دەڵێن «قۆپی بیران» و لای سەرووی باریکترە لە سەرووی مۆزێک و ڕەنگە بە چەند مەترێکیش لەو بڵندتر بێ. بەرزاییان لە دەوری 1470 مەتردایە. عوسمان پاشای بابان (لەبەشی یەکەمی ئەم گەشتە خەبەرێکی لێ گێڕدراوەتەوە) لە «قۆپی بیران» دادەمەزرێ. ئەوانەی چوونەتە سەرووی لووتکەکە دەڵێن 11 بیری لێ هەڵکەندراوە بە زۆریش لە بەردی ڕەق بۆ عەمبار کردنی ئاوی باران و بەفری زستان. دەڵێن لە نزیک سەرووی شاخەکەوە کارێزێک سەرەژێر دەبێتەوە بۆ لای دامەنی، بەر لە کوێربوونەوەی زەلامی تێدا ڕۆیشتووە، گۆیا عوسمان پاشا لەم کارێزەوە ئازووقە و خۆراکی بۆ چووە تاکوو بەدکاران خەبەری کارێزەکە دەگەیەننە حکوومەتی عوسمانلی ئیتر کە ئەو ڕێگەیەی لێ گیرا ناچاری خۆ بەدەستەوەدان بووە. خۆم ئەو شوێنەم نەدیتووە، چی لێرەشدا باسم کرد لە خزمانی جەلی، بەتایبەتی فەقێ برایمی کوڕی ئامۆزا محەمەدی جەلی کە ئەویش ڕیشەی نەسەبی دەچێتەوە بۆ مەلا عەبدوڵای کاکی جەلی، بیستوومە. ئەو حیکایەتە بە سەر زاری خزمی جەلیزادەی کۆیەشەوە بوو، کە منداڵ بووم گوێم بۆ شل دەکرد بەتایبەتی چونکە سەرەتاکەی لە

چنارۆکەوە دەست پێ دەکات. بۆ بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە کاریزەکە و بیرەکان هی ڕۆژگاری عوسمان پاشا بن تۆژینەوەی شارەزایانەی دەوێ.

چنارۆک شوێنێکە تێکەڵ بە خەون و خوولیام بووە، بە درێژایی سەرووی شاخەکە لەو مەودایەوە کە بەر چنارۆک دەکەوێ، تا ئەو ڕێچکۆڵانەی لە کەمەری شاخەکە پیادە و کەردار و دەعبای پێدا دەڕوا، تا کەپر و ساباتی فەقێیان لە بن شاخی سوولی پاشا و بە سەر قەپۆزی گردی نێوان سوول و کانی خاتوونەوە، تا باغەکانی و ڕەزەکانی و کانیەکانی و هۆبەکانی و مەزراکانی، تا گەلێک لە تەڕاش و دەوەنی بن تاشەبەردی بە سێبەری هەمووی مۆڵگەی خەیاڵی منداڵی و خەونی فەراقەیی و ئاواتی گەنجایەتیمن. زۆر لە درەختەکانی دۆستمن. بەڕاستی دۆستمن- کە دەیانگەمێ لەگەڵیان دەدوێم. جارەها و بارەها و ساڵەها لە خزمەت باوکمدا لەگەڵ هەرەوەزی ڕەزەوانەکانی کۆیێ دەچووین بۆ پێمەڕە کردنی باغچە ئاوییەکانمان، لەو ڕۆژی ڕوون و بێگەردی بەهاردا بە دیار دیمەنی ئەو دەشتودەرە سەوز و سازگارە و هەڵەت و پەڵەتی هەمەڕەنگی ڕوو لە بیتوێنی تەخت و ڕیزە شاخە گەردنکێلە بەفراویەکان و قەندیلی سەرکەش و بێپەڵە... دەربەند و پژدەر... شاخ لە دوا شاخی خۆشناوەتی... کۆسرەتی لای ڕاست و ئاوەگردی لای چەپ...

نرکەی پێمەڕەدارەکان و ڕەش هەڵگەڕانی خاکی کێڵراو و کرپەی ئاگری چایە و هاتوباتی حازر کردنی ژەمی نیوەڕۆ بە نانی تیری و هێلکە و تەڕەپیاز و ماست و پەنیر و قەیماغییەوە بەڕاستی «عیشی بود ان نه حد هر سلطانی» - خیام - (ژیانێکە دەست هەموو سوڵتانێک ناکەوێ). خاوەن ڕەزەکانی کۆیێ و ئەوانەی ڕەزیان بە زەمان دەگرت لە بەهاردا بە دوو وەجبە، هەر جارەی دەوری بیست پێمەڕەیەک، سبەینە زوو لەگەڵ باوکمدا دەچووم بۆ چنارۆک و بەو دوو جارە باغە ئاوییەکانیان لە خەم دەڕەخساند. منیش چەندێکی لەو دەمانەدا لە کۆیێ بوومبێتم بەشداریم لەو سەیرانە کردووە. هەموو جارانیش مەلا مەجیدی موفتی، کە فەقێی باوکم بوو، بە خۆی و چەند کەسێکەوە بەو کارە ڕاگەیشتووە. چ موبالەغە لەوەدا نییە کە دەڵێم تێربوون لە چایە و جەمی ئەو نیوەڕۆژە زۆر ئەستەم بوو. سروشت بە بارانی بەهار وەها پاک خۆی دەشووشت و دەڕازاندەوە بە گیا و گەڵا و مەل و گڵۆکی ڕەنگاوڕەنگ هێزێکی دەدایە لەشی مرۆڤ و خۆشییەکی لە گیانی دەگێڕا و گەشاییەکی تێدا دەبووژاندەوە بە قەڵەم نەخشەکێش ناکرێ.

هەروا لە بیرمە جارێک لەو جارانە، لە کۆتایی ڕۆژێکی گەش و خۆشی پڕ چالاکی و تەڕدەماغی و بێخەمیدا دەست لە ئیش هەڵگیرا و خەریکی گەڕانەوە بووین بۆ کۆیێ، بە پێمەڕەدار و دەستە و دایەرەی خۆمانەوە چل کەسێک دەبووین تەنها باوکم بە سواری وڵاغەبەرزە هاتبوو ئەوانی دیکە سەرلەبەر پیادە بوون. کە چوون وڵاغەکە بۆ باوکم بهێنن دیتیان بە قەدی چیاوە وڵاغەکە ڕێ و ڕێ بەرەو کۆیێ، بە زینەوە خەریکی سەرکەوتنە. قەتارچیی خۆمان سێ گوێدرێژی دەگێڕا، ئەو ڕۆژە هەرسێکیانی بار کردبوو لە گیا. لە ناو گوێدرێژەکاندا یەکێکیان ناوی «کەرەبۆز» بوو فەرخە هێسترێک بوو. باوکم بۆ لای چوو پێی گوت: کەرەبۆز، چەندێکی زەحمەتیش بێ، چارەت ناچارە دەبێ تا سەر چیا هەڵمگری، ئیشە و قەوماوە لە پیاوانیش دەقەومێ. دوو بەشی شاخەکە پتر سەرکەوتین ئنجا دیتمان وڵاغەکە بە دەست ڕێبواری دیوی کۆیەوە بەرەو لامانەوە دێت. کە باوکمیان دیت بەسەر بارە گیاوە لە لنگانیان کردە دەنگ و خێراتر وڵاغەکەیان لێ خوڕی تا بە باوکم گەیشتن. ڕاستییەکەی ئەمەشیان هەر تەرزە خۆشییەکی ئەو هەرەوەزانە بوو.

جارێک لەو جارانەی پێمەڕەداران بۆ خزمەتی باغەکانی چنارۆک مام ئەحمەد ناوێکی خەڵقی دیوی کوردستانی ئێران کەوا چەند ساڵێک بوو گوزەران هێنابوویە کۆیێ و لە حەسارەکەی بەرانبەر ماڵماندا خۆی و کوڕێکی سەعید ناو و کەرێکی بۆزی کارگوزار دەژیان و پێشیان دەگوت لالۆئەحمەد و لالەحمەد و وەک فەقێکانی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی نزیک ماڵمانەوە ڕاتبەی ئێوارانی بۆ دەچوو. ئائەو لالۆئەحمەدەش بەگەڵ هەرەوەزەکە کەوتبوو. مرۆیەکی ئێسکسووکی قسەخۆش بوو. سوێندی هەرەگەورەی لای براگەورەکان ئەوەبوو دەیگوت: بەگیان تۆ بە گیان سەعە بچێ بۆ بان کەرەبۆز... لەو ڕۆژەدا پێمەڕەدارەکان لە لاپاڵێکی باغچەی مێو و هەرمێیان خەریکی پێمەڕەکاری بوون. باوکم چاوی گێڕا لالۆئەحمەدی نەدیت. بە پرسیار زانی بەرەو چ لایەکەوە ڕۆیشتووە، گوتی: کوڕینە بگەنێ هەتا موتوربەی هەرمێیە ئەڵماسییەکەی ڕیشەکەن نەکردووە. باوکم خۆیشی بۆ ئەولا کشا دیتی لالۆئەحمەد پاڵەوانانە لە کاری خۆی بۆتەوە و گوتی: قوربان ئەم بنەکۆلکەم لە کۆڵ باغچەکەت کردەوە، لایەکی لێ داگیر کردبوو، نەمامی تازەی لە جێگەدا دەچێنین، قەزات بچێ بۆ بان کەرەبۆز... بابم زۆر لێی بە پەرۆش بوو بەڵام بوو بە پێکەنینێک هەر مام لالۆ سەری لەو پێکەنینە سوڕ مابوو. موتربەکەش تەنها قەڵمێک بوو بۆی

هاتبوو لە خۆشناوەتی لە نێوان چەند قەڵەمدا کە خۆی گرت و شین بوو، ڕێکیش نەکەوت جارێکی دیکە لەو نەوعە قەڵەمە پەیدا ببێتەوە... لالۆئەحمەد دوای دوو سێ ساڵ گەڕایەوە بۆ نشیمەنی خۆی و لێمان نەبیستەوە.

لە سەرەتای پاییزیشدا کە ماڵ دەگەڕانەوە بۆ کۆیێ باوکم بە خۆی و چەند بەردەستێکەوە بۆ ماوەی بیست ڕۆژێک دەمایەوە بە نیازی خزمەت کردن و ئاوەدانی باغەکان. ڕەزەوانی مەعلان و لێزانی خۆشناوەتی ئەو وەزعەیان دەزانی دەهاتن بۆ یاریدەدان لە خزمەت و لە موتوربە کردن و هەڵپەرداوتن و ئیشی دیکەی سەربە ڕەزەوانی. زۆر لەوانیش تەڵەیان پێ دەبوو تا ئەوەی گەلێک شەوان 8-9 تەڵە دادەندرایەوە و بەزۆری ئەوەندەیان لێ دەتەقین گۆشتیان تەئمین دەکرد.

ئەو باغەوانانە لە خۆیانەوە بێ تەکلیف دەهاتن. بێگومان بۆ ئەوان ڕەفاقەتیی «مەلای گەورە» لە نزیکەوە هەڵکەوتێکی دڵدەرەوە بوو دە جاران ئەوەندە ئەرکەی دەهێنا کە لە پیاوەتی خۆیانەوە بێمزە بە چنارۆکیان دەبەخشی. باوکم لەحەدبەدەر ئاشقە درەخت بوو لەو ڕووەوە لێم دەبیست کە زەردەشت چاکەی بە سەر ڕەزداری و باغەوانییەوە هەیە لە نێو کوردەواریدا... دەشیگوت لە شاخی پیرمەمەوە تا کۆتایی دێ لە بەرانبەر دووکان پێنج هەزار ڕەز کاول بوو لەسەردەمی عوسمانلییان لەبەر زوڵم و زۆریی ڕەزانەستێنان. مەراقی زۆری لەو دەردە بێدەرمانەی درەخت دەخوارد کەوا لە پێش چاوی خاوەنەکە دەیکوژێت و دەسەڵاتیشی پێی ڕاناگات. یەکێک لەو دەردانە کەمعومریی دار خۆخ و قەیسی بوو، جارێکیان لەو باغەوانانەی پرسی ئاخۆ لە کەسبەکەیانەوە یان لە بیستنەوە چ چارێکیان بە بیردا نایەتەوە گوتیان، قوربان جەنابی مەلا ئەوە بە ئەمری خوایە. باوکم پێی گوتنەوە، ئێوە لای خوا بۆ من لێ گەڕێن من لە ئێوەی شارەزاترم، ئەگەر لە زانینی دنیاییەوە شتێکتان وەرگرتووە پێمی بڵێن. بەداخەوە هیچیان لێ نەدەزانی. دواتر باوکی کەوتە سەر ئەو باوەڕە کە مردنی ئەو دوو درەختە، بەتایبەتی خۆخ کە زۆر ناسکە و خێراشکستە، دەچێتەوە بۆ گەزەندەیەک (حشرة) لە قەڵغەتدا هێندەی سیسرەیە، بە درەختەکەوە دەنووسێت و شرینقەی ناو دەمی تێدەچەقێنێ تەڕایی ناوەوەی لێ دەمژێ. کە دەمیشی لێ هەڵگرت، لەو کونەوە کە تێی خستووە دارەکە جەوی دەردەکات و پێیدا دێتە خوارێ یان بە تۆپەڵە لە دەوری کونەکە کۆمەڵ دەبێ ئنجا کە درەختێک بیست گەزندەی ئەوتۆیی لە هەموو لایەکی قەدیەوە بریندار بکەن و ئەو هەموو جەویەی

لەبەر هەڵبنیشێ و گەرمای هاوینیش لە ژوورەوەی دەرختەکە یارمەتیی ئەو جەوی لەبەر هەڵنیشتنە بدات، ئایا لە سێ ساڵاندا چ خوێنیک لە دەماری درەختی ئەوتۆییدا دەمێنێ بایی ژیان بکات کە دەزانین جەوی خوێنی درەختە؟ ئەو تێبینییە بەوەدا پتر خۆی دەسەپاند کە درەختی خۆخی ناو سێبەر و فێنکایی پتر دەژیا لەوەی هەتاو داغی دەکرد چونکە لە سێبەردا کەمتر جەویی دەردەکرد.

تەجرەبەی خۆم لەگەڵ درەختدا دوای باوکم کە درێژەی تەجرەبەی ئەو بوو، کارتێکەرێک بوو بە لای نامادد ییەوە دەچێتەوە. ئەو درەختانەی کە بە سەرپەرشتی باوکم نێژرابوون و ئەو موتوربانەی بە فەرمانی ئەو کرابوون (وا هەبوو لە یەک بنە کرۆسک سێ جۆرە هەرمێ موتوربە کرابوو) لە هەستی عاتیفیمەوە وەک برادەر سەیرم دەکردن یان لە جێی خوشک و برادا بوون، حورمەتی باوکم لە دڵی مندا ڕێزی لەوانیش دەگرت. هەرگیز دەستم نەیانچوویێ بێباکانە لکیان لێ بشکێنمەوە. کە میوەم لێ دەچنین بە دەستێکم ئەو بستەیەم دەگرت کە میوەکەی پێوە بوو، بە دەستی دیکەم میوەکەم دەچنی، نەکا بستە وەیا لکەکە بشکێتەوە. زۆر کەس کە حەزی دەچێتە هەنارێکی بڵند و قەرانگی پێ نابێ لکەکەی بچەمێنێتەوە گاشە بەردی تێدەگرێ، من ئەمەم نەکردووە لەگەڵ ئەو درەختانەی باوکم ناشتبوونی وەیا بەتایبەتی خەریکیان بووبوو، دواتریش کە خۆم درەختی دیکەی هەمەجۆرەم لە باغەکان ناشت هەستی خزمایەتیم لە گەڵیاندا هەمیشە دەستپارێزی پێ دەکردم لە ئەزیەت دانیان.

سۆزی مرۆڤ بۆ درەختی دەستچێنی خۆی و چوارپێی دەرکزاو و پەلەوەڕی خانەیی سۆزێکی عادەتی نییە. هاوینێکیان باغەوانەکەم کە خۆی و کوڕە منداڵە تاقانەکەی و پیرە دایکەکەیم بەخێو دەکردن لە بری خزمەتی باغەکانی چنارۆک، لە گەرمەی کژی باغەوانیدا ناساغ کەوت، خۆی و دووەکەی دیکەشم لەگەڵدا ناردنەوە کۆیێ بۆ لای دکتۆر. چارم نەما، خۆم دەستم دایە باغەوانی چونکە یاریدەرەکانی دیکە هەر یەکەیان کارێکی سەرلەبەری ئەوتۆی هەبوو نەیدەتوانی وازی لێ بهێنێ بۆ خزمەتی درەخت.

باغەکان لە سێ کانیاوەوە دەداشتران، ئاوی سوولی گوێز، کزە ئاوێکی سەربەخۆی خۆمان بوو. ئاوی کانی خاتوون لە هەفتەدا چوار ڕۆژی بۆ ئێمە بوو. ئاوی کانی تووڕەش، لە نۆ ڕۆژان سێ ڕۆژی هی ئێمە بوو. وەها دەبوو سەراسۆیی سێ ئاو بکەم

له سێ شوێنی جودادا و له هەمان کات. بەپێی خەریتەی تەسویە ڕووپێوی باغەکان دە دۆنم بوو بەڵام کە چۆمەکانی نێوان باغەکان و نغوردی بەر کانییە خاتوون و سوولی گوێزت خستبانایە سەر، حیسابەکە زۆری لەوە تێدەپەڕاند، عاردی خواش چ ئاگای لە کادیسترۆ نییە تاکوو خۆی وێک بهێنێتەوە بەپێی بڕیاری ئەو. خوا هەڵناگرێ، منیش ئەو هاوینە وەک جانفیدا وەیا دەروێش و سۆفیی گەرمەتەریق ڕەزەوانیم کرد. درەختە ئاوییەکانم وەها لە ئاوان گرت، لە چلەی هاویندا پەلکی نوێیان هێنایەوە. لکە هەنجیری تازە کە بە تەئسیری ئاودانەکە دەرهات، تا کاتی ماڵگەڕانەوەمان بۆ کۆیێ ئەوەندە هەڵکشان لە باڵای زەلامیان تێپەڕاند، هی وەهایان تێدا بوو باقۆشی دەرکرد. ئەو هاوینە نە من نە باغەوانەکەم هیچ لایەکمان دەریغیمان نەکرد، من لە باغەوانی، ئەویش لە نەساغی.

هەر لەلایەن کارتێکردنی ناماددییەوە حیسابی ڕابواردنی منداڵانە دێت، شارستان بۆ منداڵ جودایە لە لادێ، هەردووکیشیان جودان لە ڕەز و باغی ناو شاخ. گەمەوگەپی جێگەی وەکوو چنارۆک دەبێ پێوەندی بە درەخت و دڕک و داڵ و کانیاو و کەپکەشاخ و هەوراز و نشێوەوە هەبێ... قاڵۆر بهێنە و بیکۆڵە و لە شکلی تفەنگ شوێنی پەلاپیتکە و گوللە و جاسووسی نیشان تێگرتن و نازانم چی بۆ بکەم و لە جیاتی قایش پەتێکی تێبیخە و بە ملتیدا بکە... لەو تەڕاشانەی ئەسبابی کەپر و ساباتی منداڵانە ساز بدە و لە بن سێبەری لێی پاڵکەوە. باقۆ هەنجیر بێنە و وەک پەڕی جەنجەڕ چەند چڵە دارێکی وەک کفریتی شقارتەی تێ بچەقێنە و چڵێکی لەوان ئەستوورتریش بهێنە و باقۆکەی پێ بسمە و لەبەر خۆڕگەی جۆگەلە ئاو بینێوە و ئاوەکە لە پەڕەکانی بدات و بی سووڕێنێ و ناوی لێ بنێ ئاشۆکە... بڕۆ بۆ ناو چۆم و بێشەڵێن بەدوا هێلکە و فەرخەی تەیردا... ئازابە و دەست بگەیەنە میوەی ناو نغوردی چۆم و خۆتی پێ هەڵدەوە بە سەر ئەو منداڵانەی ناوێرنە شوێنی وەها. منداڵان کە یەکێکیان بە نەوێراوی بشکاندایەوە «فۆفۆ» یان بۆ لێ دەدا، هەر ئەوەندەش بوو دەیانگوت «فۆفۆ نەیوێرا» یان «فۆفۆ هەڵات» یان «فۆفۆ ترسا- ژێرکەوت- بەزی...» بەپێی جۆری تێکشکانی تێشکاوەکە ترسی «فۆفۆ» ش لەو دڵە بچووکانەدا کەم نەبوو، زۆر جاران دەیخستنە خەتەری کوشندەوە.

لەو گەپانەی منداڵی کە لە چنارۆک پێوەی خەریک دەبووین و دەگەشاینەوە مەسەلەی «شیوەقولە» بوو، هەر منداڵە لە کەرەستەی چێشت لێ نان شتێکی

بەردەکەوت، ئەمیان ساوار، ئەویان ڕۆن، سێیەم مەنجەڵ، چوارەم قۆریە، پێنجەم چەند ئیستیکانێک، شەشەم و حەفتەم و هەشتەم شەکر و چیلکە و نان و خوێ... هەتا تاقم تەواو دەبوو، بە زۆریش هەر ساوارمان لێ دەنان. زوربەی ئەرکی کارەکەش دەکەوتە ئەستۆی من و نەجیبەی خوشکم، لە ماڵەوە قسە ڕۆیشتووتر بووین لە منداڵی دیکە. بەهەمەحاڵ دەستەی منداڵان دەچووینە ژێر کەپکەشاخێکی سێبەرداری لەبار و کێشەی ئەسبابی ساوار لێ نان و چایە سازدان و ڕایەخ گوێستنەوە و هەموو سەر و بەرێکی ئەو گەپە دەستی پێ دەکرد و پێوەی دەخافڵاین، بەشدارانی ئەو گەپە لە کچ و کوڕ پێک دەهاتن بێ کچیش هەر نەدەچووە سەر، چونکە چێشت لێ نانەکە پتر ڕووی لە مێینە دەکرد.

هاوڕێکانی ئەو گەپە کە تەمەنیان لە تەمەنم نزیک بوو جگە لە نەجیبەی خوشکم، سەلاح و سەعادەتی ئامۆزام، ڕەفیق و خەجاوی عەبدولڕەحمانی مەلا نەشئەت، ئیسماعیلی مەلا نووری، حەوێزی مەلا سبووح، جەمالی مەلا عیززەت، مارفی مام برایم (جەلیزادە نەبوو) جارجارە حاجی کوڕی حاجی عەوڵای ساڵح (لەو هۆبەی تەنیشتمانەوە) بە زۆریش هەندێ لە هاوتەمەنی دراوسێکانی کۆیەمان بۆ ماوەی حەفتە و دوو حەفتە لەگەڵمان دەژیان، بەر لە هەموویان سددیقی کاک تاهیری حەمە لاڵ کە زۆر ئۆگرم بوو باوکیشی وەکیلی باوکم بوو لە سەرپەرشتیی کردنی دێی پێبازۆک، لە شاریش بە زۆری هەر لە خزمەتیدا دەبوو.

ئەمانە و هی دیکەش لە سەلک و بنکی منداڵی لە خۆمان بچووکتر، لە پێش هەموو هەموانیشەوە فەتحی کوڕی یاعیسمەتی دایانم کە ئەو لە ئێمە گەورەتر و بە دەستەڵاتریش بوو لە کێشەی ئاو و سووتەمەنی و ڕایەخی قورس، کە ئەوسا بۆ ئێمە هێندەی خەریکبوونی «معمر القذافي» بە نانەوەی هەرا دڵکێش بوو. ئەوسا فەتحی لە چاو ئەوانی دیکە ئەو دەورەی دەدیت کە لە حیکایەتخوانان «سەرکدوولە» دەیدیت. حیکایەتەکە هی کۆمەڵە منداڵێکە بە چاوساغیی سەرکدوولە ڕێیان دەکەوێتە ناو دێو و درنج و جادووان و بە ئەنواعی فێڵی لە خشتەبەر سەرکدوولە هەڵیان دەخەڵەتێنێ تا منداڵەکان ڕزگار دەکا. فەقێ ئامینەی خوشکی سەید ئەحمەدی مەلا وەلی، کە دایانی منداڵی مامم بوو، ئەم حیکایەتەی بۆ دەکردین و ئێمەی بەو کۆمەڵە منداڵە دادەنا فەتحیشی دەکردە سەرکدوولە... دێو دەڵێن، سەر کدوولە نوستووی؟ فەتحی سەرکدوولە دەڵێ، دایکم فێری کردووم

هەتا قەسپ و کاکڵەگوێز نەخۆم نەنووم... ئیتر دێو خەریک بێ بەو شەوە قەسپ و گوێز بۆ فەتحی حازر بکات. سەیر لەوەدا بوو فەتحی ئەو ناوەی سەرکدوولەی بە دوا نەکەوت، دەترسم دوای بڵاوبوونەوەی ئەم سەرگورشتەیەی من ناوی سەرکدوولە هەڵبداتەوە... خولاسە ڕۆژانی شیوەقولە پایەیەکی تایبەتی هەبوو لە ژیانی ئەوسای چنارۆکمدا تا لەو تەمەنە تێپەڕیم بەرەو مەراقی دیکە.

ئەو حاجییەی کوڕی حاجی عەوڵای ساڵح کمێک لە من بە عومرتر بوو نەختێکیش لە ڕۆیشتندا دەلەنگی. منداڵێکی ڕوحسووکی بەکزادانە هەڵکەوتووی لە تەمەنی خۆی عاقڵتری بە وێڵ و تەرتیب بوو، وەکوو کوڕە دەوڵەمەند، بگرە زیاتریش، پۆشتە و پەرداغ و لەماڵەوە قسە ڕۆیشتوو بوو. باوکی هەرگیز دڵی نەدەشکاند. حەزی بە ڕاوی تەڵە و داوە مووسکە و تفەنگی ساچمە دەکرد باوکیشی هەموو ئەسبابێکی بۆ دەردەست دەکرد. گەلێک جاران هەر من و ئەو لە بن تاڤگەی ئاوی کانی توووەڕەش بە سەرمان دەبرد و چی حیکایەتی ڕاوی تەڵە و تفەنگ و داو هەبوو لەوانەی لە خۆی قەومابوون بۆمی دەگێڕایەوە، تاقمی چایەشی هەمیشە پێ بوو، چایەی بۆم لێ دەنا و قسەی بۆ دەکردم منیش هەرگیز لێی تێر نەدەبووم. لە عومرێکی دواتردا ڕۆژێکیان بە خۆی و تفەنگی لاشانییەوە هاتە خزمەت باوکم، چوار کەوی پێ بوون بە داو ڕاوی کردبوون بەدیاری بۆ باوکمی هێنان. بەڕاستی هەر کەوەی بە قەد باڕۆکەی مریشک دەبوو. باوکم زۆری بە خێر هێنا، ئەویش نموونەی ئەدەب و وێڵ و تەرتیب بوو. پێی گوت کەوەکانم قبووڵن ئەمما دەبێ نیوەڕۆ بێیتەوە لام بەیەکەوە بیان خوێن. لە بیرمە ئەو نیوەڕۆیە کەوەکانیان بە پڵاوی سەدری «سیادوم» لێ نا لەگەڵ بامیە و تەماتەی باغچەی خۆمان. نیوەڕۆ من و حاجی لە خزمەت باوکمدا نیوەڕۆژەی ئەو کەوانەمان خوارد. برنجە سەدرییەکەش لە قەڵادزەوە دۆستەکانی باوکم بۆیان دەنارد. ئەوسا حاجی میرزا عەبدوڵا «خادم» و حاجی تاهیر و حاجی سادق کە هەرسێکیان بە ئەسڵ کۆیین ماڵیان لە قەڵادزە بوو. چی نایاب بوایە لە تووتنی بێنخۆش و میوەی وشککرایەوەی وەک کشمیش و هەنجیر و قەیسی و لە برنجی سەدری سیادومی زێدە پەسەندیان چنگ کەوتبایە لە فرسەتدا بۆ باوکمیان دەنارد. بە درێژایی 30 شەوەی ڕەمەزان خۆشاوی ئەو میوە وشککراوە نازدارانەی دیوی ئێران لە ماڵی ئێمە، لە هیممەتی ئەو دۆستانەوە، تاموشامی لە فتار و پارشێومان دەگێڕا. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕیان.

حاجی له ته‌مه‌نی هه‌ڕه‌تی نه‌وجه‌وانیدا، هه‌ر له چنارۆک، جوانه مه‌رگ بوو، وه‌ی که کاری تێکردم. شه‌و بوو زیڕه له ماڵی حاجی عه‌وڵا هه‌ڵستا. له مه‌جلیسی باوکم جه‌ماعه‌ت دانیشتبوون، له خزم و مه‌لا و هێندێک مێوان، یه‌کێکیان مه‌رحووم مه‌لا مه‌عسوومی هه‌ورامی که ساڵانه بۆ ماوه‌ی دوو سێ هه‌فته له چنارۆک لای باوکم ده‌مایه‌وه. ئه‌و شه‌وه هه‌موومان له خزمه‌ت مامما چووینه لای حاجی عه‌وڵا بۆ به‌شداری کردن له خه‌فه‌تی. پیاوی تایین ده‌تگوت هه‌ر ئێستاکه ئاگری تێ به‌ر ده‌بێ... ئه‌و شه‌وه ڕووپه‌ڕه‌ی دۆستایه‌تییه‌کی زۆر پرشنگدارم پێچرایه‌وه.

به موناسه‌به‌ی ناو بردنی سدیقی کاک تاهیری حه‌مه لاڵ ده‌بێ ئه‌وه بڵێم که‌وا ئه‌و له خۆوه، به منداڵی، ناوی نام «کاکه سه‌عد» و بۆم بوو به شوون. له باوکم به‌و لاوه هه‌رچی هه‌بوو به کاکه سه‌عد ناوی ده‌بردم. به‌ڵام له گه‌ڕه‌که‌که‌ی کۆیه‌مان ئافره‌تێکی ڕوحسووکی به‌ساڵداچووی ناوی «یافاتمی مام خدر» بوو، نه به کاکه سه‌عد نه کاک مه‌سعوود نه مه‌سعوود ناوی نه‌ده‌بردم، به ڕاشکاوی و بێ مه‌به‌ست پڕبه‌ده‌م پێی ده‌گوتم «کاکه موسته‌قینه». تۆ بڵێی ئه‌گه‌ر ئه‌وه ناوم بووایه بۆی ده‌ربڕابایه؟ چه‌ندێکی به حینجه‌یی ناوه‌که‌میان بۆ ده‌گوته‌وه که‌ڵکی نه‌بوو. وا دیاره ئه‌و «ق» ه له‌ناوی کاک موقته‌دیره‌وه په‌ڕیوه‌ته‌وه، چی ده‌مێنێته‌وه ئه‌ویش له «صراط المستقیم» ه‌وه هاتووه. مه‌رحووم کاکه حسێنی خانه‌قا که ئه‌و ناوه‌ی که‌وته به‌ر گوێ به زۆری ئه‌گه‌ر بێگانه له به‌یندا نه‌بوایه، وه‌های بانگ ده‌کردم.

بگه‌ڕێمه‌وه بۆ چنارۆک. له کۆیه گه‌ڵێک دۆست و براده‌ر سه‌ردانیان ده‌کردین. تا منداڵ بووم پتر که‌یفم به‌و میوانانه ده‌هات که دیاریی منداڵانه‌یان پێ بوو. که‌سێکی مه‌حره‌م بووایه ده‌یزانی چه‌ند منداڵ هه‌ن و که‌یفیان به چی دێت. له هه‌موان شاره‌زاتر کاک تاهیری حه‌مه لاڵ بوو. له شیرنه‌مه‌نی حه‌لقووم و بادام و شه‌کری که‌سک و سووری بۆ ده‌هێنایین. له‌وان خۆشتر کفریتی ڕه‌نگاوڕه‌نگ و عه‌نه‌تریک بوو. ئه‌و عه‌نه‌تریکه بریتی بوو له شیشه‌یه‌کی باریک، ده سانتیمه‌ترێکی لای سه‌رووی ده‌رمانێکی لێ ده‌درا که به ئاگر ده‌کرا ده‌ستی ده‌کرد به پریشک هاویشتن و کفه‌کف و کرپه‌کرپ تا ده‌کوژایه‌وه ده‌تگوت تۆپه‌ڵه ئه‌ستێره هه‌ڵپه‌رکێی به ده‌وره‌وه ده‌که‌ن. چه‌ندێکی له‌و کفریته و عه‌نه‌تریکه‌مان بۆ بهاتایه له شه‌وێکدا ته‌واومان ده‌کرد. ده‌مانگوت خوا که‌ریمه بۆ شه‌وێک و جارێکی دیکه. ئه‌مانه هه‌مووی و هی دیکه‌ش هه‌ن وه‌ک ئه‌مان ده‌چنه‌وه بۆ ئه‌سه‌ری نامادديی چنارۆک له مندا.

لە لایەنی تەئسیری ماددیی چنارۆکەوە لە مندا دەبێ لە پێشەوە بڵێم بە پێچەوانەی هەموو چاوەڕوان کردنێک، هەرگیز نەمتوانی ببمە دارەوان. زانیم مەلەوانی فێر نەبووم لە شەرمی جلک فڕێ دان، بەڵام دارەوانی کە شەرمی تێدا نییە ئاکامێکی ئاسایيشە بۆ کەسێک لەگەڵ درەختدا بژێت. چەندێکی ویستبێتم وەک هاوڕێکانم بە داردا هەڵبگەڕێم تەنها ئەوەندەم بۆ کراوە دەست لە قەدی دار وەربهێنم و توند خۆی پێوە بگرم و قاچەکانم لە زەوی هەڵبگرم بێ ئەوەی توانیبێتم یەک باڵ هەڵبکێشم. لەو خۆ توند کردنە بێسوودەشدا دەستم دەیەشان، ڕووم بە قەدی دارەکەوە ئەزیەتی دەدیت. دارێکی لە قەدی خۆیدا پێپلیکەی دەرنەکردبێ، لە نزیکی زەویەوە دوو لقەی نەبووبێ وەکوو زینی وڵاغ سواری ببم، خۆم لێی نەداوە. بە هەموو عومرم نەموێرا بچمە سەر دارتوو یان دارسێو بە دەستی خۆم میوەیان لێ بکەمەوە، هاوڕێکانیشم وەکوو چوێلەکە و مارمێلکە لێیان بێباک بوون. ئەوان توویان بۆ دادەوەشاندم. من هەر ئەوەندەم میوە دەپچڕی کە لە ئەرزەوە دەستم دەیگەیشتێ. لەو بێدەستەڵاتییەم ناڕاحەت بووم بەڵام بەسەر خۆم نەدەهێنا، کەسیش لە ڕووی نەدەدام.

لە بابەتی سوودی ماددی کە پێم گەیشتبێ جموجووڵ و گەشت و گەڕان، هەوراز و ژوورچوون و بەرەو نشێو داکشان و غارغارێنێ و بزووتنەوەی بێوچان بوو کە هێزی لەش و ڕاهاتن لە ئەرک و تەحەمولی ماندووەتی پێ زیاد دەبوو. من هەرچەند کوڕە شارستانی حەسایەوەش بووم توانیم، وەک گوتم، هاوینێکی سەرلەبەر باغەوان بم، تەنانەت کە لە پشووی هاوینەی سەردەمی خوێندنی حوقووقم دەهاتمەوە کۆیێ بە زۆری لە دەشتم ڕادەبوارد بە کەسابەتی سەرپەرشتی کردن لە تووتن و خەلە و خەرمان و دروێنە و جەنجەڕ لێخوڕین خەریک دەبووم تاکوو کژی چنارۆک دادەهات ئنجا دەکەوتمە سەر ژیانی ناو چیا و درەخت و ئاوی سارد. چنارۆک نەیهێشت دەست و پێ سپیلکەبم وەیا وەکوو خوێندەواری شارستان لە بورجی عاجییەوە سەیری کەسبە نەفەسبڕەکان بکەم.

لە منداڵیمەوە سەرنجم بۆ لایەنیکی ژیان کشا هەر بەهۆی چنارۆکەوە، ئەو مێوانانەی کە لە کۆیە ڕوویان تێدەکردین و بۆ چەند ڕۆژێک وەیا لە حەفتە زیاتر لامان دەمانەوە هەر یەکەیان بەپێی ئەو کەسبەی لێی شارەزا بوو خزمەتی چنارۆکییەکانی دەکرد. سەرتاش بوایە سەری خەڵقەکەی دەتاشی، جلدروو پینە و

پەڕۆی بۆ دەدروون. نەججارِ کەلووپەلی بۆیان لە بار دەکردەوە... ناڵبەند کاری خۆی دەکرد. هی وەهایان تێدا بوو شارەزای هەنگ بوو لەگەڵمان دەگەڕا شارەهەنگی دەدۆزیەوە و هەنگوینەکەی بۆ دەردەهێناین. خولاسە هەریەکەیان مەهارەتەکەی خۆی دەخستە گەڕ. من لەوەوە پتر بیرم کردەوە لە گرنگیی ئەو کارانە تا ئەوەی لە کۆیێ خەیاڵم لێی کردەبێتەوە. لە شارستان هەست بە سەر ئەو کەسبانەدا دەکشێ و لێیان ورد نابێتەوە و لە گرنگییان ناگات چونکە هەمیشە لەبەر دەستدان. بۆ منی منداڵ کە بە ڕواڵەت دەبێ لە گەمەوگەپ بەولاوە بیر لە هیچ شتێک نەکەمەوە سەرنج کشانم لە زووەوە بۆ ئەو وردە حیسابانە، یاریدەدەرێکم بۆ لە تێگەیشتنی گۆشەیەکی گرنگی گوزەران کە کەسب و ئەرک و ماندووەتییە.

لە چنارۆک بە ڕوونی تێدەگەیشتم مانای چی شارێک بێ سەرتاش یان جلدروو بێ. لە شار خەڵق بێمنەت بە دوو ئانە سەری دەتاشی لای سەرتاشێکی حازر بە دەستی ئامادەی خزمەت، بەڵام لە چنارۆک ئەو سەرە نەدەتاشرا ئەگەر بۆی نەچووبایە شار، هەروەهاش کەسبەکانی دیکە، هیچ پەندی بەدوا کاتەوە بە خوێنەر نافرۆشم کە بڵێم بە عومری خۆم ئەو کەسبانەم بەلاوە بێبایەخ نەبووە و هەرگیز هیچیانم بە کەم نەزانیوە. بێگومان تەجرەبەی سەربەخۆی خۆم لەم مەیدانەدا پتر دەوڵەمەند دەبوو بەو ڕەفتار و گوفتارەی لە باوکمم دەدیت و دەبیست چونکە ئەو خۆی هەمیشە کاسبکار و ڕەنجبەر و ئەرکدەری خاوێنی بەلاوە موحتەرم بوو، سەدان جاریش لێم بیستووە ڕەنجبەرێکی چالاک هەزار سۆفی و فەقێ و دەروێشی عەمەلبەد دەهێنێ، یان کە دەیگوت نانێکی بە ئەرکی شان پەیدا کرابی سەد شەرەفی هەیە بەسەر سوود و دارایی ناڕەوادا. لەبیرمە جارێکیان کۆمەڵێک لە خزم و دۆستی دڵسۆز لای دانیشتبوون لە بن کەپری ماڵی خۆمان لە چنارۆک. شەو بوو بە دەم مەجلیسی ئەوتۆیی چایە و میوەوە قسەی جۆراوجۆر دەکران تا کێشایەوە بۆ باری گوزەران و زەحمەتی دەربردن لەگەڵ گوزەرانگێڕانی ئەو خەڵق و خوایەی وا بە مل باوکمەوەیە، ژمارەی فەقێکان دەوری بیست کەسێک دەبوون... خێزانێکی زۆر... مێوان... موراجەعەکەر... خولاسە قسەیان گەیاندە مەبەست و گوتیان قوربان بۆ سەفەرێکی بەغدا ناکەیت خۆ حکوومەت لە خوای دەوێ جەنابت ڕووی تەکلیفی لێ بنێت، وەزعیش ئاشکرایە بایی ئەرک و مەسرەفەکەتی بەبەرەوە نییە. باوکم لە وەڵامدا پێی گوتنەوە، والله وبالله وتالله، کە بە نووکی دار عەساکەم ئاو ڕادەکێشم بۆ

بن دەرختێکی تینوو هەزار جار بەلامەوە بە شەرەفترە لەوەی لەبەر دەرگەی مەلیک یان «رئیس الوزراء» داوای ڕوخسەتی چوونە ژوورەوە بکەم. دواتر بە دەم پێکەنینەوە ئەم بەیتەی خوێندەوە:

شاهی کە نەبێ ڕادەبوێرین بە فەقیری
بۆ ئەهلی قەناعەت لە پڵاو خۆشترە داندووک

ئەم پەندەی بەهەند هەڵگرتنی کەسب و کار ڕەنگە بشێ بدرێتەوە بە لایەنی سوودی نامادی. بەڵام لکانی پەندەکە بە گوزەرانەوە و ئەرکی شان و ملانەوە بۆ لای ماددیی دەباتەوە. هەر چۆنێکی حیساب بکەیت، چنارۆک لەم مەیدانەدا لە سەرەتای ژیانمەوە پەندیارم بوو، دوای ئەو «پیبازۆک» لە تەمەنێکی گەیشتووتردا تەجرەبەمی گێڕا بە تەجرەبەی هەمەچەشنەی بەرفرەوان چ لە ڕووی ئەوەوە بێ کە خەریکی دەکردم لەگەڵ شیناورد و فەلاحەت و درەخت و چەم، چ لە ڕووی ڕەفاقەتی بەردەوامم بێ لەگەڵ زورراع و فەلاح و ڕەنجبەر تا ئەوەی لێرەدا بە نموونە بۆ خوێنەر شتێکی لێ باس دەکەم. هاوینێکیان زورراعێک، عەزیزی مام برایم بلْباس، دوای داچاندنی بەراوەکەی بە تووتن نە ساغ کەوت و بردرا بۆ کەرکووک، بە درێژایی ئەو کژە لە هەموو نۆرە ئاوێکدا لەگەڵ منداڵەکانی خەریک دەبووم و وەک ئەوان لەبەر قرچەی هەتاوی نیوەڕۆی تەمووز سەراسۆیی ئاوەکەم دەکرد و لە شەلەگەی هەرە سەرووی زەویەکانەوە تا بەراوەکەی ئەوان کە زوربەی بەراوەکان لەو شەلەگەیەوە دوورتر بوو بە دەستی خۆم جۆماڵم دەکرد. تووتنێکی باشمان بەرهەم هێنا بەڵام داخم ناچێ، لای توجار چوار فەردەی ئەم تووتنە دزرا و ماندووبوونی منداڵەکان و خەریکبوونی من بە جووتە بە فیڕۆ ڕۆیی. باش بوو مام عەزیز بە سەلامەتی گەڕایەوە. ئێستاش کە ساڵحی مام عەزیز دەبینم ئەو منداڵە 5-6 ساڵییەم بە بیردا دێتەوە کە لەو هاوینەدا، بێ باوک و دایک، هەر منی شک دەبرد بۆی خەریک بم. خەڵقەکەی دیکە هەر یەکە دووچاری دەردی سەری خۆیەتی ناپەرژێ بۆ کاری لابەلایی واز لە مەشغەڵەتی خۆی بهێنێ... بە تۆبزی نەبێ سەپانی قرشەشکێنی سەر خەرمان یان ئاودێری تووتنی نۆرە ئاو پێ ڕاگەیشتوو لە کەسبە پشت شکێنەکەی دەستی پێ هەڵناگیرێ.

تەجرەبەی زیندووم لەگەڵ تەوژمی گوزەراندا گەیاندمی بە دوو ئاکامی لە یەک نەترازاو، یەکەمیان، باوەڕهێنان بە ڕەوابوونی هەوڵی ڕەنجدەر لە پێناو

سوودمەندبوون بە هەموو بەرهەمی ڕەنجەکەی. دوەمیان ڕەوابوونی بەکارهێنانی مافی ڕازیبوون و ڕازینەبوون لەلایەن ڕەنجدەرەوە لەو شتانەی پێوەندییان بە کەسبەکەی خۆی یان باری گشتی وڵاتەوە هەیە.

من کە کەوتمە ناو کاروباری سیاسەتەوە هەرگیز باوەڕم بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزیی ئەو خەباتگێڕە نەبووە کە دەیەویست ملّکی ملّکدار و پارەی پارەدار بەسەر هەژاراندا ببەشێتەوە بەڵام لێیان بە زیاد بگرێ بە دەمیدا بێنەوە وەیا ڕەخنە لە گوتە و کردەوەی بگرن. مامڵەتی ئەوتۆیی لە خەباتگێڕەوە چاکە کردنە لەسەر کیسەی خەڵق، ئنجا خۆ سەپاندنیشە بەسەر وەزیفەی «قاسم الازراق» دا. تۆ کە ڕێ بە ڕەنجدەر نەدەیت مافی نارەزامەندیی هەبێ دەتوانێ سبەینێ چی پێت داوە لێی بستێنیتەوە، بشی خەیتە بەندیخانەوە.

من لە ساڵی 1940 ەوە دەستم کرد بە هاتوچۆی سەرپەرشتیی کردن لە ملّکانی پێبازۆکمان. لە حەسەنی مام فەتاح مێوان دەبووم. هەرچەند ئێستاکە بە ناوساڵدا چووە و دەشڵێن چاوی کزبووە بەڵام شایەدیی پێ دەدرێ لەوەی وا خەریکم لە موناسەبەدا دەیگێڕمەوە: پێم گوت و هی دیکەش لێی بیستووم: ڕۆژەک دێت ئەم ئەرز و ئاوە بە سەر ئێوەدا دابەش دەکرێ. با ئێمە پیاو بین تا ئەو ڕۆژە مەردانە بەیەکەوە هەڵکەین.

بەڵێ دەزانم دەبێ لە پەروەردەبوونمدا وەیا لە سروشتمدا ماکێک هەبووبێ لە زوویێکەوە منی خستبێتەوە سەر ڕێبازی باوەڕهێنان بە «مرۆڤ». بەڵام گومانم لەوەدا نییە کە تەجرەبەی منداڵیم لە ژیانی ناو شاخ و درەخت و ئەرک و زەحمەتی هەوراز و نشێوی چنارۆک و هەست کردن بە ئارەقەی ڕەنجدەر و هەناسەسواریی ئاودێر (کە خۆم هەناسەم تێیدا سوار بووە) و بایەخی مەهارەتی کاسبکار زەمینەی لێ ڕوانی تۆوی بیر و باوەڕی دوارۆژم بووە یان هەرنەبێ لەو مەیدانەدا ڕێی دووری بۆم نزیک کردۆتەوە.

تەواوکەری ئەو تەجرەبەیەم، ئەویش هەر لە چنارۆک، ڕوویەکی دیکەی کۆمەڵایەتیی بۆم ڕوون کردەوە، ئێمە لەو کەپرانەدا بە دیار چەند بنەدرەختێک و سێ چوار خەتە تەماتە و دوو قومی ئاوی ساردەوە هەموو هاوینێک بایی داهاتی دە ساڵ و بیست ساڵی ئەو ملّکەمان لە فەقێ و ڕێبوار و مێوان سەرف دەکرد، کە

نۆرەی سەرپەرشتی گەیشتە من دوای باوکم، وەزعی گوزەران و ڕابواردن بەرەو پێشترەوە گۆڕابوو، قەرزی بیستوشەشم دەکرد تا لە ئاست مێوانی و پەنابەر شەرمەزار نەبم بێ ئەوەی لە ورێنەشدا تارمایی بەرژەوەند و سوودی ماددی بە دڵمدا تێپەڕیبێت... ئەو باغەوانەی باسم کرد، کەتنێکی کردبوو، لە ترسی حکوومەت و تۆڵەستێن پەنای بۆ لای من هێنا بوو، هەر خواش دەزانێ چەند سەغڵەت بووم لە ئاست ئیحتیمالی مومکیننەبوونی پاراستنی لای خۆم، لەوە هەر بگەڕێ کە بەخێوکردنی سێ کەس بە سەر باری خێزانی زۆرەوە خۆی لە خۆیدا ئەرکێکی بەرهەستە. ماڵیان ئاوابێ حکوومەت و تۆڵەستێنیش لەو ساڵانەدا کە لای من مایەوە خاڵەبەخشیان کرد و بەلایەوە نەهاتن، دواتریش باری ڕاست بۆوە و چووە کەرکووک ژنی هێنا و منداڵی پێ گەیاندن.

لەوەوە بە کردەوەی ساڵ لە دوای ساڵ بۆم ساغ دەبۆوە کە ئەم دنیایە بریتی نییە لە تاکە هاندەری خوێنمشتن و دەستدرێژی و خەڵق بە قوربانی خۆ کردن، دەشێ مرۆی بە دەسەڵات هەموو جاران ستەمکار نەبێ وەیا هی وەک خۆمی مامناوەنجی لە خۆ بوردوو بێ. ناشێ و نابێ بڕیاری یەکجارەکی دەرچێ دژی هەموو ئەو کەسانەی خوا نانێکی پێ داون وەیا دەستەڵاتێکی پێ ڕەوا دیتوون، لێی گەڕێ تا بە تەجرەبە دەزاندرێ کابرا مێرخاسە یان شەیتان. ڕەنگە بگوترێ ڕەوڕەوەی مێژوو لەو تەرزە گرفتۆکانە ناسەنگرێتەوە و گوێ بەو حیسابە وردیلانە نادات، لە وەڵامدا دەڵێمەوە من و تۆ مامەڵەتمان لەگەڵ ئەو حیسابە وردیلانەدایە و لوقمەنان لەگەڵ ئەو جۆرە خەڵقە دەخۆین، هیچ کامێکمان عەرەبانچیی عەرەبانەی مێژوو نین. لە ساڵی 1940 ەوە تا ئێستا 45 ساڵێک تێپەڕی ئنجا ئەگەر بە خاترانەی مێژوو هەموو وردەحیسابێکمان لە دەفتەری مامڵەتی ڕۆژانەمان بڕیبایەوە، خەسارەتکردوویەک دەبووین مێژووش نەتوانێ لە دواڕۆژدا بۆمان تێ بهێنێتەوە. دەبێ لە حیساباتی فەلسەفیماندا سەرلەبەر بە لای حەقدا بچین. هەر ئەو حەقپەرستییەش دەبێ هەڵوەستمان پێ بکا لە ئاست بڕیاردان بەسەر ئەو خەڵقەدا.

ڕاهاتن و بینین و تەجرەبەی ئەو ساڵانەی سەرەتای ژیانم پاراستمی لە توندوتیژی و پەرگیری و نەبەخشین و فەرامۆش نەکردن. کە کەوتمە چالاکیی سیاسی هەمیشە من لەگەڵ بیروڕای بەرەو تێکگەیشتن و ئاشتبوونەوە و بەیەکەوە هەڵکردن و هاریکاریی بێخەوش بووم. ڕەنگە لێرەدا ڕەخنەیەکی بەهێزم لێ بگیرێ بەوەدا کە

بگوترێ ستەمکاریش، لە خاوەن ملّک و دەربەگ، ڕەنجی ڕەنجدەر دەبینێت و هەستی پێ دەکات کەچی هیچ حیسابی بۆ ناکات و سوور دەبێ لەسەر زولّم و زۆر... لە وەڵامدا دەڵێم: من قیاسم لەوە ناکرێ چونکە من بەچکەی ستەم نیم. ڕەنگ بوو ئەگەر هاندەری تەجرەبەی شەخسی بەلای بیری چاکیەوە نەبردبامایە، بەپێی باوەڕێکی پێوەی دەژیام لەسەر خەتێکی بێتەرەف لە نێوان ستەم و مێرخاسیدا برۆم... ڕەنگ بوو تەجرەبەی سەلبی بۆ ستەمدۆستیی ڕەتاندبامایە.

هاتوباتی مشتاغرِۆنان و دۆشاوگوشین، هەر دوویان، دەچنە ناو جغزی تەجرەبەی ماددی هەرچەند لەو تەرزە تەمەنەی وەها شلکی 7-8 ساڵیدا خەیاڵی نرخی ماددیی مێوژ و دۆشاو بە دڵمدا تێنەدەپەڕی بەڵام بەهەمەحاڵ بەرهەمی باغن و دۆشاوگوشین خافڵاندنێکی خۆشکەلەی پێوە بوو. لە کۆنەوە کۆگەی دۆشاو لە هۆبەی ئێمە هەبوو بەڵام کوێر بووبۆوە ئیتر لە هۆبەی تەنیشتمانەوە دۆشاومان بۆ دەگوشرا. وەک پێشتریش دەبنە خۆراکی زستانانەی زۆر شیرن. منداڵی وەکوو من بە لایەنی بەرژەوەندەوە هەر هێندەم دەزانی ئەو ترێیە چ بۆ مێوژ بێ چ بۆ دۆشاو نابێ خەسار بێ وەیا پیس بکرێ. لەو دەوڵەتپارێزییەش ڕەنگە زیاتر لایەنی کوڕێنی و خۆسەپاندن مەبەست بووبێ. ئەو وڵاغانەی کە قەڵتارەی ترێیان لە مشتاغدا بەتاڵ دەکران، منداڵان لێیان سواردەبوون و بۆ غار بۆ لای ڕەزەکانیان دەبردنەوە هەتا کاروانی دیکەیان پێ بهێننەوە سەر مشتاغ و دیسانەوە لێیان سوار بنەوە بۆ ناو ڕەز. من لەم سوارییە بەشداریم نەدەکرد، لەوەتەی بیر دەکەمەوە خۆمم پاراستووە لە لیقاوی میوە. میوەیەکی شیرەدارم دەست دابێتێ ئۆقرەم لێ هەڵستاوە تا دەستم شوشتووە، ئەوساش کورتانی وڵاغی ترێهەڵگر بە خۆی و بەو قەڵتارەی پێیەوە دەبەستراوە، هێندەی کە مەرەکەب بە دوێتەوەیە ئەوانیش ئاوی ترێی ڕەشیان پێوە بوو. هاوزاکانم گوێیان نەدەدایە ئەو وردپێوییە. شتی دیکەش هەبوون کە من بە هەندم هەڵدەگرت و ئەوان لێی بێغەم بوون.

سەروبەری مشتاغ و دۆشاو، بەتایبەتی دۆشاو، بە ئەستۆی کافیەی مەلایانەوە بوو ئەم ئافرەتە هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، یەکێک بوو لە سێ خوشکی بێبرا، پاش مام حسێنی باوکیان بە دوا یەکدیدا شوویان کرد. کافیە بە مێردەکەیەوە دانەنیشت ناشزانم بۆچی لێی تۆرا، بەڵام یەکسەر هاتە ماڵی باوکم. ئەوسا ڕەنگە عومرم سێ ساڵی بووبێ. کافیە لە ماڵمان مایەوە و شووی نەکردەوە. هەتا خەڵقندەیەک هەبووبێ

وەفادار و دڵسۆز و بێخەوش و جانفیدا لەگەڵ ئەو ماڵەی فراژی بووبێ بە کافیەی مەلایان ناگات. ئێمەی لە خۆی خۆشتر دەویست چ جایی لە خزم و کەسی. عومری خۆی بە ئێمە بەخشی. شانازی دەکرد کە پێی دەڵێن کافیەی مەلایان. مامم دەیگوت کافیە لە من بە کەڵکترە بۆ ماڵی کاکم. ڕاستییەکەی ئەم ئافرەتە مەخلووقێک بوو لە مەیدانی خۆیدا کەم هەڵدەکەوێ. دوای دەست هەڵگرتنی کاک تاهیری حەمە لاڵ لە سەرپەرشتی کردنی پێبازۆک، کافیە بوو بە چاودێر بێ ئەوەی باری کەسابەتی موڵکەکان دابلەنگێ، جگە لەمە ئەو مەسرەفەی کە ماڵی کاک تاهیری پێ دەژیا گەڕایەوە بۆ باوکم. سەڕای ئەمە، حەسارێکمان هەبوو بەرانبەر ماڵی خۆمان وڵاغی تێدا دەبەسترایەوە، کافیە بە ئیزنی باوکم کردی بە خان و کرێی لێ وەردەگرت و لایەکی مەسرەفی ماڵەوەی پێ جێبەجێ دەکرد، جێی وڵاغی جارانیشی تێدا دەبۆوە.

قسەی خۆمان بێ، زۆر لە برا کوردە کاسبکارەکانی دیوی کوردستانی ئێران لە سەردەشتەوە ماڵی قاچاغیان دەهێنا (کە بە مەزهەبی قەومایەتی و دینیش قاچاغ نییە) لەو حەسارەدا بە ئاگاداری لێکردنی کافیەی مەلایان ساغ دەکرایەوە، پۆلیس و قۆڵجیش نەیاندەوێرا خۆ هەڵقورتێنن. چنارۆکیشی بە ملەوە گرت بەتایبەتی شیناوەردی هاوینە کە هەر خۆی دەیچاندن و ئاوی دەدان.

لە ئیشی ژنانە هەر ئەوەندەی دەکرد، بەر لە پەیدابوونی کارەبا، پاش عەسران فانۆس و قوتیلە و لالەی دەسڕینەوە و نەوتی تێ دەکردن، خەڵقیش بە چاوی پیاو سەیریان دەکرد. جارێکیان «ڕادیۆی پارس» لەبەرنامەی داخوازی گوێگران گۆرانیەکی پێشکەش بە «کافیەی مەلایان» کرد. دواتر بە یەک دوو ساڵ وەها ڕێکەوت تەکلیفێکی کافیە ڕەت بکەمەوە، ئاوی لە چاوان گەڕا و گوتی «پارس» بە ماڵی تۆوە منی هەڵداوە ئێستا ئەوەیە وەڵامی تەکلیفم؟ خوێنەر! تۆ بایت لە جێی من چیت دەکرد؟ پێی ناوێ زۆری بە دوو بکەوم، ئەوەندە بەسە بڵێم لە 1975 وەهاوە خوشکێکم کەوتە دەرەوەی عێراق… لێرەوە بەو پیرییە، بە پشتی وڵاغ، شاخەوشاخ ڕۆیی هات خۆی گەیاندێ، کە گەڕایشەوە زۆری چەکمەسەری لەسەر ئەو سەفەرە کێشا.

کافیە دەنگخۆشێکی کەممانەندیش بوو. تا منداڵ بووم، ئەویش جحێڵ بوو بەیتی سەیدەوان و «سامسام»م لێ دەبیست بەو جۆرەی کە هەر لە دەمی فریشتەوە

دەردێت. لە بەیتی سەیدەوان کە بە زاری باوکی سەیدەوان و براکەی، مەلکەوانەوە شینی دەگێڕا و دەیگوت: «سەیدەوانم ڕۆ! مەلکەوانم ڕۆ!». بۆنسۆ لە دڵی گوێگر هەڵدەستا. لە بەیتی سامسام هەر ئەوەندەم لە بیر ماوە کە دەڵێ:

ئەسپی سامسام دەحیلێنێ
هەر چوار نالان دەچەقێنێ

گوتم ئەو هۆبەیەی ماڵی حاجی عەولای ساڵح و مام ئەمینی لێ بوو. کافیە بە یارمەتی یاڕابی، خێزانی مام ئەمین سەروبەری دۆشاوەکەی دەکرد، یەک دوو شەویش لای یاڕابی دەمایەوە. من حەزم دەکرد لەو کەسە ڕامێنم کە لە کۆلی دۆشاودا بەسەر توورەکە بووزووی ترێوە شەپتکێی دەکرد، ئاوی ترێش لە کۆلەوە پلووسکی دەبەست بۆ ناو سەتڵ، کە پڕ دەبوو سەتڵەکەیان بەتاڵ دەکردە ناو مەنجەڵێکی گەورەی بە سەر ئاگرەوە کە پێشتر گڵی دۆشاوی تێکرابوو. ئەو تلّپی لە گوشینی ترێ پەیدا دەبوو، پاشان هەندێکیان ئاو وەپاڵ دەدا و دەگوشرا و دەیانکولاندەوە وەک دۆشاوی لێ دەهاتەوە پێیان دەگوت «مەتێ». خەڵقەکە لەو مەتێیانەیان دەخوارد، دەستیان بۆ دۆشاوەکە درێژ نەدەکرد.

هاتوباتی مشتاغ داکردن و دۆشاو دەرهێنان چەند ساڵێکیان بەردەوام بوو لەو تەمەنەی کە من شتم بە بیر بێتەوە، دواتر وازی لێ هێنرا. وابزانم بە داشکانی بڕشت و پیتی کۆلکەمیوی ڕەزەکان لەبەر کەمخزمەتی، ئەو ترێیە نەما بکرێ بە مێوژ و دۆشاو، خەڵکیش مەشغەڵەتی زۆر بوو نەدەپەرژایە ئەوجۆرە کەسبەی وەها بیندرێژ. ڕەزەکانیش کە بوون بە میرات، خاوەنیان زۆر بوون و ڕووپێویان لە پشکی میراتگران کەم بۆوە. بە نموونە ڕەزی حاجی مەلا ئەحمەد (مامی باوکم) ساڵێکیان لە سەردەمی ئەودا 14 عەڵبە مێوژی دابوو کە دەوری 450 تەنەکە دەگرێتەوە، دوای خۆی ڕەزەکە بوو بە 7-8 بەش.

بەهەمەحاڵ تاکوو ئەم ڕووپەڕەیە لەکەسبی باغەوانی پێچرایەوە منیش تەمەنم بۆ پەروەردەی درەخت هەڵکشا. دوای هاتنی کافیە بۆ ماڵمان بە دوو سێ ساڵ ئافرەتێکی دیکە «عەیشێ» ناو، خەڵقی گوندی گۆمەشین، ناوچەی ڕۆژاوای کۆیە، ڕووی لە ماڵمان نا ئەم ئافرەتەش وەکوو کافیە لامان مایەوە و بەجێی نەهێشتین. هەرچەند خۆی شیری نەبوو، سێ خوشک و برایەکمی گەورە کردن. بۆیان دایک و

دایان و دۆست و هەموو شتێک بوو. هەتا یاعیسمەت دایانم بوو ئەم دوو ئافرەتە، کافیە و عەیشێ، بە ئەمری ئەو دەبزاوتن.

هەر سێیان بووبوونە سێ کۆڵەگەی ژێر ساباتی ماڵمان، یاریدەدەری دیکە لە ژن و لە پیاو دەهاتن و دەڕۆیشتن بەڵام ئەمانە وەک پەندی کە دەڵێ «ئاو دەڕوا زیخ دەمێنێ» نەبزووتن. تەنانەت کە یاعیسمەت لە 1929 شووی بە مامەی وەستا برایم کرد (مامە لە خزمەتی باوکم خەریک بوو) لە دراوسێیەتیی خۆماندا ژیا و ڕۆژانە چەند جارێکان سەری لێ دەداین، بە شەویش مەگەر تۆفان بوایە دەنا تا دەمی نوستن لامان دەبوو. بیست ساڵێک دواتر عەیشێش بوو بە هەوێی یاعیسمەت.

ڕۆژێک دەمەو عەسر لە ڕۆژانی بەهاری 1965 یاعیسمەت بە ژوور کەوت، بە ڕوویدا دیار بوو دڵی ناڕاحەتە دیتمی بۆم هات و گوتی: لە خەونمدا سێ هێشوو ترێی ڕەشی گەورەم خوارد، خوا ساتران نەدا… وەها ڕۆیشتووە ترێی ڕەش لە کژی خۆی نەبێ خەون پێوە دیتنی بەدیومە. لە 13/5/1965 من بە ماڵەوە هاتمە بەغدا زۆری نەبرد هەر لەو سێ ساڵەدا «عبدالرزاق»- تاکە کوڕی یاعیسمەت لە شووی دووەمی- بە نەساغی هات بۆ لای دکتۆر. لە خەستەخانە سکیان کردەوە دەرکەوت شێرپەنجەیەتی… لە ماوەیەکی کەمدا جوانەمەرگ بوو. چەند ساڵێک پێشتر ژنێک لە ناسیاوەکانمان فنجانی قاوەی بۆ گرتبۆوە پێی گوتبوو بە گەنجی دەمریت. سەیری ڕێکەوت!! بەڵام جارێ ڕێکەوتی خەونەکە ماویەتی. لە دوای چەند ساڵێک فەتحی کوڕی گەورەی یاعیسمەت، ئەویش شێرپەنجەی لە شەویلکەی هات بەڵام بە فڕێ دانی شەویلکەی ڕزگار بوو. لە 1971 خوشکێکی من تووش هات: لە 14 ی تەمووزی 1972 جوانەمەرگ بوو. عەیشێ ژیا تا دەوری 1970 بە نەساغی لە خەستەخانەیەکی بەغدا ئەمری خوای کرد. کافیە لە کۆیێ، 1982 کۆچی دوایی کرد. بەر لەوان یاعیسمەت مردبوو.

ئەم سێ ئافرەتە لە ڕووپەڕەی ناوەوەی ژیانی منداڵیمدا شوێن پەنجەیان هەیە، بەتایبەتی یاعیسمەت. ئەگەر ڕەوا بایە لە گەشتنامەی ژیانی کەسێکدا جێ بۆ کەسانی دیکە بکرێتەوە دەبوو گەلێک بەدرێژی لەسەر هەرسێکیان بنووسم. لێرە بە دواوەش بەپێی داخوازی بابەت باسیان دێتەوە.

بەزمێکی بچووکی یەک ڕۆژە لە چنارۆک سماقڕنین بوو. هەتا بوومە 10-12 ساڵیش لەگەڵ سماقڕنان دەچووم و هەر تەماشاچی دەبووم. چۆمیکمان هەیە لە دامەن ڕەزەکانی هۆبەی مەلایان (چۆمی مەنجەڵی گیپە ئاوبردوو) پێی دەڵێن چۆمی «مەلەک ڕحان» بە ناوی قەبری ئەو ئافرەتە پیرۆزەوە، دارسماقی زۆر بوو. بە دەوری چەمەڵێنی کانیە خاتوونیش دارسماق هەبوون. لە بەرەو کۆتایی ئاب و سەرەتای ئەیلوول گوڵەسماق کامڵ دەبن و دەبێ لێ بکرێنەوە دەنا دانە سماقەکانیان دەوەرن. «میر کچان»ی سماقڕنین عەیشێ بوو، دەستەودایەرەی لە ئافرەت و مێرد منداڵان کۆ دەکردەوە و بە دوای خۆی دەدان و لەو دوو چۆمە سماقی پێ دەڕنین.

کەسبی ڕەزەوانی بە وردەیە، هەرچی جۆرە درەختێکی یان شیناوردێکی تێیدا بێ، پێوە خەریکبوونی دەوێ. بەرهەمێکی لە کژی خۆیدا کۆنەکرێتەوە بە فیرۆ دەڕوا. ساڵێکی بەرازی هەبێ لەوانەیە بە لێ غافڵبوونی دوو شەوان ڕەنجی ساڵێک لە خزمەتی ڕەزی مێو بچێتە هیچە. مەشوورە دەگوترێ ترێ دوژمنی زۆرە، هەر لە دز هەتا سەگ، هەتا بەراز، هەتا گورگ و ڕێوی و چەقەڵ و دورەشێر، هەتا زەردەواڵە هەمووی ئاشقە ترێیە. هەنجیری تۆڵیخاوە ئەگەر زوو نەکرێتە ئەستووکە هەنجیر دەترشێ... هەرمێی گەیشتوو بوەخرێ بڵ دەبێ بەتایبەتی سێوهەرمێ... هەنار بە زۆری دەقەڵشێ... سماق دەتۆقێ... هەروەها پێبەپێی هەموو سەروبەرێکی باغەوانی.

لە تێکڕای کەسبی باغەوانی و لەزەت بردن لە ئەرکەکانیەوە فێر بووم بە دڵ حورمەتی کژ و کاتی کەسابەت بگرم ئەگەر چی خۆم تێیدا بەرپرس نەبووبێتم. کە بەرپرسیش ڕووی لێ نام بە قەدەر مەراقی دینداری بە وەسوەسە لە ئەدا کردنی نوێژی سبەینان مەراقم بوو لە دەمی پێویستدا بە سەر شیناورد و خەلە و خەرمان و درەخت ڕابگەم. من دەزانم ڕنجبەر و ڕەنجدەر چەندیان لێ حەڵاڵە ئەو ڕزقەی پەیدای دەکەن، چەندیش حەرامە لە غەیری خۆیان. دەڵێن پێغەمبەر (د) دەستی کابرایەکی ماچ کرد کە هەستی کرد بە هۆی کەسابەتەوە دەستەکە زبر و ڕەق بوو، بەڕاستی ئەو ماچە پاکترین ماچە.

هەر لەو ناو شاخوداخە و دەشتودەرە بە فەرمانی قواقیع لە زوویکەوە بەزەییم بۆ وڵاغ و ئاژەڵ بزووت، مەگەر وڵاغ زۆر بێمەعنایی کردبێ دەنا نەقیزەم تێوە نەوەژاندووە. وڵاغ بەستەزمانە، ئەرکدەرە، بەسوودە، بێزەرەرە، بەوەفایشە، دەرکی خاوەنی خۆی لە هەموو بەهەشتی دنیا پێ خۆشترە، لەگەڵ ئەهلی ماڵەوە ڕادێت و

دەبێتە ئاشنا، نافەرمانی لە بیر دەچێتەوە، تا هۆشی کەرەوارانەی بە شتان بشکێ دەیەوێ بە مجێزی خاوەنی بکات.

لە وەفاداری ئەم نموونەیە بە شایەد دەگرم، پاییزێکیان ڕێگر کاروانی چەڵتووکی مەلازادانیان برد بە وڵاغەکانەوە. گوێدرێژێکی ماڵی خاڵە عیززەتی مەلا حەبیب پێیان دەگوت کەرەگێلە بەگەڵ تالان کەوت. دوای دوو ساڵ، ماڵ لە چنارۆک بوون ڕۆژێکیان ئەو کەرەگێلەیە بۆ خۆی لە کاروانی بەرەو کۆیە دەرچوو هاتەوە سەر پەتی خۆی لەو شوێنەی کە جاران لێی دەبەسترایەوە لەپشت ماڵی خاوەنیەوە.

منداڵی شارستان ئەگەر لە ماڵی خۆیدا وڵاغی نەدیتبێ و بەخێوی نەکردبێ بیر لەوە ناکاتەوە وڵاغیش ماندوو دەبێت و حەسانەوەی دەوێت. برسی دەبێ، خزمەتی گەرەکە، پێی خۆشە لەگەڵی بەرەحم بێت. منداڵە شارستان وا دەزانێ وڵاغ وەکوو پایسکل بێهەست و هۆشە و چ داخوازی نییە. هەر ئەم کام زانییەیە وا لە دانیشتووی شارستان دەکات کاتێک کە دەچێتە لادێ بەسەردان یان بە ئیش دەست ناپارێزێ لە پچڕینی کاڵکوکۆڵکی شووتی و کاڵەک وەیا لێکردنەوەی میوەی درەخت، لە بازاڕی شار بە خەیاڵیدا نایەت دەست بۆ یەک بۆلوە ترێی دووکانی بەقاڵ ببات. من ماڵە فەلاحی شەریکی خۆمم دیتووە ئێستری مردووە شینی بۆ گێڕاوە. بەهەمەحاڵ ڕەزداری و وڵاغداریش لەو کەسبانە بوون چنارۆک لێیان شارەزا کردم، تا ئێستاش بۆ هەردوویان بە پەرۆشم.

لایەنێکی سەربە ماددی و مەعنەویی تەجرەبەی ژیانم لە چنارۆک مێوانداریيە. لە سەردەمی باوکم هاوینان بە دائیمی فەقێ و موستەعیدی بە دەرس و دەور لە گەڵمان دەبوون. ساڵێکیان ژمارەیان بیست و سێ کەس بوو. ئەو ساڵە بە درێژایی هاوین هەموو ڕۆژێک لە ماڵمان ژنان لە دوای جەمیی سبەینەوە تا عەسر خەریکی نان کردن دەبوون تەنها ناوناوە یەکدوانێک دەستیان لە نان کردن هەڵدەگرت بۆ ڕاپەڕاندنی کاری دیکە و حازر کردنی جەمی نیوەڕۆ. دەبوو سەعاتەها نان بە ساجەوە بنرێ ئنجا بەشی فەقێ و ئەهلی ماڵەوە و مێوانێکی ڕوومان لێ بنێ، بکات. فەقێکان یارمەتییەکی ڕاتبەی ئێوارانیان لەو ماڵانەوە بۆ دەچوو کە لە هۆبەی ئێمە بوون.

ماڵی مامیشم بەپێی بۆ لووان ئەرکی هەڵدەگرت بەڵام زۆری دەما بۆ ئەرکی سەرشانی باوکم. هەروا لە بیرمە باوکم دوو ڕەزی «باریکە» و «قالە کەرکوژ» ی لە قەبەڵ کردن، بە هەردوویانی بایی هەفتەیەکی نە کردن. لەلایەن میوەوە خاوەن ڕەزەکان درێغیان نەدەکرد، هەریەکە بەقەدەرحاڵ دیاریی ترێ و هەنجیریان بۆ دەهێنان. بەڵام هەرچۆنیک بووبێ، هەبوونی فەقێکان ئاوەدانییەکی خۆش و بە تاموشامی پێک دەهێنا بەتایبەتی بۆ من. بە ڕۆژ پێکەوە دەخافڵاین، ئێواران دەچووینە گەڕانی قەد شاخ، گەلێک شەویش بەیەکەوە کۆدەبووینەوە بە دەوری میوەی لەبار و چایەی دەم کێشاودا. دۆستێکی لێمان مێوان بووبایە ئەگەر عەلاقەی لەگەڵ دین و خوێندەواری هەبوایە شەو لای فەقێکان دەنوست. هەندێکیان دەرسی زانستەکانی مەکتەبیان لای من دەخوێند. یەک لەوان مەلا عەوڵای بنگردی، لە ئیمتیحانی پۆلی شەش دەرچوو، وازیشی لە مزگەوت هێنا بۆ وەزیفەی دنیایی.

ئەو مەلا عەوڵایە گوماناوی ببوو لە عەقیدەی سەربە غەیبی خۆی. تەنگەتاوی وەهای لێ کرد جارێکیان لە دانیشتنێکی قەوغای چنارۆک کە مەلای میوانیشی تێدا بەشدار بوو، بە ڕووی سوورهەڵگەڕاو و لێوەلەرزەوە گوتی: زانایانی فەلەک هەموو کەلێن و قوژبنی فەزایان کەشف کردووە ئەدی ئەو بەهەشتەی بەقەدەر ئەرز و ئاسمان پانە لە کوێیە؟... دەمەتەقەی دوورودرێژی لەسەر پەیدا بوو بێ ئەوەی نەتیجەی ببێت. بەڵام دەبێ بڵێم ئەم گومانەی نەیخستە سەر بێباکی لە نوێژ و ڕۆژی و عیبادەت. دوای دەرچوونی لە ئەزموونی بەکالۆریای قوتابخانەی سەرەتایی و پاش ماوەیەک بوو بە «امام طابور». کتێبەکانی چەند ساڵان لای ئێمە بوون هەتا بەر لە مەرگی بەدوایدا ناردنەوە و بۆی چوونە کەرکووک. فەقێکان لە هەموو لایەکەوە بۆ خوێندن دەهاتن نەک هەر لە هەرێمێکەوە، بە تێکڕایی تاقمێکی هەمەڕەنگ و هەمەزەوقیان لێ دروست دەبوو. لە سییەکاندا دوو جاران وەها ڕێککەوت کۆنە فەقێی باوکم لە دیوی ئێرانەوە بێن بۆ ئیجازە وەرگرتن، هەر دوو جاریش ماڵمان لە چنارۆک بوو، یەکیان مەلا ساڵح ئەوی دیکەیان مەلا جەلال. وا بزانم مەلا جەلال بە لەهجەی خۆی و تاقمەکەیدا دیار بوو شکاکە. مەلا ساڵح موکریانی بوو.

لە باوکمم بیست دەیگوت: حەزم دەکرد خوا گوزەرانێکی کافیی دابامێ، لە چنارۆک نیشتەجێ بم، چوار پێنج موستەعیدی زیرەک و بە مەراقم دەرس دابان، چەند

بەردەستێکی چالاکیش یارمەتییان دابام لە خزمەتی ڕەزەکان، ئەگەر بە هەموو عومرم شارم نەدیتبایەوە باکم نەبوو. ڕاستییەکەی من خۆیشم دە دوازدە ساڵ دەبێ بە تەواوی لە ژیانی شار وەڕزم، حەزم دەکرد لەو شوێنەی کە خۆم دەست نیشانم کردووە، لە چنارۆک، خانوویەکی مناسبم بۆ دروست بووبا و تێیدا ژیابام... بەڵام حەز کردن شتێکە و لووان شتێکی دیکەیە. پێوەندی من بە فەقێ و مەلا هی هەموو عومرە، چی لێرەدا دەیڵێم شتێکی زێدە کورتە لە موناسەبەی باسی مێوانداریيەوە هات.

لە شار بێ مێوان نەبووین بەڵام لە چنارۆک حاڵەکە دەگۆڕا، لە لایەکەوە هەرچی کەرەستەی پێوە ژیانی خۆمان و ئەسبابی مێوانداری هەیە دەبوو لەگەڵ خۆماندا بۆ چنارۆکی بهێنین، لەلایەکی دیکەوە دەبوو ساباتی مێوانان و ئالیکی وڵاغیان و بایی خزمەتیان لە خەڵق و خوا تەئمین بکرێ. لە لای سێیەمەوە مێوان و فەقێ تێکیان دەکردەوە و دەبوو خزمەتی هەموان وەکوو یەکدی بکرێ. لە لای چوارەمەوە مێوانی چنارۆک گەلێک پتر بوون لە هی کۆیێ. هەر نوقسانیەکی هەشبوایە لە ماڵەوە چاری نەدەکرا چونکە دەست بە بازاڕ ڕاناگا هانای ببەیتە بەر. بەرچاییەکی لایق بە میوان بێ، دەبوو لەو چۆڵ و هۆڵە کاردروستایی بۆ بکرێ، هەموو سبەینان لە کانیکەندەوە ماستمان بۆ دەهات بەڵام کە مێوان هەبن ماستی ئەوتۆیی بەش ناکات ماستاوی نیوەڕۆ چۆن چار دەکەیت؟ خولاسە مێوان داکردن لەلایەن ماڵێکەوە خۆی شارستانی بێت و بۆ ماوەی دووسێ مانگ خۆی مێوانی دەشتودەر بێ، ئەرکی زۆر گرانترە تا ئەوەی هەر لە شار بەخێری بهێنیت وەیا خۆی لە دەشت نیشتەجێ بێ. ماڵی ئێمە کە دەچووین بۆ چنارۆک چواریەکی کەلووپەلیشمان بۆ نەدەگوێزرایەوە، ماڵی کۆیەمان هەمیشە بە ئاوەدانی دەمایەوە هەتا پووری گەورەم یافەخرە بەرحەیات بوو، بە خۆی و کاکە موقتەدیر و بەردەستێک، ماڵەکەیان بە ئاوەدانی ڕادەگرت و هەمیشە خەڵکی دەر و جیرانیان لێ کۆدەبوونەوە. دوای ئەو ماڵێکمان لە ناسیاوان ساز دەدا بێتە ماڵەکەمان تا دەگەڕێینەوە لە چنارۆک. هەرچی ئەسبابی قورس هەبوو بەجێ دەما، ئێمەش گۆیا بە سووکبار دەچووینە ئەو دیوی شاخەکە...

دوای باوکم فەقێ نەمان بۆ چنارۆک. مامم هەر لە شار دەرسی بە فەقێیان دەگوتەوە، بەڵام مێوان زیادی کرد. زۆر کەس لە سەردەمی باوکمدا تەقیەی دەکرد

له هاتن له شەرمی باوکم، جگە لەوەی کە هاوعومرەکانم لە دۆست و ناسیاو چالاکتر بوون لەوانەی بەپێی عومر بتوانن لە باوکم مێوان بن.

لە ساڵی 1943 بە دواوە داهاتی تووتن خەڵقێکی زۆری خستە سەر پشتی وڵاغ و دەستەڵاتی سەردانی خەڵقی پتر پێ دان لە جاران. لە سەردەمی مندا لۆکس و ڕادیۆش پەیدا بوو... هەرچۆنیک بێ، مێوانداری ئەرکی زۆر بوو بەڵام لە هەمان کاتدا دەربوونەیەکی فرەوان بوو بۆ چاوکرانەوە و بەخۆدا ڕاپەرموون و خەڵق ناسین و لای خەڵق ناسران. کە جەم حازر دەبێت و ڕیزێکی هەشت کەس دە کەس، کەمتر زیاتر، لەوانەی سینی خواردەمەنییان بەسەر سەرەوەیە لەماڵەوە بەرەو مێوان دێن دیمەنێک جلوە بەست دەکەن بۆ مێوان و خاوەن ماڵیش پڕە لە هەستی حەسانەوە و ڕەزامەندی و بەولاتریشەوە. خۆ ئەگەر ئەو ڕیزە بوو بە پازدە کەس یان بیست کەس و زیاتر هەر دەبێ سەڵەواتی بۆ لێ دەی، بەڕاستی زۆر جارنیش بە وەجهی نوکتە ئەو سەڵەواتە لێ دەدرا بەڵام بە دەقێکی ئەوتۆ لەگەڵ باری نەفسیی ئەو کۆمەڵەی وا چاوەنۆڕی خۆراکن بگونجێ، بە زۆری یەکێکی نوکتەباز و لێ سەلمێندراو پێش ڕیزی سینی هەڵگرتووان دەکەوێت و دەنگ هەڵدەبڕێ، تووری پاک، شێلمی کولاو، خەڵقەکەش لێی دەقۆزێتەوە و دەبێتە دوو خۆشی.

مەسەلەی ڕادیۆش هەروەها، بەڵێ ئاسان نییە هەموو دوو ڕۆژان جارێک، دوو پاتری و سێ پاتری بە زەلام و وڵاغەوە بچێ بۆ شار و ئێوارێ پاتری شەحنکراو بگەڕێتەوە بۆ ناو شاخوداخ، بەڵام بێگومان دەنگی ڕادیۆ لە چۆڵستانی ئەو سەردەمانەدا تا بڵێی نەشئەبەخش بوو، بەڵگەشی بەدەستەوە دەدا بۆ دەستەڵات ڕاشکانی خاوەنەکەی بەسەر حاڵوباردا.

لەو دەمەڕا کە باوکم هەموو ساڵێک دەهاتە چنارۆک تا ئەو ساڵەی دەستم هەڵگرت لە چوونە چنارۆک، هاتوباتی مێوان و فەقێ و گەلانگەدان و پەنابەر و بە درەختەوە خەریکبوون و شیناورد و ڕەنێوهێنان و وڵاغ بەخێو کردن و تێکڕای سەروبەری ژیانی ناو شاخوداخ و دەشتودەر بۆ من بریتی بوو لە ڕاهاتنم و ئامادەبوون و لەخۆ ڕادیتن و بەهەڵکەوت وێران و لە تەجرەبە دەرچوون و چاوکرانەوە. وەنییە نهێنییەک ئاشکرا بکەم کە دەڵێم بە درێژایی مێژووی جەلیزادان ئەرکی سەرشانی براگەورەی بنەماڵەکە زۆر قورستر بووە لە داهاتی عادەتی، قۆناغ هەیە بە دەست و دیاریی خەڵق شاهانە سووڕاوە، تەکیە و خانەقا داهاتی بێ منەتی هەبووە، بەڵام

ئێمەمانان بە داهاتی حەڵاڵی بە ئەرک و مەسرەفی خۆمان کەم بووبێت یان زۆر بووبێت ڕێگەمان لە چرگەنیی گوزەران دەر کردووە. کورد گوتەنی «خوا وەهای بڕیوەتەوە» هەندێ ساڵ لە سەردەمی باوکمدا پاوانی جەلی و سناوە و چنارۆک لەنگەری ئەرک و مەسرەفی ڕادەگرت. ساڵێکی لە وڵاتی هەولێر و دزەییاتی کەمباران بووایە مێگەلیان دەهات بۆ پاوانەکانی وڵاتی کۆیە و ڕانیە، خەڵقەکەی ئەو گوندانەش کە سەربە جەلیزادانن پاوانەکانیان واز لێ هێنابوو بۆ حیسابی باوکم، پاوانەکانیان دەفرۆشت و نرخەکەیان دەهێنایە چنارۆک. هەڵبەت لە بری ئەم خزمەتە و بێ ئەو خزمەتەش هەر تەنگوچەڵەمەیەکی تووشیان هاتبایە هانایان بۆ باوکم دەهێنا. یا خوا ڕوویان سپی بێ، ئەوانە کە لەگەڵ برادەر و خزم و کەسانێکی بە سەریان دەکردینەوە لە چنارۆک بە دەوری یەک سفرەوە دەستمان بۆ خۆرش و میوە دەبرد، لەو برادەرانەش بە زیاد بێ کە یەکماڵی و یەکدڵی و سۆزی برایەتی بەو شاخوداخەی هەڵدەگێڕان خانەیان ئاوەدان دەکردینەوە. خۆزی ئیمکان هەبوایە سەرلەنوێ بەو ژیانەدا هاتبامایەوە، بە هەموو ئەرک و ماندووبوونیەوە... بە هەموو کەم دەرامەدی و ناگزووریەوە... بە هەموو ئێشک و تفەنگ لە گۆڵم گرتنی شەوانیەوە...

لایەنێکی زێدە تایبەتی تین و تاوی چنارۆک بۆ دەروونم دیمەنی چەشمەندازەکەی بوو، زۆر بە دەگمەنی، ئەو ڕیزە شاخانەی دوور و نزیکی یەک لە دوای یەک و یەک لەوی دیکە بڵندتر هەر لە چیای شێخ زەردەوە کە هێندەی چیای چنارۆک بڵند نابێ، پێبەپێ، تا لووتکەکانی قەندیل کە بەفری لێ نابڕێ و هێندی پنۆکی هەتا بارانی پەڵەش لە چنارۆکەوە دیارن، دەڵێی بۆ تاکە مەبەستی جوانی و تێوەڕامان وەها ڕێک خراون، تەنانەت جارێکیان خێزانێکی بەسرایی لەگەڵ دۆستی کۆیی سەریان لێ داین، کە زانییان ئەو ڕیزە شاخانە ئاوایی و عەشرەت و کشتوکێڵی لە نێواندایە تەواو تەواو سەیریان هاتەوە و یەکێکیان گوتی بڕوا بکەن هەر وامان زانی بۆ جوانی وەها ڕێک بۆتن... جوانیی ئەم دیمەنە لەو ڕووەی کە چنارۆک سەیری دەکات هەرە جوان و ڕەنگین و ئێسکسووکە لە هەموو ئەو شوێنانەی لێوەیان دیارە، بەڵام کە زۆری لێ دوورکەوتیتەوە وردایەتیی جوانیەکە چاو تێی بڕ ناکات. ئەمەشی لێ بترازێ، چەشمەندازی چنارۆک تایبەتیەکی هەیە، کەم، زۆر کەم، بۆ شوێنی دیکە ڕێک دەکەوێ، لە ماوەی پەنجا مەتردا بۆ هەر لایەک بڕۆیت دیمەن دەگۆڕێ و

هەر شوێنە نەشئەی سەربەخۆی خۆی هەیە. لە مانگی ئابدا ڕۆژی وەها دەبوو کە لە کەپرەکانی قەدی «گردی دارتێل» ەوە سەیری ڕەز و چۆم و گردە شینکەکانت دەکرد گەشایەکت دەهاتە بەر چاو نەتدەزانی لە چییەوەیە. بەینێک وەهام دەزانی هەر من بە وەهم ئەو گەشاییە دەبینم تا لە کاک مەجیدی ئامۆزامم پرسی، دەرچوو ئەویش ئەو هەستەی کردبوو بەڵام نەیدەدرکاند. بڕوا ناکەم ئەو حاڵە دوای گۆڕانی تێکڕای وەزعی چنارۆک بۆ هیچ چاوێک دەرکەوێتەوە، هەر نەبێ هاموشۆی بێپسانەوەی ئۆتۆمۆبیل ڕێ نادا هەست تەنک بێتەوە بۆ دیتنی دیمەنی وەها ئەفسانەیی.

بەولای جوانییەوە دیمەنی چنارۆک بۆ من لێکدانەوەیەکی ورد و بەردەوامی پێک هێنا تا ئێستاکەش لە باری وەهادا سەر هەڵدەداتەوە، لە منیش بەولاوە کەسی دیکە بە خۆیەوە خەریک نەکردووە، ئەمەش یەکەم جارە لێم دەبیسترێ. ئێواران لە سەیر کردنی ئەو دیمەنە نازدارەوە، کەم کەمە، سەرنجم بۆ درێژبوونەوەی سێبەری گرد و بەرزترەکانەوە کشا تاکوو لە کۆتاییدا گەیشتم بەو پلەیەی کە لە درێژبوونەوەی سێبەرەکان و تێپەڕینی سێبەری هەندێ شوێن بە سەر هەندێ شوێنی دیکەدا بتوانم بزانم کوێ لە کوێ بەرزترە. بە تێوەڕامان و لێکدانەوەی ساڵ لە دوا ساڵ حیسابێکم بۆ دۆزرایەوە جێی باوەڕم بێ لەوەدا کە بڕیار بدەم فڵانە لووتکە شاخ لە بەرزاییدا ڕەفیقی فڵانە شوێنە لە شاخەکەی بەرانبەری. بە نموونە، ئێواران سێبەری چیای ئاوەگرد لە سەرەتای هاویندا بەبەر هەرێمێکدا درێژ دەبێتەوە کە چیای کۆسرەت پەنای لێ دەکات و لە چنارۆکەوە نادیترێ بەڵام پێبەپێی داکشانی ڕۆژ لە گەشتی بەرەو پاییزدا، سێبەرەکی ئاوەگرد دەگوێزێتەوە بۆ شوێنی دیار لە ڕیزە شاخی ئاسۆس، تاکوو لە ئاکامدا دەپەڕیەوە بۆ ڕیزە شاخی پژدەر، لای دووپەزە و بڵفەت... پاییزان دەیداوە شاخی کێوەڕەش بەسەر ڕانیەوە ئنجا سەرنجم لێی دەگرت تا ئەو دەمەی تیشکی ڕۆژ تینی نەدەما سێبەر بۆ شاخە نزمەکان دروست کات...

هێندێ جار بە سەر شاخی چنارۆک دەکەوتم و لێی دەمامەوە تا دەمی نزیک ئێوارە کە ئیتر لە ڕۆژی بێگەردیشدا سێبەری شاخی گەرمێن بە شاخی کوێستانەوە زڕ دەبێت و وەک «شبه ظل»ی لێ دێت و حیسابی لە سەر هەڵناستێ، لەو سەر شاخەوە ڕۆژم دەدیت بە ئاسمانەوە، لە مێشکی خۆمدا لێکم دەدایەوە ئایا ئەگەر ئەرز خڕ نەبوایە و ڕاستایی بوایە، ئەو بەرزاییەی کە ڕۆژ تێیدا جارێ تیشکەکەی

سێبەر پەیدا دەکا چەند بڵندتر یان نزمتر دەبوو لە ترۆپکی ئاوەگرد؟ واتە ڕۆژم دادەنا لەسەر بەرزاییەکی مەوهووم کە خڕایی ئەرزی تێدا خوێندرابێتەوە، بەرزاییەکەم دەگرت بە بەرزایی ئاوەگرد و سەیری سێبەرەکەم دەکرد لە چیای پژدەردا و بڕیارم دەدا لەسەر هێندێ کە ئاوەگرد بڵندتر یان نزمترە لەو شوێنەی سێبەرەکەی گەیشتۆتێ، لەوەدا حیسابی ئەوەشم دەکرد کە ئەگەر ئەرز تەختایی بوایە شاخەکەی پژدەر لە ئاست ئاوەگرددا بڵندتر خۆی دەنواند لە ئێستاکەی... خولاسە ئەگەر لە بارێکدا بوومایە بە سەر بڕیارێکەوە بەند ببم بە لێکدانەوەی ورد و قووڵی ئەوسای منداڵیم، شوێنیکم دیاری دەکرد لەو شاخەی کە سێبەری ئاوەگردی پێوە دیار دەبێ و دەمگوت تا ئەم نوختەیە لە شاخی ئاسۆس یان پژدەر بارتەقای ئاوەگرد بێ، تەجرەبەکەم لە زۆر ڕۆژاندا بەرانبەر چەندین نوختەی دیکە لە چیاکانی کوێستان دووبارە دەکردەوە، دەشمەویست لە ڕۆژی ڕوون و بێگەرددا تەجرەبەکەم بکەم تاکوو سێبەر لە ئێوارەدا باشتر دیار بکەن و پتر دەوام بکەن.ساڵە و ساڵیش خەریک دەبووم تاکوو خەریتەیەکی وەهمکردم لە دڵی خۆمدا بۆ بەرزایی ئەو شاخانە ڕێک یەخست، چاوێکیشم دەبڕیە ئەو کتێبانەی لەو سەردەمەدا باسی جوغرافیایان دەکرد و بەرزایی شاخەکانی دنیا و ناوناوە هی وڵاتی خۆشمانیان تێدا دەگوترا. هەر ئەو سەرنج دانە بوو منی خستە سەر هێندێ کە دێی هێرۆی پژدەر بە سەد مەتر لە لووتکی چیای هەیبەسوڵتان بەرزترە.

مەراقی بە یەکدی گرتنی بەرزایی شاخەکان لەگەڵمدا دەهاتەوە کۆیێ بۆ ئەوەی بزانم سەربانی فڵانە کۆشک و فڵانە کۆشک کامیان لەوی دیکە بەرزترە. لە کژی زستاندا ڕۆژ بە نیسبەت خانوەکانی و درەختی بەرزی ناو حەوشەکانی پتر ڕادەکشان، سێبەری شار لە ئێوارەکانی زستاندا دەپەڕیەوە بۆ بەری قەبرستانی دەروێش خدر و بەولاوەترەوە بۆ گردی باویان و هەڵەت و پەڵەتی بەرەو بناری شاخی چنارۆک. دار تووێک هەبوو لە حەوشی مزگەوتی بابیزاغا لە هەموو درەختەکانی کۆیێ بەرزتر بوو، دیمەنیشی بە خۆی و گەردن کێلی و دوو لکی سەروویەوە کە وەک دەستی دوعا بەرەو ئاسمان هەڵبڕابوون دڵمی بۆ خۆی دەکێشا و بەزۆری تێی ڕادەمام و دواتر فکرم لێی کردەوە، سێبەریشی بە مەودا لە سێبەری بەرزترین کۆشک و درەختی شارەکە دوورتر دەچوو. تەواوێکیش دوای ئەو خانوانە و درەختانەی لێوە نزیکن هەتاوی لێ دەبڕا. بۆ دیتنی دیمەنی ئەو درەختە گەلێک

جار بە دەوری شاردا دەخولامەوە تا بزانم لە هەموو لایەکەوە چ شکڵگۆڕی دەکات و چەند گەردن کێل خۆ دەنوێنێ.

بێ ئەوەی دەنگ بکەم لەگەڵ خۆمدا بەرزایی زۆر جێگە و خانووی کۆیەم لێکدابۆوە. بەو درەنگە لە ساڵی 1956 کە بۆم ڕێککەوت تەعمیرات لە کۆنە خانووماندا بکەم، میزانی وەستای بەننام بەکارهێنا بۆ تاقی کردنەوەی ئەو بەرزی و نزمیانەی بڕیارم لەسەر دابوون، دەمهێنا میزانەکەم بە ڕاستی و ڕێکی لەسەر شتێکی لووس دادەنا و چاوم دەخستە سەر تەختایی پشتی میزانەکە و لەو شوێنەم دەگرت کە مەبەستم بوو. لە گەلێک کۆنە حیسابەکەی منداڵیمدا نیشانم پێکابوو، لە هەندێکیشیان سەهووم کردبوو.

حیکایەتم لەگەڵ چنارۆک زۆری بە بەرەوە ماوە، جارێ لێرەدا دەستی لێ هەڵدەگرم، دواتر چەندێکی ڕووداوی ئەم گەشتە پێویستی بێ، چنارۆک دێتەوە ناو حیکایەتەوە. لێرە بە دواوە دەچمەوە سەر شریتەی تەمەنی منداڵیم کە بەرەو هەراشتریەوە درێژ دەبێتەوە. خوێنەریش نابێ وەڕز بێ چونکە گەشتی ژیان لە ساوایی و منداڵیدا بە ناچاری ڕووبەڕووی شتی وردیلەبابەتی کەمبایەخ دەبێ. هەر ئەو وردیلە کەمبایەخانەش دەبنە کێڵگە بۆ ئەو تۆیەی لە عومری کامڵیدا گوڵ دەکات. دەمەوێ بە قەدەر حاڵ پاشخانی هەوەڵ ساڵەکانی عومرم ڕوونکەرەوەی ژوورخانی تەمەنی گەیشتنم بێ، ئەمەش کارێکە تا بڵێی زەحمەتە، هەر نەبێ لەبەر ئەوەی هەموو شتێک ناشێ بگوترێ. وابزانم فرانک هاریس لە کتێبەکەی خۆی *My life and loves* دا لە هەموو نووسەرێک پتر ڕووداوی شرایەوەی ژیانی خۆی، بێپەردە، باس کردووە. لە کەس داوا ناکرێ ئەو کارە بکات، ڕەنگە بێلزوومیش بێ چونکە دەشێ نووسەر حەقیقەتی هەڵکەوت و هەڵوەست لە شتی گرنگدا بە دەستەوە بدات بێ ئەوەی خۆ بکاتە فرانک هاریس.

### ئاڵقەی سێیەم

لە لایەن تەنسازییەوە، ساواییم بە سەلامەتی تێپەڕیوە. جگە لە سووریژە (کۆیی پێی دەڵێن سۆرکە) دەردی ئەوتۆم نەدیتووە مەترسی لێ بکرێ. سوریژەش بە مل هەموو کەسێکەوە هەیە.

وردە نەساغی وەکوو تا و چاکوولی بۆ ئەو دەمانەی بەر لە 60 ساڵ پتر، دەفتەری بۆ ناگیرێتەوە بەڵام من لەو کەسانەم کە دەرد و ئازار زۆریان تین بۆ دەهێنن. جاران حەکیمان دەیانگوت ئەوەی میزاجی (بەڵغەمی Phlegmatic) بێ، هەستی بە ئازار کەمترە لەوەی میزاجی «هەوایی» بێ. وابزانم هەوایی لە زاراوەی ئەم ڕۆژانەدا پێی دەڵێن Sympathetic ئەگەر وەهاش نەبێ و زاراوەی دیکەی بۆ داندرا بێ، فەرق بە باری تەنسازیی من ناکات، وشەیەکە منی تێدا بە سەهوو چووم، لەشم سەهووی پێوە ناکات.

بەهەمەحاڵ چەندی شوێنێکم بریندار بووبێ درێژەی کێشاوە لە چاو برینی هاوڕێکانم. تا ئێستاکەش شوێنی ئاودزبوونی پشت نینۆکی پەنجەی ناوەنجیی دەستی ڕاستەم بە چاو فەرقی پێ دەکرێ، ئاودزیەکەش بە برینێکی زێدە بچووکی دڕوویێک بوو، بەحاڵ فەرقی پێ دەکرا، لە بن پێستی پشت ئەو نینۆکەم، بەڵام خۆ نەپاراستنم لە ئاوی حەوزی بن سوولی پاشا لە چنارۆک تەشەنەی بە برینەکەم کرد، خەڵقی دیکەش وەکوو من برینیان تێدەکەوت و بە ئاوی سوولی پاشا تەڕیان دەکرد و چشیان لێ بەسەر نەدەهات. ئەو ئاوە مەشوورە بۆ خراپە، بەڵام با چاکەشی باس بکەم، لە هەموو ئاوەکانی هۆبەی مەلازادان لە چنارۆک سازگار ترە بۆ چێشتی برنج. دیارە ماددەیەکی تێدایە ئەو کارەی پێوە بێ.

لە لایەن هەست و هۆشەوە، وەک بۆیان دەگێڕامەوە و خۆیشم بە بیرم دەهاتەوە بە پێش تەمەنی خۆم دەکەوتمەوە. باوکم لە ڕادەبەدەر دڵی پێم خۆش بوو، چاوەنۆڕیی کرداری لە باری لێ دەکردم. بۆ باوکێکی کوڕەکەی خۆش بوێت و بە تەمای زەکاوەتی بێت، جێگەی دڵ ئارامیە بۆی کە ڕۆڵەکەی بە بەریەوە هەبێ ئەوەی لێوە بگوترێ کە باوکم لەم بەیتەدا بۆ منی ڕەوا دیتووە:

به ئومێدم له لطفی «لم یزلی»
ببیه نائب منابی کاکی جەلی

وەها بووە لە مەجلیسی خۆی، کە جارێ تەمەنم 4-5 ساڵی بووە، قسەی مەیلەو کامڵانەی لێ گێڕاومەتەوە. لە سەرشکێن کردنی ئەو کەسانەی بە خورافات هەڵدەخەڵەتێن و قسەیەکی منی باس کردبوو بۆ ئاپۆرەی گوێگرانی وەعزی ئێوارەیەک لە ئێوارانی ڕەمەزانی ئەو تەمەنەم، گوێبیست بووبووم، گۆیا کەری دەجاڵ جێگەی حەفتا هەزار جوولەکەی لە سێبەری یەک گوێچکەیدا دەبێتەوە، منیش گوتبووم کۆڵانەی کۆیێ تەسکن، ئەو کەرەیان پێدا نایەت لێی مەترسن باوکیشم قسەکەی لە وەعزدا کردبوو بە شایەد بۆ زێدە گومڕایی و گەمژەڵیی کەسێکی درۆیەک بسەلمێنێ کە هۆشی ساوایەک پێی ڕازی نەبێ.

لەو تەمەنەی منداڵیمدا وەکوو هەموو منداڵێک، یەکجار حەزم دەکرد شەوانە گوێ لە سەرگورشتەی جۆراوجۆر بگرم، بەڵام لە زۆر زووەوە دەمزانی هەمووی درۆن، هەرچەند حەزیشم دەکرد ڕاست بانایە. پاڵەوانەکانی ناو ئەفسانانم خۆشدەویستن، بەڵام خەفەتم لەوە دەخوارد کە هەڵبەستراون. بە نموونە جارێ لە تەمەنی پێش چوونە مەکتەبم بوو سبەینەیەکی زستان، بەر لە ڕۆژهەڵات، لە نزیک موغەیریی ژوورەکەی باوکم دانیشتبووم و فکرم لە حیکایەتێکی شەوی ڕابوردوو دەکردەوە و دەمگوت: من هەر خۆمم، پشیلەکەم هەر پشیلەیە، موغەیری هەر موغەیرییە... باوکم دوای نوێژی سبەینە چووبۆوە ناو نوێنەکەی و گوێی لەو گرِوگاڵەم بوو، لە دایکمی پرسی مەسعوود بۆچی وەها دەدوێ؟ دایکم بزەیەکی هاتێ و گوتی، شەوێ لە حیکایەتی سیحرباز گوێی لێ بوو کە جارێکیان بوو بە هەنار و خۆی بە دیواردا دا و دەنکەکانی پەرت بوون، ئافرەتە دڵپاکەکەش بوو بە مریشک و دەنکەکانی هەڵگرتنەوە و خواردنی... ئەویان بوو بە ئاگر، ئەمیان بوو بە ئاو بیکوژێنێتەوە، دیارە حیکایەتەکەی بە بیر هاتۆتەوە و باوەڕی پێ نەهێناوە... باوکم وەها گەشایەوە باس ناکرێ.

لەو بابەتەی باوەڕ نەهێنانم بە قسەی نادروست، نەجیبەی خوشکە گەورەم تا ئێستاش لە موناسەبەدا دەگێڕێتەوە چۆن کە منداڵ بووین، بە شەو پاشماوەی

جەژنانەیان لە باغەڵەکانمان دەردەهێنا و خەڵووزیان لە شوێندا دادەنا، سبەینێ پێیان دەگوتین پارەکە بۆتە خەڵووز، تەنها من بەو قسەیە ڕازی نەدەبووم.

بە بیرم دێتەوە یەکجار منداڵ بووم، جارێکیان حەفت ڕوپیەی جەژنانەم لە کونی کلیلەوە خستە ناو کیلوونی دەرگەی ژوورێکی نابەرچاوی ماڵەکەمان (ڕوپیەی ئەوسا پتر بوو لە ڕۆژانەی دوو ڕۆژی کرێکاریک). چەندێکی گەڕان بەدوا ئەو پارەیەدا نەیاندۆزیەوە، منیش پێم نەگوتن چیم لێ کردووە. وا بزانم ئەو کارەم تاکتیکێکی سافیلکانەی هۆشی منداڵیم بوو بەرانبەر فڕوفێڵی «پارەکەت بوو بە خەڵووز». چەند مانگێکی پێ چوو، جارێکیان بەڕێکەوت لە کردنەوەی دەرگەی ئەو ژوورەدا کە کلیلیان لە کیلوونەکەی بادا زرینگەی ڕوپیەکان هات، ئیتر بزماری کێلوونەکەیان کێشاوە و پارەکەیان لێ دەرهێنا. چاک بوو پارەکە هەر بە پاشماوەی جەژنانە حیساب کرا و بوو بە هی یاعیسمەتی دایانم.

لە نموونەی (بە پێش تەمەن کەوتنەوە) ڕووداوی تەمەنێکی ساواتری خۆمم بە بیر دێتەوە، بەڵام ئەگەر دواتر بە گێڕانەوە لە مێشکم چەسپ نەبووبایە لەوانە نەبوو فکرم بۆی بچێتەوە: شەوێکیان لە شەوانی زستان مەجلیسی باوکم قەڵەباڵغ بوو بە ئەهلی گەڕەک و بە دەستەودایەرەی جەمیلاغای حەویزی، کە ئەوسا قایمقامی کۆیە و لە پیاوە هەرە بەرچاوەکانی بوو. یەکێک لەوانەی خزمەتی باوکمیان دەکرد، منی لە باوەش کرد و بردمی بۆ مەجلیسەکە، ئەوسا من پێڕەوکە بووم. کە کابرا بردمیە ژوورەوە، هەر لە دەرگە ئاودیوی مەجلیسەکە بووم دەستی ڕاستەم بۆ لای لاجانگم برد و بە زمانی ساوایانەم سەلامم کرد و گوتم «سەلاعەکوم». ئەو خەڵکە تێکڕایان بۆم بەرز بوونەوە و جەوابی سەلامیان داوە. باوکم وەری گرتم و لە تەنیشت خۆیەوە بە لای جەمیلاغاوەی دانام، لەوە بەولاوە چی دیکە ئەو شەوەم بە بیردا نایەتەوە. دواتر کە هۆشم بە شتان شکا فکرم لەوە دەکردەوە، چۆناچۆنی ڕاستبوونەوەی ئەو هەموو خەڵقە بەو دەنگە پوورەهەنگییەی یەک نەوای سەلامدانەوەیان نەیشڵەژاندنم، لەبەر چاوی ساوایی ئەو دەمەدا قەڵەباڵغیی ژوورەکە وەک دارستانی چڕ بوو...

بەڵێ دەزانم ماڵمان هەمیشە قەڵەباڵغی و هاموشۆکەری پێوە دیار بوو، ئەمیش تاڕادەیەک ڕای هێنابووم بە دیتنی ئاپۆرەی خەڵق، بەڵام باری ئەو دەمەی کە سەلامەکەم کرد و بۆم ڕاستبوونەوە وەک باری کەسێک دێتە بەر چاوم کە یەکەم

جار لە سەر شانۆ بەرانبەر ئاپۆرە و جەماوەر ڕادەوەستێ لەگەڵ تێبینیی ئەودا کە
من پێشتر بە تەما نەبووم بچمە سەر شانۆ، ئەو تەمەنەشم نەبوو لە هەڵکەوتی
ناکاودا وەکازی ئیرادە و خۆگیریم ڕاست ڕابگرێ. لە بەراورددا هەڵکەوتێکی دیکە
باس دەکەم، مەبەستی پتر پێ ڕوون دەبێتەوە لە نەشڵەژانی ئەو دەمە گشتەی
ساواییمدا:

دوو سێ ساڵێک دواتر کە چووبوومە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتایی، ڕۆژێکیان
ڕێزیان بە هەموو قوتابیان بەست لە هەیوانە دوورودرێژەکەی نهۆمی خوارەوەی
قوتابخانەکە، بێ ئەوەی بزاندرێ مەبەست لەو ڕیزبەستنە چییە. لە ناکاو مدیری
مەکتەب کە لەگەڵ مامۆستاکان لە شوێنێکی دیار و بەرچاو وەستابوو بە دەنگی بڵند
ناوی منی هێنا کە بچم بۆ لای. زۆر باش لە بیرمە، ئاوازی ئەو بانگ هێشتنە لە بەر
گوێم شیرن نەبوو هەرچەند نەشم دەزانی لەبەر چی، چونکە لەو دەمەدا بە ڕواڵەت
هیچم شک نەدەبرد لێی بسڵەمێمەوە. لە هەوەڵەوە نەبزووتم هەتا جاری دوەم مدیر
بە دەنگێکی نەرم و خۆشەویستانە و بە دەستیش بانگهێشتنی کردم بچمە لای.
شوێنی ڕاوەستانی مدیر لێمەوە نزیک بوو، منیش لەو قەڵەباڵغیەدا کە هەموو چاوێک
تەماشای منی دەکرد، بە دوودڵییەوە هەنگاوی نارەزامەندیم بەرەو مدیر هەڵێنا تا
گەیشتمە بەردەمی، ئەوسا کارتێکی چاپکراوی «ئافەرین» لێ نووسراوی بەرز
کردەوە و لەگەڵ هەڵدانەوەیەکی دڵسۆزانەی ڕەوشت و زەکا و نازانم چیم،
کارتەکەی دامێ و خۆی و مامۆستاکان، لەگەڵ ئەواندا هەموو قوتابی و فەڕاش و
ئەوەی ڕاوەستابوون کەوتنە چەپڵەڕێزانێکی گەرموگوڕ تا گەڕامەوە شوێنی خۆم.

زۆر چاک لە بیرمە ئەو چەپڵەڕێزانە گەلێک پتر بەرەو شکۆلێنیشتن و نائارامییەوەی
بردم لە چاو دەمی جەوابدانەوەکەی «سەلاعەکوم»ی ساواییم، تەنانەت نەچوومەوە
باری ئاساییم، هەتا بە پەلە گەیشتمەوە شوێنی خۆم لە ڕیزی قوتابیانی پۆلەکەم و
لە زەقوزۆپی هەڵوەستە مەسرەحیەکەم ڕزگار بووم. ئەو ئافەرینە هەر وا دەزانم بە
من درا، نەمبیستووە پێش من بە کەس درابێ، دواتریش کەسی دیکە وەری
نەگرت، بێگومان لەوەدا حورمەتی باوکم دەخلی هەبوو بەڵام دەبێ خۆیشم شتێکم
بۆ ڕەچاو کرابێ، دەنا ئەگەر هەر خاترانەی باوکمیان لەو پاداشەدا تێخوێندبایەوە
دەبوو پاداش بە کوڕی جەمیلاغای قایمقامیش بدرێ. بەهەمەحاڵ ئەو ڕۆژە من لە
تەمەندا بچووکترینی قوتابی مەکتەب بووم و بەو ئافەرینەش بەرچاوترینیان بووم.

لەو ڕووداوانەی دەیانگێڕایەوە، کە جارێ لە هەموو شتێکدا من تەمەنی بیرهاتنەوەم نەبووە، جارێکیان لە هاویندا کەریمی فەتاح بەگ بە خۆی و نەوەد سواری چەکدارەوە دێتە چنارۆک. ماڵی ئێمە و ماڵی مامم لەگەڵ خزمانی خاوەن ڕەز و باغ بەخێریان دەهێنن خزمەتێکی باشیان دەکەن. باوکم و مامم و «مەلا عزت کوڕی مەلا حەبیب» یش کە پیاوێکی بەرچاوی جەلیزادان بوو، هیچ کامێکیان لە چنارۆک نابن. کەریم بەگ لە حکوومەت قاچاغ بووە هەر ڕۆژە لە جێگایەک و هەر شەوە لە نوایەک بەسەری بردووە، تەیارەی ئینگلیزیش بە دوایدا دەگەڕا.

ترسی تەیارە وەهای دەکرد کە دەبوو کەریم بەگ سەبەینان بەر لە بەخۆکەوتنی تەیارە بۆ سۆراغ کردنی بگاتە حەشارگە، ئێوارانیش دوای بەسەرچوونی وەختی فڕینی تەیارە بەڕێ بکەوێ. ئەو ڕۆژە لە چنارۆک بەر لە هەموو شتێک وڵاغەکانیان لە نێو چۆم و نغوردی درەختدا شاردنەوە نەکا تەیارە بیانبینێ، لەوەشدا بە سەهوو نەچووبوون چونکە لەو ڕۆژەدا چەند جارێک تەیارە بە سەر ئەو ناوەدا تێپەڕیبوو دیارە لە کەریم بەگ و سوارەکانی دەگەڕا. کەریم بەگ لە ئاکامی تێشکانی شۆڕشی شێخ مەحموود دژی ئینگلیزەکان لە سەرەتای بیستەکاندا بوو بە قاچاغ. شێخ مەحموود بە برینداری گیرا و نەفی دەرەوەی وڵات کرا. وەک دەیانگێڕایەوە کەریم بەگ ڕەفتاری مەردانە و حەیاکارانە بووە. نەیهێشتووە بەردەستەکانی پرکێشی لە کەس بکەن، هەر کە دەگاتە شوێنی لێ حەسانەوەی بن سوولی پاشا و وڵاغەکان حەشار دەدەن بە خەڵقەکە دەڵێ، من کۆنە مریدی «شێخ کەریمی بەرزنجی»م[9] (کە تەکیەی لە کۆیە بوو، بەر لە بیست ساڵێک وەفاتی کردبوو). خەڵقەکە پێی دەڵێن «فاتمەخان»ی خێزانی شێخ نووری نەوەی شێخ کەریمە و ئێستا مێوانداریت دەکا لەم چنارۆکە. فەتاح بەگ کە ئەمە دەزانێ پتر دەکەوێتە حورمەتکاری و سڵاو بۆ فاتمەخان (مامۆژنم) دەنێرێ. وەک دەگێڕنەوە منیان بە باوەش بۆ لای بردبوو، گۆیا لە جیاتی باوکم بەخێرهاتنی دەکەم (هیچم لەوە بە بیر نایەت) بەڵام کاک مەجیدی مامە نوورەددین کە ئەوسا مێردمنداڵە بووە لای دادەنیشێت و هەموو حورمەتێکی لێ دەبینێت. وەها ڕێک دەکەوێ لە شوێنێکەوە چەند وڵاغێکی دۆست و ناسیاوان بە بارەوە دەکەنە ماڵی مامم. چەند پیاوێکی کەریم بەگ ئەو وڵاغانە

9- دواتر لە ئەڵقەکانی ئایندەدا باسی بنەماڵەی شێخ کەریم دێت.

دەردەست دەکەن بە نیازی ئەوەی کاتێک بەڕێ بکەون کەلوپەلی خۆیانیان لێ بار بکەن. کەریم بەگ بەمە نازانێ. پاش عەسر کە خەریکی ڕۆیشتن دەبن ماڵاوایی لە مامۆژنم دەکات و تەوازوعی بۆ دەنوێنێ، ئەویش پێی دەڵێتەوە کە جەنابت وەها ڕادەنوێنێ مریدی باپیرم بیت ئەدی بۆچی پیاوەکانت جەردەییمان لێ دەکەن؟ ئنجا کەریم بەگ حیکایەتی ئەو وڵاغانە دەبیستێت و بە توندی لەو کەسانە قەڵس دەبێ کە دەستدرێژییان کردبوو. دوای عوزر خوازییەکی پیاوانە، وڵاغەکان دەگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئیتر ملی ڕێگە دەگرن لە بناری شاخەوە بەرەو لای هەیبەت سوڵتان کە لەوێوە بۆ دیوی دەشتی کۆیێ ئاوا ببن و بچن لە قەیاغی دووکان بۆ بەری سلێمانی بپەڕنەوە. ئەم ڕووداوە لە هاوینی 1923 بووە.

لە نێو تەمومژی بیری منداڵیم، وێنەی کەسان و شتان و شوێنان زۆر جودا خۆیان دەنوێنن لە وێنەی دواتریان کە دەهاتە بە هۆشی تەمەنی هەڵکشاوترم. هەوای دیمەنی چەشمەندازی چنارۆک، کە لە تەختەی فاممدا نەخشبەستوو بووە، وەهام دەهێنێتەوە یاد کە ئەو شوێنانەی لە ماڵمانەوە نزیکن ئەوسا دوورتر خۆیان نواندووە، شاخە دوورەکانیش چ حیسابێکی تایبەتیی دووری و نزیکیم بۆ نەکردوون. وا پێ دەچێ لەو تەمەنەدا دووری و نزیکی هەر لەو مەودایانەدا حیسابیان بۆ کرابێ کە بە لای فکری ساواییمەوە خەلقیان دەگاتێ و لێی دێنەوە. ڕەنگە هەروەک ئاسمان بەولای عەیارەی دووری و نزیکییەوەیە و شتێکە بەر پێوانە و کێشانە ناکەوێ، هەروەهاش شاخەکانی پژدەر و قەندیل و هۆوێ و هۆوێندەرێ لەبەر چاوی تەمەنی 3-4 ساڵیمدا نە دوور بووبن نە نزیک. نەک هەر ئەمەندە و بەس، بە چاکی دێتەوە یادم، دیمەنی گشتیی ئەو دنیایە لەبەر یەکتری کێشرایەوەی بێسنوور، کە دەهاتە چەشمەندازی چنارۆک بۆم نەدەبووە دیمەنێکی سەرانسەری بە سەر یەکەوەی یەک پارچەی بێبڕگەی بێجمگە، بە پێچەوانەوە تاڕادەیەک لە تابلۆی سوریالستی دەکرد کەوا هەر شوێنەی وجودێکی سەربەخۆی هەیە، تا لە هەموو تابلۆکە نەگەیت لە تاک تاکی وێنەی ئێرە و ئەوێی ناگەیت بایی ئەوەی مەفهوومێکی گشتی تابلۆکەت بۆ ڕوون بکاتەوە.

لەمەش پتر بینینی ئەنتیکەی تەمەنی ساوایی خۆمم دێتەوە یاد، دیمەنی هەندێ شوێنی ئەوتۆ کە بە زۆری لە دەوروبەری نزیکمدا بە سەریاندا دەکەوتم خۆی دەسەپاند بەسەر ئەو شوێنانەی کە لە نەدیودان وەیا نەدەهاتە بەر زەینم، ئیتر کە

دواتر بیرم بۆیان دەچوو وام دەزانی گەلێک شوێنی ئەم جیهانە بریتین لە درێژەکێشانی شوێنە بەرچاو و ئاشناکان. ئەم «چاوئالۆزی» یان «زەینئالۆزی»یەم لە چنارۆک بۆ دەرەخسا کە چەشمەندازی بەرەو پێشەوە و بەرەو ڕاستە و بەرەو چەپە دووری دەخوێندەوە و هەرچی دیمەنی شار بوو خێرا بە خێرا دەخزایە ناو قەپێلکی بەرتەسکی چوار دیواری حەوشە و سەربان و کۆڵانە، مەتەڵی دووری و نزیکی لێ پەیدا نەدەبوو. من نازانم منداڵی دیکەی وەکوو خۆم چ خەیاڵی وەهایان بە دڵدا هاتووە لە نموونەی ئەوەی لێرەدا باسی دەکەم یان نا، چونکە هەرگیز پرسیاری ئەوتۆییم لە هیچ هاوڕێیەکم نەکردووە، ڕەنگ بوو ئەگەر پرسیش بکەم وەڵام وەرنەگرمەوە، یەکەم جاریشە وا لەم نووسینەدا باسی وڕێنەی «چاو سوورڕکێ»ی منداڵیم دەکەم، پێشتر ئەم گرێیانەم بۆ کەس نەکردۆتەوە.

هەر لە بیرمە، ساڵێکیان، کە جارێ زۆر منداڵ بووم. دوای بەسەرچوونی کژی هاوین، ماڵمان لە چنارۆکەوە گەڕایەوە بۆ کۆیێ، وێنەی پچرپچرم لە چنارۆک یاد دەکردەوە. وام دەهاتەوە بیر کە خۆڵەپۆتەی لاپاڵی ڕۆژاوای ئەو گردەی کەپرەکانی هۆبەی گەڕەکە ماڵی مەلازادانی بە سەرەوە بوو، ئا ئەو خۆڵەپۆتەیە بە هەموو لایەکی گردەکەدا تا دامەنی دەکشا و کەسێکی بیەوێ دەتوانێ بە ئارەزۆی خۆی «خۆڵەخلیسکێ - خشخشۆکێ»ی لێ بکات. کە هاوینی دواتر چووینەوە چنارۆک خۆڵەپۆتەکەم نەدیت تومەز جارێ خاکەکە ڕێی هاتوچۆ و پێخوستی لێ نەکرابوو. بەرەبەرە خۆڵەپۆت پەیدا بوو بەڵام لە ڕووپێوێکی بەرتەسکدا کە سەدیەکی ئەو مەودایەشی تێنەدەبوو من بە تەمای بووم.

ئەو هاوینەیان لەوەندە وەستام کە خۆڵەپۆتێی ساڵی پێشوو دەرنەکەوت بەڵام ساڵەو ساڵ بە هۆی دەرنەکەوتنەوەی خۆڵەپۆتە ئیقلیمگیرەکە بۆم ڕوون بۆوە کە من کاتی خۆی لەبەر منداڵیم و کەمفامیم بە سەهوودا چووبووم، زۆریشی برد تا سەهووی منداڵی لەو تەرزە بارانەدا بۆم ببێتە ئەنجامێکی ئاسایی نەک ڕێکەوت لە زەینی ساوادا لەو ڕووەوە کە خەریکبوونی مێشکی ساوا بە دیمەنی نزیکەوە بە بەریەوە هەیە لە دیمەنەکە زیاد بکات و بەسەریەوە بنێ، تومەز عەیارەی پێوانەی زەینەکە بچووکە، وەک ئەوەی کە قوماش بە میلیمەتر بپێویت درەنگ لێی دەبێتەوە و لە قیاسدا قوماشەکە درێژتر خۆی دەنوێنێ لە حەقیقەتی خۆی.

بەداخەوە لە سەدی نەوەدی خەیاڵ و خوولیا و لێکدانەوەی منداڵی دەسڕێتەوە و لە بیر دەچێتەوە، چونکە ئیمکان نییە تۆمار بکرێ. کە مرۆڤ دەشگاتە تەمەنی هۆشکرانەوە و دەستەڵاتی نووسین لە سەد هەزاری یەکێکی ئەرکی تۆمار کردنی خەیاڵاتی کۆن و هی دەمی نووسینەکەی بە ئەستۆوە ناگرێ هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە بایەخی پێ نادات و بە ماندووبوونێکی بێسوودی دادەنێت کەچی بەعەکسەوە، نەقشبەستوو کردنی خوولیای هەر تەمەنێک بێ وەک تاشینی پەیکەرە کە بوونەوەرێک نەمر دەکات. ئێمە بە تێکڕایی کوڕی دوێنێ و پار و ئەوەندە ساڵەی ڕابوردووین نەک لەبەر ئەوەی کە بە عەزم و ئیرادەی خۆ بە بیر هاتنەوە ڕچەی ڕەوتمان لە ڕۆژگار بەستووە و بە ئاوڕدانەوە وێنەی خۆمان لە هەموو قۆناغە بەسەرچووەکانماندا دەبینین، تەنانەت من خۆم ئەوەندە فۆتۆغرافەشم نەکێشاوە بە شێوەیەکی ڕێک دە ساڵ، دە ساڵی تەمەنم بنوێنن: ئێمە لە ڕابردوومان ئەو دیمەنانەمان بەبیردا دێتەوە کە بە خێری خۆیان و ڕێکەوت نەسڕاونەتەوە. چەند حەزم دەکرد لەم تابلۆیەی بیرەوەریی ساواییمدا، وەکوو وێنەگر هەموو تابلۆکەم بەبیر هاتنەوەی سەرلەبەر ڕەنگاوی بکردایە نەک وەکوو تاکتاکە ڕایەڵی جاڵجاڵۆکە وێنەی پچڕپچڕی ژیانم بە خستنە بەر تیشکی لێ وردبوونەوە نەختێک گەش بێتەوە.

بەهەمەحاڵ خوێنەر دەبێ لەگەڵمدا باڵ قۆڵ بێت و ئەرکی لێ بیستنم هەڵبگرێت، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ کردنەوەی ڕووپەڕەی ژیانی هەر کەسێک بێت بەر و بەرهەمی لەوە تێپەر ناکات کە بخوێندرێتەوە و ببیسترێت، نە خۆراک نە پۆشاک نە نوای حەوانەوە نە سامان و دارایی، نە زانینی زانستی و ئەدەبی و هونەری، هیچیان لەو سەرگورشتەیەی گەشتی ژیانەوە بە سەر کەسدا نابارێ تەنانەت بە تەمانیم، هەتا بۆم بکرێ، پەند و ئامۆژگاریش لە پەنا بیرەوەریدا بە خوێنەر بفرۆشم. بەڵام ئا لێرەدا خەبەرێکی میراتی خانەوادەیی خۆی ڕەپێش دەکات پێوەندی بە بیرهاتنەوەی تەمەنی ساواییەوە هەیە، نەختێکیش پەندامێزە:

باپیری باپیرم، مەلا عەبدوڵا (واثق باللە) کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلی، سێ حاڵەتی شیرەخۆرەیی خۆی بیر هاتۆتەوە کە پێوەیانەوە ناڕاحەت بووە: یەکێکیان ئەوە بووە، لەکاتی پاشەڵ شووشتنی ساوادا سەری ساواکە دەکەوێتە تەنگژەی نێوان بن هەنگڵ و ڕان و قەپرغەی دایکی و تێیدا هەناسەسوار و خەفەخان دەبێ.

دووەمیان ئەوە بوو کە بە سەر ئاگرەوە ئەم دەست و ئەو دەستیان پێ کردووە زۆر ترساوە. سێیەمیان ئەوە بووە متومۆری و نوشتەیان لە پاشەسەری کۆچکەی درووە و لە سەر پشتی لانک ئەو زەق و ڕقانەی لەسەری چەقیوون، چەندێکی گریاوە لەبەر ئێشی سەری دایکی مەمکی لە زاری ناوە و لایە لایەی بۆ کردووە و ژیر نەبۆتەوە... ئامۆژگاریی دایکان دەکات کە منداڵەکانیان لە ئازار و ترسی ئەوتۆیی بپارێزن.

لە ڕێی گێڕانەوە دەزانم کاتێک ویستبوویان لە شیرم بکەنەوە، بەپێی عادەت دەرمانی تاڵ و سوێریان هێنابوو لە گۆمەمکی دایانم یاعیسمەت بدەن تاکوو مەمکەکەم لەبەر چاو بکەوێت. وا پێدەچێ ئۆگرم بە دایانمەوە وەها بووە پاش تەمەنی دووساڵیش هەر مەمکیم مشتووە، هەر چەند شیریشی زۆر کەم بووبۆیەوە، تەمەنی ئەوەم هەبووە مەبەستیان تێبگەم، ئیتر پێم گوتبوون دەرمانی تێ مەدەن مەمکی نامژم ئەمما لێم گەڕین هەر لای ئەو بنووم. بەمە مەسڵەتیمان کردبوو.

ئەو دیمەنە پچرپچڕانەی بیرەوەریی منداڵیم کە دێنەوە بەر هۆش و گۆشی ئێستاکەم هێندێکیان چشتی ئەوتۆن لە کژی خۆیاندا ساڵانە ڕوویان دەدا وەک: گوێزەی ماڵ بۆ چنارۆک، مشتاغ ڕاکردن، کاردروستایی ڕەمەزان، چرپوجۆپانی قاورمە و گیپەی دابەستە، چەڵتووککوتان، ئامادەکردنی ماڵەوە بۆ ژیانی زستانە، کاروانەداری دۆستی لادێی لە کژی پاییزدا، هەنار و ترێی جەلی و نازەنین و سناوە لە کژی خۆیدا... هتد... هتد.

کە فیلمی ئەو دیمەنانە لە زەینی خۆمدا دەدەمەوە بەر یاد کردنەوەوە بە ڕوونی دەبینم وێنەیان لە تەمەنی منداڵیمەوە بۆ تەمەنی هۆش کرانەوەم لە یەکدی جودان. بە نموونە لەبەر تیشکی کزی فامی منداڵیمدا ئەو کوتەکانەی کە ئاڵقەی پیاوان بە نرکەی سینگیانەوە لە کۆمەڵی چەڵتووکیان ڕادەکێشا کارێکی مەتەڵاوی تەماوی بوو، بەند بوو بەو دەمەی هەڵسوکەوتەکەی تێدا دەکرا و گەپ و گۆبەندی تێدەخزا و چایەی بە دەمەوە دەخورایەوە و لە مێشکمدا نە دەچۆوە بۆ برنج سپی کردن و چێشت لێنان وەیا بزنج فرۆشتن و بەدیاری هەناردن. دەمزانی کوتەک لە چەڵتووک دەدەن بەڵام پێم سەیر نەبوو ئەگەر لە جیاتی چەڵتووک لە گڵ و بەردیان ڕاکێشابایە... دەمدیت یەکێک بە سیکاردەوە دێت (دواتر زانیم پێی دەڵێن قەساب) دابەستەکان سەر دەبڕێت و کێشەی گیپە و قاوورمەی بە دوادا دێت بەڵام ئەگەر لە جیاتی سەربڕینیان بە پێش خۆی دابان و بردبانی بۆ هەر کوییەک

بێت فەرقێکی ئەوتۆی نەدەکرد بەلامەوە. دەمزانی دابەستەکان پێوەندی بە ماڵمانەوە هەیە بەڵام خاوەنایەتیی ئێمە پێیانەوە هێندەی خاوەنایەتیی خۆم بە پەپەجانەکەمەوە نەبوو (پەپەجانە: جۆرێکە لە پێڵاوی ساوایان). هەروەها کە لە چنارۆک دەمدیت ئەو خەڵقە کتوپڕ ڕۆژێکیان دەکەونە خۆیان و شوێنی مشتاغرۆنان پاک و هەموار دەکەن، بە کەر و قەڵتارە ترێ ڕەش لە ڕەزەکانەوە دەهێنن و هێشوو هێشوو ڕای دەخەن، دەمزانی ئەو ترێیە دەبێتە مێوژ بەڵام ئەگەر لە جیاتی ڕۆنانی پێشێلیانت بکردایە وەیا بەملاولادا فڕێیان دابایە کارێک دەبوو، بۆ بەر زەینی منداڵیم، برای ڕۆنانەکە بێت. هەستم نەدەکرد بە «حتمیة» ی هاتوباتی مشتاغرۆنان و مێوژهەڵگرتنەوە. ئەمما ئەگەر شەوێکیان یەکێک لە ئەهلی ماڵەوە شوێنی نوستنی گۆڕیبایە ئەو جێگۆڕکێیە قاڵبی هەمواری لە قەناعەتمدا پەیدا نەدەکرد.

بەشێکی دیکەی ئەو دیمەنانە هی هەڵکەوت و ڕێکەوتە کە کژ و جەم و دەمی بۆ نییە، یان هی شتی بەردەوامە کە نە کژ نە هەڵکەوتی تێدا نییە- لە نموونەی هەڵکەوت: سەفەر، سەیران، شایی، شین، شەڕە چەپەڵۆک، بروسکە و ڕەهێڵ، داوەت... هتد.

نموونەی شتی بەردەوام کە لە خەیاڵی منداڵیمدا شوێنی هەبێ، کەسانی بەرچاو، هاوتەمەنەکانم شوێنی گەمە لێکردن، ماڵ و دەربوونە و گەڕەک، وڵاغی جوان، پشیلەی دەستەمۆ، درەختی ڕێک، خانووی بەرز...

تێکڕای ئەو دیمەنانە کە هەر بایی فامی منداڵ واتای دیاریان لە مێشکمدا زرەڕەنگی دەدایەوە، تەختەیەکی «وشەی تێکهەڵکێش - کلمات متقاطعة» لە بیری منداڵیمدا دروست دەکەن، هێندێ وشەی زۆر شیرن و هێندێکیشی زۆر و کەم، تاڵن، شیرنایی و تاڵیشیان چەندێکی هەبووبێت لە عەیارەی فامی منداڵیمدا کەلەڕێژیان دەکرد، واتە پتر لەوەی هەبوون دەهاتنە بەر هەستی ساواییم، نەک لەبەر ئەوەی هەڵکەوتەکان زل بوون بەڵکوو لەبەر بچووکیی پۆرگی دەروونی ساوام.

لە وشە خۆشەکانی ئەو تەختەیە، بۆ تەمەنی هەرە زووی بیرکردنەوەم، «سەیران» بوو، ئنجا چ لە بەهاراندا بەر لە پشکووتنی درەخت و چ لە سەرەتای هاویندا کە دەبووە کژی پێگەیشتنی فەریکە سێو و تووی هەمەجۆر. کە ساوابووم سەیرانم بەند

بوو بە ئەهلی ماڵەوە چونکە لەو تەمەنەدا من و هاوڕێکانم توانای سەیرانی تایبەتی خۆمانمان نەبوو. ماڵی ئێمە و ماڵی مامە نوورەددینم لە بەهاردا یەک دوو جاران دەچوون بۆ سەر چاک یان دەرماناو، وەهاش دەبوو لەگەڵ خزمی دیکەدا بە کۆمەڵی گەورەترەوە ئەو سەیرانەمان دەکرد بە تاقمی ڕابواردنی ڕۆژێکی سەرلەبەرەوە، ولاغ بۆ سواری و بار لێنان بە هی خۆمان و هی خوازرایەوە بایی پێویست، بگرە لە پێویستیش پتر، ئامادە دەکران و دوای بەرچاییەکی بە پەلە و زوو لە سبەینەدا تێکڕامان جگە لە باوکم و مامم و یافەخرەی پووری گەورەم و یەک دوو بەردەست، بەرەو شوێنی سەیرانەکە دەچووین، ژن و منداڵ و پیاوی لێهاتوو بە سواری و هێندێکیش بە پێیان... ئەو ڕێگایە، بایی ڕۆیشتنی سەعاتێک و دوو سەعات بوایە بە چەپڵەڕێزان و نوکتە و پلار تێگرتن و تریقوهۆڕ و گەشانەوە دەپێچرایەوە بۆ سەر ژوانی مەبەست.

من بەپێی بڕیاری ساواییم لە کۆشی دایانم بەسەر ولاغەوە یان بە باوەشی پیاوێکەوە وەکوو قەپووچکەی ئاو لەگەڵ شەپۆلی ئەو کەیف و زەوقە سەراو دەبووم.
هەندێکیان کە جارێ لە تەمەنی پێش مەکتەبمدا بووم، بەر لەوەی بچین بۆ چنارۆک، بە قەڵەباڵغی و هاتوباتەوە سەردانێکی چاکی «پەڵکانە» مان کرد. ماڵی ئێمە و ماڵی مامم و ماڵی «خاڵە سەدر»ی کوڕی شێخ کەریم (خاڵی مامم بوو) لەگەڵ چەند ئافرەتێکی بەساڵداچووی، کە بە عادەت دەکەونە بەر حیسابی دڵڕاگرتن و خاترانە، دوای بەرچاییەکی زوو لێ سوار بووین و بە دوو سەعات و نیو گەیشتینە سەر چاکەکە و لە ژێر دارتوویەکی بەسەر کانیاوێکەوە ڕوابوو بنگەمان دانا. وەها ڕۆیشتبوو کە ئەو کانیە، بە «اصطلاح»، بێبنە واتە کەسێکی بچێتە ناویەوە پێی ناگاتە زەوی و ئەگەر مەلە نەزانێ دەخنکێت.

منداڵێکی لە ئێمە باڵخۆشتر، حەوێز- ناو10 کوڕی ئافرەتێکی سەربە ماڵی خاڵە سەدر - مان لەگەڵدا بوو ئازایی خۆی تاقی کردەوە بەوەدا جۆلانە بە سەر

---

10- حەوێز کوڕی نەجمەددین و نەوەی «وەستا محیەددین»ـە. ئەو وەستا محیەددینە لە گرانیەکەی ١٩١٧ پاسەوانی قەیسەری کۆن بووە. شەوێکیان دەستەیەک لە مرۆی بێئینساف بە نامەی پێداویستیی کفن بۆ مردوو دەرگای قیسەریەکەی پێ دەکەنەوە و سەری دەبڕن، مێرد منداڵەیەکیشی لەگەڵدا دەبێ

کانیەکەدا بکات و ترسی خنکان نەیوەستێنێ. دەستی گەیاندە لکەتوویێک و خۆی بۆ شل کرد و بە دەنگی بەرز تێی هەڵکرد: حێلانێ جۆلانێ... جارێ بە تەواوی سەرێکیان بە سەر کانیەکەوە جۆلانەی نە کردبوو لکە تووی هەرام قرچەی کرد و شکا و حەوێز شڵپەی لە ئاوی کانیەکە هێنا. دایکی زیڕاندی و خەڵقەکەش سەغڵەت بوون لە ترسی ژێراوبوونی لەو کانیە بێبنەدا، کەچی حەوێز بە سەلامەتی لە کانیەکەدا چەقی و هەر هەتا هەوراز کەمەری لە ئاوداا بوو. تومەز کانیی فێڵباز بە هیچە ئەو ناوبانگەی بۆ خۆی داسەپاندبوو. ترسی خنکانەکە بوو بە پێکەنینێک و تریقوهوڕێک ئەو سەری دیار نەبێ.

ئەو حەوێزە باوکی نەمابوو، لە جیرانەتیی ماڵی خاڵە سەدر بە خۆی و دایکیەوە، لە چاو وەزعی بێباوکی، ژیانێکی خۆشکەڵەی ڕادەبوارد و بە زۆریش لە هاموشۆی خزمانەدا هاوبەشی دەبوو لە گەمەوگەپی هاوتەمەنەکانی خۆی لە بەرەی ئێمە و ماڵی خاڵە سەدر. ئەو ڕۆژە لەو جۆلانە مەترسیلێکراوەدا مەبەسی خۆهەڵدانەوە بوو بە سەر فەتحی شیربرام و فاتیحی خاڵە سەدر کە هاوتەمەنی بوون.

«پەڵکانە» بریتییە لەو کانیاوە و قەبرستانێکی لێوەی نزیکە، وەها ڕۆیشتووە کە پیاوچاکێک لەو قەبرستانە نێژراوە، گۆیا ئاوی کانیەکەش دەرماناوە. لە ماوەیەکی کەمدا دێی «ناسراغا» هەیە کە هی ماڵی شێخ کەریم بوو، ئەوسا بەشێکی هی خاڵە سەدر، دواتر بە کڕینەوە هەموو بوو بە هی ئەو. لەو جۆرە سەیرانانەدا ئەو دێیەی لێمانەوە نزیک بایە یارمەتیی دەداین لە هەر شتێکی پێویست بایە، لە ماست و دۆ درێغییان نەدەکرد، وەها دەبوو گیسک وەیا بەرخیان بە دیاری بۆ دەهێناین هەرچەند لەلایەن خواردنەوە بە کاردروستایی تەواوەوە دەچووینە ئەو شوێنانە. خەڵقەکەش ئەو ڕۆژە پێمانەوە دەگەشانەوە هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە هەلێک دەبوو دەقی ژیانی یەکنەوایانی تێدا بشکێنن و لە نزیکەوە سەربە جۆری ژیانی شارستاندا بگرن. هەمیشە ئافرەتی لادێ حەزی کردووە خشڵ و پۆشاکی ئافرەتی شارستان ببینێت بە بەژن و باڵای ئافرەتەکەوە. زۆر بە سەیری منداڵەکانیان

---

چەندێکی لە بەریان هەڵدێت و لێیان دەپاڕێتەوە دادی نادات، ئەویش سەر دەبڕن. چەند دووکانێک لە قەیسەری تاڵان دەکەن. هەر لێرە هەتا بڕانەوەی دنیا لەعنەت لە ڕوحی زۆردار و خوێنڕێژ بێت.

نامۆییان لێ دەکردین، هەر دەتگوت ئێمەیان بە دانیشتووی جیهانێکی نائاشنا بەوان حیساب دەکرد، تەنانەت کەم گەپی منداڵی لادێ هەیە بە هی منداڵی شارستان بچێ، لەوەشدا جوداوازیی شارستان و لادێ کاریگەر بوو نەک هی چینایەتی چونکە بۆ منداڵی لادێ هەموو منداڵی شارستان بێگانە بوون بە دەوڵەمەند و هەژاریەوە، لە شاریشدا منداڵ هەژار بایە یان دەوڵەمەند بەیەکەوە یارییان دەکرد.

لە کۆیە کە بتڕوانیبایە پەڵکانە و ناسڕاغا، ڕووت دەکەوتە ڕووکاری دەربەندی بازیان واتە لە نێوان باشوور و ڕۆژهەڵاتی کۆیێ کەوتوون.

جاری وەها دەبوو لە سەرەتای هاویندا لە کۆیە، یان لە مانگی ئاب لە چنارۆکەوە دەچووین بۆ کانیە گەرمەکەی مەشوور بە «حەمام جەلی». بۆ خەڵقی ناوچەی کۆیێ بە ئاهەنگی ئەو ناوەوە دەگوترا حەمام عەلی و حەمام جەلی. مەبەست لە حام عەلی کانیە گەرمەکەی «حمام العليل» ی نزیک مووسڵە، کەم کەسیش دەیزانی «حەمام عەلی» قوتکراوی «حمام العليل»ـە. کانیاوی «حەمام جەلی» لە دوو کیلۆمەتری دێی جەلی بە سەر ڕووباری «باسەڵەم» و لە دامەنی کلکەی چیای ئاوەگرد بەلای چنارۆکەوە هەڵکەوتووە. جێگەی هەڵقوڵینی کانیە گەرمەکە بە ڕۆخی ڕووبارەکەوە بوو، هەر ساڵە کەڵەکی مەحکەمی ئاو نەدەڵاندوویان بە دەوری کانیەکەوە هەڵدەنا تاکوو ئاوی ڕووباری تێکەڵ نەبێ و ساردی نەکاتەوە.

هەڵبەت کەڵەک لە خۆوە هەڵناندرێ و ئاوی سارد و گەرم بە خۆڕایی لێکدی جودا ناکرێتەوە. دەبوو یەکێک ئەم کارە بە ئەستۆی خۆیەوە بگرێ. لەو دەمانەدا کە من بۆ بیرەوەرییان دەچمەوە خزمێکی جەلیەتیمان، حاجیی کوڕی مەلا عارف، سەروبەری کانیهەڵنان و ڕێکخستنی شوێنی ژنان و پیاوانی ئەنجام دەدا لە پاداشدا مزەیەکی بێئەرکی بۆ دەچوو لەو کەسانەی دەهاتنە سەر گەڕاوان و ئاوی گەرمی حەمام جەلی (نەختێکی دیکە باسی گەڕاوان دێت). من ئەو مامە حاجییەی مەلا عارفم چاک بە بیر دێت. چ لەو سەفەرانەی جەلی و حەمام جەلیی ئێمە بێت و چ لە سەردانی ئەو بۆ چنارۆک و کۆیە بێت، گەلێک جاران دیتوومە و گوێم لێ بووە. مەلا عارفی باوکی، کە ئەوسا پیرترین کەسێکی جەلیزادان بوو، بەحاڵ وێنەیەکی تارماییرەنگی لێ یاد دەکەمەوە ئەویش لە ڕێی بیستنەوە. بەینێکی مەودادرێژی لەگەڵ باپیرم، بە دوا ئەویشدا لەگەڵ باوکم ڕابواردووە هەر لە ماڵی ئەوانیش وەک ئەندامێکی خێزان بەسەری بردووە.

خەبەراتی ئەو «مەلا عارف»ە لە گەلێک باردا دەکرا تەنانەت باوکم گەلێک لەتیفەی لێ دەگێڕایەوە، یەکێک لەوانە ئەوە بوو دەیگوت ڕەمەزانێکیان کەوا تازە دەهات بکەوێتە گەرمای هاوین، مەلا عارف، دمەو عەسرێک لای باوکم لە قووڵایی دڵەوە هەناسەیەکی حەسرەتەومەندی هەڵدەکێشێت. باوکم لێی دەپرسی ئەو هەموو حەسرەتەی بۆچی بوو؟ دیسان بە دەم هەناسە هەڵکێشانەوە دەڵێ خۆزی نەدەمردم هەتا فتارێکی بە ئارەزۆی دڵی خۆمم کردبایەوە. باوکم پێی دەڵێ، مەلا عارف تۆ ئارەزۆکەت بڵێ، مەرج بێ مادەم لە توانامدا بێ فتارەکەت بۆ ساز دەدەم، دابزانم حەز لە چی دەکەیت. ئەویش پڕ بە دڵ و بێ مەبەستی گەپ و پێکەنین دەڵێ: تەرۆزییەکی پیر پیر، دۆیەکی ترش ترش، نانێکی ڕشاوی بووبێتەوە هەویر... ئەمەی گوت و وسکت بوو. باوکم بە دیار ژماردنی خواردەمەنی دیکەوە گوێ ڕادەگرێ بەڵام هیچی دیکەی بە دوادا نایەت. دەزانێ ئەمەیە ئارەزۆکەی، ئەویش پێی دەڵێتەوە: مەلا سبەینێ دوای عەسر دەنێرم لای بە قاڵەکان کام تەرۆزی لەبەر زێدە پیری حەیوانیش نای خوات ئەوەت بۆ بهێنن. هەر لە دوا ڕۆژهەڵاتیشەوە دۆی ماڵەکەی خۆمانت بۆ لەبەر هەتاو دادەنێین هەتا وەکوو زەهری هەلاهیل ترش هەڵدەگەڕێ، نانیشت بۆ لە ئاوی گەرم هەڵکێشن بە ئارەزۆی خۆت نەرم بێتەوە، ئەمما ئەگەر لە نەوسان وەزگیش بدەی نابێ لەوە بەولاوە هیچت بچێتە هەناو، خۆ تۆ منت تۆقاند بەو هەناسە دووکەڵاوییەت، لام وابوو داوای زلابیەی بەغدام لێ دەکەیت... ئێوارەی ڕۆژی دوەم مەلا عارف فتاری بە تەرۆزیی پیر و دۆی ترشاو و نانی هەویراوی کردەوە بەو جۆرەی کە تامەزرۆی خۆراکی بە هەشت لێی تێر نابێ. کە گەدەی لەو فتارە پڕ کرد شایەدیەکی بە دڵی هێنابوو گوتبووی ئنجا مردن حەقە و ناحەق نییە.

نەوەی مەلا عارف، کوڕی حاجی مەحموود ناو، دوای مەرگی باوکی بە زۆری لای ئێمە، بەتایبەتیش لای مامم لە کۆیە و چنارۆک بەسەر دەبرد. دواتر بوو بە خاوەن ژن و ماڵ. وابزانم ئێستا لە هەولێر نیشتەجێ بووە منداڵیشی پێ گەیاندوون.

لە دەست خۆمدا نییە چەندێکی بە جەلییەوە خەریک بم لێی تێر نابم. لە لایەکەوە ڕیشەی وجوودم لە کۆنەوە بەوێوە بەستراوەتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە پێوەندیم پێیەوە لە ساوایی و منداڵیمدا بەهێز بوو. لێرەشدا بەسەرهاتی ئەو ڕۆژگارانەم

دەگێڕمەوە کە بەشێکیان بە جەلی و حەمام جەلی و «گەڕاوان» و خزمانی جەلییەوە بەستراوەتەوە.

ئەو ناوە ئاوی مەعدەنیی زۆر هەبوو. جگە لە ئاوە گەرمەکە کە ناوی «حەمام جەلی» ی لێ وەرگیراوە، ئاوی دیکەی هەبوو پێیان دەگوت «عەنکفریت». دیارە مەبەست «عین کبریت» ـە کەر دەماودەم زاراوەکە لە عەرەبییەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەو ئاوەیان یەکجار زۆرتر بوو لە ئاوە گەرمەکە. وەک لە بیرمە ئاشگێڕ دەبوو، ئەویش بە ڕۆخی ڕووبارەکەوە، بەڵام لە بەری لای چنارۆک نەک جەلی، بەر لەوەی لە زاری گەلیەکەوە بەرەو دیوی جەلی دەربێت، بە ڕەنگێکی شینی سپات و بە کەفوکوڵەوە هەڵدەقوڵی و خەڵق بە نیازی چاکبوونەوە لە دەرەی باداری تێیدا دەمانەوە…

نەختێک لە ڕووبارەکە و بناری شاخەکە ترازابایت بەرەو چنارۆک دەگەیشتیتە شوێنێک پێیان دەگوت «گەڕاوان» و لە دوورایی نیو کیلۆمەترێکەوە، بەڵکوو زیاتریش، بێنێ دەهات. ئاوی ئەو شوێنە بۆ دەردی پیسکی و گولی چاک بوو. وشەی «گەڕ» وەک بزانم لە فارسیدا بە واتای کەچەڵ دێت بەو پێیە «گەڕاو» دەبێ بە ئاوێک بگوترێ بۆ کەچەڵی دەرمان بێت. مناسبی جێگەیە بڵێم وشەی «پیسک» یش لە کوردیدا بۆ ڕیشەیەک دەچێتەوە لە بنەڕەتدا پێوەندی بە «پیسی» ەوە نییە. وەک لە لاپەڕە 113 ی کتێبی «فرهنگ ایران باستان» لە نووسینی «پور داود» باس دەکات، وشەی «پەیس» لە ئاڤێستادا بە واتای نەخشاندن هاتووە. پێشگری «نی ni» بە واتای «دا- وەک داهاتن، داگرتن» ی هاتۆتە سەر و لە دەورانی هەخامەنشییان بۆتە «نپشتن» بە واتای «نووسین» کە ئەگەر بە وردی لێک بدرێتەوە «دانەخشێن» دەگرێتەوە، «نەخش»ـەکەش کە بۆ «نووسین» بردراوەتەوە لەوەوەیە کە نووسین خۆی بریتییە لە پنۆکی ڕەش و سپی، ئیتر بۆ «بەڵەک» یش بردراوەتەوە. بەو پێیە وشەی «پیسک» لە ئەسڵدا بە واتای «بەڵەک» هاتووە.

بەهەمەحاڵ ئەو ئاوەی گەڕاوان حەقی بە سەر زمانەوانی و مێژووەوە نەماوە ئێستاکە بۆ گولی و پیسکی خۆی لە بار کردووە، ئەو قوڕەی لەو گەڕاوە پەیدا دەبێ وەکوو خمی شین خۆی دەنوێنێ. بەلای چنارۆکەوە بێیت دەگەیتە محاڵێک پێی دەڵێن «شینکان» سەرلەبەری بریتییە لە گردی شینکاڵ، هەر دەڵێی کۆمەڵی خۆڵەمێشی

داری سووتەمەنین. بێگومان ماددەیەک لەو خاکەدا هەیە وەهای شین دەکات و لەولاتریش ئاو دەکاتە «گەڕاو». حەیفە شوێنی وەها نایاب دەستی شارستانەتی و پیشەسازی و ئاوەدان کردنەوەی نەگاتێ.

دیمەنی ئەو گەلیەی ئاوی ڕووباری باسەڵەمی پێدا دێت بەرەو حەمام جەلی و ڕووەو بیتوێن و دووکان، بۆ ئەو تەمەنی نێوان ساوایی و منداڵیم، زۆر سەرنجڕاکێش بوو. بەر لەوەی چەکی ئاگردار زۆر بڵاو بێ شاخەکە پڵینگی هەبوو. هەر لە بیرمە لەو سەفەرانەی کە تەمەنم گەیشتبووە پلەی هۆش کرانەوە، ترسێکی پڵینگ لە گەڵمدا دەژیا تاکوو بەرەو ماڵ لێی دوور دەکەوتینەوە، ترسەکەش بە ئەساس لەوەوە دەهات کە دەنگوباسی ڕاوەپڵینگی ئەو شاخە بەسەر زارانەوە بوو، کەسانیش هەبوون لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ناویان لە ڕاوەپڵینگ دەرکردبوو، ئەوەی ڕاستی بێ، شاخەکەش لەمبەرەوبەری ڕووبارەکەی باسەڵم، بۆ بەر زەینی ئەوسای منداڵیم، دەهشەتێکی دەخستە لێکدانەوەی خوتخوتە تێگەڕاوم چونکە تا ئەو دەمە هیچ شاخێکی وەها جڕ و نغورد و سەخت و بە تەڕاش و تاوێڵەبەردم نەدیتبوو، بە چاکی دیتەوە بیرم، کە لە دیمەنەکە ڕادەمام دەتگوت ئەمبەرەوبەری گەلیەکە ڕاز و نیازی خۆیان بە خامۆشی لە یەکدی دەگەیەنن، تارمایی پڵنگیش لەناو وتووێژدا وەکوو تەڵە نراوەتەوە بۆ ئەو کەسەی بێباکانە لە ئاوەدانی دوور بکەوێتەوە.

چەندی لە حەمام جەلی مابایەنەوە هەمیشە خزمانی جەلی بە دەورمانەوە دەبوون و لە خزمەت و بە فریاکەوتن درێغیان نەدەکرد. بەر لە چوونمان کەپر و ساباتمان لە حەمام جەلی بۆ ساز دەدرا، شەوانە پیاوی ئێشکچییان لامان دەمانەوە لەگەڵ جەماعەتی خۆمان هەتا سبەینە ئاگادارمان دەبوون، چەند جارانیش سەرمان لە گوندی جەلی دەدا و خزمانمان بە سەر دەکردەوە بەتایبەتی ئێمەی منداڵ کە حەزمان بە گەڕان پتر دەکرد تا خۆ لە ئاو هەڵکێشان. ئەو دەمە لە نێو خزمانی جەلی ڕیشسپیەتی بە «ئامۆزا محەمەد» ی خوالێخۆشبووی ڕەوا دیترا بوو.

ئەم پیاوە لە چاو هاو مەسەلەکانی خۆی زێدە بەرچاو و زۆریش ڕێزلێگیراو بوو. لکی جەلیزادەی کۆیە و ئەو لکەی ئامۆزا محەمەدی براگەورە بوو لە مەلا عەبدوڵای

کاکی جەلی (باوکی مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلی)11 دەگەنەوە یەک. باوکم تا بڵێی ئامۆزا محەمەدی خۆش دەویست و ڕێزی لێ دەنا و دڵی بۆی دەکرایەوە، منیش لەو منداڵییەمدا دڵم بۆی دەچوو. دەمدیت لەو خزمانەی جەلی و کەسانی ئەو ناوەی دەهاتنە لای باوکم تەنها ئامۆزا محەمەد یەکسەر دادەنیشت ئەوانی دیکە خۆگیرییان دەکرد هەتا باوکم تەکلیفی دانیشتنی دەکردن. ئەم دابەش شتێک نەبوو باوکم بە سەر خەڵقەکەیدا سەپاندبێ. لە خۆوە خەڵقەکە وەهایان لێ خۆش دەهات دوای ئیزنی ئەو لای دانیشن. لە نموونەی ئەو ڕێز و شکۆیە، نەمدیت لە هیچ کوێیەک کاکە حسێن و کاکە حەمە لە مەجلیسی سەید ئەحمەدی خانەقای باوکیان دابنیشن، هەمیشە لە حزوور باوکیان وەک درەخت بە سەر پێیانەوە دەچەقین.

ئەو ساڵەی کە باوکم چوو بۆ لای جەلی، پێوەندی بە سەفەرە عادەتیەکانی ساڵانەی ماڵی ئێمە و ماڵی مامەوە نەبوو، چشتێک ڕووی دابوو، کە ئێستاکە نازانم چی بووە، هەلی ڕێک خست بۆ باوکم کە سەردانێکی ئەو ناوە بکات، زۆر لە مێژیش بوو حەزی دەکرد زیارەتی گۆڕی باپیرە گەورەمان کاکی جەلی و دیدەنی خزمانیش بکات. هاتوباتی ئەو سەردانە چ خزمایەتیی نەبوو لەگەڵ سەفەری ئێمە، لەو چەند ڕۆژانەدا کە باوکم لەو ناوە مایەوە خەڵقی ناوچەکە تێکرِایان هاتنە بەخێرهێنانی، خوا هەڵناگرێ خزمانی جەلیش بە گەورە و گچکەیانەوە، کوردی گوتەنی، خۆیان شەهید کرد لە خزمەتی میوانان.

لە بیرمە ئەو هاوینە مێگەلی کۆمەڵێک لە مەڕدارانی دزەیی هاتبوون بۆ پاوانەکانی ناوچەی جەلی سناوە و ئەو دەوروبەرە. خاوەن مێگەلەکان کە لە ئاغاکانی دزەیی بوون، ئەوانیش هاتنە سەردانی باوکم، دەستودیارییەکی باشیان پێ بوو بۆ ئەو بنگەیەی کە خۆراکی بۆ مێوانەکانی باوکم دروست دەکرد.12 ڕەنگە ئەو ساڵە من

---

11- مەلا عەبدولڕەحمانی کاکی جەلی چوار برای لە خۆ گچکەتری هەبووە. لە مانە برای سێیەم «مەلا مەحموود» باپیرە گەورەی تیرەی ئامۆزا محەمەد بووە. برایەکیان چووە بۆ شام و بۆتە مریدی مەولانا خالد و کچە برای دەخوازێت و لەقەبی «داماد» وەردەگرێ.

12- وام بیرە پێشڕۆی ئاغاکان ناوی عارەباغا بوو. باوکم خۆشی دەویست و منیش دڵم بۆی دەکرایەوە، مەیلیشی وەک بە تێوەڕامانی ئەو دەمەم بۆی دەردەکەوت،

لە پۆلی دووەم یان یەکەمی سەرەتایی بووبێتم، چ بەرهەڵستیشم نییە لەوەدا بمگێڕنەوە بۆ ئەو تەمەنە و ئەو چرگەنەی بناری ئاوەگرد و دوو قەراغی ئەم بەر ئەو بەری ڕووبارەکەی باسەڵم.

لە یادی ترسی پڵینگ ئەو شتانەم بە بیردا دێنەوە کە لە ساواییم و لە منداڵیمدا ترسم لێیان هەبوو، مەبەسیش شتی ئەوتۆن لە عادەت بەدەر بن. لە سێ شت دەترسام هیچیان پێوەندییان بەوی دیکەوە نییە. یەکەمیان ترسی سەگ، نازانم لە کوێوە ئەو ترسەم بۆ هاتبوو بەڵام لە بیرمە بە هەموو دڵ و گیانم لێی دەتۆقیم، تەنانەت لێشم دوور بایە ترسەکەم ڕێ دەنیشت. کە گەورە بووم بە خۆدا شکانەوە نەیدەهێشت ترسەکەم پێوە دیار بێ بەڵام ئەوساش تا پێم کرابایە خۆم لە شاڵاوی سەگ دوور دەخستەوە، واتە خۆمم نە دەخستە ئەزموونی ترس و نەترسانەوە.

دووەمیان ترسی بە پەیژەدا هاتنە خوارەوە. نەمدەزانی چوونە سەری پەیژە هێندە جودایە لە پێدا هاتنە خواری. تاکوو جارێکیان بە پەیژە سەر کۆشکێکی تازە دروستکراوی ماڵی مامم کەوتم کە ویستم وەکوو خەڵقەکە بە پەیژەکەدا بێمەوە خوارێ لە سەرەتاوە ترسێکم سواری شانان بوو، ئنجا ترسەکەم لێ بوو بە سەرسوڕکێ. لەو سەربانە عەوقام و بە هیچ جۆرێک جورئەتم نەکرد لەپەیژەکە نزیک بکەومەوە. پیاوێکی لەوانەی خزمەتی باوکمیان دەکرد «صمد» ناو هات و لە کۆڵی خۆی کردم و پێشی گوتم چاوەکانت بچووقێنە و دەستەکانت لە ملم توند بکە و ترست نەبێ. ئامۆژگاریەکەم لە سەدی سەد جێبەجێ کرد، بەڵام لە دڵدا ئومێدم کەم بوو کە بە سەلامەتی دەگەمەوە سەربانەکەی ژێرەوە. دیار بوو «صمد» چ پەروای نەبوو چونکە هێندی بڵێی یەک و دوو لە بانی ژێرەوەی دانام.

سەمەد کوڕە خاڵی کافیەی مەلایان بوو، کە ئەوسا چەند ساڵێک بوو هاتبووە ماڵمان، خۆیشی پتر لە دە ساڵ خزمەتی باوکمی کرد، تاکوو بۆی ڕێکەوت لە کۆتایی سییەکان کاک مەجیدی ئامۆزام بوو بە مدیری قوتابخانەی ڕانیە و سەمەدی کرد بە فەڕاش. لەوەوە بوو بە ڕانیەیی بەڵام هەتا مرد هەر خزم و ناسیاو و دڵسۆزمان

---

خاکی و دیندارانە بوو. ساڵەهای دواتر لە هەولێرم دیتەوە، هاتە سەردانی باوکم کە مێوانی مەلا ئەفەندی بوو لە باداوە.

بوو. مردنەکەشی جۆرێک بوو بە زەینی کەسدا نەدەهات، ئاوی کوێرەکانی لە ڕانیە، حەوزێکی گەورەی بە دیوار بۆ هەڵنرابوو، تاکوو ئەوانەی لە مزگەوتەکەی نزیکیەوە نوێژ دەکەن دەسنوێژی لێ بشۆن. جارێکیان لەو دەمەدا کە سەمەد حەنەفییەکی حەوزەکەی کردبۆوە و دەسنوێژی لەبەر دەشووشت، لە پڕ دیواری حەوزەکەی بە سەردا ڕما، ئاسنی لوولە و حەنەفییەکە لە سینگی چەقیبوو، یەک دوو ڕۆژ دواتر گیانی سپارد. هەزار ڕەحمەتی لێ بێ. وەی کە بۆی بە پەرۆش بووین.

ترسی سێیەم ئەگەر لە خۆم نەقەومابایە ڕەنگ بوو باوەڕ بە هەبوونی ئەو جۆرە ترسە نەکەم. چەند ساڵێکی تەمەنی ساواییم لە چاوی دوو کەس دەترسام، کە پێویست نابینم ناویان بهێنم، هەر دووکیان دەمێکە مردوون، چ ئاگاداریش نەبوون لەو ترسەی چاوی ئەوان بۆ منی دەڕسکاند، هەر دووشیان پێوەندییان پێمانەوە بە تین بوو، خۆشیان بە بچووکی باوکم لە قەڵەم دەدا، هەر ئەمیش بوو موشکیلەی بۆ من دەنایەوە چونکە ئەو پێوەندییە وەهای دەکرد زۆریان ببینم. تا منداڵ بووم کەس لێی نەبیستم حاڵی من چۆنە بە دەست ئەم دوو جووتە چاوەوە. بێگومان چاوی خاتوو زین ئەو کارەی لە کاکە مەم نەکردووە. کە گەورەبووم و لە ڕێگای تووشیان دەبووم بۆم ڕادەوەستان تا سڵاویان لێ دەکەم بە بیرمدا دەهاتەوە ئەو چاوانەی وەها پڕ لە خۆشەویستییان دەبینم کاتی خۆی چ باجێکی سەختی گیانییان لێ سەندووم، خۆشیان لە وەهم و لە خەیاڵیشدا هەستیان بەو کاریگەرییەی چاوەکانی خۆیان نەدەکرد. جیهان پڕە لەو جۆرە هەستی دەرنەبڕاوە و تەئسیری بێ شوێن و کاریگەرایەتیی نەزۆک... بەڵام کێ دەڵێ حاڵوباری ئەوتۆ نەبووە تەئسیری ئەوتۆیی بە زەقی و لە ڕووداودا خۆی نواندبێ؟ بە چ مەعلووم هەندێ نەساغی نەفسی لە من و تۆدا ناچێتەوە بۆ سەرچاوەی وەها خەیاڵ لێ نەکراو کە بە بیردا نایەتەوە؟ بە چ مەعلووم؟

لەو دیمەنانەی کە دێنەوە بەر خەیاڵی ساواییم و پەردەی زەینم بە تەواوی پڕ دەکەنەوە دیمەنێکە، ئەویش تێم دەگەیەنێ کەوا ڕەنگە بچووکیی پۆرگی تەحەمولی منداڵ بکێشێتەوە بۆ بە گەورە نواندنی ئەو شتانەی دێنە بەر هەستی. نیوەڕۆ بوو، بە بۆنەی هاتنی خاڵە شێخ مارفی هەڵەجە، کە خۆی براگەورەی بنەماڵەی بەرزنجییەکانی کۆیێ و خاڵە گەورەی مامم بوو، قاوەڵتی لە ماڵی مامم دەکرا.

من منداڵ بووم جارێ نەچووبوومە قوتابخانە. بە دەوری سینییەکی گەورەی سەرووی ڕیزە سینییەکانەوە باوکم و خاڵە شێخ مارف و دوو برای دیکەی کە خاڵە شێخ موحییەددین (نهانی) و خاڵە شێخ نجم الدین بوون، منیش لە خزمەتیاندا، نانمان دەخوارد. وام دەزانی ڕیشی ئەو سێ خاڵانە لە هاتوچۆی پاروو جوویندا هێندەی باوەشێنە دێن و دەچن... ڕاستییەکەی لەو دەمەدا، وەختە بڵێم، دنیام لێ بووبووە باوەشێنستان. هەر ئەو جارەش بەخزمەت خاڵە شێخ مارف گەیشتبووم، ئەویش بەم شێوەیەی نەفامی و نیگاشێوان. دواتر زانیم خاڵە شێخ مارف ڕیشی وەها نەبوو وەک دەهاتەوە بەر زەینی ساواییم، تومەز لە پەنا سێبەری ڕیشی دوو خاڵەکەی دیکەدا، بەتایبەتی هی خاڵە موحیەددین، ڕیش لە خۆوە زیادیان کردبوو.

دیمەنێکی دیکەی بەر زەینی ساواییم، کە لەو تەمەنەدا هەزاران هێندەی خۆی نرخ و بایەخی لام هەبوو، ئەمەیان بوو: کە پاییز دادەهات و لە ژووران دەنوستین من و نەجیبەی خوشکم و فەتحی لەگەڵ یاعیسمەتی دایانم لە کۆنە ناوماڵی قەدیمی سەردەمی باپیرم دەبووین... لە پاییز و زستاندا سبەینان تیشکی ڕۆژ لە سێ کولانکەی نزیک بنمیچی ناو ماڵەکە دەهاتە ژوورەوە. یەکەم کولانەی کە تیشکی لێوە دەهاتە ژوورێ ئەوەیان بوو کە لەو سەری ناو ماڵەکە، دووری دەرگا و بە تەنیشت دیواری نێوان ئێمە و ماڵی مامەوە بوو. من چاوەنۆڕی ئەو دەمەم دەکرد، ئیتر لە هەوەڵەوە بە قەد پنۆکێک تیشک لە دیواری پشت کۆنە ئەستێرکەوە گەش دەبوو. بەپێی هەڵکشان و سووڕانی ڕۆژ ئەو پنۆکە تیشکەی کە هێندەی درهەمێک بوو ورد ورد پانتر دەبوو، جێگۆڕکێشی دەکرد بەرەژێری دیواری پشت ئەستێرکەکە. زۆری نەدەبرد پنۆکێکی نوێ لە تیشکی ڕۆژ، لە کولانەی ناوەڕاستەوە وەکوو شیشەی سپی، دووکەڵ و گەردە تۆزی ناو ماڵەکەی دەسمی تا لە شوێنێکی دیواری بەرانبەری چەسپ دەبوو. کە ڕۆژ پتر هەڵدەکشا و مەیلی بە تیشکی خۆی دەکردەوە ئەویش لە کولانەی سێیەمەوە گەرد و دووکەڵی دەسمی و... منیش بەو هەست و هۆشەی ساواییمەوە لە ناو نوێنی خۆمەوە بە خەیاڵ و خوولیا لە گەڵیاندا دەژیام هەتا دەمی بەرچایی، ئەوسا تیشکەکانیش لە دیوارەکان بەردەبوونەوە سەر زەوی و تێوەڕامانیان وەزەحمەت دەکەوت جگە لەوەی کە نشینگەیان بە سەر کەلوپەل و پێڵاو و شتومەکی ناو ماڵەکەوە ئەو لەبارییەیان نەدەما وەک کە بە دیواری بێگرنجەوە ڕێکوپێک و لووسولێک خۆیان دەنواند.

ڕۆژێکی ئەگەر هەور و باران بایە زەوقی سبەینانم دەگۆڕا بۆ خوولیایەکی دیکە کەوا ڕەنگە لەوێشدا هەر من بە تەنها بەشتی وەهاوە خەریکابێتم. لە تەمەنێکی زۆر زووەوە حەزم دەکرد سەرنج لە ڕێژەوی پلووسکی بانەکان بگرم. ئەو پلووسکەی ئاوەڕۆی بانی پانی بەڕێ کردبایە ئاوەکەی زۆرتر و پەلامیزەی دوورتر دەڕۆیی پتر لێ ڕازی دەبووم. ئەگەر بانێکی پان پلووسکی نالەباری پێوەبایە ناڕاحەت دەبووم چونکە ئاوەکەی بە پرژاوی و لە نزیک بەردەمی خۆیەوە دەکەوتە سەر زەوی.
ماڵەکەمان ئاوەڕۆی حەفت پلوسکی بانەکانی دەهاتەوە حەوشەی حەرەم و دیوەخانە. هەتا زۆر منداڵ بووم بەو حەفت پلوسکە تامەزرۆیی خۆمم لە مەراقەکەم دەشکاند، فێڵێکی دیکەشم دەخستە گەڕ بۆ دڵنیایی تەواوی خۆم: دەهاتم لە حەوشەی ژوورەوە خانیچکۆڵەی وەهام دەکرد بانەکەی بایی ئەوە بکا کە بارانی مەیلەو غوردەم بباری پلووسکی هەڵستێ هەرچەند بە کزیش بێ. لە هەڵنانی خانیچکۆڵەی وەهادا فەتحی یارمەتیی دەدام و یارمەتیەکەم بە هەوڵی خۆم حیساب دەکرد، ئەگەر یەکێکی گەورە دەستی لەو کارەدا بایە لە سەر خۆمم بە نوقسانی حیساب دەکرد و تامی نەدەما و خانیچکۆڵەکەم بە فێڵێک دەڕماند. کە نەختێک فەراقە بووم «مەراقی پلووسک» م لە سنووری ماڵەوە ڕۆیی بۆ گەڕەکی خۆمان، دواتر بۆ گەڕەکی دیکە تاکوو گەیشتمە تەمەنیک پەراوێزی مەراقەکەم بە پانایی شارەکە پان بۆوە ئیتر دەمزانی لە هەر گەڕەکە کام پلووسک قارەمانە و میزاوی دوور دەڕوات و دەوامەی ئاوەکەی پترە لە پلوسکی دیکە. لەو وردەحیسابەی بینبرکێی نێوان پلووسەکەکان چەند پلووسکێکم هەڵاواردبوو کە ئاوەکەیان هێندە زۆر بوو لە بارانی غوردەمدا دەبوونە تاڤگە، یەکەمیان پلووسکی بازاڕی عەتاران، دوەمیان پلووسکی بانی قەیسەری نوێ، سێیەم پلووسکێکی مزگەوتی گەورە. بە کورتی لە ڕۆژی بارانەدا ئەو مەراقەم منی دەگێڕا، بە خۆم و چەتری بان سەرمەوە، لە تەفتیشی حاڵ و هەواڵی کەڵەپلووسکەکان و چەندوچۆنی ڕێژەویان و ئەو قۆرتەی لە خاک هەڵی دەکەنن.

سەیر لەوەدا بوو، حەزم نەدەکرد پاتەوپات پێمەوە دیار بێ ئەو مەراقەی دڵم دەبزێوێ، خەڵقەکەی ماڵەوەش لەگەڵ ئەودا کە شارەزام بوون لە ڕوویان نەدەدام نەکا دڵشکستەم بکەن، بەڵام هەمیشە یاعیسمەت بە بەهانەیەک دەیبردمەوە بن نوا هەتا وشکی دەکردمەوە و گەرمی ڕادەهێنامەوە بێ ئەوەی پێم بڵێ ئاگاداری مەراقەکەمە وەیا چوونە بەر بارانم بۆ خاتری پلووسکی ساردوسڕ و بێ ئاگا لە

منداڵی ژیر ناوەشێتەوە. هەر لە بیرمە کە دەمدیت یەکێک تەماشام دەکات لە کاتی سەرنج کشانم بۆ ڕێژەوەی پلووسکێک، گورج چاوم لە پلووسکەکە هەڵدەئەنگاوت بۆ لایەکی دیکە. وەها دەبوو بۆ تاقی کردنەوەی زۆری و کەمیی ئاوی دوو پلووسک دەهاتم دوو عەیارەی چوونیەکم لە یەک کاتدا دەخستە بەر ئاوی ئەو دوو پلووسکەوە: هەر کامێکی زووتر عەیارەی پڕ کردبایە ئەویان پاڵەوان دەردەچوو بە زۆری لەوەدا هاوزایەکم بە هانام ڕادەگەیشت بۆ ئەوەی بە هەردووکمان بتوانین لە یەک کاتدا عەیارەکان بخەینە شوێنی مەبەست.

بیرەوەریەکی بە هاتوبات و سەر و سەدای تەمەنی سەرەتایی منداڵیم ئاهەنگی «سونەتانە» بوو. لە کۆنەوە وەها ڕۆیشتوو کە سونەت کردنی نێرینە لە حەوش و ناوماڵی ئێمەدا بەدیوومە، لەبەر ئەمە هەرچەند ئاهەنگەکەش بۆ حیسابی ماڵی ئێمە بێت پێویستە لە ماڵێکی دراوسێ و ناسیاودا بگەڕێ. داوەت و پڵاولۆغان و کەیف و شادی ئەو ڕۆژە لە زەینمدا نەقش بەستوو بووە. من و سەلاحی ئامۆزام و چەند هاوزای دیکەمان لە ماڵی جێرانیکمان «حاجی فەقێ محەمەد» کە یەکێک بوو لەوانەی بە درێژایی عومر شەوانە دەهاتنە لای باوکم، دراینە دەست وەستا و حەکیمی ئەو دەمە، لە هەرا و هەڵاهەڵا و قیژەقیژی ئەوتۆدا کە بیری منداڵ بە خۆیەوە خەریک بکات لە ساواییەوە بۆ منداڵی بەڕێ کراین. هەندێک لەو منداڵانە بێ ئەوەی بکەونە ناو نوێنەوە یەکسەر لەبەر دەستی وەستاوە ڕوویان کردە کۆڕی گەمەوگەپی عادەتی. ڕۆژێکیان حەوێزی مەلا سبوح (مەلا سبوح ئامۆزای باوکم بوو، ئەوسا بەرحەیات نەمابوو) نەک هەر بۆی نەکەوت، کە گەڕایەوە ماڵەوە کەوتە نێو حەوزەکەشیانەوە کە هەر خوا دەزانێ چ جۆرە میکرۆبی تێدا دەژیا. سەلاح و حەوێز و ئیسماعیلی مەلا نووری (ئەویش کوڕی ئامۆزای باوکم بوو) لە من هەراشتر بوون. سدیقی کاک تاهیر و وابزانم ڕەفیقی حاجی کەریم (حاجی کەریم لە دایکڕا برا گەورەی کاک تاهیر بوو) کەمێک لە من بچووکتر بوون.

لە نێو هەموویاندا من، کە ئاهەنگەکە بە ئەساس بۆ من بوو، ئازارێکی زۆرم لەو سونەت کردنە دیت 40 شەوی بۆ کەوتم. لەو بەینە ماڵەکەمان هەمیشە وەک کارێزەبازاڕ یان خەستەخانە بوو. برادەرە سونەتکراوەکانیشم وەکوو خەڵقی دیکە دەهاتنەوە ئەحواڵ پرسیم. خەفەتێکی ئەو ڕۆژانەی لە جێگەدا کەوتم گەلێک پتر لە ئازاری چل ڕۆژیم بەردەوام بوو. گرامۆفۆنی دۆستێکیان هێنابوو بۆ خافڵاندنم، لە

دەمی نیشتنەوەی ئازارم حەزم دەکرد گوێ لە قەوانەکانی بژاردەم ڕابگرم، ئەوسا «منیرة مهدیة» بە ناو بوو، منیش لەو تەمەنەدا ئاشقی دەنگی ئەو بووم. مەراقم لە گرامۆفۆن داگرت و داوام کرد یەکێکم بۆ بکرن.

هەتا لە جێگەدا بووم گرامۆفۆنی خوازرایەوە تەسکینی دەدام، دوای هەڵستانەوەم بۆ خاوەنی هەناردراوە، ئیتر کەلێن کەوتە ئارەزۆمەوە و بە توندی داوای گرامۆفۆنێکی مڵکی خۆمم کرد. کاک تاهیر لێم بووە درکی مەموزینان و بە هەزار بەڵگە ئەو خەڵقەی ئیقناع کرد کە کرینی «صندوق» کارێکی نابەجێیە و پارە بە فیرۆدانە. لە مەسەلەی پارە خەرج کردن کاک تاهیر لە ماڵی ئێمە قسەی دەرۆیشت چونکە وەکیلی باوکم بوو. سەری خوێنەر نەیەشێنم لەو شەڕە گەرەکێیەی کرین و نەکرینی «صندوق - گرامۆفۆن» کاک تاهیر سەرکەوت منیش وەها دڵشکستە بووم کاری لە گیانم کردبێ. ئەو کاک تاهیرە لە باری دیکەدا وەها جانفیدا بوو بۆم سێودووی نەدەکرد لەوەدا گیانی خۆی لە پێناومدا بخاتە مەترسییەوە، کەچی لە ئاست سەد ڕووپیەی نرخی سندووق لێم بووە دوژمنی بابەکوشتە، مەسرەفەکەش لە کیس ئەو نەدەچوو. گەردەنی ئازاد بێ، هەرچەند لەحەدبەدەر خەفەتم خوارد و ساڵەهای دواتریش باس دەکرایەوە و خەفەتی نوێم لێ دەخواردەوە، ئێستاکەش لەو خەفەتە ڕەها نەبووم.

جارێکیان لەو تەمەنەی ساواییمدا وەختابوو لە ئاودا بخنکێم. من و سەڵاحی ئامۆزام و حەوێزی مەلا سبوح لەسەر ڕۆخی حەوزەکەی ماڵی حەوێز بە ڕیز
هەڵتووتکابووین. سەڵاح لە نێوانماندا بوو. لە پڕ بێ ئەوەی پێشتر خەبەرداریەک لە سەڵاحەوە مەعلووم کرابێ من و حەوێزی خستە ناو حەوزەکەوە. ئەوەندە ورد و ساوا بووم نەتوانم لەو ئاوەدا پێ لە زەوی گیر بکەم و پەلەکوتکەی هاتنە دەرەوە بکەم. سەڵاح دوای کەتنەکە هەڵاتبوو بێ ئەوەی کەس ئاگادار بکاتەوە لەوەی کردووەتی. لە بیرمە، کە ژێر ئاو بووم وەهام دەزانی ئاو دەمسوڕێنێ و سەروبنم دەکات بەڵام سەغڵەتیەکی وەهام بە بیردا نایەتەوە خەیاڵی مردنی پێوە بێ.
خواوڕاستان یەکێک بەڕێکەوت دەبینێ لچکی جلکی منداڵ لە ئاودا دەیارە. بە ڕاکێشانی ئەو لچکە دەزانێ مەسەلە چییە و من و حەوێزی لە ئاوەکە دەرکێشا، ئیتر بوو بە هەرا و گریان و قەڵەباڵغی. لە بیرمە سەرەوژێریان کردمەوە بۆ ئەوەی ئاوی هەناوم دەردەمەوە. ئەویشم لە بیرە کە یاعیسمەت لە باوەشی کردم، گوتی کلی

چاوم بە ئاو شۆرا، دیارە تازە چاویان بە کل ڕشتبووم. سەیری نێوانی مردن و ژین چەند تەنکە! چەند دەقیقەیەکی دیکە پێمان ڕانەگەیشتبان من و حەویز بۆی دەرچووبووین. ئەم حەوێزە برایەکی لە خۆ گەورەتری ناوی مەلا نافیعە، ئێستاکە دوەم تەمەندرێژە لە جەلیزادەکانی کۆیە. لە هەموان بەتەمەنتر «حیسامووددینی مەلا ڕەفعەتی مەلا حەبیب»ە. بە بۆنەی ناوهێنانی حیسامووددینەوە دیمەنێکی زۆر کۆنی بیرەوەریی مندالیم دێتەوە یاد.

مەلا ڕەفعەت، ئامۆزای باوکم، بە جحێڵی کۆچی دوایی دەکات و دوو کوڕی لە پاش بەجێ دەمێنێ «حسام الدین» و «عمر». لە تەمەندا ئەم دوو برایە لێک نزیک بوون. دیارە بێباوکی دەبێتە هۆی نەمانی چاوسوورکەرەوە لە بەیندا ئیتر تۆران سەربە شەڕە چەپەڵۆک دەگەیەنێ. ناوناوە، بە زۆریش لە دەمی جەمی سبەینەدا. یەکێک لەو دوو برایە بە چاوی فرمێسکاوییەوە لە پڕ بە ژوور دەکەوت و شکاتی لە براکەی دیکەی دەکرد لای باوکم. من ئەوسا زۆر منداڵ بووم ئەو دیمەنەم وەکوو ڕووداوێکی عادەتیی گەرما و سەرما و با و باران دەهاتە بەرچاو کە هەر دەبێ بقەومێ. باوکم هەرجارە ساردی دەکردنەوە و شکاتی دەپرسینەوە و بەسەر دەسدرێژکەردا دەچۆوە.

حیسامووددین زوو ژنی هێنا، لەگەڵ ماڵی شێخ ڕەسووڵ، کە خاوەن تەکیە و ڕێوجێن لە کۆیێ، خزمایەتیی بەست. لە ژنهێنانی خزمەکانم دووانم بە بیردا دێت کە جارێ زۆر منداڵ بووم، یەکیان ئەمەی کاک حیسامووددین، ئەوی دیکەیان هی مەلا فەتاحی مەلا عیززەت کە ئامۆزای کاک حیسامووددین بوو. لە بیرمە گرامۆفۆنیان لە ماڵی خاڵە عیززەت لێ دەدا- مەلا عیززەت ئامۆزای باوکم و خاڵی عەبدولموقتەدیری برام بوو. لەو قەوانانەی دەنگیان لەبەر گوێم دەزرینگێتەوە و هەستی ئەوساکەمم لە دڵی ئێستاکەمدا دەبزێوێ گۆرانیی «انا راضي وابوها راضي»ی ساڵح عەبدولحەی (صالح عبدالحي) و «رسول السلم الى مصر» کە دەیان گوت هی کەلسوومە، یەکێکی دیکەی میسریش بوو کە ئاهەنگەکەیم لە بیرە بەڵام هیچ وشەیەکی شیعرەکەیم لە بیر نەماوە. لەگەڵ ئەم قەوانانەدا قەوانی مەلا تەهای کەرکووکی و سەید ئەحمەد و سەید ئەمینی مووسڵی-یش دەنگیان دەهات. نایەتەوە بەر یادم، ئەو دەمە، قەوانی کوردیم لە بەزمەکەدا بیستبێ.

دیمەنێکی دیکەی بیرەوەریی منداڵیم، کە ئەویش وەکوو با و بارانی حەتمی هەر دەبێ ڕوو بدات، ئەوەبوو کە لە چەند مانگێکدا جارێکیان سۆفی تۆفیق- لە مریدەکانی بنەماڵەی شەدەڵە- بە خۆی و عەسای دەستی و ڕیشی درێژیەوە بەحاڵ و سەمای جەزبەگرتنەوە خۆی بە حەوشی دیوی حەرەمدا دەکرد و چەرخەبەدەوری ئەو دار و دیوارانەی دەکرد و کەفی هەڵدەدا و یەک نەفەس و بەردەوام. «بە قوربانت بم مام مەلا، سەگی دەرگەتم مام مەلا، ئاگرم تێبەربوو مام مەلا...»ی بە دەنگی هەرە بەرزی دەگوتەوە و دەگریا و دەگەڕا و نازانم بڵێم چی دەکرد، باوکیشم بەسەر پێیانەوە سەبری لێ دەگرت هەتا سارده دەبۆوە و دەهاتەوە سەر باری ئاسایی، ئەوسا بەپێی عادەتی هەموو جارانی «مووفەڕک» ێکی لە پۆشاک، وەک سەرکەوا، سەڵتە، کورتەک لێ وەردەگرت و بە دەستەکانیدا دەنووسا و بەدەم هەنیسکەوە بۆی دەردەچوو. ئەم حاڵ و جەزبەی سۆفی تۆفیق یەکجار کاری تێدەکردم و ماوەیەکی درێژ لەگەڵمدا دەژیا، دواتریش کە هۆشم کراوەیەوە ئاواتم دەخواست کەوا کاشکی وەزعەکەم نەدیتایە چونکە لە دەروونمدا دەیهەژاندم و زامداری دەکردم.

ئەگەر بوێرم دەڵێم دیمەنی جەزبەی سۆفی تۆفیق ناوناوە لە خەومدا لێم دەبوو بە جۆرە کامووسێک چەند سانییەیەکی دەخایاند و زۆری پێوە سەغڵەت دەبووم. ئەم شێوە کامووسە جودایە لە کامووسی عادەتی کە دەشێ دووچاری هەموو کەسێک ببێت، خۆیشم لێی بەڵەدم کەف و لەرز و هەڵسووڕانی سۆفی تۆفیق تێک بکەوە و بیکە بە شڵەژانێکی چەند سانییە و بە مێشکتیدا تێپەڕێنە پێبەپێی هەڵکشانم لە تەمەندا ئەم جۆرە کامووسە بەرەو کەم بوونەوەوە ڕۆیی تا ئەوەی بڵێم لە چەند ساڵێکدا جارێک دەیبینم یا نایبینم.

هەر لە بیرمە، زۆر بە ڕوونیش بیری دەکەمەوە، یەکەم جاری کامووسی عادەتیم تووش بوو، ڕەمەزان لە زستاندا بوو، یەکەم ساڵیش بوو دەستم کردبوو بە ڕۆژوو گرتن، شەوێکیان دوای پارشێو کردن نوستمەوە لە شێوەی خەونی ئاڵۆزدا دووچاری حاڵەتێک بووم لە هەناسە سواری و مشەوەشی و شڵەژان و ترس و تەنگەتاوی کەوا هەرگیز پێشتر دووچاری نەبووبووم. کە حاڵەتەکە بەسەر چوو خەبەرم بۆوە و دڵەکوتکەی تەنگەتاوی خەوەکەم هەر پێوە بوو. ئەوسا هیچ ناوێکم بۆ ئەو حاڵەتە نەبیستبوو، فکریشم نەکردبۆوە لە هەبوونی حاڵەتی ئەوتۆیی. وەهام زانی خەونێکی

زێدە ناخۆشم دیتووە، بەڵام نەمتوانی وەیا نەموێرا بخەومەوە لە ترسی هاتنەوەی خەونە ناخۆشەکە. دواتر کە خەڵق خەبەریان بۆوە خەونەکەم بۆ گێڕانەوە پێیان گوتم ئەوە کامووس بووە. دوای ئەم تەجرەبەیە بە زۆری کە ڕادەکشام بۆ نوستن ترسێکی کامووس لەگەڵمدا دەبوو بەڵام بەینێکی درێژی خایاند تا کامووسی دووەمم دیتەوە. وردە وردە لە کامووس ڕاهاتم تاکوو وەها دەبوو لەگەڵی بەخەبەر دەهاتم و ئاگاداری هەموو شتێک دەبووم و قسەی خەڵق تێدەگەیشتم بێ ئەوەی بتوانم لە ژێری هەڵستمەوە. بۆ ئەوەی خەڵقەکە ئاگادار بن لێم و ڕزگارم بکەن ناڵەناڵم دەکرد. ئەگەر بە ناڵەناڵ سەرنجی کەسم بۆ نەکشابایە بە دەنگی بەرزترەوە دەمناڵاند...

لە بیرەوەریی هاتوباتی فتارەکانی ڕەمەزان کەوا جارێ ساوا بووم و ڕۆژووم پێ نەدەگیرا بە چاکیم لەیادەکە ئێوارەیەکیان ڕۆژ لە زەردەپەڕ بوو دنیاش سارد، زلۆبیەکم بردە سەربان بە دوو پەنجەی دەستی ڕاستمەوە بەرەو هەتاوم ڕاگرت، گۆیا سارد نەبێتەوە هەتا دەمی مەلا بانگدانی ئێوارە بەڵام زۆرم خۆ پێ نەگیرا و زلۆبیەکەم خوارد...

سەڵاحی ئامۆزاشم، زۆر لە ئێوارەکان، دەهاتە ناو زارکی دەرگەی نێوان ماڵی مامم و ئێمە. لەو دەمەدا کە لەگەڵ باوکم خەریکی فتار دەبووین سەڵاح وەکوو مەلای موئەزین بانگی دەدا بەڵام چۆن بانگێک؟ دەیگوت «ئەڵاهو نەشەد ئەڵاهو نەشەد». وشەی «نەشەد» ی لە جێی «اشهد» بەکاردەهێنا، وشەکەشی لە ناوی «مەلا نەشئەت» و «سۆفی نەشئەت»ـەوە دەخواستەوە کە یەکەمیان خزمێکی خوالێخۆشبوومان بوو دووەمیشیان ناسیاوێکی گەڕەکەکەمان بوو خەڵقیش بە «مەلا نەشەد» و «سۆفی نەشەد» ناویان دەبردن. بەهەمەحاڵ بانگەکەی هەموو ئێوارەیەک پاداشی لەگەڵدا دەبۆوە. باوکم لە فتاری سەر سینی تێشووی بۆ دەنارد لەو خۆراکەی کە بە لای منداڵەوە خۆش بێت و بانگی بۆ بدات، سەڵاحیش هەر ئەمەی بە ئامانج دەگرت لەو بانگدانەی.

لە موناسەبەی یادی ڕەمەزانی منداڵیم شتم بە بیر دێنەوە، بەڵام هەموو شتی ئەوتۆن بە لای ساواوە سەرنجڕاکێش بێ. ئێواران ئەگەر ساماڵ بایە باوکم بەر لە ڕۆژاوا بە چەند دەقیقەیەک دەچوە سەربانی ژوورەکەی خۆی ئەو ماوەیەی پێش بانگدانی ئێوارەی بە پیاسە ڕادەبوارد.

لەو بانەوە گونبەدی مزگەوتی گەورە دیار بوو. موئەزینی مزگەوت ناوی مەلا حەبیب بوو، لە شوێنێک ڕادەوەستا کە باوکمی لێوە دیار بێ. کاتێک «سواد» بڵند دەبوو باوکم دەستێکی لێ هەڵدەتەکاند، ئەویش لە جێگەی خۆیەوە جبەکەی هەڵدەتەکاند بۆ ئەو تۆپچییەی لە بەردەمی قشڵە بە سەر تۆپی ڕەمەزانەوە چاوەنۆڕی دەکرد، ئیتر تۆپەکەی ئاگر دەدا و فەرەحنایی دەکرایەوە.

ئەوسا تۆپچی «عەزە بەغدایی» یان پێ دەگوت. جگە لە تۆپی فتار و ڕۆژی جەژنەکان شەوی ڕەمەزانانیش لە دەمی پارشێودا خۆی و هاوڕێیەکی (ئاغڵەب حەمە عەبۆ هاوڕێی دەکرد) بە شاردا دەگەڕان و بە جووتە تەپڵیان لێ دەدا، هەر یەکەیان لە نەوایەک. عەزە بەغدایی تەپڵێکی بچووکی بەبەر سنگییەوە دەگرت و بە هەر دوو دەست، ئەمما بە ئوستادی دەیکوتا. حەمە عەبۆ دەهۆڵێکی زلی بە لاشان و کەمەریدا دەکرد و بە دەستێک لەنگەری ئاهەنگی بۆ عەزە ڕادەگرت.

لە تەمەنی نێوان ساوایی و منداڵیمەوە، بەزۆری، لە دەمی تەپڵی پارشێودا خەبەرم دەبۆوە، کە دەنگی تەپڵ و دەهۆڵ لە گەڕەکەکەی ئێمە نزیک دەبۆوە یەکێکم بە چراوە لەگەڵدا دەهات و دەرگەی دەرەوەیان بۆ دەکردمەوە و عەزە و حەمە عەبۆ دەگەیشتنە بەر دەرگەمان. تاوێکی باش تەپڵ و دەهۆڵیان بۆ دەکوتام تا لێی تێر دەبووم، ئنجا قامتە جگەرەیەکی کوردیی بۆن خۆشم دەدانێ و دوعاخوازیمان لە یەکدی دەکرد. ئەو پێوەندییەی دەمی پارشێو لە بەینماندا هەتا هەردوویان بە ڕەحمەتی خوا چوون، هەرگیز لە بیر ناکەم.

شەوی وەها دەبوو زوو بە خەبەر نەدەهاتم، کاتێک خەبەرم دەبۆوە گوێم لێ دەبوو تەپڵ و دەهۆڵ بە عادەتی شەوانی پێشوو لەبەر دەرگەمان دەنگیان دێت وەک کە خۆم لەوێ بم. بە پەلە بۆیان دەچووم و «تعارف» مان بەجێ دەهێنا، وەهاش دەبوو بەخەبەر نەدەهاتن ئەوان فەرمانی خۆیان هەر بەجێ دەهێنا ئنجا سووری تەپڵ لێدانیان تەواو دەکرد. شەوێکی باران و ڕەهێڵ بوایە تەپڵ لێدان بە کۆڵاناندا نەدەشیا بەتایبەتی لەبەر ئاوی پلووسکان کە خۆ لێ پاراستن و دەهۆڵ لێ شاردنەوەی وەزەحمەت دەکەوێ. لەو تەرزە شەوەدا عەزە لە کەمەری دەوری گونبەدی مزگەوتی گەورە دەگەڕا و دەیکوتا، منیش ئەگەر بە خەبەر بامایە خەیاڵم بۆی دەکشا و بە یادی شەوەکانی دیکە گوێم لێ دەگرت.

عەزە بەغدایی وەک بە ناوەکەیدا دیارە. عارەب و بەغدایی بوو. ڕەنگی ڕەشتاڵە و باڵای کورت بوو، وتوویژیشی پێوە دیار بوو کە فێری کوردی بووە. لە زۆر وردە کەسب و کاردا شارەزا بوو، وەک کە دیتمان تۆپچی و تەپڵ زەن بوو. ڕۆژێ کە بووک بۆ کاکە زیادی حەماغا گوێزرایەوە، عەزە بەغدایی دەست ڕەنگینییەکی جوانی نواند. ئەوسا من لە سەرەتاکانی خوێندنمدا بووم و بە چاوی منداڵی سەیری مەهارەتەکەی عەزەم دەکرد. ناتوانم بە تەواوی وەسفی چۆنیەتیی ئەو مەهارەتە بکەم بەڵام ئەوەندەم لە بیرە کە عەزە لە پێش وڵاغی بووکەوە لە ژێر تارایەکی ئاڵ و سەوز و بەریندا بەسەر ئەسکەلەیەکی دارینەوە کە لە ژێر پەردەدا بە چاو نەدەیترا مەقەسەی دەکرد هەر دەتگوت سواری جانەوەرێکی ئەفسانەیی بووە، مچەی حەبە تۆزەش (خەڵقی سلێمانی بوو لە کۆیێ پێیان دەگوت مچە ژنانی) جلکی ئافرەتانی لەبەر کردبوو، بە ڕەقس و چەغانە لە پێش پێشەوە بەرەو ماڵی زاوا دەهات، ئاپۆرەی بینەرانیش لەم بەر و ئەو بەری ڕێگەی دەستەی بووک گوێستنەوە، هەر لە ماڵی کەریماغای مەلا وەحیداغای حەوێزی هەتا ماڵی حەماغای غەفووری وەک بێشەڵانی تێک هاویشتوو کەڵەکەیان بەسەر یەکدیدا دەکرد.

بەزم و ئاهەنگی ئەو شاییە دە ڕۆژێکی خایاند و گەلێک سوار و پیادەی عەشایر و دەشتودەری کۆیە و ڕانیە و خۆشناوەتیش تێیدا بەشدار بوون و ئێواران ڕمبازیی و جلیتبازی لە مەزاری بەر «دەرکی گەروو سۆرک» دەکرا. لەبیرمە ئێوارەیەکیان بەدەم غارێنێ و ڕمبازیی سوارانەوە لەگەڵ چەند کەسێکی خۆمان ڕاوەستابووم، دیتم سوارێکی عەشرەتی جلیت بەدەست وڵاغی تاودا بۆ لای شەفیقی عەوڵاغای حەوێزی کە ئەوسا لە سوارە هەرە ماهیر و شیرینەکانی دەوری خۆی حیساب دەکرا، گەنجێکی زێدە بەرچاو و قۆزیش بوو. شەفیقاغا بەپێی دەستووری جلیتبازی وڵاغەکەی خۆی خستە غار و ڕووشی وەرگێڕا بۆ لای کابرای جلیت بە دەست. کابرا جلیتی حەواڵەی لای شەفیقاغا کرد، ئەویش هەوڵی دا جلیتەکە بقۆزێتەوە بەڵام دەست و قامی کابرای جلیت هاوێژ ڕاستی نەدەهێنا و جلیتەکە مەتر و نیوێک لە شەفیقاغا دوور ڕەت بوو. شەفیقاغا بۆی هەبوو باداتەوە سەر غەریمی خۆی بەڵام وابزانم تێبینیی لەوەدا کە کابرا مێوانە و خاڵەبەخشی کرد. من ئەم دیمەنەم بە چاکی لە بیرە، واش دەزانم لەو شاییە بوو کە بۆ ئاهەنگی ژنهێنانی کاکە زیاد دەگەڕا، ئنجا ئەگەر لە بیرکردنەوەدا بە سەهوو چووبێتم نازانم بڵێم لە چ ئاهەنگێکی

دیکەدا بووە چونکە لەو تەمەنەدا بەزمێکی دیکەی وەها بە هاتوبات نایەتەوە بەر یادم.

«دەرکی گەروو سۆرک» ناوێکی پاشماوەی ئەو دەورانەیە کە کۆیێ شوورەی بە دەورەوە هەبووە و شەوان دەرگاکانی دادەخران. ئەم دەرگەی گەروو سۆرک لەلایەن قیبلەی شارەکەوە بوو. یەکێکی دیکە لە سەرووی شار بەلای باکووردا پێی دەگوترا «دەرکی خۆشناوان». سێیەمیان وەختی خۆی پێی گوتراوە «دەرکی بابان» لە سەمتی بەری وڵاتی سلێمانی بوو. لە دەورانی ئێمەدا ناوی گۆڕابوو پێی دەگوترا «قۆنگری سەرشاخان». لە دیوەخانی حەماغا باس کرابوو گۆیا حاجی بەکراغای حەوێزی شوورەی نزیک گەڕەک و ماڵی حەوێزیانی هەڵوەشاندووە و کردوویەتی بە کەرەستەی کۆشک و باڵەخانەی خۆی. حەماغا گوتبووی حاشا للە ئەو نەی کرد، ئێمە کە خانوو و دیوەخانەی مەحموداغای باوکمان بینا کرد بەشێکی شوورەکەمان، کە مەیلەو کاول بووبوو، هەڵوەشاند و کردمانە دیواری ئەو تازە بینایەمان. لە کتێبەکەی «حەماغای گەورە» مێژووی دروست کردنی ئەو خانووە بە حیسابی «جمل» لە برە شیعرێکی فارسی چەند بەیتیدا هاتووە، دەکەوێتە پاش 1270 ساڵ مەرگی حاجی بەکراغا.

بەهەمەحاڵ ئەم دیمەنانە هی سەرەتای قۆناغی دوای ساواییمە، لەوەشدا عەزە بەغدایی پشکێکی بەرچاوی هەیە، مچەی حەبە تۆزەش یەکێکە لەو کەسانەی وێنەیان لە ئاوێنەی هەستی ساواییمدا نەقش بەستوو بووە چونکە بە زۆری سەردانی کۆیەی دەکرد و بەپێی مەیلی ژنانەی هەمیشە لە مەجلیسی ژنە خاوەن ماڵ و حاڵەکانی ئەوسادا خزمەتگوزاریی بەجێ دەگەیاند و هەر جارەش خەبەراتی ژنە ناودارەکانی سلێمانی و کەرکووک و هەڵەبجەی، وەک «نەشرەی ئەخبار» بەو مەجلیسانەدا بڵاو دەکردەوە. هاتوچۆی بۆ ماڵی ئێمە و ماڵی مامم بەردەوام بوو، تەنانەت جارێکیان لەگەڵماندا هات بۆ سەردانی حەمام جەلی، لە گەڕانەوەشدا بە درێژایی ڕێگا گۆرانیی بۆ گوتین و چەغانەی لێدا، بە سەر پشتی وڵاغەوە.

ئەو جارەیان مامم و خاڵە عیززەت لەگەڵدا بوون، منیش لە پاشکۆی کاک تاهیری حەمە لاڵ سواری ماینە بۆرە بووم کە لە خاڵانمەوە بە دیاری بۆم هاتبوو، مەبەستیش خاڵوانی پژدەرە. لە هەوەڵەوە ئەسپێکی گوڵڕەنگی قەشەنگم لە شێخ حەسەنی حاجی سەید گوڵ، ئامۆزای دایکم و زاوامان، بۆ هات... دواتر باوکم

ئەسپەکەی بۆ هەناردنەوە بە نیازی ئەوەی لە شوێنی ئەودا ماینێکم بۆ بنێرن، ئیتر
ماینەبۆرە، دەتگوت شیری سپییە وەک پەیکەری وەستایەکی هونەرکار خڕوخۆڵ و
قەشەنگ ڕەوت و غاری دەکرد، لە جێی ئەسپەشێ بۆم بوو بە دیاری. ئەو ڕۆژە کە
لە حەمام جەلی دەگەڕاینەوە و مچەی حەبە تۆزی گۆرانی و چەغانەی لە کاردا
بوون کاک تاهیر جڵەوی بۆ ماینەبۆرە بەرەڵا کرد و بەمەودا پێش قافڵەی
حەمامچییان کەوت، بەڵام لە ڕێگەیەکی هەڵەوە ڕۆیی... چەندێکی جەماعەت لە
دواوە بە پلار و دەنگی بەرزەوە گۆرانیی «هۆی خاڵی ڕێبوار، ڕێم لێ گۆڕاوە» یان
بە دوادا ناردین کاک تاهیر لێی نەبیستن ئەوانیش گۆرانیەکەیان گۆڕی بە «ڕێت
لێ گۆڕاوە». دوای هەڵەبوونێکی مزرۆکە ئنجا هاتینەوە سەر ڕاستە ڕێگای چنارۆک.

## ساواییم و حەمەدی ڕەش

دەنگوباسی حەمەدی ڕەش داستانێکە بۆ خۆی. ڕاستییەکەی بەسەرهاتی ئەم کەڵەدزە بێباک و نەترساوە شیاوی سەرەباسێکی سەربەخۆی درێژەداری بە وردەیە. من لێرەدا تارماییەکی ڕووداوی شەقاوەتەکەی حەمەدی ڕەش باس دەکەم کە لەگەڵ بیرەوەریی تەمەنی شلکی ئەوسامدا بگونجێ، دەرفەتیشم نییە لە بەغداوە بۆی بچمەوە کۆیێ بە پرس و تۆژینەوە ڕەگوڕیشەی ژیانی بۆ بەر ڕووناکی دەربکێشمەوە.

حەمەدی ڕەش فەقێ بوو. لە ساواییمدا بەینێک لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی خوێندووە زۆر جاران ئیشوکاری بەردەستیی پووری گەورەم «یافەخرە»ی کردووە. دەیانگوت وەکوو خۆیی هاتوچۆی ماڵ و مزگەوتی دەکرد. من بە بیرمدا نایەت بە زیندووەتی دیتبێتم، باشتریش ئەوەیە بڵێم وێنەیم لە یاد نەماوە، بە ڕواڵەت فەقێیەکی شەرم بەخۆ و چالاک بووە، دواتر دەرکەوت گورگ بوو لە پێستی مەڕدا. شەوێکی هاوین، ماڵمان لە چنارۆک بوو، بەڵام من بەڕێکەوت لە کۆیێ لای باوکم بووم. لەبەر منداڵیم، هێشتان مەجلیسی باوکم قەڵەباڵغ بوو من نوستم. کاتێک خەبەرم بۆوە شەو وەکوو ڕۆژی لێ هاتبوو لەبەر زۆریی چرا و هامووشۆکەر و دەنگوبەنگی قەوغای ماڵ و کووچە و کۆڵانەی دەورمان. ئەو دەمە جۆرێک سەیرهاتنەوە و ڕامان و شڵەژانێکم هەست پێکرد، دواتر بۆیان باس کردم چ ڕووی داوە. پاش هەڵستانی مەجلیس مەلا عیززەتی ئامۆزای باوکم و مامەی وەستا برایم بە نۆرەی شەوانەی خۆیان لای باوکم دەمێننەوە، یاریدەدەرەکانی دیکە چوبوونەوە بۆ ماڵەکانیان. دوای داخستنی دەرگەی دەرەوە، لە سەربانەوە مامەی وەستا برایم ڕووناکییەکی دێتە بەرچاو لە ژوورێکی نزیک دەرگەی دەرەوە بۆ ماوەی ترووکەیەکی چاو گەش دەبێتەوە و نامێنێت. بە باوکم و خاڵە عیززەت دەڵێ ئەگەر چاوم ڕەشکە وپێشکەی نەکردبێ زەلامێک لەو ژوورە خۆی حەشار داوە... خولاسە بۆی دەچێتە ژوورەکەوە، کابرایەک دەردەپەڕێ بە خۆی و دیواربڕێکی گەورەی ئاسنەوە. مامە لە دواوە باوەشی پێدا دەگرێ، بۆی زەوت ناکرێ. کابرا کە دیتی دەرگا پێوە دراوە خۆ هەڵدەکوتێ بۆ سەربان، مامەی بە سەر پشت و کۆڵەوە. چەند پێچکەیەک لە قادرمەکان سەر دەکەوێ باوکم هەر دوو قاچی ڕادەکێشێ و دەیهێنێتەوە بۆ حەوشە. مەلا عیززەت دیواربڕەکەی دەکەوێتە بەر دەست تا تینی هەبوو لە پشتی مامەی ڕاکشا بوو. مامە هاوار دەکات و کابرای لە دەستان بەر

دەبێ... سەری خوێنەر نەیەشێنم خەڵق بە دەنگەوە هاتن و کابرایان دەردەست کرد، ئەویش هەر خەریک بوو ڕووی خۆی بشارێتەوە تاکوو سۆفی نەشئەت دەیناسێتەوە دەڵێ: کاکی ڕەش ئەوە تۆی؟ ئیتر عالەم ڕژانە ئەو ناوە، حکوومەتیش خەبەری بۆوە و حەمەدی ڕەشیان بردبوو بۆ سەرا. لە ڕێگەی بەرەو سەرا مەلا فەتاحی مەلا عیززەت لەو دەمەدا کە حەمەدی ڕەش بە دەست خەڵق و پۆلیسەوە لە شەق و زللەدایە نوکتەی بۆ دێت و دەڵێ: فەقێ حەمەد ئەرێ «ضرب زید عمرا» تەرکیبی چییە؟

دەیانگوت حەمەدی ڕەش لەو شەوەدا ڕقی هەڵگرت لەو کەسانەی بە لێدان و شکاندنەوە زۆریان دەسدرێژی لێ کردبوو، لە ساڵانی دواتردا ئەو ڕقەی خۆی هەڵڕشت وەک کە بە کورتی لە بارەیەوە دەدوێم. کە ژوورەکەی دەگەڕێن چەند چشتێکی دزراوی تێدا دەدۆزنەوە کەوا تا ئەو دەمە نەزاندرابوو کێ دزیونی، یەکێک لەو شتانە سەعاتی موفەتیشی معاریف بوو کە لە قوتابخانەی سەرەتایی بە شەو دوای خەوتن لێی دزرابوو... حەمەدی ڕەش تەنها دانی بەوەدا هێنابوو کە بە نیازی دزی بۆ ماڵی ئێمە هاتبوو، شتەکانی دیکەی ئینکار کردبوو کەوا بە دزین دەردەستی کردبن. گوتبووی لە کۆڵانە و نازانم کوێ دۆزیمنەتەوە. باوکم لە حەقی شەخسی خۆی خۆش بوو، لە ئاکامدا بە چەند مانگێک حوکم کۆتایی بە موحاکەمەی هات...

چەند ساڵێک بە سەر ئەم ڕووداوە تێپەڕی، حیکایەتی حەمەدی ڕەش کۆن بوو. من گەیشتبوومە تەمەنی خوێندن. دمەو هاوین باسی دزرانی ماڵی فڵان و فڵان بەشاردا بڵاو بۆوە. چەند شەوێکیان خەڵقەکە بێباک بوون بە خەیاڵی ئەوە کە دزین هەر هەبووە و هەر دەبێ. بەڵام مەسەلەکە لە حیسابی عادەتی تێپەڕی کرد. شەوانە چەند ماڵێک دەدزران بێ ئەوەی کەس هەست بە دز بکات. حکوومەت دەورییەی دەنگ دان، خەڵقیش بە هەستە و کورکەوە خەویان دەکرد. لەگەڵ ئەمەشدا بۆ سبەینە دەزاندرا کە 4-5 ماڵ دزراون. بە درێژایی شەو فێفرەی پاسەوانان لە کۆڵانە دەنگی دەهات خەڵقیش لە سەربانان ئاودەنگی یەکدییان دەکرد کەچی بۆ سبەینە 6-7 ماڵ مەعلووم دەکرا کە دزراون. خەڵقی شار بە تەواوی ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو، منیش لەو تەمەنەدا وام بە بیردا دێت گوێبیستی ئەو هاتوباتە دەبووم، بەڵام ترسم ڕێ نەدەنیشت چونکە ماڵمان لە چنارۆک بوو من هەمیسان بەڕێکەوت ئەو هاوینەش لە کۆیێ لەگەڵ باوکم بەسەرم دەبرد و بە شەو دەوروبەرمان قەڵەباڵەغ

بوو لەوانە نەبووین دز تەماعمان لێ بکات. ئەوسا جەمیلاغای حاجی ئەسعەدغای حەوێزی قایمقام بوو. یەکێک لەوانەی ناحەزی بوون نامەی نووسیبوو بۆ ڕۆژنامەیەکی بەغدا و ئەو بارە نالەبارەی کۆیەی تێدا باس کردبوو، تاوانەکەشی لە مل کەمتەرخەمی و بێباکیی ئیدارەی قەزا پێچابوو. کە ئەم خەبەرە لە ڕۆژنامە بڵاوبۆوە ئیدارەی هەولێر و کۆیێ پێی سەغڵەتتر بوون. پاسەوان و دەورییەی شەویان زیاد کرد، هەستیش بەوە دەکرا کە ئەم دزە، یان ئەم دزانە، بەر لە بەیانی شار جێ دەهێڵن بۆ دەرەوە، ئیتر لە پاش عیشاوە دەستەیەک لە تفەنگچی لە زارکی هەر کۆڵانەیەکی بۆ دەرەوەی شار دەربکات خۆیان دادەنووساند، پاسەوان و دەورییەی عادەتیش لە گەڕان و سووڕاندا دەبوون هەتا سبەینە. شەوێکیان لەگەڵ تەقەی دەسڕێژی تفەنگ خەبەرم بۆوە، هەستیشم کرد خەڵقی سەربانەکان کەوتنە پرس و گفتوگۆ لەگەڵ یەکدیدا، پاسەوانیش وەکوو تەتەر بە کۆڵاناندا دەیانچرپاند و فیفرەیان بە دەنگ دەهێنا. من خەوم لێ کەوتەوە. سبەینە بەر لە ڕۆژهەڵات هەڵستام و گوێم لێ بوو خەڵق بە تێکڕایی لە باس کردنەوەی تەقەکانی شەو بوون. هەر لەو قسانەیاندا بیستم کە حەمەدی ڕەش بەر ئەو تەقەیە کەوتووە و مەیتەکەی لە حەوشی سەرا فڕێ دراوە. یەکسەر چووم بۆ حەوشی سەرا.13

---

13- لە نووسینی هەوەڵ جاری یاداشتەکانم لە زیمنی باسی حەمەدی ڕەش، چاوپۆشیم کرد لە هەواڵێکی تایبەت بە تەجرەبەیەکی یەکجار دەگمەنی خۆم کە پێوەندی حاڵەتی هەستی ونم بە ڕووداوی کوشتنی ئەو کەڵەدزەوە هەیە... دوای نووستنەوەم، خەونێکم دیت خوێنەر دڵنیا بێ لەوەی یەک زەڕڕە بەسەرەوەنانی تێدا نییە. لە خەونمدا وام زانی من خەبەرم بۆوە لەو نوێنەی تێیدا بووم، ڕۆژ تەواوێک بڵند بووە، دوو ئافرەتی گەڕەکی خۆمان لە بەر دەرگەی ماڵمان کە شوێنی لێ نووستنی من بەسەر دەرگا و کۆڵانە و جێگەی ئەو دووژنەیدا دەنۆڕی وتووێژیان دەکرد: یەکیان گوتی تەقەی ئەو شۆکە حەمەدی ڕەشی بەرکەوتییە. ئەمەم لە خەوندا بیست و بەخەبەر هاتم دیتم جارێ زۆر زووترە لەو کاتەی لە خەودا دەمدیت بەڵام خەڵقەکە لەسەربانان پێیانەوە دیاربوو شتێکیانە کە من جارێ نەمدەزانی چییە... هەڵستام و پرسیارم کرد چ بووە ئیتر زانیم حەمەدی ڕەش کوژراوە... کە خەبەرم بۆوە سەیری دەرگام کرد پێوە درابوو نەک داخرابوو

یەکەم جار بوو چاوم بە سەروسیمای مردووی بێهەناسەی حەمدی ڕەش بکەوێ. قەوارەی برینی گوللە لە دەندەڵەی سینگی دیار بوو، چاکەتێکی پۆلیسانی لەبەر بوو، پڕی باغەڵەکەی سەرسینگی تۆچایە بوو، لای دامەنی چەرچەفێکی پێدا درابوو چونکە لەکەمەری بەرەژێرەوەی ڕووت بوو، قەیتانی فیفرەشی بە فیفرەوە لە ملدا بوو تومەز هەموو شەوێک بە جلکی پۆلیسان دەگەڕا و کە پاسەوان و دەورییەی لێ نزیک دەبوونەوە فیفرەی بۆ لێ دەدان وەک کە خۆی پاسەوان بێ، تفەنگیش بە شانەوە دەبوو وەکوو پۆلیس و پاسەوانەکان. ئەو شەوە چەند ماڵێکی بڕیبوو. بەر لە فەجر لەگەڵ هاوڕێکانی بەرەو دەرەوەی شار دەڕوات. بەڕێکەوت ئەو شەوە لەو ڕێگایەوە بەرەو دەرەوە دەڕوات کە دەکەوێتە لای دەباخانان و حەمامی پیسکان بۆ سەر پردی ناو ڕەزەکان شۆڕە دەبێتەوە. تاقمێک لە پاسەوانی تفەنگچی کە لە ناویان پیاوی تایبەتی جەمیلاغا هەبوون، بە تەنیشت حەمامەکەوە خۆیان پەنهان دەکەن و بێ سەدا و دەنگ چاوەنۆڕی ڕێکەوت دەبن. کاتێک حەمەدی ڕەش و

---

کەسیش لەمدیو و ئەودیوی دەرگەکە پەیدا نەبوو... دوودڵی هەوەڵ جارم لە نووسینی ئەم تەجرەبەیە لەوەوە بوو کەوا ڕەنگە ببێتە جێی نەسەلماندن و دەمەتەقەی باوەڕکردوو و باوەڕنەکردوو، سەرەڕای ئەوە کە نەنووسینی دەخلێکی نابێ بەسەر هیچ سەروبەرێکی گەشتی ژیانم. ئەوانەی لێم شارەزان دەزان زۆر جاران خەونی ڕاست دەبینم، لەو ساڵانەی دوای عومری ٥٠-٦٠ ساڵیم زۆر لەو خەونانەی دەمەو عەسر دێتە بەر زەینی نووستووم دێنە جێ، لە هێندێکیشیان ترسم ڕێ دەنیشت وەک خەونێکی ١٩٧٤ دیتم و هەموو ماڵەوەم تێ گەیاند ئاگاداری خۆیان و منداڵەکان بن، قەزا و قەدەرێک بەڕێوەیە، دەرچوو خۆم زەدەبووم و برینکاریم بۆ کرا و شەش شەوان لە خەستەخانە مامەوە، چوار دکتۆر بەسەرمەوە بوون، بەر لەوەی بەنج بکرێم پێم گوتن ڕەنگە ئێوە کە ڕێبازی «علمانية»-تان لەبەرە باوەڕ بە هەندێ ڕووداوی نەفسی و سۆسەی دەروونی نەکەن بەڵام بڕوا بفەرموون من لە پێرێوە ئەم برینداریيەی خۆمم لە خەوندا دیت... هەر چواریان گوتیان فلان ئێمەش باوەڕیمان هەیە وەک تۆ بە ڕاستبوونی گەلێک لە دیاردەی دەروونی. ئەمە دەنووسم وەک ئەوەی قەرز بدەمەوە وای حیساب دەکەم، تۆش خوێنەری بەڕێز خۆت و قەناعەتت و باری نەفسی و دەروونیت!!

جەماعەتەکەی دەگەنە بەر لوولە تفەنگی ئەو ئێشکچییانە دەنگیان دەدەن، حەمەد تفەنگێکیان لە باڵ دەکات ئەوانیش دەسرێژی لێ دەکەن تەقە دەبڕێتەوە بێ ئەوەی بزانن کەس بەرکەوتووە یان نا.

پاش بەیان ئێشکچییەکان دەگەڕێنەوە بۆ ناو شار. ئەوساش مەعلووم ناکرێ چی ڕووی داوە، هەتا ڕێبوارێک لە ڕانیەوە دەگاتە ئەو شوێنەی تەقەی لێ کراوە. دەبینێ کوژراوێک کەوتۆتە ناو جۆگای بەر ڕێگەکەوە ئیتر خەبەر بە حکوومەت ڕادەگەیەنێ و مەیتەکە دەبەنەوە بۆ سەرا و دەزاندرێ حەمەدی ڕەش کوژراوە. هاوڕێیەکی حەمەدی ڕەش، ناویم لە بیر نییە، بریندار دەبێ و بە خوێنەکەیدا دەچنەوە تا مەیتەکەی لە بناری شاخی چنارۆک بە دیوی کۆیەدا دەدۆزنەوە. ئەمیان سەربە جەماعەتی کوێخا خدری هۆرمزیار بوو کە بە خۆی و چەندماڵێکی خزمیەوە لە «کانیکەند» ی سەربە چنارۆکی ئێمەدا دەژیان.

لە تەحقیقاتدا دەرکەوت حەمەدی ڕەش لەگەڵ ئەم تاقمەی ماڵی کانیکەند ڕێک دەکەوێت و مەکۆیان لە گردێکی بناری چیای چنارۆک بەسەر کانیەکەوە دەبێت. ئەو گردە ئێستا پێی دەگوترێ گردی حەمەدی ڕەش، کانیەکەش هەر بەوەوە ناو دەبرێ. ماڵێکی بە دزین دەستیان کەوتبایە لەو ناوەدا دەیانشاردەوە. کە لێیان قەوما و مەکۆیان دۆزرایەوە کەمتاکورتێکی ئەو ماڵە گەیشتەوە دەست خاوەنەکانیان.

کوێخا خدر بە خۆی و حەسەنی کوڕی و کەسانی دیکەشی گیران و حوکم دران، بەڵام نازانم چەندوچۆن. هێندەم لە بیرە هاوینێکی دواتر ماڵمان لە چنارۆک بوو کە کوێخا خدر ماوەی حوکمەکەی بەسەر برد و گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی لە کانیکەند. کە بە لاماندا تێپەڕی دیتم ڕەنگی لە چاو هی پێش حەپسبوونی وەکوو شەعریی زەردی لێ هاتبوو تومەز لەو ماوەیەدا کەمتر لە جاران کەوتبوە بەر هەتاو. زۆریشی نەبرد بەسەردا مرد.

حەسەنی کوێخا خدر دوای باوکی گوێستییەوە بۆ بیتوێن. لەکوژرانی کەمالی جەلال سائیب، قایمقامی ڕانیە، تۆمەتی بۆ چوو و نەختێکیش گیرا بەڵام حوکم نەدرا. ئەویش زوو مرد، کچێکی «ئەستێ» ناوی لە دوا بەجێ ما لای زڕنەنکی لە کانیکەند، مایەوە. هەتا دنیا دنیا بێ دەنگ نییە و نەبووە وەکوو ئەستێ بالۆرەی

گوتبێ. جۆرە زەنگۆڵە و هێنان و بردنێکی دەگمەن و تایبەتی لەو دەنگەدا هەبوو بالۆرەی بەرەو بەرزاییەوە دەبرد. ئەویش بە جحێڵی مرد.

حەمەدی ڕەش جگە لە سوود وەرگرتن لە جلک و فیفرەی پۆلیسان، بۆ شوێنبزری لە نۆینەکانی شاریش بە مرادی دزێوی دەگەیشت. بەشێکی زۆری ئەو نۆینانە زەلامیان تێرا دەڕۆیشت، لەوەوە دەیتوانی لە دەمی سەغڵەتیدا خۆی تێدا بشارێتەوە. وەها دەبوو لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی دراوسێ بە نۆییندا هاتوچۆی دەکرد. لە هەر کامێکیان لێی بە دەنگ هاتبانایە بەو نۆیینەدا دەچوە ماڵەکەی دیکە وەیان بەولاوە تریش، بە ئاسانیش دەیتوانی لەو تەرزە ماڵانەدا بە یەک شەو چەند ماڵێک بدزێ. لەلایەن تۆڵەستاندنەوە لەو کەسانەی کە لە شەوی دەردەستبوونی ئازاریان دابوو وەیا سووکایەتییان پێ کردبوو، وابزانم تۆڵەی خۆی لە هەموان ستاندەوە و یەک یەک ماڵەکانیانی بە تالان برد، لەگەڵ هەندێکیان هەڕەشە و تۆقاندن و سووک کردنیشی بەکار هێنابوو بێ ئەوەی خۆیان لێ ئاشکرا بکات.

هاتوباتی حەمەدی ڕەش دەوری چل شەوێکی ئەفسانەیی خایاند. لەو ماوەیەدا وەکوو مۆتەکە لە پەردەی مێشکی هەموو هۆشدارێک لە شاری کۆیێ بە نامۆیی و نەناسراوی چەسپ بوو. لە پاشماوەی دوای مەرگی دوو شت بەجێ مان، یەکێکیان بێوەژنەکەی بوو کە من لە دەمی کوژرانیدا جارێ نەمدەزانی ژنی هێناوە، دواتر بیستم بێوەژنی حەمەدی ڕەش شووی کردۆتەوە بە «ئاغا کۆر» کە بۆرە پیاوێکی چاو کزی کۆیی بوو. جگە لەوەی کە ئاغا کۆر بەو ژنەوە ناوی دەناسرا مەهارەتێکیشی هەبوو هەر لەوەم دیتوە. لەتکە هەناری بە دەستێکەوە دەگرت و بە ددان و زار خەریکی خواردنی دەبوو بێ ئەوەی یەک دەنکی لێ بڕژێ. من چەندین جار ئەمەم لێ دیتووە و هەرگیز دەنکی بەرنەبۆوە.

پاشماوەی دوەمی ئەو مەکۆ و گرد و کانیە بوو کە لە دەمی دزیندا کردبوونی بە حەشارگە. من و برادەران زۆر جار بۆی دەچووین و لێرە و لەوێ ژێر ئیستیکان و کەوچکە چایە و شتی ئەوتۆییمان لێ دەدیتەوە، لە سەرووی گردەکە دارمازوویێک هەبوو، لە ژێریەوە دانە شاخەکان بۆی ببون بە سەربان و بنمیچ. لە ڕووکاری بەرەو ژێری گردەکەوە بایی ئەوەی تفەنگچی نیشانە بگرێ کونێکی بچووک ساز درابوو بەسەر سێ لای گردەکەدا زاڵ بوو بە جۆرێک کەس نەتوانێ لێی نزیک ببێتەوە.

ئەو قایم کارییەش شتێک بوو لە مەهارەتی دزانەی حەمەدی ڕەش دەوەشایەوە.
یادی حەمەدی ڕەش دەبێتە کۆتایی ئاڵقەی سێیەمی ئەم زنجیرەیە.

دەڵێن: «عند ذكر الصالحين تنزل الرحمة»، خوایە تۆش بە گەورەیی خۆت، ڕووڕەشیی حەمەدی ڕەشمان لێ بکەیت بە شەبەقی کازیوە کە موژدەی ڕۆشنایی و هێمنایی ڕادەگەیەنێ.

**تێبینی**

لە ئاڵقەیەکی پێشووتردا باسی حەسەنی مام فەتاحی پێبازۆک هاتبوو. دواتر زانیم لە 13/1/1985 ز کۆچی دوایی کردووە. حەسەن بە ناوی فەتاحی مامییەوە هەڵدەدراوە، باوکی ناوی عەبدوڵا بووە. دوو کوڕی دیکەی کەوتنە دەشتی دزەیان. حەسەن وەچەی زۆری لە کچ و کوڕ لە پاش بەجێ ماوە. من سەرەخۆشیم لە کوڕە گەورەکەی، عەبدوڵا، کرد. حیسامودینی مەلا ڕەفعەت و مەلا فەتاحی خاڵە عیززەت-یش لە ناڕاحەتییەکەی ساڵی 1990 لە هەولێر کۆچی دواییان کرد و لەوێش ناژران.

## ئاڵقەی چوارەم

قۆناغی نێوان ساواییم و سەرەتای چوونە مەکتەبم، کەوا سێ ساڵێکی خایاندووە، لە هەردوو سەریشیەوە پەراوێزی هاوبەشی لەگەڵ قۆناغی پێشتر و دواتریەوە هەیە زڕە ڕەنگێکی پێوەیە وەکوو تاریک و لێڵی دوای بەیانی کەوا نە شەوی تەواوە و نە ڕۆژی تەواو. هەندێ پارچە لە ڕووپێوی ئەو ماوەیەی تەمەنم لەبەر هەستی دەخزێ و دەیەوێ خشکە بکات بۆ تەمەنێکی دیکەم، بەتایبەتی تەمەنی خوێندنم چونکە بیرەوەریی ئەو دەمانەم وەها ڕوون و ڕێک نییە ڕووداوەکانی جۆشخواردوو بکات و بەیەکەوەیان بهۆنێتەوە، هەموو جارانیش شایەدم بۆ پەیدا نابێ لە خۆم باشتر ئەو سەردەمانەی بە بیر بێنەوە، چونکە زوربەی هەرە زۆریان، ئەگەر نەڵێم سەرلەبەریان، ئێستاکە لەگەڵ فرشتەی دوای بەسەرچوونی ژیانیان خەریکی وتووێژن، مەبەسیشم لەو شایەدانە ئەو کەسانەن کە وەک خۆم لە ڕووداوەکەدا پشکێکی هەبووبێ، دەنا پشت بەو کەسە نابەسترێ لە دوورەوەی ڕووداوەکە ژیابێ.

بە نموونەی ڕوون کردنەوەی مەبەست دەڵێم کە لە بەشی سێیەمی ئەم گەشتەدا باسی سەفەری باوکم بۆ جەلی نووسی، دواتر لەگەڵ خزمانم کەوتمەوە سەر باس کردنی، نە کاک مەجیدی ئامۆزام کە بە 7 ساڵ لە من گەورەترە و نە نەجیبەی خوشکم کە بە دوو ساڵ گەورەترە هیچ کامێکیان ئەو سەفەرەیان بە بیردا نەهاتەوە، تا ئەوەی خەریک بووم لە خۆم بکەومە گومانەوە. باش بوو وەک بڵاچەی ئەستێ و بەرد کە لە شەودا چەخماخەی بگەشێتەوە، نەجیبەی خوشکم بە بیری هاتەوە کە چۆن لە گەڕانەوەی باوکمدا بۆ چنارۆک یەکێک لە ڕیزی ئەو سوارانەی بە دوایەوە بوون، مەلا عیززەتی مامە حەبیب، کە نزیک ماڵان بوونەتەوە، هەر لە سەر پشتی وڵاغەوە منداڵێکی خۆی بەرز کردۆتەوە بۆ کۆشی خۆی و هەتا ماڵەوە کە مەوداکەی لە سەد مەتر تێپەڕ ناکات بەیەکەوە سەرە ژوور هەڵکشاون. تومەز کاک مەجید و نەجیبەی خوشکم لەو سەفەرە بەشدار نەبوون. لەگەڵ ئەم تەگەرەیەشدا دەبێ بڵێم ڕووداوی ژیانی منداڵێکی 4 – 5 ساڵی ئەگەر لە بیرکردنەوەدا نەختێک پێش و پاشیش بکەوێ زەرەر بە هیچ کێشانە و پێوانە و مێژووی کۆمەڵایەتیمان ناگەیەنێ. تەنها زەرەرێک هەبێ لەوەدایە کە خۆم لە وردە حیسابی هەڵسەنگاندنی تین و تاوی ڕووداوی قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانم نەختێک دڵشکستە دەبم چونکە دڵم ئارامتر دەبێ ئەگەر ڕێچکەیان بە ڕێکی بێتە ناو نووسینەوە. بەخێر ئەگەر تۆیش ئەی

خوێنەری نووسەر، کەوتیتە سەر باری یادنووسی وەکوو من ئەم دڵشکاویەت دێتە بەر.

لەساڵی 1924 باوکم ناچار بوو لە ڕووی تەکلیفەوە ئەندامەتی «مەجلیسی تەئسیسی» قبووڵ بکات. هەرچی خاوەن ڕەئی و قسەڕۆیشتوو هەبوو لە براگەورە و پیاوماقووڵ و ڕیشسپیی شار وەهایان پەسەند کرد باوکم نوێنەری شار و وڵاتی کۆیێ بێ. من لەو دەمەدا منداڵێکی پێنج ساڵی بووم، هۆشم بەو جۆرە کێشانە و پێوانەیە نەدەشکا و هیچیشم لێی بە بیر نەیاتەوە ئەوەندە نەبێ کە دەمزانی، بە هەستی ساواییم، هاتوباتێک لە بەیندا هەیە و قەڵەباڵغی لە ماڵماندا پترە لە عادەتی، تەنانەت ئەگەر یەکێکی قسەزان بە بیرم نەهێنێتەوە ناتوانم بڵێم ڕۆژی بەڕێ کردنی باوکم بەرەو هەولێر و لەوێوەش بۆ بەغدا چۆن بووە.

دوای بەسەرچوونی ئەو کژەی کۆبوونەوەکانی مەجلیس هاتوباتی گەڕانەوەی باوکم بۆ کۆیێ جموجووڵی پووره هەنگانەی خستە ناو شارەوە بەتایبەتی ماڵی خۆمان.

خەبەرێک بڵاوکرایەوە، گۆیا باوکیشم لە هەرای بەغدا دژی پەیمانی نێوان عێراق و ئینگلیز کوژراوە. دیارە خەبەری ئەوتۆیی لە دوو ڕووەوە پەرە دەستێنێ. ڕووی یەکەم ئەوەیە بە عادەت هەموو خەبەرێکی گرنگ، خۆش بێ یان ناخۆش بێ، بەسەر زارانەوە خول دەخوات و دەئامسێ، هەتا خەبەریش ڕوو لە ناخۆشی بێ پتری بە سەرەوە دەندرێ، چونکە کۆمەڵی زوڵملێکراو و کەنەفتی وەکوو هی خۆمان تەجرەبەی لەگەڵ ناخۆشیدا بووە، بۆیەکا پتر بە تەمای ناخۆشییە تا خۆشی. ڕووی دوەم ئەوەیە، هەموو ئەو کەسانەی لە ناحەزی و حەسادەتدا ناڕاحەت دەبن بە خۆشی و شۆرەتی شەخسی حەسوودی پێ بڕاو، جۆرە تەکسینییەک لەوەدا شک دەبەن کە باسی ناخۆشی وەپاڵ شەخسەکە بدەن. بەڵام ئێمە- مەبەستم ئەوانەن کە بەرپرس و ئاگاداری کاروباری ماڵەوە بوون- دەمانزانی باوکم سەلامەتە و چ ڕۆژێکیش بەرەو وڵات دەبێتەوە. چ لە ڕێی حکوومەتەوە بێ و چ لە ڕێی مەلا ئەفەندیی هەولێرەوە بێ، ڕۆژانە ئەحواڵی باوکم بەو خەڵقە دەگەیشت، چ جایی ئەوەی ناوناوە ڕاسپاردە و دیاری و کاغەزی دەگەیشت. بەهەمەحاڵ گەڕانەوەی باوکم لەو سەردەمەدا ڕووداوێکی زێدە بەرچاو بوو. هەر کە زاندرا گەیشتە لای مەلا ئەفەندی لە هەولێر، کەسانی نزیکی وەکوو مام و هەندێک لە خزم و دۆستی خۆماڵی بەرەو پیریەوە چوون، دوای ئەوانیش کە زاندرا هاتۆتە هەڵەجە لای شێخ

مارفی شێخ کەریمی بەرزنجی کە خاڵە گەورەی مامم بوو، ئەهلی شار و بەشێکی ئەهلی دەشت لەوانەی حاڵوبارێکیان هەبوو بەرەو هەڵەجە جمین. لە ئەشراف و توجار و گەورەپیاوی شار کەس نەما ڕوەو هەڵەجە مل نەنێ، تەنها جەمیلاغا نەبێ، کە قایمقام بوو، ڕێی نەبوو، گلەییشی لێ نەدەکرا، شار بەجێ بهێڵێ. ئەویش لە ڕۆژی گەڕانەوەی بە خۆی و دەستەی دایەرەی حکوومەتەوە چەند سەعاتێک بە سواری بەرەو پیریەوە ڕۆیی، کە گەیشتنە شاریش تەرتیبات وەها کرابوو کە یەکەم دابەزینی لە دیوەخانەی جەمیلاغا بێ.

من لەو تەمەنەدا هەستی هاتوبات و تێک هاویشتنی خەڵق و قەڵەباڵغی لە ڕادەبەدەر و ئەو جۆرە شتە بەرچاوانەم دەکرد.14 بەر لە گەیشتنی باوکم و ئەو قەڵەباڵغییە نەبیستراو و نەدیتراوە خەڵقی شار بە گەورە و گچکە و ژن و پیاوەوە تێکڕایان لە چاوەنۆڕیی هاتنەوەی باوکم ڕژانە مەزاری لای گردی مام جەردیس و باسکی عارەبیان کە دەکەوێتە سەر ئەو ڕێگایەی لە جنوبی شارەوە بە دەرکی گەروو سۆرکدا دێتە ناوشار. ئەو ڕێگایە بۆ ماڵی جەمیلاغا و گەڕەکی ئێمەش نزیکترە تا ڕێگایەکی دیکە.

من لەگەڵ کافیەی مەلایان و چەند کەسێکی دیکە لە ژن و پیاوی ماڵی خۆمان وەکوو خەلقی دیکە هاتینە سەیری ئەو هەرایە و پتر لەوان بێئۆقرە بۆ دەمی دەرکەوتنی باوکم لە دوای سەفەرێکی شەش مانگی. لە گەڕەکی خۆمان شایی و زەماوەند دەگەڕا و ئەهلی ماڵەوە خەریکی کاردروستایی مێوان و پێداویستی ڕۆژێکی

---

14- حەزم کرد ئەم ڕەفتارە دەلالەتبەخشەی باوکم لێرەدا تێ چێنی چاپی دووەمی «گەشت» بکەم: باوکم بەو قەڵەباڵغییەی کە لە گەڵیدا بوون لە هەڵەجەی شێخ مارفی شێخ عەبدولکەریمی بەرزەنجی بەڕێ دەکەون، شەو لە دێی شاخەسپیکە بە مێوانەتی لە دیوەخان و ماڵی حسێناغای غەفووری مێوان دەبن. باوکم دەیزانی لەو شەوەدا مانگ دەگیرێ… لێکدانەوەی کردبوو کە ئەو هەموو تفەنگدارانە لە دەمی مانگگیراندا تەقەی تەقلیدی بکەن هەتا مانگ لە دەست شەیتان دەردەهێنن لەوانەیە زەرەری ماڵ و گیانیشی لێ بکەوێتەوە، ئیتر ئەمر دەکات سەر لە ئێوارە بانگ ڕادەهێڵن ئیمشەو مانگ دەگیرێ و لە مەلای گەورەوە ئەمرە کەس تەقە نەکات. بەم جۆرە مانگگیران و شەوەکە بە هێمنی بەسەرچوو.

وەها دەگمەن بوون. تەمەنم ئەوسا 5-6 ساڵی بوو، بە بەر هۆش و گۆشی ئەو دەمەوەم نەبوو لە هەموو سەروبەرێکی هەرای وەها گەورە بگەم، ڕەنگە لە هیچ ڕێکەوتێکدا وەها نەلوابێ کە ئەو عالەمەی شار بەشداری هاتوباتی ڕووداوێک ببن کە سەرەتای سواران لە کلکەی گردی کەکۆن دەرکەوتن، جموجووڵێکی تازە کەوتە ناو خەڵقەکەوە. بایی لەشکرێکی مامناوەنجی سوار بە پیر باوکمەوە چووبوون. من چاوم بڕیبووە دەمی دەرکەوتنی «ئەسپەشێ» کە پێشتر گوتبووم بە دیاری لە خاڵوانمەوە بۆم هاتبوو، چونکە ئەو ئەسپە بۆ سواریی باوکم ساز درابوو. کە نزیک بوونەوە لێمان، من بەردەوام تەماشای باوکمم دەکرد، ئەو هەموو عالەمەی کە لە دواوەی و لە دەوروپشتییەوە لە پێشییەوە بەرەو ناو شار دەجمین، لەو دەمەدا، سەرنجی ڕانەدەکێشام، کافیەی مەلایان و ئەوانەی لەگەڵی بوون دەشگریان و شادیشیان دەکرد. لە نزیکمانەوە و لە پشتمانەوە ئافرەتێکی بێئەژمار بە ڕاوەستاوی و بە دانیشتنەوە سەرگەرمی تەماشاکردن و بزرِکاندن و پێکەنین و هەلهەلە و ئەو تەرزە شتانە بوون. بەڵام زۆر بە سەیری چەند ئافرەتێکی کە لێمانەوە نزیک ڕاوەستابوون و ئێمەشیان نەدەناسی کە دیتیان بە سەر پشتی ئەو ئەسپەوە پیاوێک لە هەئیەتی «مەلای گەورە» وا دێت و پێشیەوە دیارە کە ئەو هەرایە بۆ گەڕانەوەی ئەو لە کاردایە گوتیان: تو خوا تەماشای، ئەو قەپێلکەیان هێنایە بە شکڵی مەلای گەورە هەتا وا تێبگەین نەکوژرایە. تومەز خەبەری نەمانی باوکم چووبووە دڵی گەلێک کەسەوە بایی ئەوەی ئەو هەموو حەشاماتەی بە پیریەوە چونە هەولێر و بۆ گەڕانەوەی چەندین سەعاتە زوربەی خەڵقی شار بە ئینتزارەوەن نەتوانێ بە درۆی بخاتەوە. لەو دەمەدا من ئاگام لەو تەرزە قسانە نەبوو، ئەوانەی لەگەڵمدا بوون بۆ ئەهلی ماڵەوەیان دەگێڕایەوە...

لە چەندوچۆنی ژیان و بەسەر بردنی ئەو ڕۆژانەم تەنها هاتنەوەکەی باوکمم لە بیر ماوە، لە خۆمەوە ناتوانم بڵێم فڵانە ڕووداو یاخود فڵانە باری ڕەفتارم هی ئەو ڕۆژگارەیە. دوور نییە ڕووداوی شاردنەوەی حەفت ڕوپیەی جەژنانەم لە مەخزەنی کێلوونی ژوورێکی ماڵەوەمان، کە لە ئەڵقەی سێیەمی ئەم گەشتە باس کراوە هی ئەو سەردەمە بێت. بەڵام هاتوباتی دروست کردنی ئەو بەشەی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد کە ناوی نرا «مدرسە» هی لە بیر کردن نییە، مەسەلەکەش حیکایەتۆکێکی بە دواوەیە.

جارێک لەو جارانەی کە باوکم لە دەمی نیابەتیدا دیدەنی مەلیک فەیسەلی یەکەم دەکات وتووێژیان دەکێشێتەوە بۆ باسی ئایین و زانستەکانی ئیسلامی و زمانی عەرەبی و ئەو جۆرە بابەتانە، مەلیک فەیسەڵ لە قسەکانیدا دەردەبڕێ کە حەز دەکا لە ئایین و لە زماندا پتر قووڵ بێتەوە تا ئەوەی بەم ڕستەیەی عەرەبی مەبەستی خۆی دەردەبڕێ، «ارید أن استكمل معلوماتي في الدين وفي العربية عند سماحتك».
ئیتر هەر لەو دیتنەدا بڕیار دەدرێ کە لە هاوینی داهاتوودا سێ مانگ بێتە کۆیێ بۆ ئەم مەبەستە، دیارە دەبێ جێگە و ڕێگەیەک ڕێک بخرێ لە دەرس و تەحسیلی مەلیک بوەشێتەوە. مەلیک فەیسەڵ چەند هەزار ڕووپیەیەکی نارد (دوو ڕوپیە دەکاتە 150 فلس) ئەو شوێنەی پێ دروست بکرێ. هاتوباتی دروست کردنی مەدرەسە لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد چونکە بۆ موناسەبەیەکی وەها گرنگ بوو گەلێک لە بارستی خۆی پتر دەنگی دەدایەوە و خەڵقی تێ دەورووکان.
خۆشبەختانە سەرچاوەیەکی نووسراوی گومان لێ نەکراو هەیە یاریدەی ڕوون کردنەوەی ئەم لایەنە دەدات. ساڵی 1953 کە نائیب بووم، نامەیەکم وەرگرت لە مەلا ئەحمەدی ئیمامی مزگەوتی «زیوە مزورکا» لە ئامێدی گەلێک بیرەوەریی ئەو ڕۆژگارانەی تێدا بوو کە لای باوکمی خوێندووە و ئیجازەی لێ وەرگرتووە. لێرەدا چەند دێڕێکی ئەو نامەیە دەخوازمەوە کە پێوەندییان بە دروست کردنی ئەو مەدرەسەیە و هێندێ سەروبەری ناواخنی نووسینەکەمەوە هەیە. لە بەرەو کۆتایی ڕووپەڕەی دووەمی کاغەزەکەی ئەمانە دەنووسێ، بە عەرەبی نەک کوردی کە دواتر عوزر دەهێنێتەوە بۆ لەبیر کردنی نووسینی کوردی بە لە هجەی سۆرانی و گوڕانی ڕێنووسی تازەی کوردی کە ئەو زەفەری پێ نابات. مامۆستا دەفەرموێ:

ايها الاستاذ كاكه مسعود أنا سكنت في حجرة مسجد جدكم الحاج محمد اسعد أفندي لمدة اربع سنين تقريبا وفيها أخذت العلم من العالم الكبير والعلامة النحرير والدكم المرحوم طيب الله ثراه وجعل الجنة مثواه ومأواه وحين الختام اخذت الاجازة العلمية وذلك بتأريخ *1346* هـ (*1927*) حينما كان المرحوم قاضيا وجميل أغا قائمقاما وقد أخذت الاجازة في المدرسة الجديدة التي شيدها له الملك فيصل الأول بحفلة عديمة النظير دامت ثلاثة ايام بلياليها حضرها رؤساء الدوائر وحضرها جميع صفوف المدرسة الرسمية بزيهم الرسمي وبأناشيدهم وكنت انت ايها الاستاذ السيد في دور الطفولية ولا أدري هل كنت في الصف الاول أو الثاني والشقيقة السيدة نجيبة خاتون متقدمة عليك ومن العجب أن عبد المقتدر كان يحبني حبا جما وما سبني قط خلال تللك المدة الطويلة وكان يسب كل من شاء حقيرا أو عظيما وفي تلك المدة تصادف انه جاء عندي وخدمني الشخص الذي سود الله وجهة وجعل جسمه مطابقا لاسمه المدعو حمه

رش فاراد أن يسرق من بيتكم شيئا مكافأة لكم على احسانكم ففضه الله على رؤوس الاشهاد فالقي القبض عليه الاستاذ الوالد في نصف الليل تقريبا...

لێرەدا مامۆستا یادی عەبدولموقتەدیر و بە دوا ئەودا حەمەدی ڕەش دەکاتەوە کە لە ئاڵقەی پێشووتر ناوی خۆی و باسی دزینەکانی هاتنەوە ناو ئەم نووسینەوە، نەختێکیش ئاهەنگی دروست کردنی ئەو مەدرەسەیە ڕوون دەکاتەوە کە ئەگەر ویستبای دەیتوانی پتری لەسەر بڕوات، چونکە تەنها ئاهەنگی دەست بە دروست کردنی سێ ڕۆژی خایاندووە، پێشتریش هەرگیز ڕووی نەداوە لە کۆیێ خانوویەک بە ناوی سەرۆکی دەوڵەتەوە بۆ تاکێکی ئەو شارە بە ئاهەنگی ڕەسمییەوە بنیات بنرێ. من لەبەر ساواییم کە جارێ نە چووبوومە مەکتەب، هێندەی مامۆستای نامەنووس وردییاتی ئەو هاتوباتەم بە بیردا نایەت بەڵام لە تێکڕای قەڵەباڵغی و تێک هاویشتنی خەڵق و سەرەتاتکە کردنیان لە عەمەلە و وەستای بەننا و ئەو جۆرە دیمەنانەوە دیمەنێکی گشتی دەوامەداری بیندرێژی پڕ جموجووڵ و چالاکی یاد دەکەمەوە کە لە کۆتاییدا سەری گەیاند بە ڕایەڵ کردنی ڕستەیەکی درێژی جل لەسەر هەڵخستن لەلایەن وەستای بەنناوە کە خوالێخۆشبووی وەستا شاکر بوو، ئیتر هەرچی خاوەن ناو و جێگە و ڕێگە و هێز و پێزێکی شار هەبوو تۆپە قوماشی دەهێنا و وەکوو جلکی شووراو بەو ڕستەیەیدا دەکرد و دەبوو بە خەڵاتی وەستا. بریق و باقی ئەو تۆپە قوماشانەی هەمەجۆری هەمەڕەنگ تا ئێستاکەش لە مێشکمدا دەتریسکێتەوە وابزانم بە ناوی منیشەوە تۆپە قوماشێکیان کرد بە شاباشی وەستا.

مامۆستا لە نامەکەیدا دەڵێ لە 1927 ئیجازەی وەرگرت و ئاهەنگەکەشی لەو مەدرەسەیە بووە. ئەوسا من لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی دەرچووبووم بۆ پۆلی دوەم. هەرچی دروست کردنی مەدرەسەکە بوو لە 1925 دەستی پێ کرد و تەواویش بوو کە جارێ من نەچووبوومە مەکتەب. بەهەمەحاڵ مەلیک فەیسەڵ نەیتوانی بێت بۆ کۆیێ. وابزانم گیروگرفتی ئیستیفتای ولایەتی مووسڵ دەرفەتی نەدا، نامەیەکی عوزرخوازی و کۆمەڵێک کتێبی بە دیاری هەنارد بۆ باوکم بەڵام ئەوەندەی من هەستم بە شتان کردبێ بۆم ڕوون دەکاتەوە کە باوکم ئەو وەعدە بە خیلافەی مەلیکی لە بیر نەکرد، دواتریش کەڵەکە کردنی تەجرەبەی تاڵ لە دەمی مەلیکایەتیی ئەودا وەعدە بە خیلافەکەی زیندووتر دەکردەوە تاکوو لە دەرفەتێکدا

بایی ئەوەی مومکین بێ، مرۆڤێکی ڕێز لە خۆناو تۆڵە لە مەلیکێک بستێنێتەوە، باوکم بە زیادەوە، تۆڵەی لە مەلیک فەیسەڵ ستاندەوە. بە خێر لە شوێنی خۆیدا ئەم لایەنە ڕوون دەکردێتەوە و هەڵوێستێکی پڕ جورئەتی باوکمی تێدا مەفهووم دەبێ.

لە نامەی مامۆستادا باسی جنێودانی عبدولموقتەدیری تێدایە: قسەی مامۆستا ڕاستە بەڵام دەبێ ڕاستییەکی دیکەی وەپاڵ بدرێ تاکوو ئەو «جنێوفرۆشی»یە جێگەی ڕەوای خۆی پێ بدرێ. عەبدولموقتەدیر بە دەردی شەپڕەی ساوایان ئەو هۆشەی نەمابوو بە نیازی سووک کردن جنێو بدات. بۆ بێتالعی خۆی و ئەو کەسەی ڕێکەوت دەیکرد بە نیشانەی تیری قسەکانی، هەندێ شوێنەواری کۆنە زەکاوەتیی بەر لە دەردەکەی پێوە مابوو، تا بڵێی ڕقی لە درۆ بوو، تا بڵێی کاری بێجێی بە لاوە ناشیرن بوو. درۆی لە هەر کەسێک بدیتایە یەکەندەردوو بەو زمانە شکستەی شەپڕە لێ دراوی خۆیەوە لە دەستی دەنا، دەیگوت «بە سەری جەنابی بابم وادەکەی لەبەر درۆیەکی» واتە «بەسەری جەنابی بابم درۆ دەکەیت» ئیتر کابرای وەها سەرشکێن دەکرد، ئەگەر شەرمی بە خۆی بوایە جارێکی دیکە لای ئەو درۆی نەدەکردەوە.

زۆر کەسی حەز لە گەپ کردوو بە ئانقەست زرە درۆی ناقۆلایان لە لا دەکرد، هەر بۆ ئەوەی جنێوی شەق و پەقی حاڵەتی ڕق هەڵستانی لێ ببیەن، ماڵم هەقە ئەویش درێغی لێ نەدەکردن، ئیتر بەو زمانە شێواوەی شەپڕەداریەوە تەعبیری وەها سەیری دەردەپەڕاند کە لایەنی جنێوەکەی لە بیران دەبردەوە و کابرای جنێوپێدراو لە هەموو کەس پتر بە خۆی و قسەکان پێ دەکەنی. ڕاستییەکەی گەلێک جاران لایەنی غەدرلێکراو لەو تەرزە وەزعەدا عەبدلموقتەدیر خۆی دەبوو چونکە وەها دەبوو بە کاری نالەبار و بە درۆ و فیشاڵ دەهاتە فێ گرتن. گوێی لێ بایە یەکێک بە زار جرت دەکێشێ هەر بە جارێ شێت دەبوو.

یەکێک لەو تەلانەی کە هەموو جارێ پێوەی دەبوو ئەوە بوو کەوا بە عادەتی خۆی ئەگەر وشەیەکی تاکت بۆ درکاندبایە دەهات لە ئەلفەوە هەتا یێ، هاوکێشی ئەو وشەیەی دەگوتەوە، بە نموونە، ئەگەر بتگوتبایە، هۆ کاک موقتەدیر ئەرم، ئیتر وشەی دەژماردن، ئەرم، بەرم، تەرم... دەگەیشتە دەنگی «ک» وشەکە دەبووە «کەرم» ئنجا دەیزانی تەپکەی بۆ نراوەتەوە و شریتەی وشەکانی دەبرِیەوە و ڕووی لە کابرا دەکرد، هەی سەگی منافق... بەڵام بە خۆیشی پێدەکەنی. بەدوا ئەوەدا

ئەگەر یەکێکی دیکە گوتبای «ئەگم» کاکە موقتەدیر پێدا دەچوو تا «سەگم»...
خولاسە هەرگیز تەنبێ خواردوو نەدەبوو چونکە هەم هۆشکول بوو هەم ئەسیری عادەتی خۆی بوو. عادەتێکی هەبوو هەرگیز تەرکی نەدەکرد، ئەگەر ناوی یەکێکیان بردبایە لە بەیت و مەتەڵ و بەستەدا هەبوایە دەبوو ئەو شتە فۆلکلۆرییە بخوێنێتەوە و ناوەکەی تێدا دووپات بکاتەوە. لە «پێبازۆک» فەلاحێکی بەرچاو کە برای مام فەتاحی وەکیلی باوکم بوو ناوی «سلێمان» بوو. چەند جارێ هاتبایە لامان لە کۆیە و کاک موقتەدیر بیدیتایە بەر لەوەی ماندوونەبوونی لێ بکا گوتەیەکی فۆلکۆری دەخوێندەوە کە دەڵێ: ئەلوور تەکامێ، زەرتک شوورتک شەمامێ، ئاڵنجی باڵنجی سلێمان قنجی... پەنجەی بۆ مام سلێمان ڕادەکێشا و لە تریقەی پێکەنینی دەدا ئنجا ماندوونەبوونی لێ دەکرد یان لە بیری دەچۆوە. جارێکیان چووە لای موستەعیدەکانی باوکم لە مزگەوتی گەورە، مێوانێکیان هەبوو ناوی مەلا خدر ناوێکی زۆر موحتەرەم و ئیجازە وەرگرتوو بوو. بە عادەتی هەمیشەیی بەخێرهاتنێکی گەرموگوڕ و بەسەروسەدایان لە کاک موقتەدیر کرد و مەلا خدریان پێ ناساند کە مەلایەکی وەها و وەهایە. ئەویش هەر کە ناوی «خدر»ی بیست دەماری فۆلکۆر دۆستییەکەی بەخەبەر هات و دەستە ساغەکەی چەپەی بڵند کرد بەرەو مەلا خدر و گوتی: چەندم گوت خدری بەسێ، بە شەش خانان دامەڕسێ، ئیکەرێت بەڕێی...!!

وەها دەبوو لە خۆوە قسەیەکی ڕێکی پێکەوە دەنا و دەیکرد بە بابەتێکی فۆلکلۆری وەک ئەوەی کە جارێکیان ئافرەتێکی دیت و بیستی ناوی «سارێ» یە، ئیتر دەستبەجێ و بێوەستان، بە لەهجەی ئاخاوتنی کۆیێ گوتی: سارێ، وەرە مارێ، پێکەوە بنووین هەتا بەهارێ...

کاک موقتەدیر لە دوو جۆرە گرەو هەرگیز نەیدەدۆڕاند: یەکێکیان چەڵەمەشکێنە ئەوی دیکەشیان شەڕە شیعرێ، لە بابەتی چەڵەمەشکێنە بۆ خۆم دیتم جارێکیان دوای نانی نیوەڕۆ کاکە موقتەدیر بەسەر دەستشۆرەوە دەستی دەشوشت ئاوی لە دەمدا بوو، کابرای مەسینە بە دەست کە چەڵەمەی لەگەڵ کاک موقتەدیر شکاندبوو، دەرفەتی دیت و سابوونی خستە دەستە ساغەکەی کاک موقتەدتیرەوە، بەڵام بەر لەوەی بتوانێ بڵێ بردمانەوە، یان دۆڕاندت کاک موقتەدیر بە زاری پڕ ئاوەوە گوتی لە بیرمە هەرچەند قسەکەشی لەگەڵ ئاوەکە بە بڵمەبڵم لە زارەوە

دەرهات. بۆ شەرە شیعری چەند قەسیدەی لەبەربوون بە پیتی «ث، ض، ظ» کۆتاییان دەهات یان دەستیان پێ دەکرد.

دەردی شەپرە دووچاری مرۆیەکی زیرەکی هەستیار بووبوو. لەوەوە ئاکامێکی لەنگەر نەبەستوو پەیدا بووبوو، بەشێکی شەپرە و بەشێکیشی لێهاتوویی بەر لە شەپرە بوو.

جارێکیان چوو بۆ لای فەقێکانی مزگەوتی حاجی ئەسعەد، دیتی مام حاجی لە ئەهلی گەرەک کەوا شەوانە لە مەجلیسی باوکم پەیدا بوو خەریکە لەو حەوزەی دەزنوێژی لێ دەشوورێ تارەت دەکات، یەکسەر چووە لای قایمقام، جەمیلاغا و ناچاری کرد ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ مام حاجییان خستە بەندیخانەوە، دواتریش بە خاترخوایی لێی خۆش بوو. کاک موقتەدیر لەگەڵ ئەو دەردە کوشندەیە چهرەیەکی بەرچاوی کۆیە بوو، تێکرا، لایەنی چاک و خراپی بخرابایە سەریەکدی، شەپرەدارێکی ئێسکسووکی قسەخۆشی خۆشەویست بوو.

لەگەڵ دەستەودایەرەی مەکتەب پێوەندییەکی بەتین و بەردەوامی هەبوو، خۆیشی بەر لەوەی دەردەکەی دووچار ببێ قوتابی و هاوڕێی دەرس و دەوری مەلا فەتاحی مەلا عیززەت و مەلا نافیعی مەلا سبووح و کاک مەجیدی ئامۆزام بوو ناویشی بە زیرەکی دەرکردبوو. لە بیرمە کە قوتابی بووم، ئەو ڕۆژەی کاک موقتەدیر هاتبایە مەکتەب مدیر و مامۆستاکان و قوتابییەکانی پۆلی پێنج و شەش لەگەڵیدا خەریک دەبوون و دڵیان ڕادەگرت و ئەنواعی گەپ و سوحبەتی خۆشکەڵەیان بۆ دەهێنایە کایەوە.

بەهاران قوتابییەکان کە حەزیان لە سەیران دەبوو مدیریشیان پێ ئیقناع نەدەکرا خێرا هانایان بۆ کاک موقتەدیر دەبرد و لای باوکم تکای بۆ دەکردن ئەویش پسوولەی بۆ مدیر دەنووسی، مدیریش، خوالێخۆشبووی مەلا عەبدولڕەحمان شەرەف، قسەی باوکمی نەدەشکاند و دەیکردە سەیران... ئیتر هوتافی «بژی کاک موقتەدیر» لە قوتابییانەوە بەرز دەبۆوە. کاک موقتەدیر بە گەلێک باردا بۆ کەسانی دەوروبەری خۆی مایەی خۆشوەختی و نوکتەبازی و فەرامۆشی بوو. لە هەر جێگایەکی دیار کەوتبایە یەکەم ئاکامی دەرکەوتنی لای خەڵقەکە پێوە گەشانەوەی دەبوو. تاڵایی دەردەکەی، بە زۆری، بۆ خزمی نزیکی خۆی بوو. لەگەڵ خزمانیش ئاغڵەب هەر بە پێکەنین و گەپ و گەشایی دیبردە سەر.

دوو سێ ساڵی کۆتایی عومری حەزی دەکرد ژنی بۆ بهێنن و بە هۆشە کولەکەی خۆی پشتگیریی لەو حەزەی دەکرد. بە نموونە، دەیگوت بەسەری جەنابی بابم فڵانە کەس وا دەکا لەبەر دوو ژنان ئەمن سمێڵیشم گەورەترە لە سمێڵی ئەو وا ناکەم لەبەر ژنەکی.

گەلێک جار خەڵقەکە ئەم لایەنانەی دەکردە هۆی تەڕدەماغی و قۆشمەیی و نوکتەی جۆراوجۆریان لێ پەیدا دەکرد، یەکێک لە خەڵقی گەڕەک ژنێکی پیر و یەکێکی جەحێڵی هەبوو خۆیشی حەزی لە نوکتە بوو، دەیگوت کاک موقتەدیر ئەگەر حەزت لە ژنە «داکی گەورەت - مەبەستی ژنە پیرەکەی بوو» لێ پیرۆز بێ، ئەویش بە دڵسافییەوە دەیگوت: ناپیاو، توسەری بابم وەها بکە لەبەر ژنە جوانەکەت لۆ خاتری من.

کاک موقتەدیر هەر لە نیازی ژنهێنانەوە دەیگوت: لە سەربانان قیرەقیرِ شایی کاک موقتەدیر. گورج خاڵی، مەلا عیززەت لێی دەقۆستەوە: لە کۆڵانان تەپوتۆز شایی خاڵی ڕدینبۆز. ڕۆژێکیان بە هەڵەداوان هات بۆ لای باوکم و بە گەرمی داوای لێ کرد ژنێکی بۆ بهێنێ. باوکم پێی گوت: ڕۆڵە من ژنم هێنا تۆی لێ بوویت، تۆ ژن بهێنی دەبێ چی لێ پەیدا بێ...

لە چارەسەر کردنی دەردەکەی ئەوەی مومکین بوو هەوڵی بۆ درا. جارێکیان هەناردرا بۆ خەستەخانەی کەرکووک کە ئەوسا جارێ ئۆتۆمۆبێل پەیدا نەبووبوو، دکتۆری ئینگلیز لەو خەستەخانەیە سەرپەرشتییان دەکرد... جارێکی دواتر هەناردرا بەغدا، خاڵی مەلا عیززەت و چەند کەسێکی دیکەی لەگەڵدا بوون. لە فەحسی ڕۆنتگین دەرکەوت ئێسکێکی جامی سەری سەرەژێر ڕۆ چوو بووە ناو مێشکی. دکتۆرەکان بە مەلا عیززەتیان گوتبوو دەتوانین عەمەلیەتی بۆ بکەین بەڵام لایەنی تێدا چوونی یەکجار بەهێزترە لە ڕزگاربوونی، مەلا عیززەتیش دڵی نەهاتبوو بیداتە دەم چەقۆکارییەکی کە سەدی نەوەدی بکێشێتەوە بۆ مردن. دواتر کە هاتنەوە بۆ کۆیێ، باوکم بە مەلا عزەتی گوت خۆزی عەمەلیەتەکەت بۆ دەکرد. گوتی قوربان وەڵاهی وەک ئەوەم دەهاتە پێش چاو کە بەرخ تەسلیمی قەساب بکەم، دڵم بڕوایی نەدا.

ڕووداوێک لە کاک موقتەدیر دەگێڕمەوە بەر لە مردنی بە چەند ڕۆژێک خۆم چاوم لێی بوو کە ڕوویدەدا مەبەسیشم نییە خوێنەر بهێنمە سەر باوەڕ کردن بە تەعلیلی غەیبی، حەز دەکا دیاردەکە بداتەوە بە «نفس»، «عقلي باطن»... هتد یا هەر شتێکی بە باوەڕی خۆی جێی متمانە بێ، بەڵام لێم بسەلمێنێ کە چی دەیگێڕمەوە یەک زەڕە گومان لە ڕاستبوونی ناکرێ.

چەند ڕۆژێک بوو کاک موقتەدیر هەر باسی بەهەشت و مردنی دەکرد. هەتاکوو جارێکیان ڕووی لە بابم ناو گوتی بابە بەسەری جەنابی بابم بەهەشت زۆر خۆشە هەر دەبێ وا بکەین لەبەر بەهەشتەکی (واتە: دەبێ بچینە بەهشت) باوکیشم مەیلەو بە زەردەخەنەوە پێی گوتەوە ڕۆڵەکەم خوا حەز بکا دەچینە بەهەشت ئەمما جارێ زۆر زووە سەبری لێ بگرە. کاک موقتەدیر هەر لەسەر قسەی خۆی سوور بوو، تەنانەت پێوەی دیار بوو وەزعی ئاسایی و عادەتیی خۆی پێوە نەماوە و فکری- ئەگەر بتوانین بڵێین فکری هەبووە- لە تەشویشدایە. ڕۆژێکیان چێشتەنگاو بوو من لەگەڵ کاک موقتەدیر لە کەلەگی کۆشکی ماڵەوەمان کە بەسەر حەوشەی حەرەمیدا دەنواڕی ڕاوەستابووم دیتم لە ناکاو کاک موقتەدیر ڕووەو قیبلە چاوی ئەبڵەق بوون و ڕووی بزڕکانی گەشایی و هاواری کرد، وڵاهی دیتم، بەسەری بابم دیتم، وەی چەند خۆشە بەهەشت... هەر ئەمەی گوت و گوڕی بەست بەرەو حەوشە لە پێپلیکانەوە سەرەژێر ڕۆیی بە خێراییەکی ئەوتۆ هەرگیزاو هەرگیز دەیەکی ئەوەش لەو ڕەچاو نەدەکرا لە حەوشەش بە گورگەلۆقە (کە لە هەموو ساڵانی نەخۆشییەکەیدا سێبەرێکی ئەوەشی لێ نەدیترابوو) بەرەو هەیوانی ئەوبەری حەوشەکەوە ڕۆیی کە باوکم و دایکم لێی دانیشتبوون بە درێژایی کاتیش بە دەنگی بەرزەوە دەیگوت و دەیگوتەوە، بەهەشت خۆشە، وەی چەند خۆشە، بەسەری جەنابی بابم دیتم... دەچمە بەهەشت... تاگەیشتە لای باوکم، ئیتر ئەوەی دەگوت و دەسووڕا و دەگەڕا وەک سەرخۆش باوکیشم خەریک بوو هێوری بکاتەوە. ڕاستییەکەی جۆرە حەپەسانێکی بەسەر هەموو ماڵەکەدا هێنا. خۆم لەو تەمەنەی یازدە ساڵیمدا نەمدەزانی فکرم بۆ کوێ ببەم مەگەر ئەوەی کە بڵێم شێتییەکە و هێزێکی وەک جەزبە گرتن ورووژاندی، یان بەڕاستی شتێکی هاتە بەر چاو لەو بەهەشتە بکات کە خۆی باوەڕی پێی هەبوو.

بەهەمەحاڵ دیمەنەکە یەکجار بەولای عادەتییەوە بوو، بەخەیاڵی کەسێکشدا نەدەهات موقتەدیر ئەو هێزەی ماوە یان قاچە سەکەتەکەی دەتوانێ هەنگاوی ئەوتۆیی پێ هەڵبهێندرێ. ئەو ڕۆژە هەر خەریکی «بەهەشت و بەهەشت خۆشە و دەچمە بە هەشت» بوو. وابزانم هەر ئێوارەی هەمان ڕۆژ یان ڕۆژی سبەینێ فێیەکی وەهای گرت خستییە ناو جێگەوە و لێی بەهۆش نەهاتەوە لە چەند ڕۆژێکدا کە کەوتە ناو جێگە وردە وردە ژمارەی فێیەکانی زیادی کرد تاکوو وەهای لێ هات لە دەقیقەیەک جارێکی دەگرتەوە بەڵام بێ هەڵپە و زیرە و لنگەفرتکێ. هەر ئەوەندە بوو دەلەرزی و ڕووی دەبزرکا.

باوکم بە خەتی خۆی لەمەرگی موقتەدیردا ئەمەی بە عەرەبی نووسیوە:

«انا لله وانا اليه راجعون ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم توفي ابني وقرة عيني المعصوم المبتلي بالفلج والصرع الشديد وقد ذقت مرارة الموت كل يوم مرات عديدة حين ارى نوبات صرعه قد عجز الاطباء عن مداواته منذ سنين وهو عبدالمقتدر ولم ير من عمره لذة وقد جاوز العشرين في ليلة الخميس بعد الساعة الثامنة منها غرة شهر شعبان المعظم سنة 1348هـ.ق 1307هـ.ش 1930م».

ئەم «الساعة الثامنة» یە هی پاش ڕۆژاوایە نەک پاش نیوەڕۆ.

مامۆستای نامەنووس کە یادی کاک موقتەدیری تێدا کردبوو دەڵێ لە ساڵی 1927ز ئیجازەی لە باوکم وەرگرتووە و ئاهەنگەکەشی لە «مدرسە» ی ناوبراودا بووە، ڕاستییەکەی من ئەو ئاهەنگەم بە بیردا نایەتەوە، یاخود دەبێ بڵێم لەو ئاهەنگانەی کە لە مەدرەسەیە بەرپا بوون نازانم کامیان هی مامۆستا بووە، بەڵام ئاهەنگێکی زووترم دێتەوە یاد کە جارێ نەچووبوومەوە مەکتەب قەڵەباڵغییەکی زۆری لەو مەدرەسەیەدا کۆدەکردەوە، باوکم کچی خۆی «عفت» کە خوشکە گەورەی عبدولموقتەدیر بوو دا بە شێخ حەسەنی حاجی سەیدگوڵ. شێخ حەسەن ئامۆزای دایکم بوو، منیش هەر پێم دەگوت خاڵە حەسەن، هەمووشمان بەو خوشکە گەورەیەمان دەگوت «یاعیففەت».

قەڵەباڵغیەکی زۆر لە سوارانی پژدەر هاتن بۆ گوێستنەوەی بووک، لەگەڵیاندا شێخ حسێن برای شێخ حەسەن و هەندێک لە خاڵەکانیان و پیاوماقووڵانی دیکە پژدەر.

باوکم لەو مەدرەسەیە بەخێری هێنان و هەر لەوێش نان دەخورا و کاردروستایی نوستن و ڕاحەتی مێوانان دەکرا. ئێستری باڵەبانی بە تاقەتی پانوپۆڕیان لەگەڵدا بوو بەتایبەتی ئەو ئێسرەی کەژاوەی بووکی بەسەرەوە بوو بەستەزمانێکی هەڵکەوتوو بوو. هەر لەبیرمە بووک و بەربووک خرانە کەژاوەوە، بەربووک (نەنە عەیشێ) ئافرەتێکی سەرسپیی ڕەقەڵەی ئێسکساغ بوو، بە زۆری هەر ئەو مامانی دەکرد بۆ ئەو ماڵانەی پێیان دەگوترا ماڵەگەورە. چەند جاران وەها بووە لە هاویندا کە ماڵمان لە چنارۆک بووە و کاریان بە مامان هەبووە ئەم نەنە عەیشێیە بە خۆی و تاقمی مامانییەوە هاتۆتە چنارۆک و نزیکی مانگێکی لەگەڵمانی ڕابواردووە. لە کەسبی خۆیدا لێزان و دڵسۆز بوو. نزیکی دە ساڵی دیکەش دوای ئەو ساڵە ژیا و زۆر بە پیری مرد. یاعیففەت چەند کەسێکی خۆشمانی لەگەڵدا چوو بۆ سندۆڵان، لە مانە خاڵی خۆی مەلا عیززەت و وەکیلی باوکم تاهیری حەمەلاڵ، بە چەند پیاوێکی دیکەشەوە. ترس هەبوو لە سەلامەتیی کەژاوە کە بە تەنگی «خدران» دا تێدەپەڕێ چونکە زۆر سەرەژێر و جرگەن و بەرداوی و لاپاڵ و هەڵدێر بوو بەڵام خەڵقی زۆر و پسپۆڕی ڕێگا و خاوەن هێز کەژاوەیان بە سەلامەتی لەو تەنگەبەرەیە تێپەڕاند... من لە ماڵی خۆمانەوە هەتا سوارەکان لە شاخی هەیبەتسوڵتان ئاوا بوون هەر بە دیاریانەوە بووم. لە بیرمە چۆن کە بە شاخ هەڵدەگەڕان و پێچیان دەکردەوە وەک ڕێچکەی مێرووم دەهاتنە بەرچاو، لەو دوورایيە شەوە هەر هێندەی مێرووی ڕەش خۆیان دەنواند.

یاعففەت کە گەیشتە ناو پژدەرییان ناوەکەی بوو بە موشکیلە، بۆیان نەدەگوترا بڵێن «عیففەت». بە زۆری هەر دەیانگوت «یای حیفریت، حیفریت خان». لەوەوە بڕیاری گشتییان دا و ناویان گوڕی بە «عیسمەت خان». ئیتر کە دەهاتەوە کۆیێ دەبۆوە بە «عیففەت خان» و کە دەچۆوە پژدەر باری دەگۆڕا. لەلایەن ئاکارەوە ئەم ئافرەتە لە فرشتەی دەکرد، خاوەن دڵ و تەبیاتێک بوو هەرچی خەوش و لەککە هەبێ تێیدا نەبوو. دایکم گۆیا بۆ ئەو زڕدایک بوو من و نەجیبەش زڕبرا و زڕخوشک، بەلایەوە وەها خۆشەویست بووین هیچ سنووری نەبوو، تۆ بڵێ بۆچی ئەم جیهانەی ئادەمیزاد هێندە بەدبەختە بە کەمبوونی ژمارەی مرۆی ئەوتۆیی!

وەک لە بیرمە دوای گوێستنەوەی یاعففەت کە قوتابخانە کرایەوە من بووم بە قوتابی، بەر لەوە، نەجیبەی خوشکم لە ساڵی 1925 چووبۆوە مەکتەب، منیش بێ ئەوەی گوێ بدەمە دەرس و دەوام هاتوچۆیەکەم دەکرد و مامۆستاکانیش لێیان

دەسەلماندم بە کەیفی خۆم بچمە ژووری دەرس و بە کەیفی خۆم لێی دەرچم، بەڵام شتێک ڕووی دا لەو ساڵەی چوونە مەکتەبی بێخوێندن تاوی گەیاندە دەروونم، نازانم چۆناوچۆنی و بە هۆی چ سەبەبێکەوە سەلاحی ئامۆزام، کە بە ساڵێک لە من گەورەتر و قوتابیش بوو، لە حەوشەی قوتابخانە شەقێکی لە مامۆستایەکی هەڵدا. ئەم دیمەنە کاری تێکردم بێوەستان گەڕامەوە ماڵێ و بە باوکم گوت ناچمە مەکتەبێک قوتابی شەق لە مامۆستای هەڵبدا.

لەوە بەولاوە هیچ سەروبەرێکی دیکەی ئەو ڕووداوەم لە بیر نەماوە، وابزانم لەو ساڵەدا نەچوومەوە مەکتەب ناشزانم ساڵی دواتر لە سەرەتای مەکتەب کرانەوەدا هەڵوەستم لە ئاست چوونە مەکتەب چۆن بووە، بەڵام ئەوەندەم دێتەوە بەر یاد ناوناوە بەهانەم دەدۆزیەوە بۆ خۆدزینەوە لە مەکتەب، ڕەنگە ئەم بەهانانە بلقی بیرەوەریی شەقەکەی ساڵی ڕابوردوو بووبێت. بەر لە چوونم بۆ مەکتەب دوو ڕووداوی بە هاتوبات و سەروسەودام دێنەوە بەر یاد.

یەکێکیان سەفەری دایکم بۆ بەغدا بە نیازی تەداوی، وەک بشزانم ئەو و عەبدولموقتەدیر و جەماعەتی لێرە بە پێشەوە باسکراو بەیەکەوە سەفەریان کرد. ئێستا لە بارێکدا نیم بتوانم پرس بەو کەسانە بکەم لە من چاکتر ئەو سەردەمەیان بە بیردا دێتەوە تا بزانم بە دڵنیایی، ئاخۆ بەیەکەوە چوونە بەغدا یان بە جودا. لە ڕووی چەندوچۆنی ژیانی منداڵیمەوە هیچ فەرقێک لەوەدا پەیدا نابێ ئایا چۆناوچۆنی سەفەریان کرد. من بە هۆی دایانم «یاعیسمەت»ـەوە بێدایکیم پێوە دیار نەبوو، زۆریشم مەبەست نەبوو لەگەڵ دایکم بم مادەم ئەو لەگەڵبوونە یاعیسمەتم لە کیس دەدا، بەڵام نەجیبەی خوشکم درنەی داگرت بۆ چوونە سەفەر، تەنانەت دوای ئەوەی قافڵەی سەفەر کردووان بەڕێ کەوت و لە شار چووە دەر نەجیبە فرسەتی وەرگرت و بەرەو ڕێی قافڵە کەوتە غار، پیاوێکی زۆر لە پێشی باوکم ساڵحی مام عەلاو کەوتە شوێنی تا لە شار دەرچون نەیگەیشتێ. نەجیبەی خوشکم دەیگێڕێتەوە دەڵێ بە غار لە دەرکی گەروو سۆرکەوە شوێن قافڵە کەوتم بەو ڕێگایەدا کە ڕووەو هەولێر دەڕوا، ساڵحم زۆر جێ هێشتبۆوە و لەوانە نەبوو بتوانێ بمگرێ، بەڵام بۆ بێتالعی جووتیارێک کە هیچ ئاگای لە بینبرکێی ئێمە نەبوو لەوژەکە لەوژەکە لە گردی قشڵە بە جووتە گاوە بەرەو مەزارەکەی لای گردی عارەبی دەهاتە خوار. ساڵح بانگی کرد، هۆی جووتیار دادەی ئەو کچەم لە بۆ بگرە. نەجیبە دەڵێ جووتیار

ئاگای لە هیچ شتێک نەبوو بەو بانگەوازەش بایی سەری موویەک خۆی نەچرچاند، خۆ ئەگەر بەردەوام بامایە لە ڕاکردنەکەم جووتیاریشم نەدەگەیشتێ کەچی بەو بانگە ڕەق بۆی ڕەوەستام و بەغدا و هەولێرم لەبیر چوونەوە و لەگەڵ ساڵح گەڕامەوە ماڵێ... دواتر دایکم دەیگوت ئەگەر نەجیبەم بگەیشتابایە دڵم نەدەهات بیگێڕمەوە لەگەڵ خۆمم دەبرد، جا ئەوسا نەجیبە خەفەتی لە جووتیار دەخوارد بەڵام چ فایدە.

سەفەری ئەوسای بەغدا لە کەرکووکەوە تا کەنگربان بە ئۆتۆمۆبیل و لەوێوەش بە شەمەندەفەر بۆ بەغدا دەچوو. دایکم لەو سەفەرەدا جگە لە کۆمەڵەی پیاوان ئافرەتێکیشی لەگەڵدا بوو مەشوور بوو بە مامۆستاژن، خێزانی حاجی فەقێ محەمەدی جیرانمان بوو. ئەو مام حاجییە بە ساڵدا چوو بوو، شەوانە لای باوکم بوو چەندی عەسرانیش باوکم چووبایە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد حاجی فەقێ محەمەد لای دەبوو. مامۆستاژن ناوی «مریم» بوو بەڵام بەهۆی مێردییەوە پێی دەگوترا مامۆستاژن، بە بیرم دێ ساڵێکیان بەیەکەوە چوون بۆ حەج. تەنها کچێکی بوو «فەقێ عەیشێ» ناو، شووی کرد بە کەریمی حاجی حەمە ڕۆمی کە خۆی و براکەی (وەستا تەهای جلدروو) و خوشکێکی (یارەحمەی خێزانی حاجی کەریمی ئاسنگەر) زۆر لە نزیکەوە پێوەندی دۆستایەتییان پێمانەوە هەبوو. بنەماڵەی حاجی حەمە ڕۆمی و حاجی کەریمی ئاسنگەر، لە ئاییندەدا شتێکیان لە سەر دەنووسم هەر لە چوارچێوەی ئەم گەشتەدا. کوڕێکی حاجی کەریم، میرزا کە ساڵی 1978 کۆچی دوایی کرد و برادەرێکی هەرە کۆنم بوو، ئەویش دەبێ لە سەری بنووسرێ و خەباتی بە خەڵق ڕابگەیەندرێ، تا ئێستاکە ئەو مرۆیە سەربازێکی نەناسراوی کوردایەتی و پارتی دیمۆکراتی کوردە. کەم کەس هەیە هێندەی ئەو خزمەتی بێ مزە و هەرا و بێ ناو و شۆرەتی کردبێ. ناساندنی ئەویش بە خوێنەری کورد قەرزێکی ئایندەی سەر شانمە. بگەڕێمەوە بۆ سەفەرەکەی دایکم و مامۆستاژن.

پاش ئەوەی مامۆستاژن لە زگ وەستایەوە تەنها کچێکی بۆ مێردەکەی بەرهەم هێنا خۆی کەوتە خەمخۆریی پەیدا کردنی ژنێک بۆ حاجی فەقێ محەمەد کە میراتگرێکی نێرینەی بۆ پاشەکەوت بکات. دۆزینەوەی ئەو جۆرە ئافرەتە ئاسان نەبوو چونکە مام حاجی پیر بووبوو. دەبوو ئافرەتێکیش بدۆزێتەوە هەم خۆراکی ئەو بێت و هەم لە تەمەنێکدا بێت کەڵکی منداڵبوونی پێوە مابێ. مامۆستاژن (پێشیان

دەگوت حاجی مریەم) کچی «شێخ تەها شێتە»ی بۆ خواست، شێخ تەها، ڕاستییەکەی شێت نەبوو بەڵام مرۆڤەکی ئاساییش نەبوو. دەستکورتی و بەساڵداچوون و پلەی نزمی لێهاتوویی ناچاری دەکرد بە گرتنە بەری کەسابەتی ئەوتۆ لە ڕواڵەتدا کڕین و فرۆشتنی تێدا بێت و ناوەڕۆکەکەشی برای سواڵکردن بێت، بە زۆری چەند شقارتە و قەیتانی چەخماخ و بەردە چەخماخی لە باڵەکانی دەنا و دەگەڕا بەم و بەوی دەفرۆشتن کە تێیرا دەدیتن لێی دەکڕن و بە زیادەوە نرخی بۆ حیساب دەکەن. بەڵام لەگەڵ ئەم حاڵەتەشدا شێخ تەها لە دیوەخانەی جەمیلاغا و ئاغاکانی غەفووری ڕووی خۆشی دەدیت و بەخێر دەهێنرا، لای ئەفەندیی مەکتەبدیدەش ڕێزی بەقەدەر حاڵی لێ دەندرا، خۆ لەگەڵ مامۆستا زەکی هەناری چەندی بڵێی زار سوحبەت و نوکتەبازی و شەڕەجنێوی مزرۆکەی ڕۆحسووکی بەرپا دەکرد. بەهەمەحاڵ شێخ تەهاش یەکێک بوو لە ڕووە کۆمەڵایەتییە ناسراوەکانی کۆیەی ئەو سەردەمە. خەڵق بە تێکڕایی پێیان دەگوت خاڵە شێخ تەها.

هەرگیز لە بیرناکەم، ئەوەندەی زستانان دیبێتم جلکەکەی چوار نهۆم بوون، ڕۆخی دەلینگی شەلوار (یان دەرپێ) ی دەگەیشتە قاپان. شاقەلی کەواکەی لە نێوان ئەژنۆ و ڕۆخی شەلواری بوو. سەرکەواکەی دەگەیشتە ئەژنۆی، سەڵتەشی بەسەر هەموانەوە لەبەر دەکرد دەگەیشتە کەمەری. هاوینان نهۆمی دوەمی کە سەرکەوا بوو کەم دەبۆوە و دەمایەوە سێ نهۆم... مەعلووم لە بەهەشتیش هەروەها جلک لەبەر دەکا چونکە شەقڵ و دەقی پێوە گرتبوو.

مامۆستاژن کچی شێخ تەهای بۆ مێردی، مام حاجی گوێستەوە، خواش بە ڕەحم بوو کوڕێکی لەو ژنە پێ عەتا کرد ناونرا حەمەد مستەفا. لەبەر پێوەندی کۆن و جیرانەتی و دواتریش کە فارووقی برام بوو، لە تەمەندا نزیکتری حەمەد مستەفا بوو. ئەم حەمەد مستەفایە زۆری لە ماڵی ئێمەی بەسەر دەبرد، بەتایبەتی چونکە حاجی فەقێ محەمەد زۆر نەژیا دوای بوونی مستەفا، خێزانە تازەکەشی بەو کوڕەوە دانەنیشت و چۆوە ماڵی باوکی ئیتر مستەفا مایەوە بۆ مامۆستاژن کە لێی بوو بە باوک و دایک، ئەویش بە تەبیعەتی حاڵ و بە عادەتی خۆی ئاغڵەبی کاتی ڕۆژی لە ماڵی ئێمە دەبوو، ئیشێکی زۆری کژ لە دوا کژی ساڵ لە ماڵی ئێمە بەو مامۆستاژنە دەسپێردرا، دایکم لێی ئەمین بوو هەم لە ڕووی دەستخاوێنی و دینداریيەوە هەم لە

ڕووی لێزانی و کابانییەوە. لەوەش بترازێ مامۆستاژن نوێژکەری ڕۆژووگری بە عیبادەت بوو، هەمیشە لەگەڵ پووری گەورەم یافەخرە هاوبەرماڵ و هاوقیبلە و هاوفکر و زکر بوو، سەد جاران بەهەشتیان لێ پیرۆز بێ.

ساڵی مردنی حاجی فەقێ محەمەد-م لە بیر نییە بەڵام سبەینەی کە خەبەری مەرگی زانرا لە مێشکم نەقش بەستوو بووە چونکە وەها ڕێککەوت لە بانێکی خۆمانەوە سەرم بە حەوشەی ماڵی مام حاجیدا گرت دیتم لەسەر تاتەشوار بە مردوویی درێژکراوە، ئەو دیمەنەم قەت لە بیر نەکرد.

جاران بەر لەوەی ئەو خەڵقە لە یەکدی بکەوێتە کلکان، دۆستایەتی و جیرانەتی و ئیش بەیەکدیبوون و فریای یەکدی کەوتن و حوقووق پاراستن و خەسڵەتی ئەوتۆیی تاموشامێکی لە ژیانی سادەی ئەو سەردەمانە دەگێڕا، کەسیشی تێدا زەرەر کردوو نەدەبوو، ڕەنگە کەسێکی دەست تەنکیش بوایە لەو پێوەندییانە پتر بەهرەمەند بێ تا دەگاتە بابای حاڵخۆش. دۆستایەتی و جیرانەتیی حاجی فەقێ محەمەد و مامۆستاژن-یش لەگەڵ ماڵی ئێمەدا بەدرێژایی ڕۆژگاریان ڕووپەڕەیەکی گەش و خۆشی ئەو سەردەمانە بوو، دەتوانم بڵێم هەرگیز ڕووی نەدا نە لەوان و نە لە ئێمە شتێک هەڵکەوێ و ببێتە جێی گلەیی لای دراوسێکەی...

مامۆستاژن ئەمینداری دایکم بوو لە هەرچی پێی دەگوترێ پیت و بەرەکەت و کەلوپەل و ئەسبابی ناوماڵ، هەر لە بزنج و هەتا گەنم هەتا ڕۆن هەتا مێوژ و دۆشاو هەتا نیسک و ساوار و دانەوێڵە هەتا دار و چیلکە هەتا میوەی هاوینان هەتا مریشک و جووجەڵە هەتا جلک و بەرگی ناو سندووق هەتا پارە و پوولێکی هەبووبێ بۆ خەرجی هەمووی لەبەر دەست و دەمی مامۆستاژندا بوو، ئەویش (سوێندی لەگەڵدا بێ) نەک هەر دەنکە دانەوێڵەیەک و فلسێکی بە لاوە نەناوە بەڵکوو بۆ ماڵەکەی ئێمە بە پەرۆشتر بوو لە ماڵی خۆی. دەک هەزار ڕەحمەت لە خاکی پاکی سەرقەبرت ئافرەتی خواناسی بەشەرەف. هەر ئەو متمانە پێکردن و تێڕا دیتنە بوو وەهای کرد دایکم بۆ سەفەری بەغدا مامۆستاژن لەگەڵ خۆیدا ببات. کە هاتنەوە، دوای چەند مانگێک، باشترین دیاریی دایکم بۆ من ئەوە بوو پەیکەری بزنێکی بەسەر تەختەیەکی ڕەوڕەوەداری بۆ هێنابووم، درێژاییەکەی 25 سانتیمەتریک دەبوو، کە ڕیشیت ڕاکێشابایە دیباڕاند، بۆ ئەو سەردەمەی 1925 عاجباتی وەها لە شوێنی وەکوو کۆیەدا کاری مۆتۆڕسایکلی ئیمڕۆکەی دەکرد بگرە

پتریش. منداڵانی گەڕەک پێوەی حەپەسابوون، تا ئەوەی ئیمتیازێکی گەورە بوو بهێڵم یەکێک لەو منداڵانە ڕیشی بزنەکەم ڕابکێشێ... بەڵام هیچ شتێک نەمر نییە، بزنەکەی منیش هەروەها، لە پێشەوە وردە وردە لێی تێر دەبووم، ئنجا تووکەکەی، واتە مووەکەی، بەرەبەرە دەوەری، زۆری نەبرد چاوێکی ئنجا ئەوی دیکەشی دەرپەڕی تاکوو لە ئاکامدا بارِیشی پێ نەما. ئیتر چووە گۆڕستانی مێژووەوە.

بەڵام حیکایەتی سەفەرەکە گەلێک دوای جوانەمەرگبوونی بزنەکەم کۆڕی مەجلیسی دایکمی خۆش دەکرد و گوێم لێ دەگرت و زۆریشم حەز لێ دەکرد. بەغدا ئەوسا هەرچەند بە لای ئەورووپاییەوە دێیەکی گەورەی نارێک و دواکەوتوو بوو، بێگومان بە لای کوردەوارییەوە شادگەی خەون و خەیاڵ بوو، ئەو حیکایەتانە کە لە زاری دایکی خۆمەوەم دەگێڕانەوە بۆ هاوڕێکانم، هەستێکی شانازیی پێ دەبەخشیم لە چاو ئەوەی قسەبیستی بابایەکی بازرگان یان سەفەرکردوویەکی هاکەزایی ببم، ڕەنگە ئەوسا دایکم یەکەم ئافرەتی ئەو ڕۆژگارەی کۆیە بووبێت سەفەری وەها بە دەنگ و سەدای بۆ بەغدا کردبێت. چوونی پیاو بۆ هەر کوێیەک بێت ئەو مەعنایە نابەخشێ، سەفەری ئافرەت دەیبەخشێ... بە کورتی، لەزەتێکی زۆرم برد لە بزن و دەنگوباس و حیکایەتی ئەو سەفەرە.

ڕووداوەکەی دیکە ئەوەبوو کە باوکم بە بۆنەی هاتنی مەلیک فەیسەڵ بۆ هەولێر تەکلیفی لێ کرا ئەویش وەکوو پیاوماقووڵی دیکەی کۆیێ بچێ بۆ هەولێر بەتایبەتی کە ئەو زێدە لە خەڵقی دیکە شناسایی لەگەڵ مەلیک فەیسەڵدا هەبوو، جگە لەوەی کە زیاتر لە خەڵقی دیکە بە کەڵکی ئەو موناسەبەتە دەهات، چونکە هاتنەکەی مەلیک بە نیازی هان دانی دانیشتوانی ناوچەی کۆنە ویلایەتی مووسڵ بوو بۆ دەنگ دان بە لای پچڕینەوەی ویلایەتەکە لە تورکیا و خستنە سەر عێراقی. لێرەدا کە من بیرەوەریی ژیانی خۆمم مەبەستە، ڕێم نییە باسی چەندوچۆنی ئەو مەسەلەیە بەو جۆرەی لە هەولێر لە نێوان مەلیک و ئەو خەڵقەدا باسی لێ کرا بهێنمە ناو نووسینم، بەڵام ناچارم بۆ ڕوون کردنەوەی لایەنی تەجرەبەی تاڵ لە دەمی مەلیکایەتیی فەیسەڵدا شتێکی ئەو سەروبەرە بگێڕمەوە.

مەلیک لە باداوەی مەلا ئەفەندی، بە مێوانەتی لە مەلا ئەفەندی، دادەبەزێ. لە قەڵەباڵغیی پێشوازیکەراندا مەلیک دوانێک دەدات و تەکلیف لە باوکم دەکات قسەکانی بۆ سەر کوردی وەرگێڕێ. وەرگێڕانەکەی باوکم، بەتایبەتی کە قسە دەگاتە

دەوری سەڵاحەددینی ئەییوبی15 لە پاراستنی ئیسلام و ڕۆژهەڵات، شەوق و ڕەونەقێکی بێئەندازە بەو قسانە دەدات. پێی ناوێ زۆر بەدوا قسان بکەوم، ئەو حاڵوبارە لەو ڕۆژ و هەڵکەوتەدا سەنگێکی زۆر بە هەڵوست و شەخسییەتی باوکم دەدات... سەبیح نەشئەت کە وەزیرێکی هەولێری بوو دێتە لای و پێی دەڵێ، قوربان لەم بارەدا هەرچی بفەرمووی جێبەجێ دەکرێ، فرسەتیش هەموو جاران ناگەڕێتەوە، چ ئارەزۆیەکت هەیە مەلیک بۆتی ڕەوا دەبینێ... باوکم پێی دەڵێتەوە، سەبیح من کە لەگەڵ خستنەسەر مووسڵم بۆ عێراق لە باوەڕەوە دەدوێم، وەڵای خۆیشم بە پارەی هەموو دنیا نافرۆشم، ئاخۆ دەبێ من تەما و ئارەزۆی چیم هەبێ؟ ئەگەر لە دوارۆژدا بەپێی هەڵکەوتی زەمانە موراجەعەتەیەکی حکوومەتم کرد لەو مەسڵحەتەی کە هەیتم وا دەزانم پێویست نییە گومان بەرم بۆ ئەوەی لەمپەڕی دەخرێتە بەر. سەبیح نەشئەت چەندێکی پێ دادەگرێ لەسەر هێندێ کە باوکم تەکلیفێک بخاتە ڕوو باوکم نایسەلمینێ. دواتر پێشبینیی سەبیح نەشئەت هاتە جێ و حاڵ گەیشتە بارێک کە حکوومەت خۆی دەستی بەسەر هەندێ ملکماندا گرت (بگەڕێوە بۆ ئاڵقەیەکی لەمەوپێشتر کە باسی قەنبەران دەکات).

تەرزە تەجرەبەی تاڵ بەدوا هەڵوەستی وەها جوانەمەردانەی باوکمدا ڕێخۆشکەرەوە بوو بۆ ئەوەی لە دوایین سەردانی مەلیک فەیسەڵ لە هەولێر باوکم دەرفەت

---

15- باوکم کە دەگاتە تەرجەمەی قسەی مەلیک فەیسەڵ لە بارەی «سەڵاحەددین»ـەوە پێی دەڵێ ئەم مەوزووعە دەیەوێ پتر ڕوون بکرێتەوە. مەلیک دەڵێ خۆت موختاری چۆنی دەتەوێ وەها بفەرموو. ئیتر باوکم شکڵ موحازەرەیەک لەسەر دەوری سەڵاحەددین و کورد دژی خاچهەڵگران (خاچپەرستان) دەدات، عالەمەکە سەرسام دەکات، لە برە شیعرێکیشی ئەم بەیتەی لە بارەی ڕۆڵی کوردەوە گوتوە (وەک دەقەکەیم لەبیر مابێت) ئەمەیە:

لە پاش حەربی صەلیبی، ئاسیایی
دەبوو مەمنوونی کوردان بن وەکوو عەبد

وەربگرێ و قسەی پێ ببڕێتەوە. بەخێر، لە شوێنی خۆیدا کە نۆرەی قسەی گەیشتێ ئەو باسەت بۆ دەنووسم.

ڕێکەوت وەها بوو کە باوکم جارێ لەو سەفەرە نەگەڕابۆوە بەفرێکی لەحەدبەدەر باری و سەرمایەکی زێدە سەختیشی پێوە بوو. باوکم لە دەمی بەفر و سەرماکە بە خۆی و قەڵەباڵغیی لەگەڵیدا بوون، میوانی شێخ مارفی هەڵەجە، خاڵە گەورەی مامم، بوو. ئێمە لە کۆیێ بە درێژایی ئەو ماوەیە بە بەفرەوە خەریک بووین. حەوشی ماڵەوەمان کە بەفری بانەکەیشی هاتبۆوە ناو وەک چاڵەبەفری لێ هاتبوو. کاک موقتەدیر پیاوێکی تایبەتی خۆی خزمەتی دەکرد ناوی قالە حەبێ بوو، موقتەدیر بە عادەتی خۆی لەقەبێکی بۆ دۆزیبۆوە هەمیشە بانگی دەکرد «قالە قۆقانی سەگی سەربانی» ئەویش «بەڵێ بە چاوانی» وەڵام دەدایەوە، لەو بەفرەدا کاک موقتەدیر کە خۆی توانای هیچ جۆرە گاڵتەوگەپی سەر بەفری نەبوو فێڵێکی خۆشکەڵەی دۆزیەوە خۆی پێ دەخافڵاند ئێمەشی پێوە دەزرووقاینەوە، باز بازانێی بە قالە حەبی دەکرد لە سەربانی ماڵەوە بۆ ناو بەفری حەوشە، قالەش وەکوو یاری یەکبازی بەهاران تا ئەو سەری بان لێی دەکشایەوە گوڕی دەبەست و خۆی هەڵدەدا دەگەیشتە ڕۆخی ئەوبەری حەوشەکە و هەتا بن پیلان لە بەفردا ختم دەبوو، بە تەکان خۆی دەردەهێنا و ڕای دەکردەوە بۆ بان و سەرلەنوێ تووڕ هەڵدەدا ئەو خەڵقەش بە تەماشایەوە لە تریقەی پێکەنینیان دەدا، کاک موقتەدیریش بە زمانە شەقوپەقەکەی ئەوەی دەگوت کە کەس نازانێ چۆناوچۆنی بوو. سەرماکە وەها سەخت بوو، ئەو هەموو کەلێن تێکەوتن و پێشێل کردنە بەفرەکەی نەدەتاواندەوە.

قالە حەبێ بەینێک خزمەتی کاک موقتەدیری کرد، ناشزانم بە هۆی چ ڕووداوێکەوە پەنای بۆ ئێمە هێنابوو. لەو ساڵانەی دواییدا خەبەری مەرگیم بیست. ڕەنگە دوای ئەوەی ئێمەی جێ هێشت تا مرد هەر جارێک یان دوو جاران دیبێتمەوە.

بە باشی لە بیرمە، شەوانی ئەو زستانەی کە بەفرەکەی بە زۆری لێ باری دەتگوت مانگەشەون هەرچەند مانگیش بە دیارەوە نەبوو، تومەز سپیایی بەفرەکە کە هەموو زەویی داگرتبوو بایی ڕووناکایی مانگ چاو تێی بڕ دەکرد. ئەم دیاردەیەی سپیچوونەوەی بەفر لە شەودا دواتریش سەرنجی دەکێشام بەڵام نەک هێندەی دەمی منداڵیم تومەز بچووکیی دەفری زەین و نەفسی منداڵ لە بارستی دیاردان

زیاد دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا دەمزانی سپیایی دنیا لەو شەوانەدا هی بەفرە و لێشم ڕوون بوو کە مانگ بە دیارەوە نییە.

چەندوچۆنی هاتنەوەی باوکم لەو سەفەرەی هەولێری و هاتنەوەی دایکم لە سەفەری بەغدا بە هیچ جۆرێک خۆ نانوێنێ لە یادمدا، وەها سڕاونەوە هیچ شوێنەوارێکیان لە ڕووپەڕەی ویژداندا نەماوە، وابزانم زۆری سەفەری دایکم و باوکم لە موناسەبە و لە پێویستدا بە درێژایی ئەو ساڵانەی کە من جارێ منداڵ بووم هاتوباتی چوون و هاتنەوەیانی لەبەر چاوی ساوامدا تێکەڵ بە یەکدی کردووە تا ئەوەی لێک ناپچڕێنەوە بزانم «کامیان کامن» بێگومان ئەگەر خۆمیان لەگەڵدا بامایە باشترم بە بیردا دەهاتنەوە.

ئێستاکە بەدەم نووسینی ئەم یادگارانەوە زرِە دیمەنێکی کۆنترم بە بیر دێتەوە، لە لای خۆیەوە وێنەی ڕۆژانی بەسەرچووتر بۆ بەر زەینم ڕادەکێشێ، بە بیرم دێتەوە ڕۆژێکیان نانی نیوەڕۆ بە قەڵەباڵغیەوە لەو تازە ژوورەدا دەخورا کە بووبووە ژووری دیوەخان. خەڵقەکە لەسەر مافوور و دۆشەگ دانیشتبوون کە ئەمە وەها ڕادەگەیەنێ جارێ تاقمی تەخت و قەنەفە بۆ ئەو تازە دیوەخانەیە دروست نەکرابوو. لە لای سەرووی ژوورەکەوە کابرایەکی سوورکاڵی شەپقە لەسەری ئەژنۆ ڕووت، بە بریق و باقی نیشانەی سەر شان و سینگییەوە دوو سەرینیان بۆ دانابوو لەسەر یەکدی لە جیاتی کورسی دانیشتبوو. هەرچی یادی ئەو ڕۆژەیە بە هۆی ئەو شەپقە لەسەرە ئەژنۆ ڕووتە سوورکاڵەوە خۆ دەنوێنێ، دیارە کاربەدەستی ئەوسای ئینگلیزەکان بووە (ڕەنگە بەسەفەر و سەردان هاتبێتە کۆیێ چونکە ئەو دەمانەم بە بیر نایەن کە ئینگلیزەکان لە کۆیێ فەرمانبەر بوون). لە پەنا شەبەنگی ئەو کابرایەی سەرووی ژوورەکەوە شەبەنگی دیکەی نامەئلووفی زەرد و سوورم لێ تێکەڵ دەبن هەر دەڵێی پارچە تەمی زەردەواڵەیی بووبن بە چەند شوێنێکی ئەو ژوورەوە گیرسابێتنەوە لەبەر یادی مندا، هەڵبەت ئەو پنۆکە زەرد و سوورە نامەئلووفانەش هەر ئینگلیز بوون، بەڵام لەبەر یادی مندا چاو و لووتیان نەڕسکابوون.

ئەشەدوبیللا لەو دەمەدا بە هیچ جۆرێک بیری ساواییم بۆ ئەوە نەچوو ئایا لەبەر چی ئەو زەرد و سوورانە بەسەر سەرینی بەرزەوە دانیشتوون؟ بۆ زەرد و سوورن؟ بۆچی لە باری سەرەوە دانیشتوون؟ کێن؟ لەبەر چاوی ئەوسامدا کابراکان لە بەنیادەمیان نەدەکرد. قەتیش ڕێک نەکەوت دواتر کە هۆشم بە شتان شکا بپرسم

ئەو کابرایانە ناویان و وەزیفەیان و فەرمانی سەرشانیان کە بۆی هاتبوونە کۆیێ چی بوو.

باسی ئەم شەبەنگە زەردەواڵەییە کە تازە ژووری دیوەخانەی لەگەڵ خۆیدا بەریاد کردەوە، تازە ژوورەکەش لە ڕێی «تداعی» یەوە بۆ ڕووداوێکی بە سفتوسۆی کۆنترم دەباتەوە. بەر لەوەی ئەو ژوورە تازەیە ببێتە دیوەخانە باوکم لە ژوورێکی دیکە میوانی بەخێر دەهێنان کەوا لە نزیک دەرگەیەوە قادرمەی بانی کۆشکی دوو نهۆم سەر دەکەوت. جیرانێکمان حاجی تەها، کە ماڵەکەی بە تەنیشتی لای ڕۆژاوای ماڵمانەوە نووسابوو شەوانە کە لە دیوەخانە هەڵدەستا بەو قادرمانەدا سەر دەکەوت بۆ سەر کۆشک و لەوێوەش 70 سانتیمەترێک بۆ بانی کۆشکی ماڵی خۆی دادەبەزێ و بە قادرمەی نێو هەورەبانی خۆیدا دەچوە خوارێ بۆ ناو ماڵی خۆی، ئەمەی دەکرد چونکە زۆر کورتتر و قەدبڕتر بوو لەوەی بە کۆڵانەدا بەرەو ماڵ بێتەوە. شەوێکیان لە میعادا هەڵدەستێ بەرەو ماڵ، لە سەربانی کۆشکی ئێمە ڕێی لێ هەڵە دەبێ، لە جیاتی ئەوەی بەرەو بانی کۆشکی خۆی بڕوا ڕوو دەکاتە سواندەی لای حەوشەی ماڵی ئێمە و لە دوو نهۆمەوە کەوتە خوارێ و کەسی بە دەنگ نەگەیشتە سەرێ. من شیری خێزانی دوەمی حاجی تەهام خواردبوو، ماڵەکەی بۆ من و بۆ نەجیبەی خوشکم وەک ماڵی خۆمان بوو، لە ژنی یەکەمی سێ کچی هەبوو، لە هی دوەم کوڕ و کچێک، هەموویان هەر بەڕاستی بۆ من خوشک و برا بوون. حاجی تەهام بە یەک فۆرم بە بیر دێتەوە، پیاوێکی کەڵەگەتی داڵەگۆشت و مووسپی، کورتەکەکی تا ئەژنۆی لەبەر، لەوە بەرەژێژ دەرپێی سپی...

دیارە ئەم وێنەیەم لە بەرگی هاوینیدا دیتبوو. هیچ سەروبەرێکی کەوتن و مردن و تازیە و ئەو جۆرە هاتوباتانەم بە بیر نەماوە. ئێستا خانووی حاجی تەها لە دەست میراتگرانیدا نەماوە، ئەو بەشەی ماڵی ئێمەش کە بریتی بوو لە حەوز و مەتبەخ و ناو ماڵ و خانی زەخیرە و بە خانووی حاجی تەهاوە نووسابوو، بۆتە خانووی شێرکۆی فەتحیی برای شیریم... ئەو بەشە، کاتی خۆی، باپیرم حاجی مەلا عەبدوڵا کڕیبووی، ئەوساش هەر بە کۆنە خانوو کڕابوو، سەیر لەوەدایە، بە درێژایی عومری ئەو خانووە کە هەر نەبێ لە 200 ساڵی تێدەپەڕاند پێویست نەدیترا هەڵگەڕێتەوە یان داری لێ بگوڕدرێ تا بەر لە دوو ساڵێک شێرکۆ لە بنەڕەتەوە نوێی کردەوە، کۆڵگە و کاریتەی ناو ماڵەکە و هێندێک لە داری ڕایەڵی چەند بڵێی مەتانەتیان پێوە بوو.

ئەو ناو ماڵە بە لای ئافرەتانی چینی پێش ئێمەوە قودسیەتی هەبوو، زۆرم دەدیتن کە سەردانی یافەخرە، دوای ئەویش هی دایکمیان دەکرد یان خزمانی هەولێر و دزەییاتی ڕێیان دەکەوتە کۆیێ دەهاتن دەرگە و دیواریان ماچ دەکرد، سەیریش نییە بۆ ئافرەتی جیلی پێش ئێمە جێگایەک بە موقەدەس بزانن کە لەوەتەی بە بیراندا دێت نوێژ و تەراویحی ئافرەتانی تێدا کراوە و قورئان خوێندراوە.

لەبەر یادی منداڵیدا ناوماڵ و پوورە فەخرەم تەواوکەری یەکدی بوون لەگەڵ ئەو پوورەمدا داکە زەینەب «حەزینە» دایکی مامم هەتا مرد عیبادەتی لەو ناو ماڵەدا دەکرد. چی ڕزقێکی خواش بە ئێمەی دابێ لەو ناوماڵە و خانی زەخیرەی کە بە سەریەوە بوو، دەرگەشی لە ناو ناوماڵەوە بوو، دا دەکراو دەبوو بە خۆراکی ڕزقخواردووان. واز لە مێوان بهێنە، هەر حیسابی ئەو ڕزق و ڕۆژییەی لە ماوەی پتر لە 100 ساڵدا بە ڕاتبە بۆ فەقێی مزگەوت چووە، بدەیتە بەر تەرازووی خێر و شەڕان، چارت نامێنێ لەوەدا حورمەتی ناوماڵەکە بگریت. بشزانە، خوێنەر، ڕزقی حەرام نەچۆتە ئەو ناو ماڵە. ئەحمەد شەوقی بە زاری مەجنوونەوە لە یادی سەردەمی منداڵی و شوێنەواری کە لەگەڵ لەیلا تێیاندا بەسەری بردووە دەڵێ و چەند بە پاکی و سۆزەوە دەڵێ:

*قد يهون العمر الا ساعة*

*وتهون الارض الا موضعا*

ئینجا ئەو ناو ماڵە و ژوورێکی دیکەش کە وەختی خۆی باپیرم و بەدوا ئەودا باوکم تێیدا ژیاون بە ڕاستی و بێ تێخوێندنەوەی باب و ئەولادەتی هەقیان بوو ڕێزیان لێ بندرێ. ناو ماڵەکە فەوتا بەڵام ژوورەکەی باپیرم بە تەعمیرکراوی هەر ماوە.16

16- ئەم ژوورە باسکراوەی باپیرم لەوەتەی کە من بە بیرم دێ تێیدا نووستووم و خەڵقی ماڵەوەش وەکوو من. شەوان کە سەرم دەخستە سەر سەرین هەتا خەوم لێ دەکەوت تەپەتەپ و ڕەپەڕەپێکی بەردەوامم دەبیست دەتگوت یەک دوو کەس کاری زۆرخانە دەکەن لە ژێر زەمینێکی مەوهوومی بن ئەو ژوورەدا. ئەهلی ماڵەوە هەرچی بە شەو لەو ژوورەدا نووستبێت ئەو دەنگەی بە ئاشکریی و بەردەوام بیستووە. چەندێکی خەیاڵم لێ کردووە و خەیاڵیان لێی کردووە سەرەدەریمان لێی

کە بیرم دەبەمەوە بۆ کۆنترین ئەو ڕۆژانەی دەشێ بێنەوە بەریادم وێنەیەکی گەڕەک و کووچەی دەوروپشتی ماڵی خۆمانم بە نیمچە وێرانی دێتەوە بەر چاو. لە ماڵمانەوە تا ڕۆخی شار مەودای پتر لە سەد مەتر هەبوو هەمووی وێران بوو. لە نێوان ئێمە و مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد کە بە ئەسڵ لە دەرەوەی شوورەی شار بووە مەودایەکی بەرین هەبوو پێیان دەگوت «کاولی عەلی بەگ» شوێن گەمەی منداڵ و جحێڵان بوو. دیارە کاتی خۆی بابایەکی «عەلی بەگ» ناو خاوەن ملک و ماڵ بووە لەو ناوەدا. بەسەر ئەو کاولەوە بەرەو خوار و بەرەو ژوور هەر وێرانگە بوو. دەتوانم بڵێم لە ڕووپێوێکدا کە هەڵدەگرێ بەر لە وێرانبوونی 10-15 خێزانێکی تێدا ژیابێ تەنها دوو خانووی شڕی بە پێوە مابوو، یەکێکیان ماڵی مام عەلی ئەوی دیکەشیان ماڵی مام قادر کە پێیان دەگوت «قالە خەجێ»، خێزانی ئەو مام قادرە ژنێکی پانوپۆڕی وەکوو مێردەکەی بەساڵدا چوو بوو نازناوی «کووپە» یان پێوە نابوو، بووبووە «خەجێ کووپە». ئەو ژن و مێردە بێ وەچە بڕانەوە.

زۆر منداڵ بووم دمەو پاییز بوو سبەینەکیان کە خەبەرم بۆوە بیستم دەگوترا ماڵی خەجێ کووپەیان بڕیوە. ماڵەکەیان دە مەترێک لە ئێمەوە دوور بوو، بەغار چووم دیتم لە قوونەبانی لای چۆڵی بە دیوی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەددا شەباقەیەکی گەورە کەوتبوە دیوارەکەیانەوە کە لە قوڕ و خشت هەڵنرابوو بۆ دز لەمپەڕی نەدەکرد. وابزانم دزەکە دیواربڕێکی ئاسنی لێ بەجێ مابوو. ئەوەی کە بەکەڵکی دزین بێت لەو ماڵە دزرابوو. زۆری نەبرد گوتیان کەتنەکە لە کابرایەک ئاشکرا بووە پێیان دەگوت ڕەسووڵی کۆلانی. دواتر ئەم ڕەسووڵەم ناسی، کەنناسی بەلەدییە و فەقیری ماڵی خۆی و زۆریش بە ئەدەب بوو بەڵام لە مێشکی مندا بە خۆی و دیواربڕ و شەباقی دیواری مام قادرەوە نەخش بەستوو بووبوو. نازانم بە ئاکام چی لێ بەسەر هات یان کێی لە دوا بە جێ ما، ئەوە نەبێ کەوا بێگومان وەکوو ملێونەها هەژاری دیکە بەهەناسە ساردی چووە ژێر خاک.

---

نەکرد. من لە ساڵی ١٩٦٥ ەوە تێیدا نەنوستووم، بەر لە هاتنیشم بە ماڵەوە بۆ بەغدا، چەند ساڵێک بوو لە سەر چاربایەک دەنووستم نەختێک مەسافەی هەبوو لەگەڵ ئەو شوێنی کە دەنگەکەی بە ئاشکرایی لێ دەبیسترا، ئیتر نازانم لە حاڵی ئێساکە کە کرێگرتەی تێدایە ئەو دەنگە ماوە یان نەماوە.

مام قادر و مام عەلی، کە جیرانی یەک دیوار و یەک سەربان بوون هەرچەند لە دەرگە بۆ دەرگە جیرانەتییان پێوە دیار نەبوو، لە تەمەندا ڕەنگە لە یەکدی نزیک بووبن بەڵام من وێنەی مام عەلیم بەبیردا نایەت کەچی وێنەی مام قادرم بە چاکی لە بیرە، دەرگەی ماڵی قادر بە ڕووکاری ماڵی ئێمەدا بوو ئیتر هەمیشە لە کۆڵانەوە یان لەسەربانەوە دەمدیت، هەرچی ماڵی مام عەلی بوو دەرگەی لە نەدیوی ماڵی ئێمەوە بوو. دوای خۆی خانوەکەی لەلایەن هەندێک لە کوڕەکانیەوە تەعمیر کرایەوە تەنانەت بەشی زۆری کە بوو بە هی کوڕە هەرە بچووکەکەی حاجی «فتح الله» لەلایەن وەستای مووسڵەوە بنیات نرایەوە. حاجی «فتح الله» گەنجێکی لێهاتووی بەرچاوی بە وێڵ و تەرتیب بوو، براکانی کە هەرسێکیان لەو گەورەتر بوون بە چاوی براگەورە سەیریان دەکرد. کە لەو بەشە خانووەی تازەکراوەی باوکی جێنشین بوو شەوانە دەهاتە لای باوکم، ڕاستییەکەی باوکیشم زۆری خۆش دەویست گەلێکیش بە پەرۆش بوو بۆ مردنی. بە خەتی خۆی نووسیوەتی:

*«فتح الله مام عەلی چووە بەغدا بۆ تداوی لە گەڕانەوە لە (دێگەلە) وفاتی کرد امرو غنودەی خاک غفران بو. یک ماهـ صفر بیست و حەفتی مارت ڕوومی علیه رحمه الله 1358 هـ.ق 1318 هـ.ش 1939م»*

وشەی غنودە فارسییە بە واتای «حەسایەوە» دێت... «هـ ق.» واتە هجری قەمەری. «هـ ش.» هجری شمسی.

حاجی «فتح الله» بۆ دووەم جار ژنی هێنایەوە، کچی حاجی تەهای جیرانی ئێمەی خواست. چونکە من شیری خێزانی حاجی تەهام خواردبوو هەموو کچەکانی خوشکم بوون، ئەمەشیان بوو بە دایکی چوار خوارزام، هەموویان کچ. تا ئێستا سێ لە مانە بوونەتە خاوەن کچ و کوڕی پێگەیشتووی تێگەیشتوو، بەرخورداربن. منداڵانی کچانی حاجی تەها، چ ئەوانەی لە حاجی «فتح الله» کەوتوونەتەوە و چ ئەوانەی لە کچی دووەم- فاتمە ناو بوو بە خێزانی شێخ سادق و کەوتنە قەڵادزە، ئەمانە و هەموو ئەو منداڵانەی لە خوشکانی شیریم پەیدا بوون پڕ بەدڵ پێم دەڵێن خاڵە، وا دەبێ خوارزاییێکم نا ناسمەوە هەتا خۆیم بۆ هەڵدەدا. دەڵێن مەڕ بە بەرەکەتە، خوا پتری بەرەکەت تێبگێڕێ، بەڵام بەنیادەمیش بێبڕشت نییە.

لە پەنا دیمەنی کۆنی شکلۆیرانی کۆیەی سەردەمی منداڵیمدا، دیمەنێکی وەک ئەو کە هەر خزمە لەگەڵ پێداویستی ویرانی، لەگەڵمدا ژیاوە و هەرگیز سپیپات نەبۆتەوە، چەندین خێزانی کورد و عەجەم لەبەر ڕەوی سپای قەیسەری ڕووس و دواتریش بە تەکانی قاتوقڕی ساڵی 1917 داپەڕیبوون بۆ گەرمێن لە مانە چەندین خێزانێک لەو گەڕەکە نیشتەجێ بوون کە ماڵی ئێمەی لێ بوو. تێکڕای ئەو خێزانانەی ڕێز لە خۆ گرتووبوون و بە ئارەقەی نێوچەوانیان نانیان پەیدا دەکرد. میرزا غەفووری سابڵاغی، کە باشتر بە باوکی «دڵشاد ڕەسووڵی» دەناسرێتەوە وابزانم کەسبی عەتاری هەڵبژارد. دڵشادی بوو بە قوتابی، کە مەکتەبی کچان کرایەوە خەجاوی کچیشی بوو بە قوتابی، بەڵام هۆیەکی بێبایەخ لە کۆیەی هەڵقەناند و بردییەوە بۆ سابڵاغ. دڵشاد سەروسەدای هەبوو لە دەمی «قازی محەمەد»دا پاشتر بووە پەنابەر لە عێراق... سەرت نەیەشێنم، زۆر بەداخەوە، لە هەڵسوکەوتی هەرای وڵاتی خۆمان تێدا چوو. لەو ساڵانەدا وردە هەواڵێکی خەجاوی خوشکیم بیست لە سابڵاغەوە و چی دیکە نا...

یەکێکی دیکەی خەڵقی سابڵاغ فەرەجاغا، ئەویش لە خانوویێکدا دەژیا کە ماڵی مەلا تاهیری ئامۆزای باوکمی تێدا بوو. ماڵێکی بە شەرم و شکۆ و بە وێڵ و تەرتیب کەوا بێگومان ڕێکاری ڕەفتاریان پتر لە هی کۆیێ شارستانەتی پێوە دیار بوو. خێزانی فەرەجاغا شیری دەدایە ئیقلیمە-ی خوشکم و لەوەوە شێوە یەک ماڵییەک لە نێواندا پەیدا بووبوو. تاقانە کوڕێکیان هەبوو ئەحمەد، ڕەنگە بە ساڵێک لە من گچکەتر بوو، وەها لەگەڵمدا بوو بە هاوڕێ بێ ئەو هەڵم نەدەکرد. کچە برازایەکەشی هەبوو «جیهان» شووی کرد بە برازای کاک تاهیری حەمە لاڵ بەڵام زوو بێوەژن بوو و ئەویش لەگەڵ مامی چۆوە بۆ ئێران. لەو ساڵانەی دواییدا خزمم لە سابڵاغ ئەحمەدی ناسیبۆوە. فەرەجاغا خەیاتیی دەکرد.

یەکێکی دیکە لەوانەی بە کوردی و تورکیش باش دەدوان «وەستا خەلیل» بەننایی دەکرد. دوو ژنی هەبوو یەکێکیانی «ئامینە»، بوو بە دایان و شیردەری منداڵەکانی مامم. ژنەکەی دیکەی بەرچاوتر و لای مێردی ڕێزلێگیراوتر بوو، کوڕێکی لێی هەبوو «مەجید» ناو، هەمیشە لەگەڵ خۆیدا دەیگێڕا و سەرپەرشتیی هێندە سەروبەری کاری بەننایی پێ دەکرد کە لە عومری بوەشێتەوە.

ئەم مەجیدە هەرگیز تێکەڵ بە منداڵی کۆیێ نەبوو، قەتیش نەدیترا لە هیچ کژێکدا بەشداریی گەمەوگەپی کۆڵانان بکات. لە ئامینە کوڕێکی هەبوو ناوی «جەلیل»، بەڵام لە منداڵیدا سەر سەپۆڵە بوو پێیان دەگوت «سەرەگا». ئنجا کە حەمە عەلی ئامۆزام بوو بە 4-5 ساڵی قەڵسم دەکرد و پێم دەگوت «حەمە عەلی برای سەرەگایە، داکی ئامینە، بابی خەلیل وەستایە» بەوەدا تەزکەرەی نفوسی وەهام بۆ دەبڕی پێوەندی بە مامم و مامۆژنمەوە نەمێنێ. وەستا خەلیل براگەورەی بەرەماڵێک بوو ئێواران لە هاویناندا بەر لە ڕۆژاوا، هەموویان لە سەربان بە ڕێکی دادەنیشتن و شامیان دەخوارد و بەدوای شامدا سیغاریان دەپێچایەوە و دیشلەمەیان دەخواردەوە، زۆری نەدەبرد دەچوونە ناو نوێنەوە. وابزانم براکەی وەستا خەلیل ناوی وەستا ئەحمەد بوو، وەک لە بیرمە بە هیچ جۆرێک شکڵی برایەتییان پێوە دیار نەبوو، خەلیل شووش و باریک، ئەحمەد خینگە ملەی پانوپۆڕ… ئەوەی لە بیرمە لەو ماڵانە کچێک هەبوو ناوی «مەڕاڵ» بوو، قەتیش لەوە بە پێش ناوی ئەوتۆ لە کۆیێ نەبیسترابوو، بەشکڵ ئەو مەڕاڵە دەچۆوە سەر براکەی وەستا خەلیل.

یەکێکی دیکە کە ئەویش لە گەڕەکی ئێمە نیشتەجێ بوو ناوی مستەفا بوو لەبەر کەڵەگەتی پێیان دەگوت مستەفا درێژ. ئێستا کوڕێکی «محەمەد» ناوی لە هەولێر خاوەن دووکانی کەباب و گۆشتە، محەمەد هاوڕێی منداڵی و گەمەوگەپی (تۆپانی و خواجەڕۆیێ و زرینگ زرینگ تاوە)م بوو. چەند ساڵێک لەمەوبەر، بەتایبەتی، بە خۆم و چەند برادەرێکمەوە چووینە دووکانەکەی، تێر بەزگ نان و کەباب و تکەمان لا خوارد بە ماستاو و چایەوە.

کابرایەکی عەجەم کە کوردییەکەی زۆر شڕ بوو باشترین وەستای شیرنەمەنی بوو. لە شکڵی زلابیەی ئەمڕۆکە شیرناییەکی دروست دەکرد بەڵام ماددەکەی گەنم بوو لنجایی زلابیەی پێوە نەبوو، ناومان لەو شیرناییە نابوو «پەنجەرە»، باوەڕ ناکەم شتی لەوە خۆشتر لە هیچ دەستێکی ڕەنگین برەخسێ. کوڕێکی هەبوو کوتومت خۆی بوو بچووک بووبۆوە. ناوی هیچ کامێکیانم نەدەزانی ئەوە نەبێ پیاوەکە «شەکر بە نانی» ی لێ بووبووە لەقەب چونکە دەگەڕا بۆ فرۆشتنی بابەتەکەی بە لەهجەی عەجەمانەی خۆی دەنگی بەرز دەکرد و دەیگوت: «شەکەر بە نانە، شەکەر بە پارە، های شەککەر های شەککەر». لە وشەی شەکەردا دەنگی «ک» ـە کەی کلۆر دەکرد وەک کە لە کوردیدا لە وشەی وەک «کێ، کوێ» دا کلۆر دەکرێ. ئەو

وەستایە جلوبەرگیشی عەجەمانە بوو، زووش گەڕایەوە بۆ دیوی ئێران. هەندێک لەو پەنابەرانە مانەوە لە کۆیێ و لە ئاکامدا بوون بە خاوەن ماڵ و منداڵ و کەسابەت. یەکێکیان تا ئێستاش بە لەقەبەوە ناوی دەبردرێ و پێی دەڵێن «ناله عەجەم» کەچی وەک بزانم زمانی هیچ شێوەی عەجەمایەتیی پێوە دیار نەبوو. قەی ناکا مامە نادر، لە پیاوان دەقەومێ.

بەحاڵ دێتەوە بیرم، تووتنەوانێک لە کۆیە چوو بۆ پێبازۆک و لە دەمی کە تووتن دەبێتەوە «کەڵەبابە» لەگەڵ فەلاحێکی پێبازۆکی «خلە بلّباس» ناو بە دەمەقاڵ هاتبوو. بە غافڵگیر تفەنگی پیاوێکی باوکم دەڕفێنێ و خلە بلّباسی پێ کوشت و بۆی دەرچوو. ئەو کابرایە خۆیشی تووتنەوان بوو لەسەر زەویی باوکم و مامم، وابزانم یەکێکیش بوو لەو پەنابەرانە. ئەو دەرچوونەی بۆی دەرچوو نە بە کەس گیرا و نە هیچ سەروسۆراغێکیشی لە کەس مەعلووم بوو، هەر نەبێ من هیچی لێ نازانم. بۆ ئەو دەمە, کوژرانی مرۆ بە سفتوسۆ و بەدەنگ و سەدا بوو.

لە گێڕانەوەی دەماودەم دەزانم کە خەبەری کوژرانی خلە بلّباس گەیشتە کۆیێ خەڵقێکی بەرحیساب لە خزم و پیاوی سەربە باوکم بە هەڵەداوان و بە تاقمی پێویستی کاری دنیاییەوە ڕۆین بۆ پێبازۆک، زۆریش بە تەعقیبی ئەو کابرایە لە سۆراغدا بوون بەڵام بێسوود. وابزانم ناوی کابرا هەمزە بوو. ئەو پیاوەی کە تفەنگەکەشی لە عوهدەدا بوو هەتا مرد خەفەتی لێ دەخوارد هەرچەند عەیبێک نەدەهاتەوە سەر ئەو چونکە کابرای تووتنەوان بێ ئاگای ئەو لە غەفلەتی خەڵقەکەدا تفەنگەکەی بردبوو، تومەز ئەو پێش گەیشتنی باس و خواسی دەمەقاڵیەکە بۆ ناو ئاوایی خۆی گەیاندە شوێنی مەبەست و تفەنگی ڕفاند... خلە بلّباس برا گچکەی «بلە بلّباس» بوو. ئەم مام برایمە زۆر ژیا، بەڵام ددانی نەکەوتن. سێ کوڕی لە پاش بەجێ ما یەکێکیان ئەو مام عەزیزە بوو کە لە ئاڵقەیەکی پێشووتر باسی نەخۆشبوون و بەشداریی کردنم لە بەرهەمهێنانی تووتنەکەی نووسی...

لە بابەتی «کوژران» چەند ڕووداوێک دێنەوە بەر یادی تەمەنی ئەو ڕۆژگارەم کە حەمدی ڕەشی تێدا دەردەست کرا و مامۆستای نامەنووسیش پەنجەی بۆ درێژ کرد، بەڵام ئەگەر پرس نەکەم ناتوانم بەپێی سرەی ڕووداونیان لەسەریان بنووسم، لەم بارەشمدا دەنگم بە کەس ڕاناگات چ زەرەریش لە پێش و پاش خستنیان و ڕوو نادات.

ڕووداوێکیان کە دەنگێکی گەورەی دایەوە ئەوەبوو دوو شێخی تازەگەنجی بنەماڵەی تاڵەبانییان، شێخ بورهان و شێخ ئەفزەل کە هەردوویان برا بوون، لە دیوی بیتوێن کوژران. ڕاستییەکەی ناتوانم بڵێم هۆی کوشتنیان چی بوو هەرچەند بە لای خەڵقەوە بەتایبەتی تاڵەبانیەکان، دەبێ مەعلووم بێ، منیش بیستوومە بارەها باسی ئەو واقیعەیە کراوە بەڵام بەداخەوە وەهام لە بیر نەماوە بە نووسین بۆ سۆنگەی مەسەلەکە بچم. هەرچۆنێک بێ، بڵباس و ئاکۆی تێدا تاوانبار کران، مەسەلەش بە ئیدارە، لەلایەن موتەسەڕیفی هەولێرەوە هەڵبڕایەوە و بەپێی نرخی خوێنی ئەو دەمە تۆڵە لە سەرەک عەشیرەتەکان ستاندرا و درا بە خوێنئەستێنی ئەو دوو برایە. دوو کوڕی شێخ بورهان، حیسامەددین و شەرەف، هەرچەند بە تەمەن لە من گەورەتر بوون بەتایبەتی شێخ حیسامەددین، بەینێک لە سەرەتاکانی خوێندنماندا بوونەوە بە هاوڕێی مەکتەبم، لە ڕاستیدا شێخ شەرەف زۆر زیرەک بوو بەڵام خۆی و کاکی، شێخ حیسام (باوکی مام جەلال)، زوو دەستیان لە خوێندن هەڵگرت.

کوشتاری دوەم مەسەلەی کوژرانی فەتاحی تۆفیق ئەفەندی مەلا ئیمام بوو. خەبەری هات کە لە ڕێی سەفەری بەرەو کەرکووک لە نزیک دێی قەرەناو یان شوێنی وەکوو ئەو بۆی لە بۆسە دانیشتبوون و بە تفەنگ کوشتیان. فەتاح کوڕێکی شۆخ بوو بە ئاستەم ئادگاریم بە بیر دێتەوە، باوکیشی تۆفیق ئەفەندی کاتبی مەحکەمە بوو، وابزانم بە ئەسڵ کەرکووکین. کوژرانی فەتاح زۆری قسە پێوە دەکرا کەس نازانێ چەندی ڕاستە و چەندی درۆ. بە قەناعەتی من چەندێکیشی ڕاست بێ بایی ئەوە ناکا لە مەسڵەتییەوە بگەیەندرێتە کوشتن.

سێیەم کوشتار لە گەڕەکی خۆمان و لە ماڵی خزمێکمان ڕوویدا، پیاوێکی مامم خاوەن خێزان خەبەری درایێ کە خێزانەکەی دەستی لەگەڵ کوڕێکی گەڕەک تێکەڵ کردووە و ئا لەو دەمەدا بەیەکەوەن لە ماڵی مەلا عیززەت. بوختانەکە درۆیەکی ڕەجاڵی بێئەسڵ و ئەساس بوو، بەڵام مێردە دەستی دایە خەنجەر و چووە ماڵی مەلا عیززەت کە لەو دەمەدا خێزانەکەی لەگەڵ فاتمە خانی خێزانی مەلا عیززەت بوو، عەبدەلبەشەرێکی دیکە لە ماڵەکە نەبوو. کوردی گوتەنی خوێن بەری چاوی گرتبوو، وەرگەڕایەوە ژنەکەی و ونجڕونجڕی کرد بە خەنجەران، دوای قەسابیەکە بە خەنجەرەوە ڕێ و ڕێ گەڕایەوە لای مامم و گوتی قوربان کارێکی وەهام کردوە تەسلیمی حکوومەتم بکە... چەند ساڵان لە بەندیخانەدا بوو، هەتا مرد.

پەشیمانیی پێوە دیار بوو چ خێریشی لە خۆی نەدیت... بوختانکەرەکەش ئافرەتێکی پەنابەر، واتە لە دەرەوە هاتبوە کۆیێ و لەگەڵ خێزانێکی خزمی خۆمان دەژیا. تێناگەم لە چییەوە بوو ئەو بوختانە بێڕەحمەی بەو ئافرەتە بێتاوانەوە کرد، دەڵێن هان درا... بەڵام بۆ دەبێ هان دان مرۆ بەرەنگاری بەدکاریی ئەوتۆ بکات سەد جاران لە هان دانەکە مەزنتر بێ! بەهەمەحاڵ دڵسۆزیی ئەو ئافرەتە بۆ مندالانی خاوەن ئەو ماڵەی لێی دەژیا چ پێوەندی نەبوو بە کاری وەها بەدەوە. مەسەلەی «هان دان» ـەکە پاکانەی بۆ ئەو ئافرەتە کرد و هەتا دوای دەیان ساڵ مرد، بە ئاسایی و بێ سەرشکێنی کردن ژیا.

خەیاڵێکی منداڵی و ساوایی سەیر، ئەم ئافرەتەی بوختانکەر، لەگەڵ ئەوەدا کە لەقەبی «کەچەڵ» ی پێوە بوو، وەک دواتریش بۆم ڕوونتر بۆوە هەر دوو چاوی بەڵغێکی لەسەر بوو وەک تانەیەکی تەنکی شین، بۆ بەرچاوی منداڵیم جوانترین مێینەی شارەکە، با بڵێم گەڕەکەکە خۆی دەنواند.

لەو تەمەنەدا جارێ هەستی فەرق کردن بە مێ و نێر لەلایەن زایەندەوە لە مندا نەڕسکابوو هەر ئەوەندەم دەزانی ئەمە پیاوە و ئەمەش ژنە. ئنجا تۆ سەیری کەس نەمێنێ ببێتە نموونەی جوانیی مێینە کۆنە کەچەڵێکی تانەدار نەبێ، ئەمما ئەگەر لە بەژن و باڵا بدوێیت ئەشەدوبیللا هەرچی ڕێکی و شلکی و شۆخی بێ پێوەی دیار نەبوو، لەوە هەر بگەڕێ کە جلوبەرگی وەها ناقۆڵای لەبەر دەکرد، ئەگەر بە بەر ڤینۆسەوە بوایە بە لای پەتیارەییدا دەبردەوە. چاک بوو خوا ڕەحمی پێکردم ئەم زڕە بەهەڵەداچوونە لەگەڵم فراژی نەبوو، زوو لە سەهوەکەم دەرچووم. تا ساڵەهای دوور و درێژیش شەرمم دەکرد ئەم ڕازەم بدرکێنم و بڵێم فلانە عیفریت بووکی خەیاڵی ساواییم بوو. بەڵام دەبێ دان بەوەدا بهێنم کە ئەم خوولیایەی شەیدابوون - ئەگەر تەعبیرەکە زیادیی تێدا نەبێ - بۆ باری پێچەوانە هەر لە ئاست ئەم ئافرەتە لێمی بەدەر نەدا، زۆر جاران وەها دەبوو دڵم شتێکی پەسەند دەکرد کە لە دەست هاوڕێیەکمدایە گەلێک بەرەژێرترە لەوەی خۆم هەیەتم، یان کەڵەبابێکم بە قارەمان دادەنا کە لەبەر زۆر کەڵەبابان هەڵدەهات، هەر جارەش بە هانەیەکی خۆتەفرەدەرم دەدۆزیەوە بۆ ئەوەی ماوەیەکی دووروردرێژ پەنجە لە سەهوەکەم گیر بکەم و لەزەتی لێ وەرگرم.

یەکەم جارە ئەم ڕازە دەدرکێنم زۆریش لەگەڵ خۆمدا لێکدانەوەم کردووە بۆ دۆزینەوەی هۆی مەیلی وەها نالەبار لە تەمەنی ساوایی و منداڵیمدا، بێ ئەوەی بگەم بە هیچ ئەنجامێک. لە کەسیشم نەپرسیوە ئایا وەک من مەیلی ئەوتۆیی هەبووبێ، چونکە هەتا مەیلەو ناکامڵ بووم شەرمم دەکرد منداڵیی خۆم بە ئاشکرا کردنی ئەو مەیلەم لەبەر چاوی برادەر دزێو بکەم، دواتریش مەشغەڵەتی گەورەتر بۆ خۆی دزیمەوە. پشکنینەوەی شتی ئەوتۆیی پتر بە لای کاری «زانای نەفس» دا دەچێتەوە هەرچەند قسە لێوە کردنی لەلایەن هەرکەسێکەوە بێ هیچ زەرەری تێدا نییە بگرە لەوانەیە سوودیشی هەبێ، بەڵکوو خواوڕاستان بە وتوێژ و لێکدی بیستنەوە گرێیەکی دەروونی بکرێتەوە!

بچمەوە بۆ لای ئەو دەستوپاوەندانەی لە منداڵیمدا یارمەتیدەریماڵەکەمان بوون. لە پێشەوە دەبێ ئەوە بڵێم بەر لەو ساڵانەی دوایی عادەت نەبوو ئافرەتی یاریدەر بە مانگانە و مزەی قەرارداده خزمەت بکات. کوردی زاراوەیەکی هەیە دەڵێ «نان و زگ» کە بریتییە لە خواردن و لەبەرکردن و ناوناوە خەرجییەکی سووک، ئەمە بوو مزەی ئافرەتێکی بکەوتایە ماڵی بێگانە. بەڵام وەنییە هەموو جاران ئەو ماڵانەی ئیشکەری ئافرەتیان دەبێ وەکوو یەکدی بن لە نەوازشت و بەخشندەیی.

زاراوەیەکی دیکەی کوردی هەیە لێرەدا جێی خۆی دەکاتەوە، دەڵێن «فڵانە کەس سایە چەورە» بێ دوودڵی و بێ گومان و بێ خۆهەڵکێشان، ماڵی ئێمە لە قەدیمەوە سایە چەور بووە، چونکە هەم بە بەریەوە هەبوە ئەو خەڵقەی دەوری لێ دەدەن بە گرد و کۆییەوە خەریک بن، هەم حیسابی حەسقێلیشی لەگەڵ کەسدا نەکردووە. ئافرەتێکم نەدیتووە هاتبێتە ماڵمان و مابێتەوە نەبووبێتە خاوەن جلک و بەرکی زۆروزەبەندەی بایی گیازی بووک بکات، وەیا پتر لەوەی پێی دەڵێن «لەقەدەرحاڵ» چەک و خشڵی پێکەوە نەنابێ وەیا دەسمایەی کەساباتی لە پریسکەدا نەبووبێ.

ڕاستییەکەی ئەگەر هاتبایە ماڵێکی وەکوو ماڵی ئێمە مانگانەی بەو کۆمەڵە ئافرەتانە بدایایە کە هەمیشە لە گەڵماندا دەژیان، دەبوو بکەوێتە سواڵ و سەدەقە، ئیشزۆری و بەرپرسیاربوونی گەلێک لایەنی بە ئەرک و ناچاربوون بە هەڵگرتنی قورسایی باری نالەباری کۆمەڵایەتی وەهای دەکرد کە ماڵەکەمان سەرەڕای ئەوەی هەمیشە 4-5 ئافرەتمان لە ماڵدا هەبێ، جگە لە دایک و پوور و کیژ، دەبوو بۆ نان کردن و

ساوار کوڵاندن و زۆر کاری دیکەی ئەوتۆیش لە لاوە ئافرەتی دیکەی یاریدەدەر بێن و جێبەجێی بکەن.

لە لایەن یاریدەدەری پیاوەوە، ئەم کەسەی وڵاغی دەگێڕا چ بۆ دارهێنان بێ لە شاخەوە و چ بۆ کاروانچییەتی بێ، مانگانەی هەبوو لەگەڵ جلوبەرگی ساڵانە. ئەوانی دیکە مزەی قەراردادەیان نەبوو بەڵام هەمیشە پۆشتە بوون و خەرجییان ناوناوە دەدرایێ، خۆشیان مەودای مامڵەت و کەسابەتیان لە پێش ئاچووغ بوو چونکە پێوەندیمان بە دەشتودەر و کرمانجەوە ڕێی بۆ دەکردنەوە پتر لە بابایەکی لاوەکی لە سەلەم و کڕین و پێفرۆشتنەوە و ئەو جۆرە مامڵەتانە سوودمەند ببن.

خولاسە ئەگەر بۆ خۆشمان لایەنی ئابووریمان لە سەغڵەتیدا بووبێ یاریدەدەرکانمان هەمیشە تێروتەسەل بوون، خۆ ئەگەر ئێمە تێر باین ئەوان تێرتر دەبوون.
یاریدەدەرێکی هەرە کۆنی بەبیرم بێتەوە ناوی «مام ئەوڕەحمان» بوو، مووی ماش و برنج بووبوو، کورتەباڵای ئەسمەرەی مەیلەو گرژ و عەسەبی بوو بەڵام هەتا بڵێی ڕوحسووک بوو، کەسیش لەو عەسەبیەتەی زویر نەدەبوو. سێ گوێدرێژی دەگێڕا بە دارکەری و کاروانچیەتی و سەردانی مڵکان و گوێزەی دەغڵ و مێوە و شتی دیکەش. وەک دێتەوە بیرم کە جارێ زۆریش منداڵ بووم، دەلوو تەبیات بوو.

جارێکیان یەک لە پیاوەکان مریشکێک سەر دەبڕێت. پووری گەورەم دەکەوێتە شوبهە لەوەی کە بەپێی شەرع مردار بۆتەوە. چەندی دەکەن لە قسەی خۆی لانادا. ئەهلی مەتبەخ پێیان خەسار بوو مریشکی وەها قەڵەو و ناسک فڕێ بدرێ، کوڵاندیان و لێیان نەخوارد، هەڵیان گرت هەتا مام ئەوڕەحمان لە داران هاتەوە... کە نانیان لە پێش دانا ڕان و سنگە و قاڵچەی تەواوی مریشکی بەسەرەوە بوو. گوتبووی بە خوای ئەو ماستە مووەکی تێدایە ئەما وەڵاهی هەزار مووی تێدا بێ دەیخۆم. مام ئەوڕەحمان نوێژی نەدەکرد. جارێکیان ماڵ لە چنارۆک بوون، لە کۆیە بەرە ئێوارە دەگەڕایەوە، کە گەیشتە سەر کانی تووەڕەش و وڵاغی بەردانە ئاوخواردنەوە پێیان گوت ئەگەر نوێژی عەسر بکا دوو ئانەی دەدەنێ، ئەویش بە مامڵەتەکە ڕازی بوو خێرا دەزنوێژی شووشت و نوێژەکەی کرد کەچی لێی پەشیمان بوونەوە و پارەکەیان نەدایێ، ئەویش پێی گوتن، وا تێ دەگەن فێڵتان لێ کردووم، دەنا بە حەقی قورئان دەمزانی لێم لە فێڵن ئەمنیش نە فاتحە و نە تەحیاتم لەو نوێژەدا نەخوێندووە. ڕۆیشتنیشی لە ماڵمان وەکوو خۆی سەیر بوو، سبەینەیەکی

هاوین یاعیفەتی خوشکە گەورەم دەبینێ، مام ئەورەحمان لێفێکی هیزاری لەسەر خۆڵ ڕاخستووە یەکێکی جانگیشی بە خۆیدا داوە، ئەویش پێی دەڵێ دەبوو جانگەکە ڕابخەی و هیزارەکە بە خۆتدا دەی، لەوەوە وەها تۆرا سوێندی خوارد کە یەک دەقیقەی دیکە لەو ماڵە بەسەر نەبا. لەوە بەولاوە مام ئەورەحمانم نەدیتەوە.

یەکێکی دیکەی زۆر کۆن لەو پیاوانەی خزمەتی باوکمیان کردووە ساڵحی مام عەلاو بوو. ئەم مرۆیە وەها دڵسۆز و وەفاکار و بە ئەدەب و لێزان بوو لە خزم خزمتر حیساب دەکرا. لە حکوومەت وەزیفەی «مباشر» ی مەحکەمەی هەبوو، ئەوسا باوکیشم قازی بوو ئیتر ساڵح شەو و ڕۆژ هەر لە خزمەتیدا بوو. لەگەڵ لێهاتووییدا خوێندەواریش بوو، یەکێکیش بوو لەو حیکایەتزانانەی دەم و ئارداوێژیان بە تام بوو. لەوەوە شەوانی زستان دوای بەسەرچوونی دەمی دیوەخانە و پیربوونی دانیشتنی دووەمی خزمە نزیکەکانی وەکوو مامم و مەلا عیززەت لای باوکم کە هەمیشە بە شێوەیەکی شیرن و بەتام، چ لەلایەن قسەی خۆش و نوکتە و سوحبەتەوە بێ و چ لەلایەن شەوچەرەوە بێ، ڕادەبوێردرا، ساڵح ڕادەسایە حیکایەتخوانی هەتا باوکم دەچوە خەو. ناوناوە ساڵح هەستی ڕادەگرت بزانێ باوکم خەوی لێ کەوتووە یان جارێ بە خەبەرە، ئنجا ئەگەر بەدەنگ نەهاتبایە ئەویش دەچوە سەر باری نوستن، واش دەبوو باوکم دەیگوت ئێی سالی (زۆر جار پێی دەگوت سالی لە جیاتی ساڵح) دێوی ڕەش چی کردووە؟ ئیتر ئەویش دەکەوتەوە سەر حیکایەتخوانیەکەی.

گەلێک شەوان دانیشتنەکەی دووەمی ئەو کۆمەڵەی لای باوکم دەمانەوە بە خوێندنەوەی داستانەکانی ئەسکەندەرنامە و ئەمیر ئەرسەلان بەسەر دەبرا. وەها دەبوو کە گەیشتمە تەمەنی گوێ گرتن لە حیکایەتی بە سەروبەر شەو لای باوکم دەخەوتم. لەبیرمە جارێکیان ساڵح سەرگورشتەیەکی خۆشی دەگێرایەوە سێ قارەمانی تێدا بوون یەکیان دەریابڕ، ئەوی دیکەیان ئەستێرەشناس، ناوی سێیەمیانم لەبیر نەماوە. ساڵح گوتی، دەریابڕ موویێکی خۆی خستە ناو بەحرەکە و بەحری وشک کرد. باوکم بەدەنگ هات و گوتی دەک زارخۆش سالی، درۆ وەها نەبێ بەکەڵک نایە. ساڵح بەینێک بێدەنگ بوو تومەز بە ئەسپایی لەبەر خۆیەوە پێکەنینی دەهاتێ شەرمیشی دەکرد ئاشکرای بکات.

لە خوێندنەوەی داستانەکانی فارسی مامم سەرپشک بوو، وەها بە گەرموگوڕی و بە شارەزایی و بەپێی نەبزی ڕووداو دەنگی خۆی دەبزاوت ڕوحی بە بەر داستانەکان

دەهێنا. گەلێک جار کە دەگەیشتە بڕە شیعرێک بە ئاهەنگ دەیخوێندەوە شەوقێکی دەخستە ئەو دانیشتنە و داستانە و گوێگرتنەوەوە خەڵقەکە شەو و ڕۆژی لەبیر دەچۆوە. یەکێک لەو بڕە شیعرە فارسییانەی کە لەوساوە نەقشبەستووی زەینم بووە ئەمەیە:

ای همچو گل سرخ شکفته رویت
وی همچو گل بنفشه اید بویت

ما همچو گل زرد دعاگوی توایم
تا همچو گل سفید گردد مویت

ئەی ئەو کەسەی وەک گوڵی سوور ڕووت پشکووتووە
وەی ئەو کەسەی وەک گوڵی بنەوشە بێنت دێت

ئێمە وەک گوڵی زەرد دوعاگۆی تۆین
تا مووەکانت وەکوو گوڵی سپییان لێ دێت

مامم دوای مەرگی خێزانی، فاتمەخان، لە 1939 سەری بەسەر ئەو داستانەدا نەگرت.ساڵح جارێ لای باوکم بوو ژنی هێنا. لەوە بەولاوە ناوناوە لە ماڵی ئێمە دەنوست و ناوناوەش دوای بەسەرچوونی کژی دەیوەخان دەچۆوە ماڵەکەی خۆی، سبەینانیش لەگەڵ بەخەبەر هاتنی ئەهلی ماڵ ئەو دەگەیشتەوە لامان.

لەو دابەی کە پیاوەکانی دیکەش لێی فێر بووبوون ئەوە بوو کە لە دیوی ماڵێ جۆرەک ڕاوەستان ڕادەوەستا هەر لەو دەوەشایەوە، هەرگیز ڕووەو باوکم نەدەبوو، لە پەنا سووچی دیوارێکی ئەو شوێنەی باوکمی لێ دادەنیشت ساڵح وەها ڕادەوەستا کە لاشانێکی لە باوکمەوە دیار بێ هەتا مەعلوم بێ حازریشە و نادیاریشە. ئەگەر ڕاوەستانەکەی درێژی خایاندبایە بێ ئەوەی باوکم داوای ئیشێکی لێ بکات یەکێکی دیکەی لە پیاوەکان لەو جێگایەی خۆی ڕادەگرت بەو ئسووڵە کە خۆی دایناببوو تاکوو دەچوو جغارەیەکی دەکێشا و ئاوێکی دەخواردەوە بایی جغارەکێشانەکەیش دادەنیشت بۆ حەسانەوە.

ساڵح لە پێشخزمەتیدا بۆ ئەو سەردەمە بێمانەند بوو، لە دەمی قەڵەباڵغبوونی مەجلیسی باوکم، بە درێژایی کات سەرپەرشتیی پێداویستی مەجلیسەکەی دەکرد، هەر خۆیشی سەروبەری چایە لێنان و سەماوەر گوێستنەوە و چایە تێکردن و تاقم ڕێک خستنەکەی دەکرد و کە دەستوپاوەندی میوانەکانی باوکیشم، لە ڕۆژانی سەردانی حەویزی و غەفورییان لە باوکم، بەکۆمەڵ لەگەڵ ئاغاکانیان دەهاتن ساڵح مەجلیسی ئەوانیشی ڕادەهێنا و جغارە و چایە و ئاگری زستانان و بەفراوی هاوینانی بۆ سازدەدان و وەک پەروانە لە عەیببڕینی خزمەتی ئەو خەڵقە دەکۆشا و دەجۆشا.

هەر لەبیرمە چۆن بە منداڵی حەزم دەکرد شەوان ئەو قەڵەباڵغیە ڕوومان لێ بنێن چونکە لە شەودا پف لە سەماوەر کردن گەشەدارتر بوو. ساڵح لەو پف لە سەماوەرکردنە وەها شارەزا و دەستەڵاتدار بووبوو کە بەدەستی ڕاستی قوریەی لەسەر هەڵدەگرت و پەنجە و لەپی چەپەی دەکردە بازنە بە دەوری زارکی سەماوەرەوە و لە قووڵایی سییەکانیەوە ئەو پفە بەهێزەی لە دەروونی پڕ ئاگری ئاتەشخانەکە دەکرد یەک لوولە بڵێسە و هەزاران پریشک و گەردەلوولێک لە خۆڵەمێشی پۆلوە ئاگرەکان بە بن و نێوان کونەکانی پەنجەرەڕەنگی ژێر ئاتەشخانەکەدا بە قرچ و هۆر ئەو دەوروبەرەی دادەگرت، یەک دیمەنی وەها جوان و ڕەنگینی بە بەرچاودا تێدەپەڕاند کەوا بە دڵ چاوەچاوی ئەو دەمە دەبووم جارێکی دیکەش ئاگری ئاتەشخانە کزبێتەوە و خۆڵەمێشی لێ بنیشێ و ساڵح پفێکی پێدا بکاتەوە...

بێ گومان و بێ مەبەست دەڵێم هەرگیز نەمدیت کەس بەقەدەر ساڵح بەدەوری سەماوەرەوە شیرن بێ. گەیاندنی سەماوەرەکەش لەماڵەوە بۆ دیوەخانە خۆی لە خۆیدا کارێکی ئەستەم بوو، کە چایە پێ دەگەیشت و ئاوی سەماوەر دەکەوتە کوڵ، ساڵح بەدەستی ڕاستەی قۆریەیەکی عەجەمی گەورەی دیوەخانەیی پڕ لە چایە هەڵدەگرت و دەبوو پەنجەش لە قوڵپی ڕاستەی سەماوەرەکە گیربکات و دەستی چەپەشی قوڵپی چەپە بگرێت و ئەو قوریە و سەماوەرەی پڕ لە چایە و ئاو بە قورسایی خۆیانەوە بەرز بکاتەوە تا لە کەمەری تێ هەڵدەکشێت و بە پێپلکەی قادرماندا سەرکەوێت و پێچەدەورە لە بانێکی 70-80 مەتری بکات و بەخێرایی و هەنگاوی لەسەر یەک و ڕێک، بە سەلامەتی، بارەکەی بگەیەنێتە مەجلیسی پیاوان. پێی کەمایەتی بوو، ئەو قوریە قورسە بە یەکێکی دیکە هەڵگرێت. سەماوەرەکە مابوو

له ماڵمان و هاته بەغداش لەگەڵمان، هەتا دووسێ مانگ پێشی ئەم نووسینە 28/7/1985 لە هیچە و بێسەبەب دۆڕاندمان، من لە سەفەردابووم، نەجیبەی خوشکم بەعادەتی خۆی لە کۆیێ لە ماڵی کاک مەجیدی ئامۆزام بوو، محەمەدی کوڕم وەتەنگ دێت لەو هەموو ئەسبابی شڕە و بێکەڵکەی لە ژوورەکان و لە سەربانان و لەسەر قادرمان کەڵەکەیان کردووە و هەرەوەزی لێکردن و هەمووی ڕاگوێستن بۆ بەردەرگەی ماڵەوە تا ئۆتۆمۆبێلی «امانة العاصمة» کە لێی نووسراوە «اعتن بنظافة مدینتک» هات و کۆمەڵە شڕەی بارکرد. کە من گەڕامەوە بەغدا ماڵەکەمان پاک کرابۆوە، لەو بەینەش خەبەر گەیشتە کۆیێ کە وا خەریکی ماڵ پاک کردنەوەن لە بەغدا ئیتر بە هەڵەداوان نەجیبەی خوشکم تەلەفونی بۆ کردم ئاگاداربم لەوەی ئەو سەماوەرە بەنرخە و مێژووییە لەگەڵ شڕە فڕێ نەدرێ. بەڵام بەداخەوە کار لە کار ترازا بوو، سەماوەر بۆ زبڵخانەی «مدینة السلام» ڕاپێچەک درا بوو.

لە فەقەرەی سەماوەران ئەمە دوەم جارە دەچینە خەسارێ، سەماوەرێکی دیکە زەردی مامناوەنجی لە ماڵمان هەبوو بە ئەسڵ لە حاجی بەکراغاوە بە میراتی کچێکی کەوتبوە لای ئێمە. وەها ڕۆییشتبوو کە ئەمە یەکەم سەماوەرە هاتۆتە کۆیێ. دیسان بەداخەوە ئەویش بە جۆرێکی کە نازانم چۆناوچۆنی بوو، فۆتا و ون بوو...

مام عەلاوی باوکی ساڵح، کەرکووکی بوو لە کۆیێ نیشتەجێ بوو، دوو کوڕی دیکەشی هەبوون، محەمەد و ڕەفعەت بە زۆری ژیانیان لە دەوری مەحکەمە بە عەرزوحاڵنووسین بردەسەر و پێوەی دەژیان. ساڵح لامان بوو تاکوو باوکم لە قازییەتی بوو، ئەوساش ساڵح داوای کرد واز لە وەزیفەی موباشیری بهێنێ، باوکم لێی نەسەلماند و لەسەر وەزیفەکەی خۆی هێشتەوە بەڵام پێوەندیی پێمانەوە هەرگیز نەپچڕا. دواتریش کە من گەورە بووم برادەرێکی نزیکم بوو هەتا بشڵێی خۆشم دەویست و لێی ئەمین بووم. ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕووی نەدا بایی سەری دەرزی دڵم گەردی لێ بگرێ. هاوینان لە چنارۆک سەردانی دەکردین بایی ئەوەی بتوانێ ئیجازەی بۆ وەربگرێ لە مەحکەمە. داخم ناچێ دووچاری نەساغیی سیل بوو و لێی ڕزگار نەبوو... دوای خۆی ماڵ و منداڵی چوونەوە کەرکووک، کوڕە گەورەی ناوی عیززەددین بوو، ڕێک نەکەوتەوە دوای ڕۆییشتنیان بۆ کەرکووک بیبینمەوە. لەگەڵ ساڵح کوڕە پوورێکی خۆی، حەمەدەمین، خزمەتی باوکمی دەکرد. نەختێک گوێی

گران بوو ناوناوە لە وەڵام دانەوە دەوەخرا لەبەر نەبیستن، ئەویش لە سنووری دەسەڵاتی خۆی هەموو ئاکارەکانی ساڵحی پێوە دیار بوو. ئەمیان زۆر بە جحێڵی مرد.

عومەر پووربەگی لە منداڵییەوە، بەر لەوەی منیش هەبم، بەهۆی دایکییەوە کە دانیشتووی گەڕەکمان و لە ماڵی «یاخەجیج» ئامۆزای باوکم دەژیا، پێوەندی بە ماڵی ئێمە و ماڵی مامەوە هەبوو. یەکەم دیمەنی کە بەبیرمدا دێتەوە ئەوەیە کە مامزی بۆ کاک موقتەدیر بەخێو دەکرد و بەزۆری لەگەڵ ئەودا بوو. مامزەکە وەها ڕسکاربوو، لە عومەر بەولاوە، کەس نەیدەوێرا لێی نزیک بێتەوە، بەڵام وەکوو تووله بەدوا عومەر دەکەوت و لێی جودا نەدەبۆوە. ئەگەر عومەر بۆ کارێکی بەلایەکدا ڕۆییبا، مامزەکەی بە پەتێکی ئەستوور لە لەوحەداری گەورە یان لە سینگی مەحکەم دەبەستەوە، دەنا کەس نەیدەوێرا سەر دەرێنێ لەترسی ئەو دوو قۆچە تیژە و شان و ملی وەک گاجووتی. زۆر جاران کە تینی دەدایە خۆی، لەوحەداری بەدوا خۆیدا ڕادەکێشا و وەک گامێش دەیمرقاند. کاک موقتەدیر بەزۆری کە بانکی عومەری دەکرد بە عادەتی قسە نەستەقە شەقوپەقەکانی خۆی دەیگوت، عومەریلان برای گوجیلان داکی پشیلان.

پووربەگی، دایکی عومەر، لەکوردستانی تورکیاوە لەگەڵ مێردەکەی «هیدایەت» ناو، کەوتبوە کۆیێ، ئافرەتێکی کورتیلە خڕ بوو. لەهجەی لە ئاخاوتندا شێوەیەکی سەربەخۆی هەبوو، لە هیچ لەهجەیەکی کوردیی بیستراوی نەدەکرد. سەرەتای قسانی لەجیاتی «دەڵێم» بە «ئەبێم» دەستی پێ دەکرد وەکوو ئاخێوەری خۆشناوەتی. بە ئاوریشمی دەگوت ئارمووش. شەوێکیان دز پارێز بۆ ئەو ماڵە دەبا کە پووربەگی لێ بوو. کژ هاوین و خەڵق لە سەربانان بوون، پووربەگی لێی بەخەبەر دێت و دەنگی دەدات دەزش هەڵدێ. دواتر گوێم لێ بوو حیکایەتی بۆ خەڵقەکە دەگێڕایەوە و باسی دزەکەی دەکرد دەیگوت: «ئەی ڕو، ئی دە زلە بوو». ئێمەی منداڵ ئەوسا نەمان دەزانی «ئی دە زلە بوو» واتای چییە پێمان وەها بوو ئەویش شێوە مەتەڵە لەوانەی زمانی پێ تاقی دەکرێتەوە وەکوو «ئەوبەڕە شڕەی لووس ڕایەخە» یان قسەی بێواتای وەکوو «فسنستنبکتکنفتموها» ی ناو فەقێیان یان لە گەپی شەوانە کە دەگوترا «گەنمە نە دوو دوو دوو برنجە دوو دوو دوو»

ئەو «دوو دوو» ەش وەها دەردەبڕا وەک کە لە کاتی دان ڕۆکردن مریشکی پێ بانگ دەکرێ.

پووربەگی زۆر حیکایەتی کورتیلەی بۆ دەکردین چ سەرگورشتە بایە و چ باسی ژیان و سەفەری خۆی و مێردەکەی و عومەر بایە لە ماردین و خەرپووت و ئەو شوێنانە بە مووسڵ و هەولێردا بۆ کۆیێ. کە گەیشتمە تەمەنێک سەرەدەری لە جوگرافیا بکەم پێم وابوو پووربەگی کە دەڵێت «لە شەتی مراد پەڕینەوە» سەهوو لە ناوی «فرات» دەکات کە چی «مراد» خۆی بەڕاستی کەرتێکی فراتە. لەو حیکایەتە کورتیلانەی بۆی دەکردین ئەوەندەم لە بیر ماوە کە کەڵەباب و مێروو لەسەر پەنیر بە شەڕ دێن و کەڵەباب دەندووک لە چاوی مێروو دەدات و زەدەی دەکات، شەرع دەبەنە لای کوندەبوو، مێروو شکاتەکە دەکات و دەڵێ، کوندی لەسەر سندی، ئەویش دەڵێ: جێگەمە. مێروو دەڵێ: شەرعان دەپرسی؟ کوند دەڵێ: پیشەمە. مێروو دەڵێ: ماڵم ماشت. پێی دەڵێتەوە خاوێنت کرد. مێروو دەڵێ: سەلکە پەنیرەکەم دیتەوە. دەڵێ: ماڵداریت کرد. مێروو دەڵێ: لە بن تلیانەیەکەم دانا. دەڵێ: تاقەتیت کرد… لەوە بەولاوە چی دیکەم بە بیر نەماوە و نازانم کەڵەباب و مێروو چۆناوچۆنی لەو شەرعە بوونەوە.

دەیانگێرایەوە کە عومەر تازە لەبەر خوێندنی مەکتەب داندرابوو، شەوێ موتاڵای دەرسەکانی دەکرد و درێژەی دەدایێ، دایکی بە لەهجەی خۆی پێی دەگوت: ڕۆڵە حومەرە خەتەکی وێرا بینە و یەکی وێرا بینە و چرایەکە وەکوژێنە. دایک لە خەیاڵی نەوتی چراکە بوو بەخەسار نەچێ، چاکیش بۆ چووبوو، چونکە عومەر لەوانە نەبوو بە خوێندنەوە دابین بێ. مەخلووقێکی بزۆزی ناڕاحەت بوو هەرچەند لە دوو خاڵەوە زۆر بێعەیب بوو، هەتا بڵێی دەسخاوێن بوو، قەت بەدزیەوە دەنکە ترێیەکی نەخستۆتە زاریەوە. هەتا بشڵێی لە ئەمر و گوێدا بوو، لە ڕووی لە خۆ گەورەتران هەڵنەدەگەڕایەوە. کەتنێکی کرد...هەڵات بۆ پژدەر، دوو سێ ساڵان لە سندۆڵان لای شێخ حەسەن و شێخ حوسێن مایەوە. دوای ئەوەی کەتنەکەی لێ بەسەر چوو هاتەوە. عومەر بە شێوەی پژدەر دەئاخاوت، ئەو لەهجەیە لەگەڵیدا ژییا تا مردن بەڵام وردە وردەیەکیش بە لای ئاخاوتنی کۆیەدا دەهاتەوە.

پووربەگی بڕیاری دا ژن بۆ کوڕی بهێنێ، کچێکی ڕووسووری، هەتا بڵێی بە حەیا و بێدەنگ و بێ سرکە و کورکەی بۆ هێنا. شەوێکیان دەوری نوێژی عیشا کۆمەڵە

ژنێکی گەڕەکی خۆمان و لەشکرێکیش لە منداڵی ئەو ناوە، منیان لەگەڵدا، چووین و لە گەڕەکی قەڵاتەوە بووکمان گوێستەوە بۆ عومەر.

ئێستاش نازانم چۆن وەها ڕێکەوت یان کێ وەهای ڕێک یەخست هەر کە بووک پێی لە دەرەوەی ماڵەوەی نا و کەوتە نێوان ئافرەتانی گەڕەکەکەی خۆمان، ئەو هەموو منداڵە بە چەپڵەڕێزان تێیان هەڵکرد، ئەمما چۆن تیهەڵکردنیک «هەتلیلینجان هەتلیلینجان، زاوا کەچەڵ بووک باینجان...» یەک بین و یەک نەوا ئەم چەپڵەکوتانە و دوڕقەڵێشییەی بەخێرهێنانی بووک بەردەوام بوو هەتا بووکمان پەستایە ماڵە کاولەکەی مێردە ناموبارەکەکەی. دەسا نە ئەو دەمە و نە هیچ وەختێک و نە ئێستاکەش زانیم مانای چی، هەتلیلینجان! ئەرێ ئێوە کەستان دەیزانێ؟

داستانی عومەر کۆتایی بۆ نییە، لەکورتی دەیبڕمەوە و دەڵێم، عومەر مرۆیەکی دەسخاوێنی، تەنبەڵی، درۆزنی، بە وەفا و مردەی ولاغەبەرزە بوو. لە نموونەی شەیدابوونی بۆ سواریی ولاغەبەرزە لە نێو چەندین نموونەدا ئەمەیان بۆ خوێنەر دەگێڕمەوە، جارێکیان، سەرەتای هاوین بوو مامم عومەری نارده پێبازۆک بۆ لای مام سلێمانی وەکیلی خۆی کە هەندێک دەغلی بۆ بفرۆشێ و پارەکەی بۆ بنێرێ بە عومەردا. کوڕی گۆنگەران کاکە عومەر یەکسەر چووە لای کوێخا محەمەدی کوێخا پێبازۆک و سەلامی مامی پێ گەیاند و گوتبووی کاکم (مەبەستی مامە) منی ناردووە بۆ لای تۆ ئەسپە بۆرەی بۆ بنێری، سەفەری پژدەری هاتۆتە پێش لە خزمەت کاکیدا و زۆریش بە پەلەیە ئەگەر ئەمڕۆکەی ولاغ نەگەیەنمێ بەجێ دەمێنێ.

کوێخا محەمەدیش پیاوێکی بە ڕێوجێ و ئەوسا خاوەن ئەسپ و ماینی نایاب بوو، گوتبووی عومەر، دەبوو بۆ جاری وەها ئەمنیش بە پیاو بخوێننەوە و لێم بگێڕنەوە ئەمما ئەوە ئەسپەبۆرە و حەز دەکەی بیتۆپێنە... عومەر لەوێوە بەسواری یەکسەر هاتەوە بۆ کۆیێ و لە هەمووی بە غار ئەسپەکەی هێنا، لە دەشتی «شەوگێڕ» هاتوچۆ بەئەسپەکە دەکات و بە ناو کێڵە قەبرانیدا تاو دەدات، کێڵێک بەینی هەردوو دەستانی شەق کردبوو. کە گەیشتەوە بەر دەرگەی ماڵی مامم ئەسپ لە خوێندا سوور بووبوو. مامم بەڕێکەوت ئەسپەکە و عومەری دیت بەر لەوەی لە دەرگەی دەرەوە بە ژوور کەوێ، زانی کاکە عومەر فەتحێکی کردووە نەیهێشت بێتە

ژوورەوە هەر لەبەر دەرگا لێی پرسی چی ڕووی داوە ئەویش بە ڕاشکاوی لە ئەنباری درۆیان لا گوڵمێک قسەی لووس و لیکی هەڵڕشت و گوتی: چوومە لای سلێمان هەر خۆیشی تێ نەگەیاندم ئەمنیش دەمزانی پارەت لزوومە چوومە لای کوێخا محەمەد و وەزعم تێ گەیاند گوتی لەو دەمەدا چ پارەم نییە کە وەهاش پەک لەسەر پارە کەوتبێ ئەسپەبۆرە قوربانی کاکە شێخ بی (مەبەست مامم شێخ نوورەددینە) با بیفرۆشێ، منیش لەسەر تەکلیفی خۆی بۆم هێنای. سەیر ئەوەیە، سەد کەتنی ئەوتۆیی دەکرد و لەبەر چاوان نەدەکەوت، ڕاستییەکەی بەدڵ دڵسۆز و جانفیدا بوو بۆ ماڵی ئێمە و ماڵی مامم... دواتر بوو بە پۆستەچی لە نێوان کۆیە و ڕانیە، مانگی وڵاغێکی سەکەت دەکرد، هەندەی وڵاغ بە پارەی پووربەگی کڕی ئیفلاسی پێ کرد- ناوناوە ناوماڵێکی دەفرۆشت. هەتا مردن نەی حەساندەوە، نەحەسایەوە.

یەکێک لەو چیهرە پاک و خۆشەویستانەی کە لەگەڵ یادکردنەوەی کزەم لە جەرگەوە دێت بۆ خۆی و مەرگی ناکامی، حەمەدی نەجیماغای غەفووری بوو، کەوا بێ ئەوەی (خوانەخواستە) ناوی خزمەتکاری لێ بێ، بە جان و دڵ خزمەتی باوکم و مەجلیسی باوکمی دەکرد. لە ماڵەوە وەکوو کوڕی باوکم حیساب دەکرا، چ تەقیە و پەردە لە بەیندا نەمابوو، ئەویش بە جۆرێک چالاک بوو لە جێبەجێ کردنی هەرچی پێویستی خزمەتی دیوەخانە و مێوان بێ دەتگوت خۆراکی گیانی خۆی جێبەجێ دەکات. بەر لەو کوڕێکی حاجی تەهای جیرانمان، کە ناوی ئەحمەد بووە و من بە بیرمدا نایەت و ڕەنگە پێش ئەوەی من پێ لەم دنیایە بنێم ئەو ماڵاوایی لێ کردبێ، ئەویش بۆ باوکم لەخۆبووردوو بووە بە جۆرێک کە چەندێکی باسی دەهات باوکم خەفەتێکی نوێی بۆ دەخوارد. حەمەدی نەجیماغا زۆر بە شلکی و جحێڵی جوانەمەرگ بوو. هەر لە هەوەڵەوە ڕەنگی زەردباوی نەساغیەکی نادیاری لە ڕوودا ئاشکرا بوو بەڵام کە من دەمدیت بەو جلە شیکە خاوێنەی لەبەری دەکرد و بەو ڕەوتی قەشەنگی جحێڵانەی و بەو هەموو نەزاکەت و نەجابەتەی کە بەخزمەتی باوکمەوە خەریک دەبوو نموونەی مرۆیەکی فریشتەئاکار بوو... سەد هەزار ڕەحمەت لە گیانی پاکی.

لە ناوتوێژی قساندا دەمەوێ بە خوێنەر ڕابگەیەنم، ئەو کەسەی بۆی ڕێک بکەوێت بە هۆی پێوەندی هەمەچەشنەی بە خەڵقەوە ژیانێکی بەسەروسەدا و هاتوبات و

ڕەنگاوڕەنگ و تێکەولێکە و بێنەوبەرە ڕاببوێرێ لە زۆر ڕووەوە جۆری بەسەر بردن و مامڵەت کردنی لەگەڵ بوونەوەردا جودا دەبێ لە کەسێکی بە باریکە ڕێگەی گوزەرانی خێزانییەوە لە چارچێوەی فەرمانی دەستوورە کورتەبەر و تەنگەبەر و تەسکپێوی (لەماڵەوە بۆ بازاڕ و لەوێوە بۆ مزگەوت و لە مزگەوتەوە بۆ بازاڕ و ماڵەوە) مەیدانی کۆمەڵایەتی تێپەڕێنی. مرۆی عادەتی کە باوکی دەمرێ خێرا لە دابەش کردنی میراتەکەی دەبێتەوە و دارێک بە نێوان خۆی و براکەیدا دەهێنێ و قۆزاغەی دوورەپارێزی بە دەوری خۆیەوە دەتەنێ و دەبێتە خاوەن چاکە و خراپەی خۆی تا ئەوەی ئەگەر هێلکەی مریشکی جیرانی بە هەڵە بکەوێتەوە ماڵەکەیەوە لە حیسابدا بەدەر دەداتەوە، هێلکە مریشکی ئەویش کە کەوتە ژێر مریشکی جیرانیەوە کەڵێن دەکەوێتە لێکدانەوەیەوە.

من هەرچەند لەوەتەی هۆشم بە سەختی و زەحمەتیی گوزەران شکاوە حەزم کردووە خاوەن کیسە و خەرمان و مشتاغی خۆم بم، هەمیشە ئەسیری وەزعێک بووم کە ملکی میراتیم لە حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی باپیرمەوە بە شەراکەتی هەموو جەلیزادان لە دەست و پێم ئالاوە، هەروەهاش باوکم ئەو زەحمەتییەی هەڵگرتووە. لە ملک بگەڕێ و بادەوە سەر وەزعی مزگەوت و فەقی و فەرمانی بەرباربوونی ئەرکی ئەو شتەی بە زاراوە پێی دەڵێن «براگەورەیی!!»...

لزووم نابینم بەدوا خورد کردنەوەی ئەو هەموو لایەنانەی کە موعادەلە نادروست و لەنگەربەزیوەکەی «ئەرکی زۆر و داهاتی کەم» بە مل بنەماڵەیەکی وەکوو ماڵی مەلای گەورەیدا دەهێنی بۆ ئەوەی لە خوێنەری ڕوون بکەمەوە کە باری وەها نالەبار لە ناو جغزی کەسب و گوزەرانێکدا کە سنووری پشکی خاوەنەکەی لە ملک و ماڵدا تێکەڵ بە حیسابێک بووە چ سەروبەری دیار نەبێ، گرفت و بەرهەڵست و دوژمنایەتیی جیرانی بەهێز و خاوەن عەشیرەت و چەکی زۆر بەنفوز لە حکوومەتییش بە درێژایی ڕۆژگار بینەقاقای حەسانەوە و هەناسە هەڵێنانی خۆشیی لێ گرتبێ. «اذا قمت من باغ عثرت بمعتدي» - احمد شوقی — لە زامێک هەڵدەستمەوە، لە دەسدرێژکەرێک هەڵدەئەنگۆم.

ئا لەو بارەدا کە دوژمنایەتی کردن لەسەر سالآنەی داهاتێک کە بەشی مەسرەفی نیو مانگت ناکا، ناچار بیت شەوانە پاسی ماڵەکەت بەو هێندە تفەنگە و بەو هێندە زەلامی پاسکردووی نەخەوتوو بکەیت... ئا لەو گۆنگەرە مزرەدا دەستەیەک لە ژن و

پیاو کە زاراوەی بێئینساف ناوی خزمەتکاریان لێ دەنێ بۆت جانفیدا بن و لە ناگزووری نەسڵەمێنەوە و ئەرکی قورست بۆ هەڵبگرن و یەخەشت نەگرن بە زەلیلگیری سەرت پێ دانەوێنن بۆ هیچ دڵخواز یان پێداویستیی خۆیان بەڵکوو لە خۆشی و ترشی ڕازی بن بەوەی هەمیشە دوای تێربوونی مێوان و ئەموئەو دەست بۆ پاروو درێژ بکەن. تۆ بڵێ مرۆیەکی یەک تۆسکاڵ ویژدانی هەبێ و هەستی مەردایەتی لە خوێدا شک ببات بە چ چاوێک سەیری ئەو لەخۆ بوردووانە بکات؟ ئەمانە «دەستوپێ و خزمەتکار»ن یان گرێی بڕبڕەی خانەوادەن؟

من هەروەک دەم دیت ماڵەکەمان لە سەردەمی باوکمەوە درێژەی دەکێشا بۆ گەلێک ماڵی دەر و جیران و کەس و ناسیاو تا ئەوەی نیوەڕۆیەکیان دیتم مەتبەخچی سێزدە منداڵ بە دەورەیەوە قاپ بە لەپ و پاروو لە زاران، لەوانەش تەنها یەکێکیان منداڵی ماڵی خۆمان بوو. هەروەهاش خزمایەتیی نەسەبی و جەلیزادەییم بە درێژایی هەموو ڕۆژگارم لە خزمانەوە پەڕیوەتەوە بۆ دەیان و پتر لە دەیان ژن و پیاوی دڵسۆزی بێعەیبی بێتەماعی خۆ لەبیرکردوو کەوا گەلێک بەولای خزمایەتییەوە مەیدانی یەک دڵی و یەک هیوایی و یەک بەرژەوەندییان بڕیوە لەگەڵماندا. کەسێکی ژیانی سادەی یەک ڕێگەی یەک ئاهەنگی، بێ لکوپۆپ و بێ ڕەگوڕیشەی بڵاو ڕابوێرێ، بە عادەت، عەیارەیەکی تەسکپێوی کەمقووڵایی بەکاردێنێ لە هەڵسەنگاندنی چاکە و خراپە و ڕەوایی و ناڕەوایی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان. ئینجا دەشێ بەو پەڕی ڕاشکاوییەوە بڕیار بدا دژی پەیدابوونی پێوەندیی نێوان خەڵق کە گەورە و چووکەیی و خوار و ژووری تێدا بێ. کەچی ئاگای لە خۆی نییە لە دەمی داخوازی بەرژەوەندا ڕازییە نازی کادری حیزبی و پۆلیسی سەرجادان و معاونی پۆلیس و قایمقام و حاکم و کوێخای گەڕەک و دەیان کەسی دیکە ڕابگرێ هەتا دەتوانێ دووکانێکی بچووکی نازانم چۆناوچۆنی بکاتەوە و دوو سۆبەی نەوت و سێ تەلەفزیونی تێدا بفرۆشێ...

ئاخۆ ئەو کەسە دەبێ چ بڵێ ئەگەر لە نزیکەوە ببینێ بابایەکی خۆم ئاسایی کە نە ئاغا و نە زۆردار و نە مڵکداری گەورە بووم لە موراجەعەی لادێییەکی مەیلەو بێگانە بە خۆم، بایی قازانجی ئەو دوو سۆبەیە و ئەو سێ تەلەڤیزیۆنەم بە ئەرکەوە بە قوربانی ئەو موراجەعەیە کردووە؟ من ناڵێم خەڵق هەمووی یەک ئاکار و یەک ڕەوشتە، من ئەوەندە دەڵێم، نابێ وەها بە سەهوودا چووبین کە لە سەری زمانەوە

هەموو پێوەندییەکی کۆمەڵایەتی تاوانبار بکەین هەر چونکە لەگەڵ پێوانەی قەناعەتمان یان فەلسەفەمان یان بەرنامەی حیزبمان ڕێک ناکەوێ، ئینجا پاشدانیش بە پێوەندیی وەها لەنگەربەزیوی چەوتوچوێر ڕازی بین کەوا لە چاو پێوەندییە کۆنەکان دەبێ بڵێین سەد ڕەحمەت لە کفندزی پێشوو!! بۆیە من کە دێم یادی ئەو مرۆ لە خۆ بوردووانە دەکەمەوە و حەسرەتیان بۆ هەڵدەکێشم سۆزێک دەمبزێوێ چ فەرقی نەبێ لەگەڵ ئەو هەستەی کە نەدیتن و نەبیستنی خوشکێکم لە ماوەی چواردە ساڵدا زامدارم دەکات.

ئافرەتێکی لەوانەی زۆر پێش چوونە مەکتەبم بە ماڵی ئێمە و ماڵی مامم ئۆگری گرتبوو ناوی «زێنەبی شەدەلار» بوو. ئەو ئافرەتە کە من گەیشتمە تەمەنێک دەرکی شتان بکەم دەتگوت لە هێوێنی دڵ فەراحی و بێغەمی و «دنیا گمرە و ربیع وموت مامش» خوڵقا بوو. هەر مەجلیسێکی ئافرەتان ئەو زێنەبەی لێ بایە پەستی و مونیی پێوە نەدەما. لە ماڵی ئێمە شووی کرد بە پیاوێکی خۆمان کە لە پلەی خزمایەتی دادەنرا. زۆر بەداخەوە. بەسەر یەکەم منداڵیدا جوانەمەرگ بوو. هەر لە ماڵی ئێمە... دکتۆر سەڵاح «سووریەیی» زۆر دۆستی باوکم بوو چی لە توانای بوو بۆ ڕزگار کردنی ئەو ئافرەتە بە خەرجی دا، تەنانەت بە دەستی خۆی بە عەمەلیەتی جەراحی منداڵەکەی بە مردوویی بوواند کەچی بێسوود بوو. ئەگەر بڵێم لەو ماوەیەدا کە ژان زۆری لێ کرد تا ئەو دەمەی دڵی ڕاوەستا، دکتۆر سەڵاح بە شکڵی دایم لە سەراسۆیی بوو ڕاستییەکی بێفێڵم گوتوە. ئەگەر لە ماڵی خۆی بایە هەرگیز ئەو هەموو پێوە خەریکبوونەی بەخۆیەوە نەدەدیت... لەبیرمە ئافرەتان وەکوو پوورەهەنگ تێی ئاڵا بوون و کە مردیش چۆن شینێکیان بۆ گێڕا.

لزووم نابینم چی دیکە بە سەربەخۆیی باسی تاک تاکی ئەو کۆمەڵە ژن و پیاوە بکەم، چەندی بە دەم گەشتی ژیانمەوە هەڵکەوت داخوازی لێ کردم بەپێی پێویست بۆ تاکتاکیان دەچمەوە.

دیمەنێکی ناپەسەندی ئەو دەمانەی کە جارێ نەگەیشتبوومە تەمەنی خوێندن، دواتریش بۆ ماوەیەکی بەمەودا بەردەوام بوو مەشقەڵی ئاگری خەرمانان بوو کە لە زۆر شەوانی هاویندا دەشتی کۆیەی دەکردە چراخان.

دوژمنایەتییە کۆنینەکەی نێوان حەوێزی و غەفووریيان لەو ساڵانەدا مەلا حەوێزاغای حەسەناغای غەفووری و جەلالاغای حاجی ئەسعەداغای حەوێزی بۆ خۆی تەرخان و خەریک کردبوو. بۆ منی منداڵ، کاری بەدی نادیاری خراپەی دوژمنایەتیی یەکدی کردنیان لەوانە نەبوون هەستیان پێ بکەم، ئەوەی سەرنجی چاوی نیوەبیناشی ڕادەکێشا «ئاگربازی» یەکەی خەرمان سووتاندنی شەوگار بوو کەوا جگە لە بڵێسە سوورە گەشە دووکەڵاوییەکانی، هەرچی ئادگاری دڕندەیی و بێڕەحمی و بێهۆشی هەیە پێوەی دیار بوو. هەموو شەوێک بەو کارە نافڕەجایەیانەوە زەرەرێکی قورسیان لە خۆیان و پتریش، لەو سەپانە هەناسە ساردانە دەدا کە ڕەنجی کژێکی کەسابەتی سەرلەبەریان دەچوە هیچە چونکە سەپان لە سەرەتای دروێنەوە خۆی و گوزەرانی لە قەبەڵ ئەو دەغڵە دەکات و هیچ داهاتێکی دیکە شک نابات بەتەمای بێت تا خەرمان هەڵدەگیرێن و کێشەی کایەکەشی تەواو دەبێت کەوا بەزۆری هەتا مانگی ئەیلوول دەخایێنی، لەوە بەلاوە سەپانەکە دەکەوێتە پەلەکوتکەی کەسابەتێکی دیکە، ڕەنگە دەستیشی نەکەوێ.

وەک لەبیرمە ئەو دوژمنایەتییەی نێوان حەوێزاغا و جەلالاغا تەشەنەی نەکرد بۆ هەموو بنەماڵەکە، بەڵکوو تەنها ئەو دوو کەڵەشێرەی لە یەکدی گیف دەکردەوە. هەرچی جەمیلاغای سەرۆکی حەوێزییان و براگەورەی جەلالاغا بوو نە تەبیایی لە هەرا و بگرەبەردە بوو نە وەزعی تایبەتی خۆیشی کە قایمقام بوو لێی دەسەلماند خەریکی شەڕەگەڕەکێ بێ. کاکە زیادی حەماغاش لە تەمەنێکدا نەبوو ڕابسێتە کاری وەها بەدئاکار، دواتریش کە چەپ و ڕاستی خۆی ناسی ڕێگەی ئەوتۆیی نەگرتەبەر، بە پێچەوانەوە بە لای بزووتنەوەی کوردایەتی و نیشتمانیدا بۆوە هەتا بوو بە یەکێکی ناودار لە کوردایەتی و لە ئاشتیخوازی (چەند جار نامەی بۆ هاتووە لە سەرۆکی بزووتنەوەی ئاشتیخوازیی جیهانی، نامەکان من دەمخوێندنەوە بۆی...) لەمەش بترازێ کاکە زیاد خوارزای جەمیلاغا بوو، مەلا ئەحمەداغای سمایلاغاش کە ئامۆزای حەمەغا بوو هەر زاوای جەمیلاغا بوو. لەوەوە دەماری ئەو پێوەندییە کاری دەکردە سەر ڕەفتاری هەر دوو لایان بەرانبەر بە یەکتر. بەرەی ماڵی سلێماناغاش (کە غەفووری بوون) بە براگەورەیی مەلا ئەحمەداغای سلێماناغا پتر ئاغای سەر بەرماڵ بوون تا ئەوەی وەکوو «دۆن کیشۆت» لەگەڵ (ئاشی با، یان ئاشی ئاگر) شەڕە شەپڵتە (شاپڵیتە) بکەن.

سەرت نەیەشێنم جووتە کەڵەشێری سەروپۆپنە بە خوێنی پەڕوباڵ فش هەڵماو لەو ناوەدا دوو ئاکتەری سەر شانۆی ئەو ئاگربازییە بوون بە خۆیان و دەستوپاوەندی خۆیانەوە. ڕاستییەکی ناتوانم لێرەدا وەڵامی پرسیارێک بدەمەوە لە خۆمی بکەم بڵێم، لەو دەمانەدا کە جەمیلاغا جارێ قایمقام بوو بۆچی بێتەرەفانە ڕاوەستا؟ نە یاریدەی برای خۆی دا نە بەرهەڵستیشی لێ کرد؟ توومەز کاری دنیا، کە ئادەمی بوونەوەرە هەرە چالاک و وریا و ژیر و بە سەهوودا چوویەتی، هەموو جاران بە بارێکدا ناخولێتەوە کە موعادەلەی 2+2=4 ڕای دەنوێنێ... لەبیرمە، دوای چەندین کژی خەرمانانی ئەو شەڕەدەندووکێیە، شەوێکیان هێشتان نوێژی عیشا نەبووبوو لە پڕ ئاسمانی لای خواروی کۆیێ وەکوو خوێن سوور هەڵگەڕا، کە ڕاست بووینەوە بۆ سەیر کردنی چۆنایەتی و چەندایەتی و هۆی ئەو ئاگر لە ئاسمان گەڕانە دیتمان بڵێسەی خەرمان زمانە دەکێشێ، بە جۆرێک مرۆ لە دوورەوە ترسی لێ دەکردەوە. لە دوورایی کیلۆمەترێک مەودا لە ماڵی ئێمەوە خەرمانێکی هەرە گەورەی لای حەوێزاغا کە هەموو داهاتی زەویەکانی نزیک کۆیەی لێ کۆکرابۆوە، ئاگردراوە.

ئەو شەوە بۆ ماوەیەکی درێژ شەوقی ئاگرەکە هەموو وڵاتی ڕووناک کردبوو تەنانەت چاو دەیدیت کە بەری شێخ بزێنیایەتیش پێی گەشاوەتەوە!! ڕێزە چیای هەیبەسوڵتان و باواجی هەر پێی دەویست قوتابی لێ بێت و دەوری دەرسەکانی لێ بکاتەوە چونکە حەوجە بە چرا نەبوو. بەڕاستی ماڵیان ئاوابێ، ئەو شەوە جووتە قارەمانی کۆیێ وڵاتیان لێ ڕوون کردبووینەوە، بەڵام کە خەرمان دامرکایەوە تاریکایی داهاتەوە، چونکە ئەوسا زۆری مابوو کۆیێ کارەبای لێ پەیدا بێ. زۆر بە سەیری، ئەنجام وەها بوو هەر دوو ئاغا، هەریەکەیان لە ڕووداوێک پێیەکی زەدە بێت و بشەلێت، هەر دەتگوت برای جمرانە بوون کە وێکڕا ناساغ دەبن و دووچاری هەمان نەخۆشی دەبن. خوا بیانبەخشێت و خزمانیشیان من ببەخشن لە گێرانەوەی بەسەرهاتی وەها تاڵ، بەڵام لە شیرین کردنەوەی ئەو تاڵاییە دەڵێم، سپاس بۆ خوا، شوێنی ئەو خەرمانە ئێستاکە بەر ئاوەدانیی شار کەوتووە و خانووی ڕێکوپێکی لێ دروست کراوە.

## ئاڵقەی پێنجەم

باسی قۆناغی ساواییم لەو چوار ئاڵقەیەی ڕابووردوودا بە کۆتایی دەگات هەرچەند کەمتاکورتێکی سپیپاتبوویەوەی ئەو ڕۆژگارەم یاد کردەوە. من کە لە تەمەنی 65 ساڵیمدا بچمەوە بەرەو ڕووداوی تەمەنێکی ساوایی کە 60 ساڵی بە سەردا تێپەڕی بێ، بێ ئەوەی بە نیازی پاراستنی دەق و شەقڵ و دروشمەکانی لە هیچ کەسێکەوە تۆماری بۆ گێرابێتەوە هەر ئەوەندەی لێ پاشەکەوت دەبێ کە بە هەڵگوشینی مێشک و دابێشتنی هێڵەگی یادگار دڵۆپێک یان دانەیەک لە بەروبوومی ئەو سەردەمە بکەوێتە ناو دەفری سواڵکەرەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر ترسی وەڕسبوونی خوێنەر لە چشتی، بە ڕواڵەت، کەمبایەخی دەمی ساوایی دەستمی پێ هەڵنەگرتبامایە جارێ مابووم لەو پچڕپچڕەی نەخشەی سەرەتاکانی ژیانم ڕەنگ و دەنگ وەربگرمەوە چونکە زۆر کەینوبەینی سەردەمی ساواییم وەکوو ئەستێرەی پشت هەوری تەنک لەیاد کردنەوەدا بە لێڵی دەبریقێنەوە، ئینجا ئەگەر سەرنجی لێ توند بکەم دەتوانم تەمومژی فەرامۆشی لێ برەوێنمەوە، بەڵام وەها ناکەم و دەگوێزمەوە بۆ قۆناغی منداڵیم و دەست بە خوێندن کردنم. ڕەنگە لە هەڵکەوتدا ناوناوە بەپێی داخوازیی داستانخوونی بۆ ئەو پچڕپچڕانە بچمەوە چونکە زەحمەتە بە کەس بکرێ دەماری پێوەندی سبەینێ بە دوێنێیەوە هەڵبڕێتەوە.

باسی خوێندنیش چونکە چی ئەوتۆی زرینگەداری تێدا نییە هەر بە وەڕسکەر لە قەڵەم دەدرێ بەڵام بەهەمەحاڵ ناشێ لە تەختەی گەشتی ژیان بسڕێتەوە و شوێنەکەی بە بەتاڵی بمێنێتەوە. لەبەر ئەمە چەندێکی بۆم بلوێ لە سنووری زەرەر نەگەیاندن بە نرخی حیکایەتەکەم لە ڕێگەی قەدبڕەوە پێیدا تێدەپەڕم. لەم تەرزە نووسینەشدا بەرەو دوا گەڕانەوە و بەرەو پێشەوە چوون گەلێک جاران دەبێتە کاری ناچاری.

**سەرەتای خوێندنم**

بەعادەت کار و فەرمانی مرۆ دوای تێهەڵچوون و پێوە خەریکبوونی تووشی حاڵەتی پچڕپچڕی دێت، کەچی خوێندنی من سەرەتاکەی پچڕپچڕ بوو. من لەگەڵ نەجیبەی خوشکە گەورەم بەیەکەوە ساڵی 1925ز چوینە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتایی لە کۆیێ. ئەو هەشت ساڵی بوو، من شەش ساڵی. هەرچەند لەم ڕۆژانەدا تەمەنی شەش ساڵی بۆ منداڵی پڕبەپێستی سەرەتای خوێندنیەتی، وابزانم لە زۆر باریشدا بە پێنج ساڵی منداڵ دەچێتە بەر خوێندن، کەچی بۆ ئەو سەردەمە تەمەنەکە لەگەڵ خوێندندا ڕێک نەدەگونجا.

منداڵان لە تەمەنی نۆ ساڵی و هەڵکشاوتریشدا دەچوونە مەکتەب. قوتابی هەبوو لەگەڵ مندا دەیخوێند، هەر لەگەڵ منیشدا بوو کە لە قوتابخانە بەیەکەوە دەمانخوێند ژنی هێنا. وادیارە هەست کردن بە پێداویستییەکانی کۆمەڵایەتی، ئەویش وەکوو فەرق کردن بەوەی لە کۆمەڵدا پێی دەڵێن ڕەوا و ناڕەوا، بەرهەمی پەروەردەبوون و فرچک پێگرتن و لێڕاهاتن و بیستنەوە و چشتی ئەوتۆییە، دەنا بۆچی لە 1925 تەمەنی شەش ساڵی زوو بێ بۆ خوێندن کەچی لە 1985 بە دواکەوتوو حیساب بکرێ؟

هەر لەم بابەتە کۆمەڵایەتییە دەبینین تەمەنی عادەتیی شوو کردنی کچ لە لادێ چەند ساڵێک زووترە لە هی شارستان، هی کچی ڕۆژهەڵاتیش بە تێکڕایی لە چاو هی ئەورووپایی هەروەهایە.

بێگومان دەبێ کە خۆم لە قوتابخانەدا دیتبێتەوە و هەموو قوتابییەکانم بە گەورە هاتبێتە بەر چاو، بێ ئەوەی هەست بکەم یان لێکم دابێتەوە، خۆم بە خەڵکی ئەو شوێنە حیساب نەکردبێ و ئۆگرم پێوەی نەگرتبێ. منداڵان کە لە کۆڵان و گۆڕەپاناندا گەمەیان دەکرد لە خۆوە دەبوون بە سێ چوار گرووپ، هەر گرووپە هی تەمەنێک. کەس لەواندا بە خەیاڵییدا نەدەهات ڕەفاقەتی لە خۆ گەورەتر یان بچووکتر بکات، چونکە بێ ئەوەی فکر بکاتەوە دەیزانی ڕەفاقەتی منداڵی لە خۆی گەورەتر دەکێشێتەوە بۆ تێشکانی، گەمەوگەپی منداڵی لە خۆی بچووکتریش بەپێی کەیف و زەوقی خۆی نییە.

ئەم خۆ بە بێگانە زانینەم لە نێوان قوتابییە تەمەن گەورەکاندا نەیهێشت لە مندا هەستی «قوتابییەتی» بڕسکێ، لەبەر ئەمە هاتوچۆم بۆ مەکتەب لە سەرەتاوە هەر بریتی بوو لە «جێگۆڕکێ» لە گۆڕەپانی گەڕەکەوە بۆ حەوشە و ژوورەکانی فێرگە [فێرگە: قوتابخانە]. خوا هەڵناگرێ منیش هەروەهام دایە بەر داس. ڕۆژێکی دەچوومە فێرگە دووان نەدەچووم، کەسیش ئەو «هەدارانێ» یەی بە لاوە سەیر نەبوو. مامۆستاکانی فێرگە لێیان دەسەلماندم بە دڵخوازی خۆم بچمە پۆل یان نەچم، وەهاش دەبوو لە نیوەی ماوەی دەرسدا بێ پرس کردن بە مامۆستای دەرسدەر دەچوومە دەرەوە. سەرت نەیەشێنم ئەو ساڵەم بۆ بووە مەشقی ڕاهاتن لە فێرگە کەوا هەرچەند نەمخوێند بەڵام ئامادەی کردم کە ساڵی دوەم خۆم بە «مەکتەبلی» بزانم. لە ساڵی 1926 کە ناوم لە پۆلی یەکەم بە قوتابی نووسرا نەجیبەی خوشکم چووبووە پۆلی دوەم، منیش بچوکترین قوتابی فێرگە بووم.

لە خزمانی خۆم مەلا نافعی مەلا سبوح و مەلا فەتاحی مەلا عیززەت و کاک مەجیدی ئامۆزام و وابزانم، عومەری مەلا ڕەفعەت قوتابی بوون بەڵام پۆلیان جودا بوو. ڕەفیقی تاهر چەلەبی و میرزای حاجی کەریم-یش لە کوڕانی گەڕەکی خۆمان قوتابی بوون بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ لەو ساڵەدا تەنها کاک مەجید و ڕەفیقی تاهیر چەلەبیش (کە دواتر بوو بە دکتۆر) بەبیرمدا دێنەوە، کاک مەجید ئامۆزام بوو ڕەفیقی تاهیر چەلەبیش دەنگخۆشێک بوو، کە لە ڕیز گرتنی بەر لە چوونە ژووری پۆلەکانمان نەشیدی دەگوت، دەنگەکەی زاڵ دەبوو بەسەر هەست و هۆشی ئەو خەڵقەدا وەها دەزانم لە خۆی گەورەتر دەبێ. پێم وەها بوو ئەو تەرزە دەنگە ناشێ لە قەڵغەتی قوتابییەکی عادەتییەوە هەڵستێتەوە چونکە وام دەزانی دەنگەکە بە ئەستوورایی باوەشی پیاو لە قوڕگییەوە دەردێت، ئینجا ئەگەر هەر هێندی قەڵغەتی خەڵکی بەبەرەوە بێ دەبێ قوڕگ و کەمەری شەق ببەن.

دەنگی ئەو قوتابییە «خارق العادة» بوو. بەولای خۆشی و چرکە و زەمزەمەوە سام و شکۆی لێ هەڵدەڕژا. دوای چەند ساڵێک کە دەنگەکەی پتر ڕسکا لە سەیرانەی هاوینادا بە ڕاشکاوی و بێپەروا و بێ ئەوەی خۆی بدزێتەوە لە تەنگەبەرە و ئاستەنگەکانی ئاهەنگی سەرکێش، گۆرانی «يا جارة الوادي» «عەبدولوەهاب»ی دەگوت و بە سەریدا زاڵ دەبوو. کە دەگەیشتە شوێنی «لم ادر ما طيب العناق...» دەنگی خۆی وەها بەڕەڵا دەکرد، بەرەژوور و بە هەموو لایەکدا، عەبدولوەهابی لەبیر

خەڵقەکە دەبردەوە. ئێستا کە دەبیەم فەیرووز و «نوورولهودا - نور الهدى» ئەو گۆرانییە دەڵێنەوە باشتر تێدەگەم د.ڕەفیق لە دەمی قوتابییەتی خۆی لە کۆلێجی «طب» چەند پلە ژووررووی ئەوانەوە بوو لەلایەن دەنگەوە. (دەبێ ئەوەندەش لێرەدا بڵێم کە فەیرووز تۆزی نوورولهودا ناشکێنێ ئەگەر تەنها بە دەنگەکەیەوە بۆی بێتە مەیدان).

کە چوومە مەکتەب دەستەی مامۆستایان بریتی بوون لە ژمارەیەک کەوا ڕەنگە لە حەوتی تێنەپەڕاندبێ. ئەوانەی من لەو ساڵەدا بە بیرمدا دێنەوە چوار تاکیانن:

1. مەلا عەبدولرەحمان شەرەف کوڕی مەلا عەبدوڵای نازەنینی مدیری مەکتەب بوو دەرسیشی دەگوتەوە. بنەماڵەی «نازەنینی» لە کۆنەوە خەریکی مەلایەتی بوون و مەلای چاکیان لێ هەڵکەوتووە. بەداخەوە لە دەمی نووسینی ئەم ئالقەییەدا دەنگم بە کەس لەو بنەماڵەیە ڕاناگات شتێکم پێ بڵێ لە بارەی مێژوویانەوە. ئەوەی بزانم، مەلا عەبدوڵای نازەنینی یەکێک بووە لەو مەلا دیندارانەی ترسی خوا نەبێ هەرچی ترس بووە لە دڵیدا نەبووە. کاکە زیاد بۆی گێڕامەوە گوتی جارێکیان مەلا عەبدوڵا دەچێتە لای حەماغا. بەرەو ڕووی خۆی و قەڵەباڵغی دیوەخانەکە بێ دوودڵی کردن پێی دەڵێ ئاغا برازایەکت هەیە لە دێی خدران پیاوێکی باش نییە و دەستدرێژی لە خەڵق دەکا. نەسیحەتی بکە با واز لە خراپە بهێنێ. حەماغاش دەڵێ مامۆستا ئەو برازایەم ئێستا لێرەیە و گوێی لە قسەکانتە. ئەویش بێ ئەوەی ڕوو وەرگێڕێ گوتی بە خوا چاک بوو قساکانم نەبوونە غەیبەت، ئیتر پتر بەسەریدا ڕۆیشت هەتا لە مەجلیسەکە هەڵستا.

برازاکەی حەماغا، قادراغای سمایلاغا، نەیکردە نامەردی کە چۆوە خدران دیارییەکی باشی بۆ هەنارد بە بەڵگەی ئەوەی کە لێی دڵگران نەبووە و قسەکانیشی هەڵگرتۆتەوە. خەبەراتی خواناسی و نەترساوی و مەلایەتی مەلا عەبدوڵای نازەنینی بە تەواتور دەگێڕدرێتەوە. گەلێک جاران لە مەجلیسی باوکم لە دوا باوکیشم لە مەجلیسی مامم یادی مەلا عەوڵای

نازەنینی بە حورمەتەوە دەکرایەوە. کوڕە گەورەکەی، مەلا سەدیق ئەفەندی کە یەکەم کۆیی بوو لە کۆلێجی حقووق دەرچوو، لە پلەی حاکمایەتی تێهەڵکشا تاکوو بوو بە سەرۆکی دادگاکانی «مەنتیقیەی ئیستیئناف»ی کەرکووک. لەگەڵ مامم و مەلا سادقی سددیقی دایەخەجێ و مەلا عەلی باداوەیی موستەعیدی دەرس خوێن بوون لای باوکم. ئەو پێوەندییەیان بەردەوام بوو هەتا هەر چواریان بە ڕەحمەتی خودا شاد بوون. لەبیرمە جارێکیان لە کارتی جەژنەپیرۆزانەی کە بۆ باوکمی نارد ئەم بەیتی نووسی بوو:

یا خوا گوشاد بێ دڵت وەک گوڵشەن
جەژنت پیرۆز بێ قیبلەکەی وەتەن

مەلا عەبدولڕەحمان شەرەف لەو تەمەنەدا نەبوو کە لەگەڵ کاکی لای باوکم بخوێنێ بەڵام ئەوەندەی کە لە کۆیێ مدیری مەکتەب بوو هەفتانە 4-5 جار بەڵکوو پتریش دەهاتە لای باوکم، باوکیشم زۆر جاران سەردانی دەکرد لە مەکتەب. لەگەڵ مامیشم یەک ماڵ بوون، تەنانەت کە هاوینان بە سەفەری یەک ڕۆژە بهاتباینە کۆیێ زۆر جاران قاوەڵتی نیوەڕۆژەمان لە ماڵی ئەودا دەخوارد. لە چەند ساڵێکی بەرەودوای وەزیفەداری وازی لە «تعلیم» هێنا و بوو بە مدیری ناحیە و هەڵکشا، بوو بە قایمقام، ساڵی کۆچی دوایی مامۆستا شەرەفم لێ ڕوون نییە. ڕەنگە بەر لە 1958 بێ.

2. مامم، شێخ نووری حاجی مەلا عەبدوڵا.

3. مەلا حەوێز ئەفەندی قۆچاغا. وا بزانم لە بنەماڵەی ئەو محەمەد قۆچ پاشایەیە، کە مێژوو باسی کوژرانی دەکا لەلایەن عەبدولڕەحمان پاشای بابانەوە، لە ساڵی 1216 ک ( وەک لەبیرم بێ). ئەم مامۆستایەمان مەلایەکی دڵ هۆشیاری ئێسکسووکی پاکپۆشی ئەدیب و قسەخۆش بوو. بەدەم دەرسەکانییەوە گەلێک جاران بای دەدایەوە سەر گێڕانەوەی ڕووداوەکانی مێژوو بە دەموودووی حیکایەتبێژ کە زۆر پتر لە مێژووی

پاتەوپات لە دڵاندا کاریگەر و جێگیر دەبوو. بە کوردی و فارسیش هەڵبەستی هەبوون. کەسی لە دوادا بەجێ نەما وەجاغی ڕوون بکاتەوە.

4. مامۆستا عومەر ئەمین. خەڵقی هەولێر بوو. باشترین دەرسدەری «قراءة» و حیساب بوو. دوای دەیان ساڵ بۆی دەگێڕامەوە (خۆیشم لە بیرم بوو) کە لە ماوەیەکی کورتدا فێری نووسین بووم، هێندەشم لێ ڕازی بوو کە زۆر جاران لە کاتی دەرسدا بە دوایدا دەناردم لە پۆلی خۆمەوە بۆ پۆلی لە خۆم هەورازتر، دەچووم و پرسیارێکم وەڵام دەدایەوە کە قوتابییەکی ئەو پۆلە وەڵامی پێ نەدرابۆوە. تا بشڵێی مەمنوونی دەکردم کە دەمبیستەوە لای باوکم ڕەزامەندی خۆی بەرانبەرم دەربڕیوە. مامۆستا عمر امین لە پاش خۆی دیارییەکی باشی بۆ سەقافەتی کوردی بەجێ هێشتووە، ئەویش د. وریا عومەر کە لە سەقافەتی نوێی زمانەوانیی ئەورووپا بەرخوردار بووە و خزمەتی زمانەکەمانی پێ دەکات.

مامۆستاکانی دیکەم کە لە ساڵی خوێندنمدا دەرسیان دەگوتەوە، بۆم ساغ ناکرێنەوە، واتە نازانم لەو مامۆستایانەی کە بیرم دێنەوە چەندیان هی سەرەتای خوێندنم بوون. ناچارم بە تێکڕایی و بێ دەستنیشان کردنی ساڵ و ڕۆژ ناویان دەبەم مەگەر بەرێکەوت لە بارەی یەکێک و دوانیانەوە ئەو ساڵ و ڕۆژە بزانم و باسی بکەم. لە مامۆستاکانی هەرە دێرینم کەوا ڕەنگە تێیاندا هەبێ لە ساڵی یەکەمی خوێندنەوە دەرسی پێ گوتبێتم ئەمانەن: مامۆستا ساڵح قەفتان، مامۆستا عەلی ئاغا، مامۆستا عەزیز (ناوی باوکی نازانم و خەڵقی سلێمانی بوو).

مامۆستا قەفتان لەبەر بیروڕای نەترساوی جارێکیان دووچاری سەرێشەیەکی ناقۆڵا بوو. کە من ئەوسا هەر لە دوورەوە بۆرە باسێکی دەهاتە بەر گوێم و دواتر بە درێژای بۆیان گێڕامەوە. بەتایبەتی مامۆستا عەلی ئاغا کە خۆی لەو دەمەدا هاوڕێی مامۆستا قەفتان بوو زۆریش بە مەسەلەکەوە ناڕاحەت بووبوو. کێشەکە دەخلی بە عەقیدەوە هەبوو، بۆیە بوو زۆر لەوانەی خۆیان بە خاوەن ماف دەزانن لە پاراستنی عەقیدە، لە مامۆستا قەفتان کەوتنە چپەچپ و مەسەلەیان گەیاندە حکوومەت. باوکم کەوتە نێوانەوە و لە دوا هەموانی نارد و لای خۆی هەراکەی کپ کردەوە.

لێرەدا ڕێم نییە چەندوچۆنی ئەو مەسەلەیە باس بکەم چونکە هەم هەستیاری تێدایە و هەم پەکیش لەسەر شەن تێدا کردنی نەکەوتووە.

لە پۆلی دوەم یان سێیەم بووم مامۆستایەکی هەولێریمان بۆ هات تەنها ڕیازەی بە قوتابییان دەکرد ناوی ئەنوەر حاجی حەسەن بوو. جارێکیان لە چوونەوەمان بۆ ژووری دەرس، بێ لزوم زلەیەکی لێ دام، تا ئەو ڕۆژەی لێدانم نەخواردبوو، ئەو ڕۆژەش لە نەشارەزایی مامۆستاکەمەوە بوو لێم درا. تازە هاتبوو، قوتابییەکانی نەدەناسی دەنا دەبوو بزانێ من لە قوتابییە هێمنەکان بووم. وا پێ دەچێ لە قەڵەباڵغیدا بە هەڵە منی تاوانبار زانیبێ. بە دەست خۆم نەبوو لە هەژمەتان گریام. مەسەلەکە گەیشتەوە مدیر و مامۆستاکان بێ ئەوەی من هیچ بڵێم یان شکات بکەم. ئەوان، نەک لەبەر لایەنگیری بەڵکوو لە باوەڕی خۆیانەوە کە من هی لێدان نیم، تێیان گەیاندبوو کە کارێکی باشی نەکردووە...

سەرتان نەیەشێنم مامۆستاکەم بە دڵ پەشێمان بۆوە و دڵی دامەوە. زۆر نەمایەوە لامان، دواتریش خوای لێ خۆش بێ، شێوا و لەو شێواوییەدا جوانەمەرگ بوو. دوای دوو سێ ساڵ برایەکی ئەو، مامۆستا عیسا حاجی حەسەن، بوو بە مامۆستامان و دەرسی حیسابی پێ دەگوتین، بەڕاستی جوانمەرد و تێگەیشتوو بوو تا بشڵێی لە سەرخۆ بوو، خوێندنی بەرزی تەواو کرد پاش ئەوەی چەند ساڵێک بە موعەللیمی ڕابوارد شەهادەی دکتۆرای لە «بیطرة» وەرگرت. هەتا ئەم دەمە پێوەندیمان بەردەوامە و بەچاوی ئەو سەردەمەی سەیر دەکەم...

مامۆستایەکمان کە لە پۆلی پێنجەم دەرسی «اشیاء»ی پێ دەگوتین مەلا ساڵحێکی بادینی بوو. لەو باسە نوێیانەی کە تازەبەتازە دەهاتنە ناو کۆڕی خوێندن و خوێندەوارانەوە هەر شتێکی لەگەڵ عەقیدەی کۆنی خۆی ڕێک نەکەوتبایە لێی بەدەنگ دەهات و دەیگوت ئەمە قسەی ئەورووپاییانە، خواش نەبێ کەس نازانێ ڕاستی و حەقیقەت چییە، نەکەن بەو تەرزە قسانە باوەڕ بکەن... ئەویش زۆر نەمایەوە.

خالیدەفەندییەکی خەڵقی سلێمانیمان بۆ هات، ڕەفتاری لەخۆڕازی بوو وەک کە زاپتێک لەگەڵ عەسکەرەکانی ڕێ بکات ئەویش لەگەڵ ئەو خەڵقە وەها بوو. لەبەر هۆیەکی کە نازانم چی بوو کەیفی بە شێخ مەحموودی حەفید نەدەهات... ئەو ساڵە

تازەبەتازە زەکی ئەحمەد هەناری کە لە دەرچووانی فێرگەی کۆیی بوو کرابوو بە مامۆستا لە کۆیێ. زەکی هێندێک سروودی بە قوتابیان دەخوێندەوە دەبووە هۆی گۆبەند و خالیدەفەندی وەها توورە دەبوو باس ناکرێ. زۆر جاران نەشیدەکەی بە قوتابیان دەبڕیەوە. زەکی هەناریش سمێڵەخنکەی دەهاتێ و بە قەستی پۆزی وەهای وەردەگرت گۆیا لە کردەوەکەی خالیدەفەندی نارازییە.

یەکێک لە دوو کوڕەکانی خالیدەفەندی کە ناوی عەبدولا بوو هاوتەمەن و هاوپۆلم بوو هەتا لە کۆیێ بوون زۆر برادەر بووین و بە دڵ خۆشم دەویست. ساڵەها دوای ئەو ڕۆژگارە یەکدیمان دیتەوە ئێستا نازانم لە چ عالەمێکدایە. برا گەورەکەی ناوی عەبدولخالق بوو لە ئێمە بەرەوژوورتر و بە تەمەنیش لێمان دوور بوو، هەرگیز لێی نزیک نەبوومەوە. نیوەڕۆیەکیان عەبدولام لە ماڵی خۆمان گل دایەوە و بەیەکەوە دۆڵمەمان خوارد. خالیدەفەندی وەهای کرد ڕۆژێکی دیکە عەبدولا من بۆ نیوەڕۆژە بباتەوە ماڵی خۆیان، بەلام نانەکەیان گەلێک لە سنووری دولمەی تێپەڕاند بوو. بێگومان خالیدەفەندی بە ڕاسپاردە وەهای کردبوو کە ئەو ڕۆژە خواردنی نایاب دروست بکەن. وا بزانم ڕێشی نەدەدا لە من بەولاوە چ قوتابییەک وەها لە عەبدولا نزیک بێتەوە کە بگاتە مێوانداری و هاتوچۆی نێومالْ.

لە مامۆستا بەرچاوەکانمان کە بەپێی کێشانە و پێوانەی تەمەنی منداڵی و دەفری زەینی فێرگەی سەرەتایی بە خاوەن شەخسییەت دەژمێردران، لە کۆمەڵیشدا ڕێزی تایبەتییان لێ دەنرا، سێ کەسیان شوێنی تایبەتییان لە زەینی ئەوساکە و ئێستاکەشمدا هەیە.

یەکێکیان مامۆستا عەبدولا عەزیز، بە شێوە و بە گفتار و بە جۆری دەرسگوتنەوەش سەرنجی ڕادەکێشام و ڕێزم لێدەنا. هەرچەند ماوەی مانەوەشی لە کۆیێ زۆر درێژ نەبوو، یادی لە دڵماندا زیندوو بوو. دوای دوور کەوتنەوەی لێمان چەند جارێک دیتمەوە دەتگوت هەرگیز لە یەکدی دانەبڕاوین. دواتر بوو بە مدیری ناحیە کە ئیتر ئاگام لە چەندوچۆنی هەڵسوکەوتی ژیانی نەما. لەچاو هاوتەمەنەکانی خۆیدا زۆر زوو کۆچی دوایی کرد. بەداخەوە ناتوانم بڵێم خەڵقی کوێ و بنەماڵەکەی چی بوو چونکە شارەزای ئەو بارەی نیم.

ئەوی دیکەیان مامۆستا عەبدولا سامی بوو. هەتا بڵێی مرۆیەکی زەینکرایەوە و ڕوحسووک و قسەخۆش و خوێندەوار و یارانی بوو. لە هەر مەجلیسێک بایە گیانێکی نوکتە و گەشایی و خۆشیی تێدەگەڕا. لەبیرمە جارێکیان سەیرانی مامۆستاکان و قوتابیە کۆییەکانی فێرگەکانی بەغدای ئەوسا بوو کە لە پشووی هاوینەدا هاتبوونەوە کۆیێ. من هەرچەند جارێ لە سەرەتاییدا بووم بەڵام کوردی گوتەنی پێکیان دەکردم. ئەوسا باوی گرامۆفۆن بوو، هەریەکە داوای قەوانێکی دەکرد ئیتر پەیتا پەیتا قەوان بە دوا قەواندا دەهات. مامۆستا عەبدولا سامیش پتر حەزی بە قسە و نوکتە دەکرد. لە کۆتایی قەوانێکدا مامۆستا سامی دەنگی هەڵبڕی و گوتی ئینجا نۆرە دڵخوازی منە، تکام ئەوەیە بۆ من قەوانێک لێ مەدەن ئیتر خۆتان ئەو قەوانە هەڵبژێرن... ماوەیەکی باش بۆ ئەو نوکتە خۆشە گرامۆفۆنیان وەستاند، مامۆستا عەبدوڵاش بەدەم قسە و پێکەنینەوە سەری با دەدا و خۆی دەهێنا و دەبرد بۆ ئاوازی ئەو قەوانەی کە بە وەستاوی لەسەر گرامۆفۆنەکە داندرابوو.

جارێکی دیکە لە نادی کۆیێ خەڵقەکە یاری کۆنکانیان دەکرد، زوربەشیان ئەفەندی مەکتەب بوون و کەوتنە سەر باری نوکتەهێنانەوە بە دەوری یاری کۆنکانەوە. یەکێک گۆتی: «یا اهل الکونکان»، ئەوی دیکەیان گوتی نەخێر دەبێ بڵێن «ایها الکونکانیون»... مامۆستا سامی گوتی، هەر دەڵێی مێژووتان لەبیر نەماوە، لەسەر وەزنی «غساسنة و مناذرة» دەبێ بڵێن «ایها الکناکنە». ماموستا سامی هەر وەک دەرسی زێدە ڕێکوپێکی دەگوتەوە لە تەمسیلیش، بێ مامۆستا شارەزایی هەبوو. لە یەکەم تەمسیلی شانۆی کە لە مەکتەبی کۆیێ بە سەرناوی «کچی کوردستان» ڕێک خرا مامۆستا سامیش و مامۆستا زەکی هەنار-یش دەوریان هەبوو، دەوری هەریەکێکیشیان بەپێی دروشمی شەخسیەتی بۆی ڕەچاو کرابوو، مامۆستا زەکی نەختێک بزێو بوو کرابوو بە ڕێگر، چەتە. مامۆستا سامیش بە خۆی و تەبیاتە دوورەشەڕەکەیەوە دەوری یەکێکی مێرخاسیان بۆ دیاری کردبوو. بەپێی زەوق و تێبڕ کردنی ئەو سەردەمە هەردوویان لە دەوری خۆیان سەرکەوتوو بوون. بەڵام تەرازووەکە نەختێک بەلای مامۆستا زەکییەوە بوو چونکە جموجووڵی پڕ هەرا و هاتوباتی ڕێگر خەرمانەیەک بە دەورەی ڕێگردا دەبەستێ. مامۆستا سامی بە درێژایی عومری بۆ من مامۆستا و دۆست و براگەورە و برادەر بوو. وەی کە بە دڵ خۆشم دەویست. پار بە خامۆشی و بێ دەنگ و سەدا سەری نایەوە، تا من

خەبەردار بووم ماوە بەسەر مەرگیدا تێپەڕی بوو. چەندێکی ویستم، نەمتوانی دەنگم بە هیچ یەکێک لە ئەولادی ڕابگەیەنم، چەند جاران ژمارە تەلەفونی خاتوونی کچیم بادا، کەس بیسەرەکەی هەڵنەگرت. وا بە ناچاری و بەدوا کاتەوە لێرەدا سەرەخۆشی لە خانەوادەی دەکەم، بەتایبەتی فوئادی کوڕی کە لە تەبیاتی باوکییەوە دڵفرەوانی و بەخشندەیی وەرگرتووە. بۆ گیانی پاکی عەبدوڵا سامیش سەد عوزری خەجاڵەتی...

مامۆستای سێیەم کە با ئانقەست ناویم خستە ئاڵقەی دواینەوە مامۆستا «عەبدولخالق قوتب»ـە. بنەماڵەی «قطب» چەند پشتێکە لە کەرکووک نیشتەجێن و بە دەرس و زانستەکانی ئیسلامییەوە خەریک بوون. بەپێی کورتەی مێژووی ئەو بنەماڵەیە کە لەسەر داخوازی خۆم مامۆستا مەلا عەبدولمەجید قوتب (بەعەرەبی) بۆی نووسیم، درەختی نەسەبی مامۆستا عەبدولخالق بەم جۆرەیە: باوکی ئەحمەد کە دوای دەرچوون لە ئیمتیاز لە ئەستەنبول بۆتە قازی و خاوەن تەئلیف بووە لە زۆر زانستەکانی ئیسلام، کوڕی مەلا محەمەدە کە ناوی بە قطب دەرکردوە، ئەویش کوڕی مەلا ئەحمەدە، ئەویش کوڕی عوسمانە. بەر لە مەلا عوسمان وەک کە مامۆستا عەبدلخالق بۆی گێرامەوە بنەماڵەیان لە ناوچەی شێخ بزێنی ژیاوە. مەلا مەجید خۆی کوڕی حاجی مەردانە و ئامۆزای مامۆستا عەبدوخالقە و شوێنەواری عیلمییەتی بنەماڵەی لە کەرکووک پاراستووە.

مامۆستا عەبدولخالق (لێرە بەدواوە بە قطب ناوی دەبەم) لە قوتابخانەی کۆیێ مامۆستایەکی هەرە بەرچاو بوو، هەر کە بەدیار دەکەوت قوتابییەکان دەکەوتنە باری خۆپاراستن و شەرم و شکۆ. لە دەرسی ئەودا هیچ قوتابییەک نەیتوانیوە بێڕێزی یان بێئسوولّیی لێ بەدەر بدات. لە پۆلی پێنجەم و شەشەم دەرسی ڕێزمانی ئینگلیزی دەگوتەوە، بێ دوودڵی کردن دەڵێم لەو ماوەیەدا سەرلەبەری ڕێزمانی ئینگلیزیی پێ گوتینەوە تا ئەوەی لە هەموو خوێندنی دواترمدا شتێکی تازەم لە ڕێزمانی ئینگلیزی نەبیست. ڕاستییەکەی قطب نەک هەر لە ئینگلیزی بگرە لە هەموو ماددەکانی ئەوسای قوتابخانە دەستێکی باڵای هەبوو. مامۆستا عەبدولڕەحمان شەرەف نەقڵ کرا بۆ قەزایەکی دیکە (وابزانم ڕەواندز) ئیتر مامۆستا قطب لە جێی ئەو بوو بە مدیر.

دۆستایەتیی مامۆستا قطب لەگەڵ باوکم زۆر بەتین بوو. لە سەردەمی مودیرایەتییەکەیدا زۆر جاران باوکم سەردانی دەکرد و نیوەڕۆژەشی هەر لە

مەکتەب لای مامۆستا قطب دەخوارد. لەو تەرزە ڕۆژانەدا مامۆستا وەڵامی بۆ دەناردم کە دوای دەوام بمێنمەوە و لەگەڵ ئەواندا نان بخۆم. پێوەندیمان کە لە مامۆستایی و قوتابیەتییەوە دەستی پێ کرد بە درێژایی ڕۆژگار لە بەرزبوونەوە و پتر بەهێزبووندا بووە تا ئەمڕۆژەی 20/9/1985 کە ئەم یاداشتەی تێدا دەنووسم.
ڕێکەوتی زۆر خۆشیش بوو کە پێوەندی مامۆستا قطب لەگەل مامۆستای دیکەمدا، عەبدوڵا سامی، هەتا بڵێی بە تین بوو ئیتر لەو ساڵانەی دوایدا بە زۆری کە دیدەنی یەکدیمان بکردایە هەرسێک بەیەکەوە کۆ دەبووینەوە. مامۆستا قطب دواتر بوو بە مدیری «متوسطة» لە کۆیێ، پاشان چوو بۆ ئینحساری تووتن و بوو بە مدیری ئینحساری سلێمانی. لێرەدا تاکە نموونەیەکی هۆشیاری و شارەزایی و ئەمەکداری و قەدرزانی ئەو ئینسانەتان بۆ دەگێڕمەوە.

زەعیم ڕوکن عومەر علی لە پەنجاکاندا موتەسەڕیفی سلێمانی و کەوتە سەر سیاسەتی بێهێز کردنی بنەماڵە هێزدارەکان، لە پێش هەمواندا بنەماڵەی کاک ئەحمەدی شێخ. مامۆستا قطب مودیری ناوچەی ئینحیسار بوو لە سلێمانی. عومەر عەلی لێی داواکرد ئەو ئیجازەی تووتنی بە دێیەکانی شێخ مەحموود دراوە بیان بڕێت. مامۆستا قطب پێی گوتبوو مێژوو ئەمەمان لێ ناسەلمێنێ چونکە سەرچاوەی سەدەیەک و چارەکە سەدەیەک لەمەوبەر هەیە کە شوێنێکی وەکوو دەشتی بازیان تووتنی لێ چاندراوە ئیتر چۆن زات بکەین ئەو ڕاستییە مێژووییە پێشێل بکەین؟ ئیجازەکانی بۆ ماڵی شێخ مەحمود پاراست.

وەفاداری لێم داوا دەکات چاکەی مامۆستاکانم بڵێم. ئەوەی ڕاستی بێ لە زۆر کەسم داوا کردوە، لەوانەی ناویان دێتە ناو یاداشتەکانم، کورتە باسێکی بنەماڵەیان وەیا بەرچاوترین ئەندامی بنەماڵەکەیانم بۆ بنووسێ تاکوو باس و خواسی ناو ئەم نووسینەی پێ دەوڵەمەندتر بکەم و ناو و شۆرەتی جوانمێریشیان بپارێزم. بەپێی ئەو بارە کۆمەڵاییەتیەی کە تێیدا ژیاووم پێوەندی خانەوادەییم لە لایێکەوە و پێوەندی شەخسیم لە لایەکی دیکەوە وەهای کردووە زۆر کەس و کۆمەڵ و بنەماڵە بناسم و لە گەلێک هەڵوەستی دەگمەندا خۆم دیتبێتەوە. ئینجا ئەگەر بێم لە گەشتی ژیانمدا تاکە داوی ڕشتەی عومری خۆم هەڵبگرمەوە و سەر لە تەنیشت و ڕۆخم خوار نەکەمەوە و برادەران و هاوتەمەنان و ناسیاوان لەگەڵ خۆمدا نەهێنمە بەر ڕووناکایی وەک ئەو کەسە دەبم کە خەڵق بۆ سەر سفرەی بەتاڵ بانگهێشتن بکەم. دەمەوێ

لەم نووسینەمدا مافی تەواو بەخۆم بدەم کە دێم مافی ئەو کەسانە و ئەو کۆمەڵانە تێدەخوێنمەوە کە ڕەوتی ژیانم بە ڕێچکۆلەی ئەواندا تێپەڕیوە یاخود لەگەڵیاندا، کەموزۆر، جووت ڕۆیشتووە.

بگەڕێمەوە بۆ مامۆستاکانم. جگە لە مامۆستا قطب کە کەرکووکی بوو، مامۆستایان ڕەمزی ئەفەندی و فاتیح موستەفاش کەرکووکی بوون. ڕەمزی کەم مایەوە، بەڵام مامۆستا فاتیح بەینێک لامان بوو. ئێستاش تێی نەگەیشتم بۆچی قوتابیانی پۆلی شەشەم لێی کەوتنە شکات لای مدیر کە ئەوسا مامۆستا قطب بوو. من بێ ئەوەی هیچ سەروبەرێکی ئەو شکاتە بزانم لەسەر خواییشتی هاوڕێکانم، کە هەموویان لە من گەورەتر بوون، زۆر بە دڵ ساردییەوە پشتگیریم لە شکاتەکە کرد. تا ئێستاکەش لەبیرمە کە مامۆستا قطب بە دوایدا ناردم و لێی پرسیم هۆی ئەو شکاتە چییە. ئەوەندە بێ وەڵام و گومان لەخۆ کردووبووم فرمێسکم هاتنە خوار. وابزانم مامۆستا قطب تێم گەیشت بۆیە بوو خێرا ئیزنی دام بچمەوە ژووری دەرس و بایی سەری دەرزی سەغڵەتی نەکردم. وەی کە پەشیمانم لەو هەڵوەستە بێبنج و لەرزۆکەم. بەڵام زۆری نەبرد شکاتەکە و هەر بنگەیەکی ڕاست و درۆی هەبووبێ لەبیران چوونەوە و مامۆستا فاتیح بۆوە بەو خۆشەویستە کە لێی دەوەشایەوە.

لە نوکتەکانی ئەو مامۆستا فاتیحە شتێک دەگێڕمەوە. جارێکیان ئەزموونی شەفەوی قوتابیانی پۆلی چوارەم یان پێنجەمی دەکرد لە جوغرافیا. من ساڵی پێشوو لە مەکتەب دەرچووبووم بەڵام ڕۆژانە دەوامم دەکرد، ئەو ڕۆژەش بە عادەت هاتمەوە مەکتەب و لەگەڵ کاک مەجیدی ئامۆزام بەیەکەوە لای مامۆستا فاتیح بووین. هەر پرسیارێکی لەو قوتابییە کرد، بێسوود بوو نەک لەبەر ئەوەی کە وەڵامی ڕاستی نەداوە بەڵکوو چونکە ورتەی لەبەرەوە نەهات، بە زاراوەی ناو فەقێیان «شقی شفەی» ی نەکرد. لەگەڵی بە پشوو بوو هەتا پشووش پەکی کەوت. ئەوسا پێی گوت: فڵانە کەس (ناوی ناهێنم خوا لێی خۆش بێ) یەک سوئال ماوە لێتی دەکەم ئەگەر وەڵامت دایەوە باشە ئەگینا سفرت بۆ دادەنێم. سوئالەکەش ئەمەیە، ئایا کۆیێ (واتا کۆیسنجق) قەزاییە یان بەڵایە؟ قوتابییەکەش بە زاری کۆییان زۆر بە ڕەوانی و دەنگ دلێرانە وەڵامی دایەوە و گوتی: «ئەفەندی بەرایە»... مامۆستا فاتیح لەسەر بەڵینەکەی خۆی سوور بوو پێنج نومرەی بۆ دانا کە بایی ناجیحبوونی دەکرد،

بەڵام دەشیزانی ئەگەر دە نومرەشی بداتی سوودی نادات چونکە لە ماددەکانی دیکە ناتوانێ بە «قەزاوبەرا» دەرباز بێ.

مامۆستایەکی دیکەشمان، ئەحمەد فەخری، بە کەرکووکی دەزانم هەر چەند لێشی دوودڵم. زۆر کەم مایەوە لامان بەڵام پێیەوە دیار بوو کە چەند ڕێز لە خۆی دەنێت و تا چ ڕادەیەک لە پۆلدا شکۆی خۆی دەپارێزێ. دوای ساڵەها کە من کەوتمە باوەشی جیهانی بێنەوبەرەوە لەگەڵ مامۆستامدا بووین بە برادەر، بارەها و جارەها لە سەر سفرەی شێخ ڕەئووفی خانەقا لە کەرکووک بەیەکەوە کۆدەبووینەوە و سەعات لە دوای سەعات بە وتووێژی شیرن و شەنگ ڕامان دەبوارد. دوایی بوو بە مدیری ناحیە. خۆم لێم نەبیست بەڵام «مالیکی شێخ ڕەئووف» کە خاڵی منداڵەکانمە بۆی باس کردم کە مامۆستا ئەحمەد فەخری بەپێی گێڕانەوەی خۆی کاتێک کە لە ناوچەی سیدەکان مدیر ناحیە بووە چۆتە سەردانی یەکێک لە شێخە خاوەن تەریقەت و مریدی ئەو ناوە، لە وتووێژدا باسی جگەرە و توتن کراوە، شێخەکەش گۆیا مەعلوومات فرۆشی دەکات، گوتبووی، خوا لە قورئان دەفەرموێ «لعن الله من احدث التوتن» وشەی توتنیشی بە شێوە ئاخاوتنی خۆی دەردەبڕی بوو کە دەنگی «و» تێکەڵ بە «ی» دەکەن وەک کە فرەنسییەکان دەیکەن.

ئەو قوتابیانەی کە هەر لە دەمی قوتابییەتیی من لە فێرگەی سەرەتایی کۆیێ خوێندنی بەغدایان تەواو کرد و بوون مامۆستا لە کۆیێ ئەمانە بوون: زەکی هەناری، سەعید سەلیم، تاهیر سادیق، جەلال حەوێز، عەبدولڕەحمان نورجان. ڕەنگە هی دیکەش هەبن من ناویانم لەبیر چۆتەوە یان بە هەڵە وەها بزانم دوای دەرچوونی من بووبێتنە مامۆستا وەکوو سابیر ئیسماعیل و سەعید ئەحمد مەلا وەلی. لەمانە و لە هەموو ئەو مامۆستایانەی دەرسیان پێ گوتووم لە فێرگەی کۆیێ تەنها مامۆستا قطب ماوە، خوا تەمەنی درێژ کا، ئەوانی دیکە هەموویان یەخسیری بەندیخانەی قەبر بوون.

ئەوەندەی بیر دەکەمەوە لەو قوتابیانەی کە لە ساڵی یەکەمی خوێندنم هاوپۆلم بوون تەنها یەکێکیانم بە بیردا دێتەوە، ئەوانی دیکە ڕەنگە وردە وردە لە هەڵکشانی من و دوا کەوتنی ئەوانەوە بووبێتنە هاوپۆل. ئەو قوتابییە کە بە چەند ساڵێکیش لە من گەورەتر بوو عەبدولڕەززاق-ی کوڕی تۆفیق ئەفەندی مەلا ئیمام بوو، بەڵام چۆن قوتابییەک!؟ کە دەرسی قەواعیدی عەرەبیمان دەست پێکرد لە وەڵامی پرسیاری

مامۆستادا «ضرب» تەرکیبی چییە جەوابی دایەوە: «مامۆستا، زەڕبە ئیسمی موڕالیعە»!

وابزانم لە پۆلی دوەم یان سێیەم بووم کڕیش زستانە و ڕەمەزان بوو، لە دەرسێکدا مدیرمان، مامۆستا عەبدولڕەحمان شەرەف لێی داوا کردین بەپێی دەستوقامی خۆمان باسی جۆری ڕابواردنی ڕۆژانەی خۆمان بکەین بە عەرەبی. ئەو زەمانە عادەت وەها بوو کە کاتی نوێژی نیوەڕۆ دادەهات چەند مامۆستا و هەموو قوتابییە نوێژکەرەکان و هێندێکیش لەوانەی بە چاولێکەری ڕەگەڵ خەلقی دەکەون دەچووینە مزگەوتی گەورە کەوا 50-60 مەترە لێمانەوە دوور بوو. زوربەی خەلقی شار و ئەفەندیی خوێندەوار و بەشێکیش لە منداڵی ژیر پاش عەسران دەچوون بۆ مەجلیسی وەعزی باوکم. ئەویش هەر لە مزگەوتی گەورە. خەڵقەکە ئەوسا دەیانگوت «دەچین بۆ سەیری وەعزان». منیش کە لە نووسینمدا هاتمە سەر باس کردنەوەی چوونم بۆ مەجلیسی عەسرانەی وەعز ئەو زاراوەیەی «سەیر» م بەکارهێنا چونکە هیچی دیکەم نەدەزانی «...اذهب الی الجامع لسیر الوعظ». شوێنی دیکەشی بۆم ڕاست کردبۆوە بەڵام چۆنیەتیەکەم نایەتەوە بیر.

خوێندنی ئەوسا لە هێندێ ڕووەوە پتر و زووتر ماوەی دەبڕی لە هی ئێستاکە. بە نموونە دەڵێم، جارێکیان کە قوتابیی پۆلی چوارەم بووم لە جیاتی باوکم دانی ئێوارە چوومە بەشداری کردن لە تازیەی ماڵی شێخ کەریمی بەرزنجی. دانی نیوەڕۆ باوکم خۆی دەچوە تازیەکە و نانیشی لەگەڵ خزمانی تازیەدار دەخوارد ئێوارانیش منی دەنارد. من لە تەنیشت خاڵە نەجمەددین، هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، کە لەو تازیەیەدا گەورەترین کوڕی شێخ کەریم بوو، دانیشتبووم. ئەویش لەگەڵم کەوتە گفتوگۆ و زۆر شتی لێ پرسیم لە بارەی فەلەکەوە کە بە چاکیم دەزانی و لە مەکتەب و لە خوێندننەوە و بیستنی دەرەوەی مەکتەبەوە سەرەدەریم لێ دەکرد و دانەدەمام، بەڕاشکاوی وەڵامم دەدایەوە و مەجلیسەکەش سەرلەبەری گوێی گرتبووە ئەو وتووێژەی نێوان پیرێکی سەربەرماڵی 65 ساڵی و منداڵێکی 12-13 ساڵی. خاڵە سەدر، کە برا چووکی خاڵە نەجمەددین بوو لە دوورایی سی مەترێکەوە دانیشتبوو، شەخسێک (ئێستاکە نازانم کێ بوو) بە دەنگی نزمەوە لێی پرسی و گوتی ئەرێ پێم ناڵێی قازانجی ئەو مەکتەبە چییە؟ من چونکە بەر ئەو پرسیارە دەکەوتم باشم گوێ لە قسەکانیان بوو، خاڵە سەدر پێی گوتەوە، قازانجی مەکتەب ئەوەیە منداڵێکی وەها

لەگەڵ شێخێکی وەکوو کاکمدا دەدوێت و من و تۆش تێیان ناگەین. بڕوا دەکەم خاڵە سەدر لەو وەڵامەیدا مەبەستی بوو لایەنگیریم بە زیادەوە بکات دەنا بێگومان ئەگەر دڵی دابایە ئەو وتووێژە باشی تێدەگەیشت.

ئیشکالێکی زۆر گەورە بۆ من لەو تەمەنەدا ئەوە بوو کەوا گەلێک جاران باوکم لە جیاتی خۆی بۆ شوێنی ئەوتۆی دەهەناردم کە هەر پیاوی گەڕایەوە لێی چاوەڕوان دەکرا بە سیفەتی «براگەورە» تێیدا بەشداری بکات. وەها ڕێک دەکەوت پیاوە هەرە گەورەکانی کۆیێ بە خۆیان و دەستە و دایەرە یانەوە ئامادەی کۆبوونەوەی ئەوتۆیی، چ شین چ شایی، دەبوون کە من تێیدا نوێنەری باوکم دەبووم، ئەوانیش لەبەر حورمەتی باوکم لە هەموو هەڵستان و بزووتنەوە و دانیشتنێکدا منیان پێش خۆیان دەیەخست ئیتر هەر منداڵێکی وەکوو ئەوسای من دەیزانی لە هەڵکەوتی وەهادا چەند زەحمەتە لە ئسووڵی دەقگرتوو هەڵە نەکات. جارێکیان کەوا منداڵ بووم بەو جۆرەی هەموو ئسووڵی نوێژ فێر نەبوو بووم چوومە سەر داوەتی گوێزانەوەی بووکێک، نوێژی ئێوارە بە جەماعەت دەکرا منیش بە هەموو عومرم نوێژی جەماعەتم نەکردبوو. ڕەکعەتی سێییەم کە لە بەر خۆمەوە «تحیات» م تەواو کرد نەمزانی چ بکەم، بەینێک بێ خوێندن ڕاوەستام مەلای پێشنوێژ درێژەی دایە نوێژی خۆی، منیش نەمکردە تەنبەلی سەلامم دایەوە و ڕاستبوومەوە بۆ سەر ئەو شوێنەی لە سەرووی خەڵقەکەوە پێشتر لێی دانیشتبووم. کەس لە ڕووی نەدام بەڵام دەبێ خەیاڵێکیان لەو ڕەفتارەم کردبێ، بەڵکوو وەهایان زانیوە کەوا بە بیرمدا هاتۆتەوە دەستنوێژم نەبووە! چەندین جار وەها دەبوو لە باری ئەوتۆییدا مەلای پێشنوێژ ئیلحاحی دەکرد من بەو منداڵیمەوە ببمە ئیمام بەڵام لێم نەدەسەلماندن نەک لەبەر شەرم و ترس بەڵکوو چونکە نەمدەزانی چۆن ڕێ بکەم و جگە لە فاتیحە چی بخوێنم. بەڵام خۆم ناچار دیت فێری چەند ئایەتی کورتیلەی و دوعای پێش ئیمامەتی ببم نەکا تووش بێم. ڕاستییەکەی تووشیش هاتم، لە داوەتێکی ژنگوێستنەوەدا، نیوەڕۆژەمان لە ماڵی زاوا کرد، بەر لە نان خواردن بانگی نیوەڕۆی دا و ديندارە بێفێڵەکان پێیان داگرت لەسەر ئەوەی نوێژی جەماعەت بکرێ، مام حاجییەک وەکوو قیروبنێشت پێوەم نووسا و قۆڵی گرتم خستمیە شوێنی ئیمامەوە منیش وەکوو سندرقۆق بەو تەمەنە شلکەمەوە ملم نایە خوێندنی «اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة...». لە ڕەکعەتی یەکەم، بە خامۆش، «انا اعطیناک

الکوثر...» و لە هی دووەمیش «قل هو الله...» م خوێند و لە هیممەتی چاک و پیران ئەو چەڵەمەیەم تێپەڕاند بەڵام چ جاری دیکە تووش نەهاتمەوە. ئەگەر لەگەڵ ماممدا نوێنەرایەتی باوکمم کردبایە ئیشم باش دەبوو چونکە ئەو وەکالەتی باوکمی دەکرد لە ڕەسمیاتی شەکلی و ئایینی ئەو جۆرە هەڵکەوتانەدا، هەر ئەوەندە بوو لە خەڵقەکەی دەگەیاند کە من لە جیاتی باوکم بۆ ئەو شوێنە چووم.

شەخسییەتی باوکم لە لایێکەوە زۆر یارمەتی دەدام لە ناو منداڵاندا کە هیچ کامێکیان بێدڵیم نەکەن و لە قسەم دەرنەچن و نازیشم بکێشن، لە لایێکی دیکەشەوە مەیدانی ئازادیی گەمەوگەپی لێ وەتەنگ دەهێنام چونکە بۆ یەکێکی وەکوو من، کە ڕۆژێک پێشتر نوێنەرایەتیی باوکمم لە قەڵەباڵغی پیاوماقووڵاندا کردبێ گەلێک ناقۆلا خۆی دەنواند کە لە جگێنە و تۆپێنەی منداڵاندا بدیترێم. ئیتر هەر جارە کە یەکێک لەوانە منیان لەو موناسەبەتەدا دیتبوو بە گەڕەکەکەماندا تیپەڕی بایە من یا زوو خۆم دەشاردەوە کە بە جەگ و تۆپەوەم نەبینێ یان بە جۆرێک کنارگیر ڕادەوەستام وابزانێ سەیری منداڵەکان دەکەم، ئەویش سەلامێکی ڕێکوپێکی لێ دەکردم و وەڵامی لێ وەردەگرتمەوە و تێدەپەڕی.

جارێکیان پیاوماقووڵێکی گەڕەکی خۆمان بە لاماندا تێپەڕی بۆ مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد بە نیازی چوونە مەجلیسی باوکم. منیش ئەو هەڵمات و جگەی لە دەستمدا بوون خستمنە دواوە و ڕاوەستام. کابرا سڵاوی کرد و بە زمانی فەسیح پێی گوتم، کاکە فلان بە خوا لە تۆ ناوەشێتەوە کەلایانێ (هەڵمات) لەگەڵ منداڵان بکەی. وەی کە کاری تێکردم و کوژاندمییەوە. پەنجەکانی ئەو دەستەم کە جگ و کەلاکەی تێدا بوو شل بوونەوە و چی لە دەستمدا بوون لە دواوەوە ترپ بەربوونەوە سەر زەوی.

ئێستاکە کە بۆ یادی ئەو دەمە دەچمەوە هەستی ناڕاحەتی و خۆ بە مەغدوور زانین دەکەم، بە ڕاستیش ستەمدیدە بووم چونکە گەمەوگەپ لە خوێنی دەماری منداڵاندا هاتوچۆ دەکا کە لێی مەنع کردن وەک ئەوەیە ماسی لە ئاو مەنع کەیت. چ بڵێم، ئەمە چارەنووسم بوو. هاوڕێکانم لەو بەندە ڕزگار بوون و گوێیان نە دەدایە هاموشۆکەر، کەچی من لە هەر شوێنێک تووشی پیاوی گەورەی ئەو ڕۆژگارەی کۆیێ هاتبامایە مامڵەتی پیاوانیان لەگەڵدا دەکردم بە سەلام کردن و ئەحواڵ پرسینەوە چونکە هەموویان دەیانناسیم هەرچەند من هەموویانم نەدەناسی.

ساڵی یەکەمی خوێندنم بەسەرچوو، گەیشتینە پشووی هاوینە. بێ ئەوەی من ئاگاداربم بڕیارێک درابوو لەماڵمان ڕووپەڕەیەکی نوێی لەو هاوینەدا هەڵدایەوە کەوا بۆ تەمەنی ئەوسام سەیروسەمەرە بوو. دایکم، بە ئیزنی باوکم سەردانی سندۆڵانی دەکرد کە نیشنگەی باب و باپیرەکانی بوو، خوشکم یاعیفەتیش ببووە نەوبووکی ماڵی حاجی سەیدگوڵ، مامی دایکم. لە ئاڵقەی پێشووتر باسم کرد کە شێخ حەسەنی حاجی سەیدگوڵ ئەو خوشکەمی مارە کرد. لە سندۆڵانەوە شێخ حسێن و فەقێ وەسمانی سەرکاری ئیش و کەسابەتیان و حەسەنی خانمێ کە پێشخزمەت و خەزووری فەقێ وەسمانیش بوو لەگەڵ چەند بەردەستێکی بە قەتاری ولاغانەوە هاتن بۆ کۆیێ.

بە هاتنی ئەوان من زانیم سەفەری پژدەرمان لە پێشە. ڕۆژێکیان بارووتە لێک نران و عەسری دابوو لە ڕێی چاکی هەیبەسوڵتانەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بەڕێ کەوتین. لەو سەفەرەدا جگە لە دایکم و نەجیبەی خوشکم و من، یاعیسمەت و فەتحی و کافیە و عەیشێ (لە ئاڵقەی پێشووتردا باسیان هاتووە) بەشدار بوون. چەند پیاوێکیش، کە لەواندا هەر کاک تاهیری حەمەلاڵم بەبیردا دێت، بە ناوی ئاگاداری و خەبەرهێنانەوەی دوای گەیشتنمان لەگەڵمان بوون. چونکە ئافرەت و منداڵ و ولاغی بار لەو قافڵەیەدا هەبوون نەختێک بە تەنبەڵی دەڕۆیشتین بۆیە بوو کە گەیشتینە ئەو ئاستەنگەی پێی دەڵێن تەنگی خدران تاریک داهات و سەلامەتی خەڵقەکە بەند بوو بە هێزی چاوی ولاغەکانەوە.

کاک تاهیری حەمەلاڵ لەو شوێنەوە هەتا نزیکی خدران کە خەتەری هەڵدێران و خلیسک بردنی ولاغ نەما منی بە کۆڵی خۆی هەڵگرت، لێش نەگەڕا کەسی دیکە نۆرەی لەگەڵدا بکات. ئەمانەتی باوکم بووم دڵی ڕەوای نەدەدا تەسلیمی کەسی دیکەی بکات. شەو لە ماڵی سمایلاغای مەلا ئەحمەداغای غەفووری، کە مدیر ناحیەی خدران بوو، مێوان بووین، بەڵام هەر بە ناو پێمان دەگوترا میوان چونکە سمایلاغا هەم بە دڵ باوکمی خۆشدەویست هەم زۆریش دۆستی بنەماڵەی سندۆڵان بوو، خێزانەکەشی هێندەی خوشک بۆ خوشک لەگەڵ دایکم ئاشنا بوو، ئەهلی ماڵەوەشمانی یەکە بەیەکە دەناسی.

بەبیرم نایە ئەو شەوە چۆن بەسەرچوو. لەبەر ماندووبوون زوو خەوتم تا سبەینێ. دوای بەرچایی کەوتینە ڕێگە بەرەو دەربەندی سەنگەسەر کە پێی دەگوتری

«دەربەندی ڕەمکان». نیوەڕۆژەمان بردە ماڵی کاکەمینە لە دێی تۆبەکاران (ئەگەر لەناوی دێیەکە سەهوم نەکردبێ). وابزانم بەر لەوەی بگەینە ئەو قۆناغە ئافرەتێکمان لە پەڕینەوەی ڕووبارێک کەوتە ناو ئاو بەڵام سەلامەت بوو، لە پێکەنینی گشتی بەولاوە چ زەرەرێکی لێ پەیدا نەبوو.

ماڵی کاکەمینەش هەر دۆست و ناسیاو و ئاشنا بوون زۆریان خزمەت کردین. دیمەنی ئەو ناوە کە هاتبێتە بەر چاوی ئەو تەمەنەم کمێکی لێ یاد دەکەمەوە. پووشی بیتوێن بە دەوری ڕێگەوە بەشی هەرە هەرە زۆری چەشمەندازی ڕێبوارێکی وەکوو من بوو کە ئەوسا چاوم نەیدەبڕیە دیمەنی دوور. قەمیشەڵانی ئەو قۆپیانەشم دێتەوە یاد کە لێیان دەپەڕینەوە بەڵام نازانم کامیان کامە و چی پێ گوتراوە.

بەهەمەحاڵ دیسانەوە دمەو عەسر بەڕێ کەوتین. کە لە دەربەند ئاودیو بووین بۆ پژدەر گۆڕانی تەواو بە سەر باری ڕێگە و دەوروبەردا هات. ئەوەندەی کە ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سندۆڵان دنیای گەشی هاتە بەرچاوان، تومەز لەو ماوەیەدا چەند ڕووباری گەورە و سەرچاوە ئاو هەیە شیناوردی لەبەر دەکرێ و چەم و چەمەڵێنی تەبیعیشی بە دەورەوە دەڕوێت کە هەمووی هەر سەوزایی و تەڕاییە، هەمیشەش شینایی چەمەکانی قەراغ زێی گچکە کە بە زۆری لە ڕێگاوە دەدیترا پانۆرامایەکی سەوزی لە مێشکمدا نەقش بەستوو دەکرد. ئەوسا لە تێکڕای دیمەنی سەوزەوە خەیاڵی خۆشی و زەنویریم بە دڵدا دەهات و دواتر تێی گەیشتم کە هۆی ئەو سەوزاییە دەچێتەوە بۆ ڕووبار و کانیاو و زێ، خۆ ئەگەر لێک بدەینەوە چۆن لە ماوەی دە دەقیقەدا پووشی وشکی بیتوێن دەگۆڕێ بە تەڕایی و سەوزایی مافی ئەوەم دەدرێتێ کە لەو تەمەنەدا سەوزایی پژدەر سەرنجی منداڵانەی ڕاکێشابم.

بێتوێن ئەوسا زۆر چۆڵ بوو، ئاوەکانی بەزۆری لە برنج (مەرەزە) سەرف دەکران وەهاش ڕێککەوت ئەو ساڵە هیچ قاڵبە مەرەزە نەکەوتە سەر ڕێگەمان لە زەردایی و وشکایی پوشەکە کەم بکاتەوە. ڕەنگە هۆیەکی دیکەشی هەبێ کاری خۆی کردبی، ئێمە ئەوەندەی کە لە بیتوێن بووین لە گەرمای چێشتەنگاو و نیوەڕۆدا ڕامانبوارد، کە گەیشتینە دیوی پژدەر عەسرێکی فێنک بوو، پشتەوڕۆژیش دەڕۆیشتین بە پێچەوانە سەفەری دانی سبەینەمان کە لە خدرانەوە بەرەو بیتوێن بەڕێ کەوتین، هەموو ڕۆیشتنمان ڕووەوڕۆژ بوو. بە کورتی، من کە گەیشتمە سندۆڵان بە خەیاڵی فێنکایی و شینایی و تەڕاییەوە لە وڵاغ دابەزیم. ماڵی شێخ حەسەن و شێخ حسێن

(شێخ حسێن جارێ ژنی نەهێنابوو) ماڵێکی قەوغای بە هاتوبات و مێوان بوو. ئایشەخانی دایکی شێخ حەسەن و شێخ حسێن کچی حاجی ڕەسواغای براگەورەی تایەفەی مەحمووداغا بوو لە پژدەر، ئافرەتێکی بەشەخسیەت و کارامە بوو. هەم لەبەر شکۆی ئەو شەخسیەتە و هەم بە پشت و قوەتی تایەفەی مەحمووداغا ڕێی نەدابوو چ کەمایەتی و نشوست بێتە بەر ئەو بنەماڵەیە لە دوای شەهیدبوونی حاجی سەیدگوڵ. ئەو دوو کوڕەی لە منداڵییەوە بێ باوک پێگەیاندن و ماڵەکەشی هەمیشە بە قەدەر ماڵی دەستڕۆیشتووە هەرە گەورەکانی پژدەر بە چەک و نۆکەر و وڵاغ قەتار و مێگەل ڕاگرت. تەکیەشی بە ئاوەدانی هێشتەوە هەرچەند هیچ یەکێک لەو دوو کوڕە نەبوونە شێخی بەرماڵنشین.

من وردییاتی ژییانی ڕۆژانەی ئەوسای سندۆڵانم بە بیر نایەتەوە بەڵام دروشمی هەر دیاری ئەو ژییانە قەڵەباڵغی و مێوان و هاتوبات بوو. لە سندۆڵان زۆر نەماینەوە لەگەڵ تێکڕای ماڵی حاجی سەید، کە دەکاتەوە ماڵی ئایشەخان، بەرەو فێنکایی ناو شاخەکانی پژدەر هەڵکشاین. بە عادەت ئەو ماڵەی هاوینان دەچێتە کوێستان بایی بەڕێوەبردنی کەسابەتی وەرزی ساڵ ئیشکەر و وەکیل لە گەرمێن بەجێ دەهێڵێ، لەوە بەولاوە بە ماڵ و مەڕ و دەستوپێ و نۆکەرەوە بۆ کوێستان بەڕێ دەکەوێ. ئەو ساڵەشی چونکە ئێمە لەگەڵدا بووین و دەزاندرا لە ساڵان پتر مێوان ڕوویان دەنێ بە بارگەی قورسەوە بەرەو ناو شاخ بزووتین. نازانم تا گەیشتینە دێی هێرۆ کە هی حاجی ڕەسواغا بوو و مەحمووداغای کوڕی (سێییەم کوڕی بوو) سەرپەرشتیی دەکرد، بە کوێدا چووین و لە کوێمان لادا. چەند ڕۆژێکی خۆشمان لە هێرۆ ڕابوارد هەتا جێگەمان بۆ سازدرا لە مەزاری «بەکاوی سەروو». ئەم «بەکاو»ە بە پاڵ شاخی لای ڕۆژهەڵاتی هێرۆوە لە بەرزایی 150 مەترێک، دەشتاییەکی درێژۆکەیە بە سەر پژدەردا دەنوڕێ و بەشێکی بیتوێن و بەولاوەتر ڕیزە شاخی هەیبەسوڵتانیشی لێوە دیارە تەنانەت بە دووربین هەموو گردۆڵکەکانی هاوینەوارەکەی خۆمان، چنارۆکی مەلایانیش دەخوێندەوە. ئاوی سارد و سازگار و لەوەڕی چاکی هەبوو. کەپر و ساباتی ماڵەوە و دیوەخانە بە تێروپڕی بایی ئەوەی لە هەموو پێویستێک زیاد بێ هەڵنرا بوون. هەتا لە هێرۆ بووین ماڵی مەحمووداغای حاجی ڕەسواغا زۆرمان پێوە خەریک بوون، دێیەکەش بە داروبار و ئاوی سازگار و قەڵەباڵغیشە. چاکێکی لێیە مەرقەدی بۆ دروست کراوە پێی دەگوترێ «شێخ بائومەر» خەڵقەکەی ئەو

ناوە و هەموو پژدەر زۆریان بەلاوە «مقدس» بوو، کەس بیری لەوە نەدەکردەوە دەستی نائەمینی بۆ ئەو ناوماڵە جۆراجۆرەی کوێستانییەکان بە دەوری مەرقەدەکەوە جێی دەهێڵن، درێژ بکات. سوێندی گەورەی خەڵقی دێی هێرۆ ئەوە بوو دەیان گوت «بە دۆڵی بەئۆمەری».

هەر ئەوەندە لە «بەکاو» نیشتەجێ بووین مێوان سەری کرد، بەتایبەتی لە تایەفەی مەحموداغا و ئەو تایەفانەی دۆست بوون بەو تایەفەوە. کە حاجی ڕەسواغای باوکی ئایشەخان هات بە دەنگی بڵند لە دیوەخانەوە ڕایگەیاند و گوتی: ئایش ئەمن بەکاو-م نەداوە بە تۆ دامە بە حەبەخان (مەبەستی داکم بوو). کوڕانی حاجی ڕەسواغا، پیرۆتاغا، خدراغا، مەحموداغا، سەلیماغا و حەمەداغا بەزۆری لە خزمەت باوکییاندا سەریان لێ دەدایین وەهاش دەبوو یەک و دوویان بە جودا دەهاتنە لامان. سەلیماغا ئەوسا جحێڵ بوو، ڕەنگە جارێ ژنیشی نەهێنابێ، خۆی فێری ناڵبەندی کردبوو، جێگەیەکی ئەوی لێبایە پێویستی بە ناڵبەند نەدەما. ڕۆژێکیان هەندێک لەو ئاغا و بەچکە ئاغایانە دەیاندوواندم و لەگەڵمدا دەکەوتنە دەمەتەقە لەسەر بەراورد کردن لەنێوان پژدەر و کۆیێ، ئەوان بۆ پژدەریان دادەشکاند منیش بایی توانام لەسەر کۆیەم دەکردەوە. سەلیماغا ویستی لەو وتووێژەدا بەرِی خۆی بهاوێتە مزگەوت. گورج پێم گوت ئەتۆ حەقی قسانت نییە ناڵبەندییەکەت بکە... لەو عومرەدا قسەکە خۆش هات خەڵقەکە پێیان خۆش بوو، بەر لە هەموان سەلیماغا خۆی.

من هۆشی ئەوەم نەبوو بزانم باری گوزەرانی تێکڕایی ناوچەی پژدەر چۆنە وەیا ئەرکی مسکێنەکان لە چ ڕادەیەکدایە، بەڵام دەمدیت ئاغاکانیان پۆشتە و پەرداغن و هەر قۆناغێکی بۆی چووبین تێر و بەتاقم و تەدارەک بوو، خۆ لەلایەن چەک و وڵاغە باشەوە پژدەری ئەوسا دەتگوت قشڵەی عەسکەرە. تیپ تیپ، ئەو سوارانە بە سەردانە یەکدی یان بۆ ئیشوکاری عەشرەتی و حکوومەتی لە ڕێگەوبانان چریسکەی سیلاحیان دەهات و بە دەم ڕێگاوە بە تاژی ڕاوە کەروێشکیان دەکرد. دەتگوت لە خەمی دنیا ڕەهان. ئەو بەینەی لە بەکاو بووین ڕۆژانە نیشان دادەکرا و تفەنگچییە جحێڵەکان دەستوقامی خۆیانیان تاقی دەکردەوە، یان چەند سوارێک هەر جارە بە مەیدان دەهاتن دا بزانن کێ گرۆ دەباتەوە. لەبیرمە ڕۆژێکیان سێ جاران

ولاغیان بە مەیدان هێنان هەر سێ جاران مەحموودی عەباساغای مەحmoودئاغا پێشکەوتەوە.

عەباساغای مەحموودئاغا برا گچکەی حاجی ڕەسواغا بوو بەڵام سەرۆکایەتیی تایەفەی مەحموودئاغا بەو سپێررابوو، کاروباری ئیدارەی تایەفەکە و بەشداری کردن لە هەڵسووڕاندنی چەرخ و بازاڕی تێکڕایی عەشیرەتی میراودەلی و ناوچەی پژدەر ئەو بە ئەستۆیەوە گرتبوو. لەو ماوەیەدا هاتە لامان، پێشتریش ناوم بیستبوو بایی ئەوەی کە بزانم یەکێکە لە دوو سەرۆکە هەرە بەرچاوەکانی پژدەر. ئەوی دیکەیان بابەکراغای سەلیماغا بوو، تایەفەکەش هەر بە ناوی سەلیماغاوە مەشوور بوو. کە عەباساغام دیت و لێم بیست هەر ئەوە دەرچوو کە پێشتر لە بارەیەوە زانی بووم، تا بڵێی بەرچاو و بەشەخسییەت و قسەخۆش و ڕووکرایەوە بوو. ئەو لەگەڵ خەڵقەکە خەریکی قسە و گەپ و سوحبەت بوو منیش بە تەنیشت شێخ حەسەنەوە دانیشتبووم، بەدەنگی نەرمەوە لە شێخ حەسەنم پرسی، ئایا عەباساغا ئازاترە یان جەمیلاغای کۆیێ؟ لەو تەمەنەدا عەیارەی گرنگی و بایەخ بۆ پیاوان بە لامەوە ئازایی بوو. شێخ حەسەن پێکەنی. عەباساغا گوتی، شێخ حەسەن کاک مەکوودی چی گوت؟ ئەویش پرسیارەکەمی بۆ گێرایەوە. عەباساغاش بەو ڕاوێژە نوکتەساز و ڕەوان و پاراویەوە گوتی، کاک مەسحوودی تەمایەتی بە شەڕم بێنێ (وشەیەکی لەگەڵ ئەو شەڕەدا بەکارهێنا من لێرەدا ڕێ بە خۆم نادەم دووپاتی بکەمەوە، بەڵام لەو دەمەدا خەڵقەکەی خستە سەرپشت لەبەر شیدەتی پێکەنین). ئەمما بابە، کۆیی ئەوەندە دۆڵمە و کفتە و شفتە و سڵقان دەخۆن کێ پێیان دەوەستێ؟ (لە نێوان عەشرەتەکانی ئەو ناوەدا کۆیی مەشوورن بە سڵقاوخۆر).

هەر لەو سەفەرەدا جارێکی دیکە لە هێرۆ عەباساغام دیتەوە خەریکی مەزاق بوو لەگەڵ «مووساشێت» و وەهای پێوە مەشغووڵ بوو دەتگوت چ خەفەتی دنیای نین. مووساشێتم دیتەوە بیر بە وێنە و شێوەی ئاخاوتن و شکڵی شێتایەتی کە بە سەر و ڕوویدا دیار بوو، بەڵام هەتا بڵێی ئێسکسووک بوو، قسەشی لەسەر شانان قورس نەبوو، دەستیشی نەدەوەشاند. کە ئێمەی دەدیت دەیگوت، کۆیی هاتن حۆری هاتن، قومری هاتن... ئتر بەم جۆرە وەکوو پێدا هەڵگوتنی بێ مەبەس دەکەوتە سەر نەزمی قسەی ئەوتۆیی.

ڕۆژێک لە بەکاو وا ڕێککەوت لە دەمی بێ مێوانیدا ڕێوییەک ڕای کرد. شێخ حەسەن دەنگی تاژییانی دا و کەوتنە شوێن ڕێوی، من و نەجیبەی خوشکم و فەتحیش بەگەڵ کەوتین، ڕێوی لە پێشەوە و تاژی بە دواوە و ئێمەش لە دوا ئەوانەوە. ماوەیەکی باش تاژییەکان ڕێوییان هەڵبڕی هەتا دەستی شاخی گرت و لە نێو تاشە بەردان بزر بوو. هەرچەند لەو هەڕا کردنە بە پشووەدا هەر شەکەتیمان بۆ مایەوە بەڵام دواتر کە لە کۆیێ فەتحی بە زمانە شرمپڕمەکەی خۆی موناسەبەی دۆزیەوە بۆ باسی ڕاوەڕێوی وەهای تێک هەڵشێلا تا ئێستاش لە کرانەوەیدا پێکەنین دەمانگرێ. فەتحی ڕووی لە برادەرەکانی گەپی ئێوارانەی کرد و بە مەبەسی خۆ هەڵکێشان لێی پرسین، ئەنگۆ دەزانن ڕاوی ماوی کوو دەبێ؟ گوتیان، کوو دەبێ؟ گوتی، هەر تاژیت دیت و غاری دەیێ. خەڵقەکە لە قاقایاندا، کوردی گوتەنی دەست و پێت بڕیبانایەوە بە خۆ نەدەهاتنەوە. هەرچەند تێشینەگەیشتن چ دەڵێ، بەڵام من و ئەوی وەکوو من لە ئەهلی ماڵەوە شارەزای بوون زانیمان مەبەستییەتی بڵێ، دەزانن ڕاوی ڕێوی کوو دەبێ؟ هەر ڕێویت دیت و تاژی تێبەردە.

نابێ لە بیر بکەم، ئێمە، دوو ماڵی حاجی سەیدگوڵ و مێوانەکانیان، کە خۆمان بووین، لە گوێستنەوەمان بەرەو شاخەکان، بە خواییشتی ئایشەخانی حاجی سەیدگوڵ هەرچی ئافرەتێکی لە قافڵەکەدا بوو چەندێکی خشڵی زێڕ و زیوی هەبووبێ بە خۆیەوە کردبوو تا ئەوەی لە دوورەوە چریسکەییان دەهات منیش لەو جارەدا وەهام پێ خۆش بوو سواری بارگەی گوێدرێژێک ببم بە تەنها نەک لە پاشکۆی سوارێک یان لە بەردەمی یا عیسمەت. پرچ و کاکۆڵێکی درێژیشم هەبوو کە لە ناو عەشیرەتدا ببڕای ببڕای بە هیچ منداڵێکەوە نە دیترا. ئەم وەزعەی من کە بە پرچ و کاکۆڵەوە سواری بارگەی کەر بووم وەهای لە خەڵقی هێندێ دێی سەر ڕێگامان کردبوو کە ئێمە بە دۆم و خەڕات بزانن، ئیتر بێ ئەوەی ئێمە خەبەرمان هەبێ بە ناو خەڵقدا بڵاوبووبۆوە کە هۆبەیەکی خەڕاتی زۆر بە زێڕ و تاقمی ڕێکەوە هاتوون بەرەو ناو شاخەکان ڕۆییشتن. ڕۆژێک لە بەکاو چەند ئافرەتێک پەیدا بوون، هاتن بەرەو ساباتی دیوەخانە و ماڵێ هەتا گەیشتنە ناو خەڵقەکە. دیار بوو دوودڵییان لێ پەیدا بووبوو چونکە ئەو هەموو وڵاخ و نۆکەر و تفەنگ و چەکی باش بابەتی دۆم و خەڕات نییە. لە دەمی کەپرەکان سڵامیان لەو پیاوانە کرد کە ڕاوەستابوون و لێیان پرسین ئاخۆ ئەوەندە دەمێننەوە چەند کاسە و کۆتک و کەچکیان بۆ دروست بکەن.

فەقێ وەسمان زوو تێیانگەیشت بە ماڵە خەڕاتمان تێگەیشتوون پێیی گوتبوون ئەو سوئالە داک وەستا دەتوانێ جەوابی بداتەوە پرسییان داک وەستا لە کوێیە، ئەویش ڕێی ساباتی ماڵەوەی نیشان دان. ئافرەتەکان هاتنە بن ساباتەکە و دەستێک لە پێش قاچییێک لە پاش، سڵاوییان کرد و مەعلووم بوو بۆچی هاتوون، ئیتر ئەو ئافرەتانەی لای ئایشەخان و دایکم لێیان کەوتنە فێڵبازی و بەدەم مامڵەت کردنەوە بە پرسیاران وەهایان سەرشێت کردن نەیان دەزانی چۆناوچۆنی مامڵەتی کەچک لە هی کۆتک جودا بکەوە... لە دوایی کە تێگەیشتن ئەمە ماڵی حاجی سەیدگوڵی سندۆڵان و مەلای کۆیەیە وشک بوون. وەک قانگەلاچک بەدەم ڕەشەباوە پەرتەوازەیان کرد و هەتا دیار بوون بە غار ڕۆیشن و ئاوڕیان نەداوە... بەینێک ئەو مەسەلەیە لە بەکاو بەسەر زارانەوە بوو، ئایشەخانیان بانگ دەکرد بە داک وەستا و دۆمانە و خەڕاتانە لەگەڵ یەکدی وتووێژیان دەکرد، کاکۆڵ و پرچم ئەو هاوینە دەورێکی مێژوویيان گێڕا.

لەلایەن عادەتی خواردنەوە، عەشایری ئەو ناوە داب و دەستوورێکی قەراردادەیان هەیە زۆرم بە لاوە شیرنە. جەمی نیوەڕۆ بۆ مێوان چێشت لێنان، بە هێلکەوڕۆن یان ماست و پەنیر، هەندێ نیوەڕۆش بە کەباب جەم بەڕێ دەکەن. «کەباب» بە گۆشتی برژاو دەگوترێ کە دەکاتەوە «تککە»، لە ڕاستیشدا وشەی «کەباب» بە واتای گۆشتی برژاو دێت هەر بۆیەشە لە تەمسیلی میسریەکان دەبینین لە وشەی «کەباب» مەبەستیان «تککە» یە. پژدەر بۆ ئەوەی شارەکان پێی دەڵێن کەباب وشەی «کەبابی کوت» واتە کوتراو بەکاردەهێنن. میسریش پێی دەڵێن «کفتە» کە هەر دەکاتەوە «کوت» ـەکەی پژدەر. لە دیوەخانەی بەکاو لەبەر ئێمە عادەتەکە گۆڕابوو. ئەگەر میوان نەبایە چێشت لێدەندرا دەنا هەمیشە ئەو کەبابە جەمی نیوەڕۆ بوو. لە بیرمە حاجی ڕەسواغا کە دەهاتە بەکاو نەرمۆک و دونگی بەرخێکیان بۆ دەکردە کەباب- تککە. تەنها منیشی لەگەڵدا شەریک دەبووم چونکە لە نێو عەشیرەتدا یەک سینی دوو کەسی بەسەرەوە دەبێ. حاجی ڕەسواغا بەدەنێکی زلەی هەبوو بەر و گەدیشی بۆ خواردن بە بەریانەوە هەبوو، لە هەر کەسێک مێوان بایە حیسابی حاجی ڕەسواغای دەکرد. لەبەر قورسایی لەشی هەمیشە بە سواری ئێستر سەفەری دەکرد، ئەو ئێسترەی کە سواریشی پێ دەکرد شتێکی هەڵکەوتوو بوو، هەم لەلایەن هێزەوە و هەم لەلایەن دامەزراوی و بێساتمەیی و مەعلانیشەوە.

مەجلیسی حاجی ڕەسواغا ئەو خۆش و بەتامە بوو کە هیچ پێوەندیی بە لەشی ئەستوورییەوە نەبێ. ئەغڵەب کوڕە گەورەکەی، پیرۆتاغای لەگەڵدا بوو. ئەوسا پیرۆتاغا لە تەمەنی کامڵیدا بوو، سمێڵێکی بە شکۆ و شەوکەتی هەبوو لە چیلچیلەی گوێی تێپەڕی بوو. دەیانگوت زووتر، لە پاشەسەری دەگەیشتنەوە یەکدی، دواتر، پاش چەندین ساڵ، ئەوەندەی شیعرەکەی حاجی قادر کە دەڵێ: «شەوکەتی جووتەی سمێڵت تاکە، مانەندی کەمە» هاتبێتە بەرچاو و فکرم یادی ئەو سمێڵەی پیرۆتاغام کردۆتەوە. سەرەڕای جوانیی ئەو سمێڵەی پیرۆتاغا سوارچاکێکی بەناوبانگ بوو، تەنانەت ڕۆژێکیان کە حاجی ڕەسواغا و کوڕانی لامان بوون شێخ حەسەن سواری ئەسپێکی زۆر باش بوو لە بەردەمی ساباتی دیوەخانە چەند سەرێکیان هاتوچۆی کرد. پیرۆتاغا، کە خاڵی شێخ حەسەن بوو، بانگی کرد، شێخ حەسەن وەرە سەر بەرماڵەکەت تەبیاتی ئەسپەکە تێک مەدە. شێخ حەسەنیش لێی سەلماند و ئەسپەکەی پێ دا، پیرۆتاغا لێ سوار بوو بەینێک تەعلیمی بە وڵاغەکە کرد بەڕاستی دەتگوت شەکرە هێندە شیرن بوو.

کوڕی دووەمی حاجی ڕەسواغا ناوی خدراغا بوو، ئەسەری شەپڕۆیەکی سووکی بەسەر دەم و لێوانەوە مابوو بەڵام تابڵێی قسەخۆش بوو. ئەوسا لە بەهرەی قسەخۆشیەکەی بەڵەد نەبووم دوای چارەکە سەدەیەک بە هاتوچۆی بەردەوام بۆ پژدەر لێی شارەزا بووم و بووینە برادەری جانیبەجانی. خدراغا لێیان دەگێڕایەوە کە لەگەڵ ورچ تێک ئاڵاوە و بە خەنجەر ورچەکەی کوشتووە، دواتر خۆی بۆمی گێرایەوە کە لەگەڵ دوو کەسی دیکە سوێند دەخۆن بەیەکەوە بچن بۆ کوشتنی ورچێکی زەرەری لە مەڕوماڵ دابوو، دووەکەی دی تەڵاقیش دەهاوێن بەڵام خدراغا ئەوسا بێژن بووە. دەچن بۆ ئەو کەرخەی کە بە زۆری ورچەکەی لێ دیتراوە، لە پڕ ورچەکە لە بن بەرد و تەڕاشی ژێر پێیانەوە، بەهۆڕەهۆڕ لێیان هەڵدەستێتە سەر پاشووان. هەردوو برادەرە سوێندخۆرەکەی هەڵدێن بۆ ئەوبەری خڕێکی بە تەنیشتیانەوە بووە تانووتیش لە خدراغا دەدەن خۆ ڕزگار بکا. خدراغا سوێندەکەی لەبیر ناچێ، ورچەکە مێزی لێ دەدا و دەکەوێتە دڕندەیی و هەڵگلۆفتنی، خدراغاش خەریکی خەنجەرکێشان دەبێ، بانگۆز دەبن بۆ لێژایی و لێک جودا دەبنەوە، خۆوتالع خدراغا دەکەوێتە باری سەرەوە و ورچەش لە بەرەژێری ئەو. کە تێک هەڵدەقژێنەوە خدراغا دەرفەتی باشتر بووە و بۆی دەگونجێ ورچەکە بداتە بەر

خەنجەران، ورچەکەی کوشتبوو بەڵام بۆ خۆشی برینی زۆری لە ورچە هەڵگرتبوو بە تەداوی کردن چاک بووبۆوە... خدراغا لە مارت یا نیسانی 1964 کۆچی دوایی کرد.

مەحمووداغا کوڕی سێیەمی حاجی ڕەسواغا، چونکە جیرانمان بوو لە هێرۆ، پتر لەوانی دیکە ئاشنامان بوو. لە زووەوە پێوەی دیار بوو مرۆیەکی لێهاتووە، تەنانەت لە موناسەبەدا کە وەفدی پژدەر دەچێ بۆ تاران و دیدەنی ڕەزاشا (بەر ساڵەی 1927 کە ئێمە لە پژدەر بووین) دەکا، نوێنەری تایەفەی مەحمووداغا ئەو مەحمووداغایە بووە، وەک بشزانم زۆری وتوویژ لەگەڵ ڕەزاشادا ئەو کردبووی. تایەفەی مەحمووداغا بە سەرۆکایەتی عەباسی مەحمووداغا دژی ئینگلیزەکان بوون، تەنانەت لێی هەڵگەڕانەوە و لە نزیک دەربەندی ڕەمکان بە دیوی بیتوێندا شکاندیانن و کوشتارێکی قورسیان لێکردن. مەحمووداغای حاجی ڕەسواغا کە برازای عەباساغا بوو لە پاش مردنی عەباساغا (وابزام ساڵی 1946) بوو بە دەمڕاستی تایەفەی پژدەر و هەمیشەش لە بزووتنەوەی نیشتمانی کوردایەتی نزیک بووە. ساڵی 1955 بە ناکات و لەپڕ کۆچی داویی کرد.

ناوناوە گەڕانی ئێرە و ئەوێمان دەکرد و نیوەڕۆژەمان لای یەکێک لەو خزم و دۆستانە دەخوارد. کە چووینە سەردانی ماڵی خدراغا، وەک لە بیرمە، هۆبەیان لە شوێنێک بوو پێیان دەگوت «قووڵێ گەڵان». فەتحی ئەو ناوەی وەها دەگۆڕی هەموو جاران خەڵقەکەی لە قاقا دەهێنا. کوردی گوتەنی ئەوی ئەو دەیگوت نایەتە گوتنێ، ئەوسا لە کوڕانی خدراغا هەر برایمم دیت، کە سێیەم کوڕی بوو، لە منیش گچکەتر بوو بەکەڵکی برادەریم نەدەهات. عەلی کوڕەگەورەی بوو، ئەو سەفەرە نەمدیت، دوای چەندین ساڵ لە 1940 سەردانی سندۆڵانم کردەوە عەلی خدراغام دیت. عومەر، کوڕی دوەمی، کە من بووم بە نائیب ئەویش لە پژدەر بوو. لە نەوادیری عومەری خدراغا شتێک دەگێڕمەوە خۆمی تێدا تێشکاوبووم. تازە ڕێی ڕانیە بۆ ئۆتۆمبێل کرابۆوە، ڕۆژێکی هاوینە بە تەلەفۆن ڕێک کەوتین کە ئێمە لە کۆیەوە و خاڵەکانم لە ڕانیەوە بچین بۆ چنارۆک و ئەو ڕۆژە ڕاببوێرین. ئێمە بەر لەوان گەیشتینە قۆناغ چونکە ڕێمان نزیکتر بوو، خۆشمان خانەخوێ بووین، منیش لە ژێر جلەکانەوە پەجامەم لەبەر بوو بۆ دەمی حەسانەوە. خاڵەکانم شێخ خدر و شێخ حسێن (کوڕی حاجی سەید) گەیشتن، عومەری خدراغاش لەگەڵیاندا بوو...

دوای بەینێک کەوتینە سەر باری خۆ لێک کێشانەوە و پاڵکەوتن، من جلەکانم لەبەر خۆ داکەند و بە پێجامەوە دانیشتمەوە، عومەری خدراغا کە دیتی کیفێکم داڕنی و کیفێکی دیکەی لە بندا بوو بێ وەستان گوتی فلانەکەس وەڵاهی هەر دەڵێی سەفەرتاسی بوویت... خوا هەڵناگرێ قسەکەی زۆر خۆش بوو ڕەنگە بە هەموو عومریشی هەر سێ چوار قسەی وەهای بۆ هاتبێ.

ئەوسا مەحموداغا کوڕی ئەوتۆی نەبوو لە تەمەنێکدا من بینینم، ڕەنگە جارێ منداڵی نەبووبێ. دایکم پتر مایەوە لە ئێمەی منداڵ و سێ ئافرەتەکەی دیکە، وابزانم یاعیسمت پەلەی کرد ئیتر نازانم لەبەر چی بوو. دەزانم پێش هاتنەوەمان بە ماوەیەک دایکم دڵی بەبەر نەوەستا لە ترسی دڕندەی وەکوو ورچ، من لەسەر زەوی بنووم، کەپریان کرد بۆ نوستنم. ڕەنگە هەر ئەو ترس و تەقیەیە هۆی هاندانی دایەنەکەم بووبی لە پەلە کردن. چەند پیاوێکی ماڵی شێخ حەسەن بەگەڵمان کەوتن و بەرەو گەرمێن بووینەوە، کە لە دەربەند هاتینە دیوی بیتوێن ڕێی گەڕانەوەمان گۆڕی، قۆناغمان بردە ماڵی خاڵە خدرم لە سەیداوای نزیک ڕانیە. کچێکی حەلیمە-ناو و کوڕە گەورەی، جەلال، ئەوە بوون لەگەڵیان بخافڵێین چونکە لە تەمەندا نزیکی یەکدی بووین. من جارێکی دیکە حەلیمەی کچی خاڵم نەدیتەوە هەتا جوانەمەرگ بوو بەڵام لەگەڵ کاک جەلال بە درێژایی ڕۆژگار خزمایی و دۆستایی و براییمان هەتا ئێستاش بەردەوام بووە.

چونکە هەوای ئەو ناوە بیتوێنییە و هاوین گەرمە، یەک شەو ماینەوە و بەڕێکەوتین بۆ چنارۆک، کەپریان حازر کردبوو، یان حازرکرا و لەوێ هاوینەکەی کە مابووی بەسەرمان برد. نازانم چۆناوچۆنی گەڕامەوە کۆیێ و باوکمم دیت. لەو بابەتە هیچم لەبیر نەماوە.

ئەو سەفەرەی پژدەر چاو کردنەوەیەک بوو بۆ من، دنیا هەر ئەوەندە نەبوو کە لە کۆیە و دەوروبەری چاوم پێی دەکەوت، خەڵقیش بە خۆ و داب و دەستوور و جۆری ژیانەوە هەر ئەوانە نەبوون کە لێیان ڕاهاتبووم. ئەو شاخە دوورانەی بە خەیاڵیش تێیاندا نەدەگەڕام سەرنەرم بوون بۆ ژێر سمی وڵاغی کە سوار بووبووم، خاکەکەشی بۆ ژێر بازی یاری و غارێنێم تەسلیمم ڕووی کاغەز لووس و لێک بوو، لە ڕاستیدا بە پووش و دڕک و قەسەڵ و کرتوو و غەرداڵ و قۆپی و ڕەن بانوەکانیەوە لە دەموچاوی ڕق هەڵستاو گرژتربوو. لە دوای ئەو سەفەرەوە کەسانێکی لە پژدەر و

لای ڕانیه دەهاتن، بەلامەوە لە جاران ئاشناتر بوون، باشتریان تێدەگەیشتم. خولاسە بێ ئەوەی ئەوسا بە وردی لە ئاکامی سەفەرەکەم بگەم پەردەیەک لەسەر ڕووی مەجهوول هەڵدرایەوە، چونکە هەرێمی ڕۆژهەڵاتی چنارۆک تا ئەو هاوینە وەک ژووری داخراو بوو. من منداڵانە ئاشنایەتیم بە کۆیە و هێندێ شوێنی وەکوو پیازۆک و جەلییەوە هەبوو بەڵام بە عومری خۆم دوو کیلۆمەتر بەرەو ڕۆژهەڵات لە چنارۆک تێ نەپەڕی بووم، بەو سەفەرە شەقڵی ئەو تەڵەسمبەندەم شکاند.

لە دڵی هەموو منداڵێکدا، بگرە هەموو کەسێکدا، مەیلی زاڵ بوون بەسەر کاری زەحمەتدا هەیە تا ئەوەی وەها دەبێ لە پێناو سەرنەرم کردنی شتێکی مەیلەو دوورەدەست خەڵق خۆی دەهاوێتە مەترسییەوە. بۆ خۆت لێک بدەوە چەند کەس تا ئێستا لە هەوەڵی سەرکەوتنی لووتەشاخە سەرسەختەکان تێ چووە، هەروا بەڕێوەشن بۆ تێچوونی تازەبەتازە، منیش لە تەمەنی هەشت ساڵیمدا مومکین کردنی نامومکینی تێپەڕین بە تەنگی خدران و بڕینی دەشتی بیتوێن و ئاوابوون بە دەربەندا بۆ دیوی پژدەر و گەڕان و ڕاو کردن لە کەمەری شاخەکانی هێندەی شکاندنی تەڵیسمی باغی «فازهر»ی ناو داستانی ئەمیر ئەرسەلان تامەزرۆییمی شکاند. لەوەبەلاوە کە کاروانی توجارەکانی کۆیێ لە ڕانیە و قەڵادزەوە بە چنارۆکدا دەگەڕانەوە بۆ کۆیێ سامی هاتنەوەیان لە دوورستانی ئەرزی مەقەدەس بەسەرمدا نەدەهات. ئنجا چی بوو لە قەڵادزەوە هاتوونەوە، خۆ من چوار سەعاتە ڕێگەش بەولای قەڵادزەوە ڕۆیشتووم. بە تاژییەوە شوێن ڕێویش کەوتووم. لەو ئاوە ساردانەی ناوشاخەکانیشم خواردۆتەوە.

چاک بوو بەر لەوەی کژی بەسەر بچێ ئەم وشەیەی «تاژی» بە بیری هێنامەوە کە شێخ حەسەن سێ تاژی زۆر جوان و پەسەند و نازگیراوی هەبوون ناویان سەقەر، سەرهەنگ و جەیران بوو. زۆر ڕۆژان ئەو تاژییانە دەتگوت لەبەر ئەو خەڵقە دەپارێنەوە بۆ ڕاو، وەها دەبوو لە خۆوە دەچوونە ڕاو بە کەروێشکی مردارەوە دەهاتنەوە، ئەغڵەب کەروێشکەکەشیان دەخستە ئاخوڕی وڵاغەکەی شێخ حەسەنەوە.

بەهەمەحاڵ ئەو گەشتەی پژدەر لە تەجرەبەی منداڵیمدا بازدانێک بوو بۆ دەرەوەی پەرژینی دەوراندەری هەڵسوکەوتی منداڵیم. بگەڕێمەوە بۆ قوتابخانەکەم.

لە سەرەتاکانی خوێندنمدا بووم چەند قوتابییەکی لەوانەی دەیانناسم دوای تێپەڕاندنی ئەزموونی بەکالۆریای پۆلی شەشەم و بەسەرچوونی کژی هاوینە، چوونە بەغدا بۆ خوێندن. لەوانە کاک مەجیدی ئامۆزام و مەلا نافیعی مەلا سەبوح و ڕەفیقی تاهیر چەلەبی بوون. مەلا نافیع لە قوتابخانەی «صنایع» و دووەکەی دیکە لە «سانەوی مەرکەزی» وەرگیران. دوور کەوتنەوەی کاک مەجید هەلێکی ڕێکخست کە کاغەزی بۆ بنووسین و وەڵامی لێ وەربگرینەوە. یەک دوو نوسخە لەو نامانە ماون کە بە خەتی پلەی پۆلی دوەم و فیکری ئەو تەمەنەم نووسیوە. نامەکان، وەک چاوەڕوان دەکرێ، بە کوردی نووسراون، خەتەکەیان دەخوێندرێتەوە، ئیملاکەشیان لە خوێندنی ئەوساوە هاتووە. وردە هەواڵ و نوکتە و سافیلکەی ئەو کاتەیان تێدایە وەک ئەوەی کە داوا لە کاک مەجید دەکەم کاتێک گەڕایەوە بۆ کۆیێ هەندێک سۆراووسپیاو بە دیاری بۆ پلکە ئامینە بهێنێ. ئەم پلکە ئامینەیە ئافرەتێکی سەرسپی ڕووگەشی یارانی بوو، بەشی زۆریساڵی لە ماڵی مامم ڕادەبوارد، چی دەشم دەنووسی بە مەجلیس بۆم دەخوێندەوە و تێروپڕ هەموومان پێدەکەنین. پێکەنینی ئەو سەردەمانە تەمسیلی شارلی شاپلن و عادل ئیمامی نەدەویست. مەلا نافیع مەکتەبی تەواو نەکرد و تەنها ساڵێکی لە بەغدا ڕابوارد.

کاک مەجیدیش، وابزانم لە ساڵی دوەمی خوێندنی، دووچاری قەزاوقەدرێکی خەتەرناک بوو. لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی خۆی لە «شارع الرشيد» بەرەو قۆناغیان دێنەوە، سەرخۆشێک ڕێیان پێدەگرێ و دەکەوێتە مشتومڕی بێهۆشانەی سەرخۆشی لەگەڵیاندا تاکوو یەخەگیری کاک مەجید بووە چەقۆیەکی قەسابانی پێ دەبێ لە پەڵاسووەکانی بن پیلی دەدات برینێکی بێڕەزای تێخستبوو. هەڤاڵەکانی خێرا دەیگەیننە خەستەخانەی مەجیدییە، مامیشم لە بەغدا بووبوو خەبەری دەدەنێ و بەو کاتە ڕادەگا کە دەیبەن بۆ عەملیات. مامم دەیگێڕایەوە دەیگوت یەکێک لە دکتۆرەکان بە دکتۆرێکی دیکەی دەگوت «لولا العظام لفتك بالاحشاء» نەشی دەزانی مامم باوکی ئەو برینداریە. ئەو ڕووداوە بووە هۆی تەگەرە لە خوێندنی کاک مەجید. بەینێک لە خەستەخانە بوو، کە دەرهات خوێندنی پێ نەدەکرا ئیتر ئەو ساڵە هاتەوە کۆیێ. لەبیرمە بە بۆنەی سەلامەتیی کاک مەجید دوای هاتنەوەیان لە بەغدا بە ماوەیەک، مامم مەولوودێکی گەورەی بەڵاگێڕانە کرد تا بڵێی قەوغا و

قەڵەباڵغ بوو. کاک مەجید جارێکی دیکە بۆی نەڕەخسا بچێتەوە بەغدا بۆ خوێندن. دوای تێپەڕینی کژی هاوینە چووە قوتابخانەی ناوەندی لە هەولێر.

مەکتەبی سەرەتایی کۆیێ لەو ساڵانەی کۆتایی 1920 دا شوێنێکی دیاری لە کۆمەڵایەتیدا هەبوو. جگە لە هەندێ مێشکتەسک کە بە هەموو بابەتی تازە قەڵس دەبن، خەڵقی کۆیێ ڕێزیان لە مەکتەب و مامۆستاکان دەنا. قوتابی کە دەگەیشتە پۆلی پێنج و شەش بە چاوێکی تایبەتی سەیر دەکرا و لە ڕێزی «پیاوان» دادەنرا. لە زۆر باردا گوتراوە لێرەشدا دەیڵێمەوە، باوکم پشتگیرییەکی بەهێزی لە مەکتەب دەکرد و بە قسە و بە کردەوەش لە چاکە و پێشخستنی مەکتەبی نوێ خەریک بوو. لە مەجلیسەکانی خۆی و لە دووانەکانی ڕەمەزان زۆر جار باسی مەکتەب و بابەتە بەکەڵکەکانی کتێبە نوێیەکانی دەکرد.

جارێکیان لە سەر مەسەلەیەکی دینی، قوتابییەکی هەژاری ئەوسا ڕەشید عارف کە دواتر بوو بە دەوڵەمەندێکی ناسراوی بەغدا لەگەڵ مامۆستاکەی کە مەشرەبی بۆ لای سەلماندنی هەموو قسەی کۆنینە دەچۆوە، لێیان بووە کێشە و ڕەشید قسەی مامۆستاکەی نەسەلماند. مەسەلەکە گەیشتەوە لای باوکم، بە ئاشکرا و لە قەڵەباڵغیدا باوکم پشتگیری لە ڕایەکەی ڕەشید کرد و کێشەکەی بە قانزاجی ئەو ساغ کردەوە، ڕەشیدیش جارەها و بارەها، تا کۆتایی ژیانی ئەو مەسەلەیەی باس دەکردەوە و خۆی پێ هەڵدەداوە و هەقیشی بوو.

لە هەڵبەستدا باوکم تەمای چاکە و بەرژەوەندی بە قوتابی و قوتابخانەکەیانەوە پێوەندکردووە، ئەمە بەیتێکی نموونەیە لەو هەڵبەستانە:

خاصە نەوباوەکانی مەکتەبی کۆ
دەبنە پشت و پەناهی میللەتی خۆ

مەدحی بابەتەکانی دەرسی مەکتەبی کردووە:

عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە
قالە و قەوەلە گشتی هەبایە

عیلمی کیمیات گەر نەخوێندووە
بەخوا نازانی خوا چی کردووە

لە هەموو ئاهەنگەکانی مەکتەبی سەرەتایی و دواتریش کە قوتابخانەی ناوەندی کرایەوە لە ئاهەنگەکانی ئەوێشدا باوکم حازر دەبوو، زۆر جارانیش گوتاری کردنەوەی ئاهەنگ هی ئەو دەبوو. دوو تەمسیل لە قوتابخانەی سەرەتایی پێشکەش کرا، لە هەردووواندا باوکم بە گوتاری کاریگەر پشتگیری لەو هونەرە کرد تا ئەوەی لە یەکەم جاردا تەمسیلی دانا بە پێداویستێکی سەردەم، لەو ڕووەوە بە یەکێک لە «فروض الكفاية»ی لە قەڵەم دا کە بەپێی فەرمانی ئایین پشتگوێ خستنی دەبێتە تاوانی گشتی وەک ئەوەی کە لە ئاواییدا بانگ نەدرێ یان نوێژ لە سەر مردوو نەکرێ... لەو ئاهەنگانەدا کە باوکم حازر دەبوو هەرچی گەورەپیاو و ناسراوەکانی کۆیەش هەیە پێڕەویان لەوە دەکرد.

قوتابی لەو ساڵانەی بیستەکاندا جلکی کوردییان لەبەر دەکرد، بە دەگمەن نەبێ جلکی ئەفەندییانە بە بەر قوتابییەوە نەدەدیترا مەگەر کوڕە مەئموورێکی غەریبە بووایە کە لە شاری خۆی جلکی تازەی پۆشیبێ، چونکە ئەو غەریبەی لە مووسڵ و بەغداوە هاتبایە هەڵبەت جلکی کوردی لەبەر نەدەکرد، بەڵام تێشیاندا هەبوو کە زۆر دەمانەوە دەبوون بە کۆیی. هەر لە بیرمە ڕۆژێکیان لە دەرسدا بووین مودیر، عەبدولڕەحمان شەرەف، دوو کوڕی نەناسراوی چاکەت و پانتۆڵ لەبەری لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ ژوورەوە. یەکەم نیگام وەها لێیان بە سەهوو چوو سنووری نەبێ: وام هاتە بەرچاو کە یەکجار کەڵەگەتن کەچی بە لای کورتیدا بوون، تومەز ئەمانە کوڕی «مولاحیز»ی تازەی گومرگ، ئەحمەد عیززەتی کەرکووکی، بوون گەورەکەیان مەدحەت و گچکەکەشیان شەوکەت ناو بوون. ئەو دوو کوڕە لە ئاکامدا وەها ئۆگریان بە کۆیەوە گرت و هێندەش تەبیاتخۆش بوون، بەتایبەتی مەدحەتیان، دەتگوت لە هەوەڵەوە خزم بە کۆیێ بوون. ئێستاکە نازانم شەوکەت لە چ دایە بەڵام مەدحەتیان، بەداخەوە، چەند ساڵێکە دووچاری نەخۆشی شەپڕە بووە، کوڕێکی، محەمەد، بۆتە کۆیی و جیرانی خانەخوێی کۆیەمە کە ماڵی کاک مەجیدی ئامۆزامە، مەدحەتیش وابزانم بردرا بۆ سلێمانی. باوکیان هەتا ئینحیساریش لە چلەکاندا داندرا هەر مودیری گومرگ بوو لە کۆیێ و یەکەم سەرۆک لیژنەی فەحسی تووتن لە کۆیێ ئەو بوو.

وابزانم کە یەکەم جار جلکی ئەفەندییانەم لەبەر کرد قوتابیی پۆلی چوارەم بووم، ئەمما برا عەجایەب شەرمێک گرتمی، هەتا لێی ڕاهاتم و شکڵم پێوە گرت. هەر

دەتدیت جلکە کوردییەکەم لەبەر دەکرد یان لە کۆڵانە تووشی ناسیاوێک دەبووم ڕێگەم بە لایەکی دیکەدا دەگۆڕی.

کە گەیشتمە ئەو تەمەنە پرچ و کاکۆڵیشم بڕی بوو. بە باشی دێتەوە یادم، کە پرچەکەم نەما گوڵینگی شەدەی کوردیم بە پێستی مل و بناگوێیان دەکەوت پێی نارەحەت دەبووم هەتا بە چەند ڕۆژان لەویش ڕاهاتم، مووەکانیشیان بەپێی عادەت، بە زێڕ هەڵکێشا و کردیانە سەدەقە. وەستای سەرتاشی ئەو دەمە کە پیاوە ماقووڵەکانی کۆیێ، هەموویان یان زوربەیان سەریان بەو دەتاشی، وەستا مەعرووفی کامەلا بوو. هەر جارە بە خۆ و تاقم و شاگردەوە دەهاتە ماڵمان بۆ سەروقەڵەمی باوکم و تەراشی منیش. لە هاوینیشدا جارێک دەهاتە چنارۆک بۆ ئەو مەبەستە. دوای عەسر بەرەو شار دەبۆوە. ئەو ڕۆژە کە دەهاتە چنارۆک لە بەرژەوەندی ڕۆژانەی دەبوورد.

وەستا مەعرووف لە بنەماڵەیەکی قەدیمی کۆیێ بوو، زۆر ڕێزی لێ دەندرا، دووکانیشی شێوەی دیوەخانەی هەبوو کە ئەگەر یەکێک بەسەر کورسیی تەراشەوە بایە چەندین کەسی دیکە، جغارە بە دەست و چایە لەبەر دەم، لەسەر تەختەکانی دووکان دادەنیشتن و کۆڕی قسە و سوحبەتیان گەرم دەکرد. کوڕە گەورەی وەستا مەعرووف، حەمەدەمین، بەیەک دوو ساڵ یان پتریش لە من گچکەتر بوو، بەڵام ئەو فەرقە لە تەمەنی پاشتردا خۆ نانوێنێ ئیتر بووینە برادەر و لە یەک باوەڕی سیاسیدا خۆمان دیتەوە ئێستاکە لە کۆیێ خانەنشینە. لە نامەی تایبەتیدا بۆی نووسیم کە دایکی «جەمیل سیدقی زەهاوی» پیرۆز خان لە تایەفەی ئەوان بووە، پێشتر دەمزانی کە دایکی جەمیل سدقی کۆیی بووە بەڵام تا ئەو نامەیەی مامۆستا حەمەدەمین بیرم نەدەکردەوە لە تیرە و تایەفەکەی.

جلکی ئەفەندییانە لەو ڕۆژانەدا، فەرمانێکی وەزارەتی مەعاریف لە بەغداوە، بەسەر قوتابییانیدا سەپاند. لە هەوەڵەوە قوتابییە هەڵکشاوەکان بوون بە ئەفەندی بەڵام وردەوردە فەرمانەکە پشتگوێ خرا، ئیتر جلکی قوتابییەکان بوو بە هەرەمە. قوتابیی هەژار هەبوو ئەو جلکەی پێ نەدەکرا، هاوڕێکانیان و خێرومەندان و، تارادەیەک، مامۆستاکان خۆیان بە بارمتە جلکیان بۆ کردن، چاوپۆشیشیان لە هەندێکیان کرد.

له پۆلی یەکەم یا دوەم بووم قوتابییەکی هاوتەمەنم له ڕەواندوزەوە هات. باوکی، نووری باوێلاغا، کرا بە معاون شورتەی کۆیێ. دوو کوڕی هەبوو، گەورەکەیان ناوی سەباح بوو له ئێمە هەڵکشاوتر بوو. بچووکەکەشیان، سمکۆ، کەمێک له من گەورەتر بوو. هاتە پۆلی ئێمە. له هەوەڵەوە نەگونجاین بەڵام زووبەزوو بووینە برادەر. منداڵێکی بە زیپک و زرینگ بوو. بە خۆیشی دەنازی، ئەگەر له یاری و گەپی منداڵانەماندا هەموو یاریکەران هاوتەمەن باینایە ئەو دەبوو بە دەمڕاستی لایەنێک و منیش بە دەمڕاستی لایەنەکەی دیکە، بەڵام ئەگەر منداڵی له ئێمە هەراشتر بەشدارییان کردبایە ئەو و من دەکەوتینە یەک لایەن.

ئەم سەباحەی نووری باوێلاغا له شەڕی هەرای ڕەشید عالی کوژرا، باوکی له بەندیخانە بوو، ویستی بە جانفیدایی کردن له شەڕ دژی ئینگلیزەکان بتوانێ داوای بەخشینی باوکی بکات، کەچی خۆی تێدا چوو و باوکیشی هەر له بەندیخانەدا مایەوە تا مەودای حوکمەکەی بەسەر برد. دواتر له ئاڵقەیەکی دیکەدا تووشی ئەم بەسەرهاتە دێمەوە کە نووری باوێڵاغای تێدا حوکم درا.

نووریاغای معاونی شورتە له بنەماڵەیەکی ناسراوی ڕەواندز بوو، بێ ئەوەی مووچەخۆری حکوومەت بێ، ڕێزی لێ دەنرا. زۆر دۆستی باوکم بوو، هەروەک لەگەڵ هەموو پیاوە بەرچاوەکانی کۆییدا دۆست بوو، بەڵام وابزانم لەگەڵ باوکمدا ڕەفتاری تایبەتی هەبوو. دەیزانی باوکم حەز له دەنگی خۆش دەکات، گرامۆفۆنێکی باشی هەبوو بە قەوانی خۆشی ئەوساکەی «منيرة المهدية» وە. ناوناوەیەک داوەتێکی شەوانەی باوکمی دەکرد، مامم و من و چەند کەسێکی دیکەی مەحرەم له خزمەتیدا دەچووین بۆ خواردن و بۆ بیستن. لەبیرمە دوو قەوانی منیرە یەکیان «شكوت فقالت» ئەوەی دیکەشیان «الماني الماني...» بوو. من شەیدای هەردوویان بووم.

هەر لەو سەروبەرەدا کە گوترا «کەلسووم»ێک پەیدا بووە منیرەی بەجێ هێشتۆتەوە بە توندی قسەکەم ڕەت کردەوە و لەوانەش بووم هەرای بۆ بنێمەوە، هەتاکوو دەنگیم بیست، چ ببیەم! ئەوەندە له منیرە هەڵکشا بوو، ئاسمان و ڕێسمان... له سەرەتاوە سێ قەوانم لێ بیست: «الشک يحيي الغرام»، «انا على كيفك» و «د الحب كان من سنين». گۆرانیی یەکەم لەو تەمەنە شلکەمدا وەهای دەهەژاندم و موچڕکی پێدا دەهێنام و بە جۆرێک له دەروونمدا کاریگەریی دەبوو هەموو شتێکی

له بیر دەبردمەوە و ئەو شەوەی گۆرانییەکەم ببیستایە ڕۆژیی دوایی هەر لەگەڵ خەیاڵی ئەودا دەژیام، تا ئێستاکەش کە دەیبیستم دەچمە بارێکی دیکەوە. لەو ساڵانەی دواییدا گوێم لە عەبدولوەهاب بوو لە بیرەوەری کەلسوومدا وەهای ڕاگەیاند کە ئەویش لە یەکەم بیستنی دەنگی کەلسوومەوە شەیدای بووە، بە دەنگێکی بێهاوتای داناوە کە پێشتر وێنەی نەبووە. گوتی لە ئاست دەنگی کەلسوومدا نە «لحن» نە شیعری گۆرانییەکە و نە تیپی مۆسیقا هیچیان نموودیان نەبوو. لەبیرمە ئەمانەی بە «ولا حاجە» حیساب کردن.

بەڵام لێرەدا دەبێ بڵێم دەنگی ئەو ئافرەتە هەتا زستانی نێوان ساڵانی 1949 و 1950 بێ کۆسپ و تەگەرە نمای کرد و لە هەر قۆناغێک بووایە لووتکەی ئیمکانی ئەو قۆناغەی دەکردەوە. لەو زستانەدا بۆ یەکەم جار دووچاری نەساغییەک بوو ناچاری کرد بچێ بۆ لەندەن بە نیازی تەداوی. لە دوای ئەو نەساغییەوە تا مردنی لە 1975 تەنها چوار پێنج جار توانی بگاتەوە تۆقەڵەی بەرزایی جاران. کەلسوومیش و عەبدولوەهابیش بەختیار بوون لەوەدا کە ساڵی 1964 گەیشتنەوە یەک، کەلسووم ئاهەنگەکانی عەبدولوەهاب بۆی بوون بە داروەکاز چونکە دەنگەکەی ئەو هێزەی نەمابوو بێنیاز بێ لە هەموو شت. عەبدولوەهابیش توانی حورمەتی مۆسیقاکەی خۆی بپارێزێ لە توغیانی دەنگە ئیعجازکارەکەی جارانی کەلسووم چونکە بێگومان لە چلەکان و سییەکاندا هیچ ئاهەنگ (لحن) ێک نەبوو بتوانێ دەیەکی هێزی دەنگی ئەوسای کەلسووم بمژێ. کە دەکرایەوە دەریا و فەرتەنە و بورکانی هەڵدەڕشت. لەحنی بەستەزمان دەبووە قاووت بەدەم ڕەشەباوە.

ڕاستییەکەی دەنگی کەلسووم وەهای کرد لە بیستنی گۆرانی عادەتی بتۆرێم، ئەگەر گۆرانیبێژ ئاگرۆچکەی لە دەمارەکانمدا هەڵنەگیرساندبایە بە فلسێکم نەدەکڕێ. ئێستاکەش هەر وەهام و پتریش بە لای مەرجی قورسدا بوومەتەوە بۆ پەسەند کردنی گۆرانی چ سووچم نییە چونکە هەر وەک لەوحەی ڕەسم یان پەیکەری پەیکەرتراش، یان بەرەوخوار بێین و بڵێین بەرە و مافوور و چێشتی نیسکێنە ئەگەر عەیبیان هەبوو پێیاندا هەڵناڵێین، کە عەیبەکەش لە چاوان چەقی ڕەفزیان دەکەین، هەروەهاش گۆرانی کە بریتییە لە دەنگ و ئاهەنگ و مۆسیقا و وشە، هەرکامێکیان ناتەواو بوو نرخی گۆرانییەکە بەرەوخوار دادەشکێنێ. لەمەوپێش خەڵق زۆر گوێی نەدەدایە غەیری دەنگ، بەڵام ئێستاکە شیعر و ئامێرەکانی مۆسیقا و ئاهەنگ

پشکێکی گرنگی گۆرانی بۆ خۆیان دەدزنەوە تا ئەوەی دەتوانم بڵێم لە زۆر باردا دەنگی گۆرانیبێژ دەبێتە کەفەلوولکەیەک بەسەر لووزەی مۆسیقا و ئاهەنگدا، کە من زۆر تێدا نارەحەت دەبم چونکە دەوری دەنگ لە پلەی یەکەمی گرنگیدا بەرەژێر دەبێتەوە بۆ هیچ.

هەر لە بیرمە لە سەرەتاکانی جلەکاندا کە تازە هاتبوومە بەغدا بۆ خوێندن لە حقووق، دەمەو عەسرێکیان لای کاکە حەمەی خانەقا بووم، گۆرانیبێژێکی کورد لە ڕادیۆ خەریکی لۆرەلۆرێک بوو بەحاڵ بۆی دەبووە گۆرانی. پیاوی تایین نەیکردە نامەردی لە نیوەدێڕی دووەمی بەیتێکی گۆرانییەکەی ئەم گەوهەرانەی قەڵاشت: «خواردنی یارم شەکر و شیر و پەنیرە!!» بێ مەبەست لەگەڵ کاکە حەمە دامانە پێکەنینێک لێی نەدەوەستاینەوە…

کە هەر هاتمە ئەم مەیدانەوە با ئەمە بڵێم: لەوەتەی عیراق گۆرانی دەڵێ هیچ شیعریکی گۆرانی بە قەدەر «لاخەبەر لاچفیە لاحامض حلو…» سەرکەوتوو نەبووە هیچ کامێکیش هێندەی ئەو بێتالع نەبووە چونکە ئاهەنگەکەی (لەحنەکەی) لە چاو خۆیدا هەر دەڵێی کراسی جانگە بەبەر باڵای پەرییەوە. ئەم شیعرە لە ڕیزی شیعرەکانی «حسین السید» ی میسرە وەک «ساكن قصادي، حياتي انت» ئەگەر نەڵێم لێیان تێپەڕیوە…

خوێنەر بمبەخشێ لەم لابازەی هێنامیە ناو باسی گۆرانی کە دەبینێ لە سەرەتاوە بیرەوەری مندالیم و هەڵکردنەوەی گوشی ڕایەڵەی ئەو تەمەنەم بەرەو ئەم لایەنەیەوەی بردم، زۆریشم قسە پێیە بەڵام ڕووپەڕەیان پێ پڕ ناکەمەوە، بە سێ ئامۆژگاری لێیان دەرباز دەبم:

- شاعیر دەبێ ئاگاداری لایەنی سازان و نەسازانی جیرانەتیی وشەکان بێ لە هەڵبەستدا، واتە خۆی بپارێزێ لەوەی بە عەرەبی پێی دەڵێن «تنافر الحروف».
- ئاهەنگساز ئاگادار بێ لەوەی نەفەسی لەحن لەگەڵ نەفەسی شیعر پێکەڵپێک بن تاکوو «لە ماڵەوە» نەبێتە «لامەڵەوە - لامەڵاوە» یان «پێشەوا مانە» نەبێتە «پێشەوەمانە» وەک کە گوێمان لێیە و پێشی نارەحەتین.

- گۆرانیبێژ نەکا لە سەری زمانییەوە خوولیای شیعر سارد بکاتەوە، دەبێ لە قوولایی دڵیەوە باوەڕی بە کڵپەی هەڵبەست هەبێ دەنا دەچێتە ڕیزی ئەوانەی بەر لە دەیان ساڵ بەستەیان بۆ مەیموون دەگوت هەر هەتا تەقلەبازی پێ بکەن.

شاعیر و ئاهەنگساز و گۆرانیبێژی کوردیش تێکڕایان نەیانتوانیوە ئێستا بەرهەمێک بخوڵقێنن لە تەک ئەلاوەیسیدا خۆ بنوێنێ... بگەڕێمەوە بۆ قوتابخانە.

نووری باوێلاغا زۆر نەمایەوە. دوای نەقڵبوونی، سمکۆم نەدیتەوە هەتا گەیشتمە پۆلی دووەمی حوقووق، بەڕێکەوت لە قاوەخانەیەکی بەغدا بە یەکدی گەیشتین. ئەو لەسەر دەقی منداڵی گەورە بووبوو هیچ نەگۆڕابوو بەڵام من چووبوومە شکڵێکی جوداوە لەوەی ئەو پێمیەوە دیتبوو، پێشی گوتم زۆر گۆڕاوی. لەو سەفەرەیدا چەند جارێکیان بەیەکەوە دانیشتین و عەنباری قسەمان هەڵڕشت... لەوە بەولاوە چاوم پێی نەکەوتەوە هەتا لە شەستەکاندا، یان کەمێک وەهاوەتر، کۆچی دوایی کرد.

وابزانم لە پۆلی دوەم یان سێیەم بووم، یەکەم جار، قوتابییەکی وێنە نامەئلووفم دیت، کەڵەگەتتر بوو لە هاوتەمەنانی، نامۆییشی پێوە دیاربوو جلکیشی لە هی منداڵی نەدەکرد. ئەمیان یوونس ڕەئووف (دلدار) بوو. زۆر ئاگاداری خۆی بوو کە لالییەکەی لێ بەعەیب نەگیرێ، هەر ئەم خۆگیرییەشی وەهای کرد ئەو دەمە لە نزیکەوە یەکدی نەناسین، ئەویش زۆر نەمایەوە و بۆ شوێنی دیکە چووە خوێندن.

لە سەرەتاکانی خوێندنمدا موعجیزەی ئۆتۆمۆبیلم دیت، دەنگ بلاوبۆوە کە ڕێگەی ئۆتۆمۆبیل خەریکە بگاتە کۆیێ. ئەوانەی ئۆتۆیان نەدیتبوو گوێکوربوون بۆ ئەو ڕۆژەی پاڵەوانی چاوەنۆڕکراو بگاتە شار، منیش لەوانە بووم هەر ناویم بیستبوو. ڕۆژێکیان بیستم ئۆتۆ هاتە ناو شار. چونکە ڕێگەکەی کە لە هەولێرەوە دەهات دوور لە ماڵی ئێمەو بوو لە خۆوە نەدەهاتە بەر چاوم، دەبوو من بۆی بچم بەڵام هەستی ئارەزۆیەکی ئەوتۆم نەدەکرد بە دوایدا بگەڕێم. لە لێکدانەوەی وردداا بۆم دەردەکەوێ هۆی بێئارەزۆییم ترسێکی دەروونی بووە لە دەعبایەکی لەش ئاسنی هەناو ئاگرینی بەگرموهۆڕ کە پێشتر لەو هەرێمەدا نەدیتراوە.

لە ماڵی خۆمانەوە دەمدیت شتێکی کەس نەدیتووی کەس نەبیستووی بێوێنە ئێواران لە بەردەمی قشڵەی پۆلیسان بە تەنیشت جێگەی تۆپی ڕەمەزانانەوە

ڕادەگیرا، لە جیاتی گەراج کە جارێ پەیدا نەبووبوو. بەڵام لەو دوورەوە ئەگەر شێر و پڵنگیش بوایە جێی ترس نەبوو. دوو سێ ڕۆژ تێپەڕی ئەگەر نەڵێم هەفتە، ئنجا بڕیارم دا بچم بۆ دیتنی. لەگەڵ چەند کەسێکی هاوتەمەندا نزیکی عەسر بەرەو ئەو شوێنەوە چووین کە دەگوترا بە ڕۆژ ئۆتۆی لێ ڕادەگیرێ. لە مزگەوتی گەورە تێپەڕین گەیشتینە سەرەتای شورەی سەرا، لەنکاو گرەگرێک هات و لە پڕ لە سووچی دیوارێکەوە کە تەنها بیست مەترێک لە ئێمەوە دوور بوو، دێوێکی چوار پێچکەی خێوەت بەسەری هەڕەشەکەری شەرفرۆشی بزۆز پێچی دایەوە و شاڵاوی هێنا. کورد دەڵێ: ڕوح لە جێگەیەکی قاییمە و نایەتە دەرێ، قسەیەکی ڕاستیان گوتووە. باوەڕم نییە تا ئەو ڕۆژە ترسی ئەوتۆم ڕێنیشتبێ. بیرم لە هەڵاتن نەکرد، وەک بڵێی بە قەناعەتی ئەو دەمەم ڕزگاربوون بە هەڵاتن لە ئیمکاندا نەبووبێ، بە هەموو هێزمەوە خۆم بە دیواری سەراوە چڕساند و دەستم لە بەردی دیوارەکە قاییم دەکرد کە گەچی دەوراندەوری بەری دابوو بە زەقی لە دیوار هاتبووە دەرێ. دەمەویست دیوار شەق بێت و ئاوای دیوی دیکەم بکات. ماوەی ترسەکەم بریتی بوو لە دە - پازدە سانییە چونکە ئۆتۆ لەو ماوەیەدا ئێمەی بەجێ هێشت و لە بیست سی هەنگاو بەولادا وەستا و خەڵقیش تێی وەرهاتن بێترس و بێکۆمە لێکردن تومەز خەڵقەکە لەو چەند ڕۆژە لێی ڕاهاتبوون. ئێستاکە نازانم دوای ئەمە من چیم کرد بەڵام لەوانە نەبووم دوای ئەو ترسە و داچڵەکانە یەکسەر چووبێتمە دیار ئۆتۆکە (بە کورتی ئۆتۆ دەنووسم لە جیاتی ئۆتۆمۆبێل کە یازدە جاران قەڵەمی لێ هەڵدەئەنگێورێ بۆ نووسینی ئەو هەموو کەرت و خاڵ و نیشانانە).

وەک لە بیرمە یەکەم کۆیی کە ئۆتۆی کڕیبێ تاجرێک بوو، حاجی محەمەد ئەمین لچۆ، ئەو دەمە لە هەمووان بە پارەتر بوو. ئۆتۆکەی بۆ کرێ بوو، سایەقێکی بۆ ڕاگرتبوو ناوی مەمۆ بوو. من لەو منداڵیەمدا خوولیام چووبووە سەر وێنەکێشانی ئۆتۆ ئیتر بە قەڵەمی ڕەساس پرۆفایلی ساکاری ئۆتۆی چوارپێچکەییم دەکێشا و لە ژێرییەوە بە خەتی منداڵانەم دەمنووسی: «ترمبیل، حاجی محمد امین لچۆ، ممو». ڕەنگە نووسیبێتم مەمو چونکە دەرسی ئیملامان کوردی بوو، وابزانم لە پۆلی دووەمەوە دەستمان کرد بە ئیملای عەرەبی.

حاجی محەمەد ئەمین دوو کوڕی لە من گەورەتری هەبووە، لەبەر نازی دەوڵەمەندی خوێندنیان پچڕپچڕ بوو، زووش وازیان لێ هێنا. گەورەکەیان ناوی

عومەر ئەوی گچکەیان ناوی بەکر بوو. حاجی بۆ خۆی لە زەرەری تووتن ئیفلاسی کرد و ساڵانی کۆتایی عومری بە فەقیری ڕابوارد. کوڕەکانی دوای دەوری هەرزەکاری کەوتنە سەر باری گوزەران، عومەر بوو بە سایەق، گەلێ جار لەگەڵی دەبووم بە هاوڕێی سەفەر زۆریش دڵم پێی دەکرایەوە پەروەردەی ڕێز ڕاگرتن بوو، قسەی لەوجەڕی ئەهلی گەراجی بە زاردا نەدەهات و دەیزانی بەپێی شەخس ڕەفتار بکات. ئەویش زوو مرد بەڵام وابزانم دوای بەکری برابچووکی ماوەیەک ژییا.

هاوڕێکانی ساڵانی خوێندنی سەرەتاییم! چەندم حەز دەکرد یەکەیەکە باسی خۆتان و بنەماڵەتان بکەم، هانام بۆ چەندین کەسیش برد کە کورتەیەکی باسی خۆیانم بۆ بنووسن. کە دەستم دایە نووسینی گەشتی ژیانم لە بیرم بوو کە من دەگەمە باسی پلەی خوێندنم بە ناچاری لە مامۆستاکانم و لە هاوڕێکانم دەدوێم، کە لێشیان بدوێم وەها شیرینە بیانهێنمە بەر ڕووناکییەوە. لە سەرەتاوە تکام لەوانە کرد کە دەنگم پێیان ڕاگەیشت کورتەیەکی باسی بنەماڵەیانم بۆ بنووسن، چەند کەسێکیان نووسیان، هێندێکیشیان بەڵێنیان داوە، زۆریشیان لێم دووربوون بایی ئەوەی دەنگم نەیانگاتێ. ئێستا لەم کاتەدا پێویستیم بە کورتەی باسی بنەماڵەی دوو هاوڕێی ئەو پلەیەم هەیە کە برادەریمان لەسنووربەدەر بوو، لە هیچ لایەکیشەوە سەروسۆراغی بنەماڵەکەیانم چنگ نەکەوتووە. ئەو دوو برادەرەم بەپێی تەمەن یەکەمیان عەبدولڕەحمانی مامۆستا مەلا سادق بوو ئەوی دیکەیان حەمیدی تاهیر چەلەبی بوو. لە تەمەندا من بچووکترینیان بووم بەڵام لە خوێندندا بەر لەوان چووبوومە مەکتەب.

عەبدولڕەحمان، جگە لە هاوڕێیەتی مەکتەب، پێوەندی باوکیشی بە باوکمەوە کە هێندەی مامم لێی نزیک بوو وەهای کرد ببینە برادەر. ماڵی ئەوان لە گەڕەکی ئێمە مەیلەو دوور بوو نەدەشیا بەشداری گەمەوگەپی عەسرانە و شەوانەمان بێ بەڵام چەندی لە مەکتەب دەبووین و لە زۆر سەروبەری هەڵسوکەوتی وەزعی ڕکابەری و لێک تۆرانی نێوان قوتابییەکاندا کە ڕووی لە ئێمەش دەکرد، من و عەبدولڕەحمان و عەبدولحەمید یەکدیمان دەگرتەوە. عەبدولحەمید هەم لەبەر جیرانەتیمان و هەم لەبەر دۆستایەتی نێوان هەردوو بنەماڵەدا کە لە کۆنەوە بەردەوام بووە تا ئەوەی تاهیر چەلەبی بە درێژایی عومری وەزیفەی، واتە بەر لە تەقاعودبوونی، شەوانە دەهاتە لای باوکم، هەتا بڵێی ئۆگرم بوو. بڕوا ناکەم لە ڕووپەڕەی برادەریی منداڵاندا

کەس باسێکی خوێندبێتەوە دۆستایەتییەکی هێندەی دۆستایەتی ئەو سێیەمانی بەهێز نیشان دابێ. من ساڵێک، لە پێش عەبدولحەمید، وابزانم عەبدولڕەحمانیش، بووم. لە ماوەی پێنج ساڵی هاوڕێیی مەکتەبمان هەرگیزاو هەرگیز هیچ کامێکمان بایی سەری دەرزی دڵی دووەکەی دیکەی نەڕەنجاند. سەڵاحی ئامۆزام لەگەڵ مندا دانووی نەدەکوڵا، هەر بۆیەشی بوو کە زۆر جاران نەیدەوێرا لە ترسی باوکی پڕکێشی لە من بکات شەڕی بەو هاوڕێیانەم دەفرۆشت بەتایبەتی عەبدولحەمید چونکە بەپێی جیرانەتیمان پترم لەگەڵدا دەبوو بۆیە ڕقی لەو پتر بوو.

لە نێوان قوتابیی منداڵدا وردە حیسابی برادەری و تۆران و ڕاڵێبوون و خۆشنەویستن و ئەو جۆرە هەستانە جیهانێکی سەربەخۆ بۆ هەر یەکێک لەو قوتابییانە ساز دەدا کە بەپێی تەمەن و دەسەڵات و هۆش تێبڕ کردن بەقەدەر وەتەنگ هاتنی سەرۆک وەزیرێک لە ئیزرابی کرێکاران وەتەنگ دێت. منداڵ هەیە وەک «جوندی» فەرمانی لە خۆ گەورەتر و دەسەڵاتدارتر بێهەرا دەسەلمێنێ، هی وەهاش هەیە سەری ببڕن دان بە بێدەسەڵاتی و کۆڵداندا ناهێنێ. من خۆم لە بارێکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆدا بووم لێم بە عەیبێکی گەورە دەگیرا ترسم لەم و ئەو پێوە دیار بێ یان نازی کوڕی خاوەن دەسەڵات ڕابگرم. ئەو وەزعەم بۆ ئەوەی بردم کە لەگەڵ سادقی جەمیلاغا (قایمقام بوو) بە شەڕ بێم، هەرچەند لە من بە عومرتر و کەڵەگەتتریش بوو بەڵام کە تێک ئاڵاین خستم.

عەبدولخالقی فەتاحاغای عەولاغا کە پوورزای من و خزمی بنەماڵەی سادقیشە چاوی لەو تێک هەڵقژانەمان بوو، ئێستاش ناوناوە لە موناسەبەدا دەیگێڕێتەوە. پێی ناوێ من بڵێم، لەو دەمانەدا بەشەڕهاتن لەگەڵ کوڕی جەمیلاغای سەرۆکی حەوێزیان و قایمقامی شار شتێک بوو قوتابییەکان خۆیان لێ دزییەوە، هەرچی من بووم چاوکراوەتر بووم چونکە بە زۆری جەمیلاغا و براگەورەکانی دیکەم دەدیت لای باوکم یان باوکم لای ئەوان. گەلێک جارانیش بەو منداڵییە لەسەر سینییەک لەگەڵ باوکم و جەمیلاغا نانم دەخوارد، تەنانەت لە منداڵیمدا کە زۆر حەزم لە پەقلاوە دەکرد، بە زۆری سینییە پەقلاوەم بۆ دەهات یان لە ماڵی جەمیلاغاوە یان لە ماڵی مەلا ئەحمەداغای سلێماناغای غەفوورییەوە. خولاسە من کۆمەم لە کەس نەدەکرد، دوای ئەو تێک هەڵقژانەش بە زوویی بووینەوە برادەر. پتریش لە جاران لەیەک نزیک بووینەوە چونکە لە نێوان دوو بنەماڵەی حەوێزی و جەلیزادانداا

خزمایەتی و دۆستایەتی هەبوو، باپیرم و باوکم لە ئافرەتی حەویزی بوون، هەروەهاش مامەکانی باوکم، جەمیلاغا پووریکی منی مارە کردبوو و کوڕی دووەمی جەمالاغا، پوورزام بوو. پووریکی دیکەشم بووبووە خێزانی برایەکی.

لە کوڕانی گەڕەکی خۆمان حەمەدی حاجی سەعیدی حاجی حەوێزی هەتا خوێندی لێم نزیک بوو. یەکێکی دیکەشی مەجیدی حاجی فەقێ عەولا لە ڕێی پێوەندی باوکی بە باوکمەوە بە برادەرم حیساب دەکرا، لە من هەراشتر بوو بەڵام تابڵێی دوورەشەڕ و سەرەخۆ بوو. لەو ساڵانەی دواییدا ئەمری خوای کرد. کوڕێکی ناسیاومە، ناوی دلاوەرە، هاتووچۆی دەکرد بۆ دانانی مەکینەی مریشکان لە نزیک کۆیێ، لێم پرسی ئەرێ ئێوە هێلکە دەکەن یا جووچکە هەڵدەێنن؟ وابزانم جووچکە پەروەردە دەکەن.

باسی سەروبەری دوژمنایەتی و شەڕەچەپەڵۆکێ و تێک هەڵقژانی قوتابییەکان کە من و ئەو دوو برادەرەم، عەبدولڕەحمان و عەبدولحەمید، هەمیشە لایەنێکی گرنگی بوون، دوای گێڕانەوەی یەکەم سەفەرم بۆ هەولێر سەرەی دێت.

گەیشتبوومە پۆلی چوارەم، باوکم لە سەفەرێکی بۆ هەولێر منیشی برد بۆ دنیایەکی تازەبابەت کە تەواوکەری تازەییەکەی دنیای پژدەر بوو. من ئاگاداری هیچ شتێک نەبووم کە ڕۆژێکیان باوکم تێی گەیاندم لەگەڵ خۆیدا دەمبا بۆ سەفەری لای هەولێر بە بۆنەی وەفاتی شێخ مارفی شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی کە سەرۆک و براگەورەی بنەماڵەکە بوو. ماڵیشی لە دێی هەڵەجە، لە دوورایی سێ سەعات ڕێ بە سواری وڵاغەبەرزە بەرەو ڕۆژهەڵاتی مەیلەو باشوورەوە بوو. باوکم بۆ تازیمانەی بنەماڵەکە دەچوو.

شێخ مارف پیاوێکی کەڵەمێردی ئایینی، دنیایی بەدەسەڵاتی خاوەن تەکیە و دیوەخانە بوو کە هەمیشە دێیەکەی لە بەر زۆری مێوان و مرید و خاوەن ڕجایان دەتگوت کارێزەبازاڕە. مەسرەفی لە داهاتی دێیەکانی دەکرد نەک لە دەستودیاری مریدەکانی کە خۆی تەریقەی بە کەس نەدەدا، ئەو مریدەی لێی کۆ دەبوونەوە هی شێخی دیکە بوون. هۆی دوورکەوتنەوەی لە کۆیێ و گیرسانەوەی بە هەڵەجەی نزیک هەولێر حیکایەتێکی بە دواوەیە: شێخێک دێتە کۆیێ لە سەردەمی شێخ عەبدولکەریمی باوکی شێخ مارفدا، ئیدیعای سەیدایەتی دەکات و لە پەنا ئەو

ئیدیعایەدا خۆ دەژێنێ. لە سەرەتاوە زۆر ڕێز دەبینێ لەلایەن شێخ کەریمەوە ئاغڵەب لە تەکیەکەی ئەودا بەسەر دەبا، دوایی دەزاندرێ کە ئەو درەختی نەسەبی سیادەت کە خۆی پێ دەگەیەنێتەوە سەیدەکانی بەرزنجە هەڵبەستراوە و کابرا چ پێوەندی بە سەیداتییەوە نییە. لەوەوە شێخ کەریم بە توندی تێی ڕادەخوڕێ کە چی دی ئەو ئیدیعایە نەکات و بەو شەجەرە نەسەبەوە خۆی هەڵنەکێشێ. کابرا دوای ئەو ڕیسوابوونە باری دادەلەنگێت و لە بەرزاییەوە بۆ نزمایی بەرەوخوار دەبێتەوە تاکوو بە ناچاری دەبێتە قاوەگێڕ لە تەکیە تاڵەبانیان. ڕۆژێکیان لە عادەتی سەردانی تەکیەی تالەبانیان دەبێت، کابرای قاوەگێڕ فنجانی قاوە بۆ شێخ کەریم ڕادەگرێ، لەو دەمەدا کە دەست دەبا قاوەکەی لێ وەرگرێ کابرا خەنجەرێک لە پشتی شێخ کەریم دەدات. شێخ کەریم هاوار دەکات ڕۆڵە مارف بمگەیێ گوژرام، شێخ مارف لە نەدیوی باوکییەوە دەبێ، ڕادەپەڕێ بۆ لای باوکی دەبینێ خوێن لە برینی کوفارەی بەستووە کابراش خەنجەر بەدەستەوەیە، ئەویش لەو هەیەجانەدا یەک خەنجەری پڕ لە ڕق و کەسەری تۆڵەساندنەوە لە کابرا دەدات و دەیکوژێت و بۆ خۆشی لە سەر دیوارەوە باز دەداتە کۆڵانە و دەبێتە قاچاغ لە حکوومەت. شێخ کەریم لە برینەکەی بە سەلامەتی دەردەچێت، بەڵام مارف ماوەیەکی دوورودرێژ بە قاچاغی دەمێنێتەوە. لەو هەڵاتنەیدا پێوەندی بە کۆیەوە دەبڕێت و بۆی ڕێک دەکەوێت، بە زەکا و شەخسییەت و لێهاتوویی خۆی، لە هەرێمی هەڵەجە و ئاخۆڕە و ئەو ناوەدا نیشتەجێ بێت و خاوەنایەتی چەندین دێ بەدەستەوە بگرێ. تەکیەی بەرزنجیان لە کۆیێ هەر ما بەڵام لە پاش شێخ کەریم و هەتا ماوەیەکیش دوای وەفاتی شێخ مارف قورسایی بنەماڵەکە کەوتە هەڵەجە.

من دەمزانی شێخ مارف وەفاتی کردووە بەڵام کە باوکمی بردمی بۆ هەولێر نەمدەزانی چ مەبەستێک هەیە لەو سەفەرەدا، دواتر تێی گەیشتم.

باوکم میوانی مەلا ئەفەندی دەبوو، لە کۆنەوە دۆستایەتی لە نێوان جەلیزادان و ماڵی باب و باپیرانی مەلا ئەفەندیدا هەبوو. وا پێ دەچێ پێشتر مەلا ئەفەندی پێشنیازی کردبوو کە لە دەرفەتدا باوکم من بۆ خزمەت ئەو ببات. شێخ مارفیش هەر وەک دۆست و خزمی جەلیزادان بوو، لەگەڵ مەلا ئەفەندیش هەتا بڵێی دۆست بوو. وەک ئێستاکە ڕوونی دەکەمەوە موناسەبەی سێقۆڵی دۆستایەتیی باوکم و مەلا ئەفەندی و وەفاتی شێخ مارف وەهای کرد کە ئەو دەرفەتە لە بارترین دەرفەت بێ بۆ ئەو

مەبەستە بچووکەی چوونی من بۆ خزمەت مەلا ئەفەندی. شتی بچووک کە پێوەندی بە گەورانەوە هەبوو ئەویش بایەخ پەیدا دەکات.

ماڵی مەلا ئەفەندی لە دێی باداوە بوو کە لە سنوور شاری هەولێری ئەوساوە سێ کیلۆمەتر دوور بوو (ئێستاکە کەوتۆتە ناو شاری هەولێر). ماڵەکەی لە هەموو کوردستانی عێراقدا هاوتای نەبوو لە قەشەنگی و خۆشی و ڕێکوپێکی و ئوسووڵدا. دیوەخانەکەی ئەوسای (دواتر ژووری دیکە و تارمە و زیادی زۆری بەسەرەوە نرا) بریتی بوو لە دوو قات، قاتی سەرەوەی ژوورێکی گەورەی دیوەخانە و ژوورێکی نوستن و تارمەیەکی کرایەوەی هاوینان و هەیوانێکی بچووکی نێوان دوو ژوورەکە و ڕاڕەوێکی بۆ قادرمەی بەرەو لای ماڵەوەی هەبوو. قاتی ژێرەوەی دوو ژوور و مەتبەخێک و قاوەجاغی هەبوو. دیوی ماڵەوە پێی دەگوترا «قصر» لە ڕاستیشدا بۆ وڵاتی ئێمە بە قەسر دەژمێردرا، چ دیوەخانەی قاتی سەرەوە بێ و چ ژوورەکانی دیوی ماڵەوە بێ هەمووی بە نەقش و نیگار و سەقفی لە دارهەڵکەندراو بوو کە وێنەی نەدەدیترا. ئەمانە هەمووی بەلاوە بنێ و تەنها باسی باغ و ڕەزی دەوری دیوەخانە و قەسرەکەی لێی بە کۆتایی ناگەم… ڕێگایەکی قیرتاونەکراو ئۆتۆی پێدا دەگەیشتە باداوە، لە دەمی دەرگای باغەکەوەش تا بەر هەیوانی دیوەخانەکە بەردرێژ کرابوو کە نەیەڵێ قوڕوقڵی ڕۆژی بارانە بە پێچکەی ئوتۆوە بگاتە دیوەخانەکە.

هەرچەند ماڵی مەلا ئەفەندی بەولای هەموو شتێکەوە بوو کە من دیبێتم، دیسانەوە چونکە وەها بە گەشی و ڕووی خۆش و دڵی فەراحەوە بەخێر هێنراین، مەلا ئەفەندیش هێندە لەگەڵم بە لوتف و بەزەیی بوو دەتگوت چوومەتە ماڵی مامم. ئەو پێشوازییەی لە باوکم کرا هی گێڕانەوە نییە. دواتر کە لە ساڵانی خوێندنی ناوەندیمدا هاتمە باداوە ئنجا دوو شتم بۆ ڕوون بۆوە: یەکەم ئەوە بوو کە پایەی باوکم لای مەلا ئەفەندی لە چ ڕادەیەکدایە. دوەم ئەوە بوو کە شکۆ و سامی مەلا ئەفەندی و بەرودیوەخانەی بۆ خەڵقی دیکە چ ڕادەگەیەنێ. من هەستم نەکرد چووبێتمە جێگەیەکی غەریب. کەچی دواتر دەمدیت ئەو پیاوماقووڵانەی دێن بۆ دیدەنی مەلا ئەفەندی چلۆن لە دەرەوەی سنووری باغەکەوە تا دیوەخانە بەوپەڕی خودداری و هەنگاو لە باری و داپێچراوی و بێدەنگییەوە بە پێیان ڕێ دەبڕن و ئەو ماوەیەی بە دیار هاتنی مەلا ئەفەندیشەوە لە دیوەخانە چاوەنۆڕی دەکەن وەک

ئەوەی لە حزوور مەلیکێک دانیشتبن بە ویقار و بێجووڵە دەمێننەوە. خولاسە، مەسەلەکە زۆر دوور و قووڵ بوو.

یەکەم جەمی خواردنمان هی شەو بوو، باوکم ئەگەر مێوانی بێگانە نەبوایە حەزی دەکرد بە عادەتی کوردەواری لە سەر زەوی و بە دەوری سینییەوە نان بخوات، هەر بەو عادەتە لە باداوەش نانیان لە سەر سینییەکی زۆر گەورەی بان کورسییەکی نزمەوە دانا. جگە لە من، وەستا تەها و دوو بەردەست لەگەڵماندا بوون. کە چووین بۆ نانخواردن باوکم وەستا تەهای تەکلیف کرد، مەلا ئەفەندی (سەد هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی) ئیلحاحی کرد کە دەبێ دووەکەی دیکەش بێنە سەر سینی، باوکم ڕێی نەدا هەر نەبێ لەبەر دوو سەبەب، یەکیان ئەوە بوو کە نانیان بۆ ئاوا نەدەکرا لە وەزعی وەهادا، دوەمیان ئەوە بوو کە بە عومری خۆیان لە دیار باوکم نانیان نەخواردبوو.

لە بیرمە ئەو خواردەمەنییە جۆراجۆرە قەشەنگە پڕلەزەتە کە سینییەکان بە پڕی ڕازاندبۆوە جۆرێک شیرنی تێدا بوو یەکجار بە دڵم بوو، کوردی گوتەنی لێی تێر نەدەبووم. باوکم لە بارەی ئەو شیرنییەوە بە مەلا ئەفەندی گوت، تۆ دەزانی من خواردنێکی هێلکەی تێکەڵاو بێ ناخۆم. شەوی دواتر کە نان داندرا ئەو شیرینییەی لەگەڵدا نەبوو، نەمکردە شەرمگیری، بە مەلا ئەفەندیم گوت: ئەفەندی خۆ ئەمن هێلکە دەخۆم... قسەکەمی هێندە پێخۆش بوو، پێوەی گەش بۆوە. سبەینێ نیوەڕۆ کە لە هەولێر گەڕاینەوە بۆ باداوە دیتم یەک بەلمیان لەو شیرنییە بۆ من بە جودا هەڵگرتووە.

دوو ڕۆژێک دواتر کە پێش نوێژی مەغریب مەلا ئەفەندی بە عادەتی خۆی هەڵستا بۆ لای ماڵەوە بچێتەوە دەستی گرتم و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ دیوی حەرەم... هەموو قەسرەکەی نیشان دام، ئنجا بردمیە ژووری خۆی... لوتفێکی وەهای نواند لە خەیاڵ بەدەر بێ. کە بانگی مەغریبی دا دەستی گرتم و بردمی بۆ ژووری عیززەددین بەو نیازە تا لە نوێژ دەبێتەوە تەنها نەبم. ڕاستییەکەی لەگەڵ منداڵیشمدا ئەو هەموو نەوازشتەم پێ هەزم نەدەکرا. لە دەرفەت دەگەڕام بۆی دەرچم.

ژوورەکەی عیززەددین ژوورێکی پڕ تاقم و ڕازایەوە بوو، خێزان و خوشکی مەلا ئەفەندی لەگەڵ چەند ئافرەتێکی کە نەمدەناسین لەسەر فەرش دانیشتبوون عیززەددینیش لەسەر کورسییەک، منیش لە تەنیشت ئەوەوە بەسەر کورسییەکەوە گیرسامەوە. خێزانی لە بنەماڵەی یەعقوبی هەولێر، خاتوونێکی لێ وەشاوە بوو، خوشکی مەلا ئەفەندیش کە بە نازناوی «خاتوون»ـەوە ناویان دەهێنا، هەروەها. هەردووکیشیان لەگەڵ دایکمدا ئاشنا بوون، زۆر ئەحواڵپرسییان کرد و گەلێکیان بەخێر هێنام.

قاسم منداڵ بوو خۆم لێی نزیک کردەوە و دەستیم گرت و بەناوی پێکەوە گەڕان لە ژوورەکە دەرچووین، پێم گوت ڕێگەی چوونەوە دیوەخانەم نیشان بدات، ئیتر هاتمەوە لای باوکم... مەلا ئەفەندی لە شەوان زووتر هاتەوە دیوەخانە هەر بۆ ئەوەی بە نەوازشتەوە گلەییم لێ بکا.

هەموو شەوێک دوای بەسەرچوونی دانیشتنی پاش نانی خەفتنان، مەلا ئەفەندی لە ماڵەوە یەک قتووی پڕاوپڕی شەوچەرە و شەکەراتی هەمەچەشنەی هەرە مومتازی بۆ دەناردم، شەوی یەکەم بە ناوی عیززەددینەوە، شەوی دوەم بە ناوی قاسمەوە، شەوی سێیەم بە ناوی خۆیەوە کە ئیتر حورمەت بۆ منداڵێکی یازدە ساڵی لەوە تێپەڕ ناکات.

سبەینان من و وەستا تەها و یەکێک لە یارمەتیدەرانی باوکم، دوای بەرچایی، دەهاتین بۆ شار بە ئۆتۆی مەلا ئەفەندی. پاش چێشتەنگاو مەلا ئەفەندی و باوکم دەهاتنە شار لە مزگەوتەکەی قەڵا دادەنیشتن. ئێمە دەگەڕاین و دنیامان بە سەح دەکردەوە هەتا نزیکی ئەو دەمەی کە لە قەڵاتەوە دەگەڕاینەوە بۆ باداوە.
ترمبێلەکەی مەلا ئەفەندی بە دوو جاران دەیبردینەوە. جاری دوەم مەلا ئەفەندی و باوکم و من دەهاتینەوە، پێشتر وەستا تەها و ئەوانی دیکەی دەگەیاندەوە.

دوای چەند شەوان سبەینەیەکیان پاش بەرچایی بە ئۆتۆکەی مەلا ئەفەندی لە خزمەت باوکمدا چووین بۆ هەڵەجە. خەڵقەکە ئاگاداری ئەو سەردانە بوون، قەڵەباڵغی لە هەڵەجە کۆبووبۆوە. باوکم بە گەرمی سەرەخۆشی لە شێخ عەزیزی کوڕە گەورەی شێخ مارف و لە هەموان کرد، بەدڵ و بە کوڵ و بەردەوامێک بۆ

شێخ مارف گریا. لە دەمی بیستنی مەرگی شێخ مارفدا ئەم چەند دێڕەی بە عەرەبی نووسیوە:

«انا لله وانا اليه راجعون ضياع عظيم وخطب جسيم. توفي الشيخ والسيد النبيل، رجل الدنيا والاخرة، صاحب الجود والماثر الفاخرة المعروف السيد الشيخ معروف ابن السيد العظيم السيد الشيخ عبدالكريم البرزنجي في الساعة العاشرة من يوم الجمعة، الخامس عشر من شهر رمضان المبارك المطابق لاول يوم من الروم سنة 1348 هـ ق 1930 ميلادي».

لەو سەفەرەدا بۆ یەکەم جار «جەباری شێخ عەزیز»م دیت، برایانی لە خۆ گەورەتری و مامەکانی و ئامۆزاکانی باوکی و گەلێکی دیکەش لە دانیشتوانی هەڵەجەم ئەم جارە دیتبوو باسی کاک جەباریشم بیستبوو، زۆر کەیفم بە دیتنی هات و ئەو چەند ڕۆژەی لە هەڵەجە ماینەوە من و ئەو هەر بەیەکەوەمان ڕادەبوارد.

ڕۆژێکیان چێشتەنگاوی قاییم کردبوو مەلا ئەفەندی گەیشتە هەڵەجە، تومەز من نەمدەزانی ئەم سەفەرەی باوکم و هاتنی مەلا ئەفەندی پێشتر بڕیاری لەسەر درابوو. زووتر مەلا ئەفەندی هاتبووە پرسەی شێخ مارف، ئەم جارەش تازیمانەی نویٚ کردەوە. دوای ئیسراحەتێک بوخچەیەک کە لە ئۆتۆی مەلا ئەفەندی هێنرابۆوە خواریٚ بەدەستی باوکم و مەلا ئەفەندی کرایەوە، کەشیدەیەکی زەردی حاجییانە و عەبایەکی بەنرخی تێدابوو، یەکێک لەو دوو مەلایە زلە کەشیدەکەی لە سەری شێخ عەزیز بەست، ئەوی دیکەش عەباکەی لەبەر کرد و بە موسافەحەی قۆڵبۆسی موبارەکبادییان لیٚ کرد و لە جێی شێخ مارفیان دانا. ئێستاکە نایەتەوە بیرم لە مەلا ئەفەندی و باوکم کامیان کەشیدەکەی لەسەری شێخ عەزیز بەست و کامیان عەباکەی لەبەر کرد، بەڵام چاکم لە بیرە ئەو خەڵقە هەموو لە شکۆی ئەو دیمەنە دەستی کرد بە گریان. دوای نانی نیوەڕۆ پێش عەسر لە خزمەت مەلا ئەفەندی و باوکمدا گەڕاینەوە بۆ باداوە.

ساڵی دواتر، 1931، جەباری شێخ عەزیز هاتە کۆییٚ بۆ خوێندن. وا پێدەچیٚ هەتا شێخ مارف وەفاتی نەکرد خاڵە عەزیز زاتی نەکرد کوڕی خۆی بۆ مەکتەب بنێریٚ. کاک جەبار لە ماڵی خاڵە سەدر کە مامی باوکی بوو و لە ماڵی مامم کە پورزای باوکی و مێردی پووری بوو بەسەری دەبرد و بەزۆری لەگەڵ تاقمی برادەرانی ئێمەی ڕادەبوارد. بەڵام بە جۆرێک کە لە تەدبیری کەسدا نەبوو برادەریمان گۆڕا

به باری پێچەوانەدا، کاک جەبار لە خۆڕازی و نازکێشراو بوو. لە تەبیاتیدا حەزی سەرپەرشتی و فەرمان دەرکردن هەبوو. سەلاحی ئامۆزام کە کوڕەپووری بوو وەک گوتم دانووی لەگەڵ مندا نەدەکولا، بوو بە یاریدەدەری تێکچوونی بەینمان. من شەرم بە خۆ بووم، نە پلانگێڕیم دەکرد و نە لای کەس هیچم دەدرکاند. کاک جەبار بە زمانشیرنی و چاووڕاو ئەو ئامانجەی گرتبووە بەر کە مەیلی سەرۆکایەتیەکەی لێی خۆش دەهێنا. سەری خوێنەر نەیەشێنم، لە ماوەی ساڵێکدا، هەرچی برادەری قوتابخانەم هەبوو بوون بە برادەری ئەو تاکوو لە ئەنجامدا جەبهەی لای من مایەنەوە من و حامیدی تاهیر چەلەبی و عەبدولڕەحمانی مەلا سادق.

ئەو ساڵەی پۆلی شەشەمم، 1932، بە دەردیسەر بردە سەر. نە ئاگام لە دەرس و خوێندن ما نە بیرم لە زەوق و خۆشی دەکردەوە. خوولیای شەو و ڕۆژم ئەوبوو چۆناوچۆنی بە سێ کەسان بەرگری چل کەس بکەین بێ ئەوەی خەبەری ماڵەوە بدەم یان شکات ببمە لای مامم. ئەگەر شەرمم لە خۆم نەکردبایە دەمتوانی چەند پیاوێک دەنگ بدەم و گرێمان بۆ بڕەوێننەوە یان خەبەری مامم بدەم کە مامۆستامان بوو، بێگومان بە تروکەی چاوێک میحنەتی زێدە قورسی ئەو ساڵەی منی بەسەر لایەنەکەی دیکەدا دەشکاندەوە. حاڵم گەیشتە ئەوە مامۆستاکانم بە باوکم ڕابگەیەنن کە دەرسەکانم پشتگوێ دەخەم، منیش هەر جارە بە بەهانەیەک وەڵامم دەدایەوە. ئەو ساڵە حەمیدی تاهیر چەلەبی زۆری ناخۆشی دیت چونکە سەلاح و جەباریش دەسدرێژییان لە من نەدەکرد هەر بە پلار و توانج ئازاریان دەدام لەگەڵ حەمید زۆر دڕ بوون، بەتایبەتی سەلاح، منیش هەر جارە سەلاح لەگەڵ حەمید بەشەڕ هاتبایە خۆم تێ دەهاویشت و لەسەرم دەکردەوە بەڵام زۆر جاران بە تەنهایی بەرەنگاری دەبوون. ئەویش هێندە مەرد بوو نە چاوی لێ دەچووقاندن نە ڕێی خۆی لە ترسی ئەوان دەگۆڕی و نە یارمەتیشی لە کەس داوا دەکرد.

ڕۆژێکیان دەمەو بەهار، یان ڕەنگە نیسان بوو، گرووپی ئەو کۆمەڵە ناحەزە بە سەرکردەیی جەبار وەلامیان نارد بۆ من و حەمید کە ئەگەر چ غیرەتمان لەبەردایە بابچینە ژووانیان لە گردی مام جەردیس. ئەو گردە دوورە لە ماڵی ئێمە و لە گەڕەکی برادەرەکانی جەبار و سەلاح بوو. هەرچەند دەمزانی بەرەو مەرگ دەڕۆین

بەڵام چاری کوڕی مەرد چییە غەیری مەردایەتی. لە میعاددا بە جووتە چووین بۆ ژووانەکە. باغەڵەکانمان پڕ کرد لە گاشەبەردی لووسولێک، پەنا بە خوا لەو سەری شارەوە دەرچووین بەرەو گردی مام جەردیس. نیمچە تابوورێک بۆمان کۆمەڵ بووبوون. ڕۆییشتین هەتا لێیان نزیک بووینەوە بایی ئەوەی کە دەبوو پەلامارمان بدەن. دیار بوو ئینتیزاریان دەکرد فەرمانیان بۆ دەرچێ بە هجووم، لە ناویاندا سەمەدی جەباراغا هەبوو کە پێشتر زۆر برادەرم بوو، قسەشی بەسەر خەڵقەکەدا ڕادەشکا، هاتە پێش لێمان و گوتی بە خودای دەبێ ئاشت ببینەوە، بەسە چیدی شەڕ و هەرای پێناوێ، هەموومان براین...

دەک زارت خۆش سەمەدی جەبار! لە برادەرەکانییەوە دەنگی ناڕەزایی بەرزنەبۆوە، ئێمەش ناقایل نەبووین... هاتن بۆ دەستەملانێ و لە یەکدی خۆش بووین. بەڵام سەڵاحی ئامۆزام دوورکەوتەوە زۆر قسەی سووکی بە برادەرەکانی گوت کە ئێوە حەوجەیان بوونەوە، لە جیاتی شەڕیان لەگەڵدا بکەن دەستەملانیان دەبن. سەمەد چوو بۆی قایلی بکات، ئەو بە غار دوورکەوتەوە لێمان، تێی قووچاند بەرەو شار.

سەڵاح وردەوردە کە دیتی وەکوو جاران کۆڕی شەڕ گەرم نابێ، ئەویش ساردبۆوە، بە لای ئاشتیدا هاتەوە. لەگەڵ حەمید بە تەواوی ڕێک کەوتەوە، بەڵام لەگەڵمندا سەرزارەکی قسەی دەکرد. ئەمانەی گوتم بە خۆشی و ناخۆشی و تاڵی و شیرینییانەوە لەو ساڵە نالەبارەی پۆلی شەشەممدا زۆری نەبرد کۆتاییان بە کارەساتێکی خوێناوی فرمێسکاوی هات.

ئەزمورونی کۆتایی ساڵ نزیک بووبۆوە، دەبوو، بەتایبەتی من، خۆ ئامادە بکەم بۆ ئەزموونی بەکالۆری، برادەرانی دیکەش هەر یەک بە قەدەر حاڵ کەوتە سەرباری خۆ حازر کردن. ئێواران من و چەند قوتابییەک دەچووینە باغێکی سەربە چایخانەی گەرمووک کە لە شیوی ڕەزان هاوینان دادەنرا و بناوانێکی لە تەنیشتەوە هەڵدەبەسترا بۆ ئاودانی چەندی باغی دامەنی خۆیەوە. حاجی قادر کە دەڵێ: «نموونەی جەننەتە شیوی ڕەزانی» مەبەستی ئەو شیوەیە کە ڕووباری کۆیەی پێدا دەڕوات و لە هەردوو بەریەوە بۆ ماوەی سەعات و نیوێک ڕۆییشتنی پیادە ڕەز و باغی بە دەورەوەیە.

ئێوارەیەکیان کە بەرەو ماڵ بووینەوە، سەرەو هەورازی شیوەکە دەهاتین هەستم کرد لە دواوە مقۆمقۆیەک هەیە برادەران لە ڕۆییشتن دەوەخرێنێ. منیش دەنگم دان کە درەنگە دەبێ هەنگاو هەڵێنین، تێیان گەیاندم سەڵاحی ئامۆزام دەیەوێ چەند کەسێکی لەگەڵدا بگەڕێتەوە بۆ ڕووبارەکە بە نیازی تەقاندنی بۆمبایەک کەوا چەند بەینێک لە تووردڕکەڵێنێکدا دۆزراوەتەوە و چەند جارێکیش چۆتە سوێی و دەوری هەڵاتووە، کە ئەمەم زانی هۆش لە سەرم دەرچوو، بە قسەی قورس لێیان تووڕە بووم و بە توندی ڕاپێچەکەم دان بۆ لای ماڵەوە. سەڵاح کە لەدڵدا لێم پڕ بوو دەستی کرد بە قسەی عەلەقمەلەقی وەک «ئەتوو ترسنۆکی... ئەتوو نایەڵی بۆمبای کافران بتەقێنین...» ئەمانە و هی دیکەشی دەرپەڕاند و لێمان تۆرا و بە تەنهایی بە لایەکدا بۆ ماڵەوە چوو.

تا ئەو کاتە من نەمبیستبوو بۆ مبایەکی نەتەقیوی ساڵی بۆمباردمانی ئینگلیزەکان لەو ڕووبارە ماوەتەوە و بەرێکەوت لافاوی ئەو ساڵە بەدەری خستبۆوە. ئەو ڕۆژە لە ماوەی هاتنەوەمان بەرەو ماڵ چەندی پێم کرا هاوڕێکانمم تێ گەیاند کە تەقاندنی بۆمبا مەرگی پێوەیە نابێ توخنی بکەون.

دواتر زانیمەوە کەوا خێرۆمەندێک مامم و مامۆژنمی ئاگادار کردبۆوە لەوەی سەڵاح بەتەمایە بۆمباکەی ڕووبار بتەقێنێ... تومەز خەڵقێکی زۆر بەم بۆمبایەی زانی کەچی هیچ کەس بیری لەوە نەکردەوە هەر نەبێ بەلای حکوومەتدا بچێت و داوای چارەیەکی ئەو بۆ مبایەی لێ بکات. من بەو ئامۆژگارییانەی کە کردم دڵنیابووم و لە چەند ڕۆژێکدا بە تەواوی بۆمباکەم فەرامۆش کرد.

دەوری دە ڕۆژێک یان نەختێک کەمتر تێپەڕی ئێوارەیەکیان بە عادەتی ڕۆژانی پێشوو بەرەو ئەو باغە چووین کە سەعیمان لێ دەکرد. کاک جەبار و من یەکدیمان گرتەوە برادەرەکانی دیکە هیچ تاکێکیان ئەو ڕۆژە دەرنەکەوتن. لە هاوڕێیانی پۆلی خۆم دوو کەسی دیکە ئەو ئێوارەیە لە باغەکە حازر بوون یەکێکیان سەمەدی حاجی تەها و ئەوی دیکەشیان ئەحمەد کەمال ناوێکی کەرکووکی بوو کە لە سێبەری نەنکیدا دەژیا و خۆی تاقانە و تاکە خوشکێکی هەبوو کە نازانم چۆناوچۆنی لە کۆیێ گیرسابوونەوە. ئەو چوار کەسە بە دەوری کورسییەکی نزمی بچووکەوە دوای چایە خواردنەوە خەریکی سەعی کردن بووین... لەنکاو گرمەیەک هات گەلێک بە دەهشەتتر لە هی برووسکە، هەر چوارمان بەرەو پشت بووین بەڵام خۆمان گرتەوە.

ئەحمەد کەمال وەها شێوا ڕەنگی سەوز بوو، ڕاستییەکەی کەمی مابوو بمرێ، هەر ئەو وەزعەی ئەویش ئێمەی خەریک کرد تا ئەوەی نەزانین دنیای ئەو گرمەیە چ باسە... کاتێک ئاگادار بووینەوە هەستمان کرد خەڵقی چایەخانەکە کە لە کەلێنی پەرژینی باغەکەوە دیار بوون وەها تێک دەهاوێن بە عاجباتی. قیژە و هەرا و چ بوو چ بوو دنیای پڕ کردبوو. لە یەکێکم بەدی کرد گوتی «چەند ڕۆژێکە دەستی وەردەدەن» ئەوساش بیرم لە بۆمبا نەکردەوە بە بێمەعنایی وەهام زانی مەبەستی دەست تێوەردانی تفەنگە. وەختێک لووزەی خەڵقەکە جمی بەرەو لای سەرووی ڕووبارەکە، ئێمەش لە باغچەکە دەرهاتین، جارێ نازانین چی ڕووی داوە بەڵام دیار بوو ئەوەی قەوماوە شتێکی گەورەیە. بە قەڵەباڵغیدا تێپەڕیم بەرەو و ئەوبەری ڕووبارەکە: لە سەرەتای ئەو ڕێگایەی کە ئێواران لەوێوە بەرەو شار هەڵدەکشێین لووت و بزووت گەیشتمە حەمیدی تاهیر چەلەبی، بەڵام چۆن حەمیدێک: لەشی یەکپارچە خوێن، ڕووی هەڵپڕووکاو، جلکی شڕوبڕ، کوفارەی خوێن لە قۆڵی چەپییەوە سەر دەکات... حەمید ناسیمیەوە، لە گەرماو گەرمی برینداریيەوە هەستی بە خۆی نەدەکرد ڕێگەی دەبڕی بەرەو شار. بە گریان و لوورەی ناڵێنەوە گوتی: هەموویان مردن... سەڵاح سەری پێوە نەمایە... بابەڕەسووڵ مرد کەس نەما... کە ئەمەم بیست ئنجا زانیم بۆمبا کاری خۆی کردووە لەو دەمەدا کە کەس ئاگای لەکەس نەمابوو، بەتایبەتی ئەوانەی قەسابخانەکەیان دیتبوو وڕ بووبوون، من هیچم پێ نەدەکرا خۆ ئەگەر بشم ویستبایە ئەو عالەمە لێ نەدەگەڕان هیچ بکەم. خەڵقیش لە حەمید وروکان ئیتر بیرم لەوە کردەوە کە خەبەر دەگاتەوە شار خوا دەزانێ چۆناوچۆنی بە باوکم دەگات، بە پەلە هەنگاوم هەڵێنا بەرەو ماڵ.

کە هاتمەوە حەوشەی ماڵەوە باوکم دیت لە شوێنی عادەتی خۆی دانیشتبوو بەڵام ڕەنگ لە ڕووی نەمابوو. هەر ئەوەندە چاوی پێم کەوت و دڵی تەسکین بوو گەڕامەوە بۆ لای دەرگای دەرەوە. کە من لە شیپانەی دەرگە دوو دەریەکەمان ئاوای کۆڵان بووم حەمید بە سواری گوێدرێژ و خەڵق بە دەورییەوە گەیشتە بەر دەرگاکە... دوای تێپەڕینی ئەو، تاقمی ئافرەتان لەگەڵ مامۆژنم بە سینگ کوتان لە ڕووبار دەهاتنەوە. شاری کۆیێ لە سەرەتاوە شەقژا، دواتر وەها کپ و خامۆش بوو کوردی گوتەنەی دەتگوت خۆڵ و دۆت بەسەردا کردووە.

ژمارەی کوژراوەکان پێنج بوون، سەڵاح و تاقانەی خاڵە عەلی (مامی مامۆژنم) کە ناوی بابەڕەسووڵ بوو، هێندەی پەڕەسێلکە لاشەڕ و بێزەرەر بوو، ئامۆزایەکی حەمیدی تاهیر چەلەبی کە بە ناوی باپیری، حاجی عەبدوڵا کرابۆوە، پێیان دەگوت «بابەکە»، دوو کوڕی منداڵ کە بەڕێکەوت لە نزیکیانەوە مەڕی دابەستە دەلەوەڕێنن. حەمیدیش هەر بە کوژاو حیساب بوو ئەجەل لێی گەڕا. پاش پتر لە مانگێک کە حەمید کەوتە بارێک بتوانم قسەی لەگەڵ بکەم لێم پرسی چۆن کەتنەکەتان کرد، گوتی سەڵاح ئێمەی کۆکردەوە بۆ تەقاندنیماڵی کافر، بابەڕەسووڵ زۆر پاڕابۆوە وازبهێنن سەڵاح نەیسەلماند بوو. پێیەک لە پاش یەکێک لە پێش لە شەرمان بەگەڵیان دەکەوێ... کە دەگەنە جێگەی بۆمباکە ئەو دوو منداڵە لەوێ دەبینن، سەڵاح تەماعی کۆترەی تەقلەبازیان لەبەر دەنێ کە بۆمباکەی لەناو دڕووکان بۆ دەربهێنن ڕازی نابن و خەریکی مەڕلەوەڕاندن دبن سەڵاح خۆی دەری دەهێنێ. چەند جاران بە ئەرزیدا دەدەن ناتەقێ تاکوو بابەکە، کە منداڵێکی وردی زیرەکی دەسترەنگین بوو، چەند جەڕ و بورغی لە بۆمباکە دەکاتەوە و کفەکفی لێوە دێت ئەو جار سەڵاح بەردێکی ڕووبار لەسەر زیخەڵان دادەنێ و بۆمباکە دەباتە سەر سەری و بە بەردەکەیدا دەدات، ئنجا تەقی بوو. حەمید دەیگوت بەتەمابووین بەر لە تەقینی هەڵبێین، دەشبێ وەها بووبێ دەنا کەس نایێ بەو جۆرە ئاگر لە عومری خۆی بەر بدات.

بۆمبا ئەوەی کردی کردی بەڵام ئێمە جارێ قەرزداری قەزاوقەدەر بووین، دایکم لە سەردانی خزمانی سندۆڵان بوو کوڕێکی کۆرپەی بەرمەمکانی، مەجیدەددین، کە دەتگوت پارچە ئەڵماسە، لە کۆیێ بەجێمابوو لای دایانی کە کچی ئامۆزای باوکم کاکە مەلای مەلا حەبیب، بوو، هەر لە ماڵی خۆمان بەخێوی دەکرد. سێ ڕۆژێک بەسەر مردنی سەڵاحدا تێپەڕیبوو، جارێ شین بە گەرمی دەگەڕا، ئەم برایەم زیڕەی تێ وەستا، دایە گریانێک کە لێی ژێر نەدەبۆوە، وەهاش بە هەژمەت دەگریا دڵی خەڵقەکەی بۆ دەبوو بە ئاو. چەندێکی دکتۆر سەڵاح (سووریەیی بوو) و حەکیمی خۆماڵی خەریکی بوون ئەو منداڵە لە گریان نەوەستا... چوار ڕۆژی بێوچان و بێپشوو ئەو بەستەزمانە گریا، من تەحەمولم نەدەما لە ماڵەوە دەردەچووم. ڕۆژی چوارەم نووزەی پێ مابوو، لەشیشی وەک گوڵی بێئاو لە سیسبووندا بوو. هەتا هێزی مابوو لە بێئۆقرەیی، خۆی لەم باوەشەوە بۆ باوەشێکی یەکێکی دیکە هەڵدەدا لەویشەوە بۆ

یەکێکی دیکە. کەس لەو بەینە خەوی نەبوو، خۆراک وەک زەقنەبووت بوو... هەتا نووزە و هەناسەی بەیەکەوە وەستان. ئاگری مەجیدەددین لە دڵماندا ساڵەهای ساڵ زیندوو بوو بەتایبەتی دایکم کە بەسەر تەرمیشی ڕانەگەیشت، نەشیزانی مردووە هەتا لەبەر خەبەری سەڵاح هاتەوە کۆیێ.

بەم وەزعە من چوومە ئیمتیحانەوە بەڵام ڕێکەوتێکی تاقانە لە مێژووی ئیمتیحانی بەکالۆریی قوتابخانەی سەرەتایی لەو ساڵەدا ڕووی دا. بڕیارێک هات لە مەرکەزەوە کە بەر لە بەکالۆری قوتابییەکان «امتحان داخلی» (یان زاراوەیەکی وەکوو داخلی لەگەڵدا بوو) بکرێن لەلایەن مامۆستاکانیانەوە ئەوەی لەو ئەزموونە دەرچوو دواتر بەشداری بکات لە ئەزموونی بەکالۆری. وابزانم لەو ئەزموونە هەموو قوتابییەکان دەرچوێندران. زۆری نەبرد فەرمانێکی نوێ هات کە ئەو ئەزموونە لە جیاتی بەکالۆری حیساب بکرێت.

بۆمباکەی ئەو ساڵەی 1932 کە ئەو کۆمەڵەی کوشت لە هەموو ناوچەکانی کوردەواری دەنگی دایەوە چونکە ئەوسا وەک سەردەمی ئێستاکە نەبوو باسی کوشتن بایەخی نەمابێ، تەقینەوەی بۆمباش لەو ڕۆژگارەدا لە دەگمەن دەگمەنتر بوو. بەڵام سەیر لەوەدا بوو کەوا هەرچەند کارەساتەکە لە دڵاندا کاریگەر بوو، بەتایبەتی لە خەڵقی کۆیێ، تەنها شاعیرێکی بەری بابان کە ناویم لە بیر نەماوە هەڵبەستێکی لاواندنەوەی بۆ ئەو قوتابییانە هۆنیەوە، تۆ سەیری ڕێکەوت یا قەزاوقەدر بکە: لە هەموو بۆمباردمانی ساڵی 1922 هێندەی ئەو تاکە بۆمبای دە ساڵ بەسەرداچووی، لم لێنیشتووی، ژەنگ هەڵێناو زەرەر لە گیان نەکەوت.

ڕوونکردنەوە: بەپێی بەڵێنی کە داومە بۆ تیشک خستنە سەر دەوروبەری ئەو ناوانەی دێنە ناو نووسینمەوە لێرەدا کورتەیەکی ڕابوردووی بنەماڵەی شێخ کەریمی بەرزنجی کۆیێ دەنووسمەوە، بەو جۆرەی کە لە کاک حەمیدی خاڵە سەدرەوە بۆم هاتووە.

لە شێخ حەسەنی گڵەزەردەوە دەست پێ بکەین بەرەو ژێر، چونکە بەرەژوور پێویست بە لێدوانی نییە و شەجەرەی بێگومان هەیە ڕوونی دەکاتەوە و خەڵقیش دەیزانێ.

شێخ حەسەن هەشت کوڕی هەبووە کوڕی هەرە بچووکی ناوی شێخ کەریمی هەشتەزینی بووە. ئەم شێخ کەریمە سێ کوڕی هەبووە: شێخ سەلام و شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەد.

شێخ سەلام و شێخ ئەحمەد هاتوونەتە کۆیێ بەڵام مێژووی هاتنیان نەزانراوە. شێخ سەلام براگەورە بووە، لە کۆیێ مردووە قەبریشی لە گۆڕستانە مەشوورەکەی دەروێش خدرە. کوڕەکانی چوون بۆ حیجاز و «شرق الاردن» لە ساڵی 1928 یەک لە نەوەکانی «سید محمد نصرت» بە سەردانی خزمان هاتۆتەوە کوردستان ماوەیەک لە هەڵەجە و کۆیێ لای خزمان بەسەری بردووە. کاک حەمید دەنووسێ: «ساڵی 1948 چوومە شام و سەردانم لەو سەید نەسرەتە کرد، پیر بووبوو، کوڕێکیشی هەبوو نەبیل ناو». دوای مەرگی شێخ سەلام، برا بچووکەکەی کە شێخ ئەحمەد بووە لە شوێنی دەبێتەوە تەکیەنشین. ئەم شێخ ئەحمەدە لەگەڵ کاک ئەحمەدی شێخ لای شێخی نۆدێی خوێندوویانە بە تەمەنیش لە کاک ئەحمەد گەورەتر بووە. شێخ ئەحمەد لە کۆیێ ناژراوە لای براگەورەکەی شێخ سەلام. تاکە یەک کوڕی لە شێخ ئەحمەد بەجێ دەمێنێ ئەویش شێخ کەریمی بەرزنجی. مێژووی وەفاتی لە مەرسییەیەکدا کە حاجی مەلا عەبدوڵا بۆی داناوە بە «مات قطب من العراق کریم- 1314 ک» زانراوە.

شێخ کەریم هەشت کوڕی لە پاش بەجێماوە: شێخ مەعرووف، شێخ محیی الدین «نهانی»، شێخ نەجمەددین، شێخ سەلام، شێخ ڕەزا، بابە عەلی، سەید ئەحمەد «حسێنی»، شێخ سەدرەددین. کوڕی گەورە شێخ مەعرووف وەکوو نووسیمان لە 1930، هی هەرە گچکەش، شێخ سەدر، لە مارتی 1963 کۆچی دواییان کرد، یەکەمیان لە هەڵەجە و دووەمیان لە کۆیێ لای باپیرانی ناژرا.

کوڕ و نەوەی ئەو برایانە لە کۆیێ و ڕانیە و هەولێر و سلێمانی و بەغدا و شوێنی دیکەش دەژین و بە وەزیفە و کەسابەتی هەمەجۆرەوە خەریکن. تەکیەی مەرکەزییان ئێستاکە لە هەولێرە. سێچوار دێڕی پایین هی خۆمە نەک هی کاک حەمید.

## ئاڵقەی شەشەم

سێ ڕوون کردنەوەی کورتیلە هەن، دوویان هەڵەن ڕاستیان دەکەمەوە سێیەمیان لە بیر چووە دەیهێنمەوە بەر یاد، هەڵەی یەکەم ئەوەیە کە مامۆستایەکم بە ناوی «أنور حسن» لە خەڵقی هەولێر برای د. عیسا حاجی حەسەن نییە و بنەماڵەیان جودایە، من بە سەهوو وەهام زانیبوو بران. ئەنوەر حەسەن لە بنەماڵەی «قەساب»ـە و کوڕی یەکێک لە چوار برایان. هەڵەی دوەم ئەوەیە کە شێخ حسام و شێخ شەرەف تاڵەبانی کوڕانی شێخ «نورالله» و برازای شێخ ئەفزەل و شێخ بورهانن. لە تاوتوو کردنی هەندێ سەروبەری هەواڵی تاڵەبانیەکانی کۆیێ کە پێویست بوو هەڵپەرداوتنێکی تێدا بکرێ ئەو هەڵەیە ڕووی دا.

لەبیرچوونەکە ئەوەیە کە دەبوو بڵێم شەهیدی کوردایەتی خێروڵا عەبدولکەریم، یەکێک بوو لە مامۆستاکانی پلەی خوێندنی سەرەتاییم... ڕاستییەکەی وێنەی خێروڵا لە دەمی مامۆستاییەکەیدا وەها لە سەرەخۆ و بێدەنگ و مەند دێتەوە بەر یادم، بیری بۆ ئەوە نەبردمەوە کە دواتر بوو بە ئەفسەر و شوڕشگێڕ و قوربانیی ڕێگەی کوردایەتی، خولاسە خێروڵای شۆڕشگێڕ پەردەی خستە سەر خێروڵای مامۆستا.

پلەی خوێندنی سەرەتاییم دەپێچمەوە چی دیکە بە دوادا ناڕۆم هەرچەند گەلێک لایەنی سەربە خوێندن و بە ژیانی کۆمەڵایەتیشم ماوە باسی بکەم و خۆمی تێدا ڕوونتر بکەمەوە هەر ئەو مەبەستی خۆ ڕوونتر کردنەوەش بوو لە سەرەتاوە بەرپرسی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» بۆی دانام بە ئامانج بە نیازی ئەوەی لە دوارۆژدا ورد و درشتی ناوەڕۆکی ژیانم، وەک ڤەترینەی فرۆشگاکان، لە ڕووپەڕەکانی ئەو گۆڤارەدا بکەوێتە بەر نیگای تەماشاچیان، من لە خۆمەوە وردییاتی ژیانم بە ملی خوێنەردا نەداوە.

ساڵی 1934 تەمەنیشم گەیشتبوە قۆناغی پاش مێردمنداڵەتی، فاروقی برایشم ساڵێک بوو منی لە خانەی خز و لەقی پڕ هەست و مەترسیی تاقانەیی وەدەر نابوو. دوو ساڵ بوو پلەی سەرەتاییم بڕیبوو، لەبەر تاقانەیی و نەڕسێن ڕێی چوونە خوێندنم بۆ هەولێر لێ بەسترابوو، کۆیەش ئەوسا فێرگەی ناوەندی لێ نەکرابۆوە.

ماڵمان لە چنارۆک بوو بەرەو کۆتایی مانگی ئاب بوو بڕیارم دا هەنگاوی هەڵێنم بۆ خوێندنی ناوەندی. پێشتر قسە لەوە کرابوو، دەشکرا، کە دەرفەت بوو بمنێرن بۆ

هەولێر ئیتر لێم نەکۆڵیەوە و پێویستم نەدیت نیوە بەڵێن بەبیر کەسوکار بهێنمەوە، وەهام دانا، چوونم بۆ هەولێر بەجێ گەیاندنی بڕیارێکی لێرە بە پێشەوەیە.

ئەو ڕۆژە چنارۆک تابلێی گەش بوو، قایمقامی کۆیێ، سەلاح زەکی بەگی ساحێبقڕان بە دەستە و دایەرەی کاربەدەستە گەورەکانی قەزا و هەندێک لە دۆستی ئاشناوە بەرچایی گەیاندە چنارۆک و لەگەڵ باوکم و مامم و کەسانێکی خزم و دۆستی ئەو دەمە لە بن سابات و شاخی سوولی پاشادا خۆشترین کات و بەتامترین بەرچایی و ئاودارترین مێوەی هەمەچەشنەی باغە ئاوەدانەکانی ئەوسای چنارۆکیان دەکرد بە خۆراکی ماددی و مەعنەوەی لەش و گیان.

هەر لەو دەمەدا کەوا بەراستی ڕووپەڕەی دڵێک ژەنگی مەینەتی لێ سڕابۆوە، نووری بەگی ساحێبقڕان، مدیر ناحیەی خدران و خزمی سالح زەکی بەگ و دۆستی خۆمان، بە تاقمێکی حکوومەتی و عەشیرەتییەوە گەیشتە جێ، تومەز پێشتر خەبەردار کرابوو بە ماوەیەک کە بتوانێ تێیدا ئامادەی ئەو سەردانە ببێ. باقی بەگ، کوڕە گەورەی نووری بەگ، ئەوسا لە حوقووق دەیخوێند مابووی دەربچێ ئەویشیان لەگەڵدا بوو. پێشتر باقیم دەناسی، بەهۆی سەردانی لە ماڵی سالح زەکی بەگ لە کۆیێ یەکترمان دیتبوو.

لە مناسەبەدا دەڵێم، هاوینی پێشووتر مامۆستا شاکیر فەتاح ئێوارەیەکیان لەگەڵ خوالێخۆشبووان، مامۆستایان عەبدوڵا سامی و زەکی هەناری و ئاسەفی مەلا ڕەئووف لە گەشتێکی ناوچەی جەلی و نازەنین و هیران و ئەو هەرێمە دەگەڕانەوە، بە مەبەست ڕێیان هێنایەوە چنارۆک و سەردانی باوکم و مامميان کرد. شەوێکی زۆر خۆشمان لەگەڵدا ڕابواردن هەرچەند مامۆستا شاکیر فەتاح نەختێک ماندوویی پێوە دیار بوو. ئەو شەوە بوو بە بناخەی پێوەندییەکی نەپسایەوەی دۆستایەتیمان هەتا ئێستاش. شاکیر فەتاحیش جارێ لە حوقووق دەیخوێند. کۆمەڵەی سالح زەکی بەگ و کۆمەڵەی نووری بەگ کەمێک دوای عەسر هەریەک لەو ڕێگەیەی لێوەی هاتبوون بەرەو ماڵ بوونەوە، منیش ئەوەندە خۆم گرت کە مەودا بکەوێتە نێوان لەگەڵ کۆمەڵەی زەکی بەگ، سواری ولاغێک بووم و ئاودیوی کۆیە بووم. لە ڕێگا تووشی ئەو چنارۆکییانە بووم کە هاتبوونە شار، خەبەرم بۆ ماڵەوە پێدا ناردن کەوا من چوومە کۆیێ بە نیازی سەفەری هەولێر.

دایکم بە زانینی خەبەرەکە ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو... وەڵامی بۆ ناردم هەر چاوێکی پێم بکەوێتەوە چی دیکەی لێم ناوێ. سبەینێ گەڕامەوە چنارۆک، دیتم دایکم بە تەواوی شڵەژاوە. دەیگوت لێم ڕوون بوو دەمرم و ناتبینمەوە. شەوێک دووان مامەوە بە نامەیەکەوە لە باوکمەوە بۆ مەلا ئەفەندی هاتمەوە کۆیێ. ڕۆژی دواتر لەگەڵ وەستا حاجی حەمە ڕۆمیی جلدور کە دۆست و وەکیل خەرجی باوکم بوو لەو کەمتاکورتە داهاتەی ناوشار کە پێمان دەگەیێ، چووین بۆ هەولێر. لە گەراجی هەولێر بە تاکسی یەکسەر چووینە باداوە. مەلا ئەفەندی زۆری بەخێرهێناین. پێشتر وەستا تەهای دەناسی چونکە لە هەموو سەفەرێکی باوکم بۆ هەولێر بەشدار دەبوو.

مەلا ئەفەندی لە بنەماڵەیەکی گەورەی کوردی هەولێرە. وەختی خۆی لە دیوی کوردستانی ئێرانەوە هاتوون، چەند پشتێکیان بەسەرچوون تا مەلا ئەفەندی بوو بە براگەورە و وارسی وەجاهەتی ئەو بنەماڵەیە. لە مەلایەتیدا بەرەوژوور چوو بوو تا پلەی هەرە دوایی ئەو کەسبە. لە قەڵاتی هەولێر مزگەوتی جومعە هی ئەوان بوو، ڕۆژانە دەرسی بە فەقێیان دەگوت و بە مەسرەفی خۆیشی دەیژییاندن، ئەوەی ئیجازەشی لێ وەرگرتبایە شوێنێکی بۆ دەدۆزییەوە مەلایەتیی تێدا بکات. لەلایەن شۆرەتی دنیاییشەوە کەس نەبوو لە کوردستانی خۆمان لەوێ تێپەڕاندنێ. لە پێش جەنگی یەکەمەوە خانوویەکی قەشەنگ و دیوەخایەکی زەنوێڵی لە دێی «باداوە» بنیات نا. ئەوسا باداوە سێ کیلۆمەتر دوور بوو لە شار، لە سەرەتاوە بە عەرەبانە، دواتر بەسەیارە ڕۆژانە هاتوچۆی مزگەوتی قەڵاتی دەکرد تا دوای نوێژی نیوەڕۆ بە دەرس و مێوانداری خەریک دەبوو، نانی نیوەڕۆی دەهێنایەوە باداوە. عەسران لە دیوەخانە دەبوو تا پێش نوێژی ئێوارە. شەو ئەگەر مێوانی هەبایە دوای نانی خەوتنان (وەکوو نوێژی خەوتنان) لەگەڵیاندا دەدوا تادەمی نوستن.

مێوانی کوردەواری کە ڕووی لە مەلا ئەفەندی بکردایە دوو جۆر بوون: هێندێکیان حەزیان بەوە دەکرد لە شار بمێننەوە، شەو لە مزگەوتەکەی قەڵات دادەمەزران، هێندێکیشیان دەهاتنەوە باداوە، ئەوەی ئۆتۆمۆبیلی نەبایە بە ئۆتۆمۆبیلی خۆی هاتوچۆی پێ دەکرا، سبەینان لە باداوەوە بۆ هەولێر، ئێوارانیشی بە عەکسەوە. زوربەی هەرە زۆری عەشایری لیوای هەولێر پێوەندیان بە مەلا ئەفەندییەوە هەبوو، لە بەری بادینانیش دۆست و خزمی عەشیرەتەکانی هەرێمی ڕەواندز و شەقڵاوە سەریان لە باداوە دەدا... براگەورەکانی ئەو عەشیرەتانە هەمیشە لە پێویستدا

فەرمانبەرداری مەلا ئەفەندی دەبوون، موتەسەڕیفێکی مەلا ئەفەندی ڕای لێی نەبایە نەیدەتوانی لە هەولێر بەردەوام بێ.

بە دەوری دایەرەی حەرەم و دیوەخانەوە، لە چوار لاوە، باغێکی ئەوەندە بەرین هەبوو، ئێواران کە پیاسەمان بە تەنییشتیەوە دەکرد، هەتا سووڕمان لێ دەدایەوە مەیلەو ماندوو دەبووین... لە دوورایی سێ سەعات ڕێگا بە پێیان ئاوێکی ئاشگێڕی لە کارێزی دێی «بنەسڵاوە» وە هەفتەی جارێک ئەو باغەی ئاو دەدا... هەرچی مێوەیەکی وڵاتی خۆمان هەیە لێی ناشترابوو... بەشێکی پەرژینی باغەکە «گوڵەباغ» بوو، بەهاران دووکانداری هەولێری گوڵەکەیان بە «ضمان» وەردەگرت و لە بازاڕی هەولێر دەیانفرۆشت.

موباڵەغە لەوەدا نییە ئەگەر بڵێم داهاتی ئەو گوڵەباغە لە داهاتی ئەوسای بۆرجوازییەکی مامناوەنجی گەلێک زیاتر بوو. باغەکە دابەش کرابوو بەپێی ژمارەی ئەو مێوەیەی لێی چاندرابوون. باغی هەنجیر، باغی سێو، باغی قەیسی، باغی فستەق (ئەمیان شوورەی تایبەتی بە دەورەوە هەبوو)... لێرەولەوێ بنە تووی هەمەچەشنە... بەشی هەرە زۆری باغەکەش مێوی ترێ بوو.

بەهارێکیان لە دەمی گەیشتنی قەیسی، شێخ محەمەدی شێخ حیسامەددینی تەوێڵە هاتە سەردانی مەلا ئەفەندی ئێوارەیەکیان بە ناو باغەکەدا گەڕا، کە هاتەوە بە مەلا ئەفەندی گوت، چەند بنە قەیسیەک لە باغەکەتدا هەیە تەنها لە باغەکانی «گوڵپ» و «باغەکۆن» ی باوکم دیتوومن، هەتا بڵێی پەسەندن بەڵام باوەڕ ناکەم باغەوانەکانت ئاشکرایان بکەن... لەسەر ڕاسپاردەی شێخ محەمەد پێ تەرازۆیەکیان لەو قەیسییە هێنا. بە دیمەن سەوزی نەباتی دانە هەراش بوون هەرچی دەستی دەگەیاندە قەیسییەکە لە شوێن پەنجەکانی ئاو دەزایەوە، هێندەش بە تام و شیرین بوون، ڕاستییەکەی، پێشتر شتی وەهام نەدیتبوو، لەوە بەولاوە چەندێکی لە کژی ئەو قەیسییەدا مێوانی نیوەڕۆژ لە باداوە نانیان خوردبایە ئەو قەیسییە بە ناوی مێوە پێشکەش دەکرا. هەر لە بیرمە، کە «المحكمة الكبرى» لە هەولێر پێک دەهات، نیوەڕۆ دەستەودایەرەی حاکمەکان بە سەرۆکیانەوە، کە پیاوێکی ئینگلیز بوو، لای مەلا ئەفەندی نانیان دەخوارد... ئەوانیش لەو قەیسییەیان خوارد و زۆری لێ ڕازی بوون.

بووم بە قوتابی لە پۆلی یەکەمی «ناوەندیی هەولێر». سبەینان لە باداوەوە لەگەڵ کوڕە گچکەکەی مەلا ئەفەندی کە ناوی قاسم بوو، دوو خوشکی لە خۆی بچووکتریشی، بەیەکەوە دەهاتینە هەولێر بۆ خوێندن... نیوەڕۆیان دەهاتمەوە مزگەوتی قەڵات بۆ نانی نیوەڕۆ، دوای دەوامی دوەمی خوێندن سەیارەمان بە دوادا دەهاتەوە لەگەڵ قاسم و خوشکەکانی دەگەڕاینەوە باداوە. قاسم لە سەرەتایی کوڕان و دوو خوشکەکەیشی لە سەرەتایی کچان دەیانخوێند. قاسم پیاوی خۆی لەگەڵدا بوو خوشکەکانیشی دایەنیان هەبوو. دایکی ئەو پیاوە لە ژوورەوەی حەرەم دایانی قاسم بوو. ئافرەتێکی تورک بوو، نە خۆی کوردیی فێر بوو نە کوڕەکەشی «هدایت» ڕەوانی کرد. دایانی خوشکەکانی کورد بوو بۆیە ئەوان هەمیشە بە کوردیی دەدوان.

چەند ڕۆژێکیان هەتا جلکی نوێم بۆ دوورا قاتێکی هاوڕێیەکی پۆلی شەشەمی کۆیەم، جەلالی حاجی عەبدولا بەگم لەبەر کرد. جەلال بەگ لە بنەماڵەیەکی زۆر کۆن و بە ڕێوجێی کۆیەیە، لەوەتەی بە بێراندا دێت و بە خەبەریش بیستوومانە ئەو بنەماڵەیە لەگەڵ جەلیزادان دۆست و بگرە خزم بوون. خزمایەتییان لەگەڵ هەندێ بنەماڵەی کەرکووک (کە بە ئەسڵ تکریتین) هەیە، دیارە ئەسەری ژن بە ژنەیە. ئەوەی ڕاستی بێ ئاکاری ئەو خزمانەشیان وەک هی خۆیان گیانێکی ئاشکرای پیاوەتیی پێوە دیارە. هاوڕێیەکی دیکەشم لە هاوڕێیانی پۆلی شەشەمم، ڕەفیقی حاجی تۆفیق، لەگەڵ جەلال بەگ، دوو ساڵ بوو لە هەولێر دەیانخوێند. ئەوان وەکوو من بە دەست تەمەن بچووکی و تاقانەییەوە نەوەخرابوون، یەکسەر هاتبوونە هەولێر بۆ خوێندن، لەو دوو ساڵەدا قوتابیی دیکەش دەرچوون و بۆ خوێندن ڕوویان لە بەغدا و لە هەولێر کردبوو. لەوانەی ئەو ساڵە لەگەڵ مندا بوون بە قوتابی لە پۆلی یەکەم، تاهیر ئەحمەد حەوێزی بوو. دواتر فاتیحی خاڵە شێخ سەدرەددینی بەرزنجی-یش بەگەڵمان کەوتەوە... ئەو بەر لە من لە پۆلی شەشەم دەرچووبوو بەڵام خوێندنەکەی کەوتوڕەوت بوو تا منی پێگەیشتمەوە.

یەکەم دەرسی بۆی دانیشتین لە ژووری پۆلی یەکەم لە چاو ژوور و تەختە و کورسیی مەکتەبەکەی کۆیێ وەک ئەوە بوو لە ساڵۆنی سینەما بۆ لۆجەکانی ڕاگوێزیت. من هیچ سام و مەترسیم لێ نەنیشت لەو دەوروبەرە نوێیەی بە تازەیی خۆمی تێدا دەبینمەوە، تومەز لە پەنا سێبەری باوکمدا بە خۆدا ڕاپەرموونم بێ کەموکەسر بوو. وەها ڕووی دا هەوەڵ مامۆستای هاتە ژوورەکەمان «ریفعەت

دوغرەمەچی» دەرچوویەکی خوێندنی ئەمەریکا و لە بنەماڵە ناسراوەکانی هەولێر بوو. لە بەری هەڵستاین بەڵام ئەو بەپێی تەبیات و پەروەردەیەکی دیتبووی حەزی لەو ڕەسمیاتە نەبوو پێی گوتین لزووم بە هەڵستان ناکات. من وەهام دانا ئەم ئامۆژگارییە بۆ هەموو دەرسێک و هەموو مامۆستایەکە. دەرسی دوەم مامۆستا ئەیووب سەبری هاتە ژوور. قوتابییەکان تێکڕایان ڕاست بوونەوە، من بە تەنها لەسەر کورسییەکەم بێجووڵە مامەوە.

ئەیووب سەبری دەرسی عەرەبیی دەگوتەوە، خەڵقی مووسڵ و خاوەن سەقافەتێکی کلاسیکی بوو. کە دیتی من هەڵنەستام تەماشایەکی کردم و دەستێکی بۆ لای من درێژ کرد و «قم یا ولد» ێکی گوت. ڕاست بوومەوە بە عەرەبی و بە ئارداوێژێکی نارەزامەندانە لێمی پرسی، خەڵقی کوێیت، ناوت چییە. بە عەرەبییەکی باش وەڵامی دایەوە... بۆچی هەڵنەستایت؟ تێم گەیاند کە مامۆستای پێشووتر ناڕازی بوو لە هەڵستانمان، منیش وەهام دانا هەڵستان بۆ مامۆستا ناجایەز بێ. گوتی «عربیتک لا بأس بها» و بە ڕووی خۆشەوە دای نیشاندمەوە... لەوە بەولاوە مامۆستا ئەیووب سەبری بە چاوێکی دڵدەرەوە و ئازاترکەرەوە سەیری دەکردم... لە کۆتاییساڵدا نێردرا بۆ سەرپەرشتی کردنی ئیمتیحانی بەکالۆریای پۆلی شەشەم لە کۆیێ. چووبووە لای باوکم و گەلێک قسەی ڕەزامەندانەی لە بارەی منەوە کردبوو، تا ئەوەی باوکم لە نامەیدا بە خۆشیەوە باسەکەی بۆم نووسی، قسەی خۆمان بێ منیش کوڵێک کەیفم بەو شایەدیە بێفێڵەی مامۆستای خۆم هات.

لە ڕووداوە بچکۆلە خۆشکەڵەکانی سەرەتاکانی خوێندنم لەو ساڵەدا ئەوەبوو کە مامۆستا ڕەفعەت دۆغرەمەچی لە ئەزموونی مانگانەی زمانی ئینگلیزی کە جارێ دەفتەرەکانی پێ نەدابووینەوە و نەماندەزانی چۆناوچۆنی دەرچووین، لە کاتی گوتنەوەی دەرسدا بە تێوەرێخ گوتی «أحسن درجة أخذها مسعود محمد»، ئەوسا وتووێژ لە مەکتەبەکانی هەولێر بە عەرەبی بوو. ڕاستییەکەی هەستێکی لەخۆ باییبوونم تێگەڕا. هەر لە بیرمە کە دەفتەرەکانمان وەرگرتەوە 87م وەرگرتبوو، بەڵام دەرکەوت موعتەسەمی فەتاح چەلەبی دەباغیش وەکوو من 87ی وەرگرتووە کەچی گەشایی یەکەمینایەتی بەر من کەوت...

مدیری قوتابخانە «خورشید سەعید» پیاوێکی ڕژد بوو لەسەر گێڕانی کاروباری دەرس و دەوران بە ڕێکوپێکی. زۆر جار بە بیرمدا هاتووە کەسایەتیی ئەم مرۆیە

بەبەریەوە هەبوو ببێتە «ممثل» یّکی وەکوو «هەمفری بۆگارت». هەرچەند لە بەڕێوەبردنی ئیدارەی قوتابخانە هەرگیز شلکەی نەدەکرد بەڵام لە کاتی پێویستدا دەیتوانی هێندەی شەربەتی پرتەقاڵ شیرن و بە تام بێ. لە بیرناکەم جارێکیان لە موناسەبەدا کەوتە سەر ئامۆژگاریی قوتابییەکان و چووە باری پۆزی خیتابیەوە، بە جۆرێک سواری هەست و هۆشمان بوو فرمێسک لە زۆر چاوان هاتە خوار... لە مانگی یەکەمی خوێندنمدا بووم، موتەسەڕیفی هەولێر، مەحموود فەخری، سەردانێکی مەکتەبەکەمانی کرد و بە پۆلەکاندا گەڕا... پاش گەڕانەوەی بۆ دایەرەی خۆی (بەرانبەر مەکتەبی ئێمە بوو) خورشید سەعید بە دوایدا ناردم، گوتی موتەسەڕیف داوای کرد بچێتە لای و هەر ئێستا چاوەڕوانت دەکات... مەحموود فەخری زۆر دۆستی مەلا ئەفەندی و باوکم بوو. پێشتر لە ڕێکەوتدا دیتبووم تەنانەت بەر لە ساڵێک نیوەڕۆژێکیان لەماڵی شێخ مستەفا قەرەداغی کە «حاکم منفرد» ی هەولێر بوو، بە موناسەبەی سەردانی باوکم لە مەلا ئەفەندی، نانی نیوەڕۆمان خوارد و مەحموود فەخریش ئامادەی داوەتەکە بوو، هەر ئەو سێ مێوانە و منی مێردمنداڵەش بەشدار بووین بەڵام من هەر گوێگر بووم.

ئەو ڕۆژەی کە لەسەر داوای خۆی چوومە لای یەکەم جار بوو وتووێژمان ببێ. چەندێکی بڵێی بەخێری هێنام و پێی گوتم دەبێ بە مامی خۆممی حیساب بکەم دەنا گلەییم دەباتەوە بۆ لای باوکم. زۆری پەلە کرد خزمەتێکم بکا لێم قبووڵ نەکرد و بە سپاسەوە پێم گوت کە من لە باوکیشمەوە هیچم بۆ نایەت چونکە مەلا ئەفەندی بە زیادەوە لێم خەرج دەکات و هەموو مەسرەفێکمی دەر عوهدەی خۆی کردووە و لێی مەنع کردووم کە هیچ شتێک لە هیچ کەسێک قبووڵ بکەم. بەهەمەحاڵ تەواوێک مەمنوونی کردم و وتووێژمان بە کوردی بوو، چونکە خەڵقی کەرکووک بوو کوردییەکی ڕەوانی قسە دەکرد. کە گەڕامەوە باداوە حیکایەتەکەم بۆ مەلا ئەفەندی گێڕایەوە، پەسەندی ڕەفتارمی کرد. بە نامەش خەبەری باوکمم دا کە موتەسەڕیف ڕەفتارێکی وەها پیاوانەی لەگەڵمدا کردووە. بەڵام مەحموود فەخری خۆیشی نامەی بۆ باوکم نووسیبوو بە ناوتوێژێکی نوکتەسازیەوە لە بارەی قبووڵ نەکردنی خزمەتی ئەومەوە گوتبووی «ناخەڵەف دەرچوو» واتە ڕێبەدێیی لە باوکی خۆی نەکرد. باوکم لە وەڵامدا پێی گوتبۆوە خۆ باوکی هیچی لێ وەرنەگرتوویی هەتا «ناخەڵەف» دەرچووبێ.

هەر لەو سەروحەدەدا بوو دیسان ڕۆژێکیان خورشید سەعید بانگی کردمە لای خۆی. ئەوسا هەولێر لەلایەن «معاریف»ـەوە سەربە کەرکووک بوو. پێی گوتم لە مدیرییەتی مەعاریفەوە بڕیارێک هاتووە کە بە ناوی «تەلەبەی هەژار» ەوە مانگی دینارونیوێکت پێ بدرێ بەڵام حەز ناکەم قبووڵی بکەیت چونکە وەزعەکەت ئەوە هەڵناگرێ. ڕاستییەکەی خۆیشم هەر لەو باوەڕەدا بووم کە یەکێکی وەکوو من بێنیاز لەو تەرزە یارمەتییە و مێوانی کەسێکی وەکوو مەلا ئەفەندی نابێ خۆ بە هەژار لە قەڵەم بدات. مدیرییەتی مەعاریفی کەرکووک لە خۆوە، بەپیاوەتی، ئەو بڕیارەی دابوو. بە عادەت دەبوو مەزبەتەی فەقیری و داوای یارمەتی و ئیسپاتی خوێندن بە عەرزوحاڵ بگاتە مەعاریفی کەرکووک ئنجا بڕیار دەربچێ. ئیشەکە لە بنەڕەتەوە مامۆستا عەبدوڵا عەلی حیکمەت کە پێشتر لە کۆیێ معلیممان بوو دواتر بوو بە موەزەف لە مەعاریفی کەرکووک، پێکی هێنابوو ناشزانم چۆن مدیری مەعاریفی ئیقناع کردبوو کەوا بەبێ ئەوراق و عەرزوحاڵ ئەو بڕیارە دەرچوێنێ.

«عەلی حیکمەت ئەفەندی» لە ناسراوەکانی کەرکووک و مەلا هەرە زلەکانی بوو، لای باپیرم ئیجازەی وەرگرتبوو، وا بزانم لە دەوری عوسمانلییەکان بوو بە نائیبیش. عەبدوڵا ئەفەندی تا لە کۆیێ بوو، دواتریش بەردەوام، دۆست و ناسیاو بوو، هەتاکوو ئێستاش پێوەندی دۆستایەتی هەر ماوە لە نێواندا هەرچەند یەکتر دیتن وەزەحمەت کەوتووە.

خورشید سەعید، خوا لێی خۆش بێ، غەدرێکی لێ کردم هیچ ڕێشم نەبوو بتوانم غەدرەکە بسڕمەوە. هەر لەو ڕۆژانەی مانگی دوەم و سێیەمی خوێندنی تازەمان بوو دڵی قوتابییەکی شەقڵاوەییم یەشاند، ئەویش بە نوکتە و پلار نەک بە دەسدرێژی لێکردن، بە گریانەوە چوو بۆ لای مدیر، منیش بەرەو ژووری مدیر ڕۆیشتم لە نزیک دەرگای ژوورەکەی تووشی بووم و ئەو قوتابییەی بە دواوە بوو. بێ ئەوەی ڕێم بدا هیچ بڵێم زللەیەکی لێ دام... من دنیام لە پێش چاوان تاریک بوو یەکسەر کشامەوە و لە مەکتەب دەرکەوتم. دوای من مدیر هەموو قوتابییەکانی کۆ کردبۆوە و بڕیاری شکاندنی پێنج پلەی ئاکاری منی بەسەردا خوێندبوونەوە. سبەینە وەکوو هەموو ڕۆژێکی دیکە هاتمەوە مەکتەب و هیچی دیکەی بە دوادا نەهات. نە مەلا ئەفەندی و نە باوکیشم لەو ڕووداوە ئاگادار نەکران. لە کۆتایی حەفتاکاندا مامۆستا و مدیری کۆنم خورشید سەعید لەگەڵ مامۆستا عەبدولخالق قوتب کە ئەویش

مدیر و مامۆستام بوو لە سەرەتایی کۆییدا، هاتنە لام لە مەجلیسی خدمە (چەند ساڵێکان تێیدا ئەندام بووم). کچێکی مامۆستا خورشید سەعید موراجەعەی دامەزراندنی دەکرد، ئەویش بە چاوساغیی مامۆستا قوتبەوە هاتە لام بە تەمای ئەوەی یارمەتییەکی کچەکەی بدەم، پێی ناوێ بڵێم، هەرچی ڕێز هەیە لێم نا و هەرچی لە دەستەڵاتمدا بوو بۆم بەکارهێنا. دوای ئەو سەردانە زۆری نەبرد کۆچی دوایی کرد، بەڵام لە دەمی سەردانەکەدا هەر ئەوەبوو مووی سپی بووبوو دەنا پێستی لۆچاوی نەبووبوو، بریقەی چاوی نەکوژابۆوە. سەد جار گەردنی ئازاد بێ.

لە سەرەتای کرانەوەی مەکتەب مامۆستایەکی ڕیازەی بەدەنیمان لە کەرکووکەوە بۆ هات دەتگوت هێزی کارەبا دەیگێڕێ هێندە چالاک بوو. شاکر سەید حەکیم خوا لێی خۆش بێ، لەو چەند ڕۆژانەدا کە مامۆستامان بوو وێنەی خۆی لە زەینمدا نەقش بەستوو کرد. بە زوویی نەقڵ کراوە بۆ کەرکووک و یەکێکی دیکەی (حاجی داود ناو کە دواتر بوو بە زابت) هاتە جێ، کەمتر لە مامۆستا شاکر توندڕۆ بوو.

لە زۆر جاروباردا مامۆستا شاکرم دەدیتەوە تاکوو ئەویش لە ساڵانی دواییی حەفتاکاندا هاتە لام لە مەجلیسی خدمە بۆ گەڕانەوەی بۆ سەر وەزیفەکەی کە لەبەر وەزعی تایبەتی کوردەواری بە تەقاعود لێی دەرچوو بوو. بەداخەوە ئەویش دوای گەڕانەوەی بۆ وەزیفە بە ماوەیەکی کورت کۆچی دوایی کرد.

بە خوێنەر بڵێم، کە ئەو مەعاشە دینار و نیویەی حکوومەتیم ڕەت کردەوە و بە قوتابییەکانی کۆیە و ڕەواندزیم گوت، تەواوێک گلەییان لێ کردم، گوتیان دەبوو قبووڵی بکەیت و تەلەبەی موحتاجی ببەخشیت. ئەوان کۆمەڵێک بوون بەیەکەوە خانوویان گرتبوو هێندێکیشیان مەعاشی هەژارییان وەردەگرت. دینار و نیوێکی ساڵی 1934 پتر بوو لە مانگانەی عەمەلەیەک و خەڵقی پێ دەژیا. ئەو هاوڕێیانە لەسەر حەق بوون بەڵام منیش عوزرم بە دەستەوە بوو. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ، مەعاشی هەشت مانگ خوێندن کە دەیکرد دوانزە دینار، گەنجێکی ئەوسای وەها پۆشتە دەکرد، دەیبردەوە ڕیزی کام مومەسیلی مەشوور بوو. قاتە جلکی هاوینی دینار و نیوێکی تێدەچوو، پێڵاوی چاک بە 400 فلس بوو. بەهەمەحاڵ ڕەت کردنەوەی مەعاشەکە زەریبەیەک بوو دەبوو بیدەم. بەخێر ئەگەر لێرە بە دواوە شتی وەهام بۆ ڕێککەوت ڕەتی ناکەمەوە.

بێمە سەر باسی برادەریی نێوان خۆم و عیززەددینی مەلا ئەفەندی. عیززەددین بە دوو ساڵێک لە من گەورەتر بوو دایکی کچی عەبدوڵا موخلیس بەگ بوو کە لە نەوەکانی برایەکی پاشا کۆرە بوو. لەو ڕیشەوە خزمایەتیی هەبوو لەگەڵ سمایل بەگی ڕەواندز، ئەو سمایل بەگەی لە زۆر سەرچاوەی نووسراوی کاربەدەستە ئینگلیزەکانی سەرەتای دامەزرانی عێراق ناوی دێت، بەتایبەتی لە کتێبەکەی هامیلتن *Road through Kurdistan*.

من سمایل بەگم دیتبوو ئەویش جارێک لەو جارانەی کە لەگەڵ باوکمدا دەهاتمە هەولێر و لای مەلا ئەفەندی لە باداوە دادەبەزین، سمایل بەگ مێوانی مەلا ئەفەندی بوو. هەتا بڵێی گەنجێکی لێ وەشایەوەی مەند و مەستوور و بە ڕێوجێ بوو. مەلا ئەفەندی زۆری خۆش دەویست و زۆریشی ڕێز لێ دەنا شەویش هەتا درەنگ لە داوەتی دۆستەکانی لە هەولێر دەمایەوە.

زۆری نەبرد دوای ئەو دیتنەم، هاوین بوو لەگەڵ کاک مەجیدی ئامۆزام لە کۆیە هاتینە هەولێر، سێ شەوان لای سەید نەزیفی شێخ کەریم، مامۆستای قوتابخانەی یەکەمی سەرەتایی هەولێر،ماینەوە. دایکی سەید نەزیف عایشە خان کچی شێخ کەریمی بەرزنجی و خوشکی «حزینە» ی دایکی مامم بوو. ئافرەتێکی نوورانیی کورتەباڵای قسەشیرنی پڕ سۆز و پەرۆش بوو، کە بە لا گەردنماندا دەنووسا و ماچی دەکردین دەتگوت هەڵمان دەمژێ، ئێمەش هەمووومان چ جەلیزادە و چ تایەفەی شێخ کەریم تا ڕادەی تەقدیس خۆشمان دەویست، بۆ هەمووان چ دایک بوو، هەزار ڕەحمەتی لێ بێ. دوای سێ ڕۆژ چووینە هەڵەجە لای خاڵە شێخ عەزیزی شێخ مارفی بەرزنجی کە دایکی کاک مەجید بە سەردان لە براگەورەی خۆی، شێخ عەزیز، بەینێک بوو لێی مێوان بوو ئێمەش هاتبووین بیبەینەوە بۆ کۆیێ. لە هەڵەجە بووین ڕۆژێکیان خەبەر هات سمایل بەگ کوژراوە. بەڕاستی تا ناخی دڵ تەئسیری لە هەموو کەس کرد. بە هەق خەسارەیەکی زل بوو لە ڕەواندز و کورد کەوت، کوژرانەکەشی لە هیچە بوو.

دوژمنایەتیی نێوان ماڵی سمایل بەگ و ماڵی باوێلاغا لە ڕەواندز ڕووپەڕەیەکی ڕەش و خوێناویی ئەو هەرێمەیە. درێژەی باسەکە لێرەدا جێی نابێتەوە، ئەو ساڵە بەر لە چەند مانگێک سەباحی نووری باوێلاغا لە جادەی هەولێر دەمانچەی هەڵکێشا و ویستی سمایل بەگ بکوژێ، وابزانم سمایل بەگ نەختێک بریندار بوو. بەهەمەحاڵ

له مەحکەمە سمایل بەگ وازی له دەعوای شەخسی هێنا، بەڵام سەباح بە تۆمەتی «شروع بالقتل» بڕیاردرا لەسەر گرتنی. نووری باوێلاغا ئەمەی له دڵی خۆی گرت و لەسەر سمایل بەگی حیساب کرد. ڕۆژی گەڕانەوەی سمایل بەگ بۆ ڕەواندز نووری باوێلاغا له شوێنێکی نێوان سپیلک و خەلیفان بە کۆمەڵێکەوە بۆی له بۆسە دانیشت. که سەیارەی سمایل بەگ دەگاتە ئەو جێگایە دەسڕێژی لێ دەکرێ و بەردەکەوێ و دەرحاڵ دەمرێ، نووریش بە بریندارى گیرا، دواتر حوکم درا. سەباح حوکمەکەی تەواو کرد و دۆستایەتیی لەگەڵ یوونس سەبعاوی هەبوو بە نیازی ئەوەی شەفاعەتکاری بکا بۆ باوکی له هەرای مەشووری 1941 بە هەرای ڕەشید عالی وەهای جانفیدایی کرد تێدا کوژرا. نووری حوکمەکەی تەواو کرد و چاک بۆوە و ژییا تا ساڵانی دوای 1960، بەهەمەحاڵ سمایل بەگ بوو بە قوربانییەکی تازە و گەورەی دوژمنایەتیەکی کوێرانە.

لەگەڵ کاک مەجید 16 شەو ماینەوە له هەڵەجە. له دێی ئاخوڕەش، که ماڵی شێخ تاهیری برای دوەمی شێخ عەزیزی لێ بوو سێ شەو ماینەوە ئەو ماوەیە دەتگوت له دنیایەکی دیکەین. ئەگەر تارمایی کوژرانی سمایل بەگ نەبوایە کاتی وەها کامەران و بە تام و خۆشی کەم دەست دەکەوێ.

بگەڕێمەوە بۆ باسی عیززەددەین، پێشتر له سەفەرەکانی که هاتمە باداوە ئاشنایی و بۆرە دۆستایەتیمان پەیدا بووبوو. ئەمجارەیان بۆ ماوەی پێنج ساڵ، ساڵی نزیک هەشت مانگ بەیەکەوە بووین. دۆستایەتیمان هەموو سنوورێکی تێپەڕاند. باوکی له زووەوە ژنی بۆ هێنا، کچێکی تاقانە کچی ئامۆزایەکی خوالێخۆشبووی خۆی لێ مارە کرد. چەند دێیەکی عومدەی کەندێناوە لەو ئامۆزایە بە میرات بەجێ مابوو، مەلا ئەفەندی هەمووی بۆ ئەو کچە هێشتەوە، میراتگرەکانی دیکەی بە پارە ڕازی کرد. دایکی کچەکە کیژی شێخ حیسامەددینی تەوێڵە بوو دەمێک بوو ئەمری خوای کردبوو. له یەک دوو ساڵدا جارێک سەردانیان لێ دەکرد، ئەویش، لەگەڵ عیززەددین سەری لێ دەدانەوە.

عیززەددین کوردی و تورکی و عەرەبی و ئینگلیزیی بە چاکی دەزانی. هەر لەو ساڵانەدا که بەیەکەوە بووین مامۆستای فرەنسی سانەوی دەهات و دەرسی فرەنسیی پێ دەگوت هەتا لەویشدا ڕەوان بوو. کتێبخانەیەکی بە پۆزی له کتێبی نایابی هەمەچەشنەی ئینگلیزی و فەرنسەیی بەیەکەوە نا، گەلێک گۆڤار و ڕۆژنامەشی له

ئەورووپاوە بۆ دەهات، ئەندامیش بوو لە کۆمەڵەی «کۆنکۆردیا»ی پوولی پۆستە کە ناوچەکەی لە بەرلین بوو، تەنانەت بوو بە وەکیلی کۆمەڵەکە لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. پۆستەی ڕۆژانەی عیززەددین بە قەدەر پۆستەی دایەرەیەکی ئاوەدان دەبوو. گەلێک جار لە ئەندامانی کۆمەڵەی پوول بایی دەیان دینار پوولی وڵاتانی بۆ دەهات، لە بری ئەواندا پوولی عێراقی بە دەیان دینار دەکڕی و بە تەمغەی پۆستە بە تاڵی دەکردن و بۆ ئەو خەڵقەی دەناردەوە. لە زۆر ڕووەوە زەوقمان وەکوو یەک بوو، ئەگەر جوداییش هەبا وردە وردە لە یەکدی نزیک دەبووینەوە.

ژیانی باداوە بۆ من دەرگەیەکی نوێ بوو، بەرەو دنیای بەرینتر لە دنیاکەی کۆیێ، لێم کرایەوە. هەرچەند لە کۆیێ ژیانم لە چاو هی خەڵق گەلێک بە تامتر و بەرفرەوانتر و ڕوونتر بوو، دیسانەوە کۆیێ شارێکی لا چەپ بوو، بە خۆیەوە خەریک بوو. هەولێر ناوچەی لیوا بوو، باداوەی مەلا ئەفەندیش ناوەندی بزووتنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەوسای هەولێر بوو. یەکێک گوێی هەڵخستبایە هەموو سرکە و کورکە و وردەنهێنیی ڕەسمی و ئەهلیی ئەو وڵاتەی دەبیست. چی لە بەغداش ڕووی دابایە یەکسەر خەبەرەکەی دەگەیشتە باداوە. ئەو ساڵە کە من چووم بۆ خوێندن عیززەددین تازە لە یەکەم سەفەری بۆ دەرەوەی وڵات گەڕابۆوە، لەگەڵ موحسیناغای سەرۆکی شارەوانیی هەولێر کە کوڕی پووری بوو بەیەکەوە چووبوون بۆ لوبنان و تورکیا و یۆنان. ناسیاوی پەیدا کردبوون، هەندێکیان هاتنە باداوە و لێی مێوان بوون، یەک لەوانە قەشەیەکی زۆر موحتەرەمی لوبنان بە خۆی و کچکێکەوە هاتن و چەند ڕۆژان مانەوە. ڕاستییەکەی مرۆ حەز دەکا پیاوە ئاینیەکانی وڵاتی خۆیشی وەک ئەو قەشەیە ڕۆشنبیر و بەڕێز و قسەزان و ئوسووڵزان بن. کچکەکەی جحێڵ بوو لە چاو ئافرەتی خۆماڵی دەتگوت پەپوولەیە ئەوەندە ناسک بوو.

پێویستە دان بەوەدا بهێنم کە دوای ماوەیەکی دوو هەفتەیی لە هاتنم بۆ هەولێر بیری ماڵەوەمان وەهای بێئۆقرە کردم هیچ حاڵی پێ نەهێشتم. هەرگیز هێندە لە ماڵەوە دوور نەکەوتبوومەوە. بەزۆر باردا خۆم بۆ تەسکینی تاقی دەکردەوە، هیچیان بە قەدەر ئەوە ئارامی نەدەکردم کە دەهاتم لە تارمەی دیوەخانەکە بەرەو هەولێر دادەنیشتم بە چاوەنۆڕی دیتنی هاتوچۆی ئۆتۆمۆبیلان لە نێوان کۆیە و هەولێردا. ڕێگەی کەرکووک و شەقڵاوەش لێمەوە دیار بوون بەڵام ئەوان قیرتاوبوون ئۆتۆمۆبیل بە سەریانەوە وەکوو پنۆکی ڕەش و بۆری گەورە و ناوەنجی و بچووک

پشتەو هەولێر و بەرەو هەولێر بێ سەروسەدا دەخشین، هەرچی ڕێی کۆیە بوو خۆڵ بوو، لە دووری دوورەوە تۆزی بڵند دەکرد و وەکوو گوریسی قەفقەف بە دوایدا دەهۆنرایەوە و خاو دەبۆوە. ئەوانی دەهاتنە هەولێر لە دوورەوە بە خێرم دەهێنان، ئەوەی بۆ کۆیەش دەچوون بە خەیاڵ لەگەڵیاندا سەفەرم دەکرد.

لە پاش بارانان ئەو تۆزە خۆشخەبەرە نەما چونکە تۆز لە قوڕ هەڵناستێ بەڵام تا ئەو دەمە بێئۆقرەییم بەسەر چووبوو: ڕێکەوت وەیا پێداویستێک داوای کرد بچمەوە کۆیێ. ئەو سەردانەم لە کۆیێ و مانەوەی شەوێکم لەگەڵ ئەهلیماڵەوە لە کلێپەی سۆزمی کز کردەوە. کە چوومەوە خەڵق لە بانان هاتبوونە هەیوانەکان بۆ نوستنی شەوانە. هەر لە بیرمە بێشکەی فاررووقی برام هەتا بەیانی چرای لە نزیکەوە هەڵدەکرا، ئەوسا کۆیێ جارێ زۆری مابوو بگاتە سەردەمی کارەبا.

باداوە کارەبای خۆی هەبوو، لە مەودای سەد مەترێک دووری دیوەخانەکەوە یەک حەساری گەورە کرابوو، ماڵی لێخوڕی ئۆتۆمۆبیل (جوادی خەڵقی ئەستەمبوڵ) و نشیمەنی وەستای کارەبا (وەستا مووسا کە دواتر لە سەنعەتکاری کارەبادا بوو بە دەوڵەمەندێکی هەولێر) و بەردەستەکەی و ماڵی پاسەوانەکان و سەقا و دەستوپاوەندی دیکەی سەربە ماڵی مەلا ئەفەندی لەو حەسارەدا بوو، مەکینەی کارەباش هەر لەوێ بوو. یان ساڵی هەوەڵ یان ساڵی دوەمی خوێندنم بوو، خەتی تەلەفۆنیش ڕاکێشرا بۆ باداوە، ئەوسا زۆر زەحمەت بوو تەلەفۆن بە دەرەوەی سنووری بەلەدیە بدرێ.

ڕەمەزان هات، ئەوسا دەکەوتە کژی سەرماوە هەموو داب و دەستوورێکی باداوە گۆڕا. مەلا ئەفەندی درەنگتر لە ڕۆژان دەچوو بۆ هەولێر و پاش عەسر دەگەڕایەوە بۆ باداوە تا ئەوەی من لە دەوامی دوەمی مەکتەبم دەبوومەوە و لە خزمەت ئەودا دەبووم لە گەڕانەوەدا. هەموو شەوێک مەلا ئەفەندی لە ژووری دیوەخانی گەورە و عیززەددین و قاسمیش لە ژوورێکی بچووکتر دادەنیشتن و مێوانی هەولێریان بەخێر دەهێنا هەتا شەو ڕادەشکا. ئێمە بە دزیەوە ڕادیۆمان لێ دەدا نەکا دەنگی بگاتە بەر گوێی مەلا ئەفەندی چونکە حەزی لێ نەدەکرد، بە گەپ و یاری و نوکتەش خۆمان و مێوانی مەحرەمیشمان دەخافڵاند.

ئێوارەیەک لەو ئێوارانەی یەکەم ڕەمەزانی کە لە هەولێرم بەسەر برد. بە عادەتی ڕۆژان، سەعاتێکی مابوو بۆ ڕۆژاوا لە خزمەت مەلا ئەفەندیدا دەهاتینەوە باداوە، کە دەرچووین لە شار دیتم هەورێکی ڕەشی خماوی تێری ترسناک سەری لە ئاسۆی ڕۆژاوای باشووری دەرهێناوە بۆ لامانەوە دێت. نیو سەعاتێکی مابوو بۆ سەڵای ئێوارە هەور گەیشتە جێ. لە دەقیقەیەکدا وڵات بەسەر ئاو گەڕا و دنیا بوو بە تاریکی ئەنگوستنەچاو. ئەو ڕۆژە مەلا ئەفەندی مێوانی لە شارانەوە بۆ هاتبوو، لەگەڵ ئەواندا فتارمان کردەوە. کە بانگی دا دەتگوت هی نوێژی خەفتنانە، گرمەی هەورە تریشقەش وەها لە شەڕدا بوو دار و دیواری دەلەرزاند و هەناوی مرۆی دادەخورپاند. لەو دەشتاییە ئاو وەها هەڵستا هاتوچۆی نێوان دیوەخانە و حەسارەکەی نزیکیەوە بڕا. لە هەموو عومرم دیاردەی وەهام نەدیتبوو نەشم دیتەوە کە هەور وەکوو لێفە بەسەر وڵاتدا بێت و تروسکەی ڕووناکایی لێوە ڕەت نەبێت و ئێوارە بکات بە نیوەشەو.

ئەو ئێوارەیە خواردەمەنی بە ئەرکەوە لە دیوی ماڵەوە بۆ ژووری نان خواردنی مێوانان دەگەیشت چونکە ماوەی بیست مەترێک بە بۆشاییدا لەبەر باران دەگوێزرایەوە بارانەکەش غەزەبی خوا بوو، دەبوو بە دوو سێ کەس یەک قاپ خواردەمەنی ڕزگار بکەن لە دەست لێزمەی نووح. بەر لە 40 ساڵێک ئێوارەیەکی ئەوتۆیی لە ڕەمەزاندا کۆیەش، بەر لە سەڵای ئێوارە، هەورێکی ڕەش شەوی لێ داهێنا بوو تا ئەوەی هەندێک وایان زانیبوو سەعاتەکانیان لە هەڵەدان و فتاریان کردبۆوە بەڵام خێرا ئاسۆی ڕۆژاوا ڕوون بوو بۆوە و مامە ڕۆژ دیار کەوتبۆوە. ئەوەی منیش ئەگەر هەورەکەی ئەو ڕۆژە ئاسۆی غەربی بەردابایە ڕۆژی لێ هەڵدەهاتەوە بەڵام باران و تۆفە و شەڕە تۆپی ئاسمانی هەتا دوای نوێژی عیشاش هەر لە فتنەجۆییدا بوو. ئەو شەوە ئاوی بەستی ناو شار چەند ماڵێکی نزیک بەستەکەی بردبوو.

بۆ جەژن گەڕامەوە کۆیێ، دەوری حەفتەیەک مامەوە بەڵام بە جۆرێکی چاوەڕوان نەکراو خەڵقی شار ڕوویان لێ نام. باوکم کمێک ناساغ بوو لە دیوی ماڵەوە دەمایەوە و خەڵق دەچونە لای، منیش لە دیوەخانە بەخێرهاتنم لەو هەموو دۆستخوایانە دەکرد کە هەندێکیان، بۆ جێ کردنەوەی هێندێکی دیکە، ژوورەکەیان جێ دەهێشت. شەوان مەلا ئەسعەدە کۆرە مەجلیسەکەمانی بە غەزەل و گۆرانی دەڕازاندەوە،

هەرچی قسەخۆشی شار هەبوون سەردانیان دەکردین و بە نوکتە و قسەی شیرن کۆڕیان گەرمتر ڕادەهێنا. مەلا مستەفای عاسی دوو پارچە مەدحی دۆستانەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، یەکێکیان بۆ من ئەوی دیکەش بۆ عیززەددین.

شەوی جەژنمان بە قەڵەباڵغی لە حوجرەی مەلاکانی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە ڕابوارد. تا سەعات دەی عەرەبی خەریکی گەمە و کارەمستێنە و سوحبەتی قسەخۆشان بووین. لە سەعات دەشەوە هەتا بانگی دا لە ژووری فەقێکان شایی دابەسترا. ئەوەی ماندوو دەبوو جێی خۆی بە هی حەسایەوە دەدا.

تۆ سەیری ئەو وشکە کەیفە بکە، چۆن کۆمەڵەی دەیان پیاو بۆ ماوەی پتر لە دوو سەعات و نیو زرمە لە عەردی حوجرە بهێنن و تۆز بۆ هەوا بەرز بکەنەوە و «خانمی کیژێ کاکەڵا»ی بە دەمەوە بڵێن و بەرزەپێ هەر جارەی بۆی هەڵستنەوە و ڕەپ دابەزنەوە و ماندوو نەبن وەک ئەوەی کە هەر یەکە دۆیەک[17] و دووانی لە دەستدا هەڵپەڕن. کە بانگی دا خەڵقەکە وازی لە شایی هێنا، چی لە شەوچەرە مابوو، بە شەڕە چەپەڵۆک فڕان فڕان کرا. تومەز برسی بووبوون هەم لەبەر شایی و هەم لەبەر بێ پارشێوی. دوای نوێژ تێکڕا چووینە مزگەوتی گەورە بۆ نوێژی جەژن. بەڕاستی ڕووناکی ئەو بەیانییە بەر لەوەی لە ئاسۆی خۆرهەڵاتەوە شەبەق بدات لە ناخی هەناومانەوە تریفەی دەدا.

ساڵم ڕابوارد، لە خوێندن باش بووم بەڵام بە دەست ڕیازەی بەدەنییەوە ناڕاحەت بوو. شەرمم دەکرد جلکی ڕووت و قووتی ڕیازە لەبەر بکەم، نەشم دەدرکاند بۆچی ڕیازە ناکەم. خورشید سەعید بە عادەتی خۆی هەر قوتابییەکی نافەرمانییەکی کردبایە لە ڕۆژێکدا چوونەوە ماڵی نیوەڕۆی لێ مەنع دەکردن و بە ڕیازە ماندووی دەکردن بەڵام لە جلکی عادەتیدا. هەر حەفتەیەکی ڕیازەی تێدا کرابایە منی تێدا غایب دەبووم و ئەو سزایەم لە دەست مدیرم دەچێشت. جارێکیان دەفتەری نەخۆشانم برد بۆ نەخۆشخانە د. سەبری کە دۆستی عیززەددین بوو منیشی باش دەناسی و لە زۆر شتدا بەیەکەوە دەدواین بۆی نووسیم کە دوو ڕۆژە لە ڕیازە ئیستیراحەت بکەم چەندی گوتم دکتۆر لەم دوو ڕۆژە تەنها یەک ڕۆژی بۆ من

17- دۆ: ئافرەتی دەستی پیاو لە شایی ڕەشبەڵەکدا. کورتکراوەی دۆتە.

دەبێ چونکە سبەینێ ڕیازە هەیە دوو سبەینەم لێ دەچێتە خۆڕایی، فایدەی نەدا. لە گەڕانەوە بە هەموو مەهارەتێکی هەم بوو، زۆریش نەبوو، هەستام «اجازة یومین» م کردە «اجازة شهرین». گۆڕانەکە خراپ نەبوو بەڵام سەرەواوی «یومین»م بۆ چاک نەکرا وەکوو دوومەڵ لە نێوان «ش - هـ»ی «شهرین» پۆزایی هەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا فێڵەکەم سەرکەوت و کەس لێمی بەسەر نەگرتەوە.

د. سەبری قەببانی وەک گەلێک لە خوێنەرانی ئەم ڕۆژگارە دەزانن خەڵقی سووریە بوو، لە خەستەخانەی هەولێر بووبوو بە دکتۆر. بە ماڵەوە هاتوچۆی باداوەی دەکرد. لە گەشتی بەهاران کە ڕۆژانی جومعە هەر جارە بەرەو لایەک بۆ ڕابواردن دەچووین، د. سەبری لەگەڵماندا دەبوو، بە زۆریش ئەو کامێرای لە کار دەهێنا و وێنەکانی سەروبەر دەکردن. لە ژمارەیەکی پار، پێراری گۆڤاری «الف باء» یەکێک لەو ڕەسمە کۆنانە بڵاو کرایەوە و چەندوچۆنیەکەی شەرح درابوو. بەڵام زۆر بە سەیری جارێکیان لەو گۆڤارە «طبي» یەی خۆی لە شام دەری دەچواند ڕەسمێکی لەو ڕەسمانە بڵاو کردەوە کە لە دێی بێستانە گیرابوو، حەمەد مستەفای وەکیلی مەلا ئەفەندی و کوێخای دێیەکە مێوانداری دەکردین. ئەو ڕۆژە حەمەد مستەفا کام جلکی قۆزی هەیبوو لە سەڵتەی سوورمەدار و کەوای تاقە و سەروشەدەی ئاوریشم لە خۆی ئاڵاند بوو، ڕەسمەکەش هەر وەهای دەرخستبوو. د. صبری وای ڕانواندبوو کە ئەم وێنەیە لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی بەیەکەوەمان گرتووە کەچی زۆر باش دەیزانی حەمەد مستەفای بێستانەییە. خوای لێ خۆش بێ، دیارە مرۆ دەکتۆریش بێ هەر بە مرۆیی و بەو کەموکەسرییەی هەیەتی دەمێنێتەوە. د. سەبری تا سەرەتاکانی جەنگی دوەمیش هەر لە هەولێر بوو، تەنانەت ناسیاوێکی خۆی، د. فائق نەحجاس، کە کرا بە دکتۆری کۆیێ نامەی شناسایی لە د. سەبریەوە بۆ باوکم هێنا.

لەوەوە د. فایەق نەحجاس هێندەی تاکێکی ماڵی خۆمان ئاشنا و برادەر و دۆست بوو. کە ماڵمان چوو بۆ چنارۆک خۆی هاتە خانووە کۆنەکەمان تا لە گەشتی هاوینە گەڕاینەوە. ڕێکەوتێکی سەیرە کە لە ساڵی 1926 و 1927 ەوە تا گەڕانەوەی د. فایق و د. سەبری بۆ سووریە ئێمە پێوەندیمان لە کۆیە و لە هەولێر بە دکتۆری سوورییەوە پتر بوو تا هی عێراقی.

لە ساڵی 1926 و بەرەو دواتر «د. ریاض» کە بەڕاستی بلیمەتێکی دکتۆری بوو لە کۆیێ، هەتا خەیاڵ بکەیت لە دۆستایەتیی باوکم و ئەو، خەیاڵەکەت بڵاو نەبوە.

برینکاریی وەهای دەکرد بە بێ ئەسبابیەی کە لە «مستوصف» بوەشێتەوە سەری خەڵقی تێدا سورِ دەما... خەڵقی حەلەب و گاوور بوو بەڵام دەتگوت لە بوداپست وەیا ڤیەنەوە بە دیاری بۆ کۆیێ هاتووە. دوای ئەو د. سەڵاح کە خەڵقی شام بوو چەندین ساڵ لە کۆیێ بە دکتۆری مایەوە. زۆری نەبرد لە هەولێر د. سەبری و لە کۆیێ د. فایق نەحجاس بوون بە ناسیاو. دوای ئەوان د. سەلیم نەحجاس کارگێرِی خەستەخانەی هەولێر بوو، بەڵام نازناوی «نەحجاس» رِێکەوت بوو بۆ ئەو و د. فایق نەک هی خزمایەتییان بوو.

د. سەبری مرۆیەکی گەش بوو، چالاکییەکی هەستپێکراوی دەخستە ئەو شوێنەی لێی بایە. لە هەموو خۆشتر بۆ من ئەوە بوو کە چەندین قەوانی ئێمە نەبیستووی کەلسووم و عەبدولوەهاب و سەید [...] لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. لە کۆیێ کەسی ئەوتۆم نەبوو (جگە لە میرزای حاجی کەریم) لەگەڵمدا تێکەڵ بە گیانی ئەو گۆرانیانە بێ کە کاریان لە ناخی ناخم دەکرد. عیززەددین بۆ من ئەو کەسە دائیمییە بوو کە هەمیشە دەنگی هەستی خۆم لەودا دەبیستەوە. بەیەکەوە گوێمان دەگرت و بەیەکەوە بۆ شیرنکاری گۆرانیبێژ تەزوومان پێدا دەهات. یارمەتیدەرێکی گەورەی هەردووکمان گۆرانیبێژی قورئانخوێنی بێهاوتای ئەو دەمە و هەموو دەمێکی کورد «شەهاب» بوو کەوا بەرِاستی لە موعجیزەی دەکرد. بێ دوودڵی کردن و بێگومان دەڵێم کەس نەبووە توانیبێتی نەفەسی گۆرانی و نەفەسی تەرتیلی قورئان لە دەنگی خۆیدا کۆ بکاتەوە وەک کە شەهاب کۆی کردبۆوە. وەکوو شێخ محەمەد رِەفعەت قورئانی دەخوێند، وەکوو سەلامە حیجازی و کەلسووم وساڵح عەبدولحەی گۆرانیە سەخت و سەرکەشەکانی میسری دەگوت. لە قۆریاتی کەرکووک مامۆستای مامۆستایان بوو. لە گۆرانیی کوردی شتێک دەگێرِمەوە پایەی نیشان بدات. عیززەددین باسی کرد. گوتی ئێوارەیێک لە شەقڵاوە بە کۆمەڵ پیاسەمان دەکرد تا ماندوو بووین. لە لارێ بە سەر باغەکاندا لە رِوانگەیەک دانیشتین بۆ حەسانەوە گوتی من لەسەر بەردێکی زل دانیشتبووم شەهاب بە پێوە سەیری باغەکانی دەکرد. لەنکاو کە تێی هەڵکرد: لە باغان ئاهـ و ناڵین دێ... وەها بە لادا چووم خەریک بووم لە بەردەکەوە سەرەنگرێ ببم. شەهاب خەسارەیەکی زل بوو لە گۆرانی، بە گشتی، و هی کوردی بەتایبەتی کەوت، خۆی خەراباتی بوو، هێندەش دەست کورت بوو

زستانان گەرمی نەدەبۆوە. ئۆقرەشی نەدەگرت، کە هیچ جێگای نەدەما بە خۆیەوە بگرێ دەهاتەوە مزگەوتەکەی مەلا ئەفەندی و تێیدا ستار دەبوو.

هەوەڵ ساڵی خوێندنم بوو لە باداوە، ڕامز بەگی عەبدوڵا سافی یەعقووبی-ی کەرکووک کە قایمقامی کۆیە بوو بە مێوانی هاتە لای مەلا ئەفەندی. شەو ژوورێکی بۆ تەرخان کرا و خۆی و شەهاب تێی خزان. من لە ژووری خۆمەوە گوێم لە دەنگی شەهاب بوو قۆریاتی دەگوت بەڵام دەتگوت ئاگر لە هەناوی دەردێت. ئەو شەوە هەتا درەنگێکی زۆر درەنگ شەهاب گوتی و ڕامز بەگ دەگریا و لەسەر و پۆتەڕاکی خۆی ڕادەکێشا. پیاوەکانی مەلا ئەفەندی لە کەلێنی پەردەی پەنجەرەوە ئەوەیان لە ڕامز بەگ دیتبوو دواتر من زانیم ڕامز بریندراری عیشقێکی ناکام بوو. شەهاب بە دەردی سیل ئۆغری کرد، سەرەتاکانی عومریشی بوو لە چاو ئەو عومرەی کە مامۆستای خۆی سەید مەردان ڕایبوارد. حیکایەتی سەید مەردان و شەهاب و بە دوا ئەوانیشدا هی حەیدەر (مەشوور بە حەیدەرە کەچەڵ) بە سفتوسۆیە بەڵام لێرە جێی نابێتەوە.

عیززەددین بۆمی گێڕایەوە: جارێکیان مەلایەکی قورئانخوێنی میسری دێتە هەولێر و لە مزگەوتی قەڵات سەردانی مەلا ئەفەندی دەکات. لەو دەمەدا شەهاب لای عیززەددین قەلەندەرانە دانیشتووە. مەلای میسری عەشەرەیەکی قورئان بە شێوەی خۆیان دەخوێنێ. شەهاب لە پەنا دەرگەی ژوورەکەی مەلا ئەفەندی گوێ ڕادێڵێت بۆ قورئانخوێن. ناوناوەیەک کە ڕای لە خوێندنەکە نابێت دەبۆڵێنێ. کە مەلاکە «صدق الله العظیم»ی لێ دەکێشێت، شەهاب هەرچەند لەحەدبەدەر شەرمی لە مەلا ئەفەندی دەکرد، ئەو ڕۆژە خۆی پێ ڕاگیر نەکرا و چووە ژوورەکەوە و بەسەر ئەژنۆیانەوە قورئانێکی خوێند کە هەر بەو دەکرا. کابرای میسری واقی وڕ ما، دواتر لە مەجلیسی عیززەددین بە شەهاب دەڵێ: وەرە لەگەڵمدا بتبەمە میسر، عەهد بێ بەو دەنگەتەوە عەبدولوەهاب دەشاریتەوە و دەوڵەمەندت دەکەم بە مەرجێک بەڵێنم پێ بدەیت دوای دەوڵەمەند بوونت لەگەڵمدا بەوەفابیت. بەڵام شەهاب لەو دنیا خەراباتیەی کە قاڵبی پێوە گرتبوو وازی نەهێنا.

لەو جۆرە مێوانانە بارەها دەمدیتن سەردانی مەلا ئەفەندییان دەکرد و بە تێڵەگەی پڕەوە بەرەو ماڵ دەبوونەوە. جارێکیان مەلایەکی ئەوتۆیی قسەزانی شاعیری باخەبەری نوکتەباز یا لە فەلەستینەوە یا لە میسرەوە هاتبوو چەند ڕۆژێک لە باداوە

میوانی مەلا ئەفەندی بوو. ئەوسا (ساڵی 1938) مەحموودی کۆنە پێشخزمەتی ساڵح زەکی بەگی ساحێبقران ببوە پێشخزمەتی مەلا ئەفەندی لە باداوە. یەکجار لە پاکی و ڕێکی دیوەخانە دەکۆشا، هەرچەند مەیلەو عەسەبی بوو. مەلاکە لێی ڕازی بوو، ئەم دوو بەیتەی کرد بە مەدحی:

ان الكريم اذا لانت عريكته
كانت مواليه في الاخلاق محمودة

لذاک منی علی الملا بطائفة
نعم الموالي واعني فيه محمودا

لە موناسەبەی گۆرانی و گۆرانیبێژ بە بیرم دێتەوە، هەر لەو ساڵەی یەکەمی خوێندنم بوو جارێکیان میرانی قادر بەگی شەقڵاوە بە دەستەودایەرەی خۆیەوە هاتە باداوە لە نێوانیاندا کاوێساغاش پەیدا بوو. کاوێساغا لە ڕیزی براکانی قادر بەگ دەژمێردرا و بەشداری دانیشتن دەبوو لە مەجلیسی مەلا ئەفەندی. بەو دواییە لە گۆڤارێکی کوردی باسی کاوێساغام خوێندەوە، چی لەو باسە نووسرابوو لە بارەی ڕێز لە خۆنانی کاوێساغاوە هەمووی ڕاستە چونکە دانیشتنی لە مەجلیسی مەلا ئەفەندی بەو شێوەیەی خۆم دیتم هەموو ئەو باسانە دەسەلمێنێ. (ئەمەم لە 28/4/1986 نووسی).

لە مامۆستاکانی ساڵی یەکەمی خوێندنم حاجی مەلا کەریمی کۆیێ بوو، دەرسی دینی پێ دەگوتین. هەر جارە لە ئەزموونی مانگانە پارچە ئینشایەکی ڕێکوپێکی عەرەبیم بۆ دەنووسی بێ ئەوەی ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری وەپاڵ بدەم، چونکە لەبەرم نەبوون، ئەویش لە سەرەخۆ سەد نومرەی دەدامێ، بێ ڕیا و تێخوێندنەوەی هیچ شتێک زۆر خاتری دەویستم، ئەویش نەک هەر لای من، لای هەموو قوتابییەکان، تا بڵێی خۆشەویست و موحتەرەم بوو، هەر لە هەولێر ما هەتا مردن. مامۆستایەکی دیکەم، حیکمەت بەکر، دەرسی ڕیازییاتی پێ دەگوتینەوە. تورکی ئەستەمبۆڵ یان شوێنێکی وەک ئەوێ بوو چونکە ئاخاوتنەکەی بە تورکی ئەگەر بنووسرابایەوە دەبوو بە گوتار. وردە وردە لە عەرەبی هەنگاوی هەڵدەهێنا. عیززەددین گێڕایەوە بۆم، کە جارێ ئەو قوتابی بووە لەو مەکتەبە حیکمەت بەکر لە

دەرسی «فسلجة» باسی دڵی کردووە گوتوویەتی: «الانسان القلبها مثل الانسان القبضتها» مەبەسی بووە بڵێ دڵی مرۆ هێندەی مستیەتی. لە ڕیازیات بێوێنە بوو، خۆ کە تەباشیری بە سەر تەختەی ڕەشەوە دەسووڕاندەوە و دایەرەی ڕەسم دەکرد دەتگوت پەرگاری بەکار هێناوە. دوای خورشید سەعید ئەو بوو بە کارگێڕ، قوتابیان هەناسەیەکی ئۆخەیان هەڵێنا چونکە حیکمەت بەکر هەرچەند لە ئیدارە بێهێز نەبوو مەیلی توندی و خۆسوور هەڵگێڕانیشی نەبوو، پتریش بە لای بایەخ دان بە سەقافەتەوە دەچوو نەک بە ڕیازەی بەدەنی و تەدریبی عەسکەری (سامی شەوکەت کە بوو کارگێڕی گشتی مەعاریف تەدریبی عەسکەریی داهێنا بە چاولێکەری لە ئەڵمانیا و ئیتالیا).

ناوناوە نیوەڕۆژم لای هاوڕێیە کۆییەکان دەخوارد لەو خانووەی کە لە تەیراوە تێیدا کرێگرتە بوون. ڕۆژی وەها خەبەرم بە پیاوەکانی مەلا ئەفەندی دەدا کە بۆ نانی نیوەڕۆ ناچمەوە مزگەوتی قەڵات، یان قاسمم تێدەگەیاند. ئەو هاوڕێیانە تفاقی بژێویان لەماڵەوە بۆ دەهات یان کە لە عوتلە دەگەڕانەوە بۆ هەولێر لەگەڵ خۆیاندا دەیانهێنا. باوەڕ بکەن ئەو لوقمە پاکەی لەو ڕۆژانەدا بە هەستی برایەتی تێکەڵ لەگەڵ هەستی غەریبی بەیەکەوەمان دەخوارد، دەتگوت خۆراکی بەهەشتە، لە بیری ناو حەوشە ئاویان هەڵدێنجا.

ڕۆژێک لەو ڕۆژانەی مامۆستا ڕەفعەت دوغرەمەچی میزاجی ساف بوو بە کوردی دەدوا و هاتە سەر باسی پاکی و میکرۆب و نەخۆشی. بێ ئەوەی ئاگاداری بیری حەوشەی خانووە کرێگرتەکەی برادەران بێ گوتی دەبێ مەودا لە نێوان بیری ئاوی خواردنەوە و ئاوەڕۆی ئەدەبخانە پەنجا مەتر کەمتر نەبێ. فاتیحی خاڵە شێخ سەدر گوتی: ئەفەندی مەودای نێوان بیری ئێمە و ئەدەبخانەکەمان لەو خانوەی تەیراوادا پێنج مەتریش نابێ دەبوو هەمووومان بمرین. قوتابییەکان دایانە قاقای پێکەنین، ڕەفعەت ئەفەندی بە بزەیەکەوە گوتی، بەرخم دەبێ ئەنگۆ ڕوحتان لە پۆڵا دروست کرابێ پێتان ناوێرێ.

پار، هاوینی 1993، لە هەولێر بووم، ڕۆژێک زانیم مامۆستا ڕەفعەت دوغرەمەچی کۆچی دوایی کردووە کە تازیەی بەسەر چووبوو، خەڵقەکە لە زیارەتی سەرقەبریشی گەڕابوونەوە. من چەندێکی بۆم ڕێک کەوتبێ و برادەری خاوەن سەیارە و شارەزای ماڵەکەی ئەوم چنگ کەوتبێ سەردانیم کردووە. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی. هەتا

مرد حورمەتی خۆی پاراست و شەقامەڕێی میراتیی بەر نەدا بۆ ژیانی تازە مۆدێلی شێوە چەرخوفەلەک کە هەر ساتە لە ڕێکێکدایە.

لە بیرەوەرییەکانی ساڵی یەکەمی خوێندنم، کە هێشتا مانگێک بەسەریدا تێپەڕی نەکردبوو، ئەوە بوو کە قوتابییانی پۆلی شەشەمی یەکێک لە فێرگە سەرەتاییەکانی سلێمانی بە سەرپەرشتی کردنی مامۆستای ڕیازەیان ساڵح ئەفەندی (ناوی باوکی نازانم و بووش بە ناسیاوم، چەند ساڵێکە کۆچی دوایی کردوە) سەردانێکی هەولێریان کرد و وەک بزانم لە قوتابخانەی ناوەندی هەولێرش مێوان بوون. قوتابییەکانی هەر سێ پۆلی مەکتەبەکەمان بۆ پێشوازی لێکردنیان ڕیز بووین و کە هاتنە حەوشەی مەکتەب لەلایەن مامۆستای ڕیازەمان، حاجی داودەوە، بە گوتارێکی سەرپێیی عەرەبی بەخێر هێنران و کۆتایشی بە «بەخێر بێن» هێنا، مامۆستا ساڵح زۆر بە گورجی و بێگرفت و بە گیانێکی گەرم و گوڕی کوردایەتیەوە وەڵامی دایەوە و سپاسی ڕاگەیاند و پێوەندی «کوردبوون»ی سلێمانی و هەولێری کرد بە بنەمای قسەکانی. لە چەند قوتابییەکی کەم ئەژماری توکپەروەر بەو لاوە هەموو قوتابییەکان بەو گوتارە گەشانەوە و چەپڵەڕێزانێکی بە هاتوباتیان بۆ گێڕا. لەوەندە بەولاوە ماوە نەبوو بیان بینینەوە یان لەگەڵیان دانیشین چونکە بەرنامەی گەڕان و سەردانی شوێنی دیکە و کەم مانەوەیان دەرفەتی نەداینێ بە داخوازی دڵ بیاندوێنین و بیانبینین.

هەولێر گیانێکی کوردایەتیی تازە کەوتبوە ناو گەنجە تازە خوێندەوارەکانیانەوە. مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەورێکی گەورەی بینیبوو لە ئاگادار کردنەوەی ئەو خەڵقە بۆ کوردبوون و خۆ بە کورد زانین. بەشێکی گەنجەکانی نازناوی کوردییان هەڵبژاردبوو پێوەی دەناسران، یەکێک لەوان، فەتاح جەبار، پتر بە فەتاح خەسرەو دەناسرا (بەو دواییە بیستم ماڵاوایی لە ژیان کرد) و هەر لە گەڵیدا ژیا. من گیانی کوردایەتیم لە عیززەددیندا دەدیت، ئەویش بەپێی چاوکرانەوەی لەگەڵ گوتە و گوتارەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی، تاڕادەیەکی، تیشکی ئەوی دەدایەوە چونکە لە دەمی مامۆستایی ئەودا خۆی قوتابی بوو.

ئەو هەستە تازە سەرهەڵداوە بە هۆی شریتەی بێپسانەوەی قوتابییەکانی کۆیێ بۆ خوێندن لە هەولێر، تاڕادەیەکیش بە تەئسیری ڕەواندز و قوتابییەکانی کە لە چالاکیی سەید حسێن حوزنی موکریانی و چاپخانەکەی شیرمژی کوردایەتی

دەبوون، ئا ئەو هەستە بەردەوام و لە گەشە کردندا بوو تا ئەوەی چیرۆکێکی تەمسیلی کوردی کە پێشتر لە مەکتەبێکی کۆیێ بە ناوی «کچی کوردستان» پێشکەش کرابوو، لە هەولێریش لە ژێر ناوی «کچی دامەنپاک»دا بە کوردی تەمسیل کرایەوە، بۆ دەوری قارەمانەکە لە کۆیێ عومەر عەبدوڵا کە پێشتر خۆی لە کۆیێ ئەو دەورەی دیتبوو داوەت کرا بۆ هەولێر. ئەو خوێنە گەرمە بوو لە دەماری گەنجەکانی دەگەڕا و لە پاش هەشت ساڵان «ڕەمزی نافیع»ی بەرەو خۆبەخت کردنەوە برد بەو شێوەیەی لە ژمارەیەکی گۆڤاری «کاروان» دا بڵاوکرایەوە.

لە کۆیێ جارێ قوتابیی سەرەتایی بووم، یەکەم چیرۆکی تەمسیلی لەلایەن مامۆستا و قوتابییەکانەوە هەر لە بیناکەی قوتابخانەی سەرەتایی ئەوسادا پێشکەش کرا. دواتریش هەر لەو شوێنە چیرۆکی تەمسیلی «نیرۆن» ئاهەنگی بۆ گێڕدرا. لە هەردوو ئەشراف و پیاوە ناسراوەکان داوەت کران بۆ ئاهەنگەکان، لە هەردوو جارانیشدا باوکم گوتاری سەرەتای ئاهەنگەکەی لەگەڵ شەرحی سوودی ئەو جۆرە تەجرەبانەی بە خەڵقەکە ڕاگەیاند تا ئەوەی تەمسیلی گەیاندە پایەی «فرض الکفایة» کە بریتییە لەو پێویستییەی کە ئەگەر کەس پێی هەڵنەستێ، بە حوکمی شەرع، هەموو کەس تێیدا گوناهبار دەبێت، تەمسیلیش بۆتە پێداویستییەکی کۆمەڵایەتیی سەردەم و دەبێ بەو چاوە تەماشای بکرێت. هەر لە بیریشمە کە شەو دوای بەسەرچوونی تەمسیلی نیرۆن کە کۆتایی بەوە دێت، کۆمەڵێکی نادیار لە پشت پەرەوە هاوار دەکەن: ستەم بەردەوام نابێ و ستەمکار هەر تێ دەچێ، هەروا بە ڕێگەوە بەرەو ماڵ دەبووینەوە، باوکم گوتی: ڕاستە ستەمکار دەوام ناکات ئەمما هەتا زاڵمێکی تێ دەچێ هەزاران مەزلووم ماڵی کاول دەبێ.

لەو ساڵەی 1935ی خوێندنی هەوەڵ جارم لە هەولێر چونکە وەها ڕێک دەکەوت لە کڕی زستان و باراندا بەرەو ماڵ ببینەوە، ناخۆشیی ڕێگەی قوڕ و خواروخێچ و هەوراز و نشێوم دەچێشت. وەها دەبوو شەو لە ڕێگا دەماینەوە. عەزابی کوتانەوەی ڕێی بێقیرتاو بە ملەوە بوو هەتا ئەو ساڵانەی دوایی کە ڕێگاکە لە نوژەنەوە وەک ڕێگایەکی فەرعی قیرتاو کرا. چەندێکی سەفەرم بەسەر ڕێی قیرتاودا دەکرد دەتگوت ئەو کەسەم کە جلکی خوازرایەوەی لەبەر کردووە چونکە منیش وەک ئەو کە گەیشتمە سەر ڕێی بەرەو ماڵ، قیرتاوەکە بە خاوەنی دەدەمەوە.

ئەوسا سەرژماری قوتابییەکانی مەکتەبی ناوەندیی هەولێر، بە هی ناوەوە و عەنکاوە و کۆیە و ڕەواندز و شەقڵاوە و دزەییانییەوە، 60-70 کەسێک بوو. قوتابییەکانی پۆلی یەکەم کە نموونەی پۆلەکانی دیکە بوون هەر ئەو چین و ئەسنافانەی دەنواند کە دانیشتوانی شار پێکیان دەهێنن. وەک لە بیرمە سەید محەمەداغای سەید عەبدوڵاغای نەقیب و حەیدەری سەلیماغا (خوارزای موحسیناغای سەرۆکی شارەوانی کە خوارزای مەلا ئەفەندی بوو) ناوی «ئاغا» بە لەقەبیانەوە بوو بێ ئەوەی لە ڕەسمییات دەربکەوێ. محەمەد و موعتەسەمی فەتاح چەلەبی و عەبدولخالق ئەحمەد چەلەبی لە بنەماڵەی توجاری هەرە پێشەوەی هەولێر بە «دەبباغ» ناویان دەهێندرا. مووسا سەمەد، عومەر عوسمان، عوسمان قۆجە قەساب ئەگەرچی لەقەبی ئاغایان پێوە نەبوو بەڵام لە هیچ ڕوویەکەوە خۆیان لە کەس بە کەمتر نەدەگرت، خۆ عوسمان قۆجە و مووسا سەمەد چونکە زیرەک و تێکۆشەر بوون لە دەرسەکان هەمیشە لە قوتابیی هەرە بەرچاوی ئەو دەمە بوون. جەمیل میران ڕەشید بەگ لە بەگزادان و ئەحمەد حەسەن لە ئەسنافان نوێنەری شەقڵاوە بوون. نەژاد عەزیز لە ڕەواندزەوە هاتبوو. بابیز و برایمی عەزیزاغای ئەحمەد پاشا و بابیزی عەبدوڵاغا لە دزەییەکان بوون. دواتر هی دیکەشیان پێ ڕاگەیشتن، وەکوو جەوهەر عەزیزاغا و کانەبی عەزیزاغا و برایمی عەلیاغا. محەمەد عوسمان و عەبدوڵا حوسێن کسرە، وابزانم عەرەب نەژاد بوون، بەڵام لەگەڵ کوردان فەرق نەدەکران. چەند قوتابییەکی عەنکاوەمان لەگەڵدا بوون ناویانم لە بیر نەماوە، وا بزانم دییانی شەقڵاوەشمان لەگەڵدا بوو. جەلال قادر، برایمی سەید یووسف، عەزیز مولود، ڕەجەب وابزانم ناوی باوکی عەبدوڵا بوو هی دیکەش کە ئەگەر زەینمی تێدا بگوشم ڕەنگە بە بیرم بێنەوە هەموویان هەولێری بوون. هەرچی بڵێ ئیدارە یان مامۆستای مەکتەب فەرق و جودایی لە نێوانیاندا کردبێ بەهۆی دەوڵەمەندی و دەستەڵاتەوە، ئەشەدەوبیلا درۆی فەرمووە. قوتابییەکی دیکەمان لەگەڵدا بوو براکەی ناوی «جمیل» و مامۆستای مەکتەبی سەرەتایی یەکەم بوو لە هەولێر، وا بزانم هەولێری نەبوو، بەڵام کورد بوو، ناوەکەیم لە بیر نییە بەڵام زۆر بە سەیری هەرگیز ڕێک نەکەوت قسەی لەگەڵدا بکەم. کوڕێکی لەسەرەخۆی بە وێڵ و تەرتیب و ئەسمەر ڕەنگ و دوورەشەڕ. ئێستاش خەفەت لەوە دەخۆم (خەفەتێکی کەم) کە لە ماوەی چەندساڵدا ڕێک نەکەوێ لێو لەگەڵ یەکدیدا بقەڵێشێن بە وتوێژ. وا بزانم وەها لووا

که لە سەرەتاوە یەکدی نەدوێنین، دواتریش لێم بوو بە کوردە غیرەتی، ڕەنگە ئەویش هەروەها بووبێ.

سەید محەمەداغا و سەید برایم دەنگیان لە قورئانخوێندندا خۆش بوو. سەید محەمەداغا زوو مەکتەبی جێ هێشت، لەگەڵ عیززەددین بەیەکەوە خزمەتی عەلەمیان جێ بەجێ کرد. سەید برایم بە زاری خۆی نازناوێکی بەسەر خۆی داهێنا. جارێکیان مامۆستای لێی دەپرسی فلانە شت چی لێ هات؟ ئەویش بە تەئسیری دەرسێک کە لە بارەی «تبخر»ی ئاوەوە نیشتبوە دڵی بێ لێکدانەوە گوتبووی: مامۆستای تەبەخوری کرد!! ئیتر خۆی بوو بە «سەید تەبەخور». لێشیان دەگێڕایەوە گۆیا لە باسی «حروف الجر» کە مامۆستا بە قوتابیان دەڵێ ئەو حەرفانە تاوی فیعل بۆ سەر «مجرور» ڕادەکێشن سەید برایم بە تاقییان دەکاتەوە، دەستەسرێکی خۆی بە ئاودا دەدات وەری دەگەڕێتێ بە حەرفی جەڕ بەڵکوو ڕایبکێشنەوە بۆی، چی لەو حەرفە زانی بووی: «من، في، علی، الی...» هەموان دەڵێتەوە و بە دەستیش ئیشارە دەکات کە دەستەسڕەکەی بۆ بێتەوە، سوودی نابێ. کە هاتەوە مەکتەب یەخەی مامۆستاکەی عەرەبیی گرتبوو کە ئەم حروفە نەڕادەکێشن و نەترخێنەشن دەستەسڕەکەم ئاو بردی. ئەو ساڵەمان بەسەر برد، دەرچووم بۆ پۆلی دوەم، بە بیرمدا نایەت کەسێک لەو قوتابییەی بەیەکەوەمان دەخوێند لەو ساڵەدا کەوتبێ.

خزاینە هاوینی 1935 ڕێکەوتێکی خوولیایی ئاواتێکی دوورەدەستی خستە ناو لەپمەوە. لە نێوان پاییز و هاوینی 1934 بڕیاری دامەزراندنی کاک مەجیدی ئامۆزام بە مامۆستای سەرەتایی لە وەزارەتی مەعاریفەوە دەرچووبوو. خۆی بۆمانی گێڕایەوە لە هەوەڵی دامەزراندا، کە لە بەغدا بوو، بە ناوی باوکمەوە نامەیەکی بۆ مەجید بەگ یەعقوبی، کارگێڕی گشتی مالیە، نووسیبوو کە یارمەتیی کاک مەجید بدات بۆ دامەزراندن. گوتی هەرچەند بەڵێنی دامێ دەرێغم بۆ نەکا بەڵام بێئومێد گەڕامەوە کۆیێ. مانگێکی نەبرد، ئەمرەکەی دامەزراندنی لە ڕۆژنامە باڵاو بووبۆوە. ئەوسا مامم بە ماڵەوە لە خدران بوو چونکە بە مامۆستایی بۆ قوتابخانەی ئەوێ نەقڵ کرابوو. فەتحی (برای شیریم) ڕۆژنامەکەی گەیاندە خدران و لەو سەرەوە لەگەڵ کاک مەجید گەڕاوە بۆ کویێ. تەعینەکەی لە بەرزنجەوە بوو هاوینی دواتر وەزارەتی مەعاریف بڕیاری دا دەورەیەکی ڕاهێنان بۆ ئەو مامۆستایانە بکاتەوە کە پێویستیان بەو ڕاهێنانە هەیە.

سەرت نەیەشێنم دەبوو کاک مەجید و گەلێک لە مامۆستاکانی دیکەش بچنە بەغدا بۆ بەشداری کردن لەو دەورەیە. مامم وەهای پەسەند کرد تا بەغدا لەگەڵ کاک مەجید بێت، ئیزنی لە باوکم بۆ منیش خواست و ڕەزامەندی لێ وەرگرت. کە ئەو موژدەیەم پێ درا، عارد بە خۆیەوە نەدەگرتم، ڕەنگە لە تەمووزدا بوو ڕۆژێکیان لە خزمەت مامما من و کاک مەجید و چەند مامۆستایەکی دیکەی وەک عەبدولڕەحمان نوورجان، مەلا حەمیدی عەسکەری، چووینە هەولێر. نیوەڕۆ نانمان لە باداوەی مەلا ئەفەندی خوارد. لە کەرکووک یەک دوو ڕۆژ ماینەوە دەبوو ئەوراقی مامۆستاکان لە مەعاریفی کەرکووک بۆ ئەو دەورەیە ڕێک بخرێت. میرزای حاجی کەریم لەو بەینە بە کاتب- وا بزانم هی مەحکەمەی کەرکووک- دامەزرابوو، زۆرمان پێ گەشایەوە و کە لە دەوام دەردەچوو تا دەمی نوستن لەگەڵماندا دەبوو.

یەکەم جار بوو لە عومرم سینەما ببینم. لەگەڵ میرزا بەیەکەوە چووینە سینەماکان، هەر شەوە لە یەکێکیان. مامم لەو یەک دوو ڕۆژەدا سەردانی چەند دۆستێکی کرد، لە هاتوچۆی دایەرەی مەعاریفیش عەبدوڵا عەلی حیکمەت لە ڕادەبەدەر پێمانەوە خەریک بوو. وەک لە بیرمە ئەو ساڵە «داود السعدي» کارگێڕی مەعاریفی مەنتیقەی کەرکووک بوو کە سەیری سلێمانیشی دەکرد. بەڵام سلێمانی زوو کرا بە ناوچەی مەعاریفی خۆی.

سەفەری ئەوسا لە کەرکووکەوە بۆ بەغدا، مەگەر چۆن، دەنا بە شەمەندەفەر بوو. بۆ ئێمەمانان کە چاومان لە دنیا هەڵنەهاتبوو تەپ و تۆزەکەیشی خۆش بوو. گەیشتنی شەمەندەفەر بە ئێستگەیەک و لێ وەستانی و هاتنەخوار و سەرکەوتنی چەند کەسێک و دەنگی هێلکەفرۆش و ئاوفرۆش لەبەر تیشکی کارەبای کز جیهانێکی ئەفسووناوی بە بەر چاودا تێدەپەڕاندن. دوو جێگە لەو ڕێگەیە هەبوو، وەکوو ماچ کردنی حەجەرولئسوەدی حەج، نەدەبوو لێی بێ ئاگا بیت، یەکێکیان توونێلە بەستەزمانەکەی حەمرین بوو کە هێندەی «چاهی وەیل»ی ناو ئەسکەندەرنامە خەیاڵ ورووژێن بوو، ئەوی دیکەیان لێک کردنەوە و تێکبەستنی ئەو واغۆنانە بوو کە هەندێکیان دەچوون بۆ خانەقین و زۆربەشیان بۆ بەغدا. شوێنی ئەو کارە گرنگە، کە ئەوسا بە هێزی شان دەکرا (لە دنیای پێشکەوتوودا هەمووی ئۆتۆماتیک بوو، ئێمە لێی بێخەبەر بووین)، ئێستگەی قەرەغان بوو. دوو شەمەندەفەری خوێڕی دەگەیشتن بە یەک، هێندێک لە واغونەکانی بۆ خەتێکی دووەم دادەبڕان، کارەساتێک

بوو سەعات و نیوێکی دەویست کە دەبوو لە پێنج دەقیقەدا بکرێ. ڕاستییەکەی ئەمن لە تانووت و هاندانی خەڵقەوە تاوم بۆ ئەو دیمەنە ساکارانە دەگرت، هیچیش بە دڵمدا نەدەهات کە هەر دەبێ لە کانتینەکەی قەرەغان چایە و ماستاو بخۆمەوە. ئەو شەوەیان شتێکی دیکەش سەرنجی لە کانتین و واغۆن گۆڕی بۆ خۆی دەدزیەوە. لە کەرکووک کە سوار بووین وەها ڕێکەوت ئەو واغۆنەی دەرەجە سێی ئێمەی چووینێ ئافرەتێکی پەنجا ساڵی مووسڵی و کچە عازەبە جوانکیلەکەی جێگەیان کەوتە ڕیزی ئەو بەری ڕیزی ئێمەوە. بە جووتە دایک و کچ لەسەر کورسییەکی دوو نەفەری دانیشتن و یەکسەر ڕوویان لەو دەرگەیە بوو کە خەڵق پێیدا دێنە ژوورەوەی واغۆن و لێی دەردەچن. کیژەکە عەبای بە سەرەوە بوو، هەتا بشڵێی بە ئەدەب و ئاگا لە خۆ بوو. دوای چەند ئێستگەیەک دایکەکە گوتی، ئەو کیژەم خوشکتانە، کیژتانە بە هەمووتانی دەسپێرم و لێی نوست. دەمدیت گەلێک لە دانیشتووانی واغۆنەکە لە هەموو ئێستگەیەک بەو دەرگەیەدا دەچنە خوارەوە و لێی سەردەکەونەوە کە کورسی ئەو دایک و کیژەی بە تەنیشتەوە بوو. لە هاتنەوە ژووریان بە چاوی گورگانە سەیری ئەو کیژەیان دەکرد و نیگایان دەبڕیە کەلێنی دوو لای عەباکەیەوە بەڵکوو هەر نەبێ بۆ ترووکەیەکی چاو بە دیتنی بەر ئەژنۆی بحەسێنەوە.

من بەو جۆرە ڕەفتارە ناڕاحەت دەبم. بێشەرمی و کۆمە لە خەڵق نەکردن جودایە لە دامرکاندنی بە دزیەوە ئارەزۆی زایەندی. زۆر جاران لە دەمی هاتنەوە ژوورەوەیان بە بەهانەیەک خۆم دەکردە لەمپەڕ لە نێوان ئەو کیژە و دەرگاکە. بەستەزمانە هەستی بەو نییازەیان کردبوو، ئیتر هەر خەریک بوو عەباکەی وەها لە خۆی وەرپێچێ، کەلێن نەدا، بەڵام سەفەری دوازدە سەعاتی ناو ئەو شەمەندەفەرە ئەسەرییە تاقەتی لێ دەبڕی و ناوناوە خەو بە لایدا دەبرد و دەستی لە عەباکەی شل دەبوو. موبارەزەی نێوان شەرمی ئەو کیژە و چاوبرسییەتیی خەڵقەکە لە ئێستگەی قەرغان بۆ ماوەیەک هودنەی تێکەوت. دایکەکە خەبەری بۆوە و ئاگای لە هیچ نەبوو، کیژەکەش هیچی بۆ نەدرکاند. مامم ڕایسپارد ساردەمەنی و چایەیان لە کانتینەوە بۆ هات. پاش قەرەغانیش موبارەزە دەستی پێ کردەوە هەتا ئێستگەی «باب المعظم» لە بەغدا. کە لێک دابڕاین کیژەکە زۆر بە نهێنی نیگایەکی سپاسی بۆم بەرێ کرد و قەڵەباڵغی و تێک هاویشتنی حەماڵ و عەرەبانەچییان و خاوەن

شرۆشیتاڵ و ماڵ و کوتاڵ تەقەڵەکانی پێوەندیی ئەو شەوەی لەبەر یەک هەڵوەشاندن و هەریەکەی بەرەو ئامانجێکەوە ڕاپێچەک دا. لە یەک دەقیقەدا پەردەی ئەزەل و ئەبەد لە نێواندا دادرایەوە.

ئەو بەیانییە کە دنیا ڕووناک بوو هەتا ڕۆژهەڵات من خەریکی سەرنج ڕاگرتنێک بووم کەسی دیکەی خەریک نەکردبوو، بەپێی ئەوەی کە لە کەرکووکەوە بەرەو باشوور سەرەوژێر دەبێتەوە دەبێ ڕۆژ لە دەستە چەپمانەوە هەڵبێ. چاووم بڕیە ئاسۆی چەپمەوە بە دیار خۆرهەڵاتەوە، کەچی هەڵنەهات و هەڵنەهات، هەتا کاتێک دیتم تیشکەکەی لە پەنجەرەی دەستە ڕاستمانەوە، واغۆنەکەی سمی. کەس سەیری لەوە نەهاتەوە، کەس نەیپرسی بۆچی ڕۆژ جێگۆڕکێی کرد. ڕاستییەکەی من شەرم دای گرتم ئەو پرسە بکەم لە بارەی شتێکەوە کە بەزاهیر لای خەڵقەکە جێی لێپرسینەوە نییە. بەهەمەحاڵ من ڕۆژاوام لێ بووە ڕۆژهەڵات و کوردستانم لێ کەوتە لای بەسرە. دنیا لەبەر زەینم تەقڵەی لێ دا یاخود وەکوو وڵاغ گەوزی و تەنیشتی گوڕی. بە درێژایی مانەوەم لە بەغدا سەرەوبنبوونی دنیا بەردەوام بوو، تەنانەت کە گەڕاینەوە بۆ کەرکووک دەتگوت لە هەولێرەوە بۆی لێژ دەبینەوە. تێگەیشتنی هۆی ئەم تەقڵە لێدانە نەختێکی خایاند، بەڵام پرسم بە کەس نەکرد و خۆم گرێکەم کردەوە. شەمەندەفەری کەرکووک لە سەرەتای بەغداوە ناوەستێ، بەرەوژێر دەروا تا بە دەورە بۆ «باب الشیخ» دەگەڕێتەوە، لەوێوە ڕووەو کەرکووک دەبێتەوە هەتا لە ئێستگەی «باب المعظم» دەوەستێ. ئنجا لە دەمی بەرەوژوور بوونەوەی بۆ «باب المعظم» ئەو سبەینەیە ڕۆژەکەمان لێ هەڵات. دیارە لەو بارەدا کە شەمەندەفەر ڕووی لە کوردستانە، دەبێ ڕۆژ لەلای ڕاستیەوە هەڵبێت. لە ئۆتۆمۆبیلدا بادانەوە و سوڕانەوە هەستی پێ دەکرێت وەک کە خۆت بادەیتەوە و بسووڕێیتەوە بەڵام لە شەمەندەفەردا هەست بەو ڕووگۆڕییە ناکرێ، بۆ بیتاڵعی، منیش تاکە کەس بووم حیسابی ورد و قووڵم لەگەڵ ڕۆژ و ئاسۆدا دەکرد، خەڵقەکەی دیکە لە هەر کوێیەکەوە ڕۆژ هەڵاتبایە گوێیان پێ نەدەبزووت. ئەم سەر سووڕکێیەی من هەر خۆمی تێدا سەغڵەت بووم. کەسم لێ خەبەردار نەکردەوە.

بە عەرەبانەوە گەیشتینە ئۆتێلی «وجنة الشارع» لە گەڕەکی مەیدان و نزیکی حەیدەرخانە. لەبەر چاوی چ نەدیتکەی ئەوسامدا بەغدا نموونەی شاری ئەفسووناوی بوو. قەڵەباڵغی و تێک هاویشتنی ئەو خەڵقە لەحەدبەدەر بوو. ڕاستە

دەگوترێ شوێن نەبوو پێی لێ دانێیت. هەرچەند ژمارەی دانیشتوانی ئەوسای 350 هەزار کەسێک بوو، ژمارەی ئۆتۆمبیلی خسوسیشی لە چوار هەزار تێنەدەپەڕاند بەڵام چونکە «شارع الرشید» تاکە شەقامی بوو، ئەوەندەی خەڵق پێدا دەهات و دەچوو هەمووی دەتگوت «سوق الهرج»ـە. ئەوساش گەلێک جاران هەتا دەمانتوانی لە شەقام بپەڕینەوە بەینێک ڕادەوەستاین تا ئۆتۆمۆبیلەکان کەلێنیان دەدا. عەسران کە فێنک دادەهات لەو مەیدانەوە هەتا «باب الشرقي» و حەدیقەی ئەمیر غازی ڕێ بەر ڕێدار نەدەکەوت. سینەماکانی هەمیشە قەڵەباڵغ بوون. شەوێکیان بە فێڵێک خۆمان لە مامم دزیەوە چووینە تیاترۆیەک سەلیمە پاشا لێی دەخوێند. وەزعی تیاترۆ نەکەوتە بەر دڵم هەتا دواییش هەرگیز حەزم لێ نەکرد.

سەفەرەکەی بەغدامان زۆر زۆر خۆش بوو. وەکوو ماچی حەجەرولئەسوەد چووینە زیارەتی عەبدولقادری گەیلانی و کازمییە. لە گەڕانەوەدا سواری گارییە بووین دیتمان مەلا ناسیحی باشمەلای ئەوسای کەرکووکیش دانیشتوە. من پێشتر بە خزمەتی نەگەیشتبووم بەڵام لەگەڵ مامم شناساییان هەبوو، بە گەرموگوڕی لە یەکدییان پرسی... مەلا ناسیح دیار بوو ناڕاحەت بوو بە سواری گارییە چونکە مەلایەکی سەلەفی بوو حەزی بە لە کارهێنانی دروستکراوی تازەبابەت نەدەکرد. لە دابەزیندا دوعاخوازی لێ کردین ئیتر نەماندیتەوە.

ڕۆژێکی، وابزانم جومعە بوو چووینە خزمەت شێخ مەحموودی حەفید. حکوومەت لە سلێمانیی دوور خستبۆوە، خانوویەکی لە ئەعزەمییە بۆ خستبوو، قەڵەباڵغی بە دەورەوە بوو. لەبەر گەرمای هاوین و نەبوونی ئامێری سارد کردن کەوا و سەڵتەی لەبەر نەکردبوو. کە مامی ناسی خێرا عەبایەکی هاوینەی بە خۆیدا دا و چەندی بڵێی تەوازوعی نواند و بە دڵ لە باوکمی پرسی.

ڕاستە دەڵێن جەوهەری مرۆ لە دەمی سەغڵەتیدا دەردەکەوێت. شێخ مەحموود لەو بارە نالەبار و کزەدا یەک کێوی وەقار و قورسی و بەخۆنازی و مێواننەوازی بوو. تەواوێک لە خزمەتی دانیشتین کە هەڵستاین تا دەرەوە مامی بەڕێ کرد و سەرلەنوێ سڵاو و حورمەتی خۆی ڕاسپارد بۆ باوکم. ڕاستییەکەی ئەوەی ڕایسپارد لە سڵاو پتر بوو بەڵام ئەدەب دەکەم بیڵێم. لێرەدا پێش دەستی دەکەم و دەڵێم بە خزمەتی شێخ نەگەیشتمەوە هەتا ئەو شەوەی کە لە خەستەخانەیەکی بەغدادا

وەفاتی کرد. بیست و یەک ساڵ و دووسێ مانگێک کەوتە نێوان یەکەم جار و دوایین جاری بەهرەمەندبوونم بە دیتنی ئەم مرۆیە مێژووییە.

چووینە لای مەجید یەعقووبی هەم لەبەر دۆستایەتیی کۆن لەگەڵ باوکم و مامم‌دا هەیبوو هەم لەبەر ئەو یارمەتییەی کە کاک مەجیدی ئامۆزامی پێ بووە موعەلیم، بە کوردی لەگەڵماندا دوا، هەندێکیشی لەو شیعرانەی باوکم خوێندەوە کە قسەی نەستەقی ئەوتۆیان تێدا بوو خۆی حەزی لێ دەکرد. بەڕێکەوت، لە دەمی چوونە لای مەجید بەگ پیاوێکی عەرەبی زێدە بە شەوکەت و هەیبەت لە ژوورەکەی هاتە دەرێ، کەڵەگەتێکی بە لای کەمەوە دوو مەتری بەدەن ڕێک و موو ڕەش و گەنم ڕەنگ، جلکێکی عەرەبیی بە نرخی لە بەردا. لەبەر عەمامەی مامم سەلامێکی لە ئێمە کرد و بە جەماعەتێکەوە تێپەڕی. خەڵقەکەی لەو کۆریدۆرە بوون بۆی ڕاوەستان. بە پرسین زانیمان «عجیل الیاور»ی سەرۆک ئێلی «شەممەر»ی لای مووسڵە. لە ئینگلیزەکان لەقەبی Sir ی پێ درابوو. لە ئاهەنگی تاج نانە سەری مەلیکی بەریتانیا عجیل الیاور یەکێک بوو لەو پیاوە نارەسمیانەی بانگهێشتن کرابوون. لە نارێکیی ناوەکیی خزمایەتییان کوژرا. لە 1953 کە بووم بە نائیب کوڕی ئەو «احمد عجیل الیاور» یش نائیب بوو، چەندی باوکی بە لەش زل بوو ئەمیان بە لای بچووکیدا بوو بەڵام قسەزان و هۆشیار و خاوەن سەقافەتێکی ئەورووپایی بوو.

لە کۆییان کە ماڵیان کەوتبووە بەغدا حەمەد تەیباغای حاجی تاهیراغای حەوێزی و حەمەد مستەفاغای برای لەوانە بوون ئەغڵەب ڕۆژ سەردانمان دەکردن. ڕەشیدی عارف سەقا کە موهەندیس بوو، فەتحوڵای مەلا ئەسعەدیش کە نازانم خەریکی چی بوو بە زۆری لەگەڵ مامم وەفای قوتابییەتییان دەنواند. ڕەشید دەیگوت: «خاڵە شێخ بۆ هەموو ئەمرێکت حازرم نوێژ نەبێ. بۆ هەموو جێگەیەک لە خزمەتتدام مزگەوت نەبێ».

لە نزیک ئۆتێلەکەمان بە لای مەیدانەوە، «مطعم العاصمة» هەبوو، ناوی دەرکردبوو بە خۆراکی پوختە و خزمەتی بێقسوور، یان دەچووین لەوێ نیوەڕۆژمان دەکرد یان دەماننارد لەوێوە خواردنمان بۆ دەهات. «دجاج علی تمن» و «قوزي علی تمن»ی ئەو چێشتخانەیە بەو کەرەستەیەی ئەوسای بازاڕی دەوڵەمەندی بەغداوە ئەوەبوو کە دەڵێن دەستی خۆتت پێوە دەخوارد. نیوەڕۆژێکی کە بە دەعوەت یان بەڕێکەوت

لە شوێنێکی دیکە نانمان خواردبایە بە خەسارەتم دەزانی. نرخیان 24، 25 فلس بوو کە ئەو دەمە لە نرخی خواردنی چێشتخانەی دیکە پتر بوو.

زۆر ئێواران لە چایەخانەی هاوینەی ساڵحیە یان لە باب ئەلشەرقی بەسەر دیجلەوە کۆمەڵ دەبووین. بەرماڵێکی هاکەزایی پەیدا دەبوو بۆ مامم نوێژی لەسەر بکات. ئەوسا چایخانەکان نوێژکەریان لێ پەیدا دەبوو، خاوەنەکانیشیان بە زۆری نوێژکەر بوو. تاکسی کەم بوو، عارەبانە بە سەدان لە جادە و کووچە و دەربوونەی بەغدا دەگەڕان، پاسی ئەهلیش لە شارع ئەلرەشید و لە نێوان بەغدا و ئەعزەمییە ئیشی دەکرد. پردەکانی ئەوە بوون بەسەر دوببەوە سەراوبوون و بە نۆرە ئۆتۆمۆبیلی ئەم سەر و ئەو سەر پێیدا دەپەڕینەوە. کە کەشتی بچووکیش دەیەویست تێپەڕێ، پردەکە لە ناوەڕاستەوە کەرت دەکرا خەڵقیش بە دیارەوە دەبوونە تەماشاچی.

وابزانم دەوری حەفتەیەک ماینەوە. کە جەماعەتی مامۆستاکان چوونە دەورە، من لە خزمەت مامما بۆ کەرکووک گەڕاینەوە. ئەو شوێنانەی جادەی کەرکووک کە دەمناسینەوە هەموویان لە پێش چاوم پەڕیبوونەوە بۆ ئەوبەری جادە تومەز سەرسووڕکێی سبەینەی گەیشتنم بە بەغدا جارێ لە کاردا بوو. مامم خەیاڵێکی پیرۆزی بە دڵدا هات کە سەرێکی سلێمانی بدەین. لە خوام دەویست هەلی وەهام بۆ هەڵکەوێ. گەراج نزیک بوو، سەیارەش دەتگوت چاوەنۆڕی ئێمەی دەکرد. ئەفەندییەک پێشەوەی سەیارەکەی گرتبوو، مامم و منیش لە پشتەوە، بە سێیان کەوتینە ڕێ. زوو بە زوو یەکترمان ناسی. تومەز هاوڕێمان تۆفیق قەزاز بوو. لە ڕێگا خۆشمان ڕابوارد و نەیهێشت دەست بۆ باخەڵ ببەین. ئەوسا بە ئیسراحەتی ڕێگەوە سەفەری کەرکووک و سلێمانی سێ سەعاتێکی دەخایاند دیمەنی شاخی پیرەمەگدروون کە دوور بە دووری لە وڵاتی کۆیەوەم دەدیت و زۆری تێوە ڕادەمام. ئا ئەو دیمەنە لە نزیکیی بیست کیلۆمەترێکەوە گەیشتن بوو بە ئاواتێکی بچووکم، بەڵام دەبێ بڵێم پیرەمەگدروون لە ڕووکاری بەرەو دووکان و کۆسرەت و وڵاتی کۆیەی دڵگیرترن و جوانترین چیهرەی خۆی نیشان دەدا.

لە کتێبەکەی ئەدەمۆندز وێنەیەکی ئاسمانی «لە فڕۆکەوە» هی پیرەمەگدروون و شاخەکانی پشتی سوورداش و شەدەڵە لەو ڕووکارەوە گیراوە مرۆ شەیدای خۆی دەکات. ئەوەی دەیەوێ قسەکەم بە تاقی بکاتەوە با سەرنج ڕاگرێ، لە دووکانەوە کە بەرەو تاسلووجە دەڕوات و ناوناوە بەژن و باڵای پیرەمەگدروونی لێ دەردەکەوێ

بزانێ چ شیرین وێنەیەکی دێتە بەرچاو کە هیچ خزمایەتیی نییە لەگەڵ ئەو دیمەنەی دواتر لەلای «چەرمەگا» و دیوی سلێمانییەوە بە پیرەمەگدروونییەوە دەبینێت. لە سلێمانی مێوانی سەید نووری نەقیب بووین. خزمانی نزیک دەوریان لێ داین، بەر لە هەمووان شێخ حەمە غەریب هاتە لامان زۆری نەبرد شاکیر فەتاح هات، ئیتر تەنیشت و ڕۆخی بەرنەداین. سبەینە لە خزمەت مامەدا مامۆستا شاکیر فەتاح و من چووینە سەردانی ساڵح زەکی بەگی ساحێبقڕان کە موتەسەڕیفی سلێمانی بوو. لەو ساڵەی دوای نەقڵبوونی لە کۆیێ هەڵکشابوو بۆ موتەسەڕیفایەتی. چەندێکی خەیاڵ بکەیت بەخێری هێناین. بۆ قاوەڵتی سبەی نیوەڕۆ دەعوەتی کردین، مامیشمی کردە وەکیل لە زاری ئەوەوە بە سەید نووری و شێخ محەمەد غەریبیش ڕابگەیەنێ. مامۆستا شاکیر دەیەویست سبەی نۆرەی ئەو بێ بەڵام زەکی بەگ نەیسەلماند. باقیی نووری بەگ-یش کە زانی ئێمە لە سلێمانین ئەغلەب لەگەڵماندا بوو ئەو نیوەڕۆیە لە ماڵی خانەخوێمان نانمان خوارد. خێزانی سەید نووری زەوەخان، لە سەیدەکانی «کانی لەلە» و خزمێکی نزیکی دایکم بوو، کابانپوخت و لێزان و شۆڕەژن بوو. ڕەنگە کەم کەسم دیتبێ وەک ئەو قبووڵی سلێمانیی پوختە کردبێ. ئێوارە من لەگەڵ مامۆستا شاکیر و باقی بەگ نەختێک بە ناو شاردا گەڕاین و ئیستیراحەتێکمان، لە قاوەخانەیەکی ئەوسای سلێمانی کە لە ڕۆخی شار بوو، کرد، ناوی ئەو شوێنە وابزانم تەکیە بوو. سەرچنارمان دیت، ڕۆژی دیکە نیوەڕۆژەمان لای زەکی بەگ کرد. مامۆستا شاکیر و دەعوەتکراوەکانی دیکەش ئامادە بوون، نانێکی بەتام و قسەی خۆش و مەجلیسی گەرموگوڕمان خستە سەر یەک. بەڕاستی ئەو دانیشتنەی دوای خواردنەکەم زۆر بە دڵ بوو.

ئێوارێ لەگەڵ مامم و شاکیر فەتاح و باقیی نووری بەگدا چووینە لای پیرەمێرد. شوێنە مەشوورەکەی کە قەلەندەریی دەروێشمەشرەبێکی پێوە دیار بوو بە ڕوحی ئەو پیرەمێردەوە سەد جاران لە سینەما و گازینۆی ڕازایەوە دڵگوشاتر بوو. هەتا بڵێی بەخێری هێناین و هەموو تەوازوعێکی لەگەڵ مامەدا کرد و زۆر مەمنوونی ئەو سەردانەی بوو. لە ژمارەی سبەینێی ڕۆژنامەکەیدا باسی ئەو سەردانەی نوسیبوو کۆڵێکیش بە خێرهاتنی لە مامم کردبوو. نیوەڕۆژەی ئەو ڕۆژەمان لای شاکیر فەتاح کرد. زەکی بەگ عوزری هێنایەوە بە هۆی مەشغەڵەتی وەزیفەکەی، جەماعەتی دیکە هەمووومان لای مامۆستا شاکیر نانمان خوارد.

با له بیرم نەچێ به خوێنەر بڵێم سەرسووڕکێی بەغدام له سلێمانی چارەسەر کرا، ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای سلێمانی وەکوو هی کۆیێ هەم له شێوەدا و هەم له ئاشکراییدا هاوچوونن. ئاسۆ و ئاسمان کەوتنەوە سەر دۆخی خۆیان و منیش مێشکم حەسایەوە. سێ شەو ماینەوە له سلێمانی. گەڕاینەوە کەرکووک.

لێرەدا شتێک له بارەی هەرزانیی ئەو سەردەمه به خوێنەر دەگەیەنم، ئەو سەفەره بیندرێژەی له هەوەڵەوە هی سێ کەس و دواتر هی دوو کەس، به مەسرەفی ڕێگا و خواردن و نوستنەوە هەتا له سلێمانی گەڕاینەوە کەرکووک کەمتر له ده دیناری تێچوو بوو. له کەرکووکەوە بۆ کۆیێ، گەڕانەوەمان نەختێکی لەبەر بڕا. یەک چواریەکە دینارمان له میرزای حاجی کەریم قەرز کرد دواتر بۆم ناردەوە.
کەرکووک دوای سەفەری سلێمانی چووبۆوە باری ئاسایی خۆی، دووکان و ئوتێل و قەڵا و باکوور و باشوور جێیان گۆڕیبۆوە و دامەزرابوونەوە. که له بەغداوە هاتین وەهام دەزانی بەرەو بەسرە دەڕۆین بەڵام بەرەو کۆیێ بووینەوە بێ تەقلە و بێ هەڵە. چی له هاوین مابوو به عادەتی هەموو ساڵێک له چنارۆکمان ڕابوارد.

پاش ئەوەی لەگەڵ عیززەددیندا دۆستایەتیمان زۆر به تین بوو به درێژایی پشووی هاوینه هەفتەی کاغەزێک لەوەوە بۆ من و یەکێکیش له منەوە بۆ ئەو دەنووسرا. به کوردی و به عەرەبی و به تێکەڵیمان دەنووسین و له قسەی خۆش و نوکته دەگەڕاین بۆ یەکدی بنووسین. شتێکی نهێنی بەینی خۆمان بایه به هێما دەماندرکاند نەکا کاغەزەکانمان بکرێنەوە یاخود دواتر بکەونه بەر چاوی خەڵق. دواتر زانیم زوربەی کاغەزی ئەو بۆ من دەکرانەوە لەلایەن ئەوانەی مەراقیان بوو بزانن له نێوان کوڕی مەلا ئەفەندی و کوڕی مەلای کۆیێ چ ڕازونیازێک هەیە. که له چنارۆک دەبووم هەر کاغەزێکی بۆم هاتبایه به ناچاری دەبوو دەستا و دەست بکات ئنجا بگاته لای من.

به چاکی ناتوانم دەست نیشانی ساڵەکە بکەم ئایا هاوینی 1935 بوو یاخود هی 1936 که ناکۆکیی نێوان سواراغای سەرۆکی بڵباس و بنەماڵی کانیمارانییان کێشایەوە سەر هێندی که مەلا ئەسعەدی کانیمارانی به ئیزنی باوکم له کانیمارانەوە ڕاگوێزی بۆ «کانیکەند» که ئاواییەکی سەربه چنارۆکە و مڵکی باوکم بوو.
سەرخمەی سواراغا جیرانی دێی کانیمارانه و دەشێ له ناکۆکیدا هەموو ڕۆژێک قەپوقڕ لەسەر نێوان بەزاندن و مەڕ له شینایی کردن و گامێش بەردانه کەرخ و

پاراو و گیسک لە یەکدی دزین و ئەو جۆرە کارە خویڕیلانە ببنە بەهانەی هەرای گەورەتر، مەلا عەلی براگەورەی مەلا ئەسعەدیش ماڵی لەو ناوە نەمابوو، وا بزانم نیشیمەنێکی لە دەوروبەری حاجی ئۆمەران پەیدا کردبوو، ئیتر بە ناچاری بۆ دەفعی بەڵا مەلا ئەسعەد هاتە جیرانەتی ئێمە.

لەگەڵ کانیمارانییان هەتا هەبووبین دۆست بووین ئیتر سەیر لەوەدا نییە هاوینێکی ئەوتۆیی یەکێکی وەکوو مەلا ئەسعەد چنارۆک و کانیکەند هەڵبژێرێ. کانیکەندیش سێ چوار ماڵی بڵباسی لێ بوون کە پێوەندیی چووکەییان بە بڵباسەوە نەمابوو، کوردی دەڵێ، کاسبی ماڵی خۆیان بوون. وەها ڕێککەوت لە خزمەت ماممدا سەفەرێکی بیتوێن و لە بیتوێنیشەوە بە ڕەفاقەتی سواراغا و دەستوپاوەندەکانی شەوێک چووینە «سێنان»ی سەیدان لە محاڵی سماقووڵی کە دەکەوێتە ڕۆژاوای شاخی ئاوەگرد و دەوری 2,5 سەعات بە سواری لە چنارۆکەوە دوورە. ئەوەندە دەزانم سبەینە زۆر زوو بەڕێ کەوتین و لەگەڵ سواراغادا بەرچاییمان هێنایە لای باوکم لە چنارۆک. چێشتەنگاو گەرم بوو بەکۆمەڵ لە خزمەت باوکمدا ئەو خەڵقە تێکڕا چووینە سەردانی مەلا ئەسعەد. تومەز بێ ئەوەی من بزانم باوکم ماممی ڕاسپاردبوو لە سواراغا کە دەبێ بێتە سەردانی مەلا ئەسعەد و دڵی ڕاگرێت.

بەو سەردانەی سواراغا لە مەلا ئەسعەد و نانێکی نیوەڕۆی کە لە ماڵی ئەوی خوارد هەرچی ناکۆکیی ئەو دەمە و مانیعی چوونەوەی مەلا ئەسعەد بۆ کانیماران هەبوو هەڵستا. ئەو ڕۆژە بە خۆشی و بە نانی تێر و چەور و بەتامی کانیمارانییان و مێوەی نایابی چنارۆک چووە سەر تا دەوری عەسر، ئیتر سواراغا و جەماعەتی بەرەژێر دوعا خوازییان کرد بۆ دیوی بیتوێن ئێمەش بەرەژوور ماڵاواییمان کرد بۆ چنارۆک کە دەوری دوو کیلۆمەتر لە کانیکەند دوورە و بەسەر یەکەوەن. یەک دوو ڕۆژی نەبرد مەلا ئەسعەد باری کرد بۆ دێی خۆی، کانیماران. ساردایی نێوان سەرخمە و کانیماران هەر ما بەڵام جارێکی دیکە ڕووی نەدا کەس نشیمەنی خۆی جێ بهێڵێ.

ئەو سەفەرەی بیتوێنمان بۆ سەر داوەتی ژنبەژنەی نێوان خزمەکانی ئێمەی شێواشان و سەیدەکانی سێنان بوو. کە بووکەکان لە نیوەی ڕێی نێوان هەردوو ئاواییدا بەیەکدی گۆڕدرانەوە ئێمە چووینە شێواشان و دوو شەوان ماینەوە. لەوێوە شەوی سێیەم لە خزمەت مامدا هاتینە لای سواراغا، لە هەورای هاوینەی سەرخمە بە سەر ڕووباری باسەڵمەوە کەپر و ساباتی کردبوو. دیارە بۆ ئەو

تەکلیفەی کە باوکم مامی ڕاسپاربوو هاتینە سەرخمە. شەو خەبەریان هێنا کە لە تەقەی بووک گواستنەوە یەکێکی سێنانی کوژراوە و مەفرەزە لە کۆیە هاتووە ئیتر لە مانگەشەودا بە قەڵەباڵغیەوە، پەنجا سوارێک دەبووین چووینە سێنان. ئیشەکە چارەسەر کرا و کەسی تێدا بەرپرس نەبوو. ئەو معاون شورتەیەی تۆژینەوەی لەو ئیشەدا کرد هەولێری بوو، ئیستا ماڵی لە بەغدایە، ناوناوە هەواڵ پرسیم دەکات. ئەو جارە ئارەزۆی کردبایە هەگبەی خۆی پڕ دەکرد بەڵام مەردانە جووڵایەوە و لە بەربەست کردنی مەسەلەکەش هەموو لایەک ڕازی بوون، خاوەن کوژراویشی لەگەڵدا بێ.

ساڵی دوەمی خوێندم درێژەکێشانی ساڵی یەکەم بوو بەڵام لەم ساڵەیاندا کارگەرێکی نوێ تێکەڵ بە بنەماکانی سەقافیم بوو. دەمدیت عیززەددین بە قووڵی خەریک دەبێ لە خوێندنەوەی کتێبە چیرۆکەکانی کە بە ئینگلیزی دەدوێن هەرچەند بەشی زۆریشیان لە فرەنسییەوە وەرگێڕدرابوون. کتێبەکان چاپی بە نرخ بوون نەک هەرزان، بەرگی ڕازایەوە و چەندین تابلۆی قەشەنگ لە ناوەڕۆکدا هاندەرێکی گەورە بوون بۆم. ڕاستییەکەی بە دڵیش دەمەویست لەو مەیدانەدا وەکوو مەیدانەکانی دیکەی وتوویژمان هەنگاو لەگەڵ هەنگاوی جووت بڕوات.

یەکەم جار دەستم دایە بەرگی یەکەمی زنجیرەی ئەو چیرۆکە مێژووییەی ئەسکەندەر دوماس-ی گەورە کە بە عەرەبی لەژێر سەرناوی «*الفرسان الثلاثة*» دا بڵاوکرایەوە:

- بەرگی یەکەم *Three Mosqueteers*
- دوەم *After Twenty Years*
- هی سێیەم «*لویز دۆ لاڤالیر*»
- چوارەم «*ڤیکۆنت دۆ براجیلۆن*»
- پێنجەم *The Man in the Iron Mask* «*ذو القناع الحديدي*»
- شەشەم *Son Of Parthos*

بە هەموویان دەوری 4500 لاپەڕە دەبوون. براینە کەوتمە دەریای بێبنێ چیرۆکی بلیمەت و زمانی پێشکەوتوو. لە سەرەتاوە ویستم فەرهەنگ بەکاربهێنم. دەرکەوت تا لاپەڕەیەک دەخوێنمەوە دوو شەوی دەوێ چونکە وەها دەبوو پتر لە دووسەد

وشەی لاپەڕەیەکم لێ پەنام بوو. تومەز ئێمە لە قوتابخانە شتێک فێرنابین لە ئینگیزی بایی فلسێک بێت. بە ئامۆژگاریی عیززەددین ملم نایە خوێندنەوەی بێئەنجام. دوو سەد لاپەڕەم پتر خوێندەوە ئنجا بەحاڵ هێندێ تروسکەی کز لە ناوتوێژی دێڕەکاندا بڵاچەیەکی وەکوو هەوری درۆزنی دەدا.

ئەو خوێندنەوەیەم وەهای بۆ خۆی دزیمەوە کەمتر دەرفەتم دەبوو سەربە کتێبەکانم داگرم بەڵام ئاسۆیەکی تازەی بەرفرەوانی تەسەور و ئەدەب و مێژووی بە بەرنیگامدا تێدەپەڕاند، خۆ کە لە خوێندنەوەی هەموو بەرگەکان بوومەوە، هەموویشی بە کارەساتی دڵتەزێن کۆتاییان دێت، بەینێک دەروونم لە قەبەڵ جیهانی ئەفسووناویی پاڵەوانەکانی دۆماس کرد. ئەمما دەبێ بزانین ئەو پاڵەوانە هەڵبەستراوانە ڕاستگۆترن لە مێژووی ڕەسمیی مەکتەبان بۆ ڕەنگرێژ کردنی واقیعێکی خزم بێ لەگەڵ ڕاستی و دروستی.

من مێژووی فرەنسە و ئەورووپام لەو چیرۆکە هەڵبەستراوانەوە بۆ ڕوون بۆوە. ڕۆژ بە ڕۆژ ڕووداو هەناسە هەڵدێنێ و تەختەی کۆمەڵایەتی پڕ دەکەنەوە بە جۆرێک لەو جۆرانەی کە ڕووداوی سەردەمی خۆم دنیا دەتەنێتەوە نەک بەو جۆرە نامەفهوومەی کە مێژوونووس ژمارەی یەک و پێنج و پازدە دادەنێ بۆ هۆ و ئەنجام. شت کە ڕوو دەدات ژمارەی پێوە نییە، ڕووداوەکانیش وەها قەتار نابن وەک مێژوونووس بە قەڕاسی تەعلیلاتی خۆی قەتاریان دەکات، ژیان و مێژووش هەر بریتی نین لە پلانی سیاسی و ڕاوە بەرژەوەند.

ئەو پیاوە تەئریخیانەی ناویان لە کتێباندا دێت وەیا ئوترووحەیان لەسەر دادەنرێت هەر بایی ئەوەی کە کۆتەڵ (ڕۆبۆت) کۆک کرابێ بۆ گەڕانێکی قەرارداده کە ساوای پێ ژیر بێتەوە ئەوانیش کۆک کراون بۆ ئەنجام دانی ئەو سیاسەتەی بەندە بە ئابوورییەوە. نە پێدەکەنن، نە زوێر دەبن نە تاوڵە و دۆمینە و کەوشەک دەکەن، نە چاوبڕکێ لەگەڵ کیژ و لووسکە دەکەن، نە برادەری کەسن، نە گیپە دەخۆن، نە قڕقێنەیان دێتەوە، نە زاربێگەنن وەکوو عەبدولمەلیک (یان سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک)ی ئومەوی نە چەڵمنن وەکوو وەلید، نە نینۆکی خۆیان دەخۆن وەکوو ناپۆلیۆن، نە خەریکی «Incest– زنا بالمحارم» ن وەکوو تالیران، نە شێتن وەکوو نیرۆن، نە فرشتەن وەکوو عومەری عەبدولعەزیز. هیچ ئەو مرۆیە نین کە خۆمان خۆمان دەناسین. دەسا من نەمزانیوە مرۆی ئەورووپای بەر لە 400–500 ساڵ چەند

قینی لە ئیسلام بووە تا قسەی وتوویژی عادەتی ناو ئەو چیرۆکە هەڵبەستراوانەم خوێندۆتەوە.

بە کورتی ئەو ڕیزە لە چیرۆکەکانی دوماس و بە دوا ئەودا هی تریش بە تەواوی خستمیە بارێکەوە دەتگوت بە دەورمەوە دیوارێکی شەفافی جوداکەرەوە لە تەسەوراتی تازە دام دەبڕێ لە واقیعێک کە ئەگەر وەکوو من ئەفسوونی ئەو نووسینانەی خوێندبایە گەلێک باری نالەبار و بێنرخ و بایەخی خۆی واز لێ دەهێنا و ئەرک و خەرجییەکەی بۆ شتی سوودبەخشتر لە کار دەهێنا. بە نموونە دەڵێم لەو ساڵەدا مامۆستای ڕیازەی بەدەنیمان تازە دەرچوویەکی هەولێر بوو، بە شتێک کە لێی نەدەوەشایەوە درایە مەحکەمە. لە کەرکووکەوە حاکمە زلەکان هاتن، سەرۆکیان، مەلا سددیق ئەفەندی نازەنینی (کۆیی بوو) کە زۆر دۆستی مەلا ئەفەندی و تەڵەبەی باوکم و موجازی ئەو بوو. لەگەڵ مندا وەکوو مامم بوو. بەعادەتی خۆی لە مەلا ئەفەندی مێوان بوو. ئەو مامۆستایەم بە پاڕانەوە لێم پاڕایەوە تکای بۆ بکەم لای سەرۆکی مەحکەمە (مەلا سددیق ئەفەندی). لە خوولیای ئەو چیرۆکانەدا بووم کە مامۆستاکەم لێم پاڕایەوە. نازانم ئەگەر چیرۆکەکانم نە خوێندبایەوە چۆن دەبووم بەڵام گومان لەوەدا نییە بایی فلسێکی قەڵب هەستی بە خۆ نازینم نەکرد. دەتگوت گیانی «دارتنیان» یاخود «ئاثۆس»ی برادەری لە مندا بە هانای ئەو مامۆستایەم دێت. بێ ئەوەی من هیچی لێ چاوەنۆڕی بکەم لە خۆوە مامۆستاکەم کە دەیزانی لەگەڵ ڕیازەدا دۆست نیم چاوی لێ دەپۆشیم و پەنای دەدام.

لەو ساڵەی 1936 مامۆستایەکی نوێی دەرسی عەرەبیمان بۆ هات ناوی یەعقووب حەنا عیسکۆ بوو، مرۆیەکی هێمن و خۆش تەبیات بوو. ڕای لێم بوو، بەڵام لە ڕێکەوتدا دەرکەوت کە موجامەلەکەی لەگەڵمدا هەنگاوی پێ خوار ناکاتەوە. لە ئیمتیحانێکی مانگانە لێ داواکردین ئینشایەک بنووسین بە ناوی «الشق الباكي» منیش خوا بۆی هێنام شتێکی باشم نووسی. ئەوەندەی لێ ڕازی بوو بەسەر هەموو پۆلەکانیدا خوێندەوە و بردییە لای مامۆستاکان و تا گەیاندییە مدیریش.

دوای ئەم ڕەزامەندییە بە چەند ڕۆژێک موتەسەڕیفی نوێ «ئەحمەد تۆفیق بەگی تابووراغاسی» کە لە بنەماڵەکانی سلێمانی و خوارزای پژدەریەکان بوو سەردانی قوتابخانەکەی ئێمەی کرد. هاتە پۆلی ئێمە خەریکی واتا و ئیعرابی سەرەتای «موشح»ی «جادک الغیث اذا العیش همی» بووین. گوێی لێمان گرت پرسیاری

کرد بۆچی کە دەڵێ «یا زمان الوصل بالأندلس» ئەو وشەی «زمان» فەتحەی بە سەرەوەیە. ئومێد لە من دەکرا بزانم، من گوتم مونادای مەقسوودە یاخود غەیر مەقسوودەیە، قسەیێک بوو لە ناچاری هاتە سەر زارم. ئەحمەد بەگ لە مامۆستا یەعقووبی پرسی، ئەم وەڵامە ڕاستە؟ گوتی نەخێر ڕاست نییە، وشەکە لەبەر «اضافە» منصوبە. مامۆستا یەعقووبم پتر کەوتە بەردڵ بەڵام زۆری نەبرد خۆی لەگەڵمدا کەوتە تاقی کردنەوەوە. غەزەلێکی، وەها بزانم، هی ئیسماعیل سەبری پاشا بە سەر ناوی «لواء الحسن» هەیە یەک لە بەیتەکانی دەڵێ: «سأعفي امال انضاء الهوى بقبول من سجاياک رخاء» مامۆستا یەعقووب خوێندییەوە: «سأعفی» (بە کوردی دەنووسرێ: سەئوعەففی). منیش بەدەنگ هاتم گوتم بەم جۆرە نە کێش نە واتا لە بەیتەکەدا نامێنێ، ڕاستییەکەی «ساعفی- ساعیفی» یە. بە چاکیم لە بیر نەماوە چۆناوچۆنی وەڵامی دامەوە بەڵام دەزانم منجەمنجی لەگەڵدا بوو.

لە زستانی ئەو ساڵەدا خەبەر هات لە کۆیەوە، حاجی کاکەمینی مام خدر، باشتوجاری کۆیێ لەسەر قەپوقیرێکی بێبایەخ بە دەستی عەدەی دورسن کوژرا. ئەم عەدەیە لە کۆنەوە بە پیاوێکی نەسەلمێنی قبووڵ نەکەری لە خۆڕازی مەیلەو سەربە فیتنە بووە. وەک دەگێڕنەوە کەسانی دیکەشی لە دەس کوژراون. ئەو ساڵ حەماڵی دایەرەی گومرگ بوو، حاجی کاکەمینیش خاوەن بەرژەوەندی تووتن بوو. لە ئیشەکەی عەدە ڕازی نابێ و پرکێشی لێدانی دەکات، بە خەنجەر حاجی کاکەمینی کوشت. هاتن بە دوا دکتۆردا، سەبری قەببانی چوو بۆ تەداوی، بەفر لە گۆڕێ بوو، بە زەحمەت گەیشتە کۆیێ بەڵام بێسوود بوو، مەرگ نەگەڕایەوە. عەبدولمەجیدی حاجی کاکەمین دوای بەسەرچوونی حوکمی عەدە ساڵەها لێی تاسپ بوو تاکوو لە جادەی ڕەشیدی بەغدا نزیکی شەقامی موتەنەبی دایە بەر دەمانچە. چەند گوللەیەکی بەرکەوت بەڵام نەمرد و زووش چاک بۆوە. بە هەوڵی کاکە زیاد وەها کرا دەعوایەکە بدرێتە مەحکەمەی عەشایر، عەدەش ڕازی بوو. عەبدولمەجید بە زوویی لە حەپسخانە دەرچوو. عەدەش و عەبدولمەجیدیش بە مردنی تەبیعی مردن.

من ساڵەها دوای ئەم ڕووداوە «عەدە»م دیت بە چاوی مامەڵەت سەیرم کرد. کەسێکی پێشتر باسی سەرگوشتەی نەبیستبایە خەیاڵی پیاوکوژی لێ نەدەکرد بەڵام بە لێ وردبوونەوە عەزمێکی بەهێزی تێدا ڕەچاو دەکرا. دەموچاوی لە هی ئەو مومەسیلانەی دەکرد دەوری ڕێگر یا مرۆی کاری نهێنی و پەنامەکی دەبینن.

ڕاستییەکەی عەدە نموونەیەک بوو لەوانەی دیراسەیەکی باش هەڵدەگرن. مامم بۆی گێڕامەوە گوتی لە سواراغا مێوان بووم «عەدەی دورسن»یش لە دیوەخانەکەی سواراغا بوو. نزیکی نانی نیوەڕۆ بوو وەها ڕێککەوت باسی مەلا حەویزاغا کرا، سواراغا لە کولانەی ناحەزییەوە باسی کرد. عەدە لە شوێنی خۆی کەوتە سەر چۆک و تفەنگەکەی خستە سەر ڕانەکانی و ڕووی لە سواراغا کرد گوتی: ئاغا زۆر حەیفە لە بۆ پیاوان لە دیوەخانەی بە پاشەملە باسی پیاوی گەورە بکات. ئەمەی گوت و هەڵستا، چەندێکی ویستییان بۆ قاوەڵتی بمێنێتەوە گوێی نەدانێ و بەرەو ڕانیە ڕۆیی. عەدە نیسبەتێکی گەورەیی و چووکەیی لەگەڵ مەلا حەویزاغادا هەبوو، نەیتوانی ئەو نیسبەتە پشتگوێ بخات.

پێویستە بڵێم کوردەواری لە خەم پاراستنی ناوی ئەو کەسانەوە نەبووە کە هەڵدەگرن بپارێزرێن. یەکێکی وەکوو قاڵەی گچکەڵ هەڵی دەگرت بیرەوەریەکانی تۆمار بکرێن. عەرەب لە کۆندا چ دەماودەم بێت و چ بە نووسین بێت شوێنەواری گەلێک لە ناودارەکانی پاراستووە تا ئەوەی «صعالیک» کە ناوی خۆیان بە خۆیانەوە بە قەدەر «إمرؤ القیس» حیکایەتیان لێ بە جێ ماوە بگرە لەویش پتر. ئێمە بە پێچەوانەوە، وەتەنگ دێین لە ناوهێنانی ئەو کەسانەی کە بەر حیسابی خزم خزمێنەمان دەکەون یاخود پاڵپشتێکی فۆلکۆری وەکوو گۆرانیبێژی وەیا زۆڕنائەنگێوی شیرینیان ناکات.

بچمەوە بۆ باسی گەشتی خۆم، هاوینان لە چنارۆک چەند موستەعیدێک لای باوکم دەرسیان دەخوێند، فەقێش لای ئەو موستەعیدانە دەرسەکانی بەرەژێرتریان دەخوێند. ژمارەیان بەپێی ساڵ هەوراز و نشێوی دەکرد. ساڵێکیان بە مەلا و فەقێوە 23 کەس بوون. زۆر لەو مەلایانە بە دەم دەرسی مەلایەتییەوە خەریکی کتێبەکانی پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی دەبوون و من بە دەرس پێم دەگوتنەوە. لەوانە یەکێکیان، مەلا عەولای بنگردی، بە دڵ خەریک بوون تا ئەوەی توانی لە ئیمتیحانی بەکالۆریای سەرەتایی دەرچێت. لە فکردا تووشی گومان بووبوو. زۆریش بە دەست گومانەکەوە ناڕاحەت بوو بەڵام وەها زۆری لێ کرد کە خۆ نەگریت و لەگەڵ مەلا هاوڕێکانی بکەوێتە دەمەتەقە. پاش دەرچوونی لە ئیمتیحان، وازی لە مزگەوت هێنا، ئەو کتێبانەی هەیبوون لای ئێمە بەجێ هێشت و خۆی ڕۆیی بۆ بەرەژێر. وەختێک بوو بە ئیمام تابوور، لەو ساڵانەدا خەبەری مەرگیم بیست.

گەلێک لەو مەلایانەی خوێندنی چنارۆک، بوون بە خاوەن ڕێوجێ. یەکێکیان مەلا عومەری ئاکرەیی حاڵوباری لەوانی دیکە تێرتر بوو. دەنگی زۆر خۆش بوو لەگەڵ مەلا فەتاحی مەلا عیززەتی ئامۆزای باوکم، بە جووتە گۆرانیی کوردی و ناوناوە فارسییان دەگوت. لە گوتنە هەرە خۆشەکانیان کە بەیەکەوە تێی دەئاڵان ئەم گۆرانییە فارسییە بوو کە سەرەتاکەی وەها دەست پێ دەکات:

چندان که گفتم غم به طبیبان
درمان نکردند مسکین غریبان

بیا بیا ای نگارم حال ندارم بیقرارم
ای یوسف ثانی ای ماه تابانی... هتد

مەلا عومەر ئیجازەیەکی بە سەروسەودای وەرگرت و گەڕاوە سەر جێوڕێی حازر بە دەست بەڵام داخم ناچێ لە تافی گەنجایەتیدا جوانەمەرگ بوو. مەلا ئەبوبەکری یاهوو لە زۆر دێی دەزییان و لای شێخەکانی هەڵەجە و ئاخۆڕە مەلای مودەڕیس بوو، فەقێی زۆر بوون لەم دواییدا بوون بە مەلای ڕەسمی لە مزگەوتی حاجی مەحموود عەللاف لە هەولێر. هەشت نۆ ساڵێک دەبێ وەفاتی کردووە. مەلا سەید عەوڵا (یان خاڵ یان مامی مامۆستا حوسێن ڕەشوانی) لەو مەلایانەی چنارۆک بوو بەڵام نازانم پاشان سەرەنجامی بە چی گەیشت. مەلا محەمەد ئەمین سندۆڵانی دڵپاکێکی وەها بوو ئەگەر عیلمەکەی بە قەدر دڵپاکییەکەی بایە دەبوو بە موجتەهید. زۆر بە جحێڵی کۆچی دوایی کرد.

مەلا قادری کانی دەربەندی وەکوو «بقیة السلف» بەرحەیاتە، لە کۆیێ خانەنیشینە بەڵام مەلایەتییەکی پوختەی هەیە، هەتا بشڵێی لە ئاکار و ڕەفتار و گوفتاری باوکم بەخەبەرە. مەلا ساڵحی ڕەواندزی، مەلا خالیدی بەری بادینان و گەلێکی دیکەش کە ڕۆژگاری خۆشم لەگەڵدا ڕابواردوون لێیان بێخەبەرم. مەلا شێخ عەزیزی کوڕی کاکی هیران کە هاتە لای باوکم بۆ خوێندن، هەتا ئیجازەی وەرگرت مایەوە، هەموو هاوینەکانیشی لە چنارۆک بە خوێندن ڕادەبوارد. زۆر بەداخەوە لە سەرەتاکانی ئەم ساڵەی 1986 کۆچی دوایی کرد...

لە ناو فەقێکاندا دەنگخۆش پەیدا دەبوون. لە جەماعەتی شێخەکانی «سەلان»18 یەکیان دەنگخۆش بوو. براگەورەیان مەلا شێخ محەمەدی کوڕی شێخی سەڵان مرۆیەک بوو دەتگوت فریشتەیە. گەنجی هێندە ئەرباب و شیرنئاکار هەر نابێتەوە. ئەویش زۆر بە گەنجی ڕۆیی. وای کە لە چنارۆکەوە بەرەو شاخەکانی کوێستانان ڕادەماین و مەلا شێخ محەمەد یەک یەک ناویان و هەوارەکانیان و لووتکەکانیان و گوندی دەوروبەریانی باس دەکرد. لەوم بیست لووتکەی «ئاراسن» نزیکی دێی سەڵانی ئەوانە. چەندی حەز دەکرد و حەزم دەکرد هاوینێکیان بچمە لایان و لەو شاخانە گەشت و گەڕان بکەین.

بەر لە خۆی ئامۆزایەکی، مەلا شێخ محەمەد، چەند ساڵان لای باوکمی خوێند و هاوینان دەهاتە چنارۆک بەڵام تەبیاتی جودا بوو لە مەلا شێخ مەحەمەد، هەمیشە کنارەگیر بوو لە تەمەنیشدا ڕەنگە بە دە ساڵ پتر لەو گەورەتر بوو ناشزانم چی بەسەر هاتووە...

فەقێ جەلالێک بەینێک لامان بوو بەڕاستی دەنگخۆش بوو بەڵام لەوەتەی گوێم لە دەنگی فەقێی کورد بووە، کەسم نەبیست هێندەی فەقێ ئەحمەدی ئالانی دەنگخۆش بێ. کە دەیگوت:

دڵ بۆتە بۆتە بۆتە پڕ نار و بڕ حەرارەت
فەوتاوە دڵ ئەوێستا خەریکی حفظی جانم

ئاگری لە گوێگر بەر دەدا، زەمزەمە و چەهچەهەیەکی کوردانە نەک فارسانە لە دەنگیدا هەبوو جودا بوو لە هەموو دەنگێک. نازانم ئەویش چی بەسەر هات.

---

18- نازانم ڕاستینەی ناوی ئەو گوندە «سەران»ـە یاخود «سەڵان - سەلان» ـە خەڵقەکەی ئەو ناوە دەڵێن «سەران» چونکە ئەگەر سەڵان - یش بێت هەر دەڵێن سەران وەک کە بە شەقڵاوە دەڵێن شەقراوە. ڕێی تێدەچێ سەران بێت لەبەر بەرزایی جێگەکەی.

لێرەدا شتێک لە مامۆستا ڕەشوانی ئاشکرا دەکەم. لەگەڵ مەلا سەید عەولا-دا لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدی نزیک ماڵی خۆمان دەیخوێند، پاش عەسرێکیان بە عادەتی فەقێیان نۆرەی «راتبە» وەرگرتن لە ماڵان هی ئەو بوو. هاتە بەردەرگەی ناوەندی نێوان دیوەخانە و لای حەرەمی ماڵی ئێمە و دەنگی هەڵبڕی، لە جییاتی ئەوەی بڵێی «ڕاتبەی فەقێیان بچنە بەهەشتێ» گوتی «بچنە مزگەوتێ»... دەیزانی باوکم گوێی لێیەتی یەکسەر بە خێرایی بەرەو مزگەوت ڕۆیشتەوە. بە خودا مامۆستا ئەو هەڵەیەی بەر لە چل ساڵێک گەلێک بە تامتر بوو لە زۆر ڕاستییەکانی ڕۆژگاری بۆمبای ئەتۆم.

نوکتەیەکی دیکەی فەقێیانە لێرەدا جێی دەبێتەوە، ئەو ساڵەی مەلا ئەسعەدی کانیمارانی ماڵی هاتبووە کانیکەند فەقێیەکمان لە فەقێکانی سوختە ناوی فەقێ باوەدین بوو (دواتر بووە مەلایەکی لێهاتوو)، لە بانگدان دەنگی تابڵێی ناخۆش بوو. نیوەڕۆیەکیان باوکم و هەموو مەلا و فەقێکان لای مەلا ئەسعەد بانگ هێشتن کرابوون. لە بن کەپرێک دانیشتبووین، چیغ بە لای هەتاوەوە گێڕدرابوو. لەو دیو چیغەکەوە پاڵا گامێشێک، کە لێمانەوە دیار نەبوو، قۆڕاندی ئەمما چلۆن قۆڕاندنێک. هەندێک ڕاپەڕین بۆ ئەوەی پاڵاخەکە دەرکەن چونکە بەرێکەوت زۆر لە جێی باوکمەوە نزیک بوو. باوکم گوتی لێی گەڕێن هەر نەبێ لە بانگەکانی فەقێ باوەدین ئەهوەنترە.

فەقێ مستەفایەکی یەک چاوەی خڕوێلکاوی هەبوو بە قەدەر سوعاد حوسنی لە ڕێک خستنی جلوبەرگ و سمێڵ و برۆکانی خەریک دەبوو (بەداخەوە سوعاد سمێڵی نییە). بە مووکێش مووی زیادی هەڵدەکێشان، کشتەکی دەکرد، ڕیشوەی مێزەر و جەمەدانەی بەر دەدانەوە، خۆی بە یووسفی زەمانە حیساب دەکرد. هێندە قسە چەور و لووس بوو خەڵقی لە خشتە دەبرد. نازانم سەرەنجامی بە چی گەیشت ئەمما لەگەڵ هەموو ئۆیینبازییەکی کە پێیەوە دیار بوو مەجلیسی خۆش دەکرد و لە خزمەت وەڕەز نەدەبوو. بێگومان لە کەسبی خۆ شیرن کردن لای ئافرەتیش چەشەخۆر بووبوو دەنا ئەو زەحمەتییە بەردەوامەی خۆ تاسولووس دانی نەدەکێشا.

فەقێکان لە بن شاخی سوولی پاشا و لە قەد گردی نێوان ئەو سوولە و کانی خاتوون ساباتیان ساز دەدا، ئەوی تەنبەڵیش نەبایە بۆ نوستنی شەو کەپرێکی یەک نەفەری قوت دەکردەوە هەر نەبێ لە زیندەوەری شەوگەڕیدە ترسشکێنی دەکرد. ئەو

ڕۆژانەی میوانمان دەبوون بە مەلا و فەقێکانەوە قەڵەباڵغیەکی مزری پەیدا دەکرد. ساڵێ لە کۆییان تاق و جووت بە میوانێ دەهاتن بەڵام هەموو هاوینێک، هەتا باوکم مابوو ئاغاکانی غەفووری لە پێشیانەوە مەلا حەوێزاغا و کاکە زیاد، سەردانی بابمیان دەکرد و دوو ڕۆژ و شەوێک دەمانەوە. جەمیلاغای حەوێزی، قایمقامیش بوو، هاوینێکیان بە هەموو مەئموورە زلەکان و گەلێک لە دۆست و ناسیاوی دیکەوە ڕۆژێکی لەبیرنەکراوی لای باوکم ڕابوارد، مامە حاجی عەبد جاسم ئەوسا لە تافی جوانیدا بوو، قسەخۆش و «مقلد» و زمانزان و شارەزاییێکی وەهای کورد و تورک و عەرەب بوو (بە هەموو لەهجەی زمانەکانەوە) تاکی نەبوو. ئەو ڕۆژە بێموبالەغە کارێکی وەهای کرد نە بە شارلی نە بە عادل ئیمام نە بە هیچ کەس دەکرێ. خۆی پۆلیس بوو بەڵام پایەی لای هەموو گەورەپیاوانی کوردەواریی ئەو ناوچانەی کۆیە و ڕانیە و پژدەر و خۆشناوەتی و نازانم کۆی گەلێک بەولای ئەو حیسابانەوە بوو. لە تەقلیدی معاونی شورتەی خۆی، بە تەمسیلەوە ئەو ڕووبەڕووبوونەی دەگێڕایەوە کە لە نێوان مەفرەزەی شورتە، بە سەرۆکایەتیی معاون شورتە «قادر ئەفەندی» و دەستەی چەتە مەشوورەکەی ئەوسای کوێخا مەجید ڕووی دابوو. لە گەرمەی تەقەدا (هەموو هەر خۆی عەبد جاسم بەرپای دەکرد) کە قادر ئەفەندی تینی بۆ دێت چۆن ڕای کرد و دەشی گوت «جەسوورم جەسوورم» و خۆی کوتایە بن کورتانێکی کەر. عەبد لە بن کورتانەوە دەستی هەڵدەتەکاند و ئەو حەلەق بەلەقانەی دەردەپەڕاند کە قادر ئەفەندی لە دەمی تەسادومەکە بزرکاندبوونی. قادر ئەفەندیش وەکوو ئەو خەڵقە لەسەر پشت کەوتبوو. ئەوەی عەبد دەیکرد و دەیگوت بە هیچ کەسێک ناگێڕدرێتەوە.

ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی چنارۆکمان دەمی چێشتەنگاو، بێ ئاگا، دەوری پەنجا سوارێکی پژدەری بە پێشەوای مەحموداغای حاجی ڕەسووڵاغا کە بەرەو ڕانییە لە ڕێدا بوون، لایان دایە لای باوکم. لە سەردانی موتەسەڕیفی هەولێر دەگەڕانەوە کە بۆ کارێکی نێوان پژدەر و حکوومەتدا بۆی چووبوون، باوکم مەحموداغای خۆشدەویست، ڕاستییەکەی، مرۆیەکی لێهاتوو و لایق بە براگەورەیی بوو، تەنانەت پیرۆتاغای براگەورەی خێزانی حاجی ڕەسووڵاغا هەموو کاروبارێکی سەربە عەشایەر و حکوومەتی بەو سپاردبوو. لە سەردانی ڕەزاشاشدا، کە وەفدێکی پژدەری بۆ تەبریک و بۆ وتووێژی بەرژەوەندئامێز چووبووە تاران، مەحموداغا نوێنەری تایەفەی

مەحمووداغا و قسەکەری وەفدەکە بووبوو. بۆمی دەگێڕایەوە کە چەند ئەسپێکی زێدە ڕەسەنیان بە دیاری پێ بووە و ڕەزاشا لە ئەحواڵی بابەکر و عەباس- ی پرسیبوو، مەبەستی بابەکری سەلیماغا و عەباسی مەحمووداغایە. ئەو ڕۆژە دەوری کەمتر لە سەعاتێک مانەوە، دوای چایە و مێوە دۆعاخوازییان کرد.

لە دەورانێکی زووتردا، کە جارێ من نەهاتبوومە دنیا، بابەکری سەلیماغاش جارێکیان لای دابووە چنارۆک، نیوەڕۆژەی لەگەڵ باوکمدا خوارد بوو. ئەوسا ئەحمەد تەوفیق بەگی تابوورئاغاسی، کە لە تەشکیلاتی حکوومەتی عیراق بوو بە موتەسەڕیف و خوارزای پژدەریان بوو، ئەویش لەگەڵ بابەکراغادا بوو، تەمەنی گەنج و شکڵی بەگزادانە و مەند و مەستوور بوو... بەپێی گێڕانەوەی باوکم هەست بەوە دەکرا کە ئەحمەد بەگ پەروەردەی شارە نەک عەشایەر، تا ئەوەی باوکم ماممی تێگەیاندبوو کە هەمیشە ئاگاداری دڵڕاگرتنی بکات و پلەی حورمەتی لە جیرانەتی حورمەتی بابەکراغادا بێت.

هاوینێک لەو هاوینانەی خوێندنی ناوەندیم کارەساتێک لە ڕانیە ڕووی دا بۆ ئێمە لە زۆر سەرەوە دڵتەزێن بوو. جەلال سائیب قایمقامی ڕانیە بوو. کوڕەکانی لە پشووی هاوینە سەردانی دەکەن. خەڵق هەموو لە سەربانان دەنوون، تاوانبارێکی بێویژدان بە نیازی کوشتنی جەلال بەگ لە تاریکیی شەودا پارێز دەبا بۆ ئەو بانەی خێزان لێی نوستن. وەک دەگێڕنەوە کەمال ئەو شەوە لە نوێنی باوکیدا دەنوێت. لە دەسرێژدا کەمال بەرکەوت و کوژرا. خەبەرەکە و گەنجایەتی و بێتاوانیی ئەو ناکامە کاری لە دڵی خەڵق کرد. جەلال بەگ ناسیاوی باوکم بوو، ساڵی پێشتر سەردانێکی لێ کرد لە چنارۆک تەنانەت چەند جلدێکی کتێبی «صبح الأعشی» ی
«قەلقەشەندی»ـشی لە باوکم خواستبۆوە دواتر کە بۆی ناردەوە وردە پەراوێزی لە هێندێ شوێنی کتێبەکە نووسیبوو بە خەتێکی وردی خۆش. جا ئەگەر ئێمە پتر لە کۆیێ دیکە بۆ مەرگی کوڕەکەی خەفەت بخوێن سەیر نییە.

کارەساتەکە بووە هۆی یەکتر تاوانبار کردن لەلایەن دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی ڕانیە، هەر یەکەیان دەیویست گومان لە خۆی دوور بخاتەوە بەهۆی گومان بردنە سەر خەڵق. لە ئاکامدا سواراغای تێدا موتەهەم بوو هەرچەند کەموزۆر دەخلی بەسەر کارەکەوە نەبوو. جەلال سائیب داوا لە سواراغا دەکات کە سوێندی بۆ بخوات نە خۆی نە کەس لە جەماعەتی ئەو ئاگای لەو کارە نییە. سواراغا لە سوێند دەترسا.

گوتبووی لە جیاتی کەس سوێند ناخۆم بەڵام هەر چۆنێکی دەڵێی سوێند دەخۆم لەسەر هێندێ کە خۆم لە هیچ ڕوویەکەوە ئاگاداری ئەو کارە نیم. سواراغا درایە مەحکەمەی کوبرا لە کەرکووک. ئەحمەد حامید سەراف بۆی گێڕامەوە گوتی «من مدعی عموومی بووم لە کەرکووک. لام ئاشکرا بوو کە سواراغا بێسووچە و بۆی هەڵبەستراوە. بە پێچەوانەی فەرمانی وەزیفەم زۆرم یاریدە دا تا ڕزگاری بوو».

چی دەگوترێ با بگوترێ لە بارەی تەماعکویری و دین و بە قوربانی دنیا کردن، ئەمما گومان لەوەدا نییە کە سواراغا هەموو شتێکی خۆی بە گیانیەوە خستە مەترسی تێچوون لە ئاست حورمەتی ئەو قورئانەی کە بە لایەوە کەلامی خوا بوو. ڕەنگ بوو سوێند بخوا چونکە بەڕاستی بێتاوان بوو بەڵام زێدە تەقییەتی لە قورئان هەبوو نەیهێشت بە پشتگەرمیی بێتاوانی خۆی بۆ غەیری خۆی ڕەپەی لێ بێنێ... مەسەلەکە پاش چەندێک زانرا لە کوێوە و چۆن کراوە. کە فەوزی سائیب لە 1952، 1953 بوو بە قایمقامی ڕانیە ئەوانەی بەو ئیشەوە ناویان دەرچوو ترسیان هەبوو فەوزی تۆڵەیان لێ بستێنێتەوە بەڵام کاکە فەوزی وەکوو مرۆیەکی ڕۆشنبیر و شیرپاک عاتیفەی تێکەڵ بە وەزیفە نەکرد و تێی گەیاندن کە ئەو نەهاتوە بۆ تۆڵەستاندنەوە و ترسیان نەبێ.

لەو پلەیەی خوێندنی ناوەندیمدا ئینقلابی بەکر سدقی و کوژرانی دواتری ڕوویدا. لە بیرمە ڕۆژنامەی عەبدولغەفوور ئەلبەدری چەند گوتارێکی زێدە وێراوی دژی ئەو ئینقیلابە نووسی. کە لە مەکتەب دەگەڕامەوە بۆ مزگەوتی قەڵات جەریدەکەیمان دەخوێندەوە و تێکڕا ئافەرینیمان لەو نەترساوییە و مەنتیقە بەهێزەی دەکرد کە گوتارەکانی تێیانرا دیار بوو. هەر لە بیرمە لە ئاست بەیانێکی «جەعفەر چەلەبی ئەبوو تممەن» دا کە بووبوو بە وەزیری دارایی و گوتبووی خەزێنەی دەوڵەت بەتاڵە عەبدولغەفوور ڕەخنەی گەورەی لێ گرتبوو بەوەدا کە دوژمنایەتیی شەخسی وەها لە وەزیرێک بکات ئیفلاسی دەوڵەتەکەی بە هەموو جیهان ڕابگەیەنێ.

هەرچییەکی بە دوا کاتەوە لە بارەی هەڵوەستی کورد بەرانبەر بزووتنەوەی بەکر سدقی بگوترێ هەڵکەوتی ئەو دەمە یاخود هەڵوەستی ئەو دەمە ناگۆڕێ. کوردەواری جگە لە تیرێژێکی ڕۆشنبیرەکان و سیاسییەکانی بەو لاوە لەو بارەدا نەبوو خێرا بە خێرا هەستی خۆی لە ئاست ڕووداوی ڕەسمی و حکوومەتی و ئاڵوگۆڕی وەزارەت دەرببڕیت. خەڵق هیچ ئاگای لە بنج و بناوانی ڕووداوێک نەبێ (ئێستاش تێی

نەگەیشتوە) چۆناوچۆنی بۆی دەکەوێتە جرتوجۆیان؟ بە ئومێدی چی؟ لە کوێوە بزانێ کامیان لەوەی ڕۆیشت و لەوەی هات بۆ ئەو چاکترە؟ چەند کەس لە هەموو کوردستان جەریدەی دەخوێندەوە؟ چەندی تێی دەگەیشت؟ کێ گوێی لە دەنگی ڕاگرتبوو؟ خۆی چ دەنگێکی هەبوو یاخود پەیدای کردبوو تا دەریببڕێ؟ لەو سەردەمەدا کە پەنجا ساڵ پێش ئەمڕۆکە بوو، سیاسەت گەپی نێوان تیرێژی سیاسیەکانی سەرەوە و بەشێکی ئەفەندییەکانی شارستان بوو کە بە لێڵی و لە شێوەی هەڵپە و پەلەدا هەڵوێستی خۆی ڕادەنواند.

لەو دەمانەدا جارێ تاکە حیزبێک پەیدا نەبووبوو ڕەگی لە نێو گەلدا داکوتابێ. بە موناسەبە دەڵیم لەو سالانەدا حیزبی «الاخاء الوطني» لکێکی لە هەولێر کردبۆوە. بەرەی مەلا ئەفەندی حەزی لێ نەدەکرد، خەڵقی شاریش سەیریان پێی دەهات، دەستەیەکیش هەر گوێی پێی نەدەبزووت. زۆری نەبرد لە خۆوە هەڵوەشایەوە. «ڕەفعەت ئەفەندی» لە دۆستانی مەلا ئەفەندی هەڵبەستێکی عەرەبی هۆنیبۆوە سەرەتاکەی وەها دەست پێ دەکا:

فاه ثم اه ثم اه
علی حزب الاخاء وما جناه

کۆتاییەکەشی بەم بەیتە دێت کە بە حیسابی «جمل» مێژووی هەڵوەشانەوەی حیزبەکە پێک دێنێت:

فحطم قامه الأعدا وأرخ
تفرق شمل کل من نواه

مەبەس لە شکاندنی باڵای «اعدا» لە ناوبردنی ئەلفەکەیەتی بەوەدا یەک ژمارە دەردەکرێ لەسەر جوملەی نرخی پیتەکان کە دەکاتە 1352- (1932، 1933)، یەکێکی لێ دەرچێت دەمێنێتەوە 1351 (1931-1932).

داماو - سەید حوسێن حوزنی موکریانی - ناوناوە سەردانی مەلا ئەفەندی دەکرد لە مزگەوتەکەی قەڵات. کە باوکم هاتبایە هەولێر و حوزنیش لە هەولێر بایە دەهاتە

لای. وەک کە مامۆستا گیو دەیگێڕێتەوە لە هەندێ نووسینەکانی خۆیدا، سەید حوسێن لە مەسەلەیەکدا سەغڵەت کرا. مەلا ئەفەندی و باوکم پشتگیرییان لێ کرد. من بێ ئەوەی لە نزیکەوە چەندوچۆنی مەسەلەکە بزانم، هەستم دەکرد لە هەندێ لە سەردانەکانیدا، سەید حوسێن بێئارامیی پێوە دیارە. هەتا پتر هۆشم بە دنیا دەشکا پتر خەفەتم بۆ سەید هەڵدەگرت. تۆ وەرە وەکوو کە پشیلە بێچووەکانی بە دەم دەگێڕێ بۆ شوێنی سەلامەت، چاپخانەیەک لە سووریەوە بە شان و مل هەڵگرە بۆ خزمەتی کوردایەتی و چوارگۆشەی وڵاتی پێ بکە، بە ئەرک و مەسرەفی ژیانی کۆلەمەرگی کتێب دانێ لە زیندوو کردنەوەی ناو و مێژووی میللەتەکەت ئنجا لە جیاتی پاداشتی چاکە و مەردایەتی، قەبرت بۆ هەڵکەنن!! پەحا کە ئەم دنیایە ناوناوە خۆی وەها خوێڕوو دەکات کەڵکی پێوە نامێنێ.

لە بیرەوەریی سەید حوسێن دەڵێم یەکێک لە قوتابییە هاوپۆلەکانم بورهانی سلێمان بەگی سلاحشۆڕی ڕەواندزی بوو. سلێمان بەگ لە مەلا ئەفەندی مێوان دەبوو، ئەو پیر و من جحێڵ زۆر شەوان دوای بەسەرچوونی کژی دیوەخانە بەیەکەوە دادەنیشتین و داستانی بیرەوەیەکانی خۆی بۆ دەگێڕامەوە. مێژووی ئەورووپامان دەخوێند لە نووسینی مامۆستا عەلی حەیدەر کە کوڕی سلێمان بەگ بوو.

هەرچەند عەلی حەیدەر لە سیاسەت زۆر پێشکەوت بەڵام بە خۆیشم گوتوە کە سەقافەت خەسارەتێکی گەورەی لێ کەوت بە دوورکەوتنەوەی لە نووسین و دانان. ڕاستییەکەی خۆدزینەوەی عیززەددینی مەلا ئەفەندیش لە نووسین خەسارەی لێ داین. بەڵام پەرۆش هەڵگرتن لەوان دادی کەس نادات. وابزانم لە سەرەتاکانی هاوین بوو، ڕەنگە هی ساڵی 1935، یەکەم جار چووم بۆ شەقڵاوە. ڕۆژێکیان لەگەڵ عیززەددین و قاسم و موحسیناغای سەرۆکی بەلەدیە بە ئۆتۆمۆبیلی مەلا ئەفەندی چووینە لای میرانی قادر بەگ لە شەقڵاوە. لە بن درەختە چنارە زلەکانی دیوان دانیشتین ڕۆژێکی خۆش و تەجرەبەیەکی نوێ بوو بۆ من چونکە پێشتر بەرەو شەقڵاوە لە هەڵەتەکانی خانزاد تێنەپەڕیبووم. پیرمەم ئەوسا یەک چایخانەی ژێر کەپرێکی قەلەندەری لێ بوو ڕێبوارِ هاوینان چایە و ماستاویان لێ دەخواردەوە. بڕوا ناکەم زستانان لە ترسی سەرما کەسی لێ مابێتەوە چ نوا و خانووش دیار نەبوو بۆ زستان دەست بدات، یان هەر نەبێ من وەهام بە بیر ماوە. لەگەڵ ئەمەشدا پیرمەم

خۆی جێگەیەکی دڵگوشاد و دارستان و دوورخوێنەوە بوو، هەر لە چیای مەقلووبی لای مووسڵەوە تا شاخەکانی سنووری ئێران و توورکیای لێوە دیار بوو.

قادر بەگی شەقڵاوە کە بە میرانی قادر بەگ دەناسرا و دەمێک بوو لە هەموو هەڵبژاردنێک بە نائبی هەولێر دەردەچوو، لە کۆنەوە دۆستی مەلا ئەفەندی بوو، ساڵ لە دوای ساڵیش دۆستایەتییان بەهێزتر دەبوو هەتا وەهای لێ هات بوو بە یەکەم دۆستی. لە خوێندنی ناوەندیمدا بووم و تازە لە هەڵبژاردندا قادر بەگ بوو بۆوە بە نوێنەری شەقڵاوە لەنکاو ئەمری خوای کرد.

باوکم لەو دەمەدا مێوانی مەلا ئەفەندی بوو، بەیەکەوە چووینە سەر تازیەکە. گەرما و گەرمی و بێوەخران مەلا ئەفەندی لەگەڵ کاربەدەستانی بەغدادا دوا و یەکسەر سددیق بەگی کوڕە گەورەی قادر بەگ کە جارێ سی ساڵەشی تەواو نەکردبوو لە جێی باوکی کرا بە نوێنەر. جێی خۆیەتی لێرەدا تێوەرخێک لە لاوە بهێنم بۆ ناو قسەکانمەوە. لە یاداشتێکی دەسنووسی «فایق بێکەس»ی نەمر کە کاتی خۆی من لە کۆڕ بووم شێرکۆ بیکەس بۆ هێناین، فایق بێ زمانگرتن باسی ئەو شتانە دەکا کە لە تەجرەبەی خۆی دیتوونی. لە سەردانێکی شەقڵاوەی مێوانی میرەکان دەبێ، زۆر زۆر مەمنوونە لە پیاوەتییان و بە کوردپەروەریان دادەنێت. چ لەوانەوە بێت و چ لە غەیری وانەوە بێت هەر چاکەیەکی دیتبێتی وەیا بە خۆی گەیشتبێت بێ کۆمە کردن دانی پێدا دەهێنێت تا ئەگەر کەسێک نانێکی بۆ کڕیبێ وەیا پارەی ئۆتۆی بۆ دابێت باسی دەکات. لە قسەکانییەوە میرەکان خزمەتیان کردووە.

بەڕاستی مەردایەتی لەوەدایە کە بێکەس کردوەتی. حەیفە ڕاستی پێشێل بکرێت هەروەک حەیفە بە کەیفە مەدحی خەڵق بکرێت بێ ئەوەی پێداویستی مەدح هەبێت. شێرکۆش وەک پیاوی بەخۆ ڕاپەرموو ئەو ڕاز و نیازەی باوکی خستە ڕوو، ماڵی ئاوابێ. خۆزی ئەو یاداشتانە، هەرچەندە کەمیشن، بڵاو کرابانایەوە. لە تەرازووی بەراوورد کردندا بە لای مجێزی منەوە یاداشتەکان لە بەشی زۆری شیعرەکانی بێکەس بایەخدارترن، چونکە هەرچۆنیک بێ شیعر ئارایشی پێوەیە، یاداشتەکانی هێندەی کەسێکی لە حەمامدا تەنها بێ، ڕووتن و هێندەی دیمەنی ڕووتیش ڕاستگۆن.

ئەحمەد تۆفیق بەگ زۆری دەوام نەکرد بە موتەسەڕیفایەتی لە هەولێر، ڕەنگە بە هەمووی ساڵێک نەمایەوە و نەقڵ کرا. وەها بزانم دوای ئەو مستەفا یەعقووبی بوو بە موتەسەڕیف. لەو ماوەیەشدا دوای نەقڵبوونی جەمیلاغای قایمقامی کۆیێ بۆ ڕانیە کەریم بەگی ڕەواندزی بوو بە قایمقام. دوای ئەو ڕامز بەگی یەعقووبی و یەحیا بەگی عەبدوڵا موخلیس بەگ کە ئەویش وەکوو کەریم بەگ سەربە بنەماڵەی پاشا کۆرە-یە. لە دەمی موتەسەڕیفایەتی ئەحمەد بەگدا، لە کۆیێ «ئەحمەد سامی دەبوونی مووسڵی» قایمقام بوو ئیتر کاتەکەی دەکەوێتە نێوان دەمی قایمقام کەریم بەگ و یەحیا بەگ یان ڕامز بەگ. سرەی ئەو قایمقامانە کار ناکاتە سەر گەشتەکەی من، لە دەفتەری حکوومەتیشدا ئەو سرەیە پارێزراوە.

دەبوو پێشتر باسی تێپەڕینێکی ئیسماعیل حەقی شاوەیس بە چنارۆک و بیتوێندا بکەم بۆ هەرێمی پژدەر و سەردەشت. ماڵمان لە چنارۆک بوو دەمەو عەسرێک ئیسماعیل شاوەیس لای دایە چنارۆک. هەر لە بیرمە باوکم لە بن شاخەکەی سوولی پاشادا دانیشتبوو، کە ئیسماعیل بەگ گەیشتە جێ باوکم بەلایەوە چوو، ئەو مرۆیە کە هەتا بڵێی ڕاستگۆ و هەقپەرستێکی بێفێڵ بوو بۆ باوکم هات و گوتی: قوربان (سوێندیشی خوارد) دەستی کەسم ماچ نەکردەوە ئەمما بە فەخرەوە دەستی تۆ ماچ دەکەم. تەنها لەو سەردانەدا حەمەد بەگی قالە چاوشین، کە ناسیاومان بوو، بە سواری لەگەڵیدا بوو. سەمەدی حاجی محەمەدی بەننا-ش (کە مەشوور بوو بە حاجی مەنجەڵ) بە پێیان کەوتبوە ڕێ بەڵام نەهاتە بن سوولی پاشا. لە چوون و هاتنەوەدا ئیسماعیل بەگ لای دایە چنارۆک. لە گەڕانەوەدا بوو لێمی پرسی، چ دەرسێک حەز لێدەکەیت؟ منیش بێگرفت گوتم: عەرەبی! حەزی دەکرد شتێکی دیکە بڵێم. ئێستا و ئەوساش نەمزانی ئەو چوون و هاتنەی بۆ چی بوو.

لەو ساڵانەدا چەندێکی ماڵمان لە کۆیە بایە یان خۆم سەردانی شارم کردبایە ڕابواردنی عادەتیم لە نادییەکەی فەرمانبەران بوو. لە هاویندا بە زۆری کاتی دەوامی ڕەسمی هەر مامۆستاکانی مەکتەب و قوتابییەکانی کە لە جێیان دەیانخوێند و هەندێک لە خەڵقی شارەکە حەز بە ڕابواردنی ئەفەندییانە دەکەن لە نادی کۆ دەبوونەوە.

ئەوسا خەڵقەکە برِبرِ و کەرتکەرت نەبووبوون، جارێ جوداوازیی بیروباوەڕی سیاسی «ئایدیۆلۆجیا» پەیدا نەبووبوو، تەنانەت یەکێکی وەکوو زەنوون ئەیووب بە

مامۆستایی بۆ کۆیێ نەقڵ کرا، بێگومان لە دڵدا بیری سەربە چەپی هەبوو، بەڵام هیچی وەهای نەدرکاند جودا بێ لەوەی بە عمومی ئەو خەڵقە دەیگوت. ئەگەر لە نێوان گرووپەکانی نادیدا جودایی هەبووبێ هی هۆی عادەتی بوو کە لە سەدان ساڵەوە کاری جوداکەرەوەی بەجێ هێناوە. هەر لەبەر نەبوونی جوداوازیی ئایدیۆلۆجیا لە ماوەی چەندین ساڵدا بە دەگمەن نەبێ دەمەقاڵێ و شەڕە چەپەڵۆکێ ڕووی نەدا. ئەوسا گیانێکی کوردایەتیی ساف و بێقۆرت هەبوو، کەس لەسەری بە شەڕ نەدەهات، بەتێکڕاییش ئەفەندییەکان حەزیان دەکرد دەنگ و سەدای «معارضة» لە بەغدا ببیەن.

ئەفەندییایەتی لە نێوان بەشێکی پیاوماقووڵ و بەچکە توجارەکاندا شەرمنانە دەستی پێ کرد و لە چاو شاری دیکە بە دەرنگەکاتیشەوە بوو. بەڵام زۆری بە سەیری ئەندامەتیی نادی بۆ غەیری مەئموووران پتر لە پیاوە ناسراوەکانی دییان و جوولەکەوە سەری هەڵدا، ئەمما هەر بە جلکی کوردی. پیاوماقووڵ و بەچکە توجارەکان، وەک لە بیرمە، پاش جوولەکە و دییانەکە سەردانی نادی و ئەندامەتییان دەست پێ کرد. وا بزانم کۆیێ بەر لە هەموو قەزاکانی لیوای هەولێر نادیی لێ کرایەوە.

ساڵی 1937 لە پۆلی سێیەم و ئەزموونی بەکالۆریا دەرچووم. لە ئینگلیزی حەفتاوپێنجم وەرگرت بەڵام بەپێی ئەوەی لە مەعهەدی بەریتانییەوە کتێبم بە پاداش بۆ هات دیارە لە هەموو قوتابییەکانی بەکالۆریای ناوەندیی چوار لیوای سەرووی عێراق نومرەم پتر بوو لە دەرسی ئینگلیزی. هەر لە بیرمە ناوی کتێبەکە Through Space and Time بوو. باوکم لێی داوا کردم بۆی وەرگێڕمە سەر کوردی یاخود عەرەبی. بەشێکیم خستە سەر عەرەبی بەڵام کتێبەکە گەورە بوو نەمتوانی لە کەمێکی بەولاوە بە ئەستۆوە بگرم، باوکیشم چاوپۆشیی کرد، هەر ئەوەندەی ئامۆژگاری کردم کە ئەگەر زانیارییێکی گرنگم هاتە بەرچاو بە قسە بۆی بڵێمەوە. مەبەستی بوو زانیاری سەربە فەلەک لە کتێبی نوێ وەربگرێ تاکوو لە پێویستدا بۆ تەفسیری هێندێک شوێنی قورئان بەکاری بهێنێ.

هەر لە پۆلی سێی ناوەندی دەرچووم بڕیار درا پۆلی چوارەمی ئەدەبی لە هەولێر بکرێتەوە و مەکتەبەکە بوو بە سانەوی. مامۆستاکانمان زۆر بووبوون، چەند کەسێکی سوورییەیی خوازرابوونەوە بۆ سوودبەخشی مزاش بوون. سەید ئەحمەد مستەفا

عەرەبی و تەئریخی پێ دەگوتین، عەبدولقادر حەیدەر-یش ساڵێک لەو دوو ساڵانەی سانەویمان مامۆستای تەئریخمان بوو. نەجیب لازار ڕیازییاتی دەگوتەوە، بلیمەتێک بوو بە ئاکاری شیرینەوە. باوکی، لازار ئەفەندی، ددانی نەمابوون، بە «محاضرة» فرەنسەیی پێ دەگوتین. نەجیب دوای چەند ساڵێک شێوا و کەوتە شەماعیە بەڵام لەوێشدا زیرەکایەتیی کۆنی پێوە مابوو تا ئەوەی خۆم دیتم ڕۆژنامەیەک، یان گۆڤارێک، ڕێپۆرتاژی لەسەر بڵاو کردەوە.

ئای برای خوێنەر کە مەفتوونی منارەی چۆلی بووم. های لە یەکەم سەردانی هەولێرمەوە کە دیتم لە دوورەوە گەردەنی کێل کردووە خەریکە، لە بەرزایی، شەڕ بە قەڵاتی هەولێر دەفرۆشێ، بووم بە لایەنگیری. بە سەرنج گرتن زانیم کۆشکە بڵندەکانی قەڵات نەختێک لەو تێهەڵکشێوترن و بە سەریدا دەنوارِن بەڵام لەلای خۆمەوە بەوەدا بۆم تێدەهێنایەوە کە ئەگەر جێگاکەی لەو چاڵاییەدا نەبوایە قەڵاتەفەندی نەیدەتوانی ئەو نازوفیزە بکات. لە ساڵی 1930 کە یەکەم جار سەردانی هەولێرم کرد منارەکە مەودایەک لە دەرەوەی شار بوو، هەر بۆیەش پێی دەگوترا منارەی چۆلی، تا ئەو ماوەیەی منیش لە هەولێرم دەخوێند هەر لە چۆلی مایەوە. لەگەڵ وەستا تەها و یەکێکی دیکەش لەوانەی لە خزمەت باوکمدا هاتبوون، وابزانم خدری حەم لاڵ بوو، چووینە دیار منارەکە، دەرگاکانی بێ دەروازە بوون. من لە بن منارەکە مامەوە ئەوان لە ناودا بۆی سەرکەوتن تا لە هەندێ کولانەکانییەوە کە سەریان دەردەهێنا دەتگوت سەری منداڵە لەبەر بەرزایی و دوورییان. کە پاش چەندین ساڵ کتێبەکەی «ڕیچ» م خوێندەوە و زانیم لە کۆندا گەلێک بەرزتر بووە تا ئەوەی ڕیچ دەڵێ شوێنی لێ بانگدانی مابوو، لەو شوێنە بەولاترەوە وێران بووبوو، هەر بە جارێ ڕام شکاند بەسەر قەڵاتی هەولێردا. ڕاستییەکەی بەر لە دیتنی ئەو کتێبەش دەمزانی منارەکە بەرزتر بووە بەڵام چوزانم شوێنی بانگدانی مەلا پتر لە سی مەتر دوورە زەوی دەبێ. ئەو مەلایە ئەگەر پیر بووبێ هەر بەشی بانگدانی یەک حەفتەی کردووە چونکە سەرکەوتنی 35 مەترەی پێچەبەدەورە بەسەر پێپلکەی سوایەوە، چراش بە دەستەوە لە شەوی تاریکدا یان بە خەواڵۆیی بەیانیان، هەر جارە نرخی چەند ڕۆژ عومر لە پیاوی پیر دەستێنێ. ئەدی ناڵێن گۆزە لە ڕێگەی سەراو دەشکێ؟

وابزانم لە پۆلی چوارەم بووم لە بەرەو کۆتایی بەهاردا ئاهەنگێکی کێبەرکێ (مسابقە)ی خیتابە لە قوتابخانەکەمان گێڕدرا. من بە سەرناوی «اهمیة الطیران في العصر الحدیث» شتێکی باشم نووسیبوو. قوتابییەکان هەریەکە بابەتێکی لە کەسێکییەوە بۆ نووسرا بوو، هەرچەند وەهاش ڕانوێندرا کە خۆیان گوتارەکانیان نووسیوە. فەتاحی محەمەد ئەفەندی مفتی (مفتی ئامۆزای مەلا ئەفەندی بوو) هەڵبەستێکی باوکی لە مەدحی مەلیک غازی خوێندەوە بە هونەری تەمسیلەوە وەهام دەزانی یەکەم دەردەچێ. تەنها قافیەی بەیتێکی ئەو هەڵبەستەم لە بیر ماوە «غاز محارب». کە بڕیاری لیژنەی نرخاندن دەرچوو پاداشتی یەکەم بە ئیحسان شێرزاد درا، دووەم هی من بوو. کاک ئیحسان بە پۆل لە دوا منەوە بوو، بەڵام هەرچۆنێک بێ پاداشەکەی وەرگرت لێی پیرۆز بێ. دواتر ڕەفعەت ئەفەندی (ڕەنگە ئەوسا یان ساڵی دواتر بوو بە کارگێڕی قوتابخانە) پێی گوتم - شایەدیش لە بەیندا بوو - کە دەبوو پاداشی یەکەم بە من بدرێ. نەیدرکاند لەبەرچی بڕیار جۆرێکی دیکە بوو.

ئەمە دەڵێم نەک خوانەخواستە لەبەر پەرۆشێک یان خۆ بە مەغدوور زانینێک. ساڵەهای ساڵە دڵم بۆ ئیحسان شێرزاد، وەک بۆ خۆم، کراوەتەوە بە هەموو بەڵگەیەکیش ئیسپاتی کردووە هەموو ڕێزێک و یەکەمینایەتییەکی لێ دەوەشێتەوە. تەنها مەبەستێکم هەبێ دانەوەی واقیع و ڕاستییە لەو بیرەوەرییانەی دێنەوە بەر زەینم.

مەلیک غازی کوژرا، یان خۆی لە دەست خۆی چوو. عێراق شەقژا، خەڵق بۆی هاتنە شین و بابەڕۆ. لە هەولێر نمایشت کرا، چەند قوتابیی فێرگەکەمان لە ڕیزی پێشەوە بە سینگ کوتان و چاوی تەڕەوە دەرۆیشتن. هێندێکیان بۆ خۆدزینەوە لە دەرس دەماری نیشتیمانپەروەریان بزووت، فرمێسکیشیان درۆزن بوو، بێگومان منیش دڵم بۆی دەتووزایەوە بەڵام هەستم نەدەکرد مافی گریان و سینگ کوتان و لە ڕیز ڕۆیشتنی بەسەرمەوە هەبێ. بەرانبەر چی؟ لە عومردا دوو جاران ئەمیر غازیم دیتبوو، جارێکیان کە ئەمیر بوو لەگەڵ باوکی سەردانی هەولێری کرد. جاری دووەم کە بوو بە مەلیک و گەشتی بە وڵاتدا کرد. من لەگەڵ باوکم هاتم بۆ هەولێر. نامەی تایبەتی بۆ مەلا ئەفەندی و باوکم هات (دیارە بۆ مەزنە پیاوەکانی دیکەش چووە) کە جێگەی پێشوازی کردن لە مەلیک دێی «عەرەب کەندی» یە.

مەلا ئەفەندی لە باوکمی پرسی ئایا ڕای لەسەرە بچن بۆ پێشوازی؟ باوکم لە شکڵی نوکتەدا گوتی: نامەکە دەڵێ عەرەب کەندی خۆ ناڵێ کورد کەندی! ئەو نوکتەیە بووە هۆی ئەوەی مەلا ئەفەندی لە جیاتی خۆی عیززەددین بنێرێ. من لەگەڵیدا چووم بەڵام نەک بە وەکالەتی باوکم. کە مەلیک گەیشتە شوێنی دیاریکراو لە ئۆتۆمۆبیل دابەزی، پانتۆڵی کورتی هەتا سەر ئەژنۆی لەبەردا بوو، بە جلکی عەسکەری هاوینانە، موتەسەڕیف خەڵقەکەی پێشکەش کرد عیززەددینی پێش هەموان خست. دواتر خۆم گوێم لێ بوو کە عیززەددین باسی پێشوازیەکەی بۆ باوکی دەگێڕایەوە لێی پرسی کێ بەر لە هەموان تۆقەی لەگەڵدا کرد؟ ئەویش چۆنیەتیەکەی بۆ گێڕایەوە. مەلا ئەفەندی بەوەدا ڕووی کرایەوە. ئەگەر موتەسەڕیف جۆرێکی دیکەی کردبایە دەبوو مەلا ئەفەندیش لەلای خۆیەوە حیسابێکی بە ئەرک و مەشغەڵەت بۆ ئەو ڕەفتارەی موتەسەڕیف بکات.

مەلیک غازی-م لە «عەرەب کەندی» لە نزیکەوە بە تۆقە لەگەڵدا کردن دیت. مرۆیەکی کورتیلەی مووزەردی سوورکاڵ بوو، ئێسکی سووک بوو، تۆقە و زەردەی سەر لێوانی گەرماییان پێوە دیار بوو. لەوانە بوو زوو خۆشت بوویێت، با بڵێم ئەم خەیاڵە بوو لەو دەمەدا بە دڵمدا هات. ڕەنگە لیوا فواد عارف کە هاوپۆلی کولییەی عەسکەریی مەلیک غازی و دواتریش کە بوو بە زاپت، سەرۆکی پاسەوانەکانی کۆشکی «زهور» بوو، لە هەموو کەسێک باشتر مەلیک غازی بناسێ. گەلێک پیاوەتی و وەفاکاریی لێ دەگێڕێتەوە. حەیف تێچوو. لیوا فواد دەڵێ کە خەبەری کوژرانی بەکر سدقی بە مەلیک غازی گەیشت هەموو پەرۆش و سەغڵەتییەکی بۆ جانتایەکی ڕەش بوو کە بەکر سدقی لەگەڵ خۆیدا بردبووی. زۆری پرسی بە تەلەفۆن ئەو جانتایە چی لێ هات؟ کە زانی جانتاکە نەماوە گوتبووی منیش حیسابم تەواوە. ئەمە شایەدیی کاک فوئاد عارفە. سەیری چارەنووسی مەلیکێک بەندە بە جانتایەکی ڕەشەوە.

لە هاوینی 1938 کە ماڵمان لە چنارۆک بوو تاسی زێڕی سەری دایکم دزرا. ڕێ بە خۆم نادەم لە سەری بڕۆم. هەرچۆنێک بووبێ نامەردییەک بوو لەگەڵماندا کرا و سەرپۆشی بەسەردا دەدەمەوە.

ساڵی 1939 لە پۆلی پێنجەمی سانەوی و ساڵی بەکالۆریام بوو. ئەوسا سانەوی پێنج ساڵ بوو. چەندێکی بلێی لە خوێندن تەنبەڵیم کرد. ڕاستییەکەی بە تەمای کەوتن

بووم پتر لە هەموو شتێک. بۆ ئیمتیحان هاتینە کەرکووک، هەموو قوتابییەکان خانوویەکی گەورەمان بۆ گیرابوو، هەریەکە تەدبیری نوێن و خواردنی خۆی دەکرد. من قەریۆڵەی سەفەریم کڕی، هێندێک ڕایەخێکی تری لەسەر زەوی ڕادەیەخست. چەلەبیزادەکان لە ئۆتێلێکی تازە دروستکراوی بەرانبەر خانووکەی ئێمە دابەزین. من و قوتابیی دیکەش هەبووین بتوانین لەو ئوتێلە دابەزین بەڵام خۆهەڵاواردنمان بە جوان نەزانی. بە پێچەوانەی بۆچوونی خۆم لە هەموو ئەو دەرسانەی لێیان دەترسام بە چاکی دەرچووبووم کەچی لە تەئریخ و کیمیا کەوتبووم. لە کیمیا بگەڕێ ڕێی تێدەچێ لە جیاتی پەنجا کابرای موسەلیح چلوپێنج نومرەی دابێتمێ بەڵام تەئریخ مەیدانی قەڵەمڕانیی خۆم بوو، بێگومان یان سەهوو کراوە یان کابرای موسەلیح لە دەمی تەماشا کردنی دەفتەری مندا خۆی ون کردووە.

لە چنارۆک بووم کاک مەجیدی ئامۆزام و میرزای حاجی کەریمی برادەرم بە جووتە گوێیان لە ڕادیۆ بووبوو، ڕۆژانی ئیمتیحانی دەرسەکانی منیان پێکەوە نووسیبۆوە و بۆیان ناردمە چنارۆک. من دوو ڕۆژ پێش یەکەم دەرسیان چوومە کەرکووک، گوتیان ئیمتیحان لە هەولێر دەدرێ. ئێوارە بوو، سەفەرم خستە سبەینێ، سبەینێش بە کاوەخۆ گەیشتمە هەولێر، لە ئوتێلێک دابەزیم. هاوڕێیەکی پۆلی خۆم دیتمی پێی گوتم بۆ ناچیتە ئیمتیحان؟ گوتم سبەی نۆرەی منە. گوتی خێراکە پێڕا بگە. کە چوومە ساڵۆنی ئەزموون نیو سەعات بەسەرچوونە ژوورەوەدا تێپەڕیبوو.

موراقیبەکان دوو کەس بوون یەکیان مامۆستایەکی خۆمان کە لە دەرسی ئەودا هەمیشە یەکەم بووم، ئەوی دیکە مودیری مەکتەبێکی سەرەتایی بوو کە لە گەڵم ناحەز بوو. من هەموو شتێکم بۆیان باس کرد. ناحەزەکەم گوتی با ڕێی پێ بدەین و ئیمتیحانەکەی لە کیس نەچێ. دۆستەکەم گوتی ڕێی پێ بدەم دەستم دەبڕن. ئەو هەڵوەستە ناڕاحەتی کردم و لە ناخی دڵم کاریگەر بوو.

ڕێوڕی گەڕامەوە و یەکسەر بۆ لە بیر کردنی ئەو کۆڵەمستە بە سفتوسۆیەی ڕێکەوت لە دوا ڕێکەوتی نالەبار و کتوکوێر ڕێی بەغدام گرت. شانزە شەوان لە بەغدا مامەوە، پتر لە نیوەی بە ناساغیی تا و لەرز. دوو هاوڕێ و خزم، یەکێیان شێخ فاتیحی خاڵە شێخ سەدر ئەوی دیکە بابە شێخی خاڵە سەید ئەحمەد (خاڵی مامم بوون) لەو سەفەرەدا لەگەڵم بوون و هەمیشە بەیەکەوە بووین، هەرسێکمان لێقەوماو. بابە شێخ سەد ڕەحمەت لە گۆڕی، بە درێژایی ناساغیەکەم خزمەتی کردم و

تەنیشت و ڕۆخمی بەر نەدا. شەوانی وڕێنەم هەتا سبەینە نەدەنوست. کە گەڕامەوە بۆ کۆیێ لە کەرکووک ئۆتۆمۆبیلی حازر نەبوو تا ئێوارە مامەوە. لە بیرمە حەزم چووە دۆڵمە، لە لۆقنتەیەک دۆڵمەم لە پێش داندرا، ئەو پارووی بۆ زارم برد نەمتوانی ئاودیوی بکەم. سایقێکی کۆیی کە لەم یاداشتەدا ناوم هێناوە، عومەری حاجی محەمەد ئەمینی لچۆ هاتە لام و گوتی حازرم بە نیوە کرێ بت بەمەوە، ئەگەر کەسیش پەیدا بوو بۆتی دادەشکێنم. زۆر زۆر مەمنوونی کردم. نیو کرێ بۆ تاکسی خسووسی دەیکرد 750 فلس. لە دەمی سواربوون کە تاریک داهاتبوو کابرایەک پەیدابوو 200 فلسی داو منیش 550 فلسم بەرکەوت. کە گەیشتمەوە ماڵێ، شەو بۆ ئەو سەردەمانە مەیلەو درەنگ بووبوو چونکە لە کەرکووکەوە سێ سەعاتێکی دەخایاند تا کۆیێ. ماڵەوە زۆرم پێوە گەشانەوە، هەرچی ئیشارەتێک بێ بۆ مەسەلەی ئیمتیحانی لە کەسەوە دەرنەچوو. هەستی خۆم بریندار بوو بەڵام نەک لەبەر پەرۆشیی تێشکان و بەرژەوەند دۆڕاندن.

خوێندنی مەکتەبم لە پێش چاو کەوت. بڕیارم ئەوە بوو چی دی ڕووی تێنەکەم. بەڕێکەوت ئەو سەرەتایەی هاوین کە ئیکمال بوونم مەعلووم بووبوو باوکم لە هەولێر بەخێر هاتنی ڕەشید عالی گەیلانی-ی کردبوو کە لە 1924 ەوە شناساییان هەبوو، دواتریش لەگەڵ یاسین پاشا و ئەمین زەکی بەگ-دا هاتە کۆیێ، لە 1934 کە سەرلەنوێ پێوەندییان بە باوکمەوە بەتینتر بووبوو. لەو ساڵەی 1939 دا باوکم بە ڕەشید عالیی گوتبوو کە مەسعوود ئیمتیحان ئیکمالی لە پێشە، بەخێر کە دەرچوو دەبێ جێگەیەکی خوێندنی باشی بۆ ڕەچاو بکرێت. ڕەشید عالی گوتبووی: بابێتە لام وەها بزانێ دێتە لای برای خۆی. ڕەشید عالی سەرۆک وەزیران بوو. بەو بەڵێنەوە باوکم نامەی دۆستایەتی بۆ ڕەشید عالی نووسی و پێی دام کە دوای ئیمتیحان لە بەغدا بیگەیێنمە ڕەشید عالی. من کە وەزعەکەم بەو جۆرەی لێ بەسەر هات ڕووم نەهات بە سەردانیش خۆمی نیشان بدەم. زۆر برادەر دەیانگوت، دەبا نامەکەی بە زوویی بگەیەنمێ، چارەسەری ئیمتیحانەکەشمی دەکرد. من ئەمەم نەسەلماند بەڵام دوای 37 ساڵ شتێکم زانی ئەگەر ئەوسا بمزانیبایە لە خۆمەوە وەهام دەکرد کە برادەران دەیانگوت.

لە هاوینی 1976 کە جێگیری سەرۆکی کۆڕ بووم ڕۆژێکیان برا و برادەرم د. کەمال مەزهەر-م لا بوو، ئەحمەد شەوقی هاتە لام. ئەو مرۆیە دۆستی مەلیک فەیسەڵ و

پیاوە دەسەڵاتدارەکانی پێش شۆڕشی 1958 بوو، بە زۆریش مدیری ئەشغالی عام دەبوو. ئەو ڕۆژە بۆ من و د. کەمالی گێڕایەوە کە هاتنی یاسین پاشا و ڕەشید عالی گەیلانی و ئەمین زەکی بەگ و کەسانی دیکەش کە لە گەڵیاندا بوون بەتایبەتی بۆ دیتنی باوکت (مەلا گەورە) بوو. گوتی (خۆم لەگەڵیاندا بووم و ئەو سەردانەم زۆر پەسەند کرد و هانم دان). من چوزانم شتی ئەوتۆیی لە خەزێنەی غەیبدا پەنهانە و ئەو کەڵەپیاوە دەسەڵاتدارانە سەردانی کۆیەی لاچەپ دەکەن بۆ دیتنی مەلایەکی کناگیری وەکوو باوکم. کە هاتنە کۆیێ زۆر مەجامەلەی باوکمیان کردبوو، تەنانەت ڕۆژی دواتر جومعە بوو خەبەریان بۆ باوکم نارد، دێینە لای لە مزگەوتی گەورە و نوێژی جومعەی لە دواوە دەکەین دەبێ خوتبەی جومعەمان بۆ بخوێنێ.

دەزانم وەک عەرەب دەڵێ «نعم التصادف» شەهابی دەنگخۆش و قورئانخوێنی باسکراویش لە کۆیێ بوو. قورئان ئەو ڕۆژە و بانگی نیوەڕۆ و نوێژی جومعەش خۆی خوێندی بەو دەنگە ئاسمانییەی خۆی. دوای نوێژیش کە باوکم خوتبەیەکی دڵتەزێنی هۆشفڕێنی خوێندبۆوە یاسین پاشا و ڕەشید عالی و جەماعەت ڕێزیان بەستبوو هەتا باوکم پێشیان کەوتبوو ئەوانیش وەکوو قوتابی دوای مامۆستایان لە دوویەوە بوون و خەلقولاش حەوش و بان و دەرەوەی مزگەوتیان تەنیبوو. دوای 37 ساڵ غەیب لە گوێم دەچرپینێ ئەگەر چووبایە لای ڕەشید عالی حاڵت شتێکی دیکە دەبوو. یاخوا بەخێر بێت خەبەری بە درەنگە کاتەوە.

من لەو بارە نەفسییەی دوای نەساغی و کەوتندا بووم و هیچی پێ نەچووبوو لێم ساردبێتەوە، جەنگی دووەمی جیهانی هەڵایسا. ڕەنگە ڕووداوی وەها گەورە بەشێکی بەخۆوە گلان و گرفتی ژیانی مرۆ بۆ خۆی بدزێتەوە و فەرامۆشییەکی بەسەر هەستیدا بهێنێ بەڵام دیسانەوە من بەشی بە حاڵی خۆم هەڵستی ئەڵمانیای نازیم بە فەلاکەتی گەورەی ئەو ڕۆژگارە دادەنا. لە ناخی دڵەوە نازیەتیم بە دوژمنی چاکەی گشت ئادەمزاد و بیروباوەڕی خودی خۆم دادەنا. کە جەنگیش دەستی پێ کرد تا چەند ساڵێکیش هەر پێشکەوتن و سەرکەوتنی نازیەکانی بە موژدە دەداینێ.

لەو ساڵانەی بەر لە شەڕ پسپۆڕەکانی چەک و جەنگ پێشبینییان ئەوە بوو کە جەنگی تازە بە بەریەوە نابێ خۆی لێک بکێشێتەوە و لە کورتی دەبڕێتەوە، تاڕادەیەکیش لەبەر کەم تەجرەبەیی ئەو پێشبینیانەم دەسەلماندن. دواتر دەرچوو هەرچی ئەو پسپۆڕانە فەرمووبوویان هەڵە بوو. لە پێشەوە پۆڵۆنیا بە ئیزنی ستالین

تێک هەڵشێلدرا و کەرت کرا، هەر خواش دەزانی چەندم خەفەت خوارد. وەکوو بەرکوڵ، هەتا ساڵی دواتر نۆرەی فرەنسە هات، ئەڵمانیا نەرویجی داگیر کرد. ئنجا فرەنسە و هەموو ئەورووپای ڕۆژاوا تێچوون. خولاسە پەیتا پەیتا ناخۆشی لە زیاد کردندا بوو، خەڵقی بێتەجرەبەش لە خۆوە بوون بە دەروێشی حاڵگرتوو بۆ زەعیم هیتلەر. گوتارەکانی یوونس بەحریش بەو دەمورِاوێژە ڕەوان و بە تاموشامەی گوێگری بە ملوێن لەسەر ملوێن بۆ ڕادیۆ و ئێستگەی بەرلین ڕادەکێشا.

جەنگ بەردەوام بوو منیش لەسەر نەچوونەوە مەکتەب بەردەوام بووم هەتا دوو ساڵی ڕەبەق. لەو دوو ساڵەدا جگە لە ئەبڵەقبوون بەرانبەر جەنگەوە هیچم پێ نەدەکرا ئەوە نەبێ ڕۆژ بە ڕۆژ پتر ڕقم لە دیکتاتۆرایەتی هەڵستێ. لە مەیدانی ڕق لە دیکتاتۆر بوونەوەدا، جارێکیان، قسەیەکم کرد و ڕێم نەبوو ڕوونی بکەمەوە. لەو دەمەوە هەتا ئێستاش چەندێکی بە بیرمدا دێتەوە پەرۆشێکی لێ دەخۆم. لە مەجلیسی باوکم بە بۆنەی جەنگ و پێشەواکانی میللەتە شەڕکەرەکان و دەوری ئەو پێشەوایانە من لە کولانەی باوەڕم بە دیمۆکراسییەوە گوتم: «میللەت ناتوانێ ئیعتیماد لەسەر زەعیم بکات» (ئەمە دەقی قسەکەی ئەو دەمەمە). بێ ئەوەی مەودا هەبێ خۆم ڕوون بکەمەوە باوکم گوتی، ڕۆڵە چۆن میللەت ناتوانێ ئیعتیماد لەسەر زەعیمیک بکات کە دڵسۆزیی خۆی بە ئیسپات گەیاندبێ؟ باوکم لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، من نەمتوانی دەرفەت وەربگرم و قسە قسەی ڕاکێشا و من و بیرورِایەکەم لەو دەمەدا و بۆ یەکجاری لە لێڵیدا مایەوە. من دەمەویست بڵێم میللەت ناتوانێ بە دیار پەیدابوونی زەعیمەوە چاوچرِ بکاتەوە. دەبوو بڵێم «ناتوانێ ئیعتیماد لەسەر پەیدابوونی زەعیم بکات». هەرگیز ڕێک نەکەوت بگەڕێمەوە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستەم. باوکم لە قسەکەیدا مەبەستی لایەنگیری کردن لە زەعیمێکی دەستنیشانکراوی ئەو دەمە نەبوو، هەتا بشڵێی دژی هیتلەر بوو تەنانەت دەیگوت: «یاخوا هیتلەر بت بینم بە کەوچکان لە کفنت بنێن». یەکەم جاریش بوو ئەو تەعبیرەی «بە کەوچکان لە کفن نان» ببیەم.

## ئاڵقەی حەوتەم

ئەو زەبرەی لە نەگەیشتنم بە ئەزمووونی ئیکمالیم پێم گەیشت بە خامۆشی لە دەروونمدا مێروولەی دەکرد بەڵام لەگەڵ هەموو ئازار و زرە ناڕاحەتییەکی بۆمی پەیدا کرد، قووڵایی نەفس و گیانم بە دروستی مانەوە. ئەو ساڵە جگە لە کەوتنم باری تایبەتی خۆم هەبوو پڕ ئێش و کەسەر بوو، نەدەشیا کەسی تێدا هاوبەش، یان چارەکار بکەم، ئێستاش ڕێم نییە بیدرکێنم. ئەو حاڵوبارەش لە لای خۆیەوە وەهای کرد کەوتنم لە ئەزموون بەو هەڵکەوتە مەینەتە یەکجار دەگمەنەی لە مەوعیدی دواخستم پتر کارم تێ بکا. بێ ئەوەی ڕەشبینی بە سەرمدا زاڵ ببێت، وەک یەکێکی دڵی لە خواردن ببێزێ، منیش خوێندم لەبەر چاو کەوت. هەستم دەکرد وازهێنانم لە خوێندن کەلێن و ناتەواوی ناخاتە هیچ شتێکی پێوەندی پێمەوە هەبێ. ڕەنگە ڕاست بێ بڵێم، دوور کەوتنەوەم لە مەکتەب دەتگوت دەرچوونە لە نەخۆشییەکی وەکوو تاداری. زۆر کەس لە برادەر و ناسیاو هانی دەدام تێهەڵچمەوە و لە سەری ساڵی نوێی خوێندندا بگەڕێمەوە بۆ مەکتەب بەڵام دڵم بۆ ئەو ئامۆژگارییانە نەدەکرایەوە. هی وەهاش هەبوون حەزیان دەکرد واز لە مەکتەب بهێنم و بە هەلیان دەزانی ڕووداوەکە سەرەوخێر بێ بەوەدا کە لای باوکم بخوێنم بە هەویای وەجاغ ئاوادانیی بنەماڵەی جەلیزادان.

خوێنەری سەرنجدەر حەقیەتی لێم بەگلەیی بێ بۆ ئەو هەموو کۆڵدانەی تاکە یەک لەمپەڕی کەوتنی ساڵێک لێمی بەدەر دا. چ قەوما؟ کەعبە کەچ بوو مەسجیدولئەقسایە ڕووخاوە؟ ئەدی برسیی کۆڵانان و کۆستکەوتووان و عەزیز مردووان و ئاگرتێبەربووان چۆناوچۆنی خۆیان هەڵدرن؟ بە ڕاستیی ئەوەی ناوم نا «کۆڵدان» نەختێک زیاد لە پێویست بە هەڵاتووم دادەنێ چونکە من تەنها لە خوێندنی مەکتەب دزام، لەگەڵ هەموو لایەنێکی دیکەی ژیان و کۆمەڵایەتی خۆشجڵەو بووم. خەفەت داینەهێزاندبووم، بەڵام زامێکی شەخسی، کۆنتر لەو ساڵەی تێیدا کەوتم و ناشیەتە گوتن، لەگەڵ کەوتنەکەم کە تێک هەڵکێش بوون، وەهای کرد دوورکەوتنەوەم لە مەکتەب تاکە یەک دەروازەی کرایەوە بێ بە ڕوومدا.

باوکم کەموزۆر پێوەی دیار نەبوو مەسەلەکەی بەهەند هەڵگرتبێ. بەهیچ جۆرێک نە قسە نە هێمای قسانی بە لای ئەو مەوزووعەدا نەهێنا. هەرچەند خۆی شتێکی لە دوو لێوە دەرنەچوو بزانم بۆچی لەو هەڵکەوتە نالەبارەی من بێدەنگە، ئەمما لە خۆوە

بۆ ئەوە دەچم کە هەستی باوکەتی لە لایەکەوە و باڵ قوولّی لە لایەکی دیکەوە و تێبینیی نەکولاندنەوەی زامی نەفسیم کەوا ڕەنگە کولاندنەوەی زەرەرمەندم بکات لەلای سێیەمەوە وەهای کرد مەسەلەکە بە تەواوی واز لێ بهێنێ بۆ دڵخوازی خۆم. باوکم لە سایکۆلۆجی نابەڵەد نەبوو چونکە بەردەوام کتێبی نوێبابەتی بۆ دەهات تەنانەت کە خوێندەوارە نوێیەکان بەر لە سەفەریان بۆ بەغدا لێیان دەپرسی ئەمرت چییە؟ دەیگوت کتێبی چاک!! هەر لە بیرمە جارێکیان مەرحووم مامۆستا نوورجان کتێبێکی بە دیاری بۆ هێنا. چەندێکی پێ چوو ئەوجا زانیمان کە چەند دێڕێکی بە ڕووی ناوەوەی بەرگی کتێبەکەوەیە، پێشکەشنامەیە بە خەتی مامۆستا نوورجان خۆی. ڕاستییەکە خەتەکەی ئەوەندە جوان و ڕێک بوو وەهاش ئەندازەکێش کرابوو لە چاپ بە پشتەوە بوو، تومەز خەتیشی خۆش بوو، پێشیەوە خەریک بووبوو.

لەو خوێندەوارانەی ئەوسا گەنج بوون و پێوەندییان لەگەڵ باوکم بەتین بوو مەرحووم مامۆستا سابیر ئیسماعیل بوو. بە دڵ باوکمی خۆشدەویست، ئەویش بە چاوی ئەولاد سەیری دەکرد. لە هەموو سەفەرێکی کتێبێکی بە نرخی بۆ دەهێنا. پێی دەگوت سابیر هەر کتێب!

لە نموونەی پێوەندیی پڕ سۆز و بێفێڵی نێوان باوکم و بەشی هەرە زۆری خوێندەواری ئەوسای کۆیێ ڕووداوێکی کورتیلەی مزرۆکە باس دەکەم دەبوو زووتر بێتە ناو یاداشتمەوە، ئێستا دەبێ چەند ساڵێک بۆی بگەڕێمەوە دواوە. ڕۆژێک لە ڕۆژانی قایمقامەتیی کەریم بەگی ڕەواندزی 1932-1933 لەنکاو کەریم بەگ بە خۆی و کاغەزێکی موتەسەڕیفی هەولێرەوە «مەحموود فەخری» هاتە لای باوکم. موتەسەڕیف لە نامەکەیدا بۆ باوکمی نووسیبوو، کاغەزێک بە ئیمزای تۆ بۆم هات هەندێ شیعری لەنگیشی تێدا بوون ناشێ هی تۆ بن، نارەزاییت دەربڕیبوو لە هەندێ ئەفەندی و مامۆستای کۆیێ، ئەمرم داوە بە قایمقام چۆنت دەوێ وەها بکات. موتەسەڕیف کاغەزە هەڵبەستراوەکەشی خستبووە ناو زەرفی کاغەزی خۆی تا ئەگەر باوکم ئارەزۆ بکات کابرا بناسێتەوە.

کاغەزەکە شکاتی قورسی تێدا بوو لە دەست ئەوانەی باوکم خۆشیدەویستن، بەتایبەتی دژی عەبدوڵا سامی. کەریم بەگ پرسی ئەمرت چییە؟ پێی گوتەوە: کەریم بەگ، ئەمانە ئەولادی منن، تۆش لە ڕیزی نوورەددینی برامی، دەشبینی کاغەزەکە سەراپا هەزەیان و هەڵبەستە، دڵ نیگەرانیم لێیان هەبایە خۆم پێم

دەگوتن، مەبەستم تەنبێ خواردنیان بایە بە خۆتم دەگوت (کەریم بەگ هاوڕێی منداڵیی مامم بوو، هەرگیز لە بیری نەکرد). باوکم وەڵامی موتەسەڕیفی دایەوە بەو شێوەیەی لە کەریم بەگی گەیاند، کابرای کاغەزنووسیش هاتوچۆی ڕجاکارانەی کرد هەتا کاغەزەکەی لە باوکم وەرگرتەوە. باش بوو کەس زەرەرمەند نەبوو. عەبدوڵا سامی و هاوڕێکانی زۆریان لە باوکم خواست کاغەزەکەیان پێ بدات بیکەنە بنگەی شکات بەڵام باوکم لێی نەسەلماندن و وەهای پەسەند کرد بەردێک بخرێتە سەر مەسەلەکە، ڕەنگە بەرژەوەندیش لەوەدا بووبێ نەکا ناحەزیی شریتە بکێشێ.
بەهەمەحاڵ مەسەلەکە لە خۆوە فەرامۆش کرا. نامەنووس و شکاتلێکراوەکان بوونەوە بە ئاشنا. دیارە خۆگیریی باوکم لە دانی نامەکە بە عەبدوڵا سامی ئەم ئاکامەی بەخشی. ئێستا، کە تێ ڕادەمێنم دەبینم هەرچی ناوی هات و نەهات لەوانەی پێوەندییان بە مەسەلەکە هەبوو هەموویان بەسەرچوون، تاکێکیان لێ نەماوە مەگەر بابای کاغەزنووس، تەمەنی درێژ بێ، وەک عەرەب دەڵێ: «حي يرزق» - ئەمەم لە 28/8/1986 نووسی.19

نەچوونەوەم بۆ مەکتەب گرفتێکی بۆ پەیدا کردم، دەبوو بچم بۆ عەسکەری. قایمقام سەعید عەبدولقادر کەرکووکی زۆر حۆقەلی بوو، هەر دەتگوت جەمال پاشایە ڕوتبەی هاتۆتە خوارێ. جارێکیان لە ژوورەکەی خۆی ماملەتی من تەماشا دەکرا، مەئمووری نفووس، شاعیری هەولێر، «کانی» بوو. کورد دەڵێ: «دز و ماڵخۆ یەک بن، گا بە کولانکەدا دەبەنە دەر» کەچی لەو ڕۆژەدا، هەرچەند قایمقام بە هەموو دڵ لایەنم بوو، «کانی»یش مەبەستی خاتری باوکم و چاکەی من بوو، پەڕەسێلکەش بە کولانکەدا دەرنەچوو. دەرکەوت چارەسەر کردنی مەسەلەی عەسکەری بەتایبەتی بۆ یەکێکی نەختێک بەرچاو بێ، پینەسازییەکی تەواو وەستایانەی دەوێ. ئەو ڕۆژە مەسەلە خرایە ڕۆژێکی دیکە.

---

19- بابای کاغەزنووسیش زۆری نەبرد پاش ئەو درکاندنەی من بەرێکەوتی ئۆتۆمۆبیل گیانی سپارد. حاڵی زیندوو ئەمەیە دوای مردنی فارس گوتەنی: «توگوئی که اصلا ز مادر نەزاد». ئەم تێوەرێخەم، لە بەغدا، لە پێدا چوونەوەم بە «گەشتی ژیانم»-دا نووسی: 26/11/1992.

سەعید عەبدولقادر بە هەوای حۆقەلییەتی خۆی ڕووی تێکردم، زاپتی تەجنیدیش لەو دانیشتنەدا حازر بوو، گوتی مەسعوود! بە حەقی خوا حکوومەت هەرچی بکات تۆی تەسلیم ناکەم بە عەسکەر. هەرچۆنیک بێ لە کوێرە ڕێگاوە عەسکەریم لە کۆڵ بۆوە بەڵام بێ هەرا و سەروسەدا تێپڕا نەڕۆییشتم. چەندین ئیخبارییە و چوغوڵی و شکاتی پەنامەکی بە هەولێر و بەغدا ڕاگەیەندرا. هەڵوەستی «کانی» لە هەوەڵەوە تەئویلی خراپی لێ درایەوە گۆیا کارەکە وەزەحمەت دەیەخێ، کەچی دەرکەوت لە کارامەیی و شارەزاییەوە دەیەویست مەسەلەکە هەر لە سەر چاوپۆشی قایمقام نەوەستێ چونکە لەوانەیە نەقڵ بێ، یاخود قسەی نەڕوا. هەر لەو ماوەیەشدا کە سەعید عەبدولقادر قایمقامی کۆیە بوو، «کانی» چارێکی دۆزییەوە. ئافرەتێکی بێکەسیان لە مەحکەمە لێ مارە کردم، بۆی بووم بە «معیل» چاوپۆشی و یارمەتیدانەکە لەوەدا بوو کە دەبوو بەر لە هاتنی ناوم بۆ عەسکەری بەهانەی «اعالە»م هەبێ. ئیدارە و تەجنید و نفووس پێکڕایان چاوپۆشییان کرد. لەو دەمەدا کە من ئەم گرفتەم لە پێش بوو، هێشتان عەسکەری کردنی عیززەددینی مەلا ئەفەندی و سەید محەمەدی سەید عەبدولاغای هەولێر هەر لە بیران بوو.

ڕابواردنم لەو دوو ساڵەدا کە خوێندنم وازهێنا چ فەرقی نەکرد لەگەڵ وەزعی ساڵانی پێشترم. شەوەکانی ڕەمەزانمان چۆوە بۆ گەشایی ساڵە هەرە خۆشەکانم. بە زۆری کە سەردانی کەسمان نەکردبایە، کۆبوونەوە لای ئێمە دەبوو. لەو شوێنە دادەنیشتین کە لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد پێیان دەگوت «قەسر»، ئەوە بوو بە نیازی تێدا دابەزینی مەلیک فەیسەلی یەکەم دروست کرا. ئەوسا ڕەمەزان لە کڙی پاییزدا دەهات. هەوا فێنک، ڕۆژ کورت، شەو درێژ، مێوە لە مشە. کە تۆپی پارشێو ئاگر دەدرا بڵاوەمان لێ دەکرد. عەزە بەغدایی تاقەتی دەهۆڵ لێ دانی نەمابوو. شەوێک لای مەلا محەمەد ئەمینی مەلا مستەفای عاسی لە مزگەوتی گەرمک کۆبووبووینەوە سەرگەرمی سینی و زەرفێن بووین، حەمەی مەیتەر ئامۆزای کافیەی مەلایان، لە بەری ئێمە بوو. کە سینی ئەنگوستیلەی تێدا شارایەوە، حەمەد وەری گرت و هەر بە دەستیەوە بوو جارێ دای نەنابوو، لەسەر چۆکان بە دیار سینیەکەوە وەکوو بولبول بە دیار گوڵەوە تێی هەڵکرد:

ڕەفیقانم بزانن شەو چ وەختە
کە بولبول عاشقی بەرگی درەختە

خوای لە سەران!! ئەو دەنگە لە کوێوە هات! هەناوی بەنیادەم چۆن بۆی دەلوێ ئەو هەموو ئاگرە بە ئاهەنگ وەدەرنێ هەتا ناخی هەست و گیان ئاگرۆچکە لە گوێگردا هەڵایسێنێ!

لە موناسەبەدا دەڵێم، لە بەرەو کۆتایی ساڵی 1938، لە شایی ژنهێنانی کاک مەجیدی ئامۆزام شەوێک لە شەوانی ئەو ئاهەنگەدا کە دەنگخۆشان مەجلیسیان گەرم دەکرد بە گۆرانی هەمەچەشنە، ئەوساش لەنکاو شێخ ئەنوەر و مەرحووم جەلالی براچووکەی خۆی تێیان هەڵکرد لە «موشح»ی «الغصن نقا مکلل بالذهب» بەڕاستی شاکارێکیان چڕی لە وەهم و خەیاڵ بەدەر بوو، دەنگەکەیان تێک دەئاڵا بە سۆز و کڵپە و بڵێسەیەکەوە ئاگری لە هەناوی گوێگر بەردەدا...

ساڵەهای ساڵی دواتر کە ئەم مووەششەحەم لە «فەیرووز»ی لوبنانی و غەیری ئەویش بیستەوە، ئەگەر بڵێم سەد نومرە بە هی ئەنوەر و جەلال درابایە پێنج نومرەی دەدرایێ، لەمەشدا موبالەغە نییە چونکە ئەوەی پێی دەگوترێ «ابداع، اعجاز» لە هونەردا ئەو تێهەڵکشینە جوداکەرەوەیە وەک نووکی قەڵەم کە پەڕاندت و نەتهێشت، قەڵەمەکە دەبێتە چیلکەدار، لەوحەی «جیۆکۆندا» کە لە نرخ نایەت نەختێک لە بزەکەی دابلەنگێنە لە ملیار دۆلارەوە دادەبەزێ بۆ ملیۆن و کەمتریش. ئەنوەر و جەلال هەتا ساڵانی دوایی ژیانی مامیان، شێخ نەجمەددینی شێخ کەریمی بەرزنجی وەک دوو بولبولی مەجلیسی ئێوارە و شەوانەی بوون. شێخ نەجمەددین خۆی لە دەنگخۆشە هەرە بەناوەکانی ئەهلی دین بوو، پیریش بووبوو سبەینان کە بانگی دەدا و ڕەمەزانان لە بانگ و کەباردا هەر دەبوو گوێی بۆ هەڵخەیت. لە باوکمم بیستووە: جارێکیان بە کۆمەڵ لەگەڵ دەستەودایەرەی شێخ مەعرووفی هەڵەجە، براگەورەی شێخ نەجمەددین، کە پەنجا سوارێک دەبووین لە هەڵەت و پەڵەتی نێوان هەڵەجە و ئاخوڕەدا، خاڵە نەجمەددین «سوارۆ» یەکی تێ هەڵکرد ئەو پەنجا سوارەی گریاند. (قسەی باوکم تەواو بوو).

لەو ساڵانەی دوایی ژیانی، بینینی نەمابوو، ناوناوە لە خزمەتیدا دەبووم و بە ڕاوێژی فریشتەکارییەوە شیعری بۆ دەخوێندمەوە. جارێکیان چەند بەیتێکی تەصوفی خوێندەوە بە سۆز و ئاگرێکی ئەتۆوە لە تەحەمول بەدەر، خۆ کە گەیشتە ئەم بەیتە:

مقصود من از مسجد و میخانه توی تو
مقصود توی مسجد و میخانه بهانه

بە جارێک خۆی و منیش تواینەوە، بووین بە لەرز و موچڕک و فرمێسک!!

لە نووسینمدا باسم کردووە ئەو مەقامناسەی مەشوور بە «الجمال المشرقي» کە بەر لە 600 ساڵ زیاتر مردووە خەڵقی کۆیە بووە... باوکم دەیگوت «گۆرانی لە دیوی کوردستانی ئێران دادەنرا، لە سلێمانی گەڵاڵە دەبوو، لە کۆیێ لە چەرخ دەدرا» بە زەدەبوونی کۆیێ لە شەڕی یەکەمی جیهانییەوە ئەم لایەنە و هەموو لایەنێکی ژیاری کۆیێ دالەنگا.

دانیشتنمان لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد ڕووەو شیوی ڕەزەوان و چیای هەیبەت سوڵتان بوو. گەلێک شەوان بەر لەوەی دەنگمان گوێ لێ بێت، دەمزانی تۆپی پارشێو ئاگر درا. تۆپەکە بەسەر گردێکەوە لە بەردەمی قشڵەی سواری کە ڕووەو شار و ڕۆژهەڵاتە، دامەزرابوو. ڕووناکایی تێزکە و تەقینی بارووتی تۆپەکە لە شەوی ئەوسای بێکارەبادا تۆپەڵەی ئەو گرد و هەڵەتەی ڕووناک دەکرد کە لە ئێمەوە دیار بوو، لەوەوە دەمزانی تۆپی پارشێو ئاگردرا. دوای چەند سانییەک ئنجا گرمەی دەمان گەیشتێ.

شەوێکیان پاش مەجلیسی عادەتیمان هاتمەوە ماڵەوە، هێشتا جلکم نەگۆڕیبوو تەقەی دەروازەی دەرەوە و ڕەپەی وڵاغان لە کۆڵانەی بەر دەرکی ماڵمان هێنامیەوە بۆ لای دەروازە. بە «لایتی» دەست ڕێگەم ڕوون کردەوە، زانیم ڕەپەی بەر دەرگە هی دانیشتووی شار نییە، خێرا دەروازەم خستە سەر پشت و بە لایت خەڵقەکەم ئاشکرا کرد، دیتم چەند کەسێکی ناسیاوی خەڵقی «پیبازۆک» بە چەند وڵاغێکەوە، یەکێکیان مەیتێکی کفنکراوی بەسەر پشتەوە. شەکەتیی ڕێگەیان پێوە دیارە، وڵاغەکانیش بێئۆقرەی ماندوویی و برسییەتین. لە پێشیانەوە حەسەنی مام فەتاح بۆم هات و گوتی: مەیتی حەمە عەلیاغا-یە ئەمرۆکە دوای نیوەرۆ لە قەنبەران عەمری دا حازری ئێمەی پاش شووشتن و کفن کردن لە پێش فتارەوە بە ڕێگاوەین، لە ترسی کەوتنی بەسەر پشتی وڵاغەوە ولەوەتەی تاریکیش داهاتووە زۆر لە سەرەخۆ هاتین شوکور وا مەیتەکەمان گەیاندەوە. دەک ڕووی هەزار ساڵەتان سپی بێ، وەی

مەردە بە وەفاکان هەی لە جێی خزم و کەس!! چ هەستێکی شەرافەتکارانەیە وەها لە ئێوە بکات بێ ترسی جەزا و بێ تەمای دنیا ئەو ئەرکە بێڕەزایە و ئەو ئەمانەتە زلەی مردوو و خێزانێکی و کەلوپەلێکی هەیبوو بە ئەستۆوە بگرن. بە برسییەتیی ڕۆژوودارەوە، بە ڕێگەی چڕگەن و ئەستەم و شاخاوی دە سەعاتە ڕێی مەیت هەڵگرتووانە لە تاریکایی شەودا بکوتنەوە، بەتینی بازووتان، بە وڵاغی دەرکزاوی خۆتان، مەیت بگەیەننە بەر بڵاچە و گرمەی تۆپی پارشێوی کۆیێ؟

کوڕینە، کچینە، گوێگرینە، ئەی خوێنەرەکان! ئەم دنیایە هەر بە ڕاستە حیسابی 3+4=7 لێک نادرێتەوە. کارێکی لەو ڕۆژەدا ئەو چەند کەسە بێناوونیشانەی پێبازۆک کردبوویان، گەلێک گەلێک پتر مەردایەتی و ئازایەتی و مرۆڤایەتیی تێدا بوو لە دەیان شەڕی ئەمیرێک بۆ گەیشتن بە حوکم جانفیدایی تێدا کردبێ چونکە شەڕی ئەوتۆیی بۆ دارایی و دەسەڵات و نازوفیزە، چی ئەمانە کردیان بە تەنکدەستی و ئەرک و سەرقاڵیی کەسابەتەوە، عەزاب و بەخشینێکیان بە ملەوە گرت بە چاکەی غەیر و زەرەری خۆیان تەواو دەبوو.

حەمە عەلیاغا (مەشووە بوو بە عەلی غەربی، لە شەڕی یەکەمی جیهانییەوە بە هۆی مانەوەی لە عەلی غەربی ئەو ناوەی بۆ مایەوە) خوارزای باوکم بوو لە زۆر جار و باردا وەکیلی دەبوو. ئەو ساڵەی تێدا مرد سەرکاری مەرەزەی قەنبەران بوو لە بیتوێن، مڵکەکە میراتی جەلیزادان بوو لە حاجی مەلا ئەسعەدەوە. لەو دەمەدا بە حەسەن و هاوڕێکانیم گوت مەیتەکە دابەزێنن لە حەوشەی دیوەخانەی دابنێن و وڵاغان بەرنە حەساری خۆمان لە بەرانبەر ماڵەکەمانەوە. گورج هاتمە ژووری، کافیەی مەلایانم بە خەبەر هێنا و لە خەڵقم دوور خستەوە و پێم گوت ئیشم پێیەتی دەبێ بێتەوە هۆش ئنجا تێم گەیاند چی ڕووی داوە. عالەم پێی زانی، من هەر خەریکی ماندووە برسییەکان بووم فتار و پارشێویان بدەمێ. ئەو شەوە پارشێوێکی تاڵمان خوارد. نوستن نەما هەتا سبەینە و هەتا مردووش ناژرا. تازیە بە عادەتی کۆیێ سێ ڕۆژی خایاند. چونکە ڕەمەزان بوو هەر ئێواران سفرە دەهاتەوە.

مەرگی حەمە عەلیاغا گۆڕانی خستە جۆری ڕابواردنی شەوانەمان هەتا ڕەمەزان بەسەرچوو. من بەدڵ عەلیاغام خۆش دەویست نەک هەر لەبەر خزمایەتی بەڵکوو چونکە مرۆیەکی نەترساو بوو، ئیشی لەبەر دەرۆیی، خەڵق کۆمەی لێ دەکرد، بە دەنگییەوە دەچوون. ڕاستییەکەی لەلایەن ڕەوتی دنیاوە مردنی عەلیاغا بەتاڵاییەکی

بۆمان دروست کرد لە نێوان عەشایری دیوی بیتوێن چونکە دەیتوانی ئەو شتە بکات کە ئەوان دەیکەن. لە ئاڵقەیێکی پێشووتر باسم کرد کەوا لە دەمی نیابەتی بابم ساڵی 1924 حەمە عەلی هەمیشە لە پاراستنی باوکم خەریک بووە تا ئەوەی کە دەنگ بڵاو دەبیەوە لەسەر هەرای ئیمزا کردن و نەکردنی موعاهەدە نائیب و غەیری نائیب کوژراون حەمە عەلی بێپەروا دەمانچە هەڵدەکێشێ و گوێ ناداتە حەرەس و پۆلیس و نیزامی مەجلیس هەتا ئەو ژوورەی باوکمی تێدا دەبینێ بە سەلامەتی، ڕاناوەستێ. وابزانم «محسن السعدون» خواییشت لە باوکم دەکات کە بفەرموێ حەمە عەلی دەمانچەکەی بخاتەوە گیرفانی.

جەنگی دوەم درێژەی کێشا، پۆلۆنیا دوو کەرت کرا و پێچرایەوە. من بە دڵ و بە باوەڕ، کە جارێ زووش بوو بۆ باوەڕ ڕەگ لە هۆش و گۆشمدا داکوتێ، لای دیمۆکراسی بووم. لە کۆڵانەی کوردایەتیشەوە هیچ مەرحەبایەکم لە نازی و فاشیستەوە نەدیتبوو حەزی خۆمی پێ بگۆڕم. نە ئەڵمانیا نە ئیتاڵیا بۆ هەڵخەڵەتاندنیش ڕادیۆیێکی کوردییان نەیەخستە کار. ساڵی یەکەم نرخی شتومەک فەرقێکی ئەوتۆیی نەکرد. لە پارەدارەکان زیرەکی ئەوتۆ هەبوو پێشبینیی دوارۆژیان دەکرد. زیرەکێک هەتا توانی قەندی کەللەی عەنبار کرد. لە ئاکامدا کەللەی 75 فلسی بە دوو دینار فرۆشرا. بۆ بێتاڵعی ئەو خەڵقە سن و کیسەڵەی دەغڵ پەیدا بوو تا وەهای لێ هات دەتگوت گەنم خەریکە لە وەڵاتی کوێێ نامێنێ. ئێمە لە هەموو فەلاحەتی خۆمان، بە ماڵی خۆمان و مامم و فەلاحەکانەوە 24 تەنەکەی پیتەکی گەنمی سن خواردوومان هاتە کیسەوە کە وەڵاغیش نەی دەخوارد. بە ئەسڵ فەلاحەکان گەنمەکەیان درووەوە و کوتایان بۆ خاتری کایەکە. ئەو هاوینە مەلا ئەفەندی سەد بار گەنمی یەکدانەی کەندیناوەی بۆ ناردین، جگە لە نانی ساڵی بنەتۆیێکی مناسبیشمان لێ داچاند، بۆ ساڵی دیکە بووینەوە خاوەن گەنمی خۆمان. دەبێ بشڵێم ئەو سەد وڵاغە و کەسانێکی لە دەشتی هەولێرەوە هێنایانن بە مەسرەفی مەلا ئەفەندی بوون.

خەڵک وردەوردە بەرەو هیتلەرپەرستییەوە دەچو، هۆی هەرە سەرەکی ئەوەبوو کە ئەڵمانیا لە مەیدانی جەنگدا ئەو دەورەی پاڵەوانەتی دەدیت کە ڕۆستەمی زاڵ لە ئەفسانەدا بۆی هەڵبەسترابوو. ڕەنگە پیاوی خەیاڵبڵاو بێن و ئەو نازیزمە منداڵانەی نەخوێندووان بدەنەوە بە هۆی ماددی و بەرژەوەندکرد. تەنها هۆیەکی بکێشێتەوە بۆ

لای بەرژەوەند هەر ئەوەیە کە خەڵق ئینگلیزی خۆش نەدەویست، بەڵام ئەم هۆیە زۆر بە درەنگەوە خۆ بە دەست بەرژەوەندەوە دەدات چونکە پیاوی حاڵ خۆش و سەربە حکوومەتیش، زۆریان هیتلەرپەرست بوون، کەسیش نەیدەپرسی ئەگەر ئەڵمانەکان سەرکەوتن چ خێر و بەرەکەت بە دوا خۆیاندا دەهێنن.

لە نموونەدا دەڵێم، بە بۆنەی مردنی مامۆژنم، شێخ حسێنی حاجی سەید و مەحموداغای حاجیاغا-ی پژدەر هاتنە پرسە و چەند ڕۆژێک میوانی باوکم بوون. هەر لە بیرمە هەردوویان بە دڵ بۆ ئەڵمانیایان دادەبڕێ. باوکم لەگەڵیان هاوباوەڕ نەبوو، هەر ئەوەندەی بە پێکەنینەوە پێ گوتن: «یاخوا خوا لە زارتان بنۆڕێ بابزانین کێ زەرەر دەکات»...

لە چایەخانان کاتی ئەخباری یوونس بەحری لە ڕادیۆی بەرلین دیمەنی ئەو ڕۆژگارانە دەگەڕانەوە بەرچاو کە حەکایەتخوونان بە دەم قارەمانەتیی ئەمیر ئەرسەلان و لەندەهۆڕی سەعدان-ەوە گوێگرەکانیان بۆ سەرشێت دەبوون.

دەڵێن مستەفاغای باوکی شارەزا[20] ئەسکەندەرنامەی دەخوێندەوە، بەڕێکەوت دەمانچەیێکی بە دەستەوە بووە، بەپێی ئاهەنگی گەرمبوون و کزبوونەوەی شەپۆلی

---

20- مستەفاغا لە حەویزییان و پیاوێکی بەرچاو و ئەدەبدۆست و مێژووناس و حیساب ڕاگری ساڵ و مانگ و کژەکان و فارسیزان و بەوەفا و قسەخۆش بوو. من بە دڵ خۆشم دەویست، لە مەجلیسی تێر نەدەبووم. نوکتە و ڕەفتاری سەربە گەپ و مەیلەو مەلای مەشوورانەی هەبوون مرۆ پێیانەوە دەگەشایەوە، لە وەچەی بەرچاو ئەحمەد دلزار و کەریم شارەزا و خاتوو فریشتە-ی لێ بەجێ ما، هەر سێیان شاعیرن. لە تازیەی مامم، ساڵی ١٩٥٢، تازە شۆڕشی میسر بەرپا بووبوو، ئێوارەیەکیان مستەفاغا، کە ڕۆژانە و شەوانە لە تازیەکەماندا بەشدار بوو، بەو سەراحەتەی لە قسەکانیدا هەبوو لەگەڵ خەفەتی بۆ مامی دەخوارد، بە دەم قسانەوە گوتی: دەڵێن ئەجەل ئەجەل، وا من حەفتا ساڵم ڕابوارد - سوێندی خوارد - چارپینەشم بکەن ناگەمەوە ساڵێکی دی... دوای چەند مانگێک کە لە سلێمانی حاکم بووم خەبەری مەرگی هات. ئەو خەبەرە بۆ من، هەم لەبەر مەحەببەتێکی ئێمە بۆ ئەوان هەبوو ئەویش بۆ ئێمەی هەبوو، هەم لە پێشبینی مەرگی خۆی کە

حیکایەت، دەمانچەکەی بە حەرەکە دەیەخست. جارێکیان لەگەڵ زەبری گورزی لەندەهۆڕ ئەویش دەمانچەی بۆ سەر کتێبەکەی هێنا و ئاگری دا، ئەسکەندەرنامە هەڵاهەڵا بوو. ئەم حیکایەتەم بیستووە یاخوا ڕاست بێ، چ زەرەری لێ پەیدا نابێ. دەشڵێن جارێکیان لە کەرکووک، کابرایێک شەو لە قاوەخانە بە کزی و خەفەتەوە دەگەڕێتەوە ماڵێ، ژنەکەی لێی دەپرسێ بۆچی وەها پەستە، گوتبووی ئەمشۆ عەنتەر بریندار بوو، ژنەکەشی دەڵێ بریندار دەبێ چاوی دەرێ، مێردەش زۆر مەردانە بە هەواخوایی عەنتر یەکسەر ژنەکەی تەڵاق دەدات و وەدەری دەنێت.

خەڵقەکەی کە هیتلەر- یشی خۆش دەویست هەر عەنتەرپەرست بوون، بەڵگەشیان لەگەڵ خۆیاندا بوو چونکە دوای تێشکانی ئەڵمانیا، زوربەی هەرە زۆری ئەو هیتلەرپەرستانە بوونە ستالینپەرست. ڕێکیش نەکەوت باری جیهان وەها بگۆڕێ ئەوانیش دیسان لەگەڵی بگۆڕێن، ئیتر بە ناچاری، لەبەر نەبوونی عەنتەرێکی تازە، هەموویان لەسەر دینی ستالین مردن، خوا پاداشی هەموو جۆرە دینەکانیان لەو دینادا بداتەوە.

لەو ساڵەی یەکەمی خانەنشینیم، بەپێی داخوازی دەوروبەرم، وردەوردە پێی هاتوچۆی لادێم کرایەوە. پێبازۆک مەیلەو دوور بوو، بە سواری وڵاغەبەرزە سێ سەعاتی دەخایاند، بەڵام قەوغایی دێیەکە و بەرژەوەندی کەسابەتمان بەرەو ئەوێیەوەی دەبردم تا شوێنێکی دیکە. سەردانەکانی هەوەڵ ڕۆژانم بە نیازی سەیران و گەشت و کمێکیش بۆ چاوکرانەوە و ڕاهاتن بوون. بەڵام کە دروێنە و چاندنی شیناورد نزیک بوونەوە خوولیای سەرپەرشتی کردن و دەست تێوەردانی مشوور خواردنی وەرزێر و زوڕاعانم بزووت. لە هەوەڵەوە خەریکی دەغڵ و دان بووم شیناوەردم بۆ سەرکاری خۆی بەجێ هێشت، زۆری نەبرد ئەو سەرکارە بای دایەوە سەر کەسابەتی شار، لەوە بەولاوە سەرپەرشتیی هەموو داهاتێکم دەکرد. چاندن کەسبێکی زیندووە، هەموو ساڵێک بە فراژیبوون و هاتنەوە کایەی دێمەکار و ئاوییە دوو کۆرپە دەبن و پێش دەگەن. خۆ ئەگەر ئاژەڵداریشی لەگەڵدا بێ کە تەواوکەری

---

لێم بیستبوو، پتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا بۆی پەرۆشدار بووم. وا دەزانم بە عەینی پەرۆشەوە کاغەزی پرسەم بۆ شارەزا نووسی.

فەلاحەتە کارەکە دەبێتە کردەوەییێکی خەڵقی سەرلەبەر. تۆ بوەشێنە، شیناورد بچێنە، ئاژەڵ ئاوەدان بکەوە، ساڵی سێ مێینەی زیندوو دەزێنی.

قۆناغم ماڵی حەسەنی مام فەتاح بوو، لەبیرمە یەکەم سەفەری کژی خەرمانانم بۆ پێبازۆک، لە عەسرێکی کامڵدا کرد لە ترسی گەرما. دەوری نوێژی عیشا گەیشتینە ماڵی حەسەن. هۆبەیان لە هەواری «زەویی کوڵێنان» کەپریان کردبوون. ئەوەی من لێی دابەزیم بایی نیمچە دیوەخانێک کەپرەکەی درێژە پێ درابوو، بە چیغ لە دیوی ماڵەوە جودا کرابۆوە. هەستی وڵسات بە دەوری ماڵاناوە و حەپەی ناوناوەی سەگەکان ئاوەدانییێکی لەو چۆڵە ساز دەدا. زەویی کوڵێنان بۆم بووە یەکەم شەوگەی پێوەندیم بە گوزەرانی فەلاحی کوردەوە، پێوەندییێکی بەرەو ناوەوەی ئەو گوزەرانە سەختە بڕوات. سەختی چی؟ ئەوساکە جارێ تراکتۆر و مەکینەی دروێنە پەیدا نەبووبوو، فەلاحەت ئەرکێکی نەفەسبڕی، پشتشکێنی، مرێنی، نێرخەسێنی پێوە بوو، دەسا سوێند بە نانە پاکەکەی ئەو ئەرکە پیرۆزە، دوای چەند ساڵێک هەر لەو زەویەی کوڵێنان نموونەییێکیم دیت لە ڕەنجی بێڕەحمی بێبەزەیی بێسنووری ڕەنجبەر و پاڵە و سەپان، مەگەر چیرۆکنووسێکی وەکوو «پیرل پیک» بتوانێ لە حیکایەتی خەیاڵکرددا تانوپۆی ڕووداوی ئەوتۆ بتەنێتەوە کە ئیرادەی تەنگەتاوکراو بگەیەنێتە ڕۆخی یان مەرگ یان ئەم ئاواتە بێبایەخە. ئائەمەم دیت فەرموو لەگەڵتدا پێیدا بێمەوە!

کژی خەرمانان لەو هاوینەدا ئاخەلێوەی بوو، سەپان ڕۆحی هاتبۆوە سەر لووتی ئۆقرەی نەمابوو، خەرمانە جۆیێکی هەرە گەورەی فەلاحەتی ماڵی مام فەتاح لەو کوڵێنانە حازر کرابوو بۆ دابەشین و گوێستنەوە. وڵاغی پێویست بۆ کێشەی خەرمانەکە ئامادە کرابوون هەر دەبوو بار بکرێن. ئێسترێکی جووتی ئەو فەلاحەتە مەشوور بوو بە «ئێسترە شێتە» هەتا لە خۆوە ملی نەنابایە بەر باس کەس نەیدەوێرا نزیکی بێتەوە. بەینێک بوو دابوویە لاساری نەدەگیرایەوە. ئەو دەمەی کە قسەی لێ دەگێڕمەوە ئێسترەکە بە گوێی هەمیشە موچیەوە، بێ قەڕاسە و جلوجۆر، دوورەپارێز دەوری خەرمانەکەی دەدا و مرومۆی لە کا و کۆتی دەکرد. سەپانێکیان، عەولای سۆفی مارف، کە لە قەدیمە ماڵەکانی پێبازۆک بوو، پێوەی دیار بوو خەفەتێکی گەورە لەو ئێسترە بەرەڵایەی بارنەبەر دەخوا. وەختێک ڕووی قسەی لە ئێسترەکە کرد و گوتی، ئێسترە شێتە! بەو خوایەی لە سەرانە خۆمت تێدەکەم، یان

هەلاهەلام دەکەی یان بارت دەکەم، خۆ من لە خەفەتت تەقم کرد. چەندی پێمان گوت کورە خۆت شێت مەکە، بێفایدە بوو. بەینێک خۆی لە ئێسترەکە نەبین و نەبیس کرد، بە خەڵقەکەشی گوت سڵی نەکەن. ئێستر ماوەی نیو سەعاتێک بەو فەرامۆشییەی سەپانەکان کمێک لە خۆی ئەمین بۆوە. پتر خۆی لە ڕاستە خەرمانی دابەشکراو نزیک کردەوە. عەولا سەبری گرت هەتا وەها بوو مەودای لەگەڵ ئێسترەکە پێنج، شەش مەتر مایەوە. پێشتر خۆی گورج کردبوو، پێڵاوی فڕێ دابوو - ئەگەر پێڵاوی لە پێ بووبێ - دەتگوت باشووکە دەیەوێ دابێتە چوێلەکە. لەنکاوێکی غافڵگیر تا تێیدا بوو ڕۆ بووە هێسترەکە. هێستری شێت ڕاپسکووت، بە سەرەولێژی پەرێزدا، بە جووتە و تێتریزاندن و هەرەکەتێکی تێی دایە، کەوتە خۆ دەرباز کردن.

عەولا بەو گورەی بەستی و بەو خێراییەی کردی، وەکوو گورگ، لە لای چەپی ئێسترەوە لەگەڵی جووت بوو، بە هەردوو دەست گوێی چەپی ئێسترەکەی گرت و خۆی پاشەوشکێن کرد و جووتە پاژنەشی وەک گاسن لە پەرێز چەقاند. ئێستر هار بوو، ڕاست و ڕاست بێ پێچەکە و خوارەکە سەرەولێژ ڕۆیی عەولاش بە تەنیشتیەوە. هەر جووتەیەکی ئێسترەکە بەر عەولا کەوتبایە نانی بە کەرتک نەدەکرد. من لێم سوور بوو ئێستا نا ئێستا عەولا کۆڵ دەدات و هێزی دەبڕێ هەر دەبێ خەریکی دەرباز کردنی ڕوحی بێت.

دەوری پەنجا مەتر ئەو کێشە ترسناکە شێتوشوورە ئەجەلیاخوونە بەردەوام بوو. جووتە پاژنەی عەولا لەو پەرێزەدا خەتە جووتێکی وشکی پەنجا مەتری هەڵدڕی هەتا ئێستر ملزەم بوو. ئێستر وەها دەردەست بوو، لەو دەمەدا شێتایی پێوە دیار نەمابوو، ئەوە نەبێ کە چاوەکانی توورە و گوێی ڕاستی وشت بوو. لەو سەرەوە عەولای چەنەبەڕی ئۆی بە ئێستر دایەوە و ڕای کێشا، نەخێر گوێکێشی کرد بەرەو خەرمان. پێیەکانی عەولا بەو عارد هەڵدڕینە هیچیان لێ نەهات، تومەز لە ئیشاندا وەها خارا بوون وەکوو گولاسنیان لێ هاتبوو. عەولا ئێستری بارکرد و هەناسەیەکی حەسانەوەی هەڵکێشا، ئای لەو حەسانەوەیە! هەر دەبێ بەراوردی بکەی لەگەڵ ڕاکشانە نەرمونۆڵە وەنەوزاوییەکەی سەر سیستەمی بەر کۆندیشن!!

ئەمەیە وێنەی سەپانی پێش تراکتۆر و پیکەپ. لەو شەوەدا کە گەیشتینەماڵی حەسەن خێرا حەوجۆشی ڕەش خرایە تەنیشت ئاگری چایەوە و ماستاو خورایەوە

بەڵام بێ بەفر. حەسەن لێمی پرسی چ حازر بکەن بۆ خواردن. گوتم هەرچی زوو حازر بێ ئەوە چاکە. گوتی دەفەرمووی «سیپابەڕۆن» ت بۆ بکەن؟ یەکەم جارم بوو ئەم وشەیەم دەبیست، دەرچوو بە تەعبیری توێکڵداری ئەدەبی کرمانجەتی، «سیپابەڕۆن» دەکاتەوە شلکێنە. (فەلاحی دەشتی کۆیێ پێیان دەڵێن کرمانج - بەزیاد بێ).

لەو یەک دوو ساڵەدا خەڵقێکی بە دەوری باوکمەوە کۆ دەبوونەوە چیهرەی نوێی تێدا دەردەکەوت. چەند فەلەستینییەک، حکوومەت بە نیازی ژیاندنیان، هەر یەکە بەپێی لێهاتوویی خۆی ئیشێکی لە کۆیێ پێ سپارد بوون. لەمانە «ابراهیم ابو لبن» مامۆستای سەرەتایی و عەلی لەبابیدی کە خوێندەواریی پێوە دیار نەبوو بەیەکەوە دەژیان. وەها ڕێککەوت دکتۆر «فائق نحاس»، خەڵقی شام، کە بە نامەی ڕاسپاردە لە دکتۆر سەبری قەببانییەوە بۆ باوکم، لەیەک ڕۆژەوە بوو بە دۆستمان، کرابۆوە دکتۆری کۆیێ. بە هۆی عەرەببوونییەوە کە لە کۆیێ هاوزمانی خۆی نادۆزێتەوە لەگەڵ ئەبو لەبەن و لەبابیدی خانوویەکیان بەیەکەوە گرت. دکتۆر فایق و ئەبوو لەبەن بە زۆری شەوان دەهاتنە لای باوکم، هەتا دیوەخانە بڵاوەی لێ دەکرد دەمانەوە. ناوناوە من و کاک مەجیدی ئامۆزام سەرمان لێ دەدان.

یەکێکی دیکەی فەلەستینی «احمد دباغ» مەیل و سەقافەت و ئاکاری لە ئەبوو لەبەن جودا بوو، مامۆستای سانەوی (یان ناوەندی) بوو، هەتا بڵێی لە چاو ئەو دەمە ڕۆشنبیر بوو. عەرەبیزانێکی ئەدیب، مەشرەبی خەراباتی، لەلایەن پارەوە بێباک، مەیلی بۆ چەپ بوو، چەندێکی بڵێی باوکمی خۆش دەویست و بە مەزنی دەزانی. هەر هەلی دەست بکەوتایە دەهاتە لای. بە زۆریش میرزای حاجی کەریم، کە کاتبی دادگا بوو لە کۆیێ، بە شارەزایی لەگەڵی دەهات. میرزا بۆی گێڕامەوە گوتی لە ئەحمەد دەبباغم پرسی مەلای گەورە چۆنە لەتەک «حاجی ئەمین حوسێنی»ی ئێوە؟ وەڵامێکی دابۆوە من ڕێ بە خۆ نادەم بیگێڕمەوە، لەگەڵ هەموو حورمەتم بۆ حاجی ئەمین.

کۆڵانەی کۆیێ تاریک و پێچەک، ئەحمەد دەبباغ نەشارەزا، هەر چاوساغێکی وەکوو میرزای دەویست! شەوێکیان کە لە میعاددا گەیشتە ماڵی ئێمە، ئەحمەد دەبباغ هەتا ئەژنۆی لە قوڕدا بوو تومەز لە کۆڵانەیێکی نزیک ماڵمان خێرەومەندێک قوڕی سواغی گرتبۆوە. ئەحمەدیش بە نەشارەزایی ملی لێ دەنێ میرزاش بە درەنگەوە

بۆی بە ئاگا هاتبوو، کار لە کار ترازا بوو. ساردبووبوو، سۆبە لە دیوەخانە هەڵرژابوو، بەو شەوە جارێ لە پێشەوە ئاوی گەرم ساز درا ئەحمەدمان بە جلکەوە لە ئەژنۆی بەرەو ژێر شووشت ئیتر هاتە ژووری دیوەخانە لە نزیک سۆبە دانیشت بۆ وشک بوونەوە، دەیگوت «هذا الابلیس نزلني بالطین» دەستیشی بۆ میرزا درێژ دەکرد بەڵام بێ گلەیی و قڵسبوون و بە باری نوکتەدا.

سەید ئەحمەد مستەفای کۆنە مامۆستای هەولێرم، ئەویش بووبووە مامۆستای سانەوی کۆیێ. سەید ئەحمەد ئەدیب و عەرەبی و تورکیی زان بوو. هەفتەی جارێک دووان، بە شەو، دەهاتە مەجلیسی باوکم. کە لەگەڵ ئەحمەد دەبباغدا بەیەکەوەبان باوکم پێی دەگوتن «الاحمدان». ئەحمەد دەبباغ لە ئاکامدا خۆی خەسار کرد، مەشرەبە خەراباتییەکەی لێی بوو بە تێکدەری شیرازەی ڕەفتار. بەداخەوە، پاش دوور بوونەوەی لە کۆیێ وردەوردە بەرەو شێواوییەوە چوو، لەوەشدا عەرەق دەوری هەبوو.

یەکەم جار باسی «اشتراکیة»م بە ڕوونی لەو بیست. لە قساندا وەزعی کامل چادرچی گێڕایەوە بۆم کە دۆستی بوو. لە بارەیەوە گوتی «عنده تفکیر اشتراکي». ئەحمەد خۆی لە باوەڕدا بەولای ئیشتراکیەتەوە ڕۆیشتبوو، تا ئەوەی بێپەروا باسی دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ کچە جوولەکەیێکی شیووعیی فەلەستینیدا دەگێڕایەوە، بەڵام باوەڕ ناکەم ئەندامەتیی هیچ حیزبێکی پێ هەڵگیرابێ ئەویش لەبەر تەبیاتە خەراباتییەکەی.

ئەحمەد بە هەموو سەقافەتی هەمەبابەتییەوە لە پەراوێزی ژیاندا دەژیا. ئارداوێژی ئەو کابرایە لە خوێندنەوەی شیعردا بەلای سیحر و تەڵەسمدا دەچۆوە. شەوێکیان لای باوکم ئەو مەرسیەی لەبەر خوێندەوە کە «الاخطل الصغیر» لە مەرگی ئەحمەد شەوقی هەڵبەستبوو، بەڵام چ خوێندنەوەیەک!! خۆی لە دەمی خوێندنەوەدا کەوتە بارێک دەتگوت عابیدە لە پەرستگەدا غەیبپەرستی دەکات، شیعریش چ شیعر!!

قف في ربى الخلد واهتف باسم شاعره<br>
فسدرة المنتهى ادنى منابره

وامسح جبينک بالرکن الذي انبلجت
اشعة الوحي شعرا من منائره

اتراب مريم تلهو في مقاصره
ورهط جبريل يحبو في مقاصره

والحور قصت شذورا من غدائرها
وارسلتها بديلا من ستائره

والملهمون بنو هومير ماترکوا
لما اهل لهم سجعا لطائره

ئەم پێنج بەیتەی سەرەتای قەسیدەکەم لەو شەوە هاتە بەر، تاکە و تەرای بەیتی دیکەشم بە نارێکی لە بیر ماون. هەتا لە خوێندنەوەی هەموو قەسیدەکەی بۆوە ورتە لە کەسەوە نەهات، دەنگی ئەو گرپەی سۆپە و هاشەی سەماوەر دەبیسترا و بەس. زوربەی خەڵقەکەی لە دیوەخانە دانیشتبوون لە عەرەبییەکە نەدەگەیشتن بەڵام دیمەن و ڕاوێژی ئەحمەد دەبباغ، کە چووبووە حاڵەتی خۆ ون کردن، هەستی داگیر کردوون کە جووڵە نەکەن.

ئەحمەد و ئەبوو لەبەن دانوویان بەیەکەوە نەدەکوڵا. ئیبراهیم خۆی بە شۆڕشگێڕێکی عەرەبی موسڵمان دەزانی، بەلای ئەوەوە کەمتەرخەمیی ئەحمەد دەبباغ لە ئاست ڕەگەزپەرستی و جەزبەی دینی و جۆری ڕەفتار دەچوە پلەی خیانەتەوە، ئەحمەدیش دەیگوت: «ابو لبن عایش بمستوی قمامات الشرق وانا اعیش حضارة اوروبا في القرن العشرین». هەر دوویان خۆ پارێزییان دەکرد لەوەی بەیەکەوە کۆببنەوە لە ماڵی ئێمە. بەهەمەحاڵ من دۆستایەتیم بە هەردوو لاوە زۆر بەتین بوو.

دکتۆر فایق دەتگوت لە ئاوریشم و قەیماغ دروست کراوە، کەم ئەورووپایی وەها ناسک و تەنکم دیتوە. کەچی کە دەچووینە دەشتودەر وەکوو لادێیی ڕایدەبوارد. جارێکیان لەگەڵ کاک مەجید بە پێیان هاتە چنارۆک. لە هەورازی سەرەژووری شاخ بەو گەرمایەی پاش عەسر نزیک بوو بخنکێ. کاک مەجید دەیگوت تەمای لە

خۆی نابوو بەڵام خواوتاڵع یەک دوو کەسی خۆمان لە چنارۆکەوە بەرەو کۆیێ پێیان دەگەن، ئاوی سارديان پێ دەبێ، دکتۆر فایق بەو ئاوە هاتبۆوە سەرەخۆ. کە گەیشتە لای ئێمە هەتا بلێی ژاکابوو. ئەو شەوە خەوێکی لێ کەوت هەتا سبەینە چرچەی نەکرد.

ئەبوو لەبەن خۆرەیەکی سەیر بوو، سبەینان دە کەبابی ئەوسای دەخوارد، دەشی گوت ئەگەر ترسی پارەم نەبێ پەنجا کەباب دەخۆم. بەڵام چ ئەو و چ دکتۆر فایق و «لەبابیدی»یش بە هەموو خواردنێک ڕازی بوون. ڕەشەشێوێکی کە لە هاتنی بێوەختیان لە پێشیان داندرابایە و ئێمەی پێوە شەرمەزار دەبووین سەد شوکرانەی پڕ بە دڵیان لەسەر دەکێشا. ماڵی ئێمە لە سەردەمی باوک و باپیریشمەوە هەر نیوەڕۆیان خەفتیانی جەمی سەرەکیی دەکرا، ئێواران ئەگەر مێوان نەبایە، عادەتی بەسەر دەبرا. لە هەرای ڕەشید عالی چی قەومی فەلەستینی هەبوو بەرەو بەغدا بوونەوە، ئیتر نەمان دیتنەوە.

دوای پازدە ساڵێک کە دۆستایەتیم بە بەشێک لە سیاسییەکانی بەغداوە پەیدا بوو وەها ڕێککەوت لە سەردانێکی کامل چادرچی ئافرەتێکی عەبا بەسەری شەرم بە خۆ، بە دەم فرمێسکەوە، شکاتی حاڵی خۆی دەکرد. کامل بەگ گوتی: «ئەمە ژنی ئەحمەد دەبباغە دەردی خۆی هەڵدەڕێژێ، بەڵام ئەحمەد شێت بووە کەڵکی دواندنی ژیرانەی پێوە نەماوە». یەک جار ئەحمەدم دیتەوە لە بەغدا، لە دووکانێکی «شارع الرشيد» دانیشتبوو بێباک و بێخەفەت چاوەکانی دەبریسکانەوە، لەو پازدە ساڵەدا هیچ نەگۆڕابوو، ئەو منی نەدیت خۆشم لێ ئاشکرا نەکرد. زۆری نەبرد بیستم خۆی کوشتووە، حەیفە پشکۆی وەها گەرم و گەش بە ئاوپڕژێنێکی نەفسی کەفدەرکدوو ببێتە خەڵووز، سەد حەیف.

لە 1939-1940 ئینحیساری تووتن بوو بە قانوون. تا ڕادەییک تەئسیری چاکی بوو بۆ زوربەی ئەوانەی تووتنیان مەعدەن نەبوو. ئەم ئینحیسارە لە هەوەڵ ساڵیدا هەلێکی بۆ من دروست کرد پێوەندی بە داهات و پارەوە نەبوو. یەکەم ساڵ ڕانیە ئیحیساری نەبوو تووتنی ئەوێ لە کۆیێ فەحس دەکرا. خاڵەکانم، شێخ خدر و شێخ جنێد و شێخ حسێنی حاجی سەید کە هەر دەکاتەوە خاڵ (ئامۆزای دایکم بوو) تووتنیان هێنایە کۆیێ. تووتنی شێخ حسێن زۆر بوو، هەتا لە هەموو سەروبەرێکی بۆوە دوو سەفەری بۆ کرد. وەهای پێشنیاز کرد سەردانێکی شێخ حەسەن (برا

گەورەی خۆی) و پژدەر بکەم. زۆرم لێ خۆش هات، ئیزنی بۆ خواستم لە بابم، کە مەشغەڵەتی برا، بەرەو پژدەر ڕۆیشتین. یەک کەسی خۆمانم لەگەڵدا بوو، حەسەنی قەرەنی کانیکەندی سەربە چناروک، چونکە شێخ حسێن سواری چەکداری زۆر لەگەڵدا بوون. لە بیرم نەماوە نیوەڕۆژەمان لە کوێ کرد، هەر ئەوە دەزانم دەمەو ئێواران گەیشتینە سندۆڵان. ئەو دیمەنانەی کە لە هاوینی 1927 ەوە وێنەیان لە مێشکمدا چەسپ بووبوو هاتنەوە بەر چاوی تەمەنی بیستویەک ساڵەییم. وێنە و واقیع نەدەچوونەوە سەر یەک، نەک چونکە هەر واقیعی ئەو ڕۆژە زستان بوو لەگەڵ دیمەنی هاوینی بەر لە دوازدە ساڵ جودا بوو بەڵکوو ئەندازەی دووری و نزیکی و پێشی و پاشی ڕووبار و ئاوایی و شاخەکانیش یەک پێوانە بوو. ناچار وێنەی کۆن جێی بۆ واقیعی ڕەق و زەق چۆڵ دەکرد.

ئەو ڕۆژە کە بە ڕێوە بووین قەیاغی دەربەندی سەنگەسەر،21 کە پێشی دەڵێن دەربەندی ڕەمکان، نەدەگەڕا ئەگەر گەڕابایە پێی دەپەڕینەوە بۆ بەری ئاسۆس و سەرسییان، لەوێوە بە دیوی ڕۆژهەڵاتی چیای ئاسۆسدا دم زێ و دم زێ، نزیکی سەعات و نیو ڕێگە دەڕۆییشتین تا قەیاغی سندۆڵان کە دەبوو سەرلەنوێ پێی بپەڕینەوە بۆ بەری ڕۆژهەڵات کە سندۆڵان خۆی لێی بوو. یەکەم ڕووباری مەترسی و بەسام ڕووباری «گارفێن»-ی پێ دەڵێن، چەند سەد مەترێک بەولای زارکی دەربەندەوەیە. پێشتر ڕووبارێکی نابەردەوام هەیە «سپیچار»-ی پێ دەڵین، کە دنیا لە بارانان ئاوس دەبێ، هەر بارانێکی بباریێ ئاوی سپیچار بە عەنتیکەیی زیاد دەکات هەندێکی لەبەر ڕێگای ناو زارکی دەربەند وەکوو بێخاڵ لە شکڵی کەفی شیر

---

21- ئەم دەربەندە وەهای کردووە بە دیوی لای ڕۆژهەڵاتی بگوترێ: پژدەر «پشت دەر - پشدەر - پژدەر» دیوی ڕانیەش «بەردەر». لە کتێبی «صبح الأعشى» ی قەلقەشەندی بەر لە 500 ساڵێک پێگوتراوە دەربەندی «قرایر». وشەی «قەرایر - قرایر» لە سەرچاوەی مێژوویی ناوی هەیە بەڵام دەقەکەی نەختێک جودایە وەهام لە بیرە وشەکە شتێکی وەک «کوریرا» بێت. لە بارێکدا نیم دەستم بەو سەرچاوانە ڕابگات. تەقڵ و شەقڵی ڕۆژگار ڕێی پێ نەدام کتێبخانەی ڕێک یان نارێکم هەبێت. لەم ڕۆژانە پێی دەڵێن «دەربەندی ڕەمکان» چونکە بە دیوی ڕانیەدا تیرەی «ڕەمک» جیرانی دەربەندەکەیە.

هەڵدەڕژێ. تومەز دەشتی وڵاتی مەندەمەرە یەک تۆزاڵی خۆڵ بەسەریەوە ئەویش خۆڵی کۆنە گۆمی ئەو دەمانەی زێی گچکە جارێ زارکی دەربەندی نزم نەکردبوو هەموو پژدەر ژێر ئاو بووە، لە بن تۆزاڵە خۆڵەکەوە سەرلەبەری دەشتەکە چەوە، هەر بارانێکی دەبارێ بە خڕی دایدەدا بۆ ناو ئەو چەوەی سەرپۆش خاکی، ئیتر بە سافی و ڕوونی هەموو ئاوەکە لە چەند ڕۆژێکدا بەو «سپیچار»ەدا دەچێتەوە ناو زێی گچکە. شیوی سپیچار بووە بە «مبزل» ی بێلزووم و ناپەسەند چونکە نەمانەوەی ئاوەکە لە ناو خاکدا وەهای کردووە هەموو دەشتی مەندەمەرە لە کانییێک لەولاوەی لێ نەبێ.

من مەلەوان نیم، سەریشم دەسووڕێ لە ناو ئاو. کە گەیشتینە گارڤێن شێخ حسێن وڵاغێکی مەحکەمی دیاری کرد بۆ پەڕینەوەم، گوتیشی: چاوان لە چووق بنێ و جڵەو بۆ وڵاغەکە شۆڕبکەوە و لێی گەڕێ، ئێمەش بە دەورتەوە دەبین. لە ئاوی ژاراوەش هەر وەهامان کرد. هەرچی چۆمی سوڵتانە دێیە بەرتەسکە. سندۆڵان بە هاتوبات و مێوان و جمووموۆڵ و گەلان گەدان بوو. پتر لە دەساڵ بوو شێخ حەسەنم نەدیتبوو، زۆری بەخێر هێنام و کۆڵێک پێکدی گەشاینەوە. لەو ساڵەدا شێخ حەسەن تەنسازیی لە سالان باشتر بوو. زستانان جلکێکی زۆری لەبەر دەکرد و بە دانسقە دەرکەی دەکرایەوە و بە کێشانە و پێوانە داری سووتەمەنی بۆ سۆپەی ژوورەکەی ورد دەکرا. نەدەبوو چوار کەس بە دوا یەکدیدا لە زستان بچنە ژوورەکەی نەکا دەرگاکەی لە پێویست بەولاوە بە کراوەیی بمێنێتەوە. ئەو ساڵە جلوبەرگی عادەتی بوو، بێپەروا لە ڕۆژی سارد و بارانە هاتوچۆی وەتاغی دەکرد. بەیەکەوە سەردانی قەڵادزەمان کرد کە ئەمە لە ڕابوردوودا بە هەموو مەزهەبان فەلاکەت و تەهلوکە بوو بۆی.

یاعیففەت-ی خوشکم لەو سالانەدا سەردانی دەکردین. کچێکی هەبوو فاتم ناو بەو منداڵییەی هێندە بەڕێز و ئاقڵ بوو سنووری نەبێ. هەرچەند لە پژدەر دەژیا بەڵام پێیەوە دیار بوو کە حەز بە کۆیێ دەکات. مانگێکی تەواو لە سندۆڵان و پژدەر مامەوە. بەڕاستی باری ڕابواردن و سەردانی دۆستان و بەخێرهێنانیان و وەزعی کۆمەڵایەتی میراودەلییان بە سیفەتی قسەزانی و نوکتەسازی و مێواننەوازییەوە بۆ ئەو دەمە بەهەشتێک بوو بۆ خۆی، بەتایبەتی بۆ مێوانێکی وەکوو منی بێ خەم و خەیاڵ. لەو مانگەدا یەک دەقیقە وەڕزیم هەست نەکرد.

ئەم سەفەرەیان بەڵەدی کەبابی پژدەر بووم، کە دەهێنن مریشک یان عەلیشیشی قەڵەوی پارچەکراو بەسەر پۆلووە ئاگرەوە دەبرژێنن و قەدقەد نان بەو ڕۆناوەی لە بەزەکەیەوە دەزێتەوە چەور دەکەن و دەبێتە «نانەچەورە» ئیتر بە پیاز و ترشی و شیناورد و ماستاو دەیکەن بە جەمی نیوەڕۆژە. نانەچەورە لە گۆشتەکە بەلەزەتترە هەرچەند گۆشتەکە خۆی، ئەگەر پی نەبێ، چ قسوورییەکی نییە. هاتوبات و خەریک بوون و چزە و بزە و چاوەنۆڕیش لەوێ ڕاوەستێ. وشەی کەباب لە بنەڕەتدا بە «برژاو» دەگوترێ چ گۆشتی مەل چ هی چوار پێ. ئەوەی لە شار پێی دەڵێن کەباب لە پژدەر کەبابی کوت و لە میسر کفتەیە. یەک دوو جار سەری قەڵادزەمان دەدا، بە وڵاغ سی چل دەقیقە ڕێ دەبێ. ئەو ساڵە خانەخوێ غەفوور ناوێک بوو لە بنەماڵەی قەڵادزە بوو.

هەر لەو سەفەرەشدا بۆ یەکەم جار، شێخ موحیەددینی شێخ ئەمین، کوڕەمامی دایکم و براکانی و شێخ حەسەن و شێخ حسێن، بە دیتن دیتم. بەشێکی سندۆڵان هی ئەو بوو، وەتاغی بە مێوان و ئەسبابی هەبوو. چەند جاران ئەو لای ئێمە و ئێمە لای ئەوان بەیەکەوە نانمان خوارد. شێخ موحیەددین مەشوورە بە گوڵەدین لەتەبیاتدا چووبۆوە سەر تەبیاتی شێخ ئەمینی باوکی کە هەم خاوەن مرید و هەم دنیادۆستیش بوو. شێخ حەسەن و شێخ حسێن خوارزای تایەفەی محەمەداغا و گوڵەدین خوارزای تایەفەی سەلیماغا بوون. هەر تایەفەیە بە خۆیان و ئەوەی دۆستیانن لە خوارزای خۆیان مێوان دەبوون. لە ساڵانی دواتردا دۆستایەتیم بە گۆڵەدینەوە گەلێک بەرەژوور چوو، تا ئەوەی دەستە نوێنی تایبەتییان بۆم لە چەرچەفدا هەڵدەگرت تا لایان دادەبەزیم.

داب و دەستووری عەشیرەتی لە نێو پژدەریان بە تەواوی ڕەچاو دەکرا، ئەوسا نیوەڕۆژەی وەتاغ (دیوەخانە) بێ پڵاو بەڕێ دەکرا. شەوێ هەتا نزیک نوێژی خەفتنان نانیان دەوەخراند نەکا مێوان هەبێ بە ڕێگاوە. نانی شەو بە عادەت بریتی بوو لە پڵاوبزنج و گۆشت و یەک جۆرە ترشی (مەرەگە). مریشک دەکرا بە دوو بەشەوە، هەر کەرتە لەسەر دەورییە چێشتێک دەبوو، هەر سینییەش بۆ دوو کەس، ئەگەر سێ کەس بانایە، دەکرا بە دوو سینی. نان لە ژێر دەورییە چێشت و قاپی مەرەگە، بە پانایی سینی، ڕادەیەخسترا کەسیش لێی نەدەخوارد، دواتر دەبوو بە خۆراکی سەگ و تاژی و توولە. ئەو عەشرەتانەی من دیتمن نانیان بە چێشتی پڵاو

نەدەخوارد، مەگەر بە ڕەشەشێو، یان ماست و پەنیر و هێلکەوڕۆن. بۆ من نانی جودایان لەسەر سینی دادەنا. لزوومیش نەبوو قاپی بەتاڵ هەبێ چونکە پلاوەکە لە دەمی خواردن دەخرایە سەر نانەکە. لە کژی کە شیر زۆر دەبوو مەحەلەبی بەگەڵ خواردنەکە دەدرا. هەتا پارەی تووتن زیادی کرد لە گۆشت و پاقلاوە و برمەیان زیاد کرد. لە زووەوە پێم گوتن لزووم بە لێ زیاد کردن نییە، چی لە قەدیمەوە داب بووە لە پلاو و گۆشت و مەرگە بەسە، فایدەی نەبوو، کە تووتن دابەزی بەو زیادە مەسرەفەوە سەغڵەت بوون.

گەشتێکی چوار ڕۆژیمان کرد. لە پێشەوە چوینە سەردانی مەحموداغای حاجیاغا. ماڵی لە هێرۆ لە مەیلەو دامەنی شاخە بەرزەکانی سەر سنووری نێوان عێراق و ئێران بوو. بەپێی لێکدانەوەی سەرنج گرتوانەم وا دەزانم خانووەکانی سەرووی دێ دەوری 1200 مەتر لە ڕووی دەریاوە بەرزن، بگرە نەختێکیش زیاتر، ئێمە لە ڕێگەیەکەوە بۆی چووین پێیان دەگوت ڕێی سەروو، تەنکە بەفری بەسەرەوە بوو. بایەکی کزی ساردی دەهات پێی دەڵێن «زاویتە». کە لەسەر کانیاوێک دابەزین بۆ نوێژی عەسر حەسەنی قەرەنی گوتی: «بەوی خوایەی ئەوی نوێژەی بمباتە بەهەشتی نایکەم، خۆ ڕەق بوومەوە». بایەکە وەک تیغ پێستی دەبڕی.

شێخ حسێن و حەسەن و من لەو ڕێگاوە چووین، پاش عەسر گەیشتینە قۆناغ. مەلایەکی موحتەرەمی لێ بوو لە موجازەکانی باوکم. دوو شەوان ماینەوە، سبەینە و نیوەڕۆ و ئێوارە، مەحمووداغا، لە پلاو و گۆشت و کەچکەک و کفتە و پەقلاوە و مێوەی وشکی نایابی گرتین. خزمەتەکە لەحەدبەدەر بوو. مەحمووداغا حەزی دەکرد مێوانی بم، هەرچەند لە عومردا تەفاوت هەبوو بەڵام هەتا بڵێی وتوویژمان خۆش بوو. هەر لە بیرمە باسی ئەستێرەڕژان هات، وەها چۆبووە دڵانەوە کە ئەستێرەی ڕاستەقینەن ڕادەخزن و دەسووتێن. گوتم ئەگەر ئەستێرە بانایە دەمێک بوو دانەیان نەدەما، ملیۆنەها ساڵە ئەستێرە دەرژێن. مەحمووداغا گوتی: خوا هی نوێیان لە جێگەدا دادەنێ، ئەوە نییە ئەم ساڵە ئەستێرەیەکی تازە پەیدا بووە؟ تێم گەیاند ئەمەیان ئەستێرەی مەریخە لە یازدە – دوازدە ساڵاندا جارێک لە ئەرز نزیک دەبێتەوە و وەها گەش خۆ دەنوێنێ. نەختێک بە درێژایی باسی فەلەکایەتی ئەوسام بۆ کرد. بەشێکی زانینەکەشم لەو کتێبە ئینگلیزیەی کە لە 1937 دوای دەرچوونم لە ئیمتیحانی پۆلی سێیەمی ناوەندی مەعهەدی بەریتانی بە دیاری بۆی ناردبووم، ئا

لەو کتێبەوەم وەرگرتبوو کە لە فەلەکیات دەدوا بە سەرە ناوی *Through Space and Time*. مەحموداغا زوو قسەی وەردەگرت، مێشکی کرایەوە بوو. (بەڕێکەوت ئەستێرەی مەریخ ئەم ساڵەش 1986 لێمان نزیکە، پاش ئەوسا تا ئێستا چوار جاران جیرانەتیی کردووین).

شەوی سێیەم هاتینە گردەسپیان بۆ سەردانی بابەکراغای سەلیماغا. لە هاتنەوەدا هەمووماں کە دە سوارێک دەبووین، بە ڕێگاکەی سەرەوەدا هاتین. من سواری یەختەی شێخ حەسەن بووم. ئەو یەختەیە بەستەزمانێک بوو چ بە شکڵ چ بە ڕەفتار چ بەکردار سونعێکی خودایی بوو. لە سەرەونشێوی ڕک هەستت نەدەکرد بە لێژایی، بەسەر پشتیەوە دەتگوت لەسەر قەنەپە دانیشتوویت. چی ویستبات ئەوەی دەکرد. ترسی لە هیچ شتێک نەبوو، هەر لە ئاگر هەتا ئاو هەڵدێر هەتا دڕندە، ڕەوێنەوە و سڵ کردن هەر هیچ. خۆشڕۆیێک بوو هیچ وەڵاغێک تۆزێ نەدەشکاند. لە نزیک ئاواییان لەنجەولارێکی دەکرد دەتگوت بە تەعلیم دان فێرکراوە. کە لە دێیێک نزیک بایتەوە و ڕووی تێکردبا بە یەک بادانی لغاوەکەی دەکەوتەوە سەر ڕێی مەبەست و ڕووی لە ئاوایی نەدەکردەوە. سەیر کردنی شان و کەوانەی ملی و گوێیە مامزییەکانی و نیونیگای بەملا و بەولادا لە سەر پشتییەوە، هێندەی تێوەڕامانی هەر شتێکی جوان دڵدەرەوە بوو. کوێتێکی کەڵەگەتی شیرنی ئەوتۆ بوو لە نرخ نەدەهات، لە پژدەر مەشوور بوو کە کاری جێبێکی ئەوسای دەکرد.

بەینی عەسر و ئێوارە گەیشتینە لای بابەکراغا کە براگەورەی کەرتێکی سەرلەبەری پژدەر بوو. بابەکراغا پیاوێکی مەزنەپیاو بوو، کەموزۆر شوێنقامکی لەگەلێک سەروبەری کوردستانی عێراق و ئێران هەبوو. لە ناسراوە بایەخ پێدراو و قسە بیستراوەکانی عێراق بوو. دیوەخانەکەی هەمیشەکات، وەک ئەو ئێوارەیە قەڵەباڵغ بوو، مێوانی بە وێڵ و تەرتیب و قسەخۆشی زۆری لێ بوو. قسە بە هەموو لادا شریتەی دەهاویشت هەتا گەیشتە ئەوەی بابەکراغا گوتی: پرسیارێکت لێ دەکەم لە زۆر کەسانم کردووە ئیقناعیان نەکردووم، مەلا دەفەرموون خوا جوزئی ئیختیاری بە بەنیادەم داوە چاکە و خراپەی پێ لێک دەکاتەوە و لەسەری دەڕوات، بە چاک بێ یان بە خراپ بەپێی ئارەزۆی، لە لایەکی دی دەڵێن جوزء تابیعی کوللە، کە ئیختیاریش جوزء بێ بۆچی کوللەکەی تابیع بێ کە بەنیادەمەکەیە. نازانم ئەوان قسان چۆن دەچنەوە سەر یەک. گوتم ئاغا مەسەلەی جوزئی ئیختیار بە تەواوی

وەکوو مەسەلەی سوکانی پاپۆرە، سوکانەکە هێندەی گولمێکە کەچی پاپۆڕێکی هێندەی کەرتەچیایەکی بێرە و بەوێدا دێنێت و دەبات. بابەکراغا قسەکەمی وەها بە دڵدا چوو پێوەی گەشایەوە. دواتر بیستمەوە لە چەندین جێگا باسی ئەو پرسیار و وەڵامەی وەها کردبوو پڕ بێ لە مەحەببەت و ڕا لێ بوون. پرسیاری دووەمی بابەکراغا ئەوە بوو گوتی: نازانم بۆچی ئەهلی مەکتەب بە زۆری پشت لە دین دەبن؟ ئێستا من زارم هەڵنەهێنابوو، خۆی وەرامی دایەوە و گوتی: وابزانم هێندە بایەخ بە تەبیعەت و تەئسیرەکەی دەدەن لای عەقیدەیان بە خوا زەعیف دەبێ... منیش پڕ بە دڵ بە دەم تەسدیقی ڕایەکەیم کرد. ئەو شەوە نوێنی کە بۆیان هێناین، بەتایبەتی ئەوەی بەر من کەوت لە هەرە نایابەکان بوو. شێخ حسێن گوتی ئەو نوێنە زێدە دەگمەن نەبێ دەرناکەوێ.

بابەکراغا دوو سەگی زێدە عەجایەبی هەبوو، یەکیان زلەیەکی کەللە شێرانە بوو هێندەی جاشەکەرێک. ئەوی دیکە جارێ نەڕسکابوو بەڵام دەتزانی دوارۆژێکی گەشی هەیە. مووی ڕەشی بریقەدار بوو، شکڵیشی لە سەگی بێگانەی دەکرد. بابەکراغا تەقیەی لێ نەدەکردن بە پێیەوە بەسەر پاشوانەوە ڕادەوەستان و دەستیان دەخستە سەر شانی. ئاغاییێک گوتی: بابەکراغا ئەو سەیانە غەدرێ لە جلک و بەرگت دەکەن، ئەویش بە زەردەیەکەوە وەڵامەکی عادەتی دایەوە لە بیرم نەماوە چی گوت.

بۆ سبەی ئێوارێ چووینە «چۆم خرکە» بە نیازی سەردانی عەباسی مەحموداغا. خۆی لە ماڵ نەبوو ئەحمەدەفەندی، مەشوور بە ئەحمەد تەقی کە وەکیلی هەمیشەیی عەباساغا بوو، ئەو شەوە بەخێری هێناین. مەجلیسی ئەحمەد تەقی خۆش بوو، شارستانەتی و عەشایرگەریی پێوە دیار بوو، تا درەنگ بە وتووێژی هەمەچەشنە بردمانە سەر. سبەینێ دوای نیوەڕۆ بەڕێ کەوتین چەند بەچکەئاغاییێکی پژدەریمان لەگەڵدا بوون بەتەمابووین شەو لامان بن لە سندۆڵان چونکە ماڵیان لەوەبەری زێ بە بناری شاخی کوڕکوڕی مەرگەوە زۆر دوور بوو. لە دووریێیانێک دۆعاخوازییان کرد، چەندی کردمان پەشیمان نەبوونەوە. لە سندۆڵان دیتمان زێ ئەوەندە هاتووە ئەوە نییە قەیاغی لێ بگەڕێ، گوتمان هەر ئەوەندە بزانە ئەو گەنجانە هاتنەوە چونکە دەزانن قەیاغی فڵانە دێ ناگەڕێ چۆمیش لەوانە نییە

کەس خۆی لێ بدات. کەچی هەر نەهاتن. پاشتر دیتماننەوە گوتیان بەڕاستی شەرممان کرد پاشگەز ببینەوە، بەتەمای خوا ملمان لە چۆمی نا.

ئەمە دەگێڕمەوە لە نموونەی دەماری بەخۆنازین کە لە باری عەشرەتگەریدا بە نەترساوی و بێباکی خۆی دەنوێنێ. شارستانی لە خەسڵەتی ئەوتۆیی ڕانایەن، لێشیان بە عەیب ناگیرێ لە ئاو و ئاگر و ورچ و هەڵدێر بترسێن. ڕۆحی عەشیرەتگەریی ئەوتۆیی ئەگەر نەختێکی بەزەیی شۆڤالیزمی لەگەڵدا بێ هەر خۆیەتی بەکەڵکی نیشتیمانپەرستی و کۆمەڵپەرستی دێت.

لەو سەفەرەدا یەکەم جار ڕادیۆی قاهیرە گۆرانیی «کرنک» ی عەبدولوەهابی بڵاو کردەوە، بە مەدحێکی زۆرەوە پێشکەشی کرد. ئەوەندەم لەزەت لێ برد باس ناکرێ. خوێنەر بە وردی گوێ بگرێ لە کۆپلەی:

این یا اطلال جند الغالب
این امون وصوت الراهب

وێرانی «اطلال»ی هەموو دنیای تێدایە، مۆسیقاکەشی شیوەنێک دەگێڕێ بە بەرینایی مێژوو. لەو تەرزە شوێنەدا دەنگی عەبدولوەهاب لە دەنگ دەردەچێ دەبێتە موچڕک و لەرز و سۆز. چل و شەش ساڵ بەسەر کەرنەکدا تێپەڕی جارێ بە مەیدان لە پێش گۆرانییەکانی ئەم سەردەمەیە.

لەو سەفەرەدا کژێکی باران چەند شەووڕۆژی بێوچانی خایاند. چۆم (بە زێ و ڕووباری گەورە دەڵێن چۆم) وردەوردە زیادی کرد. زۆرایی ئاوی دیوی ئێران پاش بڕانەوەی باران گەیشتە لای ئێمە. ئاو هەڵستا تا ئەوەی تێڵی قەیاخی دەدا و شەپۆلی ڕەهەوا دەخست دەتگوت کۆمەڵە دێو بە قەدەداری بنەگوێز لەو ئاوە ڕادەکێشن. کە ئەو سیمە بە زەبری ئاوەکە بەرز دەبۆوە و لە هاتنەوە خواردا لە ئاوەکەی ڕادەکێشا شڵپەی دەنگی دەدایەوە لە شاخ. سندۆڵان خەریک بوو ببێتە جەزیرە. ڕاستییەکەی ئەگەر ڕۆژەکەی پاش بارانە وەها ڕوون و بێهەور نەبایە ترسمان ڕێ دەنیشت لەوەی باران لە ئاوەکە وەها زیاد بکات لە لای نزمایی «پاشکەڵک»ـەوە لەو شوێنەی ڕێی قەڵادزەی لێ نشێو دەبێتەوە بۆ ڕەنی پاشکەڵەک ئاو دامان ببڕێ لە وشکایی. لە دامەن سندۆڵانەوە بەرەو سەنگەسەرت دەڕوانی

هەرچی چەم و نغوردی ئەو مەرزایەیە هەبوو کە پێی دەگوترا «قەدەغە» ژێر ئاو بووبوو. ڕووبارەکانی کە لە زێیان دەکردەوە بەرەو دوا پاشاویان دابۆوە، خەڵک هەڵکشان بۆ بواری لێ پەڕینەوە لەو ڕووبارانە کە خەریکی نیشتنەوە بوون.

دەیانگێڕایەوە جارێکیان لە پژدەر دە ڕۆژی لەسەر یەکی بێوچان باریبوو، سندۆڵان تا سێ ڕۆژان بە جەزیرەیی مابۆوە. دایکم ئەو باسەی بە درێژی بۆ دەکردین کە لە سەردەمی باوکی، شێخ ڕەزادا، ئەو تۆفانە ڕووی دابوو. ئەو ئاوەی لە پاشکەڵەکەوە کەلەڕێژی کردبوو و سندۆڵانی دابڕیبوو لە وشکایی هێندە زۆر بووە لەو ماوەیەدا ڕێی نەداوە کەس بپەڕێتەوە. دەیگوت ئێمە لە جەزیرە و خەڵقیش لەوبەر ئاوەکەوە بۆمان دەگریان، لەبەر ئاسۆسیش خەڵقی گوندەکانی ئەوبەر دەهاتنە دیار سندۆڵان بەڵام بێدەسەڵاتانە. دانیشتوانی لای بەرایی دێ خانووەکانیان چۆڵ کردبوو کە بەشێکی ئاو بردنی. ئەم جارەیان خەتەر نەگەیشتە جاری پێشووتر، ڕەنگە داکەوتنی ماڵی زێ بە داخوران و داشۆرانی چل ساڵان دەخلێکی هەبێ لەوەی ڕێکاری ئاو نزمتر بێ، هەرچەند میقداری ئاویش لە یەکدی نزیک بێ.

باوکم دەیگێڕایەوە، ئەو بارانە لە کۆیێ نۆ ڕۆژ دەوامی کردبوو تا ئەوەی ئاوی ڕووباری کۆیە کە لە شیعری حاجی قادردا بە «شیوی ڕەزان» ناوی هاتووە (نموونەی جەننەتە شیوی ڕەزانی) لەگەڵ ئاوی ئەو دیوی قەبرستانی «دەروێش خدر» کە پێی دەڵێن «تالاوان»، لە ناو ڕەزەکان یەکدییان گرتبۆوە کە لە هیچ ڕاستە حیسابێکی باران و تۆف چاوەڕوان ناکرێت.

دوای مانگێک گەڕامەوە بۆ کۆیێ. دوو سێ ڕۆژان لای خاڵەکانم بووم لە سەیداوای تەنیشت ڕانیە. لەو سەفەرەدا نەختێک باری ناوەکیی پژدەر لە جاران باشتر تێگەیشتم. ڕەنگە سەرجەمی کاریگەرەکانی کە زەق خۆیان دەنواند لە شیرازەی کۆمەڵایەتیی پژدەر لەم چەند خاڵەدا جێیان بۆ بکرێتەوە:

1. خوردەمالیکی پژدەر کە خاوەنی زەوی و دارایی خۆیان بوون بێ ئەوەی ئاغاکان تەمایان لێ بکەن وەیا خەریکی پلان بن دەژیان. ئەمانە لە کۆنەوە «مەجلیسی ماقوولان» یان لێ پێک دەهات کە دەیانتوانی بڕیاری بنەڕەتی بدەن لە کاری گرنگی ناوچەکە تا ئەوەی ساڵێکیان لەو ساڵانەی جارێ کۆنیش نەبووە بڕیاریان دا بەرەبابێکی پژدەر نەفی بکەن بۆ بیتوێن

(عەولاغای پژدەری گوتی ئەم ڕووداوە بەر لە شەڕی یەکەم بوو، تایەفەکەش بەگزادە بوون، نەفی کران چوونە بیتوێن، دوو ساڵێکیان مانەوە هەتا حاجی ڕەسواغای مەحموداغا کە خوارزایان بوو کەفالەتی کردن لای ماقووڵان ئنجا هاتنەوە).

خوردەمالیک بێ هەرا و سەروسەدا سەنگی هەبوو لە قاڵەب گرتنی ڕەفتار و سیاسەتێکی براگەورە دەسەڵاتدارەکان لەسەری دەرۆیشتن بایی ئەوەی ڕوو لە خوردەمالیک بکات چونکە شێواندنی باری خوردەمالیک یەکسەر دەیکێشایەوە بۆ لەنگەر بەزینی حیسابی دەسەڵات و تایەفەگەریی میراودەلیان. خوردەمالیک خۆی دابایە لایەنی هەر دەسەڵاتێکی باری دەسەڵاتی دیکەی لەنگ دەکرد کە دەبوو ڕاڕەوێکی ئەوتۆ بگرێتە بەر بۆ ڕاست کردنەوەی لەنگەری بەرژەوەندی خۆی نازاندرێ سەر بە چییەوە دەنێ. جەلبی ڕەزامەندی خوردەمالیک و ڕاکێشانی بۆ جغزی دۆستایەتی بە کوتەک نەدەکرا و نەدەشیا، دەبوو بەپێی شێوازێک بێت کە لە ئۆینی دامە و شەترەنج بکات. خولاسە خوردەمالیک کاریگەرێکی سیاسەتی پژدەر بوو.

2. مسکێنەکان: ئەمانە ئەو فەلاح و زوراعانەن زەوی و موڵکیان نییە. بەپێی دەستووری قەراردادە لە دابەش کردنی ئەرک و داهات، موڵکی خاوەن زەوییان دەکێڵا کە بە زۆری هی ئاغاکانی میراودەلی و هەنێکی هی پیاوە ئایینی بوو وەهاش دەبوو هی خوردەمالیک. مسکێن سەنگی لە سیاسەتی پژدەردا نەبوو بەڵام ئەو زوڵمەشی لێ نەدەکرا کەوا لە حیکایەتان باس دەکرێ. لەلایەن پشکی داهاتەوە مسکێن ئەوەی لە ئاغا وەردەگرت کە لە خوردەمالیکیشی وەردەگرت. تا ڕادەیێک دەشێ دابەشبوونی دەسەڵات بەسەر بەرەبابەکاندا بووبێتە چەپارەدەری مسکێن چونکە ڕکابەری و کێبەرکێی تایەفەکان بۆرە دڵخوازێک بۆ بێدەسەڵات دروست دەکات بەوەدا کە دەتوانی نواگۆڕی بکات. شیناورد بە نیوەیی دابەش دەبوو لە نێوان مسکێن و زەویدار. خزمەتی زراعەتەکە لە ملی زوراع بوو، مەسرەف پەیدا کردن و قازانجی پارەی توجار لە مل خاوەن زەوی بوو. دەمدیت

بەشێکی زوراعان سەرەڕای پشکی خۆی چەند دینارێکی دەدرایێ بە ناوی «دەرماڵ» نەشم زانی دەرماڵ بۆچی بۆتە باو.

3. حکوومەت: لە 1937 ڕشتەی بنیاتی حکوومەت لەپژدەر دامەزرا. ئەمە هەر وەک دەسەڵاتێکی نوێی لەو هەرێمەدا دروست کرد، ئۆتۆمۆبیلیشی گەیاندە قەڵادزە (ڕانیەش). بەمەشدا پارەداری بازاڕ حورمەتێکی تازەی بە خۆیەوە دیت. کردنەوەی مەکتەب کە وردەوردە پەری پێ ستاندرا، ئەویش خۆی خستە حیسابانەوە. خۆم لە پیرۆتاغای حاجی ڕەسواغام بیست بە دڵ دەیگوت: مەمنوونم خزمەتی موەزەفەکە بکەم ئەمما مەکتەبلی دەبێ لە ئێستاوە دڵی ڕابگرم چونکە لێم دەبێتە موەزەف.

بەر لە حکوومەت بچێتە قەڵادزە دەسەڵاتداری پژدەر دەستی کراوەتر بوو. تایەفەکانی میراودەلی لە گەپی بەربەرەکانی یەکتردا پارسەنگێکی نوێڕەخساوی ئاینوئۆینی یەکدی تەنگاو کردنیان لە هێزی حکوومەتدا دۆزیەوە کەوا هەرچەند وەکوو مێش مەعیدەی تێک دەدا بەڵام کەسێکی ڕەزامەندیی بێدرۆی لێ وەرگرتبایە دەستە تەرازوەکەی لە حاڵوباری پژدەر قورستر هەڵدەستایەوە. حکوومەتیش بۆ سیاسەتی خۆی سوودی لە تایەفەگەری وەردەگرت، موەزەفەکەش بەرتیلێکی پێوە دەخوارد.

نیابەتی پژدەر یەک لەو عەیارانە بوو تا ڕادەیێک مەیلی حکوومەتی وەلای تایەفە ئاشکرا دەکرد. نائیب لە چ تایەفەیێک بووایە بەڵگە بوو بۆ قسەڕۆیشتنی ئەو تایەفە لای حکوومەت. دوازدەساڵێک دواتر جارێکیان بۆ تەرجەمەی قسان لەگەڵ «مەحموداغای حاجیاغا» و «شێخ حسێنی حاجی سەیدگوڵ»دا چووم بۆ مواجەهەی سەرەک وەزیران نووری پاشا. ئەو منی نەدەناسی منیش خۆم پێ نەناساند چونکە بێلزووم بوو. مەحمووداغا گلەیی دەربڕی لە فەرق و جودایی کە حکوومەت بە چاکەی بابەکراغای سەلیماغادا دەیکات. نووری سەعید لە چۆنیەتی فەرق و جوداییەکەی پرسی. لەو دەمانەدا جەمال بابان. وەزیر بوو، هاتە ژوورێ و ئەو بوو بە تەرجومان. ئەوسا جەمال بابانیش منی نەدەناسی. مەحمووداغا

لە جەوابدا گوتی: بۆ دەبێ نائیب لە پژدەر بە قسەی بابەکراغا نامزەد بکرێ؟ با حکوومەت لێ بگەڕێ ئەو خەڵقە هێزی خۆی تاقی بکاتەوە لە دەرچوواندنی نائیب، ئیتر کێ دەبێ بابێ. نووری سەعید ئەو دەمە جەوابی خۆشی دایەوە بە مەحمووداغا کە ئیتر لە هەڵبژاردنی داهاتوودا گلەیی نامێنێ.

وەها ڕێک کەوت ئەو هەڵبژاردنە منی لە کۆیێ تێدا بووم بە نائیب، لە پژدەر نائیب بە «قورعة» دەست نیشان کرا. ئەوانەی چاویان لێ بوو لە تایەفەکان ناویان نووسرا و خرانە توورەکەوە، کە ناو ڕاکێشرا عومەری خدری حاجیاغا، کە برازای مەحمووداغا بوو، ناوی دەرچوو. هەر دەڵێی بەڵێنەکەی نووری سەعید بەو شێوەیە هاتە دی لە نەهێشتنی هۆی گلەیی. ئەم «نائیبی بە تورەکە» بەینێک لە بژدەر بوو بە مەداری نوکتە، دەتدیت لە قساندا یەکێک دەیگوت، ڕقم هەڵستێنن ئەو جارەی خۆ دە توورەکێ داوێم.

4. تایەفە و بەرەبابەکانی میراودەلی: ئەمانە سەرجەمیان هەشت تایەفە بوون لە حەمەداغای باوکی مەحمووداغا دەگەنەوە یەک. لە هەموویان قسەڕۆیشتووتر تایەفەی سەلیماغا (باوکی بابەکراغا) و تایەفەی محەمەداغا بوون. سەلیماغا نەوەی حەمەداغایە باوکی زوو مردووە ئەو جێگای گرتۆتەوە و بە سەرۆکی تایەفە داندراوە. لە موناسەبەی ناوی سەلیماغا کورتە باسێکی خۆشکەڵە جێی دەبێتەوە، ئەویشم لە عەولاغای پژدەری وەرگرتووە خۆیشی لە حاجی ڕەسواغای بیستووە گوتبووی:

لە دەوری سەلیماغادا پیاوماقووڵی دێی «بێناسە» (نشیمەنی حاجی ڕەسواغا خۆی) فەقێ ئەحمەد ناوێک بووە لەقەبی «کدوولە ڕەق»ی پێوە بووە. ئەو فەقێ ئەحمەدە ویستوویەتی سەلیماغا لە براگەورەیی بیەخێت، تومەز ئەوسا براگەورەیی بە قسە و خواییشتی مەجلیسی پیاوماقووڵان بووە. ڕێکەوت وەها دەبێ شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەچێتە بێناسە، حاجی ڕەسواغا لە ماڵ نابێ، شێخ ڕەزا دەڵێ قەیدە نییە لە فەقێ ئەحمەد مێوان دەبم. وا

دیارە خزمەتێکی باشی لێ نابینێ. سبەینێ شێخ ڕەزا دەگەڕێتەوە بۆ قەڵادزە کاغەزێک بۆ سەلیماغا دەنووسێ:

ماقووڵی «بەهێ ناسە» لەقەب کوولەکەیی ڕەق
وا لازمە هەر لێی دەی و هەر بیدەیە بەر شەق

چۆن دەکرێ بە تۆ عەزل و نەصب مامە کدوولە
ناکەس بەچە بێشەرم و حەیا… ئەبڵەق

گەر طەبعی سەلیمت هەیە ئاغا تۆ سەلیمی
مێخێکی وەهای تێبرە هەر توند و نەبێ لەق

نیوەبەیتی یەکەم وشەی «کوولەکە ڕەق»ی تێدا هاتبوو، لەنگی کردبوو، دیارە شێخ ڕەزا شیعری لەنگ ناڵێ من «کوولەکەیی ڕەق»، کردە پارسەنگ. فەقێ ئەحمەد خەبەرەکەی دەگاتێ لەگەڵ حاجیاغا سۆراغی شێخ ڕەزا دەکات لە قەڵادزەی دەبینێتەوە، چەندی تەکلیفی لێ دەکا شیعرەکەی وەرگرێتەوە شێخ ڕەزا دەڵێ حیسابت دەرچوو تازە بووە تەئریخ.

براگەورەی تایەفەی مەحموداغا هەتا ساڵی 1946 عەباساغا بوو، لەو ساڵەدا مرد. حاجی ڕەسووڵاغا (غەیری حاجی ڕسواغای بێناسە) براگەورەی تەمەن بوو بەڵام هەر ڕیشسپیەتی دەکرد. دوای عەباساغا، بۆ ماوەیەکی کورت حەمەداغا کوڕی عەباساغا بوو بە براگەورە هەرچەند مەحموودی عەباساغا لەو گەورەتر بوو، بەهەرحاڵ زۆری نەبرد مەحموداغا حاجی ڕەسووڵاغا (حاجیاغا-یان پێ دەگوت) بووە بەرپرسی کاروباری تایەفەکە. بابەکراغا لەبەر تەمەنی و لەبەر کەسایەتی تا ڕادەیێک لەو سنوورەی زەرەر نەبەخشێ بە غەیر، بە براگەورە دەزاندرا.

مناسبی جێگەیە لێرەدا حیکایەتۆکەیەکی کورتیلەی خۆشمەزە ببێتە خەمرەوێنەوە و ڕوونکەرەوەی حاڵوباری ئەوسای پژدەریش: خدراغای

حاجی ڕەسووڵاغا تا بڵێی قسەخۆش و بەتام بوو هەرچەندە لە خۆیشی حاڵی نەبوو، بابەکراغا خەزووری بوو بێ ئەوەی پێوەندییەکەیان تەئسیری هەبێ لە مەسەلەی تایەفەگەری. ڕۆژێکیان خدراغا سەردانی بابەکراغا دەکا لە دێیەکەی گردەسپیان. خدراغا لە حکوومەت دەبزڕکێنێ و ناڕەزایی لە وەزع و حاڵی پژدەر دەردەبڕێ. بابەکراغا دەڵێ: خدر دادەی هەندێکم لەو قسانە بۆ بکە خەریکە دڵم دەتۆقێ. خدراغا پێی دەڵێتەوە: دەترسێم سبەینێ هەموو قسەکانم لە کۆشی قایمقام بکەی. بابەکراغا دەڵێ: توخوا خدر ئەمنت هێندە پێ بێناموسە؟ خدراغا بە ڕاشکاوی دەڵێ: بابەکراغا، ئەتۆ بە تەنیا لە پژدەرێدا ناموست بۆ چییە؟. هەزار ڕەحمەتیان لێ بێ...

ئەم دوو تایەفەی هەمیشە خەریک بوون گرەو لە یەکدی ببەنەوە، زۆر جاران ئاغای خوێڕیلە لەو بەینەدا سوودی دەدیت و بە ڕەغبەت دەکەوتەوە. ئەم تایەفەگەرییە و خۆ خەریک کردن بە خۆ تەیار کردن و ناحەز ڕووتاندنەوە و حکوومەت بۆ خۆ ڕاکێشان و دۆست پەیدا کردن، وێڕای ڕاگرتنی سیاسەتی هەموو پژدەر لە ئاست جیرانەکانی کە هەمیشە لە گەڵیاندا پێک کەوتنەوەیان دەبوو، ئائەم وەزعە وەهای کردبوو پژدەر هۆش و گۆشێکی دنیایی تێبگەڕێ کە لە عەشیرەتی دیکە دەر نەدەکەوت. (لە پەنجاکاندا من دەمگوت کە لە پژدەر دابەزیت هەتا عەلیاغای حاجی ئەحمداغا-ی هەولێر تووشی پیاوی سیاسیی ژیر نایەیت). گەلێک لە نۆکەرە پێشخزمەتەکانیان پتر شارەزای بەرژەوەندی عەشیرەتی و حکوومەتی بوون لە براگەورەی عەشیرەتێکی دیکە. شێخ حەسەن هەر لەو سەفەرەمدا پێی گوتم: پژدەر بەو حاڵوباری تێیدایە دەڵێی مەکتەبی سیاسەتە. قسەکەشی هەتا بڵێی لە جێی خۆیدا بوو.

ئەم چوار کاریگەرە، شەلەگە و چاویلکەی جۆراوجۆریان لێ دەبۆوە تێیان دەکردەوە وەک ئەوەی کە گوتت «حکوومەت» یەکسەر لەو ڕۆژگارانەدا بیرت بۆ لای بریتانیا دەچۆوە کە خاوەنی دەسەڵاتی بنەڕەتی بوو لە وڵات، شەریکەی نەوتی

کەرکووکت بە بیردا دەهات کە خاوەن قسە بوو لە هەموو وەزعی کوردستان. بە نموونە دەڵێم لە پەنجاکاندا کە زەعیم ڕوکن عومەر عەلی موتەسەڕیفی سلێمانی دەسەڵاتێکی بێئەندازەی پێ درا بوو، لای شێخ حسێنی حاجی سەید درکاندبووی بەتەمایە سەرۆکێکی عەشیرەتی ئەوسا سەرکوت بکات (ئەم سەرۆکە ساردایی هەبوو لەگەڵ شێخ حسێن)، شێخ حسێن پێی گوتبوو پاشا پێت ناکرێ... موتەسەڕیف پێی گوتبوو چۆن پێم ناکرێ، حەبسی دەکەم، چاوی دەردەهێنم. شێخ حسێن گوتبووی ئەم دنیایە لە تۆ دەسەڵاتدارتری تێدایە، ڕێت نادات. گوتبوویەوە یەک حەفتە چاوەڕوان بە بزانە چ دەکەم. ئەشەدوبیللا هیچی پێ نەکرا.

ئەو ئاغایەی سەرۆک عەشیرەت، وەک دەزانم پیاوی شەریکەی نەوت نەبوو بەڵام ئینگلیزەکان لەنگەریان لە بەینی عەشیرەتەکان خۆیاندا و لە بەینی حکوومەتی مەحەللی و عەشیرەتەکاندا ڕادەگرت، یەکجار بە درەنگەوە ڕێیان دەدا شیرازەی باری گشتی بە لێدانی دەسەڵاتێکی بەرهەست ببەزێ. لە پاکانەی ئەو سەرەک عەشیرەتە دەڵێم، دوای بەرپابوونی شۆڕشی تەمووز، بۆ تۆژینەوە لە باری پێوەندی ئەوەوە بە حکوومەت چوومە لای مەرحووم «ڕەفعەت حاجی سرری» کە بەینێک لە سەرەتاکانی شۆڕشدا مدیری ئیستیخبارات بوو، دڵنیای کردم کە کابرا چ ناوێکی نییە لە سجلاتی حکوومەت.

لەو سەفەرەدا بۆ من کەلێنی فەقێ وەسمان کە لەمەو پێش ساڵەها وەکیل و تەرخانی ماڵی حاجی سەید بوو، زۆر دیار بوو، چەند ساڵێک بوو مردبوو. کوڕە گەورەکەی، مەحەمەد، 6-7 ساڵی بوو، کوڕی ناز بوو، هەر کە پێگەیشتێ هەموو ماڵی باوکی بەتڵاند. دواتر هۆشی هاتەوە سەر و خۆی گرتەوە. کوڕە گچکەی ساوا بوو، دواتر لە پەنجاکاندا دیتم و ناسیم و خۆشم ویست. فەقێ بابەکر کاری ڕاست بێ، هەزار جاران دامەی دۆڕاندوومێ. خاڵی هەردوویان حەسەنی خانمێ هەر لای شێخ حەسەن و یەکە پیاو لە ڕیزی خزمانی بوو. هەتا 1985 ژیا، بەر لە مەرگی بە خسووسی چوومە سەردانی لە قەڵادزە.

وام لە بیرە، مایسی 1940 بوو، کاری ناچاری سەفەرێکی کورتیلەی بیتوێن و ڕانیەی پێ کردم. مالیەی ڕانیە زەوی و بەراوی قەسرۆک و گەلی گۆڵانی جەلیزادانی دانابوو بە «امیرية» و لەبری تەخمینی داهات و بەشی حکوومەت 16 دیناری لە بەرپرسی ئەو ملکانە وەرگرتبوو کە وەکیلی ئێمە بوو. ئەو بەرپرسە بلْباس بوو، وا پێ

دەچێ لەگەڵ مدیری ماڵ کاکە و برالەیان کردبوو کە مڵکەکە بە تەخمین ببێتە حکوومەتی و ئێمەی لێ بتەکێینەوە و بۆ ئەو ساغ بێتەوە. لە خزمەت مامم، شێخ نووری، من و سوارەی کوێخا محەمەد و حەسەنی مام فەتاحی پێبازۆک پاش نیوەڕۆ بوو لە کۆیە بەڕێ کەوتین. لە کانیکەندی سەربە چنارۆک لامان دایە ماڵی کوێخاژن – ئایشە ناو، کە لە جێی براگەورەی ئەو چەند ماڵە بڵباسە بوو، لەوێ دەژیان. بێوەژنی کوێخا خدری هورمزیار بوو کە لە باسی «حەمەدی ڕەش»دا ناوی هات و دوای هاتنە دەری لە حەبسخانە بە چەند مانگێک مرد.

ڕۆژەکە لە سەرەتادا زۆر ساف و بەهارەکەی دەتگوت بەهەشتە، بەڵام هەوری کۆ کردەوە و گرمە و چەخماخەیێکی دەهاویشت. کەوتینە ڕێ بەرەو قەسرۆک. لەو ڕێگایە بێنوایەدا دەڕۆییشتین ئاسمان کردییە شەڕە بروسکەیێکی ئەوتۆ نە قەتم دیتبوو نە قەتیش دیتمەوە. لە ماوەی 4-5 دەقیقەدا نۆ بروسکەی داهێنایەوە دەوروپشتمان، لەوانەی بەهۆی نزیکییەوە بڵێسە و گرمەی وێکڕا دێن. دنیای دەلەرزاند و گرد و تەپۆلکە ئەو ناوەی سوور هەڵدەگێڕا هەرچەند ڕۆژەکەی جارێ زۆر بە تین و ڕووناک بوو. وڵاغەکان دەلەرزین، دیار بوو ترسی مردنیان لێ بوو. مامم لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بە خوێندن، ڕەنگە یاسینی خوێندبێ. ڕاستییەکەی چ ئومێدێکی ئەوتۆمان بە خۆمان نەمابوو. لە هەر یەک دەقیقەدا دوو بروسکەی هەرە هەرە زراوڕژێن دادەهاتە تەپۆلکەی دەورمان. کاتێک دایرژاندە تەرزەی دانە زلی شاش و بێش، بەڵام نێرینەی هەورەکە بەسەر ئێمە تێنەپەڕی، بەولامانەوە وڵاتی بە تەرزە سپی کرد. هۆبە ماڵێکی بڵباس، وا بزانم هی حاجی ڕەسوو، بە بن گردی کەندی سوارە- وە هەڵیان دابوو، خۆمانمان بۆ ئەوێ هەڵکوتا. خێرا جڵەوی وڵاغانیان گرت و چووینە ژێر تاوڵە زلەی مێوانان. هەر ئێمە دابەزین هەور و تەرزە و بروسکە و قیامەت بەسەر چوو. دوای چەند دەقیقەیەک بەڕێ کەوتین.

«کەندی سوارە»ی ناوبراو لە ڕووداوێکەوە ئەو شۆرەتەی وەرگرتووە: سوارێکی ڕاوکەر لە پشت گردەکە کەروێشک هەڵدەستێنێ و تاژی تێ بەردەدات و بە تاژییەوە تەقڵەکوت بۆ سەرووی گردەکە بە دوا کەروێشکەوە تێ دەکەن. لەبەر مەشغەڵەت و بەهۆی ئەوەوە کە سەرووی گردەکە لە زاهیردا بۆ چاوی بە پەلە وەها دیاردەدا کە دەوامی هەیە تومەز لەگەڵ هەڵەتی بەولای خۆیەوە تێک دەگرێن و یەک پارچە حیساب دەکرێن ئیتر کاتێک لە پڕ دەگەنە ڕۆخی گردەکە

کەروێشک و تاژی و سوار وەکوو مەل بە هەواوە سەرەژێری بن گردەکە دەبن و هەر چوار ڕوحلەبەر تێدا دەچن بەرزاییەکەی سی - چل مەترێک دەبێ.

لە قەسرۆک لای ئامیر مەخفەر - ناوی حەماغا بوو کوڕێکی بە خۆدا ڕاپەرموو، دەیزانی قەدری خەڵک بگرێ - دابەزین. خەڵقی قەسرۆک بە براگەورەیانەوە - وەکیلەکەمان - هاتن بۆ بەخێرهێنانمان. مامم تێی گەیاندن بۆچی دەچینە ڕانیە. پەلەیان کرد شەو لایان بمێنینەوە بەڵام نیازمان مەلا عەلی کانیماران بوو کە تازە (وا بزانم) خێزانی مردبوو هەر دەبوو بچینە پرسەی. ئەو شەوە لای بووین، چەندی کردمان ڕێی نەدا لەسەربان بنووین بە نامەی ساردایێکی لەگەڵ سەرخمەدا هەبوو [سەرخمە نشیمەنی سواراغای سەرەک عەشیرەتی بلْباس بوو]. ئەو شەوە من هەتا سبەینێ لەبەر کێچ نەنوستم. چی پڵاو و گۆشت و مەحەلەبی خواردبووم مامە کێچ پێی بژاردمەوە. سوارە و حەسەن دوای سەعات دوو و سێ بابەڕۆیان لێ هەڵستا. سبەینێ پاش بەرچایێکی بەگزادانە دوعاخوازیمان کرد. لە ڕانیە یەکسەر چووینە لای قایمقام، مامۆستای کوردی مەرد، ئیسماعیل حەقی شاوەیس گەلێکی بەخێر هێناین. مامم ئەوراق و سەنەداتی پێویستی نیشان دا دەرحاڵ چووە دڵییەوە کە حکوومەت ناحەقە. بێ سێودوو کاغەزی بۆ هەولێر نووسی کە کاغەزی پێشووتر لەغوو بکەن و پارەکەش بنێرنەوە بۆ ڕانیە هەتا پێمانی بداتەوە. گوتی چەند ڕۆژێکی لەم ناوە خۆتان بخافڵێنن تا ئیشەکە بنەبڕ دەبێت. شەو چووینەماڵی خاڵە خدرم لە سەیداوە، ئەو شەوەش هەتا دوای مەلا بانگدان لەبەر کێچ نەنوستم گوتم جێگەیێکم لە دەرەوە بۆ ساز دەن ساردە سارد نییە هیچ. هەتا ڕۆژهەڵات نوستم. چەند ڕۆژێکمان لای خاڵم و لای شێخ حسێن ڕابوارد، وەڵامی هەولێر هاتەوە، پارەکەیان بە خۆمان دایەوە کە خاوەن موڵک ناسراین. کابرای وەکیل ئەو پارەیەی لە کیس چوو ئەگەر خیانەتی نەبایە خۆی وەری دەگرتەوە، ڕووی نەبوو قسە بکات.

هاوینی 1940 ئەڵمانیا هێرشی چاوەڕوانکراوی هێنا بۆ سەر فەرەنسا و بەلچیکا. دەت گوت ئاگر و پووشە بێ وەستان ئەو دنیایە پان و بەرینەی دابووە بەر خۆی، گەشت و گەڕانی تێدا دەکرد. خەتە مەشوورەکەی ماجینۆ کە لە سنووری سویسرە هەتا سنووری بەلچیکا بە قەڵغانی فەرەنسە بەرانبەر ئەڵمانیا حیساب دەکرا بایی فلسێک دەوری نەدیت ئەوە نەبێ کە نیو ملیۆن عەسکەر و جبەخانەی بایی کائیناتی لە ناو خۆیدا حەبس کردبوو بێ ئەوەی تەقە لە تۆپ و تفەنگیانەوە بێت. عەسکەرییەکانی

ڕۆژاوای دیموکرات بە هۆشی 1914 دەژیان کە پیادەی خەندەقنشین نیرگەی سپا بێت و تانک و زرەلیش بەو هەموو چەرخانەی پێیانەوە و لە بنەڕەتدا بۆ بزووتن دروست کراون بە وەستاوی خزمەتکاری پیادە بن. لەشکری نۆیەمی فرەنسە بە ڕابەرایەتیی جەنەڕاڵ کۆراپ (کۆڕا- دەخوێندرێتەوە) وەکوو مێگەلی مەڕ لە بن پێیان چوو. وەک چەقۆیێکی لە هەناوی شووتی بگێڕیت، سەرەڕمەکانی سپای هیتلەریش چووینە هەناوی بەلچیکا و فرەنسە. لە کۆتایی خەتی ماجینۆوە کە لە دۆڵی «سۆم»ی بەلچیکا دەست پێ دەکات تانکەکانی فرقە مەشوورەکانی «پانزەر» ی ئەڵمانیا بە سەرکردایەتیی جەنەڕال «گودەریان» وەکوو مەقەس چەرمی پشتی فرەنسایان هەڵبڕیەوە هەتا هێندێکیان لە ماوەی زێدە کورتدا گەیشتنە زریەی مانش. فرقەی جەنەڕاڵ ڕۆمیل کە 230 تانکێکی هەبوو هەتا لەو گەشتە بۆوە پتر لە 500 تانکی فرەنسەی تێک شکاند و بە پاتاڵیشی گرت. چونکە بەدڵ یەکجار هەستیاری ئەو شەڕە بووم هەم سەرنجم لێی گرتووە و لێی دەگرت هەم ئەوەندەی پێم کرابێ کتێبم لەسەر خوێندۆتەوە. دەریا دەریای لەسەر نووسراوە کە هێندە زۆرن هێماشیان بۆ ناکرێ، من بە ئیزنی خوێنەر تەنها لە سێ خاڵی مەیلەو نابەرچاوەوە بۆی دەچمەوە:

خاڵی یەکەم ئەوەیە کە لیدل هارت پسپۆڕی عەسکەری ئینگلیز بەتایبەتی دۆڵی «سۆم» گەڕا و گوتارێکی لەسەر بڵاو کردەوە تێیدا دەنووسێ کە ئەم دۆڵە بە پێچەوانەی باوەڕی پیاوە عەسکەرییەکانی ڕۆژاوا ناتوانێ فیرقە تانکی نوێ بوەستێنێ و هەرگیز ناشێ بە درێژەی خەتی ماجینۆ لە قەڵەم بدرێ. ئەم گوتارە «گودەریان»ی ئەڵمان دەیخوێنێتەوە باوەڕی پێ دەکات و لە ڕێکەوتدا هیتلەر دەبینێ و بیروڕای خۆی بۆ ڕوون دەکاتەوە. هیتلەر قسەکانی دەچێتە دڵەوە. گودەریان بوو بە قوماندانی هەموو هێزی پانزەر کە لە سۆمەوە تێی کرد.

خاڵی دوەم ئەوەیە، کۆلۆنێلێکی فرەنسەیی کتێبێکی لەسەر شەڕی فرەنسەیی 1940 دانا، بۆت باس دەکات چۆن ئەو شەڕە بەر لە دەست پێکردنی دۆڕا بوو. لە شوێنێکی کتێبەکەیدا بەو پەڕی ئاشکراییەوە دەڵێ: The French army was outmaneuvered, outgeneraled, outfought واتاکەی، هەرچەند بە کوردی زەحمەتە لێ بدرێتەوە دیسانەوە نزیکە لەمە: سپای فرەنسە مناوەرەبەدەر بوو، قیادەبەدەر بوو شەڕبەدەر بوو. واتە لە منارەوە و لە قیادە و لە سەرجەمی شەڕ

سڕابۆوە. کابرا لە بری دەربڕینی ئەو ڕاستییانە پاداشتی بریتی بوو لە تەرفیع نەکردن بۆ جەنەڕالی. عەقڵێکی تەرفیعی بەو نەکرد ئەگەر لە شەڕێکی دیکە قائید بێ سەرلەنوێ بۆ فرەنسەی دەدۆڕێنێ.

خاڵی سێیەم ئەوەیە، مارشاڵ پێتان، قارەمانی شەڕی 1914، لەو هودنەی لەگەڵ ئەڵمانیادا کردی و دوای شەڕ لێیان کرد بە هۆی خیانەت، بێ پێچوپەنا لەو ڕۆژەدا تاکێکی هەرە دڵسۆزی میللەتەکەی بوو. سپا و گەلی فرەنسە وەک مردوو، پەک کەوتە بوون. لەشکری ئینگلیز بێچەک گەڕاوەتەوە بۆ بەریتانیا تێکڕای ئەورووپای ڕۆژهەڵات بە چۆکدا هاتووە، بەحاڵ پارووی بۆ قووت دەدرێ، لەشکری ئەڵمانیا پێوەیە هەموو فرەنسە دەپێچێتەوە، ئیتاڵیا بە نوێی خەنجەرێکی لە پەڵاسۆی فرەنسە کوتاوە، کەس نییە نە چەکدار نە بێچەک ئەوەندە هۆش و ئیرادەی مابێ شەڕ و ئاشتی بەیەکدی بگرێ ئالەو ڕۆژە ڕەشەدا «پێتان» هەموو ناو و شۆرەت و قارەمانەتیی خۆی کردە دروشمێک بەسەر داروەکازی شەخسیەتی خۆیەوە بە ئاڵای گێڕا و هودنەییێکی لە ژێر سێبەریدا کرد، کردی بەو خەستەخانەیەی نیوەمردووی تێدا چارەسەر دەکرێ یاخود ئەو کەڵەکەی مەلەوانی پێ لە ئاو ڕزگار دەکرێ یاخود ئەو پەردەیەی بە دەوری ڕووتەی عەوڕەت دەرکەتووەوە دەگێڕێتەوە. نەک هەر ئەوەندە، پتر لە نیوەی فرەنسە ڕزگار بوو لە داگیر کردن بەوەشدا ڕێی هەناسە هەڵێنانی گەلی فرەنسە بە ڕەهایی مایەوە. خەباتگێڕانی بزووتنەوەی نهێنی دژی ئەڵمانیا کە سەغڵەت دەبوون خۆیان دەگەیاندە بەشی داگیرنەکراو و ڕزگار دەبوون ئنجا ئەگەر پێتان خائین بایە چۆن دەشیا هانا و پەنا بۆ خائین بەرن؟ دۆگۆل چەندی کردی لە هەوەڵەوە کەسی بە دوادا نەچوو، هەرچی هێزی سپای فرەنسە هەبوو لە دەرەوەی فرەنسە گوێی بۆ حکوومەتی پێتان ڕادەهێشت. هێزی دەریایی فرەنسە کشایەوە بۆ ئەفریقا. ئینگلیز لێی ترسا و غافڵگیری کرد لە بەندەری داکار و زۆری لێ ژێراو کرد. ئەگەر پێتان ئەو خائینە بایە کە دەڵێن، دەبوو هێزی چەکداری فرەنسە بە هێزی دەرياییەوە بچێتە ژێر فەرمانی دۆگۆل. دواتر وردە وردە دۆگۆل خەڵق بە دەنگییەوە چوو ئەویش بە مانەوەی ئینگلیز ئەو هەلەی بۆ هەڵکەوت دەنا نە ناوی دەبوو نە نیشان. ڕاستە دوایی دۆگۆل بووە ڕەمزی بەرگریی فرەنسە بەڵام دەبێ «هەڵوەست» لە کاتی خۆیدا هەڵسەنگێنین. خۆ کە شەڕ باری گۆڕا ئەڵمانیا ئەو بەشەی فرەنسەی داگیر کرد کە پێتان پاراستبووی ئایا لەو داگیر کردنە چ

سوود بە بەرەی دیمۆکراسی گەیشت؟ زۆر کەس هەیە لە مێژووش و لە ژیانی عادەتیشدا زەدەی حوکمی بێئینسافە. لەوانەدا مرۆی وەها هەیە ناتوانم ناویشی بهێنم چونکە وەک ئەوە دەبێ بە لای زوربەی ڕۆشنبیر، وەیا غەیری ڕۆشنبیر بۆ شەیتان بپارێمەوە.

مارشال پێتان کە هودنەی کرد، بەشی فرەنسەی سەربە «ڤیشی» کە مایەوە بێ ئیحتیلال، بوو بە لەمپەرِ نەیهێشت سپای هیتلەر بگاتە سنووری ئیسپانیا و قەراخ دەریای باشووری فرەنسە بەسەر دەریای سپی ناوەڕاستدا، جا ئەگەر ئەمەی نەکردایە ئیسپانیا لە خۆوە دەبوو بە بەشێکی ژێر فەرمانی هیتلەر تا ئەگەر فرانکۆ بیویستبایە بێتەرەف بمێتەوە سپای ئیسپانیا لێی نەدەسەلماند، ئەوسا «جبل طارق»ی بنگەی هێزی دەریایی بریتانیا لە ترووکەی چاودا دەبوو بە هی ئەڵمانیا و سەرلەبەری دەریای سپی ناوەڕاست دەبوو بە دەریاچەیەکی هیتلەری و بەندەرەکانی وەک تولون و نیس و مارسیلیا دەبوونە بنگەی هێزی دەریایی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا ئنجا سەرلەبەری ئەفەریقیا دەبوو بە مەیدانی تەراتێنی فیرقە پانزەرەکانی ئەڵمانیا... میسر نەدەما... خاوەری میانە دەکەوت... هیندستان بێ پێوەندی دەمایەوە... ئەمەریکا و بەریتانیا لە ساڵی 1943 نەیاندەتوانی شەڕ بپەڕێننەوە بۆ سەرووی ڕۆژاوای ئەفەریقیا و لەوێوەش بۆ ئیتالیا... پرۆژەی Overlord لە ساڵی 1944 بۆ پەڕینەوە لە مانش دەوەخرا یان هەر نامومکین دەبوو... هەڵبەت ئەمانەی دەیڵێم هی فنجان خوێندنەوە نییە بگرە ئاکامی بەدیهەیە، وەک 2=1+1. ئەو غەدرەی لە پێتان کرا دواتر لە سادات کرا کە هات سینایەکی سەرۆک جەمال دۆڕاندبووی، بێ شەڕ هەمووی وەرگرتەوە. دەبوو کەسانێکی ساداتیان دانا بە خائن، خۆی و کردەوەکانی ڕەفز بکەن و سینا بدەنەوە بە ئیسرائیل و بە هێزی بازووی خۆیان جارێکی دیکە بیسەندنەوە...

شەڕ بەردەوام بوو، نرخی شتان بەرەژوور چوو. دەڵێن لە پژدەر نۆکەرێک بە ئاغاکەی گوت قەند گران بووە. ئاغاکە گوتی: دایەی وەها لێ دەکەم کلۆیانی لێ چووک دەکەمەوە. مەبەسی بوو کە ئەو کلۆ قەندەی چایەی دیشلەمەی پێ دەخواتەوە بچووکی دەکاتەوە نرخەکەی دەباتەوە جێی جارانی. بەڵام هەر هەتا ماوەیێک کلۆ چووک کردنەوە کەڵکی پێوە بوو. هیتلەرچییەکان وەها سەرگەرمی دەروێشایەتیە بێ ئاکامەکەیان بوون پێیان خۆش بوو زەهراو فڕ بکەن هەر زەعیم هیتلەر سەر بکەوێ. «خورشیداغا»یێکی مەیلەو خزممان دەیگوت: «جەمالی کوڕم

گوتی ئەرێ بابە ئەتوو لە بۆ ئەوەندەت ئەڵمان خۆش دەوێن؟ پێم گوتەوە ڕۆرە (ڕۆڵە) ئەمن لە شەڕی گەورە چوار ساران (ساڵان) لەگەر (لەگەڵ) ئەرمانان سونگیم وەشاندییە، وەڵاهی پێم خۆشە گوللە بەسەری دری (دڵ) توو بکەوێ نەک عەسکەرەکی ئەرمان». خوا خورشیداغا و موهەندیس جەمال عەفو بکات. ئەمما دەبوو خورشیداغا گوللەکە بۆ لای خۆی بهێنێتەوە.

لەو دەمەی قسەکەی دەکرد ئەم تێبینییەم بە دڵدا نەهات. ئەمە دەنووسم لە ڕوون کردنەوەی ئەو جەزبە حاڵگرتووە کەفدەرکردووەی خەڵقی سادەی ڕەشوڕووت دووچاری بووبوو. خورشیداغام خۆش دەویست. زۆر عەسران لە سەربانی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد لەگەڵی دەکەوتمە گفتوگۆ. قسەی خۆش بوو، قسەی خۆشیشی پێ بوو. جەمال لە نزیکەوە ئاشنام بوو چونکە پورزای کاک ئیسماعیلی مەلا نووری بوو کە یەکجار برادەرم بوو سەرەڕای خزمایەتی کە باوکمان ئامۆزا بوون، شیری دایکیشیم خواردبوو. جەمال هاوینان هەتا دەوری قوتابیەتیی بەسەرچوو بەینێکی لە چنارۆک دەهاتە ماڵی پوری کە کەپرەکانمان بە تەنیشت یەکەوە بوون، شەوانیش هەتا باوکم مابوو کاک ئیسماعیل چایەی بۆ مەجلیسی بابم تێدەکرد. خولاسە لە زۆر سەرەوە دۆست بووین. لە منداڵیمدا وەها دەبوو نیوەڕۆژم لەگەڵ ئیسماعیل و جەمال لە ماڵی خورشیداغا دەخوارد ئیتر هەرچی لە نسیبدا بایە.

کەمال برا بچووکی جەمال کە ئێمە منداڵ بووین ئەو ساوا بوو، مەودای تەمەن جودایی نەیهێشت هاوڕێی خوولیای یەک عومر بین بەڵام هەمیشە خۆشم ویستووە. چ لە منداڵیدا چ بە کامڵی نموونەی شەرم و شکۆ و ئاکاری چاک بوو. خورشیداغا هاومەشرەبێکی وەکوو خۆی هەبوو لە ئەڵمانویستیدا ئەویش فەقێ تەهای خەیات دۆستی ئێمە و خاڵی میرزای حاجی کەریم و وەکیل خەرجی باوکم لە داهاتە کەمەکەی ناو شارمان. کە بەیەکەوە لە دوو لای ڕادیۆ ئەخباری «یوونس بەحری»یان بۆ مێشکۆڵەی ناو ئێسکیان هەڵدەمشت و سەرکەوتنەکانی لەشکری ئەڵمانیایان بەر گەنجینە دەخستەوە سەر سامانە مەوهوومەکەی سەرکەوتنەکانی پێشووتر، سەیرت دەهاتەوە کە بنیادەم چۆن هێندە ئامادەیە خۆی بە هەڵە ببات. خوا لێیان خۆش بێت.

سافیلکەییکی[22] دیکە هەبوو ناوی وەستا برایم کەرکووکی و لەوانی دیکە پیرتر بوو جارێ گرفتی مابوو لە قسەی کوردی. ئەمیان، خوای لێ خۆش بێ، سەیروسەمەرەییک بوو سەربەخۆ. پاپۆڕیکی تەییارەهەڵگری ئینگلیزی بە ناوی «ئارک رۆیال» ژێراو کرا، ئەم مام برایمە دەیگوت،: «ئەڵمانی پاپۆرەکی ئینگلیثی غەرق کردییە ثی هەذار کیلۆمەترە». تومەز نەیدەزانی کیلۆمەتر درێژاییە یان قورسایی (زمانیشی پس بوو).

ساڵی دوەمی خانەنشینیم کە بەشێکی لە 1940و بەشێکی لە 1941بوو، خەفەتی سەرکەوتنەکانی ئەڵمان ڕووی لێ نام. شکستی ئیتالیا لە دەریای سپیی ناوەڕاست و لە ڕۆژاوای میسر کەمێکی دڵدانەوەی لەگەڵدا بوو، بەڵام بایی دەیەکی ئەو سەرکەوتنەی ئەڵمانیای نەدەکرد کە توانی بە هێزی چەترباز جەزیرەی کریت بگرێ. پێشتر یۆنانی پێچابۆوە. بەڵام هیتلەر هەڵە کوشندەکەی کە لە ئاکامدا بوو بە پەتی ملی، ئەوە بوو کە لە دەمی ڕمانی فرەنسەدا، هاوینی 1940، لێ گەڕا سپای ئینگلیز لە دانکیرکەوە بۆ بەریتانیا بپەڕێتەوە. لە سەرچاوەی ڕێکوپێکدا خوێندوومەتەوە کە هیتلەر ڕێی نەدا سپاکەی خۆی دەست بۆ ئەو 340 هەزار سەربازەی ئینگلیز ببات کە لە بەرچاوی ئەوان خەریکی خۆ ئامادەکردنی هەڵاتنە، تەنانەت گودەریان دەڵێ زۆر بە زەحمەت توانیمان سەربازەکانمان بکێشینەوە بەرەو دواوە لە ڕووبارێک کە فەرمانی هیتلەر لەنکاو مەنعی کردین لە لێپەڕینەوەی. دەبوو ئەو سپایە ئەسیر بکات و بێ وەخران بە چەترباز بۆ بەریتانیای بێچەک بپەڕێتەوە. وا پێ دەچێ هیتلەر نەیدەویست بەرتیانیا بشکێنێ بەڵکوو حەزی دەکرد بە برا بچووکی ئەڵمانیای لە قەڵەم بدات چونکە دیتمان بەر لەوەی هێرشیش بۆ سەر ڕووسیا ببات «ڕۆدۆڵف هیس»ی نارد بۆ ئاشتی نانەوە لەگەڵ بەریتانیادا. هەمان ڕا

---

22- وشەی «سافیلکە» ڕێژەیەکی بچووککراوی «ساف»ـە بە واتای لووس و بێ گرێ. هێندێک دەنووسن «ساویلکە» هەڵەییکی ڕێزمانی ئاشکرا دەکەن چونکە ئەمیان چووککراوی «ساو» ە نەک «ساوا» وەک کە هەندێک دەڵێن. هەر وەک «گەدا» نابێتە «گەدیلە» یاخود «زانا» نابێتە «زانیلکە» هەروەها «ساوا» ش دەبێتە «ساواییلکە» کە بمانەوێ بۆ ئەم ڕێژەیەی «سافیلکە»ی ببەینەوە، دەنا حەقی ئەوەیە بگوترێ: ساوایۆکە، زانایۆکە، ساواڵە، زاناڵە.

لێبوونی هیتلەر لە ئینگلیزەکان لە ڕووپەرەکانی *Romel papers* دەخوێنیتەوە. من لەو ساڵەی تێکشکانی فرەنسە بە وردی لەگەڵ هەنگاوەکانی شەڕدا دەڕۆیشتم، لەوساوە پێم سەیر بوو بۆچی کۆمەڵێکی 340 هەزار کەسی پەککەوتە لە ئینگلیزی شکستخواردوو ڕێیی دەربازبوونی پێ بدرێ؟

لە زستانی نێوان 1940-1941 بۆ چەند مانگێک لەگەڵ موستەعیدەکانی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد و مزگەوتی (جمعە) خەریکی خوێندن بووم لای باوکم. «اصول الفقە» کە لە زانستە هەڵکشاوەکانی مزگەوتە، بوو بە یەکەم پلەی خوێندم لەو بوارەدا. بەشێکی سەرەتای کتێبی «جمع الجوامع»م خوێند. باوکم پێ خۆش بوو بەڵام بێ ئەوەی بە تاکە یەک وشە نەخوێندنی ساڵی ڕابوردووم بداتە بەر سەرزەشت یاخود لە ڕێی دەربڕینی شادمانییەوە ئەو سەرزەنشتەی لێ بفامرێتەوە. خوێندنەکەم سێ مانگی خایاند. خێرابەخێرا ڕووکاری حەز و خوازم گۆڕا، ئەوساش باوکم هەر بە ڕووحی تەشجیعیەوە لەگەڵمدا بوو.

هەرای نێوان عێراق و ئینگلیز لە مایسی 1941 تەقییەوە. هەرچەند ناوی «ڕەشید عالی»ی بە خۆیەوە گرت، ڕاستییەکەی هەرای ئەمینی حوسەیینی مفتی فەلەستین و «چوار عەقیدی زێڕین»ە ناودەرکردووەکە بوو کە «سەڵاحەددین سەبباغ» هەرە مەشوورەکەیان بوو. کوڕێتی و سینگدەرپەڕاندن یەکێک بوو لەو هاندەرانەی هەراکەی نایەوە بێ ئەوەی زەرەو قازانج حیسابێکی ئەوتۆی بۆ کرابێ. چۆنیەتیی شەڕەکە و ئاکامەکەی باشترین بەڵگەی ئەم لایەنەیە.

حکوومەت ویستی باوکم فەتوایێک بۆ ڕەوایی و لایەنی «جهاد»ی ئەو شەڕە دەر بکات بەڵام نەیسەلماند. دەمدیت قایمقام گەلێک پتر لە عادەتی خۆی سەردانی باوکم دەکات هەر جارەش تەکلیفی فەتواکەی لەبەر دەنا بەڵام بێسوود بوو. خۆگریی باوکم لەوەوە بوو کە مەرجی «جیهاد» لەو شەڕەدا پەیدا نییە هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە پیاوانی میری گوێیان نەدەدایە دەستووراتی شەریعەت و چی پێی دەگوترێ «فسق» لە باودا بوو. چەند سەیرە حکوومەتێکی ئیسلام بەشێکی پارەی میزانیەکەی لە ڕەسمی «عموم خانە» وە بێت کەچی لە غەمی فتوای «جهاد» بێت.

هەندێک لە ئەفەندییە خوێندەوارەکانی ئەو سەردەمە هەلیان وەرگرت بۆ دەردانەوەی ژەهری هەناویان بە جۆرەها بێ شەرمی و حەیایی کە لەگەڵ کەسانی ئەوتۆیاندا دەکرد پێڵاوەکەیان لەوان بە شەرەفتر بوو. ئەو تەرزە خوێڕووانە کە پاڵەوانپفی لەبەر دەهۆڵ و زوڕنای بەزمی بنی دنیا دەکەن و خۆیانی پێ هەڵدەدەنەوە و هەنگاوی نامەردانە بەرەوپێش هەڵدێنن. زۆر زۆر کەمترن لەو سەگەی کە حیکایەتی برا عەرەبەکان بە «کلب الحائک» ی ناو دەبات بەداخەوە…

لەو بەینەدا من هاتبوومە سەر ئەو قەناعەتە کە گەڕانەوەم بۆ خوێندنی مەکتەب پێویستێکە ئاو لێڵ نەکات. باوکیشم هەر زۆری پێ خۆش بوو، تەنانەت ڕۆژێکیان دوای بڵاوبوونەوەی نیازی گەڕانەوەم بۆ مەکتەب چەند توجار و مام حاجیی ئەوسای کۆیێ بە پەرۆشەوە ئەو باسەیان لەگەڵ باوکمدا کردەوە، کە زانییان خەبەرەکە ڕاستە پرسییان ئەدی قوربان ئەو دەرس و کتێب و مینبەر و میحرابە بۆ کێ بەجێ دەهێڵێ؟ تێیاندا هەبوو بە دەم پرسیارەوە چاوی تەڕ بوو. باوکم وەڵامێکی وەهای دانەوە، کە من کەمێکی لێ دەگێڕمەوە، بردنیەوە ناو قەپێلکی خۆیانەوە، لە ناو قسەکاندا پەنجەکانی دەستی ڕاستەی بە ستوونی خستە سەر سینگی و گوتی: من لە مەلایەتی چ قسوورم هەیە؟ خۆتان دەزانن ئێوە بۆ من چین، ئەدی کوڕەکانتان بۆ مەسعوود چ دەبن؟ من لە زەمانێک ژیام، مەسعوود لە زەمانی خۆیدا دەژیت…

ئەو ڕۆژەی کۆمەڵەی ڕەشید عالی بە هەڵاتن شەڕیان بڕاندەوە، لە نادی بووم. خەبەر لە هەندێ ئێستگە وەرگیرابوو کە بەغدا بۆتەوە هی عەبدولئیلاهـ بەڵام خەڵقەکەی لە چپەچپدا بوون کەس نەیدەویست قسەکە لەوەوە دەرچێ زیاتریش لە ترسی زارهەراشیی هیتلەرپەرستەکان. کاکەی حاجی مەحموود خوای لێ خۆش بێ، گوتی: زمان گرتنی پێ ناوێ، ڕەشید عالی و جەماعەتی ڕۆیشتن بۆ ئێران و ئاش بەتاڵی لێ کرا. پاش ئەمە دەرگای قسان کرایەوە. چەند کەسێک لەوانەی بە نامەردی نازییەتییان دەکرد لە نادی بوون وەک بەرازی پێکراو حەجمینیان نەبوو، نەشیان دەوێرا ڕاماڵی کەس بدەن. ئەوەی هەرە هیچ و پووچ و نامەردیان بە دەنگی بڵند گوتی: «هەرچی چوو چوو، دنیا بۆوە هی جاران، بە ناموسم کەسێکی ناوم بە نازیەتی بهێنی چی خراپە وەهای لەگەڵدا دەکەم»… پەحا بنیادەم مەخلووقەکی عەجایبە، غاندی و عومەر عەبدلعەزیزیشی لێ هەڵدەکەوێت.

دوای شۆڕشی ڕەشید عالی کەوتمە گردوکۆیی بەشداربوون لە ئیمتیحان. دوو کەسی دیکەی وەکوو من لە کۆییان بۆ ئەو ئیمتیحانە دەکۆشان، یەکیان محەمەد ئەمین مەعرووف ئەوی دیکە شەفیق سابیر هەرسێکمان بۆ ئیمتیحانی خاریجی چووینە هەولێر. لە پێشەوە ئەزموونێک کراین تا ئەگەر لێی دەرچووین بخرێینە ئەزموونی بەکالۆری. مامۆستا حەمەد ئەمین دەیگوت من لەم ئەزموونە دەربچم بەکالۆریم بەلاوە ئاسانە، من و مامۆستا شەفیق دەمانگوت، هەرنەبێ لە شەرمی حزوور کە مامۆستاکان دەمانناسن و لەبەر ئەو پێنج دینارەی «رسم الدخول»ی داومانە ناجیحمان دەکەن. مامۆستا ئەمین نەیسەلماند بەڵام سەهووش بوو. شەفیق و من دەرچووین. ئەمین کۆڵی نەدا، دوای چەند هەوڵێک سانەویی تەواو کرد. موعەدەلم 75 بوو، لە ئینگلیزی 91 م وەرگرتبوو بەڵام پاداشی مەعهەدی بەریتانیم بۆ نەهات چونکە تاهیری عەبدوڵا سکۆت کە ئینگلیززادە بوو 92 ی وەرگرتبوو. لە پۆلی سێیەمی ناوەندی، ساڵی 1937، بە نومرەی 75 لە ئینگلیزی کتێبی پاداشتم بۆ هات.

لە سەرەتاکانی حوزەیرانی 1941 هیتلەر ڕەوی بردە سەر ستالین. ئەمەش دوەم کەرایەتیی کوشندەی هیتلەر بوو حەماقەتی ناپۆلیۆنی پێ دووبارە کردەوە. دەبوو ساڵی پێشتر بەریتانیا یەکالا بکات. هەر چونکە سیاسەتەکەشی بەرانبەر هەموو وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا سیاسەتی لە ناوبردن Annihilation بوو، دۆستایەتیی ملوێنەها دوژمنی ستالینی ڕەفز کرد چ لە ڕووسان چ لە ڕووسی سپی و ئۆکرێنەکان و گەلە بچووکەکانی دیکەی ئەو هەرێمە بێ... بە خاڵی ڕەشدا بچێت وەک چوو.

ئەو هاوینە کە دەرچووم هەر حوقووقم لە بیر بوو لێی بخوێنم. نەختێک بە دەرنگەوە ژوانی قبووڵبوون و موراجەعەی حوقووقم زانی. لەبەرەو کۆتایی هاویندا چووم بۆ هەولێر. وەسیقەی دەرچوونم لە ئیدارەی سانەوی وەرگرت بردم بۆ کەرکووک کە لەلایەن مدیری مەعاریفەوە تەسدیق بکرێ. پێنج شەموویێک پاش دەوام گەیشتمە کەرکووک. بەپێی نووسینی جەریدە دەبوو ڕۆژی شەمۆ ئەوراقم بگەیەنمە حوقووق، سبەینێش جومعەیە دەوام نییە ئیتر چی بکەم؟ جەلالی خاڵە سەید ئەحمەد، کە وا بزانم لە کەرکووک فەرمانێکی بە دەستەوە بوو گوتی مدیری مەعاریف زۆر دۆستی سەید ئەحمەدی خانەقایە، هەموو عەسرێک دەچێتە لای لە خانەقا. من لە دوورەوە بەخزمەت ناوبانگی سەید گەیشتبووم، لە کۆنەوە دۆستی باوکم و قەدرزانی باپیرم بووە.

عەسرێکی کاڵ لەگەڵ کاک جەلالدا چووین بۆ خانەقا. مدیری مەعاریف لە نزیک سەیدەوە دانیشتبوو. سەلامم کرد و بەرەو سەید سەرەژور چووم. لەو دەمەدا کە ویستم دەستی ماچ بکەم کاک جەلال گوتی: قوربان ئەمە فلانە. کە ناسیمی، دەک هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی پاکت سەیدی خانەقا و ناخانەقا!! هێندەی ڕێز لێ نام و وەهای پێشکەش بە مدیری مەعاریف و دانیشتوان کردم و بە جۆرێک بەرەژووری بردم، بێ ئەوەی بزانێ بۆچی چوومەتە خزمەتی پێویست بەو نەما ڕجاکارم بێ لای مدیر، کابرا وەها بۆم کرایەوە دەتگوت دۆستمە. پاش وتووێژێکی دۆستانە لەگەڵ مدیر کە سەید و هەموو خەڵقەکە گوێیان لێ بوو مدیر گوتی: «نشوف ماذا تعملون یا شباب الیوم». منیش بە ڕەهایی گوتم: «ننسج علی منوالکم» بە خەرەکی ئێوە دەڕێسین، گوتی «ماتقدرون» گوتم «الأیام بیننا».

لە دوای ئەو تەرزە وتووێژە لە خۆوە گوترا بۆچی هاتووم، پرسیارەکەش مدیر کردی منیش حاڵوباری خۆمم تێگەیاند. مدیر بێ ئەوەی ڕجای لێ بکەم لە خۆوە گوتی سبەینێ وەسیقەکەت بۆ جێبەجێ دەکەم. خۆشیی سەد خۆشی. ڕاستی ئەو ئێوارەیە چەند بە بەڵێنەکەی مدیری مەعاریف خۆشحاڵ بووم پتر بەو هەموو لوتف و مەرحەمەتەی سەید گەشامەوە کە پێشتر هەر لە دوورەوە ناوبانگی مەزنایەتیی و شەرافەتیم بیستبوو. ئەو جۆری بەخێری هێنام و بە خەڵقەکەی ناساندم بەلای هەموو تەمایەکمەوە بوو.

سبەینێ لە میعاددا چووم بۆ دایەرە، مەرحوم «نافذ جلال»یش لەو هەلە سوودمەند بوو چونکە مدیر پیاوانە هەر دوو وەسیقەی جێبەجێ کرد. ئێوارە بە شەمەندەفەر ڕووەو بەغدا ڕۆیشتم. بەیانیەکەی ڕۆژی شەموو مەودا زۆر تەسک بوو بۆ تەواو کردنی ئیشی تەحقیقاتی جینائی و نازانم کوێی دیکەش، هیچ شارەزاییشم بە دایەرەکان نەبوو کەسیشم تێدا نە دەناسین هەتا پشتیوانێکیشم دەدۆزیەوە دەوام بەسەر دەچوو. لەو دەمەدا خوا خدری زیندەیەکی بۆ ڕەخساندم ئەو ئیشانەی لە ماوەی دوو سەعاتدا بۆ تەواو کردم. ئەو مرۆیە خوالێخۆشبووی شێخ حسێن کوڕی شێخ محەمەدی قازیی نەقەشبەندی هەولێر کە هاوڕێی سانەویم بوو. ڕەنگە لە ئاڵقەی پێشووتر لە بیرم چووبێ باسی بکەم لەگەڵ هاوڕێکانی خوێندنم، لە موناسەبەدا دەبێ بڵێم هەروەها «هادی ڕەشید چاوشلی»شم لە بیر کردبوو کە

دواتر بە قایمقامم دیتەوە لە قەڵادزە و لە کۆیێ هەتا بوو بە وەکیل وەزارەتی داخلیە. لە هیچ قۆناغێکدا برادەریمان کەموکەسری نەکەوتێ یادی بە خێر بێ.

شێخ حسێن وەها بە پەرۆش بوو بۆم دەتگوت قەرزدارمە یاخود بە خاترانە لێی قبووڵ دەکەم یاریدەم بدات. ئەم گیانەی غەیرویستیم مەگەر لە جوانەمەرگ عومەر عوسمان دیتبێت. سەد هەزار ڕەحمەت لە یادی هەردوویان. ئەو ڕۆژە بە زوویی ئەوراقم گەیاندە حوقووق، هەر بە ڕێنموونی حسێن. ئەوسا لە پێشەوە لیژنەیێک موقابەلەی ئەو قوتابیانەی دەکرد کە ناویان لە لیستە هەڵدەواسرا. چونکە ناوی هەولێر (اربیل) بەپێی تەرتیبی ئەبجەدی یەکەم بوو منیش لەوانەی بەسەر هەولێرەوە وەرگیرا بوون نومرەم لە هەموان پتر بوو ناوم لە لیستەدا یەکەم بوو. دەبێ بڵێم لە هەولێرەوە سفارشنامەیێکی موتەسەڕیفی هەولێر، مستەفا یەعقووبی، کە بۆ عەمیدی حوقووقی نووسیبوو پێش چوونم بۆ موقابەلە گەیاندبوومە عەمید، مونیر ئەلقازی. هەرچەند دەرکەوت لزووم بە پاڵپشت نەبوو پێویستە چاکەی چاکەدار باس بکرێت.

بانگهێشتن کرام بۆ دیدەنی لەگەڵ لیژنە کە بە سەرپەرشتی عەمید خۆی بوو. لە پرسیارێکی عەمید زانیم نامەی موتەسەڕیفی بە چاکی خوێندۆتەوە، ئەویش کە لێی پرسیم بۆچی پێتان دەڵێن جەلیزادە. زۆرچاک لە بیرمە مامۆستاییێکی میسری بە عەرەبیی نەحوی پرسی «هل تتقن الإنجليزية؟» منیش لێی بوومە خزمی سێبەوەیهی گوتم «ألم بها بعض الشئ ولكن لا يقال انه إلمام راق». ئەو وەڵامەم بە لایانەوە گەلێک زیادە بوو لەوەی پێی ڕازی بوون. کە هاتمە دەرێ قوتابییەکان بە پەرۆشەوە حاڵوباری موقابەلەیان پرسی منیش خۆم گرژ کرد گوتم خوا فرسەتی عەبدی خۆی بدات چیتان پێ بڵێم!! وەی کە ڕوویان بزرِکا و خەجڵان. خێرا کەوتمە پێکەنین و گوتم «يا جماعه ماكو شي». هەوەڵ وەجبە پەنجا قوتابی وەرگیرا دیسان ناوی من لە بەرایی هەموانەوە بوو، بەڵام خێرا بڕیاری وەرگرتنی پەنجا کەسی دیکە دەرچوو. چوار قوتابیش لەساڵی پێشوو مابوونەوە پۆلەکەمان بوو بە 104 قوتابی.

من وەهام لە بیرە یوونس ڕەئووف (دڵدار) یەکێک بوو لەو چوارانە کەچی برای خۆی دەڵێ ساڵی یەکەم دەرچوو، لە ساڵی دوەم بە هۆی نەساغییەوە کەوت. هەرچی لێکدانەوەم هەیە لەگەڵ ئەمەدا ناگونجێ. جارێ من نایەتە بەر زەینم لەو

ساڵەدا یوونس هاتوچۆی کولییەی نەکردبێ. کە دیتم تەنسازیی گەڕابۆوە بەڵام پێشیەوە دیار بوو لە نەساغی دەرچووە. ئەو ساڵە وەزعی ئابووریی تەیار بوو چونکە «ئاسەف» (آصف) ی کاکی لە خوار بەغدا مەئمووری ڕەی بوو خەرجییەکی باشی بۆ دەنارد. ئاسەف زۆری نەبرد لێ خرا، هێندەی بە بەرەوە نەبوو من ساڵی یەکەم یوونس نەبینم، لە ساڵی دوەم بەیەکەوە لە پۆلی دوەم بە تێری و تەیاری بیبینم ئنجا لە ساڵی پۆلی سێیەممان سەغڵەتی ناگزووری ببێت. لەمەش زیاتر یوونس لە ساڵی یەکەمی خوێندنی بووبووە هاوپۆلی «جاسم العبيدي» کە لە هەوەڵ ساڵی خوێندنمەوە بووە برادەری منیش، لە یەکەم ساڵم جاسم پۆلی دوەم بوو، دیارە لە پارەوە بووبووە دۆستی دڵدار و کە دڵدار نەساغ بووبوو، هەر ئەوەندەیە لێکدانەوەی من تێک دەدات لە بارەی سەروبەری هەندێ وردە حیسابان وەک ئەوەی کە دەزانم زۆر زوو دڵدار منی بە «بەهییە فەرەجوڵا» ناساند نەک لە ساڵی دوەمی خوێندنم.

من سەیرم بە شتێکی دیکە دێت. ببڕای ببڕای بە بیرمدا نایەت کە دڵدار لەگەڵ من قوتابی بووبێت لە ناوەندی هەولێر. مێشکم وەها سڕاوەتەوە لەم بارەوە چەندی دەکەم وێنەی دڵدارم لە ساڵەکانی خوێندنی هەولێرم نایەتەوە بەرچاو کەچی شایەد هەن لە هاوڕێی ئەو دەمەم، یەک لەوانە مامۆستا «تاهیر ئەحمەد حەوێزی» بۆمی نووسیوە کە دڵدار لەگەڵ ئەو و مندا بەیەکەوە لە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی ناوەندیی هەولێر بووین. تومەز ساڵەها لەو قەناعەتەدا بووم کە دڵدار خوێندنی لە کەرکووک تەواو کردوە تا ئەوەی قەناعەتەکەم وێنەی هەولێری لە زەینمدا سڕیوەتەوە. ئەم دیاردەیەی سڕانەوەی وێنە وەیا گۆڕانی قسە بە شتێکی دیکە، لە کتێبێکی «فرۆید»دا بە ڕوونی شی کراوەتەوە و باوەڕی تەواوم پێی هەیە.

پاش دەرکەوتنی قبووڵبوونم لە حوقووق گەڕامەوە کۆیێ. ناوم لە جەریدە بە «محمود محمد الجلي» دەرچوو بوو. ئەم هەڵەیە لە مێشکی قایمقامی ئەوسای کۆیێ، حیکمەت زەهاوی وەها چەسپا لە بیری بردەوە کە پێشتر بەڕاستی و دروستی ناوی دەبردم (ئەمیش نموونەی ڕاستبوونی ڕایەکەی فرۆید-ە) ئیتر مەحموود ئەفەندی بەرەکەتی لەگەڵدا بێ وەک ناوی نهێنیم لە نێوان قایمقام و مندا نەقشی بەست. جەژنە داهات، قایمقام سەردانی باوکمی کرد. یەخەی گرتم بە «مەحموودەفەندی، مەحموودەفەندی». باوکم گوتی: ڕۆڵە مەسعوود ناکا ببیتە

مەحموود. قایمقام قسەکەی هەڵگرتەوە و گوتی مەحموودەفەندی چییەتی؟ قسەکەی قایمقام ئەم حیکایەتەم بە بیردا دێنێت:

کوڕێکی کەرکووکیی قاسم ناو بوو بە معاونی پۆلیس لە پۆلیسخانەی کەرکووک. خرایە جێی عەبدولقادر ناوێک کە بەینێک بوو لەبەر دەستی مدیری پۆلیس ئیشی دەکرد. مدیر چەندێکی ئیشی بە قاسم بووبایە بانگی دەکرد عەبدولقادر، هەتا وای لێ هات وەتەنگ هات، ڕۆژێکیان چووە لای گوتی جەنابی مدیر بابی من منداڵی بۆ نەدەژیا بە نیازی ئەوەی منداڵێکی نێرینەی ببێت و نەمرێت، بە خێرات و ئاهەنگ چووە سەر قەبری «ئیمام قاسم». دوای ساڵێک کوڕێکی بوو کە خۆمم ناوی نا قاسم بە هەرا و مەزاد و شایی... ها بەگم هەمووی بۆ قاسم بوو کە منم. سونەتانەی هات بووە بەزم و ڕەزم خەڵک پرسی چی بووە؟ بابە سونەتانەی قاسمە کە خۆمم. ئیتر پێبەپێ هەتاکوو نێررا مەکتەب و هەتا دەرچوو هەتا بووە موەزەف هەتا ژنی هێنا هەتا نەقڵی کەرکووک بوو هەر جارە بەزم و ڕەزمی بۆ دەگیرا هەمووشی بە ناوی قاسم قاسم قاسمەوە. ئنجا قوربان من ئەو قاسمەم. مدیر نەیهێنا و نەیبرد گوتی هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بابت بێ، بەڕاستی پێتەوە ماندوو بووە عەبدولقادر!!

دوای وروژمی هیتلەر بۆ سەر ستالین، بە بەهانەی بەر گرتن لە پەرەستاندنی نازیزم، بەرپرسانی ڕووس و ئینگیلز لە کۆشکی ڕەزاشا-ی تاران ڕێککەوتننامە-یەکیان ئیمزا کرد لەسەر داگیر کردنی ئێران. ڕەزاشا دوورخرایەوە بۆ ئەفریقیا، محەمەد ڕەزا هاتە شوێنی. بەشی زۆری یاخود بەشێکی کوردستانی ئێران کەوتە ناو ئەو هەرێمەی ڕووسەکان لە لای باکوورەوە داگیریان کرد. خەمۆ ناوێکی مەنگوڕ هەبوو فەرمانەکەی ئەوە بوو قسەی خۆشی دەکرد، دەتگوت گۆرانیبێژە کە داوای لێ کرابایە دەستی دەکرد بە قسەی نوکتە و پێکەنین. لێیان پرسی ئێرانی چۆن هاتە بەرچاو لەو تەسلیمبوونە گورجوگۆڵەی، گوتی خەمۆی هەر سێ تەلاقی کەون بە تەنێ پترم خۆ دەگرت لە لەشکری ئێرانی. گوتیان چۆناوچۆنیت خۆ پێدەگیرا بەرانبەر ڕووس و ئینگلیزان، گوتی هەر نەبایە خۆم دەشاردەوە، هەتا دەیانگرتم سێ ڕۆژی دەویست، ڕاستیشی دەکرد.

بوونی یەکێتیی سۆڤیەت لە ئازەربایەجان و کوردستانی ئێران جودا بوو لە هی ئینگلیز. ڕێ دان بە ئازەریەکان و کوردەکان بەپێی لە خۆ ڕاپەرموونی قەومی بجووڵێن چ زەرەری لە سۆڤیەت نەدەدا بێ مەسرەفیش جۆرە پاکانەیێکی بۆ باوەڕە

سیاسییەکەیان دەکرد بەوەدا کە یاریدەی میللەتی بێدەسەڵات دەدەن. دەریش کەوت ستالین بە تەما نەبوو خۆ بهاوێتە مەترسی و دەردیسەر لە پێناو کورد و ئازەری. لە چاوشێرکێی نێوان ستالین و «قەوام ئەلسەڵتەنە» سەرەک وەزیرانی ئێران کە کورد و ئازەری تێدا بوون بە نرخی بڕیارنامەی نەوتی باکووری ئێران، چ گلەییم لە ستالین نییە. خۆ وەکیلی ئەو خەڵقە نەبوو خیانەتی کردبێ، بێ مەبدەئی و قسەی ئەوتۆیش لە سیاسەتدا هەر بالۆرەی خەو لێ خستنە.

ئەو هاوینەی 1941 کە ئێرانی تێدا داگیر کرا برسییەکانی دیوی عێراق بە هەزاران هەزار ڕوویان تێکرد تا کاروانیان گەیاندە لای تەوریز. ئەوانەی پێوەندییان پێمانەوە هەبوو وەکوو تاهیری حەمە لاڵ و پێبازۆکییەکان باسی ئەو سەفەرەیان دەگێڕایەوە. بە تێکڕایی خەڵقەکەی دیوی ئێران چ براگەورە چ میللەت، پیاوانە بە خێریان هێنابوون. تاک و تەرای خوێڕوومەشرەب ناپیاوییان لەگەڵ هەندێک کەسدا کردبوو کە دەچێتەوە بۆ ئەو گوتەیەی دەڵێ، چەم بێ چەقەڵ نابێ. کاک تاهیر دەیگوت کە قازی محەمەد زانی ئەمن سەربە مەلای گەورەم گەلێک حورمەتی گرتم و زۆر ڕۆژان لای خۆی دەیهێشتمەوە. ئێمە لە کۆنەوە لەگەڵ ماڵی «قازی» و باپیری «هێمن» دۆستایەتیمان هەبووە، تا ئێستاش هەندێ کاغەزی ئەو سەردەمانەمان لەلا ماون، هێندێکیان مسوەدەی باپیرمن لە وەڵامدا بۆی نووسیون، تاکێک لەوانە سپاسنامەیە لە بری «هەزار پیشەی» ی تاقمی چایە کە فەتاحی قازی وەختی خۆی بۆی ناردووە. ئێستا بەیتێکی سەرەتای کاغەزێکی هەڵبەستی فارسیم بە ناتەواوی لە بیرە بۆ «امین الاسلام»ی ناردوە کە هێمن دەیگوت باپیری خۆی بووە.

...... امین الاسلام است

مرجع خاص و ملجأ عام است

بەداخەوە «هێمن»یش وەک ئەوان بوو بە یادگار.

بێگومان ناسراوەکانی دیوی کوردستانی عێراق هەر یەکەیان دۆست و ناسیاوی خۆی لە دیوی ئێران هەبووە بەڵام من ئاگاداری ئەو پێوەندییانە نیم بە جۆرێک باسیان بکەم، من پتر ئاگاداری ئەو شتەم لە خۆمەوە نزیک بوو. باری کوردستانی ئێران لە سەرەتاکانی کشانەوەی هێزی ئێران تاووتینی بۆ لای ئێمە هات.

لە سەرچاواندا دەخوێنیتەوە پارتی کوردستان چەند کەسی لە عێراقەوە نارد و لەوێ چ کرا و چۆن بوو لە نموونەی جموجۆڵی ئەو ڕۆژانە کە دواتر خۆم سێبەرێکیم دیت لە ئێوارەی ژیانی شۆڕەسوارێکی کوردپەروەر، ئەوە بوو کە لە ساڵی 1971 بە ڕاسپاردە لە «کۆڕی زانیاری کورد»ەوە هەناردرام بۆ شام و سەردانی «قەدری جەمیل پاشا»م کرد. بیرەوەریی سەفەرەکەی مهابادی کردەوە... بە نهێنی لە ڕێی کۆیەوە بە یارمەتیی کاکە زیادی حەماغا گەیشتووە. وەک دەزانم لە گەڕانەوەدا چەند مێرخاسێکی مووسڵی لە ناسیاوانی کاکە زیاد و عەلی حاجی ئەحەمەداغای هەولێر قەدری پاشایان بە بیاباندا دەرباز کردبوو.

لە پژدەر وەزعێکی سەیر دروست بوو. بەشێکی ئاغاکانی میراودەلی کۆنە داوایەکیان لە هەندێ زەوی و ئاوایی دیوی سەردەشت و سوێسنییاتی هەبوو کاتی خۆی لە بیستەکاندا ڕەزاشا زەرەری بۆ بژاردبوون، کە ڕەزاشا نەما میراودەلی قەرزی کۆنیان زیندوو کردەوە و لە ناویاندا باپیری بابەکری مەحمووداغا (برازای عەباساغای مەحمووداغا) سەرۆکایەتیی ئەو داواکارانەی گرتە دەست. چالاکییەکەیان پەرەی ستاند و ناوی «قۆمیتە» ی بە خۆیەوە گرت. مڵکێکی پژدەری داوایان دەکرد بە زۆری لە بەردەستی دووکەرتی سوێسنیدا بوو، یەکیان «ملکەڕی» ئەوی دیکە «بەرپاجی». باپیراغا [...] دەستی لە بابەکراغا و عەباساغا ستاند هەتا وەختێکی بە بەرژەوەندیی سەلیم خان و حەمەرەشید خانی بانە لە ساڵی 1943 هەرێمی سەردەشت بۆ شێخ لەتیفی شێخ مەحموود تەرخان کرا، شێخ لەتیف بوو بە زاوای سەلیم خان. دوو ساڵێکیان لەو ناوە مایەوە هەتا بە هۆی یارمەتیی ئینگلیزەکان سپای ئێران گەڕایەوە بۆ سەردەشت و شێخ لەتیفی لێ دەرچوو (ئەم زانیارەم لە عەولاغای پژدەری وەرگرت). باپیراغا لە دیوی عێراق قۆمیتەی لە دەستدا بوو هەتا مەرگی عەباساغا لە ساڵی 1946 ئیتر کە مەحموودی حاجی ڕەسواغا بوو بە دەمڕاستی تایەفەی مەحمووداغا ساردایەتیی کەوتە نێوان ئەو و باپیراغاوە، دواتر لە خۆوە قۆمیتە بڵاو بۆوە.

یەکێک لەو تاکانەی بۆ ماوەیەک لە دیوی کوردستانی ئێران ناوی دەرکرد گەنجێکی خەڵقی دێی سندۆڵان بوو مەشوور بوو بە عەلی گاور. کە من لە 1940 دیتم خزمەتی تەکیە و وەتاغی شێخ حەسەن و شێخ حسێنی دەکرد بەڵام جارێ تفەنگی نەدرابوویێ هەر چونکە بزۆز و جێی نافەرمانی بوو. گەنجێکی هەڵکەوتووی

بەتاقەت و چالاک و قەڵەم ڕێک و چاوشین و سوورکاڵ بوو، سینگ و شانی وەک هی ئەو عەلییەم بە کەسەوە نەدیتبوو... تفەنگچییەک بوو تاکی نەبێ... بەوبەر زێی بچووکەوە لە تەختایی ڕەنێک بەردێکی بۆری ورد لە مەودای سێسەد مەترێک دوورایی کرابوو بە نیشانە، چەندێکی ئەنگێوەکان خەریک بوون بەردەکە نەئەنگێورا. عەلی بە شێخ حەسەنی گوت: مۆڵەتم بدە تفەنگێک بگرمە ئەو نیشانەیە ئەگەر یەکوهەل نەمئەنگاوت گوێیەکم حەڵاڵت بێ. بە ئیزنی شێخ حەسەن تفەنگێکی وەرگرت و بۆی کەوتە سەر زگ، ماڵم هەقە بە هەوەڵ گوللە وەفا بە وەعدەی کرد و بەردە بۆری بانگڵۆز کرد... زۆری نەبرد کەتنێکی کرد و حەبس کرا. من لە سەفەرێکی دواترمدا دیتمەوە لە بەندیخانەی قەڵادزە بوو بەڵام فرسەتی وەرگرت و دەرباز بوو... بەینێک قاچاغ بوو مەفرەزە بە دوایدا دەگەڕا، تەنانەت من لە سندۆڵان بووم پاش عەسرێک 23 سوارەی پۆلیس لە وەتاغی شێخ حەسەن دابەزین بە نامەی تەعقیبی عەلی گاور، بەڵام حورمەتی سندۆڵان ئەوەبوو کە هەر بە ڕووکەشە لە تەعقیبدا بوون، وەکوو میوانی عادەتی لە وەتاغ مانەوە. لە ماوەی سەعات و چارەگێکدا نان و پات و پڵاووگۆشت و شیرنیی بە تاموشامیان لەبەر داندرا و بەر لە ڕۆژاوا دوعاخوازییان کرد... کە ئێران لە 1942 لەلایەن ڕووس و ئینگلیزەوە داگیرکرا و دەسەڵاتی تاران لە کوردستان کۆتابوو عەلی گاور تاقمێکی ڕێک خست و دەستی دایە خۆسەپاندن تا ناوی دەرکرد بە عەلیاغا و ترسی ڕاشکا بەسەر براگەورەکانی ئەو هەرێمەی ئەو تێیدا چالاک بوو. ڕۆژێک لە ڕۆژانی خوا عەلی بە خۆی و تاقمە چەکدارەکەیەوە بێپەروا ڕوو لە دیوەخانەی ئاغایەکی کوردی دیوی ئێران دەکات و لێی دەبێ بە مێوان. ئاغاکە زووتر پلانێکی ڕێک خستبوو، کە عەلی و تاقمەکەی دەکەونە سەر باری حەسانەوە لە پڕ چەکدارانی ئاغاکە غافڵگیریان دەکەن و عەلی و هەموو پیاوەکانی لە دەستڕێژێکدا دەکوژن. بەمەدا داستانی ئەو کەڵەمێردە نارەحەتە بە پایان دەگات.

ئەو عەلییە لە سەرەتای جحێڵیدا گاوانی سندۆڵان دەبێ. کچێکی ئاوایی لە نۆرەی خۆیدا، نان و خۆراکی سبەینە بۆ گاوان دەبات، عەلی نامەردییەکی هەرە زلی لەگەڵ ئەو کچەدا کردبوو، ماوەیەکی درێژیش لەو ڕۆژەدا لای خۆی دەیهێڵێتەوە تا لێ تێر دەبێت. کەس و برای کچەکە خۆیان سڵ ناکەن تا ڕۆژێک دایکی عەلی دەچێتە ئاودانی تووتن، ئەوانیش بە ئاشکرا ئەو کەتنە بە دایکی عەلی دەکەن کە عەلی

لەگەڵ خوشکی ئەوانی کردبوو... بەمەدا مەسەلەکە بێدەنگی لێ کرابوو. ناشزانم سەرئەنجامی کچەکە چی بوو. من ئەم باسەم دوای مەرگی عەلی لە خەڵقی سندۆڵان و بەپرس کردنیش لە خاڵەکانمەوە زانی.

بێمەوە سەر حیسابی خۆم. کاردروستایی خوێندنی بەغدام بۆ کرا (دایکم خشڵی خۆی فرۆشت) لەگەڵ تاهیری حەمە لاڵدا سەفەرم کرد. ژوورێکی بۆ ڕێک خستم لە خانی حەمە تەیباغا و حەمەد مستەفاغای حەوێزی. لە هەوەڵەوە ناوی خۆڕایی لێ هات، ساڵی دوایی بوو بە کرێ ئەمما کرێی کەم. کاک تاهیر خوا لێی خۆش بێ لەو کەرەستەی بۆمی کڕی چەندی بڵێی حەسقێلی کرد، منیش شەرمە ئەبەدیەکەم زمانی دەبەستم. پارەی دانابوو لای عەبدولوەهاب قەلەمچی، ناسیاوی باوکم و دۆستی زوربەی توجاری کۆیە بەتایبەتی هی حاجی مەجیدی ئەمینی حسێنی، کە مانگانەی لێ وەرگرم ئەمما نەمدەزانی خێر و سەدەقەیە دەمداتێ یان پارەی خۆمە کاک تاهیر، وەکوو ئینگلیز، سڕی نەدەدرکاند. خوای لێ خۆش بێ بایی نارەحەتی من بە دەست ئەو حەسقێلییەی ئەوەوە، خۆی لە ئیستیراحەتدا بوو کە چەند قرۆشێکی لێ کەم کردوومەتەوە.

## ئاڵقەی هەشتەم

دوورخوێنی ڕووپەڕەی هەر بابەتێک بێت بە بەریەوە هەیە ناواخنی لاوەکی بە ڕایەڵە جلوەی تێدا ببەستێت وەک کە سەیری ئەوبەری شەقامت کرد هامووشۆکەر و مەلی نزمفڕیش دێنە بەر نیگاتەوە. ئەو ناواخنە لاوەکیانە تێیاندا هەیە لە بابەتی بنەڕەتی خۆشتر بێت. ئەگەر شیابا مەبەستی بنەڕەتی جێگا چۆڵ بکات بۆ تێوەرێخی لە خۆی خۆشتر دەبوو ئاڵقەیێکی سەرلەبەر، بگرە پتریش، تەرخان بکەم بۆی.
دۆست و برادەری بەڕێز زۆرن لەوانەی تێبینی و پرسیاری ورد و داخوازیی تایبەتییان لێ کردووم بە بەڵگەی خۆشامەدییان لەو ئاڵقانەی هەتا ژمارە پێنج ڕیزیان بەستووە ئاڵقەی شەشەم جارێ بڵاونەبۆتەوە، خەریکە لە هێلکەدانی چاپخانە بەربێتەوە.

مامۆستا ئەمیری حەسەنپوور لە کەنەداوە نامەی نارد داوای درێژە و وردکێڵیی پتر و فرەتر کردنی بابەت، بەتایبەتی هی سەربە قوتابخانەکان و جۆری نووسین و کتێب... دەکات. وەرامم نووسییەوە بەڵام داخم ناچێ نامەکەیم بزر کرد و ئەدرەسیم لە دەست دا. ئێستە ئەو ڕەنگە وەها بزانێ کەمتەرخەمیم کردبێ. نەخێر، بەردەوام لە پەرۆشدام.

مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزی نامەیێکی سی لاپەڕەیی بۆ ناردم، یەک باوەش قسە و خەبەراتی ئەوتۆیان تێدایە کە ئەگەر پێشتر ئاگاداریان ببامایە ئەو پێنج ئاڵقەیە بێعەیبتر دەبوون. پیاوەتیی خۆی بەوەدا تەواو کرد کە دوای دەرچوونی «حەماغای گەورە»ش تێبینیی خۆی لە قەوارەی پتر لە بیست لاپەڕەدا بۆ ناردم، ئەوانیش زانیاریی وەهایان تیدابوو کە ئەگەر بەر لە دەرچوونی کتێبەکە لێیان بەڵەد بامایە سوودیان بە کتێبەکە دەگەیاند. بە نموونە لە لاپەڕە دەی تێبینییەکاندا دەڵێ:
دایکی حەماغای کۆیێ (حەماغای گەورە - وەک خۆم دامناوە) کچی وەستا حەمەدی عەودی دەباغچی کۆیێ بووە، سمایلاغاش هەر لەو ئافرەتە کەوتۆتەوە. من چەندێکی لە غەفوورییەکان پرسیارم کرد لەم ڕووەوە هەر ئەوەندەم زانی کە دایکی حەماغا ڕەحمەخانێک بووە خەبەرەکەش لە یەکێکی حەوێزی وەرگیرابوو...
تێبینییەکان زۆر بە کەڵکن ڕۆژی کەڵک لێ وەرگرتنیان دێت، بڵێن ئینشاڵا.

د. کوردستان موکریانی، بەتەلەفۆن، لە زاری خۆی و ئەوانەی لێشی بیستوون لە گوێمی چرپاند کە بیرەوەرییەکانم شەبەنگی ئافرەت و دەوری ئافرەت لە ژیانی منیان تێدا نییە. نەختێک لەو ماوە زۆر کورتەی وتووێژی تەلەفۆندا هۆی ڕەنگنەدانەوەی گوڵ و بەرگ و پەڵکەزێڕینەی ئافرەت بۆ د. کوردستان ڕوون کرایەوە... تۆ بڵێی نەزانم چێشتی بێ خوێ و باغی بێ مێوە و مەزاری بێ گوڵ و مەل نوقسانن! بەڵام چۆناوچۆنی دەرفەتی تەسکەبەری ئازادیی تەعبیر لە ڕۆژهەڵاتە خۆشەویستەکەی نەبوردووەکەی چاونەپۆشەکەی خۆمان بەرفرەوان بکەم هەتا قافڵەی بە زەنگۆڵەی پڕ هاتوبات و بریقوباقی کاڵای هەمەچەشنەیی خوشکەکەی فرشتە و پەریی کیژۆڵەی کوردستانی دەمی گەنجایەتیمی پێدا بێتە ناو چلچراخانی یادستانی دڵێکی هەستیارەوە!!

چەندین برادەری خۆشەویست و کەسانی کە پێشتر نەمناسیون بە گەرمی لە دەرچوون و دەرنەچوونی بیرەوەرییەکانم دەپرسنەوە، هەتا ئەوەی هێندێکیان پاتەوپات پێیان گوتم کە دڵشکەستەیی وەهای کرد ئەو ژمارەیەی کە چاوەڕوان دەکرا ئاڵقەی شەشەمی تێدا بێت و نەبوو نەیکڕن... یەکێکی زۆر ڕێزلێگیراو کە دەبوو هەر جارە لەلایەن دەزگای ڕۆشنبیرییەوە هەموو ژمارەی گۆڤارەکان و نوسخەی کتێبەکانی بۆ بچێت، گوتی دانەیێکی ئەو ژمارەیەی ئاڵقەی چوارەمی تێدا بوو بە دوو دیناری کڕی... ئەو ژمارەیەی کە برادەران نەیانکڕیبوو باسێکی زماناسانەی دوور و درێژی خۆیشمی تێدا بوو، تومەز تامەزرۆیی بۆ چەژی ناو گەشتەکە کێشابوونی دەنا دەبوو باسە زمانییەکە دوو هێندەیان بکێشێت.

لە زۆر لاوە خوێنەرانی ئەو ئاڵقانە کورتە مێژووی بنەماڵەی خۆیانیان بۆ ناردووم، بە سپاسەوە پێبەپێ لە جێی پێویستدا بڵاو دەکرێنەوە. لێرەدا یەکێک لەو قەردانە دەدەمەوە. لە ئاڵقەیێکی پێشووتردا باسی کوژرانی پیاوێکی سێنانیم کرد، لە هاتوباتی بووک گوێستنەدا گوللەیێکی کوێری بەر کەوتبوو. لەو موناسەبەیەدا معاون پۆلیسی ئەوسای کۆیەم بە چاکە ناوهێنا بێ ئەوەی بە خوێنەرانی بناسێنم، ئەو جوامێرە «ڕەفعەت ئەحمەد» خەڵقی کفرییە بە «وەنداوی» مەشوورن. وەک خۆی بۆی گێڕامەوە لە دزەیاتییەوە ڕایان گوێستووە بۆ کفری. دایکی کیژی فەتاح بەگ، ئامۆزای «ڕەشید بەگی ئەحمەد بەگی بێتوانە»یە کە لە تیرەی «پشتگەلی»ی میرەکانی خۆشناون، لە «ئەنوەر بەگی میرانی ڕەشید بەگ»م پرسی، لەگەڵ

نەختێک ڕوون کردنەوە، قسەکانی بە ڕاست گێڕا. کاک ڕەفعەت ئێستە ماڵی لە بەغدایە و خانەنشینە.

کە هەر قەرزدانەوە بێت پێویستە بڵێم، ساڵی 1935 کە لە خزمەت مامدا چووین بۆ سلێمانی، زیارەتی ماڵەکەی شێخ مەحموودمان کرد، بەڵام وەها ڕێککەوت کە هیچ یەکێک لە کوڕانی لە سلێمانی نەبوون، ئەمەشمان دەزانی، بەڵام پێویستێکی ئەدەبی بوو ئەو زیارەتە بکەین.

ناوناوە وردە گلەییم بۆ دێتەوە لە هەندێ باس و خواسی ناو گەشتەکە کە جێی ڕەزامەندی ئەم و ئەو نابێت، من لە بەرنامەمدا نییە بە ئانقەست یەخەگیری کەس ببم کەسێکی موناسەبەش ناوی بهێنێتە ناو گەشتەکەوە بە پارێز قەڵەمی لێ دەگێڕم. بەڵام هەروەک زەدەی ناکەم چاکەشی بۆ هەڵنابەستم. تکام ئەوەیە خوێنەرێک کە لە نووسینەکەم ناڕازی بوو هەر چونکە حەزی دەکرد شتێکی شیرنتر بگێڕمەوە لەوەی بەر دۆستێکی، وەیا خزمی خۆی کەوتووە، با ئینساف بەکاربهێنێت و ئەوەندە نووسینەم بە نووسینێکی وەک ئەوم بگرێت کە باسی کەسێکی بێگانە بە خۆییم کردووە و لێی ناڕازییش نابێت. کپ کردنی قەڵەمی نووسەر وەک زمان بڕینی مرۆی قسەکەرە. ئەگەر باخەڵفەڕاحی لە خوێنەرانەوە، وەیاخود لە خاوەن عەلاقانەوە بەکار نەیەت دەبێ هیچ کەسێک هیچ ڕووداوێک و بیروباوەڕێک بڵاو نەکاتەوە، ئەوەندەی قسەی نارەوا لە بارەی منەوە بڵاو کراوەتەوە کە هێندێکیان قانوونیش دەیگرتن پترە لە تێکرای ئەو شتانەی من لە بارەی خەڵقەوە نووسیوەتم کە بە چ نیازێکی تایبەتی و دوژمنایەتیشەوە لێم نەبیستراوە.

ساڵانی خوێندنی حوقووقم، بێگومان، لە هەموو ڕووەوە جۆرە گۆڕانێک بوو لە ڕێبازی ڕەوتی بەسەربردنم. شاری بەغدا خۆی بە تەنها تاقیکردنەوەیێکی نوێ بوو بۆم و بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە وەکوو من و پتریش لە من ژیانێکی یەکنەوای سەربە قەپێلکیان لە شارە بچووکەکەی خۆیاندا ڕادەبوارد. هەرچەند لە بەغداش ڕێم بە خۆم نەدا داوە مەعنەوییەکانی پێوەندی بە ئاکار و ڕەفتاری میراتیم هەڵبڕمەوە تا ئەوەی بە درێژایی چوار ساڵی بەغدام تەنها سێ جاران بە ناچاری لەگەڵ پیاوی ماقووڵدا چووم بۆ «ملهی» دیسان بەرینایی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی و شارستانەتی و سەقافی و خولگەی هەڵسووڕ و داسووڕ لە بەغدا قیاسی هەڵنەدەگرت لە چاو شارەکانی دیکەی وڵات.

جارێک لەو سێ جارانەی کە دەڵێم بە ناچاری چووم بۆ مەلها، ئەوە بوو کە لەگەڵ دکتۆر نەجیب عەبدلنوور، دکتۆری خەستەخانەی کۆیە، شەوێکیان چووینە مەلهاییێکی عێراقی کە گۆیا بابەتی یەکەمی مەلهاکان بوو. ئەو شەوە ئافرەتە گۆرانیبێژەکان و سەماکەرەکان ئەوەندە بەئەدەب و بەناموس بوون وەهایان لە دکتۆر نەجیب کرد کە بە دڵشکستەییەوە بڵێت: سەیری تالع و بەخت بکە، تیاترۆکان ئەم شەو لە ئافرەتی «شارع الرشید» بە ئەدەبترن. قسەکەشی ڕاست بوو، چونکە بەڕاستی جلەکانیان وەهای داپۆشیبوون هیچ جێگەییێکی لەشیان دەرنەدەکەوت کە لە نوێژدا نابێ دەرکەوێت... دکتۆر نەجیب میسری - لوبنانی بوو، هەتا بڵێی نیگافرەوان و قسەخۆش و دۆستمەشرەب بوو. لە کۆییان کۆییتر بوو. بە دوایی بووش بە زاوای کۆییان و کچێکی بە ڕێوجێی خواست کە دکتۆر نەجیب بۆی بوو بە موسڵمان... ئەم خزمایەتییەی دوای دەرچوونم لە حوقووق پێک هات، خۆیشم یەک بووم لە دوو کەسان کە داخوازیمان بۆ کرد، کەسەکەی دیکە کاکە زیادی حەماغا بوو. سەد جاران لێی پیرۆز بێت. نشیمەنی بۆ ماوەی دوو ساڵ و نیو لە ژوورێکی خانی حەمد مستەفاغا و حەمە تەیباغای حەوێزی بوو کە نزیک لە کۆنە مۆزەخانەی بەغدا بە لای ناوەوەی خانووەکانی ئەو گەڕەکە نەک بە لای شەقامەوە هەڵکەوتبوو.

بەختی یار وەهای کرد هاوڕێییێکم بۆ بڕەخسێت و لەلایەن خواردنەوە پێوەی بحەسێمەوە. محەمەد کاکەخان کوڕێکی خانەقینی کە ئەوسا لە پلەی ناوەندی دەیخوێند و ژیان فێری کردبوو چێشت لێ بنێت و سەروبەری مەتبەخچیەتی و لەوازمی خواردن بە ئەستۆوە بگرێت. ئا ئەم گەنجە بۆم بوو بە «خدری زیندە». من لە ماڵەوە هەرچی خواردەمەنی پەکی لەسەر بکەوتایە وەک بزنج و ساوار و نیسک و نۆک و دۆشاو و سماق و... و... بۆم دەهات، وەیاخود لەگەڵ خۆمدا دەمهێنا، محەمەدیش چی مەنجەڵ و کەتلی و پریمز و کەلوپەلی چێشت لێنان هەیە پێی بوو، فێریش بوو چێشت لێبنێت، بەڕاستی چاکیشی لێ دەنا. تەنها گۆشت و ڕۆن و نانمان لە بازاڕ دەکڕی... چەندێکی بشڵێی تەبیاتی خۆش بوو، لە دڵ ڕاگرتنی برادەر بێقسوور بوو، بە زیادەوەش تێبینیی خواروژووری پلەی خوێندنمانی دەکرد ئیتر بە چاوی براگەورە سەیری دەکردم، کە من هیچ ئەم لایەنەم بەسەردا

نەدەسەپاند، بە پێچەوانەوە لە غەیری چێشت لێنانەکە ڕێم نەدەدا براچووکەیی و گەورەییمان پێوە دیار بێت.

محەمد ناسیاوی «ڕەشیدی سمایلاغای باجەڵان»ی خانەقین بوو، کەوا بەر لەوەی من بێمەوە بەغدا، ڕەشید لەگەڵ «دڵدار» (یوونس ڕەئووف) و کاکە حەمەی خانەقا برادەرایەتیی خۆی چەسپاندبوو، بەڵام محەمەد لە ئاست ڕەشیددا خۆشویستن و گلەیی تێکەڵ دەکرد، هەرگیزیش نەچوومە بنجوبناوانی ئەو بارە نەگونجاوەوە.
محەمەد کەوتوڕەوت خوێندنی حوقووقی تەواو کرد. بەینێک بووە فەرمانبەری میری لە «تسوية»، دواتر وازی لەو وەزیفەیە هێنا و ئێستا مەکتەبێکی محاماتی هەیە، شوقەیێکی سەرلەبەری گرتۆتەوە لە «ساحة النصر»ی «باب ئەلشەرقی» و شوکرێ لە هەموو ڕوویەکەوە دامەزراوە و ڕەگی لە ژیانی تێروتەسەل داکوتاوە... لەوەتەی دەیناسم، کە پتر لە 45 ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، دڵم گەردی لێ نەگرتوە...

کاکە ڕەشید باجەڵان-یش کە لە ڕۆژانی سەرەتای حوقووقمەوە ناسیم و بووین بە دۆست هەرگیز لە هیچ ڕوویێکەوە بایی سەری دەرزی چ لە حوقووق و چ پاش حوقووق، دڵ نیگەرانیمان نەبوو. ئەو ساڵێک پێش من بوو، بەینێک محامات و دواتر وەزیفەی دادپرسی دیت هەتا لەو داوییە خۆی خانەنشین کرد. کە یەکدی دەبینین هەر بەو گیانی قوتابیەتیی چلەکان دەدوێین. ناڵێیت تەمەن و لە یەکتری دابڕان دەورێکی هەبووبێت لە گۆڕینی تەبیات و پەرۆش بۆ یەکتر و لەزەت لێک وەرگرتن. کە گوتاری «میرزا عبدالكريم» دەرچوو لە گۆڤاری کاروان، کاک ڕەشیدم دیت زۆری گوتارەکە پێ خۆش بووبوو. گوتارەکە خۆم نووسیبووم و بڵاوم کردبۆوە ئەویش لە وەفاداری بۆ سەربازێکی بێ دەنگ و هەرای کوردایەتی و دۆست و ناسیاوێکی دراوسێی خانەوادەیەک کە لە ڕۆژگاری باپیری باپیرمەوە لە خزم نزیکتر بوون،ماڵیشمان لە سەربانەوە بۆ بانی ئەوان 7 متر دوور و لە دەرگەمان بۆ دەرگەیان بە کۆڵانەدا سی مەتر مەودا بوو.

بە ئیزنی مامۆستا ڕەشید باجەڵان ئەم خەمرەوێنەوەی سەردەمی خوێندنی حوقووقمان بە عەرزی خوێنەر دەگەیەنم: کاکە ڕەشید و کاکە حەمەی خانەقا و دڵدار سێ برادەری هاومەشرب و هاوباوەڕ بوون، بەزۆری لەگەڵ یەکتردا ڕایان دەبوارد هەرچەند خەوگەی کاک ڕەشید لە بەری «کەرخ» دوور لە شوێنی کاکە حەمە و چەند برادەرێکی دیکەیان بوو... شەوێک لە شوێنەکەی کاکە حەمە

برادەران کۆدەبنەوە هەم بۆ ڕابواردن و هەم بۆ خەفتیانی پێداویستەکانی چالاکی سیاسییان. لە دەمی گەپ و نوکتەدا دەکەونە سەر باری قسەی تێکەڵ و تێک ئاڵقاو کە بەزۆری خەڵق بە تەڵەیەوە دەبێت. ڕەشید قسەیەکی ئەوتۆیی لە عەرببیەوە دادەهێڵێ بەڵکوو بۆریان بدات، بریتی بووە لە چەند پات کردنەوەی وشەی «نبگ» کە دارێکی بەرداری بەغدایە، ئیتر: «لنا نبگة ولكم نبگة، نبگة نبگتنا ونبگ نبگتكم...» هتد، کۆمەڵەی برادەران خۆی لێ گێل دەکەن و هەرجارە یەکێکیان لێی داوا دەکات بۆی بڵێتەوە، ئیتر کاکە ڕەشید ماندوو دەکەن تا دوایی دانیشتنیان، دەچێتەوە بۆ خەوگەی خۆی، جارێ نەنوستووە تەلەفۆن داوای دەکات، تومەز جەماعەت داوای دەکەن و دەڵێن هەر ئێستاکە بۆ کارێکی زێدە گرینگ دەبێ بگەیتەوە لامان. ڕەشیدیش لێی مەعینە شتێکی سەربە حیزبایەتی لزوومی ئەو داوایەی کردووە، بە هەڵەداوان و نەفەسسواری دەگاتەوە ژوورەکەیان و دەڵی چی ڕووی داوە؟ بە خوێنی ساردەوە دەڵێن: ئەرێ بەخێری خۆت مەسەلەی «نبگ نبگتنا» مان بۆ دووپات بکەوە، باشمان لە بیر نەماوە... با ئەوەش بڵێم، کاکە ڕەشید لە تەبیاتیدا نەبوو لە کردەوەی ئەوتۆیی خەریکی تۆڵەستاندنەوە بێت.

پێوەندیی ناسیاویم بە گەلێک لە گەنجی کوردی ئەوسا کە لە هەموو لایێکی کوردستانەوە بۆ خوێندن هاتبوونە بەغدا بنیات نرا، بەڵام زۆر بە خێرایی لەگەڵ «کاکە حەمەی خانەقا» و «عومەر عوسمان»ی کۆنە هاوڕێی خوێندنی هەولێر وەها نزیک بووینەوە، ڕۆژ و شەو تا دەمی نوستن، بە زۆری لەگەڵ یەکتردا ڕامان دەبوارد ئیتر بە موتالای دەرسەکانمان بێت، وەیا بە کاتکوژی بێت. ئەم سێیەمان بە جۆرێک یەکدیمان گرتبووە وێنەی نەبوو لە نێوان هیچ جووتە، وەیا تاقمە برادەرێکدا. بەیەکەوە بیتاقەی یانەسیبمان دەکڕی، جارێکیان بیتاقەیێکی پەنجا فلسیمان نیو دیناری بردەوە، سەر و 150 فلسمان قازانجی پێ برا، کاکە حەمە پارەکەی خۆی دایە یەکەم هەژاری پێی گەیشت، من و عومەر نانێکی قاوەڵتی باشمان پێ خوارد کە ئەوسا نەفەرێک لە لۆقەنتەی عادەتی کەمتر لە پەنجا فلسی بۆ یەک جەم دەچوو... جارێکیان دیکە یانەسیبمان نەبردەوە.

عومەر عوسمان مرۆیێک بوو لە هێوێنی ساغی و ڕاستی و دڵسۆزی و خۆنەویستی دروست کرابوو. لەو ماوەی یەک دووساڵیدا کە بەیەکەوە هەرسێمان هاوڕێی خوێندن بووین، ڕۆژەک لە ڕۆژان ئارەزۆی خۆی پێش ئارەزۆی ئێمە نەیەخستەوە...

هەر کەسەرێکی لە دڵدا هەیبووبێت نەیدەهێنایە سەر ڕووی. نەمدیت ئەم مەلایەکەتئاکارە بە هیچ مەسەلەیێکی خۆیەوە بەرنامەگۆڕی وەیا مڵچومۆنی و کزی و عاجزی بەسەر ڕابواردنی ڕۆژانەماندا بهێنێت. تۆ بڵێی لە دەستە تەرازووی چ مەردێکدا جێ دەبێتەوە بۆ ئەوەی نەساغیی کوشندەی خۆی بشارێتەوە و ئەرکی لەشساغی بخاتە سەر لەشە کەنەفتەکەی هەر هەتا بەرنامەی برادەرانی لە ڕابواردنی ڕۆژانەیاندا کەلێنی تێنەکەوێت؟ عومەر دووچاری سیل بووا بە دەرنگەوە ئەو ڕاستییەمان زانی... خوێندنی واز لێهێنا... جوانەمەرگ بوو...

برادەرایەتیی سێ قۆڵی لە نێوان عومەر و کاکە حەمە و مندا دوای مەرگی عومەر سەرلەنوێ بۆوە بە سێ قۆڵی کە دڵدار بوو بە کوچکەی سێیەم. بە دەم گەشتەوە باسی ئەم برادەرایەتییە دێت.

لەو قوتابییانەی پێوەندی نێوانمان گەیشتە برادەری و لەزەت لە یەکتر وەرگرتن چەند کەسێکی بوون. لە مانە جەمال ڕەشید و کەمال عەبدوڵا کە قوتابی بوون لە کۆلێجی «طب» و دواتر بوون بە دکتۆری سەرکەوتوو. د. جەمال وێڕای شارەزایی لە لەش و ماددە، لەگەڵ ئەدەب و زمانیش ئاشنا بوو. د.کەمال شەکرێک بوو بۆ خۆی. ئەگەر بڵێم شەرم بەخۆییێک بوو بە هەڵە ڕێی بزر کردبوو بۆ ناو گۆبەندی ئادەمیزاد لێم بە زیاد مەگرە. ڕۆژێکیان لەبەر دەمی دووکانی سیمۆن ئەفەندی (کە هەر ئێستا باسی دێت) د. کەمال و د. جەمال و من ڕاوەستابووین تەعلیقی سەیرۆکەمان لێ دەدا بەسەر ئەوەی دەهاتە پێش چاومان. دکتۆر جەمال و من لە قافیەی «مسرور، مغرور....» بە عەرەبیی کوردیئامیز کە گۆیا خەڵقەکە تێی ناگەن چۆنێکی بۆمان هاتبایە دوڕمان دەقەڵاشت. نۆرەی دوکتۆر جەمال بوو، شتێکی گوت لەو قافیە، هەر ئەو لێ بۆوە، کابرایێکی پشتکووڕ گەیشتە ئاستی من و خەریک بوو بۆ لای دکتۆر کەمال ڕەت دەبوو منیش بە قافیە ئارایی و مناسبی وەزعی ئەو کابرایە گوتم: «وپشتە قمبور» بەلای خۆمەوە چ عەربێک لەم قسەیەم تێناگەت کەچی قەمبوور لای عەرەب ئاشنایە من نەمدەزانی. کابرا ڕووی وەرگێڕا و بە ترشییەوە دەنگی بۆ د. کەمال هەڵبڕی و دەستێکی لێ هەڵتەکاند و گوتی: خۆش ئاداب یاخود خۆش ئەخلاق... د. کەمال ڕووی مۆر هەڵگەڕا نەشی دەویست تاوانەکە لە خۆی بتەکێنێتەوە بە منی بداتەوە. هەزاران هەزار حەیف کە ئەم مرۆیە نرخدارەمان لە هەڕەتی گەنجایەتی و تافی پێگەیشتنی لە کیس چوو. دکتۆر جەمال

تا دەمی ئەم نووسینە برادەرمە و بەدرێژایی 46 ساڵی ڕابوردوو برادەریمان لە گەشەدا بووە هەرچەند دەرفەتی یەکتر دیتنیش وەزەحمەت کەوتووە.

لە گرووپی قوتابییەکانی حوقووق مەگەر چۆنهایەک دەنا هەموو کوردەکان بە ناچاریی ناسیاو و ئاشنا بوون. لەگەڵ جەلال و بورهانی حامید بەگ و سەعیدی ئەفراسیاب بەگ و عومەری محەمەداغا و مەجید یاوەر و زەیدی ئەحمەد ئەفەندی و حەمە سەعیدی حاجی برایماغا و جەلیل هۆشیار و «باییز و برایم و جەوهەر و کانەبی»-ی عەزیزاغا و باییزی عەبدوڵاغا و محەمەدی فەتاح چلەبی و «برایم و تەلعەت»-ی محەمد عەلیاغا و فەتاح مەحموود و محموود تۆفیق... هەمیشە بەیەک دەگەیشتین. لەمانە هێندێکیان لە خوێندنی ناوەندییەوە ناسیاوم بوون کە لە هەولێر بەیەکەوە خوێندبوومان. لەگەڵ هێندێکیان بەپێی ڕێکەوت برادەریمان بەهێزتر بوو. زەیدی ئەحمەد ئەفەندی بەپێی خزمایەتییێکی کە لەگەڵ ماڵی مامم و دوو پوورمدا هەیبوو بۆ منیش سەرەڕای برادەری بە خزم حیساب بوو، لە 1930 شەوە دەمناسی. هێندێکیان ماڵیان لە بەغدا بوو، یاخود ماڵێکیان لە بەغدا بوو، ناوناوە نیوەڕۆژەشمان لایان دەخوارد، تێیاندا بوو بەر لە من و دوای من گەیشتنە حوقووق، هەر بەو پێیە زووتر و درەنگتر لە من حوقووقیان تەواو کرد.

قوتابییەکان لە دووکانی سیمۆن ئەفەندی کە پیاوماقووڵێکی ئەرمەنی بوو دەمێک بوو کەوتبوە بەغدا، دووکانەکەشی لە زارکی لاشەقامی ئەکمەگخانە بوو شیر و چایە و نانی سبەینانی دەفرۆشت زۆر خاتری دەویستین و ڕۆژانی جومعە قوتابیی چەندین «کلیە» لێی کۆدەبوونەوە، ئا لەوێدا ئاشنایی نێوان جۆرەها قوتابخانە و «کلیە» دادەمەزرا. مستەفا عەزیز و فەتاح شاڵی و محەمد ئەمین دەربەندفەقەرە و فەوزی سائیب لە قوتابیانی کولییەی حەربییەم لەو ڕۆژانەدا ناسین. لە برایانی بەری بادینان سددیق ئەتروشی و جەمیل ڕەشید و سادیق بەهائەدیین ڕووی ئاشنا بوون. نوکتەیێک پەیدا بووبوو دەیگوت ئەوەی کوردە دەبێ هێلکەوڕۆن لای سیمۆن ئەفەندی بخوات و سەری لە «صالون حلاقة الشرق» - کە هەر سی چل مەترێک لە دووکانەکە دوور بوو - بتاشێت و جلک لای وەستا بەشیر موشیر بدورێت. وەستا بەشیریش بە هەمووی سەد مەترێک لەو دوو مەرکەزەوە دوور بوو. من لەم سێ ڕوکنە دوانیم هەبوون بەڵام هەرگیز ڕێک نەکەوت بچمە دووکانی بەشیر ئەفەندی. هەر بە بۆنەی هاتوچۆی قوتابییەکان بۆ دووکانی سیمۆن ئەفەندی

مێوانی خوێندەواریش کە دەهاتنە بەغدا سەردانی دووکانەکەیانی دەکرد. من یەکەم جار «فایەق بێکەس»م لەو دووکانەدا دیت. ئەو قوتابییانەی وەکوو من نشیمەنیان لە سیمۆن ئەفەندی نزیک بوو هەموو سبەینەیێک نانی سبەینەمان لای ئەو دەخوارد. هێلکەورۆنی ئەو دووکانە بێمانەند بوو.

سیمۆن ئەفەندیش چاودێریی قوتابیی کوردی دەکرد. کە حەرب درێژی کێشایەوە و خواردەمەنی عەزیز بوو زۆر سبەینان سیمۆن ئەفەندی هێلکەی گل دەدایەوە بۆ قوتابییەکان و نەیدەدایە کەسی دیکە. قەرزی لای قوتابیی هەژاری کورد کۆدەبۆوە تا ئەوەی وەها ڕێک دەکەوت قەرزەکە دەسووتا... تا بڵێی لامان بەڕێز بوو، خۆیشی لە بنەماڵەکانی ئەرمەنی بوو. خێزانی ناوناوە سەری مێردی دەدا، ئافرەتێک بوو وێچوویی و خاتوونیی لێ دەبارێ... دواتر لە سەفەرێکمدا کە چوومە لای سیمۆن ئەفەندی و هەواڵی خێزانەکەیم پرسی دایە گریانێکی بە هەنسک ئاوی لە چاوی منیش هێنا. گوتی چەند حەفتەیەکە مردوە... دوو کوڕی هەبوون، ژیانی مەیلەو بەڕەڵای ئەوسای بەغدا لە چاو وێڵ و تەرتیبێکی کە سیمۆن ئەفەندی و ژنەکەی بە جحێڵی لە مەفتەنی خۆیان تێیدا پەروەردە بووبوون دەرفەتی ئەو دوو کوڕە و دایک و باوکەکەیانی نەدا کە بەیەکەوە بگونجێن، هەمیشە سیمۆن ئەفەندی گلەیی لێیان هەبوو، ناوناوە بەدەم گلەییەوە دەشگریا.

ئەو ساڵەی خوێندنی حوقووقم کە بە ساڵی 1941-1942 دەناسرێت هیچ کیژێک وەرنەگیرا. خوالێخۆشبووی عەمیدی ئەوسای حوقووق مامۆستا «مونیر ئەلقازی» لەبەر ناتەواویی ئەو خانووەی حوقووقی تێدا بوو لە ڕووی پێداویست بۆ حەسانەوەی کیژان بڕیاری دا کیژان وەرنەگیرێن. حوقووق ئەوسا لە «باب المعظم» بوو خانوەکەشی کۆن و تەسکەبەرە بوو. زوو بە زوو گوێزرایەوە بۆ بینایێکی دیکە گەورەتر لە «وزيرية» بەڵام لەوێشدا حەسانەوەی کچ مەسۆگەر نەبوو. خۆم دیتم کچێکی یەک لە وەزیرەکان دەرچوو بۆ لای ماڵە «معێدی» یێک کە لەو نزیکانە زنجێکیان پێکەوە نابوو، بە یارمەتیی ئافرەتەکانی ئەو ماڵە معێدییە کچەکە لە تەنگەتاوی ڕزگار بوو. ئەم ڕووداوە هی ساڵی دوەمی خوێندم بوو، واتە لەو بینایە نوێیەشدا تا ساڵی بەسەردا تێپەڕی چاری وەزعی کچە قوتابی نەکرابوو. کچان لە ساڵی دوەمی خوێندنم وەرگیران بۆ پۆلی یەکەم بەڵام مامۆستا مونیر ئەلقازی لە عەمیدایەتیدا نەمابوو یەکێکی میسری، د. عەبدولحەمید ئەلوەشاحی بوو، بووە

عەمید. بەر لە ئێمە تاکە تاکەی کچان لە پۆلی دوەم و سێیەم و چوارەم هەبوون. من دەمگوت بوونی کیژ لە پۆلدا بۆ هاوینان جێگەی پانکە و لە زستاندا جێگەی سۆبە دەگریتەوە. ئەمەم بۆ نوکتە بوو بەڵام بەڕاستی هەبوونی کچ لە پۆلی کوڕاندا لەنگەرێکی ڕێکوپێکی ماقووڵی و شەرم بەخۆیی و بەخۆوە خەریک بوون ڕادەگرێت.

دوای من بە دوو ساڵ یەکێک لەو کیژانەی وەرگیران ناوی بە جوانی دەرکردبوو لە بەغدا. من لە پۆلی سێیەم بووم ئەو هاتە پۆلی یەکەم. شاعیرێکی «ڕؤوف الجبوري» ناو - کە یەک تاڵ موو بە لەشیەوە نەبوو بەڵام هەتا بلێی ڕووحسووک و قسەخۆش بوو - شیعرێکی بەو کچەدا هەڵگوت نوکتە ئامێزی ئەدیبانە، سەرەتاکەی ئەمە بوو: «الله اكبر يا...! فيم التكبر والدلال...» ئەم شیعرە بە سەلامەتی تێپەڕی بەڵام قەباحەتێکی دیکەی بێئینسافانە دەنگی دایەوە. ئەوسا لە گۆڤارێکی حەفتانەی میسر عەباس مەحموود ئەلعەققاد وەڵامی پرسیاری خەڵقی دەدایەوە بە شێوازە دەوڵەمەندەکەی خۆی. یەکێکی خەفەت لەدڵ بە ئیمزای ئەو کچە نامەی نارد بۆ عەققاد دەڵێ: من کچێکی نیگافرەوانم لەگەڵ کوڕان دەردەچم بەڵام بەداخەوە هەر کوڕێکی بیناسم هەر دۆستایەتی و دڵداریم پێشکەش دەکات، کەس نەهات خوازبێنیم بکات... عەققاد بێ ئەوەی بزانێ نامەکە هەڵبەستراوە وەڵامی دایەوە دەڵێ: لە پرسیارت وەڵام دەزاندرێ، ئایا خۆت ڕازی دەبیت شوو بکەیت بە کوڕێک لەلایەن ڕووکراوییەوە وەکوو خۆت بێت؟ کچەکە لە ناخی دڵەوە ئێشی گەیشتێ و شکاتی بردە لای عەمید. نووسەر ناسرا بەڵام نازانم چۆناوچۆنی مەسەلە چارەسەر کرا، نووسەریشم نەناسی چونکە لەو دوو ساڵەی من تێیدا قوتابی بووم هێندە قوتابی وەرگیران نەدەناسران. ئێمە 100 کەس وەگیراین، دواتر 500، 600- 1000 وەرگیران.

پاش بەرپابوونی شەڕی نێوان ئەڵمانیا و ڕووسیا و لەو ساڵەی 1941 دا، ئەوانەی قەومی بوون لەگەڵ شیووعییەکان لێک دڕدۆنگ بوون تاکوو یەک لە ڕۆژەکانی ساڵی 1942 کوڕی وەزیری عەدل کە شیووعی بوو لە توانجێک کە لە ڕووسیا گیرا لە کۆریدۆری بەینی پۆلەکان یەخەگیری یەکێکی نازی بوو، من لە پێپلکانەوە دەهاتمە خوارەوە، جێگەم بەرز بوو تێک هەڵقژانەکەم لە قەڵەباڵغیدا دەدیت. شیووعییەکە کەوتە سەر ئەرز بەڵام خێرا هەڵستایەوە بۆ شەڕ، خەڵقەکە کەوتنە نێوانیانەوە. مامۆستایێکی میسری، د. جابر جاد عەبدولڕەحمان، لەو دەرسەی دوای

شەڕەکە بە توندی دوا و زۆر بەسەر ئەوانەدا ڕۆیشت کە شەڕی ئایدیۆلۆجیای دەوڵەتانی دوورەوڵات دەهێننە ناو چوار دیوارەی کولییە. بەڕێکەوت شەڕکەرەکان هەردوویان قوتابیی پۆلی ئێمە بوون. بەڵام ئەم دووانەی مامۆستا نەیتوانی ببێتە ئاگرکوژێنەوە، بە پێچەوانە پەراوێزی ناکۆکی فرەوانتر بوو تا ئەوەی بە دەستە لێکیان دەدا. کار گەیشتە جێگەیێک عەمید مەسەلەی بە حکوومەت ڕاگەیاند ئیتر بە دەسەڵاتی وەزارەتی داخلیە کێشەکە چارەسەرکرا. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێم زوربەی هەرە زۆری قوتابییەکان هیچ پێوەندییان بەو ناکۆکییەوە نەبوو زۆریشیان پێ ناخۆش بوو هەرا بگاتە ئەو ڕادەیە.

برادەرێکم، «سعاد مراد مبارک»، کە پێشتر نەمدەناسی و لە حوقووق شناساییم لەگەڵ پەیدا کرد و پلەیێک لە من هەورازتر بوو لە خوێندن، دۆستایەتیی هەبوو لەگەڵ بەرەی چەپ ئیتر هەرچی پەخش و بڵاوکراوەی چەپ هەبوو بۆی دەهێنام. نووسین هەبوو ڕام لێی بێت بەڵام جارێکیان لە موناسەبەی گۆڕانی وەزارەت سەرگوتارێکی نهێنی لەو پەخشە نهێنیانەدا بە مەدحەوە هەڵوەستی میللەتی باس دەکرد کە هیچ گوێی بەو ڕووداوە نەبزووتوە و بایەخی پێ نەداوە. بە سوعادم گوت: مانای چی بێ میللەت مەدح بکرێت بەوەدا کە گەورەترین ڕووداوی سیاسی بێ پرسوڕای ئەو بکرێت و هیچ گوێی نەداتێ؟ ئایا ئەگەر پەرۆشی لێ خواردبایە وەیا دەنگی نارەزامەندی خۆی لێ دەربڕیایە دەبوو بە پیاو خراپ ناو ببرێت؟ جارێکیان لە سوعادیان داوا کردبوو کە من لە ئەدەبی کوردییەوە شتێکیان بۆ وەربگێڕمە سەر عەرەبی، منیش پارچە نووسینێکی کوردیم لەگەڵ کمێک دەسکاری کردن بەلای شۆڕشگێڕایەتیدا وەرگێڕایە سەر عەرەبی. دوای دوو ڕۆژ سوعاد پێی گوتم، ئەو برادەرانە نووسینەکەیان زۆر تەماوی دانا دەڵێن شتی خەستترمان دەوێت، منیش نە شل و نە خەست هیچی دیکەم بۆ نەنووسین. ئەم «سعاد مراد مبارک» ـە لە ڕادەبەدەر بوو بە برادەرم. باوەڕ ناکەم لەگەڵ کەسی دیکە وەها نزیک بووبێتەوە. لە سەرەتای پەنجاکاندا بوو بە حاکم (قاضي) لە کۆیێ. ئەوەندەی باوەڕ بە دۆستایەتیم هەبوو هەرچی ئیدارە و پۆلیس لێیان داواکردبایە هەتا پرسی بە من نەکردایە بڕیاری لێ نەدەدا... بە قسەی خۆم نەڵێم منیش چی لە توانام هەبوو لە چاکەی ئەو دریغیم نەدەکرد لێی.

له نموونەی پێوەندیی دۆستایەتیی ئەو سەردەمە شتێک دەگێڕمەوە. سوعاد له دەرووندا دوودڵییەکی هەبوو لەوانە بوو زوو بەخۆیدا بشکێتەوە. کاتێک ناچار بوو سەر له مەحکەمەی ڕانیە بدات، ترسی ئەوەی هاتێ چوونەکەی لەگەڵ دوو سێ پۆلیسی بێقوناغ و بێدەسەڵاتدا بکێشێتەوە بۆ بێسەنگی له نەزەر عەشیرەت و براگەورەکانی ئەو هەرێمەدا. که ترسەکەی لای من درکاند گوتم برا ترست نەبێت، ئێمەت لەگەڵ دەبین. خۆی چوار پۆلیسی لەگەڵدا بوو، منیش 10-12 سواری چەکدارم بەگەڵ خۆم دا، بووینە 15-16 بەڵکوو پتریش. شەو گەیشتینە ماڵی خاڵه شێخ خدرم له سەیداوای پەنا ڕانیە... بەو شەوە خزمان له بۆسکێن و ڕانیە زانییان هاتووین قەڵەباڵغیمان تێ ئالا... سبەینێ که چووین بۆ ڕانیە چەکدارەکانی خاڵه خدرم و هی شێخ حسێنی حاجی سەیدگوڵ و ئەوەی لەگەڵمان بوون 30-40 سوارێک دەبوون... بیستمەوە قایمقامی ئەو دەمەی ڕانیە گوتبووی حاکم هاتووە ڕانیە ئیحتیلال بکات... هەڵبەت مەبەسی له زۆریی ئەو چەکدارانە بوو. زۆر بە سەیری، لەو چەند ڕۆژەی سوعاد مراد ئیشی مەحکەمەی ڕانیەی دیت تاکە یەک سەرەک عەشیرەت لەوانەی گومانێکیان له خۆیان دەکرد نەهاتنە ڕانیە کەچی سوعاد خەیاڵیشی لێ نەدەکردن.

خوێنەر بمبەخشێت لەوەدا که وێنەیێکی دواکات ڕادەکێشم بۆ ناو باسی دەمی خوێندنم له بەغدا. پێویستە ئەوەندەش بیەخمە سەر قسەکانم که سوعاد موراد بەر لەوەی من بچمە حوقووق لەگەڵ «ڕەشید باجەلان»-دا برادەرییێکی بەتینی پەیدا کردبوو، ئەم برادەرییە هەر ما هەتا ئەوەندەی من زانیبێتم. سوعاد لەو ساڵانەی دواییدا له سەردانی خاتوو د. جوانی کیژی له لەندەن کۆچی داویی کرد. کتێبی دەگمەنی پەیدا کردبوو. هەر جارە سەفەرێکی ئەورووپای کردبایە چەند دانەیێکی نەزانراو و نەناسراوی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە. من لەو کتێبە دەگمەنانە *Magic, The shroud, The Great Pyramid* (تەرجەمەی ئەمەی دواییان وەها دەبێت: سیحر له ڕۆژاوای کریت - من دەقەکەم له بیر نەماوە. لەوانەیشە کریت نەبێت جێگەیێکی لەو نزیک بێت) و هی دیکەشم خوێندنەوە، جیهانێکی ئەفسووناوییان دەهێنا بەر نیگای خوێنەرەوە. لەم تەرزە دیراسانەوە دەمگوت: سەیر نییە ئەو خەڵقە ئاسمانگەڕی بکەن...

لە نموونەی پێوەندی و باوەڕی سوعاد موبارەک پێمەوە دەڵێن، دوو ئێستری ناسیاوێکی کۆیی کەوتە لای عەلی حەسەناغای مەنگوڕ، خاوەن ئێستر نامەیەکی سفارشی لێ وەرگرتم بۆ خاڵە خدرم کە ئێسترەکانی بۆ وەرگرێتەوە لە عەلیاغا. عەلیاغایەکی نیوەی ساڵی بە مێوانەتی لە خاڵە خدرم و شێخ حسێن ڕادەبوارد. خاڵم نامەکەی من لەگەڵ نامەیەکی ڕجاکارانەی خۆی بۆ عەلیاغا نارد... بێ سەمەر بوو. خاوەن ئێستر شکاتی کرد دژی عەلیاغا لە مەحکەمەی ڕانیە، کە ئەوسا بێ حاکم و لە دادگەی کۆیەوە سەرپەرشتی دەکرا، سوعاد لێمی پرسی گوتی: لە شورەتی ڕانیەوە بە ڕەسمی داواکراوە لێم فەرمانی بەندی کردنی عەلیاغا بنووسم بۆیان، تۆ دەڵێی چی؟ گوتم عەلیاغا ئەو ئێسترانەی زەوت کردووە و ئاگام لە مەسەلەکە هەیە، خۆشت حەق و ناحەق دەزانیت. دوای چەند ڕۆژێک دەمەو عەسر بوو یەکێکی ئەهلی ماڵەوە گوتی چەند پۆلیسێکی سوارە و چەند گرتوویەک لەبەر دەرگە داوات دەکەن، کە چووم دیتم عەلیاغایە بە سەر وڵاغەوە و بە دەستی بەستراوەوە گوتی فلان! وا لەسەر مەسەلەی ئێستران گیراوم چارەیەکم بکە... گوتم بە من چارە ناکرێیت و چوومەوە ژووری ماڵەوە. عەلیاغا بە نەتیجە بەربوو بەڵام بایی نرخی پێنج - شەش ئێستری پتر لە کیس چوو... خوا عەفووی کات. عەلیاغا لە ماڵی خۆی ناندەر بوو و قسەشی خۆش بوون. لە ئاکامیشدا بە تۆهمەیەکی بێ ئەساس خۆی و چوار پێنج کەس ئیعدام کران.

لە موناسەبەی حاکمایەتیی سوعاد مورادا دەڵێم چەند ناسیاو و برادەرێکی ئەو ڕۆژانەی خوێندنی حوقووقم بوون بە حاکم لە کۆیێ لە مانەی بە بیرم ماون: مەجید یاوەر، جەوهەر عەزیز، محەمەد ئەردەڵان، تەلعەت یەعقووبی، بەر لەوان خوالێخۆشبووی نوورەددین بەهائەددین. چەندێکیان لامان بوون بە قایمقام، سوبحی یەعقووبی، هادی ڕەشید چاوشلی و هی دیکەش کە ئێستا ناویان نایەتەوە بەر یادم.

وەختێک بورهانی سلێمان بەگ بوو بە مدیر ناحیە لە تەقتەق، دواتر بوو بە حاکم، لەو ساڵانەدا «جەنگ و کوردایەتی» لە مێشکی گەنجەکاندا بەیەکەوە دەژیان تاک تاک و کۆمەڵ کۆمەڵ خەیاڵگێڕییان لەوەدا دەکرد ئایا جەنگ چ کارێک دەکاتە سەر چارەنووسی کورد؟ بە کام لادا بکەوێت بۆ کورد لە بارترە؟ کورد چی بکات؟ هەمووی هەر کاری «کتێبگرتنەوە» بوو مەگەر ئەوەی کە بەشێکی چالاکی گەنجەکان لە ڕێی پێوەندییان بە حیزبی «هیوا» وە خەیاڵی خۆشکەڵەتریان بە دڵدا

تێدەپەڕی. ئەوسا جارێ فکری «چەپ» لای گەنجی کورد خەست نەبووبۆوە هەرچەند چەپایەتی خەریک بوو وەکوو هێوێن لە دەروونی ڕۆشنبیرە تازە پێگەیشتووەکاندا بگەڕێت. دەشێ بڵێین هەبوونی هێندێک کۆزرە کوردی سەربە چەپ کاری دەکردە قەناعەتی بەشێکی ئەو گەنجانەی کە زۆر شلک بوون و بریق و باقی چەپایەتیش تریفەی مێژووی کۆن و گەشایەتیی دوارۆژی بە بەرچاوی برسی و تینووی کورددا دەهێنا. بەشێکی زۆر لەو قوتابییانەی سەربە هیوا دوای دەرچوونیان لە حوقووق و کۆلیجەکانی دیکە بایان دایەوە بۆ چەپایەتیی خەست.

ڕابواردنم سادە بوو. سینەما بۆ من و چەند کەسانێکی وەکوو خۆم بەندێکی بنەڕەتی بوو. ئەگەر ڕووداوێکی ناگەهان خەتی هەنگاومی نەگۆڕیبایە سبەینان لای سیمۆن ئەفەندی هێلکەورۆن، دوای چایە و شیر لای ئەو ئینجا پیاسەی بەرەو کولییە. لە ڕۆژی گەرما و باران و درەنگ داهاتندا بە پاس دەچووم. لە گەڕانەوەدا کاکە حەمە و عومەر و من، کە عومەر داماڵا، یوونس ڕەئووفمان لەگەڵدا، دەهاتین لە لۆقنتەی «الهاشمي» بە تەنیشت سیمۆن ئەفەندییەوە فراڤین (نانی نیوەڕۆمان) دەخوارد. چایەمان لای سیمۆن دەخواردەوە. هەریەکە دەچۆوە بۆ حەسانەوە لە هێلانەی خۆی. پاش عەسر لە چایەخانەی «خلیل ابراهیم» کە بیستوپێنج مەترێک لە سیمۆن ئەفەندی دوور بوو یەکترمان دەگرتەوە جا ئەگەر نزیک ئەزموونی کۆتایی ساڵ باینایە هەر لە سەربانی ئەو چایەخانە بە قەپ و قڕی قەڵەباڵغی و شەق و تەقی دۆمینە و تاوڵەیەوە تا دوای دوازدەی نیوەشەو ڕامان دەبوارد، لەو بەینەشدا نانی ئێوارەمان هەر لە لۆقنتەی هاشمی دەخوارد...

عومەر عوسمان بە «بەختیار» نازناوی گرتبوو عەرەبەکانی هەمیشەنشینی ئەو چایەخانەیە دەیانگوت: «مرحبا اختيار افندي». خاوەنەکەی خەلیل ئیبراهیم، دواتر بوو بە حاجی خەلیل، پیاوێکی مەرد و گەش و لە بەغدا ناسراو بوو، ڕەنگە دە ساڵێک دەبێ مردووە. کە چایەخانەکەیان لێ تێک دا هەر لە نزیک ئەوەوە یەکێکی دیکەی ئاوەدان کردەوە و هەتا مردن تێیدا مایەوە، منیش هەتا مابوو ناوناوە لە ڕووی وەفاوە سەردانیم کرد. وەها بزانم چایەخانەکە «مقهى الحديث» ی لێ نووسرابوو.

وەفاداری لێم داوا دەکات ئەم ڕاستییە ڕوونەش بخەمە سەر ئاکارەکانی حاجی خەلیلەوە: لە ڕووری سەخاوەتەوە کیسەی کرابۆوە بۆ هەر قوتابییەکی سەغڵەتی پارە

بووبایە. لەلایەن مەردایەتییەوە لە دەستی دەهات پەنای گومانلێکراوی سیاسی بدات، چ کورد بێت چ عەرەب و غەیری عەرەب. نەشرەی نهێنییان لا دانابایە بۆی دەپاراستن ئەگەر نەڵێم، تاڕادەیەک، بڵاویشی دەکرنەوە. پاش شۆڕشی تەمووز دەمدیت پیاوی وەک عەبدولسەلام بە ڕێزەوە بەخێری دەهێنا.

ئەو ساڵانەی 1941–1945 کە من تێیاندا قوتابیی حوقووق بووم، هەنگامەی چالاکیی حیزبی هیوا بوو بە سەرۆکایەتیی ئەوسای مامۆستا ڕەفیق حیلمی. چەند ساڵێکان بەر لەوەی لێی بکەونە تەقە بە «سەرۆکی باڵا» ناویان دەبرد. مامۆستا حیلمی چیهرەیێکی گەش و ناسراوی سلێمانی و کوردایەتی و سەقافەت بوو، خۆزیا دووچاری سیاسەت نەبوایە، دڵدار و کاکە حەمەی خانەقای زۆر خۆشدەویست، لەگەڵ منیش لوتفێکی بێئەندازی نیشان دەدا. گەلێک جار ئەو سێ کەسەمان لە جێگەی وەکوو «شریف وحداد» ی ئەوسای بەغدا لەگەڵی دادەنیشتین و بۆ ماوەی دوورووودرێژ خەریکی دەمەتەقەی هەمەچەشنەی دۆستانە دەبووین. ناوناوە کاکە حەمە کە لەگەڵ دڵدار دۆستێکی بێفێڵ بوو، هەلی وەردەگرت بۆ دابین کردنی مەیلە یەکجار بەهێزەکەی بۆ نوکتە و گەپ ئیتر کە دڵدار بە دەست زمانەکەیەوە گیری دەخوارد کاکە حەمە تێی دەئالا بە وردە تێوەرێخی قوتە و قۆشمە کەوا پتر دڵداری تەنگەتاو دەکرد.

جارێکیان لە «شریف وحداد» هەڵستاین بەرەو لای «باب المعظم» ڕۆیشتین، کە بامان دایەوە بە دەستە چەپدا بۆ «شارع الرشید» دڵدار ویستی پرسیارێک لە مامۆستا حیلمی بکات، زمانەکەی گرتی، برۆ و برۆ بە تەنیشت مامۆستاوە چاوان لێک بدە و لێوان کرژ بکە و تین و تانووت بدە خۆت و یەک وشەت لە زارەوە دەرنەیەت... کاکە حەمە وردە بزەی دەهێنایە خۆی و «دەی چ بوو»ی دەگوت دڵداریش ڕێ دەبڕێت و زمان ناگیرێت... ماوەیێکی لەحەدبەدەر دڵدار قسەی بۆ نەهات کاکە حەمەش لە پێکەنینی زیاد کرد. ناوناوە مامۆستا حیلمی بێ ئەوەی هیچی پێوە دیاربێت ڕووی لە کاکە حەمە دەکرد بە نەرمەقسە پێی دەگوت: حەمە چیتەوە؟ دڵداریش نوقووم بووە... پاش ڕوحکێشانێکی دوورودرێژ، دڵدار پرسیارەکەی بۆ دەرپەڕێندرا، گوتی: قوربان چت فەرمووا! کاکە حەمە دایە پێکەنین کە من و دڵداریشی بە پێکەنین هێنا بەڵام مامۆستا نە هەر پێنەکەنی، بە قسە و بە ڕووشیدا دیار نەبوو هیچی نائاسایی ڕووی داوە.

ڕووپەڕەی سەرۆکایەتیی مامۆستا حیلمی و هەڵگەڕانەوەی ئەندامەکانی لێی تا ئەوەی بەوپەڕی دڵ شکستەییەوە وازی لە حیزبەکە هێنا تا ئێستا کەس بە ڕوونی قسەی لێوە نەکردووە. ڕاستییەکەی، ئەوەندەی منیش لێی دەزانم شتێکی وەها نییە بشێ لە سەری بنووسم چ بەڵگەی قسەکانی خۆیشم بە دەستەوە نییە. دەڵێن لە مەسەلەیەکدا مامۆستا حیلمی داخوازییەکی سیاسیی لە ماجید مستەفا کردووە کە گۆیا دەبوو نەیکات بەڵام چەندوچۆنی تێکڕای باری کێشە و چۆنیەتیی سووڕانی ئەو بارە بەو جۆرەی کێشایەوە سەر دوورکەوتنەکەی مامۆستا لە سیاسەت، پشکنینەوەی خۆ تەرخانکردووی دەوێت. ئەوەندە شایەدی دڵدارم لایە دەیگوت: پێوەندیی حیزبایەتی وەهای کرد بێدەنگ بم لە شتی هەڵبەستراو دژی مامۆستا حیلمی. بەڵام لێم نەپرسی ئەو شتە هەڵبەستراوانە چی بوون و بۆ چیش ئەو لێیان بێدەنگ بوو چونکە دەبوو نهێنی ناو حیزبایەتیم بۆ ئاشکرا بکات. ئەو قسەکەی کرد لە ڕووی دادوبڕۆ کردن لە دەست کاری پێچەلپاچی نادروستی حیزبایەتی، پەرۆشێکیشی لەگەڵدا بوو بۆ مامۆستا.

بە بۆنەی پشووی نیوەی ساڵ لە زستاندا بەرەو کۆیێ چوومەوە. لە کەرکووک زانیم ڕێگەی کۆیێ بە باران و لێزمە نیوە کاول بووە، ئۆتۆمۆبیلی بۆ ناچێت. ڕێکەوتێکی خۆش بوو کە «سمایلی سەلیماغای حەوێزی»م دیت وەکوو من نیازی کۆیەی هەیە. سەلیماغا کوڕە خاڵی باوکم بوو (دەمێک بوو مردبوو) سمایلاغاش دۆستێکی نزیک و دڵسۆزی ڕاستەقینەی باوکم بوو، کچی پوورێکیشم خێزانی بوو. بڕیارمان دا لە «پردێ»وە بە سواری وڵاغ تێبکەین... لە پردێ دوو وڵاغی سواری و یەکێکی بارگەمان بە کرێ گرت و عەسری قەیم کردبوو بە ڕێ کەوتین. شەو دوای نوێژی عیشا گەیشتینە «بەردەسپی» لە کوێخا ڕەفیق مێوان بووین. کوێخا دۆستی ئێمەش و حەوێز یانیش بوو. خزمەتێکی مەردانەی کردین. سبەینێ دوای بەرچایی وڵاغەکانی «پردێ»ی بەڕێ کردەوە و دوو وڵاغی سواری و یەکێکی بارگەی بە دوو پیاوەوە بەگەڵ خستین. باران نەبوو بەڵام دنیا تەڕ بوو، ئاوشیویش پاشماوەی بارانیان پێدا دەڕۆیشت. گەیشتینە «بەستی شەڵغە» کە لەو بەهارەدا ڕووبار بوو ئاوەکەی لە هەندێ جێگە دەگەیشتە بن زگی وڵاغ. شەڵغە پێچی زۆر بوون دەبوو حەفت جاران لێی بپەڕینەوە. هەر دەتگوت مامە شەڵغە بە نوکتە لەگەڵماندا جووڵایەوە. شەش جاران بە سەلامەتی لێی پەڕینەوە جاری حەفتەم شەڵغە دوو

کەرت بوو لە یەکەمیان دەرباز بووین لە دووەمیان ئێستری بارگەمان گەیشتە ناوەندی ئاوەکەی داماڵا… چەندێکی هانامان بردە بەر «گەیلانی» و «شاهی نەقشبەند» بێسوود بوو بارەکە شڵپەی لە ئاوەکە هێنا هێستر بە ڕووتی بۆی دەرچوو. سمایلاغا لەوساڵەدا کە چایە عەزیز بوو کیسەیێکی چایە لە سلێمانییەوە هێنا بوو بە دیاری بۆ ماڵی برای ببات لە کۆیە. جارێ کەس نەپەرژابوو دەست بۆ بارگەکە درێژ بکات زەرداوی تۆ چایەکە لە ئاوی شەڵغە خۆی نواند. سمایلاغا لە لایەکەوە پەرۆشی چایە و بارگەکەی بوو لە لاییکی دیکەشەوە دەبوو ئێسترەکە بگرێتەوە.

سەرت نەیەشێنم بێ ماسی گرتن پاشەڵمان تەڕ بوو. تا بەڕێ کەوتینەوە بوو بە نزیکی نیوەڕۆ… لە دێییێک لامان دا، نان و چاییەکمان لای کۆیخا عەزیز ناوێک خوارد کە کاتی خۆی سمایلاغا لە دەمی قرساندنی دەغڵ و بەسەر کرنەوەی مێگەلی مەڕانە ناسیاویی لەگەڵدا هەبوو… ئێوارەی تاریک کرد گەیشتینە شاخە پیسکە. نوختەی «صحی» بنگەی لێ دانابوو بۆ موکافەحەی نەخۆشیی تیفۆس. سمایلاغا پێی خۆش بوو گیر نەبین لە ترسی نەخۆشی، گوتم هیچ جێگەی لە نوختەی «صحی» خاوێنتر بە چەنگ ناکەوێ لە ماڵەکەی خۆمان سەلامەتترە… ئەو شەوە بێخەیاڵ لێی نوستم. سبەینێ زوو بەڕێ کەوتین پێش نیوەڕۆ گەیشتینە کۆیێ… سەفەرمان سەلامەت.

ئەو ڕۆژانەی کۆیەم زۆر خۆش ڕابوارد. خەڵقەکە و من بە یەکدی گەشاینەوە. لە بەرەو کۆتایی تەعتیلەکە بەفرێکی باش باری ڕێگەی ئۆتۆمۆبیلی سەرلە نوێ بەست. بڕیارم دا بە وڵاغ سەفەر بکەم. خۆم سازدا و وڵاغ و سوار حازر کران، سەمەدی حاجی محەمەدی بەننا کە کاتبی دادگە و دۆستمان بوو پێ ڕاگەیشت و بێپەروا گوتی مومکین نییە بیەڵم سواری وڵاغ بیت دوو ڕۆژ سەبر بگرە ڕێ دەکرێتەوە هەر لەو میعادەدا دەگەیتە کەرکووک کە لە ئێستاوە بە وڵاغ خۆتی بۆ هەڵکوتی… ئەوپەڕی تەئخیربوونت یەک ڕۆژە ئەو تەهلوکەیە نایەنێت. قسەکەی لە ڕاست ڕاستتر بوو. بێگومان بەو سەرمایە و لە ڕۆژی کورتی ئەو کژەدا پتر لە دوو ڕۆژی دەوێت تا دەگەمە کەرکووک. تەجرەبەکەی پردێ دوو ڕۆژی خایاندبوو… خولاسە سێ ڕۆژی دیکە مامەوە بە سەیارە چوم بۆ کەرکووک لە سەری سمایل بەگیان بەفر زۆر بوو نەختێکمان بە بێڵ «خاکەناز» ڕێگاکە بۆ سەیارە شکاند. شەو لە

خانەقا لە خزمەت سەید ئەحمەدم ڕابوارد سبەینێ بە شەمەندەفەر بەرەو بەغدا ڕۆیشتم... ساردییەکە لە وزەدا نەبوو هەر بە جلکی نوستنی شەو سەفەرەکەم کرد، کەس نەدەپەرژا سەیری قەڵافەتی کەس بکات...

کە بەراوردی گەشت وگەڕانی ئەو ڕۆژگارە لە هی ئەم سەردەمە دەکەم دێتە بەرچاوم کە هی ئەوسا لە سەرما و سۆڵدا هێندەی چووینە غەزا مەترسی لێ دەکرا. بەڵام سەر و دڵ ڕەحەتتر بوون فەقەت هەستمان پێی نەدەکرد.

دوای زستان سەمەدی حاجی محەمد هاتە بەغدا. لە سییەکاندا فەرمانبەر بوو لە بەغدا و دۆستی بەرەی چەپ بوو زۆری لێ ناسین. پێشنیازی کرد بچینە لای هێندێکیان. ڕۆژێک لەو ڕۆژانەی بەهاری 1942 چووینە مەکتەبی عەزیز شەریف. «نازم زەهاوی» و «تۆفیق مونیر»ی لا بوون. بەڕاستی هەر سێیان مرۆی گەش و ڕووناک و بە ئەدەب بوون. عەزیز شەریف گەلێکی پێ خۆش بوو ئەو شناساییە لە نێواندا پەیدا بێت، هەروەها دووەکەی دیکە. بە لای تەبیاتی منەوە خۆشییەکە لەوەدا بوو کە دڵگەرمی و هەڵپەم تێدا نەدیتن لە مەیلی چەپایەتییان. دیار بوو تۆفیق مونیر لە پلەدا خۆی لەوان نزمتر حیساب دەکرد. هەر لە بیرمە شتێکی وەرگێڕابووە سەر عەرەبی کە لە بنەڕەتدا ڕووسی بوو، وشەی «وفر» ی بەکارهێنابوو لە جێی «ثلج». منیش و سەمەدیش گوتمان ئەمە «بەفر» ی کوردییە بەغدایی وەهای گۆ دەکەن. خێرا وشەکەی گۆڕێ بە «ثلج». لە سەردانێکی دیکەدا هەمان سێ مرۆ بەیەکەوە بوون، ئەم جارەیان وتوویژ لە نرخاندنی گوتارێکی ڕادیۆیی چەرچل بوو کە تێیدا یەکیەتی سۆڤیەتی هەڵدابۆوە. زۆریان ڕا لێ بوو. من هەر ئەوەندم کردە تێوەرێخ کە چەرچل بەپێی بەرژەوەندێکی خۆی ڕەچاوی کردووە بۆ ئینگلتەرە لە گوتارەکەدا چاکەی سۆڤیەتی باس کردووە لەوانە بوو شتێکی دیکە بڵێت.

سەمەد و بەکر دوو برا بوون کوڕی وەستا محەمەدی بەننا بوون. وەستا محەمدی کوڕی وەستا ئەحمەد و ئەویش کوڕی وەستا محەمدی چەخماخساز بووە. ئەمەیان وەستاییێکی لێزان بووە، دەگێڕنەوە تۆپێکی ئەوسای حکوومەت - کە هەر نەبێ دەچێتەوە بۆ 150 ساڵێک بەر لە ئێستا - سەقەت دەبێت لە کۆیێ ئەو وەستایانەی حکوومەت لە بەغدایی و تورک چاریان پێ ناکرێت ئەو چاری دەکات. وەستا محەمەدی باپیرە گەورەی سەمەد و بەکر دەبێتە زاوای پیاوێکی ناسراوی سەردەمی خۆی مەشوورە بە باپیرە خدر کە باپیرە گەورەی بنەماڵەی دەباغی کۆیە بووە. لەو

دەمەوە ئەم دوو بنەماڵەیە بە یەک بنەماڵە داندراون. خۆم دەزانم و خەڵقیش دەزانێت بنەماڵەی باپیرە خدر و حاجی محەمەد کاسبکار بوون بە نانی حەڵاڵ ژیاون و سەریان بۆ هیچ دەسەڵاتدارێک دانەنواندەوە، بە درێژایی ڕۆژگار دۆستی ئەهلی خوا بوون.

باپیرە خدر کوڕی ڕەسووڵە کە ئیتر لەو بە پێشەوە ناوی کەسی دیکەیان بە من نەگەیشتوە. باپیرە خدر هاوچەرخی «حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە»یە و زۆریش دۆستی بووە. کوڕێکی لێ بەجێ ماوە قادر ناو، ئەویش تاقانەیێکی بووە ڕەسووڵ ناو کە بە منداڵی باوکی دەمرێت و حاجی محەمەدی مەشوور بە «حاجییە گەورە» لە ماڵی خۆی بەخێوی دەکات، حاجییە گەورە خۆی زاوای باپیرە خدر بووە. ڕەسووڵ دوای حەج کردن بە حاجی ڕەسووڵ ناسراوە. لە 1917 لە شەڕی نێوان عوسمانلی و ڕووسەکان شەهید بووە. سێ کوڕی لە پاش بەجێ ماون، حاجی عەبدوڵا و عەبدولقادر و حاجی فەتحوڵا دەبباغ. لە ئەولادیان د. خالید عەبدولقادر لە کشتوکاڵ و د. ڕەسووڵ عەبدوڵا لە «ئەحیای میجهەری» و د. مەسعوود عەبدوڵا لە کشتوکاڵ خاوەن شەهادەی بەرزن. ئەفسەرێکیشیان (مقدم متقاعد) خدر دەبباغ، هەر بە ناوی «مولازم خدر»ەوە ناسراوە.

سەمەد لە 11/2/1968 لە بەغدا کۆچی دوایی کرد. سێ کوڕی لە پاش بەجێ مان، سیامەند، موقەدەم کامران و جوانەمەرگ نەهرۆ. بکر لە 15/3/1987 کۆچی دوایی کرد، ئەویش لە بەغدا سێ کوڕی لە پاش بەجێ ماون، محەمەد و د. هیوا و پێشەوای ئەفسەر. ئەم گروپەی ماڵی حاجییە گەورە و دەبباغ و حاجی محەمەد (کە لەبەر کەسبی مەنجەڵ سپی کردنەوە پێی گوتراوە حاجی مەنجەڵ و سەمەد بارەها و جارەها ناوەکەی دەکردە بنەمای نوکتە) پێوەندییان بە ماڵی «خەلیفە نەجمەددین»ی کوڕی «خەلیفە ئەحمەد»ەوە هەبوو ئیتر هی دۆستایەتی بێت، یان هی خزمایەتی، هەر چوار بنەماڵە لە سەرووی گەڕەکی بایزاغادا گۆشەیەکی بەرچاویان داگیر کردبوو. خەلیفە نەجمەددین مزگەوتیشی هەبوو، پیاوێکی موسوڵمان و لە خوا ترساو بوو. خەلیفە ئەحمەدی باوکی مەشوورە بە دینداری و حیکایەتی لێ بەجێ ماوە ڕەنگە ئیتر جێگەی لە بار نەبێ بۆ گێڕانەوەی. لە حاجییە گەورە، کاکە مەلا بەجێ ماوە.

هەر لەگەڵ سەمەددا یەکەم جار چووینە لای حسێن جەمیل بەڵام لە بیرم نەماوە چ ساڵێکی خوێندنم بوو… پێبەپێ بەدەم ڕۆژگارەوە ئەو تەرزە شناساییەم بە خوێندەوار و سیاسییە موعاریزەکانەوە لە بەغدا پەرەی دەستاند.

خوێندنم بێتەگەرە بوو، بەسەر دەرسەکانمدا زاڵ بووم. مامۆستاکانی میسری قسەخۆش و نوکتەبازیان تێدا بوو، نەیاندەهێشت هەستی وەڕسی بکەین. ڕۆژێکیان مامۆستای قانوونی دەولی «حسن جاد» گوتی وەڵامی یەکێکتان لەو ئەزموونی دوایی ئەوەندە نایاب بوو ئەگەر خاوەنەکەیم ناسیبایە ماچم دەکرد. ڕەحمەتوڵا کوڕێکی کەرکووکی و برادەری کاکە حەمە و هی منیش بوو، گوتی مامۆستا «جوابی کان روعە…»، حسن جادیش سەری بە سەردا خوار کردەوە و لە پشت چاویلکەکانیەوە بە وردی سەیری کرد و گوتی، بە خودا ئەویش بیت ئەوم دەموچاوە ماچ ناکەم…

ڕۆژێکیان «وصي» (عەبودلئیلاهـ) هاتە سەردانی حوقووق، من ئەو ڕۆژە لەوێ نەبووم گوتیان لەگەڵ قوتابییەکان کەوتبووە گفتوگۆ و گەپ و پێکەنین. یەکێکیان پرسیارێکی ناسکی لێ دەکات دەربارەی سەردەمی جحێڵی و دەمڕووتییەوەی، «وصي»ش هەر بەو لەهجەیە پێی دەڵێ «انت غير سيبندي» سێبەندی بە گاجووتێک دەگوترێ کە سێ ساڵان جووتێ پێ کرابێت. بەغدایش بە کەسێکی کە دنیا لە سەروچاوی هەڵاتبێ دەڵێن «سيبندي».

وەرزیری مەعاریف - ئێستا وەزیری تەربیەی پێ دەڵێن- هاتە حوقووق، قوتابییێک لەو کۆریدۆرەی وەزیر تێوەی دەڕوات بۆ لای عەمید دانیشتبوو لەبەری هەڵنەستابوو. وەزیر هەڵی دەستێنێت و گوێی دەگرێت و نەختێکی بادەدات. قوتابییەکان هەرایێکی وەهایان لەسەر وەزیر گێڕا حکوومەتی پێوە مشەوەش بوو نازانم چۆناوچۆنی ئەم کارەساتە سەرپۆش کرا…

ڕۆژێکیان لە دایرەی تەحقیقاتەوە هاتن یەک دوو قوتابی بگرن بە توهمەی نازیەتی. عەمیدی ئەوسامان حامید زەکی بوو، بە ڕجای سەرۆک وەزیرانی عراق قبووڵی کردبوو ببێتە عەمیدی حوقووق، کە بە مەسەلەکەی زانی بۆ ئەو کاربەدەستانەی تەحقیقات بە حەیزەرانەوە چوو. کە دیتیان بۆیان دێت دایانە هەڵاتنێک، تاژییان نەگاتێ. هەر لەو دەمەدا حامید زەکی ئیستیقالەنامەی پێشکەش بە حکوومەت کرد

بەڵام بە تکای سەرەک وەزیران و بە بەڵێنی ئەوەی کە جارێکی دیکە کاری ئەوتۆیی ڕوونەدات ئیستیقالەکەی کێشایەوە.

مامۆستاییێکی میسریمان د. مستەفا کامیل کە دەرسی «قانوونی دەستووری» پێ دەگوتین قسەڕەوان و ئارداوێژ شیرنێک بوو تاکی نەبێت. لە یەکەم دەرسدا کە هاتە ژوورەکەمان بە خۆشامەدی لێکردن و پیرۆزبایی ژیانی نوێمان سەری قسەی کردەوە بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین کاتێک دەبینین مامۆستا چۆتە ماددەی دەرسەوە و ماوەشی بڕیوە. بە درێژایی ساڵانی خوێندنم لای، هەموو جار کە دەهاتە ژوورەکەمان لە ماوەی چەند دەقیقەییێکدا سەرلەبەری خوێندنەکەمانی کورت دەکردەوە تا دەیگەیاندینە سەرەتای دەرسی ئەو ڕۆژە. موحازەرەییێکی گشتیی دا لە بارەی «دور رئيس الدولة في الدول الديمقراطية» سەرەک وەزیران، ڕۆشنبیران و سیاسیان و پیاوماقووڵان و تەلەبەیەکی زۆر هاتنە بیستنی. ژوور و دەر پڕ بوو لە خەڵقی دانیشتوو و بە پێیانەوە. بەڕاستی هۆش و دڵی ئەو هەزاران کەسەی وەها بۆ خۆی دزیەوە لە ماوەی سەعات و نیویێکدا دەرزیت هەڵدابایە گوێت لە ترپەی دەبوو. کە لە قسەکانی بۆوە هەموو خەڵقەکە بە چەپڵەڕێزان بۆی هەڵستانە سەرپێ و سەرەک وەزیران پێشوازی لێ کرد. دواتر غەیری ئەویش موحازەرەیان دا بەڵام من نەچوومە بیستنیان، چونکە بە تەما نەبووم لە پاش شیرنایی قسەکانی د. مستەفا کامیل قسەی کەسی دیکە شیرن بێت. بەڵام گوتیان موحازەرەی د. جابر جاد عەبدولڕەحمان-یش کە هاوڕێ و هاوخوێندن و هاوشەهادەی سۆربۆن بوو لەگەڵ د. مستەفا کامیل مامۆستای خۆشمان بوو، ئا ئەو موحازەرەیەش بە تام بوو.

قوتابیی حوقووق دەبوو ساڵی شەش دینار بدەن بە سێ پشک، هەر جارەی دوو دینار. بەڵام کەسێکی بە «جيد» دەرچووبایە بۆی هەبوو داوای عەفوو بکات و پارەکە نەدات. ساڵی یەکەم پارەکەم دا بۆ ساڵی دووەم ئەو «اجور مدرسية» یە بەپێی هەڵکشانی نرخی هەموو شت ئەویش بوو بە پازدە دینار بەڵام من «جيد» بووم پارەکەم نەدا هەروەها لە پۆلی سێیەم چوارەمیش بەخشرام.

لە ساڵی یەکەمی خوێندنمەوە مەجیدی حاجی کاک ئەمینی کۆیێ، کە لە ئاڵقەیەکی پێشووتردا باسی هاتووە هاتە ژوورەکەم لە خانی حەمە تەیباغا و گوتی ئامادەی سەرلەبەری مەسرەفتم هەتا لە حوقووق دەربچیت. زۆر سپاسم کرد و پێم گوت وەزعم باشە بەڵام دیسانەوە ناوناوە خزمەتێکی چەوری بە ملدا دەبڕیم. من مەجیدم

زۆر خۆشدەویست ئەویش چ قسووری نەبوو بۆ من، لە ئاست باوکیشمدا ڕێزی تەقدیسی هەبوو… چاکەی ئەو بزر ناکرێت و حەیفە نەگوترێتەوە. لە پەنا پیاوەتی ئەوەوە دەبێت ئەویش بڵێم کە لە هەڵکەوت و پێویستدا منیش تای تەرازووی ئەو چاکەیەم لەنگەر بەست کردەوە. من لە شێخ حەسەنی حاجی سەیدگوڵیشەوە یارمەتیم بۆ دەهات هەتا جارێکیان وەهای بەسەر کردمەوە کە بایی پۆشتە بوونەوەی زستانێکی سەرلەبەری دەکردم لێشی زیاد بوو. باسی یەکماڵیی ئێمە و سندۆڵان و خاڵەکانم شتێک نییە دووبارە بکرێتەوە، ڕەنگە دووبارەش نەبێتەوە.

ڕۆژانی حوقووقم کۆی کردمەوە لەگەڵ مرۆی ئەوتۆدا کە ئەوسا بە دۆست حیساب بوو دواتر باری دنیا و سیاسەت گۆڕا بەو جۆرەی لێک ترازاین. من ڕێ بە خۆم نادەم ناوی ئەو تەرزە مرۆیە بهێنم چونکە ئەگەر بشتوانم لایەنە باشەکانیان باس بکەم ناشێ بکەومە ڕەخنە گرتن لێیان. لە هیچ ڕوویەکیشەوە بێدەنگ بوونم لەو مرۆیانە کەلەبەر ناخاتە نووسینەکەم. بەرانبەر ئەو کەسانە و هیچ کەسێکی دیکەش لە منەوە دژایەتیی شەخسی دەرنەکەوتووە بەڵام جوداوازیی بیروڕا ئەوانی دەخستە سەر دوژمنایەتیم. هاوپۆلە عەرەبەکانم تێیاندا هەبوو زمانزان و ئەدەبدۆست و شاعیر و لە موناقەشەدا بە زمانی ڕێزمانیمان قسە دەکرد منیش پیادە نەبووم. ئیتر زۆر جاران لەگەڵم دەدوان تا ئەوەی وەها دەبوو لە داڕشتنی دێڕە شیعرێک، وەیا شەرحی ڕستەی سەختی کتێبی «الوجیز» ی (اصول الفقه) پرسیان پێ دەکردم. هەر لە بیرمە یەکێکیان پەکی لەسەر وشەی «قبس» کەوتبوو کە دەنگی «ب» تێیدا وەستاو بێت بەڵام چاوگیش نەبێت. شیعرەکەی وەها دانەڕشترابوو ئەو «قبس»ە بە خۆیەوە بگرێت کە چاوگە، نەمتوانی یاریدەی بدەم. ئەو کوڕە ناوی عەبدولعەزیز و لە قەبیلەی «عقیل» بوو بەڵام جودایە لەو «عەبدولعەزیز عوقەیلی»یەی کە لە دەمی شۆڕشی تەمووزدا کاربەدەستێکی سپا بوو دواتر بووش بە وەزیری دیفاع.

وەها دەبوو بۆ نیوەڕۆژ لە ماڵی برادەرێکی - ماڵ لە بەغدا - بانگ هێشتن دەکراین لە مانە بە زۆری زەیدی ئەحمەد ئەفەندی و جەلال و بورهانی حامید بەگی جاف. یەک لەو جارانە جەلالی حامید بەگ گوتی بۆ نیوەڕۆژەی سبەینێ جگە لە کاکە حەمە و دڵدار کێی دیکەش بانگهێشتن بکەم؟ دەیزانی ئێمە ئەو سێ کەسە بەیەکەوە دووراوین.

ڕەنگە لە نووسینی دیکەمدا باسم کردبێت بەڵام ئێرە لە بارە بۆ گێڕانەوەی باسی چەندوچۆنی دڵدار و من و دۆڵمەی مێژوویی. وەها ڕێکەوت چەند جارێ زەید، من و دڵداری دەبردەوە بۆ فراقین لەماڵیان، نۆرەی ئەو ڕۆژە لە لیستەی حەفتانەیان بەر دۆڵمە دەکەوت... زەید و جەلالی حامید بەگ چوون بۆ قاهیرە کە لەوێ حوقووق تەواو بکەن... دوای دوو ساڵ زەید هاتەوە و من و دڵداری بردەوە بۆ نانی نیوەڕۆ... لە نزیک ماڵیان بە بیریدا هاتەوە و گوتی ناکا دیسان ڕۆژی دۆڵمە بێت... ئەشەدوبیللا ڕۆژی دۆڵمە بوو بەڵام یەک پێکەنین دایگرتین لە هەموو خواردنێک خۆشتر بوو. لەگەڵ دڵدار کە بەرەو شوێنی خۆمان گەڕاینەوە چەند بەیتێکمان لە مەسەلەی دۆڵمە ڕێک خستن ئەم چەند دێرەیانم لەبیر ماون:

دەعوەتی عالی شانێ
شیعاری خانەدانێ

لە پاش ناو و نیشانێ
برا هەی دۆڵمە دۆڵمە

دۆڵمە نەبوو سندان بوو
هەمووی هەر باینجان بوو

بەڕاستی هەر ئەوەندەیم لە بیرماوە بەڵام شەرمم نەکردبایە لەوانە بوو چەند دێڕێکی دیکەی بەسەرەوە بنێم...

بە خەیاڵی شیعر بۆ شتێک دەچمەوە. دوو مانگ دەبوو هاتبوومە بەغدا جارێ محەمەد کاکە خان نەبووبووە هاونشیمەنی ژوورەکەم، تەنها بووم. دیوانی نالیم لا بوو. لە سۆزێکی غەریبی و نهێنییێکی ناخی دڵەوە ئاگربارانەکەی «قوربانی تۆزی ڕێگەتم»م بەسەر خۆمدا باراند!! های برا ئەو جەهەننەمە چی بوو لەو شەوەدا پێی سووتام... شیوەنێکم کرد بە قسە ناگوترێتەوە. هەرچی کەسەرێ لە دڵدا کەڵەکەی کردبوو بە فرمێسک هەڵم ڕشت. دەمێک بوو نەگریابووم، پێویستیشم پێی هەبوو،

ئەو شەوە جۆگەلەی فرمێسکانم چۆڕبڕ کرد... وشکاییم هێنا، هەتا جارێکی دیکەش دەزێتەوە خوا کەریمە!

سەدای کاروانی فیرقەت دێ
دەڵێن سەر قافڵەچی یارە
زرەی پێشەنگی میحنەت دێ
دەڵێن کاڵایی غەم بارە

ئەمان سەرقافڵەچی کاروان
دەخیل سا چەرخەچی لەشکر
جڵەو هەڵکێشە، ڕەحمێکە
کە جارێکە و هەر ئەم جارە!!

تۆش قەبرت پڕ نوور بێ مستەفا بەگی کوردی!!

بەغدای ئەو ساڵەی 1941- 1942 پێوەی دیار بوو کە لە شکستەکەی هەرای ڕەشید عالی ماوەتەوە. هەڵوەستی خەڵقی جادە و بازاڕ هەمەچەشنە بوو نەک یەک جۆر. باشترین ئاوێنەی دەردانی ئەو هەڵوەستە دیتنی عەسکەرەکانی سپای ئینگلیز بوو، ئەوەی پەرۆشیی لە شکستەکە خواردبوو بە چاوی ڕقەوە سەیری دەکردن و لە دوورەوە تفی بۆ هەڵدەهاویشتن، زۆریش لە مانە پیاوی تەمەن کامڵ بوون. بەشی هەرەزۆری ئەهلی بازاڕ و کاسبکار کە هیچ یەکێکیان نە بە تاک نە بە کۆمەڵ دەستیان لە هەراکە نەبوو و بە هیچ کلۆجێک پرسیان پێ نەکرابوو، تەنانەت دەشیان زانی ڕەشید عالی خۆیشی لە گەلێک سەروبەری شۆڕشەکە بێدەسەڵات بوو. ئا ئەمانە بە تێکڕایی هەستێکی ناڕاحەتیان دەکرد لە دیتنی بێگانە بەڵام ئەو هەستە پارسەنگ دەدراوە بەو سەرف و سوونەی کە عەسکەرەکان دەیانکرد. بازاڕی هەموو کاڵاییێک گەرم داهات. ئەو شتە فۆلکۆریانەی کە کڕیاری نەبوو عەسکەرەکان بە ناوی Souvenir نرخی زیادیان پێ دەدا. لە ساڵی 1942 ژمارەی نەفەرەکانی سپای ئینگلیز لە عێراق بە سۆجەر و لێڤیەوە ئەوەندە زۆر بوو وەهای لێ هات لە سەدەی نەوەدی دانیشتوانی ناو سینەما ئەوان بوون. ئەوەندەش نیزامی بوون دەنگ و هەرایان پەیدا نەدەکرد. بەغدایی ناچار بوون بۆ کڕینی تیکت وەک سۆجەرەکان

ڕیز ببەستن بەڵام لە فیلمی عەرەبی و هێندی کە سۆجەرەکان ڕوویان تێنەدەکردن کۆنە بەزمی پاڵپەستۆ و جلک دڕان بەردەوام بوو، وەک بزانم، بەرپرسی ئینگلیزەکان جگە لە ڕەچاو کردنی ڕێکوپێکی کە بێ ئەو شەڕ نابردرێتەوە زۆریشیان مەبەست بوو حکوومەتی عەبدولئیلاھ لە پێناو بەد ڕەفتاری عەسکەرەکانیان ناوزڕاو نەبێت چونکە دەیانزانی خەڵق خۆشیان ناوێ.

لەو تێبینیانەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو کە دەورانێک عەسکەری ئەمەریکاییش پەیدا بوون چەندێکی عەسکەری ئەمەریکایی لەگەڵ عەسکەرێکی هیندی و سیغ بە شەڕ هاتبایە عەسکەری ئینگلیز بایی خۆ لەسەر گۆڕینەوە لای هیندی و سیغەکە دەبوو. عەسکەری ئەمەریکایی دڕ بوون، کە هاتنە کووچە و جادە و بازاڕ ڕێکوپێکی و بێهەرایی پێشووتریان شێواند. بێگومان ئینگلیزەکان لە قووڵایی دڵدا حەزیان بەو لەخۆباییبوونەی ئەمەریکا نەدەکرد، لە وڵاتی خۆشیاندا دەیاندیت چۆناوچۆنی سەربازێکی ئەمەریکا بە دۆلاری زۆرەوە دۆستەکەی و دەزگیرانەکەی لێ دادەگرێت. لە بەراورد کردندا چەندێکی پرسم کردبێت لەو کەسانەی کە بۆ دەغڵ کڕین چوونە کوردستانی ئێران هەر ئەو وەرامەم وەرگرتۆتەوە کە ساڵداتی ڕووسەکان پڕکێشی و دەستدرێژییان لەکەس نەکردووە، تەنانەت ئەگەر بۆ جگەرەیەک مردبانایە چاویان نەدەبریە تووتن و پەڕە سیغاری کەس بەڵام یەکێکی لە خۆوە جگەرەی پێشکەش کردبێتن کەرەمیان ڕەت نەکردۆتەوە. لەمەوە دەردەکەوێت ڕێکوپێکی و بێزەرەریی سۆجەری ئینگلیز و ساڵداتی ڕووسی شیووعی یەک ئاوە لە دوو سەرچاوەی جوداوە هەڵقوڵیوە. پەندێکی عەرەب هەیە دەڵێ: «خذ الحكمة لايضرک من اي وعاء خرجت».

لەو ساڵانەدا کە سپای ئینگلیز لە وڵاتدا بەرهەست و بەرچاو بوو بەرپرسەکانی سپای عێراقی خۆمان، زۆر ژیرانە، نەیاندەهێشت زابت و سەربازی عێراقی بکەونە بارێکەوە ڕووبەڕووی ئینگلیزەکان ببن. ئەم ڕاستیەش لە خۆوە دیار بوو نەک بە جاڕدان و ئاشکرا کردن. بێگومان زاپتێکی عێراقی بیدیتایە عەسکەری ئینگلیز لە ئوتێلێکی بەغدادا ویسکی هەڵدەقوڕێنێ و ئارتیستیش بۆی دەشلێتەوە خۆی بۆ نەدەگیرا، لەوانە بوو دەستێک بوەشێنیت. زاپتێکی ئینگلیز هەمان شتی بە زابتی ئەمەریکاییەوە دەدیت بەڵام ئینگلیزەکە هەم خۆیشی پێ دەگیرا هەم ئەمەریکاش بە حەرب نەهاتبووە بەریتانیا، جگە لەوە کە سەرکەوتنی بەریتانیا لە جەنگ بەند

بوو بە ئەمەریکاوە. ئەم تێبینیانەی ئێستا دەیانکەم ئەوساش بیرم لێ دەکردنەوە ئیتر دەبنە بەشێک لەلایەنی مەعنەویی گەشتی ژیانم.

ڕۆژگاری چلەکان، بەتایبەتی لە دەمی جەنگدا، ئەوە نەبوو کوردایەتیی بە دەنگ و سەدای تێدا بکرێت. نەورۆز بە ماتی لە ماڵی یەکێک لە ناسیاوان ئاهەنگێکی کورتیلەی بۆ دەگێڕدرا. سروودی «ئەی ڕەقیب» ی دڵدار خۆم گوێم لێ بوو لەلایەن حسێن بەرزنجییەوە بەو دەنگی ئاسمانیی خۆیەوە لە کۆمەڵگەی وەها بچووکدا شەپۆلی دەدایەوە. وەک لە بیرمە پاش ڕاپەڕینەکەی کە ناوی «وەسبە» (الوثبة) ی لێ نرا و پەردەی ترس و لەرزی کۆن لە خۆنیشاندان تا ڕادەیێک لە نێواندا هەڵستا، حکوومەتیش نەختێکی لە سڵی خۆی کەم کردەوە ئنجا کوردی بەغدا توانی بە ئاشکرا شادیی نەورۆز بگێڕێت بەڵام بەداخەوە خوێنگەرمیی دەمی موزاهەرە دەگوێزرایەوە بۆ ناو ئاهەنگەکەی نەورۆز تا ئەوەی وەها دەبوو بانگهێشتنی هێندێ کەس دەکرا کەچی لە ئاهەنگەکەدا بە گوتار پاتەوپات ناویان دەزڕاندن، ئەوانیش بە تووڕەیی دەڕۆیشتن، لە دواڕۆژدا ڕقی خۆیان بە خەڵقی سەربە نەورۆز دادەڕشت...

ئێمە ئەوەندە ناحەزمان هەبوو پێویست بەوە نەهێڵێت بە بیتاقە خەڵق بانگهێشتن بکەین هەتا بە سەرشکێن کردنیان وەریان بگێڕینە سەر دوژمنایەتیمان وەیا پتریان لە خۆمان هان بدەین. پشکێکی بێڕەزای لەوەی پێی دەگوترا بزووتنەوەی نیشتمانی بەتێکڕایی بریتی بوو لە پەرگیری و بەرز کردنەوەی دروشمی خەیاڵی، ئنجا هەر کە پشووی حەسانەوەیەکیشی دەدا، بەر دەبووە گیانی خۆی بە شەڕی ناوەکی و یەکدی بڕاندنەوە... ئەم دەردە کوشندەیە تا ئێستا لە هەموو جیهانی سێیەمدا بەردەوامە و جێگەی شانازی پێوەکردنیشە.

لە سەرەتای خوێندنی حوقووقمدا ژمارەی قوتابیی کورد لە خوێندنی بەرز لێشاوکەی نەبوو، کە لە هەولێر بە هەمووی پێنج کەس لە ساڵی یەکەمدا بە قوتابیی حوقووق وەرگیران دیارە هەموو قوتابیی کورد لەو ساڵەی یەکەمی حوقووقمدا نەدەگەیشتە بیست کەس، ڕەنگە پازدەشی تەواو نەدەکرد. لە «دار المعلمین العالیة» تەنها کۆییێک کە من بیرمدا بێتەوە لە ساڵی پێشوتردا وەرگیرا بێت محەمەد حەوێز بوو. لەو دەمانەدا «دار المعلمین» بە بەشی داخلییەوە و وەزیفەی مسۆگەری دوای لێ دەرچوونیەوە تێدەبرِدرا بەڵام مەرجی وەرگیران تێیدا قورس بوون. بە نموونە دەڵێم

ساڵەهاش دواتر بەشی داخلی قەڵاتێکی قایم بوو هەموو کەس نەیدەگەیشتێ تا ئەوەی کە ئەمجەدی ئامۆزام بە بەهانەی نومرەی کەم لە بەشی داخلی بێمراد کرا دوای نەختێک ئیعلانیک هەڵواسرا دەیگوت کەسێکی باوکی دە ساڵ موعەلیمایەتی کردبێت و حەفت ئەولادی هەبێت ئەو کەسە بە نومرەی کەمیش لە داخلی وەردەگیرێت، تومەز یەکێکی بە پشتیوان ئەو قیلەشەرعەیان بۆ دۆزیبۆوە خواوڕاستان ئەمجەدیش ئەو مەرجانەی تێدا بەدی دەکرا ئیتر بە خۆی و مەرجەکانی لێیان چووە پێش، چاریان نەبوو زۆر نابەدڵی وەریانگرت. قسەی خۆمان بێت ئەویش وردە فێڵێکی لێ کردبوون بەڵام نەیاندەتوانی لێی بەسەربگرنەوە منیش بە تەمانیم دوای دەیان ساڵ لێی هەڵابدەم...

ئەم ڕۆژهەڵاتەی خۆمان وەها فرچکی بە فڕوفێڵ گرتوە باوەڕ دەکەم بە تەما بێت لە پاش مردنیش بە بەرتیل بچێتە بەهەشت. ئاخر ئەی سەرپەرشتانی «دار المعلمین» چ ڕەوای حەقە خرِ دەرگە لە ڕووی کائینات دابخەن، یەک کەلێنی بدەنێ بایی تێخزانی یەک نەفەر بکات. ئەمجەدی ئامۆزام ئەو سندانەی لە جێی قوزەڵقورتی ئەوان دانا دەستی خۆش.

وەک بزانم لەو ساڵەدا، 1941، تەنها شەفیق سابیر کە پێکەوە ئیمتیحانی خاریجیمان دا، لە کۆییان بوو بە قوتابی «دار المعلمين العالية». ساڵەو ساڵ ژمارەی قوتابیی کۆلیجەکان لە کورد و غەیری کورد زیادی کرد بەتایبەتی لە پاش جەنگ. ئەوسا جارێ زانکۆ پەیدا نەبوو بوو لە عێراق، بە دەگمەن قوتابیی کۆلیجەکان سەردانی یەکتریان دەکرد، تاک و تەراییێک نەبێت یەکتریشیان نەدەناسی. لەو قوتابییانەی بەیەکەوە لە حوقووق وەرگیراین دواتر کە بووم بە نائیب چواریان لەگەڵ مندا نائیب بوون: حسن المطيري، محمد مشحن الحردان، شاكر ماهر، كريم كنه. مشحن ئەلحەردان و چەند کەسێکی دیکەش لە قوتابیی حوقووقی ئەو سەردەمە بوو بە وەزیر، لەمانە مەحموود بابان، عبدالستار علي الحسين، موسڵح نەقشبەندی، محمد مشحن الحردان. محەمەد مشحن و مەحموود بابان، بەر لە شۆڕشی تەمووز، بوون بە وەزیر. بەهۆی ئەوەی کە شۆڕشی تەمووز بە بەشداری کردنی سپا بەرپا بوو ژمارەی زاپتەکان لە نێوان وەزیراندا زۆری زیاد کرد هەتا 17 ی تەمووزی 1968 کە حیزبی «بەعس» بۆ دووەم جار هاتەوە دەسەڵات ئیتر بارەکە گۆڕا بە لای مەدەنییاندا.

بێمەوە سەر باسی مامۆستاکانمان. ڕاستییەکەی مامۆستا میسرییەکان ڕووکراوەتر بوون لەگەڵماندا. ئەوانی خۆمان ڕەهایی و گەشایی میسرییەکانیان پێوە دیار نەبوو. تەجرەبەییێکی مەیلەو سوێری خۆم- ناڵێم تاڵ- دەگێڕمەوە. مەرحووم د. عەبدولمەجید عەباس عێراقی بوو دەرسی قانوونێکی پێ دەگوتین، نەختێک لە خۆڕازی بوو کەمیش وەها دەبوو زەردەخەنەی بیەتێ. ڕۆژێک قوتابییەکانی بەتاقی دەکردەوە منی هەڵستاند و پرسیارێکی لێ کردم، منیش بە شایەدیی برادەرانم وەڵامێکی زۆر ڕێکوپێکم دایەوە، وەهاشم بە ڕەوانی و بێ هەڵەی زمانی و بێ گرفت بۆ هات پێم وابوو ئافەرینم لێ دەکات. نەختێک لە پشت چاویلکەکەیەوە بە مۆڕی سەیری دیمەنێکی مەوهوومی کرد ئنجا پێمی گوت «يظهر انک دارخ ولکن ما فاهم». باش بوو دنیا بەهاری لێ گەرم داهاتبوو وەڵامەکەی بۆم بوو بە سەتڵە ئاوێکی سارد. منیش گوتم «هذا مبلغ علمي». ئەمجارە ڕووی لە پۆلەکە کرد داخوا کێ دەتوانێ وەڵام بداتەوە. یەک دووانێکی کەمتەرخەم شەقوپەقێکیان گوت بایی فلسێک بوو. گوتی با من پێتان بڵێم مەسەلە چییە... ئەشەدوبیللا هەر ئەوەی گوت کە من گوتبووم بەڵام ڕەنگە هی من شیرنتر حیساب بکرێت چونکە لە دەمی قوتابییەوە دەرچووە. متومۆرووی قوتابی هێندەی لوولووی مامۆستا بایەخی پێ دەدرێت. لەم ڕۆژگاری مانگی چوارەمی ساڵی 1987 یش هەمان وێنەی نالەبار و نارێکی هەڵوەستە نائارامەکەی ئەو ڕۆژەی من لە نێوان قوتابی و مامۆستا و لە خزم خزمێنەی نێوان ڕۆشنبیران بە تێکڕایی بە شێوەیێکی دڕتر خۆ دەنوێنێت. هەتا کۆمەڵایەتی بەهاتوباتتر بێت دەردە دەروونییەکانی ئاشکراتر دەبن.

کە بەهار پیر دەبوو چاوەچاوی موژدەیێک دەبووین بۆ ئەوسامان خۆش بوو. تەماتە و ئاروو (خیار) پەیدا دەبوو و تامەزرۆیی سەڵاتەمان دادەمراند/ لەو ڕۆژانەی چلەکاندا کژی تەماتە و خیار کە بەسەر دەچوو ئەسبابی داکردن و لە دەرەوە هێنان وەیا لە زستاندا ڕواندنیان پەیدا نەبووبوو، هەر میوەیێک و شیناوردێک کژی بەسەر چووبایە دەست نەدەکەوت، قوتابیی ئەو سەردەمەش خەریکبوونێکی ئەوەندە گرنگی نەبوو تەماتەی لەبیر بباتەوە. لەو یارییانەی پێوەیان دەخافڵاین تاوڵە و شەترەنجەکەی چایەخانەی خەلیل ئیبراهیم بوو. لە موناسەبەدا دەڵێم دڵدار بە زۆری شەترەنجی دەدۆڕاند. چەندێکی بشی دۆڕاندبایە یەکسەر دەچوو لێی دەنوست، تەنانەت جارێکیان لە ماڵی زەید دوای نیوەڕۆژە دڵدار بە عادەتی خۆی

شەترەنجەکی دۆڕاند، بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات بێوەخران لەسەر تەنیشت لێی درێژ بوو تومەز لەو شوێنە نوێن نەبوو تێی بخزێ.

کاکە حەمە هەرگیز ئینجێک پێش نەدەکەوت لە هەر یارییێکی بیکردبایە. کاک حسێن، کاکی کاکە حەمە، دەیگوت حەمە چەندی دەیزانێ هەر هەندە، لێی زیاد ناکات. هەندێ جار لەنکاو بەسەر ڕەشید عارفماندا دەدا، بەتایبەتی بە شەو، ئەویش هەموو جاران خزمەتێکی باشی دەکردین. حاڵوباری باش بوو حەزیشی دەکرد لە ناو قوتابییان ناوی بە چاکە بێت. بە کوردایەتیشەوە خەریک بوو.

ساڵی یەکەمم بوو، گەیشتبووینە سەرەتای زستان، عەمید، مونیر قازی، بەدوایدا هەناردم گوتی لە وەزارەتی مەعاریفەوە بڕیار دەرچووە ئەگەر حەز بکەیت بە بیعسە (بعثة) بچیت بۆ میسر لە کشتوکاڵ خوێندن تەواو بکەیت. تومەز ڕەنگە دەرجەی دەرچوونم لە سانەوی لە قوتابییەکانی دیکەی هەولێر بەرزتر بووبێت... ئێمە لە سەرەتای 1942 دا بووین لەشکری ئەڵمانیا هەڕەشەی لە میسر دەکرد. کەس حاڵی نەبوو ئەنجام چی دەبێت. لەوانە بوو بچم و ڕێی گەڕانەوەم ببەسترێت. ئەگەر دوای شەڕی عەلەمێن بوایە کە لەشکری ئەڵمانیا کشایەوە بەرەو لیبیا دەشیا پێشنیازەکە هەڵبگرمەوە و بچم. بێدوودڵی و بێپەرۆش خواردن عوزری نەچوونم هێنایەوە. بە نامە خەبەری باوکمم دا. ئەویش ئیعتیرازی نەبوو وەک کە لە هیچە بڕیارێکی سەربە چارەنووسی خۆم گرفتی نەدەهێنایە پێش.

کە گەیشتینە پشووی هاوینە لەسەر دەرچوونی ئاکامی ئیمتیحان ڕانەوەستام دەشم زانی باش دەردەچم، برادەریشم ڕاسپارد زوو خەبەرم بداتێ. بۆ خۆم خێرا چوومەوە کۆیێ. لە کەرکووک هەر ئەوەندە بەند بووم چوومە خزمەت سەیدی خانەقا تەنانەت نیوەڕۆژەشم نەخوارد. تەپوتۆزی ڕێگای ئەوسا بەو شڕە ترمبێلانەی گۆڕانیان لە حەربدا وەزەحمەت کەوتبوو ئەگەر بەرەوماڵ بووم دەت گوت کلی چاوە حەسانەوەی پێوە بوو. دیمەنی وڵات تەنانەت ناو ماڵ و کووچە و بازاڕیش، جوانتر و ئێسکسووکتر خۆی دەنواند پاش دوورکەوتنەوەیێکی چەند مانگی. لە کەرکووکەوە حیسامەددین تەیب کە نازناوی «شعب» ی وەرگرتبوو، لەگەڵم بوو. هەر کە گەیشتینە سەری سمایل بەگیان و سەرلەبەری وڵاتی کۆیە و بەشێکی قەڵاسێوکە و چەشمەندازی هەتا شاخەکانی پژدەر و قەندیل و هەڵگورد و هەرێمی ڕەواندز بە کەوانە بۆ لای سەفین و پیرمەم و ئەو محاڵانەمان لێ دەرکەوت

حیسامەددین دەماری شەعبایەتییەکەی کشت بوو بە دەنگی ناسازیەوە تێی هەڵکرد بەسەر و دەستەکان و هەموو لەشیشیەوە کەوتە جەزبە... بە ڕجا و تکاش بێدەنگ نەدەبوو. حیسامەددین لەبەرەو کۆتایی ساڵی 1986 کۆچی دوایی کرد هەتا بڵێی لە کوردایەتی و پێوەندیی برادەری دڵسۆز بوو. لە دایکرا برای «سابیر ئیسماعیل»ی مەشوور بە «باشکاتب» بوو کە بەر لە چەند ساڵێک ئۆتۆمۆبیل لێی دا و لە هیچ تێ چوو.

سابیر لە نزیکەوە دۆستم بوو. ساڵی ڕابوردوو کە لە کەرکووک ئیمتیحانی بەکالۆریامان دەدا سابیر کاتبی دادگا بوو لەوێ، ئاغلەب نیوەڕۆژەمان لە ماڵی ئەو دەخوارد. ئەوسا حیسامەددین-یش هەر لەوێ بوو، ئەم ساڵەش کە دەگەڕاینەوە بۆ کۆیێ هەروەها...

مەرگ و ژین میسلی سێبەر و تاوە
ئەوەی باقی بمێنێ هەر ناوە

بەینۆلکێکی مامناوەنجیم بە حەسانەوە ڕابوارد لە کۆیێ. ڕۆژێ لە نادیی مەئموران لەگەڵ ڕۆشنبیرانی ئەو ڕۆژگارە و تەڵەبەییێکی لە بەغداوە دەهاتنەوە ڕامان دەبوارد، ئێوارانیش و شەوانیش جۆرە مەشغەڵەتێکی خۆشکەڵە دەبوو هەتا دەمی نوستن بمان خافڵێنێ... دوای ئەو ماوەیە کەوتمەوە سەر باری چاودێری کردنی خەلەوخەرمانی پێبازۆک. دەشتم لێ خۆش هاتبوو، ئەو خەڵقەش لەو وڵاتی شێوە چۆڵستانەدا پاش ئەوەی لە سڵەمینەوەوە دەکەوتە ئاشنایی لەگەڵ یەکێکی وەکوو مندا ئۆگرگرتووی یەکدی دەبووین. چەند دەمڕووتێکی قوتەقوتکەری سەرانگوێلکانی لێ دەرچێت ئەوانی دیکە تێکڕایان پیاو و ژنی ئەوتۆ بوون پشتیان پێ ببەسترێت، چەندێکی لەگەڵیان دانیشتبێتم وەڕسیم هەست نەکردووە. بەڵێ بابەتی وتووێژیان سادەیە و بە زۆری لەگەڵ حیکایەتی ڕووداوی ڕۆژانە و هەڵکەوتی گوزەران و وردە هەواڵی دێی دراوسێ و ئەو جۆرە مەشغەڵەتانەیە بەڵام بە کەمێک خۆ ڕاهێنان و ئەوان ڕاهێنان دەشێ وتوویژ لەسەر بارێکی مامناوەنجی مەسڵەتی بکات کە من و تۆش لێ ڕازی بین و ئەوانیشی پێ وەتەنگ نەیەن.

گوێ هەڵخستن بۆ باسی کاروباری جووت و سەپانی و شوانی و وڵاغ بەخێو کردن و وردە خەفەتی قەرز و سەلەم و دەردی دەغڵ و مەڕومالآت نەخشەیێکی فرەڕەنگی ترس و هێوای کۆمەڵگەی فەلاحی کوردەواری دەهێنێتە بەرچاوی بیسەری خوێندەوارەوە کە ئەگەر خۆی لێ بەسەهوو نەبات لە ئازاریشیان دەگات و هێواکانیشیان بەدی دەکات.

لە تەجرەبەی خۆمەوە دەزانم، مومکینە یەکێکی وەکوو من کە لە نەرمونۆڵی و نازونەزاکەتی شارستانەتی ڕۆنەچووە بە زوویی لە زمانی ئەو خەڵقەی لادێ ڕابێت و بە بەشێک لە زمانەکەی خۆی ڕابهێنێت، ڕۆژ بە ڕۆژیش ئەو لێ تێگەیشتنە زیاد بکات. ئەگەر بە تیژی هەستی دینداریيان بریندار نەکرێت و نەرێتیان نەشێوندەێت زۆر نابات سڵی و دوودڵی و زمانگرتن لە بەیندا هەڵدەستێت. ڕاستییەکەشی چەرخ و دۆڵابی فەلەک لەسەر ئەوە نەوەستاوە لادێی لە ماوەی دوو مانگدا هەم ببێتە هاوشانی ئەفلاتوون لە فەلسەفەدا هەم ڕۆستەمی زاڵی لێ دەرچێت بۆ ئازایی.

لەو سالآنەی سەرەتاکانی 1940 کە خۆم هەوەڵ جار بە فەلاحەکانی بەرەبابی خۆمانم گوت، ڕۆژەک دێت ئەو ئەرز و ئاوە دەبێتە هی ئەوان چاووزاریان وێکرا داپچڕان و ئەستەغفیرۆڵایان بە گەرمی و بەدڵ دەکێشا. پێم گوتن تا ئەو ڕۆژە با ئێمە لەگەڵ یەکتردا مەرد بین... ئێستا دەڵێم بۆ من هیچ هونەر نەبوو غەدریان لێ نەکەم وەیان یاریدەیان بدەم و لە تەنگوچەڵمەیان ڕزگار بکەم بەڵام بۆ ئەوان گەلێک پیاوەتی بوو لەگەڵم ڕاست بن بەدڵ حەز بە چاکەم بکەن و لە پێویستدا بێمزە بۆم ماندوو بن. کە لە بەرەو کۆتایی چلەکاندا ناچار بووم شەو بە پارێز بم و ئێشکچیم هەبێت کوڕە گەورەی مام ئەوڕەحمان و مام تۆفیقی کوێخا سمایلی پێبازۆک-م بە مەحرەم و ئەمیندار دانا لای خۆم.

سەری خوێنەر نەیەشێنم، ڕابواردنی لادێم بە هەموو تەپوتۆز و گەرما و مێشیەوە، بە دەوری خەرمان و لەسەر جەنجەڕ و دیار شەنەبا، هەتا دەگاتە چایە و ماست و دۆی بە تەڕەپیازی پەرێز، زۆر پێ خۆش بوو. ڕەنگە هەر ئەو یەکەم هاوینەی دوای پۆلی یەکەمی حوقووقم بوو کە چوومە پێبازۆک 51 شەوی لەسەریەکی لێ مامەوە. چەند بە سۆزەوە یادی ئەو ڕۆژانە دەکەمەوە لە ماڵی حەسەنی مام فەتاح دوای نیوەڕۆژە دەکەوتمە سەر باری حەسانەوە دوو کچە گچکەلانەکەی، خەجەی هەشت ساڵ و ئایشەی پێنج ساڵی، بە نۆرە باوەشێنیان دەکردم مێشیان لێ دوور

دەخستمەوە و فێنکاییان لێ دادەهێنام هەتا تێرخەو دەبووم و شەکەتیم بەسەر دەچوو. خەجە بە شکڵ ئەسمەرییەکەی چووبۆوە لای زێنەبی دایکی، ئایشە و عەوڵای کاکیان سوورکاڵیی باوکیان پێوە دیار بوو... ئاخۆ ئەو ڕووسوورانە ئێستا لە کوێ بن!! عەبدەی مام فەتاح، کە ئەو خاوەن ماڵ بوو، بەڵام جارێ ڕاست و چەپی خۆی نەناسیبوو تاقانە کوڕی مام فەتاح بوو، بە هەتیوی گەورە بوو بەڵام حەسەن کە ئامۆزای بوو، بە بەرژەوەندێکی بابم ڕەچاوی کرد، بوو بە زاوای و لەسەر ماڵەکە دانیشت... ڕاستییەکەی ئەو کەسانە بۆ من لە جێی خزم بوون و چەندی بڵێم کەمە لە بارەی ئەمەکدارییانەوە.

لەگەڵ مەلا عاریف و کوێخا محەمەددا بە زۆری یەکدیمان دەدیت. مەلا عاریف خزمی کوێخا بوو لە شەریعەت باخەبەر بوو، زۆر جاران باوکم خەڵکی بۆ لای ئەو دەنارد مەسەلەی شەرعیان بۆ هەڵبڕێت. لەوەی پێی دەگوترێ دەشتی کۆیێ مەلا عاریف23 لە پێشیوە حیساب دەکرا. ناوناوە ئەگەر سەرقاڵی و کێشەی خەرمان

---

23- باوکم لە وەرامی نامەیەکی «مەلا عاریف»دا، هی دەمی گەنجایەتی، وا پێ دەچێ وشەی کوردی لە نامە عەرەبییەکەی بەکار هێنابوو، بە هەڵبەستی کوردی - عەرەبی - فارسی تێکەڵ، بڕە شیعرێکی بۆ دەنێرێتەوە کە ئەم دوو سێ بەیتەیانم لێ بەبیر دێنەوە، بەداخەوە بڕە شیعرەکە نوسخەی نەما و لە پاش مەرگی مامم لە بیران چۆوە:

چشمتي از دوریەت گریانة<br>اشکها افتانة خیزانة

عنکبوت پەردەدار خلوتي<br>عضرفوت هەمنشین حجلتي

دوای چەند بەیتێکی دیکەی ئەوتۆیی، لە زەمینەی سپاسگوزاری خزمان بۆ هەڵکەوتوویی مەلا عاریف، ئەم بەیتەشم لەبیر ماوە:

حمد لله عارف ما شد ادیب<br>لایەقە شیعری لەبەرکا عەندەلیب

لەم بەیتەوە دیار دەکەوێ نامەکەی مەلا عاریفیش شیعر بوو.

دەرفەتی دابایە لە دیوەخانەکەی کوێخا محەمەد مەجلیسمان دەبەست و نیوەڕۆژەشمان لەوێ بەڕێ دەکرد، هەندێ جاریش لە مەغریبەوە دەهاتنە لام تا شەو ڕادەشکا بەیەکەوە دەخافلاین. خەڵقەکە تێکڕا بە ڕۆژ لە تەقڵ و شەقڵی دەغڵ و دان و شیناورد بوون. شەوان بە دەورەمەوە ئەوانەی زۆر ماندوو نەبووبوون تا دەمی نوستن دەمانەوە. خۆشکەرەوەی مەجلیس چایە و جغارە بوو. ئەگەر مێوان نەبایە خەڵکی دێ نەدەهاتن هەتا لە نانی ئێوارە دەبوومەوە نەکا تەکلیفیان بکێشم.

هەرگیز لەبیر ناکەم ئەو جارەی کە بۆ یەکەم جار نەختێکم پارە لە بەرهەمی فەلاحەتی و مەڕ بۆ باوکم بردەوە کۆیێ. ئەو پارەیە هەر بایی مەسرەفی مانگونیوێکی ئەوسایماڵی ئێمەی دەکرد بەڵام لە تای تەرازووی حیسابی خۆمدا گەلێک سەنگینتر خۆی دەنواند سەرەڕای ئەوەی کە بەرهەمێک بوو لەو دەمەدا کەس بە تەمای نەبوو. ڕاگەیشتنی خاوەن بەرژەوەند بەسەر بەرژەوەندیدا بەتایبەتی لە کاری مەڕداری و فەلاحەتیی بێپەرژین و بێحیسابدا هێندەی تەقلە لێدان باری گوزەران دەگۆڕێت. ئەگەر لە یەک ساڵدا دووسێ جاران دەرفەتی ئەوتۆیی حیساببەدەر وەر بگیرێت گوزەرانی سێیەکی ساڵ و پتریش مسۆگەر دەکات. دەڵێن «ڕزق لە لای خواوەیە»، دەشتەکیش پتر بەو پەندەوە ئۆگرن، ئنجا ئەگەر چەند جاران لە ڕێکەوتی ئەوتۆییدا خەرجی هاتە باغەڵی مرۆی موحتاجەوە پەندەکە بە چاکی جێگەی خۆی دەکاتەوە. فەلاحەتیش پتر لە بەقاڵی و بەززازی و کەسبی ناو شار ڕزقی نابەرچاوی تێدایە... لە کاوکۆت و پەرێز و دانەوێڵە و مەڕ و ئاژەڵ و قەرسیل و بەرکوت و شتی ئەوتۆیی. فەلاح هەروەک لەگەڵ زەوییەکەی دەبێتە برادەر هەروەهاش هەستێکی بەهێزی «خۆیەتی» بە مەڕ و ئاژەڵ و وڵاغەکانییەوە پەیدا دەکات. گەلێ جار کە ملی هێسترەکەی لە بن نیر یان جەنجەڕ دەدرێت (برینی گەورەی تێدەکەوێت) تا نزیکی گریان بۆی پەرۆش دەبێت بەتایبەتی لەو دەمەدا کە ناچارە ئەو ملە دڕاوە بخاتەوە بن نیر و جەنجەڕ. بەڵام ناوناوەش لەبەر زێدە ماندووبوون و لە هاڕاوچوونی خۆی بێڕەحمی لەگەڵ ئاژەڵەکەی و وڵاغەکەی دەکات کە بەکەیفی ئەو، وەیا بەپێی بەرژەوەندی ئیش مل نانێن.

خەرمان تەنک بووبوون کە کژی چنارۆک داهات. هەر ساڵە بەر لەوەی ترێ بە چاکی خۆش ببێت ماڵ دەگوێزینەوە، یاخود ماڵمان دەگوێستەوە، بۆ چنارۆک. باوکم و دایکم بە دڵ چنارۆکیان خۆش دەویست. ڕاستییەکەشی ئەگەر بە ئیروویی و

تێروپڕی تێدا بژی جێگەیێکی خۆشە بەتایبەتی لەلایەن چەشمەندازەوە، ئێمە کە هەمیشە بە جیرانەتیی میوەی زۆر و بێحیساب بە سەرمان دەبرد هەستمان بە بایەخی میوەکە نەدەکرد بەڵام ئەو مێوانەی لامان دادەبەزین و میوەی نایابی هەمەڕەنگی بۆ دادەنرا و سەماوەریشی بۆ تێدەهاوێژرا، دەیگوت کە ئەم میوەیە هەبێت چایە چ لێ بکەم، کە هاتمە بەغدا بۆ خوێندن ئەوجار زانیم میوە کڕین بە کیلۆ و نیو کیلۆ لە تەک تلیانە و بێ تەرازووی قەڵاپەرچن لە میوەی ڕەنگاوڕەنگ چ دەهێنێت.

من لە سەردەمی باوکمدا کەمتر خەریکی درەخت و شیناورد دەبووم، بە زۆری لە چەشمەندازی دڵگیر دەگەڕام. چەندێکی دەرفەت هەبایە بەرەو سەرووی شاخ هەڵدەکشام نەک بۆ باغەکان لێژ دەبوومەوە حەزیشم دەکرد ناوناوە سەردانێکی کۆیە بکەم.

لەو ساڵەی 1942 دا زگێشە کۆنەکەی باوکم زیادی کردبوو، تەنها لە ڕاکشاندا ئێشەکە ڕادەوەستا. دەرسی فەقێیان کەم بووبۆوە. نۆرەیان بۆ دەکرد. ساڵی 1942 چەند ڕۆژەک چوونەوەمان بۆ کۆیێ پێش خست هەتا نەکەوینە ڕەمەزان. بۆ من یەکەم جار بوو ڕەمەزان خۆ لە کژی چنارۆک بخشێنێت.

**ئاڵقەی نۆیەم**

وەک لە بیرمە هاوینی ساڵی 1942 جەنگ بەسەر لەنگەریێکی لەقەوە حندرحۆی دەکرد، لە شەڕگەی ڕۆژاوای میسر ئینگلیزەکان چ توانایەکی هەیانبوو لەشکری هەشتەمیان پێ ئاخنی و قۆماندانێکی نوێشیان بۆ هەڵبژارد، جەنەڕاڵ مۆنتگۆمەری، گیانێکی نوێی خستە بەر ئەو لەشکرە چاوشکاوەی ترس تێگەڕاوە. بە هێزێکی لە ڕادەبەدەرەوە مۆنتگۆمەری شەڕی «عەلەمەین»ی لە لەشکرە بێ چەک و سووتەمەنیەکەی ڕۆمێلی ئەڵمان بردەوە و بەرەو «بەرقە»ی لیبیای کشاندەوە. لە شەڕگەی ڕووسیا، لەشکری ئەڵمان پەلاماری ئەوتۆی دەدا و بە جۆرێک پێش دەکەوت بەتایبەتی لە بەشی خوارووی ڕووسیادا، مەترسیی شکستی یەکجارەکی ڕووسەکانی لێدەکرا.

من لە گۆشەی نابەرچاوی پەرۆشداریمەوە ڕەمڵی چاکم بۆ بەرەی دیمۆکرات لێ دەدا و نوختەی گەشم لە چەندوچۆنیی شەڕ بۆ ئەو بەرەیە ڕەچاو دەکرد.
بەهەمەحاڵ گەشبینییە بە زۆر دروستکراوەکەم لەو ساڵەدا بنگە و بنەمای هەبوو لە چاو ساڵانی پێشووتر کە هەرگیز شکستێکی ڕاستینەی ئەڵمانیای نەدیتبوو. کە هاوین و پاییزی 1942 بەسەرچوو لە زستانی نێوان 1942-1943 دا شکستە پشتشکێنەکەی ئەڵمانیا لە ستالینگراد گەشبینییەکەمی کرد بە متمانە و دڵنیایی. هەر لەو بەینانەدا بوو کە ڕەوی هەزار فڕۆکەیی بۆ سەر ڕۆژاوای ئەڵمانیاش دەستی پێ کرد.

باش لەبیرمە، لە هاوینی ساڵی 1943 کە ئەڵمانەکان لە ڕووسیا و لە شەڕگەی ئەفریقا و دەریای سپیی ناوەڕاستیش تەنگەتاو کرابوون خەبەری دابەزینی چەتربازەکانی ئەڵمانیا بە هاوڕێیەتیی ڕەمزی نافیعاغا و دەردەست کردنیان لەلایەن حکوومەتەوە بە ناو خەڵقدا بڵاوبۆوە. لەو دەمەدا بە ڕوونی لە کەسەوە دیار نەبوو بنیچەی ڕووداوەکە و ئامانجەکانی چی بوون. بە سۆسە کردن و قسە هەڵگرتنەوە تاڕادەیەک ڕەنگوڕوەکی کوردایەتی بەدی دەکرا، بەڵام بە شێوەیەکی تەماوی. ڕاستییەکەی من لەو کاتانەدا نە بۆم دەلوا هەموو لایەنێکی مەسەلەکە بخەمەوە سەریەکتر و ڕایەکی یەکجارەکیی لێ هەڵێنجم نە هیچ تررووسکەیەکیش لە ڕووداوەکە دەگەشایەوە سەرنجی دوورودرێژ و بەردەوام بۆ خۆی ڕابکێشێت، ئیتر وەک دیمەنێکی لێڵی ئەودیو مینایەکی چڵکن کە چاو بە تەواوی تێی پڕ ناکات،

جۆرێک مەسڵەتی لە نێوان کوردویستی و ئەڵماننەویستی لەو کارەساتەوە دەخزیە دڵمەوە و پێی تەسکین دەبووم.

من لە نزیکەوە شناساییم لەگەڵ ڕەمزی و خزمانیدا پەیدا نەبووبوو، ڕێکیش نەکەوت دوای دەستگیربوونی بیبینمەوە، پێشتریش جاروبارێکم دیتبوو، ئەو زرە ڕەنگەی گیانی کوردایەتیی لە چالاکیی ڕەمزیدا کە بۆ بەرچاوی ئەڵماننەویستێک خۆی لەو سەردەمەدا دەنواند، دواتر لە ویژدانی کوردپەروەردا تێرڕەنگ دەبوو. لە ساڵی 1943 جارێ سۆڤیەتپەرستی بە ناو کورددا بڵاو نەبووبۆوە کە ببێتە هۆی کەمتر خەریکبوونی کوردەواری بەو کارەی ڕەمزی کردی، دەنگ نەدانەوەی گیانبازییەکەی ڕەمزی لە بێخاوەنی و بێپەرۆشخۆرییەوە بوو، سەرەڕای ئەوەی کە هیچ ماوە نەکەوتە نێوان دابەزینی ڕەمزی و هەواڵەکانی و نێوان گرتنیان و خامۆش کردنیانەوە. خولاسە کارەساتەکە لەو دەمەدا کەمتر لە نرخی خۆی پێ درا لەلایەن کوردەوارییەوە، ئەوەی ڕاستی بێت تا ئێستاکەش بایەخی ئەوتۆی پێ نەدراوە کە لێی دەوەشێتەوە، فرکەیەکی بەتەوژمی دەماری کوردایەتی بوو، ڕەویەوە بێ دەنگ و زەنگ.

هاوینی 1943 یەکەم جار بوو ڕەمەزان تێیدا بەر کژی چنارۆک بکەوێت، من لە سەردانی «نازەنین» بووم کە چەند پارچە باغێکی باشمان تێدا هەبوو، ساڵانە بەرهەمی مێوەیانیمان بۆ دەهاتەوە کۆیێ. دوای گەڕانەوەمان بۆ چنارۆک لە هاتنەوەمدا شەوی سەرەتای ڕەمەزان مێوانی حەمەدەمین و برایمی ئامۆزای محەمەد بووم لە جەلی. پاش پارشێو کە دنیای ڕووناک بوو کەوتینە ڕێگە. چێشتەنگاو بوو گەیشتینەوە چنارۆک. گەرمای ڕێگا و کەمخەویی شەو، ڕۆژووی ئەو ڕۆژەمی نەختێک وەزەحمەت یەخست بەڵام لێی هەڵنەهاتم. ڕۆژووی بەر نوا و سێبەری شار ئاسانترە لە هی شوێنی وەکوو چنارۆک یاخود دەشتودەری کاکی بە کاکی کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا ڕۆژاوا دراوسێیی هەتاو خەبەردەری دووربوونە لە فتاری ئێوارە. ئەو ساڵە لە ئەیلوولدا ڕەمەزان دەستی پێ کرد، کژەکەی بەرەو فێنکایی دەچوو، ساڵەو ساڵ ڕۆژوو پتر گەرما و درێژخایێنی دەر دەچوو. بەر لە جەژن هاتینەوە کۆیێ.

نەساغیی باوکم لە زیادیدا بوو بەڵام هێزی هەبوو، دەبوو پێشتر بڵێم سەفەری بەرەو نازەنینم نەدەکرد ئەگەر باری تەنسازیی باوکم لە مەترسیدا بایە. ئەو گەشتە

کورتیلەیەم جێبەجێ کردنی داخوازییەکی برایەتی و دۆستایەتیم بوو لەگەڵ محەمەد حەوێزدا24 - کە بە حەمەڕەش بۆ خۆشەویستی ناوی دەبرا- کە لەو هاوینەدا دەبوو «رسالة» بنووسێ لە بارەی ئێلی خۆشناوەتی و لە بری «اطروحة» پێشکەشی بکات لە ساڵی چوارەمی خوێندنی لە «دار المعلمين العالية». شەوێک و ڕۆژێک لە چناڕۆک مایەوە و باوکم لە ساباتەکەی سوولی پاشا دەیدوواند و وردە پرسیاری سەربە مەسەلەی خۆشناوەتیی لێ دەکرد، ئێستا کاکە محەمەد حەوێز دەڵێ ئەوسا شەرمم دەکرد بە ڕەهایی وەرامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە. ڕۆژی دواتر بەیەکەوە لە سەر پرۆگرامێکی خۆی ڕەچاوی کردبوو بەرەو جەلی و نازەنین بەڕێ کەوتین. نیوەڕۆژەمان بردە جەلی، شەو چووینە نازەنین، ئەو چەند ڕۆژەمان بە خۆشی ڕابوارد، تامی ئەو سەفەرانەی دەدایەوە کە لە دەمی خوێندنی هەولێرماندا وەها دەبوو لە ڕێی خزمانی هەڵەجە و ئاخۆڕە، حەمەڕەش و شێخ فاتیحی خاڵە شێخ سەدر و من بە وڵاغ دەگەڕاینەوە بۆ عوتلەی نیوەی ساڵ... لە نازەنینەوە وڵاغی بۆ سازدرا تا قۆناغەکەی دیکەی ئیتر لەوە بەو لاوە خۆی بەرپرسی گەشتەکەی بوو.

پاش گەڕانەوەمان بۆ کۆیێ ناساغیەکەی باوکم زیادی کرد تا ئەوەی لە جەژنە هەر لە دیوی ماڵەوە لەلایەن خەڵقەوە جەژنە پیرۆزانەی لێ کرا، نەشیتوانی سەر لە مەلا و شێخ و پیاوماقووڵان و خاوەن دیوخانەکان بداتەوە. نەشچوو بۆ نوێژی جەژن.

ئەو ڕۆژانەی نێوان کۆتایی جەژن و 12/10/1943 خەڵق دەهاتنە ئەحواڵپرسی، ئەوساش تاقەتی هەبوو لەبەر گەلێک کەس هەڵستێت، لە ڕۆژانی 10-11 تووشی نەزیفی میعدە بوو. دکتۆر نەجیب عەبدلنوور ڕۆژی چەند جاران سەردانی لێ دەکرد هەتا سبەینەی 12/10 کە نەزیفی بۆوە دکتۆر نەجیب جودای کردمەوە و پێی گوتم کە تەنسازیی باوکم زۆر ناتەواوە، ئەو چارەیەی کە بۆ نەزیفەکەی کردووە ئەگەر ڕاینەوەستێنێ چ دەسەڵات نامێنێ دکتۆرێک بە کاری بهێنێ. لە ماوەی یەک دوو سەعاتدا، باوکم وەک چرایەکی نەوتی بێتە وشکبوون، وشکایی خوێنی دەهات.

24- زۆری نەبرد دوای نووسینی ئاڵقەکانی گەشتی ژیانم، لە هەشتاکاندا، محەمەد حەوێز کۆچی دوایی کرد. کچێکی زێدە نازدار و پێگەییشتووی ئۆتۆمۆبیل شێلای، مەرگی ناکامی ئەم کچە جێی کەسەری هەموو ناسیاوێکیان بوو، باوکیشی بە خەفەتی ئەوەوە خێراتر بەرەو مەرگ چوو... بەداخەوە.

ئەو دەمانە باری نەفسیم وەک ئەوە بوو یەکێک لە دوو لاوە بەرداش پاڵەپەستۆی بدەن ئەویش بە هەموو توانایەوە بیەوێ «قەدەر» لە گەڕ بخات و بەرداشەکان بوەستێنێت.

مەرگی باوکم شتێک نەبوو لە قەناعەتمدا بگونجێت. دایکم و مامم و نەجیبەی خوشکم و من بە دەورییەوە بووین، خەڵقی دیکە هەمان سامی کە بە درێژایی دەیان ساڵ لە «مەلای گەورە» وە سواری دیتن و بیستن و گوتنیان دەبوو وەهای دەکرد لە نەدیوی ئەوەوە ئەو دەقیقە خز و لەقانەی پێش مەرگی بە لێوەلەرزە ڕابوێرن... هێزی قسەی نەمابوو، بۆ دوایین جار بە دەست ئیشارەی کرد، مامم و نەجیبە چوونە پشتی و هەڵیان ستاندەوە بۆ سەرباری دانیشتن، بێ ئەوەی سەر بسووڕێنێ چاوێکی بە دنیا و بە مندا گێڕا و دیسانەوە بە ئیشارەت درێژیان کردەوە. زۆری نەخایاند، تەنها دەقیقەیەک، بۆ ماوەیەکی کورت کەوتە گیانەلاوە و یەکجارەکی هەناسەی ڕاوەستا... من ئەو چاوگێڕانەی هەرگیز لێم کۆن نەبوو.

لە کووچە و بازاڕ خەڵق دەیانزانی وەزعی باوکم لە چدایە، هەر کە دەنگی شێوەن لە حەوشەمان بەرز بۆوە عالەم جمین بۆ ماڵ و گەڕەکەکەمان... من هاتبوومە حەوشە بچووکەکەی دەرەوە، مەلا مەعسوومی هەورامی بە شێوەن هاتە ژوور و دڕی بە خەڵقەکە دا و منیش بە دواوە هەتا سەر ئەو لەشە بێگیانەی باوکم. ئافرەتان پەرتەوازەیان پێ کەوت، مەلا مەعسووم چی دەکرد نازانم، دەستی ڕاستەی باوکمی گرت و چەند جاران بەر و پشتیم ماچ کرد... مەلا مەعسووم وردەوردە باوەشی لە باوکم شل کرد و بە شێوەنەوە لە ئافرەتستانەکە دەرچوو منیشی بە دواوە...

شاری کۆیێ بە حکوومەت و میللەت و قوتابی و قوتابخانەکانیەوە لە دوای جەنازەی مەلای گەورە ڕۆیشت. هەرچەند ڕێکەوتێکی سروشتی بوو کە لە دەمی شاردنەوەی تەرمی باوکمدا، گەواڵەیەک هەور تێپەڕی و ڕشێنەبارانێکی بەسەر ئەو خەڵق و قەبرستانەدا هەڵڕشت بەڵام لەو دەمەدا هەر دەتگوت ئاسمان بەشداریی تازیمانەی کۆیە دەکات. مەرگی باوکم گەورەترین کۆست کەوتن بووە لە هەموو ژیانمدا، هەرچەند دەمزانی و دەزانم مەرگ کۆتایی هەموو گیاندارێکە بەڵام هەروەک دەزانم سیفەتی سووتێنەری ئاگر نابێتە کەمکەرەوەی ئازاری سووتان هەروەهاش ئەو زانینە ساردوسڕەی سروشتیبوونی مەرگ لە کەلێنی مەرگی باوکم بایی کونی دەرزیشی پڕ

نەکردەوە، ئێستاش پڕی ناکاتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبوو لە ژێر باری مەینەت دانەهێزیێم چونکە بەرپرسی خێزانێکی زگدڕاو و پاسەوانی کەلەپوورێکی گەورە بووم.

تەرازووە لەنگەربەزیوەکەی میراتیمان لەلایەن داهات و ئەرکەوە لەو دەمانەدا دەیەویست نالەبارییەکەی خۆی باشتر بنوێنێت. لە ڕۆژی مەرگیدا، باوکم سەد دیناری قەرزداریی بۆم بە سامان جێ هێشتبوو، جگە لە عەزیمەتی خۆم کە بەدرێژایی ژیانم یارم بووە، سێ هێزی دەوروپشتم یارمەتیی دام:

یەکیان ئەوە بوو کە مامم بێ بەرهەڵست یەکسەر جێگاکەی باوکمی بۆ گرتمەوە لەلایەن پاراستنی پایەی عیلمیی بنەماڵەی جەلیزادەوە. تا ئەوەی مومکین بێت کەلێنی یەکێکی وەکوو مەلای گەورە پڕ بکرێتەوە، مامم ئەو کەلێنگرەوە بوو. هیچ کەمایەتی بەسەر تەدریس و «خطبة» و ئیجازە و مەجلیسەکانی مزگەوتی گەورەدا نەهات. مەلاکانیش کە بەشی زۆریان ئیجازەیان لە باوکم وەرگرتبوو پایەی ئەویان بۆ مامم پاراست. لە ناویاندا خوالێخۆشبووی مامۆستا مەلا سادق کە بەیەکەوە لەگەڵ مامم لای باوکمیان خوێندبوو هەر لەویش ئیجازەیان وەرگرتبوو، لە ڕادە بەدەر دڵسۆزی مامم بوو. جگە لە مەلاکان شێخە خاوەن تەکیەکانیش هەمان هەڵوەستی دۆستانە و مەردانەیان هەبوو، ئنجا ئاغاکان و توجارەکان و خاوەن جێوڕێکان تا دەگاتە ئەسناف و کەسەبە و ئاپۆرەی کۆییان هیچ قسورێکیان لێ نەدیترا.

هێزی دوەم پێوەندیی ناو خێزانی خۆمان بوو کەوا بێگومان شتێکی نموونەیی بوو لە چاو جیهانی دەوروپشتمان. ئەو جۆرەی ڕۆژگار لە ماڵی ئێمە بەسەر دەبردرا هیچ وێنەی نەبوو لە کۆمەڵایەتیی کوردەواریدا. لێرەدا دەرفەت نییە بۆ خوێنەری ڕوون بکەمەوە چ تاموشامێک هەبوو لە چەژی ژیانی خێزانی مەلای گەورە، هەر وەهاش بەردەوام بوو هەتا ساڵی 1965 کە بە ناچاری نشیمەنم لە کۆیەڕا ڕاگوێست بۆ بەغدا. ئێمە بەوە ڕاهاتبووین هەموو ئەو شەوانەی پاییز و زستان و ناوەندی بەهاریش کە نوستن لە ژووران دەبوو، دانیشتنی ناوخۆیی خێزانیمان شەوانە بەردەوام بێت هەتا نیوەی شەو و درەنگتریش. ئەم دانیشتنانە دوای بەسەرچوونی کڕی دیوەخانە دەستی پێ دەکرد، بە بەشداریی ئامۆزاکانم و خزمی زۆر نزیک. شەو لە شەویش ئەو خەڵقە گەشتر و گەشبینتر و خۆشتەبیاتتر دەبوو، تاکێکیشی لەو مەجلیسانە دانەدەبڕا، مەگەر بە قەزا و قەدەر. هەستم دەکرد ئەو خەڵقە دوای

مەرگی باوکم دڵیان پێمەوەیە و خۆشیان دەوێم و چاویان لە چاکەمە، لەم لایەنەوە خورتە بە دڵمدا نەدەهات. یارمەتیدەرەکانمان چ ژن و چ پیاو جانفیداییان بۆ دەکردین، هێندەێ دۆستی نزیک لە پەرۆشەوە پێیان گوتم کە وەها باشە لە ژمارەی یارمەتیدەران کەم بکەمەوە تاکوو مەسرەف لێی دابشکێت، ئەو دۆستانە نەیاندەزانی کە لە تەرازووی ئێمەدا فەرقی کافیەی مەلایان و فەتحیی شیربرام لەگەڵ خوشکەکان و فارووقی برام، وجوودی نییە. سەری خوێنەر نەیەشێنم هەستی حەسانەوەم بە وەزعی ناو خێزان دڵدەرەوەیەکی گەورە بوو بۆم.

هێزی سێیەم لایەنی خاڵوانم بوون، شێخ خدر و شێخ جنێدی شێخ ڕەزای سندۆڵان کە ماڵیان لە سەیداوای تەنیشت ڕانیە بوو خاڵم بوون. شێخ حەسەن و شێخ حسێنی حاجی سەیدی سندۆڵان-یش ئامۆزای دایکم بوون کە فەرقیان نەبوو لە هیچ ڕوویەکەوە لەگەڵ خاڵەکانم و دەسەڵاتێکی دنیایی زۆریشیان هەبوو، هەم لە دیوی پشدەر و هەم لە دیوی ڕانیە. هیچ هەستێکی شەرم دامناگرێت کە لە یاداشتم بنووسم خاڵوانم کە هاتنە تازیەی باوکم لە گەنم و بزنج و ڕۆن و شەکر و چایە و پێداویستیی گوزەران ئەوەندەیان لەگەڵ خۆیان هێنا گەلێک گەلێک لە ئیحتیاجی ساڵێکمان زیاد بوو، تەنانەت لەو سالانەدا کە سن و کیسەڵە گەنمی کەم کردبوو ئەوەندەیان گەنم هێنا بەشێکی کرا بە تۆی فەلاحەتیمان لە پێبازۆک، ئەوەندەشیان پارە بەجێ هێشت لە مەسرەفی ساڵێکی خوێندنی بەغدام زیاد بوو. ئەو تەرزە پاڵپشتانە لە باری تەنگانەدا بایەخیان دەردەکەوێت، بۆ منیش کە جارێ دوو ساڵی مابوو خوێندنی حوقووقم تەواو بکەم، مەرگی ئەو جۆرە باوکە قورساییەکی وەهای بەسەردا بەجێهێشتم زێدە پێویستم هەبێ بە جۆرەها داروەکازی خۆ بەسەرەوە ڕاگرتن.

لەو ڕۆژە تاریکانەی تازیەی باوکمدا یەکێک لە تێبینیە شیرنەکانیم هەمیشە دەهاتەوە بەر هەست کە دەیگوت: شێخ دەمرێت کوڕەکەی یەکسەر دەبێتە شێخ و لە جێی دادەنیشێت، ئاغا دەمرێت کوڕەکەی دەرلەحزە دەبێتە ئاغا و جێگری، توجار دەمرێت کوڕەکەی دەبێتەوە توجار، ئەمما کوڕەمەلا ئەگەر بیست ساڵان چاوی خۆی بە خوێندن و «ئالێ دەلێ بابە» کوێر نەکردبێ گەسکدەری کۆلانانیشی تێ نابێت. ئەم قسەیە بۆ یەکێکی وەکوو من کە لە پاش مەلای کۆیێ بەجێ مابێت دەجارن بە ڕاست دەگەڕا. هەر من دەزانم «میراتگری»ی پیاوێکی وەها مەزن چ

بەتاڵاییەک بە دەوری میراتگردا دەهێڵێتەوە وەکوو منداڵێکی حەفتساڵی جلکی کەسێکی 25 ساڵی لەبەر بکات...

دەبێ بڵێم حکوومەتی عێراق بە ڕەسمی سەرەخۆشیی لێ نەکردین وەک کە لە حاڵەتی مردنی پیاوی وەهادا بە عادەت دەیکرد. بەڵام سەفیری بەریتانیا تازیەنامەی بۆ مامم هەنارد، هەروەهاش ئەدمۆندس و کاربەدەستی دیکەشیان. لە لەندەنەوە چەند نامەیەکی تازیە لە کاربەدەستە کۆنەکانیانەوە گەیشت... جارێ لە کۆیێ بووم تازیەنامەی مەهابادم پێ گەیشت، بۆیان گێڕامەوە، کە خەبەرەکە گەیشتبووە شێخی خاڵ25 هەستێکی زێدە مەردانەی دەربڕیبوو قەتیش ئەو قسەیەم لێ دووپات نەکردەوە...

گەڕانەوەم بۆ بەغدا بە هۆی تازیەوە نەختێک وەخرا. برادەران بروسکەی پرسەیان ناردبوو بۆم کە یەکتریشمان دیتەوە پرسەی دڵسۆزانەیان نوێ کردەوە. یوونس ڕەئووف (دڵدار) یش بەو هۆیەوە درەنگتر لە کڕی خۆی بۆ بەغدا گەڕایەوە، بەدرێژایی ڕۆژانی پرسە و دوای پرسەش هەر لێمەوە نزیک بوو. لەم ساڵەوە من و دڵدار بەیەکەوە لە ژوورێکی ئۆتێلی ڕەشیدی گەڕەکی «مربعة» ژیاین هەتا مانگێک پێش ئەزموونی کۆتایی ساڵی 1945 کە ئیتر خوێندنی حوقووقیش بەسەر چوو. دەبێ بڵێم هەرگیزاو هەرگیز ڕووی نەدا لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا بە هیچ جۆرێک دڵمان لە یەکتر بیەشێت وەیا گلەمەندییەک بکەوێتە نێوانمانەوە وەیا بە فسکەش قسەیەک لە هیچ کاممانەوە دژی ئەوی دیکە گوترابێت.

«یانەی سەرکەوتن» بە بۆنەی چل ڕۆژەی مەرگی باوکم ئاهەنگێکی گێڕا کە دەبوو بەپێی تەقلید من گوتاری کۆتایی بە سپاسی بەشدارەکانەوە بدەم بەڵام خوالێخۆشبووی مەعرووف جیاوۆک کە خۆی لە بنەڕەتدا خاوەن فکرەی یانەکە و ئەمین عامیشی بوو لە جیاتی من قسەی کرد. ئێستە بە چاکی لە بیرم نییە چۆناوچۆنی بوو بەڵام دەزانم لە پاش ئەو ئاهەنگە من خۆم بە ئەندامی لێژنەی ئیدارەی «یانە» دۆزییەوە، سەرۆک ئەمین زەکی بەگ بوو، چەند پیاوماقووڵێکی

---

25- مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ، دوای دەرچوونی گەشتەکە، بە ڕەحمەتی خوا شاد بوو، بەر لە مەرگی چەندێکی سەردانی سلێمانیم کردبێت چوومەتە خزمەتی.

دیکەی کوردی بەغدایش ئەندام بوون. لەو ئاهەنگەدا یوونس ڕەئووف (دڵدار) گوتاری هەبوو بەڵام کە دەستی کرد بە خوێندنەوەی، زمانی گرفتی کەوتێ و چەندێکی کردی نەیتوانی هیچ بڵێت، کاغەزەکانی پێچایەوە و بێ ئەوەی پێوەی دیاربێ تێشکاوە بێگرفت عوزری زمانگیرانی هێنایەوە و هاتەوە جێگایەکەی خۆی. دڵدار کەوا بێ خوێندنەوە دەکەوتە دووانی کۆبوونەوەی ئەوتۆیی هەرچی عەیبی زمان هەبوو لێی بە دەر نەدەکەوت کەچی لە خوێندنەوە و وتووێژی عادەتی وەها دەبوو بە جۆرێک دەگێرا کرانەوەی نەبوو.

هاتووباتی «یانەی سەرکەوتن» بە هۆی تێک ئاڵقانی مەیلی نوێخوازیی خوێندووەکان و مەیلی داوەستانی سەرپەرشتیکەری یانە لە ماوەی ساڵێکدا ئاکامی ناخۆشی لێ کەوتەوە ڕەنگە لەم ئاڵقەیەدا نۆرەی بگاتێ.

جەنگ قورسایی خۆی بە تەواوی لە حاڵوباری گوزەران دەرخستبوو. ڕەشوڕووتی فەلاحەت و شینایی کەنەفت بووبوون بەتایبەتی لە کوردستانەکەی خۆمان کە خولگەی هەڵسووڕ و داسووڕی نان پەیدا کردن بۆ دەشتنشین لە چاو دەشتنشینی ناوەڕاست و باشووری عێراق هێندە بەرفرەوان نییە. باران وەک ئاوی زێیەکان پشتی پێ نابەسترێت.

زێ، ئاوەکەی زۆرە، لەوانە نییە هەموو دەم لێی بپەڕیتەوە، ئیتر ئەمبەر و ئەوبەری لێک دادەبڕین مادەم پرد لە نێواندا نەبێت کە ئەوسا لە کوردستانی عێراق زێیەکی وەکوو تەقتەق (زێی بچووک) تەنها لە پردێ، کۆنە پردێکی بەسەرەوە بوو، لەوە بەولاوە ناوناوەیەک لێرەولەوێ کەڵەک هەڵدەبەستران یاخود لە پاش دامەزراندنی حکوومەت لە پژدەر و کردنەوەی ڕێی ئۆتۆمۆبیل لە سلێمانییەوە بۆ قەڵادزە، لە دووکان و میرزا ڕۆستەم و سندۆڵان قەیاغ سازدران. لەلایەن چاندنەوە زێیەکان بایی کانیاوێکی کەمئاو سوودی بژێویان لێ نەدیترا مەگەر لە شوێنی هەموار بۆ هەڵنانی «ناعور» تەنانەت بناوانێکی وەکوو هی دووکان و دەربەندیخان هەر ئەوەندەی کرد بۆ ناوچەکە کە دەوری 150-200 ئاوایی کوردی ژێراو کرد. بۆ گەلی بێدەسەڵات ئاوی زۆر و شاخی بەرز هەر دەبنە لەمپەڕ لە پێش یەکبوون و یەکچوونی ئەو خەڵقە کە بە زەحمەت یەکتر دەبینن... حیکایەتەکە زۆری بەدەمەوەیە لێی هەڵدێم.

هەژاریی خەڵق لەو ڕۆژگارانەدا خۆی لە خۆیدا نەدەبووە هۆی پەیدابوونی سەرێشەی سیاسی بۆ حکوومەت، ڕاستییەکەی هەژاریش جارێ فێرنەبوو بوو گلەیی خۆی لە مل حکوومەت بپێچێت بەڵام باری بووژانەوەی کوردایەتی و هەستی کۆمەڵایەتی لە دیوی کوردستانی ئێران حیسابێکی قووڵی بۆ دەکرا لەلایەن ئەو دەسەڵاتەی کە ئەوسا لە ڕۆژانی جەنگدا قسەڕۆیشتوو بوو لە نەخشەکێشانی سیاسەتی عێراق کە ئینگلیزەکان بوون. ترسی تەشەنە کردنی گیانی نوێخوازی لە کوردی ئێرانەوە بۆ کوردی عێراق وەهای کرد سیاسەتێکی تازەی «خەڵق خەریک کردن» نەخشەکێش بکرێت لە ڕێی زیاد کردنی نرخی تووتن و زۆر کردنی پلەی مومتاز و یەکەم لە پۆلاندنی تووتن.

ئەم سیاسەتە تازەیە لە کژەتووتنی ساڵی 1943 خرایەگەڕ و کێشایەوە سەر هێندێ کە پارەیەکی لەخەیاڵبەدەر بکەوێتە دەشت و ئاوایی و شارەکانی کوردستانەوە. تووتنەوان هەبوون کە پەنجەکانی ڕانەهاتبوون لە دینار ژماردن، چەندێکی دەیکرد دەستە دیناری بۆ نەدەژمێردرا بە ناچاری خێرۆمەندێکی دەدۆزییەوە بۆی بژمێرێت. چونکە منیش پشکم لە تووتن هەبوو باری ئابووریم بەو پارەڕژانە ڕووەو هەڵست بزووت. کژەتووتنی ساڵی 1943 لەلایەن کەموزۆریی بەرهەمەوە لەسەر 1942 حیساب دەکرا چونکە هەڵکشانی نرخی تووتن کەوتە دەمی پاش لێ بوونەوە لە چاندن، بۆ کژی 1943-1944 خەڵق بینی بە چاندنی تووتنەوە نا، تا ئەوەی کوێراویش تووتنەوانی بۆ پەیدا بوو. مەرەزە وازی لێ هێندرا، شیناورد مەیدانی بۆ تووتن چۆڵ کرد، فەحسی تووتنیش، لەلایەن لیژنەی فەحسی تووتنەوە، بوو بە مامڵەتی بازاڕی، بەرتیل ئاواتی خاوەن تووتنی پێک دەهێنا خواش غەفوور و ڕەحیمە.

لەلایەن خوێندنەوە ساڵی سێیەم تا بڵێی بە ڕاحەتی تێپەڕی، دەتگوت ئەو ساڵە بە قۆناغی حەسانەوە داندرابوو تا ئەوەی ڕۆژ یەک دەرسی تێدا دەخوێندرا. شکستی ئەڵمانەکان خەریک بوو لە گومان دەردەچوو، دوای تێکشکانیان لە عەلەمەین و ستالینگراد هیچ هەڵمەتێکی ئەوتۆیان نەبرد لە مەیدانی جەنگ تەرازووی بەخت هەڵستێنێتەوە. جەنگ پەڕییەوە بۆ ئیتالیا، مۆسۆلینی جێی لەق بوو، دواتریش خەڵقی ئیتالیا بە پەتیانەوە کرد. لەگەڵ ئەمەشدا بەرگریی ئەڵمانەکان لەو حاڵوبارە سەغڵەتەدا جێی سەرسوڕمان بوو. هەتا کۆتایی جەنگ لە هاوینی 1945 زوربەی خاکی ئیتالیایان بە دەستەوە بوو. لە ڕووی هێزی چەکەوە ڕەنگە دەیەکی

دوژمنەکانیان چەکیان بەدەستەوە نەبوو، بەهەمەحاڵ ئێمە لێرەدا مێژووی جەنگ هەڵناسەنگێنین ئەوە نەبێ کە جەنگ یەکێک بوو لە مەشغەڵەتەکانی ئەو دەمانەم و بەشێکیشە لە یادی سەردەمی خوێندنی حوقووقم.

لە نووسینی دیکەشمدا باسم کردووە کە شناساییم لەگەڵ «بەهییە فەرەجوڵا» لە ڕێی دڵدارەوە بوو، بەهییە کچە کوردێکی بەهائیی خوێندەوار و زمانزان و ئەدەبدۆست بوو، لە میسرەوە ڕایگوێست بۆ عێراق خەریکی دەرسدانی کچانی سانەوی بوو، لە ڕادیۆش گوتاری بۆ منداڵان بڵاو دەکردەوە. لە حەفتەدا یەک ئێوارەی تەرخان کردبوو بۆ مێوانان، ئیتر ماڵەکەی دەبوو بە کۆڕی ئەدەب، خۆی بە عەرەبی و فارسی و فرەنسی و ئینگلیزی دەدوا، کوردی فێر نەبووبوو هەرچەند گیانی کوردایەتی تێدا بوو، خۆشی بە کورد دەخوێندەوە. مامۆستا فەرەجوڵای باوکی لەگەڵ باوکمدا شناسایی نامەنووسییان هەبوو، وێنەی ئەو نامانەشم بە بەهییە نیشان دا، گەشایەوە. بە زاری خۆی دەیگوت حەز بە شوو کردنی گەنجێکی کورد دەکات کە ڕێی پێ بدات لە لادێی کورد خزمەت بە ئافرەت بکات… پێشتریش لە نووسینمدا گوتوومە دڵدار عاشقی بووبوو بەڵام عیشقی یەک لایی، «خەندەکەی بایی» شی بە خەیاڵی بەهییە هۆنیەوە. دوایین جار بەهییەم دیت لە پاش بەسەرچوونی ئەزموونی پۆلی چوارەمی حوقووقم لە سەرەتای هاوینی 1945، چوومە سەردانی دوعاخوازی لێکردنی، لەوە بەولاوە چاوم پێی نەکەوتەوە…

دڵدار لە ڕۆژانی هەوەڵساڵی بەیکەوە بوونمان لە ئۆتێلی ڕەشید بە ڕەسمی پێشنیازی کرد کە ببم بە ئەندامی «پارتی هیوا» بەڵام تەکلیفەکەم هەڵنەگرتەوە بێ ئەوەی هۆیەکی دەستنیشان لەو تەکلیف ڕەت کردنەوەیەدا هەبووبێت. ڕەنگە تاڕادەیەک کاڵی و کرچی لە ڕەفتاری سیاسیی هێندێک لە ئەندامانی هێوا دەخلی بەو هەڵوەستەمەوە هەبووبێت. چ لێم خۆش نەهات کە دیتم ئەندامی چەسپاوی هیوا لە خۆ ئامادە کردن بۆ دیدەنی وەزیرێکی کورد هێندە بە خۆیەوە خەریک بوو دەتگوت فەرهادە و یەکەم جارە دەچێتە ژوانی شیرین… ئنجا وەرزیرەکەش نەیدیت، کەچی هەمان وەزیر لە جادە چاوی بە زەیدی ئەحمەد ئەفەندی کەوت بە ڕاشکاوی و بێ هەناسەسواری لە زێدەوە، لەگەڵی کەوتە وتوویژ و بەینێکیش جادەیان بە پیاسە بڕی… وردە ڕێکەوتی خوێڕیلەی ئەوتۆیی نەیدەهێشت تامەزرۆی حیزبایەتی بم…

دوای ئەزموونی کۆتایی ساڵی خوێندنم لە پۆلی سێیەم کەوا بەر لە حوزێران لێی بووینەوە، گەڕامەوە کۆیێ. عەسران لە خزمەت مامما مەجلیسمان لە هەیوانی ڕووەو باغ و دەشت و تەپۆلکەکانی هەیبەسوڵتان، لەو بەشەی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەددا کە پێی دەگوترا «قەسر»، دەبەست. ڕۆژی شەشی حوزێران بوو کە چووم بۆ مەجلیسەکە قەڵەباڵغی خزم و دۆستان کۆبووبوونەوە و بەگەرمی باسی پەڕینەوەی سپای سوێندخۆرەکانیان دەکرد بۆ بەری فەرەنسا، من جارێ نەمبیستبوو، دەتگوت موژدەیەکی زۆر خۆشم پێ درا، وەک لە بیرمە ئەو ڕۆژە چواردە هەزار فڕۆکە بەشداریی لە کوتانی سپای ئەڵمانیا کردبوو. مەبەست لە چواردە هەزار ئەوەیە کە چواردە هەزار فڕینی فڕۆکە بە سەر ئەو جەبهەیەدا ڕووی دا، هەرچەند دەشێ فڕۆکە هەبووبێت لە جارێک پتر بە سەر جەبهەدا فڕیبێت.

لە ساڵێک پتر بوو ئەڵمانپەرستەکان لووتیان نزم بووبوو، بەم دابەزینە نوێیەی ئەمەریکا و ئینگلیز لە خاکی فەرەنسە، لەگەڵ لووت پشتیشیان چەمایەوە. بنیادەم مەخلووقێکی تەماوی و گرێیاوییە خۆی بەدەست ڕاڤەی ژێربێژانەوە نادات، دەنا کوردێکی کەس تێنەخوێندوویەوەی بێناونیشان بۆ دەبێ پتر لە مەراقی هیتلەردا بژیت تا مەراقی چارەنووسی خۆی و میللەتەکەی. ئەو نازییانە دەیەکی بایەخ دانیان بە ڕادیۆی بەرلین و یوونس بەحری گوێیان بۆ دەنگ و باسی کوردستانی دیوی ئێران هەڵنەدەخست بگرە حاڵوباری خۆیان و خێزانیشیان لە تەک شکۆی هیتلەردا نەدەهاتە پێش چاو، هیتلەریش یەک جار ناوی کوردی نەبرد...

پارەی تووتن چالاکییەکی بیژۆکی بێبەرهەمی وەبەر ئەو خەڵقە نابوو، مەجلیسی قومارچی و کەیفچی و ساختەچی گەرم ڕاهاتبوو، تووتنەوانیش بێقسوور بوو لە مەسرەفی بێجێ. خێزانی یەکێک لەو تووتنەوانانەی کۆیێ کە ساڵی 3000 دینارێکی داهات داهات دەبوو26، هەر جارە چووبایە بۆ حەمام زەنبیلە پرتەقاڵ و سێوی

26- بەیتارێکی خەڵقی سلێمانی، وابزانم عەزیز بەگی ناوبوو، دوای دابەزینی نرخی تووتن و ڕووتبوونەوەی خەڵقەکە، نەقڵی کۆیێ بوو. زۆر ناوی ئەو تووتنەوانەی بیستبوو بە سەخاوەت و زێدە سەرف، مەشوور بوو بە سێو و پرتەقاڵ و فستەقێکی کە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنایە نادی مەئمووران. عەزیز بەگ هەوەڵ چاو پێکەوتنی

لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ بەشینەوە. ئەمەم لە زۆر کەس بیستووە، ڕەفتاری مێردەکەشی لە دەستبڵاوی چی پێوەی بگوترێ جێی باوەڕییە...

لێرەدا نوکتەیەکم بەبیردا دێتەوە ئەمما وەکوو تووتنی بێشەما وایە: خوالێخۆشبووی د. عەبدولڕەحمان نوورجان لە گەرمەی پارەڕژانی تووتن و سەرقاڵیی ئەو خەڵقە بە چەک خورد کردنەوە و فەحس و تێکەولێکەی وردە حیسابی ناڕەوای وەک «اجور نقل» و «اجور حزم» و پارەی گونیە و... و... ئا لەو هەنگامەیەدا هاتەوە سەردانی خزمان بە شەهادەی بەرزی جۆراوجۆرەوە. مەشغەڵەتی پارە ڕێی لە خەریکبوون بە شەهادانەوە بڕیبۆوە. مامۆستا نوورجان ڕۆژێکیان کەسەری دڵی خۆی هەڵڕشت و گوتی: منیش شەهادەکانم دەسووتێنم و تووتن دەچێنم بە گونیە پارە پەیدا دەکەم... لەو قسانەدا بوو سەمەدی حاجی محەمەدی بەننا - مەشوور بە «سەمەدی حاجی مەنجەڵ»، بە هەلی زانی قسەی لێ وەرگرتەوە و گوتی: دەنا وەڵاهی ئەتوو تووتن بچێنی ئەمنیش دێم «بنەزی» (درووکێکی زۆر دڕە) لە کلکی وڵاغم توند دەکەم وا بە ناوی تووتنەکەتدا دەگەڕێم یەک پەلکی ساغی پێوە نایەڵم. مامۆستا نوورجان گوتی: منیش حەفت پاسەوان بە حەفت تفەنگی برنەوەوە ڕادەگرم هەرچی دەخڵی توونم بکات بیکوژن. سەمەد گوتی: ئنجا ئەگەر حەفت پاسەوانان ڕابگریت بە مەسرەفەکەی ئەوان موفلیس دەبێت ئەمنی پێناوێ...

خوێندنی ساڵی چوارەمم بە گرێوگاڵ و ناڕێک بوو، لە داچاندنی زەوییەکانی قەنبەرانی بیتوێنمان بە تووتن و چوونە بن باری بەرپرسییەکی گەورەی ئەو هەزاران دینارەی بۆ بەخێو کردنی پتر لە شێست تووتنەوان و مەسرەفی جۆگە و دامەزراندنی کەسابەتەکە لە توجاران وەرگیرابوو لە خۆوە داوای دەکرد لێم کە لە نزیکەوە سەرپەرشتییەکی مەیلەو دائیمی بکەم، هەندێ نەشارەزایی لەو خزمانەوەم کە بۆ یەکەم جار لە عومریان تەمای پارەداری بەرەو تێکەڵ کردن لە هەڵسووڕ و داسووڕی مڵکدارییەوەی دەبردن، شیرازەی بەرژەوەندە گشتییەکەی دەشێواند کە

---

ئەوە بوو بە بەرگی شڕ و بێ کەیف و زەوق لە جیاتی فستەق، تۆ بەربەڕۆژەی لە باغەڵ دەردەهێنا... گوتبووی: با بڕوا ئەم گ... تۆ بەربەڕۆژەم بۆ ئەقرتێنێ...

ڕاستە دەڵێن کەسێکی بە گەورەیی فێری پڵاو خواردن بێت پاروو بۆ لووتی دەبات.

ئەگەر ڕێی پێ درابایە بەگشتی تێیدا زەرەرمەند دەبووین. لە ساڵی خوێندنی 1944-1945، کە کۆتایی خوێندنی حوقووقم بوو، بەسەر ڕاگەیشتنم لە بەرهەمی کژەتووتنی 1943-1944 کە چەندین مانگی دەویست، لە فەحس کردن و حیساب پاک کردنەوەی - ئائەو بەسەر ڕاگەیشتنەم تێکەڵ بوو لەگەڵ گژەگژی دامەزراندنی باری کەسابەتی کژەتووتنی 1944-1945 کەوا هەتا بەرەو کۆتایی بەهاری 1945 ی خایاند. ئەم سەقاڵییە مەودای نەدام خوێندنێکی ڕێکوپێک بەسەر ببەم، ڕەنگە بە هەمووی مانگێکم دەوام نەکردبێت لە خوێندنی بەسەریەکەوە.

بەخت یار بوو لیستەی «غیاب»ی قوتابییەکانی پۆلی ئێمە بزر بوو، ڕاستییەکەی دەگوترا قوتابییەکی جەربەزە توانی ئەو لیستەیە لە ناو ببات، ئەگەرنا من ئەوەندەم غیاب زۆر بوو بایی ئەوەی دەکرد خۆم و یەکێکی دیکەش پێوەی لە ئیمتیحان بێبەش بکرێین… یەکەم ساڵ بوو لە هەموو عومری حوقووقی عێراق توندوتیژی لەلایەن ئیدارەوە بەکاربێت، 14 قوتابی لە پۆلەکانی دی بێبەش کران لە ئەزموون… چاودێری کردنی قوتابییەکان لە دەمی ئەزموون بۆ بەکار نەهێنانی قۆپیە لەو ساڵەدا دەستی پێ کرد. تەنها بیست ڕۆژ ماوەم هەبوو بۆ چاو گێڕان بەو دەریا دەریایەی کتێبەکانی پۆلی چوارەمی ئەو ساڵە. گەلێک فۆرمەی کتێبە نوێیەکانم بۆ هەڵنەبڕانەوە چ جایی بیانخوێنمەوە. خوێنەر لێم بسەلمێنێ کە بڕیارێکی قووڵ بە قووڵایی نەفس لەسەر هێندێ کە ناشێ لە «حقوق» بکەوم بوو بە داروەکازم و خۆمم بەسەریەوە گرت، ئەگەر لە مەکتەبێکی دیکە بامایە کە ماددەکانی سەربە کیمیا و فیزیا و ڕیازیات بن دەرنەدەچووم هەرچەند پتریشم سەعی کردبایە لەوەی کە کردبووم.

بەر لەوەی بکەوینە ئەزموون، دڵدار خەونێکی خۆی بۆم گێڕایەوە گوتی: وەهام دیت لە خەونمدا کە تۆ لە ڕێگەیەکەوە دەڕۆیت منیش بە دواتەوەم هەتا گەیشتیتە کۆسپێک لێی سەرکەوتیت، من لە کۆسپەکە کەوتم و هەڵستامەوە و لێی سەرکەوتم ئیتر لە دواتەوە دەڕۆیشتم، تۆ دەرگەت دەکردەوە و پێیدا تێدەپەڕیت بۆ دەرگەیەکی دیکە… لەو خەونە کاکە حەمەمان لەگەڵدا نەبوو… دڵدار بەدوا گێڕانەوەی خەونەکەیدا گوتی: تۆ دەردەچیت، منیش لە دەرسێک دەکەوم و دەردەچم، کاکە حەمەش دەرناچێت. ڕاستییەکەشی هەر ئەوە بوو.

من بازێکی بەرینم هاوێشت بۆ ئەزموونی کۆتایی، کە زووتر ڕووداوی ناخۆش یەخەگیری کۆمەڵێک لە گەنجانی ئەوسای کوردی بەغدا بوو، دووچاری بەندیخانە و موحاکەمەی کردن، ڕووداوەکە پێوەندی هەیە بە کاروباری «یانەی سەرکەوتن». وەها بە چاک دەزانم لە هەرەدوایی ئەم ئاڵقەیە باسی ئەو تەنگوچەڵەمەیە بکەم.

لە گێڕانەوەی شتێکی زێدە کەمبایەخی ئەو سەردەمانەی خوێندنی حوقووقم، دوو دڵم، دیارە کە هێمای بۆ دەکەم لایەنی باس کردنی پتر پاڵم پێوە دەنێت لە خامۆش بوون لێی. گرنگییەک هەبێت لە گێڕانەوەی ئەوەیە کە وێنەی دەروونی مرۆیەک ڕادەگەیەنێت لەلایەن توانای ڕەنگگۆڕییەوەی. هاوینی 1944 ماڵمان لە چنارۆک بوو، شەوێکیان خەونم بە هیتلەرەوە دیت. دۆستانە و مەحرەمانە و بێ ڕەسمییات لەگەڵم دەدوا، وتووێژیشمان بە ئینگلیزی بوو. من لە زۆر خەونی دیکەمدا بە ئینگلیزی و بە غەیری ئینگلیزی گەلێک ڕەوانتر و بێگرفتتر دواوم لەوەی لە کاتی بەخەبەری ڕەوانم. لەو خەونەش هەروەها بووم. لە بیرم نەماوە بابەتی وتووێژمان چی بوو بەڵام باش لە بیرمە کە لە کاتی خەونەکەمدا هیتلەرم خۆشویست، کە خەبەریشم بۆوە ئەسەری خۆشویستنەکە بە تێرڕەنگییەوە لەگەڵمدا دەژیا، چەند ڕۆژێکیش ئەو هەستەم بەردەوام بوو، شەرمیشم دەهاتەوە بدرکێنم شتێکی وەها لە مندا بەدەری داوە. بەڕاستی و بێ فێڵ لە خۆ کردن دەڵێم پاش ئەو خەونە نەمتوانی هێندەی جاران بە دڵ هیتلەرم بدزێت. هۆشم دەیدزا بەڵام هەستم جودا بوو. ڕەنگ بوو ئەگەر دوای خەونەکە، بۆ سپای ئەڵمانیا ڕێک کەوتبایە کە ڕەوی بێڕەحمانە بۆ سەر وڵاتی بێدەسەڵاتی بێگوناهی وەکوو یۆنان ببات کینی جارانم لە هیتلەر بەخەبەر بێتەوە، بەڵام لە ساڵی 1944 ئەو دەسەڵاتە بە ئەڵمانیاوە نەمابوو، تا کۆتایی شەڕ بۆی نەلوا هیچ هجوومێکی بێڕەحمانە بۆ سەر کەس ببات. جاروبار لەم ڕۆژگارەشمدا خەونی ئەوتۆیی دەبینم بەڵام بایی جودایی نێوان شلکیی ئەوسام و قاڵببەستوویی ئێستاکەم لە تەئسیری کەم بۆتەوە هەرچەند بە تەواویش ناسڕێتەوە.

ڕەنگە خوێنەری ئەم ئاڵقەیە تێیاندا هەبێ خۆی لە تەجرەبەکەمدا بدۆزێتەوە، خۆ ئەگەر کەس نەبێ گوێی بە تەجرەبە بچووکە ببزوێت دەبێ عوزرخوازی بکەم لە بەفیرۆ دانی کاتی. ئەمما ئەو ڕێگایەم بۆ دەمێنێتەوە کە بڵێم بایەخی خەون لە ژیانی هەمووواندا بەدەر دەداتەوە وەک کە عاشقێکی تامەزرۆ بە شەو یارەکەی لە خەوندا دەبینێت تا چەندێک پتر لە عادەتی بە خوولیایەوە دەخەریکێت وەیا یەکێک لە

غەریبیدا خەون بە وڵاتەوە دەبینێت، هەستی غەریبی کردن لە دڵیدا زیندووتر و سووتێنەرتر دەبێت، نموونەش لەم بابەتە زۆرن هەموو دەیانزانین.

دەبوو بڵێم بە دەوری دەرچوونمەوە لە پۆلی چوارەم گرفتێکی بێ بنج و بناوان چەند ڕۆژان سەغڵەتی کردم. کە لیستەی ناوی دەرچووەکان هەڵواسرا دیتم لە ڕیزی ئەو ناوانەی بە «م» دەست پێ دەکەن نووسراوە: «مسعود سعد الحلی» کە دەبوو «مسعود محمد الجلی» بێت. قسەیەکیش بڵاوبۆوە گۆیا قوتابییەک لەوانەی کەوتوون بە هەڵە ناوی چۆتە لیستەی دەرچوانەوە. مارانگاز لە خشەی پەتک دەترسێت، منیش هەڵەی ناوەکە بەو قسەیە لێم بوو بە دوودڵییەکی ناخۆش، سێ ڕۆژان خەریک بووم بەرپرسێک بهاوێمە بایەخ دان بە سەغڵەتیم هیچ سوودی نەبوو، هەر یەکەیان لە خەم و مەشغەڵەتی خۆی ڕۆچوو بوو، بایی ئەوەی نەپەرژێت واز لە کاری خۆی بهێنێت... ناچار بووم چوومە ئەو ژوورەی کە لیستەی ڕەسمیی ناوی دەرچووەکان و کەوتووەکانی لێیە و بێ تەقیە یەخەی ئەو تاکە کابرایەم گرت کە لە ژوورەکە بوو پێم گوت من سێ ڕۆژە سەغڵەتم بە دەست گومانەوە، دەرناچم لەم ژوورە هەتا تەماشای لیستە دەکەم و دڵنیا دەبم، کابرا ماڵی ئاوابێت قاسەی کردەوە و لیستەی پۆلی چوارەمی دەرهێنا و بە چاوی خۆم دیتم «مسعود محمد الجلی» دەرچووە... لە ڕۆژی 12/6/1945 لە نیقابەی «محامی» یان ڕەسمم دا و بە «محامی» نووسرام... تا ئەو ڕۆژەی کە باسم کرد خەبەری کۆیەم نەدا نەتیجەم چییە، ئەم جارە کە زانیم دەرچووم بروسکەکەم لێ دا بۆ برادەرێک، لە جیاتی بنووسم «أبشركم بنجاحي» نووسیم «اهنئكم...» قەیدی نییە سەلامەتی حیسابە...

کژەتووتنی 1944-1945 پیت و بەرەکەتێکی باشی پێوە بوو بۆ تێکڕای خاوەن تووتنان. ئەوەی دڵی شێواندم لە دەرەوەی بەرەکەتەوە بوو، هەرچەند هاندەر ئەو بەرەکەتە بوو. هەندێک لە نەشارەزایانی خاوەن پشک لە جۆگەی قەنبەرانی بیتوێنمان کە زوربەی تووتنەکە لەوێوە دەهات لە دەمی فەحسی تووتن و دابەش کردنی پارەکەی و سەروباری دامەزراندنی کەسابەتی 1945-1946 قوتەقوتێکی بێجێیان کرد کە من کەسبەکەم لێ دزێو هات و سوێندم خوارد بەهیچ جۆرێک خۆ لەو کەسبە ناگەیەنم... داهات نەگەیشتە 60% ی داهاتی کژی 1944-1945 باری فەحس و مومتاز و نومرە یەکیش دالەنگا. مەسرەفیش گەلێک هەڵکشابوو لەچاو پێشوو، ئیتر بە جۆرێک تێشکاین باس نەکرێت. هەندێک لەوانەی قوتەقوتیان

دەکرد بەشە مڵکەکەیان فرۆشت، برینی ئەو تێشکانەیان پێ قەپات کرد. مامم و من لە بەراوی قۆپی گۆمەشێرە، کە بە تەنیشت زەوییەکانی قەنبەرانەوە بوو و ساحێبیشی نەبوو، ئالەوێش هەر مەسرەفێکی کرابوو، هەر پارەیەکی درابووە تووتنەوانان، تێکڕای بوو بە قەرزی تازە بە سەرمانەوە. ئاو سەر ئەرز نەبوو تا بەدرەنگەوە پێی ڕاگەیشتم کە کژی داچاندن بەسەر چووبوو، بە ناچاری تووتنەوانەکان ئیزن دران بچنەوە وڵاتی خۆیان. ئەو ڕاگەیشتنەم بەسەر جۆگەی گۆمەشێرە هیچ پێوەندی بە سوێندەکەمەوە نەبوو کە لە ئاست قەنبەران بە زارمدا هاتبوو، ڕاستییەکەی بە ئیلحاحی کاک مەجیدی ئامۆزاشم ئەو ئەرکە بێلزوومەم هەڵگرت، ئاومان سەر ئەرز کرد بەڵام تووتن نەبوو پێی ئاو دەین...

کژەتووتنی 1945-1946 کەوتە دوای لەبەریەک هەڵوەشانی وەزعی مەهاباد، کە مەترسیی ئەولا هەڵستا تووتن لای ئێمە دالەنگا و خەڵق بە تێکڕایی کەوتە سەغڵەتی. تێشکانەکەی ئێمە 80% سووچی خۆمان بوو. کەسانێکی کەمتەرخەمی و بێمشووری و دەستبڵاوییان نەکردبوو، لەوساڵەشدا سوودمەند بوون.

ئێمە قەزری تووتنەوانەکانمان کەوتە ئەستۆ، یەخەی ئەوانیشمان نەگرت لێیان وەربگرینەوە، بەش بە حاڵی خۆم چەندین ساڵ بەردەوام بووم لەسەر دانەوەی قەرزەکە هەتا توجاری خاوەن پارە خۆی گوتی بەسە. مامم مڵکێکی مناسبی هەبوو لە بەراوەکانی گەڕاوی نزیک حەمام جەلی، هەمووی فرۆشت بۆ دانەوەی بەشەقەرزی خۆی.

فەلاکەتی لە پاش کژەتووتنی 1945-1946 خەڵقی هەڵوەراند، چەند ساڵێکی ڕێکوپێکی یەک لە دوا یەک تووتن بوو بە تەڵە و خەڵکی پێوە دەبوو، چونکە چ کەسابەتی دیکە نەبوو جێگری تووتن بێت، بە ناچاری ئاودێر ڕووی لە تووتن دەنا، نرخی کەم و پلەی بەرەژێری پۆلاندن و تێک هەڵشێلانی ڕستە تووتنەکانی ناو فەردە تووتنیش بووبووە سیاسەتی تۆڵەستاندنەوە لەو بووژانەوەی کە دەسەڵاتی ڕەسمی، نابەدڵ، سەلماندبووی لە ساڵانی چالاکییەکانی مەهابادا... فەحسی قەزاکان خرایە لیواکان، بە هەموو ئەرک و مەسرەفی زیادەوە کە گوێزرانەوەی تووتن و بە دیار فەحسەوە چاوەنۆڕ کردن داخوازی دەکرد. پارەداری مامناوەنجی زۆریان قومارباز بوون، گەلێک ماڵە تووتنەوان لە هەوای ناسازگاری بیتوێن و شارەزوور بە خۆراکی کەمەوە قڕانیان هات، قسەی خۆمان بێ، حەشری پێ کردین، تاڵایی و

بێدەسەڵاتی و مافخوراوی و ڕەنجەڕۆیی ئەو ساڵانەی بە تفتی و تیژی لە گوتارەکانی 1953ی دەمی نیابەتم تام و ڕەنگی دایەوە، بەڵام جارێ ماویەتی بگەینە ئەو قۆناغە.

هاوینی ساڵی 1945 پێوەی دیار بوو کە شەڕ لە گیانەلاوەدایە، لە سەرەتاکانی مایس بەرلین گیرا، هیتلەر و بەشێکی زۆری هەڤاڵەکانی خۆیان کوشت، ئەڵمانیا تەسلیم بوو مایەوە ژاپۆن، بۆمبای ئاتۆم لەو هاوینەدا کڕنووی بە ژاپۆنیش برد.

مرۆڤایەتی خەریک بوو برینەکانی خۆی دەلستەوە، «دەبەنگیی جەنگ» لە هەمووان بەدەری دایەوە هەرچی «هۆ و ئەنجام» ێک بۆ هەڵایسانی جەنگ و ئاکامەکەی بەدەنگ بهێنیت هەر دەگەیت بەو کۆتاییە کە ئاشتی سوودی گشتیی تێدایە. ڕەنگە بگوترێ ئەمەریکا و سۆڤیەت سوودیان لەو جەنگە چەنگ کەوت بەڵام نابێ لەبیر بکەین کە ئەڵمانیا و ژاپۆن شەڕیان هەڵگیرساند، فرەنسە و بریتانیا و ئیتالیاش یەکسەر کەوتنە جەنگ، هیچ کامێکیش لەمانە قازانجی نەکرد. سۆڤیەتیش بە تەنگانەیەکی کوشندەدا لە دەست مەرگ ڕەها بوو ئەوەندەشی چێشت شیرنایی قازانجی پێوە دیار نەبێت، جگە لەوە کە ئاو و خاک و مەزرا و لێڕی ئەوەندە هەیە دە جار لە توانای خۆی زیاترە، ئەمەریکاش بەدەست فیداییەکانی ژاپۆنەوە کە خۆیان لە بۆمبای باڵدار دەبەست و کەشتیی ئەمریکایان پێ دەتەقاند تەنگەتاو بووبوو، هێندەش تێر بوو لزووم نەبوو خوێنی گەنجەکانی لە پاروە چەور و شیرنەکانی هەڵسوێت.

هەرچۆنیک بێت جەنگ هات و بڕایەوە، تازە بە ئێمە ناکرێ بە شایەدیی چاک پەسەندی بکەین و بە توانجی ناحەزانەش دزێوتری بکەین لەوەی کە هەیە. خۆمم لە بیرە چۆنچۆنی ئاکامی جەنگ نیشتە دڵمەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ئاواتەی دەمخواست بۆ سەرکەوتنی بەرەی دیمۆکرات، شادییەکی ئەوتۆم هەست نەکرد بە هاتنە دی ئاواتەکەم. دنیا هەر وەکوو خۆی بوو، جارێ نەشماندەزانی مەهاباد سەربە چ دەگەیەنێت.

من هەرچەند حوقووقیشم تەواو کرد گۆڕانیک بەسەر چۆنیەتیی ڕابواردن و گوزەرانمدا نەهات. هاوینەکەم لە سەرپەرشتی کردنی دەغڵ و شیناورد و ڕەز و باغ لە پێبازۆک و چنارۆک بەسەر برد. سەردانێکی بیتوێنم کرد کە ئەوسا سوێندم لێ نەخواردبوو. قەپوقیرێکی نێوان سەرکارەکان وەهای کرد بچمە ڕانیە، ئەوسا مامۆستا

شاکر فەتاح قایمقام بوو. دیدەنی خاڵەکانم کرد و بە قەنبەراندا گەڕامەوە بۆ پێبازۆک. قۆناغێکی زۆر خۆشم لە نێوان بیتوێن و پیبازۆکم دێی «کانی مازوو» بوو کە حەسەناغای جەلالاغای غەفووری ماڵ و قۆناغی لەوێ بوو. هەر جارە شەوێکی لێ میوان دەبووم و لەگەڵ مەلا محەمەد ئەمین کە مجازی باوکم بوو دیدەنیمان دەکرد. فەقێ سمایلیش کە لە دەمێکەوە ناسیاوم بوو زاوای پێبازوکییانیش بوو، بە درێژایی مانەوەم لە کانی مازوو بەجێی نەدەهێشتم، حەسەناغاش ناوناوە لە هاویندا سەردانی چنارۆکی دەکرد. هەر بە دۆستیش مایەوە تاکوو لەو چەند ساڵەدا کۆچی دوایی کرد، پاش ئەوەی حەسەناغا ماڵی لە کانی مازوو هەڵقەنا، فەقێ سمایل بوو بە خانەخۆیێ ئەو سەفەرانەم، هەر جارە لە گەڵیشمدا دەهات بۆ پێبازۆک، چەندێکی بۆ کرابا لامان دەمایەوە.

مەلا محەمەد ئەمین کانی مازوەتی بوو، لای باوکم خوێندنی تەواو کرد و ئیجازەشی لێ وەرگرت. مەلایەکی لێهاتوو بوو، چەندین ساڵ دوای بوونی بە مەلای «مدرس» تووشی دەردی خروێلکە بوو، تانەی هێنایە سەر چاوەکانی. بەینێکە لێی بێ خەبەرم، دوایین جار لە بەرەو کۆتایی شەستەکان دیتمەوە، ئەوساش حەسرەتی دەکێشا بۆم کە لە جێی باوکم بەردەوامی مەلایەتی نەبووم.

محامات یەکسەر نەبووە پیشەم. مەراقێکم نەبوو دەعوا بگرم هۆیەکەشی ئەوە بوو شەرمم دەکرد مزە وەربگرم. من لە ماڵی خۆمان بەوە ڕاهاتبووم ئیشی خەڵق ڕاپەڕێنین بە ئەرک و مەسرەفی خۆمان. هەروەک زەحمەتە لەو حاڵەتەوە با بدەینەوە سەر پارە وەرگرتن لە لێقەوماو ڕەنگە زەحمەتیش بێ بۆ بابایەکی لە دیوەخانەی خۆی میوانی داکردبێت دواتر ببێتە ئۆتێلچی و شەوانەی نوستن لە خەڵق وەربگرێت. مەودا گەلێک زۆرە لە نێوان ئەوەی مێوان دابکەیت و بە خواردنەوە خزمەتیشی بکەیت لەگەڵ ئەوەی کرێی نوستنی لێ وەربگریت و بە پارەی خۆی چێشتان و فراڤینی لەبەردەم دانێیت... هەڵبەت مەبەستم ئەوە نییە بڵێم محامات بە پارە عەیبە، خۆ دواتر خۆیشم کەوتمە سەر مەحامات بەڵام تەجرەبەی خۆممت بۆ باس دەکەم لە کەسبێکی حەڵاڵ کە شەرمم دەهاتەوە پارەی تێدا وەربگرم.

ساڵی 1946 کە زستانەکەی وەکوو هەموو زستانێک دەکەوێتە نێوان دوو ساڵان ئەویش هەروەها، لەو زستانەی نێوان خۆی و 1947 دا چەند دیارییەکی بۆم هێنا:

یەکیان ئەوە بوو کە لەو زستانەدا تەکلیف کرام بۆ ئەندامەتیی پارتی دیمۆکراتی کوردستان، قبووڵیشم کرد بەڵام نەک بەو مەرجانەی ئەندامی پێ وەردەگیرێن چونکە وەزعی من ئەوە نەبوو لە کۆبوونەوان بەشدار ببم و نەشرە بڵاو بکەمەوە و حازر بەدەست بم بۆ موزاهەرە... قەتیش لە تەحەمولمدا نەبووە پابەندی بەرپرسیاری کاری گەورە بم... بووم بە پارتی و بەس و ناویشم «هۆشیار»...

دیارییە ڕەشە نەحسەکەی تێکچوونی مەهابادیش لەو ساڵەدا بوو. بوونم بە ئەندام لە پارتی وەها ئاشکرا نەبوو بە ڕەهایی هەموو کەس پێ بزانێت، لەمەوە دوو کەسی چالاکی شیووعییەکان27 حەفتانە دوو جار یان پتریش سەریان لێ دەدام هەر یەکە بە جودا. داوەت نەکرام بۆ حیزب بەڵام بەوپەڕی ڕوونی و ئاشکراییەوە لەگەڵم دەدوان، واش دەزانم بەلای کەمەوە یەکێکیان بە ئومێد بوو من خۆم داوا بکەم بە ئەندام وەربگیرێم. چالاکەکەیان لە ڕێی سیاسی یەکسەرەوە دەیدواندم، ئەوی دیکە بە لای سەقافەتدا دەچۆوە. لە بیرمە جارێکیان بابای چالاک لە وتوویژدا گوتی: «دەبێ حیزب (ضبط حديدي) ی هەبێت» من گوتم «(ضبط حديدي) کاتێک پەسەند دەبێت کە حیزب هەڵە نەکات». ئەم هاتوچۆوانە کەموزۆر بەردەوام بوون هەتا بەرەو کۆتایی 1948 کە «وەسبە»ی تێدا قەوما.

تێکچوونی مەهاباد ڕۆژێک بیسترا لە گەڕە دەعوەتی دەوڵەمەندێکی گەڕەکەکەمان بووم، لە حەج گەڕابۆوە. دوای نانخواردن خەبەر هات کە مەهاباد گیرا و... و... یەکسەر بەدوا ئەمەدا ئاغایەک گوتی: «بە سمێڵی ستالین». من بە دەنگ نەهاتم چونکە نە قەرزدار و نە وەکیلی ستالین بووم. مەلایەک لە موجازەکانی باوکم بە

---

27- ئەو دوو کەسە چالاکە، یەکێکیان عوسمان مستەفا خۆشناو، ئەوەی دیکەیان فاتیح ڕەسووڵ بوو. عوسمان مەستەفا لە گەڵمدا پتر بە لای سەقافەتدا دەهاتەوە، هەرچی فاتیح ڕەسووڵ بوو بەلای سیاسەتدا، هاوینی پار ١٩٩٣ دوای چەندین ساڵ لە هەولێر دیتمەوە زۆر بە گەرمی ئامێزی لێ دام، تەجرەبەی تفت و تاڵ لە سیاسەت و حیزبایەتی و غەریبایەتی خستبوویە بیروڕا و قەناعەتێکەوە پێوەندیی نەبێ بە تیژڕۆیی چلەکان و پەنجاکانی. عوسمان مستەفا وەک جاران هێمنە و پتریش لە جاران دۆستمە تا ئەوەی بڕە شیعرێکی ناسک و شلکی پێم ڕەوا دیتبوو، لە گۆڤاری ڕەنگین بڵاوکرایەوە.

سمێڵەخنکەوە گوتی: «پێشەوا بووە پاشەوا». خۆم پێ نەگیرا، بێ ئەوەی ڕوو لەو بکەم هەرچی هاتە سەر زارم گوتم. قسەکانم زۆر ڕەق بوون بەڵام کەس ورتەی لەبەرەوە نەهات، مەلاکەش متەقی نەکرد.

پاش جەنگ حکوومەت وەهای پەسەند کرد ڕێ بە دانانی حیزب بدرێت. «سعد صالح» بوو بە وەزیری ناوەوە، مرۆیەکی پاک و دیمۆکرات بوو. بەپێی باوەڕی من بەرەی چەپ و پێشکەوتنخواز لەو دروشمانەی هەڵی دەگرت و ئەو هەنگاوانەی دەیهاویشت و ئەو تێکهاویشتنە ناوەکییەی دەینایەوە، یەک داوی پێوەندی بە واقیع و بەرژەوەند و پلەی خەبات و قۆناغی مێژوویيەوە نەبوو، دەروێشییەکی ئایدیۆلۆجی گیان و مێشکی ئەو خەباتکەرانەی وەها داگیر کردبوو سەد خۆزیم بە دەروێشایەتیی قاپیی گەیلانی، خۆ هەر نەبێ گوێت لە دەفەزەنییەک دەبێت. خەیاڵاتی بەتاڵ و بێبنەما لەسەر هێندێ ڕایەڵەی چەپایەتی تەنافبازیی بە هەواوە دەکرد کە ئەگەر جیهانی تەسلیم کرابایە نەیدەزانی شێلم چۆن دەچێنرێت و کەنگی مەڕ دەدۆشرێت، لەو بگەڕێ کە هیچ ئاگای لە واقیعی ژیان و گوزەران و بەرهەم و ئەو حەق و حیسابانە نەبوو، تەنانەت نەیتوانی لەگەڵ خۆی برادەر بێت. لەسەر کاغەز دوژمن دیاری دەکرا، لە کووچە و بازاڕ و دەمی چالاکی یەخەگیری یەکتر دەبوون...
چەندین وردە حیزب، کە هیچیان جوداوازییەکی ئەوتۆ لە بیروڕایاندا نەبوو، کەوتنە داخوازیی ئیجازە، هێندێکیان وەریانگرت، لێیان پیرۆز بێت، بەڵام بێسوود و بێئەنجام.

ڕاستییەکەی باری کۆمەڵایەتی لەوەدا نەبوو «جەماهیر» بزانێت حیزبایەتی لە کوێوە بە پێویستی چاکە و گوزەرانی گشتی لە قەڵەم دەدرێت. جەماهیر نەیدەزانی جەریدە بخوێنێتەوە، لە دەشتودەر خوێندنەوە بەوەلەد نەبووبوو، کەچی خەباتگێڕەکان لە وەکالەتی ئەو جەماهیرە یەخەگیری یەکدی دەبوون بەناوی حیزبایەتی...

قانوونی هەڵبژاردن هەنگاوێک بەرەو پێش چوو بەوەدا کە هەر «قەزا»یەک سەربەخۆ لە تێکڕای «لیوا» نوێنەری خۆی هەڵبژێرێت، جاران گەلێک زەحمەت بوو یەکێک بتوانێ لە پەراوێزی هەموو لیوادا بەربەرەکانیی حکوومەت بکات...
چاکەیەکی دیکەی قانوونی هەڵبژاردن ئەوە بوو کە دەنگدان بوو بە یەک پلە نەک دوو پلە وەک زووتر دەبوو، لە پێشیەوە چەند کەسانێک بەپێی نفووسی خاوەن

دەنگان بە هەڵبژاراوی یەکەم دەربچن و ئەوان نوێنەر هەڵبژێرن، لەو بینەوبەرەیەدا حکوومەت دەیتوانی دەستکاری پێویست بکات.

لە نموونەدا دەڵێم کاتێک نائیب بووم لە ئۆتێلی «تروکادێرۆ» دابەزیبووم، بۆیەک لەوانەی خزمەتیان دەکرد، تکای کرد بۆی خەریک ببم بەڵکوو قبووڵی دەکەنەوە لە وەزیفەی فەڕاشی (یان شتێکی وەک ئەو) گوتی بە تۆمەتی دەستکاری کردن لە سندوقی ئینتیخابات فەسڵ کرام. گوتم ئنجا ڕاست بوو دەستکاریت کردبوو؟ گوتی «اي والله كان صدق»، بە ئیزنی مدیر ناحیە دەهاتم بزمارەکانی سەری سندوقەکەم هەڵدەکێشان و دەنگەکانمان دەگۆڕین بەو جۆرەی حکوومەت دەیویست. هەروا بەدەم وتووێژە گوتی: تۆمەتێکیشم ئەوە بوو کە بەرتیلم، بۆ مدیر ناحیەکان، لە خەڵک وەردەگرت. بە پرس لە منەوە گوتی: بەخوا ئەویش ڕاست بوو، تەنها یەک مدیر ناحیەم دیت بەرتیل نەخوات. ئەوسا مدیر ناحیەکەم دەناسی بەڵام ئێستا ناوەکەیم نایەتە بیر ئەمما سەد خۆزی بە مدیری بەرتیلخۆر چونکە ئەو کابرایە هێندە ملچومۆن بوو نە بە بەرتیل نە بە بێ بەرتیل خۆی بۆ کەس ماندوو نەدەکرد.

لەو قۆناغەدا من بە ئیزنی حیزب خۆم نامزەد کرد لە ڕانیە بەڵام سەری نەگرت... دواتر کە شوێنی نائیبی کۆیێ بە ئیستیقالە چۆڵ بوو حکوومەت لێی ڕاسپاردم خۆم نامزەد بکەم، بانگهێشتی هەولێر کرام، لەوەی پێم گوترا حکوومەت بەرهەڵستیم لێ ناکات بەڵام من نەمسەلماند، پاش بەینێک کوردێکی دانیشتووی بەغدای وەزارەتدیدە خۆی نامزەد کرد و ئێمەش بەرهەڵستیمان نەکرد...28

---

28- لە ڕێی عیززەددینی مەلا ئەفەندییەوە تەکلیفەکەی حکوومەتم پێ گەییشت. کوردەکەی دانیشتووی بەغدای وەزارەتدیدە محەمەد عەلی مەحموود بوو، مەشوور بوو بە «محەمەد ئاڵتی». کە بوو بە نوێنەری کۆیێ سەردانی کۆیەی کرد و لە کاکە زیاد میوان بوو. شەوێکی خۆشمان بە قەڵەباڵغی لەگەڵدا ڕابوارد ئەمما لە سەر وشەیەکی ئینگلیزی random خیالفمان بوو، ئەو وتی random بە واتای «اغتباط» هاتووە کە دەکاتەوە شادی و کەیف. من گوتم بەپێی ئەوەی لە نیزامی دادگاکانی ڕۆژاوادا دەستەی Jury بە جۆرێکی at random هەڵدەبژێردرێن، وشەکە «اعتباط» دەگەیەنێ بە واتای بێمەبەست، ڕەنگە لە قامووسدا «اعتباط» سکون لەسەر پیتی

له وەزارەتی «ساڵح جەبر» (صالح جبر) هاوینی 1947 کۆنگرەیەکی عەشایر له شاری «حله» بەسترا. دوو سەرەک عەشیرەتی ئەو ناوه که خەزووڵی ساڵح جەبر بوون لەو عالەمەیان گێڕایەوە و مەسرەفی سەرلەبەری کۆبوونەوەکە ئەوان کردیان. من له بەغدا بووم، بانگێش نەکرابووم بەڵام چەند سەرەک عەشیرەتێکی دۆست بەزۆر بردمیان. کۆنگرەکە به ناوی پشتگیری کردن له فەلەستین بەسترا، ساڵح جەبریش ئامادە بوو و گوتاریشی تێدا خوێندەوە. ئەگەر چی کۆنگرە و کۆبوونەوەکە هیچی لێ شین نەبۆوە ئەمما بەڕاستی نانوپاتێکی ئەو ڕۆژە بەو هەزاران هەزار کەسە درا جێی گوتنەوەیە. وەها دابنێ ڕیزە ڕەشماڵێک به درێژایی سەد مەتر، ئنجا بایداتەوە به چەپدا بۆ ماوەی پەنجا مەتر ئنجا دیسانەوە سەد مەتری دیکە بابداتەوە تا دەگاتە کێشی هەوەڵ ڕەشماڵ، به درێژایی ئەو مەودایانە مەشەمما ڕاخرابوون له جیاتی مێز و سینی. حیساب بکە یەک ڕەوسەی پڵاوبرنج سەرتاسەری مشەمماکانی گرتبۆوە، سەدەها بریانیی بەرخ و پتر له هەزار بریانی عەلیشیش و مریشکیش به دەور و نێوان ڕەوسەی پڵاوەوە، ئنجا چەندین مەرەگ و شیرنایی نایاب له ڕۆخی ئەوبەر و ئەمبەری مشەمماکانەوە... دەست شووشتن به سۆدە بوو له جیاتی ئاو... ئاغایەکی کوردەواری گوتی: هەموو ملکم بفرۆشم ئەم جەمەی تێنابێت. ئێمە ئەو ژەمەمان دیت، نانی سبەینە و شەوی ڕابوردووش هەروەها بووە...

لێرەدا شتێک دەڵێم مێژوو بۆی ناچێت: وەزارەتی ساڵح جەبر به هەر نیازێکەوە بێت هانی خەڵقی دەدا بۆ خۆ بەدەرخستن له مەسەلەی فەلەستیندا. وردەوردە ڕێ خۆش کرا بۆ «مظاهرة». ساڵی 1948 به ڕەزامەندیی حکوومەت موزاهەرە زیادی کرد. دوای پشووی هاوینەی مەکتەبەکان موزاهەرە به هۆی بەشداری کردنی ئاپۆرەی قوتابیان هێزی زیاد کرد، وێنەی بەرەو گۆڕان دەچوو. لەو وەختە هەستیارەدا وتووێژی ساڵح جەبر له لەندەن دەستی پێکرد بۆ گۆڕینی موعاهەدەی کۆن به موعاهەدەی «پۆرتسمۆث» لەگەڵ بریتانیادا. ئەو موزاهەرەی به درێژایی ساڵ له تەوژم بوو، له تشرینیشەوە خەریکی وێنەگۆڕیی بوو، به ئاسانی و شێوەی ئالەتی

---

«ع» وەک نوختە خوێندرابێتەوە کردبێتیە «اغتباط»... لێکترمان نەسەلماند. له ساڵی ١٩٥٣ دیسان بەتەمابوو کاکە زیاد بیکاتەوە به نائیبی کۆیێ، دواتر باسی دێت.

کەوتە دژی پەیمانی پۆرتسمۆث و لە ئاکامدا بووە ئەو ڕاپەڕینە خوێناوییەی پێی گوترا «وەسبە» و ساڵح جەبری لێ خست و پۆرتسمۆث-ی سڕییەوە... دەوڵەت پشووی درێژ کرد تا لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا پەیمانی بەغدای لەگەڵ چەند دەوڵەتێک، نەک تەنها بریتانیا، بەست...29

لە بەرەو کۆتایی بەهاری 1947 هەرایەکی عەشایری لە بیتوێن بەرپا بوو، هەرایەک لەسەر پشکی بەرهەمە تووتنی جۆگە ئەمیریەکانی بیتوێن ڕووی دا. غەفووری مڵکی خۆیانیان هەبوو، لە جۆگە ئەمیرییەکانیش بەشدار بوون، لەگەڵ خدری حاجیاغای پژدەریش، کە لە دێی بابیزاغای نزیک میرزا ڕۆستەم نیشتەجێ بوو، هەمیشە لێکیان دەژەنی. تەمای «حصة»ی جۆگەکان هەندێ براگەورەی خستە سەر باری دۆستایەتی لەگەڵ پژدەرییەکان. هەوڵی ڕەواندنەوەی ئەو تەگەرانە بێسوود بوو، کێشە کەوتە باری دروستایی شەڕ، پژدەر و خاڵەکانی من و ئاکۆ و - وابزانم - خۆشناوی پشت گەلی و مەندەمەرە و وردە تیرەی دیکەش یەک بەرە بوون...

---

29- چی من لێرەدا بۆی چووبووم، لە ساڵی ١٩٥٣ یان ١٩٥٤ لە وتووێژێکی بەسەرپێیانەوە، لە کتێبخانەی «مرکزی» بەغدا مەرحووم «سەعید قەزاز»یش هەمان بۆچوونی دەبڕی بێ ئەوەی بزانێ من بیرگێڕیم تێدا کردبێت یان بە ئەنجامێک گەییشتبێتم لە نرخاندنی «وەسبە» (الوثبة) کە دەرکەوت هەڵچوونێکی نەزۆک و بێجێ و خۆدۆڕاندن بوو تا ئەگەر بەبەریەوە هەبایە بە مەنهەجیش بگاتە دەسەڵاتی حوکم کە دەزانین لە وڕێنەشدا ئاکامی ئەوتۆیی وەها پەیدا نەبوو، هەمیسان سەری بە ماڵکاولی و گێرشێوێنی و یەکترکوژی و وێرانییەوە دەنا وەک کە دیتمان دواتر مەنهەجی «بەرەی نیشیمانیی یەکگرتوو» لە ئاکامی شۆڕشی ١٩٥٨ چی بەخۆی و بە عالەم کرد...

مەحوی دەڵێ:

کە مل بۆ گەینە پەت بێ
پێ لە کورسی و ئەسکەمل چ بکات

جیهانی سێیەم (ئەگەر دەیەم و بیستەم نەبێ) جارێ زۆری ماوە شەیتانی پێ پێبکەنێ...

غەفووری بە سەرۆکایەتیی مەلا حەوێزاغا و بڵباسیش بە سەرۆکایەتیی سمایلاغای سواراغا لە موقابیلدا... شەڕ دەستی پێکرد و هەڕەمەی لەشکری مەلا حەوێزاغا خۆی نەگرت... لەسەر تەکلیف30 لە خزمەت مامە شێخ نووری و خاڵە شێخ سەدری

---

30- ئەو تەکلیفە کاکە زیاد لە خۆمی کرد. بە دەم تەکلیفەوە و بە شێوەی ئاسایی مامم و خاڵە شێخ سەدر نامزەدی ناوبژی کردنەکە بوون و هەر ئەو پاشنوێژە لە خزمەتیاندا بەرەو بیتوێن کەوتینە ڕێ. لە خزمانی جەلیزادە حیسامەددینی مەلا ڕیفعەت و کاکەی کاکەمەلا و ئیسماعیلی مەلا نووری و حەمەساڵحی مەلا تاهیر (کە هەموویان بە ڕەحمەت شاد بوون) لە گەڵمان بوون. تێکڕامان دوازدە سوار بووین. شەو لە چنارۆک، لای ماڵەکانی کانیکەند-ی سەربە چنارۆک کە لە هەواری بەهاردا بوون، ماینەوە. کات درەنگ بوو بە بەریەوە نەبوو بگەینە قۆناغێکی دیکە، دنیاش وەها کشوومات بوو ئەو ڕێگەوبانانە، کوردی گوتەنی، چویلەکەکوژی پێدا نەدەڕۆیی، بەرەو بیتوێن هەرچی هەبوو لە شکەستەی لەشکری کۆییان بەرەو کۆیێ دەگەڕانەوە زڕەدرۆی عەجایبیان دەگێڕایەوە بۆ خۆ پەڕاندنەوە لەو هەلاّتنەی تێدا بوون. بە ئێمەیان دەگوت بۆ کوێ دەچن؟ دنیا جمیوە، خدران ئاگری تێ بەردراوە، کەس بە کەس نییە، ئالاّیەکی سپی هەڵگرن مادەم هەر بەرەو ئەو ئاگرەوە دەچن... ئیتر لەم بابەتە ورەبەردانە شتی سەیروسەمەرەم دیت و بیست. ئەو دەمە مەلا حەوێزاغا بەرەو کۆیێ لە گەڕانەوەدا بوو، شەڕی بەتاڵ کردبوو بەلاّم ئێمە نەمان دەزانی...

سەفەرەکەمان دوو سێ شەوی خایاند، لەگەڵ خالاّن و پژدەرییان و سەرۆکەکانی دیکەی لەشکری هەڵمەتبەر گەلێک وتووێژی مەسلەحەت ئامێز و ڕووەو ئاشتی بەدەم نوکتە و لەتیفە و پلاّووگۆشتی لەمشەوە ئەمدیو و ئەودیو پێ کرا... کژەکەی زۆر ناسک بوو، دەمی تووتن چاندن بوو، تووتنەوانان پەرتەوازەیان کردبوو ئەگەر زوو هێمنایی نەگەڕابایەوە بەشێکی بەچاوی تووتنەوانی بیتوێن بە مڵکدار و توجارەوە دەچوونە خەسارەتێکی زلەوە. ناوبژییەکەی ئێمە ئەم لایەنەی چارە کرد کە خەڵکەکە گەڕانەوە سەر کەسابەتیان، بەدەم کاتەوە دوژمنایەتییەکەش کزبۆوە بەتایبەتی لە ئاست کاکە زیاددا کە بە نەتیجە لەگەڵ خاڵەکانم و شێخ حسێن بوو بە دۆستێکی خزمئاسا.

شێخ کەریمی بەرزەنجەدا چووین بۆ ناوبژی. ئەم هەرایە لە کتێبەکەی «حەماغای گەورە» دا درێژی پێدراوە و باشتر ڕوون کراوەتەوە، لێرەدا دووبارە کردنەوەی بێجێ

---

زۆریشی نەبرد لەسەر مەسەلەی نیابەت بەینی لەگەڵ مەلاحەوێزاغادا سارد بوو، بگرە پسۆک بوو... قسە زۆرن من لێ کورت دەکەمەوە و بەمەندەی گوتم وازی لێ دێنم، بەڵام پاش دوودڵی چەندین ساڵ لە درکاندنی شتێکی سەر بەو هەرایە وەها هاتە دڵمەوە ئەو نهێنییە بچووکە چیدیکە نەشارمەوە: کاکە زیاد هەرچەند لە نیزاعی نێوان مەلا حەوێزاغا و خدری حاجیاغا-ی پژدەریدا چ دەخلێکی نەبوو، کە هەرا پەیدا بوو و ئاپۆرەی عەشیرەتەکان لەوەی چاوەڕوان دەکرا زیاتر و تیژتر لووزەوی هێنا وەها هاتە قەناعەتییەوە حکوومەت دەخلێکی بنەڕەتی هەبێت بۆ هاندانیان دژی هەموو غەفووریان نەک هەر مەلا حەوێزاغا. ڕەنگە لای کەسی دیکەی کۆیی ئەو گومانەی دەرنەخستبێت، منیش لە هەوەڵەوە ئەو گومانەم بە ئاکامی سەغڵەتی حیساب کرد بەڵام کە چووینە ناو عەشیرەتەکان و قسە و ڕاوێژ درێژەیان کێشا بۆ ڕۆژی دوەم لە پەنا گەشەی سەرکەوتنەوە عەباسی مامەنداغا بەدەم هەستی لە خۆ ڕازی بوونەوە لەگەڵ بزە و نەرمە خەندەیەک گوتی: ئەمرەکی وەهان بە دەستەوە بوو هەتا (نازانم کوێ) دەچووین... من لێم دووپات نەکردەوە ئەو ئەمرە هی کێیە بەڵام دیار بوو مەبەستی حکوومەت بوو، ڕەنگە لە حکوومەت گەورەتریشی مەبەست بوو چونکە ئەوەی ڕاستی بێت کاکە زیاد وەهای بەدڵدا دەهات شەریکەی نەوت-ی کەرکووک ڕەزامەندی بەسەر ئەو هەرایەوە هەبێت، هەر بۆیەش زێدە سەغڵەتی پێوە دیار بوو. بێگومان هەڵوەستی کاکە زیاد لە سیاسەتی سەربە کوردایەتی، بەتایبەتی ڕۆژگاری قازیی محەمەد-دا دژ دەوەستا لەگەڵ سیاسەتی ئینگلیز. ئەویش و شێخ لەتیفی شێخ مەحموودیش دۆستی جەرگسۆزی مەهاباد و قازیی محەمەد بوون. شێخ لەتیف لە پەنجاکاندا حوکمی ئیداری سێ ساڵەی بۆ دەرچوو، کە ١٤ تەمووز تەقیەوە ئەویش و شێخ ئەحمەدی بارزانی و جەماعەتەکەی بەرەڵابوون.

دەبێ ئەویش بزاندرێ کە هەراکە شتێک بوو حکوومەت قۆستییەوە نەک بۆ حکوومەت کرا، هەوڵێکی شێخ حسێن دای ئەگەر بەهەند هەڵگیرابایە هیچ ڕووی نەدەدا.

دەردەچێت، دەشبوو ئەمەندەشی لەسەر بنووسم چونکە بەشێکە لە گەشتی ژیانم. لێرەدا دەبێ بڵێم خاڵەکانم بە دڵ حەزیان لەو هەرایە نەدەکرد بەڵام لەبەر بەشداربوونی پژدەر نەدەکرا خۆیانی لێ بدزنەوە. شێخ حسێن هەوڵێکی تایبەتی دا بۆ هەڵنەگیرسانی هەراکە کە لێرەدا ڕێم نییە چۆنیەتییەکەی بنووسم بەڵام بێسوود بوو بەوەشدا فتیلەی هەراکە ئاگر درا... هەراکە بە زۆری لەشکری پژدەر و مەسرەفی شێخ حسێن بە ڕێوەی برد کەچی ناو و شۆرەتەکە بۆ یەکێکی دیکە ڕۆیشت و ڕەگی سەرۆکایەتیشی بۆ داکوتا...

وەک من لەم دونیایە دەگەم کەس لە هەراکە سوودمەند نەبوو، هەر زێدە پارووێکی کەوتبێتە کاسەی ئەم و ئەوەوە دەشیا بە تەبایی دەردەست بکرێت. مڵک و بەراوێکی حکوومەتیش کە بە لوولەی تفەنگ دابچێنرێت داهاتەکەی هەر دەبێتەوە مەسرەف کردن لە پاراستنی. چەند چاوەشێک دەهۆڵی بۆ دەکوتن و زۆڕنا دەژەنن، شەڕناخێوییەکیش لەلایەن چەند خوێڕوانەوە لە ڕۆژی ڕاوەبەراز و بووک گواستنەوەدا بەرپا دەبێت کە هەمووی بایی دوو هەفتەی ژیانی ئاسوودە و بێ ئێشک ناکات.

ڕێی مەسڵەتی لەلایەن تەبیاتی نالەباری مرۆڤەوە دەبەسترێت نەک لەلایەن خودی بەرژەوەندەوە. لە خەریتەدا سەیری ئەو ناوچەیە بکەیت کە ئەو چەند هۆز و تیرە و تیرێژەی تێدا خەریکی جرت و فرت بوون دەبینیت بایی ئەوە ناکات ناوەکەی لێ بنووسیت، خۆ ئەگەر بڵێیت هەر یەک لەو سەرۆکانە بە تەمای مەزنایەتی و پێشەوایی لە هەوڵ و تەقەلادا بووە، پێت دەڵێمەوە: گومان نییە لەوەدا کە هیچ ئاقڵێک تەمای نابێ بڵباس ئاکۆ بخوات وەیا پژدەر بتوانێ بیتوێن قووت بدات. مەزنەکان لەم ڕاستییە خەبەردار بوون بۆیە بوو هەر یەکە بەتەما بوو لە یارییەکەدا وەک لە یاریی دامەدا یەک بە دوو یاخود چۆغەدار لە دراوسێکەی بکات و قەپێکی لێ بگرێت. ئەو قەپ لێ گرتنە لەوە پتر نەبوو کە دەبۆوە بە ئەرک و مەسرەفی یەک بە دوو چۆغەدارەکە.

بیتوێن بە ڕێکی و تێکگەیشتن بخورابایە بۆ براگەورەکانیش سوودبەخشتر دەبوو، ئاپۆرەی وەرزێر و تووتنەوانیش پتری پێ دەحەسانەوە.... بەڵام چ جێگەی سەرسووڕمانە عەشرەتی نەخوێندوو لە سەر سوودی ماددی پێک نەیەت کە دەزانین هەر لەو دەمانەدا خوێندەوارەکانی بەرەی دیموکرات لە شارەکان

نەیاندەتوانی لەسەر بەرژەوەندی نامادديش پێک بێن، کە هیچ تەماعی مڵک و پارەی تێدا نەبوو. تۆ بڵێی لەم ڕۆژگارەشدا بتوانن پێک بێن؟ من بێتاقەی لەسەر نابرم... بەر لە شۆڕشی 14ی تەمووز چەندی ویستم ئەو بنەماڵە کوردانەی کەوا ناوێکی کوردپەروەرییان پێوەیە برادەر و دۆست بن بە یەکتر بەڵکوو حکوومەت حیسابێکیان بۆ دەکات و قسەیەکیان لە سوودی کوردەواری هەڵدەگرێتەوە، هیچم بە هیچ نەکرد... گوێزم بە گونبەتدا دەدا.

ساڵانی دوای دەرچوونم لە حوقووق هەتا پاییزی 1952 کە بووم بە حاکم لە سلێمانی ڕوویەکی تەقلیدیی هەبوو کە بەردەوام شەوانە لە ژوورەکەی دیوەخانی ماڵمان لە خزمەت مامم دادەنیشتین، دۆست و خزم و خۆییەکی سەری لێ دابایەن بەخێر دەهێنران، تا دەمی عادەتی بڵاوەی ئەو خەڵقە بەرەو ماڵی خۆیان، دانیشتنی هاوینان لە سەربان دەبوو جگە لەو چەند مانگەی ڕەزەوانیمان لە چنارۆک. لە چنارۆکیش هەموو هاوینێک جگە لە مێوانی ڕێبوار، برادەران لە خوێندەواری نوێ و لە دۆستی منداڵی و لە مەلا و فەقێی ئاشنا و خزمی دوور و نزیک دەهاتنە لامان، هەر تاقمە ڕۆژ و دوو پێوەیان دەخافڵاین. خاڵەکانم لە دەرفەتدا سەریان لێ دەداین چونکە ئەوانیش عادەتیان بە چوونە کوێستان گرتبوو. غەفوورییەکان بە براگەورەیەتیی مەلا حەوێزاغا و کاکە زیاد لە زەمانی باوکمەوە هەتا ئەو دەمانەی منیش دەچوومە چنارۆک عادەتیان گرتبوو شەووڕۆژێک لامان بن. ئەو سەردانانە گەلێک گەشاییان پێوە بوو بۆ ئەوان و بۆ ئێمەش.

لە ساڵی 1946 ەوە ڕادیۆی وشک و لۆکسمان بردە چنارۆک، جێگامان بەرز بوو، لۆکسیش گەش، لە دوورەوە بۆ بەرچاوی شەوبینان دیار بووین. هەر لە هاوین و دەمەو پاییزی ئەو ساڵەدا هێندێک تەعمیراتی پێویستم کرد لە بەشێکی خانووەکەمان. لە ژووری دیوەخانەوە دەرگەم بۆ دوو ژووری دیکە کردەوە، یەکێکیان شوێنی نوستنی خۆمی تێدا بوو. لەو ژوورە تازەیەدا کە نوێکراوەی ژوورێکی کۆنمان بوو (ئەو ژوورەی بە منداڵی حەوت ڕوپییەم خستبوە کونی کێلوونەکەیەوە) شەوەهای زستانم بێخەو دەبردە سەر، لە پاش سەعات دوازدەوە یەک پاکەتی بیست جگەرەییم دەکێشا.

لە بەرەو کۆتایی 1947 نیزاعێکی سەربە مڵکایەتیی دوو دێی قەسرۆک و گەلی گوڵان، کە هی جەلیزادانن، لە هەرێمی ڕانیە، هەڵوەستێکی نالەباری لە نێوان ئێمە و

کوڕانی سواراغادا سازاند. پێشتر هەرگیز تا سواراغا بەرحەیات بوو لەگەڵ ئەودا تووشی نیزاع نەبووین، دوای خۆی بێتەجرەبەیی سمایلاغای کوڕە گەورەی و بەدگۆیی هەندێ دەستوپاوەندی فیتنەدۆست ئەو نیزاعەی نایەوە. شێخ مستەفا قەرەداغی موتەسەڕیفی هەولێر بوو، جگە لەوەی دۆستی دێرینی باوکم بوو چاکیشی دەزانی حەق بە لای ئێمەدایە. حەق و وەفای تێکەڵ کرد و نیزاعەکەی بەپێی شەرع و قانوون هەڵبڕیەوە. سمایلاغا، خوا لێ خۆش بێت، لە تەمەندا شلک بوو، قادراغا جارێ لەو تەمەنەدا نەبوو تەبیاتیشی ئەوە نەبوو حەز لە هەرا بکات... دوای دوو مانگێک هەڵی دایەوە، دیسانەوە شێخ مستەفا بێوەخرانی یەک چارەسەر و بنەبڕی کرد. ئەم نیزاعە لە خۆوە فەرامۆش کرا و دۆستایەتیم لەگەڵ ماڵی سواراغا چۆوە ڕادەی کۆنینە...

پاش پلەی حوقووق، دڵدار (یوونس ڕەئووف) کە کەوتە ژیانی عەمەلی و دەستی کرد بە مەحامات، مەیلەو خێرا بەرەو چەپ بۆوە، پێشتر لەلایەن فکری سیاسییەوە کوردایەتی دین و ئیمانی بوو، ئەمجار فیکری سەربە کۆمەڵایەتیی بەرەو چەپ جێگەی خۆی لە ویژدانی کردەوە و تەنگی بە ئایدیالیزمەکەی دەوری حوقووق هەڵچنی. چەپایەتیی کورد باوەشی پێدا گرت، ئێمە برادەریمان بەردەوام بوو، هەرچەند بە ناچاری جوداوازیی بیروڕا سێبەرێک بەسەر پێوەندیی باب و کوڕ و جووتە براشدا دەهێنێت. دوای ئەو و من، وابزانم، بە دوو ساڵ سێ گەنجی دیکەی کۆیی لە حوقووق دەرچوون، خوالێخۆشبووان کەریم تۆفیق و عومەر حەبیب لەگەڵ تەمەن درێژ بەکر ئیسماعیل کە ئێستاکە سەرۆکی دادگەیە لە حوکمی زاتی. کەریم تۆفیق بۆ وەزیفە ڕۆیی، عومەر و بەکر دەستیان دایە محامات لە کۆیێ و بە دڵ خەریکی پارتایەتیش بوون.

لایەنی تەقلیدیی ڕابواردنم کە بە کورتی باس کرا لایەنێکی تازەی کەوتە پاڵ کە یەکتر دیتنی سەربە کوردایەتی بوو لەگەڵ ئەوانەی باوەڕی یەکەمیان قەومایەتی بوو ئنجا چینایەتی، وەختێک بەکر ئیسماعیل مەحەلی محاماتی کردەوە بە زۆری برادەران لای ئەو یەکتریان دەدیت. دووکانی ئەوتۆش هەبوو وەکوو مەحەلی بەکر بەننا کە ڕۆژانە دوو و سێ لێی دادەنیشتین و سەروسۆراغێکی دنیامان لە یەکتر وەردەگرت. من پاش پلەی حوقووق کە ئیتر مەشغەڵەتی ناچاریم نەبوو لە ماڵەوەم دەربهێنێت، وردەوردە خۆم تەسلیمی مەیلە بنەڕەتییەکەی تێفکرین و وردبوونە و

بەراورد کردن و پێک گرتن کرد، شەونخونیم لە زستاندا وەها دەبوو هەتا دوای شەبەقی بەیانی دەوامی دەکرد… نانی سبەینەم لەگەڵ هی نیوەڕۆ یەکدییان دەگرتەوە. وەها دەبوو حەمە عەلیی ئامۆزام و فاررووقی برام لەگەڵم بەخەبەر دەبوون هەتا دوو سێی پاش نیوەشەو، دوای ڕۆشتنی ئەوان دەمامەوە لەگەڵ ئەو خەیاڵ و خوولیا و کێشەی فکری- ویژدانی کە دەمێک بوو نەخشەی مەعنەویاتی ڕەنگڕێژ دەکرد.

کەسێکی مەراق لە دڵدا بێت و مەراقەکە لە دە ساڵاندا فراژی بووبێت و تێکەڵ بە پرسیاری زلی سەربە چارەنووسی قەومایەتی و مرۆڤایەتی بووبێت و وردە حیسابی ئەدەب و هونەر پەراوێزی بە دەورەدا کێشا بێت و گرفت و تەگەرەی باری کۆمەڵایەتی و شەخسی لە دڵیدا بجریوێنێت خۆیشی نەفسێکی شەفافی هەبێت بێگومان شەو و ڕۆژی لێ بەرەواژ دەبن بەتایبەتی کە بەرەواژبوونی شەو و ڕۆژان خەلەل بە بەرژەوەندی نەگەیەنێت… گەلێک شەوی زستان دوای سەعات 2-3 ی پاش نیوەشەو لە ڕێی ڕادیۆوە بەرەو پیری بەیانی و ڕۆژەوە دەچووم. ئێستگە بە خەبەر دەهاتن بەپێی ئارداوێژیان، کە تێشیان نەدەگەیشتم، هی ڕۆژهەڵاتی دوور بوون کە هەوەڵ جار فەجر لەوێ دەپشکوێت. ئنجا پێبەپێی کرانەوەی ئێستگەی یەک لە دوا یەک لە ماوەی دوو سەعاتدا فەجرم دەگەیاندە سەنغافۆرە و هیندستان ئیتر لەگەڵی دەهاتم هەتا «بلبل الاذاعة» کەی بەغدا چەهچەهەی دەکرد.

ئەم گەشتە خەیاڵییە بە سەر شەپۆلی بێتەل و تریفەی خۆردا ڕاڕەوێکی بۆ دەکردمەوە لە نێوان جیهانی ماددی و نامادددیدا بە وشە و نووسین وەسف ناکرێت. هەر ئەوەندەم پێ دەگوترێ کە بەخەبەر هاتنی هەستی قووڵایی دەروون تا ئەوەی تێکەڵ بە هۆش و هەستی دیارەوە دەبێتەوە بژێوێکی ڕوحیی ئەوتۆ لە تێکڕای هەبوونی مەعنەویی مرۆڤ دەگێڕێت لە چ سەرچاوەیەکی دەرەوەی لەش و نەفسی مرۆڤەکەوە هەڵناقوڵێت، سەد هەزار دەرسی هۆشەکی و نەفسی و سیاسی و سۆفی و ئەدەبی ناگاتە بەرگوێی مێشکۆڵەی ناو ئێسقانی مرۆڤ وەک کە گەرمایی ناو مێشکۆڵە و خوێن و تەوژمی هەست و نەست پشکۆی ئاگا کردنەوە بە گیانییەوە دەنێت. حەزیش دەکەیت بڵێ: وەک کە مۆرفینێ لە خۆ بێئاگابوون لە مەڵاشووی هەست و هۆشی دەسوێت چونکە لەو بارە خز و لەقەدا بە خۆ زانین و خۆ ون کردن دەگەنەوە یەکتر.

لەو شەوە ڕوون و لێڵ و تاریکانەدا زۆر جاران لە هەست و هۆشمدا سنووری «اضداد» بۆ ماوەی کورت هەڵدەستا و تێکەڵ دەبوون. وەها دەبوو ئەو ئاواتە یەکجار دوورەی حەز و تامەزرۆییمی وەکوو مووکێش بۆ خۆی ڕادەکێشا و هەستی ختووکەم دەکرد لەو شوێنانەی دەروونمدا کە ڕەگی حەزەکانمی پێوە بەند بوون، وەها دەبوو تێکەڵییەکی بوونم لەگەڵ هەموو دنیادا تا ئەوەی دەبوومە دڵۆپێکی دەریاکەی کە جودا نابێتەوە لێی، ئا ئەو تێکەڵییەم دەیکردمە دراوسێی ئاواتە دوورەکەم و لە دەمی وڕێنەی خۆ ون کردندا دەستم دەبرد بەسەحی بکەمەوە... حەفت زستانی نێوان 1945 و 1952 بۆ من بووە قاڵبێکی کە بنیادەمی تێدا دادەڕشترێت: بنەمای بیروڕا و قەناعەتی دواڕۆژم بەرانبەر زۆرینەی پرسیارە بنەڕەتیەکانی مرۆڤوروژێن لە شەوانی ئەو زستانانەدا گەڵاڵە کران هێندێکیشیان یەکجارەکی بنیات نران وەک کە بە عەرەبی نووسیبووم:

- ليس قصارى العقل ان يمتنع عن تفسير الاشياء التي لا يفهمها ولكنه يفسرها تفسيرات خاطئة.
- يفعل الانسان ما يعتقد انه مصلحة مادية أو معنوية وقد تكون مهلكة في حقيقتها.
- العقل عامل التطور التاريخي و الاجتماعي... وليس الحاجة المادية والا كانت الحيوانات كلها تتطور كالانسان لانها جميعا تشابه الانسان من حاجاته المادية الاساسية مثل الجنس و الاكل و الاحماية...

ئەم بنەمایە زلانە و هی دیکەش و لەوان بچووکتریش زادەی ئەو ساڵانەن.

گەلێک جاران بە درنگەوە خۆم خەریکی ڕەسم دەکرد بە قەڵەمی خۆنووس لەسەر کاغەزی عادەتی... شەوێکیان لەبەر نموونەی ناو گۆڤارێکی ڕەنگاوڕەنگ وێنەی کچێکی جوانم کێشا هەر بە قەڵەمی خۆنووس دەتگوت نموونەکە لە ئاوێنەدا ڕەنگ دەداتەوە هێندە چوون یەک بوون کاتێک لێ بوومەوە لۆکسەکەم کوژاندەوە، دنیا تاریک دانەهات تومەز خەریک بوو ڕۆژ هەڵدەهات ئەوسا کارەبا لە کۆیێ پەیدا نەبووبوو.

لە هاوینی 1947 ڕێم کەوتە سلێمانی. هۆی ئەو هەڵکەوتەم بە بیردا نایەت، ڕەنگە دەخلێکی بەسەر حیزبایەتی وەیا سیاسەتەوە هەبووبێت چونکە تەلەفۆنم لەگەڵ

«جەلالی حامید بەگی جاف» کرد بە خۆی و سەیارەیەوە هات، من و «حەمزە عەبدوڵا»ی سکرتێری ئەوسای حیزبی پارتی برد بۆ هەڵەبجە.31 سکرتێر خۆی شاردبۆوە و بە نهێنی دەژیا بەڵام لە سەیارەی ماڵی حامی بەگدا ترسی نەبوو، لە هەڵەبجەش سێ شەوان لە ماڵی حامید بەگ مێوان بووین، لە خانوویێکدا دابەزین کە بورهان تازەی دروست کردبوو تێیدا بووبوو بە زاوا و باوکی هەوەڵ کوڕی. چوونەکەمان هیچ سیاسەتی پێوە دیار نەبوو بەڵام پێوەندی من بە سکرتێرەوە و ڕێک خستنی ئەو سەفەرە بۆ هەڵەبجە لە سیاسەت خاڵی نەبووە ئیتر هەر چۆنێک بووبێت جەلال خۆی ئێمەی هێنایەوە سلێمانی. ئەمە یەکەم دیدەنیم بوو لە هەڵەبجە.

دەبوو پێشتر بڵێم من لە پاش ساڵی 1939 کە پۆلی پێنجەمی سانەویم بە سەرنەکەوتوویی لە هەولێر بە جێ هێشت، ڕێک نەکەوت باداوە ببینمەوە هەتا بەهاری 1946. مەلا ئەفەندی لە شەوی نێوان 1942 و 1943 کۆچی دوایی کرد، کە باداوەم دیتەوە تەعمیرات و بەسەرەوەنانێکی زۆر لە دیوەخانەکەی کرابوو. عیززەددین ژوورێکی خۆی بەتایبەتی بەر لەو تەعمیراتە کردبوو، ڕێگەی بەسەر دیوی ماڵەوە و دیوی دیوەخانەوە هەبوو، بەپێی ئارەزۆ پێوەندیی ئەو ژوورە بە هەر لایەک مەبەست بایە دەبڕا یاخود دەکرا. لەو ژوورە ماوەی درێژ بەیەکەوە تەنها ماینەوە و قسە و ڕازێکی لەو ساڵانەدا کەڵەکەی کردبوو دەرفەتی هەڵڕشتنی چنگ

---

31- سکرتێری حیزب ئەوسا حەمزە عەبدوڵا بوو، بە نهێنی لە سلێمانی دەژیا. کە بەرەو هەڵەبجە خەریک بووین دەرچین لە شار، لە نوختەی سەیتەرە، کە جەلال و سەیارەکەیان دەناسی، پرسێکی سەرزارەکییان لە حمزە عەبدوڵا کرد گوتی من پیاوی جەلال بەگم. ئەو تەنها لە پشتەوە سەیارەکە دانیشتبوو هەر هەتا گومانی لێ نەکرێت. لە هەڵەبجە زۆریان بەخێر هێنا و خانوویەکی تازەی بورهانی حامد بەگ بوو بە شوێنی لێ نووستنمان. «تووباخان»ی کیژی حەسەن بەگی جاف کە خێزانی مەرحووم بورهان بو، بێ ئەندازە لە خزمەتمان خەریک بوو، هەرچەند ڕووبەڕوو نەماندیت. خزمانی جاف دەیانزانی حەمزە هاتووە، وابزانم حکوومەتی قەزای هەڵەبجەش سۆسەی کردبوو بەڵام خۆی بێ دەنگ کرد. وابزانم سێ - چوار شەوێک ماینەوە، بە سەییارەی جەلال هاتینەوە سلێمانی.

کەوت. لە بیرمە یەکەم جار گۆرانیی «حیاتی أنت»ی عەبدولوەهابم، لەو ڕۆژانەدا بیست، تا بڵێی کاری تێکردم ئێستاش هەر وەهایە.

لە ساڵی 1946 ەوە کە ڕادیۆم پەیدا کرد، ئاهەنگی مانگانەی کەلسووم لە قاهیرە بوو بە گەشایی شەوێکی پەنجەنیشان لە ماڵەکەمان. من و فارووق و خوشکەکانم لەگەڵ بەشێکی ئامۆزاکانم لەو شەوەدا هەتا ئاهەنگ بەسەر دەچوو بۆی دادەنیشتین. خواردنی عادەتی لەو شەوەدا دەخرایە دوای سەرەتای ئاهەنگ کە دەوری دە و نیوی شەو دەستی پێ دەکرد، ناوناوە دایکم و بە دەگمەن مامیشم بەینێکی بۆ دادەنیشتن. کەلسوومی ئەوسا کە جارێ دووچاری نەخۆشی نەهاتبوو لەلایەن دەنگەوە هێزێکی بێسنوور بوو، کە دەکرایەوە وەک بورکان دەتەقیەوە خۆی و گوێگرە هەستیارەکانی بەسەر شەپۆلی ئەو دەنگە موعجیزەیەیدا بەرەو «مطلق» و «ازل» و «ابد» ەوە دەبرد کە جۆرێک لە جۆرە تەماوییەکانی «خۆدۆزینەوە»ی لە ناخی نەستدا هەڵدەقولاند دەبوو بە مەسلەتی کردنی مرۆڤ لەگەڵ خۆی و لەگەڵ بوونەوەردا. لەو دەمانەدا کە دەنگەکەی سنووری وەهم و وڕێنەی دەبەزاند و بەسەر موستەحیلدا زاڵ دەبوو، لە تێکڕای ئەو ئیبداعە ئاسمانییە توانا بەدەرەوە هەستم دەکرد ئەو جوانی و تەواوی و ئارامی و نەرمایی و شیرناییەی گیانی بنیادەم وەکوو منداڵی شیرەخۆرە بە لێوان بۆی دەگەڕێ وا لە ناو لەپی دەستیدایە، پڕی هەناویەتی… لێی دەچۆڕێتەوە. ئاهەنگ لە نێوان 4-3:30 بەیانی بەسەر دەچوو ئینجا هەر کەسە بە خۆی و زەنگوڵەی ناو دڵی خۆیەوە بۆ زیندەخەوەکانی ڕەنگاوڕەنگی پاش ئاهەنگ و پێش نوستن خشکەی دەکرد. دەمایەوە من کە بەینێکی دیکەش لەگەڵ خۆم و تریفەی بیر کردنەوەدا دەمامەوە… کەلسووم لە زستانی نێوانی 1949 و 1950 دا نەساغ کەوت. سەفەری کرد هەمووی 4-5 جاران توانی بۆ فەلەکە کۆنەکانی خۆی بەرزبێتەوە، پاش شۆڕشی تەمووزی 1952 بە دوو ساڵێک دیسان تووشی هاتەوە لەم جارەیاندا چوو بۆ خەستەخانەی بەحریەی ئەمریکا کە تەنها بۆ مرۆی زۆر مەزن کراوەتەوە… ئەمجارەیان چاوەکانی نەختێک لە قەپێلک بە زەقی مانەوە هەتا مردنی لە 1975…

لە دوای ساڵی 1946 ەوە نگبەتیی داکشانی داهاتی تووتن تا ئەوەی لە زۆر باردا تەنها زەرەری بۆ خاوەنی بەرهەم دەهێنا خۆی بە تەواوی دەرخست، لە فەحسی ساڵێکیاندا بە لیژنەی فەحسم گوت کە هەموویان ناسیاوم بوون و پەرتان پەرتانیان

به تووتنەکەمان خست، گوتم: سوێندی لەسەر بێت دەسەڵاتم هەبوایە هەمووتانم حەبس دەکرد. ساڵی 1948 قاتوقڕی پەیدا بۆوە دەوامیشی کرد تا دوای 1950. ئەو ساڵەی 1948 بە نقەنق دەخشی، ئێمەش لەگەڵیدا پاش زەرەرە قورسەکەی کژەتووتنی 1946-1947 وەکوو نەساغ دارەدارەمان بوو. ئەو ساڵە مەلۆتکەی لە هەناودا هەڵگرتبوو. بەغدا دژی موعاهەدەی پۆرتسمۆث هەڵستا، حکوومەت بە ئاگر وەڵامی دایەوە... کوشتاری لێ پەیدا بوو... بەغدا دانەمەزرا، شاری دیکەش کەوتنە جموجووڵ... مەکتەبەکانی بەغدا و شوێنی دیکەش داخران... قوتابییەکان کە گەڕانەوە بۆ شارەکانیان کارەساتی بەغدایان دەگێڕایەوە بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە مەیلی حیکایەت بە قسەگێڕەوەی دەکات و گوێگریش خۆشتر دێت...

لە بەرەو کۆتایی ساڵ بوو (ڕۆژەکانم بۆ دەست نیشان ناکرێت) ساڵح جەبر لێ خرا... دنیا هەڵستا... من لە کوێ بووم کە شار سەرلەبەری کەوتە موزاهەرە، ئەو ڕۆژە شیرازەی کۆمەڵایەتی شارەکە، وەکوو هەموو ئەو شوێنانەی موزاهەرەی ئەوتۆیی تێدا بوو، لەبەریەک هەڵوەشا. تا ئەو ڕۆژە کەس خۆی لە کەس ئاشکرا نەکردبوو، بێدەنگ لە ژوورەوە خوێنی خوێنگەرمان دەکوڵا. هەموو چینەکانی شار بەشدار بوون لە پێشیانەوە تاقمی مەلاکان دەڕۆیشتن کەچی «بمرێ، برمێ» دەتەقییەوە. یەکێک لەو خوێنگەرمانەی ئەوسا کە زووتر بە چەند ساڵێک لەبەر نالەباریی ڕەفتارەکەی لە مەهاباد دوور خرابۆوە چی نارەوا بوو لە تۆڵەستاندنەوەی خۆیدا بە کوردایەتییەکەی مەهابادی گوت. عەیبی گەورەی لێ گرتن بەوەدا کە «انفصالي» بوون... دز بوون... موزاهەرە دەوامی کرد هەتا لای نیوەڕۆ عەلی عەبدوڵا، بەرپرسی پارتی لە کۆیە، داوای کرد بڵاوەی لێ بکرێت، خوێنگەرمێکی ئەوسا فرتکی بۆ سەر بەرزاییەک بەست و گوتی: چۆن دەچنەوە ماڵتان بێ ئەوەی خوێن برژێنن... ماڵەکانتان چی تێدایە؟ خۆ گیاشی لێ نییە وەکوو ئاژەڵ بیخۆن...

38 ساڵ و چەند مانگێک بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕیوە تا کاتی نووسینی ئەم دێڕانە 12-7-1987. لەو ماوەیەدا دروشمی سیاسی نەبووە موفلیستر لە دروشمی هاندانی کورد بۆ کوشتنی کورد. وەی قوڕ بەسەر نەزان و نەفام! حەمزە لە عەبباسی چی!!

بەهەمەحاڵ زمانەی ئاگری قەپوقیڕی ناوخۆیی خەباتگێڕان وەها درێژ بۆوە لە بیری بردنەوە «وثبە» بۆچی و دژی کێ ڕووی داوە.

لە نەورۆزی دوای وەسبە کە دەکەوتە مارتی 1949 ئیجازەی دوو ئاهەنگ وەرگیرا، یەکیان بە ناوی من بۆ پارتییەکان ئەوی دیکەش بە ناوی دڵدار بۆ چەپەکان. بەزمی ئێمە زووتر بوو، من گوتارێکی عەرەبیم خوێندەوە بە سەرناوی «تحية الشهداء». تا ئەو دەمە جوانترین نووسینم لە عەرەبیدا ئەو نووسینە بوو. شەوی ئاهەنگەکەی بەدوادا دەهات خەریکی بووم، لای بەیانی لێی بوومەوە. لە وەسفی شەڕی سەر پردەکەی بەغدا شتێکی نازدارم نووسی، دوای باسی هەڵمەت و هەڵمەتی بەرانبەر لە گەنجان و هێزی حکوومەتەوە کە مێژوو تێیدا شێوابوو نەیدەزانی سەرکەوتن بۆ کام لا بنووسێت هەر لە بیرمە چیم گوتوە:

«... وفي هذه اللحظة الحاسمة الخطيرة اذ ارتبك التأريخ المذعور وضاعت معالم النصر والهزيمـة قذف بركان الحق من وقود ثورته جمرة مشتعلة الحشا في صورة فتاة، اي وربي فتاة تصطفق في يدها راية ملطخة بالدم وينعكس من عينها بريق من عناد الشعب الثائر وفي صدرها تتماوج صرخة الانسانية المندفعة نحو هدفها الاسمى وترتسم على ثغرها بسمة الإطمئنان الى النصر الأكيد. تقدمت الصفوف فكانت من الطليعة الدامية للحشد الصاخب بمثابة السنان من نصل الرمح، تقدمت وأهابت بالحشود الكعيفة ان تقدمي، فتدفقت كسيل العرم لايردها موت ولا يصدها قضاء واكتسحت ما امامها من صروح الظلم و معاقل الطغيان... عند ئذ خفض التأريخ هامتة إجلالا وسجل النصر العظيم للشعب العظيم. وما كان للتأريخ ان يفعل غير ذلك...»

ئەم نموونەیە لە کۆتاییەکەیدا گوتەیەکی تاقانەی زێدە بایەخداری خوالێخۆشبووی مامۆستا سابیر ئیسماعیل-م بە بیر دەهێنێتەوە. دوای ئاهەنگ لە نادی موەزەفان یەکدیمان گرتەوە بە دڵ پیرۆزبایی لێ کردم و گوتی، ئەم «وما كان للتاريخ ان يفعل غير ذلك» بە لامەوە سەرکەوتووترە لە قسەیەکی «ئیلیا ئەهرەنبورگ» کە لە ئاست بەرگەگرتنی لینینگراددا بەرانبەر هجومی ئەڵمانەکان گوتی «وابى التأريخ أن...» تێبینی مامۆستا سابیر بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە مێشکێکی ڕوونی هەبوو، لە ساکارییەوە قسەی ئەوتۆیی نەدەکرد بە خاترانەش بۆ لای شۆرەت و ناو و دەستەڵاتی دانەدەشکاند، ڕەحمەت لە گۆڕی. لەو گوتارەمدا بایەخێکی زۆریشم دا بە پێویستیی یەکگرتن لە ئاست پلانی دوژمنانی دیمۆکراسی. پاش ئەوەی گوتم لە

«وەسبە»دا هەر تاقمە و هەر بیرورِایە بینبرِکێی بوو بۆ پتر جانفیدایی دەتگوت جوداوازی بیرورِا هێزێکی هەرەگەورەی سەرەکەوتنەکە بوو. ئنجا دەڵیم:

«ایها العاملون في حقل الوطنية والراسخون نیه قدما!! لاتتفرقوا فتفشلوا ريحكم...»

ئیتر قسەی دیکەی ئەوتۆیش هاتن کە لەبیرم نەماون. بەداخەوە ئەم گوتارەم لێ ون بوو نازانم چی بەسەرهات...

پاش وەسبە بۆ ماوەیەک کە جارێ گورِەکەی نەوەستابوو، زوربەی خەباتگێرِان کە هەرە زۆریان باوەرِی چینایەتییان تێدا خەست بوو وەهایان دەگوت و دەکرد دەتگوت رِۆژی حەشرە و تەرازووی خێر و شەرِان هەڵخراوە خەریکە بەهەشتی و جەهەندەمییان لێک دەکاتەوە. بەڵام دەرکەوت هەمووی ورِێنەی هەرزەکاری بوو. بەلامەوە چاکیش بوو تەرازووەکە نەکەوتە دەست هەرزەکار دەنا ئەغڵەب بەهەشتی دەبردانە جەهەندەم. بەهۆی دووبەرەکی و سێبەرەکییەوە سەرگوڵ و بنکرِی خەباتی ئەو رِۆژانە و دواتریش وەکوو قاووت رِەشەبا بردی. بێگومان منیش لەوانە بووم هەوڵی بەفیرِۆیان دابێت بەڵام هەر بایی زەکاتی خەڵقەکەم زەرەر لە خۆم و عالەم خستوە چونکە تیژرِۆیی و پەرِگیری لە تەبیاتمدا نەبووە. ئەوەی توندوتیژە هەر بخەوێت سوود دەبەخشێت کە بە خەبەر هات نەعووزوبیلا...

**کێشەی یانەی سەرکەوتن**

ئیجازەی یانە لەلایەن دەستەیەک لە پیاوە ناسراوەکانی کوردی بەغداوە وەرگیرابوو. سەرۆکی ئەمین زەکی بەگ بوو، ئەمین عامەکەی مامۆستا مەعرووف جیاوۆک بوو، هەر خۆیشی خاوەن دەستەڵات و قسەڕۆیشتووی یانە بوو. ئەندامەکانی ئیدارەی پیاوی ناسراوی بێتەرەف بوون تەنها مامۆستا بەشیر موشیر سەروکارێکی لەگەڵ قسە و حیکایەتی سەربە سیاسەت هەبوو، ئەویش لە سنووری وتووێژدا نەک کردەوە.

ساڵی 1945 گەنجان کە بەشێکی چالاکیان ئەندامی حیزبی هیوا بوون و تەجرەبەی چالاکیی نهێنییان دیتبوو، هەبوونی یانەیان بە هەل زانی بۆ ئەوەی لەو ڕێگاوە خزمەتێکی ئامانجەکانیان بکەن. ئەم حیسابەیان ئەگەر چووبایە سەر و دەستیان بەسەر کاروباری یانەدا گرتبایە دەربوونەی خێر و چاکەیەکی بۆ دەکردنەوە ئەویش بە مەرجی بێهەڵپەیی و ڕازیبوون بە مومکین دەنا لە یەکەم هەنگاوی تیژڕۆییاندا یانە و سوودی یانەیان دەدۆڕاند.

لەو ساڵەدا ژمارەی قوتابیی کورد لە بەغدا زیادی کردبوو بایی ئەوەی هەموو لایەنێک هەستی پێ بکات، حیزبی هیواش تەمای هەبوو لە چەندایەتی و چۆنایەتیی ئەو گروپە قوتابییە سوود وەربگرێت کە یانەی سەرکەوتن یەکێک لەو بنکە سوودبەخشانە بوو دەشیا لە ڕێی زۆربوونی قوتابیی ئەندام تێیدا ببێت بە ناوچەیەکی ڕۆشنبیری - سیاسی بەرەو قەومایەتی. لەلایەن خوالێخۆشبووی مەعرووف جیاوۆکیشەوە چ نابەرژەوەندێک لەوەدا نەبوو قوتابی دۆست و ئەندامی یانە بن، بە پێچەوانەوە قوتابی باشترین سەنگی سیاسی دەبەخشێت بە کەسێکی بیەوێت نمایشت بکات و گرنگیی خۆی بە خەڵق و حکوومەتیش ڕابگەیەنێت.

من لەو ساڵەدا ئەندامی ئیدارەی نادی بووم بەڵام نازانم چۆناوچۆنی. لە دوای ئەو ئاهەنگە باسکراوەی کە لە یانەی سەرکەوتن بە بۆنەی تێپەڕینی چل ڕۆژ بەسەر مردنی باوکمدا بەسترا مەرحەبای گەرموگوڕم لە جیاوۆک وەردەگرت، هەروا دۆست بووین هەتا بەهاری 1945 کە لە هەڵبژاردنی دەستەی کارگێڕی یانەی تێدا دەکرا. جیاوۆک گومانێکی نەبوو لەوەی قوتابییەکان ڕێبەدێیان لەگەڵدا دەکرێت و چ پێشبینیی نەدەکرد لە پەیدابوونی گرفتێکی گەورە یان بچووک. لە ڕۆژی

هەڵبژاردندا جیاوۆک چەند ناوێکی پێشنیاز کرد بۆ ئەندامەتی، کەچی بەرەی حیزبی هیوا لیستەی هەبوو. کە دەنگ درا و دەست کرا بە ژماردنی پشکی هەر کەسێک لەوانەی دەنگیان پێ درابوو دەرکەوت نامزەدەکانی جیاوۆک، لەوانەی کۆن بوون لە ئەندامەتی تاکێکیان دەرناچێت. سەغڵەتی بە جیاوۆکەوە دیار بوو تا بەرەو کۆتایی ئەژماردنی دەنگەکان ئیتر خۆی پێ نەگیرا و دەریبڕی کە لەبەر بێتاقەتی چی دیکە ناتوانێ لەو ڕۆژەدا سەرپەرشتیی کارەکە بکات و دەبێ پاشماوەی دەنگەکان سبەینێ لە کاتی ئێوارەدا بژمێردرێن و لێک بکرێنەوە. چەندی قوتابییەکان و سەرکارەکانی هیوا هەوڵیان دا ئەو وەخراندنە نەکرێت، بێسوود بوو، جیاوۆک سوور بوو لەسەر هەڵوەستی خۆ. ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەندە دەنگەی مابوو نەتیجەی نەدەگۆڕی بەڵام چ دەکەی لەگەڵ قیلەشەرعان کە دەبێ هەموو دەنگەکان بخوێندرێنەوە بە سەرپەرشتی کردنی ئەمین عامیش بێت؟ جیاوۆک لە ئیلحاحی قوتابییەکانەوە متمانەی قورسی دا کە سبەینێ لە میعادا هەڵبژاردنەکە بە ئەنجام دەگەیەندرێت...

سبەینێ جیاوۆک بەیاننامەیەکی لە ڕۆژنامەکان بڵاو کردەوە بە بەتاڵ کردنی ئەو هەڵبژاردنە... چەند هەوڵ درا بۆ گوڕینی ئەو بڕیارەی بێسوود بوو.32 تەنانەت لای ئەمین زەکی بەگ کۆبوونەوەیەکیش کرا لەگەڵ جیاوۆک منی تێدا بەشدار بووم بە سیفەتی ئەندامیەتیم لە دەستەی ئیدارە... لەو کۆبوونەوەیەدا جیاوۆک وەهای ڕانواند

---

32- نموونەیەکی زێدە بێتام لەو هەولانە ئەوە بوو کە زۆر لەو خەڵقە داوایان لێ کردم بە سیفەتی ئەندامەتیم لە دەستەی سەرپەرشتانی یانە، لە گەڵیاندا بچم بۆ دەربڕینی نارەزایی لە ڕەفتاری جیاوۆک، گۆیا شەرعییەتی ئەندامەتی هێزێک دەدات بەو نارەزاییە... بەڕێ کەوتین، من لە پێشەوە، کاتێک گەییشتمە بەر دەرگای ژووری سەرۆکایەتیی یانە کە جیاوۆک تێیدا دانیشتبوو لە دڵدار بەولاوە یەک کەس بەدوامەوە نەما بوو، دڵدارم لە دەرەوە بەجێ هێشت، بەژوور کەوتم، چەند قسەی ڕەقم کرد لەگەڵ جیاوۆکدا ماڵی ئاوابێ لێمی بەسەرنەگرتەوە دەنا چەند خزمێکی لابوون دەیانتوانی عەزابم بدەن. هەر لەبیرمە گوتم: پەرۆشی ئەو نیودینارەمە کە لە بری سالانەی ئەندامەتی داومە بە یانە. جیاوۆک گوتی: ها پارەکەت وەرگرەوە. لە چوونە دەرەوەدا بووم گوتم: تازە چ وەرگرمەوە، پارەکە پیس بووە. دڵدار بە چاوێکی مەیلەو تەڕەوە بۆم ڕاوەستابوو، پێکەوە گەڕاینەوە «ئەمما بە عاجزی - شێخ ڕەزا».

کە من هەر لەوێش نیم، زەکی بەگ نەساغ بوو لە ماڵەوە دەرنەدەچوو کۆبوونەوەکە نەزۆک و بێلزوومیش بوو. دوای ڕۆیشتنی جیاوۆک زەکی بەگ دڵگیریی خۆی دەربڕی لە ئاست ئەوەی ڕوودەدات بێ ئەوەی ناوی جیاوۆک بهێنێت بەڵام مەبەستیشی دیار بوو لە قسەکانی.

من کە گەڕامەوە لای قوتابییەکان ئامۆژگاریم ئەوە بوو واز لە یانە بهێنن و خەریکی خۆ ئامادەکردن بن بۆ ئەزموون، گوتیشم من خۆم لەم دەمەوە کەموزۆر تێکەڵ بە هیچ سەروبەرێکی ئەم کێشەیە ناکەم... بەڵام بڕیاری «هیوا» شتێکی دیکە بوو. نەشرەیەکی نهێنیی بەشەو لە بەغدا بڵاو کردەوە هێرش بوو بۆ سەر جیاوۆک و حکوومەتیش. دوو ڕۆژێکی برد و نەبرد کۆمەڵێک لە قوتابی و ئەوانەی پێوەندییان بە هەرای یانەوە هەبوو گیران. لە مانە، عەلائەددین سەججادی، عەبدولقادر قەزاز، کاکە حەمەی خانەقا، جەوهەر عەزیز دزەیی، کانەبی عەزیز دزەیی، و هی دیکەش.

ڕێکەوتێکی دەگمەن ئەوە بوو، کاکە حەمە نامەیەکی پێ بوو لە «میرحاج»ی وەرگرتبوو بۆ کاربەدەستێکی مفەوەزیەتی ڕووس کە یارمەتیی مستەفا خۆشناو بدات بە سفارش کردنی کاربەدەستانی ڕووس لە دیوی کوردستانی ئێران بەڵکوو یارمەتیی دەدەن تا لەوێ بحەوێتەوە. نامەکە بە ئەسڵ مستەفا بۆ میرحاجی ناردبوو کە بە مفوەوەزی ڕووسی بگەیەنێ، ئەویش دابوویە کاکە حەمە چونکە خۆی لە ژێر موراقەبەدا بوو کاکە حەمە ئەم کاغەزەی لە دەست گیرا. بۆی ڕێکەوت کاک حسێنی کاکی تێ بگەیەنێ کە بە میرحاج بڵێ خۆی دەرباز بکات کاک حسێنیش بێوەخران میرحاجی خەبەردار کرد و ئەویش بۆی دەرچوو. لە مانگێک پتر ئەم کۆمەڵە لە حەپس مانەوە. تاوانی کاکە حەمە گەلێک گەورەتر بوو لە هی هەواڵەکانی، بەربوونیشی ئاسان نەبوو. باوکی هاتە بەغدا هەوڵێکی زۆری دا هەتا توانرا لە تۆمەتی کاغەزەکەی مستەفا خۆشناو ڕزگاری بێت ئەوسا خوالێخۆشبووی ئەحمەد موختار بابان وەزیر بوو، مەردانە بۆی وەستا و هەڕەشەی ئیستیقالەی نایە بەر حوکمەت ئەگەر هیچی لێ بکەن... ئەوانەی قوتابی بوون لەو حەپسانە ڕۆژانی ئیمتیحان بە خەفارەتەوە دەنێردران بۆ حوقووق، دوای ئیمتیحان دەبردرانەوە بەندیخانە... پاش چەند مانگێک درانە عورفی، بەڵام عورفی مەسەلەکەی بەهەند هەڵنەگرت، تۆمەتە زراوڕژێنەکەی کە ئیعدامی بەدواوە بوو نەچوە مجێزی سەرۆکی

عورفی که دۆستی باوکی هەندێک لە گیراوەکان بوو، بە شایەدیی مامۆستا جەوهەر عەزیز-یش کابرا پیاوێکی مەرد و بەشەرف بوو.

بە چاوێکی بێتەرەفانە سەیری ئەو کێشەیە دەکەم کە لە ماوەی 42 ساڵ دوای ئەویشەوە تەجرەبە دنیای بۆ ڕوونتر کردووینەوە و دەڵێم پێویست نەبوو پرسیارێکی وەها بچووک ئەو هەموو شیر و تیرەی بۆ هەڵبگیرێت. کە بەرژەوەندیش پێوانەمان بێت دەبوو گەنجان ڕێبازێک بگرنە بەر بتوانن تێیدا بەردەوام بن و بە قۆناغ بگەن. خەبات هەر بریتی نییە لە تێشکان و گیران و بەستران. یانەی سەرکەوتن «قەڵای دەمدم» و «دیان بیان فۆ» نەبوو بە هێز داگیر بکرێت، کەسیش نازانێ ئەنجامی سەرکەوتنی قوتابییەکان لە هەڵبژاردنەکە چی دەبوو، سەری بە کوێ دەگەیاند، گەنجان لە نێوان خۆیاندا چییان بەیەکدی دەکرد... دەبوو جیاوۆک نەترسێنن، بە نەرم و نیانی لەگەڵیدا بێن، نەختێک ئازەزۆی ئەو و نەختێکیش هی گەنجان بێتە دی. ئەگەر ئەم ڕەفتارە لە چەژی هیوا و گەنجان شیرن نەبوو پێی نەدەویست لە سەرەتاوە لە یانە نزیک بکەونەوە. جیاوۆک لە ئاکامدا ئەو پەرتان پەرتانەی بە گەنجان یەخست و خۆیشی بوو بە موتەسەڕیفی سلێمانی کەوا هەرچەند بە لای منەوە هەڵکشانێک نەبوو ئەو هەموو تاکتیکە نالەبارە بهێنێت بەڵام بە لای جیاوۆکەوە مەبەستێکی بنەڕەتی بوو، ناشزانم بۆچی هیچ هەڵکشانی دیکەی بە دوادا نەهات. بێگومان کەسانی دیکەش هەبوون لە تاریکیدا خەریکی تەڵە نانەوە بوو بۆ ڕاو کردنی سوود و چاکەیەکی لەو هەرایە برەخستێت. لەو ناوەدا گەنجان مازووچنی کون لە پاشۆڵ بوون بە ئەرکێکی لە پێویست بەدەرەوە. (بەغدا. 13/7/1987).

**ڕوونکرنەوەیەکی کورتیلە**

پێویستە بڵێم چوونی حەپسەکان لە حەپسخانەوە بۆ ئیمتیحان هەموان ناگریتەوە، مامۆستا جەوهەر عەزیز دەگێڕیتەوە بۆم کە خۆی و کانەبیی برای بەیەکەوە لە ژوورێک حەپس بوون، ڕۆژانی ئیمتیحان جحێڵەیەکی سەربە تەحقیقاتی جنائی لە گەڵیان دەردەچوو، جێگەیەکی بە ژووان دادەنا کە نیوەڕۆ لەوێ یەکدی بگرنەوە ئیتر دوای ئیمتیحان و سەردانی ماڵەکەیان بە ئارەزۆی خۆیان دەچوونەوە بۆ ژووانەکە، کەیفیان لێ بایە هەڵدەهاتن. کابرای تەحقیقات دەمی چەور دەکرا و چاوی دەپۆشی. بە مامۆستا جەوهەرم گوت ئەمەیە دز و ماڵخۆ یەک بن گا بە کولانکەدا دەبەنە دەر.

بەشێک لە حەپسەکان قوتابی نەبوون تابچن بۆ ئیمتیحان کاکە حەمەش بە هەڵوەستی ئەحمەد موختار بابان و دۆستەکانی سەیدی خانەقا بەر لە کاتی ئیمتیحان بەردرا، ئەو و من، لە دوو ژووری ئۆتێلی تروکادێرۆ دەژیاین. من ژوورەکەی ئۆتێل ڕەشید، کە بەیەکەوە لەگەڵ دڵدار دوو ساڵان تێیدا بووین، دەستی نەدەدا بۆم کە خۆمی تێدا ئامادە بکەم دوای ئەو هەموو غیابە و نەخوێندنە. ماوەیەک بەر لە ئیمتیحان گوێزامەوە بۆ تروکادێرۆ بەڵکوو لەو دەوروبەرە ئاسوودەترەدا بتوانم بەنی ڕۆژگار پتر هەڵبکەمەوە. یوونس هەموو ڕۆژێک لە دوای نانی سبەینەوە لەگەڵماندا دەبوو هەتا دەمی نوستنی شەو، هەندێ جار نانی سبەینەشی دەهێنا لای ئێمە، یوونس بە پێچەوانەی من موتالایەکی باشی کردبوو، تەنها لە دەرسی «اصول الفقه» کەوت... ئاشنایەتیم لەگەڵ مەلایان و عەرەبیزانیم یارمەتیی دام لێی سەربکەوم.

**ئاڵقەی دەیەم**

ئاڵقەی پێشووتر گەشتمی گەیاندە پاش قۆناغی «وەسبە» (الوثبة). لە وەسبەوە بۆ ناوەندەکانی 1952 کە قۆناغێکی نوێ لە ژیانمدا دەست پێ دەکات باری سیاسیی وڵات کەوتە سەر ڕۆژگاری بەر لە وەسبە، خەڵقێکی زۆر لە شۆڕشگێڕان و موزاهەرەچییان کە هێندەی ناحەزی حکوومەت بوون لە نێوان خۆیانیشدا ناحەز بە یەکدی بوون، درانە عورفی و خرانە بەندیخانەوە، وەک بزانم لە بەندیخانەشدا دووبەرەکی و سێبەرەکییان بەردەوام بوو. بەشێک لە ڕابەرەکانی پارتی گیران بەڵام برادەرانی کۆیێ سەلامەت بوون. من لەو چەند ساڵەدا بێ ئەوەی بەرنامەی بژاردەم هەبێت لە خۆوە و بەپێی بڕیاری واقیع و داخوازی تەبیاتی خۆم خەریکی خوێندنەوە و تێفکرین و خۆ دروست کردن بووم. شەوانی زستانەم بە شەونخونی دەبردە سەر، ڕۆژانم هەتا نیوەڕۆ شەو بوو... پەجامەم دەدڕاندنەوە... ناوناوە بەشداریی شاییەک وەیا داوەتێکم دەکرد. ڕێکەوتێکی خۆش بوو کە لە سەرەتای بارانان بوو بە کۆمەڵ لە کۆیە چووین بۆ مووسڵ، شەوەکیشی لێ بووین، بووکێکمان بۆ برادەرێکی دێرینم، خوالێخۆشبووی حەمیدی تاهیر چەلەبی هێنا کە لەو بەینانەدا «ضابط تجنید» ی کۆیێ بوو... بووکەکەش کۆیی بوو بەر لە چەند ساڵێک ماڵی باوکی «قادر ئەفەندی حاجی ئەوڕەحمان» بۆ مووسڵی ڕاگوێستبوو. لە بیرمە کە بەیانی بەرەو هەولێر هاتین تازە بەفرەکەی قەندیل و هەڵگورد و هەندێک لە شاخەکانی سنووری کوردستانی تورکیا وەک هێلکە سپی دەچۆوە... نانی سبەینەمان لە «کەسنەزان» خوارد کە لە مووسڵەوە بۆمان خرابۆوە ناو ئۆتۆمۆبیلەکان دەنا کەسنەزان لە ماستی ترش و چایەی زەردی بەولاوەی لێ بەدەست نەدەکەوت، ماڵی بووک بۆ ماوەی ڕێگای کۆیێ بە مێوانی خۆی هێشتینەوە.

مامم لەو ساڵانەدا چەند ئیجازەیەکی33 بە موستەعیدەکانی خۆی دا. ئاهەنگی ڕێکوپێک بۆ ئەو ئیجازانە ڕێک دەخرا و قەڵەباڵغیەکی بەرچاوی تێدا کۆ دەبۆوە. ئەو

---

33- مامم خۆگیری کرد لە ئیجازەدان بە تێبینی کەم دەرامەدی و قورسایی مەسرەفی ئیجازە. حاجی و حاجیزادەیەکی ناسیاو و کۆنە تەلەبەی خۆی هاتە لای و لێی پرسی بۆچی ئیجازەی «مستعد»ێکی خوێندنی تەواو کردووە وەها وەخراوە، گوتی ڕۆڵەکەم خۆ دەبێ جبە و عەمامە و نازانم چی بۆ بکرم، مەسرەفێکی چایە و

داب و دەستووره پاشماوەی بەرچاو ناكەوێت... لە هاوینی 1952 مامم لە كۆیێ دووچاری قەزا و قەدەرێک هات كە بە زاهیر لەوانە نەبوو ئاكامی گرنگی هەبێت كەچی چاوێكی تاریک كرد. بۆ تەداویی ئەو چاوە چووە هەولێر، من و كاک مەجید و كۆمەڵێكیش لە خزم و كەس بەگەڵی كەوتین، لە تەداویدا بوو دووچاری نەساغیەكی دیكە بوو، یوریای لە خوێنی زیاد كرد، هەتا لە ڕۆژانی نیوەی دووەمی تەمووزی 1952 كەوا چەند ڕۆژێک بوو شۆڕشی 22 ی ئۆلیەی میسر دەستی پێ كردبوو بەیانیەكیان كۆچی دوایی كرد.

مەرگی مامم بۆ من كەلێنێک بوو كە پێم پڕ نەدەكرایەوە، ئەو دوای مەرگی باوكم جێنشینێكی لێهاتووی شیاو بوو، تا ئەوەی باوكم دەیگوت لە برا گچكەكانی جەلیزادان نوورەددین لە هەموان مەلاترە. دوای ئەو دەبوو من بچمە شوێنیان بەڵام بە هیچ كلۆجێک دڵم بەو جێگرتنەوەیە تێراو نەدەبوو چونكە خەیاڵی مەلایەتی لە دڵ و مێشكمدا یەک تاكە ڕیشەی نەبوو. سەرەتا خەڵقەكە موبارەكبادیشیان لێ كردم و وەهایان زانی غەیری پڕ كردنەوەی شوێنی باپیران چ ڕێگەیەكی دیكە ناگرمە بەر.

لە مانگی ئاب كۆیەم بەجێهێشت بەرەو بەغدا، لە ئەیلوول بووم بە حاكم و لە سلێمانی دامەزرام. ئەم بڕیارەم تاكە ڕێچكۆلەیەک بوو پێیدا بڕۆم چونكە مانەوەم لە كۆیێ بێ ئەوەی شوێنەواری باپیران پڕ بكەمەوە و ببم بە مەلا شتێک نەبوو بە تەسەوردا بێت.

لێرەدا پێویستە بڵێم ڕێكەوت وەها بوو خوالێخۆشبووی جەمال بابان وەزیری عەدل بوو، كاكە زیاد تەكلیفی لەبەر نا بۆ حاكمایەتیی من. ئەویش بێ ئەوەی لەگەڵ مندا شناسایی هەبێت تەكلیفەكەی هەڵگرتەوە و بێوەخران مەرسوومی دەرچوواند بۆ تەعیینم. لە لایەكی دیكەشەوە ناچار بووم سەد دینارم لە ئەحمەداغای

---

جغارەی بۆ بكێشم، لە كوێ ئەو مەسرەفە بكێشم؟ گوتی قوربان هەموو مەسرەفەكە عائیدی خۆم... ئیتر مەسرەف كرا و ئیجازە وەرگیرا... هەفتەیەک دوای ئیجازەكەی ئەو خێرەومەندە یەک لیستەی ڕێكی مەسرەفەكەی بۆ مامم نارد كە پارەكەی بۆ بنێرێت، پێویستێتی!

حەمەدەمیناغای دزەیی وەرگرت بۆ سەفەری بەغدا و گوێزانەوەی بەشەماڵێکم بۆ سلێمانی. ئەحمەد لە برام لێم نزیکتر بوو، تەقیە لە نێوانماندا نەبوو. وەختێک لە 1964 بوومە وەزیر، لە سەفەری هەوەڵ جارم بۆ ڕانیە دوای بوونم بە وەزیر، ئەحمەد ئاوارە بوو نەی دەوێرا بەرەو ماڵ بێتەوە بۆ هەولێر و دوو گرتکان. تەکلیفم لەبەر نا ئەو سەد دینارە و زیادییەکی کە پێویستیش بێ لێمی وەربگرێ، دوای زێدە ئیلحاح دەستی گەیاندە بیست دینار، هەزار ڕەحمەتت لێ بێ جوانەمەردی کوردایەتی. لە پاش مەرگی ئەو هەشتا دینارەم بە مل کاکە وریای کوڕەگەورەیدا دا، چەندێکی پەلەی کرد لێم نەسەلماند و تێم گەیاند کە بەشەرع ئەو پارایە لێم حەرامە چونکە ئەحمەد منداڵی بچووکی لەپاش بەجێ ماوە «لاتقربوا مال الیتیم»م بە بیردا هێنایەوە. وەی کە ئەم تەرزە بیرەوەرییە بە سفتوسۆیە، ئەمما زیندوو کردنەوەشی هەستێکی مرۆیانە لە خاوەن دڵ و دەروونادا دەبزێوێت.

خوالێخۆشبووی، مەلا مەعسوومی هەورامی، کە مجازی باوکم و برادەری خۆم و دۆستی بنەماڵەی جەلیزادان و هەڵکەوتووی زمانی عەرەبی و زانستەکانی ئیسلام بوو، لە پاش ئەزموونی ڕەسمی، بوو بە خەتیبی مزگەوتی گەورە. ئەم مرۆیە خۆی دەستچێنی باوکم بوو، لە هەموو مەلایەکیش پتر بە دەوری باوکمەوە بوو. گەلێک لایەنی گەشی تێدا کۆببۆوە بە کەڵکی مەلایەتی و خۆدەرخستن بێت. لە عەرەبی یەکجار باخەبەر بوو. لە بیرمە جارێکیان بە نامە لێم پرسی وشەی «بلە» چ ئیعرابێک دەداتە وشەی دوای خۆیەوە. بۆی نووسیمەوە، سێ واتای هەیە یەکیان «کیف» بەو پێیە وشەی دوایەوە «مرفوع» دەبێ، دووەمیان «دع» وشەکە «منصوب» دەکات، سێیەمیان «ترک» خۆی دەبێتە «مضاف» و وشەی دوای «مجرور» دەبێت، لەمەوە دەردەکەوێ کە دەشێ بگوترێ: «بلە رجل، بلە رجلا، بلە رجل».

جارێکیش مامۆستای عەرەبی لە سانەویی کۆیە بە قوتابییەکانی خۆی گوتبوو: لە خۆم بەولاوە کۆیێ کەسی تێدا نییە بزانێ «سفرجل» چۆن جەمع دەکرێت، جەمعەکەی دوو جۆرە، یان «تاء الوحدة»ی پێوە دەلکێت و دەبێتە «سفرجلات» یاخود بە «جمع التکسیر» دەبێتە سفارج. قسەکە بە مەلا مەعسووم دەگات، دەڵێ: دەبوو بشڵێ ئەگەر پیتی سێیەمی وشەکە یەکێک لە پیتەکانی وشەی «أنسیتموها» بوایە دەشیا لە جەمعدا ببێتە «سفاجل» وەک کە «جحمرش» دەبێتە «جحامر» و

«جحارش». لەو ناوەدا کەس نەبوو بەقەد ئەو «حافظة»ی بەهێز بێت. مەلا قادری کانی دەربەندی، لە قوتابییەکانی باوکم، دەگێڕێتەوە دەڵێ: جارێکیان بە تاقیکردنەوەی ئەزبەر کردن دەرکەوت هەتا من دەزنوێژم شووشت و نوێژم کرد مەلا مەعسووم یازدە لاپەڕەی کتێبێکی ئەزبەر کرد (من ناوی کتێبەکەم لە بیر نەماوە).

من کە باسی ئەم مرۆیە دەکەم ڕاستیی لێ دەگێڕمەوە بێ ئەوەی خوانەخواستە پایەی مەلا و بنەماڵە عیلمییەکانی کۆنینەی کۆیێ لە بیر بکەم کە هەموویان، کاریان لای خوا ڕاست بێت، لێهاتووی خزمەت گوزاری ڕاست و دروست و خواناس بوون. گەلێک جاران کە لای باوکم کۆمەڵیان دەبەست و مەجلیسیان بە جۆرەهای بابەتی عیلمی و ئەدەبی دەڕازایەوە دەبوو هەر تێیانەوە ڕامێنێت. تکام لە هەموانیش کردووە کە کورتەی مێژووی بنەماڵەی خۆیانم بۆ بنووسن، تا ئێستا بەداخەوە تەنها لە ماڵی مەلا سادقەوە چەند دێڕێکی کەمم بۆ هاتووە لەلایەن مامۆستا مەلا زاهیر و عەبدولڕەحمانی برایەوە، کۆنە هەڤاڵی خوێندنی سەرەتاییم، کەوا بەڕاستی زۆر کەمترە لەوەی بنەماڵەکەیان بە بەریەوە هەیە. لەو چەند دێڕەدا ئەوەندە دەزاندرێ مامۆستا مەلا زاهیری ئەدیب و مودەریس و خاوەن کتێبی چاپکراو کوڕی مامۆستا مەلا سادیقە (موجازی مەلای گەورەیە).

مەلا سادیق بە ئەزموون لە مووسڵ بۆتە موفتیی ڕانیە (دیارە ئەمە لە سەردەمی عوسمانلی بووە) ئەویش کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا حەسەن کوڕی مەلا مەحموود کوڕی مەلا حوسێن مەلا مستەفا کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕێ شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەبدوڵا کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ ئەبووبەکرد کوڕی شێخ عوسمان کوڕی شێخ یەعقوب کوڕی شێخ ئیسماعیل و بەرەژووتر.

ئەم زنجیرەیە لە مەلا زاهیر بە پێشەوە چواردە پشت دەگرێتەوە ناشزانین چەند پشتی دیکە بەرەژوور بۆتەوە بۆ مەلایەتی و شێخەتی. وەک دەزانم لە هەندێ جاروباردا بە لەقەبی «دایە خەجێی سددیقی» هەڵدراونەتەوە. خۆم لە پەراوێزی کتێبێکی دەست نووسم خوێندۆتەوە نووسەرەکەی دەڵێ لە مزگەوتی دایە خەجێی کۆیەم نووسیوەتەوە، نووسینەکەشی بۆ لای 250-300 ساڵێک دەچێتەوە.
بەهەمەحاڵ سووچی من نییە نووسینەکەم لەم تەرزە بابەتە دەست بەتاڵ بێت.

مامۆستا مەلا سادق لای باوکم زۆر لە پێش بوو، تەنانەت لە هەر وەختێکدا هاتبێتە لای بێ دەرگە لێدان یەکسەر بۆ دیوی حەرەم هەتا ژوورەکەی باوکم ڕانەدەوەستا و بێگرفت لای دادەنیشت. کە پرسیار و ئیشێکی مەیلەو ئەستەم هاتبایە پێش، خاوەن مەسەلە تکای لە مەلا سادق دەکرد ئەرکی ڕوون کردنەوەی هەڵکەوت بۆ لای باوکم هەڵگرێت... هاوڕێیەکی دەمی فەقێیەتی خۆی هەبوو، کە ئەویش مجازی باوکم بوو، مامۆستا مەلا عەلی باداوەیی مودەرسی مزگەوتی منارە، هەمیشە بەیەکەوە وەک دوو برای حەقیقی بوون. مەلا عەلی چەند ساڵێک زووتر کۆچی دوایی کرد، بەڵام برادەریی ئەو و مەلا سادق بۆ مەلا محەمەد مەلا عەلی و مەلا ظاهری مەلا سادق بەجێ ما کە هەمیشە گەشت و گەڕان و سەردانی خەڵقیان بەیەکەوە دەکرد. تەنانەت هاوینان بەیەکەوە دەهاتنە سەردانم لە چنارۆک. مەلا محەمەد دە ساڵێک بەر لە مەلا ظاهر ئاودیوی ئاخرەت بوو.

سەرتان نەیەشێنم لە سلێمانی بە حاکمایەتی سەرپەرشتی مەحکەمەی چوارتام دەکرد. یەکەم سەردانم لەو مەحکەمەیە بە هاوڕێی مامۆستا «ئەنوەر یەکتا»ی حاکمی یەکەمی دادگەی سلێمانی و حاکم «بورهان سلێمان»ی کەونە هەڤاڵی خوێندنی هەولێر و بەغدام بوو. قایمقام لە چوارتا عومەراغای محەمەداغا بوو کە ئەویش هەر دۆست و ئێستاش دۆستمە، زۆری خزمەت کردین، لە دوو سەردانی دیکەدا تەنها بووم هەر جارەش عومەراغا ماڵی ئاوا بێت بەولای پێویستەوە پێوەم ماندوو دەبوو. معاونی پۆلیس عەبدولواحد بابان بوو، نەشم زانی لە بابانایەتیدا سەربە کێ دەگەیەنێ. جارێکیان لیستە ناوێکی کوردی ئێرانی بۆ هێنام کە بە تۆمەتی تێپەڕبوون لە سنووری ئێران بۆ عێراق فەرمانی گرتنیان ئیمزا بکەم، ئەشەدوبیللا دەستم نەیهێنا ئیمزام بهاوێمە سەر ئەو فەرمانە. عەبدولواحد زۆر سەغڵەت بوو، حەقیشی هەبوو لە سەغڵەتییەکەی، کە نەیدەزانی چۆن بێ بڕیار دادگا لە حەبسیان بهێڵێتەوە و چۆناوچۆنی خۆراکیان پێ بدات، گوتم ئەمە سەریەشەی خۆتە... ئیتر نەمزانی چی کردەوە لەم مەتەڵە. لە دەمی ئەم نووسینەدا 29/10/1987 چەندێکی ویستم شتێک لە بارەی بابانایەتیی عەبدولواحدەوە بزانم هیچ چنگ نەکەوت.

لێرەدا نوکتەیەک دەگێڕمەوە: لە سەفەری یەکەم بۆ چوارتا حاکم بورهان لە هەورازە ڕک و پێچاوپێچی ڕێگاکەی شاخی ئەزمەڕ ترسی وەرگەڕانی

گەڕۆکەکەمانی هەبوو ناوناوە لە لێخورەکەی دەبزرکاند: ئەها چت کرد، کوڕە نەکەی... پێم گوت گرەوت لەگەڵدا دەکەم گەڕۆک وەرناگەڕێ، ئەگەر وەرگەڕا من سەد دینارت بدەمێ ئەگەر نا تۆ پێنج دینارم بدەیێ. لەو دەمە نارەحەتەدا کاک بورهان بۆ ئەوە نەچوو کە ئەگەر وەرگەڕانی بۆ بنی شاخ سەد دینارەکە لە خۆوە دەسرێتەوە، هەر ئەوەندەی بۆ هات وەک دادپرسێک لە دەعوای مەدەنی بلێ چۆن دەشێ سەد دینار بەرانبەر پێنج دینار بێ؟ ئێستاش ئەو پێنج دینارەم قەرزار دەبوو...

لە سلێمانی چەند مانگێکی حاکمەتیم لە خانوویێک ڕابوارد دەیانگوت هی حاجی مارفە، من خاوەنیم نەدیت بەڵام وەها دەزانم دەبێ باوکی د. ئەوڕەحمانی برا و برادەرم بووبێت، لە سەراوە نزیک بوو لە چاو حاڵوباری ئەم سەردەمەش ڕێکوپێک هەرزان بوو. ماڵی کۆیەم هەر ئاوەدان مایەوە. بۆ من ڕابواردن و گوزەران لە سلێمانی بەلای خۆشیدا بوو، ناسیاوم زۆر بوون، کاتی وەڕەز بوون لە دەفتەری ڕۆژانەمدا جێی نەبوو، وەزیفەکەشم هی ئەوە نەبوو چاوسوورکەرەوەی بەسەرەوە بێت، مامۆستا یەکتاش هیچ نەیدەپرسییەوە کەی دێم کەی دەچم.

من لە 3-10-1951 بە هۆی دەردێکی سەرمای لەنکاوی سەرەتای پاییزەوە بۆ ماوەی شەووڕۆژێک خواردن و خواردنەوە و جگەرە و هەرچی چووبایە هەناو لێیان دزام، نەمدەتوانی سەیریشیان بکەم. کە ئەو دەردە جگەرەی لە پێش چاوم خست، هەر چونکە زۆرم زەرەر لێ دەدیت، دوای بەسەرچوونی دەردەکە، بە بێدەنگی، خۆم لە جگەرە نەیار کرد. یەک دوو ڕۆژ تێپەڕی بێ ئەوەی مجێزم بۆی ببزوێت. لە حەفتەیەکدا چی گلەیی هەمبوو لەلایەن کۆخە و سینگ ئیشە و هەناسەوە نەما و ئارەزۆشم بەتەواوی بۆ جگەرە کپ بوو. کە ساڵ دەوری دایەوە و کەوتینە مانگی دەی 1952، لە سلێمانی، بەجۆرێک ئارەزۆم بۆ جگەرە زیندوو بۆوە تاقەتی لێ بڕیم. وادەبوو لە ڕێگە دەڕۆیشتم نەمدەزانی بۆ کوێ دەچم. پازدە ڕۆژێکان بەم جۆرە لە عەزابێکی گەورەدا بووم، عەجایب ئەوە بوو ئەو ئارەزوە کوشندەیە وەها سواری هەست و هۆشم بووبوو وەک یەکێکی کوتەکی لە بناگوێی درابێت، کاتێک هەستم بە خۆم کردەوە چەند ڕۆژێک بوو مەیلی جگەرەم لە بنەڕەتدا نەماوە. ئیتر جارێکی دیکە لێم بەخەبر نەهاتەوە.

لەگەڵ خوالێخۆشبووی حاکم «سعاد مبارک» بەیەکەوە لە ژوورێکدا بووین، شارەزای تەبیاتی یەکتر و کۆنە برادەریش بووین لە دەمی خوێندنی حوقووقمانەوە. ڕاستییەکەی بەخاترانە من لە سلێمانی بە «حاکم اضافي» داندرام هەتا نەخرێمە قەزاییێکەوە دەنا دەبوو بچم لە چوارتا خێوەتێک هەڵبدەم ئیتر سەرپەرشتی کردنی ئەوێیان خستە سەر ناوی وەزیفەکەم، مانگی دوو جاران وەیا کەمتر، سەردانی ئەوێم دەکرد.

ئەوسا سلێمانی لە چاو شاری دیکەی وڵات، جگە لە کەرکووک، خۆی بە گەورە دەنواند بەڵام لە چاو ئێستاکەی شارۆچکە دەردەچوو. وەک لە سەرژمارەکەی ساڵی 1957 دەرکەوت 33 هەزار دانیشتووی هەبوو، هەولێر 27 هەزار بوو، کۆیێ 7800 بوو، بەڵام جمووجووڵی خەڵقەکەی چ لە ڕووی ڕۆشنبیری چ ڕامیاری چ توجاری و هەر بارێکی دیکەوە بێت بە زیادەوە هێزوپێزی پێوە دیار بوو. سەرکزەڵەیی لەو شارەدا نەدەدیترا. کەسێکی نانی شەوانەی هەبووبێت تەڕدەماغ و شەن دەردەکەوت. بەزۆری شەوان لە ماڵی برادەرێک و ناسیاوێک کۆبوونەوەمان دەبوو، خانەخوێ هەمیشە وەک حاتەم دەهاتە کایەوە. کە دڵۆپە منی دەگرتەوە نیوەڕۆژەم بۆ سازدەدان...

لە کولانەی وەزیفە حاکمایەتییەوە دیتم گەلێک باری نالەباری ئاژاوە و فیراری و تۆمەتی تاوانباری لە هیچە بە نەزانی وەیا دڵکرمێیی مووچەخۆرە زلەکان سەری هەڵدەدا. بە نموونە لە ناحیەیەکەوە فایلی گومانلێکراوێکی فێرارم بۆ هات بە شایەدی زۆرەوە لەسەر هەندێ کە کابرا ڕووخێنەر و شیووعی و نازانم چییە. هەموو «دلیل» و «مستمسک» یش ئەوەبوو لە ماڵەکەی دەفتەرێکی شیعری حەماسی و دووسێ وێنەی منداڵانەی قاچ و دەستی بە کۆتەوە گیرابوو... شایەدەکانم هێنا بێ چاوڕاو پێم گوتن درۆ نەکەن دەنا دەعواکە دەچێتە عورفیی بەغدا، بە دەعواوە بۆ ئەوەی بەڕێ دەکرێن. هەر لە بیرمە چۆن بزڕکان و سوێندیان لەسەر هێندێ خوارد کە ئەو فیرارە چ خراپەی نییە و چییان لێ بەدی نەکردووە کە جێی گلەیی بێت... دەعواکەم هەنارد بۆ بەغدا کە بڕیاری داخستنی لەوێ دەربچێت چونکە لەو دەمانەدا حاکمی تەحقیق دەیتوانی خەڵق بگرێت، بەرەڵا کردنیان لە دەستەڵاتی عورفیی بەغدا بوو... لە حەفتەیەکدا دەعواکە بەو شێوەیەی داوام کردبوو گەڕایەوە. ئەو تۆمەتلێکراوە مەحکەمەشی نەدیت ڕەها بوو لە تۆمەتەکەی.

نموونەیەکی دیکە لەم بابەتە، کە هەرای کۆتایی ساڵی 1952 لە بەغدا بەرپا بوو، سەری کێشایەوە بۆ هاتنی حکوومەتی «فەریق» نوورەددین مەحموود (سەرەک ئەرکانی سپای ئەو دەم) ترس هەبوو لە پەرەسەندنی ئاژاوە. موتەسەڕیفی سلێمانی هاتە لای ئێمەی حاکمانی دادگای سلێمانی، دەری بڕی کە بۆ بەردەوام کردنی هێمنایەتی لە سلێمانی پێویستە بە چەند کردەوەیەکی پارێزگاری وەک گرتنی کەسانی ئاژاوەساز و یاساغ کردنی کۆبوونەوە و شتی ئەوتۆیی. لێی داواکردین کە ئەگەر پەسەندی ڕایەکەی بکەین دەبێ سەرپێچی نەکەین لە دەرکردنی بڕیاری قانوونی بەپێی داخوازی هەڵکەوت. هەر چوار حاکم یەک دەنگ گوتمان ڕازی نین بەوەی چ کەس بگیرێ وەیا هیچ کردەوەیەکی خەڵق شێوێن بکرێت بێ ئەوەی خراپە ڕووی دابێت، ئەوساش قانوون چ بڵێت ئەوە پەسەند دەکەین. خوا هەڵناگرێ موتەسەڕیف بە قەناعەتەوە نەک لە بێدەسەڵاتییەوە قسەی سەلماندین و سلێمانی لە باری ئاساییدا مایەوە.

موتەسەڕیفی سلێمانی لەو دەمەدا جەلال خالد بوو کە لە ڕۆژگاری هەرای ڕەشید عالی گەیلانی ساڵی 1941 موتەسەڕیفی بەغدا بوو، دەستیشی تێدا بریندار بوو. پەنجەیەکی یەک لە دوو دەستەکانی کەم بوو. چەند ساڵێک [دوای بەربوونی لە حەبسییەکی کورتیلە] بە ناگزووری ڕابوارد. لەگەڵ کاکە زیاد و گرووپی برادەرانی نزیکی خۆی شناسایی هەبوو توتنەوانیان بۆ لە بیتوێن دادەمەزراند و منیش لەو ساڵانەدا هەر لە ڕێی ئەو دۆستانەیەوە شناساییم لەگەڵی پەیدا کردبوو. کە حاکم بووم لە سلێمانی هەوەڵ جار ئەو هاتە دیدەنیم، هێندەش یارانی و گەرموگوڕ بوو لە دۆستایەتی باس ناکرێت. ئەو دڵ فەرحییەی بوو وەهای کرد بێ دەمەتەقە قسەمان لێ بسەلمێنێ، نوکتەچییەک بوو تاکی نەبێ. لە هەشتاکاندا کۆچی دوایی کرد.

هەر لەو سێ چوار مانگەدا بە خوێندنەوەی فایلی جزائی و بە قسە وەرگرتن لە برادەری ڕاستگۆ زانیم زۆر کەس هەن قاچاغی حکوومەتن بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆیان کردبێت داخوازی ئەو هەموو توندوتیژییە لە کاربەدەستانی ئیدارە و پۆلیس بکات. مەرحوم شێخ ڕەئووفی شێخ مەحموود34 لەگەڵم دوا لە بارەی چەند

---

34- ئەو پایزەی تێیدا بووم بە حاکم، شێخ لەتیف لە دێیەکی خۆی بەسەری دەبرد. شێخ ڕەئووف و بابەعەلی کە هەردووکیان برای داک و بابی بوون، بەیەکەوە

قاچاغێکی ئەوتۆیی کە لە لای شێخ لەتیف بوونەتە پەنابەر. بەڵێنم دا بە هەوڵی بێدرێغ بۆ چارە کردنی کێشەی ئەو تاقمە. وەک لە خوێندنەوەی فایلەکان و لە قسەی خەڵقی بێلایەنیش حاڵی بووم چی شێخ ڕەئووف بۆی گێڕامەوە ڕاست بوو. بەپێی ئەوەی کابراکان سەر بەقەزای چوارتا بوون چارەسەرکردنیان لەدەست خۆمدا بوو. من کەوتمە باری توێژینەوە لەو مەسەلانە، هەڵبژاردنی نوێنەرانی پارلەمان هاتە پێش و منی لە سلێمانی دوور خستەوە بۆ هەرای هەڵبژاردنەکەی کۆیێ. بەداخەوە مەسەلەی ئەو قاچاغانە بە بێ چارە کردن مایەوە، ناشزانم دوای من چۆناوچۆنی قاڵبی بەست.

---

دەژیان. لەگەڵ هەردووکیان دۆست بووم و زۆریش لە ڕەزامەندیم بە پەرۆش بوون، هاتوچۆی یەکترمان بە زۆری دەکرد، خێراخێراش داوەتی شەوانەی بەهاتوباتیان ڕێک دەخست لە دیوەخانەکەی خۆیان. کام کەسی ئەرباب و قسەخۆش بوو بانگ هێشتن دەکران. ئەو دۆستایەتییە نەپسایەوە مەگەر ئەوەی کە مەرگی شێخ ڕەئووف لەساڵی ١٩٧٨ داوی پێوەندی ژیوەریی بە من و بە هەموو دنیاوە پساند.

**چۆن بووم بە نوێنەری کۆیە**

فەریق نوورەددین کە بە خۆی و کەسایەتیی عەسکەرییەوە بوو بە سەرەک وەزیران بۆ کوژاندنەوەی نمایشتەکانی بەغدا لە کۆتایی ساڵی 1952 وەهای پەسەند کرد بۆ دڵدانەوەی خەڵق هەڵبژاردنێکی تازەی نوێنەران بسازێنێت. بڕیار دەرچوو بە هەڵوەشاندنەوەی مەجلیسی ئەوسا بۆ هەڵبژاردنی یەکێکی نوێ. من خەریکی سەرپەرشتی کردنی پێداویستی هەڵبژاردنێکی قەزای چوارتا بووم جەلال تاڵەبانی نوێنەری حیزبی دیمۆکراتی کورد لە کۆیێ هاتە سلێمانی...

شەو لە ماڵی ئەمیناغای حاجی مەلا موحیەددین چوار قۆڵی: برایم ئەحمەد سکرتێری پارتی، مام جەلال و ئەمیناغا و من کۆبووینەوە. دیارە بە ڕۆژ مام جەلال لەگەڵ برایم ئەحمەد ئەو کۆبوونەوەیان بەو جۆرە پەسەند کردووە دەنا من لە خۆوە نەمدەزانی کۆیێ ڕاسپاردەی هەیە بۆ سلێمانی و کۆبوونەوەی لەسەر دەکرێت.

مام جەلال گوتی، برادەرانی حیزبی دیمۆکراتی کورد لە کۆیێ وایان پەسەند کرد بۆ ئامادەبوون لە بەشداری کردن لە هەڵبژاردن بکەونە چالاکییەوە. هەوەڵ هەنگاوی سەرکەوتوویان ئەوە بوو کەوا هەموو لیژنەکانی هەڵبژاردن کەوتە دەست ئەم «لایەنە» کە ئیتر بە زەحمەت حکوومەت پێی دەکرێ فێڵبازی لەو هەڵبژاردنەدا بکات، مەگەر چاوڕاو و خەڵق ترساندن دەنا ڕێگەی فێڵ و سندوق گۆڕین و شتی ئەوتۆی لێ بەستراوە، ترساندنیش شتێک نییە، ئەم لایەنە، لە چالاکیی خۆی بگێڕێتەوە. بەڕێکەوت حاکمی ئەوسای دادگای کۆیەش، مامۆستا جەوهەر عەزیز سەر بەم لایەنە بوو، ئەمیش هێزێکی زلی ڕەسمییە بە دەست لایەنەکەوە. ئامۆژگاریی لیژنەی کۆیە ئەوەیە، یەکێک پاڵاوتە بکات و تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەی ڕامیاری لە ڕێی هەڵبژاردنی نوێنەری کۆیەوە بەو خەڵقە ئاشنا بکات. لەم نوختەنیگایەوە برادەران وەها پەسەند دەکەن کە پاڵاوتە یەکێک بێت غەیری کاکە زیادی حەمەغا، چونکە حکوومەت بۆ ئەو دەسەلمێنێت وەک کە پێشتر سەلماندبووی.

هەر چوارمان35 ئەو ڕایەمان پەسەند کرد ئنجا مایەوە سەر دەست نیشان کردنی «پالاوتە» کە دوای بێنەوبەرە یەک وشە ڕوویان لە من نا کە ئەرکی پالاوتەیی هەڵبگرم. من لە قووڵایی دڵمەوە ناڕاحەت بووم بەوەی کە باری ئاسایی ژیانم لە سلێمانی کە هەمووی ئارامی و هێمنایی بوو بگۆڕم بە هەرایەکی ئەوتۆ کەس نازانێ چەند سەر تێیدا بێ کڵاو دەبێت. وەزیفەی حاکم زۆر خۆش و ڕێزلێگیراو بوو، بە بەریشیەوە هەبوو خزمەتی کۆمەڵایەتی بکات بێ ئەوەی کەسی تێدا ماندوو بێت. من نەمسەلماند، ئەوان سوور بوون لەسەر تەکلیف، دوای قسەیەکی زل کە شکاندنی دەبوو بە خیانەت لە منەوە چارم نەما سەرم دانەواند بۆ تەکلیفەکە.

هەر لە سلێمانییەوە بە بروسکە خۆم پالاوتە کرد. حیزبیش لە لای خۆیەوە بەیاننامەیەکی هەڵبژاردەی بە ناوی منەوە بڵاوکردەوە تا بڵێی توندوتیژ و ڕەق و حەق (بەلای ناحەقدا بوو). بڕوا بکەن پێم ئەگەر خۆم پالاوتە نەبوومایە هەرگیز لەگەڵ بەیاننامەی ئەوتۆیی نەدەبووم کە هی شەڕ پێ فرۆشتن بێت. خاڵە «مچەی حاجی برایماغا»ی قسە خۆش تەلاقی خواردبوو لە سەر هێندێ کە من ئەو بەیاننامەیەم نووسیوە تاکوو نەکرێم بە نایب.

دوای خۆ پالاوتە کردن بەیانییەکی زستانەی کەوەڕۆژی ئاسمان چڵکنی سارد بە جێبە ئەمەریکاییەکەی شێخ حسێنی حاجی سەیدی سندۆڵان بەرەو کۆیێ، سلێمانیم بەجێ هێشت. ڕێگاوبانی ئەو سەردەمە و تەنبەڵیی جێب وەهای کرد گەیشتم بۆ هەولێر پتر لە چوار سەعات بخایەنێت. قۆناغم باداوەی مەلا ئەفەندی بوو لای عیززەددینی برادەرم کە خۆی لە دوو دەورەی هەڵبژاردنی پێشووترەوە نایب بوو. دابەزیم و جێبەکەم بۆ گەڕانەوەی بەرەو سلێمانی ئیزن دا. سددیقی قادر بەگی شەقڵاوە مێوانی عیززەددین بوو بەرەو پیرمەوە هات و بە قسە قوتەکانی خۆیەوە بەر لە بەخێرهێنان پێی گوتم، برا ئەتوو بوویە فەتاح بەگی هەمەوەند لە بەیانییەوە حکوومەت لێرە و لە بەغدا خەریکە بتبینێتەوە. دنیا نەما بە تەلەفۆن و پرسین و ڕاسپاردن بەسەری نەکەنەوە...

---

35- ئەو چوار کەسە جگە لە مام جەلال و ئەمین ئاغا و من ئیبراهیم ئەحمەدیش بوو کە سکرتێری حیزب بوو- ئەگەر سەهووم نەکردبێ، بە هەمەحاڵ ئەندامێکی هەرە پێشەوە و قسەڕۆیشتوو بوو.

سەعید قەزاز یەکەم جار بوو لەگەڵ نوورەددین مەحموودا بە وەزیری بێت، سەروسۆراغی هەڵبژاردن لە ناوچەی کوردنشین بەو سپێررابوو. چەند جارێک لەگەڵ باداوە تەلەفۆنی کردبوو جارێ نەگەیشتبووم. ڕایسپاردبوو کە گەیشتمە جێ قسەی لەگەڵدا بکەم. سەعید قەزاز دەیزانی لە باداوە دادەبەزم، شارەزامان بوو. موتەسەڕیفی هەولێریش، مستەفا یەعقوبی، هەر چاوەڕوان بوو بگەمە جێ و پێوەندیم پێوە بکات. گورج بەغدا وەرگیرا، سەعید قەزاز لە ڕووی نەسیحەت و پەرۆشەوە گوتی، فڵان دەزانیت چەند حورمەتی باوکتم گرتووە و چەندیش خۆتم خۆشویستوە، واز لە نیابەت بێنە چونکە ئیمکان نییە ڕێ بدرێت بە دەرچوونت، بەغدا نات ناسێت تا لێت ئەمین بێت... چەندێکی هەوڵی دا من نەمسەلماند و گلەییشم لێی کرد کە لە جیاتی دەست لە پشت دان ترسم لەبەر دەنێت، وتوویژمان خایاندی هەتا لێم بێئومێد بوو.

ڕاستییەکەی ئەگەر پاڵاوتەی حیزب نەبامایە لەوانە بوو کۆڵ بدەم... دوای نەختێک موتەسەڕیف قسەی لەگەڵدا کردم گوتی، حەز دەکەم لەگەڵتدا بدوێم باداوەش قەڵەباڵغە بۆ دواندن دەست نادات، بێزەحمەت وا ئۆتۆمۆبیلی خۆمت بۆ دانێرم بتهێنیتە ماڵەکەم... من بە تۆتۆمۆبیلی عیززەددین، دوای نانی نیوەڕۆ چومە لای موتەسەڕیف لەوپەڕی ئەدەبەوە دواندمی کە حکوومەت ئامادەیە لە بەرانبەر وازهێنانم لە هەوڵی نیابەت چ وەزیفەیەکی لە شەهادەم هەڵبەستێت وەک قایمقامەتی، سەرۆکایەتیی تەسویە، تفتیش ئیداری پێمی بدەن... ئیتر لەو جۆرە بەڵێنانە شتی دیکەشی لەگەڵدا بوو. ئەوەی وەڵامی پێویست بوو لەسەرەخۆ و بە ئەدەبەوە لێمی بیست کە بریتی بوو لە نەسەلماندن...

سبەینێ بە ڕێگای قوڕاویی زستانە چوم بۆ کۆیێ، حکوومەت زۆر قوتاغ بوو، وەک تەلی خاوکێشکراو کشت بووبوو. نامزەدی حکوومەت بەرانبەر من مەلا حەوێزاغای غەفووری بوو، بەر لەو محەمەد عەلی هەوڵی بۆ درا لە بەغداوە کە ئەگەر کاکە زیاد یاریدەی بدات خۆی پاڵاوتە بکات هەر ئەویش نایبی کۆیە بوو لەو دەمەڕا کە کاکە زیاد لەسەر مەسەلەیەکی گشتی36 ئیستیقالەی دابوو لە نیابەت محەمەد

---

36- ئەو مەسەلەیە وەسبەی ساڵی 1948 بوو. کاکە زیاد لە موزاهەرەی کۆیێ، ڕۆژی دوای هەراکەی بەغدا، جارێ خەڵقەکە لە بەردەمی سەرا گوێگری قسەکانی

عەلی لە هەڵبژاردنی تەکمیلی بوو بە نایبی کۆیە. هەوڵی محەمەد عەلی بێسوود بوو چونکە کاکە زیاد ئەوسا ئەندامی پارتی بوو ئەگەر بە خەیاڵی ئەوەی کە پارتی لەوانە بێت موقاتەعەی هەڵبژاردن بکات بۆرە بەڵێنیشی بە محەمەد عەلی دابێت، دوای بڕیاری بەشداری کردنی حیزب لە هەڵبژاردن ڕێگەی بەڵێنی ئەوتۆیی بەسترا...

حکوومەتی کۆیێ ڕەچاوی لایەنی حاکمایەتیی منی دەکرد، لە ڕواڵەتدا بێلایەنیی خۆی دەردەبڕی، لە واقیعیشدا هەرچی دەستەڵاتێکی هەیبوو بۆ ترساندن و وردە فێڵی ئیداری و قانوونی، وەک کە دایەرەی نفووس موراجەعەتی دۆستی ئێمەی دەوەخراند لە بوون بە (ناخب)، بۆ حکوومەتیش مردووی بە زیندوو لە قەڵەم دەدا، هەمووی بەکارهێنا. ڕۆژی جومعەی دوای گەیشتم لە کۆیێ، کە خەڵق لە نوێژ بوونەوە هەر لە حەوشەی مزگەوتی گەورە دوانێکی توندوتیژم دا دژی هەڵوەستی حکوومەت و چی ئیمکانیش بوو لە بارەی بەکارهێنانی مافی هەڵبژاردن لەلایەن میلەتەوە بۆ ئەو خەڵقەم شەرح دا ئەوانیش بەڕاستی و پڕ بە دڵ بۆ بیستنی ئەو قسانە وەکوو ئەسپینداری چەم قیت ڕاوەستابوون لە حەوشەی مزگەوت37...

چەپڵەڕێزانی دوای ئەو دواندنە بۆ هەموو کەسێکی دەردەخست کە میللەت لەگەڵ حکوومەت نییە. ئەوەی ڕاستی بێت لە دوو نوختەوە حکوومەت بێهێز بوو، یەکیان

---

عەلی عەبدوڵا بوو، کاکە زیاد ئیستیقالەنامەی خۆی لە نیابەت نایە دەستی مامۆستا عەلییەوە و ئەویش بۆ خەڵقەکەی خوێندەوە.

37- یەک دوو ڕۆژ دوای دوانی مزگەوتی گەورە ویستم بچم بۆ تەقتەق، حکوومەت مەلا حەویزاغا-شی بەگەڵم دا وێڕای «معاون شرطة» عەلی قەمچی ڕەش. خەڵقی تەقتەق بەزۆری هاتنە کۆبوونەوە گشتییەکەی بەر سەرما و قوڕی زستان. هەر من قسەم کرد لە بارەی بەکارهێنانی خوازی بێگرفت کە یاسا دەیپارێزێت لە هەڵبژاردنی نوێنەر، ڕۆژگاری ئەوە هاتووە میللەت کێ بە چاک بزانێت دەنگی خۆی بەو بدات. نیوەڕۆژەمان لەماڵی شێخ ڕەئووف خانەقا (ی خەزووری دوارۆژم) تەئمین کرا. هاتنی «معاون شرطة» ئەو چاکەیەی تێدا بوو کە ئۆتۆمۆبیل کەوتە سەر حیسابی حکوومەت لە کۆڵ من بۆوە.

ئەوەبوو کە لیژنەی هەڵبژاردن هەمووی هی حیزبەکە بوون، دووەمیان ئەوەبوو کە پێشتریش گوتم، حاک جەوهەر دزەیی لە ڕواڵەتدا بێتەرەف و لە واقیعیشدا لای میللەت بوو. ئەوسا میرزای حاجی کەریم کاتبی حاکم و پارتییەکی چالاکیش بوو. مەحکەمە هەمووی پشت لە حکوومەت بوو. لە بەرید ئەندامی ئەم لایەنە هەبوون کاغەزی گوماناوی بکەنەوە و بخوێننەوە و خەبەر بدەن. میرزا هەموو شەوێک تەلی دەخستە سەر تەلی تەلەفۆن و گوێی لە سرکەوکورکەی حکوومەت ڕادەگرت و بە حیزبی ڕادەگەیاند...

خولاسە بەرەی سەربە میللەتیش وەک حکوومەت کەوتە خۆی و چی لە توانایدا بوو بۆ بۆ سەرخستنی ئەو تەجرەبەیە، مەردانە بەکاری هێنا. مەحکەمە لە ماوەی کەمدا هەموو ئەو شکاتانەی دەپرسییەوە کە خەڵق بە ڕەسمی لە دایەرەی نفووسیان دەکرد لەسەر دەرنەچوونی ناوەکانیان لە لیستەی ناخیبان، ئەگەر مەحکەمە دژی میللەت بوایە داوای ئەوتۆیی لەوانە بوو بە مانگ و دوو مانگیش کۆتاییان نەیەت. ئەگەر هاتبایە مەحکەمە و لیژنەی هەڵبژاردن لای حکوومەت بانایە چەندێکی حیزب و میللەت و من و غەیری من بە تێکڕایی پاڵەوان بووینایە لە ئاکامدا سندووقی دەنگەکان فێڵیان تێدا دەکرا و بەشی زۆری دەنگەکان بۆ ئەو کەسە دەبوو کە حکوومەت دەیەویست. هەڵبژاردن شەڕە تۆپ نییە، میللەتیش لێی داوا ناکرێت بۆ سەرخستنی پاڵاوتەیەک سەدان قوربانی بدات کەوا ڕەنگە بێسوودیش بێت، ئەگەر لە توانادا بێت شەڕی ئەوتۆیی ببردرێتەوە لە بنەڕەتەوە حکوومەتەکە دەگۆڕدرا. هەر نەیسە...

ڕۆژی هەڵبژاردن من لەو نوختەیە بووم کە مزگەوتی گەورەی کردبوو بە ناوچە. دایەرەی پۆلیس لە هەر دوو دەرگەی مزگەوت دوو ڕیز پۆلیسی سونگی تاقی بە ناوی پاراستنی ڕێکی و هێمنایی، بەڵام بە نیازی خەڵق ترساندن، ڕاوەستاندبوو کە دەبوو ناخیب (هەڵبژێر) بە ناویاندا تێپەڕێت بۆ سەر سندووقی دەنگ دان.

ترس بەو خەڵقەوە دیار بوو بەڵام دەنگ دان بەردەوام. حاکم جەوهەریش لە لای خۆیەوە بە سیفەتی سەرپەرشتی کردنی هەڵبژاردن و پاراستنی سنووری قانوون خەریکی ڕێ خۆش کردنی دەنگ دان بوو بۆ خەڵقەکە و هانی دەدان بەرەو نەترسان. لەنکاو قەپوقیر و «بمرێ بژی» و هوتاف لەو دیو دەرگەی لای بازاڕ پەیدا بوو.

چەپڕۆیەکان بە نامەی موقاتەعەی هەڵبژاردن ئەو وروژمە چەکدارەیان بۆ سەر نوختەی یەکەمی هەڵبژاردن لە مزگەوتی گەورە هێنا، پۆلیسەکان ڕێیان دان بێنە ژوورەوە چەندێکی حاکم جەوهەر تێی ڕاخوڕین کە بەرهەڵستییان لێ بکەن خۆیان نەخوراند. چاوم لێ بوو دەستی بۆ یەکێک لەوان درێژ کرد و بە پۆلیسەکانی گوت ئەمەیان بگرن، فایدەی نەبوو، یەکێکی زلە لەو موزاهەرەچییانە کفنی لەبەر کردبوو وەک نێرتکی تەندوورەی گێژەنی ئاو جمووجووڵ بە دەورییەوە دەکرا. خەڵقەکە هەڵات، من لە سەر سەکۆی ناوەندی حەوشە ڕاوەستا بووم، لە شەرمان مامەوە نەک لە بێترسی چونکە نەمدەزانی چ نیازێکیان لە دڵدایە. قەڵەباڵغییەکە بە تەنیشت شوێنی مندا ڕۆیی بەرەو جێگەی سندووقی هەڵبژاردن بەرانبەر من هیچ بێئوسووڵییان نەکرد. زانیم کە دەست ناوەشێنن ئیتر خەیاڵم لەوە کردەوە کەوا بێگومان تۆژینەوە لەو ڕووداوە لەلایەن حکوومەتەوە دەکرێ ڕەنگە منیش بە شایەد بانگ هێشتن بکرێم. نەکا کەس بناسم ڕووم وەرگێڕا بایی ئەوەی نەیانبینم بەڵام پشتم تێنەکردن نەکا لەسەرم بە ترس حیساب بکرێت. ئافرەتێک لە نزیکمەوە ڕووی قسەی تێکردم و گوتی، کاکە قەت بووە ئینتخابات بە لوولەی دەمانچە؟ ڕووم بۆ وەرگێڕا بێ ئەوەی سەیری ڕووی بکەم و پێم گوت خوشکێ ئێوە دەمانچەتان هەڵگرتووە خۆ من و کەسی دیکە لەو خەڵقە چەقۆشمان پێ نییە. قسەکەم وەهای کرد چی دی لەسەری نەڕوات.

کۆمەڵەی چەکداری موقاتەعە بە مەیتەوە گەیشتنە لای سندووق. بەرپرسی لیژنە، کە عەلی عەبدوڵای دەمڕاستی لکی حیزب بوو لە کۆیە، دیفاعی لە سندووقەکە کرد بەڵام لە دەستیان دەرهێنا و شکاندیان. ئنجا بە ناو ڕیزی پۆلیسی دەرگەی دووەمی مزگەوتدا دەرچوون بۆ نوختەی دووەمی هەڵبژاردن لە مزگەوتی باییزاغا. سندووقی ئەوێشیان شکاند و بڵاوەیان لێ کرد. ئاوێکی سارد بەسەر حەماسەتی شارەکەدا کرا و سۆزی «بە حەق گەیشتن»ی پێ بوو بە خۆڵەمێش.

حکوومەت بە هەلی زانی، معاونی پۆلیس وەهای لە قەڵەم دا کە موزاهەرە لە لای ماڵی منەوە ڕێک خراوە... چەندین کەسی لە خزم و دۆستی من بە تۆمەتی موزاهەرە و ئاژاوە، لە ڕێی شایەدی بەکرێگیراوەوە، گرت و دانیە مەحکەمە. حاکم جەوهەر قەڵایەکی مەحکەم بوو، بە موتەسەڕیفی ڕاگەیاند کە شورتەی کۆیێ خۆی

بەرپرسە لە هاندانی خەڵقەکە بۆ ئاژاوە… دیسانەوە مەحکەمە کاری خۆی کرد لە چەپارەدانی ئەو بێگوناهانە دژی تۆمەتی درۆزن…38

گومان لەوەدا نییە، ئەو موزاهەرەیە نەدەکرا ئەگەر حکوومەت بە ئاشکرا لە دۆشمنایەتی بەرەی ئێمە نەکۆشابایە. من ناڵێم موزاهەرەچییەکان بەکرێگیراو بوون بەڵام لە دوو شت دڵنیام، ڕابەرانی ئەو موزاهەرەیە دەیانزانی هەڵوەستیان عەیبدارە بەڵام قینیان لە پارتی پتر بوو نەک لە حکوومەت دەنا دەبوو لە هەولێر و سلێمانی هەمان نمایشت بکەن، کە نەیانکرد بۆیە بوو پارتی لەو شوێنانەدا هیچ پاڵاوتەی نەبوو خۆیشی موقاتەعەی کردبوو لە غەیری کۆیە. موقاتەعە جودایە و دژە لەگەڵ هەڵمەت بردنی چەکدار. پارتیش لەبەر واقیعیەت هەلی کۆیێ قۆستەوە چونکە چ بەرژەوەندیێک نییە لە دۆڕاندنی هەلێکی وەها لەبار بۆ کردنەوەی چاوی میللەت. لینین خۆی دەڵێ هەموو ئەو موقاتەعانەی دوای تێشکانی شۆڕشی 1905 هەتا شۆڕشی ئۆکتۆبەر کران بێجێ بوون چونکە بریتی بوون لە دۆڕاندنی هەلی ڕێکوپێک کە قانوونیش سەلماندوویەتی. ئەمەش دەخاتە سەر قسەکانی کە دەرچوونی پاڵاوتە ئامانجی هەرە گەورە نییە لەو تەجرەبانەدا، ئەگەر دەرچوو بەجێیە، ئەگەر دەرنەچوو دەرسێک لە میللەت گەیەندراوە.

ئێستا من دەڵێم چەند سەیرە حیزبێک دڵ بەوە خۆش بکات لە سارداو و ژێرزەمیناندا بەیاننامە دژی هەڵبژاردن دەر بکات و بە کردەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی بزانێت کەچی هەڵوەستی مەردانەی وەکوو ئەو جارەی کۆیێ کە بەغدای خەریک

---

38- دوای دەرچوونی گەشتەکەم لە مامۆستا جەوهەرم زانی کە ڕۆژی هەڵبژاردنەکە معاون پۆلیسی بە ئەمری مەحکەمە، لە کۆیێ دوورخستبۆوە. موتەسەڕیف و سەعید قەزازیش پێوەندییان پێوە کردبوو لەم بارەوە بەڵکوو بڕیارەکەی بگۆڕێت، نەیسەلماندبوو. ئەو ڕۆژە من لە وەزعێکدا بووم پاش شکاندنی سندووقەکان ئاگام لەو تەرزە ڕووداوانە و چەندوچۆنی موحاکەمەی موتتەهەمە بوختانپێکراوەکان نەبوو. بەڵام دەزانم من ئەو معاون پۆلیسەم نەدیتەوە لە کۆیێ. کابرا ناوی دەرکردبوو بە «عەلی قەمچی ڕەش»، خەڵقی سلێمانی بوو، ئەوەندەی لە بارییەوە بزانم و بە بیستن لێی حاڵی بووبێتم ئەوە بووە کە مرۆیەکی ئازایە و پیاوەتیشی لە دەست هاتووە.

کردبوو لە هەموو عێراقیش دەنگی دایەوە نەک هەر لە کوردستان، ئا هەڵوەستی ئەوتۆیی تاوانبار بکات، ئنجا لە لای خۆیەوە هەوڵێک بدات حکوومەت بگەشێنێتەوە. کورتبینی و لێڵبینی و حەسوودی لەو تەرزە کارانەدا ئەوەندە ئاشکرایە و سفتوسۆیە نازانم چی لەگەڵدا بڵێم.

نوختەی دوەم کە تێدا دڵنیام ئەوەیە کە جاسووسانی سەربە شورتەی ئەوسا دەستیان هەبوو لە هەموار کردنی ڕێگە بۆ هەر خراپە و ڕووخانێکی لەو ڕۆژەدا دژی هەڵبژاردنی من بکرێت. معاونی پۆلیس یەکێک بوو لەوانەی ناویان دەرکردبوو بە سەرکەوتن لە هەر کارێکی پێیان سپێردرابێت. تا ئەوەی نەتوانێ بە دیار شکستی خۆیەوە دەست لە ئەژنۆ دانیشێت. ئەم تاڵاییەی چەژی تێشکان وەهای لێ کرد پتر لە حکوومەتی کۆیە و هەولێر و بەغدا داغ لەدڵ بێت. بێگومان بە فەرمانی ئەو بوو کە لە زووەوە پۆلیسەکانی تێگەیاندبوو بێلایەن ڕاوەستن لە کاتی پەیدابوونی هەرا، دواتریش بەرەی ئێمەی گرتە بەرگومان لە مەحکەمە و تەقریری دا کە موزاهەرە لە لای ماڵی منەوە دەرچووە و موزاهەرەچییەکانی چەپارە دا.39

بە دڵشکستەییەوە مزگەوتی گەورەمان بەجێ هێشت بە دیار ئاکامی ئەم کارە نارەوایە، ئاخۆ حکومەت چ پەڵپێکی گەورەمان پێ دەگرێت و چۆن ماددەی قانوونی باهەڵدراومان لێ بەکار دێنێت. لە کەڵکەڵەی ئەو خەیاڵاتەدا بووین، دمەو عەسر، حکوومەت بانگهێشتنی کردین بۆ دەست کردنەوە بە هەڵبژاردن. خێرا سندووقی نوێی دروست کرد و ڕێگەی خۆش کرد بۆ ئەو شتەی بەر لە دوو سێ سەعات لە دژی دەجەنگا. هەڵوەستی تازەی حکوومەت وەک تەقڵە لێدان و بەرەواژبوونەوە بوو، بە جۆرێک سەرمان لێی سوڕما بەڵام کات بەبەر حەپەسانەوە نەمابوو، کەوتینە خۆمان و خەڵقیش لە لایەنگیری ئێمە و حکوومەتیش بەرەو دەنگدان ڕۆشتن. من چوومەوە مزگەوتی گەورە. ئەم جارەیان قبووڵمان نەکرد پۆلیس سونگی تاق لە دەرگاکان ڕاوەستن، کاک جەوهەر بە دەستەڵاتی ڕەسمی خۆیەوە لەو کارەدا

---

39- مامۆستا دڵزار کە ئەوسا لە کۆیێ چیهرەیەکی ناسراوی شیووعییەکان بوو، لە یاداشتی خۆی، کە دانەیەکی بە دیاری بۆم نارد لە ئەورووپاوە، بێ ئەوەی پاتەوپات هەموو شتێک دەرببڕێت، لە قسەکانی دەربارەی موزاهەرەکە دیار دەدات کە ترسیان لە شورتە نەبووە.

کاریگەر بوو. نەمانی پۆلیس و هەڕەشەکانی متمانەی دا بە خەڵقەکە و باشتر لە دەمی دەنگداندا دەروونی خۆیان دەکردەوە...

زستانی سارد، کووچە و کۆڵان و قوڕ، هەڵبژاردن درێژەی کێشا بۆ شەو هەرچەند ئەو تەگەرە گەورەیەی موزاهەرە و سندووق شکاندن و شەو بەسەردا هاتن بەشێکی لە دەنگدەران کەم کردەوە، دیسانەوە لە چاو حاڵوباری ئەو سەردەمانەدا خەڵقێکی زۆر چاوەنۆڕییان کرد هەتا چەند سەعاتێک لە شەو تێپەڕی و دەنگیان دا بۆ من. پاش تەواوبوونی دەنگ وەرگرتن گەڕامەوە ماڵێ لەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕابەرانی حیزب و خزم و دۆست، دانیشتین بە دیار دەرکەوتنی ئاکامی هەڵبژاردنی ناو شار جارێ خەبەری نوختەی هەڵبژاردنی تەقتەق و جێگاکانی دیکە کە بە هەموویان وەک لە بیرمە دە نوختە بوون جگە لە کۆی، جارێ پێمان نەگەیشتبوو...

دەوری سەعات دە و نیو خەبەر هات کە ژمارەی ئەو دەنگانەی بە ئێمە دراوە گەلێک زیاترە لە هی حکوومەت هەرچەند حکوومەت هەموو لایەنگیرەکانی خۆی گەیاندە سندووقی هەڵبژاردن. بە تەلەفۆن زاندرا کە لە تەقتەقیش حکوومەت بەزیوە ئیتر زانیمان گرەومان بردۆتەوە... هەناسەیەکی حەسانەوەمان هەڵکێشا. لە بیرمە، میرزای حاجی کەریم کە یەکێک بوو لە قسە خۆشەکانی ئەوسا گوتی ئەرێ فلانە کەس کوا خواردنێک، پلاو و گۆشتێک ئاخر ئەو عالەمە بە تۆوە خەریکە... قسەکەی حەق بوو بەڵام ڕاستییەکەی بیرم بۆ ئەو لایەنە ببڕای ببڕای نەچووبوو، قەتیش تەبیاتی من و ماڵەکەمان ئەوە نەبووە بە سەرکەوتن و دەرکەوتن ڕوحپەرەیی بمان گرێ تا ئەوەی کە دەڵێم لە هیچ ڕێکەوتێکی ئەوتۆییدا دەنگی هەلهەلە لە ماڵی ئێمە بەرز نەبۆتەوە. خواردنەکەی نامەوجوودی ئەو شەوە بوو بە هی شەوی دواتر کە ئەوسا ئاکامی هەموو ناوچەکانی هەڵبژاردن ئاشکرا بووبوو. حکوومەت لە 700 دەنگی پتر وەرگرتبوو ئێمەش لە 2000 دەنگ پتر. خەڵق گوێی لە ڕادیۆ دەگرت بۆ بیستنی نەتیجەی هەڵبژاردنی کۆیێ، دوای دوو شەو ئنجا ڕادیۆ باسی کرد...

جوانترین بروسکەی پیرۆز بایی ئەوە بوو لە برایمی عەزیزاغای دزەیی، برای حاکم جەوهەر و هاوڕێی خوێندنی سانەویم وەرگرت کە بریتی بوو لە دوو وشەی «پیرۆزمان بێت».

ڕۆژی دواتر پاش عەسر بوو ئۆتۆمۆبیل پەیدا بوو، لەگەڵ عەلی عەبدوڵا و جەلال تاڵەبانیدا بەڕێ کەوتین بۆ هەولێر. سەعات هەشتی شەو لە هەورازە نەفت سەرکەوتین ئۆتۆمۆبیل لە قوڕ چەقی، هەتا سەعات دە خەریکی قوڕ دەردان بووین ئنجا بۆ مان دەرهات بەڵام بێوەخران و یەکسەر شکا و پەکی کەوت. خۆزی لە هەوەڵەوە دەشکا... بە پێیان بەو سەرمایە و قوڕە و تاریکییە کوتامان، پاش حەفت سەعات ڕۆیشتن، گەیشتینە هەولێر...40 دیدەنی موتەسەڕیفم کرد بێوەخران لە کەرکووکەوە بە ڕێی ئاسن چوومە بەغدا. مەلا حەوێزاغا ڕەخنەی لە هەڵبژاردنم گرتبوو بەڵام گوێی نەدرایێ. جەنابم بووم بە نایب، خەبەری چەندوچۆنی دەرچوونم بە ناو خەڵقدا بڵاو بووبۆوە، هەستم دەکرد بە ڕێزەوە سەیرم دەکەن...

لێرەدا دەستخاوێنیی مێژوویی لێم داوا دەکات شتێک لە چەندوچۆنی هەڵبژاردنەکە ڕوون بکەمەوە درەبارەی هەڵوەستی کاکە زیادی حەماغا لەو هەڵبژارادنەدا. کاکە زیاد خاوەن دەسەڵات بوو بەتایبەتی لە دەرەوەی شار، خۆ لە ناو شاریشدا بێهێز نەبوو هەرچەند هێزی خوێندەوار و گەنج و چەپ و هەندێ لە ناحەزەکانی دەیانتوانی شتێک بکەن کە لە دەشتودەر نەدەکرا. جگە لە پایەی حیزبایەتیی خۆی و دەستەڵاتە ئاشکراکەی، حکوومەتیش تاڕادەیەکی هەڵکشاو لێی دەسەلماند. ئەگەر خۆی لە بەرەی پارتی دوور خستبایەوە بێ ئەوەی دوژمنایەتیشی بکات زۆری لێ دادەلەنگاند خۆ ئەگەر دژ بە پارتی بوایە دەرچوونی نوێنەرەکەی پارتی لە زەحمەت زەحمەتتر بوو بگرە نامومکین بوو. حکوومەت بۆ پشتیوانی کردن لە محەمەد عەلی مەحموود (مەشووە بوو بە محەمەد عەلی ئالتی) بە هەویا بوو یارمەتی بدرێ لە کاکە زیادەوە بەڵام تەکلیفی حکوومەت و محەمەد عەلیشی هەڵنەگرتەوە لە تەک بڕیاری حیزبدا. دواتر محەمەد عەلی لای خۆم گلەیی لە ئاست کاکە زیاد دەربڕی کە لە تەنگانەدا پشتی تێکرد گۆیا بەڵێنی لێ وەرگرتبێ کە بۆ نیابەتی کۆیێ

40- کاتێک گەییشتینە هەولێر مەلا بانگدان بوو. لە ڕێگا دڵی خۆمان بەوە خۆش دەکرد کە بەیانیان هەندێ چێشتخانە گیپە لێ دەنێن بۆ ئەو کەسانەی زوو دەڕۆن بۆ سەر کاسبییەکەیان. ئیتر بەو ئومێدە گەشەوە لەو ئۆتێلەی لێی دابەزیبووین خێرا بۆیەکەمان نارد بۆ گیپەی تامەزرۆیان. کە هاتەوە، ماڵی ئاوابێ چەند کوببەیەکی هێنابۆوە تومەز گیپە ئەو بەیانییە لێ نەندرابوو.

پشتگیری لێ کردبێت، لە ئاست ئەمەدا کاکە زیاد دەڵێ لە هەڵبژاردنی ئەو جارەدا بەڵێنم بە کەس نەداوە قسەکەشی لەگەڵ داخوازی حاڵوباری خۆی و کۆیەش یەکدی دەگرنەوە چونکە حیزبیش لە نێواندا نەبێ نیابەتەکە بە خۆی ڕەواتر بوو. خۆ نیابەت قوماشی جلک و ماست و پەنیری کوردی نییە وەها بە ڕەهایی و بێباکانە بکرێتە دیاری. حکوومەت کۆیەی دانابوو بە «دائرة مقفلة» بۆ کاکە زیاد ئیتر بۆچی لە لاوە دۆست و برادەری دوورەدەست تەراتێنەی تێدا بکات! پیاو دڵی نایێ وڵاغێکی باشی لێ بخوازرێتەوە چ جایی پایەیەکی وەها بە شکۆ.

کاکە زیاد و مەحموودی کوڕە گەورەی بە نامەی دوورەپارێزیی ڕواڵەتی دوو ڕۆژ پێش هەڵبژاردن چوونە هەولێر بەڵام کوڕی دووەمی کاکە عەبدولقادر، بە درێژایی کات لە گەڵماندا بوو، بە زۆریش لەگەڵ مندا، پەیتاپەیتاش ڕای دەسپارد بۆ ناو ئەهلی دەشتودەر کە دەنگیان بە من بدەن. لەو هەڵبژاردنەدا بایی سەری دەرزی گلەیی لە کاکە زیاد ناکرێ بەڵکوو بە پێچەوانەوە دەبێ هەڵوەستە باشەکەی و خۆ لەبیر کردنەکەی بە تەواوی بنرخێندرێ. لە موناسەبەدا دەبێ بڵێم من کە بووم بە حاکم، ئەوەبوو کاکە زیاد ڕووی تەکلیفی لە وەزیری عەدلی ئەوسا، جەمال بابان، نا، ئەویش بێ دوودڵی مەرسوومی دامەزراندنمی دەرچواند. من لەوەدا بایی تۆسکاڵێک خەریک نەبووم، ئنجا ئەگەر دوابەدوای هەڵبژاردنەکەی ساڵی 1953 گلەییەک لەو یا لە حیزب یا لە من کرابێ پێوەندی بەو هەڵبژاردنەوە نییە.

کەس ئاگای لە دەردی کەس نییە، کە لە کۆیە و لە سلێمانی دابڕام و ژیانم کەوتە بەغدا سێ مەسرەفم بە ملدا هات. ماڵەکەی کۆیەم و هینەکەی سلێمانیم و خۆیشم لە بەغدا. گوریس بەیەک لایی نەدەگەیشتەوە ئەمجارە بە سێ لایی. مانگانەی نایبان ئەو ساڵە 60 دینار بوو بەشی مەسرەفی خۆمی نەدەکرد چونکە ئەرک لێی زیاد بوو. قوتابی و نایب بۆ لایەنی مەسرەف ناچنە دەستەی تەرازوویەکەوە. لە ڕووی ناچارییەوە کە دەبوو بژێو بۆ ئەو سێ قۆناغە پەیدا بکەم چوم بۆ لای شێخ حەسەن و شێخ حسێن... ئەو سەفەرەم کەوتە باران و تۆفێکی بەردەوام مانگێکی لەو ناوە هێشتمەوە.

بەهەمەحاڵ گرفتی لایەنی مەسرەفم لەو دوو خاڵەوە چارە کرا و هاتمەوە بەغدا. حیزب نەیدەزانی باری ئابووریم چۆنە، نامەی گلەیی بۆم ناردم لەسەر بێچالاکیم، هەقیشی بوو منیش عوزرم بە دەستەوە بوو بۆ دڵدانەوە سەردانێکی محەمەد عەلی

مەحموودم کرد، خوالێخۆشبووان ئەحمەدی حەمەد ئەميناغای دزەيی و سەمەدی حاجی محەمەدی بەنناشم لەگەڵدا بوون. عوزرم بۆ هێنایەوە کە لە ئیمکاندا نەبوو داخوازییەکەی بە هەڵبژاردنی، جێبەجێ بکەین. ئەو گلەيی دەبردەوە سەر کاکە زیاد و دەیگوت ویستبای دەیکردم بە نایب. لە ئاست ئەو هەموو خۆ لە قەبەڵ کردنەی بۆ یارمەتیی لە کاکە زیادەوە، قسەیەکی قورسم کرد کە لێرەدا دووپاتی ناکەمەوە... دواتر قسەکە تەئویلی خراپی لێ درایەوە بەڵام لەلایەن خۆمەوە ئێستاش حورمەتی ئەو قسەیەم دەگرم.

یەکەم گوتار لە مەجیلسی نوێنەران دوای گەڕانەوەم لە سەفەری ڕانیە و سندۆڵان لەسەر «تووتن» بوو. ڕێکەوتێکی زۆر لەبار بوو بۆ من کە بابەتێک جێگەی قسە لێوە کردن بێت هەم شارەزای بم و هەم پەرۆشدار. بە زاری خۆم نەڵێم ئەو گوتارەم نۆبەرەیەک بوو هەرگیز بە تەمای شتی ئەوتۆ نەبووم، مەجلیسیش بە حکوومەت و نایبی حکوومەت و موعاریزەوە چاویان تێبڕیم و گوێیان بۆ هەڵخستم بێ ورتە و سرکە و کورکە هەتا دوای توول و تەفسیلێکی بێگرفتی ڕەوانی ئازای گەرموگوڕ، لەلایەن زمانیشەوە عەرەبییەکی وەهام بۆ هات سەد ماشەڵای بۆ لێ دەی... پتر لە سی نایبی حکوومەت دوای هەڵستانی مەجلیس موبارەکبادییان لێ کردم. موعاریزەکان پێوەم گەشانەوە، بیستم تەلەفۆنیان بۆ برادەرانیان کردبوو لە دەرەوەی مەجلیس گوتووبیان «کسبنا نائب معارض قوي...».

ئێستا لە چاوم نەقشبەستوو بووە کە لە دەمی کرانەوەی قسەکانم چاوم هەندێ کەس و شتی بەدی دەکرد، لەو کەسانە ڕووی مەرحووم شێخ ڕەزا ئەلشەبیبی (رضا الشبيبي) کە بە درێژایی دوانم ڕووی بۆ وەرگێڕابووم وەک تەماشای برازایەکی خۆی بکات وەهای دەنۆڕیمێ... هەڵبەت گوتارەکەم بێ نووسین و بێ ئامادە کردن بوو دەنا نە ئەو دەنگەی دەبوو نە پێشم دەکرا بە نووسین ئەو هەموو قسانە بخەمە گوتارێک کە هەر یەک چارەک سەعات بخایەنێ چونکە نەدەبوو نووسراو لەوەندە کاتە پتر بەردەوام بێت. گوتاری بێ کاغەز بێسنوور بوو.

خوێنەر با لێم گەڕێ نەختێک بە شان و باڵی خۆمدا هەڵبێم. وەک کە دەگوترێ جارێکیان خەلیفەی بەغدا سەردانی بەسرەی کرد، لەو خەڵقەی پێشوازیی لێ کردبوو سوارێک وڵاغی دەهێنا و دەبرد و دەیگوت «نعم القاضي قاضينا- قازیمان

باشترین قازییە»، خەلیفە پرسی ئەم کابرایە کێیە هێندە لە قازی ڕازییە، گوتیان قازی خۆیەتی...

ڕووداوێکی بچووکی نامەردانەی ئەو ڕۆژانە دەگێڕمەوە کە ڕووناکی دەیەختە سەر دڵ و دەروونی ئەو خەڵقەی لە کانیاوی پاکیان نەخواردۆتەوە، مدیرەی قوتابخانەیەکی کچانی کۆیێ ناسیاوی خوشکەکانم بوو، بە بۆنەی هەڵبژاردنم شەکر و چوکلاتی بەم و بەو دابوو... شەوێک لە شەوانی پاش هەڵبژاردن لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە کە بەسەر کۆڵانەوە بوو گوللەیان لە کەللەی سەری گرت بەڵام بە سەرینی ژێر سەری کەوت. حکوومەت لە جیاتی تۆڵەی بۆ بستێنێ نەقڵی کرد بۆ ڕەواندز. شارەزایانی سیاسەت لە وەزارەتی مەعاریف پێیان گوتم بۆی بە دەنگ نەیەم چاکترە نەکا قۆرتی گەورەتری بۆ هەڵبکەنن...

تەجرەبەیەک هاتە پێش، تێی گەیاندم دەستەی حکوومەت چ حیسابێکی بۆ موعارزبوونی من دەکەن. کێشەیەک کەوتە نێوان موعارەزە و حکوومەت لەسەر هەرای قوتابیی کۆلێجەکان کە ئێستا چۆنایەتی و چەندایەتییەکەی بە ڕوونی بیر ناکەمەوە. موعارەزە لەو کێشەیەدا قورسترین کەرەستەی تەنگەتاو کردنی حکوومەتی بەکارهێنا پێی دەگوترا «إستیضاح» بریتی بوو لە پرسیارێکی تفت لەلایەن پێنج نایبەوە ئیمزا کرابێت، تا ئەگەر حکوومەت نەیتوانی وەڵامێکی دڵنیاکەر بداتەوە دەبێ ئیستیقالە بدات.

لە شتی ئاساندا تاکە نایب «پرسیار» ئاڕاستەی تاکە وەزیر دەکا. لەمیاندا پرسیا ئاڕاستەی هەموو حکوومەت دەکرێت. من یەکێک بووم لەو پێنج نایبە، تەنها نایبێکی کوردیش بووم لە موعارەزەدا. چەند ڕۆژێک مەودا هەبوو بۆ لێکۆڵینەوە لەو پرسیارە. بە درێژایی ئەو ڕۆژانە ڕاسپاردەی حکوومەت خەریکم بوو ئیقناعم بکەن ئیمزاکەم بکێشمەوە، لە پاداشدا چ خزمەتێکی لە ئیمکاندا بێت بۆمی ڕاپەڕێنن. تەنانەت بە شێوەیەکی مەیلەو ئاشکرا تێیان دەگەیاندم کە خزمەتی کورد، بەتایبەتی، لە ڕێگەی ناوەندەوە دەبێت نەک پەرگیری دژی حکوومەت، نایبەکانی دیکە هەموو عەرەبن لە جینسی حکوومەتن... من گوێم نەدایە ئەوان قسانە. جەمیل ئوورفەلی کە نایبی یەکەمی سەرۆکی مەجلیس بوو، بە پەرۆشەوە، منی جودا کردەوە، هەردوومان لە ژوورێکی مەجلیس چەندین کات وتووێژی دوولایی و هەمەلاییمان کرد بەڵکوو ئیقناع بم واز لە «إستیضاح» بهێنم. دوایین تکای ئەوەبوو

گوتی، کە هەر ڕازی نیت ئیمزات بکێشیتەوە هەر نەبێ ڕۆژی ئیستیزاحەکە مەیە مەجلیس. ئەمەشم نەسەلماند، کە ئەگەر بە پێوانەی بەرژەوەندی کورد لێکدانەوە کرابایە ئەشەدوبیللا ئەو هەموو پێشنیاز و شاباشەی کە سوودی گشتیی خەلقە بەستەزمانەکەی تێدا بوو دە جاران ئەوەی دەهێنا من لە سوارچاکیی خۆم بەردەوام بم. حیسابی لێقەوماوی عەبابەیلێ و شەرانش یەکجار جودایە لە حیسابی ناخیبەکانی ئەلساس و لۆرێن و مانچستەر... بەڵام لە خۆمەوە نەمدەتوانی هەنگاوێکی خۆبەسەر بهاوێژم لە مەسەلەیەکی گشتی بۆ سوودێکی ناوچەیی کە دەزانین بە حیسابی ڕواڵەتی، «شارع ئەبوو نەواس» و دەقنەکانی بیتوێن یەک شتن. دوو سەعات قوڕدەردانی هێنایە دەرێ ئۆتۆمۆبیل و حەفت سەعات پیادەیی بە شەوی زستانە لە ڕێگایەکی نێوان کۆیە و هەولێر کەوا 25 ساڵ بوو پێوەی دەمان ناڵاند نابێ و نابێ تێکەڵ بە ئامانجە گەشەکەی بزۆزیی قوتابییەکانمان بکرێت! سەرت نەیەشێنم ئیستیزاحەکە چووە پێش بە چەند قسەیەک لەم نایب و لەو وەزیر پێچرایەوە و چوو بۆ تۆمارخانە و گەنجینەی مێژوو...

بە دوای ئەو دوانە نۆبەرەیەم لەسەر «انحصار - تووتن» زنجیرە گوتارێکی پازدە ئاڵقەییم لەسەر نووسی، ڕۆژنامەکەی سادق ئەلبەسام (صادق البصام) «الدفاع» بڵاوی دەکردنەوە. ئەم گوتارانە بە ئەنتیکەیی دەنگیان دایەوە. هێشتان بە ڕێوە بووم بگێڕی گشتیی ئینحساریان لادا و ڕۆحێکی تازە کەوتە بەر کاروباری دایەرەکە. مەجلیسی ئیدارەی ئینحساریش سێ ئەندامی تێدا بوون (تۆفیق قەزاز، کاکە زیاد، ڕشید عارف) ئاڵای موعارەزەیان هەڵکردبوو دژی تەنگەتاو کردنی وەزیر و دەوڵەمەند کردنی خاوەنانی فابریقەی جگەرە. لەو گوتارانەم ژمارە دەیان ژووررووی هەموانەوە بوو تەنانەت ڕۆژی دەرچوونی کە چوومە مەجلیس نایبی مووسڵ نەجیب ئەلسائیغ (نجیب الصائغ) کەوا بەڕاستی و بێفێڵ دۆستی یەکتر و هاوباوەڕیش بووین لە سیاسەتی بەرفرەوان پێمی گوت، دەڵێن نووسینی ئەمڕۆکەت «خطیر»، وشەی «خطیر»ی بۆ بەکارهێنا نەک «مهم». خۆی نەیدیتبوو. لە دوو معاون شوورتەی کوردم زانی کە لە لیوای مووسڵ، نزیک حدوودەوە، کاریان دەکرد گوتیان دانەیەکی ئەو جەریدەیەمان کڕی بە 250 فلس، جەریدە ئەوسا بە دە فلس بوو.

ئەو گوتارەم بریتی بوو لە بەگژدا چوونەوەی ئەو سیاسەتە بێڕەحم و بێکەرامەتە کە لە پاش ڕمانی جمهوریەتی مەهاباد لەگەڵ تووتنەوانان کرا، زیاتریش لەوەدا بە

سفتوسۆ بوو کە بە جۆرێکی ئانقەست بڕیە مێشکمانەوە کە خێر و خۆشی هەر لە دەست ئینگلیزدایە.

پێویسیت بوو بڵێم، دوای کۆبوونەوەی مەجلیس فەریق نوورەددین مەحموود ئیستیقالەی دا و جەمیل مەدەفەعی وەزارەتی نوێی دامەزراند. «نووری سەعید» خۆی کرد بە وەزیری دیفاع هەرچەند زۆرینەی نوێنەران سەربە حیزبەکەی خۆی (الاتحاد الدستوري) بوون و هەرچی دەستەڵاتێک هەبوو لە دەست ئەو و «عەبدولئیلاهـ»دا بوو، ڕەنگە لەو دەمانەدا دەسەڵاتی نووری سەعید ڕاشکاوتر بووبێت. نەختێک بە درەنگەوە واتە چەند مانگێک دوای بوونم بە نایب و ناسرانم لە لای خەڵقەی گوێ لە قسە ڕادەگرێت و چاو لە نووسراو دەبڕێت ئنجا وەها گونجا کە سەردانی نوورەددین مەحموود بکەم. لەو سەردانەدا باسی هەڵبژاردنەکەی کوێیمان هێنایە پێش. من گوتم نەمانزانی بۆچی حکوومەتی کۆیە و هەولێر لە شەڕ پێ فرۆشتنەوە بای دایەوە لای دڵ ڕاگرتنمان پاش ئەوەی کە سندووقەکان شکێنران ئێمە هیچ ئومێدێکمان بە هەڵبژاردنی سەلامەت نەمابوو چ جایی سەرکەوتوو. نوورەددین مەحموود، هەزار ڕەحمەت لە یادی بێت، گوتی سەعید قەزاز بە تەلەفۆن خەبەری دامێ کە هەرا لە کۆیە قەوماوە، موتەسەڕیف لە سەر تەلەفۆنە دەڵێ ئەگەر ئارزۆ بکەن دەتوانین ئینتیخابەکە دوا بخەین وەیا لەغووی بکەین دەنا مەسعوود محەمەد دەردەچێت. گوتی من لە خوام دەخواست کەسانێک لەو مورەشەحانە هەبن گیانی ئەوتۆیان هەبێت حکوومەتە تەقلیدییەکە حەزی لێ نەکات. من تۆم نەدەناسی بەڵام لەو قسانەڕا زانیم گیانت پاکە ئیتر بە سەعید قەزاز-م گوت، موتەسەڕیف دەخلی نەبێ بەسەر ئینتیخابەوە لێ بگەڕێ کێ دەردەچێ با دەرچێ، بزانم تەدەخول دەکات هەر ئێستە لە موتەسەڕیفایەتی دەکێشمەوە. تومەز ئەو مەتەڵەی ڕۆژەکەی ئینتیخاب لە کۆیێ کە بە کەس هەڵنەدەهات ئەم بڕیارەی نوورەددین مەحموود بوو.

لە نوورەددین مەحموود-م پرسی، تۆ کە هەرچی دەسەڵات هەبوو لە دەستتدا بوو بۆچی کەسانێکت نەهێنایە پێش جودا بن لەو نائیبە تەقلیدییانەی کە بە زۆری هەر دەستی «موافق» هەڵدەبڕن. گوتی: برالە من مرۆیەکی عەسکەریم لە سیاسەت بەڵەد نیم، شارەزای خەڵقیش نیم، ئەوە بوو بەڕێکەوت تۆ پەیدا بوویت، پێشم خۆش بوو مەحموود بابان خۆی تەرشیح کردووە... قسەمان لەوەندە بڕایەوە کە پێوەندی

بە هەڵبژاردنەوە هەبوو، هەڵبەت دەبوو لە سەرەتاوە بڕیاری لەسەر هەڵبژاردنێک دابایە هێندەی ئازادی تێدابێت گۆڕانێک لە باری سیاسییەوە بهێنێتە دی. ئەوساش دووبەختی دەبوو، یان لەبەر ناچاری و ئاژاوەیی «دەسەڵاتی باڵا» پەسەندی دەکرد یان ڕەتی دەکردەوە لە ئیتر هەر هێندە دەمایەوە یەکێکی دی ببێتە سەرەک وەزیران...

نیابەتەکەم بێکەڵک نەبوو، لە سنووری دەستەڵات چی پێم کرا بە زمان و نووسین کردم. بێگومان بە بەرمەوە هەبوو پتر بکەم بەڵام چ پێویست بەوە نییە من یان تۆ خەریک بین لافی پاڵەوانەتی لێ بدەین. جیهانەکە لەوەی پتر هەڵنەدەگرت کە کردم.

لێرەدا تەجرەبەیەکی بچووکی ئەو ڕۆژانە دەخەمە بەرچاوی خوێنەرەوە: من لە چەند لیژنەیەک ئەندام بووم. وابزانم کۆبوونەوەی لیژنەی مالیە بوو، دەوری سی نائیبێک و شەش- حەفت وەزیر بەشداری یەک لە کۆبوونەوەکانی ڕۆژێک لە ڕۆژانی ئاخروئۆخری بەهار بوون. مەسەلەیەکی گرینگ هێنرایە ناو پرۆگرامی کۆبوونەوەکە بریتی بوو لە چاوگێڕانەوەیەک لە پەیمانی نێوان عێراق و بەریتانیا بە ئومێدی گۆڕانکارییەکی بەلای چاکەی عێراقدا تێیدا بکرێت... قسەی هەمەجۆری تێدا کرا. منیش بە دەنگ هاتم و خۆشامەدیم لەو کارە کرد بەڵام گوتم: بە مەرجێک ئەو تاکتیکە نەکشێتەوە بۆ لای ئەوەی لە ئاکامدا قومێکی تاڵتر لە موعاهەدەی کۆن بچێتە ئەوەکی گەلی عیراق. ڕاستییەکەی قسەکانم بڕندە بوون تا ئەوەی نائیبێکی دیکەی کورد دوای کۆبوونەوەکە گوتبووی: فلانەکەس لە بنی کدوولەی دا... خەلیل کەننە وەزیری زانست (معاریف) بوو، داوای قسەی کرد. زۆر لە سەرخۆ و بە قسەی پێوانە و کێشانەدار ڕای نواند کە مەسئوولییەتی نوێنەر لە هی وەزیر کەمتر نییە... دەبێ هەمیشە ئاگادار بین لە جغزی «اخلاص» بۆ عەرش و بۆ یەکیەتیی عێراق دەرنەچین لەوەی دەیڵێین و دەیکەین. من و «ذيبان الغبان» و «عبدالرزاق الشيخلي» داوای قسەمان کرد، بەڵام ئەحمەد موختار بابان نۆرەی لێ بڕینەوە و داوای قسەی کرد. بەپێی مەنهەجی داخلی مەجلیس کە وەزیر داوای قسەی کرد نۆرەی دەدرێتێ، ئەحمەد موختار بابان لە تەنیشت من دانیشتبوو، خەلیل کەننە بەلای دەستە ڕاستیدا بوو، ڕەحمەت لە گۆڕی بێ، ئەحمەد موختار پشتیوانییەکی وەهای کردم خەلیل کەننە خۆی نەگرت کورسییەکەی لە ڕیزی دانیشتوان

کێشایەوە بۆ بن دیواری پشتمانەوە. ئەحمەد موختار گوتی: فڵانە کەس مرۆیەکی ناسراوە بە نیشتمانپەروەری و ئاگاداری نەک خۆی، من باوک و باپیرانیشی دەناسم کە لە سەر ڕێی حەق ڕۆیشوون. چی گوتی لە نیازی پاکەوە و لە پەرۆشی بەرژەوەندی خاک و میللەتی عیراقەوەی گوت... و ئیتر لەو بابەتە... کە لە قسەکانی بۆوە نۆرەی من هات، سەرۆکی لیژنەکە گوتی: کات بەسەر چوو، کۆبوونەوە خرایە ڕۆژێکی دیکە، مەبەستیش ئاو بە ئاگردا بکات چونکە بێگومان ئەو سێ نائیبە [عبدالرزاق و ذیبان و من] هەرایەکی زلیان بەرپا دەکرد.

«ذیبان الغبان» لەوانە بوو جارێکیان لە مەجلیس لەسەر بیروڕا لەگەڵ وەزیرێک بە دەمەقاڵە هاتبوو، تێروپڕی لێ دابوو. عەبدالرزاق الشیخلي بارەها لە ڕیزی موعاریزانەوە دەستی بەرز دەکردەوە ڕووەو ڕیزی سەرەک وەزیر و وەزیرەکان پەنجەی هەڕەشەی هەڵدەسووڕاند و دەیگوت: «انتم کلکم مصیرکم الشنق - ئێوە هەمووتان ئاکامتان پەتی خنکاندنە».

پشتگیری کردنی ئەحمەد موختار لە من دژی وەزیرێکی هاوڕێی خۆی هاوتای ئەو هەڵوەستە مەردانەیە بوو کە بەر لە ساڵێک کاکە حەمەد خانەقای پێ ڕزگار کرد لە گیروگرفتی هەرای سەربە «یانەی سەرکەوتن».

ساڵی یەکەمی نیابەتم هەتا گەیشتینە پشووی هاوینە سێ هەڵوەستم لە مەجلیس و یەک هەڵکەوت لە دەرەوەی مەجلیس لەوانەبوون بە سەکۆی لەسەر ڕاوەستان بخوێندرێنەوە. هەڵوەستێکیم ئەوە بوو لە بارەی تووتنەوە کردم و گوتم و نووسیم. هەڵوەستی دووەمم دوانێکی گرنگم بوو لە مەجلیس بۆ گێڕانەوەی عەشرەتی بارزان بەرەو شوێنی خۆیان و بەردانی ئەو حەبسە کوردانەی لە 1946-1947 ەوە لەگەڵ سەرۆکانی ئەو عەشرەتە گیرابوون. ئەو ڕۆژەی دوانەکەم دا لە مەجلیس بوو بە ڕۆژێکی دیار و ئاشکرا. لە دەورەی سێزدەمینی پەرلەمان کە منی تێدا بووم بە نایب لایحەی قانوونێک خرایە لێ دوانەوە بۆ پێچانەوەی ڕووپەڕەی مایسی 1941، شۆڕشی ڕەشید عالی، بە خۆشبوون لەوانەی تێیدا بەشدار بوون و دانەوەی «اعتبار» بە مەحکوومەکان... موعارەزە بە گەرمی پێشوازی لێ کرد. منیش کە دەستم کرد بە قسە ڕەزامەندیی بێپایانم لێ دەربڕی بەڵام گوتم کوردیش مەسەلەیەکی ئەوتۆیی هەیە چاوەڕوانە حکوومەت بۆی چارەسەر بکات. سەرۆکی کۆبوونەوەی ئەو ڕۆژە (وام لە بیرە جەمیل ئوورفەلی بوو) دەنگی هەڵبری گوتی «ارجو عدم الخروج عن

الصدد- تکا دەکەم لە بابەت دەرمەچۆ». نایبە موعاریزەکان بە توندی دەستیان لە مێزی بەردەمیان دا و دەنگیان بەرزکردەوە «استمر. استمر- بەردەوام بە». من گوتم لە بابەت دەرنەچووم، حاڵەتێک بە حاڵەتێکی وەکوو خۆی دەگرم. مەجلیسیش با بڕیار بدات ئایا لە «صدد» دەرچووم یان نا. سەرۆکی جەلسە لە نێوان هەرای موعاریزان و بەدی نەکردنی ڕای حکوومەت نەختێک بێچار مایەوە و بۆ چەند ترووکەیەک نەیزانی چ بکات (منیش بامایە هەروەها دەبووم). چاوم لێ بوو سەرەک وەزیران و نووری سەعید لە سەرۆکی مەجلیسیان گەیاند ڕێ بدات قسەم تەواو بکەم، مەجلیس بە موعاریز و حکوومەتییەوە جۆشێک و بێئۆقرەیی پێوە دیار بوو هەتا سەرۆکی جەلسەکە دوای دیتنی هێمای نووری سەعید و جەمیل مەدفەعی پێی گوتم «استمر». دوای من چوار نایبی موعاریز یەک لە دوا یەک پشتگیرییەکی زێدە بە هێزیان لێ کردم، لە مانە دوویان «رفائيل بطي» و «عارف قەفتان» بوون، دووەکەی دیکەش وەک دێتەوە بەر چاوی زەینم «عبدالرزاق الشيخلي» و «ذيبان الغبان» بوون ڕەحمەت لە ناو و یادی هەر چواریان. سبەینێ «صحافة» سەرلەبەری بە مانشێتی گەورە هەڵوەستی من و ئەو چوار نایبەیان لە ڕووپەڕەی یەکەم چەسپ کردبوو.

مەرحووم عارف قەفتان لەحەدبەدەر خۆشی دەویستم، خۆی بە ساڵادا چووبوو، وەزیفەی بەرزیشی دیتبوو، مەشووریش بوو بە ئازایی و جوامێری. ئەو ڕۆژە لە قسەکانیدا شتێکی پەندامێزی عامیانەی بە سەر زاریدا هات مەجلیسی سەرلەبەر، بە حکوومەت و نایب و تەماشاچیانەوە، خستە سەر قاقایەکی ئەوتۆ ڕەنگە لەوە پێشتر ڕووی نەدابێت. گوتی: ئەرێ حکوومەت پێم نالێن بارزان چی کردووە؟ «قابل هذوله خروا بجدر الحكومة - دەشێ ئەوانە گوویان لە مەنجەڵی حکوومەت کردبێت؟» دەگێڕنەوە بەر لە چەند ساڵێک نائیبێکی ئەوسا کە لە هەڵکەوتێکی دەگمەندا کرابوو بە نائیب شکاتی خۆی دژی نائیبێکی دیکەی هێنابووە لای عارف قەفتان، گوتبووی: «عارف بیگ تقبل فلان يگول لی گ...؟» عارف گوتبووی: ئنجا ئەگەر تۆ گ... نەبی ئەدی کێ گەوادی بکات؟

وەی کە خۆشە ببینیت، وەک کە ئەو ڕۆژە من دەمدیت، خورپەی دڵت لە دڵی واقیعی میللەتت دەنگ بداتەوە. گەلێک سپاسنامەی ئەو حەپسانەم بۆ هات کە چەند ساڵێک بوو، 5-6 ساڵ، لە بەندیخانە بەسەریان دەبرد. وەهابی حەمە

عەلیاغای ڕەواندز کە ناسیاوم بوو زۆر بە دڵ و بە کوڵ بۆی نووسیم، منیش وەڵامم دایەوە و دڵنیام کرد کە کۆڵ نادەم لە بەدواکەوتنی مەسەلەکەیان، خۆیشی لە نامەدا وەهای داوا کردبوو لێم. نەختێکی دیکە بۆ ئەم باسە دێمەوە.

هەڵوەستی سێیەمم لە ئاست هەرای وەرزێرانی هەولێر و مەخموور بوو. کێشەکە وەک لە بیرمە سەری هەڵدا لە ئاکامی بەکارهێنانی تراکتۆر لەلایەن خاوەن موڵکی دزەییەوە کە دەیکێشایەوە بۆ ئەوەی هەر تراکتۆرێک چەند ماڵە وەرزێک پەک بیەخێت ئیتر ئەو وەرزێرانەی بەر لە 15-20 ساڵ شایەدیی مڵکایەتییان دەدا بۆ خاوەنەکانیان ڕاست بوونەوە دژی تراکتۆر.

لێرەدا پێویستە بگوترێ، لەو ساڵەدا بیری چینایەتی کەوتبووە مێشکی وەرزێری ئەو هەرێمە کە ئەگەر لە دەمی تەسویەی زەویدا ئەو بیرە بەخەبەر هاتبایە گەلێک فەلاح دەیتوانی زەویەکانی ژێر دەستی خۆی لەسەر خۆی تاپۆ بکات. هۆی بەخەبەر هاتنی چینایەتی لە دەشتی هەولێر و مەخموور کە لە بنەڕەتدا بۆ پەیدابوونی ڕێکخراوی ڕووەو چەپ دەچێتەوە دیسانەوە بەچکە ئاغاکان کە خۆیان بوونە چەپگیر، بەشێکیان نەک هەموویان، دەورێکی سەرەکییان هەبوو لە پێش خستنی ڕۆژی تێک هەڵقژان، دەنا دەبوو ئەو تێک هەڵقژانە لە دەوروبەری کەرکووک زووتر دەست پێ بکات. هەر چونکە لە کۆیە و ڕانیە و پژدەر و ڕەواندز تاقمێک نەبوو جێی ئەو بەچکە ئاغایانە بگرێتەوە بزووتنەوەی فەلاح دژی خاوەن زەوی وەخرا. تەسویەی کۆیە و ڕانیە و ڕەواندز بێ هەرای چینایەتی تێپەڕی، بەڵام لە بەشێکی تەسویەی پژدەر سەری هەڵدا زۆر بەسەیری زەعیم ڕوکن عومەر عەلی کە موتەسەڕیفی سلێمانی بوو حەزی دەکرد ئاغاکانی پژدەر بە دەست وەرزێرەوە زەبوون بن تا ئەوەی بابەکراغای سەلیماغا شکاتی خۆی لە عومەر عەلی بردە لای عەبدولئیلاھ. عومەر عەلی بەپێی نەخشەیەکی پێی سپێردرابوو خەریکی بێهێز کردنی ماڵی شێخ مەحموود و ئاغاکانی پژدەر بوو.

لێرەدا جێی خۆیەتی نەختێک ڕووناکی بخەمە سەر وردبینی و سیاسەتمەداریی پژدەریان. بابەکراغای سەلیماغا بۆی گێڕامەوە کە عومەر عەلی تینی بۆ هێنان و سەغڵەتی کردن، شکاتی خۆی دەباتە لای عەبدولئیلاھ لە بەغدا. پێی دەڵێ: جەنابی وەسی من و پژدەری لەو سەرهەدە بە مەسرەفی خۆمان و ئەرک و سیلاحی خۆمان خزمەتی وڵاتەکەت بۆ دەکەین و هێمنایی تێدا ڕادەگرین و حدوودانت لە بۆ پاس

دەکەین. عومەر عەلی هاتووە دەیەوێ بێمڵکمان بکات و هێزمان پێ نەهێڵێ. ئنجا کە نانمان بڕا دێین لە بەغدا سواری ملّکەکانی تۆ دەبین و خۆی پێ بەخێو دەکەین، ئەوی دەمیش فلسێکت بۆ ناکەین. کە قسەکانی دەگێڕاوە لە پێشدا گوتی: خۆم لە وەسی گێل کرد... کەچی کۆمەڵە سیاسییەک، دوای تێفکرین، ڕاوێژ ڕێک بیەخن هێندەی ئەو «خۆ گێل کردنە» ڕێ بەدێیی ناکەن.

من لە مەجلیس دوانێکی پڕ بە پێستی ئەو هەرایەم دا، هەتا بشڵێی حکوومەت پێی سەغڵەت بوو لە ترسی ئەوەی کە هەرای وەزێر بە هۆی باس لێوەکردنی پەرلەمان ڕەنگە بتەنێتەوە چونکە چی لەو ئەنجومەنە دەگوترێ لەلایەن نایبێکەوە هەم هێزی پترە لە نووسینی عادەتی- نایب حەسانەی هەبوو دەیتوانی هەموو شتێک بڵێ لە سنووری قانوون و (نظام داخلي) پەرلەمان - هەم بە ڕەهاییش لە ڕۆژنامەکان بڵاودەبێتەوە.

ترسی حکوومەت لە قسەی نایب پتر بوو لەوەی نەشرەی نهێنی دەیترساند. بەداخەوە ئاغاکان زۆر لە گیانی سەدەی بیستەم دوور بوون و بە هەوای هەزار ساڵ لە خۆیان بە پێشەوە مامڵەتیان لەگەڵ دنیادا دەکرد. ئەو ڕقەی بەو دوانەم لێیان هەڵگرتم گەلێک زیادی کرد کە گوتارێکی بە هێزوپێز و داکوبابم لە ڕۆژنامەی «صادق البصام»دا لەسەر هەراکە بڵاو کردەوە و حکوومەتم بەرپرس دەکرد تێیدا لە دەربەدەربوونی هەزاران ماڵە فەلاح بە هۆی تراکتۆرەوە. وابزانم تراکتۆر بە فەرمانی حکوومەت ڕاگیرا.41

سەدان فەلاح ڕوویان تێکردم لە بەغدا، زۆریان لە بەندیخانە بوون کەوا بەداخەوە نەمدەتوانی هیچ یاریدەیەکیان بدەم. لێرەدا مێژووی ئەو بزووتنەوەیە تۆمار ناکەم، تەنها لە کولانەی نیابەتم کە هەنگاوێکە لە گەشتی ژیانم بۆی چووم. هەرا بەسەرچوو، چەرخوفەلەک وەک خۆی لە کاردا بوو.

---

41- هاوپۆلێکی حوقووقم لە وەزارەتی داخلیە «مدیر اوراق» وەیا شتێکی ئەوتۆیی بوو، ڕۆژنامەکانی دەخوێندەوە، چی گرنگی تێدا بایە سەربە «ادارە وامن» بێت خەتی لە ژێرەوە دەکێشا بۆ بەرچاوی وەزیری داخلیە. گوتی کە مەقالەکەتم خوێندەوە، هەر لە سەرەتا هەتا دوایین وشەی خەتی سوورم لە ژێریەوە کێشا.

هەڵکەوتەکە ئەوەبوو کە سەردانێکی نووری پاشا-م کرد. لە ئوتێلی تروکادیرۆی بەغدا دابەزیبووم، ژوورەکەم بەرەو ڕۆژاوا بەسەر تارمەی ئۆتێلەکە و زێی دەجلەیدا دەنۆڕی.

لە بەرەو کۆتایی بەهار ئێوارەیەک لە خەوی عەسرانە هەڵستام دیتم کۆمەڵەی شێخ حسێنی حاجی سەید و مەحموودی حاجی ڕەسووڵاغای پژدەر وا بە دەوری عەقیدێک (یاخود موقەدمێک) ەوە لە تارمەکە دانیشتوون. منیش چوومە لایان، زانیم عەقیدەکە مرافقی نووری پاشایە. لە قساندا دەرکەوت کە من بە گفتوگۆ لەگەڵ نووری پاشادا شناسیم نەبووە. گوترا بۆچی سەردانێکی نەکەم؟ گوتم کێ دەڵێ وەرم دەگرێت؟ عەقیدەکە (لە جەنابییەکان بوو) گوتی «فخامة الپاشا يرحب بک». گوتم ڕاستییەکەی حەز دەکەم بچمە لای، کێ بێ حەز بەوە نەکات؟

سبەینێ دوای نان خواردن عەقیدەکە بە تەلەفۆن پێی گوتم هەر ئێستا نووری پاشا چاوەنۆڕێت دەکات... کە چووم گەیشتمە لای نووری پاشا. زۆری بەخێر هێنام... دەوری سەعاتێک و پەنجاوپێنج دەقیقە قسەمان کرد... بەشێکی هەرە گرنگی وتووێژەکە هی ئەوە نییە لە بارودۆخی ئێستاکەدا باسی بکرێت.42 دوای ئەو بەشە

42- لە دەمی نووسینی «گەشتی ژیانم» و بڵاو کردنەوەی دەرفەت نەبوو هەموو قسەکانی نووری پاشا دەور و تەسلیم بکەمەوە بۆ خوێنەر. لێرەدا جێی خۆیەتی بۆیان بچمەوە و لە پەڕێکی کتێبی مێژووی چەسپ بکەم. هەڵبەت چی دەینووسم کاکڵی قسەکانە چونکە وتووێژمان لەو بابەتانەی هی بڵاوکردنەوە نەبوون بەلای کەمەوە سەعات و نیوێکی خایاند.

نووری پاشا دوای بەخێرهێنان و چایە و قاوە، کەوتە قسانەوە، لە وەزعی نیابەت و دووانەکانی نائیبە موعاریزەکانەوە بۆ بابەتی کە مەبەستی بوو ڕۆیی. کورتە و پاڵاوتەی قسەکەی ئەمە بوو کە گوتی: ئەم عێراقە کە پێک هات مەلیک فەیسەلی یەکەم زۆری پێوە خەریک بوو، ڕەنگە منیش دەستێکم هەبووبێت لە پێک هاتنی و هی دیکەش هەوڵیان دابێت بەڵام ئەوەی هۆی بنجیی دروستبوونی عێراق بوو بەرژەوەند و خواز و دەسەڵاتی ئینگلیزەکان بوو. بێ ئەوان و دژی ئارەزۆی ئەوان مومکین نەبوو عێراق بەسەر پێیانەوە ڕاوەستێت. سیاسەتێکی کە بۆ عێراق ڕەنگرێژ کرا تا ڕادەیەک لەنگەری بەرژەوەندی تیرە و تایەفە و ڕەگەزەکانی گەلی عێراقی

ڕاگرتووه. وابزانم ئەو سیاسەت و لەنگەر ڕاگرتنە بە نیسبەت کوردی عێراقەوە لەبارتر و سوودبەخشترە لەوەی کوردی ئێران وەیا تورکیا تێیدا دەژین. بەلای منەوە پاراستنی یەکیەتیی خاکی عیراق لە بەرژەوندی کورددایە. بەو پێیە و بەو تێڕوانینە ئارامی و خۆڕاگریی عێراق شتێکە لەگەڵ چاکەی کورددایە. ئنجا تۆ بەتایبەتی لە نێوان نائیبەکانی مەجلیس کە «جاي بذراعک - بە هەوڵی بازووی خۆت هاتوویت» و کەس ڕێی نییە ڕێنموونیت بکات و لە ئازادیی تەعبیرت مافی ئیعتیرازی هەبێت، هەتا قسەت لە بارەی سیاسەت ناوخۆیی عێراقەوە بێت هەرچی بیڵێیت و بەهەر ڕاوێژێک بدوێیت زەرەری بۆ کورد و بۆ عێراقیش نییە و مافێکی ڕەوای خۆتە. کە بێینە سەر باری دووان لە بارەی سیاسەتی دەرەوە کەوا دیسان دەڵێم کەس ناتوانێ ڕێت لێ بگرێ چونکە «جاي بذراعک» بەڵام تێبینییەک دێتە پێش لە نوختەنیگای چاکەی کورد خۆیەوە: چەندێکی بدوێیت و بە هەر ڕاوێژێکەوە بێت زەرەری نییە بە مەرجێک نەگاتە پلەیەک کە دەسەڵاتەکانی ڕۆژاوا لێتان بێئومێد بن کە دابینبوونتان لە چارچێوەی عیراق مومکینە، چونکە دوور مەبینە بتاندەنەوە بە تورکیا. مەسەلەی ولایەتی مووسڵ تا ئێستاکەش «قضية ساخنة» و تورک چاوی لێیەتی و لێی بێدەنگ نییە. عەرەبەکان پێتان دەڵێن «مانعيش بلياكم - بێ ئێوە ناژین» ڕاست ناکەن «عندهم من المحيط الى الخليج... عندهم تمر البصرة ونفط الزبير» - بە پێکەنینەوە ئەم ڕستەیەی دەربڕی.

ئەمە پاڵاوتەی قسەکانیەتی، ناوناوەش دووپاتی دەکردەوە کە مەبەستی بەیانی بەرژەوەندە بەپێی باوەڕی خۆی و لەلایەن مەسڵەحەتی کورد و عێراقەوە ئەگینا کەس ڕێی نییە قسە لە قسەتدا بکات.

لە وەرامدا، دوای سپاس بۆ ئەو سەراحەتە و بەهەند هەڵگرتنی نیابەتەکەی من لەلایەن ئەوەوە گوتم: فخامة الپاشا، پێم باوەڕ بفەرموو ئەگەر وەک قوتابییەکی زیرەکیشم حیساب بکەیت و ئەو ڕاستییانەم لەبەر چاوە. هەر لەبەر گرنگیی ئەو تێبینییانەی فەرمووتن و بە مەبەستی ڕاکێشانی نیگای حکوومەت بۆ لای حاڵوباری کورد من بە ڕاوێژێکی تیژ و بڕندە لە مەجلیس دەدوێم بەڵکوو حکوومەت گوێ بداتە بەرژەوەند و شعووری برینداری کورد (ڕەنگە تەعبیرەکەم بەو وشانە نەبووبێت بەڵام بەو مەعنایە بوو) فەخامەتت باش دەزانێت پەند و نەسیحەتی

ساردوسڕ تیماری دەرد ناکات، خاوەن بیروڕای ئەوتۆیی لە ناو کورددا هەن بەڵام ناتوانن دیفاع لەو بیروباوەڕە بکەن ئەگەر حکوومەت گوێ نەداتە دەرد و ئازاری خەڵقەکە. پێشم سەیرە حکوومەت هێندە بێپەروا بێت لە ئاست میللەتێکی بریندار وەک کورد کە وڵاتەکەی شاخاوییە و دروانسێیە لەگەڵ هەڵگرانی بیروباوەڕی ڕادیکاڵ و باشترین هەل بەدەستەوە دەدەن بۆ کەسانێک کە مەسڵەحەت لە پەرگیریدا دەبینن و نەرمونیانی بە خیانەت دادەنێن. کلیلی قفڵەکە لە دەست حکوومەتدایە.

ئەمانە کورتە و پاڵاوتەی وتووێژێکی سەعات و نیوی بوون. نووری پاشا دەیزانی من نوێنەری پارتیم لەو ڕوانگەوە کە پارتی هەڵگری دروشمەکانی کوردایەتی بوو (دەرکەوت) منی بە نوێنەری کورد حیساب دەکرد، وەک سەرەک وەزیرانێکی مێوانی عێراق بووبێت وەهای بەخێرهێنام، تەنانەت پاش سەعاتێک لە وتووێژمان مرافقەکەی هاتە ژوورەکە و گوتی فڵانە سەفیر لە مەوعیددا هاتووە چاوەنۆڕی دیدەنی فەخامەتتانە. من هەڵستام بۆ دوعاخوازی، داینیشاندمەوە، دەوری چل دەقیقەیەک چاوەڕوانی بە سەفیرەکە کرد تا لەگەڵ من قسە بە کۆتایی گەییشت.

لە بارەی مەسەلەی ڕێی کۆیێ و ڕانیەوە گوتم: فخامة الپاشا لە فایەلەکانی «مدیریەتی حەرەکات - مدیریة الحرکات»-ی وەزارەتی دیفاع تەقریرێک هەیە لەبارەی ئەو ڕێگەیەوە دەڵێ کردنەوەی ڕێگەی کۆیە و ڕانیە خەتەر پەیدا دەکا بۆ نەوتی کەرکووک. گوتی تۆ بڵێی شتی ئەوتۆیی هەبێت؟ گوتم بپرسە!! ئنجا گوتم پاشا چەند مخابنە بۆ ستراتیجێتی سپای عێراق کە نەزانێ ئەگەر ڕووس هجوومی هێنا باسکێکی «کماشة» کەی دەڕوات بۆ کەنداوی ئەسکەنەدەروونە و باسکێکیشی بۆ کەنداوی عەرەب (یان فارس) ئەو چل کیلۆمەترەی نێوان کۆیە و ڕانیە، کە دوو بەشی بێ هەموار کردن گەڕۆکی تێڕا دەڕوات، نابێتە لەمپەڕێکی نیو سەعاتیش بۆ سپای سەردەمی «نەوەوی». لەمەش بترازێین: ڕێی حاجی ئۆمەران و ڕێی قەڵادزە و سلێمانی و ڕێی کرماشان - بەغدا، هەمووی دژی ئەو بینینەیە کە بۆتە مانیعی کردنەوەی ڕێی کۆیێ و ڕانیە کە بە ئەسڵ ڕانیە و قەڵادزەش دوای چۆڵبوونییان لە نوێ کۆیی ئاوەدانیان کردەوە و لە قەدیمەوە ئەو دوو هەرێمە لەگەڵ کۆیێ

که پتر له سەعاتێک و نیوی خایاند هاتینه سەر شتی عادەتی که مامڵەتی ڕۆژانەی سیاسەته. به زەردەیەکەوه گوتی، بابزانم چیت خواییشته «گل لي هسه شتريد؟» - ئەو یێەی «ترید» ەکەی درێژ کردەوه، مەبەستی تەگەره نەهێشتن بوو. با به خوێنەر بڵێم من لەو دیدەنییەدا هەرگیز پاڵەوانپفیم نەکرد، نەچوومه چاوییەوه، بەوپەڕی ئارامی و ڕێز لێنانەوه دەمدواند تەنانەت له ئاست «شتريد» دا گوتم «فخامة الپاشا» لەلایەن باری شەخسییەوه هیچ تەکلیفم نییه چونکه ئابووریم تێروتەسەله، ئەگەر پێویستم هەبایه دەمگوت... سێ تەکلیفم لێ کرد. له پێشەوه داوام لێ کرد ڕێگەی نێوان کۆیه و ڕانیەمان بۆ بکرێتەوه. بێوەخران تەلەفۆنی هەڵگرت لەگەڵ نەدیم پاچەچی وەزیری «اعمار» قسەی کرد گوتی فلانه کەسم لایه دێته لات بۆ مەسەلەی ڕێی ڕانیه، هەر لەمڕۆکەوه دەست بکەنه کردنەوەی... خواییشتی دوەمم هی تووتن بوو... تەلەفۆنی هەڵگرت لەگەڵ «ضياء جعفر» قسه

---

«وحدة» یەکی ئابووریان پێک دەهێنا و ڕێگایەکی ترانزێتی کۆن له کۆیەوه بەرەو دیوی سەردەشتی کوردستانی ئێران به ڕانیه و قەڵادزەدا تێپەڕ دەبوو...

بەر له ساڵێک پتر برادەرێکی عەرەب که دوور به دوور حەزی له نووسینەکانم کردبوو، دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق له سەفارەتێکی یەک له وڵاتەکانی ئەفریقیا، خۆی پێ ناساندم و ڕۆژێک له ڕۆژانی دەمەو بەهار منی بردە دەرەوەی بەغدا، له ماڵی برادەرێکی خۆی مێوانی نیوەڕۆژە بووین. براگەورەی ئەو خاوەن ماڵە هاتە بەخێرهێنانمان، شەهادەی نەبوو بەڵام زۆر زیرەک و باخەبەر بوو. له بەرەو کۆتایی دانیشتنەکەمان گوتی: له سەرەتاکانی شۆڕشی ۱۴ تەمووز سەرباز بووم له دایرەیەکی وەزارەتی دیفاع. ڕۆژێکیان ئامری ئەو دایرەیە ناردمی بۆ مەقەڕی وەزیر که تەقریرێکی بۆ بهێنم لەسەر دیدەنێکی (د. مسعود محمد) لەگەڵ نووری پاشای کردووه، ئایه تۆ ئەو کەسەی؟ پێم گوتەوە: کەسێکی دیکە شک نابەم ئەو ناوەی هەبێت لەوانەی به بەریانەوه بێت وتووێژ لەگەڵ نووری پاشادا بکەن، بەڵام من دوکتۆرام نییه، دەبێ خێرەومەندێک ئەو لەقەبەی به شاباش له قەبەڵم کردبێت. قەوڵ بوو دوکتۆر کەمال مەزهەر دیدەنی لەگەڵ ئەو شەخسە بکات بەڵام تا ئێستا ڕێک نەکەوت یەکتر ببینن. دکتۆر کەمال خەریکی کۆکردنەوەی ئەو جۆرە وەسیقانەیە و زۆریشی کۆکردۆتەوه.

بکات کە وەزیری «مواصلات» و وەکیل وەزیری «اقتصاد» یش بوو، تووتن ئەوسا سەربە «اقتصاد» بوو. د. ضیاء لە مواصلات دەرچوو بوو. لەگەڵ تەلەفۆنی وەزارەتی (اقتصاد) قسەی کرد، دەرکەوت جارێ نەگەیشتۆتە جێ. پێی گوتم هەتا تۆ لەگەڵ نەدیم قسەت تەواو دەکەیت من «ضیاء»م دیتوە و هەموو شتێکم تێگەیاندووە. مەبەستی سێیەمم چارەسەرکردنی مەسەلەی عەشرەتەکە و گرتووەکان بوو کە بەر لەچەند ڕۆژێک لە مەجلیس داوام کردبوو. گوتی من سبەینێ سەفەر دەکەم بۆ ئەورووپا حەز دەکەی بە ماجد، مەبەستی ماجد مستەفا وەزیری (شؤون اجتماعیة) بوو، دەڵێم لەگەڵت خەریک بێت بۆ خێرایی کردن لەو مەسەلەیە، گوتم پاشا ماجد بەگ دۆستمە بەڵام بەینی لەگەڵ عەشرەتەکە ساز نییە. گوتی بە جەمیل دەڵێم لەگەڵت خەریک بێت، مەبەستی جەمیل مەدفەعی سەرەک وەزیران بوو، گوتم پاشا ڕاستییەکەی لە خۆت بەولاوە کێشەکە بە کەس چار ناکرێ. دەستی ڕاستەی هەڵگرت خستییە سەر شانی چەپەی و گوتی ئەم مەسەلەیە لەسەر منی حیساب بکە... ئیتر بەڵین لەوە گەورەتر نابێت. بەوەدا دەیدەنییەکە کۆتایی هات. پێی ناوێ بڵێم چوومە لای نەدیم پاچەچی چۆنی بەخێر هێناوم... بەرەو وەزارەتی اقتصادەوە چووم، گەیشتمە ژووری سکرتێرەکەی وەزیر دیتم نووری پاشا خۆی هاتۆتە لای... د. ضیاء یش وەک نەدیم لەڕادەبەدەر بەخێری هێنام...

دوای دە ڕۆژێک بوو بە ڕەمەزان، ئێوارەی یەکەم یان دوەم بوو مەلیک فەیسەڵی دوەم داوەتێکی نایب و ئەعیانانی کرد بۆ بەربانگی ڕەمەزان. کە لە «بلاط» ـەکەی کۆن بە ڕاستەی حەوشەی پێشەوەی بەرەو باغچەکەی بام دایەوە و چوومە ژووری ڕەحمەتی ئەحمەد مختار بابان لە دوورەوە بە باوەشی کرایەوە بۆم هات و دەستەملانم بوو گوتی موبارەک بێت, مەشرووعی قانوونی عەفوی جەماعەتەکە ئەمرۆکە ئیمزا کرا! وەی کە تەزووی شادیم بە بەدەندا هات تا ئەوەی ئەگەر خۆم نەگرتایە فرمێسکم دەهات. شەش وەزیری دیکە و نایبی سەرەک وەزیران عەلی جەودەت ئەیوبی، وەهام لە بیرە هاتن بۆ موبارەکبادیم و وێنەگریان هێنا چەند وێنەیەکی بیرەوەریمان گرت. لە داوەتەکە خۆم خەبەری هەندێک لە ناسیاوەکانم دا کە قانوونی عەفوو دەرچووە، جارێ نەیانبیستبوو...

دوای گەڕانەوەم بۆ کۆیێ لە پشووی هاوینەی پەرلەماندا شێخ ئەحمەدی بارزانی کە خۆی و چەند کەسێکی دیکە لە بەندیخانە مابوونەوە کاغەزێکی بۆ ناردم

(کاغەزەکە ماوە) بە «ئەحمەداغای زێباری»دا وێڕای سپاسنامە، داوای یارمەتیی دەکرد بۆ بەردانی خۆی و ئەو چەند کەسە. داخوازییەکەی لە کاغەزەکە نەنووسیبوو، هەر ئەوەندەی نووسیبوو کە هەڵگری نامە وەکیلی ئەوە لە هەموو قسەیێکدا، بەداخەوە دوای بەسەرچوونی پشووی هاوینە من خۆم دەرفەتم نەما هەوڵی شتی گەورە بدەم. ئەو کۆمەڵە مانەوە بە حەبسی هەتا 14ی تەمووزی 1958.

لەو هاوینەدا سەردانێکی سلێمانیم کرد بۆ دیدەنی و دوعاخوازی، مێوانی حاجی مەلا محیەددین بووم چەند ڕۆژێکی زێدە خۆشمان لەگەڵ دۆست و ناسیاوی کۆن و نوێدا ڕابوارد. هەر ڕۆژە و هەر شەوە داوەتی دۆستیمان گەرم دادەهێنا، حەماغای ئەورەحماناغا نیوەڕۆژەیەکی بە هاتوبات و قەڵەباڵغی تەواوەوە لە ماڵ و دیوەخانەکەی نایەوە. خاڵە مچۆل: «مستەفا حاجی برایماغا»م، دیتەوە گوتم وا بووم بە نایب هەرچەند تەڵاقیشت خواردبوو کە نابم. گوتی تۆ کەی نایبیت؟ حکوومەتی دەستەڵاتی نەبوو! تەڵاقی من گوناهی چییە؟

لەو هاوینەدا دەست کرا بە نەخشەکێشانی ڕێگەی ڕانیە، ئەندازیارەکان دەیانویست لە لای گوندی «فەقێیان» ەوە کە بەرەو باشووری شار کەوتووە، ڕێگاکە ئاودیوی چیای هەیبەسوڵتان بکەن. جەماهیر نەیسەلماند پێیان داگرت لەسەر ئەوەی کە هەر دەبێ ڕێگاکە لە چنارۆکەوە تێپەڕێت. چەندێکی ویستم ئیقناعیان بکەم کە لایەنی فەنیی ڕێگا بۆ ئەندازیار بەجێ بهێڵین سوودی نەبوو... بە ناچاری و بە حوکمی کوتەکی بازاڕی کۆیێ ڕێگاکە لە سەختترین شوێنی ئەو شاخەوە ئاوای دیوی چنارۆک بوو. هەرچی ڕێی فەقێیانە خاک و نەرمانە، تەنانەت لە سییەکاندا قایمقامێکی مووسڵی لە «دبوني» یەکان و زۆریش نوکتەساز بوو بە هەوڵ و ئەرکێکی کەم ئۆتۆمۆبیلی گەیاندە سەرووی چیاکە بە پشتی دێی فەقێیانەوە.

هەر لەو هاوینەدا پەیامنێری ڕۆژنامەی «نیویۆرک تایمز»ی ئەمەریکا هاتە کۆیێ لە ماڵی کاکە زیاد دابەزی دوو ڕۆژ و دوو شەومان لەگەڵدا بوو، یەکجار شتی نوێی لێ بیستین. وابزانم ناوی Robert Dotty بوو. کە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، وەک بیستمان گوتارێکی درێژی لەسەر هاتنەکەی بۆ عێراق و بۆ کۆیێ نووسیبوو بەڵام حکوومەت نەیهێشت دانەی ئەو ژمارەیە بێتە عێراق، نەمانزانی چی نووسیبوو بەڵام

مادەم حکوومەت لەو دەمەدا ڕای لێ نەبووە دیارە شتی چاکی بەلای ئێمەدا نووسیوە.

یەکەم هاوینی دوای دەرچوونم بە نایب ئیتر یان لە سەرتاکەیدا یان دوای بەسەرچوونی پشووی هاوینەی پەرلەمان بوو لەلایەن ئاشتیخوازانەوە داوەتێک کراین من و کاکە زیاد و سەمەدی حاجی محەمدی بەننا «حاجی مەنجەڵ»، وابزانم ئەحمەدی حەمەد ئەمیناغای دزەییش چووین.43

ئەو ئێوارەیە بەدەم مەزگوفێکی مەیلەو هەژارانەوە دوورودرێژ لە بزووتنەکە دواین، قسەکەرەکەیان چەندێکی ویستی ئیقناعم بکات بەوەی خۆی دەیەویست، من لە بیروباوەڕی خۆمم وازنەهێنا، ئێستاکەش وازم لێی نەهێناوە کە ئەم بزووتنەوەیە ناوەڕۆکی نییە و جۆری خەبات ناگۆڕێت و هیچی بەسەرەوە نانێت، ئەوە نەبێ کە ئاشتیخواز دەبێ بەپێی ئارەزۆی لایەنی چەپ بڕەقسێ و یەخەی دوژمنەکانی بگرێت بۆ حیسابی چەپ، ئاشتیخواز دەبوو یەخەی کۆریای باکوور بگرێت کە وروژمی بردە سەر کۆریای باشوور. ئاشتیخواز دەبوو ئیمزا کۆکاتەوە دژی جەنگ لەو وڵاتانە کە بە لای ئاشتیخوازەوە شەڕ هەڵدەگیرسێنن، چ فایدە سێسەد ملیۆن ئیمزای چینییەکان؟ دەسا من بە پێنجسەد ملیۆنیش ڕازمی نیم، چونکە هەموو چین بێ ئیمزاش لەو جغزەدایە کە ئاشتیخواز بە دەوری خۆیەوەی کێشاوە. چ سوود هەیە لەوەدا بۆ حەرام کردنی گۆشت خواردن مەزبەتە بە مەڕ ئیمزا بکەیت خۆ مەڕ گۆشتخۆر نییە! تۆ بڕۆ ئیمزای گورگم بۆ بێنە! شەوەکەمان ڕابوارد بێسوود بەڵام دوعاخوازیی برادەرانەمان لە یەکدی کرد.

هاوینی دیکە من کە چوومە جغزی ئاشتیخوازی بە ڕا لێ بوون نەبوو، حیزب بڕیاری دا بەشداری بکەم لە یەکەم کۆبوونەوەی ئاشتیخوازان. من و دوو نایبی دیکەی بەرەی نیشتیمانیی یەکگرتوو «ذنون ایوب» و«خدوري خدوري» بەشدار بووین، زوربەی حیزب و کەسانێکی پێیان دەگوترا «شخصیات وطنية» بێ ئەوەی

---

43- نوێنەرانی ئاشتیخواز ئەمانە بوون: عامر عبدالله، حمزه سلمان، صاحب حداد و رزوق تلو. قسەکەریان بە زۆری هەرە زۆر عامر عبدالله بوو... لە ١٩٧٣ بوو بە وەزیر. بە ئیستیقالە لە وەزارەت دەرچوو.

بەشداری بکەن لەو کۆبوونەوەیە موبارەکبادییان لێ کرد بە نووسین لە ڕۆژنامان...
هەموومان دەزانین ئاشتیخوازی و بزووتنەوەی لاوان و ئافرەتان و هەرچی ئەوتۆیی
هەبوو لە یەک سەرچاوەی ئاشکراوە شەلەگەیان دەکرایەوە، هەموو کارتۆنی بوون و
لە خۆوە پشتی ملی خۆیانیان نەدەخوراند و چ ڕایەکی سەربەخۆیان نەبوو لە هیچ
کارێک، ئەمەش شتێک بە لای منەوە وەک کفر وایە بە لای خواناسەوە، قەتیش
ئەو ڕێکخراوانە بە لای سەر خوارکردنەوە لە کوردانەوە نەچوو هەتا لە ڕێی
منەتبارییەوە بە تەئیید چاکەیان بدەینەوە. قسەی بێلزووم لەم بابەتەوە وەک
تۆڵەکەی بەهار وایە، هەموومان دەیزانین با چی دی سەری خوێنەری پێ
نەیەشێنم...

وا ڕێککەوت ڕۆژێک لە ڕۆژە خۆش و چالاکەکانی مەجلیسم، مام جەلال، کە
وابزانم، تازە لە سانەوی دەرچووبوو، هاتە سەردانی پەرلەمان، وەکوو گوێگرێک لە
بالکۆنی گوێگران سەیری بێنەوبەرەی نێوان حکوومەت و موعارەزەی دەکرد.
لایەحەیەکی قانوونییان هێنا بە کەم کردنەوەی ڕەسمی هەندێک لە ماددەی
خۆراک کە گۆیا بە چاکەی کەمدەستانەوە ڕێک خراوە. لە نۆرە قسەی خۆمدا
خۆشامەدیم لە لایەحەکە کرد بەڵام ڕەخنەم لەوەدا لێ گرت کە ئەو چاکەیە چی
ئەوتۆ نییە هەژاری پێ بحەسێتەوە، دوای ئەو هەموو بەڵێن و مزگێنی کە بەینێکە
حکوومەت ڕای دەگەیەنێ چاوەنۆڕی شتێکی دڵخۆشکەرەمان دەکرد کەچی
«تمخض الجبل فولد فارا». چەند جارێکی دیکەش لەو ڕۆژەدا قسەم کرد، وام بۆ
هات وشەی «جد» لە گوتارەکانمدا بڵێمەوە. مام جەلال گوتی: بەڕاستی ئیمڕۆکە
«نائیب الجد» بوویت. دوای هەڵستانی مەجیلس ئەو ڕۆژە لە کۆریدۆر لەگەڵ
جەمیل المدفعي پێک گەیشتین، نەختێک مەیلەو بە گلەییەوە گوتی: «اخي شنو ولد
فارا، ولد جملا...؟» گوتم: «صاحب الفخامة! عبرت عن شعوري».

ئەو هاوینەی کۆیەم بە عادەتی ساڵانی پێشوومم بردە سەر، ئەوەندە نەبێ کە
تێکهاویشتن و جموجووڵی دەمی هەڵبژاردنەکەی زستانی جارێ بە ڕووانەوە دیاربوو،
خەڵق پتر لە عادەتیان بە گەرمی سڵاویان لێ دەکردم. ڕێکەوتێکی زێدە خۆش ئەوە
بوو کە کاک باییز عەبدوڵا دزەیی کۆنە برادەری سانەوی و حوقووقم و معاون
تەسویەی ڕانیە سەرێکی کۆیەی دا منیش بە هەلم زانی و بەڵێنم لێ وەرگرت کە
دوای چەند ڕۆژێک بێتەوە سەردانمان لە چنارۆک... ئەو ڕۆژانی پێنج شەمۆ و

جومعەی بۆ دەست دەدا لە جێی وەزیفەکەی دوور کەوێتەوە. شەوی نێوان چوار شەمۆ و پێنج شەمۆ چوومە چنارۆک، لە بەیانی پێنج شەمۆوە برادەرانی کۆیێ سەرەتایان گەیشتە چنارۆک، کاکە زیاد و سەمەدی حاجی محەمەد (بە سەفەری سەردان لە خزمان هاتبۆوە کۆیێ) و تاقمەکەیان مەیلەو زووتر لە خەڵقەکە گەیشتن. بەهەمەحاڵ کۆمەڵەی کۆیێ و هی ڕانیە (کاک باییز، خاڵە خدر و کوڕێکی شێخ محەمد، شێخ حسێن، عەلی بەگی قادر بەگ و تاقمیان) بەیەکەوە نانی سبەینەیان لە چنارۆک خوارد. کۆمەڵێک بووین ئەوەندە گەش و ڕێک و لێکهاتوو بە جۆرێکیش لە بێ فەرقیدا نوکتەبازی و شۆخی دەکرا، کوردی گوتەنی، ئەستێرە لە عاسمانان هاتبوونە سەیرمان. قسەخۆش و سوحبەتچیی وەکوو میرزای حاجی کەریم و فەتحوڵای کشتەک و سەمەدی حاجی مەنجەڵ، تاقمی دڵتەڕی وەکوو ئەحمەدی حەمە مەلا و عومەر عەبدوڵا و عەلی گچکە، ناشزانمساڵح شەمس و مەجیدی حاجی کاک ئەمین و کەریم تۆفیق و چەندین ناسیاوی دیکە کە هەریەکە بە هەوایەک لێی دەدا و لە هەوایەک دەیقۆستەوە بەر چ جۆرە تاقمێک دەکەون، کاک باییزیش کە بە هەموو عومری خەریکی خەم و ڕەواندنەوە و تەگەرە نەهێشتن بوو، ئەو ڕۆژە و شەوێ و سبەینێ هەتا دەمەو عەسر کە جەماعەتی ڕانیە بەرەو ماڵ بوونەوە لەو مەزرایەی بێ خەم و خەیاڵی و برایەتی و پاکی و شۆخیدا دڵە چاکەخوازەکەی خۆی تێراو دەکرد.

داخم ناچێ ڕۆژی دوەم پاش جەمی نیوەڕۆژە خەبەریان لە کۆیە هێنا کە سەیدەکانی دێی سێنان لە سەر نۆرە ئاو سێ کەسیان لە یەکتر کوشتووە، مەیتەکانیان وا لە کۆیێ بۆ نازانم چی... خەبەرەکە لەو دەم و زەمانەدا کە کوشتن زێدە دەگمەن بوو وەک ئاوێکی ساردی لێ هات بەسەر ئەو بەزم و خۆشییەدا کرا... پاش عەسر کۆییەکانیش دوعاخوازییان کرد، من و میرزا حاجی کەریم شەوێکی دیکەش ماینەوە بۆ بەیانی چووینەوە کۆیێ. ئێستە کە چاوی پەندگیری لەو ڕۆژە دەبڕم، جۆرەک سەرژمارەی مەرگ و ژینی تێدا دەکەم، دەبینم لە گرووپی کەیف و شادیی ئەو ڕۆژگارە کەسانی کە دوای ئەم دێڕە ناویان دێت هەریەک بە سەبەبێک و لە کاتێکی جودادا مەرگ پێچانییەوە. لە کۆمەڵی ڕانیە، خاڵم شێخ خدر و شێخ محەمدی کوڕی و عەلی بەگی قادر بەگ و حەمەساڵحی یاریدەدەری شێخ حسێن... ڕەنگە هی دیکەش مردوون کە من ناویانم لەبیر نییە. لە کۆمەڵەی کۆیێ،

ئەحمەدی حەمە مەلا و عەلی گچکە و فەتحوڵا و مەجیدی حاجی کاکە ئەمین و ساڵح شەمس و کەریم تۆفیق میرزا و سەمەد و بەکر بەننا، برای سەمەد، ڕەنگە هی دیکەش چونکە نە هەمووم بە بیردا دێتەوە نە دەشزانم ئەو خەڵکە چەند نۆکەر و بەردەستی لەگەڵدا بوو.

بە نموونە شەوێ وڵاغەکەی کەریم تۆفیق لە نزیک جێی ڕابواردنی ئەو خەڵکە لە سوولی پاشا بەسترابۆوە پەتی پساند و چوو بۆ لای وڵاغەکانی کۆمەڵەی ڕانیە. کاکەینێ، بێ ئەوەی مەجلیسی ڕەندان ئاگادار بێ، لەو لاپاڵەی بەر کەپرەکانی هۆبەکەی چنارۆکییان کە هەموویان خزم بوون بوو بە شەڕە ئەسپێک پازدە ئەسپ لێکیان ڕادەکێشا... چۆنا و چوونی لێک ترازاندران؟ نازانم! ئەسپ هەبوو بەو شەوە مایینی هەڵبڕی بۆ ناو ڕەز و چەم و چڕگەن و هەڵدێران بە حاڵێک گیرانەوە باس ناکرێت. چاک بوو مانگەشەوێک بوو دەتگوت زیوە دەنا پیادە لەو نغوردانە بە شەوی تاریک ڕێگەی دەرنەدەکرد. گرتنەوەی ئەو وڵاغانە بە ژمارەیەک لە نۆکەران کرا کە هەموو حیسابی ژمارەی زیندوو و مردووان تێک دەدات.

دوای بەسەرچوونی پشووی هاوینەی پارلەمان چوومەوە بەغدا بۆ ئەو ژوورەی تروکادیرۆ کە ساڵی پێشتر تێیدا دەژیام. نوکتەیەکی بچکۆلانەی ئەو دەمانە پێوەندی بە ژوورەکەوە هەیە، یەک لە هاوپۆلەکانی خوێندنی حوقووقم ئیبراهیم ئەلغەسبان بووبوو بە موەزەف لە ئینحیسار. چەندی خۆمی دەدیت و چەندی لە خەڵقیش ئەحواڵی دەپرسیم هەر بە «عثمان» ناوی دەبردم، «اشلونک عثمان، شنو اخبارک عثمان، سەلمولي علی عثمان». جارێکیان لە جەریدە خوێندبوویەوە کە فڵان کەس هاتۆتە بەغدا و لە فڵانە ئۆتێل دابەزیوە. کاکە غەسبان بە شوێنی ئەو خەبەرەوە هاتووە بۆ ئۆتێلەکەم لە لەوحەی ناوەکان «مسعود محمد» و نومرەی ژوورەکەی خوێندۆتەوە، کە هاتە ژوورەوە بە گوڕ بۆ دەستگوشینم هات و گوتی: «اهلا بالاخ عثمان...» سەفەری کۆیەم کردبوو، من لەوێ نەبووم، کە گەڕامەوە بەغدا و دیتمی گوتی: «اروح ازور کویسنجق و ما اشوف عثمان؟»، بەڵام جارێ ماویەتی، ڕۆژێکیان لە کاکە زیادی پرسیبوو: «عثمان شلونە!» پێی گوتبوو: تۆ چتەوە عوسمان عوسمانت بە دەمەوە گرتووە... ئەمە فڵانە عوسمان نییە... هاتە لام لە ئوتێل ئەحمەدی حەمەدەميناغام لا بوو، بە چاوێکی شەرمنانەوە گوتی «اخاف حچایة عثمان زعلتک» تێیگەیاندم کە بە «عثمان الجليلي» مووسڵم لێ حاڵی بووە،

کەچی بەتەمابوو بم بینێ. دڵم دایەوە و دانیشتبووین ئەحمەدئاغای دزەیی خەریک بوو تێپەڕبێت، غەسبان بۆی ڕاست بۆوە، لێی قریواند: «تقضل عبد الصمد»... تومەز بە سەمەدی حاجی مەنجەڵی تێگەیی بوو. من و ئەحمەد دامانە پێکەنینێک غەسبان سەری لێ سووڕما.

پاش بوونم بە نایب و بڵاوبوونەوەی دووانەکان و گوتارەکانم ئاڵقەی ناسراویم لەلایەن خوێندەوارانی بەغدا و دەرەوەی بەغداش زۆری فەرق کرد. لەگەڵ کۆمەڵەی ڕۆشنبیرانی ناوەڕاست و حیزبە دیمۆکراتییەکاندا پێوەندیم بەهێزتر بوو، دیدەنم لەگەڵیاندا زیادی کرد. کامل چادرچی، سەد ڕەحمەت لە گۆڕی، باوەڕی پێم هەبوو حورمەتی نیابەتەکەشمی دەگرت، کە بە هێزی میللەت هاتووم. لە نموونەی ئەم باوەڕ و حورمەتە شتێک دەگێڕمەوە: ڕۆژێکیان تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی: قسەم پێت هەیە دەترسم شوێنەکەی تۆ کە ئوتێلە ڕێ بە مەحرەمیی قسان نەدات دەنا خۆم دەهاتمە لات... چوومە لای. گوتی: کوڕێکم لە بەندیخانەی «ئەبوو غرێب» گیراوە، سەردانیم کرد دیتم وەزعی ئەو گرتووانە یەکجار ناڕاحەتە. هەرچەند بە بۆنەی گیرانی کوڕمەوە بەندیخانەکەم دیت بەڵام خواهیشتم لێت بۆ کوڕی خۆم و هەموو حەپسەکانیشە. حەزدەکەم بەو جۆرەی بۆت دەلوێت لەگەڵ حکوومەت بدوێیت بۆ چارەسەر کردنی وەزعی ئەو گرتووانە. بشزانم لە خۆت بەولاوە تەکلیفی ئەوتۆ لە هیچ کەسێک ناکەم با ئەندامی «وطني ديمقراطي» ش بێت.

چوومە لای وەزیری داخلیە، مەرحووم «حسام الدين جمعة»، پێم گوت: من حەز لە هەراومەزاد ناکەم، ئەگەر چارەی ئەو بەندیخانەیە دەکەیت بەچاکتردا زۆرت مەمنوون دەبم دەنا بم بەخشە مەسەلەکە لە مەجلیس باس دەکەم. گوتی: یەک دوو ڕۆژم لێ ڕاوەستە و بەس. دواتر کامل چادرچی خۆی پێی گوتم کە وەزعی بەندیخانەکە زۆری فەرق کردووە.

سیاسەتمەدارانی دەوڵەت کە لە سەرووویانەوە عبدولئیلاهـ بوو، دەیانزانی لەبەر گەلێ حیسابی دەرەوە و ناوەوە پێویستە گۆڕانێک بەسەر وەزعی ڕامیاریی عێراقدا بێت. نووری سەعید، وەک لە بیرمە، جارێ لە دەرەوە بوو، «د. فاضل الجمالي» بوو بە سەرەک وەزیران، وەزارەتێکی هەمەڕەنگی پێک هێنا بەشێکی دیاری ئەندامەکانی سەربە حیزبی نووری سەعید بوون. سێ نائیبی «معارض»ی کرد بە وەزیر،

«رفائيل بطي» بۆ وەزارەتی «ارشاد»، «حسن عبدالرحمن»، وەک دێتەوە بیرم، بۆ «شؤون اجتماعية» و «عبدالرحمن الجليلي» بۆ «اقتصاد». هەندێک کەسایەتیی سەربەخۆ بەشدارییان کرد، لەوانە «د. عەبدالمجيد القصاب» بۆ مەعارف. «د. عبدالرحمن الجليلي» داوای کردم کە لە گەڵی بدوێم لەسەر مەسەلەی تووتن. من لە ڕانیە بووم کە وەڵامەکەی هات... بەداخەوە لەگەڵ هەموو گەرموگوڕی دەمی نیابەتمان و متمانەیەکی بە یەکدیمان دەکرد، بێبەختی وەهای کرد لە یەکەم کۆبوونەوەمان ساردایی بکەوێتە نێوانمانەوە، ئەویش نەختێک خەتای من بوو لە بەکارهێنانی وشەیەکی مەیلەو نالەبار، هێندێکیش بێتەحەمولیی ئەو کە دەبوو بزانێ مەبەستێکی خراپم نییە... بەهەمەحاڵ تاڕادەیەک بە چاکەی تووتن کردەوە بوون... هەل هاتە پێش، لە تۆڵەی نەقڵ کردنی ئەو مدیرەی کچان کە دەمانچەیان پێوەنا و لەبەر داخوازی واقیعیش ڕووی تەکلیفم لە «د. عبد المجيد القصاب» نا بۆ لادانی مدیری سانەوی. بێ ئەوەی لەسەر کاغەز بەرزی کاتەوە و ئەو چاوەی بڕیبووبیەوە ئەوراقی بەردەمی هەڵی نەبڕیەوە ئەمری نەقڵی مدیرەی ئیمزا کرد...

نفووس سەربە (شؤون) بوو، مەئمووری نفووس کە پورزاشم بوو زۆر بێلزووم ناحەزایەتیی کردین و بەردەوامیش بوو لەو پیشەیە. حەسەن عەبدولڕەحمان-یش بێ سێودوو لە کۆیەی دوورخستەوە... چەندێکی هەولێر ویستی بڕیارەکان بگوڕێن بێسوود بوو. بەو نەقڵانە سفتی و گرژی لە وەزعی حکوومەتی کۆیە زۆری کەم کرد... ڕاستە نەقڵی دوو کەس باری عێراق و کورد ڕاست ناکاتەوە بەڵام نەقڵ نەکردنیشیان چ سوودی بۆ عێراق و کورد نەبوو وەکوو دڕکیش لە چاو دەچەقین جگە لەوە کە نەقڵی دۆستی حکوومەت سەرکەوتنە بۆ ئەوەی حکوومەت نییە کە دەکاتەوە بەرەی خۆمان.

هاتنی د. جەلیلی و حەسەن عەبدولڕەحمان پتر لە وەزیری دیکە ڕاگەیەن بوو چونکە هەردوویان ئەندامی حیزبی «الجبهة الشعبية» بوون کە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە ناوداران و خاوەن پایە و خوێندەواری بەغدا و شوێنی دیکە پێک هاتبوو لەمانە: «طه الهاشمي، شێخ رضا الشبيبي، صادق البصام، نصرت الفارسي، ذيبان الغبان، عبدالرزاق الشيخلي، نجيب الصائغ» و هی دیکەش لەم بابەتە. دیارە حیزبی ئەوتویی بێ وەرگرتنی بەڵێن بە گوڕێنی سیاسەت، تێکەڵ بە حکوومەت نابێ. خێرا عورفی هەڵستا و ڕۆژنامە ئازاد بوو و ڕەهاییەکی هەستپێکراو لە نێوان تێکڕای

خەڵق، بەتایبەتی ئەوەی سەروکارێکی بە سیاسەتەوە هەیە، بە دی دەکرا. بە نموونە: گوتارێکم لە ڕۆژنامەکەی «صادق البصام» بڵاو نەکرایەوە خێرا بە خێرا لە ڕۆژنامەی «رفائیل بطي» خۆی، کە وەزیر بوو، بڵاوکرایەوە. ڕۆژنامە هەبوو داخرابوون کەوتنەوە دەرچوون. «فاضل الجمالي» ڕۆژنامەیەکی تایبەتی بە سیاسەتی خۆی دەرکرد وابزانم ناوی «العمل» بوو، دەمودووی جودا بوو لە ڕۆژنامە تەقلیدییەکانی حکوومەت.

بەیانییەک جارێ بە تەواوی خەبەرم نەبووبۆوە بروسکەیەکیان دامێ بە ئیمزای چەند کۆییەکی ناسیاوی خۆم کە خزمێکیشمیان لە نێوانیدا بووم بە ناوی جەماهیری موزاهەرەکردووی کۆیە داوای چارەسەر کردنی بێ ڕێی شارەکە دەکەن کە ئەوسا بە زەحمەت زستانان ئۆتۆمۆبیل لە کەرکووک و هەولێرەوە دەگەیشتە کویێ. من کەموزۆر ئاگام لەو کارە نەبوو، بەو بروسکەیە زانیم موزاهرە لە کۆیێ کراوە. لە دەرگەی مەجلیس تووشی سەعید قەزاز، وەزیری داخلیە هاتم. بێ سێودوو پەلاماری دام بە قسە لەسەر ئەو موزاهەرەیە. من نەمزانی بۆچی بەدوا پەلامارەکەیدا گوتی: حەمە زیاد و تۆ حەقە هەر یەکەتان حەوت ساڵ حەبس بکرێن... دواتر زانیم ئیدارەی کۆیێ لە بەغدای گەیاندووە کە موزاهەرەکە بە تەئسیری «نواب کویسنجق في بغداد» کراوە. لە وشەی «نواب» مەبەستیان ئەوە بوو کە حکوومەت بزانێ کاکە زیاد-یش مەبەستە نەک هەر تەنها مەسعوود محەمەد. من وەڵامێکی لە سەرەخۆ و پڕ بە پێستی ئەو دەمەم دایەوە بەڵام لە هەمان کاتدا بڕیارم دا شکاتی خۆم لە سەعید قەزاز لەسەر ئەو قسە قورسانەی ببەمە لای سەرەک وەزیران.

چوومە لای «رفائیل بطي» کە ژوورەکەی لە قاتی ژێر ژوورەکەی «د. فازیل جەمالي» بوو، باوەشی بۆم کردەوە و بە گەرمی بەخێری هێنام، پێم گوت کە خەبەرم بۆ بداتە د. فازیل بچمە لای تا شکات لە وەزیری داخلیە بکەم... حکایەتەکەم بۆ گێڕایەوە. بە بینینی ئەو مەسەلەکە لە ناکاو و چاوەڕوان نەکراویش بوو. جارێ قاوەم نەخواردبۆوە سەعید قەزار هاتە ژوورەوە، من لە بەری هەڵستام بە ڕووی گرژەوە، ڕەفائیل بۆی چوو زۆر بە پەرۆشەوە پێی گوت کە هەرگیز بە تەما نەبووە من گلەیی لە سەعید قەزاز بکەم... کە ئەمەی بیست سەعید قەزار بۆم هات گوتی: کوڕە چۆن لە تۆوە گلەیی بۆ من ڕەوایە تۆ خۆشەویست... و... و... نازانم

چی منی. هەر لەگەڵ ئەمەدا دەستی خستە ملمەوە منیش پێم گوت کە بە تەما بووم بچمە لای سەرەک وەزیران بۆ شکات. بەمەندە گرژیی نێوانمان ڕەوییەوە ئیتر دەستی گرتم بە قادرمەیەکی نێوان ژووری د. فازیل و بەشی مەحرەمانەی ئەو بینایەی لێی بوو سەری خستم هەتا بە دەستی خۆی دەرگەی د.فازیلی کردەوە بۆم. چەندی گوتم با داوای چوونە ژوور بکەم نەیسەلماند. منی گەیاندە ناو ژوورەکە، بایی ئەوەی د. فازیل ئەویش ببینێ ئیتر کشایەوە من وەهام ڕانواند کە تەنها بۆ سەردانی موجامەلە چوومەتە لای.

بە ئیزنی خوێنەر لە نموونەی ڕەفتاری ئەو جیلەی کە من پێی ڕاهاتبووم شتێکم لەو سەردانە دەگێڕمەوە: کە هەڵستام بۆ دەرچوون د. فازیل لەگەڵم هات هەتا دەرگای ژوورەکە خۆیشی دەرگاکەی کردەوە. من خەریک بووم پاڵتۆم لەبەرکەم تومەز تەقەڵی (بطانە) ی هەڵوەشابوو دەستم چووە ناو کەلێنی هەڵوەشاوەکە، دەستم کێشایەوە و ڕەپێشم کردەوە دیسان بۆ جاری دوەم و سێیەمیش هەرچۆوە ڕێی هەڵە. د. فازیل کە بە مامم دەشیا و لە مەرتەبەی مامۆستام بوو قاپووتەکەمی لێ ستاندم، چەندێکی ویستم نەیەڵم قاپووتەکەم بۆ ڕابگرێت نەیبیست و بە ئیلحاحەوە قاپووتەکەمی لەبەر کردم. خوێنەر لێم بسەلمێنێ کە دەڵێم ئەوسا و ئێستاکەش تەزووی شەرمم پێدا دەهات و دێتەوە.

ئەم حیکایەتۆکە هەڵوێستێکی زووترم بە بیر دەهێنێتەوە: کە دوای بوونم بە نایب، ناوێکی پەیدا کرد، چوومە زیارەتی مەلیک و عەبدولئیلاهـ. مەلیک جارێ لە ژێر «وصاية» بوو، هی ئەوە نەبوو لە غەیری ڕێزلێنان هیچی دیکەی لە گوێ بچرپێنیت. بەڵام لای عەبدولئیلاهـ چەند قسەیەکی پەنئدامێزم بۆ بەرژەوەندی نیابەتەکەم کرد کە گوتم: لەوانەیە مرۆ سەهوو بکات وەیا باشترین ڕەفتار فەرامۆش بکات وەیا لە تەعبیر سەرکەوتوو نەبێت بەڵام دەمەوێ خاوەن بەرزیی عەبدولئیلاهـ دڵنیابێت مەبەستم چاکەی ئەم خاک و میللەتەیە. لە وەڵامدا گوتی: «اخي كل انسان معرض للخطأ هسة اذا اني اگول ما اخطأ بمعني انا مجنون...» ئەمە دەقی قسەی خۆیەتی.

من لە گۆشەی تێوەڕامانی خۆمەوە بەلامەوە لە تیشکی نیوەڕۆژەی هاوین ئاشکراتر بوو کە مانەوەی د. فازیل لە حوکم جەژنی موعارەزەیە چونکە زوربەی نایبان هی حیزبێکن (حزب الاتحاد الدستوري) کە هی ئەو نییە، چاری ناچارە دەبێ لەگەڵ

موعارەزە ڕێبەدێی بکات. کەسێکی مەجلیسی بەدواوە بوو چ ترسێکی نابێ لە 10-15 موعاریز، ئەوسا ژمارەی نایبان دەوری 140 کەس بوو. من لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییە سەرەتاییەدا زمانی خۆم گرت لە موعارەزە، هەندێک لە موعاریزەکان، بەتایبەتی خوالێخۆشبووی «عبدالجبار الجومرد»، بوو بە ئاگر و لە عومری وەزارەتی جەمالی هەڵگەڕا: ئێوە چن؟ نوێنەری کێن؟ کوا پشت و پەناتان؟ بۆچی چاوبەستەکێ دەکەن لەگەڵ میللەت؟ کوا مەجلیسی نیابیتان، کوا ئەکسەریەتتان؟ ئیتر هەر ڕۆژە جۆرێک سووژناژۆی دکتۆر جەمالیی دەکرد. ڕاستییەکەی د. جۆمرد بە وەزیرایەتیی د. عەبدولڕەحمان ئەلجەلیلی کە هەردوویان مووسڵی بوون یەکجار تێک چوو تا ئەوەی ڕۆژێکیان گوتی: بەسە تا کەی لەقەبی «صاحب المعالي» ڕەوای وەزیران بدیترێت. خوا هەڵناگرێ هەتا عەبدولڕەحمان ئەلجەلیلی نەبوو بە «صاحب المعالي» د. جۆمرد چ لاریی نەبوو لەو لەقەبە... لەگەڵ نەجیب ئەلسائیغ بەیەکەوە خەفەتمان لەو غافڵییەی د. جۆمرد و موعاریزەکانی دیکەش دەخوارد کە بەدەستی خۆیان قەبر بۆ موعارەزە هەڵدەکەنن.

لە ئاست ئەو هەموو تێوەژەنینەی ڕەخنە گرتن لە وەزارەت کە پاڵپشتی نییە لە مەجلیس یەک دوو جاران یەک لە وەزیرەکانی سەربە «حزب الاتحاد الدستوري» گوتی: هەبوونی وەزیری وەکوو من کە دەستووریم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حیزب پاڵپشتی وەزارەتە. مامۆستا خەلیل کەننە سکرێتی حیزبی ئیتحادی کە بەشداریی نەکردبوو لە وەزارەت، ڕۆژێکیان ڕاست بۆوە و گوتی: نەمدەویست بە دەنگ بێم بەڵام واپێ دەچێ حیزب لەو وتووێژانەدا بە «كمية مهملة» دادەنرێت و هەر کەسە بە کەیفی خۆی لێی دەدوێ. حیزب جارێ هەڵوەستی خۆی لە ئاست وەزارەت دەرنەبڕیوە چونکە سەرۆکی حیزب، نووری پاشا، لە ئەورووپایە هەتا نەیەتەوە و سیاسەتی ڕەنگڕێژ نەکات بەرانبەر حکوومەت کەس مافی نییە لە جیاتی حیزب قسە بکات... ئەمەی گوت و سیاسەتی عێراق شەختەی کرد. نە حکوومەت نە پەرلەمان نە «بلاط» نە هیچ کەس و لایەنێک شتێکی بە دەستەوە نەما بڵێت و یا بکات... سەرلەبەریان چاویان بڕیە ڕێگەی نووری سەعید کە لە ئەورووپا بێتەوە. موعارەزەی عێراق لەو ڕۆژەوە نەفەسی بڕا و سەرقەبر نەبۆوە. بە کەوتنی د. جەمالی موعارەزەش کەوت.

نازانم لە پاش پەردە چ ئاڵوێرێک کرا بۆ هاتنەوەی نووری پاشا، بەڵام لەمسەر تا ئەوسەری عێراق گێژی چاونۆڕکێی هاتنەوەی بوو. لە هەموو لایەکەوە پێشوازیکەران ڕژانە بەغدا دەتگوت لە نۆژەن حکوومەت بنیات دەنرێ. بە پەنجەی دەستیان هەستت دەکرد نووری سەعید هەموو شتێکە وەک کە هەستی نەرمی و ڕەقی دەکەیت. ئەو چەند نایبە موعازیزەی وەک جۆمرد و عەبدولڕەززاق ئەلشێخلی بێ ئەوەی ئاگایان لە خۆ بێت خزمەتێکی نووری سەعید-یان کرد بە خەیاڵی کتێبگرەوەشدا نەدەهات.

وەک گوتم من موعارەزەی خۆمم وەستاندبوو لە دەمی وەزارەتی د. جەمالی تا ئەو ڕۆژەی لە موزاهەرەی کرێکاری بەسرە عورفی لێ ئیعلان کرا و کرێکارێک کوژرا و د.عەبدولڕەحمان ئەلجەلیلی و حەسەن عەبدولڕەحمان ئیستیقالەیان دا. بەهەمەحاڵ باری سیاسی وەهای لێ هات موعارەزە بایەخی نەمێنێت چونکە وەک دەرکەوت بەرژەوەندبینان خەریکی هەنگاوێک بوون گۆڕانی تێدا بێت. مەجلیسی نوێنەران هەڵوەشێنرا و سەرەک وەزیرانێکی غەیری جەمالییان هێنا هەڵبژاردنێکی تازە بۆ مەجلیسێکی نوێبابەت ڕاپەڕێنێت. من چ ئاگام لەوە نییە بەرەیەکی ڕێکوپێکی پانوپۆڕ لەناو پارتی و بەدەوری چەندوچۆنی کاروبارییەوە پێکهاتووە دژی من و نیابەتەکەم و ڕەفتاری سیاسیم. ئێمە تا ئەو دەمەی مەجلیس هەڵوەشا بە زاهیر لێک ڕازی و هاوڕێ و برادەر بووین چەندێکی لە بەغدا بووبین شەوانە و ڕۆژانە لەگەڵ یەکترمان ڕادەبوراد، خۆ ئەگەر ناجایەزەیەکیشی تێدا بێت دەڵێم شەوێک کاکە زیاد و شەوێک من مەسرەفی دانیشتنەکانی شەوانەمان دەکرد ئینجا ئەگەر من ئەو نالەبارەم کە شیروتیرم لێ هەڵبگیرێت ئەو هەموو برادەییە و بەیەکەوە بوونە لە کوێوە دەهات!

حیزب بڕیاری دا یەکێکی دیکە تەرشیح بکات. هەرچەند لە دڵدا تا بڵێی خۆم بە مەغدوور دەزانی چونکە هەڵوەستەکە تاوانبار کردنی منی تێدا بوو نەک لەبەر خودی تەرشیح نەکردنم دیسانەوە بایی موویەک بەسەر خۆم نەهێنا و بڕیاری «حیزب»م سەلماند وەک کە هیچی نارەوای تێدا نەبێت. لە قساندا کاکە زیاد گوتی: منیش پار لەسەر بڕیاری حیزب وازم لە تەرشیح هێنا. پێم گوتەوە: ئەوەی تۆ بۆت بە چاکە و پیاوەتی حیساب کرا، ئەمەی من تاوانبار کردنە فەرقیان زۆرە.

پێویست نابینم ئەو کێشەیە خورد بکەمەوە و کۆنە برینی پێ بکولێنمەوە هەر ئەوەندە دەڵێم دنیاکە وەها سوورِا کە لە کۆتایی تەکلیف لە خۆم کرا ببمەوە «مرشح» تەرشیحەکەشم بە بریاری هەردوو حیزبەکەی کۆیە بوو کە لەو هەڵبژاردنەدا هاریکاری هەبوو لە نێوانیاندا. حکوومەت یەکێکی بە «منافس» هێنا بۆ تەرشیح بەڵام قانوون تەرشیحەکەی رەت کردەوە من لە کۆیێ بە تەزکیە دەرچووم. حکوومەتی هەولێر ئاگادار نەبوو کە مرەشەحەکەی رەت بۆتەوە، لەنکاو زانی من دەرچووم بە نایب. لەسەر ئەم خەبەرنەدانەی هەولێر لەلایەن قەزاوە قایمقامی کۆیە، رەشید غەفوور-یان تەقاعود کرد. رەشید ئەفەندی بەم بۆنەوە دەیگوت: «کل نفس ذائق الموت و الفنیش...» راستییەکەی بۆی بە پەرۆش بووم بەڵام چ چار!

ئەو ساڵە بۆ ئامانجی هاریکاری لە هەڵبژاردن بەرەیەکی یەکگرتووی نیشتیمانی پێک هاتبوو. لە کۆیێ دوای دەرچوونم بە تزکییە نوێنەری چەپ گوتی حەق وایە بچیتە پاڵ بەرەی یەکگرتوو. منیش رایەکەم پەسەند کرد بروسکەیەکم بۆ بەغدا لێ دا کە خۆم بە ئەندامی بەرەی یەکگرتوو لە قەڵەم دەدەم. دەبێ بڵێم بەر لە چەند ساڵێک کە لە تەلەڤیزیۆنی بەغدا لە بەرنامەی «سیرة و ذکریات» گوتم لە خۆوە وەهام پەسەند کرد بچمە جەبهەوە راستییەکەی لە بیرم نەبوو کە «فاتح رەسووڵ» ئەو پێشنیازەی هێنایە پێش وا لێرەدا سەهوەکەم راست کردەوە.

حیزب ناچاری کردم خۆم لە رانیەش بپاڵێوم. هەرچەند ئەم کارە لە هیچی نەدەکرد قسەی حیزبم هەڵگرتەوە... لەگەڵ نوێنەری حیزب عەلی عەبدوڵا دوای دەرچوونم بە نایب لە کۆیێ بۆ رانیە چوین لە مەخفەری (قەسرۆک) نوێنەرەکەیان گەراندەوە کۆیێ منیش چوومە رانیە. حاکمی رانیە بە بۆنەی دەرچوونم لە کۆیێ تەرشیحەکەی رانیەمی رەت کردەوە و مەسەلە لەوەندەدا راوەستا... بەهانەی ئەم لایەنە لەو کارە بەرەواژەدا ئەوە بوو کە ئەگەر من لە رانیە دەربچم کۆیێ بەجێ دەهێڵم بۆ یەکێکی دیکە و بەمەدا پارتی نایبێک قازانج دەکات بەڵام ئەم راوێژە هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو چونکە دەشیا یەکێکی دیکەی غەیری من بۆ رانیە بێت و حیزب دەریبچوێنێت وەک کە دەبوو منیش دەرچووێنێت. لە حیزب هی وەها هەبوو بۆ رانیە لە من چاکتر بێت...

شەوێکیان نوێنەرانی هەردوو حیزب کۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ کردم بە ناوی موبارەکبادی ولێکدی حاڵیبوون... ئامۆژگاری ئەو شتانەیان کردم کە بە پێویستیان دەزانی من لە مەجلیس پێڕەوی بکەم... پێم گوتنەوە براینە لێرەوە هیچ پلانێک داناندرێت بۆ ڕەفتارم لە مەجلیس، جارێ دەبێ بزانین دەستوور هەیە ناشێ بایی موو لێی لادەم. ئنجا قانوونی دیکەی جنائی و مەدەنی هەیە سەرپێچی لێکردنی مومکین نییە. هەر پێشنیازێکی لە منەوە و غەیری منەوە بێت دەبێ بە ڕێی خۆی لە جغزی «قانوونی ئینتیخابات» و «نظام داخلي» دا بڕوات و لە دەنگداندا زۆرینەی دەنگ وەربگرێت... لەمانەش بترازێین، من چەندم هەر هەندم، هەزار جار دنەم بدەن لەوە تێپەڕ ناکەم کە دەیتوانم. لەوانەیە لائیحەی قانوون بێت هەر تێی نەگەم... لەوانەم بەسەر بابەتێکدا بکەوم باشی لێ حاڵی نەبووم وەیا عەرەبییەکەم گرفت بهێنێ... لەوانەم شەرم دام بگرێت و زمانم بگیرێ. گەلێک قسەی دیکەشم لەو بارەوە کرد کە ئەوسا وا پێ دەچوو قەناعەتیان پێی دەهێنا. برایانە و دۆستانە دوعاخوازیمان لە یەکدی کرد...

ڕۆژی کرانەوەی دەورەی چورەمین مەجلیس چووم بۆ خانەی پەرلەمان. لە پشتەوە ماجد مستەفا، بووبووە نایبی سلێمانی، و حەسەن تاڵەبانی (مدير دعايه عام)م دیت. چەند نوکتە و لەتیفەمان لێکدی گرت و چوومە لای نایبەکانی بەرەی یەکگرتوو، کامل چادرچی تازە دەگەیشتە پەرلەمان چاک و چۆنیمان کرد و گوتی لە بیرم نەماوە موعاریز لە کوێ دەحەسێنەوە... من ڕێگەم بۆ دەرکرد تا ئەو ژوورەی بە عادەت موعاریزەکان لێی کۆ دەبوونەوە. کامل پێمی گوت کەوا ساڵح جەبر وەڵامی بۆ هەناردووە لە جغزی چالاکی ناو مەجلیس بۆ چەسپاندی ئەو شتانەی بە چاکی دەزانین هاریکاری لەگەڵ یەکتردا بکەین. گوتی تۆ دەڵێی چی، گوتم من دەڵێم چ زەرەر لەوە ناکەین بۆ بەرژەوەندی گشتی هەر جارە لە «تصويت» ۲۲ دەنگی «لأمة الاشتراكية» - (حیزبەکەی صالح جبر) بۆ خۆمان ڕابکێشین. ڕایەکەی من لەوەوە بوو نایب هاتووە بۆ جێگەیەک هەرچی چاکەی تێیدا بە خەیاڵدا بێت بەندە بە تەسویتەوە خۆ پەرلەمان جێی موزاهەرە و مانگرتن نییە. بەڵام کامل دەستی ڕاستەی نەختێک بەرزکردەوە گوتی: «لا مو الى هذا الحد».

ئەم تەجرەبەیەی وا لێرەدا باسم کرد تەجرەبەی دیکەم لەگەڵ چادرچی وەهای کرد کە لە ئاڵقەیەکی «الجذور»ی ئەم ساڵەی ١٩٨٧ لە ڕۆژنامەی «الثورة» کامل چادرچی بە (متزمت) دابنێم.

کۆبوونەوەی ئەو ڕۆژەی مەجلیس تاقانە بوو، چی دیکەی بە دوادا نەهات. لە کۆتایی کۆبوونەوە بڕیار درا کۆبوونەوەی بوەخرێ تا خەبەرمان لێ دەگێڕدرێتەوە... دوو ڕۆژێکی دیکە مامەوە بە شەمەندەفەر گەڕامەوە بۆ کەرکووک بەڕێکەوت لەگەڵ جەلالی حامد بەگی جاف کە بووبووە نایب لە واگۆنێکدا بووین. ئەوەی جەلال لەو شەوەدا بۆی گێڕامەوە ڕێک دەهات لەگەڵ چی لە بەغدام زانیبوو لە بارەی پڕبوونی کاسەی حکوومەت بەرانبەر موعارەزە لە ژوورەوە و دەرەوەی پەرلەمان.

دەرچوونی دە نایب لە بەرەی یەکگرتوو بە لای حکوومەتی ئەوسای عێراق خەتەرێکی کوشندە بوو لەو ڕووەوە کە قسەی یەکێکی وەکوو کامل چادرچی و محەمەد مەهدی کوببە و هاوڕێکانیان لە پەرلەماندا بێ پەردە و پێچوپەنا دەگاتە جادە و بازاڕ، کە لە خۆوە گەرم ڕاهاتووە، وەها دەکات ئاگری تێبەربێت. لەو پێوانە و کێشانەی کە حکوومەتی عەبدولئیلاھ دژی ڕەئی نووری سەعیدی کرد و مەجلیسی هەڵوەشاند پێشبینییەکانی نووری بە هاتنی ئەو دە نایبە بەڕاست گەڕا، نووری ڕازی نەبوو مەجلیسی دەورەی سێزدەمین هەڵوەشێت، کە هەڵوەشا بە تووڕەیی چۆوە ئەورووپا. دوای هەڵبژاردن و ئەو تاکە کۆبوونەوەیە، بانگهێشتنی نووری کرا کە بێتەوە بۆ چارەسەر کردنی حاڵوباری تازە. وەک بیرمە هەتا عبدولئیلاھ بەدوایدا نەچوو هەموو مەرجەکانیشی نەسەلماند ڕێی هاتنەوەی نەگرتە بەر. مەرجی یەکەم هەڵوەشانەوەی ئەو مەجلیسە بوو... من لەگەڵ جەلال شەوێک لە هاوینەهەواری سەڵاحەددین بووم، دوای چوونەوەم بۆ کۆیێ بە یەک دوو ڕۆژ مەرسوومی هەڵوەشاندنی مەجلیس دەرچوو.

هەموو عومری ئەو دەورەیەی 14 تەنها 8 ڕۆژ بوو... نووری پاشا هاتەوە بە سەرۆکایەتیی وەزیران. دەست کرا بە ئامادە کردنی هەلومەرجی هەڵبژاردنی مەجلیسی پازدەم... موعارەزە لە عێراق دروشمی موقاتەعەی هەڵبژاردنی بەرز کردەوە بۆ بێتالعی تەنها لە کۆیەکەی خۆمان بیروڕا بەرەو بەشداری کردن لە

هەڵبژاردن بوو. چەپڕەوەکان گوتیان ئەگەر مەسعوود محەمەد مورەشەح بێت ئەوان بەشداری دەکەن لە هەڵبژاردن...

لە سەرەتاکانی خۆ ئامادەکردندا، حکوومەت ئەندامە هەرە چالاکەکانی هەردوو لایەنی گرتن و بردنی بۆ بەندیخانەی هەولێر. کاکە زیاد بێ ئەوەی حەپس بێ بردرا بۆ هەولێر ئنجا تەکلیف لە منیش کرا کە کۆیێ جێبهێڵم. جارێ خۆم تەرشیح نەکردبوو نەشم دەویست بە هیچ کلۆچێک بە تەرشیح بوونم ئاگری هەرا بەزر بکەمەوە، بێسود بوو حیزب بە ڕەسمی داوای لێ کردم خۆ پاڵاوتە بکەم... دەبوو سەد دینار بارمتەی تەرشیح دابنێم لە گیرفانمدا نەبوو چووم لە فایەق نادرم قەرز کرد خۆزیا نەیدابامێ... بەڵام ماڵی ئاوابێ... هەر وەک من دەترسام لە ئاکامی هەرا موتەسەڕیفی ئەو دەمە «ئیسماعیل حەقی ڕەسووڵ»یش ترسی زۆر بوو. پێم گوت ڕێ بدە بچمە بەغدا بەڵکوو چارەیەک دەدۆزمەوە. یەکجاری پێ خۆش بوو، من دەمزانی چوونم بۆ بەغدا بایەخی چارە کردنی پێوە نییە، دەمەویست دەنگمان بە دنیادا بگەیەنم، لە بەغدا ئەوەی پێویست و ڕوونکەرەوە بوو لە ڕۆژنامەی «صوت الاهالي»ی حیزبی «الوطني الديمقراطي» بڵاوم کردەوە. بەڕێکەوت لە «کتێبخانەی مەکەنزی» هی «کەریم مراد»ی بە ڕەحمەت شاد، سەعید قەزازم دیت، بێ قووڵ بوونەوە و هەروا سەرزارەکی و بە ناچاری چەند قسەیەکی ڕێبوارانەمان لە بارەی حاڵوباری ئەو هەڵبژاردنەوە کرد... گوتی ئەمە ئەنجامێکی ئاسایی تیژڕۆییە... دیتم «عەبدولڕەززاق شێخلی» تێی ئاڵا بۆ ئیقناع کردنی دەست بۆ مەنتیقەی ئەو درێژ نەکەن، چ سوودی نەبوو. تاکێک لە نایبە موعاریزەکان ڕێی دەرچوونیان پێ نەدرا.

دوای بڵاو بوونەوەی نووسینەکەم، لە هەولێرەوە داوا کرا کە بمنێرنەوە بۆ ئەوەی لە ئوتێل خێرەومەندێکی شورتە یاخود تەحقیقات کە کوردیش بوو دەشمناسی هات و بوو بە هاوڕێم هەتا هەولێر. لە هەوەڵەوە بردمی بۆ کارگێڕیی شورتەی بەغدا.

لە هەولێر نیشیمەنی دەستبەسەریم بۆ ماوەی چوار ڕۆژ لە مەرکەزی شورتەی خانەقا بوو. کاکە زیاد لە مەرکەزێکی دیکە دابەزێندرابوو، برادەرانی دیکەی هەردوو حیزب لە حەپسخانە بەیەکەوە بوون... من لەو ڕۆژانەدا تەواو حەسایەوە بووم، لە برادەرانی هەولێرمەوە ڕۆژانە باشترین خواردن و میوەم بۆ دەهات کە بەشی شورتەکانیشی دەکرد، هەمیشەش سەردانیان دەکردم. مەرحوم زەیدی ئەحمەد ئەفەندی و چەند برادەرێک زوو هاتنە لام، زەید قسەیەکی خۆمی کرد بە نوکتەی

زمان حاڵی ئەو دەمە گوتی: پیاو پیاو بێ حەپس و مەبس چییە... حیزب سوربوو لەسەر بەردەوامبوون لە مانەوەم بە مورەشەح هەتا کۆتایی هەرای ئەو بەزمە، من لەو باوەڕەدا نەبووم کە هەڵبژاردن شتێکە بەرەو کوشتن و کوژران و ماڵکاولی خەڵقەوە بڕوات. داوام کرد لە حکوومەت ڕێ بدات کە ئەو برادەرانەی حەپسخانە ببینم. دەرحاڵ ڕێ درا و چوومە لایان.

پارتی لە زاری نوێنەریەوە ڕای گەیاند کە بڕیاری حیزب بەردەوامبوونە. نوێنەری چەپ گوتی هەتا تۆ مورەشەح بیت ئێمە تێداین. چەپڕۆیەکان بەهۆی ئەوەی کەوا بەر لە دوو سێ هەفتە ناوم دەرچووبوو لە یەکەم کۆبوونەوەی ئاشتیخوازان پتر لە عادەت پشتگیرییان لێ کردم. پێم گوتن ئەم هەڵبژاردنە قەسابخانە دەردەچێت. لە بەغدا بیستبووم کە بەر لەوەی سەعید قەزاز بگاتە وەزارەتی داخلیە (لە دەرەوەی وڵات بوو) وەکیلەکەی کە وەزیرێکی هەرە بەهێزی حکوومەت و حیزبی «الاتحاد الدستوري» بوو گوتبووی ئەگەر کۆیەمان ژێر بەرەوژوور کردبێت نابێ مەسعوود محەمەد دەرچێت... لە ئاکامدا گوتم من لەسەر بەرپرسبوونی خۆم تەرشیحەکەم دەکێشمەوە حیزبیش چ بڕیارێک لەوە دەدات پێی ڕازیم. چوومە لای مدیری شورتە گوتم موژدە بێ هاتووم خۆم دەکێشمەوە، زەردەیەکی حەسانەوەی هاتێ لا لغاوەکانی گەیشتنەوە بنا گوێیانی. دەرحاڵ تەلەفۆنی هەڵگرت و بە موتەسەڕیفی گوت، لە خۆشیان بە تورکیشی قسە کرد لە بیریشی چوو موجامەلە بکات گوتی: مەسعوود بیتدی واتە، مەسعوود تەواو بوو... کەچی خۆی و مەتەسەڕیفیش تەواو بوون مەسعوود هەر ما. لەوە بەولاوە تەنها بۆ وەرگرتنەوەی جانتاکەم چوومەوە مەزکەز شورتەی خانەقا، پۆلیس و ئامیرەکەشیان هەتا جادە لەگەڵم هاتن کاکە زیادیش بەردرا، بەندییەکانی دیکەش پێبەپێ دەرچوون.

دواتر حیزب بڕیاری دا کە خۆ کێشانەوەم هەنگاوێکی ڕاست و دروست بووە بەڵام با ئەوە بڵێم کە من لە خۆ کێشانەوەم ڕەچاوەی ئەوەم کرد مەلا حەوێزاغا کە نوێنەری حکوومەت بوو، قازانج بکات چونکە حکوومەت و خەڵقیش بیستیانەوە مەلا حەوێزاغا گوتبووی ئامادەم ئەگەر داوام لێ بکەن خۆم دەکێشمەوە با فڵانەکەس دەرچێت.

حکوومەت لە ئاست ئەم ئیحتیمالەدا «شەفیقی عەولاغای حاجی تاهیراغای حەوێزی» کرد بە یەدەگ تا ئەگەر مەلا حەوێزاغا خۆ بکێشێتەوە شەفیقاغا خۆ

بپاڵێوێ. من بەر لەوەی کژی قانوونی خۆپاڵاوتە کردن بەسەر بچێت خۆم کێشایەوە وەهام نەکردایە شەفیقاغا خۆی دەپاڵاوت نەکا حەوێزاغا فێڵ لە حکوومەت بکات. پاش بەینێک تێگەیەندرام کە لەوانە بوو ئەگەر من بەردەوام بم لەسەر بەشداری کردن لە هەڵبژاردن جانفیدایەکی حیزب مورەشەحی حکوومەتی دەکوشت ئیتر من لە بەندیخانەش بم بە «تزکیة» دەردەچم... چاکتر بوو نەک - تەنها چاک بوو - کە خۆم کێشایەوە دەنا بە کوژرانی مورەشەحی حکوومەت ئەم دنیایە بە کەیفی ئێمە نەدەگەڕا، بە پێچەوانە، هەزار و یەک کەروێشکی لە ژێر شەپقەکەی دەردەهێنا، وەکوو ساحیر، هەریەکەی چەندین بەڵای ناگەهانی پێوە بێت...

نرخاندنم بۆ نیابەتەکەم لە کولانەی بەرژەوەندی گشتییەوە

مەبەستم ئەوە نییە خۆم هەڵسەنگێنم ئایا نایبێکی چاک بووم یان نا، چونکە سەنگی من و پلەی دەرچوونم و کەوتنم لەو ئەزموونەدا ناچێتەوە جەرگەی سوودی گشتیی میللەت، مەبەستم ئەوەیە ئایا ئەو نیابەتە کەوا یەکەم هەوڵ بوو لە هەموو مێژووی کوردستانەکەی خۆماندا توانیبێتی بە هەرا و مەزاد نوێنەری گەیاندبێتە پەرلەمان، یەکەم نوێنەریشی بوو لە ناو کورداندا دوابێت و نووسی بێت و بارتاقای نوێنەرانی عەرەب دەنگی بەرز کردبێتەوە، ئا ئەم نیابەتە لە باشترین ڕێگە و لە بارترین تاکتیکیدا ڕۆیشت؟ دامنا یەکێکی دیکە بوو من نەبووم، ئایا ئەگەر هەمان ڕێگەی منی گرتبایە بەر کە موعارەزەی خەست و خۆڵ بوو تا ئەوەی یەکجارەکی ڕێی بەشداربوون لە وەزارەتم لە خۆم کوێر کردبۆوە ئایا بەو ڕێگەیەدا خزمەتی گەورەی کوردی دەکرد؟

خەباتگێڕان چەند بنگەیەکی ئایدیۆلۆجییان کردبوو بە ئنجیل کە نەدەشیا هیچ خەباتگێڕێک لێی لا بدات وەک ئەرکانی نوێژ و نیکاح و تەڵاق، لە زۆر حاڵوباردا ئەو بنگە ئایدیۆلۆجییانە لەگەڵ بەرژەوەندی کورد کە میللەتێکی زەدەی مێژووە یەکدی ناگرنەوە. ئەو بنگانە سەر دەکێشنەوە بۆ بەرژەوەندیی هەموو مرۆڤایەتی کە لە کولانەی ئینتەرناشناڵ و خەباتی چینایەتییەوە سەیر دەکرێت. کوردی هەژار لە هیچ دەفتەرێکی ئەو تەرزە بنگانەدا ناو و نیشانی نەبووە، بایی ئاردی ناو دڕکیش خێر و بەرەکەتی لێ وەرنەگرتووە، بۆ خۆشی بە بەریەوە نییە هەستە و پیتاک بە

دنیادا بڵاو بکاتەوە وەیا قوربانی لە پێناو ئامانجی بنی دنیا بدات کە هەر نازانێ کورد چییە.

ئێمەی بەستەزمان ئیفلاس دەکەین کە دێین لە خۆوە بۆ خۆمان بیتاقەی دەعوەت بۆ بەزمی خواپێداوان دەردەکەین و ڕێشمان پێ ناردێ بچین بۆ سەرمێزی خواردن، وەک ئەو ساڵەی کە نوێنەرانی کورد لە کۆبوونەوەی گەلانی ئاسیایی ئەفەریقیایی لە قاهیرە دەرکران، کەچی نوێنەرانی قوڵی ئەمەریکا، کەوا نە میللەتن نە ئەفریقایی و نە ئاسیایی، بە چەپڵەڕێزان چوونە سەر داوەتەکە...

کورد نابێ بە هەوای ناو نەزەرییان خۆ بکاتە مەسیحی سەدەی بیستەم و بیستویەکەم لە پێناو سەلامەتیی جیهانی بێپایان و سەروبن. خۆ ئەوەی ڕاستی بێت من و غەیری من کە دێین لە خۆمانەوە دەبین بە وەکیلی میللەتی کورد بۆ قوربانی دان و سەر بەقوڕی چ ئیمزامان لەو میللەتە وەرنەگرتووە تا فتوای بەپەتەوەبوونی دەرچوێنین. ئێمەی هەژاری کەساسی بێپەنا ئەگەر بتوانین بەرە شرەی خۆمان لە ئاو دەربهێنین، کە پێشمان دەرنایەت، ئەوپەڕی ئامانجی مومکینمان جێبەجێ کردووە، کە پێشمان ناکرێت.

لەو سەردەمەدا پارتایەتی خۆی سیفەتی قانوونیی نەبوو ئینجا وەرە بۆ سەربار تۆمەتی ئینترناشنالیزمیشی لێ بار بکات. من چیمە بەسەر بزووتنەوەیەکی ئاشتیخوازی کە لە دوو لاوە ڕێی منی بۆ نەدەڕۆیشت، لایەکیان ئەوەیە ئەم بزووتنەوەیە لە نەزەر حکوومەتدا بێقانوونی بوو چونکە سەربە ڕاڕەوێکە ڕووی لە دەرەوەی عێراقە. من نەتوانم پارتایەتیی خۆم ئاشکرا بکەم لە ترسی گیران و ماڵوێرانی بۆچی وەها ئازابم لە ئاشتیخوازیدا بچمە چاوی حکوومەتەوە بانگی بۆ ڕابهێڵم، عسعس مارابگیر!

کە تۆمەتی خۆڕاییم درایە پاڵ و هەڵوەستی قانوونیم بێهێز بوو، لەبەر شتێکی نە کوردایەتیی تێدایە و نە کەسیشی پێ مەمنوون دەبێ لە کورد، کام پەڵە دەغڵم درووەتەوە! کام دیوارم ڕاست کردۆتەوە بۆ لێقەوماوێکی کورد! کام بنگەی مافی نەتەوایەتی وەیا چینایەتیی کوردم چەسپاندووە! لە زەرەری خۆم و کورد بەولاوە چ بەرهەمێکم پێشکەش بە کوردستان کردووە؟

لای دووەمی ئەوەیە کە وا بە ڕادەی پەرەستاندنی ئەو بزووتنەوەیە لە کوردەواریدا

پارتایەتی و بزووتنەوەی کوردایەتی لە ئاست خاوەنانی ئاشتیخوازیدا بێهێز دەبوو. لەوە هەر بگەڕێ کە پاراستنی ئاشتی لە هەڕەشەی شەڕ بەو بۆمبا ئاتۆمیانەی ڕووس دەکرێ کە پارسەنگی ئاتۆمیەکانی ئەمریکا دەداتەوە و بە پێچەوانەش... ئیمزای کاکە ئازاد و قامکی خالۆ مراد بەسەر ئەرزوحاڵی ئاشتیخوازییەوە لەوە تێپەڕناکات کە پێوەندییەکی بەردەستانە لەو دوو کەسەوە بۆ خاوەنانی ئاشتیخوازی، کە بەرەی هەرە چەپە، هەڵدەنێت. ئاشتیخوازی و هەموو ڕێکخراوەکانی دیکەی کە دیتمان دوای شۆڕشی چواردەی تەمووز کوردستانی تەنییەوە تا ئەوەی «العلماء الاحرار» (عولەمای ئەحرار) یش بۆ لایەنی دین هەڵنرا، سەرلەبەریان ڕووخساری جۆراوجۆری چەپایەتی بوون و فڕیان بەسەر پارتایەتی و کوردایەتی و کوردستانایەتییەوە نەبووە. هەر وەک لە نەزەر باوەڕی ماددیدا نوێژ و حەج خزمەتی گەل ناکەن هەروەهاش لە نەزەر ڕاستیدا خۆماندووکردنی کوردێک بە غەیری سوودی پاتەوپاتی خۆی و میللەتەکەی ڕەنج بەخەسارییە و بەس.

من کە نایب بووم دەبوو بزانم و لێشم بسەلمێندرێت، هەوڵدان و سەرکەوتنم بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەک لە لادێیەکی کوردستان هەزاران هەزار جار بۆ کورد سوودمەندەرتر و بەشەرەفترە لە ناز و فیزی شانۆگەرانەی قسەقەڵەوی پف هەڵدراوی تاوانبار کردنی پەیمانی ئەتلانتیک لە ئاست پەیمانی وارشۆدا.

ئاکرێ کارەبای لێ هەڵکرابایە هەزاران هەزار ئەو قەسیدانەی دەهێنا بۆ کۆریای شیمالی و بوولبوولی ڕەش هەڵدەبەستران. دوو گەشتەکەی «گۆران» بۆ هەورامان و قۆپی هەموو ئەو بەشەی دەهێنا لە دیوانەکەی کە خەریکی چەپاتەتییە. چوونم بۆ لای نووری سەعید - کەوا ڕەنگە بە لای چەپڕۆیەکەوە ناجایەز بێت - هەموو هەڵوەست و گوتار و دووانێکم دەهێنێت کە بە دڵگەرمی و بێ ئامانجی واقعی لە من کەوتوونەتەوە چونکە عەشرەتێکی کوردی گێڕایەوە بۆ شوێنی خۆی و کۆمەڵێک حەپسی چەند ساڵەی ڕەها کرد.

لەو گوتارەی کە بۆ پشتگیری کردن لە فەلاحی دزەییم نووسی لێکدانەوەیەکم خستەپێش حکوومەت کە هەر بە مەنتیقی خۆی ناچاری سەلماندی دەبوو، گوتم ئەو هەزاران هەزار ماڵە فەلاحەی لە ئاکامی دەرهێنانی زەوییەکانیان لە دەستیان، ناچاری پەڕاگەندەیی دەبن بۆ گوزەران، چۆناوچۆنی حکوومەت و وەزیری «داخلیە» دەتوانی لە باری وەهادا ئاسایش بپارێزێت؟ چۆن ئەو پەڕاگەندانە تێر دەکات؟ لە

کوێیان داده‌مه‌زرێنێته‌وه‌؟ (ئه‌گه‌ر ئه‌مانه‌ ده‌قاوده‌قیش نه‌بن گوتاره‌که‌م شتی وه‌های تێدا بوو). دۆستم هه‌بوو له‌ داخلیه‌ پێمی گوت: دوای گوتاره‌كه‌ت یه‌كسه‌ر وه‌زری داخلیه‌ فه‌رمانی دا به‌ هه‌ولێر تراكتۆر ڕابگیرێت. ئه‌مه‌ت وه‌ها كه‌چی براده‌رێكم دوورخرابۆوه‌ بۆ ڕه‌مادی به‌ ته‌له‌فۆن پێمی گوت كه‌ گوتاره‌كه‌ «توفیقی»یه‌ واته‌ شۆڕشگێڕانه‌ نییه‌. كه‌ چووشمه‌وه‌ كۆیێ نوێنه‌ری چه‌پ هه‌مان تێبینی براده‌ره‌كه‌می ده‌ربڕی. نه‌ده‌كرا له‌گه‌ڵ براده‌ره‌كه‌م به‌ته‌له‌فۆن درێژه‌ بده‌م به‌ڵام به‌وم گوت، من كه‌ بتوانم به‌ مه‌نتیقی حكوومه‌ت خۆی په‌كی بیه‌خه‌م چ لزووم هه‌یه‌ هانا ببمه‌ به‌ر نه‌زه‌رییه‌ی نه‌رم و توندی ناو كتێبان وه‌ك ئه‌وه‌ی كه‌ من داوای خانوویه‌ك له‌ كابرایه‌ك بكه‌م ئه‌ویش له‌ محكه‌مه‌ دان به‌ حه‌قمدا بهێنی چ لزووم ده‌كا سه‌نه‌دی تاپۆ ده‌ربهێنم؟ مه‌به‌ست حه‌سانه‌وه‌ی فه‌لاحه‌ خۆ شه‌ڕی جیهانیی چینایه‌تی به‌رپا ناكه‌م!

قسه‌ له‌ زۆر لاوه‌ هه‌ڵده‌ستێت به‌ڵام به‌ دوو نوخته‌ی ده‌یبڕمه‌وه‌، مه‌به‌ستیش چه‌ندوچۆنی چاكه‌ و ناچاكه‌ی نایبێكی ئه‌وسا نوێنه‌ری میلله‌ت بوایه‌،

- نوخته‌ی یه‌كه‌م: نه‌ده‌شیا و ئێستاس ناشێ نوێنه‌ر دژی قانوون بڕوات و یا بنگه‌ بنه‌ڕه‌تییه‌كانی ڕژێم بله‌رزێنێ چونكه‌ پێی بێهێز ده‌بێ.
- نوخته‌ی دووه‌م: چاو ببڕێته‌ سوودی ئه‌و خه‌ڵقه‌ هه‌ناسه‌سارده‌ی له‌ ئاهـ و نزادایه‌ بۆ پاروێ نان، نه‌ختێ داد، كه‌مێك حه‌سانه‌وه‌ ده‌نا كه‌ڵكی لێ ده‌برێت.

خوێنه‌ر بمبه‌خشێت له‌وه‌دا كه‌ درێژه‌م به‌ باسی نیابه‌ته‌كه‌م دا هه‌رچه‌ند به‌لای خۆمه‌وه‌ جارێ زۆری ماوه‌ لێی ببمه‌وه‌ به‌ڵام وا په‌سه‌ند ده‌كه‌م چیدیی له‌سه‌ر نه‌ڕۆم به‌ڵكوو نۆره‌ ده‌گاته‌ ڕووپه‌ڕه‌ی دیكه‌ی ژیانم كه‌وا ڕه‌نگه‌ ئه‌ویش تروسكه‌یه‌ك بخاته‌ سه‌ر ئه‌و ده‌وروبه‌ر و هه‌ڵكه‌وته‌ی تێیدا ژیاوم و پێیدا تێپه‌ڕیوم. له‌م ناوه‌دا خه‌ریكبوونم به‌ نیابه‌ته‌وه‌ ڕێی له‌ دوو ڕووداوی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ گرت كه‌ باسیان ده‌كه‌م، یه‌كیان ته‌تویجی مه‌لیك فه‌یسه‌ڵی دووه‌م، ئه‌وی دیكه‌شیان به‌شداری كردنم له‌ یه‌كه‌م كۆبوونه‌وه‌ی ئاشتیخوازان له‌ سه‌ره‌تاكانی هاوینی ١٩٥٤ له‌ به‌غدا. ده‌بێ بۆیان بگه‌ڕێمه‌وه‌ له‌ ئاڵقه‌ی داهاتوودا هه‌رچه‌ند به‌ كورتیش بێت.

## ئاڵقەی یازدەیەم

لە ئاڵقەی پێشووتر بەڵێنم دا، بە کورتییش بێت باسێکی تەتویجی مەلیک فەیسەڵی دووەم و هی کۆبوونەوەی ئاشتیخوازان لە بەغداد بکەم.

هەرچەند خەڵق بە تێکڕایی دەیانزانی، بە تاج لەسەرنان، نە باری سیاسەت و هیچ شتێکی دیکە دەگۆڕێت، نە فەیسەڵیش لەو قەفەسەی کە عەبدولئیلاھ دەوری پێ گرتووە لێی دەردەچێت، دیسانەوە تەتویج خۆی لە خۆیدا ڕووداوێکی سیاسی و هەمەگیرە. هەروەک بە هاتنی جەژنی ڕەمەزان ئەوەی بە ڕۆژوویش نەبووە خۆی بۆ ئامادە دەکات و ڕەنگە جلکی نوێشی بۆ ساز بدات، هەروەهاش حکوومەت و میللەت و سیاسییە موعاریزەکان بە ناچاری چاویان بڕیبوە ئەو ڕۆژەی کە دەورەی «وصایة»ی عەبدولئیلاھ بە ڕواڵەت و (لە لایەن دەستووریشەوە) لەسەر مەلیک هەڵدەستێت. هەموو ئەوانەی بەتەما بوون، یاخود ئاواتەخواز بوون دەرفەتێک پەیدا بێت بۆ تێخستنی کەلێنێک لە تامانی سفت و پتەوی سیاسەتی نووری سەعید بە دەوری ناوک و ناوەڕۆکی حوکمەوە، بەڵکوو ئاسانتر بگەن بە دەسکەگوڵی وەزیرایەتی، وەیا سەرۆکایەتیی وەزیران، وردە حیسابێکی خۆشکەڵەیان بە دڵدا دەهات لەوەدا کەوا ڕەنگە بەدەم ڕۆژگارەوە مەلیک فەیسەڵیش پێ لەسەر دڵخوازێکی خۆی دابگرێت و دەستەوتاقمێکی تایبەت بە خۆی بژاردە بکات، بەمەشدا دوو کوچکە دەسەڵاتی نووری سەعید و عەبدولئیلاھ ببێت بە سێ کوچکە و چانسی تێهەڵکشین لە دوو شیمانەوە (شیمان - احتمال) ببێت بە سێ، چونکە هەتا شاباشدەر پتر بێ شاباش وەرگر قازانج دەکات.

موعارەزەش لە لای خۆیەوە بەسەرچوونی دەوری وسایەتی ناحەزانەی عەبدولئیلاهی بە هەلێک دادەنا، هەرنەبێ لە ڕووی ئەوەوە کەوا تەجرەبەی تاڵ و تفتیان لەگەڵ عەبدولئیلاهدا وەهای لێ کردبوون ڕووی لێ نەنێت مەگەر لەوپەڕی ناچارییەوە بێت. بە عادەت و بەپێی داخوازی باری قانوونی و دەستووریش، کە موعارەزە لەگەڵ حکوومەت پووشکەی پساند و سەلام لە نێواندا نەما، ڕوو لە سەرۆکایەتیی دەوڵەت دەکات بۆ دەربڕینی دادوبڕۆی خۆی. ئنجا کە هات سەرۆکی دەوڵەت، وەیا جێگری ئەو سەرۆکەش (کە ئەوسا عەبدولئیلاھ بوو) گرێپچکەی

خستە پێوەندیی خۆی بە موعارەزەوە هەموو ڕێگەیەک لە پێش موعارەزەدا کوێر دەبێتەوە بۆ چالاکیی سیاسی لە مەیدانەدا کە قانوونی و دەستوور بە ڕەوای داناوە ئیتر جموجووڵەکەی باری نهێنی و پلانگێڕی وەردەگرێت. مەبەستم لەو موعارەزەی ناو مەجلیسی نیابی نییە، مەبەستم لە جیهانی بەرفرەوانی دەرەوەی مەجلیسە، کە ئەوسا حیزبی وەتەنی دیمۆقراتی و حیزبی ئیستیقلال دوو دەوری سەلمێندراوی ئاشکرای موعارەزە بوون، من لە هەردوو لایەنم دەبیست، بە هەناسەیەکی حەسانەوەوە و خۆشامەدی کردن باسی تەتویجیان دەکرد. هەر ئەو موناسەبەیە خۆی هەلێکی باش بوو موعارەزە بیکات بە هۆی داوا کردنی گۆڕینی سیاسەت.

هەرچی میللەت بوو، کە حیسابی جودایە لە سیاسی و ڕۆشنبیری و ئەهلی وشە و مەهارەت، لێکدانەوەشی زۆر دوورە لە هی ئەو کۆمەڵە خوولیادارە، چ ناحەزایەتیی پێوە دیار نەبوو دژی تەتویج و بنەماڵەی مەلیک. من ئاگاداری شاری بەغداد بووم. ڕۆژێ مەلیک بە شەقامی ڕەشیددا بردرا بۆ پەرلەمان تا سوێند بخوات و تاج لەسەر بنێت من چونکە جلکی ڕەسمیم نەبوو پێی بچمە ئەو کۆبوونەوەیەی کە دەمزانی هیچ دیکەی وەک خۆی بە دوادا نایەت، بەینێک لە شەقامی ڕەشید خولامەوە هەتا دەسەودایەرەی مەلیک تێپەڕی.

شەقام مۆنجەی دەهات، هەزاران هەزار لە بەرەبەیانییەوە شوێنی خۆیانیان گرتبۆوە نەکا دواتر بکەونە ڕیزەکانی پشتەوە. خوا هەڵناگرێ ئەو خەڵقە بە دڵ بەزەیی و خۆشەویستیی خۆیانیان دەردەبڕی. لەگەڵ چەپڵەڕێزانی ئاپۆرەی خەڵک بەشی زۆری ئافرەتان بە دەنگ بۆ «بێباوکی و بێدایکی»ی مەلیک دەگریان و بەسەدەقەی دەبوون. تۆ بڵێی ئەگەر ئەو ئافرەتانە لە گۆشەیەکی غەیبەوە تێگەیشتبانایە کە دوای پێنج ساڵ و دوو مانگێک ئا ئەم بێ دایک و بابە لە ڕەگوڕیشەوە هەڵدەکەندرێت دەبوو چ بڵێن و چ بکەن؟ ئەوەی ڕاستی بێت خۆم لەو دەمەدا کە مەوکیبی بەرەو پەرلەمان دەکشی هەستی بەزەییم دەکرد. ئەو دەمەش کە لە ڕۆژی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ زانیم کوژرا، نەک هەر پێم ناخۆش بوو بگرە ڕەشبینییەکی خەست دایگرتم، دواتریش کە گوێم لە ڕادیۆ دەبوو دەیگوت جەماوەر وا خەریکە کەلەشڕاکێشی دەکات، هەرچی هەستی شیرنایی و خۆشی بوو لە ناخمدا کپ بوو.

خەڵقێک دڵی بچێتە سەر ڕاکێشانی لاشەی خوێناوی و بە نوێژی نیوەڕۆی گەرمای چواردەی تەمووزی بەغدا - کە ئەو ساڵە لە ڕادەبەدەر گەرم بوو - بە ئاسانی

بادەداتەوە سەر کوشتنی برادەری خۆی کە بزانێت دوو قڕووش قازانج، وەیا یەک هەنگاو بەرەوپێشچوونی تێدایە. مرۆ ناشێ ببێتە گورگ...

بۆ داوەتی شەو کە لە «قصر الرحاب» بەرپابوو جلکی کوردیم لە جوانەمەرگ ئەحمەدی حەمەد ئەمیناغای دەزیی خواستەوە... ئنجا یەکێکی ئەو وێنەیەمی دیتبێ کە لە ئاڵقەیەکی «الجذور» بە جلکی کوردییەوەم لەو داوەتەدا نیشان دەدات بابزانێت زێدە کوردایەتیم جلکەکەی پێ لەبەر نەکردبووم بەڵکوو بێچارەیی نەبوونی جلکی ڕەسمی لێمی داوا کردبوو.

گوتەیەکی میسری هەیە دەڵێ: «يدي الحلق للي بلا ودان» واتە: گوارە بە یەکێکی بێ گوێ دەدات، ئا ئەمە بۆ من ڕەخسا وەک بۆتی دەگێڕمەوە. پێداویست وەهای داخوازی کرد چەند ڕۆژێکان هامووشۆ بە شەقامی ڕەشیددا تەنها بۆ ئەو ئۆتۆمۆبیلانە بێت کە نیشانەیەکی تایبەتی پێوە بێت. من سەیارەم نەبوو بەڵام نیشانەکەم بۆ هاتبوو. وا ڕێککەوت لەو ڕۆژانەدا حەمە تەیباغای تاهیراغای حەوێزی، خاوەنی مەعمەلی جگەرە، کە یەکێک بوو لە دەوڵەمەندەکانی ئەوسای بەغدا داوەتی فراڤینی کردم و بەو بۆنەوە لە جەماعەتێکی هەرە دەوڵەمەندی بەغداشی گێڕابۆوە وەک، «عبدالعزيز البغدادي، عبدالهادي الچلبي، داميرچي، حافظ القاضي...» بە دەم باسی تەتویجەوە، «حافیز قازی» کە ئۆفیسی لەسەر «شارع الرشيد» بوو گوتی، لەو چەند ڕۆژەدا لەبەر مەنعی ئۆتۆمبیل هەتا دەگەمە ئۆفیسەکەم ماندوو دەبم، نیشانەم نییە بە سەیارەی خۆمییەوە بکەم. گوتم، تۆ سەیارەت هەیە بێ نیشانە منیش نیشانەم هەیە بێ سەیارە، خۆ ناشێ بڵێم سەیارەکەت بۆ من بێت، با نیشانەکەم بۆ تۆ بێت... دواتر برادەرێکم کە زانی نیشانەم بە حافیز داوە گلەیی کرد کە چۆن ئەوم لە بیر کردووە (لە ماڵەوە سەغڵەتیان کردبوو). دڵیم دایەوە بەوەی کە نیشانەی نایبی پژدەر، عومەری خدری حاجیاغام بۆ وەرگرت... لەو داوەتە قازی عەبدولحەمید ئەترووشی-ش بانگهێشتن کرابوو کە پێشتر شناساییمان هەبوو... دوای ڕۆیشتنی خەڵقەکە جارێ من مابوومەوە «فخری جمیل پاشا» ش هەتا هەڵستام باسی مەلا ئەفەندی و باوکمی بۆ گێڕامەوە... لە قسەدا بوو هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی، «من بعد ملا افندی انحرمت من لبن اربيل» کە گەیشتمەوە ئۆتێلەکەی خۆم دیتم لە هەولێرەوە دوو کیسە ماستی شاهانەم بۆ هاتووە. خێرا بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ حەمە تەیباغادا

کرد کە سایقەکەی بنێریتەوە بۆ ئەو دوو کیسە ماستە، یەکێک بۆ فەخری پاشا ئەوی دیکەش بۆ خۆی... چەند ڕۆژێکی دیکە فەخری پاشا داوەتێکی فتاری ڕەمەزانی کردم هەمان گرووپی داوەتی پێشوو بەشدار بوو... هەر ئەوە بوو هیچی دیکە بە دوادا نەهات، زۆریشی نەبرد من لە پشووی هاوینە بۆ کۆیێ گەڕامەوە.

فەخری پاشا لە پیاوە ناودارەکان و مەزنی بنەماڵەی «جمیل» و لە دۆستانی مەلیک فەیسەڵی یەکەم بوو. بووبوو بە وەزیر و سەرۆکی مەجلیسی نەواب و «عین»، ئاکاری مەردانەی لە قسە و ڕەوشتی دیار بوو. ڕێکەوتێکی خۆش بوو لەو دیتنانەدا کەوا باس کردنی ڕۆژگارانی بەسەرچوودا قسەمان گەیشتە ئەو پێوەندیی دۆستایەتییەی لە ساڵی ١٢٩٣ ک ١٨٧٦ ز لە نێوان باپیرم، حاجی مەلا عەبدوڵا، و مەزنی ئەوسای بنەماڵەی «جمیل»دا کە «محمد الجمیل» بووە پەیدا بووە. باپیرم گەلێک باسی لە مەردایەتیی ئەو «محمد الجمیل»ـە گێڕابۆوە، تەنانەت لە هەموو ئیشوکار و موراجەعەی ڕەسمی بۆ لای خاوەن پایەبەرزەکانی ئەو سەردەمە یارمەتیدەر و ڕێزپارێزی بووە. تەمەنی پێوەندییەکە لە سەردەمی باپیرم تا ئەو ڕۆژەی من ناسیاویم لەگەڵ فەخری پاشادا پەیدا بوو ٧٧ ساڵی ڕێک بوو...

من بەر لە تەتویج، مەلیک فەیسەڵم دیتبوو، دواتریش پتر لە جارێک چوومە خزمەتی. مرۆیەکی سافی دڵپاک بوو. ئەگەر دەسەڵاتی هەبوایە لە چاکەی خەرج دەکرد. مەرگ هەلی نەدایێ بزانین دوای قاڵبوونەوە و چەپ و ڕاستی خۆناسین چۆن دەبوو...

بێمە سەر یەکەم کۆبوونەوەی ئاشتیخوازانی عێراق کە لە هاوینی 1954 لە شاری بەغدادا گیرا و تێیدا بەشدار بووم. ڕاستییەکەی ئەگەر بڕیاری حیزب نەبوایە لەوانە نەبوو بۆی بچم، کە بڕیاری حیزبیشم پێڕەوی لێ کرد بۆیە بوو کە دەرچوونم بە نایب بۆ جاری دوەم بە مجێزی حیزب نەبوو، نەدەشیا لە باری وەهادا نافەرمانی بکەم چونکە دەبووە بەهانەی دەوام دان بە ناکۆکی و دڵشکان. سەد فەلسەفەم بەکارهێنابایە بۆ ئەوەی کە هەڵوەستم لە ئاست ئاشتیخوازی هی قەناعەتە بایی فلسێک بوو. لە موناسەبەدا دەڵێم، جارێکیان لەگەڵ ئەندامێکی زێدە دەسەڵاتداری حیزب کەوتینە باسی ئەوتۆیی، من گوتم نەدەبوو ئاشتیخواز لە دەستدرێژیی کۆریای باکوور بەرانبەر کۆریای باشوور خامۆش بێت. لە وەڵامدا زۆر بە هەناسەی سوارەوە گوتی کۆریای سەروو کە برامە دەڵێ کۆریای خواروو لە هەوەڵەوە دەستدرێژیی کرد

تۆش بە عەکسەوە دەڵێیت. ڕاست وەکوو مەلا گوتی بە زەڕەی کەر بڕوا دەکەیت بە قسەی مەلا بڕوا ناکەیت. من لە سەرەخۆ گوتم بڵێم چی کەرەکە ڕاست دەکا و مەلا درۆزنە... وەک لە بیرمە کۆبوونەوەکە لەماڵی «فارووق پرتەو» گیرا. پاش گفت و لفت و گوتار سێ کۆترەی زێڕینی بچووک بە سێ کەس درا لە بری خزمەتیان بە ئاشتی، یەکێکیان ئیبراهیم ئەحمەد بوو.

بەلای باوەڕی منەوە کە ڕەنگدانەوەی واقیعی بێفێڵە، ڕێکخراوی وەک ئاشتیخوازی، نیقابەی هەر پیشەیەک بێت، کۆمەڵەی وەرزێران، مافی ئافرەت... هی قوتابی... هی دین و دنیا بێت پێویستە لەلایەن خەڵقەکە خۆیەوە بەپێی داخوازی بەرژەوەند و باوەڕیان ڕسکا بێت نەک حکوومەت سازاندبێتی چونکە ئەوسا کە بوو بە داروەکازی حکوومەت لە خواز و خواییشتی ئەندامانی دەشۆرێت و ڕەنگە بە زۆریش وەها بڕەقسێت کە دژی ئەو بنەمایە بێت کە لە سەری هەڵستاوە. ئەگەر ئاشتیخوازی بەپێی ڕواڵەتی زێدە ئاشکرای واتاکەی لە عێراق، یان لە شوێنێکی دیکە ڕسکابایە دەبوو نەک هەر یەخەی حکوومەتی خۆی وەیا ئەمەریکا بگرێت بەڵکوو باداتەوە سەر چین و ڕووسیاش لەو حاڵەتانەدا کە ڕەفتاری ڕووەو جەنگیان کردبایە.

من کە بە دەم دەربەگدا بێمەوە لە ئاست ئەو دەستدرێژیەی لە وەرزێری دەکات دەبێ ڕەخنەی نارەزایی لە حیزبەکەی خۆم و غەیری خۆشم بگرم کە بەتەما بێ خەڵق بە گوریس ڕابکێشێت، وەیا بە کەیفە بیانخاتە زیندانی ئەشکەنجەوە. کە ڕێکخراوەکەم هی حکوومەتی خۆم یان هی دەرەوە بوو دەبێ چاوەنۆڕی فەتوا بم لەوەوە، لە حکوومەتەوە، دەرچێت بۆ ناڕازیبوونم کە ئیتر ڕەنگە بەپێی تەبیاتی خاوەنی فەتواکە بەگژ شتێکدا بێمەوە کە زۆری حەز لێ دەکەم. من ئەگەر کۆترەی زێڕم پێ درابایە دەهاتم لە ساڵی ١٩٦١ کە کەریم قاسم بە فڕۆکەی مێگ کوردستانی بۆمباردمان دەکرد ئەو کۆترەیەم بۆ بەرەی ئاشتیخوازی جیهانی دەناردەوە و دەمگوت «ماڵی قەڵب سەربە ساحێبی»...

ئەو ڕێکخراوانەی کە حکوومەتان سازیان دەدەن هەرگیزاو هەرگیز خەریکی کارێک نابن کە لە ژێر سایەیاندا و بە ناوی ئەوانەوە هەڵنراون بەتایبەتی لەو وڵاتانەدا کە «دروشم»ی بێناوەڕۆک بایەخدارترە بۆ ڕازاندنەوەی ئامانجی سیاسی لەو بەرهەمەی کە دەبوو هەڵگرانی دروشمەکە بە میللەتی بدەن. ئەو لایەنەی کە دەیەوێ لە ڕێی نمایشت و تێکهاویشتن و بێئۆقرەییەوە بە دەسەڵات بگات چ

مەبەستی نییە پەتاتە دەڕوێ یاخود کارگە ئیش دەکات. کوردی گوتەنی، ئەو لایەنە بەزمێکی دەیزانێ سێپییە و هیچی تر... دەوجا نە حەز لە سێپێی دەکەم نە بەرژەوەندیشی بۆ کورد و بۆ جەماوەر تێدا دەبینم نە ئەنجامێکی لێشی چاوەڕوان دەکرێ ئەو هەموو جانفیدایی و خەڵق بە کوشت دانە دەهێنێت. لوکسەمبوورگ هەناسەشی سوار نەبووە و زۆریش تێروتەسەلە... بەهەمەحاڵ فایەلم لە تەحقیقاتی جینائی تۆمەتی ئاشتیخوازیشی خرایە سەر... دواتر، وەک بۆتی دەگێڕمەوە، ئەو تۆمەتەم بە چاوی خۆم خوێندەوە...

پاش بەسەرچوونی هەرای هەڵبژاردنە باسکراوەکەی ناوتوێژی ئاڵقەی هەشتەمی ئەم یاداشتانە خەڵقەکەی بەندی کرابوون و دوور خرابوونەوە ڕێیان پێ درا بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان. من لە ئیستیراحەتخانەی ئێستکەی شەمەندەفەر دابەزیبووم. لە حکوومەتی هەولێرەوە چ سەروسۆراغێکی گەڕانەوەم بۆ کۆیێ دەرنەکەوت. کاغەزێکم بۆ وەزیری داخلیە، سەعید قەزاز، نووسی کە ئەگەر چی دیکە بەندم بکەن لە هەولێر، یەخەی حکوومەت دەگرم لە دادگا بۆ زەرەر و مەسرەفێکی لە کیسم دەچێت... هەر کاغەزم گەیشتە بەغدا موتەسەڕیف پێوەندی پێوە کردم کە دەتوانم بچمەوە کۆیێ و وەزیر دەڵێ ئەو بەینەش بە چاکەی خۆی- نەکا لە کۆیێ ناڕاحەت بێ- لە هەولێر هێڵراوەتەوە.

چەند قسەیەکم هەیە دەیکەم ئەمجا بە ڕێگەی گەشتەکەمدا دەڕۆم. هەرچەند پێویستیش بێ بیروڕا بە بەڵگە بچەسپێت، لێرەدا مەودای بەڵگەکاری و چەسپاندنی زانستی و هەڵوەشاندنی پسپۆڕانە بە دەستەوە نییە، ناچارم بە کورتی لە نیشاندانی بیروڕای خۆم ببمەوە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەی لەم جیهانەی سێیەمدا خەریکی سیاسەتن بابای سەربە تیۆری و وشەسازی و بەلاغەت و دروشم هەڵکردن و چشتی ئەوتۆیین، بەتایبەتی لە نێوان بەرەی بەرهەڵستی حکوومەت کە بەشێکی زێدە بەرچاویان لە بنەڕەتدا بەرپرسی خێزان بەخێو کردنیش نین، تەنانەت بڕبڕە و کۆڵەکەی ئەغڵەب بزووتنەوەی توندوتیژ قوتابیی پلەی ناوەندی و بەرەژوورترن کە خۆیان بارن بەسەر باوکیانەوە. تاکێک لەو حیزبانەی بەیداغی نیشتیمانپەروەرییان هەڵگرتوە و هەڵگرتبوو ئەگەر ڕێکەوت کردی بە حکوومەت، نازانێ چ بکات چونکە پرۆژەی بۆ چارەسەر

کردنی هیچ کێشەیەک ساز نەداوە. هیچیان سەرەدەری لە بازاڕ و شەمەندەفەر و مەرەزەی برنج و کێڵگەی گەنم و جۆ و تووتن و تیجارەتی دەرەوە و ناوەوە... ناکەن.

هەرچی بەرهەمهێنی ڕاستەقینەیە خەریکی کەسبی خۆیەتی و نە دەزانێ خوتبە بدات و نە گوتاری ئاگرین بنووسێت و نە هوتاف لێ بدات و نە دروشم هەڵبگرێت. نیشتیمانپەروەر تەنها لە گەپی «بژی، بمرێ» پسپۆڕە و وەک دەستی لەسەر پەلاپیتکە بێت وەها ئازا و ئامادەیە هەرچی بەرژەوەندی لە دەستدایە و خەڵقی بێ دەژیت سەرەوبنی بکات بە تۆمەتی خوێنمژی و چەوساندنەوە و بۆرجوازیەتی و دەرەبەگایەتی و سەربە ئیمپریالیزمی و جنۆکەپەرستی.

تا ڕۆژی ئەمڕۆکەی ١/٢/١٩٨٨ لە سەدی یەکێکی ئەفەندییە سیاسییەکانی بەرەی هوتاف و دروشم و بژی و بمرێ نەهاتۆتە سەر ڕامان لە ڕەوابوون و ڕەوانەبوونی ئەو قازانجەی «صراف»، وەیا بانک لە خەڵقی وەردەگرێت و بەخەڵق دەدات... خوا دەست بە عومرمانەوە بگرێت، لە پەنجاکاندا هەر بینایەکی حکوومەت بیکردایە پڕ بە دڵ داوای ڕمانیمان دەکرد چونکە وامان دەزانی کە بۆ سپای ئەمەریکا دروست دەکرێت... سەددی دووکان تەیارەخانەی دەریایی بوو... خولاسە نیشتیمانپەروەر لە نێوان چوار دیوارەی خەیاڵ و خەون و وڕینەی خۆیدا دەخولایەوە، هەرگیز ئەو چاوەی لێ نەڕسکا سەیری باری ڕاستەقینەی بازاڕ و کوچە و گەڕەک و مزگەوت و ڕەز و باغ و پاوان و کەرخ و پاراوی مەرەزەی پێ بکات و تێی بگات.

سەقافەتی نەزەری، ڕۆشنبیری دنیای سێیەمی لە خۆی و لە خەڵق ترازاندبوو. لە بیرمە کوڕی خزمێکم لە مەکتەب دەرکرا سەبەب بە کەوتنی دوو ساڵ لەسەریەکی. یەخەی باوکی گرت و هێنایە حەمیلکان کە لە عەسکەری بیکرێتەوە دەیگوت، من ئیستیعمار هۆی کەوتنمە دەبێ بمکرییەوە. باوکەکە دەیگوت ڕۆڵە خۆ من ئیستیعمار نیم... هیچیشی نەبوو بیکاتە «بەدەل»ی عەسکەری. ئەم خزمەی من نموونەی ملیۆنەها تێکۆشەرانی جیهانی سێیەمە. لە نموونەدا دەڵێم، تووتن مایەی ژیانی سەدان هەزار کوردی عێراق بوو، دەسا پێم بڕوا بکە تاکە یەک کادری پارتی، وەیا شیووعی، نەبوو پڕۆژەی چارەکردنی کێشەی تووتنی گەلاڵە کردبێت، تێکۆشەران هەر ئەوەندە لە خواییشتەکانی جەماوەریان دەتۆژیەوە کە بیکەن بە هۆی قەپ و قیر و سەغڵەت کردنی حکوومەت.

ئەم وێنە سەرپێیەی حاڵی بزووتنەوەی نیشتیمانیی بەر لە شۆڕشی ١٩٥٨ تروسکێکە لەو ڕۆژگارەوە بۆ دوارۆژ تێبر دەکا و دەشیا لەو ڕۆژەوە چاوی بیینا مەجهوولی دوای چەندین ساڵی دانەهاتووی پێ ببینێت چونکە وەک دەگوترێ: مانگەشەو سەر لە ئێوارەوە دیارە.

من لەبەر زۆر هۆی تایبەت بە خۆم ئەو تیژڕۆیە نەبووم کە لێرەدا لێی دەدەوێم. چ لەلایەن تەبیات و مجێزەوە بێت و چ لەلایەن جۆری تێفکرین و عەیارەی چاکە و خراپە و سوود و زەرەرەوە بێت هەمیشە بە لای تێگەیشتن و مەسڵەتی و پێکەوە ژیان و هاریکارییەوە بوومەتەوە. هەرگیزاو هەرگیز لەوانە نەبووم دڵم بۆ قوربانی دانی خۆڕایی و بێئەنجام چووبێت. وەیا لە کولانەی دووبەرەکی و سێبەرەکییەوە بەتەمای سوودی گشتیی میللەت بووبێتم. لە خەون و وڕێنەشدا باوەڕم بەوە نەبووە کە ڕووت و ڕەجاڵی کوردەواری، بە گرتنی بینەقاقای یەکدی لە ژێر سایەی دروشمی شەڕ بە دنیا فرۆشەوە، پاڵ دەداتەوە لە ناو بەهەشتی شیر و هەنگوین.

مەجلیسی «یەک کۆبوونەوە و هەشت ڕۆژ تەمەن» مەرسوومی هەڵوەشاندنەوەی دەرچوو. هەر خۆشییەکی سەرکەوتنە بچکۆلانەکەی بەرەی یەکگرتووی نیشتیمانی بەخشیبووی بەسەر لێوانەوە وشک بۆوە. کەسانێکی نەختێک لە نزیکەوە ئاگاداری پرۆژە سیاسییەکەی نووری سەعید بوون دەیانزانی هەویری ئەم جارە یەکجار ئاوخوازە.

لێرەدا یەک تێبینی بنجیم هەیە لە بارەی زێدە تێربوونی حکوومەت لە ئاست هەرچی پێی دەڵێن بەرهەڵستی کردن لە سیاسەتی نووری سەعید کە نوێنەری دێرین و کلاسێکی ڕووکار و ڕاڕەوی عێراقی پاش عوسمانییەکان بوو. من نامەوێ و ناش پەرژێم سیاسەتی نووری سەعید بنرخێنم چونکە خەریکی گەشتی ژیانی خۆمم نەک هی ئەو، لەو گەشتەشدا هەر ئەوەندە ڕێگەیەم دەبێ بەسەر سیاسەتی ئەو مرۆڤەوە کە لە گەشتی مندا تیشکی دابێتەوە. من دەمەوێ ڕەفتاری بەرەی بزووتنەوەی نیشتیمانی هەڵسەنگێنم کەوا بێگومان دەخلی هەبوو بەسەر ئەو سیاسەتەی پێڕەوی دەکرا لەلایەن حکوومەتی عێراقەوە چونکە لە ئاشکرا ئاشکراترە، بایی زێدە تێنووسانی لایەنێکی ملانێ لایەکەی دیکەش تێدەنووسێ مادەم هێزی پێوە مابێت. بزووتنەوەی نیشتیمانی عێراق لە هەموو عومریدا نە خۆی ناسی «چەند دەخوات و چەند دەبەزێت» نەتوانیشی هەڵمەتەکانی خۆی لە چارچێوەی

«مومکین» بگونجێنێت، نە ڕۆژێک لە ڕۆژان خەریک بوو بزانێ میللەتی عێراق چی دەوێت.

لە لایەن خۆنەناسینەوە، قسە کورت دەکەمەوە و دەڵێم، ئەگەر نیشتیمانپەروەران خۆیانیان بناسیبایە دەبوو هێندی منداڵی شەڕەگەڕەکێ واقیعبین بوونایە کە لە ئاست دوژمنی دەسەڵاتداردا پێویستە یەک دڵ و یەک هەنگاوبن کەچی لە ناو بەندیخانەشدا یەخەی یەکتریان دەگرت. لە پاش ڕاپەڕینەکەی «وەسبە» ساڵی 1948 یشەوە پەڕگیری و لە خۆبایبوونێکی ئەوەندە ساوایانە زوربەی خوێنگەرمەکانی هوتاف لێدان و نمایشت گێڕان و سینگ دەرپەڕاندنی وەها گرتبۆوە هەموو سنوورێکی زرەهۆش و شکستەگوتەن (منطق)ی بەزاندبوو. وەتەنییەکان وەهایان دەدایە بەرداس دەتگوت ڕۆژی حەشرە و بەهەشتی و جەهەندەمی لە یەکدی جودا دەکرێنەوە ئیتر نەک هەر دەستەودایەرەی حکوومەت و ئیقتاع و بورجوازی و ڕەجیعییەکان، بگرە ئەوەی کاکڵی کاکڵ نەبێت، لەم جیهانە و لە بەهەشتیشدا جێی نابێتەوە. من خۆم ئەو ڕۆژانە و ئەو بۆ چوونانە و ئەو شاڵاوە فێگرتوانەم دیتوە و تێیدا ژیاوم، لە بەشێکیشی، بە ناچاری، بەشداریم کردووە. دوای وەسبە وەتەنیەکان وەها یەخەی یەکدییان گرت لزووم نەمابوو حکوومەت پێیانەوە خەریک بێت... وای لەو خەرمانە بێکۆزەرەی دەمانکوتایەوە!!

لە لایەن خۆنەبەستنەوە بە مومکینەوە، کە پەڕگیری (تطرف) ڕابەر بوو تەڵاق دانی ئامانجی مومکین و کۆشان بۆ نامومکین دەبێتە سێبەرت و لێت نابێتەوە، واتە لە خۆتەوە خەریکی نامومکین دەبیت بێ ئەوەی زەینت بە دوا مەبەستی سەخت و ڕەقوتەق و شەقوپەقدا بگێڕێت. لە نموومەی خۆماڵی دەڵێم، کە حیزب بەیاننامەی هەڵبژاردنی بۆم دەرچواند سێ ئامانجی سەرەکیی تێیدا بوو:

1- تەئمیمی نەوت،

2- قبووڵ کردنی چین لە نەتەوە یەک(نە)گرتووەکان،

3- لەغو کردنی مەجلیسی ئەعیان،

براینە چەند سەیرە جەنابی کاکە مەسعوود محەمەد، چینی شەعبی شریتپێچ بکات و بە دەم گوتاری ناو مەجلیسی نوێنەرانی عێراقەوە ڕایکێشێت بۆ سەر کورسییە ڕەواکەی خۆی لە نێوان پێنج کورسییە دائیمییەکەی مەجلیسی ئەمن... سێبەرێکی ئەم پاڵەوانپفییە لە بەشێکی حیکایەتی «فسۆس پاڵەوان» دەبیسرێت... تەئمیم دەفەرموویت؟ دەسا بە تەپەوتۆزی تەیەموومی بێ ئاو و زەوادی بێ پێخور سوێند دەخۆم، حکوومەتی نووری سەعید خۆشی لە سێدارە دابایە بۆی نەدەچووە سەر نەوت تەئمیم بکات، نە جەنابی من بیکەم!!

لە لایەن هەست نەکردن بە دڵخوازیی تێکڕای میللەتەوە: جەماوەر، میللەت، خەڵقی شار و دێ و عەشیرەت، خەڵقولا و هەرچی ناوێکی لێی دەنێیت بەپێی هەر عەیارەیەکی بەرژەوەندی پێ تاقی بکەینەوە، خۆشی بێت و ترشی بێت، بە دوا گوزەران و ماڵ و منداڵ بەخێوکردندا دەگەڕێت، چاری ناچارە دەبێت دەست بۆ شتێک ببات کە جەمی ڕۆژانەی پێ دابین بکات. ئەگەر سەرشێت نەکرێ، وەک کە سۆفیی تەریقەت سەر شێت دەکرێت، خەتەجووتی گاڕەش بەجێ ناهێڵێ بۆ نمایشتی خوێنگەرمانە، یەخەی حکوومەت ناگرێت لە پێناو ئامانجێکی نانی تێدا نەبێت. گوزەرانی خۆی بە قوربانی شاپەڕە ژەنگارەکانی کۆترەی درۆزن و ڕاستگۆ ناکات...

بە کورتی ژیانی کولەمەرگیی کۆمەڵگەی وەکوو کوردەواریی سییەکان و چلەکان و پەنجاکان ئەوە نەبوو هەناسەساردێکی ئەو ڕۆژانە بەرەو ئامانجی دوورەدەست و ئاسۆی بەرزی چارەنووسی هەموو مرۆڤەوە ببات کە بووبووە خەیاڵ و خوتخوتە و خوولیای تێکۆشەری کورد تا ئەوەی وەهای لێ هاتبوو خەریکبوون بە دەستکەوتی مومکینەوە تاوانبار بکات گۆیا ئامانجی ئەوتۆیی میللەت بەرەو چارەسەری «اصلاحي»یەوە دەبات و لە نیازە بنەڕەتیەکانی پرۆلیتاریای دوور دەخاتەوە.

تێکۆشەری کورد و تێکڕای عێراق بە شانازییەوە لە پێناو مانگرتنی کرێکارانی واقلواق ئامادەی خۆبەخت کردن بوون، یەخەی حکوومەتیشی بۆ دەگرت، بەڵام بەلایەوە مردن بوو ئەگەر لە پێناو بەرژەوەندی گوزەرانی ڕەشوڕووتی وڵاتی خۆی بە نەرمی لەگەڵ حکوومەت بدوێت. هەتا بۆی لوابایە بۆ ڕیسوا کردنی حکوومەت حەزی بە هەرا و مەزاد و تێک هاویشتن و نمایشت و نازانم چی دەکرد هەرچەند بەوەشدا نانی ڕۆژانەی حەمباڵ و کرێکار و چەوسایەوە و ئەهلی بازاڕی شارەکەی

خۆی دەبڕی. پێی وابوو هەرچی بە لای حکوومەتەوە چاک بێت دەبێ ڕووڕەش بکرێت با لە حەقیقەتیشدا چاکەی پێوە بێت.

تێکۆشەر پێی وابوو نووری سەعید و برادەرانی دەرگەی خەزێنەی بێ برانەوەیان لێ بەستووە. هەر برمێن میللەت لە تێرییان دەددرێت ئیتر مانای چی خۆ بە شتی «اصلاحی» کەمبایەخەوە خەریک بکات، لە هەموو کەس ڕوون بوو بزووتنەوەی نیشتمانی ڕازی نییە بە چارەیەک کەمتر بێت لە ڕماندنی ڕێجیمی بەر لە ١۴ ی تەمووز. ئنجا کە ئەمە وەها بێت ئەو ڕێجیمە چی دەکات لەوە کەمتر بێ کە خۆی پێ بپارێزێ. وەک دیتمان کار گەیشتە ئەوەی کە پارتی سێ و دووی نەکرد لە خۆ دانە پاڵ ئاشتیخوازی کە لە نەزەر حکوومەتدا ناجایەز بوو هەرچەند جارێ هەبوونی خۆیشی لەلایەن قانوونەوە دانی پێ نەهێندرابوو، واتە دەیزانی خۆگیری بکات لە خۆ ئاشکرا کردن بەڵام چاو نەترووکێنێ لە دەربڕینی لایەنگیریی خۆی لە بزووتنەوەی ئاشتیخوازی سەربە ئینتەرناشنالیزم، کە ئەمە حاڵی تێکۆشەری کورد بوو، هی غەیری کوردیش هەر وەها بوو. هەرچەند حیزبە ئاشکراکانی وەکوو وەتەنی دیمۆقراتی و ئیستیقلال (جەبهەی شەعبیش کە پتر کۆمەڵەی پیاوماقووڵان بوو لەوەی حیزب بێت) لە کۆبوونەوەی یەکەمی ئاشتیخوازان بە نوێنەری بەرچاو بەشدارییان نەکرد بەڵام لە جەریدەکانیان بە گەرمی خۆشامەدییان لێ کرد، جگە لەوەی کە پێشتر مەعلووم بوو دانوویان لەگەڵ حکوومەت ناکوڵێ و ئەگەر مەجلیس بەردەوام بێت هەرای کوشندە دژی ڕژێم دەنێنەوە. بەرەی نیشتیمانی بەو دە نایبەی گەیاندنیە مەجلیسی نوێنەران هەڕەشەیەکی ڕیشەهەڵکەنی لە ڕژێم دەکرد.

نووری سەعید باوەڕی هەرچۆنێک بووبێت بەرانبەر چاک و خراپەی سیاسەتی خۆی و غەیری خۆی لێی چاوەڕوان نەدەکرا سەر دانەوێنێ بۆ ئەو هەڕەشەیە، بەرەی نیشتیمانیش دەسەڵاتی خۆپاراستنی نەبوو لە ئاست هێرشێکی دڕندانەدا کە دەزانین - دواتر لە 14 ی تەمووز دیتیشمان - هێرش بۆ سەر ڕژێمی شایەتی لەلایەن ناحەزانییەوە چۆن بووا! هەر بێهێزیی موعارەزەی سیاسییەکانیش بوو چەپارەی دان لە توندوتیژی کەللەتەزێنی گەردەنپەڕێنی ڕژێم کە لەوەندەی تێپەڕ نەکرد چەند کەسانێکی لە وڵات دەرکرد و هێندێکیشی بۆ ماوەیەک خستە

بەندیخانە و لە هەڵبژاردنیشی گێڕانەوە دەنا ئەگەر ململانێی دوو لایەنی هاوهێز بایە دەبوو سەدان سەری تێدا بێ کڵاو مابایەوە، یاخود کڵاوەکان بێ سەر دەمانەوە.

من مەبەستم نییە بە شان و باڵی کەسدا هەڵبڵێم هەر ئەوەندەم دەوەێ باوەڕی خۆم لە ئاست کارە ساوایانەکانی جەماوەری تێکۆشەران دەرببڕم کە لە هەمان کاتیشدا تەفسیری هەڵوەست و ڕەفتاری حکوومەتی بەر لە تەمووز دەکات. ئەو ساواییە لە ساڵانی پاش تەمووزدا مەیدانی بۆ چۆڵ بوو هەتا تێکۆشەران تێراو و مەست بوون لە نۆشینی خوێنی خۆیان. ئەم ڕستەیەی هەرە کۆتایی قسەکانم لزوومی نەهێشت بڵێم، دۆڕاندنی شەڕەدەندووکێی ساڵانی 1953 و 1954 لەلایەن تێکۆشەرانەوە بایی تۆسکاڵێک بە لای لێکدانەوەی ژیرانە و هەنگاوی واقیعبینییەوە نەبردن.

هەرچۆنێک بێت گەشتەکەی ژیانی من بە ناو ئەو چرگەنانەدا گەیشتە نێوەندی ساڵی 1954. لە میراتی ئەو دوو دەورەیەی نیابەت زیادبوونی ئەرک و مەسرەف و بەرپرسیم بوو لەچاو ساڵانی بەر لەو نیابەتە. زیاد کردنی مەسرەف وەهای کرد پتر خەریکی نان پەیدا کردن و گوزەراندن بم کە کێشایەوە بۆ قۆڵ و باسک هەڵماڵین لە محامات کە دوای نەختێک بۆی دەچمەوە.

لەو ڕۆژانەدا کە کوردی گوتەنی ئەستێرەمان کزبوو، خێرەومەندە زمانلووسە خۆڕەپێشکەرەکان کە زوربەیان پێشتر بە دەورمانەوە بوون کەوتنە فیتنەبازی و خەبەر لێدان. چەند کەسانێکیان لە خزم و دۆستەکان نانبڕاو کرد، هێندێکیان بە نەقڵ کردن دان و خەریکیش بوون تێکۆشن بۆ بەگرتن دانی هی دیکەش، ئەگەر موتەسەڕیف ئیسماعیل حەقی ڕەسووڵ، لە دڵدا دۆست نەبوایە سەغڵەتی پتر تاوی بۆ دەهێناین. لە نموونەدا دەڵێم، لە هەولێر بووم کاک مەجیدی ئامۆزام کە کارگێڕی قوتابخانەی «حاجی قادر» بوو لە کۆیێ ئیخبارییی لێ درابوو لەلایەن پیاوچاکانەوە نەقڵ کرابوو بۆ گوێر. بەڕێکەوت دەچووم بۆ لای موتەسەڕیف کاک مەجید پێم گەیشت گوتی ماڵ و منداڵ لە ناو سەیارەن و لۆریش بە بارەوە ڕاوەستاوە کە برۆین بۆ گوێر، داخوا ڕێ نابێ لە هەولێر بمێنمەوە؟ کە چوومە لای موتەسەڕیف، ڕەحمەت لە گۆڕی، بەر لە دانیشتنم گوتم فلانەکەس، ئامۆزام لەو وەزعەدایە… دەرلەحزە ئەو ئەزوحاڵەی لێ وەرگرتم کە خۆم بە کاک مەجیدم نووسیبوو، لەسەری نووسی بۆ مدیری مەعاریف کە خاوەن عەریزە لە قوتابخانەیەکی هەولێر دادەمەزرێ، ئەگەر جێ نەبوو یەکێکی دیکە نەقڵ بکەن تا

ئەمیان لە هەولێر بێت... سەد خۆشی، هەر لەو ڕۆژەدا خانووشیان دەست کەوت و باروبینگەی نامزەدی گوێڕ، لە گەڕەکی خانەقای هەولێر خسترا... لزوومیش نەبوو کەسی دیکە نەقڵ بکرێت چونکە شاغر هەبوو.

هەر لەو ڕۆژانەدا ئیشێکی دیکەم بە موتەسەڕیف، ئیسماعیل حەقی ڕەسووڵ، بوو. مەلای دێیەکی دەوروپشتی کۆیێ بەراوێکی هەبوو تەماعکارێک لە بنەوە لەگەڵ مەئمووری تاپۆ ڕێک کەوتبوو کە بە فێڵ ئەو بەراوەی لەسەر تاپۆ بکات، بە ڕێنموونی مەئمووری تاپۆ سەنەدێکی بە تویکڵیان پێ ئیمزا کردبوو کە بتوانرێ نەقڵی خاوەنایەتیی زەوییەکەی پێوە مومکین بێت بۆ سەر ناوی قۆڵبڕەکە. چوومە لای موتەسەڕیف حیکایەتەکەم تێگەیاند کە ئەگەر فریایی نەکەوێ بە مەحکەمە دۆڕاوە... گوتی، ئەم مەئمووری تاپۆیە دەناسم، لە ئاکرێ، یان لە قەزایەکی دیکە بوو، ئەدەبخانەی مزگەوتێکی بە پارە قووت دا. مەئموورەکەی نەقڵ کرد و چاوێکی وەهاشی لە تەماعکارەکە سوور کردەوە وازی هێنا لە مامڵەتەکە بێ ئەوەی بوێرێ داوای ئەوەندە پارەیە بکاتەوە کە لە «بەیع» (عربون)ی مامڵەتەکەدا بە مەلای دابوو. مەلا پیاوێکی زۆر قسە خۆش بوو، ئەگەرنا ئەو پێنج دینارە بۆ مەسرەف پێی دام و منیش دڵیم نەشکاند و لێم وەرگرت، بەشی نیوەی سەفەرێکمی نەدەکرد لەو ڕۆژانەدا...

لە چالاکیی محاماتدا بێ ئەوەی سەنەد و مەنەد ئیمزا بکەین لەگەڵ مامۆستا بەکر ئیسماعیل بەیەکەوە دەکۆشاین. لە سەرەتاوە کە جارێ ڕێی ڕانیە گەڵاڵە نەکرابوو ئۆتۆمۆبێل پێیدا بڕوات، جغزی تێدا سووڕانەوەمان زۆر فرەوان نەبوو، دواتر کە ڕێگاکە کراوە، ڕانیە و قەڵادزەمان لێ بوو بە بەشێکی کۆیێ. من لە سەیداوا و بۆسکێنی نزیک ڕانیە و لە سندۆلانی پژدەر قۆناغم ماڵە خاڵەکانم بوو، لە قەڵادزەش حاجی ئەحمەدی حەمەدەمین، کوڕەخاڵی کاکە بەکر، بە خزمیش حیساب دەکرا. ئیتر هەر دوو قەزا بۆ هەردووکمان وەک کۆیە وابوو بگرە لە زۆر ڕووەوە لێمان خۆشتر دەهات... گیانی عەشیرەتگەری و مێواننەوازی لەو تەرزە جێگیانە تا بڵێی جودایە لە شاری داخراو.

لەو ساڵەی 1954 کە تێشکاوی ئینتیخابات بووین دەعوایەکی تەسویەی یەکجار گرنگمان بە دەستەوە بوو لە دوو دێی «کانیوەتمان» و «شێخ مەسووریان»ی «دۆڵی شاڵەبەگ»ـی سەربە محاڵی خەلەکان... مەلا حەوێزاغای تازە نایبمان، پازدە

ساڵێک دەبوو بە براگەورەیی ساڵانە ملکانەی لە زوربەی خەڵقەکە دەستاند. بەر لەوە بە دەعواکە ڕابگەین، هەر لە کەشفی تەسویەی هەوەڵ جارەوە ئاغلەب فەلاح و ئاودێرەکان دانیان هێنابوو بەوەدا کە ملکانەیان داوە، بەڵام گوتبووشیان ملکی خۆمانە. دەعوایەکە لە ڕووی قانوونەوە زۆر بێهێز بوو، ناچار بووم بە موافەقەی کاک بەکر، بیدەمە بەر تەئجیل... باریکەڕێگەیەکم لەوەدا دۆزییەوە کە داوا بکەم سەرلەنوێ کەشفی ئەو دوو دێیە بکرێتەوە... معاونی تەسوویەی ڕانیە کاک بابیز عەبدوڵا سەلماندی و ڕۆژی کەشفی دیاری کرد... لە کۆیە بە سواری هاتین بۆ دێی کانیوەتمان، تاقمی ئێمە و هی مەلا حەوێزاغا قەڵەباڵغییەکی بەرچاوی پێک هێنابوو. محامی مەلا حەوێزاغا، سددیق نەققاش، کە دەمێک بوو وەڕز بووبوو لە تەئجیل و ئەم جارەیان کە سێ سەعات بە سواری وڵاغ لەو شاخوداخە سەرەژوور و سەرەژێر بۆوە بە جارێک بێتاقەت بوو.

سەرت نەیەشێنم دوای دوو ڕۆژ کەشف و شایەدی و نازانم چی گوتی لە ڕاهی خوا قوتارم بکەن، وەرن با ڕەئیسی تەسویە بکەین بە حەکەم چ بڕیارێکی دا پێی ڕازی بین... من و کاک بەکر لە خوامان دەویست بەڵام لە ڕواڵەتدا بە خاترانە تەکلیفەکەمان قبووڵ کرد... سێ شەو لە ماڵی کوێخای دێی کانیوەتمانماینەوە ئەوەندەی خزمەتی ئێمە و جەماعەتی مەلا حەوێزاغاش کرد کە بە موجامەلە و بۆ دڵدانەوەی سددیق نەققاش-یش کە ڕەفاقەتی ئێمەی پێ خۆش بوو بە زۆری جەمی نیوەڕۆژەیان لە ماڵ کوێخا دەبوو.

هەر لە بیرمە، ڕۆژێکیان گوێم دابووە ڕادیۆی قاهیرە کە سەرۆک جەمال عەبدولناسر خەریکی دووان بوو لە مەیدانی «منشیە». لە گەرمەری حەماسەتدا بوو کە تەقەی لێ کرا. من تەقەکانیشم بیست. ماڵم حەقە جەمال نەشێوا و دەنگی نەلەرزی... گرمەی هوتافی ئەو هەزاران هەزار خەڵقە و تێک هاویشتنیان و سمڕسمڕەی خەڵقولا لە دوورەوە دەهشەتی بۆ دڵی گوێگر دەهێنا. سەرۆک جەمال کەوتە حاڵەتێکی مەجزووبانە، بە دەنگی بەرزی دلێر دەیگوت و دەیگوتەوە «یا شباب، یا رجال...»

بۆ سبەینێ، وەها بزانم ڕێکەوتی ٢٩ ی ئەیلوول بوو، گەڕاینەوە کۆیێ... هەر لە بیرمە هەوری پڕ بوو، ڕەشێنەش باریبوو. کە بە سەر هەیبەسوڵتان کەوتم نوڕیمە

قەندیل، لە کەلێنی هەورانەوە دیار بوو دەوروبەری لووتکی «قووچ باش» سپی بووبوو...

ئەم دەعوایە پاش چەند مانگێک بڕیاری تێدا دەرچوو. ڕەئیسی تەسویە یەک بستە ئەرزی بە مەلا حەویزاغا نەدا. کەم موژدەی وەها خۆشم بیستوە چونکە لە کاتێکدا بوو تازە نەختێک بەسەر دەرهاتنم لە حەپسی پازدە ڕۆژەی نێوان ٢٦ی شوبات و ١٢ ی مارتی ١٩٥٥ تێپەڕیبوو. ناوچەی دۆڵی شاڵەبەگ لە دەسەڵاتی «ئاغا» دەرچوو... سددیق نەققاش دەعواکەی ئیستیئناف کرد لە سەرۆکایەتیی ئیستیئنافی تەسویەی سلێمانی کە ئەوسا مامۆستا فایەق هۆشیار سەرۆکی بوو. خەریک بوو بچێتە ناو دەعواکەوە، گوتم ئێمە هەردوو لا ڕەئیس تەسویەمان بە حەکەم داناوە کە بە بڕیاری ڕازی بین. مامۆستا فایەق کە «تحکیم»ەکەی دیت یەکسەر کۆتایی بە دەعوا هێنا و بڕیاری دا بە ڕەددی داخوازییەکانی مەلاحەویزاغا... من ئەو بەیانییە گەیشتبوومە سلێمانی، بێوەخران گەڕامەوە بۆ کۆیێ کە لەو چەند مانگەدا ڕێگاکەی بەرەو ڕانیەی گەیشتبووە جادەی نێوان دووکان و ڕانیە... لە نزیک دێی شێخ مەسووری-یانەوە خەبەرم بۆ خەڵقەکە نارد کە دەعواکەیان یەکجارەکی بە سەرکەوتوویی بنەبڕ بوو. ئەوسا هاتوچۆی ئەم سەر و ئەو سەری نێوان کۆیە و سلێمانی بە ئۆتۆمۆبیلی خسووسی دە دیناری دەخوارد...

پێویستە بڵێم لە دوای تێشکانمان لە هەڵبژاردنەکەی ١٩٥٤ سەفەرێکی ڕانیەم کرد. کاکە فەوزی سائیب قایمقام بوو. هەر کە بیستی لە ماڵی خاڵە خدرم دابەزیوم بە خۆی و دەستەودایەرەی حکوومەتی ڕانیە هاتە بەخێرهێنانم. مرۆ نابێ مەردایەتیی مەردان بنلێو بخات. لەو سەفەرەدا حکوومەتی ڕانیە وەهای ڕێز لێنام ئەگەر لێقەوماو نەبام زاتی نەدەکرد وەهام شیرن بکات. کاکە فەوزی وەهای کرد کە لەو دەمەدا بڵێم، بەڕاستی دۆڕاندنی ئینتیخاباتی ئەوتۆیی خۆشترە لە بردنەوە...

بچمەوە بۆ سەروکاری ئەو پازدە ڕۆژەی گرتووییم، هەرچەند کەینوبەینی توندوتیژیی حکوومەت لە هەڵبژاردنەکەی دواییندا چاوی خەڵقی شکاندبوو، ماکی بێئۆقرەیی و بزۆزی هەم لە شێوەی زانەوەی ئاساییدا و هەم بەهۆی هاندانە بێوچانەکەی ڕادیۆی «صوت العرب» لەلایەن ئەحمەد سەعید-ەوە کەوا بەڕاستی هێندەی «یوونس بەحری»یەکەی ڕادیۆی بەرلینی سەردەمی جەنگی دوەم کاریگەر بوو، ئا ئەو ماکە، مانگ لە دوای مانگ، پتری هەست پێ دەکرا تاڕادەیەک حەز کردنی ئەو

خەڵقەش لە بیستنەوەی دەنگ و ناوی خۆی لە ڕادیۆی میسر. وەک کە ڕۆژانە ڕاپۆرتی نمایشت و نارەزامەندی و تووڕەی کەسان و شوێنان و میللەتانی دەخوێندەوە وەهای کرد کە زوربەی خەباتگێرانی کۆیێ، بەتایبەتی هی سەربە چەپ کە دەیویست یەکنەوا بێت لەگەڵ دەنگ و سەنگی بەرەی یەکیەتی سۆڤیەت، وەهای کرد بکەونە ڕێکخستنی موزاهەرە.

ئەم نیازە لە ڕۆژی 25/2/1955 پێکهێنرا، من لە زوییێکەوە زانیم و زۆریشم پێ ناخۆش بوو شتی وەها بێسەمەرە قوربانیی بۆ بدرێت، گۆیا چ سوودێک بە کورد و ئادەمیزاد دەگات بەوەدا ئەحمەد سەعید بڵێ کۆیەی تێکۆشەر وەهاو وەهای کرد! پاش نوێژی جومعە دەست کرا بە موزاهەرە لە دەوروبەری بازاڕەوە بەرەو سەرای حکوومەت. خۆوتاڵع هێزی پۆلیس لە دەست سەعیدی حەماغای ڕانیە بوو کە خۆی کۆیی بوو هەتا توانی پۆلیسەکانی بەرەو پاش کشاندەوە بێ ئەوەی دەست بوەشێنن. لە ئاکامی ناچاری چەند تەقەیەک کرا، یەکێکی زامدار کرد بەڵام دەردەست نەکرا. من لە ماڵەوە دەرنەچووم، دەشم زانی حکوومەت لێمان وسکت نابێ...

سبەینێ بەرچاییم دەخوارد، خەریک بووین فەحسی تووتنمان بۆ بکرێت، لە قایمقامەوە داواکرام بۆ سەرا... سەرت نەیەشێنم من و کاکە زیاد و عەلی عەبدولا نێردران بۆ هەولێر بە سەییارەی خۆڕایی. خراینە قاوشێکی بەندیخانە لەگەڵ حەبسی عادەتی. تێکڕامان چل کەس دەبووین. گرتووەکان کە هێندێکیان لەسەر هیچەش گیرابوون ئەوەندە پیاوانە بەخێریان هێناین و وەها ڕێزیان ڕاگرتین بە قسە ناگوترێ. ئەوەندەی فەقێ لە دەرس خوێندنی لای مامۆستاکەی بە ئەدەب و وێڵ و تەرتیبە ئەو گرتووانە وەها و بەولاتریشەوە بوون.

خەبەری گیرانمان زوو بە زوو زاندرا و بە هەولێردا بڵاوبۆوە ئیتر لە سبەینێوە ڕیزی برادەران بۆ سەر لێدانمان شریتەی بەست و نەپسانەوە. هەر ڕۆژە لە ماڵ برادەرێکەوە نان و پاتی بەگزادانەمان بۆ دەهات. بە هەموو عومرم ئەوەندە سێو و پرتەقاڵەم بە دەوری خۆمەوە نەدیتوە وەک لەو ڕۆژانەدا دەمدیت. د. مەردان عەلی ڕەئیس سیححە هەموو ڕۆژە بە ناوی تەفتیش دەهاتە لامان وەهای کرد هەموو شتێکی حەپسخانەکەمان لە هی ماڵەکانمان خاوێنتر بێ. چەند ڕۆژان لەگەڵ ئەو برادەرە گیراوانە و سەرلێدەرەکانمان بە کامەرانی بردمانە سەر هەتا د. مەردان وەهای کرد بگوێزرێینەوە بۆ ژووری «تضمید». باوەڕم پێ بکە غەریبیی هاوڕێکانی

قاوشە عومومیەکەمان دەکرد. لەبیرمە شەوێکیان چوار گەنجی ١٧- ١٨ساڵەیی قۆز کە سەربە بارزان بوون گەپێکی خۆوڵاتی خۆیانیان کرد بە گۆرانیی تایبەت بەو گەپەوە. ئەم چەند دێڕەم لەو گۆڕانیە بەبیر ماوە:

وەی ئەز هاتم ئەز هاتم
حەپکۆلانێ حەلهاتم
یارێ پمەمکا نخافتم

تومەز «نخافتن» بە واتای «داپۆشین» بوو لەگەڵ «نهفتن»ی فارسی کە «نهێنی»ی کوردییە یەک دەگرنەوە.

دەبێ بڵێم نوورەددیناغای حاجی ڕەشیداغا هەموو بەیانییەک سینییەکی ڕازاوەی بەرچایی دانرا و لە هەوەڵەوە هەموو نیوەڕۆژێکیش خواردنی شاهانەی دەنارد کە بایی برادەرە حەپسەکانیشی دەکرد، هەتا بە ئیلحاحی ئێمە نیوەڕۆژەکەی ڕاگرت چونکە هەر ڕۆژە برادەرێک بەڵکوو پتر لە یەکێک نانی بۆ دەناردین بەو جۆرەی کە باس ناکرێ، دیسانەوە لە سێ ڕۆژانەدا ڕۆژێک خواردنی بێحیسابی بۆ دەناردین...

دوای چەند ڕۆژێک لە گیرانمان بە ڕا لێبوونی خۆمان و دۆستان و ئەو خزمانەی لە کۆیە و ڕانیەوە - خاڵەکانم - هاتبوون نامەیەکم نووسی بۆ خوالێخۆشبووی ئەحمەد موختار بابان کە چۆن لە خۆڕایی گیراوین. ئەو جوانمەردە لە دەمی کە کاغەزەکەی پێ گەیشتبوو کەوتبووە تەلاشی بێوچان، بەو حورمەتەی کە هەیبوو لە هەمان ڕۆژدا وەهای کرد حکوومەت بسەلمێنێ بەڕەڵا بکرێین. عەلیاغای حاجی ئەحمەداغا، نایبی هەولێر، لە بەغداوە بە سەردان گەڕابووە هەولێر هاتە لامان گوتی: ئەمری بەردانتان لە ڕێگایە بە پۆستە دەگاتە موتەسەڕیف.

سەیر لەوەدایە، کابرایەکی ڕووتەڵەی بۆرەپیاو خرابووە قاوشەکەمانەوە وامانزانی جاسووسە بەسەرمانەوە، کتێبی دەگرتەوە و خەبەراتی بە خەڵکەکە دەدا. سەغڵەتیان کرد بەوەدا پێیان گوت قسەکانت درۆن، ئەویش سوورهەڵگەڕا و سوێندی خوارد لەسەر هێندێ کە سێ ڕۆژی دیکە ئێمە هەرسێکمان لە حەپسخانە ڕزگار دەبین. کە ئەمەی گوت جارێ عەلیاغا نەهاتبۆوە. وەها دەرچوو کە دوای سێ ڕۆژ ئەمری بەردانمان گەیشتە هەولێر بەڵام دەرچوونمان کەوتە ڕۆژی چوارەم، چونکە ئەو ڕۆژە

دەوام بەسەرچووبوو.. دەبوو بڵێم من و کاکە زیاد کاغەزمان ئیمزا کرد بۆ ئەحمەد موختار بابان...

حکوومەتی بەغدا بە حکوومەتی هەولێری ڕاگەیاندبوو کە بە تۆمەتی بەشداری کردن لە موزاهەرەی چەکدار بدرێینە مەحکەمە... دوای بەربوونمان لەگەڵ کاکە زیاد بۆ بەغدا چووین. بە شێوەیەکی بەربڵاو خەبەری گیرانمان زانرابوو لە بەغداد... چووینە سپاسگوزاری ئەحمەد موختار لە ماڵەکەی و بە عادەتی خۆمان سەردانی دۆستانمان کرد. لای «صادق البصام» بووین بەرێکەوت حیکمەت سلێمان-یش هات. بە نوکتە گوتی چاوەڕوانم دەکرد «حلاوه مسکت - مسقط» بخۆن لە بەندیخانە، زوویان بەردان. گوتم دوو حەلاوەی مەشوور هەیە یەکیان ئەوەی فەرمووت حەلاوەت مەسکەت بەشی ئێمەی تێدا نەبوو، ئەوی دیکەیان «من السليمانية - گەزۆی سلێمانی» فەخامەتتان چانستان هەبوو لێتان خوارد... بوو بە پێکەنینێکی خۆش. گوتی «يا اخي خلوني بغرفة الاعدام واني ما ادري شنو هيه المسألة».

چەند مانگێک هاموشۆی هەولێرمان کرد بۆ دادگەی جەزایی کە سەیری دەعواکەی ئێمەی دەکرد. عومەری مام عەلی لە سەرینایی پشتگیری کردنم لە زەوی و زاری بەرەی ماڵی کوێخا محەمەدی پێبازۆک کە عومەر تەمای لێ نابوو، دوو شایەدی درۆی ڕاست کردەوە لێم کە بە تەسادوف هەردووکیان لە سوێندی درۆ پێشتر حوکم درابوون. لە هەوەڵ جەلسە عومەر بۆم تێکۆشا گوتی، جەنابی حاکم ئەم کابرایە سەرۆکی شیووعی هەموو دنیایەیە ئەمەش دەلیل. بەیاننامەی ئینتیخابیمی لە باخەڵی دەرهێنا و دایە دەست حاکم گوتی، بیخوێنەوە هەموو شتی تێدایە. دوو شایەدەکەشی کە هەر پێبازۆکی بوون دەستیان بە قورئاندا دا کە ئەم کابرایە لە پێش موزاهەرەوە دەرۆی و هانی خەڵقی دەدا بۆ ئاژاوە. شایەد بۆ عەلی عەبدوڵاش پەیدا کرا... لە ئاکامدا من و کاکە زیاد تەبریە بووین. عەلی عەبدوڵا دە مانگ حوکم درا. حاکمەکەی کە ئەم حوکمەی دا زۆر عەیبدار بوو چونکە لە کەشفی جێگەی «حادثة» مەعلووم بوو کە شایەدەکان مومکین نییە ئەو کابرایەیان لە موزاهەرە دیبێت چونکە لەو شوێنەوە موزاهەرە هەر نەدەدیترا جگە لەوەی مەودای دوور بوو. من مامەوە هەتا قەرارەکەی مەحکەمەم بۆ ئەو نوێنەرە ئیستیئناف کرد. لە کەرکووک دادگای ئیستیئناف حوکمەکەی هەڵوەشاندەوە و برادەرەکە دەرهات.

زۆری نەبرد ڕۆژێکیان عومەری مام عەلی بەگەڵ دەستە برادەرێکم کەوت و هاتە لام. لە دوورەوە عوزرخوای کرد و پەشیمانی خۆی دەربڕی. من لە باری وەها کوردی گوتەنی ملم لە موویەک باریکترە. کێشەی ئێمە لەگەڵ ڕۆژگار گەلێک بەولای ئەوەیە حیسابی ورد و قووڵ بخەمە کارەوە بۆ بابایەکی ئەوتۆیی کە وەکوو هەزاران بێدەسەڵات بایەک دەیهێنێت و دەیبات. پاش ئەم مەسەلەیە عومەری مام عەلی هەتا مردنی بە دۆست مایەوە. گەردەنی ئازاد بێ. یەکێک لە دوو شایەدەکان لە قوڕەلیتەی لافاوێکدا خنکا، ئەو دیکەیان نازانم سەری بە چی گەیشت.

ئەو مڵکانەی بەرەبابی ماڵی کوێخا محەمەدی کە من تێیدا خەریکی پارێزگاری بووم بەر زەمانی ڕەئیس تەسوییەیەکی کورد کەوت کە جێی متمانەم نەبوو هەرچەند ناسیاوی کۆنینەمان بوو، بە جۆرێکی ئاشکراش ویستی ترسم نەهێڵێ لە نەتیجەی دەعواکە چونکە زانی من هەر جارە بە بەهانەیەک موحاکەمەی ئەو زەوییانە دەوەخرێنم. من هیچ شتێکم لە ڕووی ئەو ڕەئیس تەسوییەیە نەدا بەڵام دڵیشم ئاوی نەخواردەوە بە بەڵێنەکەی. هەتا نەقڵ نەبوو کۆتاییم بە موحاکەمەکە نەهێنا چاک بوو زەوییەکان سەلامەت دەرچوون.

لێرەدا بە باشی دەزانم تەپوتۆزێک بڕەوێنمەوە کە لەو ساڵانەدا بە دەوری محاماتی منەوە پەیدا کرا گۆیا من مڵکی ئاغا و مڵکداران دەپارێزم. هەڵبەت قسەی ئەوتۆیی لە بوختانێکی ڕەجاڵ بەو لاوە نییە. جارێ دەبێ بڵێم کەسم نەدیت لەو محامیانەی کوردپەروەر و چینپەروە دیفاعی لە قاتل و لە خاوەن مڵک نەکردبێت کەسیشیان ناوی کەسیان نەدەهێنا کەچی لە ئاست مندا جۆرێکی دیکە بوون. لە نموونەدا دەڵێم، بەرەبابێکی سەربە تایەفەی مەحموداغای پژدەر، من و مامۆستا بەکریان کرد بە محامی بۆ ساغ کردنەوەی مڵکەکانیان لە تەسویە. محامیەکی بەرپرسی گەورەی حیزبێک لە وتووێژدا ڕەخنەی لێ گرتم کە وەکالەتی «اقطاع» دەکەم. دواتر کاغەزی ئەو محامیەم دیت بۆ ئەو بەرەبابەی نووسیبوو دەڵێ حەز دەکەم وەکیلی ئێوە بم، ئنجا لە ماوەیەکی چەند ڕۆژدا ئەگەر لەگەڵم ڕێک نەکەون گلەییم لێ مەکەن دەبمە وەکیلی مودەعییەکانتان. (من خۆم لە برسانیش بمرم ڕێگەی وەها ناکوتمەوە م.م). من کە محاماتم دەکرد فەلسەفەم لە لاوە بۆ نەدەخواستەوە، کە خۆم ڕازی بم مڵکدار بم ڕازیش بم بە مڵکداریی خەڵق ئەمەش حەقیقەتێکە لە ناوەڕۆکی محاماتەوە هەڵدەقوڵێ نەک لە فەلسەفەی لاوەکییەوە. بەشێکی

دەعوەکانمان هی فەلاح بوون بەشێکیشی هی ملّکدار. بەش بە حالّی خۆم هیچ بەتەماش نەبووم هەلی تەسوییە بکەم بە هۆی نانەوەی شۆڕشی چینایەتی. لە دێیەک هەرا پەیدا بوو لە نێوان فەلاح و ملّکدارەکە، چەندێکی کۆشان تێیدا محامی بم نەمسەلماند چونکە هەموو پژدەرم درابایێ ئەوەی نەدەهێنا خوێن لە لووتی کەس بێت.

لە نموونەی چالاکیی ئەو ڕۆژانەم دوو ڕووداوت بۆ دەگێڕمەوە، یەکەمیان ئەوە بوو مینەی عەلیاغای گەناو داوای کردم بۆ مەحکەمەی قەڵادزە لە تۆمەتی قەتلی ڕزگار بکەم. لە بۆسکێنەوە، سبەینەی ئەو ڕۆژەی تەحقیق لە دەعواکە دەکرا چووم بۆ قەڵادزە. میناغا و کوڕێکی لەلایەن بۆرەپیاوێکەوە شکاتیان لێ کرابوو کە گۆیا کوڕێکی مێردمنداڵەی ئەویان کوشتووە. دەعواکە زرەدرۆی هەڵبەستراو بوو، بە پارە ئەو کابرایە و شەش شایەد، ڕاست کرابوونەوە بۆ لە ناوبردنی میناغا کە کابرایەکی فێڵبازی تەماعکار مرخی خۆی لە موڵکەکانی میناغا خۆش کردبوو بە هەویای ئەوەی لە دەمی تەسویەدا بتوانێ بۆ خۆیانی ساغ بکاتەوە. ڕۆژ ڕەمەزان بوو منیش بەڕۆژوو. باوکێک و شەش شایەد ڕەپەیان لە قورئان هێنا بە تەمایەکی کەم بۆ خاتری فێڵبازێکی بێویژدان. دیاربوو محامییەک دەرسی دابوون چۆناوچۆنی شایەدی بدەن. دوو شایەد گوتیان دیتمان میناغا و کوڕەکەی ئەو جحێڵەیان لە شاخی هەڵداشت. دوو شایەد گوتیان بەر لە مردنی گەیشتینە سەری، ئیقراری دا کە میناغا و کوڕەکەی کوشتیانم. دوو شایەد گوتیان ئەو کوڕەمان چەند ڕۆژێک پێشتر بە پەشۆکاوی دیت تێیگەیاندین کە میناغا بەتەمایە لەسەر نامووس بیکوژێت. خولاسە دەعواکە پەرچەم کرابوو کە ئاو نەدەڵێنێ. خوای لە سەران مرۆ چۆن دەزانێ وەها بەرەواژ بێتەوە بۆ دەروونپیسی و بێویژدانی!! من جارێ وەکالەتیشم بۆ میناغا و کوڕەکەی دەرنەکردبوو بەڵام حاکمم تێگەیاند کە دەبمە وەکیلیان. پاش ئەو شایەدیانە، بە حاکمم گوت مەحکەمە لە خەڵق چۆڵ بکە قسەم لەگەڵتدا هەیە، هەتا لە قسەشم دەبمەوە نابێ لە غەیری قایمقام ڕێ بە کەس بدرێ بێتە ژوورەوە، قایمقامیش بۆیە هەقی هاتنی هەیە چونکە قسەکانم پێوەندی بە وەزیفەی ئەویشەوە هەیە.

محکەمە چۆڵ کرا و دەرگا داخرا ماینەوە من و حاکم، پێم باوەڕ بکە خوێنەری خۆشەویست، ئامادە بووم لەو ژوورەدا بە تێلا لە حاکم بدەم ئەگەر قسەی لێ

نەسەلماندبامایە. کوردی دەڵێ «لە دین دەرچووبووم». گوتم فڵانەکەس شتێکت پێ دەڵێم هی ئەوە نییە ڕەتی بکەیتەوە، دەبێ بێ دووپات کردنەوە جێبەجێ بکرێ، واتە لێمی بسەلمێنێ. هێشتا زاری نەکردبۆوە بپرسێ چم مەبەستە لەسەر قسەم ڕۆیشتم و گوتم میناغا و کوڕەکە تەوقیف ناکرێن... ئەو حاکمە ماڵی بە خانەی خوا بێ، بێجووڵە گوتی تەوقیفیان ناکەم. ئنجا گوتم با پێت بڵێم بۆچی وەها لە حەد دەرچووم، هەموو پژدەر بە دیار ئەم مەحکەمەیە گوێ قوت بووە، ئەگەر میناغا تەوقیف بکرێ لە ماوەی حەفتەیەکدا سەد دەعوای وەهات بۆ دێت، چەند شایەدێک ڕەپە لە قورئان دێنێت و مڵکدارە ناحەزەکە بە گرتن دەدات بە تەمای مڵکەکانی. ئەوساش هەرایەک پەیدا دەبێت نە بە مەحکەمە و نە بە قایمقام و نە بە عومەر عەلی (موتەسەڕیفی ئەوسای سلێمانی) چارەسەر ناکرێت کەسیش سەرەدەری لە ئاکامەکەی ناکات بە چ لایەکدا دەکەوێت. عومەر عەلی لەو ڕۆژانەدا دژی ئاغاکانی پژدەر بوو.

کە دەرچوم لە ژووری مەحکەمە ئەو ناوە مونجەی دەدا لە قەڵەباڵغی. میناغا و کوڕەکەی وەکوو مەلی بەر باران بە کزی ڕاوەستابوون. کە زاندرا میناغا تەوقیف ناکرێ خەڵقەکە وەک تەلی کەهرەبایان گرتبێ وروژان. میناغا گوتی، فڵان، ناموسی لێ دەرچێت هەرچی خوا بە منی داوە هی تۆیە. پێم گوتەوە، هەموو پژدەرم پێ بدرێت نامەوێ. من شەڕی سەر و ناموسم بۆ کردوویت، خۆ فلسێکم نە خستۆتە سەر سامانت. پاش بەرپابوونی هەرا لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم کە هەمووی چوار ساڵێک لەو موحاکەمەیە دواکەوت، ماڵی میناغا بوو بە قۆناغی حەسانەوەی سەدان لەو کەسانە خواخوایان بوو میناغا لەو موحاکەمەیدا بە پەتەوە بکرێ.

ئەو ڕۆژە دەوری عەسر کە گەڕامەوە بۆ بۆسکێن، لای شێخ حسێنی حاجی سەید، لەسەر قەیاغی دەربەندڕا دیتم شێخ حسێن هاتووە کە بەیەکەوە بۆ بۆسکێن بگەڕێینەوە هەر کە دیتمی گوتی ڕەنگت گۆڕاوە دەڵێی ڕۆژوو تینی بۆ هێناوی، منیش باسی چەندوچۆنی ئەو دەعوایەم بۆ گێڕایەوە کە چەند بە دەست سوێندی درۆزنانەی شەش شاهید و باوکی «مقتول» سەغڵەت بووم. کەسێکی وەها بزانێ کە درۆی جاری ئەوها پشتگیری کردنە لە هەژار دژی زۆردار، ئەو کەسە خۆی دەخافڵێنێ و لە هەمان کاتیشدا ڕێ خۆش دەکات بۆ خۆی کە لە هەلدا درۆی ئەوتۆیی بکات بەتەپکەی تەماع.

بابەکری سەلیماغا کە گەورەی ئەو تایەفە بوو میناغای پێ دەناسرا کە زانی هەڵوەستم لەو دەعوایەدا چۆن بووە گوتبووی لێرە بە دواوە با کەس پرس بە من نەکا بچنە لای فلان. بابەکراغا ساردایی هەبوو لەگەڵ خاڵەکانم و لەگەڵ تایەفەی مەحموداغاش کە خاڵوانی خاڵەکانمن و دۆستی خۆیشم بوون، بەپێی عادەت و بەرژەوەندی قاڵبەستوو چاوەڕوانی نەدەکرد من هێندە بە پەرۆش بم بۆ خزمێکی ئەو، بێ تەماعیش. من جگە لە شەخسی میناغا کەوا زۆر زۆر دەیانویست لە هیچە بە پەتیەوە بکەن، بۆ هەموو پژدەر لە پەرۆشدا بووم کە لەسەرینایی دەعوای وەها ناحەق و بوختانکەر و چرووک باری بشێویێت و قەسابخانەی تێدا بەرپا بێت. ئەم مەسەلەیە گەلێک لایەنی دیکەی بە سفتوسۆی تێدایە، من بە لامەوە لێدووانی پەسەند نییە.

ڕووداوی دیکە ئەوەبوو کە لە دەعوای دێی مەمەنداوا کە تێیدا وەکیلی بابەکراغا بووین کەشفی تەسویە «وضع الید»ی بۆ بابەکراغا دانا. فەلاحەکان خۆیان بە مەغدوور زانی، ڕەنگە مەغدووریش بووبن، چوون پەنایان بردە بەر عومەر عەلی، موتەسەڕیفی سلێمانی. کاغەزێکی ڕەسمی لە عومەر عەلییەوە بۆ سەرۆکی تەسویە هات داوای لێ دەکات کە خۆی بچێ بۆ دووپات کردنەوەی کەشفەکە. سەرۆک تەسویە، خەڵقی سلێمانی بوو، لە وەڵامدا بۆی نووسییەوە «نزولا عند رغبة سعادتكم قررت إعادة الكشف في المقاطعة المذكورة بنفسي». ئەگەر هاتبایە لە خۆوە بڕیاری دابایە کەشفەکە هەڵوەشێنێتەوە چ گلەییم نەدەبوو بەڵام وەها پاتەوپات بە خاترانەی موتەسەڕیف قانوون ژێر پێ بیەخێت هی سەلماندن نەبوو. تازە چ متمانە دەمێنێ بە داد و حەق و ناحەق. چوومە لای، ویستی موجامەلە بکات گوتم نە چایە نە ئاویشت دەخۆمەوە من لەم دەمەڕا لێت دەچمە شکات. چەندێکی هەوڵی دا گوێی خۆم نەدایێ. مامۆستا عەبدولڕەحمان نوورجان، معاون تەسویە بوو، خەریک بوو شەڕەکە بکات بەشەڕی خۆی، پێم گوت تۆ دەخلت بە مەوزووعەوە نییە هەر چونکە کۆنە مامۆستاشمی لێت بەدەنگ نایەم (لە دەعوایەک دژی ئێمە بێقانوونییەکی کردبوو، ئەویش بە ئەمری سەرۆک تەسویە، هی ئەوە بوو ئەگەر لێی بکۆڵرێتەوە دووچاری سەغڵەتییەکی زۆر بێت. من هەم لەبەر مامۆستایەتییەکەی و هەم لەبەر بێدەسەڵاتییەکەی هیچم تێدا نەگوت، هەروەهاش کاک بەکر).

یەکسەر چومە بەغداد، هەوەڵ جار سەردانی «مكي جميل» کارگێڕی گشتی تەسویەم کرد کە ناسیاوە و کۆنەئاشنا بوو، زاتی نەکرد هیچ بکات گوتی «اخي عمر علي فد عفريت منو يگدر له...» ئنجا چوومە لای ئەحمەد موختار بابان، وەزیری مالیە بوو. من وەزیری عەدل «عبدالجبار التكرلي»م نەدەناسی، مەسەلەکەم لە ئەحمەد موختار گەیاند، تەلەفۆنی لەگەڵ وەزیری عەدل کرد هەموو قورسایی خۆی هاویشتە سەر مەسەلەکە نەک تەنها چونکە خاتری منی دەویست بەڵکوو وەک خۆی گوتی، «هذا اخلال خطير بالقضاء والعدالة». کە گەیشتمە عەدلیە «مكي جميل» چاوەڕوانم بوو، خێرا لە ژووری مدیر «عەدلی عام»ەوە بۆ ژووری وەزیری بردم لێم نەگەڕا سەلامیش لە «مدير عام» بکەم کە ناسیارم بوو. گوتم با خەبەری وەزیر بدەین، گوتی «أخي الوزير ينتظرك على جمر...» دەرگای نێوان ژووری مدیر عام و وەزیری کردەوە منی پاڵ پێوەنا و خۆی گەڕایەوە دواوە. مامۆستا تەکەرلی پیاوانە وەریگرتم، لەحەدبەدەر موجامەلەی نواند. جارێ لە پێشەوە بانگی «مكي جميل»ی کرد و گوتی هەر بە تەلەفۆن، لە پێش چاوی فڵانەکەس لە ڕەئیس تەسویەی ڕانیە بگەیەنە کە دەست بۆ هیچ ئەوراقەک درێژ نەکات... مەکی جەمیل چاوەنۆڕی کردم لای مدیر عام... وەزیر دوای قسە و لەتیفە ڕووی تەکلیفی لێ نام و گوتی، دەزانم خۆت حەز ناکەیت لە وەزیفە ئەمما پیاوی ڕاست و پاکی کوردم بۆ ئیقناع بکە مەسئوولیەتی ئەو ناوچانەی پێ بدەم بەڵکوو لەو تەرزە ڕەئیس تەسویانە قوتار دەبین.

وەزیر نومرەی تەلەفۆنی وەزارەت و ماڵەوەی دامێ کە هەر کاتێک نامزەدم دەست کەوت پێوەندی پێوە بکەم. کە گەڕامەوە بۆ کۆیێ، لە کەرکووک ئیبراهیم ئەحمەد-م دیت و تەکلیفەکەی وەزیرم پێ گوت بەڵکوو خۆی ڕازی بێت سەرۆکایەتی ئیستیئنافی تەسویەی هەموو کوردستان بە ئەستۆوە بگرێت. لە وەرامدا گوتی: دەزانم ئەو وەزیفەیەم لە دەستدا بێت بە ئاسانی دەتوانم موشکیلەی فەلاح و زەوی و زار لە هەموو کوردەواریدا بڕەوێنمەوە، ئنجا هەر بە سیارەی حکوومەت نەشرەی پارتی بێ ترس لە کوردستاندا بڵاوبکەمەوە، بەڵام چ بڵێم بە بەرەی چەپ و ناحەز کە وەزیفە قبووڵ کردنم لەسەر حیساب بکەن بە ڕێگەگۆڕی...؟ وەرامم بۆ وەزیر ناردەوە کەوا کەسم نەدۆزییەوە هەم ڕازی بێت و هەم بە قانوون بشێ بکرێتە سەرەک ئیستیئنافی تەسویەی سێ لیوا.

لەگەڵ مەکی جەمیل چووینەوە تەسویەی عامە. بە تەلەفۆن لە سەرەک تەسویەی ڕانیەی ڕاخوڕی «لاتتحرک من غرفتک، لاتلمس ورقة، لاتطلع في کشف، کلشي ماتسوي الی ان تجیک اوامر...» بۆ سبەینێ ئەمر دەرچوو بە لادانی لە سەرۆکایەتیی تەسویە و دابەزاندنی بۆ معاون تەسویە و نەقڵیش کرا بۆ شوێنێکی وەکوو قەرەداغ، دەربەندیخان... ناوی شوێنەکەم لەبیر نەماوە. بەڵام کە ئەمەیان کرد پێشتر بۆیان ڕوون بۆوە کە سەرۆکی تەسویە کاغەزەکەی بۆ موتەسەڕیفی سلێمانی نووسیبوو، ئەویش بە تەلەفۆن مەعلووم کرا چونکە ژمارە و تەئریخی ئەو کاغەزەم لابوو...

وێنەی ئەوتۆیی لە تەجرەبەی پارێزەری بە بەریەوە هەیە نیگای خوێنەری بیست سی ساڵەیی بەسەر دیمەنێکی قانوونی ڕۆژگاری بەر لە خۆیدا بکاتەوە کەوا ڕەنگە بەتەمای نەبووبێت. من موعاریزێک بووم موراقەبەم بە سەرەوە بوو. لە دەمی «عدوان ثلاثي» بۆ سەر میسر، بۆ هەر کەشفێکی تەسویە وەیا لە دەعوای دیکەدا چووبامایە دەستەی ڕەسمی لە هەندێ کاتب و پۆلیس و فەڕاشانیان ڕادەسپارد ئاگایەکیان لە هەڵستان و دانیشتنم هەبێ. کە چووم بۆ کەشفی گەناو مەخفەری شورتە و معاوینی تەسویەش ڕاسپێردران بۆ ئەم لایەنە. لەگەڵ ئەمەشدا ڕێزم دەپارێزرا و قسەم دەبیسترا وەک تازە گوتم ڕەئیس تەسویەیان لەسەر موراجەعەی من هەڵداشت.

ئەو خەڵقەی پێش شۆڕشی تەمووز گورگ و دڕندە نەبوون. لە دەستیان هاتبایە حەزیان دەکرد خەڵقیان لێ مەمنوون بێت. مرۆ کە ڕەفتار و ئاکاری بە پاکی ڕسکابێت لە هەموو دەورانێکدا مەردایەتیی خۆی دەنوێنێت، کە دەروونیشی کرمێ بوو دیسانەوە لە هەموو دەورانێکدا چڵکنی خۆی بەدەر دەداتەوە.

لە یادی ڕەوی سێ قۆڵی بریتانیا و فەرەنسە و ئیسرائیل بۆ سەر میسر دێتەوە بیرم کە خەبەرەکە لە ڕادیۆ بیسترا من لە هەولێر بووم. ئیشی محامات بردمی بۆ قەلادزە، شەوان لە ماڵی حاجی ئەحمەدی خاڵۆزای کاک بەکر دەنوستین. هەموو عالەم بە دڵ بۆ میسر لە پەرۆشدا بوو، ئێمەی سەربە سیاسەتیش پتر لە عالەم بەو ڕووداوەوە دڵگەرم بووبووین چونکە تێشکانی میسر دەیکێشایەوە بۆ کەمتربوونەوەی ئومێد بە لاچوونی توندوتیژیی سیاسەتی حکوومەتی عێراق.

شەویکیان بە درنگەوە کەوتینە ناو جێگە، کاکە بەکر خەوی لێ کەوت من جارێ بزەی چاوم دەهات. ڕادیۆم بەسەر ئێستگەی میسرەوە کردبۆوە لە ناکاو خەبەری ئینزارەکەی سۆڤیەت کە بەو سێ دەوڵەتەی دابووی خوێندەوە، کاکە بەکرم بەخەبەر هێنا و ئەو موژدەیەم داپێ. ڕەنگە هەتا لای بەیانی لە خۆشیا و بە دیار خەبەری نوێترەوە نەنوستبین... خۆشیی ئەوتۆیی لە ئاوێنەی دوارۆژدا بەیتە مەشوورەکەم بە خەیاڵدا تێدەپەڕێنێ کە دەڵێ:

که من نەخلی مرادم بێسەمەر بێ
بە من چی باغی عالەم جوملە بەر بێ

بەڵام مەعلوومە مرۆی بێدەسەڵات چ تاک بێت و چ کۆمەڵ، بە هەڵسوکەوتی لە خۆی دەسەڵاتدارترانەوە دەخەریکێت.

هەر لەو بەینانەدا بوو چەند کەسانێکی ناوداری موعارەزەی بەغداد بەر حوکمی عورفی کەوتن، لەمانە «صدیق شنشل» بۆ قەڵادزە دوورخرایەوە. من لە قەڵادزە بووم، حکوومەت ڕێی نەدەدا کەس بچێتە لای. پێوەندیم بە قایمقامەوە کرد کە ئیمکان نییە سەردانی «صدیق شنشل» نەکەم، ڕێشم نەدەن من بۆی دەچم، ئێوە دەمگێڕنەوە نامگێڕنەوە لە دەست خۆتاندایە.ماڵی ئاوابێ فێڵی لە حکوومەت کرد، بە ناوی واجیبەوە خۆی سەردانی مامۆستا شەنشەلی کرد، منیش بێ ئەوەی لە ڕواڵەتدا تێخوێندرابێتمەوە، وەیا ناوی خرابێتە لیستەی سەرلێدانی بابای دوورخرایەوە گەیشتمە ئەو ژوورەی ئیستیراحەتخانەی کە شەنشەلی لێ دابەزێندرابوو... پێش ئەوەی بچین بۆ لای، تەرتیباتی خواردەمەنیی بۆ کرابوو لە ماڵی ئەحمەدەوە. نازانم چۆن وەسفی ئەو بەیەکتر گەیشتنەمان بکەم... کە دێتەوە یادم چ برسییەتیەکی چێشتبوو لەو ماوەیەدا کە بۆ قەڵادزە بەڕێ کرابوو تا ئەو دەمەی خواردنەکەی گەیشتێ تەزووم پێدا دێتەوە. ئەو لە خۆوە هیچ دادوبرۆی لە دەست برسییەتی، وەیا مامەڵەی گەیاندنە قەڵادزێ نەکرد بەڵام دارسانی بۆ سەر خواردن فیلمی ئەو گەشتە خۆشەی نێوان بەغدا و ژوورەکەی ئیستیراحەتخانەی بە بەرچاوی زەینی بنیادەمدا دەگێڕا. قایمقام بەینێک لەگەڵمان دانیشت بایی ئەوەی بکات کە دواتر ئەگەر پێویست بوو بتوانێ بڵێ لە وتوویژیان خۆم حازر بووم... بە بەهانەیەک

ژوورەکەی بەجێهێشت. چی شاردرایەوە نەبوو لە نێواندا ئەوە نەبێ کە قسەی دوو قۆڵی نێوان دوو برادەر خۆشتر و بێگرفترە لەوەی قۆڵێکی سێیەم وەک پینە پێوەی بنووسێت. «فائق السامرائي» بۆ هەڵەبجە دوور خرابۆوە، کۆمەڵەی «الوطني الديموقراطي» لە بەغداد حەبس بوون... ئیتر لەو جۆرە خەبەرانە و هەندێ تەعلیقات و پێشبینی و چاوەنۆڕی دوارۆژ و بابەتی ئەوتۆیی و باری ناوچەی کوردەواری بوو کە ماوەی دانیشتنە دوو قۆڵییەکەمانی پڕ کردەوە.

قایمقام کەرکووکی بوو، بە چەند ساڵێک دوای من لە حوقووق دەرچووبوو. دۆستی خاڵەکان و خۆیشم بوو. هەموو هەموارییەکی لە ئیمکاندا بێ بۆ حەسانەوەی «صديق شنشل»ی جێبەجێ کرد. بە زوویی ڕێ درا خەڵق بچێتە لای، لەلایەن خزمەتیشەوە تێکڕای قەڵادزە بێقسوو بوو بۆی. دواتر وەک خۆم چاوەنۆڕم دەکرد، سددیق شەنشەل خۆیشی بۆمی گێڕایەوە، کە تێیان گەیاندووە من پارێزگاریی دەرەبەگ دەکەم...

پاش شەش حەفت ساڵێک کە لە پەڕاگەندەیی ساڵی ١٩٦٣ ماڵەکەم لە هێرۆ بوو، کۆمەڵێکیش پەنابەری سەربە چەپ بووبوون بە مێوانی ماڵی مەحموودی حاجیاغا (مەحمووداغا لە زەستانی ١٩٥٥ کۆچی دوای کردبوو) لە نێوانیاندا برادەرێکی عەرەب بوو تووشی نەساغی دڵ بووبوو، تکای بۆ کرابوو لە حاجیاغای مەحمووداغا کە ئیزنی بۆ وەربگرێ لە دەرەوەی وەڵات تەداوی بکرێ...

ئا لەو ساڵەدا دەستەیەکی شەش حەفت کەسی بووین لە بیروڕای هەمەچەشنە قسەمان لە هەموو مەیدانێکدا دەگێڕا هەتا هەل پەیدا بوو کە بەو برادەرە عەرەبە بڵێم، ئێوە لەسەر چەند دەعوایەکی تەسویە کە من تێیدا وەکیلی ئاغاکان بووم ناوی منتان زڕاند هەر لێرەوە هەتا پەکین و مۆسکۆ کەچی ئێستا من پەڕاگەندەم لە خانووی مەکتەبی منداڵاندا سەربەخۆ دەژیم، حاجیاغا نەک دۆستمە خزمیشمە، خۆیشی بە برا چووکم حیساب دەکات ئنجا ئەگەر لە برسا بمرم و بە دەردی سیل هەلاهەلابم ئەو چاوەی لێ بز ناکەمەوە کەوا تۆ دوژمنی بابەکوشتەی دەرەبەگی بە ئومێدی تەداوی لە وڵاتی ئیستیعمار چاوت لێ چڕکردۆتەوە و بە نانی ئەویش دەژیت... قسەکانم بێڕەحمانە بوو بەڵام جەرگەی ڕاستی و دادی دەپێکا. ئەو برادەرە هەر ئەوەندەی پێ کرا کە بە کوڵ بداتە گریان، خۆ منیش لەو دەمەدا بۆی گریام...

لە موناسەبەدا دەڵێم، کاتێک هەر لە بەرەو کۆتایی پەنجاکاندا کە سرەی تەسویە گەیشتە دێی هێرۆ مەحامیە تێکۆشەرەکان دەعوای تەسویەیان خستبووە قاڵبی خەباتی چینایەتییەوە تا ئەوەی لە تەسویەی دێیەک لە دێیەکانی پژدەر هەرای خوێناوی ڕووی دا ئیتر من دەستم لە دەعوای تەسویە کێشایەوە. حاجیاغا هاتە کۆیێ شەوێکیشم لێ مێوان بوو کە وەکالەتیان بکەم لە تەسویەی هێرۆ، عوزرخوازیم کرد و دەعواکەم بە ملەوە نەگرت ناشزانم چ تێکۆشەرێکیش چوە ژێر ئەرکی ئەو دەعوایەوە. لەو ماوەیەدا کە دەعوای نوێم نەگرت تەنها خەریکی دەعوا کۆنەکان بووم...

شەراکەتی بێ سەنەد و ئیمزام لەگەڵ کاک بەکر ئیسماعیل-دا ئەوەندە بێگرفت و بێقۆرت بوو دەتگوت شەریکی خۆمم. ڕۆژەک لە ڕۆژان، نەک هەر گەردی لە دڵم نەنیشاند، بگرە ئەوە نەبوو بە ڕەفتاری تازەی ئەمڕۆی دوێنێم لە بیر نەباتەوە. بێفەرقی لە بەینماندا گەیشتبووە پلەی دوایین. لە خۆوە تێبینیی ئەوەی دەکرد کە پێوەندی دۆستایەتی و خزمایەتیی بەربڵاوم لە ڕانیە و پژدەر لێم داوا دەکات گەلێک دەعوای بە ئەرکی بێمزە بە ئەستۆوە بگرم ئیتر ئەو بە زیادەوە تێیدا دەکۆشا وەک کە بۆ برای خۆی بکۆشێت. وەها دەبوو لەو کەشفانەی ماندووبوونی زۆریان تێدا بوو، بێ ئەوەی پێم بڵێ و لەسەرمی حیساب بکات بە چاکە، خۆی بە تەنها بۆیان دەچوو. لێرەدا نوکتەیەک دێتەوە بیرم سەر بەو ڕۆژانەی کە جارێ دەعواکەی دۆڵی شاڵەبەگ-یان لە کێشەدا بوو. سبەینەیەکی هاوینە ٣٢ کەس لە شێخ مەسووری و کانیوەتمانی-یان بە ١٦ بارەدار و دەپازدە کەڵەباب و مریشکەوە لێم مێوان بوون. دەستبەجێ ٨ بارەدار و نیوەی کەڵەباب و مریشکەکانم بۆ کاک بەکر نارد، ڕاشم سپارد پێی بڵێن ئەگەر حەز دەکات شازدە مێوانیشی بۆ دەنێرم بەپێی شەراکەت. گوتبووی خوا بەزیادی بکات ئەو پەڕەوڵانەم بەسە...

ئێمە لە بیستەکانەوە بەپێی داخوازی پێوەندیمان بە دەشتودەرەوە حەسارێکمان هەبوو جێی ١٠٠-١٥٠ وڵاغی تێدا دەبۆوە، دەرگای بەرانبەر بە دەرگای ماڵەکەمانەوە بوو، نە لە داکردنی وڵاغ نە لە هاتوچۆی ئالیک دانیان هەستمان بە ئەرک و زەحمەتی نەدەکرد. لەبەر ڕاهاتن، میوانی دەشتودەریش ئێسکیان قورس نەبوو لامان، بەتایبەتی کە لێیان مێوان دەبووین بە دڵ و گیان خزمەت و حورمەتمان لێیان دەدیت. جێی نوستنی مێوانی شەوانەشمان هەبوو کە عەلاقەی بە

ماڵەوە نەبێت، خۆ شەوانی هاوین کە خەڵق لە سەربان دەنوستن لە ڕایەخ بەولاوە پێخەفیشیان نەدەویست. خولاسە بۆ وەزعی من بەخێرهێنانی مێوان بێ عەزاب بوو چ جایی ئەوە مێوانێکی پێشتر نمەکم کردبێ لە ماڵی، وەیا پێمەوە خەریک بووبێت... کاک بەکریش لە لای خۆیەوە کە جیپێکی لێ دەخوڕی و من سەیارەم نەبوو، جیپەکەی هێندەی حەسارەکەی ئێمە بۆ من بێتەکلیف بوو. دەیان و ڕەنگە سەدان سەفەری سلێمانی و ڕانیە و قەڵادزە و بیتوێن و ئێرە و ئەوێمان بەیەکەوە پێ دەکرد. وەهاشی بە خاوێنی ڕادەگرت هەمیشە چریسکەی دەهات، بە کەتەلۆگ ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرد.

لێرەشدا نوکتە دەهاتە پێش، لە بۆسکێن دەبووین، زستانان، جیپەکەی شێخ حسێن سەر لە بەیانی بە پاڵ نەبا هەڵنەدەبوو ئیتر وا دەبوو کۆمەڵێک لە نۆکەر و تووتنەوان بە پاڵ دەیانگێڕا و هەزار گاڵتەشیان پێ دەکرد ئنجا هەڵدەبوو. کەچی جیپەکەی کاک بەکر کە کۆنتریش بوو لە هی شێخ، بە یەک سیلف دەکەوتە گەڕ. شێخ حسێن دەیگوت جیپی خۆم هی پاڵەوانانە وەک کەڵەگا دەغەزرێ... کاک بەکریش جیپی هەیە! ئەم وێنانە لە ژیانی من و تۆدا ڕووپێوێکی بەرین داگیر دەکات لە مەیدانی چالاکیمان، خۆ هەموو دەم هەر خەریکی بەرەوپێش بردنی ڕەوڕەوەی مێژووی گرژ و مۆن نابین، ئاخر گرژینەوەیەک، سەلام و مەرحەبایەک، تۆران و ئاشت بوونەوەیەک و شین و شادییەک و کەلا بەگوێزانییەک و کەوشەک و سێبازێکی هەر دەبێ تێدا بێت. ڕاستە بگوترێ، نابێ یاداشتی بسمارک و لینین و چەرچل کە لە چەرخوفەلەک و سیاسەتی جیهانی، وەیا هەر نەبێ بەشێکی بەرچاوی جیهان تێنیشتن، یاداشتیان لە کاری گرنگەوە بۆ کاری بێبایەخ ڕاگوێزێت بەڵام ئێمەمانان بەحاڵ چەند داوێکی کڵافەی سیاسەتی بێدەسەڵاتی کاولگەی وڵاتی خۆمانمان هەڵکردۆتەوە کەوا ڕەنگە بە چەند لاپەڕەیەک لە حیکایەتیان ببینەوە ئەگەر لە کڵافەی بابەتی غەیری سیاسەتی ڕووتیش داو هەڵنەکەینەوە.

خۆ ئەوەی ڕاستی بێ بەپێی حاڵوباری کەم دەسەڵاتی و بەرتەسکی جغزی تەلاشمان پتر لە تێوەڕامانی هەڕەمەی ڕووداوی ژیانی خاوەن یاداشت ڕوون دەبینەوە تا ئەوەی خەبەراتی بەسەروسەدای گرنگ و زێدە گرنگی ناوخۆ و جیهان بدەینە بەر زەین و خەیاڵی ڕۆخ ئاگردانە ساردوسڕەکانمان و دەوروبەری زەوییە سەرکێڵ کراوەکانمانەوە. «یەن»ی ژاپۆنی لەتەک «ڕۆبڵ»دا وەستا بەڵام بە «دۆلار»

وێرا... تەرازووی تیجارەتی برازاڤیل و برازیل لەنگەریان بەزی... لۆکەی فیلستان بە تراکتۆری پەنیرستان ئاڵوگۆڕ کرا... نۆرە سەرۆکایەتیی نوێنەری شێلمستانە لە مەجلیسی ئەمن بەسەر چوو. ئنجا بە من چی؟ بەڕاستی، وەک کە سەلکە سلْق بە کونی دەرزیدا ئاوا نابێت ئەم خەبەرانەش بە سەد پێلەقە ناترنجێنە باو پۆرگی هیچ بەرژەوەندێکی من و تۆی پێوە خەریک دەبین. بەڵام بێگومان کە بۆم گێڕایەوە جارێکیان لە سەردانی سلێمانیم «ڕەشۆڵ»ی هەمیشە زیندوو لە دڵمدا، ویستی لە نادییەکەی خۆی متەعەهدی بوو داوەتێکم بکات مەرجم لەسەر دانا کە لە گون و گورجیلە بەولاوە چی دیکە ناخۆم ئەویش ئەویش گوتی، هەر تۆ و گون؟ ئیتر کە لێبووینەوە پێم گوتەوە، ڕەشۆڵ قەت ئەم گونەت لەبیر ناکەم، ئا ئەم باسە کورتیلەیە چەژێکی کوردانەی لەبەر زار ئاشنا لە یاداشتەکەم دەگێڕێ.

بەر لە شۆڕشی تەمووز دوو هەڵکەوتی سیاسی ڕووبەڕووم بوو. یەکێکیان ئەوە بوو، لە دەمی پێکهێنانی ئەو بەرە نیشتیمانییە یەکگرتووەی کە نوێنەریان لە وەزارەتی ١٤ی تەمووز بەشدارییان کرد ڕۆژێکیان «صديق شنشل« لە چێشتخانەی مەسبەح داوەتی کردم و بەدەم خواردنەوە تێی گەیاندم کە هەموو تەرتیباتێک بە نهێنی کراوە بۆ گۆڕینی باری سیاسی عێراق، گوتی «القضية باقية عليكم انتم الاكراد...» پێم گوت من ناتوانم خۆم بە نوێنەری کورد دابنێم، گوتی، بە ناوی خۆتەوە وەک گەلێک کەسی دیکە وەرە جەبهەوە ئەگەر گلەیەکیش هەیە هەر ئێستا دەچین بۆ لای سەرۆک جەمال عەبدولناسرٍ لە قاهیرە چی لە دڵدایە پێی بڵێ تا هیچ تێبینی سەلبی لە کوردەوە نەمێنێت.

قسەمان درێژەی هەبوو، کورتەی ناوەڕۆکی ڕای خۆم دژی بەشداری کردنم ئەوە بوو کە گوتم لایەنییێکی پێک هێنەری ئەم بەرەیە بیروڕایەکی هەیە کە بەرەی یەکگرتوو بە قۆناغی کاتەکی دادەنێت بۆ زووتر گەیشتن بە قۆناغی دواتر تاکوو پێبەپێ لایەنەکانی بەرەی یەکگرتوو لە ناو دەبات و خۆی بە فەرمانڕەوای تاک و تەنها دەمێنێتەوە. من بە ئەرک و مەسرەفی خۆم نایەم ڕۆژی لەناوچوونم پێش بیەخەم بۆی، با بە ئەرک و مەسرەفی خۆی ئەم ئامانجە جێبەجێ بکات... گوتی ئەمانە هێزێکن لە وڵاتەکەمان ناشێ پشتگوێ بخرێن... گوتم بایەخی هەڵوێستەکەم ئەوەیە کە ئەمانە هێزن ئەگەر هێز نەبانایە منیش دوورەپارێزیم نەدەکرد... ئەمە بوو هۆی بەشداری نەکردنم لەو بەرە یەکگرتووەدا. ئەوساش و ئێستاش دەڵێم من

لە جیاتی ئەوەی یارمەتی لایەنێک بدەم لە ناوم ببات، خۆم دەبمە ئەندامی ئەو لایەنە، کە ڕەوا نەبینم ببمە ئەندامی بەو لاتەریقەوە ڕەوا نابینم خۆم بکەمە قوربانیی ئامانجەکانی کە من هەرگیزاو هەرگیز لەگەڵ براندنەوە و لە ناوبردن و پەلپەل کردندا نیم و نابم...

هەڵکەوتی دوەم ئەوەبوو کامل چاردچی هاتە لام لە ئۆتێلی تروکادیرۆی بەغداد بۆ داوەت کردنم بۆ بەشداربوونم لە پێکهێنانی ئەو حیزبەی کە قەوڵ بوو حیزبی وەتەنی دیمۆقراتی و حیزبی ئستیقلال تێدا بتاوێتەوە.

کە مەنهەجەکەم خوێندەوە پێم گوت، من ناتوانم پشتگیری لە مەنهەجتان بکەم چ جایی ببمە ئەندامی حیزبتان چونکە ناوی کوردی تێدا نەهاتوە. گوتی قسەت حەقە بەڵام ئیشەکە ئانقەست نەبوو... ویستی سبەینێ بچمە لای لە ماڵەوە بۆ پتر دوان لەو مەسەلەیە و ڕێکخستنی دەقێکی لەبار کە باسی مافی نەتەوەی کورد بکات. گوتم ئیبراهیم ئەحمەد وا لە بەغدایە بەیەکەوە دێین.

سبەینێ بە جووتە چووین بۆ لای چادرچی. هەر لە سەعات ٩ی بەیانییەوە هەتا یەکی پاش نیوەڕۆ ماینەوە. لەو بەینە ئیبراهیم ئەحمەد و من لەسەر تەکلیفی چادرچی بە پەلە دەقێکمان نووسی. کە گەڕامەوە کۆیێ زۆری نەبرد نامەیێکی چادرچیم بۆ هات بەم جۆرە دەست پێ دەکات:

> بغداد في ٨/٦/١٩٥٦، عزيزي الأخ مسعود تحية وشوقا وبعد. ان الموضوع الذي كنا قد بحثناه اثناء وجودكم في بغداد قد قوبل مبدئيا بالترحاب من قبل الجميع...

ئنجا دەڵێ لەبەر هەندێ تێبینی دەقەکەی ئێوە تەعدیل کرا بەم دەقە. ئاخۆ چۆنە بەلاتەوە... ڕاستییەکەی دەقی ئەوان لە هی ئێمە چاکتر بوو، هەر وەهاشم بۆ نووسیەوە. کە شۆڕشی چواردەی تەمووز قەوما فکرەی ئەو دەقانە بە دارشتنێکی تازە بوو بە «مادده ٣» لە «دەستووری مووەقەت». خۆیشم تەکلیف کرام کە ئەندامەتیی ئەو حیزبە قبووڵ بکەم، بەڵام نە حیزبەکەی ئەوان ڕێی پێ درا نە ئەگەر ڕێشی پێ بدرابایە دەمتوانی تێیدا ببمە ئەندام.

## ئاڵقەی دوازدەیەم

لەو دوو سێ ساڵەی دوای موحاکەمەی سەربە موزاهەرەی کۆیێ و شێواویی باری هێمنیی عێراق پاش «العدوان الثلاثي» هەستم دەکرد پتر موراقەبە دەکرێم لەلایەن حکوومەتەوە. چەندێکی سەری هەولێرم دابایە بە شەوان کابرایەکی سەربە «أمن» ی ئەوسا لە «دار الاستراحة»یەی ئێستگەی ڕێی ئاسنی کە منی تێدا مێوان دەبووم، دەمایەوە، مەرحووم قاسمی مەلا ئەفەندی ئاغڵەب شەو دەهاتە لام و بەیەکەوەش نانمان دەخوارد، خەرجییەکی باشیشی دەدایە ئەو کابرایە نەکا تەقریری خراپم لێ بنووسێت. ڕۆژێکیان بەر لە ڕۆژاوا هاتە لام، یەکسەر چوو بۆ لای پاسەوانەکەم و چی قسەی خراپ بوو پێی گوت، خەریک بوو لێشی بدات، تومەز قاسم ئەو ڕۆژە لای مدیری پۆلیس، کەوا یەکجار دۆستی بوو، تەقریری پاسەوانەکەمی خوێندبۆوە تێیدا لێمی بزرکاندبوو، لێی نەڕاند هەی وەها و وەها لێکراو من خزمەتت دەکەم بۆ ئەوەی هێندە نامەرد بیت؟ بە گرتنت نەدەم وازت لێ ناهێنم. کابرا کەوتە سەر دەستوپێی، تۆبە هەزار تۆبە... بە چ حاڵ هەتا قاسم وازی لێ هێنا، ڕاستییەکەی من بوومە ڕجاکاری دەنا بە ئاسانی لە دەستانی ڕزگار نەدەبوو.

ئەو پاسەوانەم سوودێکی شەوانەی پێ دەگەیاندین، چونکە مسڵمان بوو مریشکمان بەو سەردەبڕی، چێشتلێنەر، وەستا ئیبراهیم و هەموو خزمەتچییەکانی «رێست هاوز» دییان بوون، هەموو شەوێک لە «رێست هاوز» نانمان خواردبایە دیشێکی لە مریشکی برژاو و گون و گورچیلە و برژەمەنیی دیکەش دەرازاندەوە ئەمما شاهانە... ئێستا بە یاد کردنەوەی ئاو لە زارم دەزێتەوە. دەبێ ئەوەش بڵێم لەو دەمانەدا کە بۆ هەولێر دوورخرابوومەوە عەونی یووسف-یش هەموو شەوان دەهاتە لام ئیتر سێ قۆڵی ڕاماندەبوارد تا دەمی خەوتن.

ڕۆژێک لە ڕۆژانی ئاخەلێوەی بەهاری یەک لەو ساڵانە بڕیارێکی کتوپڕمان دا، من و زەیدی ئەحمەد ئەفەندی و محەمەدی فەتاح چەلەبی و برایمی عەزیزی پاشا (وابزانم قاسمی مەلا ئەفەندیش) بچین بۆ حاجی ئۆمەران. ڕۆژی ٢٢ی مایس، لە هەولێر پانکە کەوتبووە گەڕ، بە جلکی هاوینە دەرچووین بەڵام یەدەگی حازر

بەدەستمان پێ بوو… بەرەو ئەو بەهەشتانەی ناو شاخەکان ڕۆیشتین. بەڕاستی ئەگەر بنیادەم دەستی شێواندنی لێ نەبزافتبانایە نموونەی بەهەشت بوون. لە ڕەواندز بەولاوە دیمەن لە سنووری جوانی دەرچوو بەرەو ئەفسوون… بەفرستانی قەندیل هەوری بەدەورەوە بوو، هەتا لێی نزیک دەکەوتینەوە هەور لێمان دەبووە چەتر و خێوەت. کاتێک گەیشتینە ئۆتێلەکەی حاجی ئۆمەران سەرما و بارانێکی زستانەی بەردەوام کژی گێڕایەوە بۆ سێ مانگ لەمەو پێشتر… ئۆتێڵ تەیار بوو بە هەرچی دڵ حەزی لێ دەکات. بۆ ئەوسا تەماتە لەو کژەدا دەست نەدەکەوت کەچی ئۆتێل تەماتەستان بوو. وێرای خواردنی مومتازی ئۆتێلەکە بەرخێکیشیان بۆمان سەربڕی ئیتر ئەو شەوە بە دیار ئاگری موغەیری و چزەوبزە و برژاندن و بێنوبەرامەی مەتبەخی تێروتەسەل تا نوستن ڕامانبوارد…

ئۆتێل لکێکی تەلەفۆنی مەخفەری پۆلیسی بۆ ڕاکێشرابوو، هەرچی گوترابایە بەتەلەفۆن مەخفەر و ئۆتێل دەیانبیست. وەها ڕێکەوت سبەینە زوو لە «ئۆفیس» بووم، هەوری ڕەواندبۆوە لە پەنجەرەوە سەیری بەهەشتی سەر دنیام دەکرد زیلی تەلەفۆن لێی دا. بیسەرم هەڵگرت گوێم لێ بوو بەرپرسێکی پۆلیسی هەولێر لە ئامیر مەخفەری دەپرسی داخوا «مەسعوود محەمەد» بە لای ئێوەدا نەهاتووە؟ تومەز شەو دەزانن من نەچوومەتەوە ئۆتێل، لێشم خافڵ بوون کە بەرەو حاجی ئۆمەران هاتم، ئیتر شڵەژابوون لە بزربوونی من… گوێم لە قسانیان ڕاگرت دەتگوت نازانم چییان لێقەوماوە. بە برادەرانم گوت هەولێر مشەوەشە لە بزربوونی من. کە بەرەو هەولێر بووینەوە بەدرێژایی ڕێگا پۆلیسی نزیکترین مەخفەرەکان ڕاوەستابوون هەتا بە سەحیان دەکردەوە کەوا، شکر کاکە مەسعوود هەڵنەهاتووە بۆ پشت کێوی قاف. پەحا چ پیاوتۆقێنێک بووم.

دوای بەرپابوونی شۆڕشی تەمووز، پۆلیس و بەرپرسەکانی سەر نوختەی تەفتیش لەو هەرێمەی خۆمان تا خوارووی دوز خورماتوو بۆم بوون بەشایەدی پیاوچاکیم. ئۆتۆمۆبیلێکی منی تێدا بامایە نەیاندەپشکنی، بەرپرسی تازە بابەتیان حاڵی دەکرد ئەم کابرایە لە کۆنە وەتەنییەکانە!!

کژەبارانی نێوان ساڵانی ١٩٥٦ و ١٩٥٧ بەردەوام و بە غوردەم بوو هەتا سەرەتای هاوین. دوایین بارانی ئەو تەڕوتووشییە ئەوە بوو لە ڕۆژی پێنجی حوزەیران، لە کۆیێ، دوو سەعات و چارەکێکی خایاند وەک کوندەی سەربەرەژێر. ئەو ڕۆژە

ڕووبارەکەی کۆیێ پیاوێک و وڵاغێکی خنکاند. بەبیر کەسدا نەدەهات، بە گوتنەوەش نەمانبیستبوو ڕووبارەکە خەڵکی خنکاندبێت. سەوزایی دەرودەشت، جارێ دەتگوت هی نیسانە. لەو بەهارە تەڕ و لێزمەیە بوو سەرۆکایەتی ئیستیئنافی تەسویەی سلێمانی هات بۆ کەشفی زەوییەکانی قەنبەرانی جەلیزادان لە بیتوێن. حەفتسەد دۆنمی ئەو موقاتەعەیە بە ئانقەست خرابووە سەر موقاتەعەیەکی دراوسێی خۆی. بۆیەیشە دەڵێم بەئانقەست چونکە خەریتەی کادسترۆی قەنبەران دزرابوو کە ئیتر بە ئیسپات گەیاندنی داوایەکەمان وەزحمەت کەوتبوو.

مامۆستا قایق هۆشیار سەرۆکی ئیستیناف بوو، پێوەی دیار بوو کە دڵنیا بوو لەوەدا حەق بە لای ئێمەدایە. سەیر لەوەدایە ئێمە لە کاتێک کە دینار بە زەحمەت چنگ دەکەوت 1800 دینارمان لە بری «اطفاء الضريبة»ی ئەو زەویە دابوو بە حکوومەت، زەریبەکەش بە غەدر خرابوە سەر مڵکەکە ئنجا حەفتسەد دۆنمیشمان لێ قرتێندرا کەچی کەسانی ئەتۆ هەبوو لە جیرانە نزیکەکانمان بە «فضولی» و بێ زەریبە هەزاران دۆنمیان لە مشەبەلەزمە وەرگرت... وەی کە زەحمەتە ماڵی حەڵاڵ بە سەلامەتی دەرچێت. لە بۆ پارەی «اطفاء» قەنبەران 3400 دۆنم بوو، لە تەسویە بووبووە 2700 دۆنم. بەهەمەحاڵ ئەم دەعوایە کەوتەوە سەردەمی شۆڕش و کۆتایی پێ نەهات چونکە قانوونی نوێ دەرچوون چارەسەری کێشەی مڵکایەتییان دەکرد. ئەشەدوبیللا ئەوانیش لە تەتبیقدا بە زەرەری خاوەن مافی بێفێڵ دەخرانە گەڕ.

لە بەرەو کۆتایی هاوینێک بوو، لافاوەکەی سلێمانی ڕووی دا. ئەو ڕۆژە لە کۆیەوە دەستەیەکی برادەران چووینە «قەسرۆک»ی سەربە قەزای ڕانیە، لە حەمەدی ڕەمەزان کە وەکیلی من و جەلیزادان بوو لە قەسرۆک، مێوان بووین. ئەو ڕۆژەم هەر لە بیرە چونکە بەپێی عادەتی خۆم لە دیمەنی دنیا ورد بوومەوە و هەورێکی ڕەشی خماوی بەولای پیرەمەگدروونەوە کە لەو جێگەی ئێمەی لێ بووین دەدیترا، ئاسمانی ئاسۆی ئەودیوی پێرەمەگدروونی ڕەش داهێنابوو. بۆ سبەینێ زانیمان لافاو زەرەری لە سلێمانی داوە، گورج زانیم هەورەکەی دوێنێ ئەو کەتنەی کردووە.

تیپی مەولەوی بە وڵاتدا گەڕا بۆ کۆ کردنەوەی پیتاک. هاتنە کۆیە، هەوەڵ جار لای من دابەزین بەڵام مامۆستا ئەنوەر تۆفی پێمی گوت ئەو تاقمە هی وەهایان تێدایە حەز لە بۆهیمییەت دەکات و بەند هەڵناگرێت. بۆ نوستن «دار الضيافة» یان بۆ ئامادە کرا. یەکەم ئاهەنگیان کەوتە شەوی دواتر کە من بە ناوی خۆم ئیجازەی

هەموو ئاهەنگەکانم وەرگرتبوو... لە قوتابخانەی سانەویی کوڕان شانۆیان بۆ ڕێکخرا، تیپی باواجیی کۆیەش لە هەندێ چالاکیی ئاهەنگەکان بەشداریی کرد.

لە لایەن هەموو شارەوە پێشوازییەکی گەرمووگوڕیان لێ کرا. شەوی یەکەم، بەتایبەتی وەکوو سەرگوڵ، بێمانەند بوو. مامۆستا ساڵح دیلان یەکێک لە هەڵبەستە حەماسیەکانی «پیرەمێرد»ی بەرز کردەوە، ڕەشۆڵ-یش بە شێوازی خۆی شتێکی خوێندەوە، بە هەردوویان و تاک و تاکیشیان دڵ و دەروونی ئەو گوێگر و تەماشاچییانەیان خستە کڵپەوە. هەر ئەو تەئسیرە بوو وەهای کرد معاونی شورتە تکام لێ بکات کە لە شەوی دووەمدا گۆرانییەکان بگۆڕێن.

وەک لە بیرمە مامۆستا «قادر دیلان»یش تەمسیلێکی ئیسکسووکی پێشکەش کرد. هونەرکارەکانی دیکەش هەر یەکە لە بابەتی خۆی بێدریغ بوو. ئەو چوارەی ناوم هێنان پێشتر دەمناسین، ئەوانی دیکەم نەدیتبوون. لە ناویاندا ئەگەر سەهوم لە ناوی نەکردبێت «حەمە فەرەج» هەبوو کە ساڵەها دواتر بە خەتە گەوهەرینەکەی کتێبی «کنز اللسن»ی بۆ مامۆستای خاڵ نووسیەوە بە بڕیاری کۆڕی زانیاری کورد. لە وتووێژی مەحرەمانەدا برادەرانی قسەکەری تیپەکە دەیانگوت مەبەستی ئەوان لە پلەی یەکەمدا بەزرکردنەوەی دەنگێکی نارەزایی و بە خۆنازینە. دوای کۆیێ چوون بۆ هەولێر، لەوێش بە چاکی وەرگیران...

پاش بەینێک مامۆستایان ڕەفیق حیلمی و عەبدولجەبار ئەلریزەلی بۆ هەمان مەبەستی پیتاک کۆکردنەوە سەریان لێ داین. بانگهێشتن و کۆبوونەوە لە «دار الضیافة» بوو. چی لە ئیمکاندا بوو بە خزمەت پێشکەش کرا. بۆنەی هاتنی مامۆستا حیلمی و شناسایی لەگەڵ ڕیزەلیدا هەلێکی زۆر خۆش بوو. دوای وتووێژی هەمەچەشنە و سەربە زمان، مامۆستا ڕیزەلی بە ئیلحاحەوە بەڵێنی لێ وەرگرتم کە لە سەردانی بەغدادم دیدەنیەکی مامۆستا «تۆفیق وەهبی» بکەم چونکە دەرکەوت کە هەرگیز بە وتووێژ من لای مامۆستا وەهبی نەناسراوم. بەداخەوە ئەو هەلە ڕێک نەکەوت هەتا لە ساڵی ١٩٧٩ کە چوومە لەندەن لە ماوەی مانەوەمدا دوو جاران چوومە لای لە ماڵەوە، هەردوو جارانیش نانی شەوم لای ئەو خوارد. لە جاری دووەمدا «زەبیحی»شم لەگەڵدا بوو بە ڕەفاقەتی و چاوساغیی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد.

ڕۆژگار خشکەی دەکرد. ڕووداو تانوپۆی کاریکی زلی لە دەستدا بوو. جاریَ نزیکی دوو ساڵی مابوو چارەنووس مەلۆتکەی چواردەی تەمووزی لیَ بەربیتەوە، شیخ مەحموود هاتە بەغدا. شیخ لەتیف حوکمیکی ئیداری درابوو، هاتنەکەی شیخ بۆ بەغدا لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە بوو هەوڵیک بدریت ئەو حوکمە هەڵبوەشیتەوە. شیخ ناساغ بوو لە خەستەخانەیەکی بەغدای بە سەردەبرد. حوکمی شیخ لەتیف تەسدیق کرا بەڵام بە شیخیان نەگوت. وەک پیشتریش نووسیوومە، شەوی وەفاتی شیخ لەگەڵ شیخ حسینی حاجی سەیدگوڵ چووینە خزمەتی. لە هاوینی ١٩٣٥ تاکە جاریکی دیکە شیخم دیتبوو، ئەمیان بوو بە دوەم و یەکجارەکی.

لە ١/١/١٩٥٧ پردی تەقتەق بەسەر زیی گچکەوە کرایەوە. لە بەغداوە وەزیری داخلیە هات بۆ بڕینی شریتی کردنەوەی. ئەم جسرە لەسەر تەکلیفیکی من و کاکە زیاد لە مامۆستا عەلی حەیدەر سلیمان کە وەزیری ئیعمار بوو نۆرەی دەست پیکردنی پیش خسترا، دەنا وەک سەرەک ئەندازیارانی ئیعمار لای وەزیر باسی کرد، خرابووە دوای تەواو کردنی بنەوانی دەربەندیخان کە لە ساڵی ١٩٦٢ ئاهەنگی کرانەوەی لەلایەن عەبدولکەریم قاسمەوە سەرپەرشتی لیَ کرا (دەترسم لە ساڵەکە بە سەهوو چووبیتم و ١٩٦١ بووبیت، سەرمای نیوان پاییز و زستان دەستی پیَ کردبوو کە بۆ ئەو ئاهەنگە بانگهیشتن کرام).

وەزیری داخلیە سامی فەتاح بوو، کە گەیشتینەوە کۆیێ بەر لەوەی بچینە ژوورەکەی قایمقام، وەزیر ڕووی قسەی تیکردین و لە پەردەی بەرژەوەندی‌دا تارماییەکی هەڕەشەی خستە قسەکانیەوە کە ئەگەر جەماوەر حکوومەت نەحەسیننەوە چاوەنۆڕی خزمەت نەبن لە حکوومەتەوە. کە قسەکانی بڕیەوە یەکسەر ڕۆیی بۆ ژووری قایمقام لەویَ بەدەم دەست گوشینی بەخیرهینانیەوە ئەوەی پیویست بوو گوتم، ئەوەشم خستە سەر قسەکانم کە لە ماڵی قایمقامیش جاریَ دیکە وتوویژمان دەبیت. نیوەڕۆژەمان لەگەڵ وەزیر لە ماڵی قایمقام، مامۆستا هادی چاوشلی-ی دۆست و هاوڕیی خویندنم، خوارد. لەهجەی گفتوگۆی سامی فەتاح لەویَ بەتەواوی گۆڕا. بەر لەوەی دوعاخوازی بکات بۆ گەڕانەوەی بەرەو کەرکووک بەڵینی لیَ وەرگرتم کە چوومە بەغدا سەردانی بکەم، نومرە تەلەفۆنی وەزارەت و ماڵەوەشی دامیَ بەڵام بەڵینەکەم نەگەیاندە جیَ و ئەو تەلەفۆنەم نەکرد. ڕەنگە چاکیشم کردبیَ.

ساڵی ١٩٥٨ لە پێشەوە دیارییەکی سیاسیی بۆ عێراق هێنا بریتی بوو لە یەکگرتنی عێراق و ئوردون بە شێوە دەوڵەتێکی «اتحادي» ئەویش بەرتەکی یەکبوونی میسر و سووریە بوو لە عێراق و ئوردونەوە نەکا ئازاتربوونی یەکیەتیخوازانی عەرەب لە هەردوویاندا بکێشێتەوە بۆ توانەوەی عێراق و ئوردنیش لەو یەکیەتییەدا. پارتی کەوتە خۆی بۆ ڕاگەیاندنی دەنگی کورد بە دەوڵەتی «اتحادي» کە نەتەوایەتیی کورد لەو یەکگرتنەدا دووچاری نسکۆ و نشوست نەیەت. وەفدێکی ڕێکخست کە زوربەی هەرە زۆری کەسەکانی بێلایەن بوون بۆ ئەوەی بە خۆی و داخوازییەکانی گەلی کوردی عێراق لە ژێر تازە سایەبانی دەوڵەتی ئیتیحادی، بچێتە بەغدا بۆ بینینی کاربەدەستانی میری. لەمانە حمەی ئەوڕەحماناغا و تۆفیق ئەفەندی ئاغا فەتحوڵا و کاکە حەمەی خانەقا و زێدی ئەحمەد ئەفەندی و شێخ فازیلی تاڵەبانی و (وابزانم) ئەحمەدی حەمەدەمیناغای دزەیی و من و هی دیکەش کە هەبێ ناویانم نایەتەوە بیر.44

لە ماڵی کاکە حەمە، لە کەرکووک، شەوێکیان من و زەید و ئەحمەد و ئیبراهیم ئەحمەد نوێنەری حیزب دانیشتین بۆ داڕشتنی داخوازییەکانی گەلی کورد.
هەڵبژاردنی داخوازی لەلایەن هەموانەوە بوو، نووسینەکەش ئەرکی من بوو. شێوازی نووسینەکەم و داخوازییەکانیش هەتا بڵێی بە لای مەسڵەتی و هێمنیدا بوو، ئەمما مامۆستا ئیبراهیم هیچ بەرهەڵستیەکی نەبوو بە پێچەوانەوە لێشیان ڕازی بوو. بە تێوەریێخ دەڵێم، لەو ساڵانەی دواییدا ئوتروحەیەکم خوێندەوە سەربە سیاسەتی عێراقی بەر لە تەمووز باسی ئەو کۆبوونەوەیە دەکات و تەقریرێکی دایەرەی ئەمنیش ناو دەبات کە دوو ڕۆژ دوای کۆبوونەوەمان نووسراوە لە بابەتمانەوە و چی کردوومانە، بۆ بەغدای بەڕێ دەکات. دیارە ڕۆژی دوای ئەو شەوە خەبەر بە ئەمن گەیشتوە ئەمما کێ خەبەری گەیاند، چۆناچۆنی؟ نایزانم.

ئەندامانی هەموو لایەک لە بەغدا کۆبووینەوە و داخوازییەکان پەسەند کران و بەچاپ گەیشتن. ژوانمان وەرگرتبوو بچینە لای مەلیک و وەلی عەهد «عەبدولئیلاهـ». خەریک بووین لە ئۆتێلەکەمان بەڕێ بکەوین بۆ «بلاط»

---

44- مەجیدی جوکلانمای دزەیی یەکێک بوو لە ئەندامانی وەفدەکە. لە سەرەتاکانی ١٩٦٨ کۆچی دوایی کرد.

نوێنەرەکەی حیزب پێمان گەیشت و قسەی خستە بارێکی دیکە لە چاو شەوی باسکراودا و گوتی نابێ ئەم داخوازییە سارد و شلانە بەناوی کوردەوە بدرێت. ئەندامانی بێلایەن بە گەرمی ئەم قسەیەیان ڕەت کردەوە.

سەری خوێنەر نەیەشێنم خەریک بوو شەیەکە لەسەری مندا بشکێت. مامۆستا ئیبراهیم چەندێکی کۆشای ئەو بێلایەنانەی بۆ ئیقناع نەکرا ئنجا بای دایەوە سەر من و بە هەڕەشەوە لەگەڵم دوا کە نابێ داخوازییەکان ئیمزا بکەم و ناشبێ لە وەفدەکەدا بمێنم. هەتا لای بیلاتیش خەریکی ئیقناع کردنی جەماعەت بووم کە مادەم حیزب ڕازی نییە ماندووبوونی وەفد بێسوودە، کەڵکی نەگرت. من جارێ کاغەزەکەم ئیمزا نەکردبوو. حەماغا و تۆفیق ئەفەندی یەک دەنگ پێیان گوتم کە تا ئەم لەحزەیە زۆرمان لا موحتەرەمی بەڵام بە ئیمزا نەکردنت حورمەتەکە دەگۆڕێ بە پێچەوانەی حورمەت. کە ئەمەیان پێ گوتم سوور هەڵگەڕابوون و چاویان نیوە دەرهاتووبوون لە قەپێلکیان... ئیمزام کرد، هەڵوەستەکەشم بەو ئیمزاکردنە ئازایانەتر بوو چونکە ترس هەبایە لە حیزبەوە دەبوو. جگە لە ئازایی، چ مەنتیقیش نەبوو لەو تەقڵەلێدانەی بەدوا کاتەوە.

جەماوەری کورد خامۆش بوو، قەول بوو لە هەموو کوردستانەوە بروسکەی تەئییدمان بۆ بێت. لە غەیری تاکە بروسکەیەکی هەڵەبجە هیچ دەنگێک بەرز نەبۆوە. ئەگەر وەفدی ئێمە ترسنۆک بوو خۆ دەکرا وەفدێکی ئازاتر بنێرن و گەرمتر لەگەڵ میری بدوێت کەچی هەراکەی هەر لەگەڵ ئێمە بوو. دیدەنی مەلیک و عەبدولئیلاهـ-مان کرد بە مەتالیبەوە. سەرەک وەزیران، نووری سەعید، نەیدیتین، نوسخەیەکمان لە داخوازییەکان گەیاندە سکرتێرەکەی. ئیتر بڵاوەی لێ کرا. پێویستە بڵێم هەندێ قسەڕۆیشتووی حیزبی نووری پاشا زەیدی ئەحمەد ئەفەندی-یان ئیقناع کرد کە لێمان بتەکێتەوە. زەید لە هەڵبژاردن بۆ مەجلیسی ئیتیحادی بوو بە نایب. ئنجا ئەگەر بگوترێ ئەمە نرخی خۆ دەرهاویشتنی بوو لە وەفدەکە خۆ کاکە حەمەی خانەقا لە وەفدیش مایەوە و بووش بە نایبی مەجلیسی بەغدا.

لەو هەڵبژاردنەدا جەلالی حامید بەگ-یش نایب بوو. لە حوزەیرانی پێش تەمووزی ١٩٥٨ ئەو و کاکە حەمە لە کەرکووکەوە بە تەلەفۆن داوایان کردم، چوومە لایان دوای ڕۆژێک دووان هەرسێکمان هاتین بۆ کۆیێ، سەمەدی حاجی محەمەدی

بەنناشیان لەگەڵدا بوو. ئەو ڕۆژە و شەویشمان بە خۆشی ڕابوارد، سبەینێ پاش نانی بەرچایی هەر چوارمان لە ڕێی دووکان و سلێمانییەوە چووین بۆ هەڵەبجە.

سێ شەو و ڕۆژی گەش و خۆشمان بە میوانی لە حامید بەگ ڕابوارد. ڕۆژێکیان چووینە سەرچاوەی زەڵم قەڵباڵغییەکی بەتاقم و تەدارەک بووین. لە ڕێگا هەندێ پیادەی دەنگخۆش «سیاچەمانە»یان دەگوت کە جۆرێکە لە گۆرانیی ئەوتۆ هەر دەڵێی بە زۆر لە پیکی قوڕگەوە دەردێت، سەمەدی نوکتەباز بە جەلالی دەگوت:
ئەم گۆرانییە داوا لە گۆرانیبێژ دەکا، لەو نۆ کونەی خوا بە عەبدی خۆی داوە هەشتیان قەپات بکا هەتا بە یەکێکیاندا دەرپەڕێ. لەو چەند ڕۆژانەدا بەگزادانی جاف پێمانەوە خەریک بوون، لە پێشیانەوە ئەحمەد بەگی حەمە ساڵح بەگ کە دۆست و ناسیاری کۆن و نایبیش بوو لە دەورەی یەک کۆبوونەوە و هەشت ڕۆژ عومر. گەڕانەوەمان بە ڕێی کەرکووکدا بوو، جەلالیشمان لەگەڵ بوو. لە کەرکووکەوە بڵاوەمان لێ کرد، من بەرەو کۆیە بوومەوە.

پێوەندیم بە حیزبەوە لە کزبووندا بوو هەرچەند بەینێکی دیکەش کەوتوڕەوت هەناسەی هەڵدەهێنا. ئەم هەڵوەستە زێدە تەنگەتاوکەرەی کە لە وەفدی ناوبراودا دووچاری بووم لە سۆنگەی تەقلەلێدانە باس کراوەکەدا، تەجرەبەیەکی تاڵ بوو. لە زۆر باوەڕی سیاسی و چاوەدێریی بەرژەوەند و ئایدیۆلۆجیای فکری و فەلسەفیش جودا بووم لە بیر و بۆچوونی ئەو ئەندامە پێشڕۆیانەی نوێنەری فەلسەفەی حیزب بوون.

من لە دەمێکەوە بۆ ئەوە دەچووم کە «مرۆڤ» نەک هۆیەکانی ماددی و ئابووری کۆڵەکەی مێژووە هەر بەویش مێژوو شی دەکرێتەوە. دەبێ مرۆڤ بەرەو پێش بچێت ئنجا هۆی بەرهەمهێنان پێش بیەخێت بە پێچەوانەی دەقی تەقلیدی کە دەڵێ بە گۆڕانی هۆی بەرهەم کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت... ئەمە و زۆر لایەنی دیکەش تێگەیشتنی جیهان بە تێکڕایی و کۆمەڵایەتی بەتایبەتی، لە هەستی مندا جۆرێک بوون لەگەڵ هی بەرەی مەتریالیزم - کە پارتیش وەک حیزب باوەڕی پێی هەبوون - نە دەگونجا. جودایی بیروباوەڕ بەلای قەناعەتی منەوە هێندەی جودایی زەوق لە قوماشی پەجامە و شێوەی سمێڵ مافی مرۆڤە بێ ئەوەی ڕێی پێ بدا کە بیروڕای غەیری خۆی خەفە بکات. دیکتاتۆرایەتی بە هەموو جۆر و شێوە و ئامانجەکانییەوە لە هەڵسەنگاندنی مندا بە دوژمنی مرۆڤ حیساب دەکرا و دەکرێت... گرتنەبەری

بیروباوەڕێک کە لە کووچە و بازارە کاولەکانی کوردستاندا بە ناوی لەناوبردنی چەوساندنەوەوە خەڵق بەگژ یەکترا بهێنێت بێ ئەوەی دەرفەتی مەسڵەتی بدات هەرگیز نەچووە دڵمەوە. لە وڕێنە و خەیاڵیشدا پاڵە و کرێکار بە کوشتن و بڕین و هەرای ناوخۆیی ناگاتە پلەی ئەو خۆشییەی کە چینی کرێکار و فەلاح لە سوید و دانیمارک پێی گەیشتوە بێ ئەوەی خوێن لە پەنجەی کەس بێت. لەگەڵ ئەم جوداوازییەش برادەری و پێوەندی لە نێوانماندا بەردەوام بوو هەتا ناوەڕاستی ١٩٦٠...

تەمووزی ١٩٥٨ هات من لە کۆیە بووم، ماڵەکەمان و هی خزمانی دیکەش لە چنارۆک بوون. بەیانیی چواردەی مانگ لە پڕ ئیزاعە دەنگی شۆڕشی بەرز کردەوە... خەڵق ورووژان... من بە عادەت زۆر ڕموودەی ئەخبار نیم، بەڵام ئەو سبەینەیە دنیا چەشنێکی دیکە بوو... دەنگۆی شۆڕش دلێر بوو ناو ناوەیەک نەبێ کە شێوەی تانووت دانی خەڵق بۆ پشتگیری لێکردنی گرفت و کۆسپێکی لێ دەفامرایەوە. زۆری نەبرد خەبەری ڕاکێشانی لەشی عەبدولئیلاهی پێ ڕاگەیاندین. تەزوویەکی سرکەرەوەم پێدا هات... ڕاکێشانی لاشەی خوێناوی بە شەقاماندا شایەدییەکی باش لەو خەڵقە نادات. چ دڵ و دەروونێکە وەها بە ڕەهایی ڕێ دەدات پاژنەی کەلەش کون بکرێت و پەتی تێهەڵکێشرێت وەک کە دەزوو بە دەرزییەوە دەکرێت!! خزمینە، تاریکاییەکی چەند چرکەیی بە پێش چاومدا وەک هەوری ڕەش تێپەڕی... بەهەمەحاڵ چی بوو نە دەگەڕایەوە و بە کەس چارەسەر نەدەکرا. بەردێکی زلە و لە چیا سەرەژێر بۆتەوە هەتا خۆی لە ئاکامی تەووژم پێ نەمانی بە شوێنێکەوە نەگیرسێتەوە هەر تەقڵە لێ دەدات، تۆز لە عارد بەرەو ئاسمان هەڵدەستێنێت.

تێکڕای خەڵق، تاک و تەرا نەبێ، گۆڕانی ڕژێمی پێ خۆش بوو بەڵام لە نەبوونی خەبەری گیرانی نووری سەعید و دواتر بە بەڵێنی پاداش دان بە کەسێکی ڕێنموونی شۆڕش بکات بۆ گرتنی، ترسێک لە دڵاندا مابوو هەتا دوای دوو ڕۆژ بڵاو کرایەوە کە لە هەوڵی دەردەست کردنیدا کوژراوە...

وەزارەتی شۆڕش دامەزرا. ئێمە خەریکی وتووێژ بووین لە جۆری پیرۆزبایی و پشتگیری کردن لە شۆڕش و چ دەقێک بکەین بە بروسکە. لە «کۆگای ئاوات»ی بەکر بەننا دانیشتبووین، نوێنەری چەپیش لەوێ بوو کە من گوتم بەلای منەوە دەبێ پشتگری و پیرۆزبایی کورد بەندبێ بە مەرجی سوودی کورد و مافە

نەتەوەییەکانییەوە. ئەو نوێنەرە بە توندی بەرهەڵستی لەو ڕایەم کرد و گوتی وەزارەت ئیبراهیم کوببەی تێدایە چ تێوەریێخی مافی کوردی ناوێت و تەئییدی بێمەرجی شۆڕش دەبێ بکرێت. قسەمان نەگەیشتە یەک، وەک لە بیرمە هەر لایەنە بروسکەی تایبەت بەخۆی بۆ بەغدا لێ دا... ئەو بروسکانە و هی دواتریش کە لە کۆیەوە بەڕێ کران تاکێکیان لە ڕادیۆ نەخوێندرانەوە هەتا دواتر کە لەسەر داوا کردنی حیزب هێندێکمان چووین بۆ بەغدا و من بەتایبەتی لەگەڵ کاربەدەستی بەرپرسی ئیزاعە دوام لە بارەیانەوە ئنجا بڵاوکرانەوە. تومەز شۆڕش نەپەرژاوەتە سەر کاکڵ کردنی ئەو جۆرە کارانە، چۆنێکی هاتە بەر داس وەهای دەدرویێت. هاتنم بۆ بەغدا دە مانگی درێژە کێشا.

لە پێشەوە حیزب خەریک بوو، جەماوەرێکی زۆری کوردی لە بەغدا کۆکردەوە. لە ڕۆژێکی دیاریکراودا کۆبوونەوەیەک بەسترا ئیبراهیم ئەحمەد دوانێکی دا و بە تێکڕایی بەرەو وەزارەتی دیفاع چووین بۆ موبارەکبادی. ئیبراهیم ئەحمەد بە ناوی جەماهیر ڕووبەڕووی کەریم قاسم شتێکی خوێندەوە. بە ڕێنموونی لە سددیق شەنشەل-ەوە، کەریم، ئیبراهیم ئەحمەدی هێنایە تەنیشت خۆیەوە و قسەی لەباری بەو جەماهیرە گوت. خەڵقەکە بڵاوەی لێ کرد بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ کەریم بە پێپلکاندا بۆ نهۆمی یەکەمی وەزارەتی دیفاع سەرکەوتن کە شوێنی کەریم و کاربەدەستانی سپا لەوێ بوو.

لەو بەینەدا من وەکوو ئەندامێکی عادەتی لە چالاکیی بۆرەپیاوانەدا بووم. پاش ئەوەی قەڵەباڵغی لە دایەرەکان تەکایەوە لە خۆمەوە بڕیارم دا بچم بۆ لای عەبدولسەلام عارف، گوتم چانسی خۆم تاقی دەکەمەوە، بزانم قبووڵ دەکات یان ناکات بچمە لای. سکرتێری کۆن هەر لە شوێنی خۆی بوو، دەیناسیم، پێم گوت ناوم بنێرێ بۆ لای وەزیر، سکرتێر ڕێزی لێ نام خۆی چووە ژوورەوە، نیو دەقیقەی نەبرد هاتەوە گوتی وەزیر چاوەڕوانتە.

کە چوومە ژوورێ عەبدولسەلام وەهای بەخێرهێنام بەولای هەموو وەهم و خەیاڵمەوە بوو. بۆم هات و دەستی لە ملم کرد و مێزی لێ دام، خەریک بوو بڵێم لێم بە سەهوو چووە داخوا بە کێم تێدەگات کەچی بە دوو دەقیقە تێی گەیاندم کە لە ١٩٥٣ وە دەمناسێت و ئاشنای نیابەت و نووسیەکانمە... لەو بەینەدا کە بەیەکەوە دەدواین تاهیر یەحیا، مدیری شورتەی عام، و عەبدوللەتیف دەرراجی

ئەفسەرێکی زلی شۆڕش هاتن. وەها بووزی خوارد کە تاهیر یەحیا و دەرراجی بکەونە تەنیشی یەکدی، عەبدولسەلامیش کورسییەکی تەنیشت کورسیی خۆیەوە بۆ من دیاری کرد، ئیتر هەر جووتە بە جودا خەریکی وتووێژ بووین. لەم وەزعەدا بووین بێ ئەوەی کەس ئاگاداربێت دەرگا کرایەوە و عەبدولکەریم قاسم هاتە ژوورەوە. هەموو ڕاست بووینەوە و عەبدولسەلام خێرا بە پیرییەوە چوو تا لای دەرگاکە.

من یەکەم جار بوو لە نزیکەوە عەبدولکەریم ببینم، تۆقەیەکم لەگەڵدا کرد و دوعاخوازیم لە عەبدولسەلام کرد کە بڕۆم بەڵام ئەو دەستی گرتم و بە عەبدولکەریمی ناساندم و بۆ ماوەیەک مامەوە ئنجا دەرچووم. (پاشتر لە سەرەتاکانی ١٩٦١ عەبدولکەریم بە خۆمی گوت کە لە ١٩٥٣ وە دەمناسیت و ئاگای لە کەوتوڕەوتمە) چی لەو دیدەنییە ڕووی دا و گوترا هەمووم بە برادەران گوت.

دوای چەند ڕۆژێک، لە ناوەندی ئەو حەفتەی کە لە کۆتاییەکەیدا عەبدولسەلام سەردانی هەولێری کرد، چوومەوە لای. ئەمجارە لە جاری پێشووتر گەرمووگوڕتر بوو، ئەگەر مومکین بێ لەو جاریان گەرمووگورتر بێت. لە قساندا گوتی موتەسەڕیفی هەولێر «لواء رکن علاءالدين محمود»م ڕاسپاردوە کە هەرگیز لە قسەت دەرنەچێت. من ئەم قسەیەم نەخستە ئیمتیحانەوە بەوەدا کە لە موتەسەڕیف بپرسم ئایا چەندی ڕاستە و چەندی موجامەلەیە، بەر لەوەی بشیەم بۆ بەغدا موتەسەڕیف سەردانی کۆیەی کرد، هیچێکی لەو بارەوە نەگوت هەرچەند تا بڵێی مەدحی ئەو گوتارەمی کرد کە لە بەخێرهێنانیدا خوێندمەوە (ئەم گوتارە لە ڕۆژنامەدا بڵابۆوە، دواتر زۆریشی لێ پەشیمان بووم). بەڵام هەروەک ئێستا بۆت باس دەکەم لەلایەنێکی دیکەوە ڕاستبوونی قسەکەی بە ئیسپات گەیشت. زۆر دواین. بە سکرتێریشی گوت تا من هەڵنەستم کەس نەیەتە لای.

وەختێک کە مانەوەم چی دیکە تامی پێوە نەما هەڵستام، لە دەست گوشینی دوعاخوازیدا بووم پێمی گوت ئەم قسانە ڕۆژی جومعە لە هەولێر تەواو دەکەین. من دەرچووم بێ ئەوەی بەڵێنی بدەمێ کە دەچمە هەولێر. کە هاتمەوە ئۆتێل چی بوو و گوترا لەو دیدەنییەدا بە برادەرانی حیزبم ڕاگەیاند. دوای شەو و ڕۆژێک مام جەلال لەلایەن حیزبەوە ڕاسپێردرا بوو، پێمی گوت وەها بەرژەوەند دیتراوە کەوا غەیری سکرتێری حیزب هیچ تاکێک بەتەنها لەگەڵ کاربەدەستانی شۆڕش

نەدویّت. من چ مەبەستێکم نەبوو لە چوون بۆ هەولێر مەگەر سوودی کورد، کە حیزبیش وەها پەسەند ناکات سەد جاران ماڵی ئاوا بێ. سەفەری هاوینەی ئەو سەردەمی لە ڕێگەی خۆڵاوی نێوان بەغدا و کەرکووک عەنقەرەیەک بوو بۆ من هەر دەبوو بە بەهانان خۆمی لێ بدزمەوە. نەچووم بۆ هەولێر....

بگەڕێمەوە بۆ ڕاسپاردەی عەبدولسەلام لەگەڵ موتەسەڕیفی هەولێر عەبدولا عەلی حیکمەت ئەفەندیی کەرکووک، مامۆستای خوێندنی سەرەتاییم و دۆستی مامم و کوڕی موجازێکی زۆر بەناوی باپیرم هاتە لام لە ئۆتێل، بۆ نیوەڕۆژەی سبەینێ لێی گێڕامەوە، برازاکەی عەبدولوەهاب، بووبوو بەقایمقامی کۆیێ گۆیا دەیویست شناساییمان هەبێ. سبەی کە چوومە ماڵەکەی، عەبدولوەهاب پێی گوتم وەزیری داخلیە عەبدولسەلام بە دوایدا ناردووە و پێی گوتوە لە کۆیێ چی مەسعوود محەمەد پێتی گوت وەها بکە لە قسەی دەرمەچۆ... تومەز مامۆستا عەبدولا بۆ ئەم مەبەسە دەعوەتی کردم. من سپاسی وەزیر و عەبدولوەهابیشم کرد لەسەر باوەڕی چاکیان پێم، بەدڵیش داوای سەکەوتنیم کرد و چی دیکەش نا... لە مەوە دەرکەوت سفارشی موتەسەڕیفی کردووە.

حکوومەت، یان بڵێین شۆڕش، بە پەلە بوو لە دانانی قانوونی «اصلاح زراعي»، دوو پسپۆڕی ئەو بوارەی لە میسرەوە هێنا یەکیان «هجرس« ناو. وەی کە حەزم لەو کابرایە نەکرد. ڕاستییەکەی ئەو هەجرەسە چ مەبەسێکی چارەکردنی کەموکەسری زیراعەتی لە دڵدا نەبوو، باوەڕ ناکەم دەستیشی لە قوڕی جۆگە و دووکانی مەرەزە نابێت. لە ڕەفتاریشی دیار بوو دەیویست لە خۆزلترەکانی وەزارەتی ئیسڵاح زەراعی میسری لێ ڕازی بن بەوەدا کە هەوڵی دەدا قانوونی عێراق و میسریش بۆ کشتوکاڵ یەکچوون بێت بە نیازی نەهێشتنی تەگەرەی قانوونی لەبەر هەنگاوی وەزارەتێک کە لە دەمی «وەحدة»ی عێراق و میسر کاروباری کشتوکاڵ هەڵدەسووڕێنێ. هەر لەم نیازەشەوە بوو دەیەویست خولی کشتوکاڵی عێراقیش لە دوو ساڵەوە ببێتە سێ ساڵ. وەک دەزانین دێمەکاری عێراق ساڵێک دەبێتە شۆ و وەرد دەدرێتەوە، ساڵی دووەمیش دەچێندرێت، ئنجا ئەگەر فەلاح وەیا کابرایەکی بیەوێ زەوی بەکرێ بگرێت مەجبووری عەقدی ئیجاری سێ ساڵان بوو چ لەو ساڵەی سێیەمە بکات؟ هیچ! دوای دە ساڵی تەواو لە ئوردون پێشخزمەتی ئۆتێلێکی لێی دابەزیم «سمیر»

ناوێکی میسری و ئەندازیاری کشتوکاڵ بوو، باسی ئەو «هجرس»ەم لێ پرسی گوتی: من خۆم لە دەست ئەو هەڵاتووم...

دەبوو بڵێم من لەلایەن وەزارەتی زیراعەتەوە وەکوو ئەندامانی دیکەی لیژنەی قانوونی ئیسڵاح دامەزرابووم. هدیبی حاجی حموود وەزیری زیراعەت بوو. برادەرانە لێم پرسی ئایا حکوومەت مەسرەفی ئەندامەکانی دەکێشێ یاخود دەبێ خۆمان چارەی خەرجی بکەین. دڵنیای کردم کە گوزەران چ گرفت پەیدا ناکات، کەچی وەهاش نەبوو، کە سەغڵەت بووم بەڵێنەکەم بەبیر هێنایەوە. لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران باسی موخەسەساتی ئەندامانی لیژنەکە کرابوو، وەک بۆم گێڕدرایەوە، هدیب گوتبووی تەنها فڵانەکەس داوا دەکات و لێشی بە پەلەیە. چەندی بڵێی ئەو قسەیەم لێ گران هات. کاغەزێکی قورس و توندم بۆی نووسی، عوزری هێنایەوە کە وەها نەبووە، من گوێم نەدا عوزرەکەی. تا ساڵەها دوای ئەو ساڵە ئنجا لە ڕێکەوتدا دەستم گوشی. لیژنەیەکی فەرعی دروست کرا لە لیژنە فرەئەندامەکە، من و کاک جەوهەر عەزیز لەو لیژنەیەدا بووین تا دوایی کاروباری ڕێکخستنی قانوونە لەنگەربەزیوەکە.

شەوێکیان لە باغچەی لای ئەو «قاعة الشعب»ـەوەی بۆ ماوەیەک ئاهەنگی ڕەسمیی تێدا بەرپا دەبوو کۆبوونەوەمان بوو عەبدولسەلام عارف و محمد حديد و ناجي طالب و صديق شنشل- یش تێدا بەشدار بوون بۆ خێرایی کردن لە ڕاپەڕاندنی قانوونەکە. لەو شەوەدا دیتم عەبدولسەلام تا چ ڕادەیەک ناحەزی سددیق شەنشەلە، هەر بە سددیق کرا خۆی بگرێت و جڵەوی ئیرادەی لە دەست دەرنەچێت بەرانبەر ئەو هێرشە دڕەی عەبدولسەلام دەیبرد بۆ سەر هەر قسەیەک و پێشنیازێک لە سددیقەوە دەرچووبایە. ئەمان هەردوویان لە قەومییەکان بوون، دەشیانزانی، ئێمەش دەمانزانی، چ پلانی نهێنی و ژێر پەردە لە نێوان بەرەی عەبدولکەریم کە چەپەکانن و بەرەی عەبدولسەلام کە قەومییەکانن لە کاردایە.

بەرەی نیشتیمانی یەک(نە)گرتوو کە ئەمجارە لە پێنج حیزب پێک هات لە سەرەوە برا و لە ژێرەوە دوژمن بە یەکدی بوون. چەپەکان بیتاقەیان لەسەر عەبدولکەریم دەر کرد و بە تەواوی خۆیانیان بەو بەستەوە، بۆ ماوەیەکی مناسبیش پێی بووژانەوە. من وەکوو خەڵقی دیکە سەیری شانۆی سیاسیم دەکرد. بەڵام لێرەدا شتێکی سەربە چارەنووسی حیزبەکەی خۆمان باس دەکەم کە تێیدا تەماشاچی و ئاکتۆریش بووم.

بۆ گەڕانەوەی مەلا مستەفا بارزانی و هەڤاڵەکانی کە پەنایان بۆ یەکیەتی سۆڤیەت بردبوو هەوڵ درا و موافەقەش کرا لەسەری. وەها پەسەند کرا کە وەفدێک بە سەرۆکایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد پێشوازی لەو ئاوارەبوانە بکات بەوەدا کە بە پیریانەوە بچێ بۆ ئەورووپا. وەها بە باش زاندرا کە سەرۆکی وەفدەکە سەردانێکی عەبدولسەلام بکات نەکا قەومییەکان و بەرەی دووەم کەسی شۆڕش لە دڵی خۆیانی بگرن کە هیچ پرسێکیان پێ نەکراوە.

ڕۆژێک لە ڕۆژان ئیبراهیم ئەحمەد و جەوهەر عەزیز دزەیی و من چووین بۆ سەردانی عەبدولسەلام. نەختێک بە گرفت گەیشتینە لای. لە قساندا لێمی پرسی بۆچی نەچووم بۆ هەولێر. جوابی پێویستم دایەوە.45 ئنجا کاک برایم هاتە سەر باسی سەفەر و بۆرە ئیزنی خواست. عەبدولسەلام گوتی وەها بە باش دەزانم لە گەڕانەوەدا سەرێکی میسر و دیدەنییەکی سەرۆک جەمال عەبدولناسر بکەن و

---

45- عەبدولسەلام ئەو ڕۆژە دوای بەخێرهێنانمان لێمی پرسی بۆچی نەچووم بۆ هەولێر؟ پێم گوتەوە «سيادة العقيد» جەنابت قسەت وەک پێشنیاز بوو نەک لە بڕیە، بەلاشمەوە زەحمەت بوو لەو قەڵەباڵغییەی تێت دەئاڵێن بتوانم دەنگی خۆمت بگەیەنمێ، سەرەڕای گەرمای هاوین و عەزابی ڕێگە ئیتر ڕێم بە خۆم دا نەیەم. کاک برایم سەرەتای قسانی لەگەڵ وەزیردا ئەوە بوو کە وەها چاوەنۆڕین لە هەر مەسەلەیەکی سەربە کورد بێت وتوویژتان تەنها لەگەڵ کەسانی وەهادا بێت کە مافی قسەکردنیان بە ناوی کوردەوە هەبێت نەک لە لاوە کوردێکی بێگانە لە کوردایەتی ڕاوێژی لەگەڵدا بکرێت. عبدوسەلام گوتی من ئەم لایەنە باش چاودێری دەکەم بە بەڵگەی ئەوە کە چوومە هەولێر تەنها لە فلانم پرسی ئاخۆ هاتبێ ببینم! خوێنەر لێم بسەلمێنێ، بە دڵ ئەو قسەیەم پێناخۆش بوو چونکە لە هیچ ڕوویەکەوە، بەتایبەتی لەباری شەخسی خۆمەوە، سوودێکی نەبوو مەگەر ئەوەی کەسانێکی لە حیزب حەزم لێ ناکەن پتر لێم تاسب بن. من بەتەما نەبووم و نیم، هەگبەم بە بەرەکەتی کوردایەتی پڕ بکەم دەنا دەچووم بۆ هەولێر بێ ئەوەی پرس بە کەس بکەم یان تەکلیفێکم لە عەبدولسەلام (دواتر لە عەبدولکەریم) وەیا موتەسەڕیفی هەولێر هەبوو بێت، بگرە هەر نەشم دیتەوە هەتا ئیمڕۆ، ئەگەر بیرکۆلی بە سەهووی نەبردبێتم.

هەموو شتێکی تێبگەیەنن. ناوناوە لە دەمی قساندا سکرتێرەکەی بە بەهانەیەک دەهاتە ژوورەکە و عەبدولسەلام بێدەنگ دەبوو هەتا کابرا دەچووە دەر. گوتی «هذا جاسوس» مەبەسی ئەوەبوو کە ڕژێمی کۆن پیاوی زۆر ماون لە دایەرەکانی حکوومەت بەڵام نەیگوت ئەوێکی مەلیک و عەبدولئیلاهی لە ناوبردن بۆچی ئەم جاسووسە بەسەر خۆیەوە دەهێڵێتەوە، ئێمەش نەمان پرسی.

بۆ سبەینێ یان دووسبەی کامل چادرچی تەلەفۆنی بۆ کردم گوتی ئیشێکی زۆر گرنگم پێت هەیە. چوومە لای، گوتی ئێوە بۆچی وەها سادە و «طیب النیة»ن؟ کوردی دڵی تۆپێکم لە خۆم زانی. گوتی دەزانی ئەو دیدەنییەی لە عەبدولسەلام-تان کردووە چۆن تەفسیر کراوە و خراوەتە چ قاڵبێکەوە؟ من هیچم نەبیستبوو، بۆی شەرح دام، گوتی یەکێک خەبەری بە حیزبی چەپەکان داوە کە ئەو ئەندامەی پارتی لەگەڵ عەبدولسەلام ڕێک کەوتووە لەسەر پارچە کردنی عێراق، کوردستان جودابێتەوە و چی دەمێنێتەوە لەگەڵ میسر یەکیەتی پێک بهێنێت هەر بۆ ئەم مەبەستەیشە لە گەڕانەوەی سەفەری ئەورووپایدا عەبدولناسر دەبینێت... حیزبی چەپیش ئەم خەبەرەی بە تەقریرێک داوەتە عەبدولکەریم، وەهاش خەبەر بڵاو دەکاتەوە کە وتووێژی ئەو ئەندامە و عەبدولسەلام لەسەر کەرت کردنی عێراق بە ڕیکۆردەر بۆی تۆمار کراوە. دیارە ئەو خەبەرە درۆزنە، سکرتێرەکەی عەبدولسەلام بە چەپەکانی ڕاگەیاندوە.

من بەڕاستی مەسەلەکەم لە کامل بەگ گەیاند بەڵام پڕوپاگەندەکە بێئاکام نەبوو. دوای سێ ساڵ کە عەبدولکەریم بە دوایدا ناردم و چووم بۆ دیدەنییەکە، لە ژووری «مرافق»ـەکەی بووم باسی ئەو ڕێککەوتنە کرا کە چۆن ئەندامەکەی حیزب لەگەڵ عەبدولسەلام خەریکی کەرت کردنی عێراق بوون. ئەو دەمە من لەوپەڕی نارێکی و ناخۆشیدا بووم لەگەڵ حیزب، چەند مانگێک بوو مەقالەکانم لە جەریدەی «الثورة» دژی ڕابەرە مارکسیستەکانی حیزب بڵاوکرابۆوە، لەوانیشەوە وەڵامی قورس و بێئینسافیش ڕاماڵم کرابوویێ، بەڵام دەستی ڕاستەم بەرز کردەوە و قسەم بۆ مرافقەکەی عەبدولکەریم و ئەوانەی دانیشتبوون بە سوێندەوە کرد کە ئەم خەبەرە فڕی بەسەر ڕاستییەوە نییە چونکە خۆم لە وتووێژەکە حازر بووم، دەبوو منیش پلانگێڕێک بووبم...

له شوپاتی ١٩٥٩ که جارێ هەر له بەغدا بووم شەپۆلێکی سەرمای بێئامان هات و خستمی. پازده ڕۆژ بۆی کەوتم و سێ چوار ڕۆژ وڕێنەم دەکرد. گەرووم ئاوسا وەک کە هەرگیز وەها نەئاوسابوو. که نەساغییەکەم بەسەر چوو ئەو گەروە نەچۆوە باری کۆنی. ساڵەو ساڵ بەدەم ڕۆژگاری عومرەوە پیکی قورگم و ئاڵوەکانم کەمتر بە ساردایی دەوێران تاکوو لەو چەند ساڵانەی دواییدا هەر له تشرینی یەکەمەوە هەتا حوزەیران ناوێرم خواردن و خواردنەوەی گەرم نەبێ بیخەمە زارمەوە... یەک جار بەر له چەندەها ساڵ پرسێکم به د. جەمال ڕەشید-ی برادەرم کرد که متمانەم پێی هەیە گوتی، یان ئاڵوەکانت هەڵبقەنە یان خۆت له ترشی و ساردی بپارێزە. لەوە بەولاوە بۆ ئەم زەدەییە پرسم به کەس نەکردووە. هەر شتێکی کەمتر گەرم بێ له خوێنم ناڕاحەتم دەکات تا دەگەمە حوزێران. دوعایەکی خێرم بۆ بکەن هەرچەند قبووڵیش نەبێ.46

---

46- زەدەی گەرووم بەرانبەر ساردی ما هەتا بەرەو کۆتایی ساڵی ١٩٨٩. من له دەوری ٢٥-٢٧ ی مانگی ئەیلوول پرۆستاتم که له ساڵی ١٩٨٢ ەوە دەنگی دابووم، ناچاری کردم برینکاریەکی گەورەم بۆ بکرێت دەنا لەدەست دەچووم. ٢٦ شەو له خەستەخانە مامەوە، مامۆستا سەلاح جاف که لەگەڵ پاراسایکۆلۆجی خەریک بوو، کوڕێکیشی تەمەن شلکی قۆناغی ناوەندی مەشوور بە «شیفا لە دەستی هەیە» بە خۆی و خێزانی و ئەو کوڕەی (ئەحمەد ناو) شەوێک له شەوانی دوای دەرچوونم له خەستەخانە بە ماوەی مانگێک هاتنە ماڵمان و بەیەکەوە نانی شەوانەمان خوارد. باسی ئەو ناسازییەی خۆمم کرد، ئەحمەد گوتی دەتوانم چاری بکەم. پێم گوتەوە من باوەڕ بە قسەت دەکەم بەڵام له دڵدا وەها هەست دەکەم چارم ناکەیت. گوتی هەستی خۆت تەئسیری نییە... قوربان! دەستی ڕاستەی هێنا خستیە سەر ئەو شوێنەی ملمەوە که پێکی قورگی تێدایە، ماوەی ١-٣ دەقیقە دەستەکەی وەها ڕاگرت و چی دیکەش. من نەموێرا خۆم تاقی بکەمەوە مەگەر زۆر بە تەقیە و پێ دزیلکە. له هەوەڵەوە ئاوێکی شیرتێنی وەهام خواردەوە که جاران لەو کژەی ساڵدا نەم دەوێرا توخنی بکەوم، گەرووم بە دەنگ نەهات... ئاوی لوولەی بەبەر هەتاودا هاتووم خواردەوە، سەلامەت بوو... هی لوولەی ناو ماڵەوەم خواردەوە هەروەها

سەفەرێکی کۆیەم کرد و ئاوی ساردم خواردەوە چ نەقەوما ئیتر دەردەکە ئۆغری کرد.

تەجرەبەیەکی ئەو دەمەی خەستەخانەم دەگێڕمەوە: پرۆستاتم وەها ئیلتیهابی کردبوو نەدەشیا برینکاریم بۆ بکرێت پێش ڕەوینەوەی ئەو ئیلتیهابە. بۆ ماوەی حەفتەیەک ڕۆژانە دوو دەرزیم لێ دەدرا هی دەرمانێکی هەرە کاریگەری ئەو دەردە. ڕەنگە ڕۆژی ٤-٥ ی ئەو دەرزیانە بوو کەوتمە حاڵەتێکی نەفسی و بەدەنی ئەوتۆوە هەرگیز شتی ئەوتۆم نە پێدا تێپەڕیبوو نە بە خەیاڵیشمدا دەهات، جۆرێک وڕیی مێشک و تەماویبوونی بینینم و توانای قسەم دایگرتم، ڕەنگە لە حاڵەتی بەنگکێشاندا دووچاری بنیادەم بێت، لە هەمان حاڵدا هەستم دەکرد وەک بە ترومپا هێزی ژیانم تێ بکرێت هەرچی ترسی مردن و ئازاری نەساغی هەبوو بۆ ماوەی نیو سەعاتێک بە تەداوی ڕەوییەوە. دەمەویست کەس تێم نەگا وەزعم چۆنە، کە قسەم دەکرد دەمدیت بواری قسەکردنم چەند ڕێچکۆڵەیەکی وەکوو خەتی جووت بە ڕوومدا کردۆتەوە ئیتر هەموو هەوڵێکم دەدا ڕێبازی قسەم نەپەڕێتەوە بۆ خەتی تەنیشتی، ئەو جیهانە چوو بووە بارێکی بێسابیقە و وەسف هەڵنەگرتوو. دوای نیو سەعاتەکە حاڵەتەکە بەسەر چوو، نەساغییەکەم گەڕایەوە بەڵام لێم یەقین بوو نامرم.

جارێ لەوپەڕی سستی و بێهێزیدا بووم، هێندەم خوێن لەبەر ڕۆیی بوو، هەندێ جار بە دوو کەس ڕاستیان دەکردمەوە و دەنگم نیو دەنگ بوو... خواردنم لە پێش چاو کەوتبوو... بەزەحمەت هەنگاوم هەڵدەهێنا، ئا لەو بارەدا گەنجێکی کورد لەگەڵ خەڵقوخوایەکی سەردانیان دەکردم لەو قاوشەی تێیدا بووم (ئەو قاوشە بۆ من تەرخان کرابوو د. ئومێد، وەزیری تەندروستی سەردانی کردم و تەرتیباتی تایبەتی بۆم دانا، یەک لەوان کەسێکی بیەوێ بێتە لام مەنع نەکرێت) بە ژوور کەوت و هاتە تەنیشتی ڕاستەی چارپایەکەمەوە کە من لەسەر پشت لێی درێژ بووبووم و نەمدەتوانی دابنیشم، گوتی من نوێنەری جەماعەتێکم لە دەرەوەی خەستەخانە چاوەنۆڕی گەڕانەوەم دەکەن. هاتووم لەسەر ماکسیزم لەگەڵتدا بدوێم. ئێمە ئەم کۆمەڵە، هەمووومان مارکسین، ئیتر کەوتە موناقەشە لەگەڵم... چەندێکی زەعیف و بێهێزیش بووم بە زەحمەت قسەم بۆ دەکرا، دیسانەوە هاتنەکەی بە لامەوە دڵدەرەوەیەک بوو چونکە دەیارە منی وەها داناوە ئەوە بهێنم بێتە لام بۆ موناقەشە...

تێک چوونی دۆستایەتیی و هاوخەباتیی نێوان عەبدولکەریم و عەبدولسەلام لە زوییەکەوە هەستی پێ کرا. من لەو دەمەڕا لە بەرەکەتی شۆڕشی تەمووز مەیلەو بێئومێد بووم... زۆری نەبرد عەبدولسەلام لێ خرا و گیرا و موحاکەمەش کرا و حوکمیش درا. هێرشەکانی ئیزاعەی قاهیرە، بەتایبەتی هی «صوت العرب»ی ئەحمەد سەعید بۆ سەر عەبدولکەریم قاسم پتر یارمەتیی چەپەکانی دا بۆ دەورەدان لە کەریم. هەرچەند کەریم مەبەستە بنەڕەتیەکەی بەشداربوونیان لە وەزارەتی لێ نەسەلماندن دیسانەوە هەلی پەرەسەندنیان بۆ ڕێککەوت و هەلەکەشیان باش قۆستەوە. «شۆڕشی شەواف» کە لە ئاکامی کۆبوونەوەی ئاشتیخوازان لە مووسڵ تەقیەوە پتر ڕێخۆشکەرەوە بوو بۆ دەست ئەستووربوونی چەپ لە سەرانسەری عێراق، لە وڵاتی خۆشماندا قائد فرقەی کەرکووک داود جەنابی خۆی وەکوو چەپییەک ڕەفتاری دەکرد کە ئیتر چەپایەتی و حکوومەت و شۆڕش لە کوردستان وەک یەک شت خۆیان دەنواند. پارتی لەچاو چەپ بەحاڵ دەست و پێیەکی دەبزاوت.

ئەو ڕۆژەی لیوا فوئاد عارف لە مانگێکی بەهاردا هاتە کۆیێ ئەگەر بارانە تۆفانییەکە بەلێشاوکەی خۆی خەڵقەکەی پەرت و بڵاو نەکردبایە لەوانە بوو پارتییەکان قڕانیان بێت. لەو شوێنەی کە پێشتر بە دیار دەرکەوتنی مەوکیبی فوئاد عارف خەڵقەکە وەستابوو، چەپەکان دروشمی «خەیاتانی کوردستان» یان دڕاند، بە چاوی خۆم دیتم گەنجی ڕێکوپێکی چەپ دەستەو خەنجەر لە هاتوچۆدا بوون، یەکێکیان خەنجەرەکەی خستەوە کەلانەکەی و لێم بیست دەیگوت ئەمن خۆم لە بۆ قەسابیەکە حازر کردییە... تۆ سەیری بەشەر بکە کەریم قاسم-ێک بە لەشکری عێراقەوە لە بەغدا ڕژێمی شایەتی بڕمێنێ، گەنجێکی کورد خەریک بێ هەڤاڵەکەی دوێنێی لەت لەت بکات. دەڵێن حوشترەوانەک لە تەرۆکی حوشترەکی ڕادەکێشا بۆ ئەوەی هەڵستێ حوشتریش دەیهۆڕاند، کابرایەکی خۆشناویش یەکەم جار بوو

---

پتر لە سەعاتێک یەکترمان دواند، بەڵام نێوانی فکرمان هێند لێک ترازابوو، لە هیچ نوختەیەک نەدەگەییشتینەوە یەکتر، وەختێک کە دۆعاخوازی لێ کردم گوتی جارێکی دیکەش دێمەوە لات، بەڵام هەر ئەو هاتنە بوو.

حوشتری دەدیت گوتی: «تەق لەوێ سورِێ لە کێی لێ دەدا لە کێ دەهۆڕێنێ»... (کێ: لەزاری بەری سۆران لە جێی کوێ بەکار دێت).

جارێ لە بەغدا بووم، دکتۆر ئیبراهیم کوببە لە ئاهەنگێکی شەوانەی سەفارەتێک جودای کردمەوە لە خەڵقەکە و دوای پێشەکیەک داوای لێ کردم دیراسەیەکی وەزعی فابریقەکانی جگەرەی بەغدای بۆ ئەنجام بدەم... من لە ڕێی برادەری شارەزاوە گەلاڵەی دیراسەیەکم کرد و لە دەرفتەدا بۆم برد بەڵام دەرکەوت دیراسەی تێروتەسەلتری دەویست. دوای ئەمە هێندە نەمایەوە لە وەزارەتی ئابووری، کە ئەوسا تووتن بەوەوە بەسترابۆوە، بایی دیراسەی قووڵتر بکات. وا تێدەگەم دەیەویست ئەو فابریقانە تەئمیم بکات. وەک بزانم هۆی لادانی د.کوببە لە وەزارەتی ئابووری ئەوەبوو کە لە ئیتیفاقیەی ئابووری لەگەڵ ڕووسەکاندا دینار بە یازدە ڕۆبل داندرابوو... دواتر پاش لاچوونی د. کوببە دینار بوو بە ٢٨ ڕۆبل لە بازاڕی ڕەشیش بە پتر لە ٤٠ ڕۆبل بوو...

دوای ٩-١٠ مانگێک کە لە بەغدا مامەوە، گەڕامەوە کۆیێ، هەوەسی ئیقلیمگیری چەپڕۆیی ساوا ئەو نیمچە خوێندەوارانەی کوردی قوڕبەسەری گرتبۆوە هەرچی تروسکەی هۆش و گۆشی ئادەمی هەیە نە تێیدا هەبوو نە تێی بڕ دەکرد. تیژڕۆیی و پەرگیری و توندوتیژی لەحەدبەدەر کە لێی دەوەشایەوە لە trووکەیەکی چاودا ئاگر هەڵایسێنێ وەهای کردبوو پیاو چاو بگلۆفێ بۆ ناسینەوەی ئەو خەڵقەی بەر لە تەمووز دۆست و ناسیاو و برادەر بوون. هۆشبەتاڵی ئەوتۆم دەدیتن وەکوو یاخی خوێن لە چاوی دەتکا بە شەقامدا دەڕۆیشت و «لەسەریان دە کەریم لە سەریان دە»ی دەچڕی. بێ موناسەبە خەڵق دەکەوتە جرپوجۆپان و چەپڵەڕێزان و هوتاف لێدان و پاڵەوانپفی و بمرێ و برِمێ هەر دەتگوت خەستەخانەی شێتانە و نەخۆشەکانی کەفەلوولکەی فێداری دەپژێنن.

ئەوان لەو ڕۆژە ڕەشانەدا دڵ و دەروونیان ئاشکرا بوو ئەگەر دەسەڵاتیان کەوتبایە دەست کارێکیان بە وڵات دەکرد دە جاران وێرانکەرتر و خوێنڕێژتر بێ لە مامە «پۆڵپۆت»ی کەمبۆچیە... لە پارتییەکانم دەبیست کە هەر بایی نێوچەوانی ئاژەڵی بەش خۆیان دەنواند، دەیانگوت بە ناچاری لە ڕیزی چەپڵەکوتاندا بە درێژایی چەندین سەعات چەپڵەمان لێ دەدا تاکوو یەکێکیان بە برادەرەکانی دەڵێ، ئەرێ

بەڕاست، دەبێ شێت نەبووبین و بە خۆمان نازانین؟ پەنا بە خوا بەرەی یەکگرتووش لەسەر کاغەز هەناسەی هەڵدێنا!

ڕۆژێک لە ڕۆژانی بەهاری ١٩٥٩ نوێنەری چەپ بە حکوومەتی ڕاگەیاند کەوا مەسعوود محەمەد و کاکە سووری شێخ عیززولا و عەلی عەبدولا لە چنارۆکی مەلایان کۆبوونەتەوە لەگەڵ عەباسی مامەنداغا پلانگێڕی دەکەن دژی سەلامەتیی شارەکە. حکوومەت مەفرەزەیەکی پۆلیسی نارد بۆ چنارۆک، لە جادەی ناو شار تووشی کاکە سوور بوون دەشیانزانی من لە ماڵەوە هەر دەرناچم بەڵام دەبوو حەجەرولئەسوەدەکە هەر ماچ بکرێت. مەفرەزە چووە چنارۆک و کێشکەکوژی نەدیت. لە کۆبوونەوەی بەرەی یەکگرتوودا نوێنەری پارتی گلەیی ئەو ئیخبارییەی لە نوێنەری چەپ کرد کە چۆن ڕەوای دیت بوختانی وەها هەڵببەستێ؟ نوێنەری چەپ چەتری ناز و فیزی لێ دابوو، پڕبەدەم گوتبووی بە شانازییەوە لە ناوتان دەبەم!! وا نزیکی سی ساڵ بەسەر ئەو منداڵ بازاڕییە زێدە ناقۆڵایەدا تێپەڕی و هەزاران هەزار تەجرەبەی تاڵ و تفتمان خستە سەر ئەو تەجرەبە تاڵانە و ئنجا نابێ لە خۆمان بە سەهوو بچین. ئەشەدوبیللا خوێنگەرم و پەرگیرەکانمان لە هەر ڕێکخراوێک بن بایی سەری دەرزی بەلای هۆش و گۆشدا نەهاتوون، دەرفەتیان ببێ هەمان تاس و هەمان حەمام!!

کاکی خوێنگەرم لە ئەورووپاوە دەرسی تازە بابەتم فێر دەکات و دەڵێ، بورجوازییەت خەڵق دەکەم لە کوردستان و دەیرمێنم هەتا نەزەریەی چینایەتی بە ڕاست بگەڕێ... ئەم تەرزە گومڕایانە نە بە دوعای چاک و پیر نە بە پەندی ڕووداو و نە بە ئامۆژگاریی گۆرباچۆڤیش لەوانە نین چاوی واقیعبین و بەرژەوەندویست لە دنیا هەڵێنن...

دوای بەهار هاوینە. گەیشتینەوە تەمووزی شەرمەزاری ١٩٥٩... هەندێ لەو کارەساتەی وەک هینەکەی کەرکووک لە نمایشتەکانی ڕۆژی ١٤ی تەمووز کەوتەوە کە بەولای ڕەفتاری سەردەمی ئەشکەفت و دارستان بەرەو دڕی و بێڕەحمی و کوێری و ئاژەڵییەوە ڕۆیی، بوو بە هەنجەتێکی زێدە لەبار بۆ کەریم قاسم کە بابداتەوە سەر دۆستەکانی و سەرشکێنیان بکات. هەتا بە خەیاڵی خۆی شەڕی قەومییەکانی پێ ئەنجام هێنان شریتی بۆ درێژ کردن، ئەم جار نۆرەی هەڵکردنەوەی شریتەکە هات. لەو ڕۆژانەدا موراجەعەیەکی نیقابەی فەلاحانم بوو،

لەگەڵ سەرۆکی ئەو ڕێکخراوەدا هەندێک دووام. قسەیەکم ئەوە بوو کە بەربەرەکانییان لەگەڵ کەریم قاسم بە زەرەری خۆیان تەواو دەبێ. گوتی، ئەویش زەرەر دەکات. گوتم ئەو تاکێکە ئێوە بە لای خۆتانەوە بزووتنەوەیەکی مێژوویین ناشێ خۆتان بەو بگرن.... لەسەری نەڕۆیشت.

لە پاشماوەی ئەدەبیاتی ئەو ڕۆژانەی ڕێکخراوی سیاسییان تێیدا کەڵەکەی کردبوو، هی وەها نەخوێندوو هەبوو لە جیاتی کۆبوونەوە دەیگوت کۆربوونەوە. گوێم لێ بوو یەکێک لە جیاتی «مقر - مەقەڕ» دەیگوت «نەقەڕ» توومەز نوونی نیقابەی خستبووە شوێنی میمەکەوە... هەروا لە هەڵبەستراوی ئەو ڕۆژگارانە کە تاڕادەیەک لەگەڵ کاڵ و کرچیی نەزانەکان ڕێک دەکەوت ئەوە بوو کە لە جیاتی «دیمقراطیة وسلام» فەلاحەکانی دزەیی دەیانگوت «دوو مەترەق و سێ زەلام». ئەمیان هەڵبەستراوە بەڵام وەک موبالەغەی شیعر بەتامە. کە خەڵقەکە پاش وشکایی هوتاف و دروشم و بڕمێ و بژی دەست بەتاڵ مایەوە، هەر فەلاحکە خۆی ئەم پەندەی ڕێک خست:

بن دیوار و بن دیوار
وات لێ بکەم شەعبی بار

ئەم پەندەیان ڕاستەوخۆ لە پەندێکی گاڵتە ئامێزی کۆنەوە ئاوی خواردۆتەوە کە دەیگوت:

لە بن دیواران وەرە توور وەرە توور
مێردت پێ ناکەم ...دی مل ئەستوور

خوێنەر ئەم قسانەم لێ بە داوێوە نەکات بەوەدا کە قسەی لەوجەڕ و بێسوودن. لەوجەڕی و بێسوودی لە خۆ هێنان و بردن و چەقۆ تیژ کردن و یەکتر کوشتن و نەزۆک کردنی شۆڕش و پواندنەوەی گیانی پاکی کوردایەتیدا بوو. ئەگەر ڕەنجەڕۆیی کاری وێرانکەری ڕابوردوو لەبیر بکەین هەر ئەو وێرانکارییە دووبارە

دەکەینەوە، خۆ لەگەڵ بیرکردنەوەی ڕابوردووشدا ترسی دووبارە و دەبارە گێل بوون هەر دەمێنێ!

کەریم قاسم ئیجازەی بە چەند حیزبێک دا. ئەو ڕۆژەی بەیان دەرچوو بە ئیجازە دانی حیزبەکان من لە کۆیێ بووم. بە دیار ئاگری موغەیری ژوورێکی ماڵەوەمان کە شەوانە لەگەڵ خزمان تێیدا کۆدەبووینەوە دانیشتبووین، دۆڵ و زوڕنای ئیجازەدان بە حیزبەکەمان لە مەیدانی بەردەکی سەرا دەکوترا، خۆشیی زیاتریش بۆ ئەندامە ئازاردیتوەکان لەوەدا بوو کە چەپەکان ئیجازەیان نەدرایێ. کەریم حیزبێکی کارتۆنی بە سکرتێرایەتیی داود سائیغ هەڵبەست و ئیجازەی پێدا.

خەڵق لەو حاڵەتەدا بوو، حیزبەکەمان هەڵپەڕکێی دەکرد، من بەو کۆمەڵە خزم و برادەرەی لای خۆمم گوت، قوڕبەسەر کورد بۆ ئەو ڕۆژەی نۆرەی هەڵپەرداوتن دەگاتە حیزبی ئێمە و سەرۆکەکەی. فەتحی برای شیریم زاری بەش بۆوە، بە چاوی زەق دەرپەڕیوەوە گوتی، کاکە چما شتی وەها هەیە؟ گوتم بیستووتە دەڵێن، سەری دوو بەران لە مەنجەڵێکدا جێی نابێتەوە، پێشریش دیتبوومان عەبدولسەلام کە شۆڕشی سەرخست لەو مەنجەڵەدا جێی نەبۆوە. فەرقێکی گەورەش هەیە لە نێوان عەبدولسەلام و بزووتنەوەی کوردایەتی کە دەزانین کوردایەتی بە «مەرسووم جمهوری» ناپێچرێتەوە وەک کە تاکە کەس بە بڕیاری حاکمی عەسکەری بەلاوە دەندرێ وەیا تێدەبردرێ...

توندوتیژیی چەپەکان دوای بەدەنگ هاتنی کەریم قاسم لێیان بەرەو کەمبوونەوە چوو، بەڵام هەستیشی پێ دەکرا. حیزبەکەی ئێمە ناوەناوە خۆی لێ گیڤ دەکردەوە بەڵام بەهۆی باوەڕی بەشێکی زۆر لە ڕابەران و لە ئەندامانی بە ئایدیۆلۆجیای چەپ دەستی لێ نە دەوەشاندن. من خۆم لە کاتی هەڵستی چەپەکان گوێم لە ڕابەرێکی حیزبەکەمان بوو دەیگوت، قەیدی چییە ئێمە ببینە «واجهە» بۆ ئەو حیزبە وەک کە لە دەوڵەتە شیوعیەکان حیزب هەن بوونەتە واجیهە، ڕووکاربوونمان بە ڕووکاریش ڕۆڵێکی مێژوویە پێی هەڵدەستین بۆ نزیک خستنەوەی قۆناغی ڕزگاربوون لە چەوساندنەوە. هی دیکەی ڕابەر و قسەڕۆیشتوو لە حیزب هەبوو قسەی لەمەش بێتەقیەترتان دەکرد.

ئەم شلەپەیتییە لە حیزبی ئێمەوە وەهای کرد عەشرەتەکان لێی بێئومێد ببن. لە جێگایەکی وەکوو ڕانیە گاڵتەبازاڕی گەیشتە ڕادەیەک کەوا سەرۆک عەشرەتەکان لە ترسی سەکەندێکی گەراج کە خۆی سەپاندبوو بە سەرۆکی وەرزێران نەوێرن بێنە شار. من بۆ سەرۆک عەشیرەت دادوبرۆ ناکەم بەڵام دەشزانم نەخوێندەوارێکی بە عومری خۆی کەس ڕێزی لێ نەنابێت و خۆیشی بەتەما نەبووبێت لە هیچ شتێک تێ بخوێندرێتەوە ئا ئەم مەخلووقە کە دەسەڵاتی گرتە دەست پەکی بە هیچ بەرژەوەندێک ناکەوێت (ناشزانێ بەرژەوەند چییە) و تەڕ و وشک پێکەوە دەسووتێنێ. خۆزی هەر نەبایە ئەم بێدادییە چاکەیەکی کوردی تێدا بایە کە دەزانم سەکەندەکە دوژمنی کوردایەتی بوو.

بۆ تەسکینی دڵی ئەو کەسانەی کە لەم قسانەم وەتەنگ دێن با ئەوە بڵێم پاش چەند ساڵێک کە چەپ لێی قەوما پەنای بۆ ئەو سەرۆک عەشیرەتانە برد. چەندین پێشڕۆی چەپم دەدیت لە ماڵی «دەرەبەگەکان» حەوابوونەوە. بە کورتی، تیژڕۆیی و بێپەنایی وەهای لەو «براگەورانە» کرد بیرێک لە حاڵی خۆیان بکەنەوە. لە لایەکەوە چەپ بۆیان تێدەکۆشێت، لە لایەکی دیکەشەوە بزووتنەوەی قەومایەتی لەترسی چەپ ناوێرێ پارێزگارییان لێ بکات، حکوومەتیش لێیان بێخەبەرە، ئەی چار چییە؟ من بەشێکی زۆرم لەو سەرۆکانە دەناسین، زوربەی هەرە زۆریان لەلایەن پێوەندی بەم و بەوەوە تەواو خاوێن بوون، لەوەندە نەبێ کە دەسەڵاتێکی هەیانبوو بە لای چەپەوە ناڕەوا بوو، خۆ ئەگەر بووبانایە برادەری چەپ بێ دەزنوێژ دەچوونە بەهەشت و خراپەشیان بە چاکە حیساب دەکرا.

من لە بەغدا بووم خەبەریان لێ گێڕامەوە و چەند کەسێکی بەرچاویان هاتنە لام، خاڵەکانیشم لەگەڵیان بوون. بیروڕای منیان پرسی لەوەدا کە چ بکەن؟ دەڵێن هەر کەسە بە عەقڵی خۆی دەژیت منیش لە دوو کولانەی تێوەڕامانەوە سەری مەسەلەکەم دەکرد.

یەکیان بەرژەوەندیی کوردایەتی کە دەزانین هێزی ناو شارەکان بەو جۆرەی بووبووە مزاشی قەومایەتیی کەم و چینایەتیی ئەستوور پشتی پێ نەدەبەسرا ئەگەر خاوەن دەسەڵاتەکانی عەشیرەتی کورد نەیەنە جغزی سیاسەتەوە. باشترین و سەلامەتترین و پاکترین ڕێگەش بۆ بەشداری کردنیان لە سیاسەت ئەوە بوو بە دڵی خۆیان و بە باوەڕێکەوە بەشدار ببن نەک حکوومەتی کەریم قاسم بیانکرێت. خۆ ئەگەر

قاسمیش نەیکرِیبانایە بێگانە دەیویست بیانکرِێت. هەر لەو بەینانەدا بوو چەند سەد ئاغایەکی پژدەر لە غایەتی سەغڵەتبوونەوە دەستی شاخیان گرت و چوونە دیوی ئێران بەڵام خۆیان نەفرۆشت.

جەرِەش هەر جارێک و دووان لە رِێی کانی بەسەلامەتی دەگەرِێتەوە. پێشتر لەوان داود بەگی جاف رِەحمەتی لێ بێت، بە لوولەی تفەنگ خۆی و کۆمەڵەی خۆی لە نوختە تەفتیشی سەر رِێگایان دەرباز کرد و بۆی دەرچوو لە غەریبیش سەری نایەوە. عەبدولکەریم شناسایی هەبوو لەگەڵ داود بەگ، لە دیتنێکدا پێی گوتبوو: زەعیم کەریم وا دیارە هەر دەوڵەمەندت پێ فەقیر دەکرێ، فەقیرت پێ دەوڵەمەند ناکرێ.

بەهەمەحاڵ باوەرِم هەبوو (ئێستاش باوەرِی ئەوسام بەرِاست دەزانم بگرە رِاستتریش) بەوەی عەشیرەت زەرەرمەند دەبێت لە گۆرِینی دەسەڵاتی سەرۆکەکەی بە دەسەڵاتی نەفامێکی خوێنگەرمی بێباک کە بەلایەوە فەرق نییە لە نێوان تێر کردنی خەڵق و کوشتنیان بە مەرجێک خزمەتی ئینجیلە سیاسییەکەی خۆی تێدا بێت ئنجا خواش دەزانێ مێشکی بەتاڵ کام شت بە خزمەت دەزانێ.

تا ئەو رِۆژەی لە هێمنیدا حکوومەتێکی بەرژەوەندبینی بێفێڵ کاروباری هەموو میللەت بە ئەستۆوە دەگرێ شێواندنی شیرازەی کۆمەڵایەتی هەر دەکێشێتەوە بۆ ماڵکاولیی جەماهیر. واجیبی حیزبی پێشرِۆش ئەوەیە لەو بارانەدا خەڵقەکە بە تەبایی و دوور لە ئاژاوە بەرِێوە ببات بەتایبەتی لە حاڵی میللەتێکی وەکوو کوردی ئەوساکەدا کە چ رِووناکیی لێوە دیار نەبوو ئاخۆ مافە نەتەوەییەکانی سەر بە چییەوە دەنێن.

بەرژەوەندی قەومایەتی نوێژ و رِۆژوو نییە بە هەوبای پاداشی پاش مەرگ بێت، هەروەها چاویش نابرِێتە بەرەکەتی ئەو بەهەشتەی سەر دنیا کە لە ئاکامی سەرکەوتنی شۆرِشی پرِۆلیتاریای جیهانی دەرِازێتەوە. کە ئەو بەهەشتە مەوهوومە پەیدا بوو سەد جاران دیمانەی بەخێر بەڵام بە تەمای نیسکێ لە ئیمان نەگەرِێ...

ئەوی دیکەیان بەرژەوەندی گوزەران و چارەسەر کرنی گیروگرفتی کۆمەڵاتییە. من باوەرِم بە فەلسەفەیەک نەهێنابوو کە بە تێک بەردانی خەڵق و نانەوەی ئاژاوەی ناوخۆیی، مامە کوردە دەگاتە خۆشی و ئازادی. کورد ئەگەر هەمووی برا بایە بایی

هەڵگرتنی ئەرکی مێژووکردی لایەنی قەومایەتی و کۆمەڵایەتی هێزی پێوە نەبوو. تێک بەربوونی کورد هەر دەیکێشایەوە بۆ بەهێز کردنی ئەو سیاسەتەی کە گرووپی دەوروپشتی کەریم قاسم بەڕێوەی دەبرد، ئەوانیش بێگومان لە جیهانێکدا دەژیان زۆر بە غەمی چارەنووسی کوردەوە نەبوو.

من چاوەنۆڕ بووم ئەگەر سەرۆکی عەشیرەتەکان ئەوەندە هۆشەیان بپژێت کە ڕێگەی کۆبوونەوە و هاریکارییان پێ بگیرێت بۆ بەرژەوەند پاراستن و خۆ بە حکوومەت ناساندن، ئاسانتر دەچێتە باری هەڵوەستێکەوە کە لەگەڵ گیانی سەردەم ئاشناتر بێت تا ئەوەی هەر یەکەیان تەنها پەلەکوتکەی هەوڵی ژیان بدات. تا ئەودەمەی کە سەرۆکەکان هاتنە لام لە بەغدا دە ساڵێک هەبوو من بێ هەرا و نەفەسسواری خەریک بووم بۆ پێکهێنانی جۆرێک لێک حاڵیبوون و ئاشنایی لە نێوان ئەو سەرۆک عەشیرەت و براگەورە شارستانیانەی بە لای کوردیەتیدا دەهاتنەوە بەڵام چونکە بەر لە شۆڕش هەستی هەڕەشەیەکی بەرچاویان نەدەکرد هەوڵەکەم نەزۆک بوو.

هاتنیان بۆ لای من و پرس کردنیان بە من لەو ڕۆژە تەلەزگەبەستوەدا هەلێکی گەورە بوو هی لە دەست دان نەبوو. بە وردی لەگەڵیان دوام و گەلێک ئەم دیو ئەو دیومان بە چەندوچۆنی حاڵوباری زەرفەکە کرد تا گەیشتینە قەناعەتهێنان بەوەی چەندێکی مومکین دەبێ لە کۆ کردنەوەی سەرۆک عەشیرەتی کورد بۆ هاتنە بەغدا و ڕاگەیاندنی داخوازییەکانیان بە حکوومەت هەوڵی بۆ بدرێت و لە شێوەی بێلایەنی لە ئاست حیزبەکان موراجەعەی زەعیم بکرێت...

دوای ئەم پرس و ڕاوێژە سەرپەرشتیکەرانی بیروڕایەکە ژمارەیەکی زۆریان لە براگەورە و سەرۆک عەشیرەتەکان لە بەغدا کۆ کردەوە. ڕاستییەکەی چالاکیی شێخ حسێنی حاجی سەیدگوڵ و عەباسی مامەنداغا و هاوڕێکانیان لە گروپی دەوروبەری ڕانیە و پژدەر وەک ئەنوەری ڕەشید بەگ و سمایلی سواراغا داینەمۆی کارەکە بوو. ژوورەکەی من لە ئۆتێلی تروکادیرۆ بووبووە ژووری «عەمەلیاتی عەسکەری». هەر لەو ژوورە و بە خەت و ئینشای منیش عەریزەیەکی شکل مەزبەتەیی بۆ زەعیم نووسرا دەقەکەیم لا نییە بەڵام سکاڵای تەواوی ئەو سەرۆکانە و خەڵقەکەی سەربەخۆیانی تێدا بوو لەلایەن نالەباری وەزعیان و دەستدرێژییەکی لێیان کراوە و دەکرێت و تێنەخوێندنەوەیان لەلایەن حکوومەت و ناتەواویی باری ئەمنیەتیان و

ئەو جۆرە دادوبڕۆیانە. لە ناو وتوێژیشدا داخوازی ڕێ دانیان بە شێوەی ڕەسمی بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی تایبەت بە خۆیانی تێچێن کرا کە بەتەواوی سەربەخۆیی کارەکەیانی ڕادەگەیاند.

جەریدەی «اتحاد الشعب» بە توندی لە دژی ئەم چالاکییەی نووسی. بۆ ڕۆژی دواتر ڕۆژنامەی حیزبەکەی خۆشمان بە چاولێکەری لە «اتحاد الشعب» بە سەروپۆتەراکی خەڵقەکەدا هاتە خوارێ. کۆمەڵە سەرۆکەکان عەریزەکەیان گەیاندە وەزارەتی دیفاع، داواشیان کرد بچن بۆ لای زەعیم. عەبدولکەریم لەبەر هۆیەکی کە لێمەوە دیار نییە نەیسەلماند بە کۆمەڵ بچنە لای بەلام، کەمالی عوسماناغا-ی ڕاسپارد کە ئیقناعی قسە ڕۆیشتوەکانیان بکات یەک یەک بیانبینێت. ئەم قسانە لە ژوورەکەی من بە شێخ حسێن و کەسانی دیکەش ڕاگەیەندرا بەلام تاکێکی نەیسەلماند بە تەنها سەردانی زەعیم بکات. کەمال زۆر خەریک بوو بەلام تەنها سددیقی میرانی قادر بەگ قسەکەی هەڵگرتەوە و چوو بۆ لای زەعیم. دواتر سددیق بەگ، کە دۆستم بوو باوەڕیشی بە ئەمانەتم دەکرد، پاتەوپات پێمی گوت کە خۆی بە عەیبدار دەزانێ بەلام مەرحەبای کەریم قاسم ئەوەندە بە پیت و بەرەکەتە هی هەڵنەگرتنەوە نییە.

ئەم جۆش و خرۆشەی سەرۆک عەشیرەتەکان هەرچەندە لە ڕواڵەتدا سەری بە هیچەوە نەنا بەلام بە نهێنی و لە ژێر پەردەوە لایەنە سیاسیەکانی بە خۆیەوە خەریک کرد، تەنانەت وەک بۆت باس دەکەم، عەبدولکەریمیش خانەیەکی لە حیساباتی خۆیدا بۆ کردنەوە بەلام جارێ نەختێکی ماوە بگەمە ئەم خاڵەیان.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ بووم بە مدیر ئیدارەی «شركة المواد البنائية» کە بە ئەسڵ هی کۆمەڵێک لە زلزلەکانی سەردەمی پێش تەمووز بوو، ڕەشید عارف «مدير مفوض»ی کۆنی هەر لە شوێنی خۆیدا مابۆوە ئەویش بوو منی پەسەند کرد بۆ کارگێڕی شەریکەکە. کێشەی بێسەروبەری دەمی تێکهەڵدایی ساڵی پێشووتر تەگەرەی ناقۆلا و بێلزوومی دەخستە کاروبارییەوە. کەسانێک لەوانەی پێیان دەگوترێ «وروو‌ژێن - مثيرون - agitator» مابوون لە نێو عەمەلەکان، هەر ڕۆژە تووشی کاری وەهایان دەکردن نە بەرژەوەندی تێدا بێت و نە ئینساف. بە قانوون هیچیان لەگەڵ نەدەکرا، مانەوەشیان بێ دەنگدان و ترساندنێک دەبووە مایەی شکستی شەریکەکە. لە نموونە وێرانکاری ئەمەت بۆ دەگێڕمەوە:

کارگەی خشتی فەننی کە نێرتکی ئیشی شەریکە بوو، هەر شەو بە هۆی «مجففات - وشکێنەر»ەوە کە بە کارەبا دەگەڕا دەوری سەد هەزار خشتی بەرهەم دەهێنا کە ئەوسا بە ٨٠٠-٩٠٠ دینار دەوەستا لەسەر شەریکە. ڕەشید عارف دەستی بەسترابوو، قانوون ڕێی هیچ چارەسەر کردنێکی بۆ کارگوزاری شەریکە نەهێشتبۆوە. گوتی هەر وەزیری بەرپرس ئەو جۆرە گیروگرفتانە دەتوانێ دەسەڵاتمان پێ بدات... چوومە لای «عبدالوهاب أمین» کە وەزیری وەزارەتێک بوو ئێستا ناوی وەزارەتەکەم لەبیر نەماوە، سەرپەرشتی کاروباری کارگە و عەمەلە... و... و... ی دەکرد. پێشتر نەمدیتبوو بەڵام وەها پێ دەچوو دەیناسیم. زۆری بەخێرهێنام و بەڕەسمی دەسەڵاتی بێسنووری دایە کارگێڕی شەریکە بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتێکی هەبێت. مەکی جەمیل کە لە ئاڵقەیەکی پێشووتر بە مدیر عام-ی تەسویەم باس کرد، وەکیل وەزارەت بوو لای عەبدولوەهاب ئەمین، دیاربوو ساڵی پێشوو زۆری لە دەست فەڕاشی ژوورەکەی چێشتبوو. هەرچەند کە دەهاتە ژوورەکە، مەکی نەختەک بە توندی دەیدواند بەڵام کە دەردەچوو ئینجا لێوی دەکرۆشت، تومەز ترسێکی مابوو لەوەی جارێکی دیکەش بە دەسەڵات بێتەوە.

عەمەلەکان کە زانیان حکوومەت دەسەڵاتی داوە بە «مدیر مفوض» بۆ تۆژینەوە و سزادان کەوتنە مێچکە و پاڕانەوە. هاندەرەکان ئەوەندە خوێڕوو دەرچوون بێزت لێیان ببێتەوە. من کە لەو بارە شەرمهێنەوەم دیتنەوە بە دڵ لەعنەتم لە پاڵەوانپفییەک کرد کە وەکوو دەبدەبەی منداڵ بە نووکێکی دەرزی فش دەبێتەوە. ڕەشید زۆریان لێ داغدار بوو، حەقیشی بوو، گوێی نەدایە ڕجای منیش کە ویستم چانسێکیان پێ بدات...

لە بەرەو کۆتایی بەهاری ١٩٦٠ «د. عەبدولڕەززاق موحیددین - عبدالرزاق محيي الدين» لە جەریدەی «الحرية»ی «قاسم حمودي» گوتارێکی بڵاوکردەوە ڕووی وتووێژی لە کوردی قەومی بوو، زۆریش پیاوانە و ئینساف کارانەی نووسیبوو لە بارەی کوردەوە. کەسانێک لە کوردان دەنگێکیان دایەوە بەڵام بایی مەبەستی نەدەکرد.

من گوتارێکم نووسی بەهێز و پێز و بە عەرەبیەکی وەها دەشێ بە بابەتێکی بێسابیقە بژمێردرێ. پازدە ڕۆژ ئەو گوتارەم لا مایەوە، هەندێک لە ڕابەرە زلەکانی حیزبەکەمان ئاگادار بوون لە نووسینی، ڕەنگە سەرێکیشیان بە پێشەکیانیدا گرتبێت.

من نە قاسم حەمودی نە عەبدولڕەززاق موحیددین، هیچ کامێکیانم نەدیتبوو چ جایی بیانناسم. پاش پازدە ڕۆژە بە دوو جار هەوڵ دان ئنجا جێگەی جەریدەی «الثورة»یان دۆزیەوە و گوتارەکەیان بۆ برد.

لەو گوتارەدا کۆمەڵێک قسەی گرنگی سەربە کوردایەتی و مافی نەتەوایەتی هەبوو بەڵام ڕەخنەیەکی ڕاست و دروستی تێدا بوو بەرانبەر خەتی مارکسایەتی کە لە ڕابەرایەتیی حیزبەکەدا هەبوو. گوتارەکە بە دوو ئاڵقە لە ڕۆژانی دە و پازدەی تەمووز لە «الحرية»دا بڵاوکرایەوە. لە هەوەڵەوە چەند ڕۆژک بە بێدەنگی بەسەر گوتارەکەدا تێپەڕی، بەڵام زۆری نەبرد ڕۆژنامەی حیزب هەڵرژا بە هێرشی سەیروسەمەرە بۆ سەر من و عەبدولڕەززاق و ڕۆژنامەی «الحرية». پێی ناوێ برینان بکولێنمەوە، ئەوەندە دەڵێم ئەگەر دوارۆژم وەکوو ئەستێرەناس بخوێندبایەوە نووسینی توندوتیژترم بەکاردەهێنا.

لە کوشندەی ئاڵۆزانی نێوان حیزب و مندا جەریدەی حیزب بە تۆمەتی هەوڵ دان بۆ نانەوەی ئاژاوە و دووبەرەکی کە لە گوتارێکی بەدی کرابوو درایە عورفیی دوەم. مەحکەمەی عورفی، سێ خەبیری هەڵبژارد: عەبدولڕەززاق موحیددین و مستەفا جەواد و مەسعوود محەمەد... سەرۆکی عورفی کە هەرگیز نەمدیتبوو تەلەفۆنی بۆ کردم، دوای موجامەلە لێی داوا کردم کە ئەو خەبیرییە ڕەفز نەکەم پێم گوت من ئۆتۆمبیلم نییە ناگەمە مەحکەمەتان. کابرا ماڵی ئاوابێ، بەیانییەکەی ڕۆژی موحاکەمە خۆی هاتە شەریکەی «مەوادی بینائی» و منی گەیاندە شوێنی لێ کۆبوونەوە. دەبێ بڵێم کە دیتمی سەیری هاتەوە چونکە دوای خوێندنەوەی نووسینە بە هێز و پێزەکەی من کە لە «الحرية» بڵاوکرابۆوە بە تەما بوو پیرەمێردێکی سمێڵ سپیی دووکەڵاوی ببینێت کە قاڵ بووبێتەوە لە کتێبە پەڕزەردەکانی صرف و نحوی زەمانی قالوبەلایێ. پێم گەیشتەوە کە مام جەلال لە ڕۆژنامامان‌دا دانانی من و عەبدولڕەززاق موحیددین-ی بە خەبیر خوێندبۆوە گوتبووی جەریدەکەمان سەلامەت دەرچوو...

لە کۆبوونەوەدا کە د. عەبدولڕەززاق بە بەهانەی پیاسە نەختێکی دوور خستمەوە و گوتی د. مستەفا جەواد چی من و تۆ پەسەندی بکەین پێ ڕازییە چونکە تێکەڵ بە بێنەوبەرەی سیاسەت و تێکچوونی نێوان حکوومەت و حیزبەکان نەبووە... هەروا بەدەم قسەکانەوە و لەوپەڕی خاوێنییەوە گوتی خۆت دەزانی من بیروڕام بەرانبەر

حکوومەتی عەبدولکەریم چییە و چۆنە، بەڵام مەسەلەی خەبیری ئەمانەتە...
ڕاستییەکەی من قسەم پێ بڕیەوە و گوتم فڵان، ئەو خەڵقەی چاوی بڕیوەتە بڕیاری ئێمە بە تەما نییە لە ڕێی فەلسەفەی ڕووتەوە بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵوەستمان بچێت. کە هاتین بڕیاری تاوانبار کردنی جەریدەمان دا یەکسەر و بێ دوودڵی دەڵین ئەم دوو کەسە (واتە عەبدولڕەززاق و من) تۆڵەی خۆیان لە جەریدە دەستێننەوە و حکوومەتیشی پێ ڕازی دەکەن... دەرحاڵ قسەکانی چووە دڵەوە. بڕیارمان بریتی بوو لە دوو دێڕی کورت بە پەڕاندنەوەی جەریدە لە تۆمەت.

پێشتر چەند جارێک لەگەڵ د. عەبدولڕەززاق-دا دیدەنیمان لە یەکدی کردبوو. دوای دەرچوونی گوتاری ئەو و هی من و شریتەی گوتاران لەو و لە من و لە خەڵقی دیکەشەوە. د. عەبدولڕەززاق هاتە سەردانم لە ئۆتێل. مەرحووم تاهیر دەباغ بە شارەزایی لەگەڵیدا هات. د. عەبدولڕەززاق-یش وەکوو سەرۆکی عورفی لە هەندێ باری سەقافیمەوە بە سەهوو چوو بوو. دوای خۆشامەدی و چۆنی و چاکی گوتی وا پێ دەچێ لە شێوازی «عەبدولقاهری جرجانی» شارەزا بێت. گوتم باوەڕت هەبێت لە ناوەکەی نەبێ شارەزای هیچ شتێکی نیم. بەملا و ئەولادا قسە ڕۆیشت هەتا هاتە سەر هێندی کە بڵێ، قورئانت بە چاکی هەزم کردووە. گوتم ڕەنگە ڕاست بێ کە خەتمم نەکردووە. دوای قسەی ئەوتۆیی پێم گوت، لێم بە سەهوو مەچۆ، من پتر تێفکریوم لەوەی خوێندبێتمەوە ڕەنگە نەزانم حوکمی «حتی» لە ئیعرابدا چییە...
- ئێستاش باشی نازانم.

دوای سێ ساڵ کە لە ئاهەنگەکانی وتووێژی سەربە «لامەزکەزی» نیوەڕۆیەک لە ئۆتێلی «بەغدا» داوەتکراوی فوئاد عارف بووین، پیاوێک هاتە ساڵۆنی داوەتەکە و من نەمدەناسی هەتا بەیەکتریان ناساندین کە من مەسعوود محەمەد و ئەو «قاسم حمودي» خاوەن ڕۆژنامەی «الحرية»یە، ئەندامە هەرە چالاکەکەی کۆنە حیزبەکەم چاوی کرایەوە و گوتی، بۆچی ئێوە یەکترتان نەدیتوە؟ ئەمەی پرسی چونکە لەو نووسینانەی ١٩٦٠ کە هێرشی دەهێنامە سەرێ وەهای دادەبڕی کە لەگەڵ د. عەبدولڕەززاق و خاوەنی «الحرية»دا پلانگێڕی دژی کوردایەتی و عەرەبایەتی و هەموو شتەکایەتیەک دەکەین... ئەمانە هەموو بوونە خەون و وڕێنە، ئێمەی کوڕی ئەم ڕۆژەی ٢٥/٢/١٩٨٨ ین کە ئەم دێڕانەی تێدا دەنووسم.

وەزیفەکەم لە شەریکە دە مانگی دەوام کرد. لەو بەینانەدا و کە چووشمەوە کۆیێ لە کەلکەلەی شتێکدا بووم. پاش ئەوەی عەبدولکەریم قبووڵی نەکرد سەرەک عەشیرەتەکان بە کۆمەڵ ببینێ هەر یەکە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی و تێکرا کەوتنەوە سەرباری گوزەرانی ڕۆژانە، بەڵام گرووپی براگەورەکان دەوری ڕانیە و پژدەر پێوەندی خۆیان بە حکوومەتەوە بڕی و سەردانی هیچ کاربەدەستی حکوومەتیان نەدەکرد تەنانەت سەریان بە سەرای حکوومەتدا نەدەگرد. ئەم وەزعەیان بەردەوام بوو.

من لە گۆشە نیگای خۆمەوە بە دڵی نائارامەوە سەری ئەو هەڵوەستم دەکرد. موقاتەعەی حکوومەت دەبێتە موقاتەعەی بەرژەوەندی گوزەران کە دەکێشیتەوە بۆ بێهێزی و بێدەسەڵاتی. جارێکیان هەوڵێک درابوو بۆ ئاشت بوونەوە. موتەسەڕیفی سلێمانی چووبووە ڕانیە و پژدەر بەو نیازەی ڕێی هاتوچۆی سەرۆک عەشیرەتەکان بۆ حکوومەت بکاتەوە کە ئەوان بێنە بەخێرهێنانی ئەویش بچێتە دیوەخانەکانیان بەڵام هەوڵەکە بێبەر بوو، لە بیریشم نەماوە هۆی نەزۆکییەکە چی بوو.

بە نیازی دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ ئاشتی چوومە ڕانیە، لەگەڵ هەموو براگەورەکان، چەند شەوان لە ماڵی شێخ حسێن و عەباساغا و وابزانم سمایلی سواراغا بە بەشداریی پژدەر و ئەنوەری ڕەشید بەگ و خاڵەکانی دیکەم، مەسەلەمان بە هەموو باردا تاقی کردەوە. شەوی دوایین لە ماڵی عەباساغا بووین خۆمان لە قەڵەباڵغی دابڕی و دوای وتووێژی تێروتەسەل بڕیارمان لەسەر هێندێ دا کە من گەڕامەوە کۆیێ بچم بۆ سلێمانی، لەوێوە بە ڕەفاقەتی موتەسەڕیف «باقر الدجيلي» کە برادەرم بوو بێینە ڕانیە، ئیتر لە دایەرەی قایمقامی ڕانیە و قەڵادزە سەرۆک و براگەورەکان بێنە لای بۆ بەخێرهێنانی ئەویش بچێتەوە لایان بۆ سەر داوەت بێ وەیا سەردانی عادەتی بێ.

سبەینێ بەینێک لە ڕانیە مامەوە پاش عەسر لەگەڵ شێخ حسێن چووینەوە بۆسکێن دەبینم کەمالی عوسماناغا و «مقدم يوسف النقيب ضابط استخبارات»ی سلێمانی چاوەنۆڕیم دەکەن. کەمال گوتی دنیا نەما لێت نەگەڕێین، لە کۆیە و کەرکووک و سلێمانی و هەولێر بێئومێد بووین ئنجا هاتین بۆ ڕانیە... زەعیم ئێمەی بە دواتدا ناردوە بچیتە لای بۆ بەغدا. هەتا زووتریش بچیت پێی خۆشتر دەبێت. گوتم من بەڵێنێکم بەو خەڵقە داوە، ئێستا کە بار بگۆڕێت دەبێ خەبەریان بدەمێ.

بێگومان موشکیلەی ئەو براگەورانە هەر بە جارێ دەڕەویێتەوە کە عەبدولکەریم ئەو دەرگایەی دۆستایەتی بکاتەوە. دەمزانی مەقالەکانم لە «الحریة» کاری تێکردبوو، کە جەریدەی حیزبیش درایە عورفی و منی تێدا بە خەبیر داندرام هەر لەوەوە بوو نەک عورفی خودبەسەر وەهای کردبێ. تەنانەت کەسانێکی لە چەرخ و دۆلابی سیاسەت شارەزا بوون ئەو مەسەلەیان ناو لێنا «ضربة معلم» لە عەبدولکەریمەوە کە چارەنووسی جەریدە بدرێتە کەسێک لە ڕواڵەتدا هەرە دوژمنیەتی... ئەمەم دەزانی و دەشیا بایی ئەوە بکات وەکوو تاکێکی نەختێک لێهاتوو نزیک خۆیم بخاتەوە، بەڵام لێم سوور بوو کۆبوونەوەی عەشایر لە بەغدا و پرس کردنیان بە من و عەریزە ڕێک خستن و ئیمزا کردنی لە ژووری ئۆتێلی من ئامانجێکی فرەوانتری لە جغزی تاکە کەس دەهێنایە نەزەرەوە...

ئەو شەوە دروستاییمان کرد کە سبەینێ زووبەزوو خەبەر بچێ بۆ سمایلاغای سواراغا و ئەنوەر بەگ و کەسانی دیکەش کە دەنگمان بیان گاتێ نیوەڕۆ بێتەوە سەرکەپکان بۆ ئاگادار بوون... سبەینێ دوای چێشتان لەگەڵ خاڵە خدرم و شێخ حسێن و کەمالی عوسماناغا و یوسف ئەلنەقیب چووینەوە سەرکەپکان. عەباساغا خەبەری نەبوو چونکە من لزوومم نەدیت، لە وەزعیشیم ڕادەدیت هەر قەڵەباڵغیەکی کتوپڕ مێوانی بێ دانامێنێ. ڕەنگە ئەو نیوەڕۆژە ئێمە و سەرۆکەکان و مێوانی دیکەش کە هەبوون سەد کەسێک دەبووین. لە جەماعەتم گەیاند کە من دەبێ بچمە بەغدا لەسەر خواییشتی زەعیم ئیتر جارێ چوونم بۆ سلێمانی بێلزوومە. دوای دیدەنی زەعیمیش دێمەوە لایان. شەوێکی دیکەش لە بۆسکێن ماینەوە، سبەینێ من بۆ کۆیە و کەمال و یوسفیش بەرەو سلێمانی دوعاخوازیمان کرد.

کەمالی عوسماناغا مەحرەمێکی هەرە نزیکی عەبدولکەریم بوو. لە دەرفەتێکدا بەر لە دوو ساڵێک خۆی گەیاندبوویێ و ئەگەر ڕاست ئەگەر درۆ چەند بەڵگەیەکی وەکوو پارەی بێگانە و دروشمی سەربە سیاسەت و شتی ئەوتۆیی لەگەڵ خۆی بردبوو گۆیا دەوڵەتێکی بێگانە شتەکانی داوەتێ بۆ نانەوەی ئاژاوە و «شۆڕش!». کەمال بەو هۆیەوە بووە چاوساغی عەبدولکەریم لەو شتانەی سەربە کوردن. وەک بیستم لە کەسانی باوەڕپێکراوەوە، برایم ئەحمەد یارمەتیی کەمالی دا بۆ چوونە لای عەبدولکەریم. یوسف النقیب کە پێشتر دیتبووم لە بنەماڵەی نەقیبی مەندەلی بوو. برا گەورەکەی، عیززەددین ئەلنەقیب کە هەمیشە بە نایبی مەندەلی دەردەچوو،

لەگەڵ ئەویش شناساییم هەبوو. لە کۆنەوە حکوومەتی بەغدا و بەر لەو زووتریش عوسمانلییەکان حورمەتی ئەو بنەماڵەیەیان گرتوە. یوسف مەردایەتیی تێدا بوو، حەزی بە چاکە دەکرد و هەرگیز بە لای گوماناوی کردنی خەڵقدا نەدەچوو بە پێچەوانەوە ئەوەندەی زانیبێتم یارمەتیی خەڵقی داوە. نازانم سەرەنجامی بە چی گەیشت.

لەو دەمانەدا کە من خەریکی وتوویژی بەرژەوەند بووم لەگەڵ سەرۆک عەشرەتەکان بەینۆڵکێک بوو عەبدولکەریم ساردایی لەگەڵ حیزبەکەماندا پەیدا کردبوو. پێشبینییەکەی ڕۆژی دەهۆڵ کوتانی ئیجازەی حیزب خێراتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا گەیشتە جێ.

لە کۆیێ هەر بایی خۆ سازدان وەخرام. کە گەیشتمە بەغدا سێ ڕۆژی خایاند هەتا مەوعیدم بۆ دیاری کرا لەگەڵ زەعیم. لە وەزارەتی دیفاعەوە، مورافیقی زەعیم، «حافظ علوان» تەلەفۆنی بۆ کردم کە شەوێ سەعات دە و نیو چاوەنۆڕم دەکات.

## ئاڵقەی سێزدەیەم

ناتوانم بڵێم ئەو ڕۆژەی کە بۆ شەوێ دەبوو بچمە لای عەبدولکەریم قاسم لە وەزارەتی دیفاع ڕۆژی چ مانگێک بوو، هەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم کە لە زستانی نێوان ١٩٦٠ و ١٩٦١ دا بوو. ئەگەر مەبەست بێت وردتر ببمەوە لە دیاری کردنی دەوروبەری ڕۆژەکە دەڵێم چەند ڕۆژێک مابوو بگەینە ڕەمەزانی ئەو ساڵە ئیتر دەشێ بە خوێندنەوەی تەقویمی ڕەمەزانی ئەو زستانە ژووانەکە بخرێتە حەفتەی پێش ڕەمەزان.

سەعات دە و نیوی ئەو شەوە گەیشتمە ژووری «حافظ علوان» گەنجێکی قۆزی ڕووخۆشی، هەتا بڵێی بە ئەدەب، دواتریش لە وتووێژدا ڕاستگۆشم هاتە بەرچاو، بەگەرمی بەخێری هێنام... کەمال و هی دیکەش لەوێ بوون. زەعیم چووبووە داوەتێک دەبوو چاوەنۆڕی لێ بکەین. هەر لەو کاتی چاوەڕوانیدا بوو قسەی ڕێککەوتنی عەبدولسەلام و برایم ئەحمەد لەسەر کەرت کردنی عێراق کە لە ئاڵقەی پێشووتری ئەم گەشتە باس کرا هاتە پێش و من بە درۆم خستەوە. دواتر کەمال گوتی زۆرم پێ خۆش بوو ئەو شایەدییە باشەت لە ناحەزی خۆت دا... ڕاستیشی دەکرد چونکە هەر نیازێکی لە دڵدا هەبووبێت ئەوەندە بەسە بۆ ڕاست کردنی کە خۆی لە ڕێی هەمان ئەندامەوە بە عەبدولکەریم گەیشتبوو، بە عەبدولکەریم گەیشتنیشی لە ڕۆژێکدا بوو جیرانی ئەو ڕۆژە بوو کە ڕێککەوتنە مەوهومەکەی تێدا گەڵاڵە کرابوو.

عەبدولکەریم نزیکی سەعات ١٢ هاتەوە دیفاع، لە ١٢ی ڕێک چووم بۆ لای. لەو ڕۆژەی لای عەبدولسەلام، بەر لە سێ ساڵ و نیو لە نزیکەوەم دیتبوو، چاوم پێی نەکەوتبۆوە. بە عادەتی هەموو دیتنێکی ئەوتۆیی لە پێشەوە خۆشامەدی و ئەحواڵ پرسی و موجامەلە و چایە و شیر و قاوەی مێواننەوازی بەڕێ کرا. وتووێژمان هەتا سەعات چواری بەیانیی خایاند.

بە گەلێک لادا قسە شریتەی هاویشت بەڵام بەر لە هەموو شتێک سەردانەکەی ڕانیەمم کردە دەرگای بە عەرز گەیاندنی ئاواتی سەربەرزی و تەنسازی و کامەرانی لەو سەرۆک عەشیرەت و برا گەورانەوە بۆ شەخسی عەبدولکەریم کە وێنەی

بەختەتی خۆی ئیمزاکراوی لە دیوەخانەی هەموویاندا ئاشکرا و شکۆدارە، ئەویش بە گەرمی لێی پرسین و ئەگەر پێداویستێک هەبێ هەتا بۆیان جێبەجێ بکرێت، لە وەڵامدا گوتمەوە ئەوان خۆیان بە وەکیلی زەعیم دەزانن، دیوەخانەکانیشیان کە هەمیشە بە عادەتی سەدەها ساڵ پڕە لە مێوان و خاوەن حاجەت هەر درێژەی ئەو شوێنەیە کە سفرە و خوانی زەعیمی لێیە... ئا لەم بابەتە قسە چەور و شیرنانەم بەپێی مەسڵەحەت بەکارهێنا بۆ ئەوەی بگەمە قسەیەکی بنەڕەتی کە گوتم، هەر ساتێکیش زەعیم کاتی لە مەشغەڵەت زیادی چنگ کەوت ئەو دڵسۆزانەی بە هەویان بێنە بەغدا و نانێکی عەشیرەتانە لەسەر سفرەی زەعیم بخۆن. گوتی هەر وەختێک پەرژان و لێیان خۆش هات بەخێر بێن وەک کە بچنە لای برای خۆیان.

من ئەم سەرەتایەم لای زەعیم زۆر بە مەحکەمی داڕشت بەڵام داخم ناچێ کورتبینی و دڵەسورکێ و حیسابی لاوەکیی بێئەساس لە هەندێ کەسی ناوچەکەی خۆمانەوە لەمپەڕی هێنایە پێش ئەم بەرژەوەندە گەورەیە وەک کە نەختێکی دیکە بۆتی باس دەکەم.

یەکەم مەوزووعی گشتیی سەربە کوردستانەکەی خۆمان ئەو تەعدیلەی قانوونی تەسویە بوو کە چەند مانگێک لەمەوبەر دەرچووبوو یەک بستی زەوی بە کەس نەدەدا ئەگەر سەنەدی تاپۆی خاقانی نەبێت. من بە توندی و پڕ بەدڵ ئەو تەعدیلەم تاوانبار کرد، لە ماوەی نزیکی سەعاتێکیش کە باسەکە درێژەی کێشا سوور بووم لەسەر ڕایەکەم. لە زۆر لاوە بۆ ناپەسەندیی ئەو تەعدیلە و گەلێک باری دیکەی قانوونی سەربە کشتوکاڵ چووم هەتا بەدەم قسانەوە بۆم گێڕایەوە کە لەو بەینانەدا لە ناوچەی سەنگەسەری سەربە قەزای ڕانیە مەفرەزەیەک پۆلیس دەچێ بۆ ئەوەی بڕیاری تەسویە لە بارەی موقاتەعەیەکەوە بۆ هەندێ فەلاحی ناوچەکە تەنفیز بکات، مەفرەزەیەکی دیکەش بۆ تەنفیزی بڕیاری ئیسلاحی زەراعی لە بارەی هەمان موقاتەعەوە بە چاکەی چەند فەلاحێکی دیکە لە هەمان ڕۆژدا دەڕوات. دوو کۆمەڵە لێک جوداکەی فەلاحان پێک وەربوون ٣-٤ کەسیان لە یەکتر کوشت.

لە بارەی تەعدیلەکەوە گوتم «سیادة الزعیم»، هەرچی زەویی بە پیت و بەرەکەت و پانوپۆڕ و بێکۆسپ هەبوو لە سەروو، لە ناوەڕاست، لە جنووبی عێراق تەسویەی تەواو بووبوو بەر لە شۆڕش، خاوەنەکانیان هەزار دۆنم ئاویە وەیا دوو هەزار دۆنمی دێمەکاریان وەرگرت، مایەوە ئەو ناو شاخوداخەی کوردستان کەوا هەم دراوسێی

ناحەزەکانی شۆڕشە و هەم سەخت و ئاستەنگە بۆ سەرکێش و هەم بەحاڵ خاوەنەکانی بەڕێوە دەبات کە دەزانم بەشێکی زەوییەکانی لە قەد پاڵی شاخەکان کەڵەکی بۆ کراوە و خۆڵی لە لاوە بۆ هێنراوە. ئا ئەم تەرزە زەوییە لەو تەرزە شوێنەدا دەکرێتە «أميرية صرفة» و لە خاوەنی دەسێندرێتەوە. گوتم من لە دوو موقاتەعە کە خاوەن شەشیەکی بووم بە بڕیاری ئەم تەعدیلە بێبەش بووم، بەڵام من کوێخا نیم، لە ڕێگەی محاماتەوە دەتوانم نان پەیدا بکەم هەرا نانێمەوە ئەمما لە دراوسێم بابا هەیە خۆی و ماڵ و حاڵ و شەرەفی سەد ساڵەشی بەندە بەو چەند پارچە زەوییەی دەیکێڵێ. معاون تەسوییەکە بە خۆی و کراسێکی قۆڵ کورت و شەپقەیەکی تۆپەڵەی سەریەوە بەیانییەکی لەو بەیانیانەی «رب العالمين» دەچێتە دێیەکە و بە خاوەنی دەڵێ سەنەدی تاپۆی خاقانیت دەربهێنە. دەڵێ جەنابی ئەفەندی خاقانیم نین... پێی دەڵێتەوە یاڵا کەلوپەلت بگوێزەوە ئەم زەوییە حکوومەتییە. گوتم «سيادة الزعيم هذا وين يولي؟» بە هەرچی قودسیەتی دنیا هەیە هەتا نەیکوژن واز لەو زەوییە ناهێنێت و دوایین گوللەی تفەنگەکەشی لە پارێزیدا دەتەقێنێت. گوتم جەنابی زەعیم هەرایەک بەرپا دەبێت بە شورتە چار ناکرێت دەبێ جەیش چاری بکات (نەمویست بڵێم شۆڕش بەرپا دەبێت).

لە قساندا گوتی ئەم بڕیارە بۆتە قانوون، گوتم یا زەعیم قانوون قورئان نییە لە ئاسمانەوە باری بێ، قانوونت داناوە بۆ چاکەی خەڵق کە چاک نەبوو تەعدیلی بکە، بێ گۆڕە، لەغووی بکە. گوتی بەپێی باوەڕت کێن ئەو کەسانەی قانوونی وەها پێشنیاز دەکەن بۆ وەزارەتی بەرپرسی کاری ئەوتۆیی. گوتم وەک بزانم کەسانی ئەوتۆن بەپێی باوەڕی سیاسییان لە ناوبردنی خاوەن زەوی ئەوپەڕی پیاوچاکییە، گوێشیان لەوە نییە داخوا چەند ماڵ و چەند ئاوایی کاول دەبێت. لەلایەن سوودی شەخسیشەوە کابرا ئەمڕۆکە «مدير عام»ـە کە هەرا بەرپا بوو پسپۆڕیی خۆی لە پێشنیازی زرینگەدار بەکاردەهێنێت و دەبێ بە وەزیر ئیتر بۆچی ئاوی لێ بخواتەوە؟ گوتم سەدان پژدەری چووە دیوی ئێران و بەسەر شاخانەوە گیرسانەوە دوایی حکوومەت زانی مانەوەیان لە دەرەوە مەسڵەحەت نییە، هاتنە سەر گەڕانەوە بۆ عێراق. لەو بارە ناسکەدا تەعدیلی تەسویە کرا کە بستێک ئەرزیان ناداتێ ئیتر کابرا بەسەر چیدا بێتەوە؟ «يرجع الى لا ارض لا قوت لا وطن؟».

لێرەشدا پێشدەستی دەکەم لەوەدا کە بڵێم تەعدیلەکەیان تەعدیل کردەوە و ماوەیان دا خاوەن موڵکی بێتاپۆ هەتا سێسەد دۆنمی دێمەکار وەیا میقدارێکی بەراوی هەبێ. عادل جەلال کە بوو بە وەزیری زەراعە پێی گوتم ئەو تەعدیلە کراوە پێم گوتەوە بەشی ناکات و پێویست ئەوەیە بە چاوی بەسرە و بەغدا سەیری ناوچەکە بکرێت.

عەبدولکەریم گوتی، لە دەمی نیابەتتەوە تۆ دەناسم و شتێکی نووسیبێتت خوێندوومەتەوە... گەلێک شارەزایی خۆی بە کورد و کوردستان باس کرد. بە فرسەتم زانی گوتم «سیادة الزعیم» هەرچەند بۆ تۆ کە زەعیمی هەموو عێراقیت خەڵقەکە وەکوو یەک قوماش بێت وەهایە بەڵام بێگومان کوردەکە لە هەموو قوماشان بۆ تۆ چاکترە چونکە چاوی نەبڕیوەتە هیچ زەعامەتێک و ئومێدێک لە دەرەوەی عێراق. لە ئاست ئەم قسەیەمدا وەڵامێکی دایەوە زۆر کورت بوو بە بەر قسەکەی منەوە، ئیتر یان قسەکەمی بۆ خورد نەکرایەوە یان بە تێگەیشتنەوە لە درێژایی قسەکەمی بڕییەوە، گوتی من ئەمە دەزانم بۆیە هەموو ئەو کەسانەی دەیانبینی بە دەورمەوە لەوانەی خزمەتمان دەکەن کوردن... من لەم وەڵامەوە چی دیکە بۆ قسەکە نەگەڕامەوە.

ئەو عەبدولکەریمەی کە وەکوو خانەخوێ ڕەفتاری دەکرد چ وێچوونی نەبوو لەگەڵ عەبدولکەریمەکەی خوتبەدان، هەتا بڵێی لەسەرەخۆ، بە ئەدەب، ڕێزڕاگر، تێبین، گوێگر. هەستم کرد چەندێکی کەس دیار نەبا بە میانەتەوە بە ناوی «مسعود»ی بێ لەقەب دەیدواندم. کە یەکێک لەوانەی ناوناوە چایە وەیا خواردنەوەیەکی دیکەیان دەهێنا گوێی لە قسە بایە دەیگوت «أستاذ» فلان. لە قوژبنێکی ئەو هۆڵەی تێیدا بووین جلکە خوێناوییەکەی ساڵی 1959 کە لە شارع ڕەشید هەوڵی کوشتنی درا و بریندار کرا هەڵواسرابوو، شوێنی گوللەکانیش لە جلکەکەدا دیار بوون. گوتی ئەم جلکە یادگارە، هەر جارە بە بیرم دەهێنێتەوە کێ دوژمنمە و بۆچی دوژمنمە. وەڵامەکەی من لە ئاست ئەو قسەیەیدا کورت و بێهێما بوو وەک وەڵامەکەی ئەو لە ئاست قسە باس کراوەکەی مندا، واتە نەهاتمە سەر شکاندنەوەی ئەوانەی دایانە بەر گوللە، هەر ئەوەندەم وەڵام بوو کە چانسی عێراق بوو زەعیم سەلامەت بوو، تەمەنی درێژ بێت و شتی ئەوتۆیی... لەلایەن مێواننەوازییەوە دەتگوت بە عومری خۆی دیوەخانی عەشیرەتانەی هەبووە و مێوانی بەخێرهێناوە. لە دیدەنی دوەم جار ئەم لایەنەی باشتر دەرکەوت، دوای نەختێکی دیکە دەیگەینێ.

لە چوار سەعات وتوویژدا چی بە خەیاڵدا بێت لە بابەتی قسە لێوە کردن جێگەی خۆی دەکاتەوە. چەند بە وردی لە شێوازی قسە کردنی سەرنجم دەگرت هیچ عەیبێکم لێ نەدیت. وشەیەکی بە دەمدا نەدەهات کە خۆی نەیویستبێ وەک کە هەندێ کەس ناواخنی بێلزووم بەکار دەهێنن بۆ گرتنی کەلەبەری خەیاڵ بڵاوی وەیا خاوپێچرانەوەیی وەیا هەڵەشەیی زمان... لە حەرەکەی لەشیشی هیچی بێجێم لێ نەدیت. نە خۆی خوراند نە دەستی بە سەر و ڕوویدا هێنا نە ملەچەرخێکی کرد نە بەدەست بزافتن یاریدەی قسەکانی دەدا. گوێم لێ نەبوو فڕە لە چایەوە بهێنێ وەیا لە دانانی ئیستیکان و فنجان تەقەی لێ هەڵستێ... لووتی هەڵنەمشت، گەرووی بە نەرمە کۆکە پاک نەکردەوە... هیچ شتێک لەو مرۆیە ڕووی نەدا کە لە زەعیمێک نەوەشێتەوە. ئەو لە پەڕگی مێزەکە دانیشتبوو منیش لە ئانیشکەی دەستە ڕاستییەوە بووم، مەودای نێوان ڕووی هەردووکمان ناوناوە مەترێک هەندێ جاریش دەبوو بە نیو مەتر، نە هەستی هەناسەیم کرد نە پڕیشکێک لە زاری دەرچوو. ئەگەر سەهووم نەکردبێ وەهام هەست کرد کە دەستێکی بە تەئسیری گوللە لە دەستەکەی دیکەی بێحەرەکەتر بوو. بە وردییەکی زۆر ورد سەرنجم لێ گرت تا ئەوەی بەدیم کرد کە تەڕایی تف بە دووگۆشەی زاریەوە نییە، قولینچکەکانی هەر دوو چاوی تەواو خاوێنن، ددانی سپین، یەخەی دەوری ملی بێچڵکە. سەعات بووە چواری بەیانی دەرفەتی دامێ کە ئەگەر ئارەزۆم بێت بتوانم دوعاخوازی بکەم. لەگەڵم هاتە دەرێ لە سالۆنەکە گوتی لە دانیشتنی دووەممان قسەکان تەواو دەکەین. بە ئۆتۆمۆبیلێکی دیفاع هاتمەوە ئۆتێل.

لە ڕۆژانی پێش ڕەمەزاندا سەردانێکی لیوا «ئەحمەد ساڵح عەبدی»م کرد، پێشتریش لەگەڵ عەقید موحسین ڕوفێعی مدیری ئیستیخباراتی عەسکەری شناساییم بووبوو. هەر لەو بەینانەدا دیاردە ئەزەلییەکەی تەبیاتی مرۆ خۆی دەرخست. لە ساردایی نێوان حیزب و مندا گەلێک کەس هەبوون باوەڕیان لەگەڵ مندا بوو بەڵام بەرژەوەند لێمی دوورخستنەوە، کە زانییان عەبدولکەریم لێی گێراومەتەوە و لەگەڵم دواوە خۆیان نزیک کردەوە لێم بە سەردان و بە داوەت بە ئەحواڵ پرسیی تەلەفۆن...

ڕەمەزان بەسەردا هات، من بە ڕۆژوو دەبووم، حەزیشم لێ بوو ڕۆژووەکە لە ماڵی خۆم بگرم، ئۆتێلەکەشم دروستایی بەربانگ و پارشێوی پێ نەدەکرا... خۆم گرت

هەتا ڕۆژی یەکەم تێپەڕی، کە دەنگێکم نەبیستەوە لە وەزارەتی دیفاعەوە، خۆم تەلەفۆنم لەگەڵ «حافظ علوان» کرد و گوتم حەز دەکەم ئەگەر زەعیم ڕێی نییە جاری دوەم بەپێی قسەی خۆی بمبینێتەوە ئیزنم بدات بچمەوە بۆ کۆیێ. دوای چارەکە سەعاتێک یان کەمتریش بە تەلەفۆن گوتی زەعیم ئێوارە بۆ بەربانگ چاوەنۆڕیت دەکات. پێش بەربانگ بە دە دەقیقەیەک گەیشتمە ژوورەکەی «حافظ». کە بانگی دا بەربانگی دیفاعیان بۆ خەڵقەکە هێنا ئنجا «حافظ» بردمی بۆ لای عەبدولکەریم. لە ژوورێکی بچووک کە دەرگاکەی کرابۆوە. زەعیمم دیت بەتەنیشت مێزێکەوە ڕاوەستاوە، کە دیتمی هەنگاوی هەڵێنا بە لای منەوە منیش بۆی چووم، دوای سەلام لە دەست گوشیندا «صیام مبرور»م گوت، ئەویش موبارەکبادی کردم، گوتم «سیادة الزعیم ما امشیها علیک أنا مو صایم» چونکە ئوتێلەکەم ڕۆژوو هەڵناگرێ خۆ ئەگەر لە دوێنێوە بمزانیبایە فتارم لەگەڵ سیادەتت دەبێ هەر بە ڕۆژوو دەبووم. گوتی «اشكرك» ئیتر نەمزانی بۆ سەراحەتم بوو یان لە جەوابی «صیام مبرور»ەکە بوو، گوتیشی لەوەتەی عومرم بۆتە دە ساڵ ڕۆژووم نەشکاندووە.

لەو ساڵۆنەی جاری یەکەم تێیدا کۆبووینەوە، بەسەر هەمان مێزەوە لە لای نزیکی دەرگەوە بەربانگ داندرابوو بریتی بوو لە خواردنەکەی وەزارەت و لە سەفەرتاسییەکی کە لە ماڵی خوشکی بۆی هاتبوو عەبدولکەریم لە سەرووی مێزەکەوە منیش لە دەستە ڕاستییەوە عەقیدێکیش لە خوار منەوە دامەزراین. بەر لەوەی دانیشین عەبدولکەریم دەستی ڕاستەی خستە تاسە ئاوێکەوە کە هەر یەکەمان یەکێکی ئەوتۆی بۆ داندرابوو. تێگەیشتم ئەو دەستەی کرد لە ئاوەکە نەکا من بە ئاوی خواردنەوەی بزانم - لە ساڵی ۱۹۶۴ سەفەری ئەمریکا داوەتێکی نیوەڕۆژەی کردم لە سەفارەت، دیتم بەسەر مێزی خواردنەوە هەمان شکڵ دوو تاسە ئاو داندراون بەڵام هەر یەک گوڵێکی بچووکی تێخراوە. حیکایەتەکەی فتاری لای عەبدولکەریم-م بۆ گێڕایەوە کە ئەو لە جیاتی گوڵ، دەست تێخستنی کردە ڕێنموونی بۆ بەکارهێنانی ئاوی تاسەکە. کە گەشتم گەیشتە ساڵی ۱۹۶۴ باسی ئەم داوەتە دێتە پێش.

زۆر شارەزایانە بە نامەی مەیانەت یارمەتیی دەدام لە وەرگرتنی خواردەمەنی بۆ ناو قاپەکەی بەردەممەوە. دیتم هەر خواردنێکی ماملەتی نەختێک مەکرۆ بێ خۆی

دەیخستە قاپەکەمەوە وەک کفتە، کەوا لەوانەیە وەکوو کەلا لەبەر چنگاڵ هەڵێت و مێوان شەرمەندە بێت وەیا لێکردنەوەی پارچەیەک لە مریشکی سەرلەبەر... وا تێدەگەم هەر بۆ ئەم نیازەشی بوو کە لە سەرووی مێزەکە بەتەنیشتمەوە دانیشت نەک لە بەرانبەرم. بەدەم خواردنەوە قسەیەکی کرد و من تەعلیقێکی بچووکم لێ دا پێی ناخۆش نەبوو. گوتی چەندی خواردنی تازە دادەهێنن ڕەفیقی خورما و هەنگوینیان پێ ساز نەدرا. من گوتم «سیادة الزعیم»، دیارە سروشت پسپۆڕترە چونکە هەردوویان سروشتین. لەسەر هەنگوین نەختێک دواین کە زەردە و مەیلەو تاریک و هی زۆر سپیی لێ دەست دەکەوێت. من گوتم هەتا شوێنی پوورەهەنگ گوێستانتر بێت هەنگوینی سپیتر دەبێ. گوتی «سمعت من بعض اخواني الأكراد»، هەتا پوورەهەنگ کۆنتر بێت هەنگوینەکەی تاریکتر دەبێت و چەندێکی نوێ بێت هەنگوینی سپیتر دەبێت. قسەکەش ڕاست بوو من لە بیرم نەبوو بیڵێم، ئەمما قسەکەی منیش هەر ڕاست بوو.

دوای بەربانگ عەقیدەکە کە ناویم لەبیر نییە کشایەوە، ئێمە ماینەوە تا دوو سەعات و نیوێک. دیسان لە زۆر شت دواین بەڵام بەر لەوەی بکەوینە سەر وتوویژ ئیزنم لێ خواست بۆ گەڕانەوە بە نیازی ڕۆژووی بەر ئاگردانی ماڵەوە و سەردانی دۆستانی ڕانیە و پژدەر تا دوای جەژن لە پێویستدا بێمەوە بەغدا. ئیزنی دام و قسەی دۆستانە و سەلامیشی بۆ ئەو گرووپەی سەرۆکەکانی ڕانیە و پژدەر پێ ڕاسپاردم.

لە فرسەتدا ڕجایەکی دوو لاییم لێ کرد. ئەحمەدی حەمەد ئەمیناغای دزەیی دوورخرابۆوە بۆ بەغدا، مەجید حەدادیش مامۆستای سانەوی و دۆستی خۆم، لە بەسرە حەبس بوو. گوتم «سیادة الزعیم»، ئێستە ڕەمەزانە و جەژنی بەسەردا دێت هەر یەکەیان چاکەیەکیان لێ دەوەشێتەوە بۆ منیش دەبێتە چەژنانە. پرسی چۆن؟ منیش باسی ئەو دوو کەسەم کرد کە برادەرن و چ سووچیشیان نییە. گوتی کە دەرچووین بە بیرم بهێنەوە لیوا عەبدی تێبگەیەنم. لەو دانیشتنە بوو باسی حەبەشەی کرد کە هەڵگەڕانەوەیەک لە هیلاسیلاسی پەیدا بووبوو گوتی، من شارەزای وەزعی ناوەوەی حەبەشە هەم، ئەم سەرکێشییە سەر ناکەوێت. هاتە سەر ناوی هیلاسیلاسی و ئەدیس ئەبابا گوتی، «هیلا» بە واتای «حیل – توانایی» و «سیلاسی»ش دەکاتەوە «ثلاثي» پێکەوەیان دەبنە «القوة الثلاثية»ی مەسیحییان کە باوک و کوڕ و «روح القدیس»ە. «ئەدیس = قدیس» «ئەبابا = الأب»

ئەوانیش دەبنەوە «الأب المقدس». ئەمانەم لەبیرن بەڵام لێم نەتۆژیوەتەوە بزانم لە زمانی ئەمهەریدا وشەکان وەهان یان نا. گوتی من لە ئیقتیساد بەڵەد نیم بەڵام لەگەڵ مامۆستاکانی ئیقتیساد ڕێک ناکەوم کە دەڵێن تەعمیراتی خانووی تێدا ژیان پرۆژەی بەرهەمهێن نییە پارەیەکی لێی خەرج بکرێ وەک شەختە کردووی لێ دێت. لێمی پرسی ئاخۆ من دەڵیم چی، بە هەموو باوەڕی ئەوساکە و ئێستاکەشمەوە گوتم زەعیم لەسەر حەقە چونکە پارەکە خۆی نابێتە دیوار تا بڵێن شەختەی کرد، عەمەلەی پێ دەژێت، ناچار پێی دەبووژێتەوە، پرۆژەی بەرهەمهێنی وەک کارگەی چەمەنتۆ و کەرپووچی پێ دەکەوێتە گەڕ، پارەکە سەرلەبەری دەبێتە خوێن لە دەماری ئابووریی وڵات دەگەڕێ. گۆیا ئەگەر پارە بە پارەیی مایەوە چی لێ شین دەبێتەوە؟ بشکرێتە زێڕ و لە ساردای بانکەکان دابندرێت هەر شەختە کردوو دەبێت.

ئەو دەمە خەریک بوو پرۆژەی «قناة الجیش»ی جێبەجێ دەکرد، دیارە لە سۆنگەی ئەوەوە تووشی موناقەشە بووبوو لەگەڵ مامۆستاکانی نەزەریە، کە لە ساڵۆن دەرچووین عەبدولکەریم مەسەلەی ئەحمەداغا و مامۆستا مەجید حەدادی بە عەبدی گوت و چارە کران.

سبەینێ گەڕامەوە بەرەو ماڵ، شەوێک لە کەرکووک بووم. بۆ بەیانی پێش بەڕێ کەوتنم بۆ کۆیێ سەردانێکی مەرحووم بەهائەددین قوتب-م کرد کە سەرۆکی دادگەکانی مەنتیقەی کەرکووک بوو. دوای کەمێک عەزیزی ئەحمەداغا-ی مەشوور بە عەزیزاغای ئەشغاڵ هات گوتی دوێنێ عەسر لە نێوان کۆڕێ و شەقڵاوە سددیقی میرانی قادر بەگ بە چەند کەسێکەوە کوژراوە. وەی کە کاری تێکردم بەڵام چ سوود! گوتم شایەدی قسەم بن، تازە خۆشی لە وڵات هەڵگیرا. ئەم کوشتنە دەلالەتێکی هەیە لە کوشتنی ئەحمەداغای زێباری-دا نەبوو...

ئەو ڕۆژە چوومە کۆیێ بۆ سبەینێ چوومە ڕانیە. هەموو براگەورەکان لەوێ بوون. سەرێکی قایمقامم دا و لەگەڵ جەماعەت کۆبووینەوە و بە درێژی باسی بەغدا و دیدەنییەکانی عەبدولکەریمم بۆ گێڕانەوە بەڵام لە قسەی یەکێک لەو برا گەورانە کە باسی کوشتنی سددیق بەکی بە بێباکی و زەردەخەنەوە کرد وازم لە حیکایەتی بەغدا هێنا و ڕووم کردە ئەو کەسە و گوتم: تۆ بەڕاستیتە وەها بەسووکی باسی ئەو کوشتنە دەکەیت؟ ئەو کەسە و جەماعەتەکەش قسەکەمیان بەلاوە سەیر بوو

چونکە سددیق بەگ کەسێک بوو لە ڕیزی عەشیرەتەکان دەرچووبوو بەو ترازانەی بەر لە ساڵێکی لە کۆمەڵگەی براگەورەکان کە زێدە لە هەموان ئەو سەردانی عەبدولکەریمی کرد. گوتم براینە، خزمینە، دۆستینە! ئەگەر لە پێشەوە ئاگربڕی نەکەن تاکێکتان لە چارەنووسی سددیق بەگ ڕزگار نابێت. ئەمە تەپکەیە بۆ هەمووتان نراوەتەوە لە کوێ نوستوون؟ کە وەهام گوت هۆشیان هاتەوە بەرێ دەتگوت کوتکیان لە کەللە دراوە و وڕ بوون. ڕووم لە عەباساغا کرد پێم گوت، ئاگات لە خۆت بێت بەرقیە هاتووە بۆ ئیدارەی ڕانیە کە کاوانییەکان بۆ لای تۆ هاتوون، بڕوا بکەن ڕەنگی تێکچوو. گوتیان چی بە مسڵەحەت دەزانیت بیکەین؟ گوتم وەفدێک ڕێک بیەخەن نوێنەری پژدەر و بەردەر بێت لەگەڵ شێخ خدری خاڵم بێن بۆ کۆیێ منیش لەگەڵیان دەچم بۆ سەرەخۆشی کردن لە ماڵی قادر بەگ. لەوێوە ئەو وەفدە قسەی خۆی بە مەلا مستەفا بگەیەنێت کە بەم کوشتنە ڕازی نین و پێویستە نوێنەری کوردایەتی سەرەخۆشی لە تازیەدارانی سددیق بەگ بکات و چی دیکەی وەهاشی بە دوادا نەیەت. قسەکەم پەسەند کرا و من گیر نەبووم گەڕامەوە کۆیێ.

سبەی عەسر خاڵە خدرم و سێ کەس کە نوێنەری ئاکۆ و بلباس و بیتوێن و سەرلەبەری ناوچەکە بوون گەیشتن. من پێشتر بروسکەی سەرەخۆشیم بۆ عومەر بەگ و عوسمان بەگ-ی برایانی سددیق بەگ لێ دابوو. ئەو شەوە تێپەڕی، سبەینێ هەر پێنجمان مەیلەو زوو بە ڕێ کەوتین. لە شەقڵاوە دوای فاتیحە خوێندن ئێمە و فەتاحاغای هەرکی کە دۆست و خزمی ژنبەژنەی ماڵی قادر بەگ بوو لەگەڵ عومەر بەگ و عوسمان بەگ جودا بووینەوە، چی مەبەست بوو لە هاتنی جەماعەت بۆ سەر تازیەکە ڕوون کرایەوە.

عەسری دابوو من گەڕامەوە بۆ کوێی و خاڵە خدرم و هاوڕێکانیشی بەرەو مەلا مستەفا چوون. دوای دوو ڕۆژ خاڵم و هاوڕێکانی گەڕانەوە. شەوێکم لا مانەوە، بە درێژی باست سەفەرەکەیان و وتووێژێکی کردبوویان بۆمیان گێڕایەوە. ئەو دەسەڵاتە وەهای ڕانواندبوو کە ئەویش کارەساتەکەی لێ گران هاتووە، نوێنەری نارد بۆ پرسە کردن لە تازیەدارەکان. بەڵام لە سەرچاوەی باوەڕپێکراووەوەم زانی کە چەندوچۆنی مەسەلەکە بە باری دیکەدا بووە.

من لەم ماندوو بوونەوە و خۆ خەریک کردنە بەرژەوەندێکی خۆمم ڕەچاو نەکردبوو، بە عەکسەوە لە زەرەر بەولاوە هیچی تێدا نەبوو بۆ من. لەو هاتوچۆیەی بەغدا و ڕانیە و شەقڵاوە هەر هێندەم قازانج کرد برە مەڕێکم هەبوو فرۆشتم و کردم بە مەسرەف. ئەوەی من بە چاومەوە گرتبوو لە بەرهەڵستی کردنی کوشتن و سووتاندن و دووبەرەکی و شەڕی چینایەتی و عەشیرەتایەتی و حەسوودی و سوودی شەخسی قەناعەتێک بوو، ڕەنگە لە خۆم بەولاوە جارێ لای هیچ کوردێک پەیدا نەبووبوو. من بە ڕوونی دەمدیت و دەمزانی حاڵوباری کورد بە بەریەوە نییە فلسێکی بێجێ سەرف بکات و دڵۆپە خوێنێکی خۆڕایی خۆی بڕێژێت و یەک سەعات گوزەرانی بە فیرۆ بدات بۆ دابین کردنی مەیلی بیژۆک.

لەوەتەی پەیمانی سیڤەر پووچابۆوە و شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران کوژابۆوە دەبوو نەخشەی چالاکیی سیاسی کوردی ڕابەر پاراستنی کورد بێت. ئنجا ئەگەر لەبەر خاتری خاترداران بشسەلمێنم کە ئەو بزووتنەوانەی سەربە ڕاپەڕینی قەومایەتیی دژی دامودەزگای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەوا لەسەر پرۆژەی بەرژەوەندی هێزە زلەکانی ئەورووپا دامەزرابوو، ئا ئەو بزووتنەوە خوێناویانە پێویست بوو بۆ بە ئیسپات گەیاندنی گیانی نەتەوایەتیی کورد، خۆ براکوژیی ناوخۆیی و دووبەرەکی و یەکدی براندنەوە لێکدی تاسپبوون و تێکژەنینی نامەردانە و شەوکوێرانە لە وەهم و خەیاڵیشدا بە چاکەی کورد تەواو نەدەبوو.

بەر لە شۆڕشی تەمووز شێخ حسێنی حاجی سەید بێ ئەوەی وەکوو من دەفتەری مێژوو بخوێنێتەوە هەر لە بەرژەوەندبینییەکەی پژدەرییانەوە دەیگوت ئەگەر وەتەنیەت هەر بایی ئەوەندە بێ پیاو تێهەڵدرێ نەکردنی چاکترە. قسەکەی هەتا بڵێی لە بەرژەوەندا بوو، وا لێرەدا دوو بەڵگەی بەهێز دەخەمە پاڵپشتی ئەو ڕایە. ئەو وەتەنییەی کە لەبەر تیشکی بەرژەوەندی قەومی پێی خەسارە قوربانی بێلزووم بدرێت بۆ سوودی بزووتنەوەی میللەتانی ئەفەریقای جنووبی دەبێ پێشی خەسار بێ هەزاران قوربانی بدرێ لە پێناو ئامانجی لە توانا بەدەر و موستەحیل. بەڵگەی دوەم ئەوەیە کە ئەگەر ڕابەرانی بزووتنەوەی سەربە قەومایەتی دەتوانن لە ماوەی دەیان ساڵدا سەرپەرشتی لە کاری سەختی بێئەنجام و بە ئەرک و سفتوسۆ بکەن دەبوو بتوانن سەرپەرشتیی لە سیاسەتی «کوردپارێزی»ش بکەن بۆ ڕۆژێک کە هەل و دەرفەت پەیدا دەبێ. هەڵبەت دەزانم قسەی ئەوتۆیی بەلای کەسێکی لەبەر

تیژرۆیی کوشتنی سدیق بەگ و هی وەک ئەویش لەساڵی ١٩٦٠ و ١٩٦١ بۆ قەومی کورد لەو حاڵوبارەدا نەک هەر بێسوودە بەڵکوو وەک زەهری هەلاهیلە.

من کە ڕابەری میللەت بم هەر هێندەم کورتبینی لێ دەسەلمێندرێ کە چاوم پشت گرد و شاخ و نەدیوان نەبینێ، کە هاتم چاویلکەی وەها لێڵم بەکار هێنا کە هێندەی ڕوونبینیی بەقاڵێکیش هێزی دیتنم پێ نەهێڵێ، بەقەدەر نوێژکەرێکی عادەتیشم کەڵک پێوە نامێنێ کە لە سبەینەی ساردی زستاندا لە پێناو نوێژی بەجەماعەت خۆی سەرمابردووی ڕێگەی مزگەوت بکات چونکە نوێژکەرەکە هەر نەبێ تەمایەکی بەهەشتی هەیە...

ئەم قسانە دەکەم نابێ لەسەرم حیساب بکرێ بە فەلسفەی ساردوسڕی بێئەرک چونکە بۆ خۆم لە هەموو ئەرک و نارەحەتی و خەسارەتمەندیدا بووم تا ئەوەی لە هەندێ باردا بە گوێی خۆم بیستوومە، لە دەرەوەی ژووری حەپسخانەکەمانەوە دەگوترا ئەم حەبسانە هی ئیعدامن. قەتیش ڕێبازی خۆمم نەگۆڕیوە.

ئەو ڕەمەزانەم لە کۆیێ ڕابوارد مەگەر ڕۆژێک کە بۆ دەعوایەکی جینائی لە مەحکەمەی عەسکەری مووسڵ سەفەرێکی بەیانەکیم کرد و بەر لە فتار گەیشتمەوە کۆیێ ئەمما بە ڕاستی ڕێگەی ئەوسای هەولێر کە بە ڕۆژ تاکوتەرا سەیارەی پێدا دەهات لەو دەمەو بەیانییەدا چوێلکەشی لێ نەبوو، کوردی دەڵێ بێنی خوێنی لێ دەهات چونکە دنیا ڕووی لە بێ ئەمنیەتی کردبوو. وابزانم تازەبەتازە بەدرەددین عەلی بووبووە موتەسەڕیفی هەولێر، پێشتر قایمقامی ڕەواندز بوو، جەژنە پیرۆزانەی بۆم دەنارد بەڵام ڕێک نەکەوتبوو ببینم، دوای چەند مانگێک دیتم، وەک کە بۆت باس دەکەم.

پاش جەژن چوومەوە ڕانیە، ئەو قسانەی کە لەبەر مەسەلەی پرسەکردن لە تازیەی سدیق بەگ دواخران لەو سەفەرەدا بە درێژی و خوردکرنەوەوە باس کران کە لە هەموویان گرنگتر بۆ وەزعی ئەوان ئەو قسەیەی عەبدولکەریم بوو کە گوتی لە زاری منەوە سەلام لەو ئاشنایانە بکە و هەر کاتێکی ویستیان با بێن بۆ لام وەک بێنە لای برایان. من کە دوعاخوازیم لێکردن لەسەر ئەم بڕیارە بوو کە تێکڕا ئامادەن بۆ دیدەنیی عەبدولکەریم، هەر دەشبوو وەهابێ چونکە دڵ عاجزیی ئەو چەند مانگە بەو سەرلێدانە یەکجارەکی دەسڕایەوە. لەمەش بترازێ بەرژەوەندی

بنەڕەتی هەبوو وەک مەسەلەی ناپوختیی تەسویە و ئیسلاح زەراعی و ئەرزی ژێراوخراوی دووکان و دەربەندیخان و گۆڕانی سیاسەتی عەبدولکەریم بەرانبەر ڕابەرانی کوردایەتی و چارەسەر کردنی ناگزووری و بێدەرامەتی و نەبوونی پرۆژەی سوودبەخش و چەندین کێشەی ئەوتۆیی کە هەمووی بەندبوو بە هەڵستانی پەردەی دوودڵی و گومان لە نێوان ئەو عەشیرەتانە و عەبدولکەریمدا.

من بە زیادەوە دەمتوانی سوودی شەخسیم پێک بهێنم دوای نەختێکی دیکەش لەم نووسینە ڕاستییەکەت بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەڵام پرسیاری سەربە هەموو کوردایەتی بنگەی پانوپۆڕی گەرەکە. کە هاتمەوە کۆیێ جارێ بڕیاری سەفەرم نەدابوو. لە سلێمانییەوە یەکێکی موحتەرەم بەتایبەتی هات بۆ لام کە ببمە وەکیلی براکەی و چەند هەڤاڵێکی براکەی کە هەموویان قوتابی بوون و درابوونە عورفی لەسەر تێک هەڵقژانێکی لەگەڵ کرێکارێکی سەربە چەپ کە عەمەلەیەکی تێدا کوژرابوو و کۆمەڵێک قوتابی و عەمەلەش زامدار بووبوون.

ئەم تەکلیفە لە لایەکەوە یارمەتیی دەدام کە سەغڵەتی مەسرەف پەیدا کردن نەبم، لە لایەکیشەوە قورسایی دەخستە سەر قورسایی بنەڕەتی خەریکبوونی ئەوسام. مەسەلەکەی قوتابییان لە کوردایەتییەوە هەڵیدابوو، هەرچەند لێیان نەکوژرا بەڵام وەک بە پرسین و لێ تۆژینەوەش بۆم دەرکەوت هێرش لە عەمەلەکانەوە بۆ سەر قوتابییەکان هاتبوو. بەهەمەحاڵ من بەرپرسی چەندوچۆنی ڕووداوەکە نەبووم، محاماتیش لە هەر دەعوایەک بێ، حەوجەی پاکانە نییە، بەڵام من لێرەدا داوی مێژوو هەڵدەکەمەوە حەز دەکەم چی بێتە بەر نووسینەوە ڕوون و ئاشکرا بێ. دەعواکەم وەرگرت کە دەبوو بۆی بچمە بەغدا چونکە عورفی لە بەغدا بوو هەرچەند قوتابییەکان لە سلێمانی حەبس بوون.

ئێستا لە کۆیە بووم تەلەفۆنێکم لە بەغداوە بۆ کرا لە لایەن یەکێک سەربە حکوومەتەوە گوتی وا هەست دەکەم زەعیم بە تەمایە بچیتەوە لای. کە تەلەفۆنەکەم بۆ کرا خۆم ئامادە کردبوو هەر ئەو ڕۆژە بەرێ کەوتم. گەیشتمە بەغدا زانیم ئەحمەدی حەمەدەمیناغا لە کەرکووک گیرابوو، لە ڕێگەی بەرەو هەولێر هەل وەردەگرێت و هەڵدێت بۆ لای عەباسی مامەنداغا. ئەو معاون شورتەی ئەحمەدی لە دەستان هەڵاتبوو محەمەدی شێخ ڕەشید، کوڕێکی زێدە چاک و

زاوای مدیر شورتەی ناسیاوم ساڵح خۆشناو بوو. ئەم مەسەلەیەش کەوتە ئەستۆمەوە.

ئێستا خۆم لە دیفاع ئاشکرا نەکردبوو کاکە حسێنی خانەقا و کاکەی حاجی مەحموود پێکەوەیان هاتنە لام گوتیان ٣٥ کورد لەسەر کوردایەتی لە حەپسخانەی کەرکووکن هیچشیان نەکردووە هی حەبس کردن بێت بەڵام پیاوی نامەرد ئیخبارییەی لێ داون بەڵکوو هەوڵێکیان بۆ بدەیت زۆر بەجێ دەبێ.

پاش عەسرێکی بەهاری ١٩٦١ بوو چوومەوە لای عەبدولکەریم. ئەو ڕۆژە بۆم مەعلووم بوو «حافظ علوان» مرۆیەکی ڕاست و پاکە. «عەبدولکەریم جەددە» و پیاوێکی سەربە ئاشتیخوازی لە سەفەری چین گەڕابۆوە هاتبووە دیدەنی عبدولکەریم لە ژورەکەی «حافظ» بوون باس هاتە سەر ئاسمانگەڕی. قسە گەیشتە ئەوەی کە یەکیەتی سۆڤیەت باسی تاقیکردنەوەکانی خۆی ناکات هەتا سەردەکەون، ئەوەی تێبشکێ بن لێو دەخرێت. هەرچی ئەمەریکایە لە پێشەوە ڕۆژی بەڕێ کردنی کەشتییە ئاسمانییەکەی بە عالەم ڕادەگەیەنێت و کە سەرنەکەوتوو بوو هەموو کەس دەزانێ. عەبدولکەریم جەددە و ئەو ئاشتیخوازە گوتیان ڕەفتارەکەی سۆڤیەت پیاوانەترە. «حافظ» لەگەڵیان کەوتە دەمەتەقە تا ئەوەی سوور هەڵگەڕا و بە توندی بەرهەڵستی لەو ڕایە دەکرد. من هەر ئەوەندەم بە ئاشتیخوازەکە گوت کەوا بێ ئەوەی بڵێم کامیان لەسەر ڕاستین دەتوانم دڵنیابم لەوەدا جەنابت هەر ڕازی دەبوویت لە سۆڤیەت ئەگەر جۆرێکی دیکەشی کردبایە. ئەو کابرایە ناوی هەبوو ئەوسا ناوەکەیشم دەزانی وا ئێستا لە بیرم نەماوە.

لە هەمان جێگەی دووجاری پێشووتر دانیشتینەوە لەگەڵ عەبدولکەریم، ئەم جارەیان بوو بە دوایین جار و نزیکی ٢،٣٠ سەعاتی دەوام کرد. وەها ڕێککەوت لەبەر دەرکی ژوورەکە لیوا عەبدی کاغەزی ڕەسمیی پێبوو هێنابوونی زەعیم ئیمزایان بکات. بە هەلم زانی لە دەست گوشینی عەبدی بووم مەسەلەی ئەحمەداغام باس کرد کە تێناگەم بۆچی دوای لوتفی هەوەڵ جار دووچاری بێلوتفی بۆتەوە. ڕووی قسەم لە زەعیم بوو، پرسی مەسەلە چییە؟ لیوا عەبدی گوتی ئەمری گرتنی دەرچوو ئەویش لە دەست پۆلیس هەڵاتووە. دوای نەختێک ڕوون کردنەوە عەبدولکەریم گوتی ئەمرەکە لەغوو بکە. عەبدی گوتی چاک بوو فەرمووت دەنا ئەمری گرتنی براکەی و حیجزی ئەموالیشی وا لە دەستمدایە خەریک بووم بە

هەولێری ڕابگەیەنم. هەناسەیەکی حەسانەوەم هەڵهێنا. کە دانیشتین، دوای چاک و چۆنی و موجامەلەی عادەتی و بە عەرزگەیاندنی ڕێز و خۆشەویستیی کۆمەڵەی سەرۆک عەشیرەتەکان و سپاس و دوعای چاکە لە زەعیمەوە پێشەکییەکی خۆشکەڵەم کرد دەرگە بۆ باسی قوتابییەکانی سولەیمانی و گرتووەکانی کەرکووک. لە بارەی قوتابییەکانەوە گوتم لە بنەڕەتەوە تێک هەڵقژان لەوەوە هات کە بڕیارێکی نوێ لە بارەی مەسەلەیەکی «ئابووری»یەوە لەلایەن دەستەی بەڕێوەبەرانی سیاسەتی بەرزی دەوڵەتەوە دەرچوو، کرێکارانی سولەیمانی ڕەخنەیان لێ هەبوو، چووبوونە سەر قوتابییەکانی سانەوی کە هاریکارییان لەگەڵدا بکەن ئەوان نەیانسەلماند. قسە لەم و قسە لەو بوو بە شەڕ چەپۆڵک. چەند کەس لە هەردوو لا بریندار بووبوون و عەمەلەیەکیش لە برینداربییەوە مرد، لە ڕاستیشدا کەس نازانێ بە دەست کێ کوژراوە بەڵام شایەدێک لەو ناوە هەڵکەوتووە ئیفادەی داوە کە دیتوەتی قوتابییەک چەقۆی لە عەمەلەکە داوە. لەسەر ئەم شایەدییە، ئەو قوتابییە و (وابزانم) دووی دیکەش گیران و موحاکەمەیان لە عورفییەکەی لای شەمسەددین عەبدوڵایە. بەو پێیە ئەو قوتابیانە جگە لەوەی بە ئەسڵ لاشەڕ بوون، لەسەر پشتگری کردن لە بڕیاری سەرۆکایەتیی شۆڕشیش دووچاری ئەو کارەساتە هاتن. عەبدولکەریم سەلماندی کە دەبێ بپارێزرێن.

هاتمە سەر باسی گرتووەکانی کەرکووک، گوتم بە باوەڕی من ئەو گرتووانە وەکوو هەزاران و ملیۆنانی دیکەی گرتووی بێگوناهی کۆن و نوێ لەم دنیایە بێسەروبنەدا هەم عەدالەت و هەم مەسڵەحەت لە بەردانیان هەیە. بەردانیان دەنگێکی باشی دەبێ لە هەموو کوردەواریدا. ئیتر لەم بابەتە قسەی پەندئامێزی دیکەم خستە سەر لایەنی بەرژەوەندبینییەوە کە هەمووی ڕاست بوون کەڵکیشیان دەبوو ئەگەر سیاسەتی «عولیا» بیسەلماندبایە و دەستی پیسیش نەیشێواندبایە. عەبدولکەریم بێ موناقەشە سەلماندی. دواتر کە هەڵستاین، لەبەر دەرگەکەی ژووری لێ دانیشتنمان کە لیوا عەبدی چاوەنۆڕی زەعیمی دەکرد، بە لیوا عەبدیی گوت ئەو گرتووانە بەربدرێن و دەشبێ عورفی قوتابییەکان بپارێزێت.

لەو دانیشتنەدا تەواوێک لەسەر حاڵوباری ناوچەی کوردنشین و وەزعی براگەورەکان دوام. ڕێم خۆش کرد بۆ قسەیەک کە دەبوو بیکەم. مەعلووم بوو کە حکوومەت دەزانێ کاوانییەکان چوونەتە لای عەباساغا، نەدەکرا مەسەلەکە لە ژێر پەردەدا

بهێڵمەوە چونکە دەبووە خۆ لێ دزینەوە کە بێمتمانەیی ڕادەگەیەنێت. گوتم ئەو کاوانیانە پەنایان بۆ عەباساغا بردووە. لە دوو ڕووەوە پەنادانیان بە خراپ نازانم، یەکیان ئەوەیە کە عادەتی عەشیرەت لەو بارانەدا داکردنی پەنابەر بە نیشانەی مەردایەتی دادەنێت کە ئەگەر گوێی نەدرایێ دەبێتە مایەی ناوبەدی و سەرشۆڕی. دووەم ئەوەیە کە پەنادانیان بۆ بەرژەوەندی سەلەبەری ناوچەکە چاکترە لەوەی ببنە ڕێگر و چەتە بەسەر ئاواییەکانەوە و هێمنی بشێوێنن. لە ڕووی مەسڵەحەتەوە چ لە حەپسدا بن و چ لای عەباس بن فەرق نییە. عەبدولکەریم قسەیەکی خۆی خستە سەر پەندیارییەکەمەوە هەتا بڵێی زیرەکی و ڕوەتپارێزیی حکوومەت و ڕەچاوکردنی برایەتیی ئەو سەرۆکانەشی تێدا بوو، گوتی کەسیش لێ داوا نەکردووە دای نەکات خەبەریشی نەدراوەتێ کە ئەمانە لە حکوومەت پشت ڕێن ئیتر بۆچی پەنایان نەدا وەک دەیان و سەدان مێوانی دیکە کە بە عادەت ڕوو لە قۆناغی عەشیرەت دەکەن. ئەم شکست هەڵبەستنەوە لە عەبدوڵکەریمەوە دەلالەتی زێدە بەهێزی تێدا بوو بۆ حەز کردنی بە نزیک بوونەوەی عەباس و هەموو سەرۆکەکان.

لەم بابەتە سەرێشانە بووینەوە گەیشتمە ئاستەنگێک. ڕۆژی پێشووتر عوبێدی مەلا مستەفا هاتە لام لە زاری باوکی و مامییەوە پێی گوتم کە هەردوویان داوا دەکەن بچمە لایان. پێم گوت ئەگەر عەبدولکەریم ڕێ نەدات چ سوودێک لە چوونی من پەیدا نابێ. لەو دیدەنییەدا باسی داخوازییەکەی شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفام کرد کە بچمە لایان. گوتی بە فکری خۆت بۆچی داوات دەکەن. گوتم وابزانم خۆیان بە جێی گلەیی دەزانن لەلایەن زەعیمەوە، دەیانەوێ پاکانەت بۆ بکەن. گوتی بە تەلەفۆن قسەیان لەگەڵدا بکە، «بلە» تەلەفۆنی لێیە. گوتم ئیشی ئەوتۆیی بە تەلەفۆن هەڵنابڕێتەوە. سەری خوێنەر نەیەشێنم مەسەلەکەی وەها پێچایەوە کە ئەگەر پاتەوپاتیش نەبێ لە مەعنادا ڕێی پێ نەدام بچمە لایان.[47]

---

47- دەبێ دان بەوەدا بهێنم کە دەبوو هەر نەبێ یەکێکی متمانەپێکراوم بە نهێنی هەناردبایە لای شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا کەوا هەرچەند ناتوانم بچمە لایان ئەمما دڵنیابن لەوە کە هەرچی چالاکییەکی من هەیە لەو بەینەدا بۆ بەرژەوەندیی گشتییە و ئیمکان نییە کورد دۆستایەتی حکوومەت بکات ئەگەر حکوومەت سوور بێ لەسەر ناحەزی کردن بەرانبەر بارزان و حیزب. ڕاستییەکەی فیکرەکەم بە دڵدا

پاش وتوویژی هەمەلایی و فرەبابەت لێمی پرسی، چەند ساڵە لە حوقووق دەرچوویت؟ گوتم شازدە ساڵە. گوتی شازدەساڵ مودەتێکی موناسبە بۆ محامی ببێتە وەزیری عەدل. ئەو ڕۆژانە وەزارەتی عەدل بێ وەزیر بوو بەتاڵ مابۆوە. من لە وەڵامدا گوتم «سيادة الزعيم» نامەوێ موخالیفی خوایيشتت بم زۆریشت سپاس دەکەم لەسەر لوتف و متمانەی پێم دەکەیت بەڵام ئەگەر بە خواییشتی خۆم بێت وەها بە باش دەزانم لە دەقی ئێستاکەمدا بمێنمەوە تا بتوانم بە ڕەهایی بجووڵێم. عەبدولکەریم بە ڕوویدا دیار بوو چاوەنۆڕی ئەو وەڵامەی نەدەکرد، بەڵام هیچ ئیلحاحی نەکرد و بۆ مەسەلەکە نەگەڕایەوە. من لەو وەڵامەم ئەوە نەبووم وەزارەت بەهەند هەڵنەگرم بەڵام لێم سوور بوو کە ببم بە وەزیر لە نەزەر خەڵقدا منیش دەبمە حکوومەت و متمانەی جارانم پێ ناکرێ.

بە لای حیسابی خۆمەوە موشکیلەی عەشیرەتەکان گەلێک گرنگتر بوو لە بوونم بە وەزیر و گزیر، ئەگەر ئەو تەکلیفە دوای چارەسەر کردنی گرفتەکەی ئەوان بایە قبووڵم دەکرد. ڕەنگ بێ پێشم خۆش دەبوو چونکە هەر نەبێ کێشەی گوزەرانی لە کۆڵم دەکردەوە. زۆر جاران لەم مەسەلەیەدا برادەر پێی گوتووم دەبوو هەڵوەستەکەم بە چاکی بۆ عەبدولکەریم ڕوون بکەمەوە، بەڵام وا دەزانم بەوەدا پتر تووڕە دەکرد چونکە بێگومان لێی قورس دەهات بگوترێ بەشداری کردن لە وەزارەت کە عەبدولکەریم خۆی سەرەک وەزیرانە دەبێتە هۆی متمانە پێ نەکردن بەو کەسە لەلایەن خەڵقەوە. بەهەمەحاڵ لەو دەمەدا ڕەفتاری نەگۆڕا، جارێکی دیکەش لە مەسەلەی هاتنی سەرۆکەکان بۆ لای گوتی دێنە لای برایان. کە کۆبوونەوەمان تەواو بوو مورافیقێکی خۆی بەگەڵ خستم کە گەشتێکی «قناة الجيش»م پێ بکات.

---

هات بەڵام هێند یەک تەن بووم و ئەوەندە ناحەز و خەبەر لێ دەرم هەبوون نە دەپەرژام بە هەموو لایاندا پەل بهاوێژم و نە ئیمکانیش هەبوو پێوەندی نهێنی لە منەوە بەو دوو سەرۆکە زلە بە نهێنی بمێنێتەوە. بەخێر بگەینە قۆناغی دوای عەبدولکەریم تەجرەبەیەکی وەهام لێ دەخوێنیتەوە باوەڕ بە قسەی ئەم قۆناغەم بکەیت. بە هەمەحاڵ چەندێکی عوزری گەورەش مانیع بووبێت، ئەو پێوەندی نەکردنە کاری خۆی کرد و هەوڵەکەی منی پووچاندەوە.

ئەو قەناتە لە سەرەتاکانی دەست پێکردنیدا بوو، ئەوەندەی شیاوی دیتن بوو تێیدا گەڕاین و من چوومەوە ئۆتێل.

وابزانم هەر لەو سەفەرەدا مەحکەمەی عورفی بۆ دیتنی دەعوا قوتابییەکان چوو بۆ سلێمانی، منیش چووم و لە موحاکەمە حازر بووم. ئەو تاکە شایەدەی کە باسم کرد لەسەر ئیفادەکەی کۆنی ڕۆیی بەڵام لێم ڕوون بوو چی دەگوت هەڵبەسترابوو. دەمودووی شایەد و تێک هەڵدایی دەمی شەڕەکە کەوا زەحمەتە هەر بۆ یەک کەس دەرفەتی دیتنی ڕووداو ڕێک بیەخێت لە یەکدی دەوەشانەوە. شایەدی بێ درۆ هەرگیز بەو وردییە هەڵسوکەوتی قەڵەبالغی ئەوتۆیی وێنەکێش ناکات. لە مورافەعەمدا ئەو ئایەتەم هێنایەوە کە دەڵێ: «یا ایها الذین امنوا ان جاءکم فاسق بنبأ فتبینوا ان تصیبوا قوما بجهالة فتصبحوا علی مافعلتم نادمین».

مورافەعەی ئەو جارە بەسەر چوو بەڵام سەروبەری دەعوای ئەوتۆیی درێژخایێنە. تێکڕای حەپسەکان بە قوتابی و عەمەلەوە دەبوو تەحقیقی جودایان لەگەڵدا بکرێ و زۆر جاران وەها دەبێ بۆ شتێکی بچووک بەغدا دەگەڕێتەوە سەر سلێمانی وەیا شارێکی دیکە. تەحقیقاتی جینائی دەور دەبینێت. بەڵگە بەیەکدی دەگیرێن. سەرت نەیەشێنم هەویرەکە ئاو خوازە. دوایین جار کە مەحکەمەی بۆ کۆبۆوە ڕۆژی (وابزانم) چوار یان پێنجی تەمووز بوو، بە تەما بووم دەعواکە کۆتایی پێ بێت. حەبسەکان لە سلێمانییەوە هێنران بۆ بەغدا. من لزوومم نەدیت خۆم بچمە دەعواکە چونکە هەموو شتێکی تەواو بووبوو کەچی مەحکەمە دەعواکەی تەئجیل کردبوو بۆ بیستوسێی تەمووز. کە خەبەرم پێ گەیشت زۆرم لێ گران هات، تاڕادەیەکیش ترسام لەوەی عەبدولکەریم سیاسەتی خۆی بەرانبەرم گۆڕیبێت. چوومە لای لیوا عەبدی لە خۆوە چۆنیەتیی دەعواکەی پرسی گوتم، تا ئەو جەلسەیە بە باشی ڕۆیی بەڵام تەئجیلی بێلزووم بۆ بیستوسێی مانگ چی تامێکی خۆشی لێ نەهات چونکە بەتەما بووم بڕیاری تێدا دەربچێت. لیوا عەبدی گوتی، فڵان دڵنیابە ئەگەر حوکمیش بدرێن مەرسوومی جمهوریيان بۆ دەردەهێنم. گوتم، پاشا حوکم درانیان دەنگێکی ناخۆش دەداتەوە، مەرسووم زەرەرەکە تێناهێنێتەوە. کە وەهام گوت بانگی مورافیقی کرد گوتی تەلەفۆن بکە لەگەڵ شەمسەددین سبەینەی شەمموو زوو بگاتە لام. ئەو ڕۆژە پێنج شەمموو بوو. ڕۆژی شەمموو لیوا عەبدی بە عەقید شەمسەددینی گوتبوو دەبێ پێش چواردەی تەمووز بڕیاری مەحکەمە دەرچێت. شەمموو حەفتی

مانگ بوو. لە هەشتی مانگ شەمسەددین بەرقیەی لێ دا بۆ سلێمانی کە حەپسەکان بهێننەوە بەغدا. ڕۆژی نۆی مانگ گەیشتن. لە دەی تەمووز تەبریە کران. وا بزانم لە هەموو عومری عورفی و دادگەی عێراق کاری ئەوتۆیی نەکرابوو.

خوێنەر لێم بسەلمێنێ بەلای حکوومەتەوە خۆشتر بوو داوای مڵک و پارەم کردبایە لە جیاتی ئەو ئیشە زێدە نامەئلووفە. دیسانەوە لێم بسەلمێنێ چی لەو مامڵەتە بە من گەیی هەر بایی مەسرەفی سەفەری تێروپڕی دەکرد. خۆ ئەگەر مڵکیشم فرۆشتبایە وەک کە مەڕەکانم فرۆشت دەبوو چی کردم هەر بیکەم. بە عومری خۆم سەپانی پووش بووم. من لە باسی دەعوایەکە نەختێک ماوەی زەمانم بڕی بۆ ئەوەی دواتر بۆی نەگەڕێمەوە.

پاش دیدەنییەکەم لەگەڵ عەبدولکەریم گەڕامەوە بۆ کۆیێ لەوێوەش چووم بۆ ڕانیە. چی گوترابوو و کرابوو بە درێژی گێڕامەوە. بە عەباسی مامەنداغام گوت، لە پەنادانی کاوانیەکانی زەعیم پاکانەیەکی وەهای بۆ کردی بە خەیاڵدا نەدەهات. گوتی ئەوەی لە مەسەلەی ئەحمەداغاشی کرد لە بەغداوە بێ ئەوەی ئەحمەداغا خۆ بەدەستەوە بدات ئەوراقیان سووتاند (بە ڕاستی ئەوراقی دەعوای ئەحمەداغایان ئیعدام کرد کە ئیتر وەک نەبووبێ وەهای لێ هات) بۆ کەسی دیکەی نەکردووە. گوتی من خۆم ئەمری گرتنم بەسەرەوە بوو، مەلا مستەفا تکای بۆم کرد هەتا نەچوومە دیفاع ئەوراقیان دانەخستم.

هاتینە سەرباری چوونیان بۆ لای عەبدولکەریم قاسم کە چاوەڕێیانە. زۆر زۆر بەداخەوە و سەد جاران حەیف و مخابن عەباساغا عوزری هێنایەوە گوتی من پێم ناکرێ سەفەر بکەم وەکیلێکم دەنێرم. من پێم دانەگرت لەسەر چوونی بۆ لای زەعیم چونکە یەکسەر زانیم لەلایەنێکەوە پێی گوتراوە نەچێتە بەغدا و ئەو لایەنەشی بەلاوە گرنگترە لە ڕەزامەندیی زەعیم وەیا لە چارەسەر کردنی گیروگرفتی برادەران و ناوچەکەشی. تا ئەو دەمە چ هێمایەک لە هیچ کەسێکەوە دەرنەکەوتبوو وەها ڕابگەیەنێ کە ناچێتە لای زەعیم. ئێمە کە کەوتینە سەر تێفکرین لە چارەی ئەو بێ پێوەندییەی سەرۆک عەشیرەتەکان لەگەڵ حکوومەت ئەوپەڕی ئومێدمان بریتی بوو لە سەردانی موتەسەڕیفی سلێمانی، چ جایی ئەوەی بە خەیاڵی عەبدولکەریمدا بێین.

بەهەمەحاڵ لەو دەمەڕا کە عەباساغا ئەو قسەی درکاند من هەرچی گەشبینی هەبوو لێم بوو بە بەدبینی، بەتایبەتی چونکە لەو دیدەنییانەدا کە لەگەڵ زەعیم دەدوام چەندی موناسەبە هاتبێت هەر باسی دڵسۆزی و ئارەزوومەندیی سەرۆکەکان بۆ زەعیم بوون، لە زەعیمیشەوە بەخێرهێنان و خۆشامەدی بووە، ئنجا ئێستاکە چۆناوچۆنی «انسحاب فنی» بکەین؟ چاکم لە بیر نییە لەو دەمەدا کە عەباساغا عوزری هێنایەوە من چیم گوت و خەڵقەکەش چی گوت بەڵام هەرچی گوترابێت لە منەوە هەر نەپسانی داوەمووی معاوییە بووە. دواتر هەر لەو سەفەرەدا ئەوانی دیکە تێیان گەیاندم کە ئامادەن بچن بۆ لای زەعیم با عەباساغاش لەگەڵ نەبێ بەڵام من مەسەلەم خستە مۆڵەتەوە بەڵکوو جۆرێکی دیکە دەبێ. ئەمەم لەگەڵ تێکڕایان بوو، لەگەڵ کەسی مەحرەم حەقیقەتی فکر و دەروونی خۆمم وەدەرنا.

من لەو باوەڕەدا بووم - کە ئێستاکەش هەر بە ڕاستی دەزانم - نەهاتنی عەباساغا بۆ لای زەعیم جگە لەوەی ڕیسەکەمان لێ دەکاتەوە خوری، زنجیرەی ئاڵقەکانی عەشایەریش کەرت دەکات و دەبێتە دوولایەنی وەیا دووبەرەکی. ئەو لایەنەی عەباساغای تێدا دەبێت چونکە مەرحەبای زەعیمی هەڵنەگرتۆتەوە بە کوردپەروەر و وەتەنی دادەندرێ، کەس نایێ حیسابی دوور و قووڵی ساڵ و دوو ساڵ و قەولوبڕیەی چەند مانگی دوایین لێک بداتەوە و بڵێ ئەی کۆمەڵەی عەباس دەبوو لەسەر قسەی خۆتان بن. لایەنەکەی دیکە بڵێت و نەڵێت بە دژی کورد و خزمەتکاری بەغدا دەزاندرێت، ئنجا بۆ گوزەران کردن یا دەبێ ڕۆژ لە ڕۆژ پتر خۆ بداتە پاڵ زەعیم و بەگژ لایەنی دیکەدا بێتەوە یان دەبێ بە شەرمەزارییەوە پاشگەز ببێتەوە لە زەعیم.

من هەوڵی ئەساسیم ئەوە بوو کە لە ڕێگەی گرووپە عەشیرەتێکی سەد هەزار کەسییەوە برادەریمان لەگەڵ بەغدا ببێتە هۆی نەپسانی پێوەندی لە نێوان بەغدا و کورددا چونکە نزیکە بڵێم کوێریش دەیدیت بەردەوامبوونی حاڵوباری سیاسی - پاش تێکچوونی بەینی زەعیم و حیزب - لە کوردستاندا دەکێشێتەوە بۆ پێک کەوتنەوە و هەرا.

لەم نوختەیە ئەوەندە دڵنیابووم هەتا ئەوەی کە دیدەنیی زەعیم تەگەرەی تێکەوت، بە باقر دجێلی-م گوت ئەگەر پێت دەکرێ خۆت ڕزگار بکە چونکە ئەم وڵاتە حەسانەوەی تێدا نەما. باقر بۆی ڕێککەوت بوو بە وەزیری بەلەدیات.

لێرەدا پێویستە بۆ خوێنەری ڕوون بکەمەوە کە من لە کولانەی ڕەخنە لەخۆگرتنەوە بۆ ئەو ڕۆژانە دەچمەوە، لە پلەی یەکەمدا مەبەستم هاویشتنی تیشکێکە بۆ سەر هەڵس و کەینوبەینی حاڵوباری ناوخۆیی کورد. چ بێگانەیەک نەهات سددیق بەگ بکوژێت وەیا جەریدەی حیزب بهاوێتە سەر ناحەزی لە ئاست بزووتنەوەی عەشیرەتەکان بۆ چارەی ئەو کێشانەی لە چاکیی شەڕی چینایەتییەوە بۆیان مابۆوە لە لایەکی دیکەشەوە من کە گەشتی ژیانم خورد بکەمەوە لە پێشەوە ئەو ڕووداو و خەریکبوون و سەرێشەی کە دەرکزای وڵاتەکەمە و دەستکردی هەڤاڵەکەمە و لەمپەڕی ڕێبازەکەمە دەبێتە مەرەکەبی نووسینم، دواتر دەگەمە نائاشنایەک کە هەر لە پێناو گرفت و ناگزووری شێواویی ماڵ و حاڵی لەنگەربەزیوم پێی دەگەم وەیا لێی دەپارێمەوە وەیا یەخەگیری دەبم. ئێمە ئەگەر فێڵ لە خۆمان نەکەین چ گلەییمان نییە لە کەسێک و لایەنێک و هەوەسبازێک وەیا خاوەن نیازێکی لە دەرەوەی جغزی کوردایەتی بەپێی تێگەیشتنی خۆی وەیا بۆ مەبەستێکی بە بەرژەوەندی دەزانێ وەیا لە ناحەزیی ڕووتەوە وەیا بە مزە و کرێ لەگەڵمان دڕدۆنگ و لێمان تاسپە.

لە ئاست بێگانەدا گلەیی کردن، بارتەقای بە سازی ئەو هەڵپەڕین، عەیب و شوورەییە. من و تۆیەکی لەسەر سوودی کورد کۆنەبینەوە و یەخەگیری یەکتر ببین تا ئەوەی ئەگەر دوژمن بە پارەی کڕیبن لەوە بەدتر نەبین، چۆناوچۆنی گلەیی دەکەم لە شەریکەی نەوت وەیان شۆڤێنییەکی بێگانە وەیا سیاسەتێکی عەبدولکەریم بە چاکەی خۆی دایبنێت. من ئەگەر بەڵەدی سوودی کورد بم دەبێ بەپێی لوان و دەسەڵات خۆم لە نیشانەی تیری ئەوانە لابدەم و تا پێم بکرێ ڕێبازێکی مەسڵەتی بگرمە بەر کە لە سنووری خۆ پاراستندا ڕقی ڕەقهەڵگرتوو بنیشێنمەوە نەک دوژمنی تازە بخەمە سەر هی کۆن کە دەزانم بە زەحمەت پێم دەکرێ لە چەنگاڵی ڕزگار ببم چ جایی پێی بوێرم.

بەر لە هەموو شتێک دەبێ خۆم بدۆزمەوە لەو نەزەریانەی بۆ حیسابی خۆی لەگەڵ خەڵقم بەشەڕ دەهێنێ و لەگەڵیشم شەریکی شەڕەکە نابێ. تیۆری «تناقض» خەفە بکەم لە نێوان کوردەکە خۆی چونکە تەناقوزی کورد لەگەڵ دوژمنانی کورد هێند خەستوخۆڵە لزووم نییە بۆ زێدە مەزە سددیق بەگی بۆ بکوژێت وەیا پژدەر و کۆیەی تێدا بەشەر بهێنیت وەیا عەمەلەی قوڕکێش لە ساحێب سواغ هار بکەیت.

عەبدولکەریم سیاسەتێکی دەگێڕا لە هەوەڵەوە، بەخەیاڵی خۆی، قەومییەکانی عەرەبی پێ پەککەوتە کرد. دوای ئەوان شیووعییەکانی خستە قەفەسەوە. بەدەم ئەم بەند و بەست کردنەوە دیمواکراسیشی خستە قاڵبەوە تا ئەوەی محەمەد حەدید-یش حیزبی خۆی پێچایەوە کە زانی سوود لە حیزبایەتیدا مرێندرا. نۆرەی ماڵ خاوێنکردنەوەی گەیشتە بزووتنەوەی قەومی کورد. منێکی تاکە کەس بە دەسەڵاتی زێدە کەمەوە کەوا بەرێکەوت وەیا لە ئاکامی وردبوونەوە و هەستی ئازادەوە فەلاکەتی ڕووبەڕووبوونی کورد لەگەڵ هێزی دە ئەوەندەی خۆی ببینم هەر ئەوەندەم پێ دەکرا کە کردم لە یاریدەدانی عەشیرەتەکانی کورد بۆ یەکگرتن بە نیازی موراجەعەی حکوومەت نەک یەخەگرتنی. دواتریش کە عەبدولکەریم بە دوایدا ناردم هەلم وەرگرت لەوەدا دەرگایەکی دۆستایەتی لە نێوان ئەو و عەشایری سێ چوار قەزای کورددا بکرێتەوە کە ئەگەر بە وەستایی و بێ سڵ کردن و گوماناوی بوون بتوانین تێوەی بڕۆین ڕەنگە عەبدولکەریم بێتە سەر باوەڕ کردن بەوەی سەرشکێن کردنی کورد بێلزووم بێت خۆ ئەگەر لە ئاکامدا پرۆژەکە سەری نەگرت لە خۆم بەولاوە کەسی تێدا زەرەرمەند نابێت، شەڕ و هەرا و کوشتن و بڕینیش لە خۆوە دەستی هەموو کەس ماچ دەکات.

من کە دیتم عەبدولکەریم ڕێی نەدام بۆ دیدەنیی ئەو دوو برایە بڕۆم زۆر چاک دەمزانی چی لە دڵدایە و بە نیازی ملانێ و تێک ئاڵان خۆی دزییەوە لە کردنەوەی ئەو دەرگەیەی کە ڕووی بە لای ئاشتیدا بوو، بەڵام ئومێدێکم مابوو بەوەی کە ئەگەر ئەو سەرۆک عەشیرەتانە بە خۆیان و دۆستە بێ ئەژمارەکان لە تێکڕای عەشاییری کورد کە بەر لە ساڵێک پێکەوە ئەرزوحاڵیان ئیمزا کردبوو، ئومێدم هەبوو بەوەی ئاشت بوونەوەی عەبدولکەریم لەگەڵیاندا لەوانەیە دەرگای داخراوی دۆستایەتی بکاتەوە وەیا هەرنەبێ دەرگای شەڕ کە جاریێ داخراوە بە داخراوی بمێنێتەوە هەتا خواوراستان، هەلێکی لە بار وەیا داخوازی ڕۆژگار وەها دەکات هێمنی و ئاشتی خۆی بسەپێنێ بەسەر هەمواندا.

بە کورتی و کرمانجی من بۆ بەلاوەنانی شەڕم دادەبڕی بەڵام سێ شت دەستی منی بەند کردبوو:

- یەکیان ئەوە بوو کە هێزی سەربەخۆی خۆمم لە پشتەوە نەبوو دەبوو بە هێزی برادەران بچمە سەر تەختەدامەی سیاسەتی عێراق بەوەندە هۆش و بژێوە عەقڵییەکەی کە هەمبوو.
- دووەمیان ئەوە بوو مامڵەتم لەگەڵ عەبدولکەریم-ێک بوو کە وەک سەرامەدێکی جیهانی سێیەم باوەڕی بە «أوحدية» و شێوە پێغەمبەرایەتییەکی خۆی هەبوو. ئیتر چەند بە زەحمەت دێتە سەر ئەو باوەڕەی کە مەزنایەتی و گەشەداری و ناو و شۆرەت و شەخسییەتی بنوای بێهەرای خۆشی و ئاشتی، مرۆڤانەتر و سوودبەخشتر و بەردەوامتر و بەلەزتتریشە لەو نەڕەنەڕەی بەدوای «سحقناهم شذر مذر» دا دێت.
- سێیەمیان ئەوە بوو کە دڵ و دەروونی پڕ گومانی سیاسەتمەداران لە کوردستانەکەی خۆماندا (و هی هەموو جیهانی سێیەم) هەرگیزاو هەرگیز نەیدەویست وەیا نەیدەتوانی باوەڕی خۆی بە دڵسۆزی و نییەت پاکی و بەرژەوەندبینی و کوردپەرستیی یەکێکی وەکوو من دەرببڕێت کە لە ڕێچکۆڵەی تایبەت بە خۆی هەنگاو هەڵدێنێت.

لە نموونەدا دەڵێم، چەندێکی ویستم عەباسی مامەنداغا بێتە سەر ئەو قەناعەتە کە من لە بەرژەوەندی کوردایەتیدا فەرقی خاڵەکانم لەگەڵ ئەو و سەرۆکێکی دیکەش ناکەم بێسوود بوو، چونکە ئەگەر لە دڵدا ئەو باوەڕەشی هەبوو بێت قەت حەزی نەدەکرد هەنگاوێکی وەها زلی ڕێککەوتن لەگەڵ عەبدولکەریمدا بە هۆی منەوە بێت نەکا خاڵەکانم لە ئاکامدا لە خۆی بە پێش بکەونەوە. نەک هەر عەباس بگرە زوربەی هەرە زۆری ئەو سیاسەتمەدارانەی کورد کە ناو و مەرکەزیان هەبوو تێشکانی گشتییان بەلاوە کەمتر تاڵ بوو لەوەی «قارەمانەتی»ی لە کوردەواریدا بۆ کەسێک بێت کە بە هی خۆیانی نازانن تا ئەوەی لەم بابەتەی پێ داگرتن لەسەر مافی نوێنەرایەتیی کورد نووسینی بە داک و بابیشم خوێندۆتەوە.

ئەم مافە تاڕادەیەک دەشێ ڕەوا بێت بەوەدا کە کەسێک یاخود لایەنێک ڕێبازی خۆی بە ڕاست بزانێ بۆ سوودی میللەتەکەی بەڵام کە هات و گەیشتە ڕەفز کردنی سوودی گشتییەکی لە خودی خۆیەوە، واتە لەو کەسە و ئەو لایەنەوە، نەکەوتبێتەوە لە نیشتیمانپەروەری و گەلپەروەری دەردەچێت و دەبێتە خۆپەروەری. موناسیبی جێگەیە بڵێم، دوای دەرچوونی ئەو گوتارەم کە لە تەمووزی ١٩٦٠ لە

«الحرية» بڵاوکرایەوە ڕەخنەی بەهێزی تێدا بوو لە خەتی مارکسایەتیی ناو ڕابەرایەتیی پارتەکەمان، لەگەڵێک لاوە هەوڵ دار من حیزبێکی سەربەخۆ دانێم بەڵام من لە هەمان گوتاردا دەرم بڕیبوو کە بێهێز کردنی حیزب لە هەر کەسێکەوە بێت گوناهێکی بێبەخشینە. من کە بڵێم هەبوونی کەرتێکی چەپ لە کوردستاندا چونکە بزووتنەوەی کوردی دابەش دەکات کارێکی ناجایەزە چۆن دێم برێک لەو بزووتنەوەیە دادەبڕم. ئەگەر زوربەی کورد بە دوامدا هاتبایە تا ئەوەی لە واتای کەرت کردنی دەرچووبایە جێی خۆی بوو باوەڕ کردنم بە ڕاستبوونی ڕێبازەکەم حیزبێکی تازەی پێ دانابمایە کە ئەوسا نەک من، بەڵکوو کەمایەتییەکەی کە لەگەڵمدا نابێ، دەبێتە دابەشکەر و هەڵبڕەوە.

باوەڕت هەبێ کە دەڵێم، شتی ئەوتۆیی لە وەهم و خەیاڵیشدا نەڕسکا و نەگوورا ئەگەر بەڕاست و دروستیش کەوتبایە ناو لەپی دەستمەوە دیسان دەمدایەوە ئەو لایەنەی کە شەرعییەتی بزووتنەوەی کوردایەتی میراتی خۆیان بوو بە مەرجێک بۆ تاکە ئامانجی کوردایەتی قاڵ بوونایە. من خۆم دەناسم بەرپرسبوونی شتی گەورەم پێ هەڵناگیرێ چونکە ناتوانم خەڵق بۆ ئاستەنگان هەڵدێرم کە دەزانین سیاسەتی ئەم جیهانەی سێیەمە نزیکە بریتی بێ لە خەڵق بە فەنادان، دەنا هیچ ئامانجێک لەوانە نابێت بەرەو پێک هاتن بێت. ئەم تەرزە بیر کردنەوە و ئاکار و ڕەفتارە لە منەوە بەقەد ڕۆژی چێشتەنگاوان ئاشکرایە بەڵام عەرب گۆتەنی «تعال فهم حجي احمد اغا».

دوور مەڕۆ، هەر لەم ڕۆژەی ئێستاکەماندا پاش ئەوەی کە مەعلوومی هەموو دوور و نزیکێکە کە بەپێی عەیارەی نیسبی لە خۆم دەستبەتاڵتر پەیدا نابێ و کەسیش لە من پتر بۆ سوودی گشتی بە سەراحەت نەدواوە، ئاخۆ چەند کەس لەوانەی جووتێکیان لە سیاسەت دەگەڕێ زمانی چاکم لێ دەگێڕن؟ جارێ «لسان الکرد» نەکەوتبوە بازاڕی فرۆشتن، هەر کوردەکە، تۆمەتی بۆ هەڵبەست و ئیخبارییەی لێ گەیاندە حکوومەت و بۆ ماوەیەک وەستێندرا. ئەمە بە نموونەیەکی بچووک باس دەکەم لە زنجیرەیەکی بەردەوام و بێپسانەوەی کاری ئەوتۆیی کە هێندێکیان مەرگی پێوە بوو. «اللهم اهد قومي انهم لا یعقلون!!» بەڵام با حاجی قادر گوتەنی:

بەسە ئەی خامە با ئەم باسە پەی بێ
وەرە سەر باسەکی وا فائیدەی بێ

بچمەوە بۆ لای ڕچەی گەشتەکەم. لەو مانگانەی پاش هەرای شەواف لە ناسیاوانم عیزەددینی مەلا ئەفەندی و زەیدی ئەحمەد ئەفەندی48 بەینێک گیران و بەردران. کاکە حەمەی خانەقا لە گەرمەی تێک هاویشتنی ١٩٥٩ خۆی دزییەوە و بە پژدەردا بۆ دەرەوەی وڵات ڕۆیی. دوای دامرکانی فڕکەی دەماران و کەرخبوونی نەڕەنەڕی بمرێ نەژی کاکە حەمە49 هاتەوە وڵات. با ئەو شایەدییەی لێ بگێڕمەوە دەیگوت ئەو پیاوەتی و خزمەتگوزاری لە پژدەرییەکانم دیت هی سەردەمی سوارچاکیی ئەورووپای کۆن بوو، هەر ئەوانن بەڕاستی گیانی عەشیرەتییان

---

48- گیرانی زەید ڕێکەوت و ڕەشبگیری نەبوو، عەسرێکیان چەند ئاغای پژدەری چوون بۆ دیدەنی عەبدولکەریم قاسم. کوردێکی ناسراوی ئەو دەمە خۆی بەگەڵ دان بە نامەی تەرجومان. کە جەماعەت لە دیدەنی عەبدولکەریم گەڕانەوە ئۆتێل، لێم پرسین ئەو کوردەی بوو بە تەرجومان چۆن بوو؟ گوتیان پاش تەواوبوونی وتووێژمان ئەو مایەوە لای زەعیم. هەر هەمان ڕۆژی دوای یەک دوو سەعات لەو مانەوەیەی کوردە ناسراوەکە لای زەعیم، زەید گیرا. من بە عادەت گوماناوی نیم لە خەڵک بەڵام ئەو کوردە کە بۆی ڕێککەوت بگاتە لای سەروی دەسەڵاتی سیاسی خەریک بوو بۆ ناوزڕاندنی هەر کوردێکی بەلای خۆیەوە لەوانە بێ ڕۆژەک لە ڕۆژان ببێتە مونافیسی. پێشتریش و بەر لە شۆڕشیش لە زەیدی دەبزڕکاند.

49- بەر لە بیست ساڵێک کاکە حسێنی خانەقا، کاکی کاکە حەمە، سەردانێکی پژدەریانی کردبوو، زیاتریش هی تایەفەی مەحمووداغا کە پێشتر لە تەنگانەیاندا سەید ئەحمەدی خانەقا بە هانایان هاتبوو. کاکە حسێن لە موناسەبەدا باسی وەزعی پژدەر و تایەفەکانی و سەروسۆراغی کۆنیان دەکات بە شکڵێکی شارەزایانە. کە لە قسان دەبێتەوە عەباساغای مەحمووداغا-ی سەرەک تایەفەی مەحمووداغا دەڵێ: وەک کاکە حسێن لە پژدەرییان گەییشتووە بەیتاڵ وا لە کەرێ ناگا. عەباساغا قسەزان و نوکتەباز و باخەبەرێکی دەگمەن بووە تا ئەوەی بابەکراغای سەلیماغا-ی مونافیسی عەباساغا لە بارەیەوە گوتوویەتی: لەو دەمەدا کە کاکەباس خەریکی ئەوەیە لە شەڕەسەگدا سەگ بە سەگەوە دەنێت پرسێکی بەرژەوەندی دەوڵەتی پێ بکەیت جوابێکت دەداتەوە جواب هەر ئەو جوابەیە.

تێدا مابێت. لە بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی میوانەتیی خۆی لای پیرۆتاغای حاجی ڕەسواغا، لە مەرگە، قسە خۆشەکانی خاڵ سەلیمی دۆم-ی دەگێرایەوە کە پیاوێکی ڕوحسووکی قەدرزانی مەجلیسئارا و زۆریش بەحورمەت بوو لای پژدەرییەکان، چەندێکی منیش دیتبێتم شیرنایی سوحبەتی ئەوم چێشتووە. لە بەراوردا ئەم خاڵ سەلیمە و حاجی سەلیمە کوردی کۆیێ کە دۆستی غەفوورییەکان بوو لەیەکدییان دەکرد بەڵام هەریەکەیان تامێکی خۆی دەدایەوە.

مامۆستا ساڵح ڕوشدی کوڕێکی دڵگەرم و مەیلی وەلای چەپدا بوو، لە شەقڵاوە بووبوو بە نائیب حاکم، لە وێڕا ئەمری گرتنی چەندها ناوداری کوردی دەرکرد کەوا نەک لە دەسەڵاتی خۆی بەدەر و لە سەڵاحیەتی دادگای شەقڵاوەش بەدەر بوون بەڵکوو لە دەرەوەی هەموو لیوای هەولێریش بوون. هێندێکیان دەستی چیا و دەشتودەریان گرت، هێندێکیشیان گیران و بردنی بۆ بەندیخانەی شەقڵاوە. خاڵە خدرم بڕیاری گیرانی دەرچوو، وەڵامی بۆ ناردم چ بکات گوتم بە دڵی خۆی بکات چونکە بە من ڕزگار ناکرێت ناچار چووە شاخ.

جارێکیان ساڵح ڕوشدی لە بەغدا دەگەڕێتەوە هەر بە ڕێوە بڕیاری گرتنی قایمقامی دەلتاوە دەردەچوێنێت. لە میاندا دووچاری کێشە هات. نازانم لە دواییدا چۆناوچۆنی لە کۆڵ خەڵق بۆوە. ئاکامی دڵگەرمی و تیژڕۆییەکەی ئەوە بوو چوو بۆ حیجاز و لە پەنا دەسەڵاتی ڕێجیمی شایەتی و لە سێبەری مەرقەدی پێغەمبەر خۆی حەساندەوە، تێروتەسەل نە بای پێدا هاتەوە و نە باران، لێی پیرۆز بێ. موشکیلە ئەوەبوو بۆ کەسێکی لە ترسی ڕوحی خۆی دەستی چیای بگرتایە دەبووە خائینی شۆڕش، هەتا دەفتەریشی دەخوێندرایەوە لەوانەبوو کەوڵی بچێتە دەباغخانە. کوردی گوتەنی «عەینەل مەترەق - واتە: أين المفر»؟

پاش ئەوەی مەعلوومم کرد ئومێد لەو عەشیرەتانە بۆ لایەنی چارەسەر کردنی گیروگرفتی ناوچەکەش بڕا، مەگەر لە کەلێنێکەوە شتی ئەوتۆ سەر هەڵبدات لە حیساباندا نەبێ، مایەوە خۆ وەخراندن و مۆڵەت بە خۆ دان ببێتە عوزری نەچوونی سەرۆکەکان بۆ لای زەعیم. لەو بەینانەدا حەزم نەدەکرد بچمە بەغدا چونکە ناڕاحەت دەبووم بە دەست بێعوزرییەوە. حکوومەت بەردەوام بوو لەسەر ناحەزییەکەی خۆی بەرانبەر حیزب، تۆمەتی کوشتنی سددیق بەگ وەپاڵ ئیبراهیم ئەحمەد درا کە ڕۆژنامەش، وابزانم، بە ناوی ئەوەوە دەردەچوو، ئەویش خۆی

شاردەوە و ڕۆژنامەش داخرا. ئەندامە چالاکەکان یەک یەک ئەمری گرتنیان دەردەچوو بەڵام بەر لە گرتنیان خەبەریان دەگەیشتێ و بۆی دەرباز دەبوون بەرەو کوردستان. وا دەزانم عەبدولکەریم پێی خۆش بوو هەموویان بچنەوە کوردستان تاکوو بە کۆڵەمستێک پاکیان بکاتەوە، بەڵگەی گەورەش ئەوەیە کە بەر لە چەند مانگێک مەلا مستەفا ئیزنی لێ خواست بچێتەوە ناوچەی خۆی ڕێی دایێ، خۆ دەیتوانی بە بەهانەیەک لە بەغدای گل بداتەوە.

عەبدولکەریم پێی خۆش بوو لە شکڵی قارەمانی سەر شانۆ چارەی کوردایەتی بکات. زۆر بە سەیری ناوی «الحنطة الكردية- گەنمی کوردی» گۆڕا بە «حنطة الشمال». ڕەشید عارف گوتی: «ئەدی «فجل كركوك» چ لێ دەکات؟» پاسەوانی هەولێر عەگالیان لەسەر نرا. تۆ سەیری ئەم بەشەرە بکە، لە لایەکەوە عەبدولکەریم دوژمنایەتیی جەمال عەبدولناسرِ و بزووتنەوەی «وحدوي» دەکات لە لایەکیشەوە عەگال دەخاتە سەروکەللەی چەند پاسەوانێکەوە، تەرازووی وەها لەنگ بە خەونیش دروست نابێ.

کە بۆ موراجەعەی دەعوای قوتابییەکان دەچوومە بەغدا سەری لیوا عەبدی-م دەدا. کابرا هەتا بڵێی حەزی بە هێمنی دەکرد بەڵام هیچی لە دەستدا نەبوو. لە سەری زمانییەوە و نابەدڵ پشتگیریی لە سیاسەتی عەبدولکەریم دەکرد لە دڵیشدا دەمزانی، هەست بە چی دەکات. هەرچەند بایی سەری دەرزی خواییشتی خۆم نەبوو، بە ناچاری دەبوومە ڕجاکاری دۆست وەیا ئەوەی پەنای بۆم دەهێنا. محەمەدی شێخ ڕەشید کە ئەحمەداغای لە دەستان هەڵاتبوو کاتی تەرفیعی نزیک بووبۆوە ئەمما ناوی نەخرابووە لیستەی تەرفیعەوە. خۆی زۆر شەرمن بوو،ساڵح خۆشناو هاتە لام و مەسەلەی باس کرد. بە لیوا عەبدیم گوت «الأحسان بالتمام» مادەم ئەوراقی ئەحمەداغا-شتان سووتاندوە و بە نەبوونتان داناوە - تا ئەوەی ئەحمەداغا هاتبووە لای زۆریشی ڕێز لێ نابوو - محەمەدی شێخ ڕەشیدی بێتاوان بۆچی سزا بدرێت؟ بێ سێودوو ئەمری دا کە تەرفیعی پێ بکرێت.

هەر لە سەروبەری گرتنی ئەندامەکانی حیزب بوو میرزای حاجی کەریم کە موعاوین تەسویە بوو لە هەولێر دوور خرایەوە بۆ ڕەمادی. بە لیوا عەبدیم گوت میرزا برادەرمە هەتا بشڵێی بە لای سەلامەتیدایە باوەڕناکەم لە ئەخباری درۆ بەولاوە هیچی دیکە هەبێ. گوتی دەڵێن ئەندامی حیزبە. گوتم من نازانم ئەندامە یان

نا ئەمما ئەگەر ڕاست بێ ئەندامە، دەبوو هیواداربن ئەندامی هەموو حیزبێک وەکوو میرزا بەرژەوەندبین بێت. خۆ حیزبایەتی بەکەس ناسرێتەوە. دەرحاڵ ئەمری دەرکرد کە میرزا بچێتەوە سەر وەزیفەکەی بەڵام هەوەڵ جار هێنابوویە لای خۆی و زۆری بەخێر هێنابوو، عوزر خوازیشی لێ کردبوو کە لە نەشارەزاییەوە دوورخرابۆوە گوتبووشی فڵانەکەس تۆی بە من ناساند.

میرزا هاتە لام لە ئۆتێل. گوتی ئەوەندەم پێ خۆش بوو کە لە حزووری کەمالی عوسماناغا لیوا عەبدی گوتی تۆ هۆی ڕزگاربوونمی. میرزا مرۆیەکی دڵ هۆشیار و ڕێزلەخۆناو بوو، تەنانەت کە دوور خرایەوە کەسی ڕانەسپاردە لام ڕجای بۆ بکەم.

گەیشتینە سەرەتای هاوینی ١٩٦١، پێشتر بە هەندێ کاربەدەستی وەکوو وەزیری زیراعەتم گوتبوو، بە مەسڵەحەتی دەزانم ئیسڵاحی زیراعی لەو ناوچانەی شاخاوی بۆ ماوەی ساڵێک بوەستێندرێ، لەوەشدا ئەوپەڕی ئیمکانی بەلاوە نانی تێک بەربوونی عەشایر و حکوومەتم ڕەچاو کردبوو، چونکە دەمزانی ئەو سەرۆکانە بە ئاسانی ناسەلمێنن چی مڵکی هەیانە ببێتە ماڵی حکوومەت، قایمقام و موتەسەڕیف و مدیر ناحیەش بە ئارەزۆی خۆیان بەم و بەوی بدەن، سەرۆکەکانیش لە مەزنایەتی دابەزن بۆ لە برسان مردن. قسەکەی من هەڵنەگیرایەوە. لە قەزاکان لیژنە دەرچوون بۆ تەخمینی بەرهەمی کشتوکاڵ. لە دەشتی کۆیێ کە لەلایەن مدیر ناحیەی تەقتەقەوە دەقرسا مەحموودی کاکە زیاد، بێ پرسی باوکی، لیژنەی ڕاونا بە ڕیسوایی بۆ تەقتەقی گێڕایەوە، خۆیشی بە تاقمێک چەکدارەوە دەستی چیای گرت.

من لە بەغدا بووم باسەکەم زانی و بیستمەوە پژدەر و ڕانیەش پشتگیری لەو گەنجە دەکەن و سەلەبەری ناوچە خەریکی خۆ تەیار کردن و ڕیز ڕێک خستنە. ئەگەر بڵێم ئەو هەڵگەڕانەوەیە لە حکوومەت ڕەنجاندمی هەموو قسەکەم ڕاست دەرناچێت. خۆویستی لە منەوە کە بنیادەمم و بە درەنگەوە دەبمە «ئەبوو زەرری غەففاری- ابو ذر الغفاري» لێ خۆش هێنام کە بۆ کاربەدەستانی حکوومەت ئاشکرا بوو چی پێشبینی لە منەوە کرابوو دەربارەی وەزعی نەفسی و ڕامیاری و ئابووری ئەو ناوچەیە بە ڕاست دەرچوو. لێرەدا جێی خۆیەتی پێشدەستی بکەم و بڵێم دواتر کە بە ناچاری لیژنەکان وەستێندران وەزیری زیراعەت تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی، وەک تۆ پێشنیازت کردبوو ساڵێکمان ئیسڵاح زیراعی لەو ناوچانە ڕاگرت. پێم

گوتەوە «بعد خراب البصرة» تازە چ تامی ما؟ من حکوومەت بم لە شەرمی ئابڕووچوون پێ دادەگرم لەسەر ڕاپەڕاندنی قانوونەکە.

ئەمە لەلایەن حەزی نەفسەوە بەڵام لێکدانەوەی هۆش و ژیری شتێکی دیکە دەڵێت. زۆر بە سەیری خەڵقی سەربە حیزبەکەمان و عەشیرەتەکانیش وەهایان بردبووە مێشکی خۆیان کە عەبدولکەریم ناتوانێ فەوجێک عەسکەر ببزێوێت و هیچی پێ ناکرێت. قسەکەش یەکجار منداڵانە بوو بەڵام هەتا لە ئاکامی تەجرەبەی تاڵ و تفت و خوێناوییەوە و بە ماڵکاولی و کۆست کەوتن، چرووکیی قسەکە دەرنەکەوێت هەر بەڕاست دەڕۆییشت، ئنجا ئەگەر هێزێکی غەیبی دەستی قودرەتی کردبایە مانیعی شەڕ هەر دەگوترا عەبدولکەریم هیچی پێ نەدەکرا. قسەی ئەوتۆیی وەک کە لە پێشەوە ڕاست نەبوونی بە ئیسپات ناگات دوای ماڵکاولبوونیش کەس هەوەسی ئەوەی نامێنێ بە دوای کڵاوی بابردوو بکەوێت. ئەمە دەڵێم و دەشزانم و دەشمزانی عەبدولکەریم خەریکی پلانی خۆیەتی بەڵام هەتا لە توانامدا بووبایە، بە ئومێدی مەوهوومیش بێ، دواخستنی شەڕم بە چاک دەزانی بەڵکوو....

نە من داوای دیتنی عەبدولکەریم-م کرد نە ئەویش ویستی بمبینێ. لەگەڵ «موحسین ڕوفێعی - محسن رفيعي» کە مدیر ئیستیخبارات بوو قسەم کرد چوومە لای لیوا عەبدی. تا ئەو دەمە بە چاکی دەرکەوتبوو کۆیە و ڕانیە و قەڵادزە دژی ئەو ئیسلاحی زیراعییە یەک دەنگ و یەک ڕان و لەسەر بەرهەڵستی کردن سوورن. وتوویژمان دۆستانە بوو، بەسەرِاحەت گوتم، یەک دڵۆپ خوێن لە بەیندا برژێ کەلەبەرێک پەیدا دەبێ پڕ ناکرێتەوە. بۆ پتەوتر کردنی هەڵوەستی خۆم هێمام بۆ پێشنیازی وەخراندنی ئیسلاح زیراعی ئەو ناوچانەم کرد کە بەداخەوە پشتگۆی خرا، گوتم ئەگەر حکوومەت ڕازییە بێ هەرا ئەم کێشەیە چار بکرێت من لە خۆم ڕادەبینم بتوانم چاری بکەم. گوتی فڵانەکەس بڕوات هەبێ هەتا لە ئیمکاندا بێ حەز دەکەین بە خۆشی و برایەتی مەسەلە چار بکرێت. گوتم مەرجی ئەساسیم ئەوەیە کەوا نە ئیدارەی هەولێر نە سلێمانی و نە قائد فرقەی کەرکووک تەدەخول نەکەن هەتا لایەک بە لایەک دەبێ، یان چارەی دۆستانە یان ئەوەی خۆتان دەیزانن. لیوا عەبدی بێوەخران هەولێر و سلێمانی و فیرقەی کەرکووکی تێگەیاند کە دەخلیان بەسەر ئەو وەزعەوە نەبێت و فڵانە کەس چی بیەوێ وەها بکرێت.

به لیوا عەبدی-م گوت، من تەنها ملازم عەبدولقادر زیاد «ضابط احتیاط» بوو له «دفاع» که برای مەحموودی کاکه زیاده به یارمەتیدەر قبووڵ دەکەم. گوتی بۆچی کەسی دیکه بەتەما بووه تێکەڵ بەم ئیشه بێت؟ من ناوی کەسم نەهێنا بەڵام دەمزانی کەمالی عوسماناغا که خۆی به بەرپرسی کاروباری کوردەواری دەزانی لای عەبدولکەریم به تەما بوو لەگەڵم بێت. ڕاستییەکەی له لای منەوه هیچ بەرهەڵستی نەبوو له هاتنی، بگره پێشم خۆش بوو لەگەڵمدا بێت چونکه ڕێککەوتنێکی که خۆی هاتوچۆی تێدا کردبێت پتر جێی پەرۆشی دەبێت و به چاکه لێی دەدوێت لای عەبدولکەریم. ئەوەی منی ناچار کرد بۆ دەربڕینی ئەو تێبینییه، شتێک بوو ئەگەر پشتگوێم خسبایه ڕێککەوتن دەبووه نامومکین چونکه عەباسی مامەنداغا جارێکیان به مەجلیس پێی گوتم هەر شتێکی کەمالی عوسماناغای تێدا بێت منی تێدا نیم. چ مەوداش نەبوو ئەو شتانه لەو ڕۆژەدا خورد بکەمەوه و دڵی کەمالی پێ بدەمەوه.

دەمەو عەسرێک من و قادری کاکه زیاد و شێخ فاتیحی خاڵه سەدر بەرەو کەرکووک بەغدامان بەجێ هێشت. پاش دەلتاوه سایەقەکه ڕێی هەڵه کرد بەرەو «بەلەد» ڕۆیی. شەو داهات هەر دەڕۆیشتین، سایەقەکەشمان دەیگوت ئەم ڕێگایه وەک بەری دەستی خۆم شارەزام. له پڕ ئۆتۆمۆبیلمان ڕاوەستا، تومەز بۆڕیەی بەنزینی بەرهەڵبووبوو هەتا ئیشکایی هات لێی ڕژابوو. گەڕاینەوه به پێیان بۆ لای خەرمانه دەغڵێکی پێیدا تێپەڕیبووین بەڵکوو ئاوێکی لا دەخۆینەوه. نه ئاو نه نان نه نوێن هیچی لا نەبوو توومەز وەکوو مارمێلکه دەژیا ڕەنگه له برسییاتیدا گوڵه دەغڵی گڵۆفتبێ و دەنکەکانی خواردبێ.. لۆرییەکی شفتیهەڵگر هات هەڵی گرتین بۆ دەلتاوه. خاوەنەکەی گەنجێکی باقووبەیی بوو تا بڵێی مەرد، له دەلتاوه مەسرەفی چایەخانەی دا و زۆری ئیلحاح کرد شەو لێی مێوان بین بەڵام عوزری نەتوانینمان هێنایەوه.

له ئۆتێلێک ڕامانبوارد هەر هەنده له بارەی خاوێنییەوه دەڵێم، سبەینێ بۆیه بێزم هات قۆندەرەم به چەرچەفی سەر قەریۆڵەکەی بسڕمەوه چونکه به شەو لەسەری پاڵ کەوتبووم. تەپۆی ئەوەنده زل و زۆری هەبوو نەیدەهێشت خەومان لێ بکەوێ. سبەینێ سایەقەکه چاری ئۆتۆمۆبیلەکەی کرد و بەڕێ کەوتین. له کۆیێ بیستم لەشکری پژدەر گەیشتۆته بەر دەربەند. پێش ئەوەی مەحمووداغا ببینم بێوەستان چوومه لای جەماعەت له ڕانیه و قەڵادزه. تێم گەیاندن که لیوا عەبدی دەسەڵاتی پێ داوم چارەی مەسەلەکه بکەم. لێم داوا کردن هەموو بزووتنەوەیەک ڕابگرن.

سەردانی قەڵادزە و شێخ حەسەنی حاجی سەید و هەندێک لە ئاغاکانم کرد ئەوانیش پێیان خۆش بوو. بەشێکی لەشکری پژدەر تا بۆسکێن هاتبوو، تاقمی عەباساغا و سمایلاغا و ئەنوەر بەگیش ئامادە بوون. ڕاستییەکەی لێم نەپرسین لەشکرەکەیان بۆ کوێ و بۆ چییە.

بە دیار خەبەرێکی بۆیان دەنێرمەوە خێرا گەڕامەوە کۆیێ. وەڵامم بۆ مەحموداغا نارد کە دەمەوێ بیبینم، وەڵامی موافەقەی ناردەوە بۆم. سبەینێ من و عەبدولقادر چووین لە دووراییی دوو سەعات ڕێگایەکی سواری، لە بناری شاخ دیدەنیی یەکترمان کرد. پێم گوت فلانکەس هەتا ئەم سەعاتە کارێکی کردووتە بەرژەوەندی پێوەیە، بەدڵیش حەزم کرد لە مەیدانی عەشیرەتگەری تۆش کە کۆییت ناو و شۆرەتی سەرۆکەکانی ڕانیە و پژدەرت هەبێ. ئەم بزووتنەوەیەت لەم ڕووەوە کاری خۆی کردوە. بەڵام چی دیکەی بە دوادا بێت بەرژەوەندی تێدا نابێت. لە هەموو ڕوویەکەوە وەزعم بۆ ڕوون کردەوە. وەڵامی دامەوە گوتی چ بە چاک دەزانی بە قسەت دەکەم بەڵام وەها مەکە زمانکورت دەربێم لای هاوپەیمانەکانم. لەم لایەنە متمانەم پێ دا و گەڕامەوە کۆیێ.

خەبەرم دایە گرووپێ ڕانیە، جێگایەک دیاری بکەن لێی کۆ ببینەوە بۆ وتووێژ و مەسڵەحەت لێکردن. «گردجان»یان ڕەچاو کرد کە ماڵی سمایلی سواراغای لێ بوو بۆ کۆبوونەوە، لە ئێوارەیەکی دیاریکراودا، کە چوومە دیوەخانی سمایلاغا هەرچی بەردەر و پژدەر هەیە کۆبوونەوە، ئەندامانی لیژنەی کۆیە و ڕانیە و نازانم کوێش هەمووی حازر بوون. بە نان خواردنەوە هەتا دوای سەعات ١٢ی نیوەشەو خەریکی قسە و بەرژەوەنددۆزی و گیروگرفتی هەمەچەشنەی ناوچەکە و بەولاتریشەوە بووین. لیژنەکان پێیان خۆش نەبوو ڕێککەوتن هەبێ، بەڵام بێدەنگ بوون. لە ئاکامدا هەرچی سوێندخۆر بوون پەسەندی تەجرەبەی ڕێککەوتنیان کرد. بڕیاریش درا مەحموداغا هەر ئەو شەوە لەگەڵ مندا بێتەوە کۆیێ و سبەینێ بچێتە لای قایمقام کە ئیتر ئەسەرێکی ڕاونانی لیژنەی مدیر ناحیەی تەقتەق نەمێنێ. بڵاوەی لێ کرا بەو ئومێدەی کە من دوای چوونم بۆ بەغدا و ئاکامی دیدەنیم لەگەڵ لیوا عەبدی خەبەری چەندوچۆنییان پێ بگەیەنم.

سبەینێ لەسەر وەعدە بە قەڵەباڵغی چووین بۆ لای قایمقام. من هەرچەند دڵنیا بووم لەوەی حکوومەت نیازێکی نهێنی نییە مەترسیی لێ بکەم، قایمقامیش، «رعد مشحن

الحردان»، لە بنەماڵەی عەشیرەتی و برابچکۆڵەی «محمد مشحن الحردان»یش بوو کە بەیەکەوە هەواڵی حوقووق و نیابەتیش بووین لەگەڵ ئەمەشدا هەمووم تێگەیاندن کە سەر و دەمانچە لە بن جلکیان ببەستن تا ئەگەر نیازێکی گوماناوییان بەدی کرد لە حکوومەت دەست نەپارێزن. قایمقام لە حەدبەدەر بەخێری هێناین.

زۆری نەبرد موتەسەرڕیف بەدرەددین عەلی تەلەفۆنی لەگەڵدا کردم گوتی حەز دەکەم ئەم جوامێرە ببینم تەنها بۆ دیتن هیچ نیازێکی دیکەم نییە. پێم گوت، خۆت دەزانی لە بەغداوە بە چ مەرجێک من بەرپرسیاری ئەم ئیشە بووم، سوێندی بە ناموسی خوارد کە دڵ لە دڵی نەدەم. بۆ سبەینێ لەگەڵ مەحموود چووینە هەولێر، یەکسەر ڕێیان بۆ چۆڵ کردین تا ژووری موتەسەرڕیف. بەینێک لای ماینەوە بە وەعدەی خۆی وەفای کرد و تەنها دیتنی مەحموودی مەبەست بوو. وەهام لە بیرە کە گەڕابێتمەوە کۆیێ ئنجا چووبێتینە بەغدا.

بەرەی چەپ لە کۆیێ وەکوو لیژنەکانی پارتیی ئەو ناوە، حەزیان لەو ڕێککەوتنە نەکرد چونکە بە تەما بوون تێکچوونی عەبدولکەریم لەگەڵ بەرەی قەومی ناچاری بکات بە ئاشتبوونەوە لەگەڵ ئەواندا. دواتر دەرکەوت ئەم ئومێدەیان بێجێ بوو.

لە بەغدا بێوەخران چوومە لای لیوا عەبدی، خوێنەر باوەڕی هەبێ کە ئەم پیاوە لەو مەسلەتییە وەکوو گوڵ گەشابۆوە، پڕ بە دڵ شکرانەبژێریی خوای دەکرد لەسەر ڕەوینەوەی تەگەرەی وەها زل. هەموو موشکیلەکانی ئەو ناوەم بۆ باس کرد بۆ هەمووشی چارەی ئاسان هەبوو. چەند ڕۆژێک خەریک بووین بزانین سەرجەم ئەم گیروگرفتانە چەندی مەسرەف پێویستە و چۆناوچۆنی سەغڵەتیی ژێرئاوبوونی زەوی و زاری دەوری گۆمی دووکان چارە بکرێت. بە حیسابێکی دڵفەراحانە مەسرەفی بە پەلە لە نیو ملیۆنی تێنەدەپەڕاند، گەلێک موشکیلەش لە بنەڕەتدا پارەی لزووم نەبوو وەک فەحسی تووتن کە غەدری تێدا نەکرێ وەیا تەعدیلی قانوونی تەسوییە بۆ سەر باری جارانی وەیا بەهەند هەڵگرتنی خوێندن و سەقافەتی کوردی. بە دوا ئەمانەدا خێرایی کردن لە تەعویزی ئاواییەکانی دوو گۆمی دووکان و دەربەندیخان کە شتێک بوو بە ئەستۆی حکوومەتەوە بوو بێ ئەوەی لزووم بکات بە نووکە چەقۆ بیری بخەیتەوە.

نوختەی هەرە گرنگ کە هەنگاوی قۆناغی پاش ڕێککەوتنەوە بوو بریتی بوو لە بەرتەرەف کردنی ناکۆکیی نێوان حکوومەت و نوێنەرانی کوردایەتی. لەمیاندا پشووی درێژتر گەرەک بوو، چەندێکی ناویشیم دەبرد لیوا عەبدی دەیگوت «بتیسیر الله - ئەم تەگەرەیەش بە خۆشی چار دەکرێت». گەشە گەشە و خۆشی خۆشیی لیوا عەبدی لە کاردا بوو، هەردووکمان سەرگەرمی «حساب الفرح»ی ئاشتی و هێمنی بووین، قەزای ناگەهان لە حەشارگەی خۆیدا خەریکی بڕیارێک بوو دژی هەموو گەشبینەکانمان. لەپڕ بێ ئەوەی لایەنی لیوا عەبدی و موحسین ڕوفێعی ئاگادار بن عەبدولکەریم فەرمانی گرتنی هەموو سەرۆک عەشیرەتەکانی دا. عەبدی بە پەلە بوو لە هاتنی مەحموود بۆ لای، من مۆڵەتم دەخواست تا لەو حیسابانەی بەردەستمان دەبینەوە، تومەز عەبدولکەریم بێ ئەوەی خۆی لە ئیشی لیوا عەبدی هەڵقورتێنێ لێکدانەوەی خۆی دەکرد.

من نازانم و نەمزانی چ پرووشکێک بوو قاوی سەبیلی هەڵکرد، بەڵام دڵنیام لەوەی کەمالی عوسماناغا دەستی هەبوو لە تیژ کردنەوەی چەرخی چەخماخی سەبیل هەڵکردنەکە. دەزانم بە ئاسانی ناچێتە دڵانەوە بڕیاری وەها گرنگ و پەیوەست بە چارەنووسی وڵاتێکەوە بە لێک خشاندنی دوو چیلکەی ناو دەستی کەمالەوە پرووشکی سووتێنەری لێ هەڵبەزێتەوە بۆ گەلەخەرمانی وڵاتێکی وەک عێراق. قەتیش ناڵێم تۆی بڕیارەکە بە دەستی کەمال تێچێنی دەروونی عەبدولکەریم کرا. بەڵام دەبێ بزانین عەبدولکەریم مرۆیەکی بابەت «هەوایی» بوو. لە سێ ساڵی ڕابوردوودا گەلێک هەڵوەست و پۆزی کە وەریدەگرت ڕەنگی توخمی شانۆگەرییان پێوە دیار بوو کە حاڵەتێکە لەسەر بنگەی باری دەروون هەڵدەستێ نەک بەرژەوەند و لێکدانەوەی قووڵ. پیاوی وەها لەوانەیە بە قسەیەکی ناخۆش بڕیارێکی گرنگ بدات یان لە بڕیارەکە دابەزێت.

لێرەدا دیسانەوە پێشدەستی دەکەم بۆ ڕوون کردنەوەی پایەی کەمال لای عەبدولکەریم. پاش نەمانی عەبدولکەریم بە چەند ساڵێک لەگەڵ موحسین ڕوفێعی چووینە ئەحواڵپرسیی لیوا عەبدی لە خەستەخانەیەکی بەغدا بە نەساغی بەسەری دەبرد. قسە ڕۆیشتەوە بۆ وەزعی عەبدولکەریم، هەموو ئەو بارە نالەبارەی کە من دەمدیت لە کردەوەی ئەوتۆیی کە لە پیاوی سیاسی دوور بوو بگرە لێی نەدەوەشایەوە ئەوانیش لێیان بەدی کردبوو لە منیش چاکتر ئاگاداریان بوو، تا قسە

گەیشتە دەسەڵاتی کەمال هەردووکیان شتی وەهایان لێ گێڕایەوە عەقڵ نەیدەسەلمان. موحسین ڕوفێعی گوتی، لای خۆی من مدیری ئیستیخبارات بووم وەها دەبوو کاری گرنگ داخوازی دەکرد بچمە لای، دوو سەعات و سێ سەعات لە ژووری مورافیق دادەنیشتم بە دیار ڕوخسەت دانمەوە کەچی کەمال بێوەخران و بەو پەڕی ڕەهاییەوە لێی دەچوە ژووری.

بگەڕێیەوە بۆ مێژوو، نەک لە کتێبی دیراسە و فەلسەفەی مێژوو بەڵکوو لە یاداشتی پیاوە مێژووییەکان دەبینی لە بۆ خاتری دۆستێک ببێتە سەفیر وەیا ناپۆلیۆن لە پێناو خزم و برای شەڕ و گێچەڵی ناوەتەوە. عەبدولکەریمیش بنیادەمە کۆمپیوتەر نییە، لە ناپۆلیۆنیش پتر ئەسیری ئەوە بوو پێی دەڵێن Mood. لەگەڵ ئەمەشدا دەوری کەمال زۆر بێ یان نەبێ تازە کار ناکاتە ڕۆژگاری تێپەڕیو، بەڵام لەلایەن خۆمەوە باوەڕم هەیە بەوەی گوتم.

لیوا عەبدی بە ڕوویدا دیار بوو ئیشەکەی لە دەستدا شکا بەڵام بە زمان بە لای عەبدولکەریمدا دەچۆوە، چوونەوەیەکی نابەدڵ. خەبەر گەیشت کە وەزعی وڵات شێواوە و هەموو عەشیرەتەکان لە حکوومەت پشترێ بوون و ڕێوبان لە ڕووی حکوومەت بەستراوە. ئەوەی لێی دەترسام و دەمەویست کوردستانی لێ ڕزگار بێت بە تووشەوە بوو ئنجا وەرە شانەی بۆ هەڵبگرە.

لەگەڵ لیوا عەبدی کە هەرچی بمانگوتبایە و بمانکردایە ئەسەرێکی بنەڕەتی نەدەبوو لە کاکڵ و ناوەڕۆکی بڕیار و خواییشتەکانی عەبدولکەریم، بە دەست خۆمان نەبوو لەوە دەدواین ئاخۆ چ ئیمکان هەیە شەلەگەیەکی لابەلا بخرێتە گۆمی پەنگاوداوی دڕدۆنگی و گومان لێکدی کردن و لێک پڕبوونی ئەو چەند مانگەی دوایی بەڵکوو هەر نەبێ بناوانەکە بە تەواوی نەڕمێت. وەهامان پەسەند کرد کە من
سەرەتاتکەیەک بکەم لە ناوچەکە و نەبزێکی ئەو خەڵقە بگرم. بێگومان من لە عەبدی گەلێک سەغڵەتتر بووم چونکە هەرچی خۆشم دەوێت کەوتە مەترسییەوە.

بە ئاگاداریی لیوا عەبدی هاتمە سلێمانی. موتەسەڕیفی بۆ دانەندرابۆوە دوای باقر دجيلي، معاون موتەسەڕیف جێگری بوو. لە ژوورەکەی ئەو، یوسف ئەلنەقیب و حسێن شێروانی، مدیر ئەمن بوو، و یەکێکی دیکەش کە لە بیرم نەماوە کێ بوو حازربوون، قسە لەوە دەکرا چ بەرژەوەندێک مومکینە کە لەو وەزعە بدۆزرێتەوە.

پێشنیاز کرا نوێنەرانی حکوومەت بچنە ڕانیە و قەڵادزە، منیش بچم، بۆ تێکگەیشتن لەگەڵ ئەو سەرۆکانە. وەکیل موتەسەڕیف گوتی من ناتوانم بێم هەتا ئەمری گرتنیان نەوەستێندرێ. لە ژوورەکەی ئەوەوە تەلەفۆنم کرد لەگەڵ لیوا عەبدی و تێمگەیاند «الوضع مستفحل» وەکیل موتەسەڕیفیش هەتا ئەمری گرتنی سەرۆک عەشیرەتەکان لەلایەن تۆوە تەئجیل نەکرێ لە خۆی ڕانابینێ پێوەندییان پێوە بکات. گوتی هەر ئێستا بە بروسکە ئەو ئەمرەی دەگاتێ. تەلەفۆنەکەم دایە وەکیلی موتەسەڕیف هەتا یەکسەر لەگەڵ لیوا عەبدی تێک بگەن.

ئەو مەئموورە زلانە جانتای سەفەرییان حازر کرد و بە دیار بەرقیەی حاکم عەسکەری عامەوە دانیشتن. بەرقیە نەهات و نەهات. تومەس لیوا عەبدی نەیدەزانی لەو ئیشەدا هیچ دەسەڵاتێکی بۆ ڕەچاو نەکرابوو، لە هیچ سەروبەرێکی نە تەنها پرسی پێ نەکرابوو بەڵکوو ئاگاداریش نەبوو. بێگومان و سەد جار بێگومان کەمالی عوسماناغا گەلێک لە ئەویش و لە موحسین ڕوفێعی-ش ئاگادارتر بوو.

هەڵگیرسانی سەرلەبەری ئەو هەرێمە لە سۆنگەی دەرچوونی فەرمانی گرتنی سەرۆک عەشیرەتەکانەوە دەرسێکی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری لەگەڵدا بوو بۆ چاوێکی بیویستبایە ڕاستی و واقیع لە خۆی نەشارێتەوە. ئەو هەموو ناودارانەی حیزب و ئەندامە چالاکەکانی فەرمانی گرتنیان دەرچوو، هەبوو تێیاندا گیراشن، هیچ کەس گوێی پێ نەبزووت و دنیای بۆ نەورووژا، کەچی چوار پێنج «اقطاعي» کە ساڵەهای ساڵ بوو مێشکی خەڵق لە دژیان دەئاخندرا و یاسای «تەسوییە» و «ئیسڵاح زیراعی» و ئامانجەکانی شۆڕشی چواردەی تەمووزیش خەریکی بە هیچ دانانیان بوو، بەرانبەر فەرمانی حکوومەت ڕاست بوونەوە دنیایان بە دوادا هات.

حیزب کەوا جگە لە هەندێ لیژنەی محەللی بەولاوە لە بەرنامەیدا نەبوو هەڵستێتە سەرپێچی و یاخیگەری ناچار ما لە ترسی ڕووتانەوە باوەش بەو هەڵکەوتەدا بگرێت. تا ئێستاکەش ڕێکاری بۆچوون و بیرکردنەوەی جەماوەر هەر وەهایە. لە نموونەدا دەڵێم شێخزادەیەک لە هەولێر بە کارەساتی ئۆتۆمۆبیل تێدا چوو دەیان هەزار ڕەشوڕووت و فەلاح و عەمەلە و توجار و کاسبکار، جگە لە هەموو حکوومەت، بە دوای جەنازەیدا ڕۆیی. ئەدیبێکی سەربە چەپ لە هەولێر لە ناکاتدا مەرگ پێچایەوە تاکوتەرای ئەو خەڵقەی لەگەڵدا چوو بۆ گوڕستان. هەر دوو ڕووداو هی ١٩٨٧ بوون، منیش لێرەدا ئەم تێبینییە لە شەوی نێوان ڕۆژی یەکەم و دووەمی مارتی

١٩٨٨ دەنووسم، سێ دەقیقەی لاداوە لە سەعات یەکی پاش نیوەشەو، هۆشێکیشم لای گرمەی تەماپێبووی مووشەکی ئێرانە داخوا، خوا چەپەرەمان بدات، کەی دەتەقێتەوە.

پاش ئەوەی ڕووی دا و باسم کرد لە پسانی «مووی معاوییە»ی نێوان حکوومەت و سەرۆک عەشرەتەکان هیچ ترووسکە نەما نەکوژێتەوە لەوانەی من بە بەرچاوی خۆممدا دەهێنان و بە ئومێدی پووچەڵ فتیلم هەڵدەکێشان.

لە یەکەم دیدەنیم لەگەڵ عەبدولکەریم تا ئەو ڕۆژەی کە دەبدەبەی یاری پێکردنی مندالانە بە نووکە دەرزی ئەو بڕیارە عەنتەرئاکارەی گرتنی سەرۆکەکان فشایەوە، من ئەوەندە ماندوو بووم و هێندەم پشوو خواردبۆوە و زێدە مەسرەفم بە ملدا هاتبوو چی دیکە بە بەرەوە نەمابوو هەڵیگوشم. چوومەوە کۆیێ و بێدەخل لێی دانیشتم. بە ناچاری، دوای هەندێک پاشماوەی مەشغەڵەتی ئەو چەند مانگە دەکەوتم وەک مەسەلەی محاکەمەی عورفیی سەربە قوتابییەکان.

ڕاستییەکەی ئەگەر وردبین بین لە دیار کردنی مێژووی ڕووداو دەبێ سەرەتای شێواوی و ئاژاوە و بگرەببەستە لە هەڵستانی مەحموودەوە دەست پێ بکات نەک یازدەی ئەیلوول. ئەو ڕۆژە دەستنیشانەی ئەیلوول سەرەتای بزووتنەوەی لەشکر و فڕۆکەکانی حکوومەتە. ڕەنگە یەکی حوزێران لە باربێت بۆ ئەو مێژووە.

دەیانگوت بەدرەددین عەلی بە عەبدولکەریمی گوتبوو ئەو یاغییانە ڕێگای هاموشۆی نێوان شارەکان دەگرن. عەبدولکەریم گوتبووی «الشعب فی إنطلاق...» تۆ بڵێی زەعیمیش و بەدرەددینیش ئەگەر دەفتەری غەیبیان خوێندبایەوە و دواڕۆژیان تێدا دیتبایە دەبوو ئەوە بکەن کە کردیان؟ لە زۆر باردا «حتمیة»ی ڕووداو لە دەروونی مرۆڤ دەزێتەوە نەک لە زاڵبوونی داخوازیی واقیع بەسەر ئیرادەی مرۆڤدا. لیوا عەبدی دەسەڵاتی هەبایە «حتمیة» شتێک دەبوو زۆر جودا بێت لەوەی ڕووی دا...

لەو هاوینەی ١٩٦١ ماڵی ئێمە و ماڵی مامم وەکوو هەموو هاوینێک چوونە چنارۆک، من لە کۆیە مامەوە، قەت وەها نەبووە ماڵی ئێمە لە کۆیێ دوای چوونمان بۆ چنارۆک چۆڵ بووبێت، بایی ئاوەدانیی دەرگە کراوەیی خەڵقی تێدا بووە بەڵام ئەو ساڵە دوای تێکچوونی عەشیرەتەکان لەگەڵ حکوومەت هەمیشە شوێنی وەک چنارۆک وێڕای ماڵەکانی ئێمە و خاوەن ڕەز و باغەکان چەکداری عەشایری تێدا

دەبوون، زۆریشیان کە ناسیاو و هێندێکیان خزمیش بوون دەچوونە مەجلیسی دایکم لە ژێر کەپرە تەقلیدیەکەی قەدپاڵی گردی «هۆبەی مەلایان» کە پێشی دەگوترێ گردی «دارتێلان» چونکە خەتی تەلەفۆنی کۆیە و ڕانیە لە سەرووی شاخەوە دەهات هەتا دەگەیشتە دارتێلێکی تۆپەڵەی گردی پشت کەپرەکانەوە، لەوێوە هەتا ناو باغەکان تێل وەکوو ڕست، بێ دارتێل، بە هەواوە سەرەژێر دەبوونەوە.

ئەو دۆست و خزمانە کە جارێ گەرمەتەریق بوون لە چەک هەڵگرتن دژی حکوومەت دەیانگوت بەوەندە سوێند و قورئانە مانگێک نابا عەبدولکەریم ڕجا لە فلانەکەس دەکات بۆ چارەسەر کردنی ئەو نا... ڵیەی کردی. وەی کە «ئامین»م دەکێشا لەو دوعایە نامەقبووڵە. کوردستانەکەمان، وەها بزانم، بە خڕی بووە مەیدانی چەکداری عەشایر.

لێرەدا بەر لەوەی دەرفەتی قسەییێکم لە دەست بچێت و نەتوانم بۆی بگەڕێمەوە دەڵێم من کە زووتر گوتم عەباسی مامەنداغا سەربە لایەنێک بوو نەک هەر لە خۆوە ئەو هەڵوەستە نەگونجاوەی لەگەڵ بڕیارە گشتییەکانی پێشوو هەڵبژارد، لەو دەمانەدا جارێ بەڵگەم نەبوو هەر بە لێکدانەوە گەیشتبوومە ئەو قەناعەتە، دواتر لەم و لەو بە فسکە و قسەی ژێر لێو پترم بۆ ڕوون بۆوە هەتا بەر لە سێ چوار مانگێک لە ڕێکەوتدا مامۆستا حیلمی شەریف گوتی لە دەمی عەباساغای بیست کە بەفەرمانی لە خۆی گەورەتر چەکی هەڵگرتووە و ڕێی هاتوچۆی حکوومەتی بەستووە. بە تێڕادیتەیی ئەم شایەدییەی مامۆستا حیلمی-م بە پاڵپشتی بۆچوونە کۆنەکەی ساڵی ١٩٦١ ی خۆمم هێنایەوە، دەنگیشم نەدەگەیشتە مامۆستا حیلمی ئیزنی لێ وەربگرم.

## ئاڵقەی چواردەیەم

سەرکێشیی لە عەشایر و حیزبەوە بەردەوام بوو، حکوومەتیش لە ڕوواڵەتدا هەڵوەستێکی نایەتی «سلبیة» هەبوو بەڵام دەمزانی دەقەومێت و خراپیش دەقەومێت.

لەو هاوینەدا نزیکبوونەوەم لە شێخ ڕەئووفی خانەقا، لە کەرکووک، بە نیازی خزمبوون کێشایەوە بۆ خوازبێنیی کچە گەورەکەی. ئەم هەنگاوە کە مەسرەف بە دوا خۆیدا ڕادەکێشێت وەهای لێ کردم پتر هەوڵ بدەم بۆ دەرامەد لە ڕێی محاماتەوە. ئەو ساڵە هەتا ڕۆژی ١١/٩/١٩٦١ کە لەشکر بزووت و بۆمباردمان دەستی پێکرد شەش هەزار دینارم لە محامات بۆ هات. نابێ خەیاڵیش بۆ ئەوە بڕوات کەوا ڕەنگە پێوەندیم بە عەبدولکەریمەوە دەخلێکی بەو دەرامەدوە هەبووبێ. بەدڵنیاییەوە دەڵێم دۆستایەتیم لەگەڵ عەبدولکەریم لەلایەن مەسرەفەوە بە گران دەکەوت لەسەرم. بە نموونە، ئەو ٣٥ کەسەی کە لە بەندیخانەی کەرکووک بە ڕجای من بەربوون سەد دیناری خستە کیسمەوە لە بری مەسرەفێکی کردم کە لەو سەفەرەدا دووسەد دیناری تێپەڕاند، ئەو سەد دینارەش کاکە حسێنی خانەقا و کاکەی حاجی مەحموود بە تەقیە و شەرمەوە بە ناوی کاڵەکدرانە هێنایان منیش بە شەرمەوە لەبەر حورمەتی ئەوان وەرمگرت دەنا کەس نییە پیاوەتیی وەها گەورە بە پارەی وەها کەم بفرۆشێت. زەیدی ئەحمەد ئەفەندی ئاگاداری مەسەلەکە بوو، نیوە نوکتە و نیوە ڕاست، دەیگوت، دەعوای وەهام لەبۆ بێ پێی دەوڵەمەند دەبم...

هەرچۆنێک بێت دەردە ئەزەلییە میراتییەکەی بەزینی لەنگەری دەرامەد و مەسرەف نە ئەوسا و نە لە هیچ پلەیەکی عومرمدا ڕەهای نەکردووم، نە پەرۆشیشی لێ دەخۆم نە ئەگەر سەرلەنوێ بە ژیاندا بێمەوە ڕێبازگۆڕی دەکەم:

شاهی کە نەبێ ڕادەبوێرین بە فەقیری
بۆ ئەهلی قەناعەت لە پڵاو خۆشترە داندووک

مەحامات و مەشغەڵەتی عادەتی و سەروبەری خوازبێنی سەفەری پێ دەکردم بۆ هەولێر و کەرکووک و بەغدا و سلێمانی. لە سەفەرێکی سلێمانیم یەک سەلاجەی نەوتی و یەک میانەی تەوریزی ٣ بە ۴ م کڕی بەمەرجێک لە دە مانگدا نرخەکەیان پێ بدەم. ئەوسا میانەی تەوریزی بە هەشتا دینار بوو، نرخی سەلاجەکەم لەبیر نەماوە. کارەبای کۆیێ «دی سی» بوو سەلاجەی نەدەگێڕا.

هاوین وردە وردە خشکەی بەرەو پاییزی دەکرد، دنیاش بێسەروبەر تەلەزگە بەستوو بوو، خەڵقیش بە دیار قەزاوقەدەرەوە چاوی دەزەقایەوە. لەلایەن چەکهەڵگرنەوە هیچ ڕێگە نەبوو سەربە خۆشییەوە بنێت وەیا چارە بدۆزێتەوە وەیا چەک فڕێ بدات.

گەیشتینە ئەیلوول، ڕەنگە سێی ئەیلوول بوو لە بەغدا دەگەڕامەوە شەو لە کەرکووک مامەوە. لە نادیی زاپتان لەگەڵ یەک دوو زاپتی کورد دانیشتین لە باسی ئەو حاڵوبارە دەدواین. زۆرم پێ سەیر بوو زاپتێکیان کە کۆیی و کۆنە برادەری قوتابخانەی سەرەتاییشم بوو بێباکانە لە بێهێزیی جەیش دەدوا تا ئەوەی چارەسەر کردنی فڕۆکەکانیشی بەلاوە زۆر ئاسان بوو. من لەو وتووێژە گوێگر بووم پتر لەوەی بێژەر بم، چونکە چ دەسەڵاتیشم نەبوو فەرقێکی نەدەکرد باوەڕم پێی کردبایە یان نا. دواتر دەرکەوت ئەو گەشبینییە هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو.

ئێستاکەش لە بیرم نەماوە چۆناوچۆنی بوو لەگەڵ قائیدی فیرقەی دوو و موتەسەڕیفی کەرکووک بە شەو لە نادی زاپتان کۆبوومەوە. من هیچ کامیانم نەدەناسی و پێشتر نەمدیتبوون، لە ساڵانی دواتردا زانیم موتەسەڕیف سەید عەبدولڕەززاق سەید مەحموود بوو کە ئەویش عەسکەری بوو. لە ساڵی ١٩٦٣ ش بووبووە موتەسەڕیفی سلێمانی. باوەڕت هەبێ لە دەمی دانیشتنمان نەمدەزانی کامیان قائیدە کامیان موتەسەڕیف، چونکە هەردووکیان جلکی سویلیان لە بەردا بوو بەڵام ئەوان منیان باش دەناسی. من بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵوەستی حکوومەت، هی جەیش بەتایبەتی، ئەم دیدەنییەم کرد، بۆ ئومێدێکیش بە دڵمدا دەهات بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەکی ئاشتبوونەوە.

لە قساندا تێگەیشتم کە بەو زووانە جەیش دەبزوێ بەرەو کۆیە و ڕانیە و هەر شوێنێکی پێویست بێ. بۆم دەرکەوت هەر ئەوەندە دەسەلمێنن کە کەسێکی بیەوێ سەلامەت دەرچێ لەو گرووپەی چەکیان هەڵگرتووە دەتوانێ لەم دوو سێ ڕۆژەدا

خۆی بکێشێتەوە ئەگەر ئارەزۆشی بوو بێتە کەرکووک موتەسەڕیف و قائید فرقە ڕێزی لێ دەنێن. لەم بوارەوە بۆ قسەیەک چوون زانیم باشم دەناسن، گوتیان خاڵەکانت و دۆستی دیکەت کە قسەت بیانگاتێ با فرست نەدۆڕێنن، ئێمە چی چاکەی ئەوان بێت وەعدی شەرف بێت وەها دەکەین.

من چونکە دەمزانی خاڵەکانم و کەسی دیکەش ئامادەی هەنگاوی ئەوتۆیی نین، خۆیشم بە وەهمدا تێنەدەپەڕی تەکلیفی ئەوتۆ لە کەس بکەم، لەو دوو کەسەم نەپرسی ئێوە چۆناوچۆنی دەتوانن پەنای کەسێک بدەن کە لەلایەن زەعیمەوە فەرمانی گیرانیان دەرچووبێت، ڕێشی تێدەچوو قائد فرقە وەیا موتەسەڕیف لە باری وەهادا بە نامەی بەرژەوەندی ئاسایش دەسەڵاتیان پێ درابێ. من تەنها ئەوەندەم لێ پرسین هەتا چەند ڕۆژی درێژە مۆڵەت هەیە بۆ هەوڵێکی ئەوتۆیی؟ وابزانم پێنج ڕۆژیان مۆڵەت ناو هێنا.

سبەینێ چوومەوە کۆیێ یاتاغی بێئومێدیم لێ ڕایەخست و لە خەفەت خواردن نەبێ هیچی دیکەم نەکرد. لەو ڕۆژانەدا کە حکوومەتی ناوشار دەسەڵاتی نەمابوو لەبەر چەکداری حیزب و عەشیرەت، لەگەڵ کاکە زیاددا زوو زوو سەری قایمقام «رعد مشحن الحردان» مان دەدا. ماڵەکانمان لە چنارۆک هاتبوونەوە شار.

ڕۆژی دەی ئەیلوول دەمەو عەسر تەیارەیەکی مۆدێل کۆنی تەنبەڵ بەسەر شاردا تێپەڕی و بەیاننامەیەکی هەڕەشەی فڕێ دا بە هەزاران نوسخە، کەوا سبەینێ لەشکر بەرەو کۆیێ دێ، هەر بەرهەڵستی و دەست کردنەوەیەک بەرانبەر لەشکر بکرێ شارەکە کاول دەبێت. بەیانیی ڕۆژی یازدەی ئەیلوول لە بانی کۆشک جارێ بەسەر چارپاوە ڕاکشابووم ڕۆژیش گزنگی نەدابوو دیتم لە لای ڕۆژاوای جنووبییەوە دوو تەیارە وەکوو دوو برا داهاتنە زەوی و دووکەڵی تەقەمەنیشیان بە دوایانەوە شریتەی پێچەڵ پێچی دەکێشا. زانیم ئەم هێرشە بۆ سەر نوختەی تەفتیشی چەکدارەکان بوو کە لە سێ کیلۆمەتری شارەوە بەسەر سێڕییانی هەولێر و کەرکووک و کۆیەوەیان ساز دابوو. یەکسەر ڕاست بوومەوە دەنگی خەڵقم دا کە لە سەربانان نەمێنن نەکا بێلزووم ببنە ئامانجی شەستیری فڕۆکەی گێچەڵاوی. نەختێک بێباکی وەیا نەشارەزایی سەری کێشایەوە بۆ ئەوەی پیکەپێکی کۆمەڵە کرێکارێکی سواربوو بوو لە ڕۆخ شارەوە بۆ سەر ئیشی خۆیانی دەبردن تەیارەیان گەیشتێ و گوللەبارانی کردن عەمەلەیەک کوژرا. بەمەدا خەڵق ترسی ڕێنیشت،

تەنانەت حەمە عەلی ئامۆزام لە سەربانی کۆشک چاوی لێ بوو تەیارەکە تەقەی کرد بەڵام پیکەپەکە بۆ حەمە عەلی لە نەدیودا بوو، لەو بەرزەوە بە دەنگی بڵند گوتی مەترسن ئەوە تەقەی ترساندنە، جارێ لە سەربان بوو خەبەر هات کە عەمەلەیەک کوژراوە و پیکەپ پێکراوە کاکە عەلی وەها ترسا بە زەحمەت لە قادرمان هاتە خوارێ. لەگەڵ کاکە زیاد ئەو ڕۆژەش بەینێکی تەواو لای «رعد» بووین. چەکدارەکان نوختەی تەفتیشیان چۆڵ کرد و بۆی دەرچوون چونکە تفەنگی هەناسە سارد چی پێ ناکرێ لەگەڵ تەیارەی میگ، مانەوەی چەکدار لە شوێنی خۆی، دوای ئاشکرابوونی، لە مردن بەولاوە چی دی پێوە نییە.

هێزێکی قەڵەبالّغی عەشایر لە دێگەڵە بوو، وەختێکی جەیشیان لێ نزیک بۆوە و چەند تەقەیەکی لێکردن هەموویان پایدۆستیان لێ کرد. شەوێ، دنیا تاریک بووبوو جەیش گەیشتە شار، ژنانی سەربە چەپ بە چەپڵەڕێزان بە خێریان هێنان، بەڵام مەرحەبای لێ نەکردن. من و کۆمەڵێکی کەسانی ماڵی خۆم و هی مامم و هەندێ خزمی دیکە لەسەربانی کۆشکی دیوەخانە بووین کە لە دەوروپشتی خۆی بەرزتر بوو گوێمان لە گڕەی زریلی جەیش و چەپڵەریزانی ئافرەتان بوو، حاڵەتێکی کەساسی ئەوتۆ دایگرتم خۆم بۆ نەگیرا، پشتم لە خەڵقەکە کرد ڕووەو هەیبەسوڵتان لەو تاریکییەدا فرمێسکی حەسرەت و بێدەسەڵاتی و هەستی شوورەیی کردنی ئەو چەپڵانە سەری کرد. تا ئەو دەمە تەجرەبەی وەها تاڵم نەدیتبوو. سەرلەبەری چەکداری عەشایر کە بەتەما بوون عەبدولکەریم دەخالەتیان پێ بکا وەها هەڵاتن نەبێتەوە. ئنجا ژنانیش بۆیان تەواو کردن بەو چەپڵە و هەڵهەلانە، وەهام دەهاتە پێش چاو کە کوردی دەڵێ پەردەی نامووس دادڕزا.

دوای یەک دوو ڕۆژ جەیش بەرەو ڕانیە ڕۆیی. عەسری ڕۆژی چواردەی مانگ «رعد» قایمقام هاتە لام، گوتی پێش هاتنی جەیش نەدەهاتمە لات نەوەک خەڵق لە سەرمی حیساب بکات بە ترسنۆکی. منیش بێ ئەوەی قسەکەی لێ بە داوێوە بکەم پێم گوت، لەوەتەی جەیشیش هاتووە لزووم نەما بە هاتنم بۆ لات بۆیە سەرم لێ نەدایت. چی لە کۆیە و ڕانیە ڕووی دا لە بەرگە نەگرتن و کۆڵدان نموونەی هەموو شوێنێکی دیکە بوو کە چەکدارەکانی بە گیانێکی گەرمی بێتەجرەبەیی و سادەییەوە دنیایان دابووە بەر داس. یەکەم تەقەی چەکدار لە جەیشیان کردبێت

ئەوەبوو خاڵە جنێدم و چەند کەسێکی خۆی لە ڕێگەی نێوان ڕانیە و دەربەندا بەری جەیشیان پێ گرت.

سڕی و خامۆشییەک وڵاتی داگرت، ئەوەندە هەبوو خوتبەکانی زەعیم کە پڕی «شذر مذر...» بوو گەرمی دادەهێناین. هەرچەند بارزانیەکانی خۆی ڕقی لێ بوون، چەکیان لە حکوومەت هەڵنەگرت، عەبدولکەریم بە فڕۆکە بۆمباردمانی کردن، بێگومان وەهای چووبووە دڵ کە ئەو چەکدارانە یەکجارەکی بڕانەوە، بەڵام حیسابەکە وەها دەرنەچوو.

یەکەم زەبری بە حکوومەت کەوت ئەوە بوو خەزێنەی مەعاشاتی کۆیێ لە نێوان کۆیە و دێگەڵە بە تالان چوو دوو کەسێکیشی تێدا کوژرا لە خەڵقی شار کە بەڕێکەوت لەو ئۆتۆمۆبیلەدا بوون خەزێنەی دەهێنا بۆ کویێ. دیسان وەها ڕێککەوت بۆم کە بە شەو، دەوری فەجر، بکەومە ڕێگە بەرەو مووسڵ. ئەمجارەیان شوێنی ڕووداوەکە بە سامتر بوو بەڵام ڕوحلەبەر، مەگەر مێروو، دەنا دەنگ و بەنگی نەبوو... سەفەرێکی دیکە لە زستاندا بوو، کاتێکی وەها دەرچووم کە گەیشتمە لای شێخەڵوان سێبەری لووتە بەرزەکەی پیرەمەگدروون لە دەشتایی دەستە چەپمانەوە بوو. هاوینان کە ڕۆژ هەڵدەکشێ سێبەرەکەی پیر بەرەو گەرمێن ڕادەکشێ.

تازە هەراکە گەورە بووبوو. حکوومەت دوای بەکارهێنانی هێزی جەیش و هەڵاتنی چەکدارەکان بەرقیەی بە خەڵک دەنووسی بۆ پیرۆزبایی لە زەعیم. عەسرێکیان لە مەلاکانەوە وەڵامم بۆ هات یان ئەوان بێنە لام یان من بچمە لایان لە مزگەوتی گەورە، من چووم حکوومەت بە فەرمانی مووتەسەڕڕیف داوای لێ کردبوون بروسکەی موبارەکبادی بۆ زەعیم بنێرن. چەند مەلایەکی «العلماء الاحرار» دەرحاڵ ئەمرەکەیان جێبەجێ کرد، هەرچی مەلا مەعسووم و مەلا زاهیری مەلا سادق و هاوڕێکانیان کە تێکڕایان دە کەس بوون لە منیان پێچایەوە ئاخۆ بتوانم ئەو تەکلیفەیان لەسەر شان هەڵبگرم. هەڵبەت بە من نەدەکرا. بڕیاریان دا بروسکە لێ نەدەن. دوای یەک دوو ڕۆژ هەموویان گیران و بردرانە هەولێر.

بەدرەددین عەلی بێحورمەتیی لەگەڵدا کردبوون. دوورخرانەوە، بە گرتوویی بۆ بەغدا، لە ئاکامدا کەوتنە شوێنێکی پێی دەگوترا «فضيلية»، وابزانم، لە نێوان بەغدا و بەعقووبە یان حیللە. من چەندێکی لە دەستم هات (کەمیشم لە دەست دەهات)

بۆیان خەریک بووم. دوای چەند مانگ لە حەبس و موحاکەمە کەوا زۆر بێڕەحمانە مەلایەکی کۆیی لە «علماء احرار» شایەدیی لە مەلا مەعسووم دابوو بە جۆرێک بایی ئیعدام بکات. موحسین ڕوفێعی یارمەتییەکی باشی دا لە بەرهەڵدانیان. من لە بەغدا بووم کە بەربوون، هەر ڕۆژە لایان دەبووم. مایەوە بگەڕێنەوە بۆ وەزیفەیان. قەول بوو بەیەکەوە بچینە لای مدیری ئەوقافی عام، مامۆستا «بهجة الأثري»، کە ناسیاوم بوو. تا من چوومە ئۆتێلەکەیان ئەوان چووبوون بۆ ئەوقاف. کاتێک من پێیان گەیشتم لای سکرتێری «مدیر عام» چاوەنۆڕی ئیزنی چوونە ژوورەوەیان دەکرد. من ڕێگام ئاچووغ بوو، بە مامۆستا بەهجەتم گوت مەلاکان دێنە لات. گوتی، تۆ دەبینم لزووم چییە بە دیتنی ئەوان؟ لێم نەسەلماند. خولاسە بانگی کردنە لای خۆی، لەلایەن وەزیفەیانەوە گوتی من ناتوانم بیانگێڕمەوە بۆ وەزیفەیان چونکە بە فەرمانی حاکم عەسکەری عام لێ خراون. بە ئیزنی خۆی لە تەلەفۆنەکەیەوە قسەم لەگەڵ موحسین ڕوفێعی کرد لە بارەی گێڕانەوەیان بۆ وەزیفە و مزگەوتەکانیان، گوتی هەر ئێستە ئەمرەکەت بۆ دەنێرم. ماڵی بە خانەی خوا بێ، بیست دەقیقەی نەبرد قسەکەی خۆی گەیاندە جێ و مەلاکان گەڕانەوە سەر شوێن و وەزیفەکەیان. من هەرچەند بەرپرس نەبووم لە نەناردنی بەرقیەیان بۆ زەعیم دیسانەوە چونکە پێم گوتبوون موبارەکبادی کردن شوورەییە دڵم نا ئارام بوو لە گرتنیان جگە لەوەی کە هەموو دۆست بوون و خۆیشم مەلازادە.

لە لاپەڕە ١١٢، بەرگی دووەمی حاجی قادری کۆیی، لە موناسەبەدا ناوی مەلاکان هاتووە. لەمانە پێنجیان بەڕەحمەت شادبوون، ئەمە ناوەکانیانە، مەلا مەعسوومی هەورامی، مەلا محەمەدی مەلا عەلی، مەلا محەمەد ئەمینی مەلا عاسی، مەلا فەتحوڵای عەبدولکەریم، مەلا عەلی حاجی تۆفیق. زیندووەکان، تەمەنیان درێژ بێت ئەمانەن، مەلا زاهیری مامۆستا مەلا سادق، مەلا ئەنوەری شیواشانی، مەلا سەدری مەلا ساڵحی خەتیب، مەلا محەمەدی ئەمینی کانی ڕەشی، شێخ حسامی تاڵەبانی. (لە شەوی نێوان ڕۆژی ٣ و ٤ی مارتی ١٩٨٨ ئەم دێڕانەم نووسی).50 تازە مەلاکان

---

50- شێخ حسامی تاڵەبانی و مەلا زاهیری مامۆستا سادق و مەلا سەدری ساڵحی خەتیب بە دوا یەکتردا کۆچی دواییان کرد (ئەمەم لە ڕۆژی ٤/١٠/١٩٩٤ نووسی).

گیرابوون ڕێم کەوتە سلێمانی هەواڵی کۆیەیان پرسی، گوتم خەڵقەکە بە بانگی کەڵەشێر نوێژ دەکەن چونکە شار مەلای تێدا نەماوە بانگ بدات.

دوای ساڵەهای ساڵ کە کڵپە و للفەی کارەساتەکەی ئەو ڕۆژانە لە بیران نەماوە وەیا کزبۆتەوە و مرۆ دەتوانێ بە خوێنی ساردەوە چەندوچۆنیەکەی هەڵسەنگێنێت، بە ڕاشکاوی دەڵێم عەبدولکەریم غەدری لە خۆی و لە خەڵقیش کرد کە هەڵایسانی هەراکەی بەهەند هەڵنەگرت تا ئەوەی خۆی یاریدەی خێراکردنی دا. کە هەرا دوای کزبوونی بلێسەی دایەوە نەختێکی لە سیاسەتی گردەبڕی و بنەڕەتی و بێمەسڵەتی گۆڕی و بەیانێکی دەرچواند بە لێ خۆش بوون لە هەموو ئەو کەسانەی کە چەکیان هەڵگرتبوو جگە لە سەرۆکەکانیان، بەمەشدا ئومێدی هەبوو زوربەی چەکدارەکان دێنەوە بن نوای حکوومەت. کە دیتی کەسی ئەوتۆ گوێی بە بەیانەکە نەبزووت وەهای زانی ناتەواویەکی بچووکی تێدایە. ئەم جارە خۆی لە خوتبەیەکدا «حتی رؤوسهم» یشی خستە پەراوێزی مەرحەمەتی خۆیەوە کەچی بێسوود بوو.

مەسەلەکە لەوە دەرچووبوو بریتی بێ لە ساردایی نێوان دۆستان کە عادەتەن بە موجامەلە و قسەی شیرن دەگۆڕێ بە دۆستایەتی. شکڵی عەشیرەتگەری بە هەراکەوە نەمابوو، ڕەنگی قەومایەتی تۆخی دایەوە. من لە سەروبەری کوشتنی سددیق بەگ بە سەرۆکەکانم گوت، نابێ خەیاڵتان بۆ ئەوە بچێ کە هەرایەکی ئێوە بەرپای بکەن لە دەست خۆتاندا دەمێنێتەوە. شۆڕش خاوەنی لەبارتری هەیە بۆ سەرپەرشتی لێکردنی.

لە بەرەو کۆتایی پاییزی ١٩٦١ سەفەری «هەنگوینە مانگ»ی ژنهێنانم کرد بۆ بەغدا. دوو حەفتەیەک مانەوە و گەڕاینەوە بۆ کۆیێ. زستانی نێوان ١٩٦١ و ١٩٦٢ م لە کۆیێ بەسەر برد. فارووقی برام تووشی نەخۆشییەکی قورس بوو. گانگرین لە پەنجەی پێی پەیدا بوو ئازارەکەی وەها بوو دەیگەیاندە سنووری شێتی. لە بەغدا دکتۆر عەمەلیەتی بۆ کرد ئەوسا تاکە دکتۆرێک بوو شارەزای ئەو نەخۆشییە بێ. بە درێژایی نەساغییەکەی لە دەمی عەمەلیەت هەتا گەڕایەوە کۆیێ حەمە عەلیی ئامۆزام و شێخ فاتیحی خاڵە سەدر لەگەڵی بوون. هەر بەوان کرابوو ئاڵۆزبلۆزی و توندوتیژی و دەست وەشاندنی ئەو ڕۆژانەی فارووق تەحەمول بکەن. دڵسۆزیی مرۆڤ لە جاری وەهادا خۆی دەنوێنێ.

لەو ساڵانەدا بوو، واتە نێوان ١٩٦١ و ١٩٦٢، مەرگی حەماغای ئەورەحماناغام بیست. بروسکەیەکی پرسەم نووسی، یادی گیانی کوردایەتی ئەو مرۆیەی تێدا بوو، بەڕێ نەکرا. پاش پتر لە پازدە ساڵ نوسخەی ئەم بروسکەیە بە دەستی کوڕە گەورەی گەیشت. چاونووقاندن لە گەلێکی وەکوو کورد تا ئەوەی ڕەوا نەدیترێ بە بروسکەی پرسە ناوی ببردرێت بە لای ئەو گەپە منداڵانەیە دەچێتەوە کە لە بەشێکی فیلمەکەی چارلی چاپلن «میهرەجانی چارلی»دا ڕوویەکی نەفسی مرۆڤ وێنەکێش دەکات بەوەدا کە چارلی-ی ڕێگر بەسەر گردێکەوە سەرەتاتکەی لە پۆلیسەکان دەکرد تابزانێ چۆن خۆیان لێ بپارێزێ، لە تیلاکی چاوی ڕاستییەوە پێڵاوی پۆلیسێکی دیت کە لە تەنیتشت ئەژنۆیەوە بوو. گورج نەختێکی خۆڵ هەڵدایە سەری و شاردییەوە. ئەمە بوو چاری پۆلیس کەوا بەسەر سەرییەوە وەستا بوو. عەبدولکەریمیش هەروەهای دەکرد لە چارەسەری دەردی کوردایەتی.

ساڵی ١٩٦٢ پیر بوو، من محاماتم سارد بووبۆوە و سەفەرم کەم بوون چونکە باری وڵات هێندەی جاران حەزی بە گەڕان و سووڕان نەدەکرد. لە بیرم ماوە ڕۆژێکیان پاش بارانە بوو لە کەرکووک دەگەڕامەوە بۆ کۆیێ، بەسەر عەرەبانەی دەستەوە خیارم دیت، بیست کیلۆم کڕی لە ناسکترین خیار بە دووسەد فلس، کیلۆی بە دە فلس. لە ڕێگە تووشی خەزووڵم شێخ ڕەئووف هاتین لەگەڵ کاربەدەستێکی سەرپەرشتیکەری کتێبخانە ڕەسمییەکان کە لە بەغداوە بە خۆی و خێزانییەوە هاتبوون، چووبوونە کۆیێ و دەگەڕانەوە بەرەو بەغدا. کابرا و خێزانی سپاسی ئەو مێوانداریەیان کرد کە لێیان کرابوو بێ من. شێخ ڕەئووف خۆی مەشوور بوو بە مشوورخواردنی مێوان و بەخێرهێنانی، تا بشڵێن ڕووی بۆ مێوان گەش بوو.

لە کژەی ساڵدا بوو مودیر ناحیەی تەقتەق لە دووکانی دووکاندارێکی کۆیی دەسرێژی لێ کرا و کوژرا. کابرا زۆر دۆستم بوو، دۆستی گەلێکی دیکەش بوو، نەشمزانیبوو هیچی ئەوتۆی کردبێ کوشتن هەڵبگرێ بەڵام مەنتیقی هەرا و ئاژاوە جودایە.

لە زستانی نێوان ١٩٦٢ و ١٩٦٣ بوو نەشرەیەکم دیت دروشمی «حوکمی زاتی»ی هەڵگرتبوو. هەرچەند داستانی گەشتی ژیان جێگەی شەڕەدەندووکێی بیردۆزانەی تێدا نابێتەوە، دیسان ڕێم هەیە بایی پێوەندیی ئەو دروشمە بە بیروباوەڕی ئەوسام -

هی ئێستاشم - کورتەیەکی وتووێژم لە بارەیەوە بکەمە چەند هەنگاوێکی ڕێبازی ئەو ڕۆژگارەم.

بە هەندێک لە ڕابەرانی حیزبم گوت، ئێوە ئەگەر سوور بن لەسەر ئەو دروشمە لەوانەن بە قورسایی داخوازییەکانی دابهێزێن و پەککەوتە ببن، چونکە حوکمی زاتی وەکوو ماڵ ڕێکخستن بۆ ئاسان کردنی گوزەران و کار ڕاپەڕاندن تەرتیبێکی برایانە و لێک حاڵی بوون و بەیەکتر ڕازی بوونە نەک هی کوتەک و شەڕە چەپەڵۆکەیە. سەربەخۆیی لەگەڵ چەک هەڵگرتن خزمە بەڵام حوکمی زاتی وەک دابەش کردنی وڵات بۆ چەندین لیوا و قەزا و ناحیە بە دۆستایەتی دەبێ. نایەتە عەقڵەوە حکوومەت هەموو مانگێک بە حەقی کوتەک هێندە ملوێن دینارەی بێگرفت بۆ قەزا یاخود حکومی زاتی بنێرێ لە ئاکامی دوژمنایەتی و شەڕ و گێچەڵ. ئەمە و گەلێک تێبینی دیکە کە لێرەدا جێگەیان نابێتەوە کەوتە ناو وتووێژمانەوە. قسەکانم چ ئاکامێکیان لێ چاوەڕوان نەدەکرا جگە لەوەی کە بەخەبەرهێنانی چەند دەمارێکی نوستوو بوو لە هۆشی چەند ناسیاوێکدا.

ئەو دروشمە زۆر نەشەکایەوە چونکە دروشمێکی عاتفی بوو پتر لەوەی داخوازی «قۆناغ» بێت، زۆریشی نەبرد لە سەرەتاکانی ١٩٦٣ عێراق بە بارێکی دیکەدا گۆڕا. لە کۆیە بووم، ڕۆژی پێنجی کانوونی دوەم، سبەینە بوو نەجیبەی خوشکم خەبەری دامێ لە کەرکووکەوە بە تەلەفۆن کە بووم بە باوکی کوڕێک. پرسی بۆ ناوێک، گوتم ناوی بنێن «دەوەن»:

دەوەن ئاخر دەبێتە داری گەورە
مەڕی لەڕ خزمەتی بۆ گۆشتی چەورە!

بۆم نەلوا سەفەر بکەم و کوڕەکەم ببینم، نەش دەکرا لەو وەزعەی زەیستانداریی دایکیدا سەفەریان پێبکرێ.

لە هەشتی شوبات، ٣٤ ڕۆژ دوای بوونی دەوەن، ڕادیۆی بەغدا کردی بە هەرای دوەم «بەیانی ژمارە یەک»ی گۆڕانی باری سیاسی. چوار ساڵ و شەش مانگ و بیستوپێنج ڕۆژ کەوتە نێوان چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ و هەشتی شوباتی ١٩٦٣. لەو چوار ساڵەدا بایی دە ئەوەندەی چل ساڵی پێش خۆی هەرا و مەزاد و

خوێنڕێژی و شیرازە تێکچوون ڕووی دابوو، کە نموونەیەکی ڕووداوەکانی جیهانی سێیەمە بە خۆی و دڵگەرمی و ناواقعیەت و تیژڕۆیی و بێتەجرەبەیی و دووربوونی لە گیانی سەردەمی زەڕڕە قڵاشی و ئاسمانگەڕییەوە.

لە نۆی شوبات عەبدولکەریم و مەهداوی و تاها شێخ ئەحمەد و ئەفسەرێکی بچووک ئیعدام کران. عەبدولسەلام لە بەندیخانەڕا بردرا بۆ سەرۆکایەتیی کۆمار. پەرۆشم بوو تەها شێخ ئەحمەد لە دوو لایەنەوە بوو یەکیان ئەوە بوو کە لە دەمی نیابەتی هەوەڵ جارمەوە خۆی پێ ناساندم و گەلێک جوانمەردی و دۆستنەوازی و ئاکاری ڕەسەنی پەسەندم لێ دیت. لە ساڵی پەنجاوچوار بەم لاوە هەتا ١٩٥٩ بە دەگمەن نەبێ یەکترمان نەدیت. لەو ساڵەدا کە کژ هاتبوو ئاژاوە دەست پێبکات چوومە لای لە وەزارەتی دیفاع. لە بارەی تێک هەڵدایی بێسنوور و بێسودەوە لەگەڵی دوام، پێوەی دیار بوو کە هاوباوەڕە لەگەڵمدا، بەڵام بۆم دەرکەوت دەسەڵاتی چارەسەرکردنی لە دەستدا نییە نەشیویست دان بەو ڕاستییە وەیا شیرازەپسانی هێمنی و ئاسوودەییدا بهێنێت، ئیتر خۆی بەو پەڕاندەوە کە گوتی حەزدەکەم بە نووسین بیروڕای خۆت و چارەسەر کردنی گیروگرفتم بۆ ڕوون بکەیتەوە. من بەڵێنم پێ نەدا هیچیشم بۆ نەنووسی جارێکی دیکەش چاوم پێی نەکەوتەوە.

لایەنی دووم ئەوە بوو کە تەها خۆی خەسار کرد، وەیا حاڵوبار خستیە شوێنی نالەبارەوە. مرۆی وەها مەرد، بۆی حەیفە و خۆ دۆڕاندنە، نەتوانێ لە گێژاوێک دوورکەوێتەوە کە ئەگەر ناحەزەکانی نابانایەوە بە بەڵگەی تاوانباربوونیانی حیساب دەکرد. گەلێک جار وەها ڕێک دەکەوێ کە پەندی پێشینانی مەشوور «سواربوون عەیبێکە و دابەزین دوو عەیب» فرزە لە مرۆ دەبڕێت. وەها خۆشە کە پیاو جارێکیان ئەو پەندەی لێ بەڕاست گەڕا دەرفەتی هەبێ لە جاری دوەم پێوەی نەبێ. تاها بۆی نەلوا و تێدا چوو.

ئەگەر ئالەتێک خەیاڵاتی دڵی عەبدولکەریم-ی، لە دەمی ڕووبەڕووبوونی مەرگدا، وەرگرتبا ئایا لە بارەی هەڵوەستی بەرانبەر کورد، کە هۆیەکی گرنگی ڕمانی بوو، چی لێ دەگێڕایەوە. پەشیمانی یان حەسرەت خواردن لە بەکارنەهێنانی ئەوپەڕی دڕندەیی؟ دەشێ بڵێین لە شێوەی نموونەی بچووکدا ئەوەی لێ گێڕابایەوە کەوا بێگومان بە دڵی ناپۆلیۆن و هیتلەردا هاتووە لە دوای هەست کردنیان بە هەڵە کوشندەکەی هێرش بۆ سەر ڕووسیا. چەند خەیاڵ دەکەمەوە هەر «دۆگۆل»م بە

بیردا دێت بە نموونەی مرۆیەکی بڕیاری مێژووی سەلماندبێ لە حاڵی دەسەڵاتدا کە هات و چارەسەری مەسەلەی جەزایری سەپاند بەسەر فرەنسەدا. توخوا ئەوەی ئەمەریکا لە ڤێتنام و ڕووسیا لە ئەفغانستانی کرد دوعایەکە ئامینی بۆ بکێشیت؟

لە ڕۆژی یەکەمی هەرای هەشتی شوباتەوە چەکداران ڕژانە ناو شار بەڵام نەک بە دوژمنایەتیی ڕژێمی نوێ. من ئەو پاڵەی لێم دابۆوە لە سەری بەردەوام بووم. چەکداران دەهاتنە لام. بە تەواوی ساردایی دوای گوتارەکانی ١٩٦٠ یان لەبیر خۆیانیان بردبۆوە، لەگەڵمدا گەرموگوڕ بوون. وابزانم بەشێکی ئەو گۆڕانەیان لەوەوە بوو کە قسەکانم لە تەجرەبەی ئەو چەند ساڵەدا بە ڕاست دەرچوون. لە غەیری کوردایەتی بێفێڵ هیچ فاکوفیکێک نانێکی سووتاوی نەخستە کاسەی کوردەوە. هەرچی قسەی لووس و باریک و چەور و شیرینی ناو کتێبان هەبوو بە هەموو ئایدیۆلۆجیای بەهەشتی سەر دنیاوە لە نووکە چەقۆ و شەڕەشەقیان بەولاوە بۆ کورد تێدا نەبوو. بەڵێنە خۆشکەڵەکان وەک پاداشی دین هەڵدەگیران بۆ قیامەتی دنیایی.

پەنجا ڕۆژە بەسەر تەمەنی دەوەندا تێپەڕی ئنجا پێم کرا سەفەر بکەم و بیبینم. خزمینە منداڵ پارچە جەرگی باوک و دایکییەتی، بۆ من کە لە تەبیاتمدایە پەنجە لەو شتەی باوەڕم پێی هەیە گیر بکەم خۆشویستنەکە عادەتی نەبوو. حەزم دەکرد هەموو کاتم لەگەڵ ئەودا بەسەر ببەم و لێشی تێر نەدەبووم. لەو بەینانەدا حکوومەت کە لەلایەن حیزبی «بەعس»ـەوە پێک هاتبوو، دوو وەزیری کوردیشی تێدا بوو، لەگەڵ چەکدارەکان و تووێژی هەبوو بۆ گەیشتن بە چارەیەک لە مەسەلەی مافە نەتەواییەکانی کورد. وەفدێکی «شعبي» ڕێک خرابوو لە جیاتی حکوومەت پێوەندی بەچکدارەکانەوە بکات، شێخ ڕەزا شەبیبی و حسێن جەمیل و فایق سامەرڕائی و زەیدی ئەحمەد ئەفەندی و فەیسەڵ حەبیب ئەلخەیزەرانی تێدا بوو، هاتوچۆی بۆ لایان دەکرد بۆ قاڵ کردنەوەی داخوازییەکانیان و نرخاندنیان لەلایەن حکوومەتەوە. لە ئاکامدا وەها پەسەند کرا کە کۆبوونەوەیەکی گشتی کوردەواری لە کۆیێ پێک بێت بۆ گەیشتن بە بڕیارێک لەسەر داخوازییەکان.

من لەبەر گەلێک هۆی جودا و هەمەچەشنە ئومێدم بێهێز بوو لە ئیمکانی گەیشتن بە لێکرازیبوونی حکوومەت و چەکداران لەسەر چارەیەکی مامناوەنجی. بە ئانقەست خۆم دوورخستەوە لە کۆیێ هەتا نەچمە گێژاوی هەڵسەنگاندن و نرخاندن و چەندوچۆنی ئەو مافانەی بۆ کورد ڕەچاو دەکرێ. بەهانەی دەوەن کە دڵیشم بۆی

دەچوو فریام کەوت لەو خۆدزینەوەم. کۆبوونەوەی ئەو خەڵقولایە لە کۆیێ درێژەی کێشا، بیستم لەوانەیە بەدەوامدا بنێرن پێشدەستیم کرد و لە پێش هەتاو بەرِم بە خۆمدا دا و چوومە بەغدا. دوای سەفەرم بە دوامدا هاتبوون بەڵام تەیرەکە فڕی بوو. جەماعەتی خالان و پژدەریەکان لە ماڵی من دابەزیبوون، هەر تاقمەش ماڵێکی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو لێی مێوان بووبوون. لە پاش چەندین کۆبوونەوە وەفدێکیان هەڵبژاردبوو لە چواردە کەس کە بچن بۆ بەغدا و لەگەڵ «وەفدی شەعبی» بدوێن بۆ پالاوتە کردنی پرۆژەیەک لەسەر بنگەی «لا مەرکەزی» بۆ کوردستان. ناوی منیشیان خستبووە وەفدەکەوە کە هەرچەند جێی شانازی بوو ئەمما لە دڵدا پێم خۆش نەبوو چونکە نەمدەزانی لە ئاکامدا بە چی دەگەین یان ناگەین، کە نەگەیشتین سەرەنجامان چی دەبێ.

خۆمان، خەڵقی عالەمی سێیەم، شارەزای خۆمان هەین لە لێقەوماندا چ بە یەکدی دەکەین. جارێ لە بیر کەس نەچووبۆوە ساڵی ١٩٥٩ چەپەکان خەریکی چ پرۆژەیەک بوون بۆ غەیری چەپ، کە لە هەشتی شوبات خۆیانیان دایە پاڵ عەبدولکەریم چییان لێ هات و چۆن بوونە قاوت و ڕەشەبا. سبەی کە تێک گەیشتن دەست نەکەوت چ ڕێبازێک دەکرێتەوە تێیرا برۆین؟ چ لە دەوەن و ماڵوحاڵ بکەم؟ دیسانەوە موشکیلەی گوزەران هاتەوە پێش وەک کە لە سەرەتای شۆڕشی ١٩٥٨ بۆ بەشداری کردنم لە لیژنەی ئیسلاحی زیراعی هەمان موشکیلەم هەبوو. ئەمجارە ماڵ لە کۆیە و منداڵ لە کەرکووک و خۆم لە بەغدا، ناشزانم چەند دەمێنینەوە. باش بوو ئۆتێلمان لەسەر حکوومەت بوو، سەمیرامیس یان سەندباد، هەردوویان بەتەنیشت یەکترەوە بوون، جێی تێدا حەوانەوەمان بوو، بۆ ئەوسا لە ئۆتێلە هەرە باشەکان دەژمێردران.

وەها داندرابوو کە چواردە کەسەکەی بە وەفد دانرابوون حەفتیان حیزبی بوون حەفتیشیان بێلایەن. من لە بێلایەنەکان بووم، کاکە حسێنی خانەقا و محەمەد سەعید خەفاف و ڕەشید عارف و سەمەدی حاجی محەمەد و عەقید ڕوکن (وەیا زەعیم ڕوکن) مستەفا عەزیز و یەکێکی دیکەش کە ئێستا ناویم نایەتە بیر بێلایەن بوون. ئۆتێلەکەمان بە درێژایی ڕۆژ و هەتا بەشێکی شەویش دەتگوت کاریزە بازاڕە.

هەستم دەکرد ئەندامانی حیزب کە پێماندا تێدەپەڕین بە هێندیان هەڵنەدەگرتین ڕۆژێکیان بەرێکەوت لە ژوورێکی ئۆتێلی فلۆریدە کۆمەڵێک لەو گەنجە بە خۆ

نازیوانە لە دەوری ساڵح یووسفی کۆبوونەوە منیش ڕێگەم کەوتە وێ. ساڵح بۆ تەلەفۆن داواکرا، من لە مەسەلەیەک ڕایەکم دەربڕی بە لای خۆمەوە وەکوو ئەلفوبێ بوو کەچی گەنجەکان وەها یەخەگیرم بوون بە موناقەشە ئەمما ها...!! ساڵح هاتەوە بەسەر گەرمەی دەمەتەقەدا، کە تێیانگەیاند مەسەلە چییە بە توندی تێی ڕاخوڕین کە سنووری خۆیان ڕابگرن و بزانن لەگەڵ کێ قسە دەکەن...

من لە ڕۆژێکی دیکەدا، قەڵەباڵغییەکی گەورەتر لە هی ئەو ڕۆژە لە ساڵۆنی سەمیرامیس کۆبووبوونەوە لە حزوور جەلال تاڵەبانی ڕووم لە خەڵقەکە کرد گوتم، حیزبییەکان کە دەمانگەنێ بە چاوی پەپوولە و پێشولە سەیرمان دەکەن با منیش بیروڕای خۆم لەم مەسەلەیە دەرببڕم، جارێ لە پێشەوە دەڵێم من کە ئەندامەتیم قبووڵ کردووە بە ئەرک و مەسرەفی خۆم بەسەر دەبەم ئومێدێکیشم بە وەزیفە و پایەی بەرز نییە، هەرچی حیزبییە بە تەمای مزە و پاداشتە. لەلایەن ڕێز و بایەخیشەوە هەتا بە تاقیکردنەوە ئیسپات نەبێ کە مرۆی حیزبی بنیادەمی خاوەن ئیرادەیە من بە ئالەتێکی بێئیرادە و بێبیروڕای دادەنێم. ئەوپەڕی پایەی پێی بدەم ئەوەیە کە بە تووتیی دەدەم لەوەدا کە قسەی غەیر دەجوێتەوە. ئەمانە و هی دیکەی وەک ئەمانیشم گوت بێ ئەوەی کەسیان بە دەنگ بێن.

هەر ڕۆژە لە داوەتی کەسێک بووین، لە سەرەتاوە بێ خەم و خەیاڵ بووین بەڵام کە وتوویژ درێژەی کێشا هەستی موراقەبەمان کرد. لەسەر بڕیارێکی کە کۆبوونەوەی وەفدی کوردی و هی شەعبی دای، ئێمە کەوتینە سەر ڕێک خستنی پڕۆژەی ئەو «لامەرکەزی»ـیەی کە بۆ کورد سەلمێندرابوو. من لەو لیژنەیەدا بووم، خوا هەڵناگرێ خەریکی پڕۆژەیەک بووین وەها خەست و خۆڵ بوو حکوومەت بە هەواوە ڕەفزی دەکرد. زۆر جار بە دەنگ دەهاتم، هی دیکەش تێبینییان دەردەبڕی کە ئەم ماددەیە و فڵانە ڕستە قورسە، مام جەلال دەیگوت ئێوە ئاگادار نین خەڵقەکە لە وڵاتی خۆمان، مەبەستی چەکدارەکان بوو، ئەمەیش بە کەم دەزانن. لە بەرەو کۆتایی پڕۆژەکە بووین سەمەدی حاجی مەحەمەدی بەننا گوتی، ئەمن حکوومەت بم لامەزکەزی-یەکە بۆ خۆم دادەنێم چی دەمێنێتەوە بۆ خۆتان بێ.

بەرپرسە زلەکانی حکوومەتمان لە هەڵکەوت و پێداویستدا دەدیت. لە کۆتایی نیسان سەفەرێکم بۆ کۆیێ کرد پشوویەکی ڕاحەتم دا. بەهارەکە دەتگوت بەهەشتە. دەوەن

خەپەتۆڵە بووبوو. کە لە کۆیەم بە جێهێشت نوستوو بوو لێم بوو بە حەسرەت تا دیتمەوە دنیا چووبووە بارێکی دیکەوە.

وەک لە هەموو دنیادا خەڵق دەبنە فرەباوەڕ هەروەهاش حیزب و حکوومەتی «بەعس» بەرانبەر کورد لە بیروباوەڕدا خوار و ژوور بوون. ڕۆژێک لە ڕۆژان ساڵح یووسفی و من و (وا بزانم کاکە حسێنی خانەقا-ش) لەگەڵ مام جەلال چووینە لای سەرۆک وەزیران کە ئەوسا خوالێخۆشبووی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بوو. «عەلی ساڵح ئەلسەعدي - علي صالح السعدي» و «ساڵح مەهدی عەمماش - صالح مهدي عماش» وا بزانم «حەردان تیکریتی - حردان تكريتي»یشی لا بوون. لە گلەیی و گازەندەی دوو لایەنی ساڵح مەهدی عەمماش گوتی بەڕاستی ئەگەر لە فڵانە شت نەگەینە یەک شەڕ دەکەین. عەلی ساڵح سەعدی هەر تەماشای دەکرد. کە ئەمانە ڕۆیشتن سەرەک وەزیران قورئانێکی لە چاوی مێزەکەی بەردەمییەوە دەرهێنا و سوێندی پێ خوارد کە خۆی لەو باوەڕەدا نییە. ئنجا داوای کرد لە مام جەلال کە بچێ بۆ لای سەرۆک جەمال عەبدولناسر بەڵکوو دوای تێگەیشتنی حاڵوباری وڵات بە ئامۆژگاریی ئەو، ناکۆکی بەتەرەف ببێت. مام جەلال دوای ئەو دیدەنییە بە یەک دوو ڕۆژ چوو بۆ میسر.

بەر لەو ڕۆژە بە ماوەیەک، کە جارێ بزەیەک بەسەر لێوی ڕۆژگارەوە مابوو. لە داوەتی نیوەڕۆژەی محامی نەجیب بابان بووین. تێیان گەیاندم کە من دوای خواردن بمێنمەوە. تومەز وتووێژێک لەگەڵ برا فەلەستینییەکان پەسەند کرابوو، مام جەلال و ساڵح یووسفی و من لەم بەر، «نایف حەواتمە» و «باسل الكبيسي»، نوێنەری بەعس، لەوبەرماینەوە بۆ گفتوگۆ. دوای قسەی شیرنی عادەتی نایف حەواتمە دەستی کرد بە قسە. بۆم دەرکەوت قسەزانە و دەزانێ بۆچی دادەوەشێنێت و نیشانیش دەپێکێت. لە بنەڕەتدا کۆبوونەوە بە نیازی هەڵنانی دۆستایەتی و پێوەندی بوو لە نێوان دوو بزووتنەوەی ئازادکردنی فەلەستین و ڕەپێش خستنی کوردایەتی هەرچەند نازانم لە سەرەتاوە هەردوو لا بەتەمای چی بوون، قەتیش نەمپرسیوە چ حیکمەت هەبوو لەو کۆبوونەوە و وتووێژەی دوورودرێژ ئەمما بەپێی مەنتیقی هەر کۆبوونەوەیەک بێ، دیارە لە هەوەڵەوە چاوەنۆڕی لێکتر نزیک بوونەوەیەک هەبوون دەنا ئەرکی بێسوود بۆ چییە.

نایف دەستی کرد بە شریتەیەکی پڕ لە مەنتیقی ڕەوان و هەڵسەنگێنراو و بێ هەناسەسواری دوورودرێژ کە سەرلەبەری بریتی بوو لە مومکیننەبوونی هاریکاریی نێوان هەردوو لا تا ئەوەی وەک کە ئایەت دەڵێ «ما لهذا الکتاب لا یغادر صغیرة ولا کبیرة إلا أحصاها» قسەکانی ئەو لە جیاتی هەموو عەرەب عوزری دەهێنایەوە کە ناتوانن بۆ خاتری کورد، غەرب و شەریکەکانی نەوت و دەوڵەتەکانی دراوسێ و ڕەجعییەتی ناو عەرەب لە خۆیان زویر بکەن و هەر هەوڵێکیشیان هەبێ بۆ سوودی کورد هەمووی بێبەر دەبێ و دەبێتە بەفیڕۆچوونی ماندووبوون و ئەرک و مەسرەف. لەو ناوەدا فەلەستینییەکانیش ڕێیان نییە و ناتوانن و لە بەرژەوەندیان نییە خۆ بۆ کورد ماندوو بکەن کەوا نە هیچی بۆ ئەوان لێ شین دەبێتەوە نە بۆ کوردیش سوودی دەبێت. خولاسە جغزی بێئومێدیی بە دەورەدا کێشاین، هەردوو سەری بەیاز و قەپات.

من لێرەدا غەدر لە ڕەوانبێژی و مەوزووعییەت و ڕێچکەی ڕێکوپێکی قسەکانی دەکەم کە بە چەند قسەی قوت و قرتاو، دوای بیستوپێنج ساڵ، سێبەرێکی دەهێنمە ناو ئەم یادداشتەوە. ئەوەی نایف گوتی وەها ڕێک بوو بنووسرابایە دەبووە گوتارێکی سیاسی و ئەدەبی و پەندیاری و بەرژەوەندناسی لە چەرچل-ێک و هەنری کیسەنگەر-ێک دەوەشایەوە.

کە لە قسەکانی بۆوە برادەران لە لای خۆمانەوە منیان هەڵبژارد بۆ وەڵام دانەوە. دواتر بە بیرمدا هات کە دەبوو زووتر تێبگەیەندرێم کۆبوونەوە دەبێت و ئامانجیش لێی فلانە شتە وەڵامیش وەها و وەها بێت. من بە تەواوی لە تاریکاییدا بووم، لەوانەش بووم پێم نەکرێ لەپڕ وەکوو فەیلەسووفی ژیر و خەتیبی ڕەوانبێژ بدوێم بەڵام خۆوتاڵع چی بە زارمدا هات جێی ڕەزامەندی برادەران و خۆیشم بوو. لە پێشەوە موبارەکبادیم لە نایف کرد لەسەر ئەو هەموو زانیارە سەلبییەی کە لە بارەی کوردەوە لە ناو دڵیدا کۆی کردۆتەوە کەوا منێکی خاوەن ماڵ هێندە لە ماڵەکەم شارەزای لایەنی تاریک و وێرانی نەبم. ئنجا گوتم ئەو هەموو تەنگوچەڵەمەیەی مامۆستا نایف لە مەسەلەی کوردیدا دۆزییەوە کە من سێبەرێکی لێ دەزانم لە چاو ئەو، حیکایەتێکم بە بیردا دەهێنێتەوە کە دەڵێ کابرایەک بۆ دەعوایەکی چووە لای عەرزوحاڵنووسێک، ئەویش عەریزەیەکی وەها بە سۆز و ئازاری بۆ ڕێک خست، کە خوێندییەوە بۆی، کابرا بە هەردوو دەستان لە سەری

خۆی ڕاکێشا و گوتی من هێندە مەغدوورم بە خۆم نازانم؟ کوردیش وەها گلۆرەی لە لێژییە؟ ئنجا گوتم مامۆستا نایف کە دێت لە کولانەی بەرژەوەندی عەرەبەوە سەیری مەسەلەی کورد دەکات دەبێتە ئەو ئینسانە ژیر و هێمن و لەسەرەخۆیەی کە نایەوێ دڵی مێروو لە خۆی بڕەنجێنێ کەچی شۆڕشی چواردەی تەمووز بەرپا بوو هەر بۆ خاتری ئازاردان و ڕەنجاندن و تووڕە کردن و حەیابردنی ئەو لایەنانە و حکوومەتانەی کە بەهیچ دینان نابێ لە گوڵ تاڵتریان پێ بگوترێ بەپێی ڕاوێژی ئێستاکەی مامۆستا نایف. لەو بابەتە قسانە کران و هەردوو لامان برادەرانە لێکدی جودابووینەوە چی دیکەشم نایف و باسل نەدیتنەوە، لەو ساڵانەدا خەبەری کوژرانی باسل لە فرەنسە بڵاوبۆوە.

لە ڕۆژانی دواییی مایس چاودێریمان بە سەرەوە بوو بە جۆرێک لێی بزر نەدەبووین. سبەینەی هەشتی حوزیران بۆم هەڵکەوت بچمە دەرەوە لە ئۆتێل بێ ئەوەی هەستم پێبکرێت. خۆم گەیاندە برادەرێکی «ساڵح مەهدی عەمماش»51 بە تەلەفۆن پێی ڕاگەیاند کەوا من لای ئەوم و هەموو ئەو خاڵانەی جێی نەسەلماندنە لە حکوومەتەوە دەشێ چار بکرێن وەک ئەوەی کە دهۆک نەبێتە لیوا با لە مووسڵ دایەرەیەکی سەربە موتەسەڕیفی مووسڵەوە هەبێت بنوێرێتە کاروباری کوردەکانی ئەو لیوایە. گوتی ئێوارێ قسەی لێوە دەکەین. ئێوارەی ئەو ڕۆژە قەول بوو عەمماش و وەزیری دیکەش بێنە کۆبوونەوەی دوو وەفدەکە. من گەڕامەوە ئۆتێل ئارەزۆشم بایە دەرۆیشتم بۆ هەر کوێیەکی بمویستبایە.

تا ئەو ئێوارەیە سێ پرۆژەی لامەرکەزی لە دەستدا بوو. یەکیان هی ئێمە، دوەم هی حکوومەت، سێیەم هی عەلی حەیدەر سلێمان. لەو کۆبوونەوەیەدا ساڵح عەمماش گوتی وا باشە وەفدەکە ئەو سێ پرۆژەیە لەگەڵ خۆی بباتە لای کوردەکان هەتا بزانین کامیانیان بەلاوە پەسەندە ئەمما تکایە بەند مەبن و زوو وەرنەوە. سبەینێ

---

51- ئەو برادەرەی عەمماش موحامی حسێن جەمیل بوو، لە ڕۆژانی نشوستی ساڵح عەمماش-دا بە هانای هاتبوو بەڵام زوو برادەرییەکەی فەرامۆش کرد، بەپێی کە حسێن جەمیل پاشا بەینێک بۆمی گێڕایەوە.

پاش شەوێکی کە نوستن لە سەربان مەنع کرا، پێنج کەس52 لە ئەندامانی وەفد و سایقێکی سەربە حیزب، دوای بەرچایی و دوعا خوازی لە باباعەلی و فوئاد عارف کە هاتبوون بەڕێمان بکەن، بردراین بۆ تەیارەخانەی «معسکر الرشید» و پاش سەعاتێک لە تەیارەخانەی کەرکووک دابەزێندراین و هەر لەوێ خراینە ژوورێکەوە کە وا پێ دەچوو هی «تضمید- برینپێچی» بێت. دوو قۆڵتغی شکاوی لێ بوو و هیچی دیکە.

ئەو ڕۆژە و ئەو شەوە و ڕۆژی دواتر هەتا تاریک داهات لەو ژوورە بووین بەڵام نانمان دەدرایێ و ڕێی سەراومان هەبوو. کە دابەزین و ڕادیۆمان کردەوە گوێمان لێ بوو کە چۆن شەڕ دەستی پێ کردۆتەوە. شەوی دوەم گوێزراینەوە بۆ ئینزیباتخانەی عەسکەری.53 لە ژوورێکی زەمانی عوسمانلییان شەش قەریۆڵەی بە چەرچەفی

---

52- ئەو پێنج کەسە بریتی بوون لە: ساڵح یووسفی، کاکە حسێنی خانەقا، بابەکر پژدەری، عەگید سددیق و من. سایەقەکە وابزانم ناوی برایم بوو نازناوێکی عەشیرەتانەشی بەدواوە بوو.

53- لێرەدا کە بە گەشتی ژیانمدا دێمەوە بۆ کەلەبەر گرتنی کەموکەسرییەکی کە لە دەمی بڵاوکردنەوەی ئاڵقەکاندا دەرفەتی درێژە پێدان و درکاندنی هەموو مەبەستێک نەبوو تەجرەبەیەکی شەوێک لە شەوەکانی ئەو ئینزیباتخانەیە دەگێڕمەوە کە ئەوسا بە نهێنی لە دەرووندا پێوەی خەریک بووم: شەوی سێیەممان بوو - دوای ڕۆژاوا نیازێکم لە دڵی خۆمدا گرت. ئەو شەوە لە حیسابی بەرنامەی ڕادیۆ بەسەر دووشەموەوە دەژمێردرا ئەوساش ئێستگەی ڕادیۆی قاهیرە لە حەفتەدا دوو شەوان قورئانی «شێخ محەمەد ڕیفعەت»ی بڵاودەکردەوە یەکیان لە شەوی دووشەموو ئەوی دیکەشیان لە شەوی چوارشەموو. گوتم بابزانم ئەو قورئانە بە چ دەست پێ دەکات کە دەکێشێتەوە بۆ ئەوەی پێی دەڵێن «استخارە».

دەبێ بڵێم مرۆ کە کەوتە باری گومان لە گیانی خۆ کردنەوە چەندێکی خۆ گیری و بێ هەڵپەییش بکات، لە هەناودا خوتخوتەی هەمەجۆر دەیبزێوێت. خوێنەر پێم بڕوا بکات چی لێرەدا باسی دەکەم، سوێندیشی لەسەربێ بە خاکی پاکی کوردستان، یەک نوختە خۆکردی تێدا نییە. شێخ محەمەد ڕیفعەت لە سەرەتای خوێندنیدا ئەم ئایەتەی دەربڕی: «ومابلکم الاتقاتلون في سبيل الله و المستضعفين من الرجال

---

والنساء والولدان الذين يقولون ربنا اخرجنا من هذه القرية الظالم اهلها».
ڕاستییەکەی تەسکینییەکی گەشم هەست کرد، لەوەشدا سەیروسەمەرە پەیدا نییە چونکە تۆ کە هاتیت زاری تاوڵە هەڵدەیت و بۆ دۆرد جەهارت نامزەد کرد و دۆرد جەهار هات بڵێیت و نەڵێیت پێی دەزرووقێیتەوە چ جایی ئەوەی دەفتەری چارەنووسی خۆتت لێ بە نیاز گرتبێت.

شەو ڕاشکا و گەییشتینە دەوری سەعات ٢-٣ ی پاش نیوەشەو کە وام دەزانی تەنها من بەخەبەرم گوێم لە زیلی تەلەفۆن بوو. بەپێی قسەی کابرای بەرپرسی تەلەفۆن کە وەرامی سوئالی دەدایەوە دیاربوو لایەنێک بە دوا شوێنی ئێمەدا دەگەڕێت و بۆ مەبەستێکیشە نەک لە ساغوسەلامەتیمان دەپرسێت. لەو دەمانەدا دوو کابرای پۆستاڵ لە پێ پیاسەیان لە کوریدۆری بەر ژووری قاوشەکەی ئێمە دەکرد، یەکێکیان لە دوەمیانی پرسی: «هذوله منوهم، شنوهم... ئەمانە کێن، چین» لە وەرامدا پێی گوت «هذولة وفد شعبي» لێی پرسییەوە سەرەنجامیان چی دەبێ؟ گوتی هەر ئێستا «حرس قومي» دێن و وەریان دەگرن و تەواو دەکرێن «ينتهون»ی بەکارهێنا. من لە ژێر سایەی خەوی ڕواڵەتیمەوە گوتم: «خوایە قورئانەکەت وەهای نەگوت...» تومەز لەو دەمەدا کاکە حسێن خانەقا و بابەکرد پژدەریش بەخەبەر بوون بەڵام ئەوانیش بێ ئەوەی لێکتر حاڵی بن چرچەیان نەکرد و هیچیان لێ بەدی نەکرا کە بەخەبەرن یا شتێکیان بیستووە.

ڕاستییەکەی من بە دڵمدا هات ئەم موخابەرەیە و قسەی هاموشۆکەرەکان تەمسیلییە بێت بۆ نزم کردنەوەی مەعنەوییاتمان بەڵام پاش چەند مانگێک زانیم ئینزیبات «مرحوم عقيد محمد علي بدر» کە دۆستی کاکە حسێن و ناسیاوی منیش بوو کە لێی داوا کرابوو بماندەن بە حەرەس قەومی گوتبووی هەتا ئەمری بەغدای بەسەرەوە نەبێ کەس دەستیان بۆ درێژ ناکات. من بەدیار هاتنی حەرەس قەومییەوە خۆم مات کردبوو کەچی نەهاتن و نەهاتن. سبەینێ سەعات دووی نیوەڕۆ کە دەستمان لە خواردندا بوو، دەنگیان داین: خۆ گردکەنەوە ڕاتاندەگوێزین. هەر دوو کەسمان لە کەلەپچەیەک بووین، دەستی ڕاستەی من و چەپەی کاکە حسێن لە کەلەپچەیەکدا بوون. لە دەمی چوونە ناو ئۆتۆمۆبیلدا «د. توفيق

الانصاري» کە دکتۆری خەستەخانەی کۆیە و دۆستم بوو، خۆی گەیاندمێ و گوتی ماڵەوە سەلامەتن سێ ڕۆژ لەمەوبەر چوون بۆ پژدەر... دڵم ئارام بوو.

لە پاش گەشتێکی پێچەڵپێچ گەییشتینە فڕۆکەخانە، تومەز بەغدا دوای هەوڵی حەرەس قەومی وای پەسەند کرد کە بمانگوێزێتەوە بەغدا و دوور لە هەوەسی هەوەسبازان دامان بکات. بێگومان کە ئێمەشی بە نامەی هەڵسەنگاندنی پرۆژەکانی لامەرکەزی هەناردە کەرکووک مەبەستی ئەوە بوو ڕۆژنامەنووس و خەبەرنیگارانی دنیا نەزانن ئێمەی مێوانی حکوومەت بووین بە ئەسیری حکوومەت.

دەبێ لێرەدا ئەوەش بڵێم کە ساڵح یووسفی، نوێنەری حیزب، دوای دابەزینمان لە کەرکووک ڕۆژی ٩/٦/١٩٦٣ و بیستنی بەرپابوونی شەڕ، خەریک بوو گوێی خۆی بە غەڵەت دابنێ چونکە هەرگیزاو هەرگیز بەلای ئیحتیمالی وەهادا نەدەچوو، تەنانەت لەو چەند ڕۆژانەی دوایی وتووێژمان لەگەڵ حکوومەت کە باسی موراقەبە و گۆڕانی سیاسەت دەکرا دەیگوت ئەمانە هەمووی هەڵبەستی ئیستیعمارە دەیەوێ تێکمان بەربدات... ئەو مرۆیە، ساڵح یووسفی، هێندە ساکار و دڵساف بوو پێوەندییەکی بە سیاسەت و گرێوگاڵی مامڵەتی دینایەوە نەبوو. بە هەڵە ڕێگەی کەوتبووە حیزبایەتی. ڕەحمەت لە گۆڕی.

من ئەمە دەگێڕمەوە نەک بە نیازی ڕێنموونی کردنی خوێنەر بۆ سەر ڕێگای بەرەو غەیبەوە کە دەزانم دیاردەی ئەوتۆیی لە نێوان هەموو ئایین و نائایینیشدا هەیە، خۆ ئەگەر بێیتە سەر باسی خەونی ڕاست چشتی ئەو تۆ تۆ دەبیستیت سەرتی تێدا سوڕ دەمێنێ. ئنجا با پێت بڵێم، دوای چوونەوەمان بۆ بەغداش کە خراینە «سجنی مەرکەزی» دیسانەوە لە ٢/٦/١٩٦٣ ئیستیخارەیەکی نهێنیم بە قورئانی ئێستگەی بەغدا گرتەوە کە دەوری سەعات ٤-٥ ی عەسر دەکرایەوە. «ابو الحینین شعیشع» بە سورەی یوسف قورئانەکەی دەست پێ کرد... ئەم سورەتە تەنگەتاوی سەرەتا و فەرحنایی سەرەنجامی تێدایە. لەگەڵ خۆمدا گوتم، تا سێ ڕۆژی دیکە ئاخۆ چ سەروسۆراغێکی ڕزگاربوونمان دەردەکەوێت؟ ڕۆژی دواتر ٣/٦/١٩٦٣ هەرای «معسکر الرشید» ی شیووعییەکان بوو کە وەزیری داخلیە و هی خارجیەشی تێدا دەردەست کران. لە هەمان ئێوارەدا شاهێن تاڵەبانی هاتە سجنەکەمان بەڵام ڕێیان نەدا بێتە لامان، منی داوا کرد، چوومە لای لە ژووری مدیری سجن، گوتی سبەی

پاکەوەمان بۆ ئامادەکرابوو. نانێکی باشمان خوارد. من ۴۳ سەعات بوو نەنوستبووم بەڵام خوالێخۆشبوو ساڵح یووسفی ملی بەسەر شانیدا لار دەکردەوە و دەنوست. تا سەعات دووی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ۱۲/۶/۱۹۶۳ لەو شوێنە بووین. بە تەیارە هاتینەوە بۆ بەغدا. لە مەرکەزێکی «حەرەس قەومی»، لە فضل، دابەزێندراین. شەوێ بردیانین بۆ «بەندیخانەی مەرکەزی».54 ئەوەی پێی دەگوترا «قلعة» کە

---

ئێوارە بە دوای چەند کەسێکتاندا دێینەوە بۆ لای وەزیری داخلیە... سبەی ئێوارە کاکە حسێن و بابەکر و منیان برد بۆ لای حازم جەواد، ئیتر ئەوە بوو چووینە ڕانیە و هتد...

جوولەکەیەکی بەغاییمان لەو بەشە حەبسخانەیە لەگەڵدا بوو، لە ژووری بەندیخانەوە ئاگاداری سرکەوکورکەی هەموو دنیا بوو، تەنانەت سەر لە بەیانی ۳/۶/۱۹۶۳ پێمی گوت «اکو خربطة في معسكر الرشيد- واتە شێواوی لە مەعەسکەر ئەلڕەشید هەیە» زۆری نەبرد فڕۆکەی حەربی کەوتنە هاتوچۆ بەسەر بەغداوە و پاش چەندین سەعات خەبەرەکە کەوتە بەر گوێیان لە حەبسخانەکەدا.

من دوای ۳۱ ساڵ لەو بەسەرهاتانەدا دەقی ئایەتە باسکراوەکەم لەبیر نەمابوو، بابڵێم شوێنی هەموو وشەکانیم بە دروستی نەدەزانی، بە تەلەفۆن لە محەمەدی مەلا کەریم-م پرسی کە دەزانم کاشفی ئایاتی قورئانی لایە، دەقەکەی بۆ گوتمەوە. من لە جیاتی وشەی «الولدان» وشەی «الاطفال» و لە جێی «اخرجنا» وشەی «نجنا» م بۆ دەهات.

لە مرۆدا «شفافية» یێک هەیە ئەگەر زڕ نەبێت دەنگ و ڕەنگێکی پەنامەکان دەداتەوە وەک کە دەزانین گیانلەبەری دەشتودەر هەستی پێش ڕووداو دەکەن...

تا ئێستاش تێ نەگەییشتین، ساڵێک لە ساڵەکانی نێوان حەفتاکان و هەشتاکاندا چوێلەکەی شاری کۆیێ بەچکەکانیان بەخێو نەکردن و لە هێلانەکانیانەوە هەڵیانداشتنە دەرەوە! بۆچی؟ ناشزانم ئایا لە شوێنی دیکەی وڵات ئەو دیاردەیە ڕووی دا یان نا.

54- بەر لە چوونمان بۆ قاوشی ناو سجن کە پێی دەگوترا «قلعة» و هەر قاوشەش ڕەقەمێکی هەبوو، ئێمەیان بردە بەشی ئیدارەی بەندیخانە... هەر بە پێوە بووین هەتا

هەر بەشەبەندیخانە ئەو ناوەی درابوویێ، بۆ ئێمە تەرخان کرابوو. من و کاکە حسێنی خانەقا و عەگید سددیق لە قاوشێک بووین، ساڵح یووسفی و بابەکر پژدەری و یەک دوویەکی دیکەش لە قاوشێکی ئەوبەری حەوشە بەرینەکە بوون. جارێکی دیکە هاتینەوە بۆ «فضل». شەوێکیان بردراین بۆ تەحقیق، ئەوەی لەگەڵ من دەدوا بە «استاذ» ناوی دەهێنام گوتی تۆ و کەستان «متهم» نین دەمانەوێ ئەگەر مەعلوماتێکتان هەبێ پێمانی بڵێن. ڕاستییەکەی هیچ شتێکم نەدەزانی مەگەر ئەو شتەی کە بۆی ئۆتێلیش دەیزانی.

ڕۆژێکیان ڕامسپارد تەلەفۆنم بۆ بکەن لەگەڵ قاسم حەموودی55 - وابزانم ڕێ بە خۆم درا تەلەفۆن بکەم - کەوا لە فلانە شوێنم. بۆ ئێوارێ هاتە لامان. من و کاکە حسێن چووینە ژووری ئیدارە، زۆری پێ هەڵگوتین و بەڵێنی دا بەرەو هەوراز بڕوات

---

دوای چەند سەعات کە بردیانین بۆ بەندیخانە، لەو بەینەدا «یدالله» یان هێنا بردیانە لای محەققەکان، لە هاواری کە دەیکرد دەزاندرا چ توێژینەوەیە دەیکەن... ئاومان داوا کرد... هیچ، هەتا یەکێک هات ناسیاوی کاکە حسێن بوو ئاوی بۆ پەیدا کردین.

ئەو شەوە لە بەندیخانە بووین، بۆ سبەینێ ساڵح یووسفی-یان برد بۆ لێپرسینەوە. پاش چەند ڕۆژێک کە هاتەوە لەبەر ئازاری شانی نارەحەت بوو.

کە گەڕاینەوە بۆ «فضل» و بردیانین بۆ لێپرسینەوە یەک دووانێکی دیکەش لە ئەندامانی وەفد بەگەڵ ئێمە کەوتن لەوانە سەمەدی حاجی مەنجەڵ-م لەبیرە... بردنەکەمان بە شەو بوو، بێ هەڕەشە و تۆقاندن. تەنانەت ئەندامێکی یەکچاوی بەعسی چوار کەسی لە ئێمە سواری ئۆتۆمۆبیلێک کرد. ئەگەر بمانویستایە دەمانتوانی لە دەستانی دەربهێنین... ئەو کابرایە لە تەبیاتەوە بە ئەدەب بوو. لەگەڵ من زۆر کرایەوە بوو، دەیگوت ئەگەر ئارەزۆ بکەیت دەتبەم بۆ سینەما، بەڵام نەدەشیا بێ برادەران بۆ هیچ شوێنێک بچم.

55- قاسم حەموودی خاوەن ڕۆژنامەی «الثورة» بوو کە من لە ١٩٦٠ چەند گوتارێکم تێدا بڵاو کردەوە لە نەقدی خەتی مارکسایەتیی نێو سیاسەت و فەلسەفەی پارتی.

بۆ دوان لە بارمانەوە، یەک فەردە مێوەشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. تەلەبەیەکی پێنجی سانەوییان خستە ژوورەکەمانەوە.56 بەیانییان دەچوو بۆ ئیمتیحان ڕامسپارد بە

---

56- ئەو تەلەبەیەمان دەناسی، «عەبد ئەلحسێن فەیلی» گیرابوو لە پاش هێنان و بردنێک چەند شتێکی درکاند بوو لێی تەئمین بوون، هاتوچۆی هەمیشەیی دەکرد بۆ ئەو شوێنەی «مرکز الفضل» کە ئێمەی بۆ ماوەیەک تێدا ڕاگیراین. کە ئەو تەلەبەیە هاتە پاڵمان دوای بەینۆلکێک لە فرسەتدا «عەبد ئەلحسێن» بانگی کردمە دەرەوەی ژوورەکەمان- گوتم تکەلبچنی- واتە کەلەپچەم دەکەیت؟ گوتی: «لا کاکە هذا الطالب جاسوس علیکم - ئەم قوتابییە جاسووسە بە سەرتانەوە» منیش بە توورەیی و دەنگی بەرزەوە گەڕامەوە ژوورەکە و گلەیی قورسم ڕاماڵی حیزب و چەکدار و هەرای بێلزووم کرد... ئەو قوتابییە قسەکانی قۆستەوە و گوتی ئێوە کە وەها هەست دەکەن بۆچی لەگەڵ حکوومەت نادوێن، ئەمانە و شتی دیکەشی گوت کە زانیم بۆچی بە پاڵەپەستۆی شوێنبزری هێنایانە لامان... لەگەڵ ئەمەشدا باوەڕ ناکەم ئەو کابرایە زمانی خراپی لێ گێرابین چونکە ڕەفتاری سەرپەرشتانی مرکز الفضل پتر بەلای موداراوە دەچوو لەگەڵماندا. من برادەرانم تێ گەیاندن ئەو تەلەبەیە ڕاسپاردەی حکوومەتە. «عەبد ئەلحسێن» وای زانیبوو کە ئێمە بەڕێ کراین لە بەغداوە بۆ کوردستان جارێکی دیکە ناگەڕێینەوە بۆ بەغدا. کە گەڕاینەوە بۆ «مرکز الفضل» لە هەڵکەوتێکدا و زووبەزوو بە دابزڕکاوییەوە بە ساڵح یووسفی گوت: من هەرچی هەیە و نییە لە چاکە و خراپەی لکی پێنجەمی حیزبم (لکی بەغدا) خستۆتە ئەستۆی تۆوە کە بەلامەوە دەستی کەست ناگاتێ... دواتریش دەرکەوت ئەو قسەیە لە «عەبد ئەلحسێن»ـەوە بە زۆر کەوت لەسەر ساڵح یووسفی... «عەبد ئەلحسێن» تا ئەوساش بەرچاوی چەپەی ڕەش داگەڕابوو.

خوێنەر لێم بە داوێوە نەکات کە بە دوا کاتەوە دەوروتەسلیمی حیسابی کۆنی بۆ دەکەمەوە، ئەگەر دەرفەت هەبایە حەزم دەکرد لە سەرەتاوە هەموو ئاردی ناو هەنبانی دڵ و دەروونم بۆ هەڵڕشتبایە بەڵام لە هەوەڵەوە، لە هەشتاکاندا و لە قەوارەی گۆڤاردا، ئەو هەموو داستانانەی کە لە پۆرگی هەناومدا دەجریوێنن ڕێی باڵەفڕەیان بۆ دەرەوەی دەروون نەبوو و ئێستاش هەر نییە مەگەر کەمتاکورتێکی

حسێن جەمیل ڕابگەیەنێ پانکە و نوێنم دەوێ، بشچێتە لای محامی مەزهەر عەززاوی ٥٠ دینارم بۆ لێ وەربگرێت. حسێن جەمیل و مەزهەر عەززاوی جگە لەوەی پانکە و نوێن و پارەکەیان نارد خۆشیان هاتنە سەردانم بەڵام نەکرا بیانبینم.

جارێکی دیکە چووینەوە بەندیخانەی مەرکەزی، ڕۆژی ٣/٧/١٩٦٣ هەراکەی «معسکر الرشید» بوو، وەزیری داخلیە و خارجیە لەلایەن ئاژاوەچییەکانەوە گیران بەڵام سەلامەت دەرچوون، هەراکەش کوژایەوە. ئێوارەی ئەو ڕۆژە شاهێن تاڵەبانی هات گوتی سبەی ئێوارە وەزیری داخلیە بە دوای سێ کەستاندا دەنێرێ. سبەینێ لە معاددا بە دواماندا هاتن. کاکە حسێنی خانەقا و بابەکر پژدەری و منی داواکردبوو. من سێیەم بووم لە چوونە لای وەزیر. چاوڕوونیی سەلامەتیی ڕۆژی پێشووم لێ کرد پێشییەوە دیار بوو خەتەرێکی کوشندەی تێپەڕاندووە. دوای موجامەلە، گوتی عەشایری ڕانیە و پژدەر دەیانەوێ لەگەڵ حکوومەت ڕێک بکەونەوە «او بالأحری یستسلمون» وا دیارە متمانە بە ئێوە دەکەن داوایان کردوون کە لەو مەسەلەیە ئاگادار بن سبەینێ هەرسێکتان دەچن بۆ کەرکووک لەوێوەش بۆ ڕانیە.

دەبوو بڵێم جارێ هەر لە «فضل» بووین کاکە حەمەی خانەقا سەری لێ دەداین. تێی گەیاندین کە لەلایەن مدیری ئەمنی کەرکووکەوە «نووری خەیات - نوري خیاط» پێوەندی پێوە کراوە بۆ هەوڵی ئاشتبوونەوەیەک و کوژاندنەوەی ئاگری شەڕ، لەو هەوڵدانەش تەمایەک هەیە بە کەسانی وەکوو ئێمەی ناسیاو دۆست و خزم بە عەشایەری ڕانیە و پژدەر و کۆیە. دیارە ڕێککەوتێکی لەبار بووە بۆ هەوڵەکەی مدیری ئەمنی کەرکووک، نووری خەیات، کە خاڵەکانم و پژدەرییەکان و دۆستەکانیان داوای هەرسێکمانیان کردبوو بۆ ناوبژی کردن. من دەزانم خاڵەکانم زۆروکەم ئاگاداری نیازەکەی نووری نەبوون، دەیانویست لە ڕێی داوا کردنی ئێمەوە

---

بابەتی ئەوتۆیی کە تا ڕادەیەک هی باس لێوە کردن و جێی خۆشامەدی خوێنەری عادەتیشە.

تەجرەبەی هەرە گەورە فراژیبوونی هەست و هۆش و ڕەسینی بیروباوەڕە بە دەوری ڕووداو و تەجرەبەی شەخسی و تەنک هەڵبڕینەوە و وردەژمێری لێکدانەوەی دوور و قووڵە.

بۆ ناوبژی کردن ڕزگارمان بکەن. دواتریش لە قسەکانم دەردەکەوێ چییان بەچاوەوە گرتبوو لەو هەوڵوتەقەڵایەیان.

سبەینێ هەرسێکمان بە تەیارە چووینە کەرکووک. کاکە حەمە و نووری خەیات و کەمالی عوسماناغا چاوەنۆڕییان دەکردین. دەرکەوت لە پاش کوژرانی عەبدولکەریم، کەمال بەینێک خۆی شاردبۆوە دواتر بە ناوی هاریکاری لەگەڵ حکوومەت، کە حکوومەتیش پێویستی بە شارەزایی کەمال هەبوو، خۆی لە حیزب نزیک کردبۆوە بەڵام دەسەڵاتی جارانی نەمابوو بە بەڵگەی ئەوەی کە لەوەندەی تەیارەخانە نەبێ نەمان دیتەوە. لە جێگایەکی حکوومەتی مێوان بووین بێ ئەوەی ڕێ هەبێ لێی دەرچین، خزمەتی باشمان کرا و کاکە حسێن بەتەلەفۆن لەگەڵماڵەوە دوا. دوای مەغریب زەعیم ڕوکن «سەعید قەتتان - سعيد القطان - قائد قوة الميدان» کە هەموو مەیدانی حەرەکات لە ژێر دەسەڵاتیدا بوو، لەگەڵ زعیم «سعيد الصقلي» و زعیم «عبدالجبار شنشل» و نووری خەیات هاتنە لامان. سەعید قەتتان مرۆیەک بوو هەتا بڵێی بەئەدەب و نیازپاک و دەستخاوێن (نەختێکی دیکە بەڵگەی دەستخاوێنییەکەت پێ دەڵێم). چەندی خەیاڵ بکەیت وتووێژی حورمەتکارانە و بەرەو ئومێد و پشتەو شەڕ بوو.

سبەینێ دوای بەرچایی بە هەلیکۆپتەرێکی «مبطن» - کە دەنگ کەم دەکاتەوە و پیاو دەتوانێ قسە ببیەت - وەختی خۆی عەبدولکەریم سواری دەبوو، لەگەڵ سەعید قەتتان و نووری خەیات و کاکە حسێنی خانەقا و بابەکر پژدەری و کاکە حەمە بەڕێ کەوتین. بە دامەن کۆیەدا تێپەڕین، سەرنجم گرت ئێمە لە سەفین بەرزتر بووین. ڕەشانگ لەو ناوە زۆر بوو. لە مەقرِی لیوای (وابزانم) بیست کە زەعیم سددیق ئامیری بوو دابەزین. سەعید قەتتان ئەوەندە نەجیب بوو پێش من و کاکە حسێن نەدەکەوت بەوەدا سددیق مستەفا-ش کەوتە دوامانەوە. ئەم پیاوەتییەی قەتتان مەبەستێکی تایبەتیشی تێدا بوو کە سددیق مستەفا بزانێ ئێمە خۆراکی ئەو نین. دوای نانی نیوەڕۆ سەعید قەتتان گەڕایەوە. لەو ماوەی دانیشتنمان پێش نان خواردن بە تەیارەچییەکەم گوت بەرزایی فڕینمان لە ٢١٠٠ مەتر کەمتر نەبوو. گوتی لە ١٧٥٠ تێپەڕمان نەکردووە. ئەو دەنگی دلێر بوو بە بارۆمەتر منیش پشت ئەستوور بوو بە بەرزایی سەفین کە ١٩٧٠ مەترە. دوایی بە بیریدا هات گوتی من مەبەستم ١٧٥٠ مەتر لە ڕێگای کەرکووکەوە نەک لە دەریا. کەرکووک دەوری

٣٣٠ مەترێک هەیە، بەو پێیە ئێمە ٢٠٨٠ مەتر بەرز بووین. ئەو ڕۆژە شەشی تەمووز بوو، قەندیل و هەڵگورد جارێ بەفریان زۆر پێوە بوو بەڵام لە چاو ڕۆژانی ٩ و ١٢ حوزێران کە لە بەغداوە هاتین و بۆی چووینەوە تەواوێکیان لێ ڕەش بووبۆوە.

لەو ڕیزە خانووەی ڕانیە بەسەر ڕێی کۆیەوە کە بەشێکی بۆ سددیق مستەفا و گرووپی قیادەی لیوا و دکتۆر و هەندێک لە زاپتەکان تەرخان کرابوو خانوویەک بۆ ئێمە خاوێن کرایەوە و کەلووپەلی پێویستی تێخرا. نووری خەیات زاوای جەمال ڕەفعەت بوو کە ناسیاوم بوو، باوکی جەمالیشم دەناسی. نووری یارانی و مەشرەبخۆش بوو لە عادەتی عەشیرەت و دەستوراتی کۆمەڵایەتی شارەزا بوو، پێشی گوتین هەرچییەکی بە لای ئێمەوە باش بێ ئەوە دەکات بۆ کوێ بڵێین لەگەڵمان دێت چونکە باوەڕی بە قسە و بەڵێنمان هەیە. (بەکردەوەش ئیسپاتی قسەی خۆی کرد).

دەبوو یەکێکی باوەڕپێکراو لەو دیوی پژدەرەوە داوا بکەین کە بێتە لامان و لە بارەی ئەوەی گرووپی براگەورەکان ویستوویانە بیلێین و بۆ چاکەی هەموو ناوچەکە وتوویژ و ڕاسپاردە و چی پێویست بێ قسەمان لەگەڵدا بکات. ڕانیە کێشکەکوژی لێ نەمابوو بەڵام سبەینێ حەویزی بەرید کە ناسیاوم بوو هاتەوە ڕانیە. بە دواماندا هەنارد، کاغەزێکم پێ دا کە بیگەیەنێتە پژدەر و تەسلیم بە شێخ حسێنی حاجی سەید و دۆستەکانی بکات بۆ ئەوەی خاڵە جنێدم بێتە لامان لە بارەی تێکگەیشتن و بەرژەوەندی گشتییەوە بدوێین. سێ ڕۆژی پێ چوو هەتا ئێوارەیەکیان دنیا تاریک داهاتبوو، ڕانیەیی (وابزانم حەویز خۆی بوو) خەبەریان هێنا کە خاڵە جنێدم هاتووە نازانێ چۆن بێتە لامان. ڕێگە کراوەیە و خاڵم هات بەڵام هێندە بە گومان بوو لە سددیق مستەفا ئەگەر پەرۆشی ئێمە نەبایە ڕانیەت لەسەر تاپۆ کردبایە نەدەهاتە جغزی دەسەڵاتییەوە. خاڵم ئەحمەدی برایماغای ڕەمکی لەگەڵدا بوو (نازانم کێی دیکەش) پیاوێکی درۆزنۆکەی بێزەرەری هەتا بڵێی دڵسۆز بۆ خاڵەکانم و زۆریش خاتری منی دەویست. هاتنەکەی لەوپەڕی دڵسۆزییەوە بوو. ئەو ئەحمەداغایە زۆرمان بە هانا هات لە پەیدا کردنی ماست و گیسکی قەڵەو و پەنیری تازەگوشراو. ڕۆژانە، مەگەر چۆن، سەری دەداین، بە دەستی بەتاڵیش نەدەهات ئێمەش نەمان دەهێشت لە زەرەردا بێت.

نووری خەیات پاش بەخێرهێنانی خاڵم لێمان دوورکەوتەوە بە ئارەزۆی دڵ لەگەڵی بدوێین. زاپت ڕوکنی لیوا پێی گوتبوو چۆن بەجێیان دەهێڵیت؟ گوتبووی من بەرپرسم، باوەڕی هەموو دنیام پێیان هەیە. دوورودرێژ دواین مەسەلەمان بە هەموو ڕوویەکدا لێک دایەوە هەر ئەوەمان بۆ ڕوون دەبۆوە کە نزیکبوونەوەیان بۆ تەفاهوم لە چاکە بەولاوەی تێدا نییە، ڕەنگە بکێشێتەوە بۆ ئاشتیی گشتی، هەر کە سەرکەوتنیش لەو تەفاهومە وەیا نزیکبوونەوەیە دەست نەکەوت بە دوو دەقیقە دەچنەوە دۆخی جاران و هەرا دەستی هەموان ماچ دەکات. ئێمە دەمانزانی سەعید قەتتان و مدیری ئەمن ئامادەی هەموو جۆرە ڕێککەوتنێکن بۆ ئەو ئامانجەش دەبزوون، هەڵبەت عەشایریش دەتوانێ داوا بکات جعزی ئاشتی لێک بکێشرێتەوە تا ئەوەی هەموو لایەک بگرێتەوە. خاڵم ئەوەیشی بۆ ڕوون کردینەوە کە شێخ حسێن لە پێشەوە مەبەستی ڕزگاربوونی ئێمە و ئەندامەکانی دیکەی وەفدەکەن. (دواتر زانیم، لەو فکرەدا بوون کە ڕزگار کردنی ئێمە بە هەر نرخێک بێ بمان کڕێتەوە).

لە نموونەی کاروباری ئەم دنیایە سەرەوبنە دەڵێم کە کاغەزی من گەیشتبووە شێخ حسێن و بۆ خەڵقەکەی خوێندبۆوە یەکێکی پەنابەری دوای شوباتی ۱۹۶۳ کە لە ترسی مردن هەڵاتبوو گوتبووی کاغەزەکە خراپ نییە ئەگەر هیچی نهێنی لە پشتەوە نەبێ. شێخ حسێن گوتبووی من دەلیلی ڕاستیی خۆمم پێیە. دێی خۆم و دێی ئامۆزام کاول بووە، خاڵۆزا و خوارزام لە بەندیخانەن، سبەینێش کە جەیش هات بۆ پژدەر چی هەیە کاول دەبێت ئەمما جەنابت بە خۆت و جانتایەکەتەوە هاتوویت کەس نازانێ جاسووسی چەند دەوڵەتانی، کە پژدەریش کاول بوو بەخۆت و جانتاتەوە دەچییە سەر هۆو لووتە شاخە، کوردی گوتەنی ئێرە نا دێرە.

دوای کۆبوونەوەی مەحرەمانەمان نووری خەیات بە تەکلیفی ئێمە هاتە لامان، ئەویش چی چاک بوو بۆ ئاشتی ئەوەی گوت. پاش یەک دوو هاتووچۆی دیکەی خاڵم، بڕیار درا شەوێکیان من و کاکە حەمە لەگەڵ نووری خەیات بچینە کوێرە دێی هەنجیرە بە شاخی کێوەڕەشی ڕانیەوە دیدەنی لەگەڵ ڕەئیس عەشیرەت و براگەورە و بەرپرسی چەکداران بکەین. سددیق مستەفا گوتبووی بە نووری خەیات، چۆن زات دەکەیت بەو شەوە تاریکە بچیتە ناو «متمردین»؟ پێی گوتبۆوە من لە شەرەفی ئەو خەڵقە دڵنیام ئامادەم هەتا ئەو پەڕی دنیا لەگەڵ ئەو دوو کەسە بڕۆم.

لە شەوی قەرارداده کاکە حەمە و نووری خەیات و من بە جیپێک تا بناری کێوەڕەش لە هەرێمی هەنجیرە ڕۆییشتین لەوە بەولاوە سواری وڵاخ بووین سەرکەوتین بە تاریکیدا تا لە جێگەیەک دابەزین. کۆمەڵەی براگەوران لە ژووررووی ئێمەوە بە پەنجا مەترێک چاوەنۆڕییان دەکردین، کە گوتیان فەرموون دیسان نووری خەیات خۆی پاش یەخست و گوتی کاتێک لە قسەی خۆتان بوونەوە بانگم بکەن.

دەمی بەیەکتر گەیشتنمان لەگەڵ ئەو قەڵەباڵغییەی خزم و دۆستان کەوا تاریکایی شەو لە خۆی لوول دابوون تا بڵێی بە سۆز بوو. بەینێک مەحرەمانە دواین. ڕووی قسەم لە هەموان کرد بەتایبەتی لە عەباسی مامەنداغا (کە خۆگنخاندنی بەر لە دوو ساڵ بۆ چوونە لای زەعیم کێشایەوە سەر پسانی داوەمووی موعاوییە) و گوتم، ئەگەر شەرمی «وەعدە بە خیلافی» نەبێ ئێستا منیش وەکوو ئێوەم، ئازادی ناو ئەم شاخوداخەم، دەتوانم بڵێم فەرموو فلاناغا ئەمجار نۆرەی جەنابتە بچیتە مێوانەتی لای زەعیم سددیق مستەفا، خۆ کەس «لوح المحفوظي» نەخوێندۆتەوە کە هەر دەبێ من قوربانی بم کە دەزانن هیچ شتێک بە قسەی من نەکراوە. ئەوەشتان پێ بڵێم، چی نووری خەیات بۆ فەرمانی خۆی کردی هیچ کامێکتان بۆ کوردستانی ناکەن.

نووری خەیاتمان بانگ کرد دوای قسەی دۆستانە و ئەوپەڕی دەربڕینی نیازی چاکە لەوەوە کۆمەڵەی براگەوران پێ یان گوت، هەموو لایەک حەز دەکەین هەرا بەرتەرەف بێت و خەڵق بحەسێتەوە. دیارە ئێمە حەز ناکەین چی دیکە وڵاتمان کاول بێت، ئێستا پێویستە بۆ دڵنیایی هەموو لایەکمان حکوومەت بە مەبەستی دەربڕینی نیازی چاکە وەفدی کورد بەر بدات، دواتریش دەرگەی ئاشتی بۆ هەموو کورد بکرێتەوە نەک هەر ئێمە چونکە هەرا بە دانیشتنەوەی ئێمە نابڕێتەوە. کەسیشمان نە پارە و پوول و نە مڵک و ماڵمان دەوێت (بەرقیە هاتبوو بۆ سددیق مستەفا کە دەتوانێ پارە بەو برا گەورانە بدات، لە ئاست ناوی عەباساغای مامەنداغا بیست هەزار دینار دیاری کرابوو کە دەشێ لێشی زیاد بکرێ. من خۆم ئەو بەرقییەم دیت).

ویڕای بەردانی ئەندامانی وەفد و کردنەوەی دەرگەی ئاشتی، لابەلایی، قسە لەوەش کرا کە ویرانبووەکان تەعمیر بکرێنەوە و خزمەتی سەقافەتی کوردی بکرێت... و... هتد. لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو پژدەر و بەردەر و نوێنەری حیزب بەشدار بوون.

دیسان بە سواری و بە جیب ماوەمان بەرەو مەعەسکەر بڕی کاتێک گەیشتینەوە شوێنەکەی خۆمان نزیکی ڕۆژهەڵات بوو. نووری خەیات یەکسەر بە بروسکە داوای هەلۆکۆپتەرێکی کرد کە پێی بچێتەوە بۆ لای سەعید قەتتان لە کەرکووک سەعاتێکی نەبرد کۆپتەر گەیشت. بە کاکە حەمەی گوت لەگەڵی بڕوات گوتی منی بۆچییە... گوتی چۆن بۆچییە، تۆ لەولەبی کارەکەی... خولاسە هەردوویان بەو کۆپتەرە کۆنە گەڕانەوە بۆ کەرکووک. کۆپتەرەکە وەکوو قازی قورس بە ئەرک ڕەهەوا کەوت. ئەو ڕۆژە ڕۆیی تا شەویش ڕاشکا چ دەنگێکیان نەبوو. شەو خەونێکم دیت، ناوناوە خەونی ڕاست دەبینم. کە لە ئینزیباتخانەی کەرکووکیش بووین، شەوی نێوان ۱۱ و ۱۲ حوزێران کە بۆ سبەینێ بردراینەوە بەغدا سۆسەیەکی دەروونیم بە ڕاست گەڕا کە لزووم نابینم باسیان بکەم.57

سبەینێ دوای بەرچایی گرەی کۆپتەرێک هات، چوومە دیاری، کۆمەڵێکی لێ دەرهات نووری خەیات و کاکە حەمە-یان لەگەڵدا نەبوون. خەڵقەکەی لێی هاتنە خوارێ پێبەپێ لایان دایە خانووەکانی نزیکتر لەوان، یەکێکیان کەڵەگەتێک بوو (لە خەونمدا کەڵەگەتێکم دیت) بە لای ئێمەوە هات تا نزیک بۆوە. ئەوڕەحمانی شێخ حەمە ساڵحی کەرکووک و خزمی خانەقا بوو. بەخێرهاتنمان کرد گوتی کوا کاک حسێن بۆ لای ئەو هاتووم. لەگەڵیدا چووینە ژوورەوە... دوای نەختێک زمانگرتن و

---

57- لە خەوندا وەها هاتە بەر چاوم لە باداوەی مەلا ئەفەندی لەگەڵ عیززەددین بەیەکەوە لە پێش هەیوانی ژێرەوەی دیوەخانە ڕاوەستاوین دیتمان تەیارەیەک بەلای گونبەدی مەرقەدی مردووانەوە نیشت، یەکێکی باڵابەرزی لێ هاتە دەرێ بەرەو لای ئێمەوە هات، چاوەڕوان بووم سەلام بکات، گوتی بۆ لای ئێوە نەهاتووم و بەرەو ژووری ماڵەوە ڕۆیی. ئەو سۆسەیەی شەوی نێوان ۱۱ و ۱۲ ی حوزەیرانیش ئەوە بوو کە لە پەراوێزی لاپەڕەی ئەم چاپی دووەمەی گەشتەکەمدا مەیلەو بە درێژی نووسراوە. من و بابەکر پژدەری بەدیار کۆپتەرەکەوە لە دەرەوە ڕاوەستابووین، کاکە حسێن لە ژوورەوە بوو.

قسه جووینەوە دایە گریان و گوتی دوێنێ ئێوارە لە گەڕانەوەدا بەرەو ڕانیە کۆپتەرەکەی نووری خەیات و کاکە حەمەی تێدا بووە لە نزیک ڕێدار (شوان) دەکەوێت، لە ناویاندا کاکە حەمە گیان دەسپێرێت، هاتووم بە دواتدا. وەی برا لە حاڵی وەهادا کۆست کەوتن زاڵمە.

تێک هەڵاتنی وێنەی بزرکاوی دەروون و هەست بە دنیا کردن بۆ ماوەیەک، چەند چرکەیەکی سەعات، ڕووناکایی لێڵ کرد لەبەر چاوانم. کاکە حسێن لەو ڕۆژەوە هەتا مەرگی لە حزێرانی ١٩٨٤ بە نیوەزیندوو حیساب دەکرا چونکە گومان نییە لەوەدا کە کاکە حەمەی لە خۆی خۆشتردەویست. کاکە حسێن بەو کۆپتەرە لەگەڵ شێخ ئەوڕەحمان چووە کەرکووک. نووری خەیات پەلاسووی شکابوون. معاونێکی خۆی بە هەموو دەسەڵاتێکی کە لە دەست خۆیدا هەبوو عەباس وەنداوی هەنارد. ڕەنگە ئەو ڕۆژە نۆزدە وەیا بیستی تەمووزی ١٩٦٣ بووبێ. نووری خەیات دواتر بۆی گێڕامەوە، لە کەرکووک داخوازییەکانی جەماعەت بە ئامر قوەی مەیدان، سەعید قەتتان، ڕادەگەیەنێ ئەویش بە سەرۆکایەتیی شۆڕشی دەدا لە بەغدا لەگەڵ پەسەند کردنی سەلماندنی داخوازییەکان. هەمان ڕۆژ وەڵامی موافەقەی بەغدا دێتەوە بۆ کەرکووک ئیتر نووری خەیات لە خۆشییان بەو ئێوارەیە و هەمان تەیارەی چەپڵەک بەرەو ڕانیە لەگەڵ کاکە حەمە دێن و دەکەون.

عەباس وەنداوی هاتە لامان و گوتی حکوومەت سەلماندوویەتیی جارێ ئەو ئەندامانەی حیزبی نین بەربدرێن. بە ئاگاداری سددیق مستەفا من وێنەی بەرقیەیەکەم ڕێک خست بۆ بەردانی کاکە حسێن، سەمەدی حاجی محەمەد، بابەکر پژدەری و خۆم و هەڵگرتنی حیجز لەسەر ماڵە حیجز کراوەکەی محەمەد سەعدی خەفاف و ڕەشید عارف کە خۆیان چووبوونە دەرەوە. بەرقیەکە بۆ سەرۆکایەتیی شۆڕشی بەغدا و بە ئیمزای سددیق مستەفا بەرێ کرا. لە پەخشی ئەخباری سەعات هەشتی ئێوارێ بەیانێکی قیادەی شۆڕش بە بەردانی ئێمە و هەڵگرتنی حیجزی ئەو دوو کەسە بڵاوکرایەوە بەڵام هەتا بڵێی لە قاڵبی حورمەتدا بوو. یەک وشەی نەهێنابۆوە شکستی ئێمەی تێدا بێت، دەشبوو وەهابێت چونکە هەر دالەنگاندنێکی ئێمە هەبایە تێیدا دەیکێشایەوە بۆ خاوبوونەوەی چالاکیی لایەنی ئێمە لە پێناو ئەو ڕێککەوتنەدا. بەر لە چەند ڕۆژێک بەرقیەی کوردێکی زۆر گەورەی خوێندەوە، لە شێوەی دەخالەت کردن بە قائد فرقەی کرکووک دارڕشترابوو.

ئەو ئێوارەیە بیستی تەمووز بوو، سددیق مستەفا هات و موبارەکبادیی لێ کردین، هەروەهاش زوربەی زاپتەکان و گەلێکیش لە جوندیەکان کە خەڵقی دەوروبەری خانەقین بوون. سددیق مستەفا پێمی گوت ئێستاکە ئازادیت بۆ هەر کوێیەک بتەوێ دەتوانێ سەفەر بکەیت. ئەو شەوە من و عەباس وەنداوی ژوانمان هەبوو کۆبینەوە لەگەڵ سەرۆکەکان لە دێی سەرکەپکان. دەوری نوێژی عیشا بە جیپ ڕۆیشتین.

لەو کۆبوونەوەیەدا قسە لەوە کرا کە نوێنەرێکی گەورەی حیزب و حکوومەت دەیەوێ بێت بۆ دیدەنی جەماعەت و ڕێککەوتن لەسەر جۆری نانەوەی ئاشتی. بەڵێن درا کە دوای چەند ڕۆژێک خەبەری لێ دەگێڕنەوە بۆ دیاری کردنی ڕۆژی یەکتر دیتن لەگەڵ ئەو نوێنەرەدا. من مەیلم بوو بچم بۆ پژدەر چونکە لە هەشتی حوزێرانەوە ماڵ و منداڵم کۆیەیان بەجێ هێشتبوو مێوانی ماڵی شێخ حەسەن براگەورەی شێخ حسێن بوون لە پژدەر کە گەرما تینی هێنابوو هەردوو ماڵ بەیەکەوە چووبوونە کوێستان لە هەواری شیلانە لە ٣-٤ سەعات ڕێ بە سواری لە دێی هێرۆوە دوورە. عەباس وەنداوی زۆری پەلە کرد نەچم پێم گوت جگە لەوەی کە خۆم حەز بە دیتنی دەوەنی کوڕم دەکەم، بوونیشم لەوێ یاریدەی زوو کردن لە پێکهێنانی کۆبوونەوەکە دەدات. بە سواری لەگەڵ خالان و هەندێک دۆستی دیکە کەوتینە ڕێ بەرەو دەربەند. لە سەنگەسەری کۆنەوە بە ئۆتۆمۆبیل چوومە قەڵادزە. پاش ڕۆژهەڵات گەیشتمە قۆناغ. هەر ئەو ڕۆژە، دیسان بە ئۆتۆمۆبیل گەیشتمە هێرۆ، لەوێوە بە سواری ڕۆیشتم، فارووقی برام و حەمە عەلی ئامۆزام و خەڵقی دیکەش لەگەڵم بوون. پێش ڕۆژاوا گەیشتینە شیلانە. بەڕاستی لە پاش عەزابی ئەو مانگ و دوازدە ڕۆژە کە خۆم لە فێنکایی هەوارێکی گەش و سەوزی ٢١٠٠ مەتر بەرز لە ناو خاوخێزانی خۆمدا ببینمەوە هەستم دەکرد لە بەهەشتم. بەسەر ڕێگاوە باخچەیەک لە سنووری نێوان دار و بێداری شاخ هەبوو تازە شاتووی پێگەیشتبوو، سێو هەر هێندەی دەنکە فاسۆلیا خڕ هەڵاتبوو. دەوەن حەفت مانگی بوو وەک تۆپ خڕ بووبوو گەشەی دەهات.

ئەو هۆبەیە ماڵی سەلیمی حاجیاغای لێ بوو، جیرانەتیمان زۆر خۆش بوو.
سەردەشت لە دوورایی سێ سەعات ڕێ بوو بە سواری. هەموو پێداویستی ماڵ لە سەردەشت دەکڕدرا چونکە نیو هێندەی قەڵادزە دوور بوو کە هیچیشی لێ چنگ

نەدەکەوت. بۆ پێکهێنانی کۆبوونەوەی عەشایەر لەگەڵ نوێنەری حکوومەت چەندین نامە لە بەیندا هاتووچۆی کرد. وا پەسەند دەکەم دەقی چەند دانەیەکیان کە پارێزراون لێرەدا بخەمە بەر چاوی خوێنەر بە شادیەی ڕووداو. لە پێشەوە دەقی ئیزندانی خاڵە جنێدم بۆ هاتنە ناو مەعەسکەر دەنووسمەوە بێ دەستدان لە ڕێنووس و هیچ شتێکی. ئیزنەکە تەئریخی پێوە نییە:

*یسمح للشیخ جنید بالحضور الی المعسکر هذه اللیلة ولعدم التعرض الیه وقعنا.*

*ئیمزا*

*الرئیس الرکن ضابط الاستخبارات*

لە ژێرییەوە من نووسیومە:

*خاڵە جنید بەخێربێی وا چاوەنۆرت دەکەین دەبێ زوو تشریف بێنی.*

*خوارزات*

*ئیمزا*

*مسعود ملا محمد*

ئەمەش دەقی نامەیەکە کە دەردەکەوێ وەڵامی نامەی پێ دەداتەوە، لە زەعیم سددیق مستەفاوە:

رانیه - ٢٢/ تموز/٦٣

السید الاخ محمد المحترم

تحیة طیبة

وصلتنا رسالتکم المؤرخة ٢١/٧ وارسلنا فحواها الی المسؤولین واننا لمتفائلون ایضا بحل القضیة سلمیا ونود ان نخبرکم بان المسؤولین في بغداد اظهروا کثیرا من حسن النیة وهم

يرجون ان تبرهنوا على حسن نواياكم التي نثق بها. وقد اخبرنا السيد الزعيم الركن سعيد القطان بان السيد وزير الدفاع قد بين له بان المماطلة سوف تزرع بذور الشك ولاتغير في حل المشكلة وسيحضر المسؤول للاجتماع بالجماعة في سيدا [مەبەستی سەیداوەیە] وبالوقت المعين نرجو بذل المزيد من جهودكم المشكورة وتفانيكم في اقناعهم لتسوية القضية سلميا والتي هي في صالحهم بالدرجة الاولى. الزعيم سعيد يشكركم كثيرا على جهودكم ويخصكم والاخ السيد بابكر، سلامي الى الجميع والى لقاء قريب.

ئیمزا
الزعيم صديق مصطفى

ئەمەش دەقی کاغەزی زابت ئیستیخباراتە کە کاغەزی زەعیم سدیقی پێوە ناردووە بۆم:

السيد الاخ كاكه مسعود

اسعدت صباحا

اخي نرسل لك بيد حامل رسالتي هذه رسالة زعيم صديق نرجو ان تكون قد وصلتكم. اخي نرجو ارسال شخص ممن تعتمدون عليه مع الجماعة الى قرية سيدا لنصب خيمة للاجتماع وتهيئة الشاي و محلات الاستراحة للاشتراك مع الجنود على ان يكون هو والجماعة موجودين في صباح يوم ٢٥/٧ وشكرا. تحياتي للاخ العزيز بابكر وارجو لكما الموفقية الدائمة ودمتم.

ئیمزا
الرئيس الركن فيصل عبدالحليم - ٢٣/٧/١٩٦٣

لە کاغەزی زەعیم سدیق دەردەکەوێ کەوا من دوای چوونم بۆ قەڵادزە هەر لەوێوە بە تەئریخی ٢١/٧/١٩٦٣ نامەم بۆ نووسیوە بۆ ڕەواندنەوەی گومانێکی بە دڵاندا بێت لە نەگەڕانەوەم بۆ مەعسەکەر و ڕۆیشتنم بۆ پژدەر چونکە لە ئێوارەی ٢٠/٧ دوای بڵاوکرانەوەی بڕیاری بەربوونمان چووم بۆ سەرکەپکان و لەوێوەش بۆ قەڵادزە. دیارە بەتەما بوون هەر بەگەیشتنم بۆ لای خزمان شریتپێچیان دەکەم و دەیانگەیەنمە سەیداوای خاڵە خدرم کە ئەوسا چۆڵیش و وێرانیش بوو. لەم بارەیەوە داوای مۆڵەت کرا تا دەنگ دەگاتە ئەو هەموو خەڵقە. من جێگەم دوور بوو، هەموو

ڕۆژێک دەنگم نەدەگەیشتە جێگەی مەبەست. لەم دەقەی کاغەزی سددیق مستەفا ئەم لایەنە ڕوون دەبێتەوە، کاغەزەکە مێژووی بەسەرەوە نییە:

من الزعيم صديق مصطفى امر جحفل لواء العشرين

الى شيخ حسين بوسكين وباپيراغا

السلام عليكم

لقد وافق المجلس الوطني لقيادة الثورة على تحديد المدة خمسة ايام بناء على طلبكم اعتبارا من يوم ٢٨/٧ ولغاية ١/٨ و قد ارسلنا رسالة بذلك الى المحامي مسعود محمد لاخباركم. نحن في انتظار جوابكم على الرسالة ونؤكد ضرورة ورود الجواب صباح يوم ١/٨ لاخبار الحكومة والمجلس الوطني بقراركم النهائي.

ئيمزا
الزعيم صديق مصطفي
امر جحفل لواء العشرين

ئەمەش دەقی هەندێ شوێنی نامەیەکی درێژە کە لە نووری خەیاتەوە بۆم هاتووە، ئەوسا جارێ ئازاری پەڵاسووەکانی نارەحەتی دەکرد:

كركوك ٢٩/٧/١٩٦٣

الى الاخ الكريم كاكه مسعود محمد المحترم

بعد التحية والاحترام ارجو لكم وللاخوان الشيخ حسين واغوات بشدر الصحة والموفقة.

بعد ان استلمنا رسالتكم الموجهة الى السيد وزير الداخلية تجمعت المساعي للخير وحصلت تاكيدات حسن النية ووافقت الحكومة على الطلب الاخير وانني اشعر بكل اخلاص ماتعانيه انت بالذات... واعتقد ان التفكير والخوف من القال والقيل مقابل المآسي التي تحصل على الناس وتفصيل الخوف من القال والقيل والاستمرار من هذا الخوف مدة اطول قد يكون نوعا من الانانية و عليه ارجو المعذرة من كلامي... فارجو من اخي ان يفهم الجماعة بانهاء الحالة في المنطقة لكي ننتقل الي القضية العامة... وانني واثق حسب معلوماتي التي استقيتها من المنطقة ومن الاهالي وعامة الفقراء واهل القرى انهم وايديهم الى السماء يرغبون في اعادة الامن الى المنطقة في يوم اسرع... وختاما لابد اننا نلتقي في الموعد عن قريب ارجو ابلاغ تحياتي الى الاخوان جميعا.

ئیمزا

اخیکم نوري الخیاط

ملاحظة: ان الاخ المعاون عباس موجود في رانیه لادامة الاتصالات...

پاش بەسەرچوونی پێنج ڕۆژ سەرلەنوێ داوای مۆڵەتی پازدە ڕۆژ کرا. ئەمە دەقی کاغەزی معاون مدیر ئەمنی کەرکووک عەبباس وەنداوییە بۆ شێخ حسێنی حاجی سەید لە بارەی مۆڵەتەکەوە ڕۆژی ٣/٨/١٩٦٣ نووسراوە:

عزیزي الاخ الشیخ حسین بوسکین المحترم

اسعد الله اوقاتکم وارجو لکم الصحة والعافیة.

حسب المداولة التي جرت بینکم و بین الاخ کاکه حویز وافقت الحکومة على المدة التى طلبتموها وهي خمسة عشرة یوما یرجى اکمال المداولات في المدة المذکورة. والحکومة باستعداد للملاقاة معکم بعدها یرجى اشعار السلطة بواسطة مقر قوة کویسنجق هذا و تعلمون بان الحکومة اثبتت دوما حسن نوایاها تجاهکم خدمة للمصلحة العامة فیرجى عدم اتیان اي اعمال عدائیة خلال هذه المدة و نرجو ألا تألوا جهدا لانهاء الموضوع وفق المصلحة العامة هذا وبالختام الزعیم صدیق و مدیر الامن یخصونکم واغوات بشدر و کاکه مسعود بالتحیات وتقبلوا تحیاتنا و دەمتم.

ئیمزا

اخوکم معاون امن کرکوك عباس الونداوي

ملاحظة: بطي الرسالة صورة طبق الاصل من البرقیة حول الموضوع یرجى الاطلاع.

لە ژێر ئەم نامەیە کە وێنەی لەسەر گیرابۆوە نامەی شێخ حسێن بۆ من دەست پێدەکا:

*بۆ زۆر محترم جنابی کاک مسعود پێشکەشە.*

*اولا سڵاوی خوای گەورە لەسەر همو لایک بی لە پاش سلام ئەوە صورتی کاغەزی معاون امن عباس ونداوی... هروها امرو جیش رانیەی چول*

*کردوه گەڕاوەتەوە دواوە... او شەوە لە کوبونەوە لگل حویزی مام یحیی وامان نیشان دا کە ایمە قصە لەگەڵ همو کوردێک ئەکەین... هتد.*

*٤ - ٥/٨/١٩٦٣*

*حاجی سید گل زادە*

*ئیمزا «حسین»*

ئەمەش وێنەی ئەو بروسکەیە کە لە کاغەزی عەبباس وەنداوی و کاغەزی شێخ حسێنیش باسکراوە (لزوومم نەدیت درێژەی کاغەزی شێخ حسێن لێرەدا بنووسمەوە:

س. ق. ق. م.

الى ك. رانيه والحركات: سكرتير الوزير. سكرتير رأج ٨٤٨ و مدير امن كركوك. يرجي تبلغ جماعة بشدر و عباس مامند و حسين بوسكين بما يلي:

لامانع من تمديد المدة اللتي طلبوها واننا على استعداد للملاقاة بعدها وتقضي انتهائها كل ذلك بدافع حسن النية للتوصل الى نتيجة تخدم المصلحة العامة وكما يرجى ان لا يباشروا باي عمل عدائي خلال الفترة ويكون الاتصال بواسطة مقر قوة كويسنجق. انبئونا.

لێرەدا ناوی حەوێزی مام یەحیا هات. ئەو شەوەی کە لە هەنجیرە دیدەنی سەرۆک عەشیرەتەکانمان کرد حەوێزی مام یەحیا لەگەڵمان بوو بەڵام نووری خەییات نەیویست بانگهێشتنی بکا بۆ بەشداری کردن لە وتووێژ. دوای تەواوبوونی گفتوگۆی سەربە مەسەلەی ڕێککەوتن ئەوانەی لە نزیکەوە ناسیاوییان لەگەڵیدا هەبوو چاکوچۆنییان لەگەڵدا کرد، لەمانە شێخ حسێن بەولای چاکوچۆنییەوە لە ڕێککەوتنەکەش باسێکی لەگەڵدا کردووە. هەرچی عەباسی مامەنداغا بوو مەیلێکی خۆ بەرەژوور بردنی هەبوو لەگەڵ پێداویستی بەرژەوەندی گشتی نەدەگونجا وەک کە دیتمان زێدە لە هەمووان ئەو ڕێی دیدەنی عەبدولکەریمی نەگرت و بەوەشدا پردی پێوەندی و تێکگەیشتن پسا. من کە مامەڵەت لەگەڵ زەعیم سددیق مستەفا بکەم بۆچی ڕازی نەبم حەوێزی مام ئەحیا کە هەر نەبێ ناسیاوە و حکوومەتیش بە موعتەمەدی خۆی داناوە سەرەپەتێکی ئەو کارەم بۆ بگرێت. لە بەر پایەی حەوێز لای حکوومەت دەبوو پێوەندی بە حکوومەتەوە لەگەڵ «مقر قوة كويسنجق» بێت.

له نموونەی خۆ بەرەژوور خستنەوەی عەباسی مامەنداغا دەقی نامەیەکی ئەو بۆ شێخ حسێن کە لە بارەی کۆبوونەوەی چاوەڕوانکراو لەگەڵ حکوومەتدا بۆی نووسیبوو، دەخەمە بەر چاوی خوێنەر:

*۲۸/۷/۱۹۶۳*

*زور بەریز شیخ حسین*

*روژتان باش*

*به هیوام هەمیشه له خوشیدابن، هەواڵتان باش بی شکر منیش ایمرو توزی باشم. لەبابەت کوبونەوەمان منیش زور بەباشی دەزانم جا لەبەر ئەوەی که من جاری بیتاقەتم حەز دەکەم له جیگاییکی نزیک بێ، جا ایوەش بەو کەسانه تبلیغ بکه حاضر بین که سوودیان ببی وگەر جیگاییکی نزیک ممکن نەبوو خوت لەگەلیان اجتماع بکه و خوت وکیلی من به هەر قراریکتان دا من موافقم، و گەر له جیگاییکی نزیک بریارتان دا حاضر بن زوو اگادارم بکەن بۆ ئەوەی منیش حاضر ببم. ایتر سلام له جماعەت دەکەم و داوای هەواڵخوشیتان دەکەم.*

*ئیمزا*<br>*عباس مامنداغا*

ئەم نامەیە چ لە بارەی کۆبوونەوە لەگەڵ حکوومەت بێت و چ لە بارەی خۆیانەوە بێت بە مەبەستی خۆ هەڵاواردنە نەک لەبەر نەساغییە. وەک دواتر باسی دێت کە کۆبوونەوە لەگەڵ حکوومەت لە سەیداوا کرا عەباساغا وەکیلێکی نارد خۆی نەهات جێگاکەش بۆ ئەو لە هەمووان نزیکتر بوو...

سەرلەبەری خەڵق گوێی هەڵخستبوو بۆ دەنگوباسی ئەو کۆبوونەوەیەی وەها بەهەند هەڵگیراو. لە نموونەدا ئەم کاغەزە بخوێنەرەوە لە بابەکری مەحمووداغاوە بۆم هات بەڵام تەئریخی پێوە نییە:

*بۆ سەعادەتی جەنابی کاک مسعود*

*پێشکەش*

*لە پاش احترام هیوام وایە سەفرتان سەلامت و سەرکەوتوبن. قوربان اوه پیاوی شیخ حسین هات و چەند کاغەزێکی بۆ جەنابت پێم روانە کرانە خزمەتت و ایمەش ارەزومان هەیە کە کورتەیەک لە کوبونەوەکەتان بزانین اگر زحمت نیە بە کورتی بومان بنووسن مایەی سپاسە.*

*خال عەلی عەباس اغا اخلاسیو احترامی هەیە.*

*ایا لە روژی معین اتوانی حازربیت.*

*بابکر*

*ئیمزا*

جگە لەم نامانە هی دیکەش پارێزراون، بەڵام پێویست بە چی دیکە ناکات، گەلێکیش لە بێنەوبەرەی زەمانە وەیا کەمتەرخەمی لە دەست چوون.

بە پێی ئەوەی کە کاغەزی عەباس وەنداوی لە ٨/٣ دەڵێ ١٥ ڕۆژی دیکە مۆڵەت دراون دەبێ ڕۆژی ٨/١٩ بووبێتە ژوانی کۆبوونەوەی حکوومەت و عەشایر چونکە مۆڵەتەکە لە ٨/١٨ تەواو دەبێت. هەرچۆنێک بێت ڕۆژێک لەو ڕۆژانە ئیتر ٨/١٨ بێ ١٩ وەیا ٨/٢٠ بێت لە سەیداوای نزیک ڕانیە کۆبوونەوەکە پێکهات. جەیش جێگەی دانیشتنی سازدا، بەڵام سەیداوا لەلایەن عەشایەرەوە هەڵبژێردرا.

لای مەغریب کۆپتەرێک لە بنگەی لیوای بیست نیشتەوە، مەیلەو تاریک داهاتبوو، نوێنەری حکوومەت «حازم جەواد» وەزیری داخلیە بوو، بە خۆی و قەڵەباڵغییەکی زۆرەوە لە خاوەن مەقامی عەسکەری و مەدەنی هاتن. چەکداری عەشایر بە سەدان و پترپش لەو ناوە بوون. هەرچی زاپتەکان و جوندییەکان بوون بێ چەک

هاتووچۆیان دەکرد، بەمەشدا هەتا بڵێی ڕەفتاری ژیرانەیان کرد، چونکە کە سەلماندیان لە پارێزگاری مەعەسکەر دوور بکەونەوە و بچنە جغزی دەسەڵاتی عەشایرەوە لە شەوی تاریکدا چ پێویست نامێنێ بە چەند دەمانچەیەک کە لە ئاست هەزار تفەنگدا بایی پوولێکە. کاکە حسێن و نووری خەییات کە جارێ پەلاسووی شەبکەی پێوە بوو، لەگەڵ وەفدی حکوومەتی بوون. «حازم جەواد» بە ناوی شارەزایی، نەجمەددین سائیب، کۆنە موتەسەڕیفی هەولێریشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. وا پێ دەچوو بەتەمابوون لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو شتێک ببڕێتەوە چونکە خەریک بوون بە کامیرای تەلەڤیزیۆن وێنەی کۆبوونەوەکە بگرن. نەک هەر ئەوەندە بەڵکوو ویستیان بکەونە نووسینی دەقی ڕێککەوتنەکە بەڵام زوو شێخ حسێنی حاجی سەید تێیگەیاندن کەوا جارێ بۆ ئەم هەنگاوە ماویەتی. دەبێ ڕاوەستن هەتا هەموو کورد دێنە ناو جغزی تەفاهومەوە دەنا دوو ڕۆژ خۆی ناگرێ... عەباساغا نەهات، برایەکی خۆی نارد بەهانەشی نەساغی بوو.

ئەو دایشتنە هەرچەند بۆ حکوومەت ناتەواو بوو دیسانەوە لە دوو ڕووەوە جێی ڕەزامەندیی حازم و هاوڕێکانی بوو. یەکەم ئەوە بوو کە ئاپۆرەی خەڵقێکی پتر لە چاوەنۆڕ کردنیان لەو شەوەدا حازری کۆبوونەوە بوون. (دواتر پاش چەندین مانگ نووری خەییات ئەم لایەنەی پێ گوتم). ڕووی دوەم ئەوە بوو کە قسەی ئەوتۆ لەو بابەتەی مەبەست بوو کران هی بادی هەوا نەبوو بەڵکوو لە جەرگەی سوودی گشتییەوە دەهاتن. ئەو شەوە شێخ حسێنی حاجی سەید لە قسەکانیدا هەرچی عەقڵ و مەعریفەتی میراودەلیەتی هەیە بەکاریهێنا زۆریش تێیاندا بەرچاو و سەرکەوتوو بوو. ڕاستییەکەی ئەگەر ئەو یان من هەر کامێکمان تێدا نەباین کۆبوونەوە نەدەبوو. کە وەختی هەڵستان هات بڕیاردرا لە ماوەی مناسبدا خەبەری دوایین بە حکوومەت ڕابگەیەندرێ.

نازانم چۆناوچۆنی بوو، وەختێک کە خەڵقەکە لە هەڵستاندا بوو کۆمەڵێک لە دۆست و خزم بەتایبەتی شێخ محیەددینی شێخ ئەمینی سندۆڵان، ئامۆزای دایکم، منیان دوور خستەوە و چەندی کردم ڕێم بدەن بچمە بەرێ کردنی مێوانان لێیان نەسەلماندم. شێخ ئەمین گوتی، لێم مەعیەنە بچیتە لایان خواییشتت لێ دەکەن لەگەڵیان بڕۆیت بۆ بەغدا ئەتۆش بە ڕووان تەنکیت بەگەڵیان دەکەوێت خواش دەزانێ ئەوسا یەکدی دەبینینەوە یان نا... حازم جەواد و هاوڕێیەکانی چاویان بە

دوامدا گیرابوو نەیاندیتبووم بێگومان گلەییشیان کردووە بەڵام لە ئاست بێچارەیی چ دەکرێ. دواتر (پاش ئاشتبوونەوەی ١٠ی شوباتی ١٩٦٤) نووری خەییات تێیگەیاندم کە حکوومەت زۆری تەما پێم بووە بەتایبەتی کە ئەو هەموو قەڵەباڵغییەی کوردانیان بە دەوری خۆیانەوە دیت، تەکلیفیش دەکرا لەگەڵ حازم بچمە بەغدا.

ئەوساش و ئێستاش باوەڕ دەکەم چوونم بێسوود نەدەبوو چونکە جگە لە داخوازیی واقیع کە تێک گەیشتنی مەبەست بوو، کاغەزم لا هەیە لەوانەی لزوومم نەدیت بڵاویان بکەمەوە پێمان دەڵێ هەر لەو کاتەی کە من ڕێی چوونە بەغدام لێ مەنع بوو لایەنی زۆر باڵای کوردایەتی خەریکی خۆ نزیک کردنەوە بوو لە حکوومەت و چنگیشی نەکەوت. لە ساڵی ١٩٦٤ قسەی ئەوتۆم لە سەفیری ئەمەریکا بیست لە بارەی هەوڵ و تەقەڵای هەندێ کوردی زێدە زل کە لە هاوینی ١٩٦٣ ویستبووی ئەمەریکا بێتە ناوبژیکەر، هەوڵی من وەیا یەکێکی وەک من لە خۆوە دەبووە جۆگەلەیەک لەو شەلەگەیە بکاتەوە. تۆ سەیری چەرخی زەمانە بکە بە چ بارێکدا دەگەڕێ، منێکی بێدەسەڵات لە ماوەی سێ ساڵدا جارێکیان لە دەسەڵاتی عەبدولکەریم و جارێکیان لە هی بەعس-دا، کەوتمە بارێک ئەگەر تەقڵەبازیم بکردایە بتوانم تەئسیرم هەبێ یان بە چاکە یان بە خراپە. لە بیرت بێ خراپەش بە هەموو کەسێک ناکرێت...

لیوای بیست کەوا لە دەمێکەوە بوو گەیشتبووە ڕانیە بە ئومێدی مەسڵەتی نەبزووت بۆ پژدەر دەنا هیچ لەمپەرێک نەبوو هەنگاوی بوەستێنێ تەنانەت بە فڕۆکەش ئەو وڵاتەی ئازار نەدا. هۆیەکی دیکەش لەو نەبزووتنەوە ئەوە بوو کە هەرێمەکە لە دەست خاوەنەکانیدا بوو جارێ حیزب بنگەی لێ دانەنابوو. شێخ حسێن دەیویست بنگەیەک لەلایەن پژدەرییەکانەوە دابندرێت و هاریکاری لەگەڵ حیزبدا بکات نەک بنگە هی حیزب بێت بەڵام نە ئاغاکان بەرباری ئەو ئەرکە بوون نە حیزبیش مەبەستی بوو ئایا پژدەر چی لێ بەسەر دێت، لە ئاکامدا بنگەی لێ دانا. سیاسەت گەلێ جار مەنتیقی تێدا نامێنێ، حیزب پێی قووت نەدەدرا پژدەر بۆ پژدەر بمێنێ و خۆی تێیدا دەست ڕۆیشتوو نەبێ بەڵام گرنگ نەبوو بەلایەوە لە دەست خۆی و پژدەریش بچێت... بەهەمەحاڵ ئەم بێنەوبەرەی مەسڵەتی کردن و نەکردن لەگەڵ حکوومەتدا بە لۆنگەلۆنگ بەردەوام بوو حکوومەتیش هێرشی نەهێنا و دەستی لێ

نەوەشاند. لە ڕاستیدا نازانم، قەتیش نەمپرسی، بۆچی دوای نەمانی ئومێدیش بە ڕێککەوتن پژدەر هەر بە سەلامەتی مایەوە، نە جەیش هات و نە تەیارەش.

مانگی ئەیلوول بوو شێخ حەسەنی حاجی سەیدگوڵ کە لە مانگی حوزێرانەوە لە ترسی بۆمبا قەڵادزەی بەجێهێشت و بۆ بناری شاخەکان هەڵکشی و تەنسازییەکەی لەوەدا نەبوو تەقڵ و شەقڵی گوێزەگوێزە هەڵگرێت، خەبەری وەفاتی هات بۆ شیلانە. شێخ حەسەن لە دەمێکەوە بوو دووچاری نەساغیەکی ئەوتۆ بوو زاتی نەدەکرد خۆ بە بەر سەرما و هەوا بدات تا ئەوەی لە هاوینیشدا هەر لە ژوورەوە دەنوست. زستانان کە وەختی جلک شووشتنی دەهات، دەبوو بایی کێشی جلکی فڕێدراوی هی خاوێن لەبەر بکات. هەرچەند لەوانەیە نەساغی ئەوتۆیی دەخلی بە نەفس و وەسوەسەوە هەبێت بەڵام فەرق چییە لە نێوان میکرۆب و وەسوەسەیەکی لە میکرۆب کاریگەرتر بێت. ئەو هاوینە کە ناچار بوو لە ژوورەکەی دەرچێت و بگوێزێتەوە بۆ دووراییی جێگەیەکی دوو سەعاتی و پاشان بێتەوە قەڵادزە بەدەنەکەی ئەو ئەرکەی پێ هەڵنەگیرا.

ئەم مرۆیە ئەگەر لایەنی تەنسازییەکەی لەمپەڕ نەبایە لە پێشی، کەم کەس هەبوو هێندەی ئەو شیرنکەلام و دڵهۆشیار و یارانی و نوکتەخۆش، تا بشڵێی ئەدەبدۆست بوو، شیعری شاعیرە ناودارەکانی کوردی دەخوێندەوە، ناوناوە چەند بەیتێکی دەهۆندنەوە، ئەگەر لە باریش بانایە بە گاڵتە و پێکەنینەوە دەیخوێندنەوە دواتر دەیسووتاند. ئەو ساڵەی کە ماڵەکەی من بەگەڵ ماڵی ئەو کەوت گوتبووی تازە لێک ترازان مومکین نییە و نابێ جارێکی دیکە بچنەوە بۆ کۆیێ، قسەکەشی هی ناوەندی دڵی بوو. یادی باوکم لە لای ئەو موقەددەس بوو، بۆ منیش چ پلەی مەحبەتی نەهێشتبۆوە لێی تێپەڕ نەکات. ماڵی من کە چووبووە پژدەر پازدە کەس بوون، ڕەنگە پتریش، یازدە مانگ بە هەموو ئەرکەوە لەگەڵ ماڵی ئەو دەژییاین نە ئەوان و نە ئێمەش هەستی شتێکمان نەکردووە ناعادەتی بێت. ئەو مرۆیە نەساغەی کە لە ژوورەوە دەرنەهات هەموو سیاسەتی پژدەر بە بەردەم ئەودا تێدەپەڕی چونکە تایەفەی مەحموداغا کە خاڵوانی بوون، بێ ئەو بڕیاریان لە هیچ شتێکی گرنگ نەدەدا. چ لە سندۆڵان و چ لە بۆسکێنیش ڕامابایت دەتدیت ئەو دوو شوێنە لە مەرجەعە هەرە گرنگەکانی بەردەر و پژدەر بوون...

تازیەی شێخ حەسەن تا سێ ڕۆژان لە قەڵادزە بوو، ئنجا بردرایە دێی نوورەددین. عادەتی میراودەلییەکان ئەوەبوو کە تازیە هاتبایە پێش، چەند بنەماڵەیەکی دەسترۆیشتووی تایەفەی تازیەدار قۆناغیان دەهێنایە شوێنی تازیەکە بە نۆرە هەر بنەماڵەیە ڕۆژێکی بیستوچوار سەعاتی هەموو مەسرەفی تازیەی بە ئەستۆوە دەگرت. من سێ ڕۆژی قەڵادزە و بەینێکی نوورەددینیش لە تازیەکە بەشدار بووم ئینجا گەڕامەوە بۆ شیلانە.

ڕەشەبایەکی هەڵکرد دەتگوت شەڕ بە دنیا دەفرۆشێ. ڕۆژێکیان یارمەتیی یەکێکم دەدا کە سینگەکانی تاوڵی دیوەخانی قەیم دەکردنەوە، ڕەشەبا لچکی تاوڵی شەکاند و بەو هێزەی هەبوو لە چاوی ڕاستەمی خشاند. چەند ڕۆژان ژانی هەبوو، کە ژانەکە ڕەوییەوە ئەسەرێکی ئەو زەبرە بەوەدا مایەوە کە چاوم پتر لە عادەت ئاوی دەکرد. لەو ساڵەوە ناوناوە بە شتێکی ئاومژ ئەو زێدە تەڕاییە دەکێشم. نزیکی ٢٥ ساڵە بەسەر ئەو ڕووداوە تێپەڕیوە بێ ئەوەی پرس بە هیچ دکتۆرێک بکەم، خۆ ئەگەر پرسم بکردایە ئێستا دەگوترا هونەری دکتۆر بوو چاوت زەدە نەبووە.

لەو مانگانەدا کە شیلانەیی بووین مێوان سەریان لێ دەداین منیش دیدەنی هەندێک دۆست و برادەرم دەکرد. جیرانێکی نزیکم عەلی عەباساغا بوو، پێش هەموان سەردانی ئەوم کرد. پێی ناوێ درێژە بە پێدا هەڵگوتنی بدەم هەر ئەوەندە دەڵێم کە بە نوکتە و بە ڕاستیش دەمگوت هەرچی حەزی لە خواردنی خۆش و خزمەتی بێفێڵە با لە عەلی مێوان بێ. شەوێکی زێدە خۆشیشمان لە هەواری جەماڵەددین لای حاجی مەحموداغای حاجی ڕەسوواغا ڕابوارد. پێپسی کۆلای لە سەردەشتەوە جەلب کردبوو. ئەو عەسرەی گەیشتمە لای، تامەزرۆیەکی کۆنم دامرکاندەوە. دوو لووتکەی شاخی دووپەزەمان لێ نزیک بوو، بە سواری لە ماوەی پەنجا دەقیقەدا گەیشتینە هەوارەکەی و سەریش کەوتین تا تۆقەڵەی لووتکە بەرزترەکە. فارووقی برام لەگەڵمدا بوو، ماوەیەک پێشتر کە جارێ من بەرنەدرابووم هاتبووە سەر ئەم لووتکەیە و کاغەزێکی نووسراوی نێوان بەردانددا شاردبۆوە خۆمان لێی بووین بە «مکتشف».

گەواڵەیەکی هاوینە لە گەرمێنەوە هاتبوو چەند وڵات کەوتبووە بەر، ڕشاندبووی، ئەسەری بەسەر خۆڵی ئەو لووتکەوە مابوو چونکە پێخوست شەقڵی نەشکاندبوو. دنیایەکی بێسەروبنی لێوە دیار بوو. سەرنجم دایە لای قەندیل دیتم لووتکی

«کورەش» کە بە سەر مەنگوڕایەتی و وڵاتی پژدەردا دەنۆڕێت و بە چاو لە ڕیزی قەندیلە، ئەو کۆڕەشە بۆ قەندیل و حەساری سەکران وەها مات بووە ئەگەر لێی وردنەبێتەوە زەحمەتە بیناسییەوە چونکە لە سینگی قەندیل گیرسابوو.

لە گەلێک لاوە کۆنە مەعلووماتی منداڵیم کە بە سەرنج لێ گرتن و بەراوردکردن و پێکگرتن بۆم ساغ بووبۆوە، تاقیکردەوە. گرفتێک هاتەوە بەر لێکدانەوە کۆنەکانم و هی ئەو دەمەش کە بەسەر لووتی دووپەزەوە سەیر دنیام دەکرد بە چاوی مامڵەت. شاخی پشتی دووکان بە لای دەستە ڕاستی کوڕکوڕی مەرگەوە پیرەمەگدروونیش بە لای دەستە چەپییەوە دیاربوون. لەو تێوەڕامانەدا کە بەرزایی شاخەکانم لێک دەدایەوە دەبوو شاخی پشتی دووکان هێندە هەڵنەکشێ، پیرەمەگدروونیش پتر هەڵکشێ مەبەستیش لە هەڵکشان بەرزاییە. تەنها یەک تەفسیرم بە بیردا دەهات، ئێستاش هەر ئەوم بۆ دەستنیشان دەکرێ، کە ئەم دیمەنە نەگونجاوە شی بکاتەوە بەڵام لێرەدا مەودا دەست ناکەوێت و بێلزوومیشە بۆ شەرح دانی، هەتا لە هەندێ جێگەی تایبەتیشدا ئەو تەفسیرە باس نەکەم هی باوەڕ پێکردن نییە چونکە دەبێ دیمەنی بەرچاوان پاڵپشتم بێت نەک قسەی ڕووت...

لە جارێکی دیکەدا سەردانی حەمداغای عەباساغا-م کرد، شەو لای ماینەوە. بەیانی چووینە لای باییزاغای بابەکراغای سەلیماغا کە ماڵی لە هەواری کێلێ بوو. شەو ڕۆژێکی زۆر زۆر خۆشم لەو سەفەرە ڕابوارد عەلی عەباساغا و فارووقیشم لەگەڵدا بوون.

جارێکیان لە گەڕانەوەی بەرەو شیلانە نیوەڕۆژەم بردە لای مەلا محەمەدی خەتیبی قەڵادزە. ئاغایەکی لێ کەوتەش مێوان بوو ناویم لە بیر نەماوە بە ڕواڵەت هیچی ئەوتۆی ڕانەدەنواند کەچی لە قسەیەکی منەوە، بێ خۆ هەڵدانەوە، دەرکەوت تەواوێکی بە بەرەوە هەیە. شوێنی ماڵەکەی مامۆستا ناوی گوندی شیخاڵ بوو. من گوتم وا پێ دەچێ ناوەکە لە «شین خاڵە»وە کورت کرابێتەوە. ئەو ئاغایە گوتی لە «شغال»ـەوە هاتووە کە ناوێکی ئێرانییە... ئیتر کۆمەڵێک زانیاریی مێژوویی سەر بەو هەرێمە دەورکردەوە. ئاوێک لە نزیک سەرووی شاخە بەرزەکانەوە هەڵدەقووڵی سووکە ئاشگێڕێک بوو وڵاتێکی ئاو دەدا ناوی ئاوی «بێ کۆدی»یان بوو. باسی بنەچەکی ئەو ئاوە و ناوەکەشی کرد. گەڕاوە بۆ مێژووی داگیر کردنی «هێرۆ» لەلایەن لەشکری ئیسلامەوە و گوتی هێرۆیی پاڵەوانێکیان هەبووە. ناوی «گوڕنەڵ»،

ماڵەکان لە سەرووی شوێنی ئێستاکەی هێرۆ بوون. گوتی جارێکیان لە مووسڵ کابرایەکی مێژووناس لێمی پرسی، لەو هەرێمەی بناری شاخەکانی پژدەر هیچ ئاو هەیە پێی بڵێن «سلورت»؟ تومەز کانییەکەی دامەن هێرۆ بە تەنیشت ڕێی ئێستای سەیارەوە کە پێی دەڵێن «سلۆت» هەمان «سلورت»ـە کە لە مێژووی کۆن ناوی هەبووە... سەری خوێنەر نەیەشێنم ئەو پیاوە هێندەی قسە پێ بوون، هەموویشی بە دایکوباب و جێی باوەڕ کردن، ئەگەر بمنووسیبانەوە خەفەتی ئێستاکەمم بۆ نەدەخوارد و سوودیشم لێ دەدیتن.

لە حاکمی سەردەشتەوە قسەیەکم پێ گەیشت کە ئەگەر سەردانی لێ بکەم باشم بەخێر دەهێنێ و حکوومەتیش پەنام دەدات بەڵام من وەڵامم نەدایەوە.

لە نزیک خێوەتەکەی ئێمەی لێ بووین ماڵی ئافرەتێکی «باووزە»یی هەبوو هێلکەی پێ دەفرۆشتین بە قدووی بەتاڵی شیری منداڵان، هەر قدووی شیر چوار هێلکەی دابوو بە بەهانەی ئەوەی قدووەکە قوپاوە. لە ژێر خێوەتەکە نیوەڕۆژەمان دەخوارد ئافرەتەکە لە لای مەتبەخەوە بەرەو ماڵی خۆی لەپێش دەرگەی خێوەتەکەوە تێپەڕی قاپێک شلە و قاپێک پلاوی بەسەر دەستانەوە بوو، دایکم گوتی پلاوەکەی بێ گۆشت بوو ئەم قوونەخۆڵەیەی بدەنێ. منیش دەستی دایکمم گرت و ملەقۆتەیەکم لە دەستی ناو گوتم، ئەمرۆکە سێ هێلکەی لێ گێڕاوینەوە هەر حەقی ملەقۆتەی بەسەرمانەوە هەیە...

خەڵقی ئەو ناو شاخوداخە بەر لەوەی حکوومەتی عێراق لە ١٩٣٧ بێتە پژدەر و مەخفەر لە دێی گەناو بکاتەوە نە حکوومەتیان دیتبوو نە تێکەڵیشیان لەگەڵ جیهانی دەرەوەی هەرێمی لاچەپی خۆیان بووبوو. باوک و کیژێکی عازەب حەفتەی یەک دوو جار لە دێی باووزەوە کە لە گەلییەکی بناری شاخەکەی شیلانە کەوتووە، دەهاتن بۆ لای خەڵقی هەواری شیلانە. ئەگەر ئیمکان هەبایە ئەو ڕەسمە زەقانەی ئەکەد و سۆمەر بووبانە بنیادەم باوک و کێژی ئەوتۆییان لێ پەیدا دەبوو چونکە دەتگوت لەوەتەی بابەلباپیری هەرە کۆنی بەر لە هەزاران ساڵیان بە زاوزێ سەرەژێر بوونەتەوە تا سەردەمی ئەم دووانە خوێنی بێگانەیان تێکەڵ نەبووە. دەموچاوی هەردوویان وەک هی باز و سەقەر لەسەر تیژایی داڕێژرابوون. کۆتایی هەر زەقاییەکی ئەو دەمووچاوانە وەک سەری لووت و نیهایەتی چەنەگە و ئێسکی

ڕوومەت نووکە تیغیان بە بیری بینەردا دەهێنایەوە. سوورکاڵی چاوشین بوون، کیژەکە بە جوان دەژمێردرا...

لە کژی خۆیدا خەڵقەکە بۆ گەرمێنی دامەنی شاخەکان سەرەژێر بوونەوە. ماڵی من لە هێرۆ گیرسایەوە، خانووی مەکتەب چۆڵ بوو ئێمەی تێدا ستار بووین. ژوورەکانی خاوێن بوون بەڵام ڕووەو ڕۆژهەڵات و ڕەشەبا بوو. ماڵی حەمە عەلی ئامۆزام بە تەنیشت هی منەوە لە بەشێکی دیکەی مەکتەب یان دایەرەیەکی دیکەی حکوومەت بوو. هی ئەو چەشنی داخراو بوو لە سەرمادا کەمتر سەرماچێژ دەبوو. زۆری نەبرد ئەوان چوون بۆ قەڵادزە... سەرمای پاییز لە چاو وڵاتی کۆیێ زوو هەستی پێ کرا. جارێ باران نەباریبوو سبەینان ئاو دەیبەست. لەگەڵ ئەمەشدا چونکە لەش ڕادێت پێی ناڕاحەت نەبووین هەر بەقەدەر جلکی عادەتی ساڵان کە لە کۆیێ بووین جلکمان لەبەر دەکرد. مریشک و عەلیشیشمان هەبوون، مریشکەکان هێلکەکەریان تێدا بوون. دەمگوت ئێمە هەر مریشکەکانمان بەرهەم هێنن.

لە شەوی نێوان نۆ و دەی تشرینی دوەم سەری «کوڕکوڕ»ی مەرگە بە بەفر بۆز بوو. شەوی دیکە «دووپەز»یش بۆز بوو. دواتر زانیم کوڕکوڕیش بە دیوی گەرمێندا لە شەوی نێوان دە و یازدەدا بەفری پێوە دیترابوو. شەوی سەرەتای یەکی کانوونی یەکەم لە هێرۆ بەفر باری.

پێش بەفر بارین هەرای عەبدولسەلام دژی حیزبی بەعس قەوما بوو، من زانیم تازە ترسی حەرەکاتی عەسکەری نەما، ڕامان سپارد خانوومان بۆ پەیدا بکەن لە قەڵادزە. حەمە عەلی کاغەزی بۆم نووسی دەیگوت، ئێمە، واتە قەڵادزەیی، هەموو شاخەکانی دەورمان سپییە وەکوو دۆندرمەمان لێهاتووە. بۆم نووسییەوە ئێمە لە هێرۆ ئەو بەفرەین بە دەوری دوندرمەکەیەوە.

بەفر لە هێرۆ بە پشتەوە هەر لە زیادکردندا بوو، شاخی پشتی «بەکاو» ڕەزی مێوی بەسەرەوە بوون تا درەنگی درەنگ ترێیان ما، مێوەکانی لەبەر قورسایی بەفر وەکوو چاوبازە لکەکانی بەسەر ئەرزەوە دەخشین... من و دەوەن لە ژوورێکی بچووک بووین. شەوێکی لە شەوە سەختەکانی، ژوورەکەمان وەها سارد بوو ناچار بووم لەبەر دەوەن مەقاڵە خەڵووز گەش بکەمەوە. دەرگاکە لە دەرەوە و لە ژوورەوەی پەردەی هەبوو بە قڵفە و سینگ قەیم دەکران. ڕەشەبایەکی دەهات دەتگوت سەرسەرە. کە

دەرچووم پەردەی دەرەوە بەدەم ڕەشەباوە وەکوو قانگەلاچک بوو هەتا قەیمم کردەوە نازانم چیم کرد. خەڵووزم لە شوێنی خۆی بە دەستی سەرما بردوو لە دوو مەقاڵە کرد. نەوتم هێنا پێمدا کردن، بە هەر حاڵێک بوو دەنکە کفریتم گەیاندە نەوتەکە ئاگری گرت و ڕەشەبا کوژاندییەوە.

سەرت نەیەشێنم تا ئەو دوو مەقڵەیەم گەش کردەوە و بە ئاوی شەختە کردوو دەستی خۆمم شووشت تەواو سەغڵەت بووم. هێنانە ژووری مەقەڵەکان هێندە زەحمەت بوو بە خەیاڵدا نایەت چونکە دەبێ پەردەی دەرەوە و دەرگە و پەردەی ژوورەوە بکەمەوە، ئنجا ڕەشەباکە کارێکی پێ دەکردن ئەوانیش کارێکیان بە من و مەقاڵەی دەستەکانم دەکرد نەوعی شەڕە چەپەڵۆک نەبوو. پەردەی دەرەوە بەو سەرسەرە لچکی ژێرەوەی هەڵدەگەڕایەوە لە بنمیچی دەدا و وەکوو کوتەکی دەستی پاڵەوان سەرەژێر دەهاتەوە ئەگەر کەللە سەری بەرکەوتبایە کاری خۆی دەکرد چونکە بە عادەت پەردە لە سەرەوە و لە کەمەری و لە لچکی ژێریەوە داری وەکوو وەکازی تێدەگیرێ بۆ ئەوەی بە پانی شۆڕبێتەوە، ئنجا داری لچکی ژێرییەوە کە لە بنمیچەوە دەهاتەوە خوارێ دەبووە چەکێکی کوشندە. شەوەکە وەکوو هی مەلای زێندینان بوو ئەنگوستە چاو، سەرمای بێئامان و ڕەشەبای دڕندەی بڕندەی پێوە. پەرۆشی دەوەن نەبایە هیچ نرخێک ئەو شەوە دوو مەقاڵەکەی پێ گەش نەدەکردمەوە. ئینسافیشم قبووڵی نەکرد لەو قیامەتە خەڵک هەڵستێنم بۆ ئەو کارە، سبەینێ زۆریشیان گلەیی لێ کردم حەقیشیان بوو چونکە شەوی وەها لەوانەیە ورچ ڕاوی مرۆی بێچەک بکات. ئەشەدوبیللا لە گرمەی ڕەشەبا بەولاوە دەنگی ڕوح لەبەر نەدەهات...

ڕەنگە لە دەوروبەری دەی کانوونی یەکەم گوێزابێتمانەوە بۆ قەڵادزە. خانوویەکی لە چاو ئەو دەمە مناسبمان بۆ بەکرێ گیرابوو. باران و بەفر بەردەوام بوون بەڵام شەوێکیان دیاردەیەک بوو نەمدیتەوە هەتا لە حەفتاکان جارێکی دیکە، لە بەغدا، ڕێک کەوتەوە. بەفرێک باری بە لای کەمەوە بە بارستی دە سانتیمەتر. پاش مەغریب هەوای گۆڕی بە جۆرێک دەتگوت لە پڕ کەوتینە بەهار. بەفر گۆڕا بە بارانێکی لێزمە بایەکی لەگەڵدا بوو وەک هی شنە بای هاوینان کە پێی دەڵێن «بای وەشت» و لە نێوان ڕۆژاوا و باشوور هەڵدەکات. ئەو بەفرە لە ماوەیەکی کورتدا شۆرایەوە نەک هەر بە باران بەڵکوو بە گەرمایی ئەو بایە. دوای ئەمە هێندەی

نەبرد کردییەوە سەرما ئەمما بایەکی هەڵکرد بنەداری هەڵدەقەند. لە دەربەندەوە بۆ دیوی پژدەر تراکتۆری وەستاندبوو، تاژی و توولەی ڕەهەوا خستبوو. گوتیان لە سەرسیان - کە بە سەر زێی گچکەوەیە لە ڕۆخی بەری مەرگە و دەکەوێتە زارکی دەربەند - سبەینە مریشک و عەلیشیشان کە لە ماڵەوە دەرچوون وەکوو قانگەلاچک با بردنی و زوربەیان نەهاتنەوە و فۆتان.

لەو بەینانەدا مەلا مستەفا بەرەو پژدەر هات. عەقید کافی نەبەوی هاتوچۆی قەڵادزەی دەکرد لە دیتندا پرسی بۆچی کەناگیرم. گوتم لە خۆمەوە خۆ لە شتان هەڵناقورتێنم. هەر لەو ڕۆژانەدا بەیانییەکی کە بەفر لە کۆڵانان بەستبووی خەبەریان هێنا کە دکتۆر سددیق ئەترووشی شەوێ گیانی سپاردووە. تا بیستم لە شاردنەوەی بووبوونەوە. خەفەتێکی زۆرم لێ خوارد، هەم برادەر و دۆست هەم ڕۆشنبیرێکی مێشک کرایەوە و زیرەک و ئێسکسووک و دڵسۆز بوو.

کاغەزێکم بۆ هات بچمە دیدەنی مەلا مستەفا کە لە دێی دووگۆمان بنگەی هەڵدابوو. نزیکی عەسرێک بوو چەند پژدەرییەکیشم لەگەڵدا بوو چوینە دووگۆمان. هەر کە کەوتینە وتوویژ لە نوختەیەکی سەرەکی ڕێککەوتنمان نەبوو. هێرشێکی قورسی هێنایە سەر حیزب. من گوتم سەرۆکایەتیی هەر بزووتنەوەیەک بێت بە باوک حیساب دەکرێت کە ئەگەر ڕۆڵەی خۆی تەنبێش بکات دەبێ لە دڵسۆزییەوە بێت. بای دایەوە سەر پژدەرییەکان بە تێکڕایی. لە نێوان ئاغاکاندا یەکێکی کەمبایەخی بە دۆست هەڵبژاردبوو، لەو قسانەیدا ئەو کابرایەی بە نوێنەری پژدەر دانا، مەلا باقی هەبوو بێ ماڵوحاڵ بوو ئەمما ئەو ڕۆژە دەرکەوت ئەو مرۆیە چەند ئازا و ڕاستکۆ و بێفێڵە. ڕووی قسەی لە مەلا مستەفا کرد و بێ منجەمنج گوتی: جەنابی مەلا مستەفا ئەگەر لە پیاوی مەرد و بەشەرەف دەگەڕێیت و نیازتە پژدەر بکەیتە دۆستی خۆت، مەرد و بە شەرەف ئەوانەن وا هاتوونەتە لات کابرای دیکە تاکە یەک کەسی بە دواوە نییە. پژدەرییەکانی لەگەڵ من بوون بە دەنگ نەهاتن، منیش شتێکم گوت بە لای قسەکەی مەلا باقیدا بوو بێ ئەوەی کەسی تێدا بشکێنمەوە. مەلا باقی هەر بە ناو مەلا بوو، ڕانک و چۆغەڵی لەبەردا بوو.

ئەم دیدەنییە تێیگەیاندم مەلا مستەفا پرۆژەیەکی سیاسی لە دڵدا هەیە دەیەوێ بەرانبەر حیزب و پژدەریش بەکاری بهێنێت. چەپیەکان کە بەشی زۆریان لە بەغدا هەڵاتبوون دەوری مەلا مستەفایان دابوو، ئەویش بۆ سەرخستنی پرۆژەکەی

دەیحەواندنەوە. بێ ئەوەی خۆم ماندوو بکەم وەیا بچمە سەر شانۆی تەمسیل، هەڵوەستم بە ئاسایی شێوەی موعارەزەی وەردەگرت تا ئەوەی مەلا مستەفا هەستی پێ کرد.

هەندێ کەسی ڕێزدارم لە خزم و برادەران خەبەرداری ئەو پرۆژەیە کرد هەتا جارێکیان لە ماڵی خۆم پێم گوتن دەبێ بەرهەڵستی لەو سیاسەتە بکرێ. یەکێکیان گوتی من تێدا نابم...

گەلێک جار کۆبوونەوەی شکڵ مزاشی زۆر خۆش لە ماڵی برادەرێک ڕێک دەکەوت. جارێ لەو جارانە ڕابەرانی چەپ و حیزب و دۆستی دیکەش لە ماڵی شێخ حسێن (کە هی شێخ حەسەن بوو لە قەڵادزە) لە ئێوارەوە بە نان و پاتێکی شاهانەوە ڕامانبوارد هەتا شەو ڕاشکا، لە ناویاندا سەلیم فەخری هەبوو ناوی نرابوو کاکە حەمە. ٢٥ ساڵ بەسەر ئەو شەوەدا تێپەڕی وا لێرەدا بیری دەکەمەوە. کەوتینە سەر باسی ئایدیۆلۆجیا و مێژووی خەباتی گەلان و چینایەتی و ئەو جۆرە شتانە بەسەر باسی شۆڕشی قولەکانی بەسرەدا کەوتین. من گوتم ئەم هەرایە هی ڕەش بوو دژی سپی، چینایەتیی تێدا نەبوو، ئەگەر سەریش کەوتبایە مرۆڤایەتی زەرەرمەند دەبوو. ڕووم لە سەلیم فەخری کرد گوتم، تۆ لەو سەردەمەدا ژیابایت لای خەلیفەت دەگرت یان لای ڕەشەکان؟ گوتی من لێرەوە لەگەڵ خەلیفەم چ جایی ئەوسا.

لە باسی «مسلمات»ی بێبنگەوە گوتم، بەپێی تیۆری دەبوو چینی ڕەشوڕووت لە ئۆکراین و دەوڵەتە بچووکەکانی باڵتیک و بیلوڕووسیا لە جەنگی جیهانی دووەمدا جانفیدایی بۆ سۆڤیەت بکەن کەچی بە پیر لەشکری ئەڵمانەوە چوون بەڵام ئەڵمانەکان بڕیاری شتێکی دیکەیان دابوو شەستیری لێ بەکارهێنان. سەلیم فەخری گوتی، لەمەش زیاتر فلانە جەنەڕاڵ - ناوەکەم لە بیر نەماوە - لەشکری ڕێک خست بۆ هاریکاری لەگەڵ نازییەکان دژی سۆڤیەت...

سەلیم فەخری زاپتێکی سەربە چەپ بوو بەڵام مێشکی کرایەوە بوو، هەتا ئەوەی کە کتێبی «هەڵستان و کەوتنی ڕایخ»م بە دیاری بۆ هێنا - دوای هودنەی ١٠ی شوباتی ١٩٦٤ - لە بەغداوە، لە پێشکەشدا «المثقف المتعدد الميادين»م بۆ نووسی.

مەلا مستەفا وەڵامی بۆم نارد کە دەیەوێ بچمە لای ئیشی پێمە. بنگەی لە «دوازدە بانووان» وەیا سەنگەسەری نوێ بوو. شەوی دواتر چووم، خەڵقەکەی لە خۆی دوور خستەوە و دوو بە دوویی کەوتینە وتوویژ یاخود کەوتە قسە، من گوێگر بووم. گوتی ئەو باری ئێمەی تێداین موحتاجە بە پەیدا کردنی دۆست، وەدەست خستنی ڕەزامەندیی دەوڵەتان... کەسیشم نییە لێی دڵنیا بم چونکە دڵسۆزم هەیە زمان و سیاسەت نازانێ، زانام هەیە کەمتەرخەمە... تەکلیفم لێت ئەوەیە ئەرکی سەفەرێکی ئەورووپا بۆ چاکەی میللەتەکەت قبووڵ بکەیت و چی بە چاکیشی بزانیت وەها بکە و لەگەڵ چ لایەنێکی پەسەندت کرد بدوێ... من کە چووم بۆ لای نەساغ بووم، پێم گوت دەبینیت نەساغم، سێ ڕۆژ مۆڵەتم بدە وەڵامت دەدەمەوە.

یان سبەینێ بوو یان دوو سبەی لە چوار دۆستی خۆم58 گێڕایەوە و تەکلیفەکەم پێگوتن. یەکێکیان پرسی، چ پێویست بوو ئەو تەکلیفە لای کەس بدرکێنیت؟ گوتم، من بە تەما نیم تیجارەت بە کوردایەتییەوە بکەم، فێڵوفەرەجم نین، دەمەوێ بۆ سبەی ڕۆژ شایەدم هەبێت. ئەو دۆستانە هەرچواریان بە پەسەندییان زانی بچم بۆ دەرەوە. من لە لێکدانەوەی خۆم لەو باوەڕەدا بووم، ئێستاش هەر وەهام، کە مەبەستی یەکەم لەو تەکلیفە ئەوە بوو من دوور بکەومەوە چونکە هەڵوەستی من تەگەرەی دەخستە پێش سیاسەتێکی کە لەو ڕۆژانەدا بە لای سەرۆکایەتییەوە پەسەند بوو، تەگەرەش بەیەک لە سێ شتان چار دەکرێت. یان سیاسەتەکە بگۆڕێ یان تەگەرەکە خۆی - کە من بووم - دوور بخرێتەوە یان لەناو ببردرێت وەیا هەر نەبێ پەک کەوتە بکرێت. هەڵبەت دوورخستنەوەکە سەلامەت ترە مادەم سیاسەت نەگۆڕێ. لە میعاددا چوومەوە لای تێمگەیاند کە ئامادەم بچمە دەرەوە. من لە خۆسازدان بووم خوا بەفرێکی نارد هەرچی ڕێگەی هاموشۆی دەرەوە هەبوو وەها گیرا کە ئەگەر بەفریش وەستابایە تا بیست ڕۆژانیش ڕێگە ناکرێنەوە. لە بێوران بەفر ٥-٦ مەتر باری بوو، سەر شاخەکان هەر مەپرسە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ و سەرەتای ساڵی ١٩٦٤ گەییشنە یەکی دوو لووتکەی هونەری گۆرانیی عەرەب و ڕۆژهەڵات، کەلسووم و عەبدولوەهاب. پێک هات، من

---

58- ئەو چوار دۆستە مەرحووم کاکە زیاد و مەرحووم شێخ حسێن و شێخ حەمیدی خاڵە سەدر و مەحمووداغای کاکە زیاد بوون.

لەوماڵەی قەڵادزە، لە ژووری خۆم، گوێم لە «انت عمري» گرت، بۆ ماوەی دوو سەعاتی خایاند. هەرچەند دەنگی جارانی کەلسووم تەواوێک دابەزی بوو بەڵام ئاهەنگ و مۆسیقای گۆرانییەکە لەو یەکەم جارەدا کەلێنی دابەزینی دەنگی پڕ کردبۆوە.

لەو زستانەدا تەنەکەی نەوت بە 2,5 دینار بوو بەڵام فرۆشیارەکان زەکاوەتی ئەزەلی داکەدزانەیان بەکاردەهێنا بەوەدا کە نیوە نەوت و نیوە ئاو بەیەکەوە بفرۆشن. دەتدیت چرا و لۆکس جارێ لە نیوە یا پتر پڕ نەوتە کەچی دەکوژانەوە چونکە ئەوەی دەمایەوە ئاو بوو. ئەم حیزەفیعلە لەگەلێکی پێشکەوتوودا کە بە بۆرجوازی ناوی دەزڕێنن، وەکوو سویسرە و هۆلەندە، نەک هەر بە وڕێنەشیاندا نایەت کەسێکی بیشی کات حەیا و نامووسی دەچێت.

مەلا مستەفا کەوتە کەڵکەڵەی پێکهێنانی لیژنەیەک بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری خۆپاراستن و ماف وەرگرتن. بە دوا هەموو دەسەڵاتدار و ناودارەکانی عەشیرەتانیدا هەنارد لە پژدەر کۆببنەوە. عالەمێکی زۆر ڕووی لە قەڵادزە کرد و بەسەر ماڵاندا دابەش بوون. شێخ لەتیفی حەفید گەیشتە قەڵادزە بەر لەوەی بچێتە قۆناغەکەی خۆی هاتە ماڵی شێخ حەسەن (واتە شێخ حسێن). نیوەڕۆ بەیەکەوە بووین هەتا دەمەو عەسر. بەر لە هەڵستانی سەرم لە بنا گوێی نا گوتم لە زاری منەوە بە عەباسی مامەنداغا بڵێ بۆ هەردووکتان شوورەییە (وشەیەکی قورسترم بەکارهێنا) کوردایەتی بۆ شتێکی دیکە کز بکەنەوە. شێخ لەتیف و عەباساغا کۆمەڵێک پەڕاگەندەی چەپیان تێئاڵابوون نەختێک لە ڕەنگی کوردایەتییەکەیانی کەم کردبۆوە بۆ ڕەنگێکی ئاسۆفرەوانتر لە کوردایەتی. شێخ لەتیف گوتی، فڵانەکەس خوا ڕووی «ب...» ڕەش بکات کە بە پاڵەپەستۆ و زۆرەملێ و ناوزڕاندن خستمیە حاڵێک بە ناچاری پێی ڕازی بم. هەر کوردم و هەر بۆ کوردیش دەمرم.

هەر شەوە لە دیوەخانەی ئاغایەک کۆبوونەوە دەبەسترا قسەش لەو لیژنەیە دەکرا کە تەرخان بێت بۆ سەرپەرشتی لێکردنی بزووتنەوەکە. دیوەخانێکی کۆبوونەوەی تێدا کرابایە بەو شەو و ڕۆژەی سەرکردایەتی و خەڵقی دیکەش تێیدا دەژیان نیوە موفلیس دەبوو. میناغای گردبداغ بۆ بەڕێکردنی نۆرەی خۆی چەند ملکی لە

قەڵادزە ڕەهن کرد. دوو ئەندامی مەکتەبی سیاسیش بەردەوام حازردەبوون لەو کۆبوونەوەنەدا.59

شەوێک لە دیوەخانەی مەحموودی عەباساغای مەحمووداغای چۆم خڕکە کۆبووبووینەوە. مەلا مستەفا چەند کەسێکی سەربە چەپی لەگەڵدا بوو کە لە بەغداوە پەنایان هێنابوو بۆ کوردستان. ئەوان پێشنیازیان کرد ژمارەی ئەندامانی لیژنە ٢١ کەس بێت. دەرلەحزە زانیم مەبەس لە ژمارەی وەها قەوغا ئەوەیە کە عەشایر بە بەریەوە نییە ژمارەیەکی ئەوتۆ لە تەرخانان هەڵبنێن، بە ناچاری بەشێک لە ئەندامەکان بەر ئەو کەسانە دەکەوێ کە نەماڵیان هەیە و نە وەزیفە و نە هیچ شتێک دەستیان ببەستێت، خۆ ئەگەر هەموو بیستویەکەکە لەوان بێت پەک ناکەوێت. من پێشنیازی نۆ کەسم کرد، لە برادەرانیشم گەیاند مەسەلە چییە و بۆ کوێ ڕادەوەشێنێ.

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا جارێ دەنگ دان نەکرابوو مام جەلال لە دواندنی خۆیدا باسی دیمۆکراسیی کرد کە دەبێ شیرازەی بزووتنەوە بێت. چەپێک، کە پێشتر داوای کردبوو کورد چەک دانەنێت هەتا دیمۆکراسی بۆ هەموو عێراق دەسەپێنێ، ئەو چەپە گوتی باری بزووتنەوەمان ئەوە هەڵناگرێ سەرۆکایەتییەکەی بە گەزوگرێی دیمۆکراسی تەسک و ترووسک بپێورێ و دەبێ ئازاد بێ لەوەی دەیکات من گوتم کورد لە بارێکدا نییە بتوانێ قورسایی ئامانجی دیمۆکراسی بۆ هەموو عێراق هەڵبگرێت... گوتم سەیریش لەوەدایە کە ئەو دەنگەی داوای دیمۆکراسی بۆ هەموو عێراق دەکات هەر خۆیەتی نایەوێت بزووتنەوەی کورد دیمۆکرات بێت.

کە دەنگ درا ژمارە ٩ بە ڕاشکاوی بردییەوە. شێخ لەتیف دەنگی نەدا. عەباس کەوتە لای ژمارە ٩. مەلا مستەفا گوتی ٢٢... دواتر هەر لەو دانیشنەدا ڕووم تێکرد گوتم بۆچی بە لای ئێمەدا نەهاتی؟ گوتی من بە لای کەسدا نەچوم. گوتم ٢٢ برای ٢١ ـە دەبوو بفەرمووی ٨.

---

59- دوو ئەندامەکەی مەکتەبی سیاسی مام جەلال و مەرحووم نووری شاوەیس بوون.

بڕیارم لەسەر دەبڕینی ڕایەک دابوو لەو کۆبوونەوەیەدا دەری ببڕم. داوای قسەم کرد. عەریفی کۆبوونەوە ڕێی دام گوتم، ڕووشم لە مەلا مستەفا بوو، ئەو خەڵقەی لە هەندەرانەوە هاتوون و ئەوانی دیکەش لەبەر گەلێک تێبینی ناتوانن ڕازی دڵی خۆیان بە ئاشکرا لە نێوان ئەو عالەمولآیەدا دەرببڕن. من کە سەراحەت بەکاردەهێنم وێڕای تەبیاتی خۆم نە عەشیرەتم هەیە نە حیزبم بە دواوەیە نە هیچ پێوەندییەک دەستم دەبەستێت، خەڵقەکەی دیکە وەها نین بۆیان دەست نادات دڵی ئەم و ئەو بڕەنجێنن. لەبەر ئەمە وەها پەسەند دەکەم مەلا مستەفا مۆڵەتی دوو سێ ڕۆژ بەو خەڵقە بدات تا ئەوەی بیەوێ بە تەنها یان بە تاقم لەگەڵیدا کۆببنەوە ڕێیان پێ بدات و لەگەڵیان بدوێت و لە تێکڕای قسانیان هەڵوەستێک و ڕەفتارێک بژاردە بکات.

من لە قسەم نەبووبوومەوە مەلا مستەفا داوای قسەی کرد. لە دڵدا گوتم یا حافیز...

سەرۆک دەستی کرد بە قسە گوتی، فلآنەکەس گوتی خەڵقەکە بە سەراحەت نادوێت یەعنی خەڵقەکە درۆ دەکات منیش دەڵێم هەموومان درۆمان کردووە ئەمما ئەوا من ئێستا چی ڕاستە ئەوە دەڵێم... ئیتر بە سەروپۆتەڕاکی حیزبدا هاتە خوارێ چی ناشرین و ئابڕووتکێن بوو ئەوەی گوت. تاکوو لەبنی کدووی دا و دەریبڕی کە هاتووە هەتا حیزبەکە پاک بکاتەوە (دەبووە نەهێشتن و مراندن). جارێ سەرۆک لە قساندا بوو مام جەلال داوای نۆرە قسەی کرد. نەمدەزانی چ ماوەتەوە لە قامووسی گفتوگۆدا بەرانبەر ئەو قسە تاڵ و تفتانەدا بگوترێ بەڵام مام جەلال لەو شەوەدا وەها دوا بە عەقڵی کەسدا نەدەهات، ڕەنگە بۆ خۆیشی بەتەما نەبووبێ وەها زیرەکانە و شارەزایانە بدوێت. چەندێکی بمەوێ قسە گێڕانەوەی خۆم لە قسەکانی ئەو نزیک بکەمەوە بێسوودە، بە کورتی و بێئاراییشت دەڵێم باوەشی بە وشە تاڵ و تفتەکاندا گرت و کردی بە هۆی بەزەیی بۆ حیزبێکی کەم تەجرەبەی بێهێز کەوا هەمیشەکات چاوی لە سۆزی باوکی خۆی بێت... خولاسە ئەو جنێوانەی کرد بە پەندی باوکایەتی بۆ ئەولادی خۆی. بەو جۆرە کۆڵەمستەکەی کە بۆ شەویلەی حیزب وەشێندرابوو کەوتە بۆشایی.

ئەمە دەڵێم لە سنووری قسەی مەجلیسی و جوابەجێیی، چی لە دالآنیشدا هەبوو حیسابی جودایە... کە خەڵقەکە لە کۆتایی کۆبوونەوەدا هەڵستان، بە تەنیشت مەلا مستەفاوە بەرەو دەرەوە دەڕۆیشتم پێم گوت، بم بوورە ئەگەر تێبینیەکەی من هیچ

ئاکامێکی خراپی لێ پەیدا بووبێ، لە وەڵامدا گوتی، هەر ئەوەندە قسەیە کەڵکی پێوە بوو کە تۆ کردنت...

بە هەر حاڵ بڕیاردار سێ ڕۆژان مۆڵەت بێ هەتا ئەگەر کەس دەیەوێ مەلا مستەفا ببینێت لەو ماوەیەدا دیدەنی لێ بکات. ڕەنگە هیچ عەشیرەتێک و تاقمێک نەمابێ کۆبوونەوەی لەگەڵدا نەکات. من بە تەنها لەگەڵی دوام،60 قسەیەک لە ناخی دڵمەوە سەری کرد. چووم هەردوو ئەژنۆم بە هەردوو ئەژنۆیەوە نووساند دەستی ڕاستم درێژ کرد و چەنەگەیەم بە نەرمی گرت و گوتم فلان توو ئەو

---

60- عەقید کافی نەبەوی پێمی گوت: ئایا منیش حازری ئەو دیدەنی کردنەت بم لەگەڵ مەلا مستەفادا؟ گوتم بەخۆشییەوە. بەڵام نەهات بۆ دیدەنییەکە. من لەگەڵ شێخ حسێن و حاجی سەیدی کوڕی شێخ حەسەن کە زۆر تامەزووی دیتنی مەلا مستەفا بوو، وێکڕا چووینە لای. دوای ماوەیەک شێخ حسێن و حاجی سەید بەجێیان هێشتین.

من قسەی سەرەکی و بنەڕەتیم لە وتووێژێکی دوورودرێژدا ئەوە بوو کە پێم گوت: بە چەپەکانمان مەفرۆشە! وەرامیشی بە چاوی ئاوتێگەڕاوەوە ئەوە بوو کە گوتی: هیچ ڕووناکایی یارمەتیدەرێک لەم دنیایەدا شک نابەم، دەڵێم بەڵکوو لە ڕێی ئەوانەوە ڕووسەکان سەرێکمان لێ خوار بکەنەوە.

خوێنەر دەبێ بزانێ کە ئەمەم بە مەلا مستەفا گوت نە کینی شەخسی و نە هیچ نیازێکی تایبەتی هانی دام. دەمزانی چەپایەتی شۆڕشەکە بەلای نیازی خۆیدا دەباتەوە و دەیکات بە تێبەستە و پاشکۆی ئینتەرناشینال و لە ئاکامدا هەر قوربانییەکی کورد بیدات و دابێتی دەبێتە ڕەنج بەخەساری و هیچی لێ شین نابێتەوە جگە لە شەڕی چینایەتی کە خۆی لە خۆیدا بریتییە لە ماڵ کاولی کورد و ئیفلاسی هەوڵەکانی.

ئەو شەوەی مەلا مستەفا قسە تاڵەکانی بەرانبەر حیزب دەبڕی، دواتر لە مەرحووم نووری شاوەیسم پرسی: تۆ وەرامدەرەوەی ئەو قسانە بایت لە جیاتی مام جەلال چیت دەگوت؟ گوتی وەڵاهی لە قسەی لەوجەڕ و هەلەق و پەلەق بەولاوە هیچم بۆ نەدەهات.

خوایەی بە حەقی دەناسیت... ئیتر چی لە دڵدا دەکوڵا هەڵڕژا... چاوەکانی تەڕ بوون گوتی، بە حەقی ئەو قورئانەی مەلای گەورە لەسەر ڕانی داناوە... ئیتر متمانەی دامێ.

لەو بارودۆخەدا بووین ڕووپەڕەیەکی ڕۆژگار کرایەوە بە خەیاڵدا نەدەهات، لە بەغداوە عەبدولسەلام عارف باوەڕپێکراوێکی کوردی[61] نارد بۆ پێوەندی کردن بە چەکدارانەوە بە نیازی نانەوەی ئاشتی... لەپاش هەڵسەنگاندنی ڕاسپاردەکە بڕیاردرا لەسەر قبووڵ کردنی، هەر دەبوو وەهاش بێ، چونکە کەس نییە ئەوەندە شێت بێ، پێشنیازی ئەوتۆیی ڕەت بکاتەوە، گۆیا چی چاکتر هەبوو بکرێ؟

وەفدی حکوومەت بریتی بوو لە موتەسەڕیفی سلێمانی و عەمیدێکی جەیش، هەندێک نارەزا بوون لە وەفدەکە گۆیا وەفدێکی کزە ناگاتە «مستوی الاحداث». مەلا مستەفا، گوتی، پۆلیسێکیش (ڕەنگە وشەیەکی غەیری پۆلیسی بەکار هێنابێت) قبووڵمە خۆ من نەچووم دەرگەیان لێ بدەم، ئەوان ماندوو دەبن کێیان دێت با بێت.

61- عەبدولسەلام پێوەندی بە بابەعەلی شێخ مەحموود-ەوە کردبوو کە ڕاسپاردەی ئاشتی نانەوە لە حکوومەتەوە بە مەلا مستەفا ڕابگەیەنێت، ئەویش دۆستێکی خۆی هەناردبوو بۆ لای مەلا مستەفا کە ئەوسا دەمناسی بەڵام ناویم لەبیر نەماوە، وابزانم سەروکارێکی پزیشکی و ئەجزەخانەی هەبوو. من ئەو پیاوەم لەو هاتنەیدا نەدیت.

دوای گەییشتنی وەرامی پەسەند کردنی داخوازییەکەی عەبدولسەلام لەلایەن مەلا مستەفاوە، وەک دێتەوە بیرم، لە ماوەی حەفتەیەکدا، وەفدی حکوومەت هات بۆ ڕانیە کە ژووانی لێ کۆبوونەوە بوو.

## ئاڵقەی پازدەیەم

لە کانوونی دوەمی ١٩٦٤ دەست بە گفتوگۆ کرا لەگەڵ وەفدی حکوومەت، بەڵام یەکەم ڕۆژی دەست پێکردنەکەم لەبیر نەماوە، لە ڕانیە کۆدەبووینەوە. هەرچی ڕەوتێکی سیاسی وەیا دەسەڵات وەیا لێهاتوویی پێوە بوو لە کوردانی ئەو دەوروبەرە دەهاتە کۆبوونەوەکان بەڵام ئەوانی بۆ وتووێژی پێکهێنانی لیژنەی سەرپەرشتی کردن، لە دوورەوە هاتبوون بۆ شوێنی خۆیان گەڕابوونەوە. ئەو دوو ئەندامەی مەکتەبی سیاسی بەردەوام بوون لە هاتوباتی وتووێژی ڕەسمی. ڕاستییەکەی لەلایەن خۆمانەوە چەند کەسێک قسەی دەکرد ئەوی دیکە گوێگر بوون. پێی ناوێ بڵێم ڕەنگە خوێنەر لە خۆوە بزانێ بە هەموو دڵ حەزم دەکرد موفاوەزات سەر بگرێت. چەندین جار لە چەند ڕۆژی جودادا وەفد دەهاتە ڕانیە و هەتا نانی نیوەڕۆ و دوای ئەویش لە قسەدا دەبووین. ناوناوە دڵگەرمی دەگەیشتە ڕادەیەک دەتگوت ئێستە مووی موعاوییە دەپسێت، دوو جار سێ جاریش وەهابوو موتەسەڕیفی سلێمانی - کە من بە زۆری لە تەنیشتییەوە دادەنیشتم - خەریک بوو هەڵستێت و بە نائومێدی بچێتەوە بۆ ماڵی خۆی، من دامدەنیشاندەوە، نازانم ئەگەر وەهام نەکردایە کەسی دیکە کە پایەیان لە دەسەڵاتی چەکداری هەبوو بە خۆیان ڕەوا دەدیت یاخود شەرمیان نەدەکرد لەوەی بەعوزرهێنانەوە موتەسەڕیف دانیشێنێتەوە؟ ئەمە دەڵێم چونکە مەلا مستەفا لە هیچ جارێکدا بە دەنگ نەهات بۆ تەسکینی موتەسەڕیف، دڵگەرمییەکەش بە زۆری لە قسەی مەرحوم نووری شاویسەوە[62] پەیدا دەبوو

---

62- دڵگەرمییەکەی نووری شاوەیس جگەلە جوداوازی بیروڕا هۆیەکی دیکەشی ئەوە بوو کە زەدەی نەساغییەک بوو بەلای دڵگەرمییەوەی دەبرد و ئارامی لێ هەڵدەگرت تا ئەوەی لە توانایدا نەما بەردەوام بێ لە وتووێژی بەرەو ئاشتبوونەوە و گەڕایەوە بۆ مەکتەبی سیاسی. نووری لە تەبیاتدا هێمن بوو، هەرگیز لەگەڵ مندا بە توندی نەدواوە. ئەو نەخۆشییەی لە ئاکامدا کاری لە دڵی کرد و بوو بە هۆی مەرگی.

لەو ڕۆژانەی موتەسەڕیف دەهاتە ڕانیە هەرجارە چەند زەنبیلەیەکی سێو و پرتەقاڵی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا ئیتر ئەوە بوو دواتر لە ناکۆکیدا دەگوترا کوردستان بە سێو و

دیاره ئەویش ڕێ بە خۆی نادات پاشگەز بێتەوە، ئیتر کەسی دیکە بە حەقی خۆی نەدەزانی لە حزوور ئەو دوو لایەنە خۆ لە قسان هەڵقوتێنێ...

بۆم دەرکەوت موتەسەڕیفی سولێمانی، عەمید سەید عەبدولڕەززاق سەید مەحموود، بە دڵ و بێفێڵ بۆ ئاشی دەکۆشا. لە ساڵی ١٩٦٥ کە حکوومەت کەوتە سەر هەناردنی هێز بۆ کوردستان ئەو پیاوە ئیستیقالەی دا لە موتەسەڕیفایەتی... ئەو دەمە من وەزیر بووم بەرهەڵستیم کرد لە قبووڵ کردنی ئیستیقالەکەی، وەزیری داخلیە گوتی ئەگەر وەهابێ من ئیستیقالە دەدەم. ئەو وەزیرەش ناسرِی بوو، کە ئیستیقالەی دابایە دەبوو هەموو ناسرِییەکان لێ دەرچن.

ڕۆژی دەی شوباتی ١٩٦٤ نزیک نیوەڕۆ لێکرازیبوون پێک هات. مەلا مستەفا گوتی بڕۆن هەمووتان کۆببنەوە و بەیاننامەیەک بنووسن بە ئارەزۆی خۆتان و بەپێی بەرژەوەندێکی ڕەچاوی دەکەن، من ئیمزای دەکەم. لە هۆڵێکی گەورە هەرچی براگەورە و قسەزان و زاپتی پەنابەر هەبوون بۆ ماوەیەکی پێویست لەسەر چەند خاڵێک ڕێککەوتن. من بەیاننامەکەم نووسی، لەگەڵ مام جەلال بردمان بۆ لای مەلا مستەفا و پێمان گوت ئیمزای بکە. دەقی بەیانەکەم لا نییە بینووسمەوە بۆ خوێنەر، بەڵام لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژە ڕەش بوو لەلایەن نەداری و بێدەسەڵاتییەوە شتێک بوو تێکڕای خاوەن ڕایان پەسەندیان کردبوو، هیچیشی تێدا نەبوو یەک دانە پۆلکەی ڕزیو لە کیس کورد بدات. موتەسەڕیف وەها گەشایەوە دەرحاڵ بەیانەکەی لەگەڵ خۆی برد و بەو ڕێگەی قوڕاوی ئەوسا لەو وەختە مەیلەو درەنگەدا ملی لێ نا بۆ بەغدا، هەمان شەو لە ڕادیۆی بەغدا خوێندرایەوە. لە خەڵقم دەبیستەوە چ خۆشییەکی خستبوە وڵات.

پاش ئیمزا کردنی بەیانەکە هاتوچۆی موتەسەڕیف نەپسایەوە بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستێکی هەبێ. خەڵقی دیکەش دەهاتن بۆ ڕانیە، لەوانە وەفدێکی «صحفي» بوو

---

پرتەقاڵ فرۆشرا... باوەڕ ناکەم مەلا مستەفا لەو مێوەیەی خواردبێت. جارێکیان بەتایبەتی موتەسەڕیف زەنبیلەیەکی گەورەی بۆ من هێنا بوو، کەمێکی لێ گەییشتە ماڵی من لە قەڵادزە، سەرپەرشتانی پێشوازی کردن لە کۆپتەری موتەسەڕیف بەرخودار بن شارەزا بوون لە تەخش و نەخشی دیارییەکی هاتبایە.

هی قاهیرەشیان تێدا بوو لە ناویاندا «جلال کشک» نووسەرێکی «روزالیوسف» بوو کە چۆوە قاهیرە مەقالێکی ڕێکوپێکی لەسەر ئەو سەفەرەی خۆی و وەزعی کورد و کەسانی کە دیبوونی نووسی بوو، نەختێکیش باسی منی تێدا بوو.

لە مارتی ١٩٦٤ خدری حاجی ڕەسوغای پژدەر گیانی سپارد. تازیەی لە دێی گەرمکانی بناری ئاسۆس بە دیوی پژدەردا بوو. من لە شوێنێکی نزیک بەو دێیە بە کەڵەک لە زێ پەڕیمەوە، یەکەم جار بوو سواری کەڵەک ببم کە بریتیە لە دارەڕێیەکی شاش بەسەر چەند کوندەیەکی فوودراوەوە، وەختە بڵێم کەلێنی نێوان ڕایەڵی دارەکان پتر بوون لە دارەکان خۆیان. دەتتوانی لەو کەلێنانەوە بە گۆلم ئاو بخۆیتەوە، ئینجا من مەلەش نازانم، دەترسام، بەڵام نەمدەهێشت ترسم پێوە دیار بێت.

لەو تازیەیە بووم دیتم لە دوورەوە، لای سەنگەسەری نوێ کۆپتەرێک نیشتەوە دوای ڕۆژێک بیستم ڕۆژنامەچیی تێدا بوون، نوێنەرێکی حیزب گوتبووی بەیانەکەی دەی شوبات هەموو شتێک نییە، بەند هەیە نهێنی لەوێدا نەنووسراوە. حکوومەتی بەغدا زۆری پێ ناخۆش بوو، ڕۆژێک دوانی دیکە چوومە سەنگەسەر، ئەم مەسەلەیە قسەی لێوەکرا. وەها پەسەند دیترا بەدرۆخسنەوەیەک لە زاری مەلا مستەفاوە بڵاوبکرێتەوە. من دەقەکەیم نووسی بەجۆرێک حکوومەتی ڕازی کرد، ئەمما جێی ئەوەشی تێدا بۆوە، ئەگەر بەندی نهێنی هەبووبێت بەدرۆخستنەوەکە ڕەشی نەکردبێتەوە. نووسی بووم هەموو بەیانێکی ئەوتۆیی بە ناچاری هێندێ تەفسیلاتی دەبێت کە لزووم نەدیترێ بە بڵاوکردنەوەی بێ ئەوەی پێی بگوترێ بەندی نهێنی... دوای یەک دوو مانگ کە هاتمە بەغدا قەرەنی دۆغرمەچی گوتی حکوومەت بەو «تەکزیب»ـە زۆر کەیفی هاتبوو کەچی نە «تەکزیب» بوو نە هیچ...

پەڕاگەندەی شارەکان بەتایبەتی کۆییەکان ڕوویان کردەوە کۆیێ،ماڵی منیش لە مانگی نیسان گەڕایەوە کۆیێ، من ناوناوە سەفەری دیوی ڕانیەم دەکرد، کارێکی زۆرم بە ملەوە بوو، بەتایبەتی هی ئەو موەزەفانەی فەسڵ کرابوون. بۆ گەلێک سەروبەری ئەو بەیانە دەبوو هاتوچۆی بەغدا بکەم، چەند جاری چووشبام خەبەرسازان و خاوەن نیازان لە دەرەوە و ناوەوە پێوەندییان پێم دەکرد، تا ئەوەی هەندێ جار بە شەو لە جێگەی وەها دیدەنیم، دەکردن نە خاوەن ماڵم دەناسی نە

سەرەدەریم لەگەڕەکەکەی دەکرد، بەڵام هەرچی گوترابێت و پێشنیاز کرابێت لەو دیدەنییانەدا بایی موویەک منی نەبرد بە لای تێک دانەوەی ئەو ئاشتبوونەوەیە. ئەم جیهانەی سیاسەت زۆر چڵکنە، گەلێک چڵکنتر لەوەی بە خەیاڵتدا دێت ڕێگا چڵکنەکەشی چەشەی وەها لە مجێزی تێدایە کورم دەویّ خۆگیری لیّ بکات.

بە پێی پێویست ناوناوە سەردانم لە سەرۆک وەزیران فەریق تاهیر یەحیا دەکرد، بۆ لای وەزیری داخلیە «حاکم عسکری عام» ڕەشید موسڵیح-یش ڕێگای هاتوچۆم کرایەوە بوو. من لە تەبیاتمدا نییە بە ناچاری نەبیّ خۆم لە کاربەدەستی حکوومەت نزیک بکەمەوە. جارێکیان لە وتووێژدا گوماناوی بووم سەرەک وەزیران گوتی، باوەڕت پێم نییە؟ گوتم: «أنا أثق في طاهر يحيى ولكن لا أثق في رئيس الوزراء»، چونکە وەک لە شتی عاید بە خۆی دەتوانیّ دروست بێت ناتوانیّ لە شتێک کە لە زۆر لاوە تاوی بۆ دێت ئەو دروستە بێت. بێگومان تاهیر یەحیا ژیرتر بوو لە عەبدولسەلام پتریش متمانەی پێدەکرا. ناشیەتە بیرم لەو هاتووچۆیانەمدا سەرم لە عەبدولسەلام دابێت.

نێوانی مەکتەبی سیاسی و مەلا مستەفا بەرەو لێڵتربوون دەبۆوە جاریّ موویان نەپساندبوو هەوڵێک درا63 بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتی نێوانیان بە ناوبژی کردن لەلایەن کۆمەڵێک لە کوردە پەرۆشدارەکان و خاترویستراوەکانی بەغداوە. من لەبەر مەشغەڵەتی کە پێم سپێردرابوو نەمتوانی بە کۆبوونەوەی یەکەمیان ڕابگەم کە لە ڕانیە لەگەڵ مەلا مستەفایان کردبوو.

ڕۆژی دوەم کە گەیشتمە ژووری لیّ کۆبوونەوەیان و سەلامم کرد، ڕەشید عارف، لە جیاتی وەڵامم، گوتی هەموو شتێکمان تەواو کردووە هاتنی تۆی پیّ نەدەویست. گوتم خەبەری خۆشتر پەیدا نابیّ لەوەی ڕزگارم بکا لە دەردەسەریی چەقەچەقی موناقەشە. نووسراوێکی ئیمزاکراو لەلایەن مەلاستەفاوەیان دامیّ کە ڕێکخرابوو بە

---

63- ئەوەی بە من گەییشت نامەیەک بوو لە «مەکتەبی سیاسی»یەوە، دڵسۆزانە نووسرابوو کە بەشداری بکەم لە کۆبوونەوە لەگەڵ مەلا مستەفادا بۆ ڕەواندنەوەی گیروگرفتی نێوان ئەو و مەکتەبی سیاسیدا. نەمپرسی خەڵقەکەی تر ئایە بە نامە داوەت کرابوون یان بە زار.

ناوی داخوازییەکانی کورد لە حکوومەتی عێراق. کە خوێندمەوە دیتم هەڕەشەی قورسی تێدایە دەتگوت هی شەڕپێفرۆشتنە گوتم هیچ بەرهەڵستیم نییە لەو شێوازە توندە بە مەرجێک کە بزانین ئەمە ئەرزوحاڵی محامی نییە تا ئەگەر حاکم ڕەفزی کرد هیچی خراپی لێ ڕوو نەدا ئەمە داخوازیی میللەتێکە لە ڕێگای مەلا مستەفاوە بۆ حکوومەتێک ئنجا دەبێ لە حاڵی ڕەت کردنەوەیدا دەست بکرێتەوە بە شەڕ... تێکڕایان قسەکەمیان پەسەند کرد.

بایی ئەوەی لە ڕەفز کردندا شەڕ پەیدا نەکات شێوازی نووسینەکەمان گۆڕی... سوبحانەڵا لە پێنج دەقیقەدا دەرکەوت هاتنەکەم بێلزووم نەبوو. سەعاتێکیشی نەبرد تێگەیشتم ڕەشید عارف بۆچی وەها بە ڕەهایی و دڵنیایی گوتی هەموو شتێک تەواوبووە. تومەز توانیبووی بەهانە بدۆزێتەوە بۆ پێویستی بەرژەوەندێکی کورد بەو دوو نامە لە مەلا مستەفاوە بۆ سەرۆک کۆمار و ئەوەی دیکەش بۆ سەرەک وەزیران خۆیشی کاغەزەکانی وەرگرتبوو هەتا باشتر و مسۆگەرتر بیانگەیەنێتە جێگەی مەبەست. دواتر کە خەڵقەکە گەڕانەوە بەغدا منیش بۆ ئیشێک چووم، دیتم ڕەشید بەدەست ئەو دوو کاغەزەوە گیری خواردووە. گوتی چەندی تەلەفۆن دەکەم بۆ قەسری جمهوری و جێگەی سەرەک وەزیران کە کاغەزی ئەوتۆییم پێیە دەبێ خۆم بە دەستییان بگەیەنم کەس گوێم ناداتێ... یەک دوو ڕۆژی دیکە گوتی، باوکیان وەها وەها لێ بکەم بە پۆستە کاغەزەکانم هەنارد. پێم گوت فڵان تۆ کە هێندەت مەبەست بوو بگەیتە ئەو شوێنانە دەمتوانی من یاریدەت بدەم چونکە هەر کاتێک بمەوێ دەتوانم بیان گەمێ... سبەینە لە سەردانی فەریق تاهیر یەحیا پێم گوت حەز دەکەم لە دەرفەتدا مجامەلەیەکی فڵانەکەس بکەیت[64]... دوو ڕۆژی نەبرد ئەو مجامەلەی لەگەڵدا کرد.

گرووپی کوردەکانی بەغدا تەکلیفیان لە مەلا مستەفا ئەوە بوو کەوا لەگەڵ مەکتەبی سیاسی ئاشت ببێتەوە. لە پاش گەلێک وتووێژی پەندامێز قسەی خەڵقەکەی هەڵگرتەوە بەڵام گوتی، «پسن دیدم گرچە مصلحت ندیدم»، واتە سەلماندم هەرچەند بە مەسڵەحەتیشی نازانم. لەم بارە هەستیارەدا نەشرەیەکی شکڵ بەیانی

64- ڕاستییەکەی داوام لە سەرەک وەزیران کرد موجامەلە لەگەڵ ڕەشید و عەلی کەمال-دا بکات.

سیاسی65 لە مەکتەبی سیاسییەوە دەرچوو بریتی بوو لە دەوری ١٥-١٦ ڕووپەڕەی پڕ لە ڕەخنەی هەرە هەرە بڕندە دەربارەی ڕێککەوتنەکەی دەی شوبات،

---

65- من خەریک بووم دیدەنی لە مەلا مستەفا بکەم، بەر لە چونم بۆ لای بە چەند دەقیقەیەک ئەو نەشرەیەم خوێندەوە کە تازە وەک بەفری هەوەڵ شەو گەییشتبووە ڕانیە. پێی ناوێ بڵێم لەڕادەبەدەر هەستمی بریندار کرد. من کە لەسەر داوەتی مەکتەبی سیاسی بێم بۆ ئەو کۆبوونەوەیە - بێگومان هەموو مێوانەکانیش بە دوا داوەتی مەکتەبی سیاسییەوە بۆ بەرژەوەندی کورد زەحمەتی ڕێگا و ئیحتیمالی حکوومەت تۆراندنیان هەڵگرتبوو، داوەتەکەش لە بنەڕەتدا بۆ چارەسە کردنی دڕدۆنگیی نێوان مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی بێت چۆناوچۆنی دەشێ مەکتەبی سیاسی ئەو بەیانە بێڕەحم و ئینسافە ڕامالێ بناگوێی سەرۆک و بەرۆک و گەڕۆک و نەگەڕی کوردەواری بکات؟ چوومە لای مەلا مستەفا باسی ئەو بەیانەم نەکرد پێوەی دیار بوو جارێ ئاگادار نییە لێی. دوای دوو سێ دەقیقە بارزانییەک هاتە ژووری کاغەزێکی بەدەستەوە بوو، زانیم هەمان بەیانە کە مەلا مستەفا بەیانەکەی وەرگرت و کاغەزەکەی لێک کردەوە بەدەست خۆم نەبوو وەک منداڵی ساوا بە پاڕانەوەیەکی بێجێ و بێسوود گوتم: توخوا مەیخوێنەوە... خوێندییەوە و بێهەست کاغەزەکەی پێچایەوە... هەڵبەت ئەو بەیاننامەیە هەموو تەئسیرێکی هاتنی کوردەکانی بەغدایەی سڕییەوە بەڵام بێ ئەوەی بە قسە شتێکم گوێ لێ بووبێت لە مەلا مستەفاوە.

بۆ شیرن کردنەوەی ئەم تاڵاییە نوکتەیەکی ڕەشید عارف دەگێڕمەوە لە دەمی هاتوباتی خەریک بوون لە بەرتەرەف کردنی ناکۆکی نێوان مەلا مستەفا و حیزب. ڕەشید پێمی گوت، حیزبێکمان داناوە حیزبی شێتان، مەلا مستەفا سەرۆکیەتی، وابزانم ڕەشید خۆی سکرتێر بوو، ئەندامەتیشی مەرجی قورسی تێدایە دەبێ کابرا ئیسپاتی شێتایەتی خۆی بە شایەد و مایەد بکات. لەو قسانەدا بووین، کات شەو بوو عەلی کەمال ڕووی لە کۆمەڵێکی ئاغای دزەییان کرد پرسی ئێوە بۆچی هاتوون، گوتیان حکوومەت لە دێیەکانی خۆمانی دەرکردووین بێ کار و کاسبی و بێ تەعویز پەڕاگەندە بووین بەڵکوو مەلا مستەفا چارەیەکمان بکات. عەلی کەمال لە دڵگەرمیی کوردایەتییەوەی گوتی: بڕۆن دەریان کەن باوکیان لە کەر بکێشن و وەهایان لێ

عەرەبیەکەی لە ژێر سەرناوی «أسلم (ياخود أصلح) أم إستسلام» دا بوو، هەرچی حەق و ناحەقە لە توانجی تفت و تاڵ و ژاڵ بەو ڕێککەوتنەوە گوترا بوو.

کاتێک موفاوەزات بوو، بە دوا ئەویش بەیان بڵاوبۆوە ئیبراهیم ئەحمەد لە دەرەوەی عێراق بوو. کە هاتەوە ئەو بەیانە دەرچوو بەو هەموو هێرشە لەحەدبەدەرەوە. ئەوسا مەکتەبی سیاسی کە هەموو ئەندامانی بە قوتابی ئیبراهیم ئەحمەد - وابزانم سکرتێری حیزبیش بوو - حیساب دەکران بەبەریەوە نەبوو خۆی بەرانبەر بیروڕا و خواییشتی ڕابەری ڕوحیی خۆی ڕابگرێت. بەیان کە ئیمزا کرا لەلایەن مەلا مستەفاوە بەقسەی نوێنەری حیزب ئیمزا کرا… بەڵام مەنتیقی کەڕ و لاڵە ناتوانێ لەگەڵ خوازی نەفسی ئادەمی هیچ بکات، خوازیش لەوانەیە سەرکێشی بێت و لەوانەیشە تەسلیمبوون بێت…

خەڵقەکەی لە ڕانیە بە لای خۆیانەوە سەرکەوتوو بوون لەو ئامانجەی بۆی هاتبوون کەوتبوونە سەر خۆ کۆکردنەوە بۆ گەڕانەوەی بەغدا دەتگوت کەس ناپەرژێ خۆ لە مەدلوولی ئەو هێرشە کوشندەیەی مەکتەبی سیاسی بگەیەنێت. ڕاستییەکەی بێ ئەوەی ورتە لە کەسەوە بێت سڕی و گێژییەک خەڵقی تەنیبۆوە.

لە کۆتایی مایس وەیا نەختێک زووتر، سەرەک وەزیران سەردانێکی مەلا مستەفا و هاوڕێکانی کرد لە دووکان. بەیەک گەیشتنی هەر دوو لایەن زۆر بە گەشی و خۆشی چووە سەر تا ئەوەی لە تەکلیفدا شەوێکیش لایان مایەوە بە مێوانی لە ڕانیە. ئەو بەینە هەتا بەرچایی سبەینەش تەواو دەبێ خیلاف لە نێوانیاندا نامێنێ و لەسەر هەموو شتێکی باس کرابێت پێک دێن. من لەوێ نەبووم بەڵام بۆیان گێڕامەوە کەوا

---

بکەن… ڕەشید بە بەردەستەکەی سکرتێری حیزبی شێتانی گوت: «کاک عەلی کەمال بە ئەندام قبوله بێ شروط…».

لێرەدا وەفاکاری داوا دەکات شایەدییەک بۆ عەلی کەمال بدەم کە هیچ موحتاجی شایەدیش نییە لە کەسەوە بۆ دڵسۆزیی ئەو لە ئاست کورد و کوردستاندا، ئەو ڕۆژەی کە لە دیدەنی نووری سەعید-دا باسی بێڕێیی نێوان کۆیە و ڕانیەم کرد، نووری سەعید گوتی: عەلی کەمال-یش شکاتی ئەوتۆی کردووە لام لە بارەی ڕێوبانی ناوچەکەوە.

بەر لە هەڵستانی سەرەک وەزیران بۆ گەڕانەوەی بەرەو بەغدا یەکێک - وەک پێم گوترا ئەو ئەندامە بووە کە بەیانەکەی «إستسلام»ی نووسیبوو - گرفتێک قسە لێ دەکات، بوو بەهۆی هەڵوەشانی ڕیسی ئەو یەک دوو ڕۆژە.

من چیم گوێ لێ بووە ئەوە دەگێڕمەوە، لە زۆر کەسیشم بیستووە، تەنانەت دوای ئەو یەکتر دیتنە لە دووکان و ڕانیە کە سەردانی فەریق تاهیر یەحیام کرد لە بەغدا ئەویش هەمان شتی گوت. بە دەست خۆم نەبوو لە شێوەی گلەیی بە تاهیر یەحیام گوت: کێ زەرەری دەکرد ئەگەر خەبەر بە من درابایە لەو یەکتر دیتنەدا بەشدار بم؟ ئەمە دەڵێم چونکە بە ڕاشکاوی و دڵنیایی و لە خۆ ئەمین بوونەوە لەوانە بووم بێپەروا لەسەر بەیانی دەی شوبات و هەر ڕێککەوتنێکی بە دوایدا هاتبێت بکەمەوە چونکە لە گۆشەنیگای کەسێکی سەربەخۆی وەکوو منەوە ڕێککەوتن بە ڕوونی و بێپەردە دەدیترا نەک لە پشت چاویلکەی سیاسەتی حیزبی و هەق و حسێبی پەنامەکییەوە.

بەهەمەحاڵ کەسانێکی لەو یەکتر دیتنەدا مافی بیروڕا دەربڕینیان بەکار نەهێنا لەبەر هۆی هەمەچەشنە هەر خۆیان بوون لە وتوویژەکانی گشتی قەڵادزەش لەبەر هەمان هۆی هەمەچەشنە لەسەر بەرژەوەندیی خۆیشیان بە دەنگ نەدەهاتن. هەڵبەت من وەکوو ئەوان نەدەبووم. من هەر نەبێ لە سێ نوختەی گرنگەوە تەجرەبەی جودام هەبوو لەچاو ئەو خەڵقە:

- نوختەی یەکەم ئەوە بوو، من لە نیابەتدا ڕووبەڕووی دەوڵەت دوواوم.
- نوختەی دوەم ئەوەبوو لە تەمووزی ١٩٦٠ بیروڕای گرنگم بڵاو کردەوە بە ڕەخنە لە سیاسەتی حیزب.
- نوختەی سێیەم ئەوە بوو کە من ئەو زەرەرە قورسە ناکەم لە دەربڕینی بیروباوەڕ وەک کە خاوەن بەرژەوەندی زل دەیکات. زەرەری من تەنها لەوەدایە کە قازانج ناکەم...

هەرچۆنێک بێت من ئێستا کە دێم ئەم کۆنە خەرمانە دەکوتمەوە مەبەستم نییە کەس زەدە بکەم، شتێکە پێوەندی بە گەشتی ئەو ڕۆژگارەمەوە بێ ناشێ خۆمی لێ خامۆش بکەم، هەلێکیش بوو لە دەست چوو وەک زۆر هەلی دیکە کە یەکێک لەوان هەر ئێستا دەیگەمێ.

سێ مانگێک بوو ئاشتینامەی شوباتی ١٩٦٤ ئیمزا کرابوو، لە سەفەرێکی بەغدامدا کاتێک بە کتێبخانانددا دەگەڕام بۆ پەیداکردنی نوسخەیەکی کتێبی «هەڵستان و کەوتنی ڕایخی سێیەم» هەتا بیکەمە دیاری بۆ «سەلیم فەخری» کە ئەوسا لە قەڵادزە و ڕانیە بەسەری دەبرد، لە یەکێک لەو کتێبخانانەدا کابرایەکی شکڵ بێگانە، بە نامەی تەماشاکردنی کتێبان هاتە تەنیشتمەوە، بێ ئەوەی ڕووم تێبکات، بە ئینگلیزییەکی شکستە دەنگی هەڵبڕی بایی ئەوەی هەر من بیبیسم گوتی، لایەنێک هەیە دەیەوێ لە بابەت مەسەلەی کوردەوە بتدوێنێ، ئەگەر ئامادەبیت بە دواتدا دەنێرێت... گوتم ئامادەم.

بە شەو منیان بردە شوێنێک و ماڵێک کە نەمدەزانی کۆییە. بابایەک بە ئینگلیزییەکی ڕەسەن قسەی دەکرد، گوتی من نوێنەری هێزێکی زلم و ئاگاداری پەناوپەسێوی سیاسەت هەم. حکوومەتی عەبدولسەلام هیچ مافێک بۆ کورد ناسەلمێنێ، ئەگەر ئەو بڕوات حکوومەتێک دێت لەگەڵ کورد ڕێک دەکەوێت، ئێوەش دەتوانن لە ڕێی شەڕەوە بێهێزی بکەن. هەرچی یارمەتییەکی بتانەوێ لە چەک و پارە و بژێو بێحیساب بۆتان دێت.

بۆ من پێشنیازەکە هێند کوتوپڕ بوو، ئەرکی زۆر و تەمای گەورەشی تێدا بوو، هەڵوەستێکی پێ کردم هەتا ئەم پرسیارە خۆی ڕەپێش کرد، لێم پرسی، ئێوە وەیا ئەو هێزەی تۆ وەکیلیانی چ سوود دەبینن لەو مەسرەفە قورسەی بە ملەوە دەگرن؟ گوتم پێشنیازەکە بۆ ئێوە does not seem like business واتە «لە مامڵەتی سوودبەخش ناچێت». گوتی، بۆ ئێمە دامەزرانی کورد، ئاسایش و هێمنی پێوەیە سوودی لێ دەبینین. وەڵامەکەی متمانەبەخش بوو، ڕەنگە زووتر خەیاڵی لێ کردبێتەوە. گوتم دەمەوێ بزانم، بە وردی یارمەتییەکە چەندە؟! گوتی بێسنوورە.

من کابرایەکی حوقەباز و دنیادۆست نیم مەبەستم خۆ تەسەل کردن بێت و بەس چونکە ئەگەر ئەمەم مەبەست بوایە هەلی باشم بۆ ڕێککەوتبوو بەر لە شۆڕشی تەمووز و لە دەورانی عەبدولکەریم-یشدا خورجینەم پڕ بکەن. لەم حاڵەتەدا جگە لەوەی کە من هاندەری سوودی شەخسی پاڵی پێوە نەدەنام، چارەنووسی ئەو ڕەشوڕووتەی لە هاتنەوەی شەڕدا ماڵکاول دەبن، ئا ئەویش لغاوێکی قورس بوو دەخرایە زاری هەر تەمایەکی بیژۆکی کە وەکوو وەسوەسەی شەیتان لە گوێی حەز و مجێزی نەفسی خوازۆکی بچرپاندبایە.

پێی ناوێ بێلزووم بەرگی دەروێشایەتی لەبەر ئەوسای خۆم بکەم و بڵێم دڵم لێی نەدا بۆ گەشەگەشەی تێکەڵ بوون بە کاروباری گرنگەوە کە دەوڵەتانی تێدا لایەن بن، چونکە ڕاست نییە، بەڵام بێ دوودڵی و بێ گومان لەخۆ کردن و بێ خۆگنخاندن، ئامادە بووم خەزێنەی قاروون ڕەت بکەمەوە بەرانبەر بەشداری کردن لە نانەوەی هەرایەک سوودی میللەتی تێدا مسۆگەر نەبێ. من چ باوەڕم نەبوو بە عەبدولسەلام کە لە پیاوچاکیی خۆیەوە و لە عیشقی چاوی کاڵی کوردەوە دەستی بۆ ئاشتی درێژ کرد وەیا بە تەمایە دان بنێ بە کورد و مافی کورد بەڵام دڵم نەیدەهێنا من یارمەتیی گەڕانەوەی شەڕ بدەم بێ ئەوەی توانیبێتم کوتەکی لەسەر خۆکردنەوە بخەمە ناو دەستی کوردەوە وەیا چ ئومێدم هەبێت بە پاداشتێک کورد پێی بگات لە بری ئەو کارەساتەی بەسەری دێت.

بەڵێ، دەزانم و دەشم زانی بە خۆگێڕانەوەم لە یاریدەدانی گەڕانەوەی شەڕ دنیا بۆ کورد تەباوڕەبا نابێ و ئەو لایەنەی یەخەی منی گرت واز لە نیازی خۆی ناهێنێ و هەموو کابرایەکیش وەکوو من نییە چارەنووسی میللەتی بێ پەنا و دەرەتان پێش هەموو حیسابێک بیەخێتەوە، بەڵام خۆ دەمتوانی من نەبمە پۆستەچی ئاگربازی و پەندیاری کوشتار و سووتار. هەر بۆیەش بوو بە بەڵێنی بێسنوور کەوا ڕەنگە دەریایەک بێت و ڕەنگیشە کاسەیەک پڕ نەکات دڵم تێراو نەدەبوو. لەو دەمەدا کە مێشک و دڵم لە ئاست ئەو بەڵێنە بێسنوورەی کابرا تێکیان دەهاویشت تەنها یەک ڕێگەی قسانم هاتە بەر هەست کە پێیدا بڕۆم و زەرەری لێ چاوەڕوان نەکرێت، گوتم، چەند کاتت پێویستە بۆ ئەوەی پرس بەو لایەنە بکەیت کە خۆت نوێنەری ئەویت لە بارەی ڕاستینەی یارمەتییەکی بە کوردی دەدەن، من هەتا وەڵامت بۆ دێتەوە لە ئاست ئەو پرسیارەدا بەغدا بەجێ ناهێڵم. کە ئەمەم دەربڕی کابرا بێوەخران، یەکسەر گوتی ignore every thing واتە، چی گوتوومە لە بیر خۆتی ببەرەوە.

ئاوێک بە ئاگردا کرا و کوژایەوە. یەک وشەی دیکەی لە زار دەرنەچوو بە لای شەڕ و ئاشتی و کورد و حکوومەتدا بچێتەوە. لەوەش بەولاوە ببڕای ببڕای جارێکی دیکە کەس لە بەرەی ئەو هێزە زلەوە سەری لێ خوار نەکردمەوە. دوای پشوویەکی کورت دانیشتنمان کۆتایی هات بە دەست گوشینێکی ساردوسڕ.

لەم تەجرەبەمەوە دوو شتی بنەڕەتیم لێ ڕوون بۆوە، یەکیان ئەوەیە لایەنی وەها بەهێز لە باری وەهادا بەڵێنێک نادات بۆ هەڵخەڵەتاندنی کاتەکی، چی بیڵێ بەتەمایە تێیدا ڕاستگۆ بێ، دەنا کابرا دەیتوانی دوای چەند ڕۆژێک لیستەیەکی ساختەم بداتێ کە جێی ڕەزامەندی گومانکارێکی وەکوو من بێت و پێشەکیش یەک دوو لوقمەی چەور بهاوێتە سەرخوانەوە هەر کاتێکیش تێوە گلاینەوە و دەستمان لە پنچکان برا، ئەو دانەش بخاتە نێوان بەرداشی شەڕەوە کە خۆی بە چاکی دەزانێت بۆ سوودی خۆی. دوەمیان ئەوەیە، کە لە بەرنامەی لایەنی بەهێزی ئەوتۆدا نییە خۆی بردەباری بەڵێنێک بکات لە ئاست بێدەسەڵاتی وەکوو کورد کە بە عادەت لە ئاست دەوڵەتێکدا دەیکات، ڕەنگە دەوڵەتی بێدەسەڵاتیش لە تەرازووی ئەودا فەرقی هەبێت لەگەڵ هی مەیلەو بە دەسەڵات.

لەمەوە دەتوانم، بڵێم چ کوردێک لە باری وەک ئەو بارەی منی تێدا بووم هێندەی ڕوەت و گرنگی بە خۆیەوە نەدیتووە توانیبێتی بەرانبەرەکەی ناچار بکات نوختە لەسەر پیت دابنێت. هەر ڕێکەوتنێکی ئەوتۆیی لەگەڵ دەسەڵاتداریی بێگانەدا بووبێت لە شێوەی سەلماندن و مل نانی بێ پەیمان و پرسینەوە بووە. ئەم دیدەنییە بێئەنجام و تام ناخۆشە ناچارم دەکات باز بهاوێژم بە قەڵەمم بۆ ساڵی ١٩٦٥ کە بە باوەڕی من لەو ساڵەدا شتێک ڕووی دا بەرهەمی هەوڵی ئەو هێزە بوو کە بێسوود و ئەنجام بوو لەگەڵ مندا.

لە دەمی ئاشتیدا بووین، جارێکیان لە نزیک دەربەندی بازیان قافڵەی جەیش لێی درا بێ ئەوەی هۆیەکی بەرچاو هەبێت. من چوومە سەفەرێکی لای ڕانیە. لە دانیشتنێکی دوو قۆڵی، مەلا مستەفا گوتی، کە چوویتەوە بەغدا سەرۆک کۆمار عەبدولسەلام دەبینیت لە زاری منەوە پێی بڵێ فلان سەلامی هەیە و دەڵێ ئەوانەی لە قافڵەی جەیشیان دا خائینی میللەتی کوردن… ئەگەر بمزانیبایە سوودی دەبێت هەمووم دەگرتن و دەمناردن بۆی هەتا لە «باب الشرقي» بە سێدارەیانەوە بکات. بەڵام نە ئەوان بەڵکوو خۆیشم بە پەتەوە بکرێم فەرقێک ناکات چونکە لایەنی لەوە گەورەتر ئەمری بەسەرەوەیە کە دەبێ شەڕ لەگەڵ کوردان دەست پێ بکاتەوە ئنجا هەر ئەوە لە بۆ من دەمێنێتەوە کە بگوترێ پێشمەرگەی کوردی بە کوشتن دا. ئەم هەرایەش کە بەرپا دەبێتەوە لە ئاکامدا خۆی، واتە عەبدولسەلام، تێدەچێت.

کە گەڕامەوە بۆ بەغدا دەبوو هەر بچم بۆ قەسری جمهوری چونکە لەو سەفەرەمدا وەزارەت هەڵوەشابۆوە و پێک هاتبۆوە منی تێدا مابوومەوە، دەبوو بچم سوێند بخۆم لای سەرۆک کۆمار کە ئەوسا ناساغ کەوتبوو لە چەند ڕۆژێکیشدا، وەک لە بیرمە، ئاڵووی دەرهێنا، کە چوومە لای لە نوێندا بوو. دوای سوێند پێم گوت ڕاسپاردەی قسەم هەیە دەبێ پێی بگەیەنم، چەندێکی لە توانامدا بوو دڕی و تیژایی قسەکانم لە مەخمەل و ئاوریشمی تەعبیری نەرم و نۆڵدا سەرپۆش کرد بێ ئەوەی هیچ شتێک لە مەبەستەکە بشارمەوە. چەند ترووکە و چرکەیەک، ڕوو لە سەقف، ڕاما ئنجا گوتی، «دمايات العالم برقبة هذا الظالم».

تۆ سەیری! وەڵامی سەرۆک کۆمارێک لە بەرانبەر قسەی وەها ترسناک و ئاکام بەخش ئەو دوو وشە ساردوسڕە بێت کە بەعادەت خەڵق بە دەوری یاری دامە و تاوڵەیەوە دەڵێ. ئەو بەشەی قسەکان کە گەڕانەوەی شەڕی دەگەیاند بە تەواوی هاتە جێ. تێچوونی عەبدولسەلامیش هەر گەیشتە جێ ئەگەر چی دەشێ کاری ڕێککەوت بێت.

نێوانی مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی ڕۆژ لە ڕۆژ دژوارتر دەبوو تا ئەوەی گەیشتە پلەیەک جارەک لە جارانی یەکتر دیتنم لەگەڵ مەلا مستەفا ڕووی لێ نام کە بە پاڵپشتی ئەو قبووڵ بکەم ببمە سکرتێری حیزب. بە کورتی حەق و حسێبەکە دەگێڕمەوە، پێم گوت: نە من دەبمە داود سائغ (کەوا عەبدولکەریم لە جێگەی «حیزبی شیووعی»ی مێژوویی عێراقی چاند) نە داود سائغ بەکەڵکی تۆ دێت... یەکێک لە ئەندامانی حیزب یاریدە بدە بۆ سکرتێرایەتی نەک لە لاوە شەتڵ بهێنی و تێچێنی بکەی. حیزب ئەو حیزبەیە لەسەر ڕەگی خۆی هەڵستابێت... زۆر قسەی دیکەش هەن پێویست بە گوتنەوەیان نییە. وەک بۆم دەرکەوت و لە زۆر کەسیشم دەبیستەوە، گەلێک کەس بە قسە لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بوون و دنەیان دەدا بۆ بەرهەڵستی کردن لە مەلا مستەفا هەتا ڕادەی بەگژدا چوونەوە، بەڵام لە کردەوەدا هەڵوەستیان جۆرێکی دیکە بوو.

لە سەرووبەری ئەم تێکچوونەی نێوان دوو لایەنی بەهێزی بزووتنەوەدا دوو خاڵ هەیە پێویست دەکات بیاننووسم. خاڵی یەکەم ئەوەیە کە من لە وتووێژ دەربارەی چەندوچۆنی کەسان و شتان، لەگەڵ مەلا مستەفا پرسێکم کرد لەوەدا ئایا ئەندامە چالاکەکەی کە بەیەکەوە من و ئەو بەیاننامەی دەی شوباتمان دایێ ئیمزای بکات،

ئایا تا چەند بە دوا خواییشتی سەرۆکایەتیدا دێت؟ گوتی، ئەگەر داوا بکەم هەتا بەغدا بە تەقڵە دەڕوات- ئەمە دەقی قسەکەیەتی- من بەدەنگ نەهاتم...

خاڵی دوەم ئەوەیە کە من لە ساڵی (وابزانم- سەرەتاکانی) ١٩٨٧ بیستم ئەو ئەندامە لەلایەن مەلا مستەفاوە لێی داواکرابوو لە هەڵبژاردنی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی (یان زاراوەیەکی دیکەیە من نایزانم) خۆ پاڵاوتە بکات بۆ سکرتێرایەتی... ئەویش بە برادەرانی ڕاگەیاندبوو کە ئەو تەکلیفەی لێ کراوە و بە چاکی دەزانێ قبووڵ بکرێت و بۆ ماوەیەک هەتا گرێوگاڵ دەڕەوێتەوە سکرتێری حیزب کنارەگیر بێت، دوای بەینێک دەشێ بێتەوە کایە بەڵام لێی نەسەلمێندرابوو.

هەرچەند لەبەر هاتوچۆی بەردەوام بۆ بەغدا هەموو وردودرشتی کەینوبەینی کوردەواریم نەدەزانی بەڵام لەوە ئاگادار بووم کەوا ڕۆژ لە دوارۆژ نێوانی مەکتەبی سیاسی و مەلا مستەفا ناخۆشتر دەبێ، خۆیشم شایەدی ئەوە بووم کە هەندێک لە ئەندامی خوێنگەرم پێکۆڵی شەڕ دەکەن.

ڕۆژێک لە ڕۆژانی ئەو قۆناغە، لە ژوورەکەی سەردەمی قوتابییەتیم، لە ئۆتێلی فلۆریدا بووم، کوردێکی ناوداری بەغدا لە پڕ بە حەماسەتێکەوە هاتە ژوور بێ سەلام و کەلام هێرشێکی هێنا بۆم گۆیا من بە دوا مەنسەبدا دەگەڕێم. وەی کە لە دڵم گران هات. قسەیەکی یەکجار قورسم بە زاردا هات بۆ هەر کەسێکی چاوی بڕیبێتە مەنسەب... یەکسەر بەغدام بەجێهێشت و گەڕامەوە بۆ لای مەلا مستەفا کە ئەوسا لە چوارقورنەی بیتوێن بوو. حیکایەتەکەم گێڕایەوە بۆی و گوتم خۆت و دەزنوێژت تازە ناچمە بەغدا. گوتی چاکە ئەتۆ سەغڵەت بووی دێیتە لای من دەردی دڵت هەڵدەڕێژیت ئەدی من بچمە لای کێ، پێم دەڵێن کوردستانی بە سێو و پرتەقاڵ فرۆشت... گوتم تۆ چارت نییە دەبێ تەحەمول بکەیت بەڵام من ئەو ناچارە نیم، لە ماڵی خۆم دادەنیشم بە محاماتەوە خەریک دەبم... دوای ئەمە نامە نووسران بۆ کوردی بەغدا کە فڵانە کەس لە خۆوە هاتوچۆی بەغدا ناکات و دەبێ یاریدە بدرێت.

کە گەڕامەوە بەغدا، ڕۆژێک کەریم قەرەنی هاتە لام گوتی بەم زووانە سەرەک وەزیران بە دواتدا دەنێرێت بۆ وەزارەت... کەریم قەرەنی دۆستی فەریق تاهیر یەحیا بوو، بێپرس دەچوە لای... من ئەو قسەیەم بەجێ هێشت بۆ بڕیاری ڕۆژانی داهاتوو

چونکە هیچ هەنگاوێکی منی نەدەگۆڕی، دەبوو ئەوەی لێم داوا کرابوو لەلایەن کوردەوە تا پێم بکرێ بە ئەنجامی بگەیەنم، خۆ بە تەلەفۆنیش نەمدەپرسی لە سەرەک وەزیران ئەرێ خەبەرەکە چەندی ڕاستە و چەندی...؟ دوو ڕۆژی پێ چوو تاهیر یەحیا داوای کردم پێشتر وەها دەبوو داوای دەکردم بێ ئەوەی تەکلیفی وەزیفە لە بەیندا بێت. کە چووم گوتی تەعدیلی وەزارەت دەبێت وەهامان پەسەند کردووە بە «وەزیر دەولە» بۆ «شؤون الشمال» لەگەڵماندا بێت، سپاسم کرد لە سەر متمانە پێکردنم بەڵام گوتم هەتا کوردەکان نەبینم ناتوانم وەڵام بدەمەوە... ویستی بسەلمێنم کە بەیانی دانانی وەزارەت دەربچێت ئنجا بڕۆم بۆ سەرەوە، نەمسەلماند. گوتی ئێستا بە تەیارە بڕۆ بۆ کەرکووک لەوێشەوە بە کۆپتەر بۆ ڕانیە بەڵکوو بە زوویی بتوانیت وەڵام بدەیتەوە. گوتم پار ئەم ڕۆژانە بوو بە دەستی کەلەپچەدارەوە لە تەیارەی حکوومەتدا بووم بەرەو بەغدا دەهێنرامەوە، چ مجێزم لە تەیارەی حکوومەت نییە... خولاسە ئەو سەلماندی و بەیانی دامەزرانی وەزیران هەڵگیرا هەتا دێمەوە لە سەفەری خێرێ. کە گەڕامەوە ئۆتێل مەرحوم کەمالی حاجی مەجید گوتی ڕەنگت گۆڕاوە خۆ نەساغ نیت؟ گوتم تەکلیفێک کراوم هەتا بلێی سەغڵەتم... ئیتر وەزعەکەم تێگەیاند. بەرەو کویێ ڕۆیشتم.

لە کۆیەوە چوومە ڕانیە، نیوەڕۆژەم بە ڕادان دا لای خاڵە خدرم تا ئەگەر دیدەنی پێوەستم جێبەجێ کرد بگەڕێمەوە لای ئەو. چوومە سەرکەپکان لای مەلا مستەفا و حیکایەتی ڕوو لێ نانەکەی فەریق تاهیرم بۆ باس کرد، زۆری پێ خۆش بوو... نیوەڕۆژەم هێنایەوە لای خاڵم. بیستم ئەندامە زلەکانی مەکتەبی سیاسی لە خدران مێوانی کاکە زیادن. پێش عەسر چوومە خدران ئەحمەدی حەمەدەمیناغاش لەوێ بوو گوتیان سبەینێ وەڵامت دەدەینەوە، شەو هاتمەوە کۆیێ. سبەینێ نیوەڕۆ کاڵ بووبوو عەلی عەبدوڵا هات گوتی، ئێمە بەرهەڵستیمان نییە، بڕیار بۆ خۆت بەجێ دەهێڵین بەڵام بەرپرسی هیچ شتێکیش نابین کە لەم هەنگاوە سەر هەڵبدات.

ئەو شەوەش لە کۆیە مامەوە. سبەینێ بە کاوەخۆ سەفەرم کرد، لای مەغریب گەیشتمە بەغدا. بڕیاری موافەقەی سەرەوە و هی خۆیشم پێ گوت، ئیتر بە شەو لە ڕادیۆ تەشکیلی وەزارەتی نوێ بڵاوکرایەوە. باسیان کردن، لەو سێ ڕۆژەدا هەندێک کە ناویان لە لیستەی وەزارەتدا بووبوو بە هی دیکە گۆڕان...

خوێنەری حەقیەتی بپرسێت بۆچی سەلماندم ببمە وەزیر مادەم هێندەی پێ سەغڵەت بووم؟ ئەوەی دەستی منی دەبەستەوە مەنتیقی خۆم بوو! من کە بە گەرمی بۆ ئاشتی خەریک ببم دەبێ بە تەماش بم کوردێکی سەربە چەکداران ببێت بە وەزیر. ئەنجا کە خۆم پێ ڕازی نەبم دەبێ داوا لە هەموو کەس بکەم ڕازی نەبێت، بەو پێیە دەبێ بە دەستی خۆم دیوارێک بڕمێنم کە خۆم شاگردیم لە هەڵنانی کردووە. سەغڵەتیشم لەوەوە بوو کە دەمزانی گوزەران و حەوانەوە لەگەڵ جۆری بیر کردنەوەی حکوومەت و دەسەڵاتداریی سپا بۆ یەکێکی وەکوو من ئاسان نییە جگە لەوە کە لایەنی بەهێز هەیە بڕکەدار دەخاتە چەرخی عەرەبانەی ئاشتییەوە. بەشی هەرەزۆری کەسانێکی لە بزووتنەوەدا قسەڕۆیشتوو بوون حەزیان نەدەکرد لە لاوە وەزیر بە ناوی ئەوانەوە قوت بێتەوە، کوردی بەغداش تێیاندا هەبوو، زۆر نەک کەم، حەزیان بە غەیری من دەکرد... وەکوو کتێبگرەوەش دوارۆژێکی نزیکم دەخوێندەوە، کە لە وەزارەت دەردەچم، ئابووریم وەها شل بۆتەوە گوزەرانم زەحمەت بێت.

ئەم تەکلیفە لە حیسابی خۆمدا دوەم میحنەتی سیاسی بوو لە ژیانمدا، میحنەتی یەکەم بە دوای هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردنەکەی ١٩٥٤ کە تێیدا بووم بە ئەندامی نایبەکانی بەرەی نیشتیمانیی یەکگرتوو. ئەوە بوو کە حیزب تەکلیفی لێ کردم خۆم پاڵاوتە بکەم و کردم، دەتگوت بۆ مەرگ ڕام دەکێشن.

خەڵکێی بێئەژمار ڕوویان لێ نام بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکاریان منیش هەم لەبەر دڵی خەڵقەکە و هەم لەبەر ئەوەی دەمزانی غەیری ئەو جۆرە کارانە چ کارێکی گرنگی گشتی بە دیارەوە نییە کە هەموو کورد پێی سوودمەند بێت چەندی توانیم یاریدەی خەڵقم دا. ڕۆژ هەبوو بەدرێژایی بوونم لە ژوورەکەی تایبەت بە خۆم لەو بینایەی پێی دەگوترا «مجلس وطني» بە نامەی سفارش و بە تەلەفۆن، بێوچان خەریکی تکا و خواییشت و تەنفیزی بەندی گێڕانەوەی موەزەفی فەسڵکراو لە بەندەکانی بەیانی دەی شوبات بووم، تا ئەوەی دەستم شل دەبوو بەتەلەفۆنەوە چ جایی زار و زمانم. بێ پرس و دەرگە لێدان ئەو خەڵکە دەهاتە ژوورەکەم، تێیاندا هەبوو کەیفی بە دارودیواری «مجلس وطني» دەهات وەیا حەزی دەکرد بەگەڵ قەڵەباڵغی بکەوێ بۆ بیستن و دیتن و کات بەسەر بردن...

ڕۆژێکیان دارتاشێک دوو جاران هاتە ژوورەکەم، جاری سێیەم سەفیری هیندم لا بوو دارتاش دەرگای کردەوە، بێ پرس، خەریک بوو بۆم ببێ بە دیپلۆماسی لە مەجلیسی سەفیر، دوو دەستم لەسەر ڕانم بوو، ڕجاکارانە نەختێکم بەرەوژوور هەڵبڕین و چاوێکی بە خواییشتیشم بۆ لار کردەوە خوا خێری بنووسێ کشایەوە.

ئوتێلەکەم سبەینان و عەسران بەر لەوەی بەخەبەر بێم دەبوو بە دیوەخانە. هەمان ژووری کە تێیدا قوتابی بووم و دواتر بە محامیەتی و نایبەتی بە سەرم دەبرد کە بووشم بە مامە وەزیر نەمگۆڕی. «مستەر لێکلاند»ێکی ئەمەریکایی لە داوەتی سەفارەتێکم دیتمی گوتی، لێرە بەولاوە، بێگومان، لە ئۆتێل بەغدا سەرت لێ دەدەم. گوتم ژوورەکەی جارانم مێوانداریت دەکات.

سبەینەیەک لەو سبەینانەی خوا بۆ منی بە قەڵەباڵغی سازاندبوو ژووری ئۆتێلم پڕ بوو لە خەڵق. بە پێچامەوە لەسەر چارپایەکەم بۆیان دانیشتبووم قسەی شەش و بێشمان دەکرد و یەکێکی پژدەری دیتی چێشتەنگاو ڕابوورد گوتی، ئەدی کەنگی دەچییە وەزارەت؟ گوتم کەنگی ڕێم بوو جلک بگۆڕم، ئنجا بەجێیان هێشتم... بەڕاستی لە خۆڕایی و لەبەر شەرمهاتنەوە عەزاب و سەغڵەتییەکی زۆرم دەچێشت لە دەست مێوانی بێلزووم و بێکۆتایی.

لە نموونەی ئەرکی ئێسکقورس ئەمە دەگێڕمەوە، لەبەر شتێکی کەمبایەخ دڵم لە وەزیری تەربیە ئێشا، سوێندم خوارد مەرحەبای لێ نەکەم. هەستی کرد و دەشیەویست دڵم ئاشت بکاتەوە بەڵام من خۆم لێ بێئاگا دەکرد. دوو ناسیاو، یەکێکی سلێمانی و یەکێکی کۆیی (وابزانم موفەتیشی تەربیە یان مودەڕڕیسی سانەوی بوون) هاتنە لام، تەگەرەیەک کەوتبووە ئیشیانەوە بە وەزیر چار دەکرا. گوتم من لەگەڵ ئەم وەزیرە بەینم نەماوە. برادەرەکەی سلێمانی گوتی ئەی ئەم ئیشەی ئێمە چۆن چار دەکرێ؟ گوتم بۆ من قسەکردن لەگەڵ ئەو وەزیرە دەبێتە پێ لە کەرامەت نان، برادەرەکەم گوتی: یەکێک مەسئوولیەتی بە ئەستۆوە گرت دەبێ پێ لە کەرامەت بنێت. قسەکەی زۆر نابەجێ بوو، ئازاریشی دام بەڵام ئەوەندەم سەغڵەتی بە دەورەوە بوو قورسایی ئەو قسەیەشم کردە سەربار و گوتم، ڕاست دەفەرموویت، تەلەفۆنم هەڵگرت لەگەڵ وەزیری تەربیە دووام، وابزانم بێوەخران ئیشەکەی چارەکرد. ناسیاوەکەم خوا لێی خۆش بێت لە ئاست

بەرژەوەندی خۆیدا تەکلیفی وەها ناقۆڵای لێ کردم، یەکێکی دیکە قسەکەی ئەوی پێ گوتبامایە شەڕی لەگەڵ دەکرد.

بەڵێن لە حکوومەتەوە ئەوە بوو ئەنجومەنێکی کارگێڕی لە دە کورد پێک بێت بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری ئاوەدان کردنەوە و پرۆژەی جۆراوجۆر لە کوردستان بەڵام هەم لەبەر دەردە ئەزەلییەکەی بەڵێنی بێئاکامی عادەت پێوە گرتوومان، هەم لەبەر نەپشکووتنی غونچە چاوەڕوانکراوەکانی دوای بەیانی دەی شوبات کە دەبوو دۆستایەتی و لێک ئەمین بوون هەموو وڵات بتەنێتەوە هەم لەبەر وردە و درشتەی حیساباتی بنپەردە ئەو ئەنجومەنە پێک نەهات. ڕاستییەکەی ئەگەر دەستم نەبەسترابایە بەو پێوەندییەی لەگەڵ کوردەواریم هەبوو خامۆش نەدەبووم، ئەگەر ئیستیقالەشم نەدابایە هاموشۆی وەزارەتم دەبڕی.

دوژمنایەتیی ناخۆیی گەیشتە ڕادەیەک مەکتەبی سیاسی و لایەنەکەی دیکە چەکیان لێکتر هەڵگرت و بوو بە هەرا... ئاکامی ئەوە بوو کە کۆمەڵەی مەکتەبی سیاسی بە کۆمەڵێک لە ئەندامانی حیزبەوە عێراقیان جێ هێشت. ئەو ئەندامە چالاکەی کە دەبوو بەپێی قسەی مەلا مستەفا بە تەقڵە بۆ بەغدا بڕوات، ئەویش لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بۆی دەرچوو. لە موناسەبەدا بە مەلا مستەفام گوت، لەبیرتە چیت گوت و چۆن دەرچوو؟ من دەمزانی ئەو ئەندامە کوڕی مەکتەبی سیاسییە و لە دەمی خۆساغ کردنەوەدا هەر بە لای ئەوێدا دەشکێتەوە بەڵام بە چاکم نەزانی هیچی بڵێم. گوتی، فێڵی لێ کردم و هەڵیخەڵەتاندم... بەڵام نە فێڵ بوو نە هیچ، تەنانەت کە حاڵ گەیشتە چەک لیکدی هەڵگرتن ئەو ئەندامە چونکە خۆی لای ڕێککەوتنەکەی دەی شوبات بوو بە حاڵەتێکی نەفسی وەها سەختدا تێپەری گەیاندیە سنووری شێوان. من لەو ڕۆژانەدا نەمدەدیت بەڵام بزووتن و گەڕانی بێلزووم و تێکەڵپێکەڵی بیرە و بەوێدا هەر ئەو ڕاگەیاندنەی پێوە بوو. کە پێ لە جەرگی خۆی دەنێت بەو پێشێل کردنەی بەیانی شوبات بۆ خۆ دانە پاڵ هێلانە و کۆنەئاشی مەکتەبی سیاسی. ئەمە دەڵێم قەتیش لەم بارەوە لەگەڵی نەدواوم، بەڵام چی گوتم بەڕاستی دەزانم خۆ مرۆڤ داروبەرد نییە پەرۆشی کردەوە و قسەی دوێنێ و پێرێ نەبێ.

من لە ڕۆژی ١٧ی حوزێرانەوە بە وەزیر حیساب بووم، لە نێوەندی تەمووز سەفەرێکی کۆیەم کرد... شەوی یەکەمم بوو، کە سبەینێ هەڵستام دیتمماڵەکەم

پڕە لە کچی قوتابخانەکان، لەوانەی گرفتێکیان هاتبووە بەر لەو ڕۆژانەدا کە هەرا بەردەوام بوو هاتبوون داوام لێ بکەن بۆیان چارەسەر بکەم. هەرچەند نازانم وەیا لە بیرم نەماوە خواییشتیان چی بوو بە تەواوی بەڵام ئەوسا دەرحاڵ قسەم لەگەڵ تاهیر یەحیا کرد گوتم، کچان، ئابلۆقەیان داوم فریام نەویت ئیشم خراپە. بێ سێودوو بڕیاری پێویستی بۆ دەرچوواندن.

سەرێکی ڕانیەم دا بە پەلە خەبەرم درایێ کە خێرا خێرا بگەمە بەغدا. تومەز بڕیار درابوو وەفدێکی پیرۆزبایی لە سەرەک وەزیران و چەند وەزیرێک بچن بۆ قاهیرە بەشداری بکەن لە ئاهەنگی بیرەوەریی ساڵانەی ٢٣ی تەمووز. کە گەیشتمە بەغدا و تێگەیشتم، دیتم پەساپۆرتم نییە و سبەینێش سەفەر لە پێشە. لای تاهیر یەحیا بووم.. پەساپۆرتیان بۆم ساز دا و هەر ئەو ڕۆژە پێیان دامەوە. بەر لە بەڕێ کەوتنمان بۆ فڕۆکەخانە لە حزووری عەبدولسەلام، سەرۆکی کۆمار، گوتم دەستم بۆ چ ڕێگە ڕانەگەیشتووە و چ پارەش شک نابەم. عەبدولسەلام گوتی من بۆت دەنێرم... لە قەسرەوە دووسەد دیناری بۆ ناردم کە هەر ئەوەندەشم داواکردبوو، لە ڕێی فڕۆکەخانە پێم گەیشت. دوای گەڕانەوەمان لە قاهیرەوە، بۆم ناردەوە ماڵی ئاوابێ وەریگرتەوە.

لە ئاڵقەیەکی سەرەتاکانی ئەم گەشەدا گوتبووم کەوا لە ساڵی ١٩٣٥ کاتێک بە سەفەر چوومە بەغدا و دەمی سبەینە لەبەر سووڕانەوەی شەمەندەفەر بۆ ئێستگەی «باب الشرقي» ڕۆژ کە لە دەستە ڕاستمەوە هەڵات، هەموو خوار و ژوور و چەپ و ڕاستم لێ شێوا چونکە دەبوو بەپێی جوغرافیە لە چەپمەوە هەڵێ، ئەم جارەش کە چووینە قاهیرە دیسانەوە تەیارەی هەرام سووڕێکی خوارد کە من هەستم پێی نەکرد، لە جیاتی لە لای ڕۆژهەڵاتەوە بۆ فڕۆکەخانە دابەزین لە ڕۆژاواوە بۆی شۆڕبووینەوە. دەریای سپیی ناوەڕاست بۆ خۆی چووە شوێنی ئەفەریقای باشوور، سوودانیش - لە مێشکدا - خولی داوە بە لای ئەورووپا... چیای «مقطم» کەوتە ڕۆژاوامان و هەرەمەکانیش چوونە لای ڕۆژهەڵات. ماڵی سەرنج گرتن بشێوێ!.

ئەو خەڵقە کەسیان خۆی دانەنابوو بە «شرطي مرور»ی ڕۆژ و ئاسمان. تەنانەت کە لە جنووبی «عقبة»وە بەسەر دامەنی یەک لەو دوو گوێیەی دەریای سووردا تێپەڕین بەرزاییشمان حەڤدە هەزار پێ بوو سەرنجم دایە لای باکوور. دەریای سپیی ناوەڕاست لە دووری هەرە دوورەوە وەکوو خەتێکی ڕاست لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا

بەسەر هەورانەوە تێکشیبوو ئەگەر نەمزانیبا دەریا لەوێ هەیە بۆم لێک نەدەدرایەوە ئەو خەتە چییە چونکە زۆرمان لێ دوور بوو بەسەریدا ڕانەدەشکاین هەتا هیچ پاناییەکی لێ بەدی بکەین جگە لەو خەتە ڕاستە. هەورەکان نزیک بوون لێمانەوە ئێمەش لەوانە بڵندتر بووین بۆیە خەتی دەریا بەسەر ئەوانەوە ڕاکشابوو. ئەهلی ناو فڕۆکە لەو خەیاڵاتە بێئەنجامە ڕەها بوون. تەیارەکەمان پەروانەدار بوو لە چەشنی «ڤاکاونت»ی چوار پەروانەیی، خێرایی فڕینی نێوان ۴۰۰-۵۰۰ کیلۆمتری سەعاتی بوو، بەرزاییشی لە چاو «نفاثة» کەم بوو بۆیە لە ١٧ هەزار پێ بەرە ژوورتر نەچووین.

عەسر بوو، سەرۆک جەمال هاتە بەخێرهێنانی فەریق تاهیر و وەفدەکە. ڕێکەوت وەهابوو کە سرەی وێنەگرتن بەسترا لەگەڵ سەرۆک، بەتاڵایی نەبوو لەو ماوەیەی کامێرا دەیبینێت منی تێدا ڕاوەستم، پاڵەپەستۆی جێگە داگرتنیشم نەکرد، دواتریش نەمویست بە تەنها وێنە لەگەڵ سەرۆک جەمالدا بگرم، ئنجا ئەگەر یەکێک وێنەی ئەو ڕۆژە ببینێت منی تێدا نادۆزێتەوە بەوەشدا تووشی هەڵە دێت کە ناسەلمێنێ مەسعوود محەمەد لەو وەفدەدا بووە...

شوێنی لێ دابەزینمان «قصر الطاهرة»بوو، ئەم قەسرە بەشە بنەڕەتیەکەی بە میرات مابۆوە بۆ مەلیک فارووق، ڤێللایەکی بە تەنیشتەوە بۆ خرابووە سەری، من و چەند کەسێک لەو ڤێللایە دەنوستین. بەڕێکەوت ژووری نوستنی فارووق بەر من کەوت. چ لەو بەشە و چ لە بەشەکەی دیکە بێت هەرچی کەرەستە هەبوو بە دەقی خۆی و شەقڵی خۆی لە زەمانی فارووقەوە مابۆوە، لە ئاغڵەب کەلوپەلی «ملک مصر فاروق الأول» وەکوو «طرة» نەقش کرابوو. خزمەتچییەکان هی زەمانی ئەو بوون. پێشخزمەتێکیان لەو ڤێللایە کە بە زمانی قاهیرەم دوواند پتر لە عادەتی خۆی بۆم کرایەوە، حیکایەتی سەردەمی فاورقی بۆ دەگێڕامەوە. گوتی ژوورەکەی تۆی تێدایت تەنها یەک شتی گۆڕاوە ئەویش ئاوێنەیەکی گەورە بە پانایی چارپایە چوار نەفەرییەکی بەرانبەرییەوە بوو گۆڕا بەو کانتۆرە. گوتی: «الاوضة دي كان ينام فيها فاروق». بە دەست خۆم نەبوو، وەکوو قافیە کە قازیی «قم»ی پێ عەزل بوو منیش ئەوەندە شارەزاییەم لە لەهجەی قاهیرەوە بەکارهێنا و پرسیم، «لوحده والا مع ستات؟»، گوتی «بقى زي ما هو عاوز!».

هەرچەند حەز لەم قسەیە ناکەم کە خەریکە بیکەم بەڵام لەبەر پەندێکی فەرامۆشکراوی کە تێیدا هەیە دەڵێم، چارپایەکەی کە گوتم چوار نەفەری بوو، تۆ بڵێی شەش نەفەری بوو، حیکمەت لەو ئاوێنەیەی بەقەدەر چارپایە پان ئەوە بوو کە «صاحب الجلالة» ویستوویەتی لە دەمی عیشقبازیدا سەریری ئەو فیلمە بکات لە ئاوێنەدا کە خۆی قارەمانیەتی! ناشبێ ئاوێنە تەسکتر بێ لە چارپایە نەکا خوانەخواستە دیمەنی هیچ هەڵسوکەوتێکی لەیل و مەجنوون فیلمبەدەر بێت. خەڵقی دوای سەردەمی خۆیشی هەر لەبەر بە بیردا هاتنی ئەو حیکایەتانە هاتوون ئاوێنەیان گۆڕیوە بە کانتۆر. من کەموزۆر لەم لایەنەوە پرسم لەو پێشخزمەتە نەکرد ئەویش هیچی نەگوت بەڵام لزووم نەبوو بە پرسین، ئاخوڕ بۆ ئالیکە...!

لە ئسووڵیاندا هەبوو شەو کە مێوان دەچوە ژوورەکەی یەک تەبەق لە مێوە و شەکەراتیان دانابوو. من بە مەبەست تابڵێی بە دەگمەن دەستم دەگەیاندێ. ژوورەکە حەمامێکی لە ناوەوە هەبوو، حەوزی مەلەی تێدا بوو بە ئاوی سارد و گەرم لەیەک دەقیقەدا پڕ دەبوو... لای سەرووی ژووری حەمام بە پانایی ژوورەکە سەکۆیەکی پان بەقەدەر درێژایی باڵای پیاو کرابوو، دۆشەکەکەی و دیواری سێ لایەکەی بە پەشتەماڵ داپۆشرابوو کە ئەگەر مرۆ ویستی، بتوانێ بە گەوزێک لەم سەر بۆ ئەو سەری سەکۆکە خۆی وشک بکاتەوە. دەرگایەکی بەسەر کۆریدۆری ناو ژوورەکان دەکرایەوە، پەیکەری ئافرەتێکی ڕۆمانی لە دیوی دەرەوەی ژوورەکە بە لای دەستی ڕاستدا دوو دەستی هەڵنابوو تاکوو پەشتەماڵ وەیا ڕۆبی حەمامت لێ وەربگرێ... لە بیرم چوو بڵێم، ئەو کانتۆرەی جێی ئاوێنەکەی گرتبۆوە دیکۆرێکی وەهای پێوە بوو دەتگوت بە ئەسڵ لەگەڵ نەقشی ژوورەکە سازدراوە. قەسری «طاهرة» بە جەستە مامناوەنجی بوو لە چاو «قصر القبة» و «زعفران» و «رأس التين» و هی دیکەش بەڵام زۆر شیک و جوان بوو. ئینجێکی تێدا نەبوو بێ شوێن پەنجەی هونەر. ژوورێک لە ژوورەکانی تێدا دانیشتنی بریتی بوو لە سەقافەتی فارسی بە قاڵی و تەخت و ڕسم و ڕوباعییات و هەموو شتێکییەوە. تەنها یەک مێزی زۆر قەشەنگی نەبێ کە ڕووەکەی ناپولیۆن و دوازدە جەنەڕاڵی جەیشەکەی لێ چەسپ بوو یاخود لێی کوترابوو وەک «وشم». ژووری دیکەی لە سەقافەتێکی دیکە... تابلۆی هونەری زێدە بە نرخ لە هەموو ژوورەکانی هەبوون، لە دیواری ئەم بەر و ئەو بەری نەردوانە دوو ڕێگاییەکەی کە لە قاتی یەکەم و دووەم تێکیان

دەکردەوە وێنەی کێشرابوون بە پانایی و بەرزایی دیواری نهۆمەکان ئەمما چ وێنە!! جیهازی کۆندیشنیان لە هەندێ ساڵۆن و ژووری دانابوو بەڵام هێندە بە وەستایی کە بووبوونە بەشێک لە دیکۆری شوێنەکەیان.

ئێوارەی ڕۆژی ٢٣ی یۆلیە حەشامەتێکی لە ژمارە بەدەر لە «مەیدانی تەحریر» کۆبووبوونەوە. ڕەئیس جەمال سەرۆک وەیا سەرەک وەزیرانی سیوچوار دەوڵەتی ئەفەریقایی و عەرەبی بانگهێشتن کردبوو. برا ڕەشەکان بە قەڵەباڵغی هاتبوون، قیچکەتەنگیش بوون...

ڕیزی ئێمە لەو ئاهەنگەی مەیدانی تەحریردا کەوتبووە تەنیشت دوای ڕیزی هەرە پێشەوە کە هی سەرۆک دەوڵەت و سەرەک وەزیران بوو. بەڕێکەوت کورسی من کەوتبووە دوای ئەو کورسییەوە کە بۆ مستەفا ئیسماعیل-ی قورئانخوێن تەرخانە و میکرۆفۆنی بە تەنیشتەوە بوو. برایەکی ڕەش لەو مێوانانە هات لەسەر ئەو کورسییە دانیشت کە بەتاڵ بوو. جارێ قورئانخوێن نەهاتبوو. چەندێکی بەرپرسی تەشریفات بەو پەڕی ئەدەبەوە بەو کابرایەی گوت کەوا هەر کەسە کورسیی خۆی بە ناوی خۆی بۆ داندراوە گوێی پێ نەبزووت و ڕەگی لە کورسییەکە داکوتا. من لە دوایەوە پێم گوت کە منیش وەک ئەو مێوانم بەڵام بە پێویستم زانی پێی بڵێم کە ئەگەر لەسەر کورسییەکە بمێنمەوە دەبێ لە سەرەتای ئاهەنگدا قورئان بخوێنێ. چاوێکی بڕیە میکرۆفۆنەکە و یەکسەر بۆی هەڵستا و لەگەڵ تەشریفاتیدا ڕۆییشت، دواتر لە شەوێکی مێوانداریی سەرۆک جەمال لە ئەسکەندەرییە کە لێمانی کرد گوتی، من زۆر بەو برا ئەفەریقاییانەوە خەریک دەبم و دەچمە لایان و بانگهێشتنیان دەکەم دەمەوێ تێیان بگەیەنم کە عەرەب و ئیسلام هەر ئەوە نین کە بە درێژایی مێژوو قوولەڕەشیان ڕاوکردووە و فرۆشتوویانن وەیا سوخرەیان پێ کردوون. لە مەوە زانیم کە کابرای قورئان گرتوو و هی دیکەش، کە باسیانم دەبیست وەها نەسەلمێن خۆ دەنوێنن، هەموو نیگایەکی چاوانیش بە توانج دادەنێن.

ئەو شەوە گەلێک لە سەرۆکەکانی وەک بن بیللا و جۆمۆکینیاتا و هیلاسیلاسی خوتبەیان خوێندەوە، فەریق تاهیریش بە ئینشای خۆی شتێکی ڕێکوپێکی نووسیبوو خوێندییەوە. بەپێی گیانی نوکتەبازیی میسرییەکان کە نەختێکی لێ شارەزام و ناوناوە بەکاریشی دەهێنم لەو شەوەدا کە جۆمۆکینیاتا دەستی کرد بە وتوویژ لە سەرەتاوە گوتی، من هێندە ساڵە لە بەندیخانەی ئیستیعمار بەسەرم برد... بوو بە چەپڵە کوتان

من بەو دوو میسرییەی دەستی چەپ و ڕاستم گوتن، خۆشی لە خۆی وا ئێستا سەرۆکە دەنا لەوانە بوو بکەویتە دەست هەندێک لە ئینسانخۆرەکان، دەبوو بە مەرەگە...

دوای هەمووان سەرۆک جەمال دەوری سەعاتێک قسەی کرد بەڵام جەماهیری میسری دەهێنایە هەژان... لە کۆتاییدا گوتی، هاووڵاتییەکانم بمبەخشن چی دیکە ڕێم نییە مێوانەکانم بە دیار قسەی خۆمەوە ڕابگرم با قەرز بێ... بوو بە پێکەنینێکی گشتی لە جەماهیرەوە و چەپڵەڕێزانێکی لەحەدبەدەری بەدوادا هات. سەرۆک جەمالیش هەر بە نوکتەی مەبەست بوو. شەوی دواتر ئاهەنگێکی «عشا» و گۆرانی لە یانەی هێزی چەکداران سازدرا مێوان و نامێوان مێرگە پان و بەرینەکەی یانەی پڕ کردبۆوە. لە سەرەتاوە کەلسووم نەشیدی «علی باب مصر»ی گوت. کە هەڵستاین بۆ نان خواردن ڕەئیس جەمال مێوانەکانی پێش خۆی یەخست، بەڕاستی دەتگوت شوانە لە دوا مێگەلە دەڕوات. کەلسووم و عەبدولوەهاب بانگهێشتن کران. کەلسووم لە دەستی ڕاستی سەرۆک جەمال و عەبدولوەهاب لە دەستی چەپی هێلاسیلاسی دانیشتن.

پاش نانوپات مێوانە ئەفەریقاییەکان ڕۆیشتن، کەلسووم ئەمجارەیان گۆرانیی «انت عمري» گوت کە بەر لە حەفت مانگێک من لە قەلادزە بووم یەکەم جار لە سەری ساڵدا لێیم بیست. «عبدالحليم» نۆرەی هات، لە پێشەوە بە شان و باڵی ڕەئیسدا هەڵگوت ئنجا گوتی، نازانم لە حەفلەیەکی «ست الكل» تێیدا بخوێنێ ئایا خوێندنی خۆم دەبێتە «مطب والا تشريف؟». خەڵقەکەی ئەو شەوە کە زۆربەیان میسری بوون تێکڕا گوتیان، «مطب، مطب» واتە، تەپکەیە تەپکە. «فريد الاطرش»یش نەشیدێکی «انتباه»ی گوت بە کۆرسێکی ٥-٦ کەسییەوە تێیاندا «سعاد محمد، نجاة الصغيرة، فايدة كامل» و هی دیکەش هەبوون... لە تەنیشتمی ڕاستەوە وەزیری تەعلیمی عالی «عبدالعزيز السيد» دانیشتبوو، مرۆیەکی بە ساڵداچووی باخەبەری ئەدیبی قسەزان و عالم بوو. وتوویژی خۆشمان لەبەیندا بوو پێویست نابینم لێرەدا دوو پاتی بکەمەوە وابزانم لە موناسەبەدا لە بەرگێکی کتێبی حاجی قادری کۆیی باسی هەندێکی ئەو وتوویژەم نووسیوە...

لە هەندێ گەشت و گەڕانی ناو قاهیرە کە لەلایەن حکوومەتی میسرەوە ڕێک خرابوو خۆم دەدزیەوە چونکە حەزم لێی نەدەکرد. چووین بۆ دیتنی فابریقەی خوردە

سیلاح، هەناسەم پێ سوار دەبوو. خەڵق بە زەڕڕی ڕازی نییە خەریکی نەوەوییە، خوردە سیلاح چییە من لە عێراقەوە بۆی بێم!

بۆ خۆم ناوناوە دەچوومە شوێنی ئەتۆ پێشتر ناویانم بیستبوو وەک «الجامع الأزهر» کە جگە لە حەرەمی مزگەوتەکە سەرم لە «رواق الأكراد»یش دا. چوومە «خان الخليلي» و کافیتریای گروپی و سەر «مقطم» کەوتم…

بە زۆری فوئادی مەلا مەعسووم، کە لەوێ دکتۆرای لە ئەزهەر تەواو دەکرد، لەگەڵمدا دەبوو. کە بۆ «مقطم» چووین ئەویش و حاجی ڕەسوولیش کە ئەوسا قایمقام بوو، هاوڕێم بوون. لە سەرکەوتندا بووین دیتم لێخوڕی تاکسی گوێی قوڵاغ بووە لە بیستنی زمانێک کە پێشتر نەیبیستووە. بە لەهجەی خۆیان پێم گوت، «دي لغة الجان والعفاريت بتاعة إفتح ياسمسم و اقفل ياسمسم». ئێوارەیەکی دیکەش بۆی چوومەوە، کازینۆیەکی زۆر خۆشی لێ بوو بەسەر قاهیرەیدا دەنۆڕی، ئەوەندەش سارد بوو حەزم دەکرد قاپووتم لەبەر بایە.

فێنکایی میسر قەرزداری بای شەماڵی دەریای سپییە. دواتر کە چووینە «اسكندرية» دیتم ئەوەی ناوی «نسيم البحر»ی پێوەیە لە ڕاستیدا ڕەشەبایە چونکە لەوانەیە ئەگەر پەنجەرە و دەرگەی بەرانبەر یەکتر بە ڕووی بەحردا بکرێنەوە ئەو نەسیمە کورسی وەربگێڕێت. شەپۆلی دەریای دەگەیاندە جادە. ئێواران کە ئۆتۆمۆبێل لە شەقامی کورنیش ڕۆیشتبایە تەڕایی هەوا و ئەو بایە وەهای دەکرد جامی پێشەوەی فرچەی بۆ بەکاربێت وەک لە دەمی باراندا دەکرێ.

لە قاهیرە جارێکیان بە ڕەسمی و جارێکیان بە شەخسی سەردانی «اهرام» و «برج القاهرە»م کرد. چاک بوو گەڕانم بە یەکێک لەو سەیارانە بوو لێی نووسرابوو «رئاسة الجمهورية» ئیتر دەرگای داخراوی دەکردەوە. لە «برج القاهرە» لە جیاتی پارەم لێ بستێنن خزمەتیشیان کردم بە خۆڕایی. حەفلەیەکی سەفارەتی عێراقی بە شەو بوو، گەلێک کەسی ناسراوم لەوێدا دیت، بەڵام ئەوە خۆش بوو کە مەرحووم د. عەبدولڕەحمان نوورجان-یش بانگ کرابوو، بەناوی کۆنە مامۆستایی زۆرم حورمەت گرت، حەقی خۆیشی بوو. چونکە جاران لەو شەوە و شەوی دیکەشدا «جلال کشک» ـەکەی ڕانیەم دیتەوە. شەوێکیان بە سەیارەی حکوومەتی گەلێک جێگەی قاهیرەی نیشان دام، بە پێش ڤێللای کەلسووم-دا تێپەڕین…

ڕەئیس جەمال هەوەڵ ڕۆژی هاتنمان لەگەڵ سەرەک وەزیران و لەگەڵ وەزیری داخلیە «حاکم عسکری عام»، ڕشید موسڵح کۆبوونەوەی تەنهای لەگەڵ کردن. دوای یەک دوو ڕۆژ، سەفیرمان شوکری ساڵح زەکی کە پێشتر ناسیاوم بوو، پێی گوتم ڕەئیس سەلامی هەیە دەڵێ حەزم دەکرد بەتەنها دیتبامایە بەڵام حکوومەتی عەبدولسەلام لە مەسەلەی کورد زۆر هەستیارە ئنجا ئەگەر حەز دەکا «واتە من حەز دەکەم» دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا بە ناوی «استجمام» سەرێکی ئەورووپا بدات و لە گەڕانەوەدا بە قاهیرەدا بێت یەکتر ببینین...

من بە لێکدانەوە بڕیارم دا وەها نەکەم، بە کورتی، نە سیاسەتی کورد و نە هی میسر بە من ناگۆڕدرێن، عێراقیش کە پێوەندی بە کورد و میسریشەوە هەر لەوانە نییە بە دیدەنی ئەوتۆیی چاری بکرێت، کەواتە دیدەنییەکەم دەبێتە شتێکی شەخسی، منیش لە مێژەوە بوو ڕوحپەرەیی و شاگەشکەییم بۆ دیدەنی پیاوی گەورە نەمابوو ئیتر ئەم سەفەرە درۆزنە و چاوشێرکێ لە کورد و عێراق بۆچی بکەم؟

سەرۆک جەمال هەموو میوانەکانی بانگهێشتن کرد بۆ «عشا» یەک لە ئیسکەندەرییە. یەکێک لە قەسرەکانی خدێوی ئیسماعیل کەوا هەتا بڵێی لە چاو خانووی ئەم وڵاتانەی من دیتوومن بە شکۆ بوو، جێگەی داوەتەکە بوو. ساڵۆنی نان خواردنی دوو هەزار کەسی گرتبوو هەمووش دانیشتبوون لەسەر کورسیی بەدەوری مێزەوە لە وتوویژدا، بەرانبەر تێبینیی وەزیرێکی میسری کە گوتی خدێوی ئیسماعیل دەستبڵاو بووە. گوتم دەبینم کەیفتان دێت بەم قەسرە کە دەتوانن داوەتی وەها بە شکۆی تێدا بەرپا بکەن، مادەم وەهایە نابێ لەم فەقەرەیە گلەیی لە خدێو بکرێت. ئەگەر دوای شۆڕش قەسرەکەتان تێک دابایە دەشیا بیر بکرێتەوە لە لۆمەی ئەوتۆیی... ساڵۆنێکی بچووکتری لێ بوو پێی دەگوترا «قاعة النجفة» سوڕەییایەکی زێدە گەورەی لە قوببەکەیەوە شۆڕ بوو بۆوە کە پێی دەڵێن «نجفة». نەقش و نیگاری دیوارەکانی لەوپەڕی جوانیدا بوون. بە خەتێکی خۆش ناوی پاشاکان لە «محەمەد عەلی»یەوە هەتا فاروق نووسرابوو بەڵام نەختێک بە زەحمەت جێی ناوی فاروقی تێدا بووبۆوە چونکە بازنەیەکی بەو ساڵۆنە بازنەییەدا تەواو دەکرد. هەڵبەت ئەم نووسینە هی ڕۆژگاری فاروق یان دوای ئەوە (دەبێ هی فاروق بێت چونکە بە هەمووی دوازدە ساڵ بەسەر لادانیدا تێپەڕی بوو، دیارە شۆڕش لە خۆوە ئەو ناو و شاباشە بە بنەماڵەی محەمەد عەلی نابەخشێت).

مێوانە عێراقییەکان دوو شەو لە ئیسکەندەرییە ماینەوە لە ئۆتێلی سان ئیستیفانۆ دابەزی بووین بەسەر بەحریدا دەنۆڕی. شەوی دوەم لە ڤێللای ڕەسمیی سەرۆک کۆمار کە لە گەڕەکی «المعمورة» بوو مێوانی سەرۆک جەمال بووین. لەبەری میسرییان جگە لە ڕەئیس جەمال نائیبەکانی ڕەئیس جمهووری و سەرەک وەزیران عەلی سەبری و ئەنوەر سەلامە وەزیری وەرزش، هاوڕێی شەرەفی تاهیر یەحیا حازر بوون. لە هەشتی ئێوارەوە تا یەکی پاش نیوەشەو ماینەوە. شەوێکی گەش و خۆش ڕۆییشت.

سەرۆک جەمال هەتا بڵێی «ألمعي» بوو، چ لە شێوە و چ لە ناوەڕۆک هاوتای ئەوم لە سیاسیی کۆن و نوێ نەدیتبوو، نەشم بیستبوو بە وتووێژ و قسەڕەوانی بگاتە جەمال. دەنگی مەخمەلی و ئاوریشمی بوو هێندەی دەنگی فارووق شووشە بۆ بەر گوێ دەشلایەوە. وێنەی لە هەموو ئەکتەرەکانی میسر دڵکێشتر بوو. لە زەکاوەت بلیمەت بوو... عەیبی هەرە گەورە و کوشندەی بەخۆوە گلان و لەخۆدا نقومبوون بوو.

لە ئاست ئەو تەئمیمانەی لە ڕۆژی ١٤ی تەمووز، بەر لە دە دوازدە ڕۆژێک کردبوومان ڕەئیس جەمال گوتی چ پێویست نەبوو بەو تەئمیمە ئێوە دەوڵەتی نەوتن، بابایەکی عێراقی چەند هەزار دیناری لە بانک داناوە ژیان و پاشەڕۆژی منداڵانی پێ تەئمین بکات هی ئەوە نییە حکوومەت چاوی تێببڕێ. گوتی من بە تەئمیمی بانکەکان هەزار ملیۆن جنیهم لە بێگانە گل دایەوە، ئێوە بیست سی ملیۆن دینار لە عێراقییان دەستێنن چ کەلێنێکی پێ دەگرن... خولاسە زۆر لە دژی تەئمیمەکەمان دوا، کەچی عێراق لەبەر خاتری ناسرییەکان ئەو هەنگاوەی هەڵێنا، گۆیا میسری پێ ڕازی دەکات لەو ڕووەوە، کە ئەمەش جۆرێکە لە جۆرەکانی یەک شکل کردنی میسر و عێراق بۆ هەموار کردنی ئاووهەوای «وحدة»...66

---

66- ئەو شەوەی نێوان ١٣ و ١٤ تەمووز کە بڕیارەکانی تەئمیم لەلایەن مەجلیسی وەزیرانەوە بە حازربوونی سەرۆک کۆمارەوە ئیمزا کرا من لە بەغدا نەبووم، چووبووم بۆ کەرکووک. سەرەک وەزیران «طاهر يحيى» ڕۆژی ١٣ تەمووز تەسریحی خۆی لە ڕۆژناماندا بڵاو کردبۆوە کە نیازی تەئمیمی بانک و پارەی پارەداران لە بەرنامەی حکوومەتدا نییە... سبەینێ لەو دەمەدا کە ڕۆژنامەکان تەسریحی ڕۆژی پێشووی

کۆبوونەوەیەکمان کرد لەگەڵ عەلی سەبری و هەندێک لە وەزیرەکانی بۆ دیارخستنی پێداویستێکی عێراق هەبێت کە میسر بتوانێ جێبەجێی بکات. ڕاستییەکەی خوایشتێکمان کرد لە ڕواڵەتدا خواییشت بوو بەڵام لە ناوەڕۆکدا بەخشین بوو، وەزیری تەربییە گوتی چەند هەزار مامۆستامان دەوێ بۆ دەرس گوتنەوە لە قوتابخانە سەرەتاییەکان و ناوەندییەکان، لە حاڵێکدا هەزاران دەرچووی «دار المعلمين و معلمات و فنون بيتية» مان هەبوو چاویان بڕیبووە هەلێک بۆ دامەزرانیان ئەمەش هەر حیکایەتی ئەزەلیەکەی جووتەوەری «ازدواج الشخصية»کەی جیهانی سێیەمە کە حەزی کردووە بڵێ، شەل نییە پای شکاوە. چ دەبوو بگوترابایە میسر باری ئابووریەکەی نالەبارە، پێویستی هەیە بە یارمەتی دان، ئنجا هاتباین لە جیاتی ئەو مەعاشە گەورانەی کە موعەللیمی میسری لە عێراقی وەردەگرت کە پتر لە دوو هێند و سێ هێندی مافی خۆی بوو، مەعاشەکی عادەتیمان بۆ هەناردبایە و چی دەمایشەوە لە فەرقەکە دوو جاران بەشی ئەو مامۆستایە بێچارانەی عێراقی دەکرد. میسریەکی لە عێراق سەد دیناری بدەیتێ ڕازییە بە پەنجا دینار کە لە میسر بێتە دەستی، پەنجا دینارەکەی دیکەش گەلێک زیاد بوو لە مەعاشی ئەوسای دەرچووی «دار المعلمات و فنون...» حکوومەتی عێراقیش نەختێکی پارە بۆ دەمایەوە. جیهانی سێیەم حەزی لە نانی درۆزن و پێوەندی درۆزن و تیجارەتی درۆزن و هەڵوەستی درۆزن دەکات چونکە لە درۆکەدا ناز و فیز و خۆ فش هەڵێنان هەیە. لە لایەکی دیکەشەوە سەیر بکەیت، لەوانەیە میللەتی عێراق کەمتر ڕازی بێ بەوەی من گوتم لە چاو زەرەرە گەورەترەکە و درۆزنەکەش... ڕەنگ بوو بگوترێ مانای چی بێ سەبەب پارە بدەین بە میسرییەکی چ سوودمان پێ ناگەیەنێت؟

---

سەرەک وەزیرانیان بڵاوکردبۆوە کە تەئمیم جێی باس کردن نییە، سەرەک وەزیران خۆی لە ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن بڕیارەکانی تەئمیمی دەخوێندەوە. دواتر زانیم شەوی نێوان ١٣ و ١٤ ی تەمووز، وەزیرەکانی سەربە «ناسریزم» هەڕەشەی ئیستیقالە کردنیان لە ڕووی سەرۆک کۆمار و سەرەک وەزیران دابوو ئەگەر تەئمیم ئیمزا نەکرێت... ناچاری ئەو هەڵوەستە ناقۆڵایەی ڕەخساند.

لە گەڕانەوەمان بۆ قاهیرە بە ڕێی سەحراویدا سەرێکی «مديرية التحرير»مان دا... لە ئەسکەندەرییە سەرەوبنبوونی «سنیا»کەم بۆ چووە باری ئاسایی خۆی و دەریا کەوتەوە باکوور و ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە سەری دەردەهێنا. ئەم وەزعە خۆشە ئارامە بەردەوام بوو هەتا لە سەرەتاکانی شاری قاهیرە پێچێکمان بە دەستە چەپدا کردەوە دنیاکەم لێ وەرگەڕایەوە. دەتگوت لە پەردەی مێشکمدا فیلمێک گۆڕا بە یەکێکی سەروبن.

نە ئەوسا و نە ئێستاش بۆم ساغ نەبۆوە هۆی ئەم تەقلەبازییە چی بوو؟ من لە ئاڵقەییێکی کۆنی ئەم گەشتەدا گوتم سەروبنبوونی دنیا کە لە هەوەڵ سەفەری بەغدام نەقش بەستووی مێشکم بوو کاتێک کە لە گەڕانەوەدا سەردانی سلێمانیم کرد دنیاکە کەوتەوە باری ئاسایی خۆی و لێم تێک نەچۆوە، کەچی لە میسر وەها نەبووم. خوێنەر لێم بسەلمێنێ کە دەڵێم، ئەو دەمەی لە زارکی شاری قاهیرەدا بە پێچ کردنەوە دنیاکە لە پێش چاوم سوڕا، ئا لەو چرکەیەدا کە ڕاست و چەپ و پێش و پاش جێگۆڕکێیان کرد دەتگوت دەست و پەنجەیەکی مەوهووم هەناومی گوشی، تارماییەکیش بە بەرچاومدا ڕەت بوو بێگومان ڕوومی سوور هەڵگێڕابوو... دیاردەی ئەوتۆیی لە مرۆدا، وەک بزانم، سەردەکێشێتەوە بۆ نەفس، دەبێ لە زانستی نەفسدا شی کرابێتەوە بەڵام من بەسەریدا نەکەتووم. ئەم دیاردەیە لە مندا زۆر ڕەگ داکوتاوە دوور نابینم سەرسووڕکێی دەمی پەڕینەوەم لە زێ و ڕووباری بەرینیش شێوەیەکی ئەم دیاردەیە بێت. ناڕاحەتبوونم لە بەرزایی سەر شاخ و خانووی بڵند و ناو فڕۆکەش خزمی ئەم خەسڵەتەمە، هەندێ جار لە ناو نوێنی نوستندا بە خەیاڵ دەچمە سەر شاخێکی یەکجار بەرز لەوێوە خۆم بۆ بنارەکەی هەڵدەدەم، دوای چەند سانییەیەک سەغڵەت دەبم و ناتوانم بەردەوام بم لە سەرەژێربوونەوەی خەیاڵی، بە ناچاری بیرم بۆ لایەکی دیکە دەبەمەوە.

لە قاهیرە ڕۆژێکیان بە فڕۆکە چووین بۆ ئەسوان. جارێ لە سەرەتاکانی هەڵنانی بناوانی ئەسوان بوون. ئەو سەردانەی ئەسوانم زۆر نابەدڵی کرد چونکە بریتی بوو لە کات بەفیرۆ دانێکی ئێسکقورس. من چیمە لە نیلێکی مەجرای گۆڕابێ بۆ هەڵنانی بەهەشت یان هەرچی دەبێت. ئێمە لە عێراق دووکان و دەربەندیخانمان هەبوون جێی گەشت و گەڕان و تێدا حەسانەوەش بوون، زیخ و بەردی بنی نیل بە من

چی؟ ئەم تەرزە ناچاربوونە بۆ گەڕان و سەردانی ئێسکقورس وەهام لێ دەکات هەرچی داوەتی ڕەسمیی ئەوتۆیی بێت حەزی لێ نەکەم...

گەڕاینەوە بۆ بەغدا. ڕۆژ بە دوارۆژدا ئاوادەبوو بێ ئەوەی هیچ چالاکییەک دەرکەوێ بۆ ئاوەدان کردنەوەی کوردستان. ئەو ئەنجوومەنە دە کەسییەی کە دەبوو ئەندامەکانیان دیار بکرێن پشتگوێ خرا. ئەنجوومەنەک گۆیا پرۆژەی ئاوەدان کردنەوەی دادەنا وەک کە کۆنە «مجلس الاعمار» بۆ هەموو عێراقی دەکرد... پاشملەی من حکوومەت خەڵقی بۆ لای دەسەڵاتداری سیاسەتی کورد دەنارد و لەوێوە ڕاسپاردە بۆ حکوومەت دەهات بێ ئەوەی خەبەری من بدرێت.

ڕۆژێک من لە ژوورەکەی سەرەک وەزیران، لە دەمی سەردانێکی کە سەرۆک کۆمار عەبدولسەلام عارف لە ئەو و منیشی کرد، بە هەردووکیانم گوت، ئێوە ئەگەر لە من ئەمین نین با یەکێکی دیکە بێت و ببێتە ئاڵقەی پێوەندی لە نێوان ئێوە و کورددا، ئەگەر لێم ئەمینن مانای چی بێ ئاگای من پێوەندی بە دنیای کوردەوە دەکەن؟ من گۆیا هاتووم تەم برەوێنمەوە نەک خۆم تەماوی ببم. لەمەش پتر، بە دزییەوە دەنێرن کەسانێک لە کوردان بە پارە دەکڕن گۆیا بنگەی هێز لە ئۆردوگای دوژمن ساز دەدەن کەچی ئەو کەسانەی کڕیوتانن وەکوو هایدرۆجین، نەک بێ سەنگن بەڵکوو لە هەر دەفرێک بکرێن دەفرەکە سووک دەبێت. سیاسەتی خەڵق کڕین بە درێژایی مێژوو لە باو بووە بەڵام کڕدراوەکە دەبێ نرخەکە بهێنێت. فەرموون شێخ لەتیف و عەباسی مامەنداغا و شێخ حسێنی حاجی سەید بکڕن. لە کۆبوونەوەیەکی دوو لایی لەگەڵ وەزیری داخلیە باسی کوردێک هات کە ڕاسپاردەی کورد و حکوومەت بە جێگەی خۆی دەگەیەنێت. وەزیری داخلیە مەدحی ئەو کەسەی کرد... پێم گوتەوە، ئەو کەسە یەکێکە لە زیرەک و موسەقەفەکانی کورد، خۆم لەزەت لە گفتۆگۆی دەبەم بەڵام بەپێی باوەڕی خۆم هەستێکی خۆ بەکەم زانینی تێدایە لە ئاکامی ژیانی هەژارانەی تێیدا ڕسکاوە بۆتە هۆی بێ ئۆقرەیی و دڵەسوڕکێ و هێلانەگۆڕیی. لەو ماوەی پاش جەنگی دوومەوە تا ئیمڕۆ ڕاوکەی لە چەپ و کوردپەروەری و لە حکوومەت و لە دەسەڵاتی دیکەش داناوە. ئێستاکەش کە نامە لە کوردەوە بۆ حکوومەت وەیا لە حکوومەتەوە بۆ کورد دەهێنێت و دەبات لە پێشەوە بە چەپەکانی ڕادەگەیەنێت.

ئەم قسانەم لەگەڵ ڕەشید موسڵیح، وەزیری داخلیە کرد، چونکە هەلێک بوو نەدەشیا لە دەستی بدەم. من لە خۆمەوە باسی هیچ کەسم لەگەڵ حکوومەت نەدەکرد، کە لەو جارەشدا باسی ئەو کەسەم کرد لە نوختەی بەرژەوەندی کورد و ئەمانەت و ڕاستگۆیی خۆم بوو لە ئاست کوردویستیدا کە ئەوسا ئاشتیی پتر بۆ دەست دەدا. هەرچی چەپەکان بوون حەزیان نەدەکرد کورد و حکوومەت ڕێک بن هەروەک کوردیش ئەگەر لە باری ئەواندا بایە حەزی نەدەکرد چەپ و حکوومەت ڕێک بن. لەمەوە ئاشکرایە ئاگاداربوونی چەپ لە هەموو نهێنییەکی نێوان کورد و حکوومەت دەیکێشایەوە بۆ پەیدابوونی کەلێن کە دەشیا نابەرژەوەندی پێدا تێپەڕێت. سەیر لەوەدا بوو کە من بە سیفەتی نوێنەرایەتیی کورد ئەو نهێنییانەم نەدەزانی کە چەپ لە ڕێی ئەو کەسەوە پەیتاپەیتا لە کۆشی دەکرا. وا بزانم دوای ئەم گفتوگۆیە کابرا وازی لێ هێندرا بەڵام وەعدم لە ڕەشید موسڵیح وەرگرت کە هیچی خراپی لەگەڵ نەکرێت و نەشکرا.

دامەزراوێکی ئەمەریکایی سەربە کەنیشتەکانی جیهانی کە K. A. R. E یان K. E. R ڕەمزی بوو، بایی دوو ملیۆن دۆلار بژێوی پێشکەش بە لێقەوماوی کورد کرد، بەڵام هەتا من نەبووم بە وەزیر و تەخویل نەکرام بە ئیمزا کردنی خاڵەکانی ڕێککەوتننامەی ئەو پێشکەشە، شتومەکی تەسلیم بە حکوومەت نەکرد. سەفیری ئەمەریکا ئاهەنگێکی گەورەی بۆ ئەو موناسەبەیە لە ئۆتێلی بەغدا گێڕا. هەر لە بیرمە، لە بارەی زوو کردن لە گەیاندنی بژێو بە لێقەوماوان گوتم، ئەگەر بە پەڕەشووت لەو هەرێمەی فڕێ بدەن جێی خۆی دەکاتەوە. سەفیر مستر سترۆنگ گوتی، خۆ دەبێ پەڕەشووت هەبێ ئنجا خواردەمەنی پێ فڕێ بدەیت. مەبەستی ئەوە بوو بڵێ پێویستە متمانە هەبێت بۆ گەیشتنی شتەکان بە لێقەوماوان. ڕاستیشی بۆ چوو بوو. هەر من ئیمزام کرد و سەرەک وەزیران بڕیارێکی لە لای خۆیەوە دەرکرد کە بە فەرمانی ئەو شتەکان دابەش بکرێت. لە ئاکامدا بەشی هەرە زۆری بژێوەکە بە پیاوی وەها درا هەم دەوڵەمەند بوو هەم قازانجی کردبوو لە هەرای کوردستان هەم دوژمنی کوردایەتی بوو... ئەم ڕەفتارە زۆر کاری تێکردم بەڵام وەک ئێستا بۆت ڕووت دەکەمەوە هیچم پێ نەدەکرا.

لەو هاوینەی ١٩٦٤ جارێکیان لەگەڵ لیوا عەبدولڕەحمان عارف، برای سەرۆک کۆمار و سەرەکی ئەرکانی سپای عێراق، بە ڕەفاقەتی موتەسەڕیفی سلێمانی و چەند

ئەفسەرێکی گەورە لە سلێمانییەوە بە هەلیکوپتەر چووین بۆ دیدەنی کردن لە کوردە چەکدارەکان لە ئاوایی چوارتا. ڕۆژەکەی ڕەشەبای هەبوو، تەیارەکەمان دوو جاران خۆی تێکرد نەیتوانی لە ئەزمەڕ تێپەڕێت تومەز «جیوب هوائیة»ش هەبوو، جاری سێیەم زۆری لێ کشایەوە ئنجا چل مەترێک لە شاخەکە بەرزتر بۆوە. سەفەرەکە بۆ هەوڵی یەک لا کردنی هەموو گرفتێک بوو بەڵام وەکوو هەموو جاران نەزۆک بوو. من شەو مامەوە، لە دەسەڵاتداری کوردم داواکرد ڕێم بدات لە پێویستدا ئیستیقالە بدەم. دەستی گەیاندە کەمەرم و گوتی تکات لێ دەکەم جارێ ئیستیقالە مەکە. تا ئێستاش تێنەگەیشتم ئەم پەرۆشەی لە چییەوە بوو بەڵام لەو دەمەدا وەها بەدڵ قسەکەی کرد هەموو کەلێنێکی لە ئیستیقالەم گرت و پەکی خستم.67

---

67- ئەو کۆبوونەوەی چوارتا من بە دووانێکی نە کورت نە درێژ سەرەتای وتووێژم کردەوە. بە عادەتی جیهانی سێیەم مەنهەجی ڕێکخراو لە نێواندا نەبوو، چوونەکەمان وەک سەردانێکی دەروجیران بکەین وەها بوو. قسەی چەور و لووسی تێدا دەکرا... هەموو براین، شەڕ بەدە، ئاستی چاکە، هەنگوین شیرینە، دوو جاران سێ دەکات پازدە...هتد. لە پشویەکدا کوردێکی مەکتەبدیدە هاتە پێشەوە و هێندێک قسەی کرد، بە تێوەرێخ ناوی ئیبراهیم ئەحمەد-ی هێنا و وشەیەکی نالەباری وەپاڵ دا، من بە دەنگێکی ئەوتۆ کە «عبدالرحمان عارف» لە تەنیشتی ڕاستمەوە و مەلا مستەفا لەولای ئەوەوە بی بیستن گوتم: ئیبراهیم ئەحمەد ئەوە نییە کە گوترا، هەڵکەوتێکی نالەبار خستییە جێگەیەکی هەڵەوە ئەگەرنا لەوانە بوو ئێستا لەگەڵماندا بێت و بۆ ئاشتی گشتی بکوشێت. من قسەکەم ڕووی لە مدیری حەرەکات (وابزانم عبدالمجید ناوێک بوو) بوو بەڵام خۆم ڕووم وەرنەگێرابوو تەماشای پێشەوەم دەکرد کە جەماوەری گوێگران بەرانبەرمان بوون... ماڵم حەقە مدیری حەرەکات (یان هەر وەزیفەیەکی دیکەی وەک ئەو بێت) بە دەنگێکی عادەتییەوە گوتی «وجهه نظر معقولة».

ئێوارە لە خزمەت مەلا مستەفادا بە پیاسە لە ئاوایی دوور کەوتینەوە، عەباسی مامەنداغا و یەک دوو کەسی دیکەشمان لەگەڵدا بوون، عەباساغا بە ئانقەست خۆی دوا خست، مەلا مستەفا و من ماینەوە بۆ قسەیەکی پێویست بێت. لەو هەڵکەوتەدا بوو لێم داوا کرد ڕوخسەتم بدات ئازاد بم بۆ ئیستیقالە دان کە هات و کار

له زستانی کۆتایی ۱۹۶۴ دوو سەفەری پرسەم بۆ کۆیێ کرد یەکێکیان هی حاجی جەلالی حاجی ئەمینی حسێنی، لە بنەماڵە مەیلەو کۆنەکانی کۆیە و قەدیمە دۆستی جەلیزادان بوو. وەک بزانم ئەوان لە ئێمە زووتر نیشتەجێی کۆیە بوون. لە سەردەمی محەمەدی عیساغا کە لەگەڵ غەفوورییان لە ساڵی ۱۲۳۷ کۆچی بەر قەتلوعام کەوت. هەر لە ڕقی ئەو محەمەدی عیساغا-یە بەینێک کۆیەیان چۆڵ کردووە، دواتر بۆی هاتوونەتەوە. حاجی جەلال برای چوارەم بوو لە نێوان پێنج برایاندا دوای هەموان بە ڕەحمەتی خوا شاد بوو. پرسەی دوەم هی مامۆسیا مەلا مەعسوومی هەورامی، قوتابیی باوکم و جێنشینی ئەو و مامم لە مزگەوتی گەورە و دۆستی خۆم. بەر لە دەرچوونم بەرەو کۆیێ بە تەلەفۆن لە سەرۆکی دیوانی قەسری جمهوریم گەیاند کەوا کارێکی شیرن دەبێ ئەگەر سەرۆک کۆمار سەرخۆشی لە تازیەدارانی مەلا مەعسووم بکات. قسەکە جێی گرت و قایمقامی کۆیێ لە وەکالەتی سەرۆک چووە پرسەیان... مەلا مەعسووم لە ۱۹۶۱ دووچاری بەندیخانە هات و لە ۱۹۶۳ ش دە مانگان دەربەدەریی چێشت، ساڵێکیشی نەبرد دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ چووە ڕەحمەتی خوا.

حکوومەت لە لای خۆیەوە گلەیی هەبوو کە باری ئیدارەی کوردستان پێوەی دیارە حکوومەت نییە. کوردەکەش گللەیی هەبوو کە جگە لە گێڕانەوەی موەزەفی مەفسووڵ چی ئەوتۆ بۆ کورد نەکراوە دڵ خۆش بکات. بە ناوی دۆزینەوەی چارە کۆبوونەوەیەکی دوو ڕۆژی بەسەرپەرشتی کردنی ڕەشید موسڵیح لە وەزارەتی دیفاع گیرا چەند وەزیرێک و سەرۆکی ئەرکان و قائد فیرقەکان و ئەفسەری دیکەش بەشدارییان تێدا کرد. پاش وتوویژ و لێکدانەوە و هەڵگێڕ و وەرگێڕ لێم داوا کرا بچم بۆ دیدەنی کاربەدەستی چەکداران. ڕێکەوت وەها بوو بەر لەو کۆبوونەوانە لەلایەن سەفیری ئەمەریکاوە داوەت کرا بووم بۆ نیوەڕۆژەیەک کە ڕۆژەی دوای کۆبوونەوەکانی بۆ داندرا بوو. گوتم تا ئەو داوەتە بەسەر نەچێ پێم ناکرێ سەفەر

---

گەییشتە ڕادەی زەروورەت، بەڵام بە لەهجەیەکی زێدە هێمن گوتی باسی ئیستیقالە مەکە. لەو ڕۆژانەدا عەلی عەبدوڵا دەستبەسەر بوو لە چوارتا، بەینێک بوو نەمدیتبوو.

بکەم چونکە بەڵێنم داوە، لای دیپلۆماسییانیس زۆر ناخۆشە بەڵێن شکاندن بەرنامەیان لێ بشێوێنێ.

ڕۆژی داوەتەکە کە تەنها من و سەفیر بە دەوری مێزێکی بچووکەوە دانیشتبووین، خانووی سەفارەت هەتا بڵێی فرەوان بوو مێزەکەش هەتا بڵێی بچووک بوو، ئەمما خواردنەکە هەر باسی مەکە… بریتی بوو لە گۆشتێکی ناو قتوو لەگەڵ سەلاتە، ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ. سەروو کاسە ئاوێکیان بۆ دانابووین هەر کاسەیە گوڵێکی تێدا بوو، دیار بوو بۆ دەست پێ تەڕ کردن بوو، فتارەکەی لای عەبدولکەریم قاسم-م بە بیر هاتەوە کە چۆن بەر لە دانیشتنمان بەسەر کورسییەوە دەستێکی لە ئاوەکەی کاسەی خۆی تەر کرد نەکا من بە هەڵە تەمای خواردنەوەی لێ بنێم. حەکایەتەکەم بۆ سەفیر گێڕایەوە و گوتم ئێوە بەو گوڵەی ناو ئاوەکە ڕێی ئەو هەڵەیەتان لە مێوان بەستووە. گوتی، ئەمما سەیر دەبێ مێوان وا بزانێ گوڵەکە بۆ خواردنە!

لە بیرم نەماوە چەند و چیمان گوت بەڵام لە بیرمە، چ جاری ئەو داوەتە بێت و چ جاری دیکەی موناسەبان بووبێت مستر سترۆنگ شتێکی نەگوت لەوانەبێ لای عەبدولسەلام عارف نەیڵێت. سیاسەتەکەی بێ خوارەکە و خێچکە دۆستی تێکڕای عەرەب بوو، تەنانەت لە وتووێژدا کە باسی تەدەخولی میسری ئەوسا لە کاروباری یەمەن هاتە پێش یەک ڕەخنەی لێ نەگرت و چ پەرۆشیشی نەبوو بۆ سعوودیە کە بەو تەدەخولە سەغڵەتە، هەرگیزیش بۆ ئەوە نەچوو کە دەشێ سەرۆک جەمال چاوی بڕیبێتە نەوتی خەلیج، بگرە بە ئاشکرا لای سیاسەتی شۆڕشی میسری دەگرت لە ئاست «رجعیة»ی عەرەب، بایی سەری دەرزیش وشەی نەدرکاند بێنی خۆهەڵقوتاندنی لێ بێت لە کاروباری عێراق ئەوە نەبێ کە بۆ ئاشتی و لێکڕازیبوونی دادەتاشی.

ئەم تارماییانەم لەبیرن بێ ئەوەی قسەکان یاد بکەمەوە وەیا بابەتی دیکەی وتووێژمان بە بیرمدا بێتەوە، ئەوەندەش دەزانم کە من بە تەمای هیچ شتێک ئەو داوەتەم پەسەند نەکردبوو تەنها یەک نوختەم لە مێشکدا بوو ئەویش ئایا ئەگەر لە بارێکدا کەوتمە مەترسی و گیران و خەتەری کوشندەوە دەتوانم پەنا بۆ سەفارەتی ئەوان ببەم؟ ڕووداوی ١٩٦٣م لەبیر بوو نەمدەویست دووچاری وەزعێکی وەک ئەوسا ببمەوە. لە ئاست ئەم پرسیارەدا گوتی، ئێمە لە سیاسەتماندا نییە تەمای پەناهێنان بۆ لامان لەبەر کەس بنێین حەزیش ناکەین کەس پەنامان بۆ بهێنێ

بەڵام کە کار گەیشتە خەتەری کوشندە دەرگا لە ڕووی هەڕەشەلێکراو داناخەین... ڕەنگە قسەکانی ڕاستییەکی ڕووت بن و ڕەنگیشە پەردەیەکی دیپلۆماسییانەی بێت بەسەر موجامەلە کردن لەگەڵ مندا کە بە قسەی تویکڵدار تێم بگەیەنێ ڕەت ناکرێمەوە.

من کە چوومە لای کوردەکان، هەرچی ڕاسپاردەی ئەو کۆبوونەوەیەی دوو ڕۆژی بوو، بە کۆمەڵەی دانیشتووانی دیوانی مەلا مستەفام ڕاگەیاند.68 ئاکامیشی هەر نامەی دۆستانە و قسەی متمانەبەخش بوو لەلایەن کوردەوە بۆ حکوومەت، ئەوەی ڕاستیش بێت چی دیکە لە دەسەڵاتدا نەبوو چونکە حکوومەتی عەبدولسەلام زەینی مەیلەو بەتاڵ بوو لە داخوازییەکانی کوردەواری. ئەوپەڕی بەخشندەیی و ڕەچاو کردنی مافپارێزی بە لای ئەوەوە هەر ئەوەندە بوو بێ هەوا «وەکوو جاران بە دوو پاران» خەڵقەکە لە ماڵی خۆی دابنیشێت و مل لە کێڵان و چاندن و مامڵەتی بازاڕی بنێت.

مرۆ مەخلووقێکی عەنتیکەیە، بە درەنگەوە تێیدەگەیت، ڕەنگە هەر تاکێکیشی بە هەموو عومری لە خۆی نەگات، عەبدولسەلام کە پەندی وەهای لە مێشکدا بوو بۆ

---

68- لە دەمی کۆبوونەوەم لەگەڵ کاربەدەستانی حکوومەت، داوام کرد کە پێویستە چوونەکەم شیرینایییەکی پێوە بێت، هەندێک نەقدینە و پیتاکم لەگەڵدا بێت... گوتیان کە گەڕایتەوە بە خۆشی چەندی دەڵێی حازرە... کە چوومە لای مەلا مستەفا و لە دەمی وتووێژدا کە کۆمەڵێک لە بەرپرسانی شۆڕشی تێدا بوو باسی ئەو یارمەتییە بەڵێندراوەم کرد کە هە نەبێ تا وەردەگیرێت نەختێک ئارامی بپارێزرێت، مەلا مستەفا دەستی بۆ هەمووان درێژ کرد گوتی: ئەمانە هەموویان وەکوو کابرای بێتاڵعن کە مەشوور بوو بە «بێدەوڵەت»: جارێکیان لە سەفەردا بوو بە پێیان دەیکوتا تا گەییشتە شوێنێک ویستی خۆی تاقی بکاتەوە ئایا دەتوانێ بۆ ماوەیەک بە چاوی نووقاوەوە دەڕۆییشت دەرگەی خەزنەیەک کرابۆوە و دەرفەت نەبووبوو دزان خەزنەکە ڕاگوێزن - کابرای بێدەوڵەت دوای ڕەتبوونی لە خەزنەکە بە ماوەیەک، چاوی هەڵێنا و چەپڵەی بۆ خۆی لێ دا و ئافەرینی کێشا لە زیرەکی خۆی...
ئائەمانەش هەر وەکوو بێدەوڵەتەکە دەکەن هەتا ئەو یارمەتییە لە کیس نەچێ ئارام نابن.

سەلامەتیی کورد، ئەدی بۆچی هەمان پەندی بۆ خۆی بەکار نەهێنا لە ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨؟ عەقیدێکی ڕێکوپێک بوو مەعاشێکی تێروتەسەلی وەردەگرت خەڵقیش لە دەشت و شار خەریکی کێڵان و پێوان و لێ نان و خوێندنیش بوو، ئیتر بگرە بکوژەی بۆچی بوو؟

وتوویژی خۆمم لەگەڵ سەفیری ئەمەریکایی هەڵگرت بۆ دیدەنییەکی مەحرەمانە کە لەگەڵ مەلا مستەفا بە بەشداری کردنی دوو کەسی دیکەی بەرسی کورد پێک هات. چەندی بە بیرمدا هاتەوە لەو وتوویژە بۆ ئەو سێ کەسەم گێڕایەوە. لێرەدا پێشدەستی دەکەم بۆ گێڕانەوەی کورتە حیکایەتێکی مەزەدار کە پێوەندی هەیە بەم وتوویژەوە، ئەگەر بازی بۆ نەهاوێژم جارێ دوو ساڵێکی ماوە نۆرەی بگاتێ، ئەوساش بە زەحمەت ڕۆژگارم بۆ هەڵدەکرێتەوە تا زەینی خوێنەر بەرەو پاش بگێڕمەوە بۆ ڕۆژانی وتوویژەکە.

دوایین جار کە فەریق تاهیر یەحیا بوو بە سەرەک وەزیران لە سەرۆکایەتیی عەبدولڕەحمان عارفدا، چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێپەڕی ڕێکەوت وەها بوو لیوا ناجی تالب و عەقید ڕەجەب عەبدولمەجید بە دوامدا هاتن تا بەیەکەوە بچین بۆ یەک دوو پرسەی خوالێخۆشبووان. ناجی گوتی، دەبینم «ما جابوک وزیر» گوتم، تۆ خۆت بوویت بە سەرەک وەزیران «ماجبتني وزير؟» ئیتر بۆچی سەیر بێ یەکێکی دیکە «ما جابني وزير؟» نەختێک ڕاما و گوتی، «كانت غير ظروف...» من نەمپرسی ئەم «غير ظروف»ـە چی بوو، لە باری وەهادا ئایەتی «لا تسألوا عن أشياء إن تبد لكم تسؤكم» بە چاوەوە دەگرم.

پاش ئەمە. بە ماوەی دوو ساڵێک، دیدەنیی برادەرێکی وەفاکارم کرد، کە بەیەکەوە لە حوقووقمان دەخوێند و بەیەکەوەش وەزیر بووین، دوای منیش بە وەزیری مایەوە هەتا خۆی بێزار بوو لە سیاسەت و کەوتە باری محاماتەوە. گوتی شتێکت بۆ دەگێڕمەوە هەرگیز دەرفەتم نەبوو بۆتی بگێڕمەوە. گوتی، جارێکیان لای عەبدولسەلام بووین، سەرەک وەزیران و چەند ئەفسەرێک و وەزیری دیکەش لای بوون ڕاپۆرتێکی بۆ هات و بۆمانی خوێندەوە لە بارەی وتوویژێکی کە تۆ لەگەڵ سەفیری ئەمەریکات کردووە، تەقریرەکە فڵانە شت و فڵانە شتی تێدا نووسرابوو کە گوتووتە... برادەرەکەم چەندێکی شتێک لەو شتانەی باس دەکرد کە گوتوومە بە بیرم دەهاتەوە کەوا ڕاستە گوتوومە تا ئەوەی وەک کە دینار خورد بکەیتەوە بە

درهەم و هەموو درهەمەکانی دانەدانە بژمێریت، ئەو ڕاپۆرتەش هەموو قسەکانی منی خورد کردبۆوە.. ئەو دەمە بیرم بۆ قسەکەی لیوا ناجی تالب چۆوە کە گوتی «کانت غیر ظروف»، دیارە ئەو ڕاپۆرتە جارێ لە مێشکاندا گەرموگوڕ بووە بایی ئەوەی دۆستێکی وەکوو لیوا ناجی ڕێی نەبێ پرسێکم پێ بکا بە بوون و بە نەبوون...

لێرەدا دەمەوێ خوێنەر لە دزێویی دیمەنەکە ڕابمێنێت. جارەهای جار گوتوومە سیاسەت monkey business – کاری مەیموونە. تۆ سەیری! وتوویژێک تەنها پێنج کەس بیزانن هەموویشی بە ڕواڵەت جێی متمانە بن ئنجا بە گردی و بێ کەموکورتی لە کۆشی سەرۆکی دەوڵەت بکرێتەوە. بێگومان من و سەفیری ئەمەریکا دژی خۆمان شتی ئەوتۆیی ناکەین، مەلا مستەفا ئەو زەرەرە لە خۆی نادات. دەمێنێتەوە ئەو دوو بەرپرسە تێهەڵکشیوە لە کوردایەتی. یان یەکێکیان یان هەردوویان خزمەتەکەیان کردووە، بە ڕێکۆردەریش کراوە دەنا مێشکی عادەتی وەها بە سەلامەتی بیست درهەمی دینارێک دەور و تەسلیم ناکاتەوە. لەم بابەتەی ڕەفتاری گڵاو نموونەی دیکەم بیستووە لە تەجرەبەی دۆستی باوەڕپێکراوم بەڵام هێندەی ئەمیان سفت نەبووە چونکە جغزی خەبەرزانەکان هەرِەمەیی بووە و ژمارەیشی پتر بووە.

ڕووداوێکی خۆش و شیرنی پێوەندی بە خۆمەوە هەبێت لەو ڕۆژانەدا ئەوە بوو، لە ڕۆژی ١٥/٨/١٩٦٤ لە کەرکووکەوە بە تەلەفۆن خەبەرم پێ درا کەوا کوڕی دوەمم «محمد» پێی ناوتە ئەم جیهانە. شەوی بەرایی خەونم دیت. منداڵێکی ساوا بە باوەشی ئافرەتێکی ماڵی خۆمانەوە بوو، ئافرەتەکە پێمی گوت، مزگێنی، خوا کوڕەکی پێ داین. خەونەکە سەیر نییە چونکە ئاگام هەبوو کە منداڵێکمان بە ڕێوەیە. ڕاستبوونیشی لەوەدا کە کوڕ بوو نەک کچ هێندێکی دەچێتەوە بۆ حەزی خۆم کە پێم خۆش بوو کوڕێکم بە ناوی باوکمەوە ناو بنێم، هێندێکیشی بۆ ڕێکەوت، خۆ ئەگەر نەختێکیشی هی ڕاستبینی بێت لەوەدا نەماوە پێی بگوترێ ئەفسانە و جنۆکەپەرستی چونکە ماتریالیستەکانی ئەم سەردەمە لە چاو ماتریالیستی کۆنە مۆدێل هێندەی شێخی سەر بەرِماڵ باوەڕیان هێناوە بە «پەنامەکیەتی»ی زۆر باری جیهانی گیانلەبەر و سروشتیش، چ جایی مرۆڤایەتی. شەڵا زۆر نەبات مەتریالیست بەوەدا بناسینەوە ڕیشی بەردابێتەوە و تەزبیحی دوعایانی بە دەستەوە گرتبێت. جاران چەند حەزمان دەکرد مەلای «منور» ببینین ئێستا خەریکین بە دوا

مەتریالیستی «منور»دا بگەڕێین کە لە قەپێلکی ڕەق و تەقی ماتریالیزمی سەدەی نۆزدەیەم دەرچوو بێت... بڵێن ئامین!

نێوانی حکوومەت و کورد هەتا دەهات بەرەو ناخۆشییەوە دەچوو، باوەڕ پێک کردن تەنک بووبوو. ڕۆژێک لەو ڕۆژانە فەریق تاهیر یەحیا، سەرەک وەزیران، لە ژوورەکەی خۆی کە بە جووتە دانیشتبووین گوتی، ڕاپۆرتێک لە کەرکووکەوە هاتووە دەربارەی شتێکی تۆ گوتبێتت، لای سەرۆک کۆمار خوێندمانەوە. گوتی من باوەڕم نییە قسەی ئەوتۆیی بکرێت بەڵام ڕاپۆرت دەڵێ، گوتووتە ئەگەر حکوومەت داخوازییەکانی کورد جێبەجێ نەکات هەر لە ڕەواندز هەتا فاو دەکەینە ئاگر. گوتم «أبو زهير» قسەی ئەوتۆیی لەوانە نییە بە کوڕێنی بڵێم. بەڵێ گوتوومە، ئەگەر گوتبێتیشم دەبێ بڵێم نەمگوتوە. تۆ خۆت شارەزای تەبیاتمی، لە نیازەکانیش بەڵەدیت، ئەگەر پێت وەهایە قسەی وەها لە من ڕەچاو دەکرێت بیسەلمێنە، دەنا لە لای خۆتەوە فتی بکە. گوتی بێ مجامەلە من لە هەوەڵەوە ئەو ڕاپۆرتەم بە درۆیەکی بێڕیشە حیساب کردووە.69

لەو تەرزە بارەدا دەژیایین، بڕیارێک وەیا پێشنیازێک هاتە پێش کە من و سوبحی عەبدولحەمید وەزیر داخلیەی ئەوسا و عارف عەبدولڕەززاق-ی سەرۆکی هێزی ئاسمانی بەیەکەوەمان بچین بۆ دیدەنی کوردەکان لە ڕانیە. من بە ئۆتۆمۆبیل چووم بۆ کەرکووک وا بزانم ئەو دوو بەرپرسە بە فڕۆکە چوو بوون. لە ژووری زەعیم ڕوکن فەیسەڵ ئەنساری «فيصل الأنصاري» قائیدی فیرقەی دوەم، چوار قۆڵی

---

69- ئەو قسەیەی «فريق طاهر يحيى» لە دەمانێکدا بوو جارێ وەزیرە وەحدەوەییەکان نەهاتبوونە وەزارەت. دواتر کە بوون بە وەزیر ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی دڵ و فیکر کرانەوەی دۆستانەدا زۆر مەحرەمانە لەگەڵ «طاهر يحيى»دا دەدوام، قسە هاتە سەر پەلە کردن لە سەر یەکبوونی عێراق و میسر... من گۆشە نیگای خۆم دەربڕی کە وەحدەی ناپوختە خۆی لە خۆیدا بەردەوامی هەڵناگرێت چ جای ئەوەی پرس بە میللەتی عێراق نەکرابێت. «طاهر يحيى» پڕ بە دڵ بەڵام لەگەڵ گرژێنەوەدا گوتی: وەڵاهی بی پرسی میللەت وەحدە ئیعلان بکرێ ئێمەش لە کوردستانەوە هەتا ئەو سەری عێراق هەرا دەنێینەوە. لەم بابەتە هەر ئەوەندە گوترا و دووبارە نەبۆوە نە لە ئەوەوە و نە لە منەوە.

کۆبووینەوە بە دیار داهاتنی دەمی لە بار بۆ فڕینمان بەرەو ڕانیە کەوا ڕەنگ بوو ئەو ڕۆژە وەیا سبەینێ بێت... دوورودرێژ قسەمان کرد، بە زۆریش عارف عەبدولڕەززاق لەگەڵم دەدوا. تێکڕای قسەکان دەوری هەڵکەوتی نالەباری ئەو دەمە لە نێوان حکوومەت و کوردی چەکدار هەڵدەهات، لە ناویاندا سێ خاڵ بۆ ئێرە ڕادەگوێزم.

یەکیان ئەوە بوو لێمی پرسی «ما هو الحكم الوطني»؟ گوتم، نەکا وەڵامەکەم ئەو نەبێ کە بەتەمای شتی دیکەی لەسەر هەڵبستێنێت، خۆت وەڵام بدەوە. گوتی «الحكم الوطني هو ادارة البلاد بواسطة ابنائها». لەمەوە بۆ هێندی چوو کە عێراق لەلایەن کوڕانی خۆی بەڕێوە دەبردرێت ئیتر بۆچی بشێ لە ڕووی هەڵگەڕێنەوە؟ گوتم، خۆ شای ئێران کوڕی ئێرانە، بۆچی ئێوە بە پیاوی چاکی نازانن؟ بۆ شۆڕشی تەمووزیش چوومەوە تا بتوانم بڵێم هەڵگەڕانەوە وەیا موعارەزە بەندە بە باوەڕی خەڵق بە چاکبوون و چاک نەبوونی حکومەوە. بە دەم ئەم قسانەوە ڕاشم گەیاند کە من خۆم حەز لە ئاشتی دەکەم و بە دەستم بێت حکوومەت و کورد لە سەعاتێکدا ئاشت دەکەمەوە.

خاڵی دوەم ئەوە بوو گوتی، ئیستیعمار شازدە جیپی بۆ چەکداران هەناردووە لەگەڵ چەند کەلوپەلێک. گوتم، پێم باوەڕ بکە نازانم و نەمبیستووە شتی وەها هەبێت بەڵام ئەگەر ئەمە ڕاست بێت دیارە ئیستعمار حەسقێلی لەگەڵ ئەو چەکدارانە بەکار دەهێنێت چونکە وەک ئاگادارم تا پێی کرابێت کۆسپی بەر پێی حکوومەتی عێراقی هەموار کردووە لە تیجارەت و چەک و جبەخانە...

خاڵی سێیەم ئەوە بوو، لە قسانیدا گوتی، «احب الصراحة والوضوح». پێم گوتەوە، «عندك تفاؤل مسلي» چونکە سیاسەت دوژمنی پاتەوپات و ئاشکراییە. گوتیشم، کاتێک لێت داواکرا ببیت بە سەرەک وەزیران نەکەی بسەلمێنیت چونکە بەرپرسبوون دژی ئاشکرایی و سەراحەتە. گوتی، «منو يگول راح اقبل اكون رئيس وزراء...» گوتم، «من باب الاحتياط اتقدم لك بنصيحة أخوية»، یاخود شتێکی بەو مانایەم گوت. سەیر لەوەدا بوو دواتر زانیمەوە، لەو دەمەدا کە باسی «صراحة» و «وضوح» دەکرا شەوکەت عەقراوی لە ژوورێک داندرابوو، کە من نەیبینم، نامەی هێنابوو بۆیان لەلایەن چەکدارانەوە. ئەم قسەیەشم لە شەوکەت خۆی بیستەوە.

من گەڕامەوە ماڵی شێخ ڕەئووفی خانەقا. زۆری نەبرد تەلەفۆنیان بۆ کردم کە چوونی ڕانیە بەتاڵ کرا. ئەوسا نەمزانی بۆچی، دواتر مەعلوومم کرد کە هاتنی شەوکەت هۆی گۆڕانی بەرنامەکە بوو ئیتر ئەو هاتنە هەرچییەکی بە دەمەوە بووبێت فەرق ناکات...

لێرەدا دوو خاڵی بچووک دەبێ بێتە یاد کردنەوەوە، یەکیان ئەوەیە کە من ناتوانم بڵێم عارف عەبدولڕەززاق ئاگادار بوو لە پەنادانی شەوکەت عەقراوی لێم، دەشێ لەو دەمەدا کە قسەمان دەکرد ئەو هاتنی شەوکەتی نەبیستبێ. ئەمە دەڵێم چونکە من لە موناقەشەی گرنگدا ئەوپەڕی سەراحەتم لێی بیستووە. خاڵی دوەم ئەوە بوو کە من سەمەدی حاجی محەمەدی بەننام لەگەڵدا بوو، هەڵبەت لە دانیشتنەکەمان وەکوو گوێگر بەشدار بوو. سەمەد بە «تنسیب» هاتبووە «اعمار شمال» لە زۆر هاتوچۆدا بەهانام دەهات. خەتەری هەڵبوونەوەی بڵێسەی شەڕ سەری دەرهێنا. موتەسەڕیفی سلێمانی سەید عەبدولڕەززاق سەید مەحموود ئیستیقالەی دا، وەکوو زەنگی ئاگادار کردنەوە هاتە بەر گوێ.

لە شوباتی ١٩٦٥ دوو چالاکی پەلەکوتکەی «ژیان»م بۆ پاراستنی ئاشتی کرد. هی یەکەمیان لەلایەن چەند بەرپرسێکی باڵیۆزخانەی میسرەوە سەری هەڵدا. سکرتێری یەکەم و دوەمیان داوایان کرد بیان بینم. لە ماڵی سەمەدی حاجی محەمد دیتنم. یەکەمیان قسەی کرد، دیار بوو میسر ترسی هەبوو لە ساڵی ١٩٦٥ ئیسرائیل زەبرێکی گەورەی لێ بدات. ڕای نواند کە تەنها پاڵپشتێکی میسر ئومێدی پێی هەبێت سپای عێراقە، عیراقیش کە سەرلەنوێ بە کوردانەوە خەریک بێت میسر بە تەواوی بێدۆست دەمێنێتەوە. پێم گوت وەزارەت چەند وەزیرێکی ناسرِیی تێدایە بۆچی نایان دوێنیت. چاوی فرمێسکی تێگەڕا و گوتی، چوومەتە لایان و پێم گوتوون ئێوە ئەگەر بۆ خاتری میسریش شەڕ لەگەڵ کورد دەکەن «علی شان خاطر مصر سیبوهم» واتە، لەبەر خاتری میسر وازیان لێ بهێنن.

میسرییەکان دەیانویست من لە لای خۆمەوە هەوڵێک بدەم بۆ هێمنی و ئاشتی. هەرچەند من چی لە دەستم هاتبێت کردبووم دیسانەوە بەردەوام بووم لەسەر هەوڵ و تەقەلا. لە پێشەوە «ملحق عسكري»ی میسرم دیت ئەویش پاتەوپات قسەکانی سکرتێری یەکەمی کردەوە. چوومە لای سەفەری میسر «امین هويدي»، ئەویان لە سنووری دیپلۆماسی خۆی دامەزراند بی ئەوەی «ئا» وەیا «نا» دەرببڕێ کە هیچ

لزووم نەبوو بەو خۆشێرکێیە لەگەڵ مندا کە پێشتر شناسایی و توویژی مەحرەمانەشمان هەبوو، بەڵام خامۆشبوون لە بارەی وەهادا دەلالەتی «ئا»ی هەیە... چوومە لای «صبحي عبدالحميد» وەزیری داخلیە، دادوبرۆی میسرییەکانم پێ گوت، ئەویش نەیدەزانی چ بڵێ. پێم گوت ئێوە ناسرین، فەرمانی سەر شانتانە لەسەر میسر بکەنەوە... گوتیشم، فڵانە کەس، چاک بزانن، هەلێکی کە ئێستا لە دەستاندایە و تێیدا گەیشتوونەتە وەزارەت ئەگەر بیدۆڕێنن جارێکی دیەکە بە خەونیش پێی ناگەنەوە... قسەمان زۆر بوون لە بیرمە بە دڵێکی خەفەتبارەوە گوتی، چ بەختێکی بەد بوو منی هێنایە ئەم وەزعە، بۆ خۆم لە جەیش حەسایەوە بووم چ ئەرکێکی زیادەم بەسەرەوە نەبوو... خولاسە لەم چارچێوەیە دەرنەچووین بۆ مەیدانێکی نەختێک هەناسەی تێدا هەڵبێت...

وەها ڕێک کەوت، دوای یەک دوو ڕۆژ سەفیری سۆڤییەتیم هاتە لا، سکرتێرێکی لەگەڵدا بوو قسەی تەرجەمە دەکرد لە نێوان ڕووسی و ئینگلیزیدا. من یەکسەر تەنگەتاویی میسرییەکانم باس کرد. سەفیر گوتی ئەگەر مانیع نەبێ قسەکانت بە «شۆرت هاند» دەنووسینەوە. من زۆرم پێ خۆش بوو. چی گوتم سکرتێرکە نووسیەوە، گوتم میسر هەستی خەتەرێکی کوشندە دەکات لە ئیسرائیلەوە بۆی بێت. هیچ دۆستێکی بەهێزیش لەم ڕۆژهەڵاتە شک نابات پشتی پێ ببەستێت عیراق نەبێت. خولاسە هەموو حیکایەتەکەم بۆ گێڕایەوە تا ئەوەی کە ئەگەر سپای عێراق بە کوردانەوە خەریک بێت ئەم دۆستەشی بۆی بەکەڵک نامێنێت. ئنجا لێرەدا ڕووی لاپەڕەیەکی مەسەلەکەم کردەوە کە پێوەندی هەبوو بە بەرژەوەندی ئەوانەوە گوتم، ئێوە لەو چەندین ساڵەی دواییدا بۆ میسرتان کردووە و کۆشیوە هەمووی دەچێتە هیچە ئەگەر جەمال عەبدولناسرِ تێبشکێت و لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەست بەتاڵ دەمێننەوە. لێمی پرسی ئێمە چ دەتوانین بکەین لەو ناوەدا. گوتم، دەتوانن لە ڕادیۆ و ڕۆژانمەکانتاندا بڵێن، ئەگەر شەڕ لە کوردستانی عێراق دەست پێ بکاتەوە ناتوانین «فدائي» کوردی ڕووسیا بگێڕینەوە لەوەی بەشداری بکەن لەو شەڕە. گوتی دەترسم ئەم قسەیە بە تەدەخول لە کاروباری ژوورەوەی عێراق بژمێردرێت. گوتم ئەگەر ترسی میسرییەکان بێتە جێ ئێوە ئیفلاس دەکەن، تازە چ جێی دوودڵی کردنە لە گومانی «تدخل»؟ لەمەدا مەسەلەیەکم بۆ هێنایەوە- دواتر کە بۆ چەکدارانم باس کردەوە بوو بە هۆی پێکەنینێکی خۆشکەڵە- گوتم دەڵێن

کابرایەک ویستی خۆی بکوژێت، هەر ئاوی زێ هەبوو خۆی تێدا بخنکێنێ پێی گەیاندە ئاوەکە خێرا کێشایەوە گوتی زۆر ساردە قۆڵنجی پێ دەکەم... ماوەی سەعاتێک و چل دەقیقە ئەم جۆرە قسانە نووسران.

دوای سێ ڕۆژ ئێوارەیەک چوومە داوەتی سەفارەتی یەکێک لە دەوڵەتەکانی عەرەبی باکووری ئەفەریقا - وابزانم توونس بوو. من گەیشتمە سالۆنی پێشوازی موستەشاری سەفارەتی ڕووس و چەند کەسێکی لە بەرپرسەکانی (پێشتر نەمدیتبوون) هاتنە دەورم و بە دڵ سپاسگوزارییان لەو وتوێژەی چەند ڕۆژ پێشتریان لێ کردم. گوتی هەموو قسەکان، بە ڕالێبوونی تێکڕای بەرپرسی سەفارەت، درایە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت بە تەئییدەوە... ئەم ڕووداوە، وەک بیستمەوە، یەک ئاکامی هەبوو، دوای مانگێک وەیا پتر وەفدێکی حکوومەتی ئەوسای عێراق چووە مۆسکۆ بۆ ڕێککەوتن لەسەر هەندێ لایەنی ئاڵووێری ئابووری کە یارمەتی دانی تێدا بێت بۆ عێراق، ڕووسەکان گوتبوویان پێویستە وتووێژ لەسەر وەزعی کوردیش بکرێت ئنجا باسی ئابووری بێتە پێش، عێراق نەیسەلماندبوو، وەفدەکەش گەڕایەوە بێ دەسکەوت.

دەبێ لێرەدا بەر لە بەسەرچوونی کژی لەباری قسە لێوە کردن، بڵێم، سەفیری ئێران «مهدی پیراستە» کە پێشتر هەر ناویم بیستبوو نەختێک بە درەنگەوە هاتە موبارەکبادی بوونم بە وەزیر. دوای چاکوچۆنی گوتی، ئەمین بم کە ڕێکۆردەر لە ژوورەکەت دانەندراوە؟ ئنجا گوتی، بە ئەنقەست خۆم وەخراندن لە موبارەکبادیت تاکوو کەس خەیاڵێکی بە دڵدا نەیەت لە هەبوونی نیازێکی تایبەتی لە هاتنم بۆ لات. گوتی، شاهنشاهـ منی بە سەفیر ناردووە کە مەعلوومە پایەم لە دەوڵەتی ئێران و لای شاهنشاهـ چۆن بووە و چۆنە هەر هەتا لە نزیکەوە پێوەندیم بە کوردەوە هەبێت چونکە ئاریامیهر متمانەی بە هەموو کەسێک نییە لە زاری ئەوەوە وەیا لە زاری حکوومەتی ئێرانەوە دەربارەی کورد بدوێت...

ئیتر لەم بوارەوە زۆر قسەی کرد، هەموو هەر بۆ دۆستایەتیی ئێران و کوردی دادەبڕی. منیش لە وەڵامدا چەندی توانیم قسەم بۆ ئەو لایەنە ئاژوا کە ئێران دەتوانێ دۆستی کورد بێت لە ڕێی دڵڕاگرتنی ملیۆنەها کوردی ئێرانەوە، لە سنووری ئیمکاندا باسی پەنابەرەکانی مەکتەبی سیاسیشم هێنایە ناو کە حەواندنەوەیان بە شێوەیەکی حورمەتکارانە شیرنی لە زاری کورد دەگێڕێت...

دکتۆر مەهدی پیراستە ناوی هەبوو، وەزارەتی داخلیەی ئێرانی درابوویێ کە دەزانین چ پایەیەکی گرنگە بە لای حکوومەتەکانی ڕۆژهەڵاتەوە. دەشێ من بە هەڵەدا چووبێتم، بەڵام ئەوەندەی ئەو پیاوە بۆ من دەرکەوت بایی پایە و شوورەتەکەی نەبوو. ئێرانییەکان تەوازوعەکی زۆر بەکاردەهێنن کەوا ڕەنگە نەختێک لە شەخسیەتی ڕاستینەیان بشارێتەوە لەگەڵ ئەمەشدا هی وەهایانم دیتووە هێندەی پیراستە نەدەچۆوە قەپێلک. ناوناوە سەردانی دەکردم و لە داوەتی ڕەسمیش پێیانەوە دیار بوو کە دەیانەوێ هەستی ڕەزامەندی بکەم.

مولحەق عەسکەریی ئێران کوڕێکی کورد بوو ناوی عیسا پیشمان بوو کوردییەکی ڕەوانی قسە دەکرد. ناوناوە وەکوو کوردێک نەک بە سیفەتی ڕەسمی دەهاتە لام لە ئۆتێل. لە قساندا دیار بوو شارەزای کوردستانی عێراقە و چۆتە سلێمانی و کۆیە و شاری دیکەی کوردیش، کەمێک خەڵکیشی دەناسی لەوانەی ناوێکیان هەبوو، لە هێندێکیشیان مێوان بووبوو. ئەم بایەخ دانەیان بە من هەر بەردەوام بوو تا دوای وەزارەتیشم. لە جێی خۆیدا بۆی دەگەڕێمەوە.

کێشەیەکی زل و زەبەلاحی بێئاکام هاتە پێش وەکوو هەورەکەی بەهاران بەگرمەگرم هات و بی باران ڕەت بوو ئەویش مەسەلەی «مجلس الشوری» بوو. ئەم مەجلیسە کەوا لەلایەن حکوومەتەوە ئەندامی بۆ دەستنیشان دەکرا دەبووە جێگر و بریتی بوو لە مەجلیسی نوێنەر کە لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێن. ژمارەی ئەندامانیم لە بیر نەماوە ئەوەندە نەبێ کە لە سەد کەس پتر بوو.

دوو سێ ڕۆژ بە ئێوارەوە مەجلیسی وەزیران و ئەفسەری گەورە و سەرەک ئەرکان و کاربەدەستی زلی دیکەش بە سەرپەرشتی کردنی سەرۆک کۆمار و ئامادەبوونی سەرەک وەزیران لە خانەی «المجلس الوطني» کە بنەی سەرەک وەزیران بوو کۆبوونەوەیان تێدا کرد. دووردرێژ وتووێژ کرا لە هەموو بابەت و لایەکەوە. بە زۆری عارف عەبدولڕەززاق قوماندەی هێزی ئاسمانی قسەکەری ڕەخنەگر بوو بە جۆرێک هەرگیز لێم چاوەڕوان نەدەکرد. گەلێک بیروڕای بنەڕەتی دەربڕی وەکوو دەمە چەقۆ دەیگەیاندە سەر ئێسک، زۆر بە سەیری هەندێک لە وەزیرە سویلەکان (ئەوانی زاپت نەبوون) پتر لە زاپتەکان مەترسییان نیشان دەدا لە پەیدابوونی دەمەتەقەی نێوان ئەندامانی شوورا کە بکێشێتەوە بۆ وروژاندنی خەڵقی کووچە و بازار و هەرای تێدا پەیدا بێت. لە ئاست ئەمەدا عارف عەبدولڕەززاق گوتی،

هەرگیزاو هەرگیز خەتەر لە کووچە و بازاڕەوە بۆ حکوومەت نایەت، خەتەر هەبێت لە جەیشەوە دێت. ناشێ پیاوی عەسکەری لە لایەکەوە قوماندانی فیرقە بێت و لە لایەکیشەوە لە «مەجلیسی سەوری» ئەندام بێت ئیتر هەر ڕۆژێک دنیای بە کەیفی خۆی نەهاتە پێش چاو، فیرقەکەی لێخوڕێت و ئیزاعە بگرێت و «بەیانی ژمارە یەک» بەسەر میللەتدا بخوێنێتەوە. عەسکەری دەبێ لە سەرەک وەزیرانەوە فەرمان وەرگرێت و بێ گرفت جێبەجێی بکات دەنا با بچێ لە ماڵ خۆی دابنیشێت.

گوترا لەوانەیە ئەو ئەندامانە هەموویان جێی متمانە نەبن کە دێن بۆ مەجلیسی شوورا. لێرەدا عارف قسەیەکی کرد لە دوو نوختەدا هەتا بڵێی کاریگەر بوو. گوتی، ئێمە بەپێی بڕیاری لێرە بە پێشەوە دەبێ دوای ماوەیەک کە قۆناغی «انتقالي» بەجێ دەهێڵین و هەڵبژاردنی نوێنەرانی میللەت بە ئازادی دەکەین، ئەوسا نوێنەری بە زەقەی چاوی هەمووتان دێت بە خۆی و بیروڕایەوە، ئنجا کە حاڵ وەها بێت لەو بارەدا دەبێ چی بڵێین؟ بۆ کوێ هەڵدێین؟ لە لایەکی دیکەشەوە حکوومەتێکی نەتوانێ لە نێوان چەندین ملیۆن کەسدا سەد ئادەمی بدۆزێتەوە متمانەیان پێ بکات عەیبە بە خۆی بڵێ حکوومەت، چاکتر ئەوەیە واز لە حوکم بهێنێت. لە ئاکامدا وەها پەسەند کرا کە یەک دوو کەس، لە نێوانیاندا وەزیری داخلیە، لیستەیەک ئامادە بکەن بە ناوی کەسانێکی بشێ ببنە ئەندامی شوورا، لە ڕۆژێکی داهاتوودا بخرێتە بەر چاوی ئەو ئەنجومەنەوە.

لەو ڕۆژانەدا خواردنی نیوەڕۆژە و هەندێ جار هی شەویشمان هەر لە جێگەی کۆبوونەوەمان ساز دەدرا. عەبدوڵا شەریف موتەعەهید بوو هەتا بڵێی خواردنی نایابی دەداینێ. لە جەمێکیاندا کە چووین بۆ سەر مێزی خواردن کورسییەک بۆ عەبدولسەلام داندرا، وەها ڕێککەوت بریانییەکی بەرخی وەکوو گوڵ سوورە بوویەوە لە بەردەمی ئەو بوو، خەڵقەکە بۆی نەدەچوون. ڕاستییەکەی پێم خەسار بوو حەزیشم لێی بوو. چوومە لای بریانییەکە و گوتم، «يظهر هذا القوزي في حمى رئيس الجمهورية لا أحد يمد أيده عليه...» عەبدولسەلام خۆی دەنگی بەرز کردەوە «عبدالله، عبدالله تعال قلش القوزي...» ئۆخەی سەد ئۆخەی، عێراقیش نەحەسێتەوە با هەر نەبێ تامەزرۆیی ئازارمان نەدا، بێ ئێوە ناخۆش زۆر بەلەزەت بوو.

دوای چەند ڕۆژێک کۆبووینەوە، لیستەی ئەندامانی شوورا ڕێکخرابوو، کە ناوەکان خوێندرانەوە دەبینم هەرچی کوردی سەربە حکوومەتە لە ناحەزانی کۆمەڵەی چەکدار کە لە دەی شوباتی ١٩٦٤ بەر لە چەند مانگێک بەیاننامەی ئاشتییان لەگەڵدا ئیمزا کراوە، ئا ئەو کەسانە بە ئەندام پالاوتە کراون. من پەرگیریم لە قسەمدا نەکرد ئەوەندەم گوت کە پەرژەوەند نابینم کەسی ئەو لایەنە بێت بۆ شوورا هەر نەبێ کوردی بێلایەن و ڕۆشنبیر هەن با ئەوان بێن. گوتیان ئەم پالاوتانە هەموویان لەوانەن ئەگەر هەڵبژاردنیش عەیارە بێت دەردەچن. گوتم لە لای دیکەش هی وەها زۆرن کە دەربچن کەچی ناویان نییە. تێبینییەکی ڕواڵەتی و هەستیارم دەربڕی بەوەدا کە گوتم، ئەو کەسانەی لە کوردان نامزەدن بستێک ڕێگە ناڕۆن ئەگەر مەفرەزەیەکی چەکداریان لەگەڵدا نەبێت، وەیا بە هەڵۆکۆپتەر نەبێ سەفەر ناکەن ئیتر دیمەنێکی زۆر سەیر دەبێ لە ڕۆژی کرانەوەی مەجلیسی شوورادا کە یەک موزاهەرەی موسەللەح لە دەستوپاوەندی ئەو ئەندامە بە شەقامی ڕەشیددا بەرەو کۆبوونەوەی مەجلیس بڕۆن. عەبدولسەلام گوتی چ قەیدی هەیە! سەرۆکی دەوڵەتەکانیش چەکداریان لەگەڵدا دەبن...!! بەڕاستی ئەمەیە مەتەڵی عەرەبی عێراق کە دەڵێ «تعال فهم حجي احمد اغا».

خوا ڕەحمی زۆر بوو، مەجلیسەکە لە بنەڕەتەوە بە لاوە نرا و دەردی سەری شوورا بەو ئەسپرینەی لەبیر خۆ بردنەوەیە چارەسەرکرا. تێناگەم دەوڵەتە زلە پێشکەوتووەکان بۆچی چاری گیروگرفت ناکەن بە ئەسپرینی ئەوتۆیی؟ تۆ سەیری چەند ئاسان و بێئەرکە!

کە گەیشتینە ئازاری ١٩٦٥ گومان لەوەدا نەما چی ئەوتۆ نەماوە شەڕ دەست پێ بکاتەوە. بە عارف عەبدولڕەززاقم گوت، بە تەمام سەفەرێکی سەرەوە بکەم وەک دوایین هەوڵ بۆ بە لاوەنانی شەڕ، بەڵێنم دەدەیتێ هەتا یەک حەفتە مۆڵەت بێت فڕۆکە بۆمباردمان نەکات؟ گوتی دوو حەفتە مۆڵەت بێت... گەڕامەوە کۆیێ، بۆ سبەینێ چوومە قەڵادزە چەند ڕۆژێک مامەوە لە هیچ لایەکەوە بایی کونی دەرزی ڕووناکایی دیار نەبوو. ڕاستییەکەی من خەریک بووم بزانم باری ڕاگوێستنی ماڵەکەم بۆ ناو شاخوداخ چۆناوچۆنی دەبێت.

بە هەمە حاڵ کە گەڕامەوە کۆیێ ڕێوبان وەها تەندرابوو تێپەڕینی ماڵی من لەوانە نەبوو چاو لێی بە سەهوو بچێت. سەری خوێنەر نایەشێنم هەموو ئازار و نیسان و

دوازده ڕۆژی مایسیشم لە کۆیێ بەسەر برد. لە حەفتەی یەکەمی مایس خەبەرم پێ گەیاندرا کە بروسکەیەکی حکوومەت هاتووە لیستەی گومانلێکراوانی بە ئیدارە و ئەمن گەیاندووە. یەکەم کەس منم، دوەم شێخ حسامی تاڵەبانی سێیەم و چوارەم دوو خوشکم... کە سرە گەیشتە ئافرەت مانەوەم لە کۆیێ بێکەڵک بوو، چەندی سەرمان هێنا و برد ئیمکان نەبوو ئافرەت و منداڵ بە پێیان بۆ ماوەی دوو سەعات ڕێگە بڕۆن بە شەوی تاریک هەتا دەگەنە وڵاغ و پێی بڕۆن بۆ ناو شاخوداخ. یەک ڕێگە هەبو کە بە ئۆتۆمۆبیل لە کۆیێ بەناوی سەفەری بەرەو بەغدا دەربچین، لەو لای دێگەڵەوە بە ڕێگەی دەربەندی گۆمەسپاندا بابدەینەوە بەرەو لای ڕانیە ئەوساش دەبوو ئەو ئۆتۆمۆبیلانەی ئێمە ڕادەگوێزن جارێکی دیکە ڕوونەکەنەوە مەڵبەندێک کە دەسەڵاتی میریی تێدا بێت پارەم نەبوو ئەو ئۆتۆمۆبیلانە بکرمەوە، ویژدانیشم لێی نەدەسەلماندم خەڵق لە پێناو بەرژەوەندی خۆمدا دووچاری سەغڵەتی بکەم. هیچ چار نەما غەیری ڕاگوێستن بۆ بەغدا، لە ١٣/٥/١٩٦٥ بەرەو بەغدا لە ڕێی کەرکووکەوە ڕۆییشتین. لە ١٤/٥ گەیشتینە بەغدا چەند ڕۆژێک لە ماڵی سەمەدی حاجی محەمەدی بەننا مێوان بووین هەتا خانوویەکمان لە «منصور» بە کرێ گرت. ژمارەمان ١٨ کەس بوو، خوا بەرەکەتی بهاوێتێ.

ڕۆژی ١٥/٥ چوومە لای فەریق تاهیر یەحیا، سەرەک وەزیران، هەر بە زمان و بێ هیچ «ڕەسمیات» ئیستیقالەم دا و گەڕامەوە ماڵەکەم. ئەو ڕۆژەی من کۆیەم بەجێهێشت، دوای دەرچوونم لە شار، حکوومەت پێوەر بوو بۆ گرتنی خەڵق. پێشتر یەک دوو جار بە دوا فیرار و مەشبووهدا شار تەفتیش کرا، هەر جارە لەلایەن ئامیر فەوجەوە چەند حەرەسێک لەبەر دەرگای ماڵەکەی من دادەندرا نەوەک گرووپی تەفتیش ماڵەکەم نەناسن و بە سەهوو بۆ بێن، هەر جارە هەندێ لەوانەی بەترس بوون لە خۆیان دەهاتنە ماڵەکەم هەتا تەفتیش بەسەر دەچوو. بۆردمان و تۆپ باران دەستی پێ کردبوو بەڵام لە لای ناوچەی ئێمە حەرەکات نەبوو.

لە بەغدا ماڵەکەم موراقەبەی بە سەرەوە نەبوو، تەلەفۆنی «حکومي» شیان بۆ دانابوو جگە لە هی شەخسی. هینەکەی حکومی کە هەرگیز بەکارم نەهێنا هەندێ ڕۆژ لە ئیشدا بوو واتە مومکین بوو بەکار بهێندرێت هەندێ ڕۆژیش لە ئیش دەوەستێندرا. وەها بزانم ئەم شلەپەیتەیەیان بە نیازی ئەوە بوو کە ئەگەر بمەوێ، بتوانم لە ئیستیقالەکەم بگەڕێمەوە بۆ وەزارەت، بە تەلەفۆنی حکوومەتی یەکسەر

لەگەڵ سەرۆک کۆمار وەیا سەرەک وەزیران ئەو پێوەندییە مومکین بوو. بە درەنگەوە هاتن و تەلەفۆنەکەیان هەڵگرت. سێ مانگ دوای ئیستیقالەکەم لە ڕۆژنامەی «الوقائع» مەرسوومی «أقالة»م بڵاوکرایەوە، ئنجا تەلەفۆنەکەش هەڵگیرا. بەڵام «أقالة»کە لە 15/5/1965 ەوە حیساب کرابوو نەکا مەعاشی ئەو چەند مانگەم بکەوێت، مەعاشی مارت و نیسان و نیوەی مایسیشیان بە درەنگەوە بۆ سەرف کردم.

نە فلسێک داهات نە فلسێک مەعاش نە هیچ کەسب و کار، بە کۆمەڵێک خێزان و میوانی بێئەژماریش یەک ساڵ و حەفت مانگی هەرە سەخت و سەغڵەتی ژیانم بردە سەر. لە ڕۆژی کە تەکلیفی وەزارەت کرام ئەم ڕۆژە ڕەشەم لەبەر چاو بوو، دەمزانی وەکوو ماسیی بێئاوم لێ دێت چونکە مومکین نەبوو چاو ببڕمە فلسێکی حەرام. لە لایەکی دیکەشەوە بێتەلی چەکداران زۆر بێئینسافانە شتێکی لە بارەی ئیستیقالەمەوە بڵاوکردەوە هەر لەگەڵ مندا کراوە. وابزانم لە ژێر سەرناوی «استقالة علی مراحل» شەکری شکاندبوو. بەرپرسێکی حیزب «یەدولا» هاتە لام، ئەو مەسەلەیەم لە ڕووی دا، زۆر بە سەیری گوتی ئێمە دەبێ وەها بڵێین چونکە نازانین خەڵق چیمان پێ دەڵێ... ئیستیقالەت بڵاو نەبۆتەوە هەرچەند دەشزانین ئیستیقالەت داوە، گوتم تۆ لەسەر قسەی خەڵق ڕانەوەستاوی بۆ هیچ شتێک کەچی لە ئاست مندا ڕاستیش بڵاوناکەیتەوە، حکوومەت ئیستیقالە بڵاو ناکاتەوە وا من ئامادەم ئێستا ئیستیقالەکەت بۆ دەنووسمەوە بەو تەئریخەی کە تێیدا ئیستیقالەم کردووە بینێرە لە بێرووت بڵاوی بکەوە بە هەر شێوازێک کە خۆت پەسەندی دەکەیت... ئەم حیکایەتانە هەتا لە ئەیلوولی 1965 «اقالة» کەم بە تەئریخی 15/5 بڵاو نەکرایەوە، هەر بنێشتۆکەی زاران بوو.

باوەڕم نییە شتی ئەوتۆیی لە کەس ڕووی دابێت، هۆیەکەش دەچێتەوە بۆ دڵسافیی خۆم کە هیچ پێچوپەنام نەبووە. پیاوی سیاسی زۆر خەندەقان بە دەوری خۆیەوە هەڵدەقەنێ کە ساچمەی ناحەزانی نەگاتێ... برادەری نیزیکم کە هاتووچۆی ماڵەکەمی دەکرد حیکایەتی تەلەفۆنی حکومی و بڕان و کرانەوەی بە خەڵقەکە ڕادەگەیاند بە تەعلیقاتی خۆیەوە کە گوتبووی، خۆی دەڵێ ئیستیقالەم داوە تەلەفۆنی ڕەسمیشی هەر لە جێی خۆیەتی. لە وتووێژدا برادەرێکی دیکەم دواندمی تا گەیشتینە ئەوەی کە گوتم، فڵانە برادەرم قسەی وەها و وەها لە بارەی منەوە بە

خەڵق ڕادەگەیەنێ. گوتی کە ئاگاداری ئەو حاڵەتەیت بۆچی وەکوو جاران لەگەڵیدا ڕادەبوێریت؟ گوتم، کابرا حەز دەکا بە جۆرێک لە جۆران سەنگێک بۆ خۆی بدات، خۆ دەستی ناگاتە کەسی ئەوتۆ خۆی پێ هەڵبداتەوە من نەبم، کە منیش دەسەڵاتم نەبێ چاکەی پێ بگەیەنم هەر نەبێ ئەو هەلەی بدەمێ بە باسی منەوە خودنمایی لای خەڵق بکا و نەختێک نەفسی بحەسێتەوە.

سەفارەتی ئێرانی لە ڕێی «عیسا پیشمان»ـەوە پێوەندیی ئەحوال پرسیی پێوەم نەبڕایەوە، ناوناوە سبەینەی زوو سەری لێ دەدام. لە وتووێژدا باسی ئەم کۆمەڵەی «مەکتەبی سیاسی»ی کرد کە لە ئێران پەنابەرن ئەوانیشی لەسەر حەق دەزانی بەرانبەر هێزی چەکداری کورد. هێشتا عەبدولسەلام بەرحەیات بوو پیشمان لە زاری «مەهدی پیراستە»وە پێمی ڕاگەیاند کە حکوومەتی شاهنشاهـ ئامادەیە بە مێوانت قبووڵ بکا لە ڕوتبەی وەزیر، هەر کاتێک ویستت بچیت بۆ تاران بە خۆت و ماڵەوە، هەموو شتێک بە دروستی بۆتان سازدراوە. ئەمەی گوت بە سەراحەتیش گوتی کە سەفیر و هەمووشمان دەزانین باری ئابووریت لە بەغدا زۆر لاسەنگە. مۆڵەتم خواست بۆ چەند ڕۆژێک هەتا دەتوانم وەڵام بدەمەوە.

پرسم بە بابەعەلی شێخ مەحموود کرد. گوتی فڵان، بە خراپی نازانم بچیت. ئەمانە ئەگەر بێحورمەتییەکیان لە نەزەردا بایە تەکلیفی یارمەتییان دەکردی کە لێرە بتدەنێ، زۆریشیان کردووە لەگەڵ خەڵق. باوەڕم هەیە لە چوون پەشیمان نەبێتەوە، بەغداش بۆ تۆ لەم وەزعەدا زۆر بە ئەرکە... ڕاستییەکەی من بڕیاری خۆم لەگەڵ خۆمم دابوو کە چی دەکەم و چی دەڵێم بەڵام ویستم بزانم ئایا چوونم بۆ دەرەوە بە هیچ جۆرێک عەیبی لێ دەگیرێ؟ کە عیسا هاتەوە لام پێم گوت من بە مەرجێک دێم ئەویش ڕێم بدەن بە ڕەهایی هەوڵ بدەم بۆ ئاشت کردنەوەی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ کوردی چەکداری دیوی عێراق. تێم گەیاند کە من مەبەستی شەخسیم لە هیچ شتێکدا نییە. دەمەوێ کورد بحەسێتەوە، هەتا دووبەرەکیش بەردەوام بێت حەسانەوە مومکین نییە. ئەمەم لەگەڵ عیسادا گوت، لە قووڵایی حیساباتیشمەوە بۆ ئەوە دەچووم کەوا کاتێک حکوومەت با بداتەوە بۆ ئاشتبوونەوە ئەوساش ئەگەر مەکتەبی سیاسی لە دەست ئێراندا بێت حەسانەوە وەزەحمەت دەکەوێ.

عیسا دوای چەند ڕۆژێک هاتەوە لام گوتی دکتۆر پیراستە دەڵێ بۆ قبووڵ کردنی ئەو مەرجە موافەقەی تاران پێویستە. ڕەنگە دوو حەفتەیەکی بوێت هەتا لەوێوە

وەڵام دێتەوە. کارتێکی داوەتیشی بۆ هێنام کە بچم بۆ ئاهەنگی دوعا خوازیی خۆی لە دۆستانی عێراقی بە بۆنەی بەسەرچوونی خزمەتی وەک «ملحق عسكري». داوەتەکەش لە سەفارەتخانە بەرپا دەبوو. ڕاستییەکەی حەزم نەکرد نەقڵ بێت چونکە باوەڕم هەبوو کە وەکوو کوردێک تێدەفکرێت. گوتم ئەی چۆناوچۆنی خەبەرم پێ دەگات؟ گوتی، بەردەستێکی خۆم، کە ئەویش کوردە، دەبێتە جێنشینم تا ملحق خۆی دێت ئەو بەردەستەم وەکوو خۆم هاتوچۆت دەکات و چی لە منی ڕادەپەڕموویت ئەوەیش وەهایە ناویشی «منصور»ە.

شەوی داوەتەکە لە میعاددا چووم، زۆریان بەخێر هێنام. عیسا وازی لە ئیستیقبالات هێنا، لەگەڵم خەریک بوو، کۆمەڵێک تازەمێوانی تارانی هێنان شناسایی پێ کردین و بە زیادەوە باسی فارسی زانیمی کرد، سێ بەشی زیاد بوو. بەو خەڵقەم گوت هەر ئەوەندەی لێ دەزانم کە ناشارەزاییم بە فارسی ئاشکرا بێت. من عیسام نەدیتەوە. لە یاداشتێکی دەستنووسی «عەزیز یامولکی»م خوێندەوە کە کاتێک لە شەستەکان چۆتە تاران و بەینێک بە گرتوویی ماوەتەوە تێگەیشتووە کە فەرماندەیەکی گەورەی ساڤاک خەریکی بووە قسەی لێ وەربگرێت دژی عیسا پیشمان بە نیازی تێوە گلاندنی عیسا بۆ هەندێ نیازی گڵاوی خۆی، بەڵام عەقید عەزیز هیچی نەدرکاندووە دژی عیسا… بیستم لە ئەسپ کەوتووە و بەینێک خەستەخانەنشین بووە، دواتر نازانم چی لێهاتووە.

حکوومەتی عەبدولسەلام عارف بایی توانای خۆی تێکۆشا بۆ هاندانی خەڵق بەرەو لای خۆیەوە بەتایبەتی کوردی خاوەن نفووز تا ئەوەی کۆبوونەوەیەکی گشتیی زۆر فرەوانی لە پیاوە ئایینییەکان پێک هێنا لە زستانی نێوان ١٩٦٥ و ١٩٦٦. من لە ماڵەوە گوێم گرتە گوتەی خەتیبەکان. ماڵم حەقە یەکێکیان شتێکی لە دوو لێو دەرنەچوو عەبدولسەلام کەیفی پێ بێت. دەڵێن خوالێخۆشبووی مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی لە دەمی سڵاو لێکردندا بە عەبدولسەلامی گوتبوو، هەر دڵۆپە خوێنێکی بڕژێت تۆی تێدا بەرپرسیاریت.

بێ ئەوەی ناو بهێنم دوو نموونەی مامڵەت کردنم لەگەڵ کاروباری ئەم دنیایە بێسەروپێیە بۆ خوێنەری دەور دەکەمەوە کە دەچنەوە بۆ دەمی دوای دەرچوونم لە وەزارەت. خەڵقێکی زۆر لە خێرەومەندی ناو چەکدارەکان و لە کوردی بەغدا و غەیری بەغداش هەتا بڵێی ناحەزیی خۆیانیان دژی من و بوونم بە وەزیر دەردەبڕی

- خۆ منیش دژی وەزارەتەکەم بووم. لە ناویاندا یەکێکی دۆست و مەیلەو خزم هەبوو کە بە ئەسڵ لەسەر قۆناغی پێش تەمووز و پێش یازدەی ئەیلوولی ١٩٦١ حیساب دەکرا. ڕۆژێکیان منی گەیاندەوە ماڵەکەم لە «منصور» کەوتینە قسەی ڕازونیاز و ڕەخنە و گلەیی. بە هەلم زانی پێم گوت، من دوو جاران بە هانات هاتووم لە دوای شۆڕشی تەمووز، ئەمەش شتێکە دۆستایەتی و تێڕادیتن داخوازی دەکا لە مرۆ... تۆ هاتیت وەکوو ئەوانەی بە تەمای پایە و پلەی سیاسی بوون لە پاشەملە زەبری خۆت وەشاند، ئەمەش شتێکە لە مێژوو ڕوویداوە بە زۆریش ڕوویداوە کە هی لە تۆ مەزنتر، دوای بەڵێنی ئەمانەت، زەبری لە پیاوی لە من گەورەتری داوە. ئەوەی گلەیی من لە ئاست تۆدا بەخەبەر دەهێنێ مەسەلەی وەفا و خزمایەتی و برادەری نییە، شتێکی دیکەیە بەندە بە خۆتەوە، تۆ دەبوو لەوە زیرەکتر بیت کە نەزانیت جارێ نۆرەی تۆ نەهاتووە ببیتە وەزیر، لادانی من سوودی تۆی تێدا نەبوو... برادەرەکەم نەختێک لە پشت سوکانی سەیارەکەیەوە ڕاما و گوتی، تۆ هەر لە لایەکەوە سەیری دونیا دەکەیت. گوتم لایەک و دوو لا مەبەست نییە، دام نا من سافیلکەم، دیسانەوە مانی من زەرەری تۆی نەبوو لادانیشم بۆ تۆ بە قازانج نەدەگەڕا...

مامڵەتی دوەمم هەر لەم بابەتەیە، پاشتر مەودای بۆ پەیدا بوو. لە دەمی پشووی ئاشتییە کورتیلە و درێژەکاندا کە لەلایەن چەکدارانەوە کەسانیک دەهاتن بۆ بەغدا من بە یەکێک لەوانەوە خەریک دەبووم کە ببینم و داوەتی بکەم. ئەو کەسە لە کۆنەدۆستەکان و بنەماڵەشی لە قەدیمەوە دۆستمان بوو. دوای دوو سێ جار لەو پێوە خەریکبوونەم سەمەدی حاجی محەمەد پێی گوتم، تۆ هێندە خەریکی ئەو کەسەی کەچی ئەو لە ئاست تۆدا، پاشەملە، وەها پیاو نییە. گوتم بێ ئاگا نیم، بەڵام هێندێک پێوەندی هەیە لە ژیانماندا هی ئەوە نین چاویان پێدا بگێڕینەوە، هەتا ئەو تەرزە کەسە لە خۆوە پێوەندییەکە هەڵنەبڕێتەوە من نایپسێنم...

بگەڕێمەوە بۆ ڕەچەی گەشتەکەم. ئەو مەنسوورەی باسم کرد، دوای دوو هەفتە سبەینەیەکیان هاتە لام لە بارەی چوونم بۆ تاران گوتی، وەڵام هاتۆتەوە دەڵێ زۆرمان پێ خۆشە بەخێری بهێنین بە دەرەجەی وەزیر بەڵام دەرفەتێک نابینین بۆ ئەو هەوڵەی بە مەرجی دانابوو بۆ هاتنی. دوای ئەو وەڵامە جارێکی دیکە باسی چوونە تاران نەهاتە پێش بەڵام لە کاتی موناسەبەی ڕەسمیدا کە بانگهێشتن دەکرام

تێیان دەگەیاندم کە لەبیر نەکراوم ئەویش لە ڕێی زێدە خەریکبوونی هەندێ لە کاربەدەستانیان پێمەوە. ئەوسا داوەتی سەفارەتی ئێران خەڵقێکی زۆری لێ کۆدەبۆوە. جارێکیان یەکێک لە بانگکراوەکان، وابزانم کریم مراد خاوەنی کتێبخانەی مەکەنزی بوو، لە دەوری مێزی نان خواردن بووین گوتی، سەیری ئەوبەری مێزەکە بکە، کابرایەکی سەر زلەی بە خۆوە خەریکە بە چالاکی نان دەخوا، ئا ئەمە «شعبان بی مخ»ـە کە «حسین فاطمي»ی وەزیری دەورانی دکتۆر «موسەددەق»ی کوشت.

لەو کاتانەدا کە بە هۆی وەزارەتەوە و دواتر کە ماڵم گوێستەوە بۆ بەغدا ژیانم کەوتە غەریبی و کەوتە بارێک پتر لە عادەت خەڵق بناسم و بشناسرێم لەگەڵ بەشێکی زۆری سەفیری دەوڵەتەکان مەرحەبای گەرموگوڕم بۆ پەیدا بوو بەڵام من لە لای خۆمەوە هەنگاوی زیادم بۆ ئەو دۆستایەتیانە هەڵنەدەهێنا. لە نێوانیاندا سەفیری هیند، سەعادەت عەلی خان و سەفیری سوید کە ناویم لە بیر نەماوە و سەفیری ڕووس د. نیکۆلایێڤ پتر لە هەموان گەرموگوڕ بوون. هەرچی سەفیری ئەمەریکایی بوو لە کولانەی سیاسەتەوە لێم نزیک دەبۆوە.

سەعادەت عەلی خان مسڵمان بوو، بنەماڵەکەی لە وڵاتی خۆی ناودار بوو. خێزانەکەی کە ئەویش لە بنەماڵەیەکی گەورەی مسڵمانی سەرووی هیند بوو، خاتوونێک بوو بەڕاستی شاژن. ڕێکەوت وەها بوو سەفەری کەرکووکم کردبوو، لە کتێبێکی تورکی «قاموس الاعلام» لای شێخ ڕەئووفی خانەقادا خوێندبوومەوە، شاعیرێکی گەورەی سەدەی نۆزدەیەمی مسڵمانی هیند باپیری ئەو ئافرەتە دەرچوو. چەند نموونەیەک لە شیعرە فارسییەکانیم هاتبوونە بەر، کە گەڕامەوە بەغدا داوەتی ئاهەنگی یەکەم ڕۆژی حەفتەی فیلمی هیندی کرابووم، کە چووم بۆ ئاهەنگەکە سەعادەتخان بردمیە لۆجی تایبەت بە خۆی و خێزانەکەی. لەگەڵ موبارەکبادی ئاهەنگەکە خەبەری ئەو شاعیرە مەزنە و وێنە شیعرکانیشم کردە دیاری بۆ خۆی و بۆ خێزانەکەی. ئەم ڕێکەوتە یەکجار خۆش بوو بۆ ئەوان و بۆ منیش. سەعادەت خان نەقڵی فرەنسە بوو، زۆری نەبرد بیستم مردووە، بەداخەوە.

سەفیری سوید70 جگە لە داوەتی ڕەسمی ناوناوە بۆ ماڵەکەی خۆیشی داوەتی دەکردم و لە زۆر شتی ئەم جیهانی دیپلۆماسییەی دەگەیاندم، تەنانەت گوتی، هەرچی دەستوپاوەندی ئەم سەفارەتە و زوربەی سەفارەتەکانی ڕۆژاوا هەن پیاوی سەفارەتی ئەمەریکان، ئەوانیش مزەیان دەدەن. سەقافەتی ئینگلیزی بوو، لە وتوویژدا وەها دەبوو کە من وشەیەکی نالەبارم بەکار دەهێنا، بی ئەوەی بمشکێنێتەوە، قسەکەمی دووپات دەکردەوە بە وشەی ڕێکوپێک. جارێکیان من handicap م بەکارهێنا ئەو قسەکەمی گوتەوە بە misadvantage، لە جیاتی off his head ئەو mentally sick ی گوت...

د. نیکۆلایێڤ مرۆیەکی خۆشخوڵق بوو هەموو دەم گرژینەوەیەکی بەسەر ڕووانەوە بوو تا ئەوەی سەفیری چێکۆسلۆڤاکیا، لە داوەتێک بووین کە د. نیکۆلایێڤ لە دەرگاوە هاتە ژوور گوتی، وا smiling ambassador هات. واتە ئەوە سەفیری لێو بەخەندە هات... دوای ئەو بە دەقیقەیەک سەفیری کوێت هات، ئەمجارە ئەمن گوتم I smell money واتە بینی پارە دەکەم...

شەوێکیان لە داوەتی سەفارەتی چێکۆسلۆڤاکیا بووین د. نیکۆلایێڤ جودای کردمەوە گوتی، دەوێریت داوەتم قبووڵ بکەیت لە ماڵەکەم بە وتوویژ لە بارەی کوردەوە؟ گوتم، بۆ کورد هەتا جەهەنەم بە دواتدا دێم، نەشمگوت بەهەشت چونکە باوەڕت

---

70- لە ئاڵقەیەکی گەشتەکەمدا گوتبووم ناوی سەفیری سویدیم لە بیر نەماوە، زۆری نەبرد پەرۆشدارێکی مەرد کە بەداخەوە ناوی ئەویشم لەبیر نەماوە، لە سویدەوە نامەی بۆ هەناردم تێیدا نووسیبوو کە لە ڕێی وەزارەتی خارجییەی سویدەوە ناو و ئەدرەسی ئەو سەفیرەی وەرگرتووە وا بۆمی دەنێرێت تا لە دواڕۆژدا کەلێنی پی بگرم. کە هاتمە سەر پێدا چوونەوەی گەشتەکەم چەندێکی بەدوا ئەو کاغەزەدا گەڕام نەمدۆزییەوە زۆر شتی کە لزومم پێییان نەبوو، هێندێکیان گرنگیش بوون، هاتنە بەرچاوم بەڵام ئەو نامەیە دەرنەکەوت. لەبیرم نەماوە ئایە نامەم بۆ ئەو مێرخاسە لە بری سپاسگوزاری ناردووە یان نا، لێرەدا عوزرخوازی لێ دەکەم کە حاڵی تەرتیباتی «نووسیمەنیم» بێ تاموشامە، عەرەبی عیراق گوتەیەکی هەیە دەڵێ: «لحية الپاشا في بيتنا مكناسة» واتە لە ماڵی ئێمە ڕیشی پاشا گەسکە، ژوورەکەی منیش لەو بابەتەیە.

پێی نییە... دوو مانگێکی پێ چوو ئنجا داوەتی کردم ئیتر نازانم ئەو وەخرانە هی ئەوە بوو هەتا پرسی بە خارجیەی خۆیان کرد و ئیزنی وەرگرت یاخود پێشتر ئەو ئیزنەی هەبوو بۆیە توانی ئەو پێشنیازە بکات...! خوێنەر مرخی خۆی لە تەعاماتی زەمانی قەیسەر خۆش نەکات، ئەشەدوبیللا لە کاڤیار و ڕۆنەکەرە و سەموون بەو لاوە هیچی دیکە نەهاتە بەردەممان. بەڵام قسەکانمان خۆش بوون هەرچەند بە دەگمەن نەبێ باسی سیاسەتی تێدا نەکرا. د. نیکۆلایێڤ لە سەرەتای دانیشتنمان دەهات و دەچوو بۆ لای ژوورەوە و دەهاتەوە بی ئەوەی خزمەتچی لەو ناوەدا دەرکەوێت گوتی، چونکە من سەفیری دەوڵەتێکی پرۆلیتاریم بۆیە خۆم بە خزمەتەوە خەریکم لە جیاتی خزمەتچی. گوتم، جەنابی سەفیر من بە دڵ لەگەڵ پرۆلیتاریام بەڵام ئیشتیهام بۆرجوازیانەیە... د.نیکۆلایێڤ کە گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ چەند ساڵێکی بەسەردا تێپەڕی خەبەری مەرگیمان پێگەیشت.

جارێکیان لە موناسەبەی بەسەرچوونی خزمەتی سەفیری تورکیا، سەفیری ئەمەریکا داوەتێکی کرد بە هەمووی سی کەسێک بۆی بانگهێشتن کرابوون لە مانە تەنها پێنج عێراقی هەبوون هەر منیش تێیاندا کورد بووم. پێ دەچوو سەفیری تورکیا خۆی ئەو ناوانەی هەڵبژاردبێت. کژەکە زستانی نێوان ١٩٦٦ و ١٩٦٧ بوو، من و سەفیری ئەمەریکا و سەفیری سۆڤیەت بەیەکەوە ڕاوەستابووین، هەردووکیان پرسییان، ئایە مومکین نییە کورد و حکوومەت ڕێک بکەون؟ گوتم، ڕێککەوتنەکە مومکینە بەڵام ئێمەی خۆرهەڵاتی خۆمان «مستحیل»ین مومکینیش کە بەند بوو بە نامومکینەوە دەبێتەوە نامومکین لەگەڵ ئەمەشدا من دوو کەس دەناسم لە دەستیان دێت شەڕەکە بگێڕن بە ئاشتی. گوتیان کام دوو کەس؟ گوتم، تۆ و تۆ! دەستم بۆ هەردووکیان درێژ کرد. ئەو دیپلۆماسییانەش، براینە، وەکوو ئێمە ئادەمزادن حەز بە نوکتە دەکەن.

ڕۆژانی ساڵی ١٩٦٥ تێدەپەڕێ و من بە دەست گوزەرانەوە سەغڵەتتر دەبووم، کەسیش ئاگای لە دەردی کەس نییە لە خۆم بەولاوە کە بەپێی خۆ بەرپرس زانین دەچمە ژێر ئەرکی ئەوانەی بە دەورمەوەن وەیا چاویان لە دەست و قامە بزانن چیان بۆ دەکەم. لە نموونەدا دەڵێم، هاوینی ١٩٦٤ کە لە هاوینەهەواری پیرمەم کۆبوونەوەیەکی سەربە مەعاریفی کورد گیرا و مامۆستایانی کارگێڕ و هی خاوەن ڕا لەگەڵ موتەسەڕیفەکانی ئەو لیوایانەی کوردنشین بوون تێیدا بەشدار بوون. لەو

دەمەدا هەنگاوم هەڵێنا بۆ پێپیلکەی ئەو خانووەی تێیدا کۆدەبووینەوە، ئافرەتێکی ڕەشپۆشی خۆڵبەسەر ئامێزی لێ دام و دەستی کرد بە گریان. دەرچوو دایکی ئەو موەززیعەی پۆستەی کۆیەیە کە لە بۆمباردمانی سبەینی یازدەی ئەیلوولی ١٩٦١ لە ڕێی تەقتەق خۆی و یەک دوو خەیاتی سلێمانی کوژران... لەو دەمەوە دەرگەی حکوومەت و کوردیش لێ دەدات بۆ ناگزووریی و بێنانییەکی لە پاش کوژرانی کوڕەکەی دووچاری خۆی و خێزانەکەشی بووە بێ ئەوەی بگاتە کەرتەنانیک... ڕەنگە لەم جیهانەی کوردەواریدا کەسی لە من بیگوناهتر نەبووبێ لەو کارەساتەی بەسەر کوڕی ئەو و غەیری ئەویشدا هات، چونکە هەتا توانیم و نەشمتوانی ویستم نەقەومێ. ئەو کوڕەم خۆشدەویست، مەحرەمانەش ناوناوە هاتووچۆی ماڵەکەمی دەکرد لە کۆیێ و حەزیشی دەکرد لە دەرفەتدا بمبینێ. لەو دەمەدا بۆ چارەی دەردی ئەو ئافرەتە و خێزانی کوڕەکەی هەر ئەوەندەم پێ کرا چی بە دوای دەستمدا هات لە پارەی گیرفانم بیخەمە دەستییەوە...

لە نموونەی دوەمدا دەڵێم، سێ مەلای کورد هاتبوونە موراجەعەتی وەزارەتی ئەوقاف کە وەزیرەکەی کورد بوو، بە نائومێدی و بی لێپرسینەوەش وەدەرنرابوون... هاتنە لام لە ئۆتێلەکەی تروکادیرۆ، کە ئەوسا لە وەزارەتدا بووم گوتیان وەزعمان زۆر سەغڵەتە نە ئەوقاف هیچی بۆ کردووین نە پارەشمان ماوە پێی بژین وەیا پێی بگەڕێینەوە بۆ ماڵەکەمان... من لەگەڵ ئەوقاف هیچم پێ نەدەکرا، چی لە دەستم هات بۆ گەڕانەوەیەکی موحتەرەمانەی بەرەو ماڵیان وەهام کرد...

نموونەی دیکە زۆرن بەڵام یەکێکیان تامێکی مزری لێ دێت... لە وەزارەت بووم برایەکی کوردی بەری بادینان هاتە لام ئیشەکەی کە بریتی بوو لەوەی بگەڕێتەوە سەر کاری جارانی گرێ پچکەی کەوتبوویێ زۆری هاتووچۆ پێ کردبوو. گوتی نانم نەما منداڵم برسین دەستم بە هیچ بنچکێک ڕانەگەیشت ئەگەر چارم نەکەیت ئیزنت بەسەرەوەیە دەست بکەم بە بێناموسی؟ چەندێکی دڵم بۆی سووتا هێندەش بە پرسیارەکە ناڕاحەت بوو، پێم گوت، ئەم پرسیارە ڕوو لە من ناکات چونکە من هۆی فەسڵ بوونت نیم، دەبێ پرسیارەکە لە مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی بکرێت. من بەرپرسی شتێکم کە بتوانم بیکەم وەیا شکستی دەستی من بێت. بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتی زۆر زەروور دە هەزار دینار تەرخان کرابوو بەڵام ئەو

کابرایە نە دەچوە قاڵبێکی قانوونەوە کە لە ژێر عینوانێکدا کارێکی پێ بسپێردرێت. هەر ئەوەم پێ کرا کە لە باخەڵە نیوە بەتاڵەکەمدا چی هەیە بۆ ئەو بێت...

لەو حاڵەتەی زێدە سەغڵەتیەی بێئیشی و بێدەرامەدی پاش وەزارەتمدا قسەم بیستەوە لە زاری کۆنەدۆستێک و هاوڕێی حوقووقمەوە گوتبووی نازانم فلانەکەس، لەم بەغدای وەها بەمەسرەف، پارە لە کوێ دێنێت بۆ گوزەرانی بەو هەموو قەڵەباڵغییەی کە لەگەڵیدا هاتوون؟ دەبێ لەو شازدە هەزار دینارەی کە بە ناوی «تعویضات» وەریگرتووە مەسرەف بکات!! گوتم هەرچەند بە عادەت یەکێک کە بوو بە وەزیر لەوە بەو لاوە گوزەرانی جێی پرسیار نامێنێت بەڵام بەڕێکەوت لە حاڵەتی مندا پرسیارەکە جێی خۆیەتی چونکە بەڕاستی دەبێ بزاندرێت من بە چی دەژیم. نە مەعاش نە هیچ دەرامەد نە هیچ کەسب و کار دیار نییە پێی بژیم. ئەوەی دەیژیاندم تەنها قەرزبوو بەس. لە ماوەی یەک ساڵ و حەفت مانگدا چی خوا دابووی تەڕ و وشک هەمووی خورا، چەند هەزار دینارێکیش قەرزدارییی هاتە سەر. ئا ئەمە بوو ژیانم.

ئەو «شازدە هەزار» دینارەی «تعویضات» یش شازدە هەزار نەبوو هەزار و پێنجسەد بوو هەر لە دەمی وەزارەتم بەگەڵ مەعاش و دەرامەدێکی هەبوو کەوت و خورا و بڕایەوە. من نەمویرا لە کاتی وەزارەتدا ماڵەکەم ڕاگوێزم بۆ بەغدا لە ترسی مەسرەفی زیاد. لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٥ کە چەند مانگێک بوو کەوتبوومە بەغدا کاک ئەمجەدی ئامۆزام خانوویەکی سازدابوو لە ئەرزی حکوومەتی سەربە جەمعیەی خانوو دروست کردن لە هەولێر، خانووەکەی فرۆشت و پارەکەی بۆ من هێنا... ئا بە شتی وەها دەژیام.

وەزارەتی تاهیر یەحیا لە پڕ کەوت، تاهیر یەحیا لە حکوومەتی عەبدولسەلامدا وەک عەبدولسەلام حیساب دەکرا لەلایەن دامەزراوییەوە، دیار بوو عەبدولسەلام لە بنەوە خەریکی کنە لێکردنی بوو هەتا ئەوەی لادا و عارف عەبدولڕەززاق بوو بە سەرەک وەزیران. ماشەڵا چەند کەمی پێ چوو لەو دەمەڕا کە لە ژووری قائد فرقەی دوو پێم گوت نەکەی بسەلمێنیت ببیتە سەرەک وەزیران تا ئەو دەمەی بوویێ!

## ئاڵقەی شازدەیەم

چەند ڕۆژێکی پێک هاتنی وەزارەت دکتۆر ئەکرەم جاف کە بووبوو بە وەزیری زەراعەت داوەتێکی شەوی ڕێکخست لە ماڵەکەی، لە کوردان فوئاد عارف و محەمەد سەعید خەفاف و من بانگهێشتن کرابووین، ناشزانم کەسی دیکەی کورد لەگەڵمان بووبێت، چەند وەزیرێکیش هاتنە داوەتەکە لە نێوانیاندا «عزيز عقيلي» وەزیری دیفاع هەبوو، ئەوانی دیکەم لەبیر نەماون. مەبەست نزیک خستنەوەی کورد و حکوومەت بوو لە ڕێی یەکتر دیتن و توویژەوە. هەوڵەکە بێسوود نەبوو ئەگەر داوەتی دیکە و یەکتر دیتنی دیکەی بە دوادا هاتبایە بەڵام هەر لەوەندە وەستا. لە نوختەیەکی سەربە ناکۆکیی نێوان عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف، بەتایبەتی هی دەمی دەمانچە هەڵکێشانی عەبدولسەلام لە ژوورەکەی عەبدولکەریم و بە حزووری فوئاد عارف نەگونجانێک هەبوو لە نێوان ڕاوێژی فوئاد و قسەکانی عەزیز عوقەیلی. نەگونجانەکە وەکوو خۆی مایەوە بەڵام دانیشتنەکەی پێ تێک نەچوو.

عەبدولسەلام لە «دار البيضاء» وەیا «رباط» وەیا شوێنێکی دیکەی ئەفەریقای عەرەب بوو لە کۆبونەوەی تۆقەڵەکاندا کە عارف عەبدولڕەززاق ویستی ئینقیلاب بکات. بەڵام تێیدا سەرنەکەوت... عەبدولسەلام گەڕایەوە د. عەبدولڕەحمان بەززاز کە جێگیری سەرەک وەزیران بوو لە وەزارەتەکە ئەمجارە بوو بە سەرەک وەزیران.

بەیانی چووم بۆ پیرۆزبایی لێکردن. سالۆنەکەی بەردەمی ژووری خۆی خەڵقێکی زۆری لێ بوون هاتبوونە موبارەکبادی. من جێگەم کەوتە بەرانبەر خۆی لەو بەری سالۆنەکە. وەها ڕێککەوت د. بەززاز بۆ یەک دوو دەقیقە سالۆنەکەی جێهێشت، لەو بەینەدا عەلیاغا و هاواری مشیراغای دزەیی هاتنە سالۆنەکە، کە د. بەززاز گەڕایەوە، ئەو دوو کوردەی دیت زۆری بەخێرهێنان و ئەحواڵی پرسین لە وەڵامدا سپاسیان کرد و گوتیان ئەحواڵمان باشە. من لەبەر خۆمەوە بە دەنگ هاتم گوتم، ئەو برایانە هاتوونەتە پیرۆزبایی تۆ نایانەوێ سەغڵەتیی خۆیان تێکەڵ بە موجامەلە بکەن دەنا کەسی لەوان تەنگەتاوتر پەیدا نابێ، چەند ساڵە دەربەدەرن، ئاواییەکانی خۆیانیان لە دەشتی دزەیی بەجێ هێشتووە، هاتوونەتە هەولێر نە یەک فلس داهاتیان هەیە نە

هیچ ئیشێک هەیە بیکەن. کە وەهام گوت، لە وەڵامدا گوتی با بەچاکی بتناسمەوە تۆ فڵانەکەس نیت؟ گوتم هەوم. هەندێکی موجامەلەی کردم، کە لە دەمی نیابەتمدا لە شوێنی گوێگران بووە و دیتوومی قسە دەکەم… ئنجا گوتی، بەری لای تۆ بەتاڵایی تێدا نییە من بێمە لات، زەحمەت نەبێ تۆ وەرە لام جێگە لە تەنیشتمەوە هەیە… پەڕیمەوە ئەو گوتی، من کەموزۆر لە وەزعی ئەم برایانە و عەشرەتەکەیان ئاگادار نیم. گوتم ئەم ڕاستییە یارمەتیت دەدات کەوا چی بە چاکی بزانیت بۆیان ئەوە بکەیت، چونکە لێرە بە پێشەوە پابەندی قسە وەیا هەڵوەستێک نەبوویت لە کێشەی ئەواندا دەستت ببەستێت. گوتی دەبینیت ڕۆژەکەم دەرفەتم نادات لەگەڵت بدوێم سبەینێ سەعات هەشتی بەیانی چاوەنۆڕت دەبم لەم جێگەیە، وەختیش بۆ تۆ تەرخان دەکەم. سبەینێ کە چووم لە «سیطرة» ی لای شەقامەوە هەتا لای خۆی ڕایسپاردبوو نەوەخرێم. سکرتێری تێگەیاند کەس مەشغووڵی نەکا هەتا من هەڵدەستم.

وای لەم جیهانە سەیرە، هەموو ئەم گەرمووگوڕییە و بەخێرهێنانە و ئامێز کردنەوە و بایەخ پێدانە و ڕێزلێنانە، کە لە ڕواڵەتدا بێکۆتایی بێت، لە سەعات هەشتی بەیانییەوە هەتا هەشت و چارەکێکی بەردەوام بوو، کوتوپڕ گۆڕا ئەمما چۆن گۆڕانێک.

بۆ بێتالعی ئەو شتانەی منی تێدا پەرۆشدار بووم کارێکی زێدە بێبایەخی تایبەتی بە خۆم هەبوو کە دەشیا هەر باسی نەکەم، لەبەر تەنگەتاو بوون بە دەست ناگزورییەوە پێش قسە بنەڕەتییەکانم خست و گوتم بەر لەوەی بچینە ناو کێشەی دوور و قوڵەوە فڵانە شت هەیە حەز دەکەم لێی ببینەوە بە دوو قسەی سەرپێیی.
مەسەلەکەم باس کرد، وەڵامێکی خۆشی دامەوە، گوتم پەلەی لێ مەکە و پتری سەرنج بدەیێ. ئەم «پەلەی لێ مەکە» یە کە بە عەرەبی «ارتجال»م بۆ بەکارهێنا و لەوپەڕی دڵسۆزیمەوە بۆ ئەویش بوو، یەک خەندەقی خستە نێوانمانەوە پەڕینەوەی مومکین نەبێت. دوای ئەو قسەیە لە تروو‌کەیەکی چاودا هەڵستا سەر پێیان و گوتی بەداخەوە وەختم نەما، چی دیکە ناتوانم لەگەڵت بدوێم. حاجەت نەبوو کەس تێم بگەیەنێ لە خۆوە زانیم ئەو وشەیە کاری ڕوخێنەری خۆی کرد. «منیش گەڕامەوە دواوە ئەمما بە عاجزی».

دەڵێن زمان بەڵای سەرە، قسەکە ڕاستە ئەمما دەشیا دڵسافییەکی منی خستە سەر قسەیەکی بێتویکڵی نیازپاک چاوپۆشینی لێ بکرێت لەلایەن مرۆیەکەوە کە مامۆستای قانوون و سیاسییەکی ناسراو و سەرەک وەزیران بوو. من نامەوێ خۆم بپەڕێنمەوە لەوەندە گلەییەی حەقە لێم بکرێت، بەڵام چ بکەم لەگەڵ تەبیاتێکی خۆشباوەڕی بە خەڵقدا ڕاپەڕمووی بێ فرتوفێڵ کە بە هەموو عومرم ڕەفتاری ڕاستگۆیانەی ناسیاسیانەی پێ کردووەم. من لەو دەمەدا کە ئەگەر دڵی د. بەززازم ڕاگرتبایە ڕەنگ بوو هەر لە ڕێی «تعویض»ی بێفێڵەوە هەموو گرفتێکم بڕەوەێتەوە، چاوم بڕیبووە حەقێکی کەمبایەخی بێتەئویل و بێمنەت و چ حسابێکم بۆ قسەی دیپلۆماسییانە نەکرد کەوا بایی سەد ئەوەندە حەقە خاترانەی تێدا دەبوو. بەڵام واز لە هەقوهۆقی خۆشم بهێنم، گەلێک بەرژەوەندی گشتی و نیوەگشتی وەک موشکیلەی دزەییەکان لەوانە بوون بەرەو چارەسەر کردنەوە بڕۆن ئەگەر ئەو وشەیەی من نەبوایە لەمپەڕ.

ڕۆژی پێشتر د.بەزار دیتی لە نێوان ئەو هەموو خەڵقەی دێنە پیرۆزبایی لێکردنی تەنها کەسێک بیری لە سوودی گشتی کردبێتەوە و دوو لێوەی لێ بزاوتبێ من بووم، هەر بۆیەش بوو ئەو هەموو بایەخەی بە دیدەنی سبەینێمان دا، چی دەبوو دڵ فەراحییەکی بەخشندانەی لەو وشەیەی من بەکارهێنابایە لەبەر خاتری کێشەی ئەوتۆ پێوەندی بە سیاسەتمەدارییی خۆیشییەوە هەبووا! دوای دوو ساڵێک دەرفەت بوو بۆ ئەو ڕووداوەی بگێڕمەوە...!

قسەی پێشینان هەیە دەڵێ، کە خوا بدات پێغەمبەریش چەنگێکی دەهاوێتە سەر. ئەم قسەیە بۆ من بە زیادبوونی سەغڵەتی بە ڕاست گەڕا. لە کەرکووک بووم، سەردانێکی ماڵی شێخ ڕەئووفم دەکرد لەگەڵ دەوەن و محەمەد و دایکیان، ڕۆژێکیان ئافرەتێکی ماڵی خۆمان لە پڕ هاتە ژوورەوە گوتی، دوێنێ یەک مەفرەزەی حکوومەت لەگەڵ مدیرێکی پۆلیس هاتنە ماڵەوە بۆ گرتنت، چاک بوو لێرە بوویت ئیتر خۆت دەزانیت چ پەسەند دەکەیت.

سەیر لەوەدا بوو ئەهلی ماڵەوەش وەکوو خۆم بە دڵ سافییەوە دەڵێن، لێرە نییە وا لە کەرکووکە لە ماڵی شێخ ڕەئووف ئەم قسەیە ئەگەر غەیری ئەهلی ماڵەوەم بیکردایە دەگوترا خەبەری لێ دا و بۆی دەبووە عەیبە. ماڵی ئاوا بێ، مدیر پۆلیسەکە دەڵێ، من چ حەقم هەیە بە دوای بکەوم بۆ کەرکووک، حکوومەت- جنێوێکی بە

حکوومەتیش دابوو- با خۆی بە دوایدا بگەڕێ من هەر ئەوەندە دەڵێم لەماڵەوە نەبوو.

بڕیارم دا خۆم بەدەستەوە نەدەم. لە بەغدا کۆمەڵێکی کوردیان گرتبوو لەوانەی ناویان هەبوو، وەک فوئاد عارف، مەجید عەلی، زەیدی ئەحمەد ئەفەندی، عەبدورڕەحمان موفتی، ئەحمەد کەمال، فەتاح شاڵی و ڕەشید جەودەت، دووریش خرابوونەوە بۆ «عين تمر» لەو چۆڵ و بیابانەی خوارووی بەرەو ڕۆژاوای عێراق. منیش گیرابامایە هەر بۆ ئەوێ دەچووم.

خۆم نەوەخراند خێرا چوومە ماڵی کاکە حسێنی خانەقا. ئەو شەوە لەوێ بووم بۆ سبەینێ وەها بەرژەوەند دیترا لە جێگەیەکی پەنهانتر بم، ئیتر چوومە ماڵی شێخ ئەوڕەحمانی شێخ ساڵح لە بەری قەڵا. دە ڕۆژ وەیا زیاتر لەوێ بووم. ساڵی نوێم (هی ١٩٦٦) لەو خۆشێرکێیەدا پێشوازی کرد. لەگەڵ شێخ ئەوڕەحمان زۆر زۆر بە خۆشیمان دەبردە سەر، دواتر دەمگوت هەرچی حەزی لە شتی خۆشە با خۆی لە ماڵی شێخ ئەوڕەحمان بشارێتەوە.

خانەخوێم حەزی دەکرد زەللەی زمانی خەڵق باس بکات و منیش لەگەڵ ئەودا ئەو حەزەم هەبوو، ئێستاش هەیەتم. جارێکیان شێخ ئەوڕەحمان شیعرەکەی شێخ محەمەدی خاڵسی دەخوێندەوە کە ڕووی لە شێخ محموودە، لە جیاتی ئەوە بڵێ «فەلەک مل شۆڕ ئەکا...» گوتی «شەلەک فل مۆڕ ئەکا...» گوتم، دادەی خێرا بینووسەوە هەتا لە بیرمان نەچووە...

زانیمان هیچ موراقەبە بە دەوری ماڵ شێخ ڕەئووفەوە نییە، غەریبیی منداڵەکانم دەکرد، گەڕامەوە بۆ ئەوێ بەڵام خۆم بە خەڵق نیشان نەدەدا. هەندێک دۆست بۆم خەریک بوون یەک لەوان «عەبدولمونعیم مەسرەف - عبد المنعم المصرف» کە ئەوسا موتەسەڕیفی هەولێر بوو. دەیزانی لە کەرکووکم خەبەری بۆ ناردم کە لە سەردانێکی «عزيز عقيلي»، وەزیری دیفاع، لە هەولێر قسەی لەگەڵدا کردووە لەبارەی منەوە. گوتبووی وەعدی شەرەف بێت، بچێتەوە ماڵی خۆی و دەرنەچێت. عەبدولمونعیم گوتبووی ئەمە قسە و وەعدی شەرەفی ئەو پیاوەیە خۆیشی بڕیار بدات لە متمانە پێکردنی. ڕەنگە دەوری دوو مانگێک لە کەرکووک مامەوە، ڕۆژێکیان مەرحووم نەجمەددین عەونی پەیدا بوو. هاتە لام، گوتی حەز بکەیت

دەتبەمەوە بەغدا، ئۆتۆمۆبیلەکە خسوسییە شوبهەی کەمتر لێ دەکرێت. لەو بەینەشدا دەمزانی موراقەبە لەسەر ماڵم هەڵستابوو ئیتر لەگەڵ نەجمەددین گەڕامەوە بەغدا بەڵام یەکسەر نەچوومەوە ماڵێ لای سەمەدی حاجی محەمەد دابەزیم شەوێ پاش سەعات دە بەبێ دەنگی چوومەوە ماڵێ.

گەیشتینە نیسان، وابزانم لەو مانگەدا بوو تەیارەی عەبدولسەلام کەوت، خۆی و چەند کەسانێکی لەگەڵیدا بوو، تێدا بوون بە خەڵووز. هەموو دەمانزانی عەبدولسەلام پێگیربوو لەسەر گرتنی ئەو خەڵقە. بە مردنی ئەو ترس نەما خۆم ئاشکرا کرد. عەبدولڕەحمان عارف بوو بە سەرۆک کۆمار لە جێی برای. چوومە لای و پرسەم لێ کرد. دوای ئەو چوومە لای د. عەبدولڕەحمان بەززاز کە بووبۆوە سەرەک وەزیران. بیستبووم حەزی بە گرتنمان نەکردبوو بەڵام عەبدولسەلامی پێ ئیقناع نەکرابوو. عوزری خواستەوە لەوەدا کە یەکێکی وەکوو من بێلزووم دووچاری سەغڵەتی بێت گوتی ئایەتی قورئان دەڵێ «واتقوا فتنة لا تصيبن الذين ظلموا منكم خاصة...». گوتم من لە کولانەی حەدیسێکەوە سەیری ئەم وەزعەم دەکەم کە جارێکیان دووپشکێک بە پێغەمبەریەوە دا وەهای ئێشاند ناوی «خوێ»ی لەبیر بردەوە تا ئەوەی گوتی، «هاتوني ما تضعونه في الطعام»، ئنجا گوتی، «لعن الله العقرب انها لا تفرق بين من يصلي ومن لا يصلي». منیش هەروەها دەڵێم لەعنەت لە خەبەردەر بێ، کە دەیەوێ من پێوە بکات کە مومکین نییە خەریکی کارێکی بم جەزای ئیعدام بێت هەموو ئومێدی سەلامەتیشم ئەوە بێت حکوومەت ڕەحمم پێ بکات. «انا أرفض هذه الرحمة وأقعد في بيتي...».

بەززاز خەریکی ڕێککەوتنەوە بوو لەگەڵ کورد گەیشتە ئەوەی وەفدێک لەسەرەوە هات بۆ تێگەیشتن. زەیدی ئەحمەد ئەفەندی پێوەنارد. وەفدەکە لێرە بوو، بەیانی ٢٩ حزیران خوێندرایەوە ١٢ مادە بوو. سبەی ئینقلابی دوەمی عارف عەبدولڕەززاق سەرلەنوێ شکستی هێنا... ئەو ١٢ ماددەیە بە لای منەوە خراپ نەبوون. بەر لەو ڕێککەوتنە چەند کۆبوونەوە لە قەسری جمهوری کرا، عەرەب و کورد تێیدا بەشدار بوون، هی کوردانیش بەتەنها، لە «مجلس وطني» کرا. من لە هەردووکان بەشدار بووم بەڵام قسەم نەکرد.

لە شەوی ١٤ی تەمووز داوەتی قەسری جمهوری کرام... لەگەڵ بەززاز تووشی یەکدی هاتین سەلاممان لە یەکتر نەکرد. وەفدێکی سەحافیی میسر هاتبوون

داوایان کرد بمبینن، له ١٧ی مانگ چوومه لایان له ئۆتێل بەغدا. نوێنەری «روز الیوسف» و «مصور» و جەریدەی «الجمهوریة» بوون، چوار سەعات قسەمان کرد. له بارەی بەیانی ٢٩ی حزیران پرسیاریان کرد، حەزیان لێ بوو ڕام لێ نەبێ چونکه بەززازیان خۆش نەدەویست گۆیا «وەحدەوی» نەبوو. گوتم من بەر له دوو شەو به بەززاز گەیشتم سەلاممان له یەکتر نەکرد، لەبەر ئەمه قسەم بۆ دۆستایەتیی ئەو نییه. من که سەرنج له شۆڕشی کۆن و نوێ دەگرم و دروشمەکانیان و ئەنجامەکانیان بەراورد دەکەم چەند لێک دوورن به قیاس لەوان دەتوانم سێ مادەش لەو دوازده مادانه به قوربانی نۆیەکەی دیکه بکەم. دواتر «مصور» و «روز الیوسف» باسی منیان کردبوو. هەرچی «الجمهوریة» بوو، دوای پتر له ساڵێک، سەرەک نووسەرەکەیم دیتەوه، گوتی، به درێژی ئەو قسانەتم بڵاوکردەوه. قسەکان وەختی خۆی له هەموو مەیدانێکی دەپشکنیەوە هەتا هونەر و گۆرانی و «ترتیل» و... و... هتد...ی میسر.

بەززاز دەستی نەبەسترابایه عێراقی دەهێنایەوه باری ئاسایی بەڵام عەسکەرییەکان لێی بێزار بوون، هەر له ساڵی ١٩٦٦ وەهایان کرد ئیستیقاله بدات. وەزارەتی «ناجي طالب» هات، وابزانم، له مانگی یازده یان دوازدەی ١٩٦٦. ڕەجەب عەبدولمەجید جێگری سەرەک وەزیران و وەزیری داخلیه بوو.

ناجی و ڕەجەب دۆستم بوون، هەتا بشڵێی سەغڵەت بووم لەلایەن گوزەرانەوه، ئەندامەتییەکی «مجلس الخدمة» بەتاڵ بوو، ڕووی تەکلیفم لێنان و مەرسوومیان دەرچوواند به دامەزراندنم لەو مەجلیسه. ڕۆژی ٢٧ وەیا ٢٨/١٢/١٩٦٦ دەوامم کرد...71

71- لەبارەی مەرسوومی بوونم به ئەندامی «مجلس الخدمة» پێویسته بڵێم: من زانیم له ڕۆژی (وەک لەبیرمه) ١٤/١٢/١٩٦٦ بڕیاری دامەزراندنم له «مجلس الخدمة» لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوه دەرچووبوو هەرچەند مەرحووم ئەحمەد کەمال وەزیری «ئاوەدان کردنەوەی شیمال» بەرهەڵستی لێ کردبوو گۆیا مەلا مستەفا - که ئەو دەمه لەگەڵ حکوومەت ڕێک بوو - بەو بڕیاره ڕازی نابێت. بەڵام قسەی نەڕۆیی بوو. وەزیر وەکوو غەریبی حاجی ئەحمەد بەدەمیشیدا هاتبوونەوه.

ماڵەکەم لە مەنسوور گوێستەوە بۆ «مدينه الشرطة». جیرانەتیی حسێن شێروانی بۆ ئەوێی ڕاکێشام. حسێن مدیر شورتە بوو وەک دەڵێن «عصامي» بوو، دەمێکیش بوو دۆست بووین لە کۆتایی شوباتی ١٩٦٧ لە خانوێکی نزیک ماڵەکەی ئەو نیشتە جێ

---

چەند ڕۆژێک بەسەر چوو مەرسوومی جمهووری دەرنەچوو، منیش سەغڵەتی بێدەرامەدی بووم چوومە لا «سەعید صلێبی - سعيد صليبي». ئەو دەمە «ئامیر مەوقعی» بەغدا بوو شوێنەکەی لە وەزارەتی بەرگری بوو. ئەم سەعید صلێبییە لە هەردوو ئینقلابەکەی عارف عەبدولڕەززاق بوو بە هۆی پووچانەوەیان و پاراستنی بنەماڵەی سەرۆکایەتیی کۆمار. تەواوێک موجامەلەی کرد و بەڵێنی دا... چەند ڕۆژێکی دیکەش تێپەڕی بێ ئاکام، ئیتر داوام کرد بچمە لای سەرۆک کۆمار کە ئەوسا «عبدالرحمان عارف» - براگەورەی عەبدولسەلام - بوو...

من لە ژووری سەرۆکی دیوان دانیشتبووم بە دیار چۆڵبوونی ژوورەکەی سەرۆک دیتم «سەعید صلێبی» هاتە ژوور و بی سەرخوار کردنەوە یەکسەر چووە لای سەرۆک، کە دەرچوو بێ سەرخوار کردنەوە ڕۆیی. سەرۆک بەخێری هێنام، منیش مەسەلەی تەعینەکەم باس کرد گوتی: بەڕاست کابرایەکیش، نازانم کێ بوو، بە بیری هێنامەوە... لەگەڵ قسەکەیدا دەستێکی مەیلەو بێباکانەی هێنا و برد و «ئا ئا... سەعید صلێبی» یەکیشی گوت. ڕاستییەکەی ئەو ڕەفتارەم لێ گران هات هەرچەند ڕووی لە خۆم نەبوو بەڵام «سەعید صلێبی» پایە و ڕەوەتی دوو سەرۆک کۆماری لە دوو جاراندا پاراست یەکێکیان عەبدولڕەحمان عارف خۆی بوو کە هێندە بە سەرزارەکی ناوی هێنا. لەو ڕۆژەوە سەرم بە قەسری جمهوریدا نەگرت، سەرۆک کۆماریشم نەدیتەوە هەتا جارێکیان لە وەزارەتی بەزازدا ئەمیری کوێت داوەتێکی کرد لەسەر شەرەفی سەرۆک کۆمار منیش بانگهێشت کرابووم ڕێککەوت شوێنی من کەوتە ڕۆخ بەزاز کە بەینیشمان چاک نەبوو، بەولایەوە سەرۆک کۆمار بوو... هەردوویان مەرحەبایان کرد.

دوای یەک دوو ڕۆژ لەو دیدەنییەم لە سەرۆک کۆمار مەرسووم گەییشتە مەجلیسی خدمە. وابزانم لە ٢٨/١٢/١٩٦٦ دەوامی ئەو وەزیفەیەم کرد. نەشچوومە سپاسگوزاری سەرۆک کۆمار... کە ئەو لادرا چوومە موبارەکبادی «ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر».

بووین. کرێ خانووی مەنسوور پێنجسەد دیناری ساڵانە بوو، هینەکەی «مدینە الشرطة» دووسەد و چل دینار بوو. هەندێ برادەرم دەمێک بوو لێم بزر بوون پەیدا بوونەوە...

لە ساڵی ١٩٦٦ کۆمەڵەی مەکتەبی سیاسی کە زوربەیان هاتبوونەوە لای چەکدارەکان و تەنها سکرتێریان لە تاران مابۆوە، ئا ئەو کۆمەڵە بەپێی قسەی خۆیان لە ترسی ئیعدام هەڵاتن بۆ ناو حکوومەت و هێنرانە بەغدا. سکرتێریش هاتەوە بەغدا. من کاغەزێکم دیت بە ئیمزای سەرکردەی چەکداران لە ١/١/١٩٦٦ فەرمان دەدا بە کوشتنیان... من لە کولانەی کوردایەتیی بەرفرەوانەوە سەیری کەسان و ڕووداوان دەکەم، کەمتر نیگای کژکات (موسمی) دەخوازمەوە. مەکتەبی سیاسی لەو ڕۆژگارانەدا پارچەیەکی مێژووی کورد بوون، چاکە و خراپەیان لە دەست دەهات. هەرچەند لە تەمووزی ١٩٦٠ من ڕەخنەی توندم لێ گرتن بەوەدا کە لەبەر تیشکی «چینایەتی» دا بە چاولێکەریی چەپ خەباتی کوردایەتی بەڕێوە دەبەن، هەر لەو نووسینانەشدا گوتبووم کە ناشێ بۆ هیچ کوردێک کۆسپ و لەمپەڕ و تەگەرە بهێنێتە بەر هەنگاوی حیزب وەیا حیزبێکی دیکە کە ناشێ بۆ هیچ کوردێک کۆسپ و لەمپەڕ و تەگەرە بهێنێتە بەر هەنگاوی حیزب وەیا حیزبێکی دیکە قوت بکاتەوە. پاشتریش لە ١٩٦٣ بە تەواوی ئاشت بووینەوە. ئەمجارەش کە هاتنەوە بەغدا من پێوەندیم پێوە کردن و هاتوچۆ لە نێوانماندا هەبوو.

تەنانەت کە خەبەر بڵاوبۆوە زەعیم عەبدولوەهاب ئەمین داوای لێکراوە وەزارەت پێک بهێنێت چوومە لای، هەرچەند لە ناسینێکی دوور بە دووری پتر لە نێوانماندا نەبوو. دەمزانی بۆ لایەنی وتوویژ کردن لەگەڵ کورددا دۆستی نزیکی هەیە لە کوردی بەغدا، مەکتەبی سیاسییان خۆش ناوێ، مومکینە بەرەو تێنەخوێندنەوەی ئەو گرووپە ڕاوێژی بۆ بکەن. من پێم گوت سوودی گشتی لەوەدا نییە دووبەرەکیی کورد لە چەژی سیاسەتی حکوومەت خۆش بێت چونکە هێمنی و ئارامی وڵات و حوکم لە یەکبووندایە. وەها پەسەند دەکەم کە تەکلیف کراویت بۆ سەرەک وەزیرایەتی هەر نەبێ ڕووکەش بێت نەبزێکیان بگریت و بایەخیان پێ بدەیت بایی ئەوەی بەشی ئۆقرە گرتن بکات. گوتیشم من بەنیازی خۆهەڵقورتاندن لە شتی لابەلایی نەهاتووم بۆ لات، دەبوو ئەم تێبینییەت پێ بگەیەنم. لە وەڵامدا گوتی، ڕاستە تەکلیف کراوم، زۆریشم حەز کرد ئەو پەرۆشەت دەربڕی خۆیشم پێوەندیم

پێوە دەکردیت ئەمەش نومرەی تەلەفۆنتە لەو ڕۆژانەم وەرگرتووە. عەبدولوەهاب ئەمین، نەبوو بە سەرەک وەزیران قسەکانمان نەزۆک مانەوە.

زۆربەی هەرە زۆری کوردە سیاسییەکانی بەغدا وەیا ئەوەی بیروڕای هەبوو لە کاروباری کوردایەتیدا مەرحەبایان لەو گرووپە بڕیبوو، هەتا جارێکیان چوار کەس لەو کوردە ناسراوانە هاتبوونە سەردانم لە «مجلس الخدمة». کاتێک ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی هاتە ژوورەکە، ئەو چوار کەسە تێکڕایان دوعاخوازییان کرد و لە ژوورەکە دەرچوون. هەرچەند هەستی قەومایەتی لە حاڵوباری ئەوتۆییدا بشکوڵێت، شتێک دەمێنێت لە هەستی شەخسی گرنگترە پێی دەڵێن بەرژەوەندیی قەومایەتی. کوردیش ئەوە نییە لە فیزونازی هێز و ساماندا خەتێک ڕاکێشێت بەسەر ناوی سەدەها کەسانی تێکۆشەر کە ئەگەر سەهووشیان کردبێت دەبێ بە ڕێنموونی و ڕەخنەی دۆستانە لە سەهوو بگێڕدرێنەوە نەک بە شکاندنیان شێرگیرەتر بکرێن. کاتێک میللەت ئەوەندە بەدەسەڵات و چەسپاو بوو پەکی بە هەڵەی هەڵەکردووان نەکەوت حیسابەکە دەگۆڕێت، خۆ ئەوساش دوژمن بکات بە دۆست سوودمەنتر دەبێت لەوەی بە ئەرک و مەسرەف لە ناویان ببات... هەر ئەم بیروڕایەم بوو وەهای لێکردم کە دوای دوو سێ ساڵ ئەو گروپە ویستیان بچنەوە بۆ لای چەکدارەکان و پرسیارن پێکردم، بێ سێودوو لێکردن پێم گوتن ئەمە هەلی عومریانە و نابێ ئاوی لێبخۆنەوە و دوودڵیی تێدا بکەن. تێیاندا هەبوو لەم بارەوە نەبوو، سکرتێریان قسەکەی منی زۆر پێ خۆش بوو، چووشنەوە ئەولا...

لە زۆر بار و جاردا گوتوومە، من کوردم بە کورد قبووڵە هەتا ڕۆخی خیانەت. دیسان قبووڵمە لە خیانەت بێتەوە دەرێ چونکە کورد وەک هەتیمی هەژارە لەوەدا نییە کولێرەی بێڕۆن بەلاوە بنێت. لەگەڵ ئەمانەشدا من بەو گرووپەم گوت نەدەبوو ببنە لەمپەڕ. گوتم من بوومایە لە جیاتی ئێوە خۆمم «تحييد» دەکرد، لە بیرمە وشەی neutralize م بەکار هێنا، لە قسەی کوردی «خۆم بە نەبوو دەکرد»م گوت. بێگومان شەرعییەتی حیزبایەتی و پارتایەتی هی مەکتەبی سیاسی بوو، شەرعییەتی لەوە فرەوانتر هی چەکداران بوو. ئەم ڕاستییەشم هەموو دەم گوتوە هەرچەند دەشێ هیچ لایەکیان لێی ڕازی نەبن چونکە کەم وەها دەبێ خەڵق بەو پشکە ڕەوایە ڕازی بێت کە نیوە بە نیوەیە.

مەجلیسی خدمە چونکە ئیشێکی ڕووتینی، وەکوو دامە و شەترەنج، دەباتە سەر، بەهرەی مرۆی بەهرەدار دەکوژێنێتەوە، بۆیە بوو پێم دەگوت «مقبرة القابليات». لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر کاروباری بە ڕێکی و بێ خوارەکە و خێچکە ڕۆیشتبایە و کمێک نیگافرەوانیی تێدا بەکارهاتبایە بۆ خەڵقێکی زۆر لەوانەی موحتاجی وەزیفەن دەبووە مایەی خێر و خۆشی. ئەندامەکانی بەسەرۆکەوە، چ ئەوانەی من بەگەڵیان کەوتم چ ئەوانەی دواتر بوون بە ئەندام لە جێگەی ئەندامە کۆنەکان، سەر لەبەریان دەست خاوێن بوون. بەڵام ڕێکخستنی کاروباری دایەرە و دیارخستنی بەرپرسی هەریەک لە موەزەفەکان کەلێنی دەدا بۆ بەدڕەفتاری. هەتا تەسلێحی دەفتەرەکانی ئیمتیحانی تەعین و تەرفیع لە دەست لیژنەیەکی بەرەژێرتری ئەندامانی مەجلیس بوو، کاری بەد هەبوو، کەمیش نەبوو، تا ئەوەی هەر تەعینێکی بەند بایە بەو ئیمتیحانەی لیژنەی بەرەژێر کردوویەتی من ئیمزام نەدەکرد.

سەیر لەوەدا بوو دەبوو ئیمتیحانی تەرفیع بە قەڵەمی خۆنووس وەڵام بدرێتەوە. کەسێکی تەسلێحی دەفتەری کردبایە بە ئاسانی دەیتوانی چی نووسراوە بیسرێتەوە و هی دیکەی لەو جێگەدا دابنێت تومەز لە بنەڕەتدا ئەوانەی مەرجی ئەوتۆییان داناوە بە بەرچاوی خۆیانەوە گرتووە کە بتوانن مامڵەت لەگەڵ ئەو موەزەفانەدا بکەن کە دێنە ئیمتیحانی تەرفیع، مەرجەکەش لە کۆنەوە داندرابوو بۆ ئێمە سەرەژێر بووبۆوە. کە تەسلیح کەوتە دەست ئەندامانەوە ئەشەدوبیللا هەتا لە مەجلیس بووم نەمهێشت یەک موەززەف بکەوێت. منیش دەهاتم بایی دەرچوونیان دەسکاریم لە وەڵامەکانیاندا دەکرد بێ ئەوەی بزانم کابرا چییە و کێیە و خەڵقی کوێیە.

بەلامەوە لە زوڵم زوڵمتر بوو بابایەکی موەزەفی هەناسە سارد بە تەمایە لە سی دینارەوە بۆ ٣٦ دینار هەڵکشێت هەر چونکە نازانێ جەزری ١٥٣٧٥٤٥ چەندە و «تأبط شرا» کێیە و «جزر القمر» چەند پانایی هەیە، بکەوێت، کەچی ئەو ئیشەکەی خۆی بریتییە لە «ضبط»ی محاکەمەی دادگە. بەڵێ چل پلە داندرابوو بۆ ماددەی «اختصاص» و بیست بۆ زمان و بیست بۆ حیساب و بیست بۆ زانیاری گشتی بەڵام دەبوو بۆ ماددەی «اختصاص» ئەوەندە دابندرێت کە ئەگەر کابرا تێیدا سەرکەوت پەکی بە ئەوانی دیکە نەکەوێت. من ئەوەندەم پێ کرا حیسابەکە لە بیست پلەوە بهێنمە دە پلە و دەیەکەی دیکە بەسەر ماددەکانی دیکە دابەش بکرێن.

هێشتا ئیمتیحان لە دەست بەرەژێردا بوو کاتبی تەحریری ڕەواندز کە لە بنەماڵەی مەلا ئەسعەد ئەفەندی ڕەواندزی بوو ئیشی هەرە گەورەشی ئەوە بوو لە کۆبوونەوەی قۆمیسێری سنووری عێراق و ئێران و تورکیا لە سی ساڵەوە تەرجەمەی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکیی دەکرد، کە هات بۆ ئیمتیحان لەگەڵ هەموو سفارشێکی لای لیژنەی کردم هەر خستیان، جاری دوەم خستیان... کاغەزم نووسی بۆ موتەسەڕیفی هەولێر کە تەرشیحی بکاتەوە بۆ تەرفیع چونکە دوای دوو جار کەوتن دەبوو تەرشیح بکرێتەوە دیسانەوە دوو جاران خستیان، دیسانەوە لەسەر داوای خۆم تەرشیح کرایەوە هەمیسان خستیان. ئەم جارە بە مدیر عام-م گوت، بەسە و تەحەمول نەما... سەرت نەیەشێنم بە خێری خۆیان پەنجا نومرەیان دایێ و دەرچوو تەرفیعەکەشی بۆ ٣٦ دینار بوو دەیویست لەو مەعاشەدا خۆی تەقاعود بکات. ئەم کەینوبەینە ساڵێک و سێ مانگی برد.

هەرچەند من و تۆ بەرپرسی چاکە و خراپەی ئەم جیهانە نین بەڵام لە سنووری هەست کردنمان بە چاکە و خراپە، بایی دەسەڵات ڕاشکان دەبێ یاریدەیەکی چاکە بدەین. من دەمدیت دەسەڵاتی گەورە بە پای پیلان سامان بەسەر یەکەوە دەنێت، موەزەفی گەورە هەبوو ساڵانە لە سەفەری کەیف و بەزم بە مەسرەفی حکوومەت تەڕدەماغییان دەکرد. ئیتر بۆچی مەلا شەفیعی ڕەواندزی لەسەر نەزانینی جەزری تەکعیبی هەموو ئومێدی بە تەقاعودی مەعاشی ٣٦ دیناری بپووچێتەوە، ئەویش دوای خزمەتی سی ساڵی. هەر لەو دەمانەدا بوو نوسخەی بڕیارێکمان بۆ هات لە وەزارەتی داخلیەوە، دەڵێ، فڵانە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی ناحیەی «ق» کە شەهادەکەی هی «دار المعلمین الريفية» و مەعاشی سی دینارە، دەستی دایە فەرمانی نوێی لە وەزارەتی خارجیە بە وەزیفەی سەفیر و مەعاشی ١٦٠ دینار مانگانە... کە بچیتەوە بۆ قانوونی «سلکی خارجی» دەبینیت یەکێک کە بکرێ بە سەفیر دەبێ هەر نەبێ زمانێکی زیندووی بێگانە بزانێت و شەهادەکەی لەگەڵ سەفارەت بگونجێت و مەعاشیشی لە سەد دینار کەمتر نەبێت.

زۆر جاران وەها دەبوو لە سنووری ئەو قانوونەی مەجلیس پەیڕەوەیی لێ دەکرد هیچم پێ نەدەکرا بۆ یارمەتی دانی موراجیعەکان. ئەگەر ڕێم هەبایە هانام دەبردە بەر دایەرەی دیکە. لە نموونەدا دەڵێم، دەوری ٤٠ کەس لە مامۆستایانی کە دەبوو بگەڕێنەوە بۆ وەزیفە و نەگەڕانەوە و لە کچانی دەرچووی «دار المعلمات» کە

وەزیفەیان بەر نەکەوتبوو کەوتنە سەر ساڵی ١٩٦٧ و گەیشتنە نیسان و مایسیش کە ئیتر تەعینبوونیان بەپێی «نظام» وەیا قانوون مومکین نابێت هەتا مانگی ئەیلوول. لە مانە کچی مەحموود نەدیم (خەڵقی کفری) کە ناسیام بوو لەو دەمەڕا کە کاتبی یەکەمی دادگەی کۆیێ بوو بەر لە پازدە ساڵ زیاتر، ئەم کچە لە کفرییەوە سبەینە زوو بەڕێ کەوتبوو تا بگاتە «مقابلە»ی دامەزران لە مەجلیسی خدمە. لە ڕێگە ئۆتۆمۆبیلەکەی وەرگەڕابوو... موقابەلە بەسەرچوو ڕۆژی دواتر کە هاتە لام خۆڵ و دۆی دنیای بەسەردا کرابوو، دەتگوت لە لێوی قەبرە هەر ئێستا دەیشارنەوە... دایە گریانیک و هەنیسکێک باس نەکرێت... حەقیشی بوو، خۆیشی و باوکیشی لە تەقاعوددا بە تەمای ئەو مەعاشە بوون ئاهێک لە جەرگیان بگێڕێ...
نموونەیەکی دیکە، حکوومەت بە موجامەلەی کوردان لە سەد دەرجەی موعەلیمەی کچ پەنجا دەرەجەی بۆ کچانی کورد دانا کە زمانی کوردی بزانن. دوازدە کچی کەرکووک دەبوو دامەزرێن، کەچی لەمانە دە کچیان کوردییان نەدەزانی... ویستم یارمەتییان بدەم بەوەدا فێڵ بکەم لەو «عضو»ەی لەگەڵم دانیشتبوو بۆ ئەزموونی کچەکان لە زمانی کوردی، هەر کچێک دەهات بە کوردی لێم دەپرسی، کوردی دەزانیت؟ مەڵێ نازانم! کەچی بە گیانی بێمنەت کردنەوە دەیگوت و بەعەرەبیش دەیگوت، «ما اعرف کردی خو احنا مو من کردستان...» بە مەدا «عضو»ەکەی تەنیشتم ئاگادار دەبوو منیش پێم نەدەکرا بە درۆ بڵێم کوردی دەزانێت. کچێکیان نەوەی مەلا قادری ئیمام قاسم بوو کوردیی دەزانی، یەکێکیشیان بە دەنگ نەهات و توانیم درۆی بۆ بکەم، دە کچەکەی دیکە بێبەش بوون و ئەو بەشەی ئەوان خرایە سەر پشکی هەولێر و سلێمانی و قەزاکانی کوردی سەربە مووسڵ... دەوری بیست معلیمێک ئەوراقیان پێ تەواو نەکرا بۆ گێڕانەوەیان بۆ سەر وەزیفەکانیان... خولاسە چل کەسێک زۆر بە مەغدووری مانەوە. چوومە لای ڕەجەب عەبدولمەجید، وەزیری داخلیە و نائیب ڕەئیس وزەرا و پێم گوت، «ابو محمد»، چل کەسێک لەوپەڕی مەغدووریەتدا دەبێ چارەیان بکرێت حەقیشم بەسەر قانوون و مانوونەوە نییە... قسەکەم چووە دڵییەوە. تەلەفۆنی هەڵگرت لەگەڵ ناجی تالیب سەرەک وەزیران قسەی کرد، گوتی فڵانم لایە لەگەڵیدا هاوباوەڕم کە دەبێ ئەو کەسانە (شەرحی حاڵی کردن بۆ ناجی) تەعین بکرێن.

ئێمە لە قسە کردندا بووین سوڵتان ئەمین، وەکیلی وەزارەتی دیوانی وەزارەتی داخلیە، هاتبووە ژوورەکە کاغەزی ڕەسمیی پێ بوو وەزیر ئیمزای بکات هەر بەسەر پێیانەوە گوتی، کە هەر ئەو خێرە دەکەن دوو سەد کچی «دار المعلمات»ی تازە دەرچوو هەن ئەوانیش حەقە بەر ئەم ڕەحمەتە بکەون. گوتم هەڵبەت دووسەد چاکترە لە چل... ناجی تالیب بێ دوودڵی گوتی منیش لە گەڵتانم پارەیان بۆ پەیدا بکەن لە بودجەی ئەمساڵ. ڕەجەب قسەی لەگەڵ وەزیری مالیە کرد گوتی هەر ئێستە خەریک ببە بۆ خستنە سەری نەوەد هەزار دینار بۆ بودجەی ئەمساڵ لە حیسابی «تربیە». مایەوە تەگەرەی قانوون کە نابێ ماموستا لە نیسانەوە دابمەزرێن ئێمەش، وابزانم، کەوتبووینە مایس. ڕەجەب گوتی، فلان وەعد بێ هەر مانگی ئەیلوول داهات تەعیین دەکرێن. گوتم «ابو محمد» چ سیگۆرتە هەیە کە ئێوە هەتا ئەیلوول لە حکومدا دەبن؟ گوتی، ڕاست دەکەیت با چارێ بدۆزینەوە. سەرت نەیەشێ ئەو ڕێگەیەمان دۆزیەوە کە ئەمری تەعیینیان دەربچێ بە کاتب لەو قوتابخانانەدا کە لە یەکی ئەیلوول ببن بە ماموستا تێیاندا... لە هەموو مێژووی حکوومەت شتی وەها نەکرابوو، ڕەجەب گوتی ئیقناع کردنی مەجلیسی خدمە بە مل خۆتەوەیە...

کە دەرچووم دیتم دەوری ٢٥٠ کەس لە کچ و کوڕ، زۆربەشیان کچ، چاوەنۆڕمن. هەر کە گوتم هەمووتان تەعیین بوون، بوو بە قیامەتی شادی. گومانت نەبێ لەوەدا کە کۆشەشی ئەوتۆییم گەلێک گەلێک بە تامتر بوو لە یارمەتییەکی بە دەسەڵاتی وەزیفەمەوە پێشکەش بە ئەم و ئەوم دەکرد.

ڕۆژێک لەو ڕۆژانە معاونێکی شورتەی کورد کە لەسەر کوردایەتی فەسڵ کرابوو هات بۆ موراجەعەی ئیشەکەی. بەخێرم هێنا و ڕێزم لێنا و لە ماوەی کەمتر لە دوو سەعات هەموو ئیجرائاتم بۆ تەواو کرد و بڕیاری بوونەوەی بە معاونی سێ ئەستێرەییشم بۆ دەرهێنا. هاتە لام فەسڵ کرابوو، پێش دەرچوونی معاونی سێ نەجمەیی بوو، گوتی فلان قەت لە چاکەت دەرناچم... گوتم کاکی خۆم، مەمنوونبوونم ناوێ، تۆ چەند لە ئیستیراحەتدایت کە ئیشت یەک چرکە نەوەستا و زۆریشی خێرایی لێ کرا خۆ ئەگەر ئارەزۆم کردبایە چەند مانگان هاتوچۆم پێ دەکردیت، لە پاداشدا ناڵێم وەکوو من ببە لەگەڵ مراجعی کە دێنە لات، هەر

ئەوەندەت لێ داوا دەکەم، تۆ شەرەفت لە هیچە ئیشی خەڵق مەوەستێنە... ئەم برا کوردە ناویشیم نەهاتە بەر.

یەکێکی عەرەب کە هەر نەمدیت، بڕیاری تەعیینی دەرچوو کەچی ئەمرێکی «مەجلیسی قیادەی سەورە - مجلس قیادة الثورة» مان پێ گەیشت بە ئەئریخێکی پێش ئەو تەعیینە ئیمزا کرابوو لەسەر ڕاگرتنی تەعیینات. تەعیینەکەی هەڵوەشایەوە. ئەرزوحاڵی دابۆوە قەسری جمهووری کە تەعیینەکەی ئەو بەر ئەو ڕاگرتنە نەکەوێت. لێ داواکرابوو لە مەجلیسی خدمە-وە «استشهاد»ێک ببات بۆیان کە ڕاست دەکات. ئەرزوحاڵی دایە سەرۆکی مەجلیس، داخوازییەکەی ڕەت کرایەوە، بەوەدا کە مەجلیسی خدمە «استشهاد» دەر ناکات، با «قەسر - قصر» پرسیار بکات... من نەمتوانی سەرۆکی مەجلیس ئیقناع بکەم بەڵام بڕیارێکم لەگەڵ خۆم دا. بە دوا ئەو کوڕەمدا هەنارد تومەز پاش بێئومێدی ڕۆیشتبوو. نامەیەکی شەخسی و نیوە ڕەسمیم بۆ سەرۆکی دیوانی قەسر نووسی کە ئەو کوڕە ڕاست دەکات لەوەدا کە ئەمری تەعیینی دەرچوو بەڵام ڕەش کرایەوە... لە نامەکەدا نووسیم، حەدیسی پێغەمبەر دەڵێ، «من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطيع فبلسانه فان لم يستطيع فبقلبه وذلک أضعف الايمان». منیش «منكر»ێکی گەورە لەوەدا دەبینم هاونیشتمانی دەرگەی موراجەعەی لە ڕوودا ببەسترێت لە ناو نیشتمانەکەی وا قەڵەمم لە جێی زمانم ئەو «منكر»ە لەسەر شانم هەڵدەگرێت بۆ سەر شانی لە خۆم بە دەسەڵاتتر.

دوو ڕۆژی نەبرد لە قەسرەوە بە نامەی ڕەسمی داوای فایلی ئەو کوڕە کرا و ئەمرەکەی تەعیینی تەنفیز کرا... من نە پێشتر سەرۆکی دیوانی قسەرم دیتبوو نە دواتریش دیتمەوە بەڵام بیستمەوە کە ئەو دەیناسیم و نووسینەکانمی بە دڵ بوو. ئەوساش هەر لە سنووری کاغەزی ڕەسمی و هەندێک لە گوتارەکانی هاوینی ١٩٦٠ م مومکین بوو منی ناسیبێت بە نووسەر... ئەگەر ئاگای لە نیابەتم نەبوو بێت. لەم بابەتە کۆشەشانە گەلێک بەو لای تاقەتی خۆمەوە دەرڕۆییشتم. هەرچەند ماندووبوون و ناوناوە مەسرەفیشم لە کیس دەچوو بە هاتوچۆی تاکسی دیسانەوە هەتا بڵێی دەبووژامەوە بە سەرکەوتنی هەر یەکێک لەو کۆشەشانە.

حاجی ڕەسووڵ چۆن تەرفیعی کرد؟ داخلیە قایمقامێکی تەرشیح کردبوو بۆ تەرفیع، حاجی ڕەسووڵ هاتە لام گوتی چ بکەم تەرشیح نەکراوەم؟ گوتم ئیعتیراز بگرە،

مەجلیسی خدمە گوێی نەدایە ئیعتیرازەکە. کابرای تەرشیحکراو دوو مانگ بەر لە حاجی بووبووە قایمقام حاجیش هەشت «شكر وتقدير»ی هەبوو کابرای دیکە دووی هەبوو. چوومە لای وەزیر داخلیە د. شامل سامرائی، کەونە زەمیلم لە وەزارەت، گوتم، «أبو أندلس متى تقبلون الولاء من الكردي؟» حاجی لەناو شاخوداخی کوردەواری و لە دەمی حەرەکاتدا هەشت جاران تەقدیر کراوە، کابرای دیکە لەبەر سێبەر قەزای وەکوو نەجەف دوو تەقدیر کراوە هەر چونکە پشتیوانیشی هەبووە دوو مانگ زووتر بۆتە قایمقام. «يا ابا أندلس والله لو كنت أنا وزيرا بدولة كردية و جاءني عربي في مثل وضع حاجي رسول لما فضلت عليه كرديا» گوتی، فلان بەس بێ، ئابڕووم چوو... تەلەفۆنی هەڵگرت بە یەکێکی بەرپرسی وەزارەکەی گوت، «حيا مابقى»، لە بن ئەرزیش بێت بایی تەرفیعی قایمقامیک پارە پەیدا بکە... دوو ڕۆژی نەبرد تەرشیحی حاجی هات و تەرفیعی پێ کرا.

جەلالی حاجی عەولابەگ، کەونە هەڤاڵی قوتابخانەی سەرەتایی و دۆستی هەمیشەییم، چۆن تەرفیعی کرد؟ دەبوو لە پلەی حەفتاوە بۆ پلەی سەد دینار مەعاشی بەپێی نیزام داخلیی مەجلیس دیدەنیی لەگەڵدا بکرێت پاش تەرشیح کرانی لەلایەن وەزارەتی عەدلیەوە. قسەم لەگەڵ وەزیری عەدل کرد گوتی، لە وەزیر مالیە پارەم بۆ پەیدا بکە هەتا هەر ئێستا تەرشیحی کەم، ڕێکەوت وەها بوو وەزیری مالیەی ئەو دەمە دەیویست لە گەڵی ئاشت ببمەوە، یەک دوو جار هەوڵی دا نەمبیست! بۆ ئەم ئیشە چوومە لای. کە گەیشتمە ژووری سکرتێرەکەی بی ئەوەی ئیزنم بۆ وەربگرێت گوتی فەرموو. گوتم ئەدی ئیزن؟ گوتی تێی گەیاندووم هەر دەمێک هاتیت لە هەر بارێکدا بێت یەکسەر دەرگات بۆ بکەمەوە... دەرگای کردەوە. وەزیر بێوەخران پارەی پێویستی خستە سەر بودجەی عەدلیە و جەلال بەگ تەرشیح کرا و دیدەنی لەگەڵدا کرا و هەڵکشا بۆ پلەی سەد دیناری.

چوار وەزیفەی کاتب ناحیە لە داخلیەوە داوا کرا پڕ بکرێنەوە بە مەرجی زانینی زمانی کوردی. ئیعلان کران، هەشت کەسی بۆ هاتن. لە ئەزمووندا چوار کەس بەپێی پلەی دەرچوونیان تەعین بوون چواریشیان مانەوە بە «احتياط». یەکێک لە دەرچووە تەعینبووەکان «عەلی دەروێش» مەشوور بە «عەلی درێژ» هاتەوە لام بۆ سپاسگوزاری، گوتم لە جیاتی سپاس ئەگەر دەنگت دەگاتە ئەو چوار ئیحتیاتە با بزانن ئایا وەزیفە هەن لە ناوچەی کوردەواری شاغیر بێت بۆ ئەوان دەست بدات،

خەبەرم بدەنێ من مەمنوونت دەبم. خەبەریان هێنا ئەو وەزیفانە هەن. کاغەزم نووسی بۆ موتەسەڕیفی ئەو ناحیانەی وەزیفەکان تێیاندا شاغیر بوون و ڕجام لێیان کرد کە داوا بکەن لە مەجلیسی خدمە وەزیفەکان پڕ بکرێنەوە. بە زوویی کاغەزی ڕەسمییان لێوە هات و ئەو چوار «احتیاط»ـە یەکسەر تەعیین بوون چونکە «احتیاط» نە ئیمتیحان دەکرێتەوە و نە «منافسە» ش قبووڵ دەکات.

لەو ماوە کە دەوری بیست ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە عەلی دەرویش دۆستی گیانییە. لە دوورەوە دوعای بێدەسەڵاتانەم بۆ دەکات منیش بێدەسەڵاتانە مەمنوونی دەبم. هەر ساڵەش دیاریەکی بە سەنگ سووکی لە واتادا گرانم بۆ دەنێرێ. ساڵێکیان هەنگوینی بۆ هەناردم لە سلێمانییەوە. ئەو هەنگوینە لەعادەتبەدەر بە پێز بوو، ئەو داوەی وەکوو ڕیسی جاڵجاڵۆکە لە هەنگوین دەچۆڕێتەوە و درێژ و باریک دەبێتەوە لەم هەنگوینەدا وەها شریتەی دەکێشا دەتگوت پسانی بۆ نییە. لێم پرسی هەنگوینەکە لە کوێوە هاتووە بە خۆی و ئەو سیفەتەیەوە، وەڵامێکی وەها ڕوونم وەرنەگرت بتوانم بڵێم فلانە هەرێم هەنگوینی ئەوتۆیی لێ پەیدا دەبێت. لەم تەرزە دیاردەم دیتووە و ویستووشمە هۆیەکەی بزانم بەڵام بێسوود. لە سییەکاندا، ساڵێک لە ساڵان، تووتنی یەکێک لە تووتنەوانەکانی دێی «پێبازۆک»ی سەربە کۆیێ وەها خێرا دەسووتا هەتا جگەرە لە تووتنی دیکە دەگەیشتە نیوەی، جگەرەی ئەم تووتنە تەواو دەبوو، سۆتووشی زۆر سپی بوو. نەمدیتەوە جارێکی دی ئەو تووتنە دەربکەوێتەوە... لەو ساڵانەدا چوێلکەی وڵاتی کۆیێ بەچکەی خۆی بەخێو نەکرد و لە هێلانە فڕێی دەدا بۆ سەر زەوی... کەس نازانێ، ڕەنگە زاناکانیش نەزانن، بۆچی بوو ئەم بەچکەکوشتنە! من خۆم لەو کژەدا لە کوێ نەبووم بەڵام لە مرۆی ڕاستگۆم بیست، هۆی گومان لێکردنیش پەیدا نییە.

لە مەجلیسی خدمە بووم مارف خەزنەدار هانی دام بۆ دوان لە بارەی «نالی»یەوە، وەها بوو چەند دانیشتنێک بەیەکەوە دانیشتین بە تەلەڤیزیۆن لە کەرکووک بڵاو کرایەوە... دوو جاری دیکەش هەر جارە بە ڕەفاقەتی یەکێک لە بەرپرسانی تەلەڤیزیۆن لە بارەی «حاجی قادر» و شتی هەمە بابەتەوە دووام... لەسەر شتێکی بێبایەخ پێوەندیم بە تەلەڤیزیۆنەوە بڕی خەتای منیشیی تێدا نەبوو. (مەبەس تەلەڤیزیۆنی کوردییە).

ڕۆژێک لەو ڕۆژانەی کەوا جارێ ناجی تالیب سەرەک وەزیران بوو لەگەڵ ڕەشید موسڵیح چووینە سەردانی فەریق تاهیر یەحیا. ئەوان هەردووکیان بێئێش بوون. فەریق تاهیر زۆری بەخێر هێنام، هەر زووش دەرکەوت چوونەکەم بۆ لای کەوتە کاتێکی لەبار بۆ حیسابی خۆی. بە مجامەلە لە تەنیشتمەوە بە لای خوارەوە دانیشت.

گفتوگۆ هاتە سەر وەزعی «حکم» فەریق تاهیر گوتی پێویستە حکوومەتێکی بەهێز بێت چارەسەری گیروگرفتی ئابووری و ڕامیاری... و... هتد بکات. ڕووی قسەی لە من نا وەهای نواند کە منیش لەو هەوڵە بەشدار ببم وەک کوردێکی خاوەن باوەڕ و تەجرەبە و... دیار بوو دەیەویست لەگەڵ کوردیک پێوەندی بکات، ئیتر نازانم بیری لە من کردبۆوە یاخود منی نامزەد کرد.

من دۆستی ناجی تالیب و ڕەجەب عەبدولمەجید بووم، ئیمکان نەبوو بە وەهم و خەیاڵیش دژیان بوەستم. گوتم، «ابو زهیر» حەز دەکەم بزانیت من کە هاتووم بۆ لات تەنها سەردانی دۆستانەم مەبەست بووە چ پێوەندییەکی بە سیاسەتەوە نەبووە، پێشی ناوێ بڵێم بۆ خۆت دەزانی، قسەیەکی ئێستا بیستم، لە منەوە وەپاڵ تۆ نادرێ. کە زانی من تێکەڵ بەو هەوڵە نابم دوای چاو قوچێنێک جێگای خۆی گواستەوە بۆ ئەوبەری کە ڕەشید موسڵیح بە تەنها لێی دانیشتبوو. لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو گوتی، هەموو شتێک ڕێک خراوە ماوەتەوە «أحمد حسن البكر» قسەی لەگەڵدا بکرێت. سبەی لە پێشوازیی فلانە سەرەک دەوڵەت دێتە فڕۆکەخانە قسەی لەگەڵدا بکە (ڕووی لە ڕشید موسڵیح بوو) بۆ ڕێککەوتن لە گەڵمان، تۆی خۆش دەوێت... سبەینێ منیش داوەت کرابووم بۆ ئەو پێشوازییە. دیتم ڕەشید موسڵیح ئەحمەد حەسەن بەکری جودا کردەوە و لەگەڵی دوا. لە دوورەوە پێوەی دیار بوو وەڵامی ڕەفز دەداتەوە.

زۆری نەبرد وەزارەت گۆڕا، وەک لە بیرمە سەرۆک کۆمار خۆی بووە سەرەک وەزیرانیش، تاهیر یەحیا یەکەم نایبی سەرەک وەزیران بوو. فوئاد عارف یەک بوو لە چوار یان پێنج نائیبی سەرەک وەزیران - بە پرسیاری کاک فوئاد گوتی چوار بووین. ئەم ئاڵوگۆڕە کمێک پێش پێنجی حوزێرانی ١٩٦٧ بوو کە شەڕی سینای تێدا هەڵایسا.

له زستانی نێوان ساڵی ١٩٦٦ و ١٩٦٧ وەها ڕێککەوت ساردایی نێوان د. عەبدولڕەحمان بەززاز و من نەمێنێت. لە موناسەبەدا مامۆستا هادی چاوشلی داوەتێکی نیوەڕۆژەی لە ئۆتێلێکی قەشەنگ کرد، کۆمەڵیک لە محامی و پیاوانی قانوون و وەزیفەی سەربە قانوون تێیدا بەشدار بوون لە نێوانیاندا وەزیری عەدل و سەرۆکی دادگەی تەمییزی بەغدا، بوون. وەها ڕێکەوت د. بەززاز و مامۆستا حسێن جەمیل و من کەوتینە پەڕگێکی مێزکەوە، حسێن جەمیل لە بەیندا و من و بەززاز بەرابنەر یەکتر... قسەیەکی ئەو دەمەم بە بیردا دێتەوە لە بارەی وەزعی عێراق کە گوتم، عێراق «دۆگۆڵ»ێکی گەرەکە دابینی بکات. حسێن جەمیل گوتی، د. بەززاز چ قسووری نەکرد لەو ماوەیەدا کە بەرپرس بوو. گوتم، چونکە دۆگۆڵ نەبوو، لەگەڵ هەموو دڵسۆزی و ڕوونبینیی خۆی، لێ نەگەڕان بەردەوام بێت.

د. بەززاز ڕووی لە حسێن جەمیل کرد و گوتی، گلەییم لە مامۆستا کامل چادرچی هەیە. من کە بووم بە سەرەک وەزیران چوومە لای، ئەو سەرێکی لێ نەدام و ئەحواڵیشی نەپرسیم... من ئەم گلەییەم کرد بە هەلی گلەیی کردن لە خۆی، گوتم، جیلی ئێمەش گلەیی هەیە لە جیلی پێش خۆمان (مەبەستم ئەوە بوو، تێشی گەیشت) کە لەگەڵمان بێتەحەمولن... لەمەوە دەرگەم کردەوە بۆ ئەوە کە بڵێم، من بایی تێڕادیتنم لە نیگافرەوانی و باڵقووڵی کەسێکی لەگەڵی دەدوێم سەریح دەبم، چەندێکی قسە گل بدەمەوە، بە لامەوە، دەبێتە تۆمەت گرتن لە سینەفەراحی و هۆشکراوەیی ئەو کەسەی دەیدوێنم... خولاسە زۆر بە ئەدەبانە تێم گەیاند کە ئەو بەیانییەی لە وشەی «مرتجل» قەڵس بوو لەوەدا حەقی نەبوو چونکە ئاشکرا بوو کە نیازم پاکە... هەڵبەت بە ڕەمز و هێما مەبەستم دەربڕی نەک پەنجە بۆ ئەو ڕۆژە ڕاکێشم...

لەو ڕۆژەوە بووینە برادەری ڕاستەکی بێفێڵ. پاش چەند ڕۆژێک هاتە لام لە مەجلیسی خدمە، گوتیشی بە تەما دەبم ناوناو سەرم لێ بدەیت. شەوێکی ڕەمەزان چوومە لای مێوانی زۆر بوون، لە موناسبەدا گوتم، ئەو تیژڕۆییەی برا ئەفەریقاییەکان دەیکەن لە بەرانبەر ڕۆژاواییەکان بێلزووم و نابەرژەوەندیشە، دەفتەری کۆن خوێندنەوە چاکەی لێ پەیدا نابێت... د. بەززاز گوتی، تەجرەبەی تاڵیان لەگەڵ ئیستیعمار هۆی ئەو توندوتیژییەیانە بە سەهلی ڕابوردوو لەبیر ناکەن. گوتم «أبو عامر! هذا تفسير للموقف وليس تبريرا» گوتی، هەندێ جار تەفسیر و

تەبرير يەک دەگرنەوە. گوتم، لێرەدا يەک ناگرنەوە... د. بەززاز بێ ئەوەی زەرەیەک قسەکانمی پێ ناخۆش بێت لە شێوەی سەلماندن وسکت بوو... دواتر لەسەر داخوازی خۆی کاتێک دەچوومە لای، کەسی، غەیری من، لا نەبێت.

کەوتبووینە ساڵی ١٩٦٧، لە دانیشتنێکی مەحرەمانە باسی هەمەجۆرە بابەتمان دەکرد تا قسەمان گەیشتە سەرۆک جەمال. من گوتم - ئێستاش دەڵێمەوە - سەرۆک جەمال لەلایەن «المعية»ـەوە چ سیاسییەکی نەگەیشتۆتێ، هەتا بڵێی زیرەک، خەتیب، بەرچاو، بە شەخسیەت... بەڵام هەتا بشڵێی بە خۆوە گلاوە، لەخۆدا ڕۆچووە. ئەگەر هەندێکی «ذاتية»ی گۆڕابایە بە «موضوعية» گەورەترین چاکەی بە وڵاتی خۆی و هەموو عەرەب دەگەیاند. لە میسالدا گوتم، مەلەوانان کە لە ئاو دەپەڕنەوە دوو جۆر پەڕینەوەیان هەیە، ئەوی لە خۆ ڕازییە وەکوو کەسانێکی بە مەلە لە مانش دەپەڕنەوە بە هێزی بازوو یەکسەر و ڕاستە و ڕاست نوختەی بەرانبەریان لەو ڕووبار دەگرنە بەرچاو وەک ماسی بێ خوارەکە و پێچەکە ئاوەکە دەبڕن. هەندێکی دیکە خۆ دەدەنە ئاوەکە و وردە وردە مەودای لێ دەدزنەوە هەتا دەگەنە کەناری ئەوبەری بە ماوەیەک لە خوار نوختەی بەرانبەریانەوە. هەرچی سەرۆک جەمالە بەرەو هەوراز مل لە لووزەوی ئاو دەنێت. بێگومان خۆی و عەرەبیش لەگەڵیدا ماندوو دەبن. د. بەززاز بێ ئەوەی دەنگ بکات قسەکانی ڕا لێ بوون. زۆری نەبرد شەڕی سینای ١٩٦٧ بەو جۆرە هەڵایسا کە دیتمان.

ئەم جیهانەی سێیەمی خۆمان بە جۆرێکی شەیدایانە عاشقی نامومکین و ناواقیعیەتە. لە خوێندنی سەرەتاییەوە مەشقی پەڕگیری و تیژڕۆیی و نەسەلماندن و لاساری دەکەین هەر بۆیەشە تێکۆشەرانمان تێکڕایان قارەمانی «تطرف - پەڕگیری»ن و شەرم دەکەن واقیعی بن. حیسابی جەماوەر کە خەریکی کەسابەتە جودایە، هێندەش جودایە بە لای سڕیدا بۆتەوە. شەڕی ٥ ی حوزێران بە تێشکانی عەرەب بڕایەوە. بێ ئەوەی عیراق یان هەر نەبێ گەلی عێراق هیچ گوناحێکی هەبووبێ لەو تێشکانە، حکوومەتمان بای دایەوە سەر ئەو خەڵقە، شتی لێ گران کردن و مەعاشی مەئموورانی داشکاند. مانگێکیان سەیرم کرد بە هەمووی ٩٠ دینار لە مەعاشم داشکاوە، گوتم خزمینە چەند وەتەنیم و ئاگاشم لە خۆم نییە.

لەو سەروبەرەدا بوو ناجی تالیب و ڕەجەب عەبدولمەجید، لە ماڵی ناجی، وێنەی داخوازییەکیان نیشان دام کە لەلایەن ١٣ ئەفسەری گەورەوە ئیمزا کراوە و دراوەتە

سەرۆک کۆمار، عەبدولڕەحمان عارف (وەیا خەریک بوون بیدەنێ). یەکێک لەو داخوازییانە هەڵبژاردنێکی ئازاد بۆ دیاری کردنی نوێنەرانی میللەت و کۆتاییهێنان بە «حوکمی عەسکەری» و «فترة الانتقال». ساڵی ڕابوردوو کە ناجی تالیب سەرەک وەزیران بوو، ڕەجەب عەبدولمەجید وەزیری داخلیە و جێگری سەرەک وەزیران، لە ژوورەکەی وەزیری داخلیە بە ڕەجەب-م گوت، بۆچی نایەن تەجرەبەیەک بکەن کە هەرگیز لە عێراق نەکراوە؟ گوتی، وەک چی؟ گوتم هەڵبژاردنێکی بێفێڵ... گوتی لەوانەیە «مشبوهين يندسون...» گوتم، تاکە یەک کەس لەوانەی سەربە زەمانی مەلیکن وەیا لە خۆیان گوماناوین ناوێرن سەر دەرکەن. گریمان تێکڕایی ئەو نایبانە «خائن» بوون خۆ تۆ وەک قورئان بە پێغەمبەر دەڵێ «لست عليهم بمسيطر» میللەت کە ڕای لە خائینان بوو، چاوی دەرێ، با لێی موبارەک بێت... ئنجا کە داخوازییەکەیان نیشان دام پێم گوتنەوە، هەلی ئەم داخوازییە لە دەست خۆتاندا بوو دۆڕاندتان. وەک لە بیرمە ئەو داخوازییە لەلایەن ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر و ناجی و ڕەجەب و حردان و ئیسماعیل مستەفا و عەمماش، هەتا سێزدە کەسەوە ئیمزا کرابوو درایە سەرۆک کۆمار. هەر ئەو جووڵانەوەش بوو شکڵی تازەی وەرگرت و گۆڕا بە شۆڕشی حەڤدەی تەمووزی ١٩٦٨.

ساڵی ١٩٦٧جارێ نوێ بوو وەفدێکی گەورە لە میسرەوە هاتە سەردانی حکوومەتی عێراق بە دەمڕاستیی «زكريا محيي الدين». داوەتێکی شەوانە لەسەر شەرەفی وەفدەکە کرا لەو شوێنەی ئێستا پێی دەڵێن «قصر السلام». لە ساڵۆنێک دانیشتبووین کە زەکەریا بە خۆی و هەڤاڵەکانییەوە هاتنە ژوورێ. لەبەر دەرگاوە کەوتە مسافەحە لەگەڵ عێراقییەکان. بە یەکتر ماچ کردن لە جیاتی تۆقە تێهەڵکشی کە گەیشتە لام زۆر بە گەرمی و دەنگی بەرز چاکوچۆنی کرد گوتم، هەتا گەیشتیە من ئەوەندەیان ماچ کردیت تامیان لێ بڕیت. لەو سەفەرەیاندا بوو سەرەک نووسەری «الجمهورية»ی قاهیرە سامی داود (وەک ناویم لەبیر بێ) پێمی گوت کە دانیشتنە دوورو درێژەکەی ڕۆژی ١٧/٧/١٩٦٦ ی بە تەفسیل لە «الجمهورية» بڵاوکردۆتەوە. وەعدی دا نوسخەیەکم بۆ بنێرێ بەڵام هیچم نەگەیشتێ، دواتریش مەرگ پێچایەوە، بەداخەوە.

زەکەریا موحیەددین خزمی «خالید موحیەددین»ی بەرەی چەپ و لە بنەماڵەیەکی کوردن بەڵام زەکەریا بە لای ناوەڕاستدا بوو، کەمێکیش لە دیوی جغزی ڕاستدا،

سەرۆک جەمال هێنای بە سەرەک وەزیران بەڵکوو تیژایی ناکۆکییەکەی میسر و ئەمریکا کەم بێتەوە، وەهاش چاوەنۆڕ دەکرا پارەدارانی ئەمەریکا هەلەکە بقۆزنەوە و هەندێ گرێی ئابووریی میسر بکەنەوە کەچی مەرجی وەهایان دانا بۆ خستنە ئیشی پارەیان لە میسر گەلێک قورستر بوو لە چاو هی وڵاتی دیکە، بەمەشدا تەجرەبەی زەکەریا موحیەددین بێسوود پووچایەوە.

هەر لەو ساڵانەدا جارێکیان لە ماڵی زەیدی ئەحمەد ئەفەندی کە باسی سیاسەتی جیهانی کرا، گوتم ئەمریکا لە سیاسەت پیادەیە - وشەیەکی قورسترم بەکارهێنا - هەندێک لە دانیشتوان گوتیان، چۆن وەها بە ڕەهایی دەوڵەتێکی هەرە گەورەی جیهان بە نەفام حیساب دەکەیت؟ هەتا نۆرەی قسەم پێگەیشتەوە نەختێکی پێ چوو ئنجا گوتم، بەر لە من «دین ئەچیسن» کۆنە وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمەریکا لە کتێبێکیدا دەڵێ: موشکیلەی ڕۆژاوا ئەوەیە بەریتانیا شارەزایە و هێزی نییە، ئەمەریکاش هێزی هەیە و نە شارەزایە.

من لەو وتووێژەدا ئەم لایەنەم لەگەڵ سەفیری ئەمەریکا مستر سترۆنگ دەربڕیبوو. مستر سترۆنگ خۆی زۆر قووڵ نەبوو موستەشارەکەیان «لێک لاند» پیاوێکی زیرەک بوو دەیسەلماند کە خارجییەی ئەمەریکا بێباکە و زۆر شت بەهەند هەڵناگرێ... دەیگوت نازانم چۆن «اهتمام»ی خارجییە بۆ هەندێ پرسیاری سەربە کورد ڕاکێشم لە عەرەبیەکەی وشەی «اهتمام»ی بۆ نەهات دەیگوت «اتهام» و دەیزانی ڕاست نییە بە ئینگلیزی گوتی how can I make them interested هەر تێبینی ئەوتۆیشە لە کتێبەکەی Game of nations دا بەدەر دەداتەوە لە لووتبەرزیی بەرپرسە زلەکانی خارجیەی ئەمەریکا.

لەو دەربرینانەی من، بەهۆی تێگەیشتوویی «لێک لاند»ەوە ئاکامێکی بچووک پەیدا بوو کە ئەمریکا پێنج زەمالەتی بە کوردی چەکدار دا بەڵام کەس پێوە نەچوو بۆ خوێندن، ئەم حیکایەتانەش هی پێش حوزێرانی شەست و حەفتە چونکە دواتر پێوەندی سیاسی عێراق و ئەمەریکا پچڕا، میسریش پێوەندی پێ کردەوە ئێمە هەر ماین هەتا هەشتاکان...

ڕۆژی پێنجی حوزێرانی ١٩٦٧ لە کۆبوونەوەی «مەجلیسی خدمە»دا بووین کە دەنگوباسی ڕەوی ئیسرائیل بۆ سەر دەوڵەتەکانی جیرانی خۆی، میسر و سووریە و

ئوردون، بڵاو بۆوه. سەرۆکی مەجلیسی «مشكور أبو طبیخ» و ئەندامەکان د. ناجی مەعرووف و فەرید عەلی غالب و من و ناجی عیسی خەڵەف، هەر پێنجمان یەک ڕا بووین لەوەدا کە سەرنجامی ئەو دەوڵەتانە تاریکە چونکە هیچیان خۆیان تەیار نەکردبوو بۆ شەڕ مەگەر لەلایەنی خوتبە و قسەی گەرموگوڕەوە... لە ڕۆژان زووتر دەرچووم بەرەو نیقابەی محامیان. لای فایق سامەرائي، کە ئەوسا نەقیب بوو، بەینێک دانیشتم، محامییەکان پەیتا پەیتا خەبەری تێشکانی فڕۆکەکانی جوولەکەیان لە ڕادیۆی قاهیرەوە وەردەگرت تا گەیاندیە دەوری سێسەد فڕۆکە. من ئەوەندەم گوت، ڕەنگە ڕۆژی وەها کەوتنی تەیارەک لە چەند لایەکەوە بدیترێت و خەبەری بە حکوومەت ڕابگەیەندرێت ئیتر یەک بە چوار و پێنج لە قەڵەم بدرێت دەنا سێ سەد فڕۆکە بەو چەند سەعاتە ناخسترێت. کەس ئامادە نەبوو قسەکەم بسەلمێنێ... دواتر زانیمان نەک سێسەد بگرە سێ فڕۆکەش نەکەوتبوو چونکە لە پێش هەموو شتێک هەرچی فڕۆکەی میسر بوو سووتێندرابوو ئیتر «خۆ مامر نییە بە دندووک شەڕ بکات»...

لە سەردانەکەی ساڵی ١٩٦٤ کە لە میسرمان کرد، من، موشیر «عەبدولحەکیم عامر»م لە ماڵی سەرۆک جەمال دیت. ماڵم حەقە قسەخۆش و نوکتەباز و پیاوی کەیف و بەزم بوو، بەڵام هەرچی گیانی جەنگاوەری هەبوو تێیدا نەبوو. مشیر عامر یەکێک بوو لە دوو قوماندانی هەرە هەرە تێشکاوی مێژووی جەنگ کە دەشێ بڵێین لە دەمی جەنگدا نەبوونیان چاکتر بوو بۆ سپایان لە بوونیان، ئەوی دیکەیان مارشاڵ بۆدیێنی قوماندانی مەیدانی ئۆکرانیا و پۆڵۆنیای شەڕی نێوان ڕووسیا و ئەڵمانیا بوو لە ساڵی ١٩٤١. ئەوەی لە سینا ڕووی داو ناویان لێ نا «نكسة» ئەگەر پێی گوترابایە «هزيمة منكرة»ش هەر بە مەدح حیساب دەکرا چونکە هیچ ناوێک بە خۆیەوە ناگرێت بایی ئەو هەموو بێفەڕیەی «قيادة» بکات...

لە عیراق دەردە کوشندەکەی خۆفشهەڵێنان وەهای کرد سەرۆک کۆمار لە بەرێ کردنی سپای یاریدەدەر بۆ شەڕی حوزێران، بە گیانی یەکێکی بچێتە ڕاوەپۆڕ دنیای تێگەیاند، کوڕینە ئەوا هاتم خۆتان بگرن... لە نیوەی ڕێگە، سپای بێ سایەبانی هێزی ئاسمانی، بوو بە باشترین نیشانە بۆ فڕۆکەی دوژمن. پەحا کە ساواین و بە خۆمان نازانین. ئەرێ خوێنەری ئازیز، چ دەبوو بابایەکی سەرۆک کۆماری عەسکەری بایی هۆشی ڕاوەکەری سوێسکە و کەو خۆپارێزی کردبایە لەگەردەن هەڵکێشان و

نەرەنەڕ!! لە نووسینی «محمد حسنین هیکل»م خوێندۆتەوە دەڵێ ئیسرائیل سێ ڕۆژ پێش هجووم هەرچی لاسلکییەکی هەیبوو ڕایگرت و خەبەری بە نامە دەنارد بۆ شوێنی پێویست، نەکا شیفرەی لاسلکییەکەی بخوێندرێتەوە. ڕۆژی هجوومیش هەرچی لاسلکیەکی هەیبوو خستیە گەر بۆ شێواندنی جیهازی بێتەلی دوژمنەکانی. بێگومان بەرپرسی خۆماڵی بە سێ ڕۆژ خامۆش بوون شەق دەبات، حەیف نییە وەکوو عەلیشیش لەسەر شانۆ چەتر لێ نەدات؟

لە ماوەی دوو ساڵ و مانگێک کە کەوتە نێوان ١٤/٥/١٩٦٥، ڕۆژی هاتنم بۆ بەغدا، و ٥/٦/١٩٦٧ کۆمەڵێک ڕووداوی گرنگ ڕوویان دا، پێنج وەزارەت کەوتن، هی تاهیر یەحیا و عارف عەبدولڕەززاق و د. بەززاز و ناجی تالیب و عەبدولڕەحمان عارف. سەرۆکێکی کۆمار بە هەواوە سووتا. شەڕ لە کوردستان دەستی پێ کردەوە. ئاشتی پەیدا بۆوە. عارف عەبدورڕزاق دوو جاران دستی دایە ئینقیلاب و سەرنەکەوت. شەڕی سینا هەڵایسا و لە شەش ڕۆژاندا ئاوەڕۆی چارەنووسی ناوچەکەی گۆڕی. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ ئەو حیزبییانەی دۆستیان بوون هاتنە سنووری دەسەڵاتی حکوومەت... سێ دۆستی پژدەریم کۆچی دواییان کرد، بابەکراغای سەلیماغا و باپیراغای بابەکری مەحمووداغا و بایزی بابەکری سەلیماغا (ئەم ڕووداوانە بۆ خۆم بەسۆز بوون، پێوەندیان بە سیاسەتەوە نەبوو).

بایزی بابەکری سەلیماغا دووچاری قەدەرێک بوو، کێشایەوە نەساغییەکی کە لێی ڕزگار نەبوو. لە ١٩٦٦ هێنرایە بەغدا، لە خەستەخانە بوو، لەگەڵ کاکە حسێنی خانەقا بەیەکەوە چووینە لای. بایزاغا گەیشتبووە قۆناغی هەرە دوایی ژیانی، لە هۆش دەچوو بە هۆش دەهاتەوە کەچی لەو گیانەلاوەدا مەردایەتی و جوامێریی خۆی لە دەست نەدا کە بە هۆش هاتەوە کاکە حسێنی دیت گوتی، کاکە حسێن، کاکە حەمەی پشتی هەموانی شکاند... تومەز لەوەتەی ١٩٦٣ کە کاکە حەمە لە گەڕانەوەی بۆ ڕانیە تەیارەکەی کەوت و تێداچوو، بایزاغا کاکە حسێنی نەدیتبوو سەرەخۆشیی لێ بکات، ئیتر بەر لە مردنی خۆی بە یەک دوو سەعات ئەو سەرەخۆشییەی وەها قارەمانانەی لێکرد. لەو تەرزە هەڵوەستەدا پیاوەتی دەردەکەوێت. هەرگیز نەمدیت ئەم بایزاغایە عەسەبی ببێت. ئەوپەڕی دڵگەرمی کردبێت ئەوەبوو دەیگوت، پیاوی چاک بە، با وەها و وەها بکەین نەک وەک تۆ دەڵێی.

باپیری بابەکری مەحمووداغا دۆستێکی بێفێڵ بوو، متمانەی پێ دەکرا و زۆر شتیشی لە دەست دەهات، کوردی گوتەنی مرۆیەکی بەزیپک بوو، دیوەخانێکی عومدەی هەبوو لە دێی نوورەددین کە پژدەری پێ هەڵدەدرێتەوە، تا ئەگەر گوتت نوورەددینی وەک ئەوەیە گوتبێتت پژدەری.

ساڵی ١٩٦٨ داهات. حکوومەتمان زێدە لە هەموو وڵاتی عەرەب بەردەوام بوو لەسەر «تقشف» و لە مەعاش برین. گرنەی عەجایبمان دادەگرت لە سیاسەت و ئابووری، لە نموونەدا دەڵێم ماددەیەکی پەینی دەسکرد هەبوو لە ئەمەریکاوە دەهات کیلۆی بە 2,5 دینار بوو کە پێوەندیمان بە ئەمەریکاوە بڕی ئەو ماددەیەشمان ئافەرۆز کرد بەڵام هەمان ماددەی ئەمەریکاییمان (وابزانم) لە هۆڵەندە دەکڕییەوە بە هەشت دینار کۆڵێکیش کەیفمان بە خۆمان دەهات. دانیشتن چەند خۆشە بەرانبەر چاوی لەیلایێ!! خۆ گێل کردنیش چەند بەتامە لەسەر حیسابی خەزێنەی دەوڵەت!!

لە یەکی شوباتی ١٩٦٨ کامل چادرچی کۆچی دوایی کرد. لە یازدەی شوبات سەمەدی حاجی محەمەدی بەننای برادەرم ئۆغری کرد. لەو ساڵانەدا بە چەژنە پیرۆزانە لەگەڵ ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر یەکدیمان بەسەر دەکردەوە هەرچەند یەکتریشمان نەدەدیت مەگەر لە موناسەبەی پێشوازی کردن لە مێوانان... جارێکیان لە سەفەردا بووم، کە گەڕامەوە گوتیان بەتەلەفۆن داوای ئەدرەسمی کردبوو تاکوو کارتی جەژنانەم بۆ بنێرێ، کارتەکەشی گەیشت. ئەم پێوەندییەی موجامەلەی ڕووت لە ڕۆژی ٢٢/٧/١٩٦٨ ڕەنگی دایەوە وەک کە نەختێکی دیکە بۆت باس دەکەم.

بێ ئەوەی کوچە و بازاڕ هەست بکات، لە ژێر پەردەوە هەوڵ و تەقەڵلای مەیلەو ئاشکرا و بێوچانیش هەبوو بۆ گۆڕینی باری سیاسی. ڕیوایەت زۆرن لە بارەی جۆری هەوڵدان بۆ بە لاوەنانی حکوومەتی سەرۆک عەبدولڕەحمان عارف. ژمارەیەکی بەرچاو لە زاپتە گەورەکان و ئەوانەی لە چواردەی تەمووزەوە خەریکی سیاسەت بوون بە نیازی جۆراوجۆرەوە حەزیان لە گۆڕین دەکرد. تێیاندا هەبوو دەیانویست ئینقلابێکی سپی بکرێت و ژیانی ئاسایی «مەدەنی» بگەڕێتەوە، جەیشیش بە زاپتەکانیەوە بۆ ئۆردووگایان بچنەوە و واز لە سیاسەت بهێنن بۆ ئەفەندییان. وەک بیستوومە لە کەسانێکی بەشداری ئەو هەوڵە بوون، گەلێک لایەن بە ڕواڵەت ئەو

ئامانجەیان پەسەند کردووە بەڵام سیناریۆیەکی نهێنیتریان لە دەستدا بوو. وەک هەتا ئێستا بە چاکی و ڕەوانی باسی ئەو گۆڕانە نەکراوە وەک بشزانم جارێ ماویەتی بۆ ئەو ڕۆژەی نهێنیەکانی پلان و پرۆژەی لادانی «عارف» بخریتە بەر ڕووناکاییەوە. لە دۆستانی تاهیر یەحیام بیستووە، عەبدولرەحمان عارف بی ئاگا نەبووە لە کەینوبەینی ئەو هەوڵە تا ئەوەی تاهیر یەحیا خۆی ویستوویەتی بە جووڵەی بهێنێ بۆ بەرهەڵستی لێکردنی، ئەو نەیسەلماندووە. گۆیا کەسانێک بە تاهیر یەحیایان گوتبێت کە ئەو نابزوێت تۆ خۆت بەلاوەی بنێ، ئەویش گوتبێتی سوێندخۆرم لەسەر هێندێ کە خیانەت لەو ماڵە ناکەم. ئەمانەم بیستووە و هی دیکەش کە ناشێ لێی بدوێم، بەڵام دوارۆژ، کە هێز و پێزی بە زانینی چەندوچۆنی گۆڕانەکەوە نەهێشت، پەردەی لەسەر هەڵدەگرێت.

## ئاڵقەی حەڤدەیەم

گۆڕانی باری سیاسی لە ١٧/٧/١٩٦٨ بە «بەیانی ژمارە یەک»ی شۆڕش بڵاو کرایەوە، ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بوو بە سەرۆک کۆمار، عەبدولڕەززاق نایف سەرەک وەزیران، ئیبراهیم داوود (ئەگەر هەڵەم لە ناوی نەکردبێت) وەزیری بەرگری «دفاع»، ناسرِ ئەلحانی وەزیری دەرەوە... سێزدە ڕۆژی بەسەردا تێپەڕی دوایی بەعس وەزارەتێکی نوێی دانا... نایف و ئیبراهیم و ناسرِ ئەلحانی و چی سەربە ئەوان بوو وەلا نران... ئەمیان بوو بە شۆڕشی ٣٠ی تەمووز.

ڕۆژی ٢٢ی تەمووز پێنج ڕۆژ دوای بەرپابوونی شۆڕسی ١٧ی تەمووز، جومعە بوو، پاڵم لێ دابۆوە، بە بیرمدا هات بۆ دەفعی گلەیی داوای موقابەلەیەکی سەرۆک کۆمار بکەم، دەمزانی لەو سەرقاڵییەی پاش شۆڕش هەر مومکین نییە داخوازییەکەی پێ بگات. لەگەڵ «استعلامات»ی کۆشکی کۆمار قسەم کرد و ناوی خۆم دا بە ژمارەی تەلەفۆنەوە... چارەکێکی نەبرد وەڵامی دامەوە، گوتی، هەر ئێستا سەرۆک چاوەڕوانت دەکات. خێرا خۆم هێنایە سەر باری ئەفەندیایەتی و ڕیشی پیریم تاشی... سەرۆک زۆری بەخێرهێنام گوتی، ئەمرۆکە لە تۆ و ناجی تاڵیب بەولاوە کەسم وەرنەگرتووە. قسەمان لە سنووری مجامەلەدا بوو.

دواتر، پاش یەک دوو ساڵ بگرە پتریش، بیستمەوە کە ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بوو بە سەرۆک، بۆ دانانی وەزیری کورد کە پێوەندی بە بزووتنەوەی نیشتیمانیی کوردەوە هەبێت، تەلەفۆنی کردبوو لەگەڵ ئەندامێکی دەسەڵاتداری مەکتەبی سیاسی پارتی لە بارەی بانگهێشتنی منەوە بۆ وەزارەت. ئەو ئەندامە گوتبووی، مەسعوود محەمەد لە فەرمانی سەرۆکی چەکداران دەرناچێت. سەد جاران ماڵی بە خانەی خوا بێت کە منی لەم سەرێشەیە ڕزگار کرد، هەرچەند ئەو مەبەستی ڕزگار کردن نەبوو، دەشیزانی هەرچی پێوەندی هەیە لە نێوان من و ئەو لایەنەدا نەماوە، بە خەیاڵی خۆی (وەک من بۆی دەچم) تۆڵەی گوتارەکانی ساڵی ١٩٦٠ ی لێ دەکردمەوە، کەچی لە ڕواڵەتدا هەق و حسێبی کۆن سڕابۆوە.

مەجلیسی خدمە لەلایەن ڕاپەڕاندنی بڕیارەکانی سەربە دامەزراندن و «غبن» و هەندێ باری تەفریحەوە، بۆ ماوەیەک، هەڵوەستێکی تایبەت بە خۆی هەبوو کە

بریتی بوو لە بەراورد کردنی حوکمی ئەو قانوونانەی دەستیان لێ نەدراوە لەگەڵ حوکمی هەندێ بڕیاری «ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش» کە لەگەڵ قانوونەکاندا نە دەگونجا. لە سەرەتاوە بڕیاری ئەنجومەن... ئەوەبوو کە هەر فەرمانێکی دەری بکات و لەگەڵ قانوون جووت بێت بە قانوون دادەندرێت.

مەجلیسی خدمە فەرمانێکی ڕەت کردەوە و قسەکەشی ڕۆیی. جارێکیان نوسخەی بڕیارێکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی... مان لە وەزارەتی مالییەوە بۆ هات بە بەرز کردنەوەی مانگانەی کابرایەکی لە سی دینارەوە بۆ حەفتا دینار. ئێمە واتە «مجلس الخدمة» لە «مالية» مان پرسی ئایا ئەمە تەرفیعە یاخود حەفتا دینارەکە مانگانەی تایبەت بەو کابرایەیە، ئەگەر تەرفیع بێت ئەوسا تەرفیعی بۆ سەد دینار تەنها پێنج ساڵ خزمەتی پێ دەوێت، ئەگەر «راتب اسمي» بێت دەبێ زەمانێک ڕاوەستێت بایی ئەوە بکات بە ئاسایی بگاتە سیوشەش، پەنجا، حەفتا ئنجا پێنج ساڵانیش ڕاوەستێ بۆ مانگانەی سەد دینار. مالییە لە ئەنجوومەتی سەرکردایەتی... پرسی چ وەڵامێکی مەجلسی خدمە بدرێتەوە. ئەنجومەنی سەرکردایەتی... ش لە مالییەی پرسییەوە، ئێوە دەڵێن چی؟ بە ئیزنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی... ئەم نوکتەیە دەگێڕمەوە کە لە دەمی خوێندنەوەی نامەی وەزارەتی مالیە بۆ گروپی دەستەی مەجلیسی خدمە-م گێڕایەوە، گوتم: کابرایەکی ناو شاخوداخی ناوچەی وەرتێ لە خۆشناوەتی بە ڕێگاوە بوو تووشی ڕێبوارێکی جوولەکە بوو، یەخەی گرت کە دەبێ مسڵمان بێت، جوولەکەش تکا و ڕجای کرد کە وازی لێ بهێنێ، بێ سوود بوو... جووەکە ناچار بوو گوتی: ئینالیللا چ بڵێم پێی ببمە مسلمان؟ کابرای خۆشناو گوتی: وەڵا ئەزیش نازانم!!

ئەم پرس و وەڵامە کەوتە ڕۆژێک کە ئەنجومەنی سەرکردایەتی...بڕیارێکی دیکەی دەرچوواندبوو هەموو فەرمانەکانی بە قانوون لە قەڵەم دەدات، بۆیە بوو مەجلسی خدمە هەر لەلایەن چۆنیەتیی تەرفیعی کابرای پرسی بۆ سەد دینار. عەگید سددیق لە «سياحة» موەزەف بوو بە حەفتا دینار مانگانە. لە داخلیەوە، کە ئەوسا ساڵح مەهدی عەمماش وەزیری بوو، نوسخەی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی... مان بۆ هات بە گوێزانەوەی عەگید بۆ داخلیە بە وەزیفەی قایمقام و هەمان حەفتا دینار مانگانە، لە ئاست ناوی مجلس خدمە کە لیستەی ئەو دایەرانەی وێنەی بڕیارەکەمان بۆ دەچێت، نووسرابوو «لاصدار القرار على ضوء ماتقدم...». ئێمە

نامەی ڕەسمیمان نووسی بۆ داخلیە کە مجلس خدمە خۆی تەعیینەکە دەکات و مانگانەش دیار دەخات نەک پێڕەوی شتی حازر بەدەست «مصادقة» دەکات. خێرا وەڵام هاتەوە لە داخلیە، کە خۆتان چی دەکەن بەپێی قانوون لە سەڵاحیەتی خۆتاندایە.

کە خزمەتی عەگید لێک درایەوە بایی ٥٦ دینار مەعاشە چونکە خزمەتی «سیاحة...» کە دایەرەیەکی نیوەڕەسمییە ناچێتەوە سەر کۆنە خزمەتەکەی کە مامۆستای قوتابخانە بووە. عەگید کە ناسیاو و برادەری حەپسخانەی ١٩٦٣م بوو هاتە لام گوتی چار چییە من زەرەر دەکەم. پێم گوت لە لای ئێمە چارت نییە بەڵام ئایا دۆستت لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی... هەیە؟ گوتی هەمە. گوتم هەر ئێستا وەها دەکەم خزمەتی «صافي» وەزیفەت و ئەو مودەتانەی کە تەرفیعت دواخراوە و ئەو بەینەی کە لە «سیاحة» بوویت بۆت لێک بدرێتەوە، لە ژێریشیەوە دەنووسم دەشێ ئەنجومەنی سەرکردایەتی... تێکڕایی ئەو مودەتانە بە «خدمة» حیساب بکات. کە خزمەتەکەی وەها لێک درایەوە حەقی سەد دیناری هەبوو. ئەو مسوەدە کاغەزەی وەرگرت و دوای چەند ڕۆژێک فەرمانی ئەنجومەن هات بە دیارکردنی مانگانەی عەگید بە سەد دینار.

ئەندامێکی مەجلیسی خدمە د. ناجی مەعرووف کە سێ ساڵەی ئەندامەتییەکەی بەسەر چوو، بۆی نوێ نەکرایەوە، «نعمان بكر التكريتي» هاتە شوێنی. ئەم مرۆیە هەتا بڵێی مەرد و بە وەفا و ڕاستگۆ بوو. بەر لە پتر لە بیست ساڵ «مدير معارف»ی هەولێر بوو، دۆست و ناسیاوی لە کوردان زۆر هەبوون، لەگەڵ من بە زوویی بووە برادەر. هەتا لە مەجلیس خدمە بووم هەموو نیوەڕۆیان منی دەگەیاندەوە ماڵەکەم. خواش بۆ منی ڕێکخست لە چاکەی ئەودا چەندێکی ماستی کوردەواریم بۆ دەهات بەشی ئەوم بە تێری بۆ جودا دەکردەوە. دەیگوت لە هەموو خواردنێکم پێ خۆشترە، چەندیشم پێ خۆش بوو کە بێپەروا داوای دەکرد کە ئەگەر پڕی ژێر ئێستیکانیش بێت پشکی خۆی دەوێت. هەڵبەت پیاوەتیەکەی ئەو لە ماستەکەی من گەلێک بەولاوەتر بوو، بەڵام دڵدانەوەیەکی بچووکی تێدا بوو. قسەیەکیش بۆ دز

بکەین (کە خۆمم)، لە ماوەی هەژدەساڵدا کە بەسەر پێوەندی نەمانم بە مەجلیسی خدمەوە تێپەڕیوە من بەردەوامم لەسەر کارەکەی خۆم و هەر قەرزداریشم...72

72- بەداخەوە قەرزدارییەکەم لە هەشتاکاندا بە مەرگی «نعمان بکر» کۆتایی هات، وردەوردە دنیاکەشی وەها گۆڕا ماست بە ڕەهایی نەگاتە بەغدا. لە بیرەوەری ئەم مەردە بەوەفایە دوو ڕووداوی عادەتی زێدە بچووک دەگێڕمەوە پێوەندی هەیە لەگەڵ نەریتێکی کۆن: ڕۆژێکی پێنجشەمۆ کە بەیەکەوە چووینە ناو ئۆتۆمۆبیلەکەی بۆ گەڕانەوەی بەرەوماڵمان دوای دەوامی ڕەسمی، لە پڕ پژمی، من گوتم «یا حفیظ!» گوتی وادیارە بەرانبەر پژمین بەدبینیت، گوتم زۆر جاران، ڕێکەوت بێت و شتی دیکە بێت پێوەم دیتووە، بەڵام هەر ئەوەیە حەزی لێ ناکەم نەک بە هەندی هەڵدەگرم...

هاتین هەتا لە دیجلە پەڕینەوە و لە چوارڕێیانی لای کۆشکی جەمهووری نعمان گوتی ئەها! وەڵا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ مەجلیس، کوڕەکەم ئەزموونی لە پێشە کتێبێکم بۆ خواستۆتەوە و لە بیرم چوو لەگەڵ خۆمیدا بهێنم، سبەیش جومعەیە ئەگەر بۆی نەگەڕێمەوە کەڵکی پێوە نامێنێ... ئنجا هاتە سەر هێندەی کە سەیری بە پژمینەکە بێتەوە، کە مەشوورە دەبێ سەبری لەسەر بگیرێت.

جارێکی دیکەش لە هاتنەوەمان بەرەو ماڵ سێ بەشی ڕێگەمان بڕی بوو، لەنکاو نعمان پژمی، ئەمجارەیان خۆی گوتی یاحافظ! خوێنەری بەڕێز و ئازیز بەو پێوەندییە پاک و پیرۆزەی نێوان ئێوە و مندا سوێند دەخۆم دەوری دووسەد مەترێک ڕۆیشتین کابرایەکی جلکی سەربازی عەسکەری لەبەر کە ڕێبوار بوو بەسەر سنووری نێوان دوو لایەنی شەقامەکەوە دەڕۆیشت، لە زارکی شەقامێکی فەرعی کە دەهاتەوە تێکەڵ بە ڕێبازی ئێمە بێت لێمان بوو بە «شرطي مرور» و تەنها ئێمەی ڕاگرت بۆ چەند پشوویەک و ئنجا ڕێگەی داین بڕۆین. تۆ بڵێی خدری زیندە بوو، ورێنە بوو، ئەفسانە بوو، یان کابرا شێت و وێت بوو... ئەمجارەیان بەڕاستی نعمان و منیش زۆر بە زیادەوە سەرمان لەو ڕێکەوتە سوڕما چونکە شتێک بوو کە نەدەشیا ڕوو بدات.

ئەندامێکی دیکەمان «فرید علي غالب» تەقاعود کرا، لیوا «طه الشیخلي» مدیری شورتەی عام لە جێگەی دامەزرا. ئەمیشیان مرۆیەکی زۆر بە حورمەت بوو، شەهادەی حوقووقی وەرگرتبوو حەزی لە ژیانی مەدەنی پتر دەکرد تا خزمەتی چەکدار، دەمێکیش بوو شناساییم لەگەڵی هەبوو. بە هاتنی ئەو دوو ئەندامە نوێیە هیچ باری تەبایی و هاریکاری و گەشەی دانیشتنەکانمان و شێوازی ئیشمان دانەلەنگا، بگرە لە بارتریش بوو.

ساڵی ١٩٦٨ مان گەیاندە کژی بارانەی پاییز، ڕەمەزانیش ڕووی لێ نایین. من بە ڕۆژووان ئازام و تاقەتم پێ کەم ناکات، سەیریش لەوەدایە هەتا بە ساڵیشدا دەچووم خۆگرتنم بۆ ڕۆژووان زیادی دەکرد. لە ١٩٨٥ تێکڕایی ڕۆژووەکانم بە هی ڕەمەزانەوە گەیشتە ٢٠١ ڕۆژ. لەو سەرەتایانەی ڕەمەزاندا لە کۆیە خەبەر هات کە هەندێک لە چەکهەڵگرانی حکوومەتی بە بۆنەی کارەساتێکەوە کە لە بەهاری تێپەڕیودا برینی خستبووە دڵیانەوە خەڵکی بێگوناهیان تەنگەتاو دەکرد. بەڕێکەوت ئەم قسەیەم لای نعمان تکریتی درکاند، گوتی ئەگەر حەز بکەیت دەچینە لای حەمماد شەهاب ئەندامی ئەوسای ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و مەسەلەی تێبگەیەنە. حەمماد شەهاب کوڕە خاڵی یان کوڕە پووری نعمان تکریتی بوو، خولاسە خاڵۆزا و پوورزای یەکدی بوون. ڕایەکەم پەسەند کرد.

سبەی پاش دەوامی ئەنجومەن هەر دووکمان چوینە لای حەمماد لە وەزارەتی دیفاع کە ئەو دایەرەکەی لەوێ بوو بە وەزیفەی «قائد موقع بغداد». چەندێکی خەیاڵ بکەیت بە خێری هێناین و لەحەدبەدەر موجامەلەی لەگەڵ کردم «مانقبل هالعزلة منک... مقامک محفوظ...» و چەندین شتێکی دیکەی بەولای ئەم جۆرە قسانەشی کرد. پێم گوت «أبو رعد» من هاتووم بۆ ڕجایەک و هیچی دیکەم لە خەیاڵدا نییە... بە زەحمەت ڕووی قسانم پێ وەرگێڕایە سەر ڕجایەکەم. کە تێم گەیاند یەکسەر داوای کرد قائد فرقەی دووی کەرکووکی بە تەلەفۆن بۆ وەربگرن. ئنجا گوتی، هەر ئێستا تەیارەیەکت بۆ پەیدا دەکەم بتباتە کەرکووک، لەگەڵ قائد فرقە بە کۆپتەر بڕۆن بۆ کۆیێ، هەرچی ئارەزۆتە ئەوە دەکرێ. گوتم لەگەڵ سپاسم، بە من ناکرێ سەفەری ئەوتۆیی بکەم... هەرچی هەیە قائد دەتوانێ بیکات... خولاسە خۆم لەم عەنقەرەیە دزیەوە. چەند سەیرە من و قائد فرقە بە کۆپتەر لە حامیەی

کۆیە دابەزین بۆ چارەسەرکردنی نالەبارییەکی کۆمەڵەیەکی چەکداری حکوومەتی دەیکەن، وەک عادل ئیمام گوتی، «دی تبقی انتیکه!!».

لەو قسانە بووینەوە و قائد فرقەیان بۆ وەرگرت کە ئەوسا مایکرۆیێڤ پەیدا نەبووبوو. بە شێوەیەکی «قطعي» تێی گەیاند کە ڕێی چ کەسێک نەدرێ دەستدرێژی لە خەڵق بکات... ئینجا بای دایەوە سەر مەسەلەی هەرای کوردان. گوتی فلان! ئێمە لە ڕاستی و بیروباوەڕی بەرژەوەندئامێزت دڵنیاین. من بە ناوی «ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش»ـەوە دەڵێم، کاغەزێکی سپی دەهێنین هەر پێنج ئەندامی سەرکردایەتی لە ژێرەوە ئیمزای دەکەین تۆ بە حوقووقی کوردی پڕ بکەوە و بیبە لای کوردان و ئەوانی پێ ڕازی بکە و هەرا نەمێنێ.

حەمماد بە هەموو دڵیەوە قسەی دەکرد. من لە قووڵترەوە سەیری دیمەنێکم دەکرد کە حەفت ساڵ بەسەر تەقینەوەیدا تێپەڕیوە و شریتەی بە زۆر لایاندا ڕاهێشتووە، ئنجا منێکی پێوەندیم بە دڵ و دەروونی خۆم نەبێت بە کەسەوە و بە هیچ لایەنێکەوە نەبێت و بەتەماش نەبم فێڵ و درۆ لەگەڵ کەسدا بکەم، چۆن دەشێ بچمە ژێر باری کێشەیەکی کە لەوانەیە لە هەر هەنگاوێکدا چەند درۆی تێدا بکرێت و چەند دەستی لاوەکیی بۆ بێت و چەند تەپکەی خۆماڵیی لە هەردوو لاوە بۆ ساز بدرێت؟ بە هەموو توانامەوە ویستم لەو تەکلیفە خۆم بدزمەوە. چەند کردم فایدەی نەبوو، گوتی لە «قەسری جمهووری» کۆبوونەوەیەک دەکەین. سبەی ئێوارە دوای فتار ئۆتۆمۆبیلی تایبەت بە خۆی هەنارد بە دوامدا، چوومە قەسر... بەیەکەوە سەرکەوتین لە کۆریدۆرێک سەرۆک کۆمار پێمان گەیشت، تۆ خۆش و من خۆشێکی لەگەڵدا کردم... کە چووین بۆ ژوورەکەی حەمماد دیتم « عەبدوڵا سەلووم سامەڕائی - عبدالله سلوم السامرائي» چاوەنۆڕم دەکات... (دواتر عەبدوڵا پێی گوتم، لە ناکاو پێم گوترا کە بێم بۆ وتوویژ کردن لەگەڵت هیچم حازر نەکردبوو).

لەگەڵ ئەو و سەعدوون غێدان چەند ڕۆژێک دیدەنی و هاتوچۆی بێسوودمان کرد، تێیدا سەغڵەت بووم... چەندێ لە ئۆتۆمۆبیلی حەمماددا بە لای عەسکەرانەوە ڕەت دەبووم سونگی تاق دەوەستان تومەز وەکوو کەوای مەلا، سڵاویان بۆ ئۆتۆمۆبیلەکە دەکرد... سەعدوون گوتی من و تۆ زووتر یەکترمان دیتوە. من بە بیرم نەدەهات کەی و چۆن و لە کوێ، بەڵام نەشمدەگوت لە بیرم نەماوە، هەتا خۆی گوتی

هاوینی ١٩٦٤ که چووینه ئاهەنگی ٢٢ی یۆلیۆ له قاهیره من زاپت بووم لەگەڵتان بووم.

هەروەک له پڕ ئەم پێوەندییه دەستی پێ کرد هەروەها له پڕ بڕایەوە. ئەوسا نەمزانی ئەم ڕەحمەته له کوێوە بۆم هات، مەبەست ڕەحمەتی بڕانی پێوەندییەکەیە. دوای یەک دوو ساڵ له «عەبدوڵا سەلووم سامەڕائی»م پرسی چی بوو وەها له ناکاو خامۆشی کردن؟ گوتی چەپییەکان بوون به ئاڵقەی پێوەندی، حیزبیش ئەوانی مسۆگەرتر زانی... ڕاستییەکەشی هەروەها بوو چ له ڕووی دەسەڵاتەوە بێت و چ له ڕووی پشتبەستن بێت به هەوڵەکەی ئاشتی نانەوە چونکه تاکێک له کوێ و حیزبێک له کوێ که ئینتەرناشناڵ دۆستی بێت!

من ئەم مەسەلەیەم لای هەندێ برادەر باس کرد و گوتم کاغەزی سپی ئیمزا کردن له ناوتوێژی قساندا بوو... گوتیان بۆچی قبووڵت نەکرد؟ گوتم سیاسەت به بەریەوە هەیه ئەم کاغەزە سپییە ئیمزاکراوە لەلایەن ئەنجومەتی سەرکردایەتیی شۆڕش ڕۆژەک له ڕۆژان، بەپێی مەسڵەحەتی سیاسی، ببێته هۆی سزا و چەکمەسەریی کەسێکی بۆی ئیمزا کراوە.

لەو ساڵانەدا مەکتەبی سیاسی ڕێی پێ درا ڕۆژنامەی «النور» دەربچوێنێت وردە وردەش پەرە به چالاکییەکانی بستێنێت...

بێ ئەوەی ڕۆژ و مانگی بزانم دیدەنیەکم له «ناظم گزار»ی مدیر ئەمن عامی مەشوور بۆ ڕێک خرا... من نه ناظم -م دیتبوو نه هیچ به خەیاڵیشمدا دەهات ببینم، ڕەنگه له ساڵی ١٩٦٩ بوو بێت که وەها پەسەند کرا بۆ بەرژەوەندی کەسانێکی تووشی تەنگانه دەبن بچمه لای ناظم که خۆیشی دەریبڕیبوو حەز به دیتنم دەکات. پێشنیازەکه له دۆستی خۆیەوە بوو که منیش ئەو دۆستەیم دەناسی. پاش مەغریبێک لەگەڵ ئەو دۆستەی چووینه لای. بەینێکی مەیلەو درێژ به قسانەوە خەریک بووین. له پێشەوە به موجامەله وەیا به مەبەست گوتی «بعد مانقبل منک هذا الاعتزال لازم تکون بالطلیعة...» له بیرم نەماوە دەقی قسەکانم چی بووە، بەڵام هەر ئەوە بووە کەوا (بێ نیازی تووڕە کردنی و بێ جوابی سەلبی) هەموو دڵسۆزێک ئامادەی خزمەته لەو مەیدانەی تێیدا مەعلانه... وەها ڕێککەوت له ئاست قسەیەکی نوکته ئامێزی مندا گرژییەوە، گرژینەوەکەشی بوو به دوو جار،

برادەرەکەی کە لەگەڵمدا بوو، گوتی، ڕەنگە ئەمە یەکەم جار بێ لەگەڵ میوان گرژیبێتەوە... بە هەر حاڵ چی دیکەی بە دوادا نەهات و نەمدیتەوە و لێم نەبیستەوە...

لە کۆتایی ١٩٦٩ سێ ساڵەی ئەندامەتیم لە مەجلیس خدمە بەسەر دەچوو، دەبوو لەلایەن وەزیری مالییەوە تەرشیح بکرێم بۆ نوێبوونەوەی ئەندامەتیم ئنجا ئەنجومەنی سەرکردایەتی... موافەقە بکات و مەرسوومی بۆ دەربچێت. ڕاستییەکەی چ ڕێبازی کرایەوەم لە پێشدا نەبوو هەوڵی بدەم، زۆریش پێویستیم بەو وەزیفەیە هەبوو چونکە پێی دەژیام... وەها ڕێککەوت تازیەیەکی ڕەسمی هاتە پێش، لە شوێنێکی کرایەوە بۆی دانیشتن. بە پێشنیازی نعمان بەکر بەیەکەوە چووینە تازیەکە. پێنج کەس لە حیزبییە بەرزەکان پرسەیان لە خەڵق وەردەگرت، چوارەمیان عەبدوڵا سەلووم بوو کە ئەوسا وەزیری ئیعلام بوو. کە لە هاتنە دەرەوەدا تۆقەمان لەگەڵ پرسەگێرەکان دەکرد کاتێ گەیشتمە عەبدوڵا، لە دەست گوشیندا گوتی، «ماحد یشوفک» گوتم «اجیک في الفرصة...».

دوو سێ ڕۆژی پێ چوو ئنجا سەرم لێ دا. خوا هەڵناگرێ بە زیادەوە بە خێری هێنام. هەل بوو باسی نوێ کردنەوەی ئەندامەتیم لەگەڵی کرد، یەکسەر تەلەفۆنی لەگەڵ ڕێکخەری کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی... کرد، کە مەسەلەی ئەندامەتیی مەسعوود محەمەد بخاتە لیستەی کارەکانی ئەوەوە. پێم گوت دەبێ مالییە تەرشیحم بکات! یەکسەر لەگەڵ وەزیری مالییە قسەی کرد کە هەر ئێستا تەرشیحی فڵانە کەس دەنووسێت بۆ ئەنجومەنی سەرکردایەتی... جارێ تەواوێکی مابوو ئەندامەتیم بەسەر بچێت بۆم نوێ کرایەوە. لە سپاسدا بۆم نووسی، کە هەوەڵ جار ویستم بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام دیتم نووسین بەردەوامە و ناچێتەوە هەرچی قسەیە «یتصل وجوده بعدمه».

لە مەجیلسی خدمە کە «ناجی عیسی الخلف» تەقاعود کرا «خەیری ئەلراوی - خیري الراوي» هاتە جێی. مرۆیەکی بەعسی بوو، هەموو کەس وەهای زانی هاتووە بۆ ڕەقساندنی ئەنجومەن بەپێی سیاسەتی حیزب، ئەویش دەمودووی جودا بوو لە ئەندامی عادەتی، پتر بە لای ڕادیکالیزمدا دەبۆوە. لە مەجلیس ئەو مەئموورانەی لە دنیا بە پەلە بوون دەوریان لێ دا دەتگوت چاوەنۆڕن گۆشتی قوربانی ببەشرێتەوە. لە نەشارەزاییەوە وەها دەبوو هەڵوەستی لەگەڵ قانوون و تەقالیدی ئەنجومەن ڕێک

نەدەکەوت. سەرۆکی ئەنجومەن «مشکور ابو طبیخ» ئیجازەی بە خۆی دا و لە ماڵەوە پاڵی لێ داوە. من کە ئەندامی هەرە کۆن بووم، بووم بە جێگیری... ماینەوە چوار کەس. بێ ئەوەی هەناسەم سوار بێت زۆر بە ئاسانی لە هەر مەسەلەیەکی بیروڕای ئەندامان جودا بوایە دەمخستە دەنگ دانەوە. بەپێی قانوون ئەگەر دەنگەکان پێکەڵیەک بوونایە ئەو لایەنەی دەنگی سەرۆکی لەگەڵدایە دەبوو بە زۆرینە... نعمان بەکر بێ سێودوو لەگەڵ مندا بوو. دواتر ساغ بۆوە ئەم کابرایە هیچی لە دڵدا نەبوو، زۆریش دڵساف و نیازخاوێن بوو، تەنانەت لە گێڕانەوەی موەزەفی کوردی مەفسول بۆ وەزیفەیان لە من گەرموگوڕتر بوو، دەیگوت پێی ناوێ لە کەس بپرسین یەکسەر بیانگێڕینەوە، هەرچی بڕیاری حکوومەت ئەوەبوو لە دایەرەکانیان بپرسرێ ئایا لەسەر چی فەسڵ کراون.

من بیروڕام ئەوە بووە، هەر مەسەلەیەکی هۆی فەسڵ تێیدا ئاشکرایە، پرسینی ناوێ، یەکێک لەو کوردە فەسڵکراوانەی کە «مەجلیسی وزەرا» بڕیاری دابوو لەسەر گێڕانەوەی بۆ وەزیفەکەی، ئەنجومەن دەیەویست لە دایەرەکەی بپرسێت بۆچی دەرکراوە. من دەمگوت وەهامان دانا وەڵام هاتەوە کە لەبەر سەرسەریەتی دەرکراوە، تۆ بڵێی دایەرەکەی ڕێی ئەوەی هەبێ ئەنجومەنی وزەرا بە درۆ بخاتەوە؟ لە فایلەکەی تەقریرێک هەبوو دەڵێ کابرا عارەق دەخواتەوە گۆیا ئەمە گومان دەخاتە سلووکیەوە. گوتم لە بڕیاری فەسڵ باسی عارەق نییە، خۆ لەم مەجلیسە ئەندام هەیە عارەق دەخواتەوە، موەزەفەکانمان زۆریان دەیخۆنەوە، کەسی لەسەر فەسڵ کراوە؟ فایدەی نەبوو هەر پرسییان بەڵام چاک بوو وەڵام هاتەوە کە لەسەر کوردایەتی فەسڵ بووە... ڕۆتینپەرستی کە مەنتیق دەکوژێت دەبێتە دەجاڵپەرستی!.

لە مەرحووم «بورهان جاف»م زانی کە برادەری خەیری ئەلراوی بوو، هەتا بڵێی پاشەملە باسی منی بە چاکە کردبوو، گوتبووی فڵانەکەس «علامة» یە نە عەللامەش بووم و نە هیچ، تومەز کە مەلا لە دێ نەما کەڵەشێر پێی دەگوترێ بلقاسم.

سەرۆکی ئەنجومەن ٢٥ ڕۆژان لە ماڵەوە مایەوە، ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بە دوایدا هەنارد و دڵی تەئمین کرد کە بە ئازادیی تەواوەوە دەسەڵاتی وەزیفەی خۆی بەکاربهێنێت و حیزبی بەعس چ نیازی نییە دەست لە کاروباری مەجلیسی خدمە

بدات، ئنجا هاتەوە سەر وەزیفەکەی، منیش وەکالەتێکی بێگەردم لەو ڕۆژانەدا بەسەر برد.

کۆمەڵەی مەکتەبی سیاسی کەوتنە چالاکی بۆ جێ لەق کردن بە چەکداران، زۆریش لەو مەیدانە تێهەڵکشین و گەلێک وەڵاتیان هێنایەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان... بەداخەوە گوللەیەکی کوێرانە لە نزیک دەربەندی سەنگەسەر بە بەری مەرگەوە «عەلی عەباساغا»ی پێکا و کوشتی... مەکتەبی سیاسی لەوپەڕی هەڵستدا بوو کەوتینە ساڵی ١٩٧٠- پژدەریەکان لەگەڵ خاڵە جنێد و (وابزانم خاڵە خدریشم) هاتبوونە بەغدا و حکوومەت بە گەرمی وەریگرتن، تەنانەت سەرۆک کۆمار بە خاڵمی گوتبوو کە بە ئەرکی ئەو دەبێ بچێتە حەج. هاتنیان بۆ بەغدا بە پرسی من نەبوو، ئەوانیش چەکیان هەڵنەگرتبوو، تەمایەکی هەبوو بە تەعویزی زەرەرێکی سووتان و دەربەدەری لێیان کەوتبوو. ئەوان لەگەرمەی مەرحەبای قەسر و حکوومەت بوون، بەیانی یازدەی ئازار دەرچوو. من بە خاڵەکانم گوت بچنەوە ماڵی خۆیان دابنیشن و خەیاڵی ئەو چەند ڕۆژە لە بیری خۆیان دەربکەن... وەهاشیان کرد.

من تا ئەم دەمەی نیسانی ١٩٨٨ نەمزانی هۆی گۆڕانی سیاسەتی حکوومەت، تا ئەوەی بە تەقڵە لێدان حیساب بکرێت، چی بوو! قسەی لەم و لەوم زۆر بیستووە بەڵام لە ئاست ڕووداوەکە کورت دەهێنن. هەرچی سەغڵەتی هەبوو بە حکوومەتەوە نەبوو، جەیش حەسابۆوە. بە ئاسانیش ناچێتە عەقڵەوە ترسی دەسەڵات پەیدا کردنی مەکتەبی سیاسی بە خۆی و ئایدیۆلۆجیی ڕەگ داکوتایەوە بەعس-ی خستبێتە سەر سیاسەتگۆڕی، چونکە وەها پێ دەچێ بەر لە ئەوەی مەکتەبی سیاسی
سەرکەوتنەکانی دژ بە چەکداران بهێنێتە دی حکوومەت خەریکی سیاسەتێکی وەها بوو بکێشێتەوە بۆ بەیانی ئازار، خۆ ئەو تەرزە بەیانە و ڕێککەوتنێکی بە دوایدا هات کاری ڕۆژێک و دوان نییە.

بەر لە چەند لاپەڕەیەک بۆم گێڕایەوە کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٨ قسە لەگەڵ مندا کرا و منیان بەجێ هێشت، بۆ لایەنێکی دیکە چوون. خەڵک بە گشتی چەند قسەی عادەتی قوت دەکەن بە تەفسیری شتی گرنگ و لێی دەبنەوە، کە قسەکەش پسۆک بوو گرێی دەدەنەوە. من ئەو تەبیاتەم نییە، کە شتێکم بۆ قووت نەدرا قووتی نادەم.

بەیانی ئازار و ئاهەنگەکانی بە دوایدا هات و جموجوولێکی ئەو خەڵقەی دەورووژاند کەموزۆر منی نەگرتەوە. نە مەرحەبایەک، نە داوەتێک، نە تەلەفۆنێک لە هیچ کەسێک و هیچ لایەنێکەوە بۆم نەهات. بە دڵ لەو بێبەشییە حەسایەوە بووم بەڵام لە لێکدانەوەدا حەزم نەدەکرد کەسانێکی کاروباری کوردایەتی هەڵدەسەنگێنن، وەها کورت بین بن، چونکە هەتا کورد دەگاتە ڕۆژێکی مرۆی وەکوو من بەلاوە دەنێت دەبێ زۆر قۆناغی گرنگی تێپەڕاندبێت. سەرەڕای ئەمە من بە درێژایی ئەو ڕۆژگارانەی کە نزیکبوونەوە لەو کەسانەی ئێستا مەرحەبا ناکەن لە زەرەر بەولاوەی تێدا نەبوو هەمیشە پێیانەوە خەریکاوم و پەرۆشداریان بووم.

لە نموونەدا دەڵێم ئەو ڕۆژەی ٣٠/٦/١٩٦٦ کە بەیانی ئینقیلابی دووەمی عارف عەبدولڕەززاق خوێندرایەوە، هەنێردراوی چەکداران لە بەغدا بوون، ڕۆژی پێشتر بەیانی ٢٩ی حوزێران بۆ ڕێککەوتن لەلایەن د.عەبدولڕەحمان بەززازەوە خوێندرابۆوە. ئا لەو بارەدا کە نەیاندەزانی ئەگەر ئینقیلاب سەرکەوێت چارەنووسی ئەوان چی دەبێت، تەلەفۆنیان بۆ هەندێ کەسی پێشڕۆی کوردایەتیی بەغدا کردبوو پەنایان بدەن لەماڵەکەی خۆیان، نەیانسەلماندبوو، من تەلەفۆنم بۆ ئەو کەسانە کرد کە لە «القصر الاخضر» دابەزیبوون تا ئەگەر هەستی خەتەرێک دەکەن بێنە ماڵەکەی من... ئەمە دەڵێم نەک بە مەدحی خۆم یاخود سەرشکێن کردنی کەس چونکە نە لە منەوە پاڵەوانەتی هەبوو نە لەو کەسانەشدا - کە لە خۆیان و ماڵ و منداڵیان ترسان - عەیبێک بە دەری دابوو. خەڵق حەقیەتی پەرۆشی خۆیان بێت. من مەبەستم ئەوەیە بڵێم کە دوای دوو ساڵ دنیا دەبێتە شامی شەریف دەبوو ئەو مێوانانەی دەمی ترسی ١٩٦٦ ڕابوردوو لە بیر خۆیان نەبەنەوە.

لە ژیاندا گەلێک حاڵەتی ئەوتۆییم دیتووە کە کابرایەکم پێ گەیشتووە مەرحەبای نەکردووە وەهام زانیوە نامناسێت، کەچی دوای چەند ساڵێک کە ناوم کەوتۆتە کووچە و بازاڕەوە دەبینم هەمان کابرا هێندەم شارەزایە بۆ شەشەم پشتیشم دەچێتەوە و جۆراجۆر خەبەراتی باوکم و باپیرمی لایە. من لەمەدا پەرۆشی خۆمم نییە چونکە بە مەرحەبای لابەلایی نە زیاد دەکەم نە کەم، من پەرۆشی «مرۆ» مە کە بێلزووم دەرگەی برایەتی لە ڕووی خەڵق دەبەستێ.

لە تەجرەبەمدا هەیە وێنەی هەرە لێڵ و مۆن، هەیشە زێدەگەش. لەو ڕۆژانەی «مەجلیسی خدمە»م، پێویست داخوازی کرد بچمە لای وەزیری ئیعلام، کە ئەوسا

د. مالک دوهان ئەلحەسەن بوو. من ئەم پیاوەم نەدیتووە، هەڵبەت بێبڕ لە زێ نادەم لێی بپەڕمەوە، داوام لە مامۆستا ئیحسان شێرزاد کرد- ئەوسا وەزیری بەلەدیات بوو لەو وەزارەتەی کە عەبدولڕەحمان عارف خۆی سەرەک وەزیران بوو- کە ژوانێکم بۆ لە وەزیری ئیعلام وەرگرێت، دوای چارەکێک مامۆستا ئیحسان گوتی سبەی سەعات هەشت چاوەنۆڕت دەبێ. من لە سەعات هەشت چارەکێک کەم گەیشتمە ژووری خاتوون سکرتێرەکەی، سەلامم کرد وەڵامی نەدامەوە، نەشیگوت بەخێر بێیت. کابرایەکی لا بوو قاوەی دەخواردەوە، هەڵبەت قاوە و چایەی بۆ من داوا نەکرد... دوای کەمێک پێم گوت من لە خۆوە نەهاتووم، وەزیرێک پێی گوتووم کە وەزیری ئیعلام لە سەعات هەشت دەمبینێت. وەزیر گەیشتە ژوورەکەی، خاتوون چووە ژوورەکەوە، پاش دەقیقەیەک هاتەوە لای خۆمان گوتی، وەزیر عوزر دەهێنێتەوە ناتوانێ بتبینێ، هەڵستام گەڕامەوە دایەرەی خۆم.

کاک ئیحسان لێمی پرسی دیتنت لەگەڵ وەزیری ئیعلام چۆن بوو... گوتم نەیهێشت بچمە لای... گوتی ئیهانەی تۆی نەکردووە هی منی کردووە... پاش نیو سەعاتێک تەلەفۆنی کردەوە کە لە بەردەمی شایەدان چی پێ گوتوە و پێ کردووە، وەزیری ئیعلام سوێند دەخوات کە سکرتێر تێی نەگەیاندووە هەر ئێستاش قسەت لەگەڵدا دەکات و دەشیەوێ بێتە لات. دوای دوو دەقیقە تەلەفۆن لێی دا خاتوون سکرتێر گوتی، «سیادە الوزیر» دەیەوێ قسە بکات و دەستیشی کرد بە خۆپەڕاندنەوە کەوا بەو هێندە سوێند و قورئانە تێم گەیاندووە کێ هاتووە و چۆن هاتووە. گوتم خاتوون سەلامم کرد وەڵامت نەدایەوە، نەتگوت بەخێر بێیت، لەو قسانەدا بووین وەزیر هاتە خەت یەکسەر کەوتە عوزرخوازی و «هذ المسخمة الوجة ما فهمتني و... و» هەر ئێستە دێمە لات. گوتم «سیادة الوزیر» هاتنت بێلزوومە، چ گلەییشم لێت نییە چونکە تۆ خۆت ڕاڕەوەی ڕەفتاری خۆتت هەڵبژاردوە، من گلەییم لە خۆمە کە گەیشتمە ئەم عومرە نەمزانی گەیشتنی یەکێکی وەکوو خۆم بۆ لای یەکێکی وەکوو تۆ واسیتەیەکی بەهێزتری دەوێ لە وەزیرێک... هەر هەتا بێدەسەڵاتانی ئەم وڵاتە تووشی هەڵوەستی وەها عەیبدار نەکەم دەرگام کردۆتەوە بۆ «کل من هب و دب من رواندز الی الفاو» بێ سکرتێر و بێ ئیستیعلامات و بێ دەرگە لێ دان...
چەندێکی ویستی کەلێنێک بکاتەوە بۆ ئاشتبوونەوە ڕێم نەدا. هەر نەبێ لەبەر ئەوەی

که من ئادەمیزادێک بووم سەرم بە دەرگەی وەزیرێکی وڵاتی خۆمدا گرت، چ دەبوو ڕێزی نەشکاندبام... ئەم جیهانی سێیەمە کەنگێ شەیتانی پێ پێدەکەنێ!

ڕۆژنامەی «تەئاخی - التآخي» کە لە سەرەتاکانی حەفتاوە دەرفەتێکی دا و سێ گوتارم تێدا بڵاو کردەوە بە ناوی «واقعي»... پێبەپێ لە گوتارێکەوە بۆ یەکێکی دیکە تێهەڵدەکشیم. خەڵقێکی زۆریش چاوە چاوەی بوون، هەمووشیان زانییان من نووسەریانم. هێندێکیان بە تەلەفۆن و هێندێکیان بە سەرلێدان پیرۆزبایی یان لێ کردم. گوتاری چوارەمم بە لای خۆمەوە شتێک بوو تا ئەو دەمە وێنەی ئەوم نەنووسیبوو، داخەکەم «تەئاخی» تەقیەی کرد لە بڵاوکردنەوەی... داخی دووەمم ئەوەیە کە نوسخەم لێ نەپاراستووە با بڵێم نوسخەی کە هەبوو لێم بزر بوو... ئەمە دووەم خەسارەیە پاش نەمانی نوسخەی «تحية الشهداء»ی نەورۆزی ١٩٤٩ کە لێم دەکەوێت و جێگەشی پڕ نابێتەوە.

دەشێ تەجرەبەی من لە نووسین جودا بێ لە هی تۆ وەیا لە ئەوانەی خامە بە دەستیانەوە وەکوو بلوێری بلوێرژەنە هەر لێی داواکرا بین بە بلوێرەوە دەنێت، ئەویش بەپێی کە لێی داوا دەکرێ خامە لەسەر کاغەز دەگێڕێ. من لە نووسینی خەست هەتا دەروونم نەکوڵێت هیچی وەهام بۆ نانووسرێت کەڵکی پێوە بێت. بارتەقای سەرکردنی کەفوکوڵی هەناوی پەنگ خواردوو بە ژان و ژواری مەراق هێز و پێز و بڕشت و ئاراییشت لە پلووسکی قەڵەم تاڤگە دەبەستێ، وەهاش بووە کە زۆر ڕۆچووم لەو لێکدانەوانەی وەک زڕەخەونیان لێ دێت و پتر دەبنە شەبەنگ لەوەی زادەی مەنتیقی بە کێشانە و پێوانە بن. هەستم کردووە بە لێک ترازانی شەخسیەتی هۆشیارم و شەخسیەتی هەستیارم، قەڵەمیش دەکەوێتە پەنجەی هەستەوە و تەرجەمەی خوتخوتەی هۆش دەکات.

جوانکاری لە نووسیندا مەلۆتکە شیرمژی ئەو بارە خز و لەقەی کشت و سڵە... هەر نەبێ بەرداشی من هەتا گەرم ڕانەیی ئاردی ورد ناهاڕێ. مامۆستا حەمە سەعید خەفاف لە شارەزایی خۆیەوە بەو نووسینانەی لە ڕۆژنامە و گۆڤاری جێگەیەکی وەکوو بەریتانیا دەردەچێت گوتی، گوتاری سێیەمت کە لە «تەئاخی«ی ئەو ساڵە دەرچوو لە ڕیزی هەرە پێشەوەی نووسینی سیاسیی ئەورووپا دێت، یاخود گوتی لە ڕێکاری ئەو نووسینانەدایە. لە نرخاندنی مزەشەوە گوتی، کەمتر لە ٢٥٠ دینار بەو گوتارە نادرێت (٢٥٠ دیناری ١٩٧٠...). دەسا ٢٥٠ فلس و یەک فلسیشم پێ

نەگەیشت. ئەمە دەڵێم بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی گۆشەیەکی نابەرچاوی ژیان و گوزەران و بەسەربردنەوە نەک بۆ خۆ هەڵدانەوە، هەرچەند لەو حیکایەت گێڕانەوەیەدا خۆهەڵدانەوە پەیدایە خۆ وەک ڕۆنەکاڵە نییە لە دۆی بەرمەشکە بگیرێت و هەڵگیرێت و کەس نەیبینێت.

دوای بەیانی ئازار مەرسووم دەرچوو بە دامەزراندنی «مجمع علمي كردي». لایەنی شەرم و شکۆ وەهای کرد کە کۆمەڵەی سەرپەرشتیکەری دەرهێنانی مەرسوومەکە لە کوردەکان براچووکەیی «مجمع كردي» لە ئاست «مجمع عراقي»دا بەدەر بداتەوە لەوەدا کە پاداشی ساڵانەی سەرۆکایەتی و ئەندامەتیی «مجمع كردي» کەمتر بێ لە هی عێراقی. سەرۆکی مەجمەعی عێراقی ساڵانەی هەشتسەد دینار و ئەندامی عێراقی چوارسەد دینار بوو، هی کوردی بۆ سەرۆک پێنجسەد دینار و بۆ ئەندام سێسەد دینار ساڵانە داندرا... لەو ساڵانەی دوایی وام بیستەوە کە مەعاشی مانگانەی ئەندام لە سێسەد دیناری تێپەڕاندووە، لێیان پیرۆز بێت. زۆر جێگەی دڵخۆشییە کە پاداش لە زیادبووندا بێت مادەم بەرهەم لە کەم بوونەوەدا بێت...!

من یەکێک بووم لە ئەندامانی کارای «مجمع كردي» وێڕای وەزیفەم لە مەجلیسی خدمە... ڕۆژانی سەرەتا بە ساردی و بێئیشی تێپەڕی هەتا «نظام داخلي» داندرا و دیوانی سەرۆکایەتی هەڵبژێردرا. مامۆستا عەلائەددین سەجاددی لە هەوەڵ ڕۆژەوە کە ناوی ئەندامان زاندرا و بە مەرسووم بوون بە ئەندام ویستی ئیستیقالە بدات، بە هەموو باوەڕەوە دەیگوت، یەکێک لەو ئەندامانە هی ئەوە نییە کەس بتوانێ لەگەڵیدا ڕێ بکات. من و برادەرێکی تر بە زەحمەتێکی زۆر لەو نیازەمان گێڕایەوە. دەیگوت، ئێستە باوەڕتان بە قسەکەم نییە دواتر تێدەگەن چەند لەسەر حەقم... قسەکەشی ڕاست دەرچوو.

بەپێی ژمارە یەکی گۆڤاری «مجمع كردي» قانوونی مەجمەع لە ٢٩/٨/١٩٧٠ دەرچووە لە ١٧/٣/١٩٧١ ئەندامانی دیوانی سەرۆکایەتی لەلایەن ئەندامانی مەجمەعی عێراقی و کوردییەوە هەڵبژێردراون، مامۆستا ئیحسان شێرزاد بوو بە سەرۆک لە سەرەتاکانی حوزێرانی ١٩٧١، من خزمەتم لە مەجلیسی خدمەوە «اعارة» کرا بۆ مەجمەعی کوردی.

مەجمەعی کوردی لە دانیشتنێکی دوور و درێژی ئەنجومەنی مەجمەعدا ناوی «کۆڕی زانیاری کوردی»ی بۆ پەسەند کرا، پەسەند کردنەکەش لەوەوە بوو کە بڕیار درا زاراوەی بێگانەی بۆ بەکارنەیەت بۆیە بوو «ئەکادێمی» بە لاوە نرا، لەو وشانەی کە بە خەیاڵدا هات «کۆڕ» لە هەموان پوختەتر و گورجتر بوو. بە گوتار وەڵامی ئەو ڕەخنانەم دایەوە کە لە ناوەکە گیرابوو تا ئەوەی مامۆستا تۆفیق وەهبی لە بەهاری ١٩٧٩ چوومە لای لە لەندەن پێمی گوت، وەکوو محامی دیفاعێکی باشت لە ناوەکەی کۆڕ کرد، بەڵام خۆی هەر ڕازی نەبوو لە ناوەکەی دڵیشی یەشا کە پێشنیازی ئەو «ئەنجومەن» مان پەسەند نەکرد. ئێمە «ئەنجومەن» مان بۆ «مجلس المجمع - ئەنجومەنی کۆڕ» دانا. خێرەومەندێکی زیممەت شلۆق بردبوویە مێشکی مامۆستا وەهبییەوە گۆیا من لە هەموو کەسێک پتر دژی ئەو و ڕایەکانی ئەوم، کەچی باوەڕم نییە چ کوردێک هێندەی من ئەو مرۆیەی بەلاوەوە مەزن بووبێت.

د. کەمال مەزهەر یەکەم کەس بوو لەلایەن ئەنجومەنی کۆڕەوە کرا بە ئەندامی یازدەمین و ئەمینی گشیی کۆڕ. پێشتر نەمدیتبوو. لە هەوەڵ یەکتر دیتنەوە دیار بوو دانوومان بەیەکەوە دەکوڵێ. ئیعارەی خزمەتم بۆ کۆڕ وەختێک بوو کە وێڕای ئەندامەتی کارا، بووشم بە «ئەندامی تەرخان - عضو متفرغ» کە بریتییە لە وەزیفە، هەرچی ئەندامەتیی ڕووتە بە وەزیفە داناندرێت بۆیە بوو کە شیا بە سیفەتی ئەندامەتیم لە «مجلس الخدمة» ئەندامی کاراش بم لە کۆڕ هەروەهاش زوربەی ئەندامەکانی دیکە چونکە لە شێخی خاڵ و ئەندامێکی تر بەولاوە، ئەندامەکانی دیکە هەموو موەزەف بوون. یەکەم دیوانی سەرۆکایەتی منی تێدا نەبووم بەڵام ساڵێکی برد و نەبرد من بووم بە نایبی یەکەمی سەرۆک، د. کەمالیش بوو بە ئەندام تێیدا. بە دەرچوونی مەرسوومی جمهووری لە ناوی ئەندامەکان، یەکیەتیی ئەدیبان کە زوربەیان سەربە چەپ بوون هەڵپرژانە ڕەخنەی قورس. وەکوو جەنگی خاچپەرستان ئەم شەڕە بەردەوام بوو هەتا خوا حەزی کرد و کۆڕی زانیاری کوردی لە ناودا نەما، ئیتر لەنگەری داد و چاکە ڕاست ڕاوەستا و کورد و میللەتانی جیهان بە مافە بنەڕەتییەکانیان گەیشتن، هەرا کوژایەوە و دڵان ئۆقرەیان گرت. ئەوە خۆش بوو کە جارێ کۆڕ کۆنەبووبۆوە تا بزاندرێ چاک دەکات یان خراپ، نووسەران کەوتنە گیانی.

وەک بەرەو دوا سەیری مێژووی ئەو چەند ساڵەی پاش دەرچوونم لە کۆڕ دەکەم بەش بەحاڵ خزمەتم بە سەقافەتی کوردی بێت بۆ من تێی خێر بوو کە خانەنشین کرام، چونکە مەشغەڵەتی کاروباری کۆڕ کە بەشێکی زۆری کارگێڕی و ڕێکخستن و «کتابکم، کتابنا» و سەرێشەی ڕازی کردنی ئەم و ئەو و چشتی ئەوتۆیە کەوا نەک هەر پێوەندیی بە سەقافەتەوە نییە بگرە ڕێگەش لە سەقافەت دەبڕێتەوە جگە لەوەی کە بەشێکی نووسینەکانم لە هەشتاکاندا لەگەڵ وەزیفەدا نەدەگونجان، لێرەدا دەشێ بگوترێ باری زۆر لە باری کۆڕ بۆ نووسین و بەرهەمی سەربە سەقافەت، لە خانەنشینیدا دەست ناکەوێت، بەتایبەتی کە چاپخانەکەی لە بنەوپاڵەوە گەورەترین یاریدەدەری خێرایی کردنە لە بڵاوکردنەوەی نووسین، قسەکەش لە سنووری خۆیدا ڕاستە ئەگەر تێبینیی گەلێک شتی لاوەکی ناجۆر و ڕەزا قورس حیسابەکە نەشێوێنێ. بەڵام بە تێکڕایی لەلایەن سوودی سەقافیی خۆمەوە ڕەها بوونم لە گرێکوێرەی وەزیفە یاریدەدەرێکی گەورەی دەست کرانەوەم بوو پتری بۆ تێهێنامەوە لە چاپخانەی بنەوپاڵمەوە.

بێگومان ئەگەر وەزعێکی وەکوو هی کۆڕم بۆ ڕێک بکەوێت بە مەرجی نەبوونی وەزیفە بەرهەمدارتر دەبم لەوەی لە ماڵێکی ڕەق و تەقدا بە دەسەڵاتی کەمەوە ئازادیی بێوەزیفەیی بەکار بهێنم، ڕەنگە بێ تۆیش وەکوو من بیت بەڵام من لە تەنهایی و دەرنەچوون لە ماڵەوە، بگرە لە ژوورەکەی خۆم، بێتاقەت نابم. هەر دەڵێی تەبیاتی منداڵی کە خۆی بە شتی زێدە بێفەڕ و بێکەڵکەوە دەخافڵێنێ لە مندا مابێتەوە، چونکە شتی ئەوتۆ دەمخافڵێنێ وەیا سەرنجم دەکێشێ بە خەیاڵەوە بەند نابێت.

زۆر جار لە تەنهاییدا دەمەتەقە لەگەڵ ناحەزێکی خۆم هەڵدەستێنم. ئنجا چونکە من پتر لەو شارەزای عەیب و عاری خۆم هەم باشتر دەتوانم خۆم سەغڵەت بکەم هەر چونکە دەشزانم گەلێک زوڵمی کە بە قسە و نووسین لێمی دەکات دەچێتەوە بۆ باوەڕە چەوتەکەی نەک چڵکنیی دەروونی (جگە لە بەعزە کەسانێک کە تیجارەت بەو تەرزە ناحەزییەوە دەکەن) پتر ماندوو دەبم لە پاکانە بۆ خۆ کردن، چونکە دەبێ لە وتووێژەکەدا باوەڕە چەوتەکەی بگۆڕم ئنجا تەمام هەبێ بە گۆڕانی بیروڕای بەرانبەرم. سەعاتەها وەها دەبێ بە تەنها بیردەکەمەوە لە کۆمەڵگەی ئادەمیزاد کە لە دوارۆژدا هەموو زادەی منداڵدانی شووشەی دەسکردبن و کەس باوک و دایک و

خزمی خۆی نەناسێت، دایک و باوک منداڵیان نەناسنەوە، ئاخۆ ئەو کۆمەڵگەیە چ شکڵێکی دەبێت؟ خۆشەویستنیی بێ «زایەند - جنس» چی لێ دێتەوە؟ ئایا دەشێ ئەوسا ڕەحم ببزوێ بۆ مرۆی «قتوپەستی ناو شووشە» وەک کە ئێستا ڕەحمان دەبزوێت بۆ مەلێکی باڵ شکاو؟

بەر لە دوو حەفتەیەک کە دەکاتەوە سەرەتای نیسانی ١٩٨٨، گێرکەیەک لەسەر مێزی نان خواردنی مەتبەخ تەنگی پێ هەڵچنیم چەندی خەریک بێت بە خۆراکەکەمەوە هەڵبگەرێت و من لێی دوور بخەمەوە ناچار ویستم پەنجەیێکمی لێ بکەم بە پلاری بێ ئازار لە مێزەکەی هەڵدێرم کەچی پلارەکە لووس و لێک نەهات و گێرکەکە دوو سێ سانتیمەتر بانگلۆزی دا و وەستا بەڵام ڕۆیشتنی وەزەحمەت کەوتبوو. بەینێک خەریکی عوزرخوازی بووم لەو گێرکەیە ئەمما عوزر نە قەشمەری. بە ئەسپایی خستمە سەر پەڕۆکێکەوە و بردمە جێگەیەکی بێخەتەر بەڵکوو لەوێ شیفای بێت. پاش دوو سێ ڕۆژی دیکە گێرکەیەک لە هەمان سەرمێز پەیدا بۆوە. ئەمجارەیان زارم لێ نزیک خستەوە، فووم لێ کرد و لە مێزەکە بێ ئازار کەوتە خوارەوە. ئنجا ئەگەر کوڕی شووشە بین و بە مەکینە بەخێو بکرێین، عوزر بۆ گێرکە دەهێنینەوە؟ شەڕ و ئاشتی و ڕووتاندنەوە و چەوساندنەوە و ڕەتاندن و داڵدەدان و دڵداری و... و... چییان لێ دێت؟ بازاڕی بێباوک و سەرای بێدایک و کێڵگەی بێبرا و کارگەی بێخوشک چ شێوە ڕەفتاریان دەبێت.

کۆڕی زانیاری کورد کەوتە چالاکی، لەگەڵ جیهانی ڕۆشنیریی دەرەوە پێوەندی مەحکەمی پەیدا کرد. لە زۆر بنگەی سەقافییەوە نامە و دیاریی بۆ دەهات، بەتایبەتی لە یەکیەتیی سۆڤیەتەوە، بایی کتێبخانەیەکی کتێب بۆ هات. د. کەمال مەزهەر لەم مەیدانەدا دەستێکی باڵای هەبوو. جارێکیان وەفدێکی سۆڤیەتی بە سەرۆکایەتی سەرۆکی ئەکادێمی سۆڤیەتی سەری لە بەغدا دا، کە هاتە دیدەنیی کۆڕی زانیاری عێراق. د. عەبدوڕڕزاق موحیەددین بە دوا ئێمەیدا هەنارد کە بەشدار بین لەو یەکتر دیتنەدا لەگەڵ د. کەمال مەزهەردا چووین. ئێمە بەسەر وتووێژدا چووین، ڕەدەڵ و بەدەڵێک بووبوو. د. عەبدوڕڕزاق قسەی بەخێرهێنان و موجامەلەی تەواو کرد، ڕێی دا بەو خەڵقە نۆرەی خۆی وەربگرێ، یەکێک لە ئەندامانی کۆڕی عێراق بە ڕاوێژێکی گلەمەندانەی زەقەوە گوتی، لەوەتەی لە شەستەکانەوە پەیمانی سەقافی لە نێوان عێراق و سۆڤیەت بەستراوە هەتا ئێستا هیچ

شتێک لە ئێوە بە ئێمە نەگەیشتوە. سەرۆکی وەفدی سۆڤیەتی پیاوێکی وێچووی ڕەنگ بەگزادانەی قسە ئارام بوو، پێوەی دیار بوو توانجەکەی لێ گران هات گوتی، لەو ماوەیەدا من بەرپرسی ئەکادێمی سۆڤێتیم هەتا ئێستا لە ئێوە نە هیچ داخوازییەک و نە هیچ دیارییەک بە ئێمە نەگەیشتووە کە تێیدا بووبێتە جێگەی گلەیی وەیا درێغی…

من قسەم کرد، وەها بۆم سازا کە قسەکانم لە چەژی مێوانەکان خۆش بێت. گوتم خۆشبەختانە ئەو کەمتر پێوەندییەی نێوان ئەکادێمیی سۆڤیەتی و کۆڕی زانیاریی عێراق – کە جێگەی پەرۆشە – کۆڕی زانیاری کورد کەلێنەکەی پڕ کردۆتەوە بەو پێوەندییە بەهێز و بەردەوامەی کە لەگەڵ بنگە سەقافییەکانی سۆڤیەتیدا بەستوویەتی تا ئەوەی مەکتەبەیەکی ڕێکوپێکی لە کتێبی دیاریی سۆڤێتستان پێک هێناوە… کە هاتمە سەر باسی کۆڕەکەمان گوتم، کۆڕی زانیاری کورد لە دوو نوختەدا جودا دەبێتەوە لە هەموو بنگەیەکی وەکوو خۆی کە لەم جیهانەدا پەیدا بووبێت. یەکەمیان ئەوەیە کە ئێمە لە هیچەوە دەست پێ دەکەین، سەحرایەکمان لە پێشە دەبێ بە درەخت سەوزی بکەین، نوختەی دوەم ئەوەیە کە… خوێنەر باوەڕت بێت ئەو نوختەیەم لە مێشک سڕابۆوە تا ئێستا نازانم چی بوو، بەڵام بێ ئەوەی بوەستم وەیا کەس هەست بکات مەبەستم لە دەست داوە، نوختەیەکی دوەم خۆی ڕەپێش کرد بێگومان لەو نوختە تاربوویە گەلێک پەسەندتر بوو، هەر بە دەم قسەکانەوە، بێ هەڵوەست گوتم… ئەوەیە کە ئێمە هەر لە سنووری کوردستانی عێراق دەتوانین توێژینەوە لە سەقافەتی کوردی بکەین، هەرچی کوردستانی ئێران و تورکیا هەیە بە ڕووماندا داخراوە، ئەمەش تاوانی سیاسەتە دژی زانست. مەزنەکەی سۆڤێتی لە وەڵامدا بە ڕووی خۆشەوە قسەی دۆستانەی کرد و ئاواتی گەشە کردنی بۆ کۆڕەکەمان خواست و لە ئاکامدا گوتیشی ئومێد دەکەین ڕۆژێک بێت سیاسەت نەتوانێ غەدر لە زانست بکات…

کۆڕ بەپێی هەندێ لە ماددەکانی یاساکەی دەبوو پێوەندی بە بنگەی سەقافی ناوەوە و دەرەوە، بەتایبەتی هی وڵاتی عەرەب، پتەو بکات. لەمەوە بڕیار درا کە چەند ئەندامێکمان هەر یەکە سەر لە وڵاتێک بدات. من سووریە و لوبنان و میسرم بەرکەوت. پێشتر لەگەڵ ڕەوشەن بەدرخان شناساییم هەبوو. بەر لە سەفەرم بۆ شام بە بروسکە خەبەردار کرا کە ئێوارەی ١٠/٧/١٩٧١ بەڕێ دەکەوم. کە

گەیشتمە فرۆکەخانەی شام ڕەوشەن خان و مەمدووح سەلیم و زوهێر زولفۆ، زاوای ڕەوشەن خان، چاوەنۆڕم بوون. فێنکایی و سەوزایی شام لە چاو گەرما و ڕەنگی خۆڵەمێشی دەوری بەغدا پتر بە لای بەهاردا بوو. لە ئۆتێلی سەمیرئەمیس، نزیکی «معرض دمشق الدولي» دابەزیم.

ئەو ئێوارەیە لە ئۆتێل چەند سەعاتێکی خۆش و گەشمان ڕابوارد تا ئەوەی مەمدووح سەلیم کە پیرێکی پێستەڕی چاوگەشی هەشتا ساڵی بوو (ڕەنگە نەختێک کەمتر) بە گوتەی خۆی لە دەمێکی دوورەوە هەستی بەو جۆرە بووژانەوەیە نەکردبوو لە دڵ و نەفس و لە مجێزی خواردن و خواردنەوەشدا. مەمدووح لە تێکۆشەرانی کوردی تورکیا بوو، لە ترسی مەرگ ڕای کردبوو بۆ سووریە و ژیانێکی قەلەندەرانەی ڕادەبوارد. لە کتێبخانەکەیدا هەرچی شتێکی باسی کوردی تێدا بووبێ و دەستی کەوتبێ پارێزرابوو. لە ناچارییەوە ئافرەتێکی تورکی مارە کردبوو بە دەستییەوە نارەحەت بوو ئیتر بە زۆری لە کتێبخانەکەی ڕادەبوارد. زۆر بە پەرۆشەوە دەیگوت، کە مردم ئەو هەموو سەرچاوانەی بە خوێنی دڵ پەیدام کردوون پەرتوبڵاو دەبن... من ویستم کۆڕ کتێبخانەکەی لێ بکڕێت، هەم بۆ پاراستنی کتێب و نووسراوی کە تێیدا هەبوو هەم بۆ حەسانەوەی ئەویش لە کۆتایی ژیانیدا بە نرخی کتێبخانەکەی گوزەران بکات. بەڵام هەوڵەکەم بێسوود بوو، ڕاستییەکەشی ئەوە بوو کە دوای چەند ساڵێک بەسەردا مرد کتێبەکانی بوونە قاوت و ڕەشەبا.

سبەینێ ڕەوشەن خان73 و مەدووح بەگ لەگەڵ شیرینی نەوەی ڕەوشەن خان هاتنەوە لام. شیرین کچێکی قوتابیی پۆلی سێیەمی ناوەندی بوو بەڵام هۆشی کراوەتر بوو لە تەمەنی. هەتا بڵێی لەو ڕۆژانەی مانەوەم لە شام یاریدەی دام بۆ ئاسان کردنی هاتوچۆ و گەڕانم بێرە و بەوێدا، ئەمما چونکە لەشێکی باریک و وەرزشیی هەبوو تا ئەوەی لە غاردان پاداشتی یەکەمی وەرگرتبوو دەبوو هەمیشە لە ڕۆیشتنندا هەنگاوم فرەوان و خێراتر بکەم هەتا لێی دانەبڕێم. بۆ بێتاڵعی ڕێگەمان بەرەو ماڵەکەیان سەرەو هەورازیش بوو، لە گەشت و گەڕانیشدا زۆر جار تووشی هەوراز

---

73- لە ١/٦/١٩٩٢ کۆچی دوایی کرد. سینەم خان-ی کچی ڕۆژمەرگەکەی پێ گوتم.

دەبووین ئیتر حاجی قادر گۆتەنی: «ئەسپی کۆن زەحمەتە دەرچێ لەگەڵ ئاهوو» ڕەوشەن... دایکی شیرین، ئوسەیمە، لە بابڕا بەدرخانی نەبوو. دواتر ڕەوشەن خان شووی بە جەلادەت بەگ بەدرخان کردبوو. باوکی شیرین کوردێکی سووریەیی، ئەندازیار، بوو لە بنەماڵەی زولفۆ.

دە ڕۆژان لە شام مام. لەو ماوەیەدا ڕۆژانە ڕەوشەن خان و مەمدووحم دەدیت. چەندێکی بەیەکەوە ڕێگەمان بڕیبایە جانتا قورسەکەی مەمدووحم هەڵدەگرت، وەی کە حەزم دەکرد یەکێکی سووکتر هەڵگرێت.

ڕەوشەن خان چەند کتێب و نووسراوی هەبوون دەیەویست بیکاتە دیاری و پێشکەش بە کۆڕی بکات بەڵام نەدەشیا بە پۆستەدا بینێرێت لە ترسی تێدا چوون وەیا دەسکاریی «ڕەقیب». تەنها ڕێگەی سەلامەت ئەوە بوو کە بە پۆستەی دیپلۆماسیدا بۆ بەغدا بەڕێ بکرێت. بەیەکەوە چووینە سەردانی سەفیری عێراق، ناویم بە چاکی لە بیر نەماوە، دەترسم هەڵەی تێدا بکەم بۆیە نایڵێم. چەند بڵێی مرۆیەکی ژیر و بەڕێز و خزمەتگوزار بوو. کە تەکلیفەکەم لێ کرد گوتی، «على العين والرأس...» گوتیشی لزووم نییە ڕەوشەن خان بە هێنانیانەوە ماندوو بێت بۆ سەفارەت، لە سەفارەتەوە خەڵک دەنێرم بۆ بەستنیان و هێنانیان... هەوڵی دا داوەتم بکات. لەبەر بێدەرفەتی نەپەرژام قبووڵی بکەم. ڕەوشەن خانی بۆ ئاهەنگی چواردەی تەمووز داوەت کرد (دواتر زانیم بە ئۆتۆمۆبیلی سەفارەت هاتوچۆی داوەتەکەی پێ کردبوو). پاش گەڕانەوەی بۆ بەغدا هەموو نووسراوەکان لە چەند جاردا بە پۆستەی دیپلۆماسی، بێ ئەوەی کرابێتەوە، گەیشتنە کۆڕ.

چونکە کژی هاوین و پشووی حەسانەوەی بنگە سەقافییەکان بوو هەر ئەوەندەم پێ کرا سەردانێکی «مجمع اللغة العربية»ی شام بکەم، سەرۆکەکەی و یەک دوو ئەندامی ببینم. ڕەوشەن خانم لەگەڵ بوو... لەو ڕۆژانەدا دوو جاران چوومە سەردانی قەدری جەمیل پاشا. بە ناوی خۆم و کۆڕ ڕێزم پێشکەش کرد. ئەوەندە کەیفی بەو سەردانە هات باس ناکرێ، تەنانەت پێی داگرت لەسەر هەندێ کە کورسییەکەی بۆ لێ بخوڕن هەتا دەرگەیماڵەکە بۆ بەڕێ کردنم. باسی سەفەری خۆی بۆ مەهاباد گێڕایەوە کە لە گەڕانەوەدا بە کۆیە و هەولێر و مووسڵدا تێپەڕیوە. لە هەردوو جاردا «ڕەوشەن»م لەگەڵدا بوو... ئەکرەم بەگ جەمیل پاشا، برای قەدری پاشا و «قەدری جان»ی نووسەری کوردی سووریا هاتنە لام لە ئۆتێل. دانوویان

لەگەڵ ڕەوشەن خان نەدەکولا هەرچەند ڕەوشەن کەموزۆر باسی نەکردن بە چاکە نەبێت...

چوومە زیارەتی گۆڕی مەولانا خالد. ویستم لەسەر دیواری ناوەوەی کوبنەتەکەی شتێک بە قەڵەم بنووسم. چەندی کردم مەرەکەبی قەڵەمەکەم بەسەر لووسیی سپیکاریی دیوارەکەوە نەقشی نەبەست. ئاوڕێکم لە قەبرەکەی مەولانا دایەوە و گوتم، بۆ ناهێڵیت یادگارم لات بمێنێت خۆ بە دڵی سافەوە هاتووم؟ شەوێکیان چوومە لای عەدنانی خەلیل بەگ مردم، خۆی و خاتوونەکەی زۆریان بەخێرهێنام. تەمای سەفەری قاهیرەم ڕێی کردەوە کە عەدنان بەگ نامەی سفارەش بنووسێت بۆ یەک دوو ناسیاوی لە «مجمع اللغة العربية»ی میسر. عەدنان لە نەزەر حکوومەتی ئەوسای شام وەکوو کۆمەڵەی دەسەڵاتداری سەردەمی پێش تەمووز لەلایەن حکوومەتی عێراقی پاش تەمووزەوە سەیر دەکرا، بەڵام گومانم نەبوو لەوەدا کە سەقافەت و ئەدەب و پەروەردەی عەدنان بە شۆڕشەکەی سووریە دروست نەکرا. مەجلیسی ئەو شەومان زۆر خۆش بوو...

چەند جاران لەگەڵ شیرین کە وەها دەبوو مەمدووح بەگیشمان لەگەڵدا دەبوو چووم بۆ کتێبخانەی «ظاهرية». دەرفەت و مەودای پشکنینەوە لەو هەزار کتێبە نەبوو کە بزانم چەندی بە کەڵکی کۆڕ دێت. هەندێ کتێبم دیت لە باسی مەولانا خالید و لە باسی زاواکەی کە لە جەلیزادان بووە، برازای مەولانای خواستووە، لە سێبەری یادگارەهای کە لە کتێبەوە، دوای پتر لە ١٥٠ ساڵ ڕۆژگار، جلوەی دەبەست بۆ بەرچاوی زەینی خوێنەر. ڕێم بوو هەندێک بۆ ناو دەروونی شیرین بڕۆم، هەستم کرد هەڤاڵێکی هاوتەمەنی خۆی لە کوڕانی پلەی خوێندنی ناوەندی بەگەرمی دەوری دەدا. لە وتووێژدا بە شیرینم گوت کە تەمەنی پازدە شازدەساڵی زۆر شلکە بۆ ئەوەی قورسایی ماڵ و گوزەران و منداڵی دوارۆژێکی نزیک هەڵبگرێت. قسەکەی لەو دەمەدا سەلماند بەڵام زۆری نەبرد شووی پێ کرد و بە زووییش دەستیان لێک بەردا پاش ئەوەی کوڕێک لەو پێوەندییە بەرهەم هات... لە زۆر باری دیکەی ژیان لەگەڵ شیرین دەدوام، هەندێ جار بە مجامەلە لێم وسکت دەبوو. لەدڵدا ڕایەکی دیکەی دەبوو... پاش ڕاستهاتنەدیی قسەکەم لە بارەی ئەو پەلە کردنەی مەسەلەی شوو کردن، وا دیار کەوت، بیری لە گەلێک قسەی دیکەم کردبۆوە پاش

وردبوونەوە لێیان سەلماندبوونی. لەوە بەولاوە کە نامەی بۆ دەنووسیم بە ڕستەی «استاذي الاول في مدرسة الحياة» دەچوە ناو وتوویژەوە...

شام شارێکی ڕوحسووکە و فێنک و کرایەوە بوو، دانیشتوەکانیشی پتر بە لای شارستانەتیدا چووبوون. وێنەی کۆنە خانووەکان و بازاڕەکان و سەرا و دایەرەکانی حکوومەتی کە لە سەردەمی تورکەکانەوە مابوونەوە، لە چاو هی بەغدا، گەلێک بەولای جوانی و ڕێکی و هونەردا دەچوونەوە تەنانەت باڵەخانە نوێکانیشی هەر یەکە گیان و هەست و چەژێکی دەدایەوە، کەسایەتیی ئەندازیارەکەی بە دەنگ دەهێنا نەک تۆپەڵەیەک لە چەمەنتۆی شیشەڕێژ و دەرگە و پەنجەرەی حازر بەدەست.

ئەوسا شام ئەوەندە هەرزانیی تێدا بوو داوەتێکی شەوانەی پێنج نەفەری بە بەخشیشەوە پێنج دینار و نیوی تێچوو. جێگەی ڕابواردنی ئەو شەوەمان بەسەر ڕێگەی بەرەو «بێرووت»ـەوە مەیلەو لە دەرەوەی شام بوو، بە ئەسڵ خانووی «ناظم القدسي» بوو پێیان دەگوت «القصر» ئێمە لە تەختاییەکی دەرەوەی خانووەکە دانیشتین کە تەنیشتێکی گردێک بوو لێی داتاشرابوو وەکوو دیواری لێ هاتبوو لە هەمووی ئاو دەچۆڕایەوە، جۆگایەکی چەند ئاشگێڕیش بە ناویدا ڕەت دەبوو هەمووی وەک بەفراو بوو. لە زوەوە هەستی سەرمامان کرد، کەس نەیتوانی چاکەت فڕێ بدات ئەگەر هەبایە سەربەرگیش پێویست بوو. دیار بوو شۆڕش خانووەکەی لە «ناظم القدسي» داگیرکردبوو. هەڵبەت بەوەندەش لێ نەگەڕاوە... بێگومان دواتر کەسانێکی لە شۆڕش بە ڕووت بوون چەندین جار بە قەدەر ناززم و باوکی ناززمیش پڕوپاتاڵی دنیایان لە خۆ ئاڵاندوە بەڵام کوردی دەڵێ، دیزەی کابان بیشکێنێ تەقەی لێوە نایەت.

ڕۆژی ٢٠/٤/١٩٧١ چێشنگاوێک بوو، لە پێشەوەی سەیارەیەک بە تەنها سوار بووم بۆ بێرووت بەڕێ کەوتم. کۆمەڵەی ناسیاوەکانم زوو هاتنە لام هەتا ماڵاواییبوون. ڕێگا بەرەو لوبنان چەندێکی لە ڕۆژهەڵاتی شاخەکان بە دیوی سووریادا بوو سەوزایی بە دەورەوە کەم بوو مەگەر درەخت و شینایی ئاوییە. کە نزیک بووینەوە لە ڕووکاری دەریا پارچە هەور پەیدا بوون و زیادیان کرد. کە کەوتینە دیوی دەریا سەوزایی درەختی شاخەکان خۆی نواند. لە نوختەی سەر سنووری لوبنان پاسپۆرتی خەڵقەکەیان سەیر کرد... ناوی منیان بە بەرزی دەربڕی، جودا بوومەوە. لە ژووری بەرپرسەکانی سەر سنوور پێیان گوتم، پاسپۆرتەکەت خەریکە کاتی بەسەر دەچێت

بەپێی یاسا دەبوو بتگێڕینەوە بەڵام نەشیا ئەندامێکی «مجمع علمي» دڵشکستە بکەین، تکامانە لە بێرووت سەردانێکی سەفارەتی عێراق بکە مەودای کارامەیی پاسپۆرتەکەت بۆ درێژ بکەنەوە. منیش وەهام کرد.

کە کەوتمە دیار بێرووت و دەریا جیهانێکی بەهەشترەنگی تریفەییم دیت. وڵاتێکی گەش، بە هەر لاتدا دەنۆڕی ئاوەدانی و شادی و ئارایشت بوو، دەیان گرد و تەپۆلکە و لاشان و قەدپاڵ شاخەکان کۆشک و عیمارەت و خانووی قەشەنگیان بە سەرەوە، ڕێچکەی ئۆتۆمۆبیلیان وەکوو مێروو بۆ دەچوو. چەندین شوێنی ڕابواردنی هەمەچەشنەی منداڵ و گەوران بە تەنیشت ڕێگای ڕێبوارەوە لە گەرمەی خۆشگوزەرانیدا بوون هەر دەتگوت لە کەسەوە دیار نین، کەسیش دەخلی بەسەریانەوە نەبوو، پارچە بەهەشتێکی خودادای و مرۆکرد لەو شاخ و دەریا و شیو و دۆڵانەدا خۆیان بۆ بەر نیگای ئاشنا و بێگانە گامەڵاس دابوو، بێ خەم و خەیاڵ هەناسەی حەسانەوەیان هەڵدێنا. دوای کە ئاشکرا بوو، بۆ چاوێکی وردی بخوێنایەوە، کە ئەم هەموو زەوق و شادی و شارستانەتی و گەشە و تێری و پێشکەوتن و سەرەژوورچوونە، وەکوو ماسی بە ئەوەکی مامە ڕۆژهەڵاتە ناوەڕاستەکەی خۆماندا ناچێت. وەک کە ئەحمەد شەوقی بە زاری یەکێک لە کەسانی ناو چیرۆکی شانۆگەری «مجنون ليلى» لە ئاست مەدحی لم و وشتری بیابانەوە دەڵێ: «ان هذا الحرير كثير على الرمة البالية»، هەروەهاش بە هەشتی لوبنان لە دۆزەخی ڕۆژهەڵات و جیهانی سێیەم گەلێک زیاد بوو. وەک مەتەڵی کوردی دەڵێ: «یەک پای لە دەشتێ دوو پای گەیشتێ یەخستیە سەر پشتێ». درندەیی و ژەهری هەناوی بێگەنی لە کونە بۆقڕی نەفسی ترش هەڵاتووی دوژمنەکانی مرۆڤایەتیی خۆماڵی کفنێکی بە باڵای لوبنان تەنی و تێی وەرپێچا لە شڵتاغی خوێنی فرشتە و پەریەکانی هەڵکێشا...

لە ئۆتێلێکی ناونجیی ناو شاری بێرووت دابەزیم. یەک دوو کاغەزی پێ ناساندنم لە ڕەوشەن خانەوە بۆ هەندێ دۆستی خۆی هێنابوو، بەر لە هەموان خاتوونێکی بەساڵداچوو بوو (ناویم لەبیر کردووە) لەو کوردانەی دەمێکی نیشتەجێی لوبنانن، هەر خەبەری منی پێ گەیشت زۆری نەبرد کیژێکی پۆلی پێنج وەیا شەشی سانەوی، هات بۆ لام لە ئۆتێل. بەیەکەوە چووینە لای ئەو خاتوونە... زۆریان بەخێرهێنام و پێمەوە خەریک بوون. ئەو کیژەش تا ڕادەیێک بۆم بوو بە شیرینی شام... لەگەڵ

ماڵی «شاتیلا» شناساییم پەیدا کرد. هەرچەند خێزانی خاوەن ماڵەکە چاوەنۆڕی منداڵبوون بوو دیسانەوە بۆ ڕۆژی دواتر داوەتێکی شەوانەی بە هاتوباتی کردم لە ئۆتێل وەیا لۆقنتەی «یڵدزلر». ئەو «مشهیات»ـەی لەسەر مێز داندران بایی سێ داوەتی دەکرد... بەداخەوە لەبەر ناچاربوونی خێزانەکەی بۆ نوستن لە خەستەخانە نەمتوانی داوەتیان بکەمەوە. بۆ دوو ڕۆژی دیکە بە منداڵێکی نێرینە لەو بارەی ڕزگار بوو هەر بە هۆی ئەو خاتوونەوە پێوەندیم بە «حەسەن المولا»وە کرد کە کوردێکی چالاک بوو. لە نێوان گرووپی کوردە سەربەخۆکانی لوبنان کە سەریان بۆ هیچ لایەنێک دانەدەنواند و بە سازی کەس هەڵنەدەپەڕین، هاتە لام و بردمیە یانەی کوردان کە ناوچەی کۆمەڵەی دۆستایەتیی کورد و لوبنانییەکان بوو. کیژی ئەم حەسەنە شکڵی لە گۆڤاران بڵاوبووبۆوە کە لە میهرەجانێکی فۆلکلۆری کوردی دەوری یەکەمی ئافرەتانی وەرگرتبوو. هەر کە چوومە ناو یانەکە یەکێکم دیت دەست بەجێ زانیم ئەو کیژەیە.

حەسەن منی گەیاندە لای خوالێخۆشبووی ئەحمەد موختار بابان و بردمیە «بحمدون» بۆ ئەو ئۆتێلەی چەندین برادەری کوردی عێراقی لێ دابەزیبوون. ڕۆژێکیان نیوەڕۆژە و جارێکی دیکەش نانی شەوانەم لەگەڵ ئەو برادەرانە خوارد. کرێی شەوانەی ئۆتێلەکە لە بەرزایی هەزار مەترێک بە ژووری نەفەری و توالێت و سێ جەمە خواردن دەوری دوو دینار بوو... حەسەن یەکجار پیاوەتیی «کمال جنبلاط» ی بۆ گێڕامەوە کە لەگەڵ کوردەکانی لوبنانی کردوە و دەیکات. نیازم بوو سەردانی بکەم، لە بێرووت نەبوو...

بەهۆی پشووی هاوینەوە هەرچی بنگەی ڕۆشنبیری هەبوو لە بێرووت دەرگەی داخرابوو نەمتوانی سەربە هیچیاندا بگرم هەر لەمە و لە داخرانی بنگەکانی شامەوە دیار بوو هی میسریش هەروەهان ئیتر بڕیارم دا سەفەرەکەم کورت بکەمەوە، پێنج ڕۆژ لە بێرووت بەسەر چوو بێ هیچ سوودێک. چوومە «خطوط جوية عيراقية» بۆ گەڕانەوە گوتیان پاش مەغریب فڕۆکەیەکمان لە لەندەنەوە دەگات... ڕۆژەکە جومعە بوو بازاڕی هەموو شتێک مەیلەو داخرابوو، بازاڕەکەی میوەش هەروەها، حەزیشم لەگێلاس بوو دیسانەوە بیکەمە دیاری. لە ئۆتێل ئەم قسەیەم کرد و گوتیشم شارەزانیم لە کوێ میوە دەفرۆشرێت. ڕێبوارێک قسەکەی بیست گوتی دووکانێک هەیە بەڵام بەزۆری گێلاسی سوور نەک هی ڕەش لە جومعاندا

دەفرۆشێ ئەگەر دەتەوێ من دەچم بۆی، زۆر سپاسیم کرد و پارەی پێویستم دایە. بەرێ کەوت پەشیمان بوومەوە چونکە بە بیرمدا هات لەوانەیە کابرا پارەکە بخوات، بەڵام شەرمم کرد گومانەکەم دەربڕم. دەوری سەعات و نیوێکی پێ چوو، کابرا هاتەوە بە گێلاسی ڕەشەوە، چەند شەرمم لە خۆم هاتەوە کە پێشەکی کابرام دایە بەر گومان کەچی لە پاک پاکتر دەرچوو. چەند کردم هیچی لێ وەرنەگرتم ڕازی نەبوو قاوەیەکیش بخواتەوە، دوعاخوازی کرد و ڕۆیشت. بە پێچەوانەی قسەی خەڵق کە باسی فێڵبازیی خەڵقی لوبنانیان دەکرد، تەجرەبەی من لەگەڵیان دەتگوت لەگەڵ فریشتەدایە. لە هیچ یەکێکیان بایی زەڕڕەیەک خواریم نەدیت، لە هیچیان وشەیەکی ناخۆشم نەبیست.

ئەو ڕۆژەی چوومە سەفارەت بۆ نوێ کردنەوەی پاسپۆرتەکەم تاکسییەکم ڕاگرت لێخوڕەکەی داخوازیی کرێیەکی کرد بە زۆرم زانی، کابرا زانی عێراقیم، بەو کرێیە ڕازی بوو کە من بۆم دانا. دەرچوو مەودا بۆ سەفارەت، بە عەکسی خەیاڵی خۆم ئەوەندە دوور بوو کرێکەی ئەویش گوتبووی لێی زیاد نەبوو، ئەوساش بە خۆمدا شکامەوە بەڵام لێخوڕەکە ڕازی نەبوو هیچی زیادی بدەمێ. لە ئۆتێل خزمەت دەکرام بێدریغ. لە بۆیەکانەوە بە هیچ جۆرێک پەلەی بەخشیش وەرگرتن دەرنەچوو، لە خۆمەوە بە ئارەزۆ بەخشیشم دەدانێ یان نا، کە نەشم دابانێ دواتر درێخییان لە خزمەت نەدەکرد. ڕۆژی گەڕانەوەم چەکێکی مشەختی «تراڤلەرچێک»م دایە کاتبی ئۆتێل، فاتورەی ڕێک خست بە ڕێکی و بێ زیادی و دەوری شەست پاوەنیشی پێ دامەوە، گوتم بە حیسابتدا وەرەوە، کابرا ڕەنگی گۆڕا و گوتی، سید! فێڵت لێ نەکراوە... چەند جاران پێم گوتەوە باش ورد ببەوە لە تێکڕای حیساب، کەوتە سوێند خواردن. گوم براله تۆ وات زانی چەکەکەم چەکی سەد پاوەنییە کەچی پەنجاییە، تۆ پەنجا پاوەنت زیاد لە حەقی خۆم پێ داومەتەوە.

شەوێ دەوری نیوەشەو گەیشتمەوە ماڵێ، چونکە ماڵەکەشم لە «مدینة الشرطة» دوور لە هاتوباتی ناوەندی شارە، خامۆشییەکی نائاشنای پێوە دیار بوو.

شەوی نێوان ٢٥ و ٢٦ی تەمووز لە دەمێکدا کە بەلای ماڵی خۆمانەوە لە قاهیرە گەشت و گەڕان دەکەم سەلامعەلێکم لێکردن... سەفەر سەلامەت!!

گوتارێکم لە ڕۆژنامەی «ئەلتەئاخی» بە عەرەبی بڵاوکردەوە لە قاڵبی سەفەرم بۆ شام کە بەشی هەرە زۆری لەسەر مەمدووح بەگ بوو. نوسخەی ئەو ژمارەیەی تەئاخیم بۆ هەنارد، لە وەڵامدا نامەیەکی چوار لاپەڕەیی وردنووسی بۆ هەناردم کە لە ناو وتووێژدا مێژووی ژیانی خۆشی تێدا بوو. ئەوەندە بەو گوتارە گەشابۆوە پڕ بەدڵ گوتبووی «ترد الروح». نامەکە لە کۆڕ مایەوە ناشزانم چی لێ بەسەرهات. ئەم گوتارەم دوای چەند ساڵێک بە بۆنەی مەرگی مەمدووح بەگ لە ژمارەیەکی گۆڤاری کۆڕدا بە دەقی خۆی بڵاوکرایەوە.

هەوڵێکی نەزۆکم دا بۆ سوود وەرگرتن لەو گەڵاڵەی فەرهەنگی کوردی کە خوالێخۆشبووی مامۆستا گیوی موکریانی ڕەشنووسی کردبوو. دەمڕاستی لیژنەی فەرهەنگ بووم، بڕیارمان دا لەسەر دەردەستخستنی ئەو گەڵاڵەیە، پێوەندیشم بە مامۆستا گیو کرد و «عربون»یشم بۆ هەنارد (دووسەد دینار)، زۆر زۆر بەداخەوە کە من ناچار بووم لیژنەی فەرهەنگ چۆڵ بکەم بۆ ئەوەی کاروباری لیژنەی چاپخانە و گۆڤار بە ئەستۆوە بگرم (چونکە نەدەشیا ئەندامی کۆڕ لە سێ لیژنە پتر سەرپەرشتی بکات منیش لیژنەی زمان و لیژنەی ئەدەبیشم بە ملەوە بوو). یەکسەر دوای من لیژنەی گۆڤار بە سەرپەرشتی لێکردنی دەمڕاستێکی دیکە کە ئەندامی کارای کۆڕ بوو بڕیاری کۆنی هەڵوەشاندەوە لە بارەی فەرهەنگەکەی «گیو»ەوە. مەرحووم هاتە لام بە کوڵێک پەژارەییەوە، ئەو دوو سەد دینارەی بۆم هەناردبوو بێ ئەوەی دەستی لێ درابێت و لە هەمان زەرەفدا کە خۆم پارەکەم تێ خستبوو نایەوە دەستمەوە بە چاوی تەڕەوە گوتی، ئەم ڕۆژەم لەبەرچاو بوو، ئەمە پارەکە بە دەقی خۆیەوە بۆتی دەهێنمەوە، وای کە کاری تێکردم بەڵام چ سوود!!

مەشغەڵەتم لە کۆڕ بە زۆر ڕووکاردا بوو، لە لیژنەی ئەدەب و قامووس و لیژنەیەکی زمان دەمڕاست بووم. کۆبوونەوەکانی هەر لیژنەیەک پاش نیوەڕۆ دەبوو، لەبەر ئەمە بە زۆری نیوەڕۆیان لە کۆڕ دەمامەوە چونکە نەمدەتوانی هەموو ڕۆژێک دوای دەوام بچمەوە ماڵێ و دیسان بگەڕێمەوە بۆ سەرپەرشتی کردنی یەکێک لەو لیژنانە جگە لەمە کۆبوونەوەی دیوانی سەرۆکایەتی و هی ئەنجومەنی کۆڕیش زێدە ئەرکێکی دەخستەوە سەر ئەرکی بێوچانی لیژنەکانەوە.

بەپێی بڕیارێکی ئەنجومەنی کۆڕ تۆژینەوە لە شیعر و ژیانی حاجی قادر و نالی بە من سپێردرا، توێژینەوەی ئاڤێستاش بە ئەندامێکی دیکەی تەرخان سپێردرا. من لە

١٩٧٢ ەوە دەستم دایە نووسین لەسەر حاجی و لە ساڵەکانی دواتردا وێڕای حاجی، «نالی»یشم بە گوتار خستە پەڕاوێزی جێبەجێ کردنی فەرمانی سەرشانم. نووسینم لە بەشی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی»دا کەوتە ڕۆژانێک کە خوشکێکم دووچاری دەردێکی کوشندە بوو. لەو دەمەڕا کە خۆی خستە بەر دەستی دکتۆر بۆ تەداوی تا ئەو دەمەی لە ١٤/٧/١٩٧٢ گیانی سپارد نزیکی دوو ساڵی پڕ لە ئازار و سفتوسۆی بەسەر برد کە ئێمەی ئەهلی ماڵەوەش وەک خۆی بۆی بە ئازار بووین. چەندەها جار کە ئێشی بێئامان زیرەی لێ هەڵدەستاند نە خەو نە خۆراک نە تاقەتی نووسینم پێ دەما. بیستودوو ڕۆژی ڕێک لە گیانەولاَدا بوو.

وابزانم مەرحووم نافیز لە ٤/٧/١٩٧٢ پێککەوتنەوەی ئۆتۆمۆنێل زەدەی کرد و لە پاش سێ، چوار ڕۆژان جوانەمەرگ بوو، ئا لەو ڕۆژانەدا ئێمە شەو و ڕۆژ بە دیار ئەو خوشکەوە بووین بێچارە و بێدەسەلاَت ئاخۆ مەرگی بێبزە کەی دوا دەستی لێ دەوەشێنێ.

مەرگی ئەو خوشکەم قسەیەکی پێغەمبەر (د)ی بە بیردەهێنامەوە کە دەیگوت: «أنا ابن الذبیحین» کە دەکەن عەبدوڵا و ئیسماعیل. خوشکەکەی منیش وەهای بۆ ڕێککەوت کە لە منداڵیدا جارێکیان دووچاری نەساغیەکی زۆر قورس بوو. پوورێکم یائامینە، دوەم پوورم لە تەمەندا خۆی بە دەوریدا گێڕا و لە خوای داواکرد بیکاتە بەلاَگێڕی ئەو برازایەی نەکا دڵی کاکی بسووتێ، قوربانییەکەی قبووڵ بوو.
خوشکەکەم لە نەساغییەکەی هەڵستایەوە ئەو پوورەشم کۆچی دوایی کرد. جارێکی دیکەش کە عەمەلیەتی بۆ کرا، دایانی خۆی، ئەو «عەیشێ»یەی سێ خوشک و برایەکمی گەورە کرد، لە دەوری گەڕا بە هەندێک خشڵی زێڕەوە. عەیشێ مرد و خوشکەکەم بۆ ماوەی چەند مانگێک نەساغیەکەی خامۆش بوو هەتا لێی هەڵدایەوە و نەجاتی نەدا، لەوەوە دەمگوت ئەم خوشکەی منیش «بنت الذبیحین»ە.

سبەینەی چواردەی تەمووز، سەعات هەشتی بەیانی خوشکەکەم گیانی دەرچوو... عەسر بوو گەیشتینە کۆیێ. حەفت ساڵ و دوو مانگ و یەک ڕۆژ بوو کۆیەم نەدیتبوو چونکە لە ١٣/٥/١٩٦٥ لێی دەرچوو بووم. لەو بەینەدا کە چاوم لە مەودای دەشتودەر ڕاهاتبوو کاتێک لە هەیوانەکەی «قصر»ی مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد بۆ تازیە دانیشتین دەتگوت گردی باویان و گردی دەرمانا و چیای چنارۆک لە شار نزیک بوونەتەوە وەک کە بە دووربین سەیریان بکرێت وەها

دەهاتنە بەرچاوم. لە سێ ڕۆژەیدا کە ئافرەتان چوون بۆ سەر قەبرەکەی کۆتەڵێکی لە شێوەی ئافرەت و بە ئاڵوواڵا ڕازاوەیان وەکوو دروشم لەگەڵ خۆیاندا برد و شینێکی بێدادیان بۆ گێڕا.

تازیەی کاک نافیز جارێ پاشماوەی مابۆوە چونکە حکوومەت و حیزب تێیدا بەشدار بوون. من بروسکەی پرسەم لێ دابوو بۆ بنەماڵەی حەوێزی، لە تازیەی خۆماندا مەئمووری پۆستە گوتی، بروسکەکەم وەرگرت، بە غەیری خۆم نەبێ ئەو عەرەبیە زەحمەت بوو وەربگێڕێ. پوورزام، کازمی فەتاحاغای حەوێزی، بروسکەکەی بۆ هێنام کە بۆی بخوێنمەوە، دیتم وەها تێکەڵ پێکەڵ کراوە سەرەدەری لێ نەدەکرا بەڵام خۆم بێگومان دەمزانی چیم نووسیوە. ئەم کاکە کازمەی پوورزام بە مەراقەوە نووسینەکانی منی دەخوێندەوە و چی کەوتبایە دەستی دەیپاراست تا ئێستاش هەروەهایە. تومەز مەئمووری پۆستە هەر چونکە نەیزانیبوو بروسکەکە چ دەڵێت، بەلایەوە ڕاست و دروستی وەرگرتبوو...

تازیەکە نەختێک درێژەی بوو، جاران لە کۆیێ تازیە سێ ڕۆژی دەخایاند. لەوەتەی ئۆتۆمۆبێل و ڕێگەی قیرتاو پەیدا بوون پرسەکاران، بە گشتی لە دوور و نزیکەوە بەشدارییان لە تازیاندا دەکرد بە مەشدا درەنگتر بەسەر دەچوون. پاش گەڕانەوەم بۆ بەغدا کەوتمەوە سەر باری ئاسایی لە خەریکبوونم بە چالاکیی لیژنەکان و بەردەوامبوون لە نووسینی بەرگی یەکەمی حاجی قادر، لەو ناوەشدا هێرشی ناحەزەکانی کۆڕ لە توندوتیژیی خۆی بە تەکان بوو.

یەکێک لە بنێشتۆکەی زاری ڕەخنەگران ئەو چوکڵەی سەر دەنگی «ر»ی قەڵەو بوو کە کۆڕ لە ڕێنووسی پەسەندی کردبوو، پەسەند کردنەکەش لە هیچەوە نەبوو. بڕیار درا هەموو نیشانەکان لە سەرووی پیتەکانەوە بن بەڵکوو بایی ئیمکان دێڕی خوارتر مەودای ڕەهای پتر بۆ بمێنێتەوە لەوەی کە نوختە و نیشانەکانی ژێرەرە لێی داگیر بکەن بۆ خۆیان. ڕاستییەکەی وەها خۆش بوو کە ئەگەر شیابا نە نوختە و نە نیشانە هیچیان بەکار نەیەن، کە بەکاریش بێن هەر نەبێ تێکڕایان لەسەرەوە بن.

گرفتی گەورەش لە نووسینی ڕێنووسی کوردی و عەرەبی، بەتایبەتی هی کوردی، لەوەدایە کە پیتەکانی «ا، د، ذ، ر، ز، و» بە پیتی دوا خۆیانەوە نانووسێن و وشەیەک دەبێ بە چەندین کەرت لە نووسیندا، ئیتر نووسەر هەر خەریک دەبێ

قەڵەم هەڵبئەنگێوێ وەک کە ڕەسام فرچەکەی لە ڕووی تەختە بەرز دەکاتەوە. تۆ سەیری وشەی «ئۆتۆمۆبیل» یازدە جاران قەڵەمی تێدا هەڵدەبەزێتەوە. ئنجا جارێ ماویەتی لە کوردیدا ڕستە چۆن بنووسرێت، لە نموونەدا: «دەم گرت، دەمگرت. هەڵم گرت، هەڵمگرت. دەستم گرت، دەستمگرت».

کۆڕ ویستی بەپێی داخوازی سروشتی «د»ی ئایندە و «هەڵ»ی پێشگر و «دەست»ی وشەی سەربەخۆ مامڵەتیان لەگەڵدا بکات. هەرچی «د»ی ئایندە و «ب»ی ئیلتیزام (وەک بگرە) و «مە»ی نەهی و «نە، نا»ی نەهی و نەفییە بە بەشێکی پێکهێنەری بنەڕەتی کار دابندرێت و هەرگیز لێی جودا نەبێتەوە. پێشگریش بە وشەوە بنووسرێت هەتا شتێک دەکەوێتە نێوانیانەوە ئنجا جودا ببنەوە وەک «هەڵگرتن - هەڵم گرت» وەیا «پێنەزانین - پێزانین» وشەی سەربەخۆش هەمیشە جودا بکرێتەوە وەک «سەر کەوتن، ماڵ دزین». من لە نووسینی خۆمدا کە بەشێکی زۆری لە بڵاوکراوەکانی کۆڕدا کەوتنە بەرچاوی خوێنەران مەیلەو بە درێژی لەم لایەنانە دواوم. ئێستە ناشێ لە یادداشتدا بۆیان بچمەوە، مەبەست بە بیرهێنانەوەی ئەو هەرایە بێ جێ و ڕێیەیە کە یەخەگیری کۆڕ بوو لەسەر ڕێنووسێک کە ئێستە هیچی لەو چاکتر (وەیا وەکوو ئەویش) نەهاتۆتە کایەوە کەچی پاش نەمانی سەربەخۆیی «کۆڕی زانیاری کورد» کەسێک لەو ڕەخنەگرانە دەنگی نارەزایی بەرز نەکردەوە.

بەڵێ بێگومان خامۆشبوونی ڕەخنەی ناحەزانە ڕێکەوتێکی چاکە بەڵام دیاردەکە عەیبدارە. لەو باوەڕەدام ئەگەر زمانی کوردی لە دواڕۆژدا بە بەریەوە دەبێ پێی بنووسرێ پێویستە ئێستاکەی لە بێژنگ بدرێتەوە چونکە عەیبی زەقی تێدایە کە دەخلی بەسەر نەگونجانی هەندێک لایەنی ڕێنووسەکەوە هەیە لەگەڵ داخوازیی لایەنی ڕێزمان.

لە لێکدانەوەی دەوڵەمەندبوونی دیوانی نالی لە دیاردەی گیا و گوڵ و وێنەی دەشتودەر لە چاو دیوانی «حاجی قادر»دا بۆ ئەوە چووم کە نالی ساوایی و منداڵیی خۆی هەتا تەمەنێکی کە خوێندن بۆ شاری بردبێت هەر لە لادێ بەسەر بردووە، بۆیە ئەو هەموو دیمەنەی سروشت بە شیعر دەداتەوە. حاجی قادریش بە منداڵی چووە بۆ شار، هەر بایی شاعیرێکی شارنشین لە گوڵ و گیا و دەشتودەر دەدوێت. ئینجا لێرەدا «لا باسێک» خۆی سەپاند بۆ ڕەواندنەوەی گومانێک کە بیەوێ بڵێ

شاعیر کۆیلە وەیا قوڕەچەورەیە بە دەست دەوروبەرەوە. ویستم لەو لاباسەدا ڕوونی بکەمەوە کە تاکە عامیلی ئیجابی لە هەموو جیهاندا هەر مرۆڤە، ئەوەندە هەیە مرۆڤ لە بۆ شاییدا ناخولێتەوە ئیتر دەوروبەر چی بێت مرۆڤ کاری تێدەکات، ئەگینا گوڵ و گیا لەو دەمەدا کە ولاغ لەسەری دەگەوزێت چەند بێدەسەڵاتە، کە شاعیریش لە هەڵبەستدا ناوی دەبات هەمان بێدەسەڵاتە... ئەم «لاباس»ـە حەفتا لاپەڕەیەکی خایاند، دواتر بوو بە بەرگی یەکەمی «مرۆڤ و دەوروبەر» کە پتر لە ١٧٠ لاپەڕەی گرتەوە. بەشی دووەمی کە هەمووی لە سەرچاوەی یەک کۆنە ڕستەی عەرەبیم «ولیس قصاری العقل ان یمتنع عن تفسیر الاشیاء التي لا یفهمها ولکن یفسرها تفسیرات خاطئة» کەوتەوە لە قەوارەی کتێبێکی ١٩٠ لاپەڕەیی، خەریکی ڕوون کردنەوەی دەوری وێرانکەری لایەنی سەلبی هۆش بوو. بەر لە دوورکەوتنەوەم لە کۆڕ ئامادەم کرد بۆ چاپ بەڵام هەتا ساڵی ١٩٨٠ نەلوا چاپ بکرێت...

ڕۆژنامەی «ئەلتەئاخی» بە نامەی پشتگیری کردن لە دێمۆکراسی بۆ هەموو عێراق هەڵمەتێکی برد بۆ کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی خاوەن بیروڕایان لەو بارەوە. وەک چاوەڕوان دەکرا ئەو ڕایانە دەنووسران کە لەگەڵ ئەو مەبەستە بڕوات. یەک دوو نوێنەریان هاتنە لام لە کۆڕ بۆ هەمان مەبەست، لێم پرسین ئێوە ئامادەن چی بێ نووسینەکان ڕۆژنامە بڵاوی بکاتەوە؟ گوتیان بەتەمای چ بنووسیت؟ گوتم ئێوە دەتانەوێ شین و شەپۆڕی دیمۆکراسیی بەغدا و بەسرە و مووسڵ بەرپا بکەم، هەرچی منیشم پێشتر بۆ سلێمانی و هەولێر و قەڵادزە بە پەرۆشم، هەرچی بەغدا و بەسرەیە خاوەنی خۆی هەیە. ئایا ڕێ دەدەن ئێوە، داوا بکەم لێم بگەڕێن حیزبێک لە کوردستان قوت بکەمەوە، ڕازین ڕەخنەتان لێ بگرم؟ دەسەلمێنن لە هەڵەی چەکداران بدوێم... گوتیان نەخێر؟ گوتم منیش چ نانووسم! ئەگەر ڕێ بەو ڕەخنانە بدەن و بڵاویان بکەنەوە مەرج بێ چی بیزانم لە بارەی بەغدا و بەسرەیشەوە بینووسم، حیکایەتەکە لەگەڵ مندا بە مەندە کۆتایی هات.

لەو دەمانەدا بوو یەکیەتیی سۆڤیەت پێنج زەمالەی بە کۆڕ بەخشی، توانیمان چوار کەس بنێرین بۆ وەرگرتنی شەهادەی کاندیدات «دکتۆرا». زۆر مەتڵەب بوو یەکێکیان لە مێژووی «خووری»یەکان بکۆڵێتەوە کە من لەگەڵ کورد چ فەرقیان ناکەم چونکە هەر نەبێ خڵتەی ئەوان لە کورددا ماوەتەوە، خۆ نەبوون بە هەڵم و بە

ئاسماندا بڵاوببنەوە. بەداخەوە ئەو کەسەی بەتایبەتی تکام لێ کرد شەهادەیەکی هێنایەوە هەر دەڵێی پسپۆڕان بۆیان هەڵبژاردووە کە هیچ پێوەندی بە مێژووی کوردەوە نەبێت. خەفەتی سەرەدەری نەکردن لە چارەنووسی خووری و پێوەندییان بە کوردەوە هەتا ئێستا لەگەڵمدا دەژیت...

## ئاڵقەی هەژدەیەم

هاوینی ساڵی ١٩٧٣ کۆڕێکی سەقافی لەلایەن وەزیری کاروباری «اعمار الشمال»ـەوە لە شەقڵاوە گیرا بە مەبەستی وتوویژ و بیرورِا دەربڕین لە بارەی ئەلفبا و رِێنووس و سەروبەری سەقافەتی سەربە قوتابخانەکانەوە. لێم نەگەرِا هەتا ناچار بووم بچم بۆ کۆبوونەوەکە. من نووسینێکی خۆم خوێندەوە کە ئێستا لە بیرم نەماوە بە چ شێوە بۆ چارەسەرکردنی، وا بزانم بۆ ئەلفبا و رِینووس چووبووم، ئێوارەکانیش لە شکڵی موحازەرە گفتوگۆیەک لەو بابەتانە کران کە من تێیدا ئاخێوەر بوو، کەسانی دیکەش کە هەریەکە بابەتێکی ئامادە کردبوو سەرگەرمی ئەو کۆرِە بوون. لە ئاکامدا پاداشیان بەخشییەوە. بریتی بوو لە سەعات بۆ هەموو ئاخێوەرەکان، بەڵام بیلزووم سێ بابەتیان هەڵبژارد بە نامەی «بحث متفوق» سەروو سەعاتی گرانبەهاتریان پێ رِەوا دیتن.

نووسینەکەی من ئەگەر لەو پلەیەشدا نەبایە بە «مجاملة» هەر بە «سەرکەوتوو» دادەندرا، وەک لەبیرمە نووسینی مامۆستا نووری عەلی ئەمین و یەکێکی دیکەش، کە زۆر بەداخەوە لە بیرم نەماوە هی کێ بوو، سەعاتی «سەرکەوتوو» یان وەرگرت. د. عەبدولرِەحمانی حاجی مارف پاداشەکەی خۆی رِەفز کرد کە بە لایەوە نووسینەکەی کەمتر نەبوو لە پایەی «سەعاتی سەرکەوتوو». تارِادەیەکیش جۆرە رِەخنە و نارِەزاییش بوو لەو مامەڵەتجوادایيە. زۆریش لەسەر حەق بوو. وا بزانم چ مەبەستی موجامەلەش نەبوو کە نووسینەکەی منی هەڵاورد لە رِەخنە.

ئەمە دەڵێم چونکە ئەگەر مەسەلەکە خۆشمی تێ دەربەست نەبامایە هەر دەمگوت بەداخەوە سەعاتەکەم بوو بە دیاری بۆ یەکێکی کە ئەوسا دۆست بوو، دواتر دۆ و دۆشاوی تێکەڵ کرد... ئەو چەند رِۆژانەمان لە شەقڵاوە و لە پیرمەم بە خۆشی رِابوارد. شەوێک لە پیرمەم بووم بەڵام بە رِۆژ وەها دەبوو نیوەرِۆژەم لێ دەخوارد. دوای بەسەرچوونی هاتوباتی کۆرِەکە هەڵکشیم بۆ لای گەلاڵە و چۆمان. لە ماڵی سورەیای خوشکم دابەزیم، دوایین جار لە زستانی ١٩٧١ سەرم لەم ناوچەیە دابوو.

ئەوسا لە ماڵی زەیدی ئەحمەد ئەفەندی مێوان بووم. ئەحمەداغای حەمەد ئەميناغاشم رِەفیق بوو. حەفتەیەکی زۆر خۆشمان لێ رِابوارد. زەید خانووێکی بە

کارەبای لێ دروست کردبوو، کەرەستەی حەسانەوەی تێدا بوو وەک خانووی شار... بەزۆری لەگەڵ ئەو کەسانەمان ڕادەبوارد کە لە میزاجدا دەگونجاین. چەند ئەندامێکی کۆنە مەکتەبی سیاسی لە پاش بەیانی ئازارەوە لەو ناوچەیە گیرسابوونەوە لە هەموو دەرفەتێکدا بۆ لای یەکدی دەکشاین. کە ساڵی ١٩٧٣ لە هاویندا چووم زەید کەوتبووە بارێک هەر دەیەویست دەرفەتێک بدۆزێتەوە بۆ دەرچوون. ناحەزەکانی تەپکەیەکی قووڵیان بۆ نابۆوە هەتا لێی دەرهات و بۆی دەرچوو تێیدا سەغڵەت بوو. لەو هاوینەدا هەرچەند لە ماڵی خوشکم دابەزیبووم هەمیسان هەموو ڕۆژێک دیدەنیم دەکرد. ئەو بەینەی لەوێ بووم دایک و منداڵەکانیشم لەگەڵم بوون. بە عادەتی خۆم هەرچی لێقەوماو و سەغڵەت بوو بۆ لای دەچووم. کاکە حسێنی خانەقا و شێخ حسێنی حاجی سەیدگوڵ و هەندێک لە ئاغاکانی پشدەر، لە ناویاندا باپیری بابەکری سەلیماغا و عەلی عەسکەری و هی دیکەش لەوانەی دەمناسین و دۆستم بوون هەمیشە بە کۆمەڵ لای یەکێکیان نیوەڕۆژەمان دەخوارد... کە چوومە لای باپیراغا، لە گەڵاڵە، منداڵێکی تەمەن چوار پێنج ساڵەی وەهای بەخێر هێنام سەد ماشەڵای لێ بکەیت. زۆر کەوتە بەر دڵم، بە باپیراغام گوت بەرخوردار بێت کوڕەکەت زۆر ژیرە. گوتی، لە تەربیەی کۆنی ئەوەندەی بە بیر ماوە. قسەکە زۆر کاری تێکردم.

عەلی عەسکەری ماڵەکەی بەسەر ئەو باسکەوە بوو کە بەسەر ڕێگەی ئۆتۆمۆبیلیدا دەنۆڕێ. بە عادەتی خۆی هەر تریقەی پێکەنینەکەی ڕێنوێنیت بۆ ماڵەکەی خۆی دەکات... خۆشبەختانە لەو گەشتەدا دیدەنی «مەلا وەیسی»م کرد لە مزگەوتی گەڵاڵە. پێشتر بە ناو دەمناسی. مەلا وەیسی لە نەوەکانی مەلای ئیبنوئادەم بوو، مرۆیەکی ڕاست و بێفێڵ و مەلایەکی خواناس بوو، تەنانەت شکلێشی ڕەسەنایەتیی پێش سەردەمەکانی تێکەڵ بوون لەگەڵ لووزەوی شارستانەتی نوێی پێوە دیار بوو. لەحەدبەدەر پێمەوە گەشایەوە، هێندەشی ڕێز لێ نام شەرمەزاری کردم. منیش پڕ بە دڵ و بە هەموو دەروونەوە خۆشمویست. چەند سەعاتی گەش و خۆش و وێنە «تراخی»مان ڕابوارد لە نێوان دەوربەرێکی مسڵمانانەی پڕ لە مەلا و فەقێ و گفتوگۆی کوردانە. هەلم ساز دا جارێکی دیکەش چوومە سەردانی بەر لەوەی بە ناچاری وڵاتەکە بەرەو گەرمای بەغدا و سەرقاڵیی کوڕ بەجێ بهێڵم. بەداخەوە مەلا

وەیسی چەند ساڵێکی دیکە خەبەری مەرگی هات لە بارێکدا کە نەمدەتوانی بە نامەش پرسە لە خزمانی بکەم. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی.

لە پاییزی ١٩٧٣ موناسەبەی هەڵگرتنی پەردە لەسەر پەیکەری حاجی قادر داخوازی کرد بچم بۆ کۆیێ و گوتارێکی عەرەبیش بخوێنمەوە لە بارەی حاجییەوە بۆ بەر گوێی ئەو مێوانانە و ئەو کەسانەی لە مەئمموورەکانی کۆیێ کە کوردیی نازانن. هەرچەند مەودا زۆر بوو لەو ڕۆژەوە کە بڕیار درا ئاهەنگەکە بەرپا بکرێت تا ئەو ڕۆژەی لە ٢٩/١١/١٩٧٣ ئیحسان شێرزاد لە ئاهەنگەکەدا پەردەکەی هەڵگرت، من بۆم ڕێک نەکەوت ئەوەندە کاتە بەسەر یەکەوە بۆ نووسینی گوتارەکە تەرخان بکەم. شتێکی سەرەتایی کەمم بۆ نووسرابوو و هیچی دیکە. شەوی بەرایی ئاهەنگەکە، بە ناچاری، هەتا لە گوتارەکە نەبوومەوە نەسرەوتم. ئەم ڕێکەوتە بوو بە دووەم جار لە پاش ڕێکەوتی ئەو گوتارەی «تحية الشهداء» کە لە ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٩ خوێندمەوە. ئەویش شەوی پێش ئاهەنگەکە هەتا لای فەجر بە خۆیەوە خەریک کردم.

تەجرەبەم لەو بارانەدا، ئەگەر لەمپەڕم نەیەتە پێش، ئەوە بوو کە مەترسیی شەرمەزاربوون هێزێکی زیاد لە ئاسایی داوە بەوەندە بەهرەی «نووسەری» کە لە مندا هەبوو، نەک چەواشەی کردووم... لە دەمی ئەو ئاهەنگەدا سەد دانەیەک بە تازەیی لە بەرگی یەکەمی «حاجی قادری کۆیی» بڵاو کرایەوە. دوو ساڵ پێشتر هەر لە کۆیێ یادی حاجی قادر ئاهەنگی بۆ کرا و گەلێک نووسەر و تێکۆشەر تێیدا بەشدار بوو، من نەمتوانی سەفەری بۆ بکەم، گوتارێکی عەرەبیم بۆ ئاهەنگەکە نارد، یەکێک لەجیاتی من خوێندبوویەوە. هەر دوو گوتار، هی ساڵی ١٩٧١ و هی ١٩٧٣ لە لاپەڕە ١٢ هەتا ١٧، لە «اعادة التوازن الى ميزان مختل» دا بە چاپ گەیشتبوون.

پێداویستی ناچاری وەهای کرد گوتارەکان لەو کتێبەدا بنووسمەوە، هۆیەکەش ئەوە بوو خێرەومەندێک بوختانێکی گەورەی هەڵبەستبوو بەوەدا کە گۆیا من لە نووسینمدا «حاجی قادر»م بە خزمەتکاری دەرەبەگ لە قەڵەم داوە، ئەم دوو گوتارە کە بە عەرەبی و پێش ئەو بوختانەش نووسرابوون شایەدیی بۆ دەدام لای عەرەب و غەیری عەرەب کە فیشاڵی وەکوو ئەو بوختانە چەند نزمە لە چاو ئەو تۆقەڵانەی کە پایەی حاجی قادرم لە نووسینمدا گەیاندۆتێ.

نازانم زرە درۆی ئەوتۆیی چ تامێکی خۆش لە مەلاشووی درۆزن دەگێڕێ!
چۆناوچۆنیش بێشەرمی و حەیاتکان دەگاتە ئەو پایەیەی درۆی عەلەنیی تێدا بکرێ.
کە مرۆ ڕاستی و ئینسافی پێشێل کرد بۆچی درۆزنییەکەی بە پارە نافرۆشێ؟ چ
سوود هەیە لە درۆیەک بە دوو دێڕ نووسین هەڵوەشێتەوە، سەلکە تووریکیشی
نەخستبێتە گیرفانی درۆزنەکەوە؟ من مەبەستم لەو پرسیارانە تاکە کەس نییە
چونکە درۆی عەلەنی هەر لە دژی مندا نەکراوە، هەر لە نووسینیشدا
هەڵنەبەستراوە، بە پانایی و درێژایی دنیادا بەتایبەتی دنیای خەبات و تێکۆشان کە
لەخۆباییبوون و ناز بە خەباتەوە کردن پتر ڕێخۆشکەرەوەی بێباکییە، پەیتا پەیتا لە
نووسین و ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن (واتە هەرچی دەخوێندرێتەوە و دەبیسترێت و
دەدیترێت)، درۆی بێپەردە هەڵڕشتن، بۆتە هونەری حەفتەم یان هەشتەم یان
خاتری تۆ بێ هونەری بیستەم و سییەم.

عەجایب و سەد عەجایب، تێکۆشەر بە برسییەتی و لە مەترسیی مردندا بەسەر
دەبات و چاو ناترووکێنێ، کەچی لە ئاست ڕاستیدا وەک مەلی بەر بارانی لێ دێت،
زات ناکات بە زاری خۆیدا تێپەڕێنێت مادەم لەگەڵ دەقی ئینجیلە سیاسییەکەی
ڕێک نەیەت. نازانم، خەڵق باوەڕی درۆزنی بۆچییە کە حەسانەوەیشی تێدا نەبێت...
ئەگەر وەکوو ئایینە ئاسمانییەکان پاداشێکی پاش مردنی لەگەڵدا بایە بەجێ بوو.

لە دیمەنەکانی ئەو ئاهەنگە یەکێکیان وەها چەسپاوە لە مێشکمدا سڕینەوەی بۆ نیە،
ئەویش یادی چیهرەی «هێمن» چ لە دەمی خوێندنەوەی هەڵبەستەکەی چ لەو
دەمانەدا کە بەیەکەوە لە ماڵی کاکە مەجیدی ئامۆزام و شوێنی دیکەشدا لەگەڵ
برادەرانی ئەو دەمە، کوردی ئێران و عێراقیش، سەرگەرمی نوکتە و قسەی خۆش و
هەویای جەمی گەرم و چەوری کوردانەی نیوەڕۆژە دەبووین. من هەرگیز لە هێمن
تێر نەبووم. چەندێکی لە کۆڕیش بوو بە زۆری، دوو بە دوو وەیا لەگەڵ هەڤالان،
دیوانی وتوویژمان گەرم دەکرد.

هێمن هەڵبژێردرا بە ئەندامی یاریدەر و بەردەوام ئەندامی لیژنەی ئەدەب بوو.
پەنابەرانی برا کوردەکانی ئێران بۆ عێراق، جگە لە مامۆستا هێمن کە کۆڕ وەک
ماڵی خۆی بۆی کرابۆوە، تێکڕایان بە خاوەن ماڵ حیساب دەکران مامۆستایان
عەبدوڵای حەسەنزادە، حەسەنی قزڵجی (بەداخەوە کەم مایەوە لامان) و هی
دیکەش کە لیستەی ناوەکانیانم نەگرتۆتەوە، هەموویان لە پلەی برادەری بەرەو

خزمایەتییان تێپەڕاندبوو، هەر نەبێ جۆری بەیەکتر گەیشتنمان و یەکتر دواندنمان و بێتەکلیفی و سادەیی ڕەفتارمان لەگەڵ یەکتر ئەو هەستەی بە من دەگەیاند کە ئاشنایەتیی نێوان خزمان بە مرۆی دەبەخشێت، هەرگیز بە دڵمدا نەهاتووە کە پێوەندیی ڕەسمیم بە کۆڕەوە مافی خاوەنایەتیی ژوورەکەی دیوانی سەرۆکایەتی (کە هەمیشە تێیدا یەکدی گیری دەبووین) پتر بۆ من دێتەوە لەوەی بۆ ئەوان بچێتەوە.

ئەم زێدە خۆیاتی نێوانمان و هاتوچۆی ڕۆژانەمان بۆ کۆڕ و بایەخدان بە نووسینیان و بڵاوکردنەوەی بەرهەمیان و گەلێک لایەنی دیکەی ڕاگرتنی ڕێز و پایەیان هەلی ڕێک خست بۆ چەند سوارچاکێکی سەقافەتی کوردی کە ئیخبارییە بگەیەنن بە دایەرەی ئەمن دژی من، گۆیا «کۆڕ»م کردووە بە لکێکی «ساڤاک!»ی ئێران... بەپێی ئیخبارییەکە هەموو ئەو برا کوردەی پەنابەر بۆ عێراق جاسووسی مزەخۆری ساڤاکن... ڕاستییەکەی حیکایەتی لەوە بە تامتریشم لایە بەڵام چ سوود لە کوتانەوەیان وەرناگیرێ، ڕێگەش بە خۆم نادەم تاکە هەنگاوێک لەو ڕێگەیە ببڕم کە ئەوان بێپەروا پیاسەیان تێدا دەکرد. گوتراوە، حەیا قەترەیێکە...

لە سەرچاوەی بێگومانەوە ناوی زوربەی ئەو سوارچاکانەم زانی کە هێندێکیان بە زمان و هێندێکیان بە زمان و بە ڕاپۆرتیش خەریکی کۆڕ و خەریکی منیش بەتایبەتی بوون... دوو جاران ئیخبارییەی ڕۆشنبیرە گەورەکان کە بۆ تۆقەڵەکەی دەسەڵاتی دەوڵەت لە دژی من بەڕێ کرابوو سەرەژێر بۆوە بۆ لای کاربەدەستی بەرەخوار کە پشکنینەوەی تێدا بکەن. ماڵیان ئاوابێ ئەوان کاربەدەستە بچووکانە زۆر بە شەرمەوە دەهاتنە لام و بە ڕواڵەت چەند قسەیەکی عادەتییان دەکرد بە نامەی پرسینەوەی شێوەی ڕەسمی کە بایی وەڵام دانەوەی سەر کاغەز بکات... چ لەو بچووکانەوە بێت و چ لە کاربەدەستی هەرە هەورازی پشکنینەوە بێت هەموو شتێکم بۆ ڕوون دەکرایەوە....

سەیر لەوەدا بوو، ئەو ئیخبارییەنووسانە حورمەتی پووشکەیەکیان لای ئەو کاربەدەستانە نەبوو. بە چاوی هەرەنزم سەیریان دەکرا. لەمەوە تابڵێی بە خۆمدا دەشکامەوە کە دەمدیت بەشێکی بەپۆزی سەقافەتی! کوردی! تا ئەو ڕادەیە لە بەرچاوی غەیری کورد سووک و بێنرخ بێت، ئەشەدوبیللا نەمبیستووە یەکێکی عەرەب وەیا تورک خەبەری لە کۆڕ و لە من دابێت. هەروەها نەشمبیستووە لە ڕۆشنبیری ناودار بەولاوە چ کوردێک هێندە نزم بووبێتەوە.

ئەم تێبینییانەی بە دوا کاتەوە دەرمانی چ دەردێک ناکەن، ئێستاکە و دوارۆژیش سوارچاک هەن و دەبن لەو مەیدانە بێگەنەدا تەراتێنێ بکەن. دوور نەرۆین پارەکە کتێبولکەی «لسان الکرد» دەرچوو، جارێ بڵاو نەبووبۆوە سوارچاکان خەبەریان لێ دا و بۆ چەند ڕۆژێک وەستێنرا. مەبەستم لە دەربڕینی ئەم ڕاستییانە تەنها کردنەوەی چاوی خوێنەری دڵسافە بۆ سەر چاوەنداز بەڵکوو شارەزایانەتر لە دنیا ڕامێنێت...

لە برا کوردەکانی کوردستانی ئێران د. قاسملوو هەڵبژێردرا بە «ئەندامی کارا – عضو عامل»، بەپێی مادە ٩ی یاسای ئەوسای کۆڕ وا بزانم د. قەناتی کوردۆ زووتر هەڵبژێردرا بوو، مامۆستا «وەهبی»ش ئەندامی شەرەف بوو. د. قاسملوو چەندێکی لێرە بایە لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی کۆڕ بەشداریی دەکرد. مامۆستا «زەبیحی»یش، کە دەمێک بوو لە پەنابەری دەرچووبوو دۆستێکی ڕێزلێگیراو و لە دڵسۆزانی کۆڕ بوو. کۆڕ کەوتە سەر چاپدانی فەرهەنگەکەی، دوو بەشیشی لێ چاپ کرا، وشکایی هات بە کوژانەوەی چرای ژیانی خۆی، زۆر بەداخەوە.

مەراقێکی خۆم و فەرمانێکی سەرشانم، بە سیفەتی دەمڕاستیم لە لیژنەی ئەدەب، لێی خۆش هێنام کە بایەخی پڕ بە پێست بە بابەتی فۆلکلۆری بدەم. تەکلیفمان لە برادەرانی هەر ناوچەیە کرد کە چی چنگیان دەکەوێ لە بەیت و مەتەڵ و سەرگورشتە و قسەی نەستەق و ئەو تەرزە ماددانە هەیە بۆمان تۆمار بکەن و پێمانی بگەیەنن.ماڵیان ئاوابێ، بێدرێغ بە دەنگمانەوە هاتن. لە مانە مامۆستا ڕەئووف ئاڵانی بە شارەزایی تەواوەوە یارمەتیی داین و گەلێک پەند و مەتەڵی بە شەرحەوە بۆ هەناردین. هەر لەو دەمەدا بناغەی برادەریمان بە مەحکەمی چەسپا. سادق بەهائەددین، ڕەحمەتی لێ بێ، لە بابەتی سەربە زاری کرمانجیی سەروو بەهانامان هات... گەلێک لاوک و حیکایەتی بە ئاوازمان بۆ تۆمار کرا. برادەرێکی کوردی کوردستانی ئێران لە دەستەی مامۆستا هێمن نووسینییەوە بە جۆرێک بشێ بخرێتە ژێر چاپ. دوای بڕانی پێوەندیم بە کۆڕەوە ئاگام لێیان بڕا، نازانم بە چی گەیشتن.

ساڵ بەسەر دەچوون و کۆڕ تەکانی دەدا و چوار ساڵەی نێوان بەیانی ئازار و بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمیش دادەماڵا و باری ئاسایشی گشتی لەنگ دەبوو تا ئەوەی داوەمووی موعاوییە پسا و هەرا دەستی پێ کردەوە. لەو دەمانەدا بوو عەسری ڕۆژێک لەو ڕۆژانەی کۆبوونەوەی دوو لیژنە و بەدوا ئەوانیشدا هی ئەنجومەنی کۆڕم

هەبوو، ئاشنایەکی بەعسی، «عبدالرزاق الحديثي» و کارگێڕی گشتی لە مەکتەبی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش هاتنە لام بۆ بیستنی بیروڕام لە بارەی هەڵکەوتی ئەو دەمە و ئۆتۆنۆمییەکی کە حکوومەت دەیەوەێ وەفا بە وەعدی تێدا بکات. مۆڵەتم لەو دوو مێوانە خواست کە لەو ڕۆژەدا دەرفەتی هیچم نییە بایی خۆ ڕوون کردنەوە بکات. ڕێک کەوتین لەسەر هێندێ کە دوای سێ ڕۆژی دیکە، ئێوارێ، لە نادی محامیان کۆببینەوە...

لەو ماوەیەدا بیروڕای خۆمم خستە سەر کاغەز، لە ڕۆژی میعاددا سێ لایی کۆبووینەوە و نووسراوەکەم دانێ کە باشتر لە قسەی زمان سەرنجی لێ دەگێرێ. وا پەسەند دەکەم لەم گەشتەدا خوێنەری کورد بیروڕای ئەو ڕۆژەم بزانێت. نووسینەکە، هەڵبەت بە عەرەبی بوو لێرەدا بە دەقی خۆی دەینووسمەوە:

فلربما اودت به زلة لسان ما كانت لتستتبع غير البسمات في اوضاع عادية... مع تقدير هذا الظرف الصعب والتسليم باحكامه فاني اجد في موقفي الشخصي من طول عهدي بالحياد واستقلال الرأي والتجرد من الغرض ما يعين على ملافاة قسط كبير من تلك الصعوبة وتيسير مناخ غير ملجيء الى النفاق.

اسوق هذه المقدمة تعليلا وتبريرا لما قد يكون في كلامي من تغير يوحي بالتبطين او يستشف منه الحذر رغم استفراغي الجهد في تحري الوضوح الممكن، فأني اكره ان اكون غير مفهوم او يساء فهمي على غير داع.

احاول ان اتكلم منطلقا من روح الحيدة والتجرد، مع علمي بعسر هذه المحاولة فان وقوف الشخص من نفسه واهله و عشيرته وبني قومه مثل موقفه من الغريب والبعيد في امور تتعلق بالمصلحة العامة والمصير، يكاد يكون من قبيل «تكليف شيء ضد طباعه». ومهما حاولت ان انسى ان في بقعة من ثرى كردستان رفاة ابي و جدي وجد ابي فلن اعود من ذلك بطائل، وايا يكن مقدار الحق والباطل في موقف يستنزف دم الصديق والقريب فسيبقى هذا البيت من الشعر هو شاهد القبر في المنزف:

دم الود والقربى وان كان ظالما
عزيز علينا ان نراه يسيل

اذا سكتت مثل هذه الاصوات و توارت هذه الرؤى في اعماق الضمير وامكن انطاق العقل وحده ليعمل كما يعمل العقل الالكتروني بعيدا من العاطفة والتحيز والحذر ساغ لي ان اقل اني ارى «القضية الكردية» ضمن الواقع العام للعراق في ضوء الاعتبارات الثلاث الاتية:

اولا- اقرار مبدأ «الحكم الذاتي» للشعب الكردي، في حد ذاته، قفزة واسعة جدا في مسار هذا الشعب حاضرا ومستقبلا تعتبر بحق نقطة تحول تأريخي في حياتة السياسية وحقوقه القومية وهي بلا شك منعطف صاعد بطموحات الكردي المشروعة في كل مكان وزخم دافع لقدراته نحو رسم مصيره في اكثر من موطن من مواطنه خارج العراق.

ثانيا- الجهة التي أقرت هذا المبدأ اثبتت قدرتها على تخطي الصعاب الخطيرة فيما رأت انه ترجمة عموميات حكم التأريخ الى ممارسة حية في واقع الحياة وبقدر مايمكن ان يستوحي الغيب من المشهود فالمنتظر من مثل هذا الادراك لحكم التأريخ وهذه الجرأة في الوقوف عند مقتضاه ان يأتي المستقبل تصعيدا لما

تم في الحاضر من هذا الشأن باعتبار ان التأريخ ذو حركة متزايدة السرعة.
وسارجع الى ما يبنى على هذه الملحوظة بعد الفراغ من بيان الاعتبار الثالث وما قد يليه.

ثالثا- ليس من الصحيح ولا السليم التشدد في رسم الخط الذي يحدد اطار منطقة الحكم الذاتي، فما دام العرب والاكراد مصممين على التعايش وادامته فلا ضير في ان يرتفع هذا الخط هنا وينخفض هناك على حساب اقتضاء المصلحة وقد يستدعي التكامل الاقتصادي، مثلا، ان تضم اقسام من الارض المسكونة بالعرب الى الحكم الذاتي او ان تلحق ارض كردية بادارة المركز ولعل ان يكون في ضم القوميتين الى الادارة الواحدة هنا وهناك نوع من المعاشرة الحية بين القوميتين تزيد عواطف المودة بينهما.

صحيح، ان فكرة «الحكم الذاتي» ينبغي ايضا ان تؤدي اغراضها الاساسية في تطمين الشعور القومي عند الكردي ولكن صحيح ايضا انه لايسوغ اقامة «التعايش» على الشك والتوجس. والكلام في هذا يطول ويمكن تلخيصه في ان كل شعار متطرف في اي من الجانبين لا يمكن ان يخدم مبدأ الاخوة والتعايش وليس من احتمال للتجاذب و «شد الحبل» الا حينما تتنافر القلوب وتتجه نحو فصم العرى. ومن الواضح لكل ذي عينين ان الجهة العربية اقدر على إمتصاص أسباب الشك والأحتكاك بما تملك من امكانات مادية وسياسية وبشرية وجغرافية وحضارية لا حصر لها وكفى بها من الوفرة بحيث انها دخلت المصطرع الدولي كطرف مرغوب ومرهوب ثم انها هي المضطلعة بمسؤولية الحكم فتكون قد التزمت بكل ما يستوجبه الحكم من السعة والسماح الى جانب مايقابل ذلك من حماية مجموع الدولة شعبا وارضا.

الحكم في أى مكان مطالب بفتح صدره للناس كافة سواء منهم المؤيد والمطالب و المحايد، أقول هذا من باب توضيح القصد وتحديد مركز الحكم من وجهة نظر «حمل الأمانة» بقياسه الى مركز غيره من الناس افرادا وجماعات.

رابعا- لابد من رعاية مصلحة وحق الفرد الكردي الذي يعجبه ان يبقى بمعزل عن الاحزاب والتنظيمات السياسية وهو يمارس مواطنته ويدفع ضريبته ويقوم بواجبه فلقد لمست من تجربة السنين التي تلت ١١ اذار انعدام الوزن للفرد الكردي اذا لم يكن ضمن التنظيم الذي كان طرفا في بيان اذار. لا يطلب مني ان اجد للحكومة اعذارا في طمس ذاتي ومسخ شخصيتي وانزالي منزلة المواطن من الدرجة الرابعة. ومثل هذا يقال عن الشخص العربي الذي يريد ان يبقى على الحياد بين الاحزاب السياسية.

ليس مقبولا في عرف سياسي او اجتماعي او قانوني او فلسفي او مصلحي ان يستمد المواطن اعتباره وكرامته من وثيقة انتمائه الى احد الاحزاب. ولا يردني هنا قول من يقول ان ذلك لم يكن واقعا بمقتضى قانون او دستور او ما الى ذلك فانه يكفي ليشعر المواطن بالمهانة انه اذا طلب الوصول الى المسؤول كمواطن اعتيادي انسدت امامه السبل فاذا ابرز وثيقة انتمائه الى حزب قوي اخذ بالأحضان. اعود الى ما اشرت اليه في نهاية الفقرة «ثانيا» المتقدمة.

يشيع بين عدد غير قليل من ذوي الرأي الاكراد تصور سياسي محدد في واحدة من اهم الركائز التي تستند اليها وقائع الامور والمصالح الكبرى في الشرق الاوسط ولقد وجدتني مندمجا في ذلك التصور ومقتنعا به ولربما كنت من اوائل الاكراد الذين لمحوا الى ذلك في وقت مبكر بعد ميلاد ثورة ١٤ تموز، ومن يراجع سلسلة المقالات التي نشرتها سنة ١٩٦٠ في جريدة الحرية بتوقيع «هوشيار» يجد ملامح هذا التصور و خطوطة مطلة بين سطورها بوضوح.

خلاصة هذا التصور هي ما يلي:

القوى المتصارعة في الشرق الاوسط تحاول ان تجد لها اوراقا رابحة في اللعبة و تمسك في يدها نهايات خيوط تحرك شخوص المسرح. واقدرها على المناورة هي بلا شك اجمعها لتلك الاوراق والخيوط. وهذه الحقيقة في مستوى البديهية ولا صعوبة في لمسها وتحت هذه الحقيقة، او بجانبها، حقيقة اخرى تكاد تكون بمستواها من الوضوح لولا ان على الاعين غشاوة وهي ان من اقوى وامتن وارجح تلك الاوراق والخيوط ورقة «واقع الشعب الكردي» والخيط المتصل به. ان من يملك عواطف ومحبة هذا الشعب يملك في الشرق الاوسط قوة هي بمقام «القنبلة الموقوتة» في موازين الامور ومجريات الاحداث في المنطقة كلها. ان شعبا يبلغ تعداده في اقل تقدير خمسة عشر مليونا ويتوزع على مساحة من الارض في سعة دولة متوسطة الحجم و وتحتل بقعة في الصميم من الاهمية الستراتيجية وقد اذكت حماسه للنشاط والحيوية تطلعات النصف الثاني من القرن العشرين مع خلفية تأريخية هي بضعة وعشرون قرنا من الويلات والخطوب والغمط والبخس.

ان هذا الشعب جيش احتياطي، بل جيش عامل، يضع ثقله في موازين معارك من يحسن التعامل معه ويأسو جراحه. ومن طبيعة الاشياء ان يكون توافق المصلحة (او تضادها) بين هذا الشعب وبين القوى المتفاعلة في المنطقة على درجات وانماط متفاوتة طبقا لظرف كل واحدة من تلك القوى، فقد تكون احداها مضادة له على طول المدى وتكون الثانية موسمية التوافق المصلحي وهكذا... ليس لعاقل

ان يجهل ان مصلحة العروبة غير مصطدمة مع مصلحة هذا الشعب في مستقبل يدركه الفكر والنظر ويحسب له حساب، وما قد يعترض به على ذلك من وجود احتكاك اليم بينهما من جزء في ارض العراق يرد عليه بان الميادين الاخرى الرحبة من وحدة «المصلحة والخطر» جديرة بهزم بواعث هذا الاحتكاك و ملاشاتها في اقل من الوقت الذي تستغرقه كتابة مقال حول الموضوع حالما يلتقي الطرفان على فهم مشترك لحقيقة مصالحها و حقيقة المخاطر التي تجابههما.

ان العروبة في غنى عن «ممتلكات» الاكراد بما تملكه من البر والبحر والثروة والمركز الحضاري وهي بلا شك محتاجة الى حليف طبيعي غير مشكوك في مواقفه ومصالحه بل انها محتاجة الى جمهرة من الحلفاء لضخامة المعارك المفروضة عليها وتعدد ميادينها وقوة خصومها وجسامة التحديات المتولدة من كل ذلك. ومن الواضح الذي يراه حتى الاعمى انه لايمكن للكردي ان يمد بطمعه الى مصلحة عربية بل ان الواقع المعقد الشائك المحيط بوجوده يكاد يقطع امله من كل عون حقيقي ياتيه من خارج وجوده الا ما كان منتظرا ان ياتيه من العرب بسبب توافق مصالحهما...

والحديث هنا يطول الى غير نهاية وهو دائما ينتهي الى نتيجة واحدة هي انه اذا وعي العرب والاكراد حقائق الاشياء والاحداث وصحت دعواهما في رؤية وفهم «مؤشرات المستقبل» فليس امامها غير طريق واحد يقود الى المصلحة هو طريق التفاهم والتعايش والارتباط المصيري والكلام هنا يتشعب بما يفوق طاقة الكاتب من الاستيعاب اكثره مفهوم قبل ان ينطقه الناطق او يكتبه الكاتب فعسى ان يهدينا الله الى سواء السبيل ويجنبنا الزلل.

خوێنەر دەبینێت سەرەتای ئەو دەقە بە جۆرێک دەست پێ دەکات پێوەی دیارە بە دوا چەند وشە و ڕستەیەکدا هاتووە چونکە نازاندرێ بۆ چی «لەوانە بێت خلیسکی زمان...» ببێتە هۆی تێچوونی کەسێک. من ئەسڵە نووسینەکەم لا هەبوو بەڵام نای دۆزمەوە ئیتر ناچارم چی لەو نووسینە بەر چاپ کەوتووە ئەوە وەردەگێڕمە سەر کوردی:

*... لەوانەیە خلیسکێکی زمان لە ناوی ببات کە ئەگەر حاڵوبار عادەتی بووایە لەوانە بوو بزەیەک بخانە سەر لێوانەوە. لەگەڵ ڕەچاو کردنی ئەم بارە تەنگە و سەلماندنی حوکمیشی دیسانەوە دەشێ لە ئاکامی هەڵوەستی بێلایەنیم و سەربەخۆیی بیروباوەڕم و بێ تەماییم ڕاببینم کە بەشێکی زلی ئەو تەنگەتاوییە برەوێتەوە و هەڵکەوتێکی ئەوتۆ بە دەستەوە بدات مەرایی تێدا نەبێت.*

*ئەم پێشەکییە دەهێنمەوە بە نیازی پاکانە بۆ ڕاوێژێکی بە توێکڵ یا دوورەپارێز لە قسەکانمدا دەر بکەوێت هەرچەند ویستووشمە تا ڕادەی شیان و لوان سەرڕاحەتگۆ بم نەکا بێلزووم تەماوی دەرکەوم وەیا باشم لێ حاڵی نەبن.*

*دەمەوێ بە ویژدانێکی بێلایەن و خۆلەبیرکردوو بدوێم هەرچەند دەزانم هەوڵی ئەوتۆیی کارێکی زێدە دژوارە چونکە یەکچوونبوونی هەڵوەستی مرۆ لە ئاست خۆی و خزم و عەشرەت و میللەتەکەی وەک هەڵوەستی بێت بەرانبەر غەوارە و بێگانە لە مەسەلەی ئەوتۆدا پێوەندی بە بەرژەوەندی قەومایەتی و چارەنووسەوە هەبێت دەچێتە پلەی «تەکلیفی هەڵگەڕانەوەی شتێک دژی سروشتی خۆی» چەندێکیش بمەوێ فەرامۆش بکەم کە شوێنێک لە شوێنەکانی کوردستان تەرمی باوکم و باپیرم و باوکی باپیرمی گرتۆتە خۆی بە هیچ ئاکامێک ناگەم، هەتا حەق و ناحەقیش کەڵەکە بکات لە هەڵکەوتێک کە خوێنی دۆست و خزمی تێدا ڕژابێت هەر ئەو بەیتەی خوارەوە دەبێتە دروشمی کێلەقەبری خوێنستانەکە:*

*دم الود والقربى وان كان ظالما*
*عزيز علينا ان نراه يسيل*

*هەرچەند خوێنی دۆست و خزم ستەمکاریش بێ*
*لەلامان گرانبەهایە کە ببینین دەرژێت*

*ئنجا ئەگەر دەنگی لەو بابەتە خامۆش بوو و ئەو جۆرە شەبەنگانەش لە قووڵایی دەروونداا شرانەوە و شیا تەنها هۆش و گۆش بە دەنگ بهێندرێت تا وەکوو هۆشی ئەلیکترۆنی بکەوێتە کار، دوور لە سۆز و لایەنگیری و خوتخوتە بۆم هەیە بڵێم «مەسەلەی کورد» لە نێوان تێکڕای واقیعی عێراقدا لەبەر تیشکی ئەم سێ تێبینییانەدا دابینم:*

*یەکەم: دانهێنان بە مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد خۆی لە خۆیدا هەنگاوێکی بەرینە لە ڕاڕەوی ئێستاکە و دوارۆژی ئەم میللەتە کە دەشێ یەکراست بە قۆناغی گۆڕانکارییەکی مێژوویی لە ژیانی سیاسی و مافە نەتەوایەتییەکانی حیساب بکرێت کەوا بێگومان ئانیشکەیەکی بەرەژوورچوونی هەویا ڕەواکانی کوردە لە هەر کوێیەک بێت و تەکانێکی بەرەوپێشی وزەیەتی بەرەو نەخشەکێش کردنی چارەنووسی خۆی لە مەفتەنەکانی کورد لە دەرەوەی عیراق.*

*دووەم: ئەو لایەنەی ئەم بنەمایەی دان پێدا هێنا توانی لە کۆسپی گەورە تێپەڕ بکات بەرەو تەرجەمەی هەمەگیی بڕیاری مێژوو بۆ کردەوەی زیندوو لە واقیعی ژیاندا، لەمەشدا دیمەنی بەرچاوی خەملاند و غەیبی دوارۆژی لێ پاڵاوتە کرد. ئەم هەست کردنە بە بڕیاری مێژوو وێڕای ئەو جورئەتە لە سەلماندنی داخوازییەکانی لێی چاوەڕوان دەکرێت کە دوارۆژ بەرەژوورچوونی هەنگاوی ئێستاکەی بێت چونکە مێژوو هەمیشە بەرەو خێراتر دەبزوێت. دواتر دێمەوە بۆ ئاکامێکی لەم تێبینییە هەڵستێتەوە ئەویش پاش بەسەرچوونی نوختەنیگای سێیەم.*

*سێیەم: نە ڕاستە و نە دروستە پێگیری بکرێت لە کێشانی ئەو خەتەی چوارچێوەی هەرێمی ئۆتۆنۆمی دەست نیشان دەکات چونکە مادەم عەرەب و کورد سووربن لەسەر پێکەوە ژیان و بەردەوام کردنی، زیانێک لەوەدا نییە ئەو خەتە لێرە نەختێک هەڵکشێت و لەولاتر کەمێک داکشێت بەپێی*

داخوازی بەرژەوەند. لەوانەشە فراژووتنی ئابووری داخوازی بکات کە نەختێک لە ئەرزی عەرەب تێدا دانیشتوو وەپاڵ ئۆتۆنۆمی بدرێت یان ئەرزێکی کوردنشین بخرێتە سەر ئیدارەی مەرکەز (بەغدا)، بەڵکوو لەوانەیە جۆرێک لە پێکەوە ژیانی کورد و عەرەب هەستی دۆستایەتی نێوانیان پتەوتر بکات. بەڵێ ڕاستە کە پێویستە فکرەی ئۆتۆنۆمی مەبەستە بنەڕەتییەکەی لە دابین کردنی هەستی نەتەوایەتی کورد بهێنێتە دی بەڵام هەروەها ڕاستە کە ناشێ «پێکەوە ژیان» لەسەر گومان و مەترسی دامەزرێت، قسەش لەو بوارەوە درێژخایینە، کورتە و پاڵاوتەی ئەوەیە کە هیچ دروشمێکی پەرگیر (متطرف) لە هەر لایەکەوە بێت ناتوانێ خزمەتی بنەمای برایەتی و پێکەوە هەڵکردن بکات و هەرچی لێک نووسان و گوریسکێشەکی هەیە هی دەمێکە کە دڵان لە یەکتر دەتۆرێن و بەرەو لێک ترازان دەبنەوە. خۆ ئاشکرایە بۆ هەر چاوێکی بینا کە لایەنی عەرەب تواناترە لە کورد هۆی گومان و پێککەوتنەوە بمژێتەوە بەوەدا هەموو دارایی ماددی و ڕامیاری و بنیادەمی و جوغرافیایی و شارستانی بێسنوورەیەوە (لەچاو کورد) هەر ئەوەندەی بەسە کە هێند ئیرووە کە چۆتە ڕەمزگەی دەوڵەتانەوە وەک لایەنێکی تەماپێبووی و کۆمەلێکراویش.

لەمەش بەولاوە عەرەب خۆی بەرپرسیاریی دەسەڵاتی هەڵگرتووە بەوەشدا بۆتە بەرباری سینەفەراحی و لێبووردن کە «دەسەڵات» خستوویەتە ئەستۆیەوە وێڕای لایەنی پاراستنی سەرلەبەری دەوڵەت بە میللەت و خاکییەوە.

دەسەڵات لە هەر کوێیەک بێت داوای لێ دەکرێ دڵ بکاتەوە بۆ تێکڕای خەڵق چ دۆست بێت و چ داواکار (وەهام لە بیرە من وەختی خۆی لە جیاتی «مطالب» وشەی «معارض» م بەکارهێنابوو) و چ بێلایەن. ئەمە دەڵێم بە نیازی ڕوون کردنەوەی مەبەست و دیار کردنی ئێستگەی دەسەڵات لە گۆشە نیگای «هەڵگرتنی ئەمانەت» ەوە لە چاو خەڵقی تر بە تاک و کۆمەڵیەوە.

چوارەم: چاودێری بەرژەوەند و مافی تاکی کورد بکرێت لەوەدا کە بیەوێ دوورەپارێز بێ لە حیزب و ڕێکخراوی سیاسی کە خەریکە هاونیشمانیەتی

خۆی بەکاردەهێنێت و زەربیە دەدات و فەرمانی سەرشانی بەجێ دەهێنێت. لەوەتەی بەیاننامەی یازدەی ئازار دەرچووە لە تاقیکردنەوەدا بۆم ڕوون بۆتەوە تاکی کورد سەنگی دۆڕاندووە مەگەر لە جغزی ئەو لایەنەدا بێت کە بەشداری بەیاننامەی ئازار بووە. من لێم داوا ناکرێ بەهانان بۆ حکوومەت بدۆزمەوە کە دەمکووژێنێتەوە و کەسایەتیم دەشێوێنێ و بەرەژێرم دەبا بۆ پلەی هاونیشتمانی دەرەجە چوار. هەروەهاش دەگوترێ لە بارەی عەرەبێکی بیەوێت گۆشەگیر بێ لە حیزبە سیاسیەکان.

ڕەوا نییە لە هیچ نەریتێکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و یاسایی و فەلسەفی و بەرژەوەندی کە هاونیشتمان وێڵ و ڕێزی خۆی لە پسوولەی خۆدانەپاڵ حیزبێکەوە دەرۆزە بکات، لەمەشدا بەرپەرچ نادرێمەوە بە گوتەی کەسێکی بڵێ چ یاسایەک و دەستوورێک و شتێکی ئەوتۆیی بڕیاری وەهای نەداوە چونکە بەسە بۆ ئەوەی هاونیشتمانییەک هەستی سووکایەتی بکات کە هاونیشتمانییەکی بۆرەپیاو داوای دیدەنی بەرپرسێکی «حکوومەتی» کرد ڕێگای لێ ببەسترێت و کە پسوولەی حیزبایەتییەکی بەهێزی دەرهێنا، باوەشی بۆ بکرێتەوە. دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی کە لە کۆتایی بەندی «دووەم» دا هێمام بۆی کرد.

لە نێوان ژمارەیەکی بەرچاوی خاوەن بیروڕای کورد بینینێکی خەستی سیاسی هەیە لە بارەی یەکێک لە بنگە هەرە گرنگەکان کە واقیعی کار و بەرژەوەندە زلەکان بەسەریەوە دەوەستن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەندی. منیش خۆم لەوبینینەدا دەبینمەوە و متمانەم پێی هەیە و ڕەنگە خۆم یەکێک بم لە کوردانی کە هێمای بۆ ئەم لایەنە کردبێت پاش ماوەیەکی کورت دوای بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووز. جا ئەگەر کەسێک بچێتەوە بۆ ئەو گوتارانەی ساڵی ١٩٦٠ لە ڕۆژنامەی «الحرية» دا بڵاوم کردنەوە بە ئیمزای «هوشیار» ئادگاری ئەو بینینە و هێڵە پانەکانی، بە ئاشکرایی، لە دێرەکانیدا سەرەتاتکەی لێ دەکەن، پاڵاوتەی ئەو بۆ چوونەش ها لە ژێرەوە:

ئەو هێزانەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەندا زۆرەملێیانە هەوڵ دەدەن لەو گەپەدا کاغەزەی مسۆگەر بدۆزنەوە و ئەو سەرەپەتانە دەردەست بکەن کە ئاکتەرەکانی سەر شانۆ دەبزێون، هەر کامێکیان زۆری لەو کاغەز و پەتانە

*وەدەست هێنا توانای مناوەرەی پتر دەبێت. ئەم ڕاستییە لە ڕادەی بەڵگەنەویستیدایە و بە ئاسانی پەنجە هەستی پێ دەکات. لە ژێر ئەم ڕاستییەدا، یاخود بە تەنیشتییەوە، ڕاستییەکی دیکەش هەیە نزیکە هێندەی ئەو بەڵگەنەویست بێت. مەگەر چاو بەڵغی لێ نیشتبێ. بریتییە لەوەی کەوا بەهێزترین و قەیمترین و مسۆگەرترین ئەو کاغەز و سەرەپەتانە کاغەزی «واقیعی میللەتی کورد» و ئەو بەنەی پێیەوە بەستراوە: هەر لایەنێک دڵ و سۆزی ئەو میللەتە دەردەست بکات کاغەزێک لە دەست دەگرێت لە هێز و پلەی «بۆمبای قورمیش کراو» ی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بێت کە لەنگەری تەرازووی کاران و ڕاڕەوی ڕووداوان ڕادەگرێت. میللەتێکی بەلای کەمەوە ژمارەی بگاتە پازدە ملیۆن کەس و بەسەر ڕووپێوێکی زەوی هێندەی دەوڵەتێکی مام ناوەنجیی پانوبەرین نیشتەجێ بێت و شوێنەکەیشی لە جەرگەی گرنگیی ستراتێجی بێت و چاوچاوەی دووەمین سەدەی بیستەم هەڵپەوکڵپەی جۆشاندبێت بۆ چالاکی و توندوتۆڵی وێڕای پاشخانێکی مێژوویی بیست و ئەوەندە سەدەیی لە وەیشووم و فەلاکەت و ستەم و لێ پچڕین... ئائەو میللەتە سپایەکی یەدەگە، بەڵکوو سپایەکی کارایە قورسایی خۆی دەهاوێتە دەستەتەرازووی جەنگی لایەنێک مامەڵەی چاک بێ لەگەڵیدا و برینەکانی ببرژێنێتەوە. بڕیارێکی سروشتییە کە ڕێک هاتن و دژایەتی نێوان بەرژەوەندی ئەم میللەتە (کورد) و هێزە تێک گەڕاوەکانی ناوچەکە لە پلەی هەمەچەشنەدا بێت بەپێی بارودۆخی هەر یەکێک لەو هێزانە: لەوانەیە یەکیان بە درێژایی مەودا و ڕۆژگار کوردنەویست بێت و دووەمیان بەپێی کژ و کات هاوبەرژەوەند بێت و ئیتر لەم بابەتە...*

*بەڵام چ هۆشدارێک بۆ نییە نەزانێ کە بەرژەوەندیی عەرەب تێک هەڵنائەنگوێ لەگەڵ بەرژەوەندی ئەم میللەتە تا ئەوەی دووارۆژێکی بەربیر و بەرچاو بێت و حیسابی بۆ بکرێت. بەرهەڵستییەکی ئەم بیروڕایە بکرێت بەوەدا لێک ژەنینێکی ئازاربەخش لە نێواندا لە بەشێکی خاکی عیراقدا هەیە بەرپەرچ دەدرێتەوە بەوەی کە مەیدانە پانەکانی یەکیەتیی «بەرژەوەند و هەڕەشە» بەبەریەوە هەیە هەزمی هۆیەکانی ئەو لێکژەنینە بکات و لە کاتێکی کەمتر پێویست بۆ نووسینی گوتارێک لە بارەی مەوزوعەوە تێی*

ببات. هەر ئەوەندەشی دەویٚ هەر دوو لایەن (کورد و عەرەب) ویٚکڕا لە تیٚگەیشتنی ڕاستینەی بەرژەوەندیان و ڕاستینەی هەڕەشەی لێیان دەکریٚ بە جووتە کۆببنەوە. عەرەب بەو هەموو بەرڕ و دەریا و دارایی و مەرکەزی ژیاری (حضارة) کە هەیەتی حۆجەی پرۆپاتاڵی کورد نییە بەڵام بێگومان پێویستی بە هاوپەیمانێکی سروشتکرد هەیە گومان لە هەڵوەست و بەرژەوەندی نەکرێت بگرە پێویستی بە کۆمەڵێک لەو جۆرە پشتیوانە هەیە سەبەب بە مەزنەشەڕی بەسەریدا دەسەپێت و فرەمەیدانی تێدا دەجەنگێت و هێزی ناحەزەکانی و هەڕەشەی سەر بەو فاکتەرانەوە.

خۆ کوێریش لەوانەیە ببینێت کە لە دەسەڵاتی کورددا نییە مرخی لە هیچ بەرژەوەندێکی عەرەب خۆش بکات چ جایی ئەوەی واقیعێکی ئاڵۆزی دڕووکاوی لە بنیاتی کورد داوە خەریکە ئومێدی ببڕێت لە هەرچی یارمەتییەکی دەرەوەی وجودی خۆی هەیە مەگەر ئەوەی چاوەڕوان دەکریٚ لە عەرەبەوە بۆی بێت ئەویش بەهۆی گونجانی سوودی هاوبەشیانەوە... قسەش لێرەدا درێژخایێنە و هەمیشە سەربە ئەنجامێکەوە دەنێت کە بریتییە لەوەی ئەگەر عەرەب و کورد ناوەڕۆکی شتان و ڕووداوان بفامن و ڕاست بکەن لە ڕانواندنی دیتن و تێگەیشتنی «هێماکانی دوارۆژ» هەر ئەو ڕێبازەیان لە پێشە بەرەو بەرژەوەند بڕوات کە ڕێبازی تەبایی و پێکەوە هەڵکردن و سەرئەنجام تێکبەسترانە. لێرەشدا قسە بە زۆر لکدا پەخش دەبێت کە لە وزەی نووسەر دەردەچیٚ ئامێزی پێدا بگرێت، زۆریشی لە خۆوە ئاشکران بەر لەوەی ئاخێوەر بیدرکێنێت یان نووسەر بینەخشێنێت. ئیتر ڕێی ڕاستمان پیٚ بگرێت و لە خلیسکمان بپارێزێت.

ساڵی ١٩٧٤ دیارییەکی ڕەزا گرانی پێ بوو بۆم، کژەکەی دوای ئەو نووسینە عەرەبییە بوو، ڕەنگە کەوتبووینە حوزێران. خەونێکم دیت، لەوانەی بەپێی تەجرەبەی خۆم ڕووداوێک ڕادەگەیەنن. بە هەموو کەسانی ماڵەوەم گوت ئاگاداری خۆیان و منداڵەکان بن قەزاوقەدەرێک بە ڕێگاوەیە، تا ئەوەی گوتم لە پێپلکە هاتنە خوار، لە هەڵکردنی تەباخ، لە شتی کارەبای پێوەبێ، لە جادە و کۆڵانە خۆ بپارێزن.. بۆ ڕۆژی دواتر لە کۆڕ بووم بەسەر هەندێ کەرەستەی توالێتدا بەربوومەوە برینێکی شەباقەی خستە لەشمەوە. هەتا گەیشتمە خەستەخانەی «مدينة الطب» کاتی ویست...
خولاسە عەمەلیەتم بۆ کرا بە سی تەقەڵ برینەکەم دەمبەست کرا. بەر لەوەی بەنج بکرێم بەو چوار دکتۆرەی لە دوولامەوە بەسەرمەوە ڕاوەستابوون گوتم، ئێوە خەریکی کەسبێکن پتر بە لای ئالەت و شتی مادديدا دەچێتەوە، زەحمەتە باوەڕ بە سۆسەی پێش ڕوودان بکەن (حس قبل الوقوع) بەڵام باوەڕم پێ بکەن من لە پێرێوە خەونم دیتووە بە تەمای قەدەرێک بووم. وا لە خۆم بەدەری داوە... لە وەڵامدا گوتیان ئێمەش باوەڕمان بە «غەیب» هەیە... ئینجا نازانم بە خاترانە وەهایان گوت یان لە دڵیانەوە بوو، بەڵام قسەکان تامی ڕاستیی لێ دەهات.

شەش شەو لە خەستەخانە مامەوە. کە دەرچووم بەینێک لە ماڵەوە بۆی کەوتم هەتا توانیم هاتوچۆی دەرەوە بکەم. تومەز بێ ئەوەی پێشتر زانیبێتم لە لەشمدا «حساسية - هەستیاری» هەبووە بەرانبەر هەوای کۆندیشن. دوای دەرچوونم لە خەستەخانە تووشی لووتگیران دەهاتم تا ئەوەی وەها دەبوو نەمدەتوانی زاد قووت بدەم. دەبوو قەترە لە لووتم بکەم. هەناسەم بکرێتەوە ئنجا زەواد ئاوا بکەم. هەر هەوایەکی لە هەوای کۆندیشن چووبایە ئەو هەستیارەییەی بە جۆرێک بە خەبەر دەهێنا بێحاڵی دەکردم... بەڕێکەوت جارێکیان قەترەکی نوێم بەکارهێنا. برادەرینە کاری سیحری پێوە بوو. نەک هەر هەستیاریەکەی بنەبڕ کرد بەڵکوو هەتا دوو ساڵان پێویستیم بە دەستەسریش نەما، پاش دوو ساڵان بە کزی سەرێکی هەڵدەداوە بەڵام بەدەم ڕۆژگارەوە ئەویش کز بوو وەک کە بە نەبووی حیساب بکەیت.

ئیحسان شێرزاد لە هاوینی ١٩٧٥ «اعفاء» کرا لە ئەندامەتی و سەرۆکایەتیی کۆڕ، ئەویش بە بۆنەی هەڵوەشانەوەی ئەو بارەی کە کاتی خۆی بۆ سەرۆکایەتیی کۆڕی هێنا. دوای ئەو بەپێی ئەوەی کە یەکەم جێگیری سەرۆک بووم سەرلەبەری ئەرکی سەرۆکایەتی وێڕای فەرمانە عادەتیەکانم کەوتە ئەستۆمەوە. یەک دوو سوارچاکی

زارقەڵەباڵغی مەیدانی ڕۆشنبیریی کوردی کە تا ئەو دەمانە بە چاکی لێیان شارەزا نەبووبووم و نەمدەزانی تا چ ڕادەیەک بێ بەند و پەیمان و بێ پەروای شەرم و شکۆن، لە ساڵی پێشترەوە خەریکی خۆ نزیک کردنەوە بوون لە کۆڕ (لە منیش بەتایبەتی) کە دیتیان بە گەز و گرێی سوودی دنیایی ئەستێرەی کۆڕ لە کزیدایە ئاڵای دوژمنایەتییان بە ئاشکرایی هەڵکرد... ئەگەر بیانزانیبا من هیچ پێوەندییەکی دۆستایەتییم بە چەکدارانەوە نییە زووتر ئاڵاکەیان هەڵدەکرد. لە هەموو ژیانمدا بە بیرمدا نایەت بێ شەرتی و بێ شەرمی تا ئەو پلەیە لە دە کەسی پتر بەدەر دابێتەوە، پتریش لە نیوەی ئەو دە کەسانە بۆرەپیاوی بێ ناو و نیشان بوون.

لە کۆتایی بیستەکانی ئەم سەدەیە باوکم بە هەڵبەست گوتی:

ئێوە هەرچەند کە قەومەکی زۆرن
فائیدەی چی کە توخمی خۆ خۆرن

پێشتر حاجی قادر فەرمووبووی:

هەتا وەک ئاگری ژێرکان لەگەڵ یەک
ئەگەر تووفانە لەشکرتان بە پووشەک

کە هێرشی بێوچان و خەبەر لێدان، لە هاوینی ١٩٧٥ - ەوە زیادی کرد وەهام دانا بە هیچ جۆرێک مانەوەم لە کۆڕ لە ١٩٧٦ تێناپەڕێنێ. ئەم باوەڕەم هانی دام بۆ ئەوەی چەندێکی لە ئیمکانی ئادەمیزادێکی وەکوو خۆمدا بێت چالاک بین لە جێبەجێ کردنی هەر خزمەتێکی بتوانین بە سەقافەتی کوردی بگەیەنین. هەر بە نیازی خۆ تەیار کردن بۆ خزمەت هەنگاوێکم هەڵێنا کە مامۆستا ئیحسان خۆی لێ دەدزینەوە. لە بودجەی نوێی دوای دوورکەوتنەوەی مامۆستا ئیحسان بایی نرخی دوو ئۆتۆمۆبیل، یەکیان بۆ دیوانی سەرۆکایەتی ئەوی دیکەش بۆ کاربەدەستانی دیکە و پێداویستی هاتوچۆ و گوێزانەوە. کاک ئیحسان بە تێبینی کردن لەوەی کە کۆڕی زانیاری عێراق ئۆتۆمۆبیلی حکوومەتی لە دەستدا نەبوو بە لایەوە شیرن نەبوو ئێمە لەم نوختەیە لێیان تێبپەڕێنین. من لە نوختە نیگای ئەوەی کە مسکێنیی ئێمە

ئەوان پۆشتە ناکات هەنگاوەکەم هەڵێنا. لەو بارە کزەشدا موافەقە لەسەر هەردوو ئۆتۆمۆبیل کرا. من هەنگاوێکی دیکەشم هەڵێنا. لە کۆڕی عێراق کۆبوونەوەی لیژنەکان پاداشی دوو دیناری بۆ هەر ئەندامە دانابوو. لای ئێمە بوو بە سێ دینار، دواتر من گەیاندمە پێنج دینار. لە زۆر دائیرە دە دیناریان پێ دەدرا، لە هەندێ جێگای بەرز پاداش پڕی زەرفێک بۆ ئەندامەکان دەنێردرا. پاش ئێمە پاداش پتر هەڵکشا. چەند سەیرە پیاوێکی وەکوو د. مەحموود جەلیلی عەمیدی کولیەی «طب» لە موسڵەوە دەهات بۆ بەغدا بەشداریی کۆبوونەوەی لیژنەی دەکرد لە کۆڕی زانیاری عێراق بە پاداشی دوو دینار...

لەو ساڵانەدا کرێی تەنەکچی زۆر زیادی کردبوو تا ئەوەی مەزگووفی حەفتا هەشتا دیناری هەر بە ئەوان دەخورا. لەو ساڵانەدا دروشمێکم هەڵگرتبوو هەر بە قسە، دەمگوت دەبێ نرخی زانست لە هی تەنەکە کەمتر نەبێ، بەڵام قەت نەیگەیاندە سەد یەکی ئەو نرخەش. نووسەرم دیتوون بە ساڵ چاوەنۆڕی دەرچوونی تاکە یەک گوتاریان دەبوون و دەبن...

ڕۆژی ١١/١١/١٩٧٥، پاش دەوام، کۆبونەوەی لیژنەی زمانم هەبوو لە کۆڕ، جارێ مابوو لە وتوویژ ببینەوە تەلەفۆنم لەماڵەوە بۆ کرا، خەبەری مەرگی کوتوپڕی دایکمیان پێ دام... هەتا شەهادەی مردنی لە خەستەخانەیەک وەرگیرا چەند کەسی تێدا ماندوو بوو.. دواتر لە بیرەوەریی ئەو دەمە ناخۆشانەی وەرگرتنی شەهادەی وەفات گوتم، پێویستە خەڵق بۆ کورت کردنەوەی ئەو سەفەربەلگە و ئەرک و سفتوسۆکەی لە خەستەخانەیەک لێی بمرێ... بردنی جەنازە و هاتوباتی تازیە لە کۆیێ دە ڕۆژێکی خایاند. دایکم ٣٢ ساڵ و یەک مانگی ڕۆژێک کەم دوای باوکم ماڵاوایی لێ کردین. پێی ناوێ بڵێم، کەلێنێکی گەورەی دوای خۆی جێهێشت، چونکە لەلایەنی دایکەتی چەندین ساڵ دوای مەرگی باوکم لە ١٩٤٣ و هی مامم لە ١٩٥٢، ئەو بۆ هەموو بنەماڵەکە بووبووە ئەو خێوەتەی لە سایەیدا هەستی حەسانەوەمان دەکرد... ڕاستییەکەی جگە لە جەلیزادان، بنەماڵەی سندۆڵانیش کە خاڵەکانم بوون بە گەورەی خۆیانیان دادەنا... لەم لایەنەوە چەندێکی باسی پایەی بکەم کەمە، لەو دەوروبەرەی تێیدا ژیاوم بە بیرمدا نایەت هیچ ئافرەتێک لەو بەولاوە بە درێژایی ساڵ شەوانە مەجلیسی ئاوەدانی هەبووبێت و خەڵقەکە لێی تێر نەبن. پاش بەسەرچوونی دەمی دیوەخانەی پیاوان دانیشتنی مەحرەمانەی چەند

سەعاتی لای دایکم دەستی پێ دەکرد... خزمم هەن تا ئێستاش کە یادی ئەو مەجلیسانە دەکەنەوە دەگریێن... لە جێگایەکی بچووکی وەکوو کۆیێ لە ئیمکاندا نەبوو بە شێوەی هەمیشەیی هیچ بەسەر بردنێک هێندەی مەجلیسی شەوانەی ماڵی ئێمە، لای دایکم، گەش و ئاسوودە بووبێت. یەکێکی لە ناچاریدا شەوێک لەو شەوانەی لە کیس چووبایە خۆی بە زەرەرکردوو دادەنا... ڕەنگە ڕاست بێ بڵێم بە مردنی دایکم ئەو جۆرە گوزەرانە یەکجارەکی لە کوردەواری پێچرایەوە...

لەو ساڵانەدا هەتا بەرەو کۆتایی حەفتاکان سێ بەشی «حاجی قادر» و «چەپکێکی نالی» و «چەند حەشارگەیەک» و بەشی یەکەمی «مرۆڤ و دەوروبەر» و چەندین گوتاری درێژەدارم بۆ نووسرا و بڵاوبۆوە. خوێنەر دەزانێ من لە هیچ نووسینێکدا ناوی ئەم و ئەوم نەبردووە، بە هێماش کەسم بریندار نەکردووە. ئامانجێکی بە چاکەی کورد و ئادەمیزادم گرتبێتە بەر لێمی داوا کردووە هەڵەی فکریی پەرەسەندووی خەڵق بە خۆوە خەریککردوو ڕوون بکەمەوە، لەوەشدا جگە لە پێویستی ئەخلاقی مافی ڕەخنەگرتنیشم بەکارهێناوە کە دەزانین زۆر لایەنی توندڕۆ لە جیاتی وشە دێن گوللە بە ڕەخنەلێگیراوەوە دەنێن و خۆشیان بە مرۆڤدۆست دادەنێن و نازیش بەسەر خەڵقەکەوە دەکەن...

لەم جیهانەدا هەرچی پێی بڵێی «ئایدیۆلۆجیا« دوو شەقڵی سەرەکیی پێوە دەبێت. یەکیان ئەوەیە هەموو بیروباوەڕێکی غەیری خۆی بە دوژمنی مرۆ دەزانێت. دووەمیان ئەوەیە هەر ڕەخنەیەکی لێی بگیرێ دەیکاتە بەڵگەی ناپەسەندایەتیی خاوەنەکەی چونکە خۆی بە پێوانەیەک لە عەیارە دەدات کە بە قاڵبی خۆی گیراوە. لە پەنا ئەم ڕاستییەدا ڕاستییەکی بێفێڵی دیکەی هەیە بریتیە لەوەی کە هەموو ئایدیۆلۆجیەکی لە مێشکاندا جێگیر ببێت بایی ساوایی ئەو گەلەی تێیدا دەتەنێتەوە پتر بە لای نیگاتەسکی و توندوتیژیدا دەچێتەوە هەر بۆیەیە کوشتن و بڕین لەوەی پێی دەڵێن جیهانی سێیەم پتر باوە تا وڵاتێکی پێشکەوتوو.

من کە دەستم دایە نووسین و خۆ ڕوونکردنەوە ئەم ڕاستییانەم لەبیر بوو. بڕیارم دا گوێ نەدەمە ڕەخنە و بە دەمداهاتنەوە و هەر ڕەفتارێکی کە بشێ پشتگوێ بخرێت بۆیە بوو وەڵامی کەسم نەدایەوە کە لە تەنگەتاوبوونی ئایدیۆلۆجییەوە هێرشی بۆم دەهێنا هەتا ئەو دەمەی کە ناچاری خستمیە سەر نووسینی «اعادة التوازن الى میزان مختل» بەو جۆرەی لە نووسینەکەدا ڕوون کراوەتەوە.

دوای ئەم نووسینە جۆری هێرش خرایە تاکتیکێکی دیکەوە، حەز ناکەم لێرەدا دەفتەری ئەم لایەنە هەڵبدەمەوە چونکە جارێ دووکەڵەکەی نەڕەوییەتەوە و بە «اصطلاح» دەگوترێ گەرمەبرینە، سەرەڕای ئەوەی کە دەبێ ناوی ئەم و ئەو بهێنم قەتیشم حەز نەکردووە لە منەوە نشتەرکاری ناوزڕاندن دەست پێ بکات هەرچەند ئەوەی دژی من کرا لە هیچ دەفتەرێکی خاوێندا جێی نەدەبۆوە. گەشتی ژیانی دوای ساڵانی ١٩٧٦ و ١٩٧٧ هەڵدەگرم بۆ دوارۆژ، بە تۆمارکراوی. بەڵام ناتوانم دەست لە نووسین هەڵبگرم بەر لەوەی کەسەرێکی گەورەی ئەو ساڵانە دەور بکەمەوە بۆ مەینەتخانەی ژیان.

ئەحمەدی حەمەد ئەمیناغای دزەیی لە بەرەو کۆتایی بەهاری ساڵی ١٩٧٦ بە دەردی دڵ لە ناکاو بۆی دەرچوو. حەفتەیەک لەم بەغدایەمان گل دایەوە هەر شەوە برادەرێک داوەتێکی قەشەنگی پڕ زەوق و شەوقی ساز دەدا، هەتا لە ئاکامدا عوزری هێنایەوە لە نەمانەوە بۆ داوەتی دکتۆر قەرەنی دۆغرمەچی. ئێمەش کە بێ ئەحمەد داوەتەکەمان بردە سەر بێ خەبەری قەزا و قەدەر بووین هەتا کاتی دوعاخوازی لێک کردن ئنجا قەرەنی گوتی ئەحمەد لە ڕێگەی بەرەو هەولێر دەردەکەی دڵی لێ هەڵدەداتەوە و بەحاڵ گەیشتۆتە ماڵەکەی و گیانی سپاردوە. پەحا بە سەیریی هەمووومان سڕ بووین!

ئەحمەد سوارچاکێکی کوردایەتی و مەردایەتی بوو، کەم کەس هەیە وەک ئەو بە درێژایی خۆناسینی بە گیان و لەش و ماڵ، بێمزە و بێوچان لە کوردایەتی سەرف کردبێت. حەیفە مرۆی وەها چاک و پاک و خۆ لە بیرکردووی ڕێی نیشتیمانپەروەری تۆزی فەرامۆشی لێ بنیشێت. ئەحمەد لە بەخشندەیی بەولاوە دەچوو تا ئەو سنوورەی لە بەخشیندا خۆی بە قەرزدار دەزانی. لێم نەبیست ڕۆژێک لە ڕۆژان باسی هیچ ئەرکێکی خۆی بۆ برادەرانی و بۆ کوردەواری دەوربکاتەوە... ماڵ و دیوەخانەکەی قۆناغی حەسانەوەی هاوخەباتەکانی بوو، بۆ هەموو کەسێکیش لە عەشیرەت و لەوەی ڕێی شەکەتی و تێوەستان بۆ لای ئەوەی بردبایە نوای کاردروستی و بە هیوا گەیشتن بوو. کە بێینە سەر ئاکاری شەخسی دوور لە سیاسەت و خەبات ئەحمەد مرۆیەکی هەرە پاک و خاوێن و دڵفەراح و سینەکرایەوەی ڕۆژگاری خۆی بوو. لەمەوە بوو کە لە دڵی هەموو تیرە و بەرەبابی «دزەیی» ئەحمەد خۆشەویست و نازگیراو بوو... بەڕادەی سەیر لێ هاتنەوە ئەم

مرۆیە تەبیات و ئارام و قسەشیرن و ڕەفتار نەرم و نیان بوو. نەیدەزانی قسەی ڕەق و زەق بکات، فێریش نەبوو لە کەس قەڵس بێت وەیا ڕووی لێ گرژ بکات. دەشبێ بڵێم ئەحمەد وێنەیەکی وەک شکڵی بەر ئاوێنە بوو لە باوکی. حەمەد ئەمیناغای باوکی کە لە تاقی هەڵچوونیدا مەرگ پێچایەوە نیهاد پاکێک و نێک نەفسێکی ئەوتۆ بوو کە هەر خۆی بتوانێ ئەحمەدت لەبیر بباتەوە. سەد ماشەڵا لەو مرۆیەی وا مەرد و باڵقووڵ و لێبوردوو و خاکی مەشرەب. جارەها دیتوومە لە جەمی قەڵەباڵغدا خۆی ترنجاندۆتە نێوان دەستەی نۆکەران و بێ ئەوەی پێوەی دیار بێت تەوازوع دەنوێنێ ڕاساوەتە خواردن و زۆریشی بەدڵ بووە. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی.

لە بیرەوەریی ساڵانەی مەرگی ئەحمەد لە ١٩٧٧ و ١٩٧٨ بۆ بەشداری کردن لە ئاهەنگی چوونە سەر قەبری بەشدار بووم، تەنانەت لە ١٩٧٨ تا ئەو فەرمانەم جێبەجێ نەکرد سەفەرە پێنج مانگییەکەی ئوردونم نەگرتەبەر...

بێ ئەوەی برین بکولێنمەوە هێمایەک دەکەم بۆ ئەو حاڵوبارەی کێشایەوە سەر دوورخستنەوەم لە کۆڕی زانیاری کورد. شکاتێکی قورسی بێئەساس و بێبنەکەم لێ کرا لەلایەن ناحەزانەوە کە من زوربەیان هەر ناناسم... داوا کرام بچم بۆ «الهیئة التحقیقیة المرکزیة»ی سەربە ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش، لە چوونی یەکەمم بۆ لایان تۆمەتەکەم بۆ خوێندرایەوە و ڕێیان دامێ چی دەمەوێ لە وەڵامدا بیڵێم، ئیتر من دەمگوت و نووسەرێک لەوێ دانیشتبوو دەینووسیەوە... دواتر چووینە ژووری سەرەکی «هەیئە»، بەینێک وتووێژی بێ هەروگیف کرا کە هیچ شێوەی محاکەمەی پێوە دیار نەبوو، بە ئاوی سارد و چایەی میوانداریشەوە هەر دەردەکەوت کە کۆمەڵەی هەیئە لەگەڵ ئەو تۆمەتەدا ڕێک نین. جاری دوەم کە لە ڕۆژێکی دوارۆژانی مایسی ١٩٧٨ بوو چوومەوە لایان و چ دەلیلێکی لام هەبوو بۆ ئیسپاتی بێگوناهیم بۆم بردن... ئەم جارەیان لە جاری پێشووتر باشتریان بەخێرهێنام، ماڵیان ئاوابێ...

تۆمەتێکی دیکەی مەیلەو مسکێنانەش لەوەوە بۆم هەڵبەسترا کە گۆیا کتێبێکم بێ پەسەند کردنی «رقابة» دەرچووە. چەند فەرمانبەرێکی «تربیة» هاتن و چی زانییان و زانیم خرایە وتووێژەوە... ئەمانە بەسەرچوون، دوای گەڕانەوەم لە بیرەوەری دوو ساڵەی مەرگی «ئەحمەدی حەمەد ئەمیناغا» پاسپۆرتم حازر کرد و لە ڕۆژی ١/٦/١٩٧٨ چووم بۆ ئوردون، لە ئۆتێلێکی مامناوەندی دابەزیم، نەختێ لە

خەتی ناوەڕاست بەرەوژوورتر، بە تەلەفۆن لەگەڵ «رئيس المجمع اللغوي الاردني» د. عەبدولکەریم خەلیفة دوام کە هاتووم بۆ «عمان» بۆ ئێوارە خۆی و چەند ئەندامێکی «مجمع» و «د. عبدالعزيز الدوري» هاتنە لام پاش دوو ڕۆژ سەردانی «مجمع»م کرد و چەند داوەتێکی شەوانەیان کردم. بەڵام تەنها یەک حەفتە لەو ئۆتێلە مامەوە، گوێستمەوە بۆ ئۆتێلێکی دیکەی لەو هەرزانتر بەڵام ڕێکوپێک و بە ژووری یەک نەفەری تەلەفۆن و حەمامدارەوە...

خەبەرم زانی لە ڕێی «ڕەوشەن بەدرخان»ەوە، کە لە شامەوە هاتە سەردانم، کە لە ١١/٦/١٩٧٨ وە «اعفا» کراوم لەوە بەولاوە نەمویست دۆستم پێمەوە خەریک بێت چونکە (لە تەزازووی خۆمدا) هەموو ماندوو بوونێکیان بۆم دەبێتە بەخشینی بێمزە...

زۆری نەبرد دۆستی دوور و نزیک خەبەریان بوو لەو دوورکەوتنەوەیەم ئیتر بێوچان بە تەلەفۆن و بە نامە ئەحواڵپرسییان دەکردم، هێندێکیان لە شامەوە74 ناوناوە دەهاتنە لام بە خواردنی کوردانە و دیاری پەقڵاوە و فستەق، کە هەر جارە سەرلەبەری کاتب و خزمەتچیی ئافرەت و پیاو پشکێکی وەهایان بەر دەکەوت ژووروو ئومێدیان بوو. لە ناسیاوانی ئوردونی چەند «ملحق»ێکی سەفارەتی

---

74- جگە لە ڕەوشەن خان ئەوانەی لە شامەوە سەریان لێ دەدام مەرحووم عومەر مستەفا «عومەر دەبابە» و دکتۆر فوئاد مەعسووم بوون. دووا جاریان کە هاتنە لام دۆڵمەی کۆییانەیان پێ بوو وێڕای پەقلاوە و فستەق. چووینە دەرەوەی عەممان لامان دایە باغێکی خۆش و گەورە، یەتاغمان لێ ڕایەخست... یەکێک هات بەخێری هێنانین و گوتی ئەمە باغی مەلیکە... ویستمان عوزرخوازی بکەین کە نەمنزانیوە چ باغێکەوە ڕاساینە خۆ گرد کردنەوە بۆ دەرچوون. کابرا نەیهێشت و مەردانە لەگەڵماندا ڕەفتاری کرد. دکتۆر فوئاد لە جارێک لە جارانی هاتنیدا سێ هەزار لیرەی سووریەشی بۆ هێنام (ئەگەر سەهوم نەکردبێ لە ژمارەکە) چەندێکی پێم گوت پارەم هەیە و حکوومەتی ئوردونیش نایەڵێ مەسرەفی ئۆتێل بدەم فایدەی نەبوو... شەڕەکە ئەو بردییەوە، قسەی خۆمان بێ تێشکانی ئەوتۆیی خۆشترە لە بردنەوە. هەر لەو هاتوچۆیەدا بوو نوسخەیەکی «اعادة التوازن الى ميزان مختل»ی لێ وەرگرتم بە دیاری بۆ «عبدالله الاحمر» ئەویش لێی ڕاسپاردبوو کە ئەگەر ئارەزۆ بکەم سووریە خۆشامەدیم لێ دەکات.

ئوردون لە بەغدا، کە چەند ساڵێک بوو پێوەندی دۆستایەتییان لەگەڵمدا هەبوو، سەردانیان دەکردم و پێمەوە خەریک دەبوون. هێندێکیان گەڕابوونەوە ئوردون بەڵام لە نێوانیاندا «ابو جومرد عبدالمنعم الكردي» کە جارێ هەر لە عێراق بە «ملحق اقتصادي» مابۆوە بەهانەی دەدۆزیەوە بۆ سەردانی «عمان»، هەتا چەند ڕۆژێک لەگەڵمدا بێت... ئەو مرۆیە چ لە ڕووی ڕەوشتەوە بێت و چ لە ڕووی کوردایەتییەوە بێت هەتا بڵێی گیانی پاک و مەرد و وەفاکار بوو. لەلایەن دڵڕاگرتنی منەوە هەموو سنوورێکی تێدەپەڕاند. زوربەی کاتی مانەوەی لە عەممان هەر لەگەڵ مندا دەبوو، ئیتر بە دنیایدا دەگێڕام و خەڵقی پێ دەناساندم و داوەتی دەکردم و منیش داوەتم دەکرد بەڵام خۆی مەسرەفەکەی دەکێشا. بەیەکەوە چووینە لای کوردە ناسراوەکانی عەممان یەک لەوان مامۆستا عەلی سیدۆ گۆرانی کە ئەدیب و نووسەر و لە سییەکاندا گەشتێکی بە کوردستانی عێراقدا کردبوو، کتێبێکیشی لەسەر نووسی بە سەرناوی «من عمان الى العمادية» لەو گەشتەدا کە هاتە کۆیێ سەردانێکی باوکیشمی کرد، کە لەو دەمەدا ماڵمان لە هاوینەهەواری چنارۆک بوو، ژمارەیەکی زۆریشی ڕۆشنبیرانی ئەوسای کۆیەی لەگەڵدا بوو. دوو ڕۆژ و شەوێک مایەوە.

مامۆستا سەیدۆ، لە کۆڕی زانیاری کورد دامەزرابوو بە پەیامنێر، گوتارنووس و بە ئەندامی یاریدەدەریش هەڵبژێردرا. لەو دەمانەدا شناسایی کۆنینەی بەر لە چل ساڵی بە نامە لەگەڵمدا نوێ کردەوە. ڕاستییەکەی من لە سەرەتاوە خۆمم پێ ناساندەوە کە لە عەممانیش چوومە لای دەتگوت هەر دوێنێ بوو لە سوولی پاشای چنارۆک. ئەو گەنج و من منداڵ لە پلەی خوێندنی سەرەتایی، یەکترمان دیتووە.

لە زوێکەوە، «ابو جومرد» بە کۆمەڵەی «یانەی صلاح الدین»ی ناساندم کە نزیک بوو لە ئۆتێلەکەم. سەرپەرشتیکەرانی یانە زۆریان تەکلیف کردم کە بگوێزمەوە بۆ ئەوێ و ژووری تێدا ژیان و باری تێدا حەسانەوەم ساز بدەن، بەڵام بە سپاسەوە عوزری وەلاوەنانی ئەو ئەرکەیانم هێنایەوە و لە ئۆتێل مامەوە. یەکێک لە ئەندامانی کارگێڕی یانە ئافرەتێک بوو بە ڕەفتار و ئاکاریدا دیار بوو خانمێکی لێهاتووە و بە خۆدا ڕاپەرمووە.

ڕۆژێک لە ڕۆژانی هەرە گەرمی تەمووز کە ۵۴ ساڵ بوو عەممان گەرمای وەهای نەدیتبوو، لەگەڵ «ابو جومرد» مێوانی داوەتی نیوەڕۆژەی ئەو خاتوونە بووین. عەممان شارێکی فێنکە بە دەگمەن نەبێ پلەی گەرمای لە ۳۵ تێپەڕ ناکات. تا

ئەوەی من لە ژوورەکەمدا چەرچەفم بۆ نوستنی ڕۆژانە بەکاردەهێنا. شەویش پەنجەرەم دادەخست.

ئەو ڕۆژەی داوەت بە هۆی نەبوونی پانکەوە، پلەی گەرماش گەیشتە ۴۳، من بە دەست گەرەماوە سەغڵەت بووم. بەڵام ئوردونییەکان چونکە ڕاهاتووی بێ پانکەیی بوون لەو پەڕی ئاسوودەییدا بوون. بە هەمە حاڵ چەندێکی گەرماش وەڕسکەر بووبێت خواردنەکان و وتووێژەکانمان بۆیان تێ دەهێنامەوە. ئەم خاتوونەم لە یانەی سەلاحەددین دەدیت کە ناوناوە بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی کارگێڕی سەردانی دەکرد. بەداخەوە ناویم لەبیر نەماوە، کەسیشم لێ نزیک نییە بیناسێت...

ئۆتێلەکەمان خەڵقێکی هەمە بابەتی لێ مێوان دەبوو لە عەرەبەکانی سعوودیە و میسر و کوێت و سووریا... هتد. شەوانە لە ساڵۆنەکەی دادەنیشتن و شێوە کۆڕێکی خۆییانەمان دەبەست هەتا دوای نیوەشەو بەردەوام دەبوو. من بە عادەتی خۆم پەروام لە قسە نەبوو، چی بمزانییایە لە بابەتی وتووێژ بێ کۆمە کردن و زمان گرتن دەرم دەبڕی، خەڵقەکەش پێیانەوە دیار بوو تینوون بۆ بیروڕای پاتەوپات، قسەش یەکیان یەکی دیکەی ڕادەکێشا هەتا چەندین مەیدانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئایدیۆلۆجی... دەکوتایەوە. کە گەیشتینە ڕەمەزان دانیشتنەکانمان درێژەی دەکێشا هەتا دەمی پارشێو. دیتم ئیدارەی ئۆتێل چ گۆڕانێکی نەخستە جەمەکانیەوە، تومەز خاوەنەکەی کابرایەکی قچکەتەنگی پارەویست بوو دەترسا لە مەسرەف. بەهەمە حاڵ ئیقناعم کردن کە بەربانگ دروست بکەن و لە جیاتی نانی سبەینانیش پارشێو بە خەڵقەکە بدەن بە مەرجی گۆڕینی نەوعیەتی. تا ئەو ڕەمەزانە ئۆتێلەکە لە خواردنی «وشکەمەنی – نواشف» بەولاوەی تێدا نەبوو، بۆ یەکەم جار لە مێژووی ژیانیدا پلاو و شلە و تشریب و مەحەلەبی... کەوتە سەر مێزەکانی ژووری خواردنیەوە.

کوڕێکی میسری «زهیر» ناو کە دەرچووی کۆلێجی کشتوکاڵ بوو لەو ئۆتێلە سەرخزمەت بوو، وازی لە وەزیفەی «مهندس»ی وڵاتی خۆی هێنا بوو بۆ سەد دینار مانگانە و ئەو بەخشیشەی لە ئۆتێل پێی دەدرێت. هەر مانگە پارەیەکی مناسبی بۆ کەس و کاری دەناردەوە. چەند دوورە مەودای نێوان دروشمی بزووتنەوەی سیاسی بە شۆڕشیەوە لەگەڵ «واقع»ی بێفێڵ. میسرێکی لە شەش هەزار ساڵەوە بێشکەی ژین و ژیار بێت، موهەندیسێکی خۆی بە باوەشەوە نەگرێت

و بۆ جێگایەکی دیمەکاری وەکوو ئوردونی بنێرێت بەڵکوو نانێک بۆ خۆی و خزمانی پەیدا بکات...

ئوردون لە جیاتی ڕووباری نیل و دەلتای بەبەرەکەت هەر سیاسەتەکەی مەلیک حسێنی شک دەبرد، کە خوێنگەرمەکان لە ناوەوە و دەرەوە دەیانویست لە کۆڵ ئوردونی بکەنەوە، لەم بوارەدا دەبێ بڵێم هەرچی بە ئەسڵ ئوردونی بوون لە ئەهلی ولاتەکەی تا بڵێی مەلیکیان خۆشدەویست، ئەویش بە کردەوە لە کاروباری گشتی و لە ڕەفتاری شەخسی و باوەڕ و متمانەی خۆی بەوان دەسەلماند. حەقیانە، نوێژی جومعەی لەگەڵدا دەکردن بێ پاسەوانی لە عادەت بەدەر، دەرگاشی کرابۆوە بۆ موراجەعە و لەگەڵ عەشیرەتەکانیش پێوەندی مەحکەمی هەبوو.

لە لایەن خۆمەوە بە ڕەسمیی تێیان گەیاندم کە «صاحب الجلالة» وەرم دەگرێت ئەگەر ئارەزۆی زیارەتی بکەم، ڕاستییەکەی زۆرم پێ خۆش بوو بچمە خزمەتی لەبەر زۆر هۆی بە ڕێوجێ یەکیان ئەوە بوو کە دەمزانی چەند ساڵێکە ئاشنای ناو و بیروباوەڕمە، تەنانەت بەر لەوەی عێراق بەجێ بهێڵم بە ماوەیەکی ١٥-٢٠ ڕۆژی «ملحق عسكري» ئوردون لەگەڵ «ابو جومرد» لە ئێوارەدا هاتنە لام. بەڕێکەوت ئەو ڕۆژە بە عادەتی ناوناوەم بە ڕۆژوو بووم و تا دوای هەڵستانیان کە ٢،٥ سەعاتی کێشا فتارم نەکردەوە. «ملحق عسكري» دەگەڕایەوە بۆ ئوردون بە بۆنەی بەسەرچوونی ماوەی خزمەتی لە بەغدا. گوتی هەم بۆ دوعاخوازی و هەم بۆ پرس کردن بێت لە بارەی بیروڕای خۆت بەرانبەر باری گشتیی ناوچەکە و بەتایبەتیش لە پێوەندیی جیرانەتی و سیاسی ئوردون و عێراقەوە هاتوومە سەردانت چونکە هەرجارە «سیدنا» - مەبەستی مەلیک حسێن بوو - ئەم پرسیارەی بیروڕای تۆم لێ دەکات...

چی پێویست بوو بە دڵێکی خاوێنەوە وەڵامم دایەوە بە جۆرێک ئەگەر وەزیری خارجیەی عێراقیشمان لابایە هەر ئەو وەڵامەم دەدایەوە. لە پێوەندی عێراق بە ئوردنەوە گوتم، هەرچەند سیاسەت بەپێی سروشتی خۆی لە هەموو جیهاندا ڕووەو گۆڕانە بەڵام نەک هەر لەم ڕۆژانەدا بەڵکوو تا ئەوەی لە پشت ئاسۆی دیاریشەوە ڕووناکایی سیاسەتی دوارۆژ گەشایی بدایەتەوە عێراق سەلامەتی ئوردنی بارتەقای سەلامەتیی خۆی مەبەستە، ئەگەر بەڵایەکی ناگەهانە لە لاوە بۆ ئوردون بێت، عێراق دەستی خۆی دەداتە بەر، چونکە بەشی هەرە زۆری دەردی سەری و کێشەی

وڵاتانی ڕۆژاوای عێراق بۆتە قۆنتەراتی ئوردونێک کە ئەگەر مەلیک حسێنی بەسەرەوە نەبێت کەس نازانێ بە چ باردا دەشکێتەوە، جگە لەوەی جیران لە هەموو حاڵدا دۆست بێ چاکترە لە ناحەز.

هۆی دوەم ئەوە بوو کە مەلیک حسێن، بێ لە هەموو حیسابی شەخسی، مرۆیەکە لەبەر لێهاتوویی خۆی و گرنگیی مەرکەزی و دەورێکی سیاسی کە دەیبینی من و غەیری منیش ئاواتەخوازە پێی بگات و لەگەڵیدا بدوێت و بە دۆستی ئەو لە قەڵەم بدرێت. هۆی سێیەم ئەوەبوو کە من بە ئاوارەیی لە ئوردون بم لێشم مەعلووم نەبێ چەندی تێدا دەمێنمەوە هەڵبەت مەرحەبای مەلیکەکەی پیشتیوانییەکی لەڕادەبەدەر متمانەبەخش و دڵ ئارامکەرەوە بوو...

بەڵام لەبەر هۆیەکی سەرەکی کە هەموو ئەمانەی لە خۆیدا دەپێچایەوە بێ ئەوەی پاتەوپات وەڵامی لایەقی بدەمەوە خۆم لەبەر باربوونی بەڵێندان دەدزیەوە، هۆیەکەش ئەوەبوو کە لە باوەڕێکدا بووم و لە بارێکدا دەژیام ئەگەر بچمە زیارەتی مەلیک حسێن یەکجاری وەیا هەتا ماوەیێکی زێدە درێژ لە ئوردون دەمێنمەوە. من کە گەیشتمە عەممان و لە ئوتێلێکی مامناوەنجی دابەزیم کاربەدەستانێکی دەیانزانی لە عەممانم تا چەند ڕۆژ شوێنەکەیان نەدۆزیەوە، چونکە لە ئوتێلی بەرەژوورتر هەواڵی هاتنمیان پرسی بوو کە دۆزیمیانەوە، ویستیان بمگوێزنەوە بۆ ئۆتێلێک کە لە عەممان ممتاز بوو، بەڵام من نەمسەلماند و لە شوێنی ئەوسام مامەوە بێگومان لە پاش دیدەنی مەلیک، کە دەمزانی لە بیروڕادا بە ئاسانی دەتوانین بگەینە یەکتر و شارەزای ئادگاری ئەدەبکارانەشی بووم و دڵنایش بووم لە مێواننەوازی ئەو، گۆشەگیری و خۆپەنادانم لە ئیمکاندا نەدەما و دەکەوتمە بارێک تێیدا بە دیارەوە بم و لەگەڵ کاربەدەستان پێوەندیم هەبێت ئیتر وەک فریز کە ڕیشەیەکی داکوتا بە زەحمەت هەڵدەقەنێت...

کە دەڵێم لە بیروڕادا دەگەیشتینە یەکتر مەبەستم ئەوە نییە بڵێم من لێی دەبوومە مامۆستا وەیا دەیکردم بە سوختەی خۆی چونکە لەو باوەڕەدام کە ئەگەر دوو لایەن مەبەستیان بەرژەوەندی ڕاستینە بێت و فرِوفێڵ و بە هەڵەبردن و هەڵخیسکاندن لە نێواندا نەبێت چاریان ناچارە بە یەکتر دەگەن...

ئەمانە لەوێ بن، من جارێ نەچوومەتە دیدەنی مەلیک، بەرپرسی حکوومەت، کە نایناسم بە تەلەفۆن سفارشی ئیدارەی ئۆتێلیانم دەکرد کە ئاگاداری حاڵ و بەجێهێنی ئارەزۆکانم بن، نەشیان هێشت فلسێک لە گیرفانم دەربهێنم بۆ ژیانی ڕۆژانەی ئۆتێلم. چەندێکی دەمەویست فاتۆرەم بۆ بێت دەیانگوت «مدفوعة»... ڕاستییەکەی خۆدزینەوەم لە زیارەتی مەلیک تا ئێستاش هەستی شەرمەزاریم تێدا بەخەبەر دەهێنێت بەڵام لێی پەشیمان نیم چونکە ویژدانم بەوە ئارامترە کە گەڕانەوەم بۆ وڵاتم ڕێی دام بیروڕای خۆم بە کورد و عێراق ڕابگەیەنم هەرچەند تەئسیریشی کەمبێت وەیا ببڕای ببڕای بێتەئسیریش بێت... کەس ئەو ڕۆستەمە نییە بە گورزی گران و سواری ڕەخشەوە دنیا بکاتە شامی شەریف.

ئێوارەیەکی ڕەمەزان یاریدەدەرێکی «ملحق عسكري» ئوردون، کە تازە لە بەغدا گەڕابۆوە، بە خۆی و برادەرێکی خاوەن پلەی بەرز لە حکوومەت، هاتنە لام و بۆ فتار چووینە ماڵی یاریدەرەکەی مولحەق لە شاری «السلط» بوو کە ٣٠ -٤٠ کیلۆمەترە دەکەوێتە باکوور ڕۆژاوای عەممان. ئێستا لە تەعمیری تازە خانووەکەی نەبووبۆوە بەڵام ژوورێکی تێیدا فتارمان کردەوە، زۆر دڵگیر بوو، هەموو «سلط»ی لێوە دیار بوو. مەبەستم شتێکە لە گێڕانەوەی ئەم داوەتە: خێزانی خانەخوێمان تێکڕایان وەکوو خزمی نزیکم بن، بەخێریان هێنام، هەرچی تەقیەیە پێیانەوە دیار نەبوو، دەتگوت ساڵەهامان لەگەڵ یەکتردا ڕابواردووە. بە دەست خۆم نەبوو ئارەزۆی خزمانم لەو دەمانەدا لە دڵم گەڕا بە جۆرێک چاوم تەڕ بوون، کە ئەمەیان دیت تێم گەیاندن چی بوو کاری تێ کردم. ئەو خێزانە هەموویان و خاوەن پلەی بەرزیش بەڕۆژوو بوون و نوێژی بە خشوعیان کرد، فتارەکەش کە زۆری تێدا خەریک بووبوون بە شێوەیەکی یەکماڵی و عەشایری بەڕێ کرا. شارەکەش ئەوەندە فێنک بوو دەبوو پەنجەرەکانی ژووری لێ دانیشتنمان هەمیشە داخراو بێت، ئاوی «مشروع» بەفری گەرەک نەبوو. شەوێکی زۆر خۆش بوو، هەموو برادەری و ناسیاوی نێوان من و خانەخوێ لە ماوەی دوو ساڵی ڕابوردوودا کە نەقڵی بەغدا بووبوو لەو چەند سەعاتەدا خۆی نواند. لەم جۆرە ئاکاری ڕێکوپێک ئوردونییەکان زۆر دەوڵەمەندن.

چیت بکرییایە لە پێداویستی ئارەزۆی ئادەمی لەلایەن حکوومەتەوە نرخێندرابوو، خاوەن دووکانەکانیش هەتا لیستەی ڕۆژانەی ڕەسمییان پێ نەگەیشتبایە لە بارەی

نرخی بابەتەکانیان هیچیان نەدەفرۆشت. میوەیەکی تازە پێ گەیشتبا بۆ ماوەیەک ئازاد بوو، تەنانەت هەنجیری زێدە نایاب کە لە سەرەتاوە کیلۆی بە ٦٠٠ فلس دەفرۆشرا لە پڕ دابەزی بۆ ٢٤٠ فلس و کەسیش سەرپێچی وەیا فێڵی تێدا نەکرد. دیاردەی ئێریەلی زێدە بەرزی تەلەڤیزیۆن بەسەر خانووەکانەوە سەرنجی ڕادەکێشا، هێندێکیان بە قەدەر خانووی شەش نهۆمی بە ئاسماندا چووبوون تومەز لە تەلەڤیزیۆنی هەموو ناوچەکە سوودمەند دەبوون. ئوردونی ڕەسەن هەتا بڵێی بەئەدەبن، وشەی «لو سمحت» بۆ هەموو شتێک لە زاریان نابڕێت، هەتا بڵێی ئامادەی خزمەتی غەیرەن. لەو چوار مانگە و بیست شەوەی مانەوەم لە عەممان‌دا نەمدیت کەس لەگەڵ کەس شەڕ بکات تەنها یەک جاریش دیتم کابرایەکی بە هەڵپە، کە دەرچوو ئوردونی نییە، یاسای پەڕینەوەی شەقامی شکاند، خەڵقەکەش بە تێکڕایی نارەزاییان دەربڕی... پێشبرکێ لە سواربوونی تاکسی وەیا پاس هەر پەیدا نەبووە لەوێ... بێئسوولی لە سینەماکان وەهم و خەیاڵە (ئەوسا وەها بوو کە ١٢ ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە)...

میللەتەکەی ئوردون زێدە چالاکن، دیتم بە پاڵ گردەوە بایی عیمارەتێکی هەشت قاتی گردیان داتاشی بوو بۆ تەختایی خوارەوە کەوا بێگومان نرخی زەویەکەی دوو جار و سێ جار دەکرد، ئەگەر بزووتنەوەی ئابووری لە هێز و پێزدا نەبێت مرۆ زات ناکات کۆهکەنی وەها وەئەستۆوە بگرێت.

گەلێک جاران، بەتایبەتی کە «ابو جومرد» لە عەممان بوایە، دەچووینە نادی سەلاحەددین شەوێکیان ٦-٧ گەنجی کوردی ئوردونی منیان لە مەجلیسی کاملان دابڕی، هەر لە سەعات نۆوە هەتا یەکی پاش نیوەشەو لەگەڵیان دوام، کە بڵاوەشمان لێ کرد بە ناچاری بوو، چونکە دوو کەس لەو کۆمەڵە دەبوو لە ١،٣٠ بگەنە ئۆتۆمۆبیلێکی بەرەو شام دەڕۆیشت. پرسیارێکی زەقیان کرد گوتیان، چۆنت ڕا لە گەنجی کوردە؟ گوتم هەتا سەرکردایەتییەکی یەکگرتوو بەسەر بزووتنەوەی سیاسیی کوردیدا نەسەپێنن هەمووتان چیلکەی ئاگرن، منیش کە دێم بێ پێچوپەنا بیروڕا دەرببڕم لەوەوەیە کە سەربە هیچ لایەنێک نیم و بەرپرسی ناتەواوی وەیا نالەباری و ناقۆلایی و هیچ ڕووداو و کردارێک نیم بە خۆمدا بشکێنیتەوە لە ڕەخنەگرتن و نارەزایی.

وەها ڕێککەوت لەو ڕۆژانەدا ڕووم لێ نرابوو کە دەنگی تکایەک بگەیەنمە کوردێکی بەناوبانگی ئوردونی کە پێشتر بووبوو بە سەرەک وەزیران و ئاشناییش پەیدا بووبوو لە نێوانماندا، بەڵکوو لە ڕزگار کردنی عەلی عەسکەری و خالید سەعید خواییشتێک بکات. من «ابو جومرد»م ڕاسپارد، بەڵام بێ ئەنجام بوو، چونکە کابراکە ڕێی بە خۆی نەدابوو لە کاری وەهادا خەریک بێت، ناهەقیشی نەبوو - دوای چەند ساڵێک بەسەردا کۆچی دوایی کرد. ئەم مەسەلەیە هاندەرێک بوو بۆ ئەو قسانەی لەو شەوەدا کردمن بێ ئەوەی لای ئەوانی بدرکێنم، ئەو گەنجانە وەکوو هەزارانی دیکە لەوپەڕی جۆشی سەودای نیشتیمانپەروەری بوون بەڵام ڕابەری چاکیان پێویست بوو، وەک کە دەروێش مورشیدی پێویستە.

بە تێکڕایی کوردەکانی ئوردون لە کەمایەتییە نەتەوەکانی تێروتەسەل دەژمێردرێن و لە دەوڵەتدا کاربەدەستی زلیان هەبوو، تا ئەوەی سەرەک وەزیرانیان لێ پەیدا بوو... کە لەگەڵیاندا کۆ دەبوومەوە هەستی خۆییاتیم لێ دەکردن. جارێ تا ئەوسا تەبیات عەشیرەتی بوون، زۆر لە خەم ڕەسمیاتدا نەبوون...

لە میانەی دەمەتەقەیەکی زمانزانی کە لە نێوان دوو مامۆستای پسپۆڕی زمانی عەرەبی، یەکێکیان لە زانکۆی ئوردون، ئەوی دیکەیان لە زانکۆی کوێت، سەری هەڵدابوو، لە ڕۆژنامەی «الدستور» بڵاودەکرایەوە. دوو گوتاری سەر بەو بابەتەم لە هەمان ڕۆژنامەدا بڵاوکردەوە. لابەلایی لە گوتاری دووەممدا توانجم لە شێوازی زامدار کردن گرت کە هەردوو مامۆستا تێوەی گلابوون. دوای ئەم نووسینەی من ڕۆژنامەکە تاکە یەک گوتاری دیکەی لەو دەمەتەقەیە بڵاوکردەوە و ڕایگەیاند کە مادەم کار گەیشتە یەکتر سەرشکێن کردن دەرگا لەو بابەتە داخرا. مامۆستا د. نیقولا حەدداد مامۆستای مێژوو لە زانکۆی بێرووت و زانکۆی ئوردون کە لە مێوانانی ئۆتێلەکەی من بوو، گوتی هەر دوو گوتارەکەتم خوێندەوە، وا دیارە تۆ بۆ «خاصة الخاصة» دەنووسیت، چ دەبوو قوتابییانی زانکۆ تێی گەیشتبانایە و سوودیان لێ وەرگرتبایە؟ گوتم قسەکەت ڕاستە کە من وتووێژم لەگەڵ بەرەی مومتازی ڕۆشنبیرانە هۆیەکەش ئەوەیە کەوا من لە بەرنامەمدا نییە داوا لە کەس بکەم بە دوامدا بێت و پێڕەوی ڕایەکانم بکات. تا ئەگەر دووچاری نسکۆیەک هات ناتوانم دەستێکی یارمەتی و چارەسەر کردنی بۆ درێژ بکەم، لەم گوتارەشدا نەمویستووە بیروڕاکەی من قوتابیانی زانکۆ بە گژ مامۆستاکانیاندا بهێنێتەوە کە هەر ئەوەی لێ

ئەنجام دێت لە کۆتایی ساڵ سزای دەرنەچوون بە پاداش وەردەگرن. من ئومێدێکی کزم لەو گوتارانە هەر ئەوەندەیە کە ئەو دوو مامۆستایە و هی وەک ئەوان بیروڕاکانم بسەلمێنن و بە قوتابییەکانیان ڕابگەیەنن. مامۆستایەکی لە وتووێژ وەیا دەمەتەقەی نووسراودا بگاتە پلەی قسەی سووک تێکگرتن دەبێت تا چەند لە قوتابی خۆی بسەلمێنێ ڕەخنەی لێ بگرێ؟

لە گوتارێکمدا هەڵەی یەک لەو دوو مامۆستایەم ڕاست کردبۆوە کە نووسیبووی «هل التنوين الا ضمتان وا فتحتان او كسرتان؟» هەڵەکەشی دوو لایی بوو، یەکیان ئەوەیە کە «التنوين هو اضافة نون الى نهاية الاسم المعرب» تا ئەوەی لە عەرەبی لەهجە هەیە لە جیاتی نوون، میم دەخاتە کۆتایی ناوەکە و «تمييم»ی پێ دەگوترێ نەک «تنوین». هەڵەی دوەم کە سەربە فۆنەتیکە ئەوەیە کە «بزوێن» چ کورت بێ وەک سەر و بۆر و ژێر وەیا درێژ بێت وەک «ا، و، ی» بزوێنی دیکەی ناچێتە سەر، هەر لە ئیمکاندا نییە بچێتە سەری لەوە هەر بگەڕێ کە مومکین نییە خۆی سواری کۆنسنانت ببێت چونکە لە بەرایی وشەوە نایەت. هەرچی دەنگی «و، ی» یە لە حاڵەتی کۆنسنانتیدا بزوێن قبووڵ دەکات دەنگی «ا» ئەلف نابێتە کۆنسنانت... جا کە هاتوو قوتابی دوو جار و سێ جار لەو تەرزە بارانەدا یەخەگیری مامۆستای بوو دەبێ حاڵی چۆن بێ.

خولاسە بەپێی بەرنامەیەکی خۆم هەڵمبژاردووە بۆ دەربڕینی بیروڕا لەو وڵاتە تەسکوتروسک پێوەی وەک ڕۆژهەڵات، دەبێ شێوازی نووسینم لە ژووررووی ناوەڕاستەوە بێت، ئنجا ئەگەر ناوەڕۆکەکەی ئەوە بهێنێت ئەرکی بۆ بکێشرێت با کاکی خوێنەر بە وردی تێی ڕامێنێت خۆ کە لە شتێک ورد نەبێتەوە هەر نازانێ ئەو شتە ڕاستە یان هەڵە، ئەمما ئەگەر ناوەڕۆکی بێکەڵک بوو، بەڵای لێ دات با کەس تێی نەگات. ڕاستیی مەسەلەکەش ئەوەیە کە سەراوبوونی زوربەی هەرە زۆری خەڵقولا لەوەوە دێت کە بە ئاسانی باوەڕی پفدراو و تەنکاو و ئەفسانەیی چ لە عەقیدەی غەیبی بێت و چ لە ڕامیاری و ئابووری و لکە بێئەژمارەکانی سەقافەت بێت، دەچێتەوە دڵیانەوە و تەنگ بە باوەڕە ڕەسەن و ڕاستەکە هەڵدەچنێ.

لەم بابەتە وتووێژەی تایبەت بە خۆم، گەلێک جار دەهاتە ناوەوە تا ئەوەی جارێکیان لەگەڵ دوو سێ کەسی «رسمی» دەدواین و قسە گەیشتە شەڕەکەی پێنجی حوزەیرانی ١٩٦٧، پاتەوپات گوتم نەدەبوو ئوردون لە ترسی ڕەخنەی ناحەزانی

تێکەڵ بەو شەڕە بێت کە بەر لە هەڵستانی دۆڕابوو. پاراستنی قودس و «الضفة الغربية» سەد جاران گرنگتر و پیرۆزتر و بەشەرەفتر بوو لەوەی چەند هەوەسبازێک دەمکوت بکرێت بەو نرخە زلەی کە بە دۆڕاندنی قودس و «ضفة» لە کیس ئوردون و فەلەستین و هەموو عەرەبیش چوو، ئنجا هەر مایەوە لە ساڵی ١٩٧٠ چی قسەی لەوجەرِ و بێباکانە و ئابڕووتکێنە بە ئوردون بگوترێت!

شەوێک لە شەوەکانی دانیشتنی عادەیی ساڵۆنی ئۆتێل ئەدیبێک و هونەرکارێکی ئوردونی (ناویانم لەبیر نەماوە) لە دۆستانی «امیر رعد» بەشدار بوون و لە زۆر بابەتی جۆراوجۆری سەربە سەقافەت پرسیاریان کرد تاکوو هاتنە سەر باسی عێراق و مەسەلەی کورد، ئنجا بایان داوە سەر مەسەلەی فەلەستین و پرسییان، بیروڕات چییە لەم مەسەلەیەدا؟ گوتم پرسیارەکە زۆری بەبەرەوەیە (هەندێک لەو ڕووەوەم ڕوون کردەوە) بەڵام من مەودا کورت دەکەمەوە و دەڵێم، پەنجا پسولە کاغەز بێنە لە هەر یەکەیان بڕیارێک بنووسە هەر لە تەسلیمبوون هەتا دەگاتە «جەنگ لەم دەمەوە»، کوێرێکی ڕێبوار بێنە بێ مەبەست و بێ دەست لێ کوتان پسولەیەکت بۆ ڕابکێشێ، ئەو پسولەیە چی لێ نووسرابێت با نووسرابێت، ئەگەر عەرەب بە تێکڕایی وەیا بەشی زۆری دەسەڵاتداری پێڕەوی پسولەکە بکات چاکترە لەوەی ئێستاکە بە کردەوە دەکرێت، چونکە چی دەکرێت هەر دەڵێی بۆ خاتری دوژمنە. تەنانەت تەسلیمبوون پتر ئیسرائیل ماندوو دەکات لەوەی عەرەبەکە بێ تەسلیمبوون خەریکی یەکتر بێت، لە نموونەدا دەڵێم، کە دوو دز بەتەما بن ماڵەکەت بدزن لەبەر تەمایەکی دیکە بە شەڕ هاتن و یەخەی یەکتریان گرت ئاسوودەترە بۆ تۆ لەوەی هەردوویان لە حەوشەی خانووەکەت ببورێنەوە وەیا بمرن، چونکە لە وەدەرنانیان بۆ کۆڵان ماندوو دەبێت، خۆ ئەگەر کەس نەبوو بیانشارێتەوە دەبێ هەر خۆت سەروبەری شاردنەوەکەیان بکەیت ئیتر چاکترە بۆ تۆ لە کۆڵان بە زیندووەتی تێک بئاڵێن.

لە زۆر باردا دووبەرەکیی سیاسی لە وڵاتێکدا هەمان حاڵ پەیدا دەکات، چونکە لایەنەکان بخەون وەیا لە خەستەخانان نەساغ بکەون قازانجی میللەتەکەیانە، هەر نەبێ ماڵ کاولییەکی لە تێک هەڵقژانی بێکەڵکی ئەوان دووچاری دێت لە کیسەیدا دەمێنێتەوە...

ئەو شەوە ئەدەبیەکە و هونەرکارەکەش، دوای بەسەرچوونی کۆڕی شەوانە میوانداریيان کردم لە ژوورێکی ئۆتێلەکە (وا دەزانم بۆ ئەو مەبەستە تێیدا مانەوە بە مێوانی ئۆتێل دەنا دەچوونەوە بۆ ماڵەکانیان) هەتا دوای سەعات سێی پاش نیوەشەو، بە ئیلحاحەوە داوایان کرد لەگەڵ ئەمیر ڕەعد کۆببمەوە کە بۆ ئەو فرسەتێکە. خولاسە بە توندی تێم ئالآن کە چیتر ناشێ لاتەریک ببم، گوتیشیان بە دواتدا دێینەوە. وەها ڕێکەوت بۆ ڕۆژی دواتر هاتبوونەوە سەردان و ئەحواڵ پرسینم بەڵام من لە دەرەوەی ئۆتێل بووم، ڕایانسپاردبوو کە لەو نزیکانە دێنەوە بۆ لام... ئەمما هەر دوو ڕۆژی دیکە من عەممانم بە جێ هێشت بەرەو عێراق...

چەند تەجرەبەیەکی شیرنم هاتە پێش، یەکەم و دوەمیان لە حەفتەی یەکەمی چوونم بۆ ئوردون بە دوا یەکتردا هاتن، کابرایەکی عەرەبی «محمرة» لەو ئۆتێلە دابەزی بوو کە منی لێ دابەزیبووم. ڕۆژانە داوەت دەکرا بۆ ناو عەشایری دەوروپشتی عەممان، پێوەی دیار بوو ڕێزی لێ دەگیرێت و حیسابێکی بۆ دەکرێت... لە وتووێژدا زانی من کێم و بۆچی دووره وڵاتم بیروراکانیشمی بەلاوە پەسەند بوون... هاتە لام لە ژوورەکەم، گوتی من دەوڵەمەندێکی خاوەن چاپم لە «محمرة»، بەرەو ئەڵمانیا دەڕۆم بۆ ماوەی مانگێک دەمێنمەوە تا مەکینەی نوێ دەکڕم و لێی شارەزا دەبم. پێشنیاز دەکەم بۆت بە هەرچی کەرامەتی مرۆیە قبووڵ بکەیت ببیتە شەریکم. حەز دەکەیت بەیەکەوە بچین بۆ ئەڵمانیا و بەیەکەوە بگەڕێینەوە بۆ «محمرة» حەزیش دەکەیت لە پێشەوە دەچین بۆ قاهیرە، شوققەم هەیە بەسەر نیلەوە، تێیدا بە، لە ماوەی ئەو مانگەدا بە دڵی خۆت ڕاببوێرە، کە گەڕامەوە لە ئەڵمانیا دەچینەوە بۆ «محمرة»... سێ ڕۆژم ماوە (یان ژمارەیەکی دیکەی گوت) تا سەفەر دەکەم چۆنت پێ خۆش بوو ئەو بڕیارە بدە! زۆر زۆر سپاسم کرد لەگەڵ عوزرهێنانەوەی نەتوانینی هەڵگرتنەوەی پێشنیازەکەی... دوای دوو ڕۆژ (کەمتر زیاتر) هاتەوە لام گوتی، وا سەفەرەکەم بۆ ئەڵمانیا دەست پێ دەکەم ئەمرت بەسەر چییەوەیە؟ دیسانەوە زۆرم سپاس کرد... ئیتر یەکترمان نەدیتەوە چونکە من ئۆتێلم گۆڕی...

دوو سێ ڕۆژ بوو لە عەممان بووم پاش نیوەڕۆیەک لە سالۆنی ئۆتێلەکە نامەیەکم نووسی، چەند پیاوێکم لێ نزیک بوون، ئافرەتێکیش لەوان دوورتر لێمەوە بە تەنها دانیشتبوو. من لە نوختەی گرفتی کاغەزنووسین، کە چەند ئەرکی تێدایە تا پوولی

پێویست پەیدا دەبێت و کاغەز دەگاتە بەرید و دەخرێتە تۆماری ئەو نامانەی بۆ هەندەران دەچن، خولاسە بە دەم ئەو ئەرکە بێلزوومەی نامە بەڕێ کردنەوە بۆ هەندێ لایەنی دیکەی بێبایەخی ژیانی ڕۆژانەوە ڕۆییشتم کە چەند مرۆ ماندوو دەکەن، ئیتر قسە بەملا و بەولادا چوو تا ئەو پیاوانە ڕۆییشتن.

ئافرەتەکە بەرەو لامەوە هات ئیزنی خواست لەگەڵمدا بدوێت... خۆی ناساند کە ناوی - وابزانم - «منی رمضان» بوو. گوتی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە عەممان دەمێنمەوە خۆم و مێردم و برایەکم بەیەکەوەین حەز دەکەم بیانناسیت، خۆیشم ماستەرم هەیە لە ئەدەبی فرەنسەیی، لە کۆلیجی ئەمەریکایی بێرووت و خەریکی دکتۆراشم... گوتی، گوێم لە قسەکانت بوو کە هەرگیز شتی وەهام نەبیستبوو لە جۆری بۆچوون و بیروباوەڕ، بۆچی ئەو فکرەت بە زمانێکی ئەورووپایی بڵاوناکەیتەوە؟ لە وەڵامدا تێم گەیاند کە حاڵوبارم چۆنە و نازانم چارەنووسم چییە، لە کوێ ئەو دەسەڵاتە بهێنم بە ئاوارەیی بژیم و ئەرکی چاپ هەڵبگرم، بە زمانێکیش بنووسم کە باشی نازانم، ئیتر دەبێ زمانزانێک پەیدا بکەم نووسینەکەم بۆ وەربگێڕێتە سەر زمانێکی ئەورووپایی.

بەینێک لە گەلێک لاوە بۆ بابەتی سەقافی ڕێی وتووێژمان دەرکرد من گۆشەنیگای تایبەتی خۆمم تێدا دەردەبڕین هەتا مەودایەکی درێژمان تێدا پێچایەوە. لە پڕ گوتی «أخاف اثقل عليك!» گوتم، یەکێک لە بیابانی چۆڵوهۆڵدا دەنگ هەڵبڕێت ئەگەر گردۆڵکەیەکی لێوە نزیک بێت دەنگەکەی بداتەوە هەستێکی ئاشنایی دەکات، ئاخۆ دەبێ من چ قورساییەکت هەڵبگرم کە وەکوو مرۆیەکی هەستیاری هۆشیار بە کۆڵێک بەزەییەوە دەنگم دەدەیتەوە لە جیاتی ئەوەی بە بۆشاییدا بڵاو بێتەوە بەرەو هیچ؟ قسەکەی زۆر بە دڵ بوو. گوتی من لە خێزانێکی دەوڵەمەندم، لە بێرووت و لە چیا خانوومان هەیە خواییشتت لێ دەکەم خۆت و هاوسەر و منداڵانت، کە هاتنە لات، لێمان مێوان بن... سپاسم کرد و بەڵێنم نەدا. سبەینێ لە ساڵۆنی نان خواردن خۆی و مێردی پەیدا بوون، منی بە مێردەکەی ناساند، دیار بوو باسی وتووێژی ڕۆژی پێشترمانی بۆ گێڕابۆوە. لە یەکەم نیگاوە هەستم کرد مێردەکەی شناساییمانی بە دڵ نییە «تفضل»ێکی سەرزارەکیی گوت بەڵام بە سپاسەوە چوومە سەر مێزێکی نەختێک لە هی ئەوان دوور، بە جۆرێکیش دانیشتم ڕوو بە ڕوویان نەبم... دوای دوو ڕۆژ بەرەو لوبنان گەڕانەوە. لە یەکترمان نەبیستەوە.

یەکێک لە کۆمەڵەی کۆڕی شەوانەی سالۆنی ئۆتێلەکەمان گەنجێک بوو خەڵقی شام، پێوەی دیار بوو بە وردی و بە ئاگاوە گوێ دەگرێتە قسەکانم. پاش بەسەرچوونی دانیشتنی شەوێکیان کە بابەتی وتوویژ ڕووی لە تەسەوف کرد و نەختێک تێدا قسەم درێژ کردەوە، بۆ بەراورد کردن لە نێوان شیعری تەسەوفی عەرەبی و فارسی و تاڕادەیەکیش هی کوردی، ئەو گەنجە بە پەرۆشەوە گوێی دەگرت و پرسیاری دەکرد. پاش ئەمە هاتە لام لە ژوورەکەم هەڵڕژا، دەرچوو شەیدای تەسەوفە. باسی خۆی کرد کە موهەندیسە لە شام، هاتۆتە عەممان بۆ فرۆشتنی پارچە ئەرزێکی کە ٧٥٠ هەزار دیناری پێ دراوە و خەریکە مامڵەتەکە تەواو دەکات. بەینێک لە بەغدا بووە لای مامۆستا مەلا کەریم بیارەیی، لە ئاستانەی گەیلانی «استمدادی ارشاد»ی کردووە، کە هاتۆتە سەر گەڕانەوە بۆ شام، مامۆستا مەلا کەریم هەواڵەی کابرایەکی کردووە لە شام بەسەر عەرەبانەوە کەلوپەلی فرۆشتووە، بەینێک ئەو مورشیدی بووە. بەر لە مردنی ڕێنمای کردووە بۆ لای یەکێکی دیکە کە ئێستا بە بیرم نەماوە چۆناوچۆنی لەیەک ترازاون، ئیتر پاش ئەو کابرایە وەکوو گومڕا ماوەتەوە تا ئەمشەوە، کە پاش چەند شەوێک لە بابەتی هەمەچەشنە، من هاتوومە سەر باسی تەسەوف.

گوتی وازت لێ ناهێنم دەبێ مورشیدم بیت، دەچینە شام من بابایەکی دەوڵەمەندم ٧٥٠ هەزار دینارەکە بەشێکە لە دارابیم - تۆ مامۆستا و من مرید هەتا لە گەرداوی سەرگێژیم ڕزگار دەکەیت و تا چەندێکی خۆت ئارەزۆتە فەرمانبەری تۆ دەبم... بە پەرۆشێکەوە قسەی دەکرد بەزەییم پێدا دەهاتەوە کە ناتوانم چارەسەری دەردەکەی بکەم. پێم گوت براله من بۆ ئەم ڕێگایە خەڵق نەکراوم. ئالوودەی دنیا بووم و قەرزداری خوام لە نوێژ و ڕۆژوو... چەندێکی بەند و بالۆرەم بۆ گوت نەیسەلماند... تەنانەت کە بەدوامدا هاتن بگەڕێمەوە بۆ عێراق، نەموێرا پێی بڵێم و تێی بگەیەنم و دوعاخوازیی لێ بکەم. نەمزانی دوای من چی کرد و سەری بە چییەوە نا...

لە چەند لایەکەوە کۆمەڵەی نهێنیی سەربە بزووتنەوەی ئیسلامی لە میسر و لە لوبنان و لە عێراق سەریان لێ خوار کردمەوە بە نیازی نزیکبوونەوەم لێیان و تێکەڵبوون لە چالاکییەکانیان. لە هەموانم گەیاند کە من پێوەندیم بە هیچ کەس و لایەن و ڕێکخراوی سیاسی و ئاینی و هونەری و وەرزشیەوە نابێت، دەبێ بە تەواوی

سەربەخۆ و ئازادی فکر و چالاکیم بم، دەنا کەڵکم پێوە نامێنێ چونکە بایەخێک لە بیروڕاکانمدا هەبێت ئەوەیە کە فکری غەیر کاوێژ ناکەمەوە و بە سازی هیچ مۆسیقاژەنێک نارەقسم. کە هاتم بەڵگەی هەر کام باوەڕ هەیە بکەم بە پاڵپشتی بۆچوونی خۆم ئیفلاس دەکەم چونکە ئەو بەڵگەیەم لە سەرەتاوە لەلایەن شتێکی من ڕەخنەی لێ دەگرم ڕەفز کراوە، بەرنامەی من ئەوەیە هەتا بۆم بلوێ بەڵگەی ڕاست نەبوونی باوەڕێکی ڕەخنە لێ دەگرم لە بەڵگەنامەی ئەو باوەڕەوە هەڵێنجم، ئنجا بێمە سەر هەڵێنجانی بەڵگە لە ڕووداو و لە تەجرەبە کە شتێک بە درۆ دەخەنەوە یان بە ڕاستی دەگێڕن، ڕەنگە لە پلەی سێیەمدا پەنا ببەمە بەر بەڵگەی هۆشەکی «عقلی»ی ڕووت...

جگە لەم تاکانە و کۆمەڵەی سەربە ئایین و غەیری ئایینیش، لەلایەن نوێنەری میسر و ڕاسپاردەی سووریەش بانگهێشتن کرام. میسر ئەو دەمە سەفیری لە ئوردون نەبوو سەفارەتخانەی لەلایەن کاربەدەستی پلە نزمتر لە سەفیر و «وەزیر مفوض» دەگێڕدرا. لە ژووری بەرپرس و سەرەک نووسەرانی ڕۆژنامەی «الدستور» موستەشاری سەفارەتی میسری، کە یەک دوو فەرمانبەری دیکەشی لەگەڵدا بوو، بە ناوی سەفارەتەوە پێشنیازی کرد بچم بۆ میسر و لەوێ بژیم تەنانەت ئەدرەس و نومرەی تەلەفۆنی خۆی لە قاهیرەش خستە سەر کارتەکە تا ئەگەر هەر ڕۆژێک ویستم و لە قاهیرە بوو، دوودڵی نەکەم لە چوون. سپاسم کرد و لەوەندە بڕایەوە. بەرژەوەند نەبوو ئەو دەمە بە هاتووچۆوە یان بە تەلەفۆن پێوەندیم پێوە بکەن چونکە نێوانی میسر لەگەڵ ئوردون بە ڕواڵەت پچڕا بوو... هەرچی سووریە بوو، ناسیاوی خۆمی ڕاسپارد لە زاری بەرپرسێکی گەورەیانەوە، کە مێوانی ئەوان بم، تەنانەت ئەو بەرپرسە داوای «اعادة التوازن الی میزان مختل»یشی کردبوو، پێشتر دانەیەکی بووبووە هی ئەو «منی رمضان»ەی باسم کرد... هەڵبەت وەڵامی سووریەشم دایەوە بە نەچوون.

لایەنی ڕابواردنی ڕۆژانەم لە ئوردون ئاسوودە بوو، هەرچی سەغڵەتی هەبوو لێم نەبوو، چی بۆ یەکێکی وەکوو منیش لە مجێز بێ هەبوو. فیلمی ئەوتۆم دەدیت هەرگیز لە عێراق نەمدیتبوون و وەک هی ئەوانیشم نەدیتبوو... خواردنیان لایەنی «تیژی» لێ دەرچێ کە من زۆر مەیلی ناکەم و خۆشم لێی دەپاراست، تا بڵێی خۆش و بەلەزەت بوو، گیرفانیشی تەنک نەدەکردی. دوو لۆقنتەم کردبوون بە

سەرشار، یەکێکیان «شعبي»بوو خاوەنەکەی کە خۆی چێشتلێنەریش بوو، بەینێکی چەند ساڵی لە بەغدا و لە ماڵی وەزیرێکی سەردەمی بەر لە تەمووز بە چێشتلێنەر ڕابواردبوو، لە تەبیاتم شارەزا بوو کە دەیزانی عێراقیم... زۆر چاودێری دەکرد لە خواردنی ئەوتۆ بە کەیفی من بێت. ئەگەر لە لیستەی خواردنی سبەینێ شلەیەک نەبوایە بۆ من دەست بدات هی ئەو ڕۆژەی بۆ هەڵدەگرتمە سبەینێ، دەیخستە سەلاجەوە. بەردەستەکانی ببونە ناسیاوم، ڕۆژێکی بە عادەتی خۆم نەچووبامایە بۆ ڕۆژی دوایی پرسیان دەکرد بۆچی نەچووم... یەکێک لەو بەردەستانە شکایەتی لە زگێشە دەکرد. ئەوەندەم خۆ بە قەرزداری ئوردون دەزانی پێم گوت بڕۆ بۆ لای دکتۆر چەندێکی مەسرەفی ویست نیوەی عایدی من بێت... بەدڵ سوپاسی کردم بەڵام لێمی نەسەلماند. بۆ ڕەواندنەی دوودڵییەکی هەیبێت سوێندم بۆ خوارد کەچی دەڵێم هی سەرزارەکی نییە... مەردانە و لە ناخی دڵەوە گوتی «سيدا! من قال فعل»، ئەم قسەیەی زۆر کاری تێکردم، چاوم لێ بز کردەوە بەینێک تێم ڕوانی و تێی ڕوانیم، من بە هەستێکی بریندارەوە چونکە وەهام بە دڵدا دەهات دەردەکەی دەروونییە و بە برینکاری نەبێ چاری ناکرێت و ئەوەندەشی لە دەستدا نییە مەسرەفەکەی تێهەڵبێت تەکلیفەکەم سێبارە کردەوە سوودی نەبوو... چی من دەمکرد شتێکی عادەتی و لە عادەتیش کەمتر بوو چونکە چەندێکی لێم خەرج کردبایە نەیدەکردە بیست یەکی ئەو فاتۆرانەی لە لاوە بۆم دەفع دەکرا واتە کوردی گۆتەنی، دۆنی خۆی لە سەری خۆی! ڕاستییەکەی وەهام حیساب دەکرد کە لە پارەی خۆی بۆی دەژمێرم، بەڵام لەوەوە دەماری مەردایەتی و ڕێز لەخۆنان دەیخستە سەر سەلماندنی شتێک کە بەلایەوە عادەتبەدەر بوو ئەگینا ڕۆژانە ئەو هێندەی قبووڵ دەکرد کە بۆم دەنایە پاڵ نرخی خواردنەوە.

چێشتخانەیەکی دیکەی زۆر قەشەنگ هەبوو بە ناوی «عمر الخيام» لە سەرووی بینایەکی شەش نهومیەوە بوو، لە دوو لاوە بەسەر عەممانیدا دەنۆڕی. تا بڵێی فێنک و بە خزمەت و ڕێکوپێک و خواردنەکانی هەمەبابەت و زۆریش نایاب. حەفتەی دوو جار بە ڕۆژ بۆی دەچووم وەها دەبوو لە داوەتدا شەویش لەوێ بەسەرمان دەبرد. دەستوپاوەندی ئەو چێشتخانەش بووبوون بە ناسیاو، لە تەبیاتم شارەزا بوون. سەڵاتەیان بۆ دەهێنام لە قاپی قووڵدا، ماست و خیاریان بە جودا دادەنا، پەرداغی

شۆراوی نەسڕاوەیان بۆم ڕیز دەکرد چی بۆ ئاوە چی بۆ پێپسیە... چایەیان بە تاقمی تەواوەوە لە پێش دادەنام...

لیستەی خواردنمان ناونابوو «وثيقة اعلان حرب» فاتۆرەش بووبووە «براءة الاطلسي» وا بزانم لە 10% خزمەت ناوی «پرۆتۆکۆڵ»ی وەرگرتبوو... ئیتر دەیانگوت «نجيب براءة الاطلسي» منیش دەمگوت «مع البروتوكول»، باوەڕ بفەرموو خوێنەری ئازیز ئەم جۆرە ڕەفتارە و کردارەمان تاموشامێکی زیادی دەخستە سەرلەبەری دیدەنییەکە و خواردنەکە و وتوویژەکانمان... بە دەگمەن نەبێ، یەکێکیان هەمیشە لێم نزیک ڕادەوەستا وەیا قسەم لەگەڵدا دەکرد، هەرچۆنێکیشم ویستبایە و هەر جۆرە خواردنێکی داوام کردبایە، ئەگەر لە لیستەشدا نەبوایە، بەپێی ئارەزۆم دەبوو، کە ئارەزۆیەکی دۆستانە و لەسەر شانانیان سووک بوو... ئاخر ژەمی نیوەڕۆژەم لەو چێشتخانەیە بوو ئیتر دوعاخوازییماڵئاوایم لێکردن...

گەڕانەوەم بۆ بەغدا لە ڕۆژی ٢٠/١٠/١٩٧٨ بوو، تەیارەکەمان لە شەودا دەفڕی پتر لە سەعاتێک لە کاتی خۆی دواکەوت بێ ئەوەی بزانین هۆی وەخرانی چییە... کە بە ڕیز بەرەو پێپلکەکانی تەیارەکە دەڕۆییشتین، ڕێککەوت وەها بوو دوو کەسی پێش منەوە کورد بوون گوێم لە قسەکانیان بوو، یەکیان بە ئەوی دیکەی دەگوت سا بەخوا ئەم تەیارەیە نامانگەیەنێتەوە بەغدا.. کاتێک بە ئاسمانەوە بووین کاپتنی تەیارەکەمان بە مایکرۆفۆن عوزرخوازی کرد لە وەخرانەکە، گوتی شوێنێکی تەیارەکە سەقەت بووبوو تا ساز بۆوە ئەو ماوەیەی خایاند... گۆیا دڵدانەوەی دەکردین کەچی مژدەی سەقەتبوون بە درێژایی فڕینمان خەیاڵمان دەڕووشاند... بۆ بێتاڵعی ئەو کوڕە کوردە بە نوکتە و بە شێوەیەکی گاڵتە ئامێزی خۆ هەڵدانەوەدا بە برادەرکەی گوت، نەمگوت نامانگەیەنێتەوە بەغدا؟ ئیتر من و دوو کەسی ئەهلی ماڵەوە کە بە دوامدا هاتبوونە عەممان تا گەیشتینە سەر خاکی فڕۆکەخانەی بەغدا ئەو موژدە خۆشەی کاپتنەکە و پێشبینیە گەشەکەی برا کوردەکە بە جووتە لە پەردەی مێشکمان دەشنایەوە. ئێمە ڕۆڵەی زەویین، لە تاقی ئاسماندا هەمیشە سڵ و قوتاغین هەتا پێ دەنێینەوە سەر خۆڵەپەتە...

ئەم دوازدە ساڵەی ١٩٧٨ هەتا ئیمڕۆکەی ١٩٩٠ جارێ زۆر بەرچاوە. وەک کە سەندباد حەفت گەشتی دەریایی کرد منیش شەش بەشی گەشتەکەم بۆ خوێنەری

کورد دەور کردەوە بەشی حەفتەمین با بمێنێ بۆ ڕۆژێک لە ڕۆژەکان و بارێک لە بارەکانی سازگارتر، بە ڕێزەوە...

«...»

## پێڕستی ناو